# عقیدەی مرضیە

دانانی:

## مامۆستا مەولەوی کورد

لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە:

**مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس**

پێداچوونەوە:

**فاتیح عەبدولکەریم**

# عقیدەی مرضیّە


**دانانی:**

سیّد عبدالرحیمی مەولەوی

•

**لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە:**

مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس

**پیاچوونەوە و داڕشتنەوە و پێشەکی و پەراوێز بۆ نووسینی:**

فاتح عەبدولکەریم



١٤٠٧ی هـ ـ ١٩٨٨ ی ز

## پێڕسی ئەم کتێبە

## یەک دوو وشەی پێویست

### خوێنەری بەڕێز!

ئەمەی لە بەردەستدایە لێکدانەوەی یەکێکە لە شاکارەکانی شاعیر و زانای پایەبەرز حەزرەتی سەیید (عەبدولرەحیم)ی مەولەوی، کە ناوی (عەقیدەی مەرزیە)یە و، بابەتەکەی زانیاریی (کلام) و بیر و باوەڕی ئایینی ئیسلامی پیرۆزە.

ئەم لێکدانەوەیە باوکم سالی ١٣٩٤ی کۆچی — ١٩٧٤ی زایینی تەواوی کردووە، بەلام لەبەر چەند هۆیەک کە هەندێکی هونەری و هەندێکی ماددیە و... هیتریش، بۆی نەڕەخسا زوو چاپ بکرێت و شوێنی خۆی بگرێت... وا ئێستە بەمجۆرە کەوتە بەردەستی خوێندەوارانی خۆشەویست.

پێوەندیی باوکم لەگەل گیانی وریای بەهرەداری حەزرەتی (مەولەوی) کۆنە، بکرە دەگەڕێتەوە بۆ سالانی دواپلەی خوێندنی؛ وەک لە (یادی مەردان)دا باسی کردووە.

من بەش بە حالی خۆم، لەو سالانەدا کە کتێبە ناوەندییە ئایینی و عەرەبییەکانم دەخوێند، دەمدی باوکم خەریکی نووسینەوەی شیعری (مەولەوی) دەبوو، گەلێجار دەمبینی دوو جار و سێجار لاپەڕەیەکی دەنووسییەوە تا دوایی سەقامگیر دەبوو لەسەر نووسینەوەکەی.

هەروەها ئاگاشم لێبوو کە هەندێ لە فەقێ دواپلەکانی (مستعّد) شیعرەکانی مەولەوییان دەنووسییەوە و خەریکی خوێندنی ئەم عەقیدەی مەرزییەش دەبوون.

ئەم پێوەندییەش شتێکی سەیر نییە؛ لە راستیدا نەک تەنها باوکم بەلکوو بەشێکی زۆر لە زانایانی ئایینی و ئەدیبان و ئەدەبدۆستانی کوردستان؛ بەشی سۆران؛ کەم و زۆر ئەم پێوەندییەیان هەبووە.

لەم پێوەندی‌یەدا، بێجگە هۆی شەپۆلی بزووتنەوەی نەتەوایەتی، کە کـەم و زۆر، بـەم شـێوە و بەو شێوە کاری لە تێکڕای کوردا کردووە، نابێ کاری لایەنە سۆفی‌یەتی‌یەکەی مەولەوی و شێوەی شیعری لەم رووەوە بخەینە پشت گوێ؛ بەڵێ مەولەوی زانایەکی ئایینی زۆر زیرەک و هەڵـکەوتوو بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سۆفی‌مەشرەب بـووە و پێوەنـدیی پیر و موریـدیی لەگـەڵ خێـزانی ڕێبازی نەقشبەندیی (بیارە) و (تەوێڵە)دا هەبووە و ئەو خوێندەوارانەش کـە هاوڕێبـازی مەولەوی بوو ون کەم نەبوو ون؛ بۆیە شیعری (مەولەوی) و عەقیدەی (مەولەوی) بووبوونە ویردی سـەرزاری زۆر کەس.[٢]

لە کاتی خۆیدا باوکم نوسخەکەی خۆی لەبـەر نوسـخە چاپەکـەی خوالـێ‌خـۆش‌بـوو مامۆسـتا (محی‌الدین صبری نعیمی) کانی‌مشکانی نووسیبووەوە و لێکدانەوەکەشی لەسەر ئەو بناخەیە بوو.

کە بڕیاری ئێجگاریی لـەچـاپ‌دانیمـان دا هەوڵـی نوسـخەیەکی دەسـتنووسمان دا کـە زیـاتر یارمەتیمان بدات و کارەکەمان پوختەتر و ڕێک‌وپێک‌تر بکات، ئـەوە بـوو لـەم دوایـی‌یـەدا بۆمـان دەرکـەوت کـە لـە هـەولێر لای بـەڕێز جـەنابی شـێخ جـەمالی کـوڕی خوالـێ‌خـۆش‌بـوو شـێخ (تاج‌الدین)ی کوڕی پایەبەرز شێخ (عبدالرحمن ابوالوفا) نوسخەیەکی دەستنووسی زۆر نایابی ئـەم (عقیدە مرضیە)یە هەیە، یەکەم جار دۆستی بەڕێزمان نووسەر کاک مومتاز حەیـدەری فۆتۆیـەکی نوسخەکەی بۆ گرتین و بۆی ناردین، دواییش بەڕێز جەنابی شێخ جەمال، بەهۆی خوالێ‌خۆش‌بـوو مامۆستا عزالدین فەیزی‌یەوە، خودی نوسخەکەی بۆ ناردین.

زۆر سوپاسی پیاوەتی و دڵسۆزیی ئەم زاتە بەڕێزانە دەکەین، بێ‌گومان ئەم یارمـەتی‌یـە پاکـەی ئەوان پێش هەموو شتێکی تر هاوکاری‌یەکی مەردانەیە لە ڕێگای بڵاوکردنـەوە و بـە ڕێـک‌وپێکـی چاپ‌کردنی کەلەپووری نەتەوایەتیمان‌دا.

ئیمە بەم نوسخەیە زۆر دڵخۆش و پشـت ئەسـتوور بـووین؛ چونکـە دیـارە نوسـخەی پایەبـەرز خوالێ‌خۆش‌بوو (ابوالوفا) خۆیەتی، کە پیرزادە و دۆسـتی گیـانی مەولـەوی بـووە و ئـەم کتێبـەی لەسەر حەز و بە (تشجیع)ی ئەو داناوە. گومان لەوەدا نییە کە مەولەوی خۆی ئەم نوسخەی دیوە. لەمەوپاشیش بە درێژی باسی ئەم نوسخە دەکەم.

کە ئەم نوسخەیەمان دەست کەوت بێ یەک و دوو دەستم دایە دووبارە نووسـینەوەی دەقەکـە لەبەر رووناکیی ئەم دەستنووسە و نوسخە چاپەکەی (نعیمـی) و هـەنگاو بـە هـەنگاویش دەسـتم کردە پیاچوونەوە و دارشتنەوە لێکدانەوەکە.

شایانی باسە خودالێخۆشبووی زانا مامۆستا (محیالدین صەبری نعیمی) کانیمشکانی سالی ١٣٥٢ی کۆچی(١٩٣٤ی زایینی) بۆ یەکەمجار لەگەڵ دەردی نامۆیی و دوورە ولاتیدا ئەم عەقیدە مەرضیەیەی مەولەوی و(فوایح)ە فارسییەکەی لە چاپخانەی (السعادە) لە میسر بە چاپ گەیاندووە[٣] ؛ ئەمەش رەنجێکی مەردانە و پیرۆزە و دوو شاکاری زانایەکی بلیمەتی نەتەوەکەمانی لە فەوتان رزگار کردووە.

سەبارەت بە زیندووکردنەوە و بەسەرکردنەوەی تێکڕای بەرهەمی (مەولەوی)ی نەمر خودالێخۆشبوو مامۆستا (محیالدین صەبری نعیمی) یەکەم کەسێکە رچەی شکاندووە؛ ئەو تەنانەت پێش (پیرەمێرد)ی نەمریش کەوتووە، نعیمی لە ١٣٥٢ی کۆچی(١٩٣٥ی زایینی) ئەم دووانەی لە میسر چاپ کردووە؛ پیرەمێردیش سالی ١٣٥٣ی کۆچی(١٩٣٥ی زایینی) (ئەسل و رۆح) ەکەی لە سلێمانی بەچاپ گەیاندووە.[٤]

لەبەر ئەوە لام وایە هەرکەس بەرهەمێکی تازەدۆزراوەی حەزرەتی مەولەوی لە چاپ بدا، یا دەست بداتە لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی یەکێ لە بەرهەمەکانی، بەتایبەتی ئایینییەکانی، دەبێت بە رێز و سوپاسەوە هێما بۆ ئەم مامۆستا زیرەکە دڵسۆزە بکات.

ئەم نووسەرە دوورەولاتە کە خوێندەوارانە و دەستپاکانە ئەم دوو بەرهەمەی چاپ کردووە، تا چەند نوسخەیەکی پەیدا نەکردووە دەستی نەداوەتە کارەکەی.

بێ گومان نوسخە یەکەمەکەی کە لە (ئەطەنە)ی تورکیا دەستی کەوتووە و خودالێخۆشبوو مەلا رەسوولی تووداریی نەقشبەندی سالی (١٣٠٨)ی کۆچی نووسیویەتیەوە، وەک خۆی دەڵێت چاکتر بووە لەوانی تر. خوالێخۆشبوو مەلا عومەری خاوەنی پێشووی دەستنووسەکەش وتوویە کە خوالێخۆشبوو مەلا رەسوولی تووداری ـ نووسەرەوەی دەستنووسەکە ـ مەلایەکی زانا و دۆستی (مەولەوی) بووە؛ ئەمەش زیاتر دەبێتە هۆی متمانە.

با بگەڕێمەوە سەر مەبەست: ئەو نوسخە دەستنووسەی دەستمان کەوت و فۆتۆکەیمان لایە و دەقەکەم لەگەڵیدا بەراورد کرد (١٢٠) لاپەڕەی گەورەیە، درێژی ٣٠ سم و پانی ١٥سم، واتە: پەڕەکانی درێژکارن. تێکڕا هەموو لاپەڕەیەکی [٢٠] شیعری تێدایە. جگە لە لاپەڕەی یەکەم و دوالاپەڕە کە کەمتریان تێدا نووسراوەتەوە، جگە لە دوو لاپەڕەیتریش کە یەکێکیان (٢١) و ئەویتریان (٢٢) شیعری تێدا نووسراوەتەوە، هەروەها جگە لەو شیعرانەی کە بەشێکن لە دەقەکە

و لە کاتی نووسینەوەدا لەبیرچوون لە ریزدا بنووسرێن و دوایـی بـە شـێوەی (صـح) لـە قـەراخی دەقەکەدا نووسراونەتەوە.(٥)

ئەم نوسخەیە خەتەکەی، تا بلێیت، خۆشە و زۆر بە رێکوپێکی نووسراوەتەوە و لە زۆر شـوێندا بە پێی پێویست (سەر و ژێر...)ی بۆ کراوە، سەرەڕای هەندێ وردەکاریی و نیشانەی رسـتەبەندی، کە ئێمەمانانی لە مزگەوت و قوتابخانە ئایینی‌یەکانی کوردسـتانەوە پێگەیشـتوو تێـی دەگـەین و گەلێک کاری لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە بۆ پیاو ئاسان دەکەن.

لەم نوسخەدا گەلێ پەراوێز بەرچاو دەکەوێ کە هەموویان بە نیمچە رستەی (منـە) دوایـی‌یـان پێ‌هێنراوە. (٦)

لە گەلێ شوێندا بۆ جیاکردنەوەی یێی بۆش (ێ) لـە (ی) ی‌تـر نووسـیویە «بـا یـاء مجهـول» هەڵبەت مەبەسـت لـەم (مجهـول)ە نادیـاری و نەکیرەیـە وەک دەڵـێت (پیـاوێ). هـەروەها بـۆ جیاکردنەوەی واوی بۆش (ۆ) نووسیویە: (بـا واو مجهـول) - لێـرەدا نـازانم بـۆ ناویـان نـاوە واوی مەجهوول؟ لەوانەیە تەنها قیاس بێ لەسەر (ێ)ی مەجهوول و هیچی‌تر، هـەر لەبـەر ئـەوەی واو و یێ بەیەکەوە ناو دەبرێن.

بۆ جیاکردنەوەی کاف و گاف بە پێی پێویست لە پەراوێزدا نووسیویە (بـا کـاف فارسـی) یـا (بـا کاف عربی).(٧)

منیش لەبەر رووناکیی ئەم سەر و ژێر و نیشانە و وردە نووسراوانە بـە پێـی رێنووسـی ئەمـڕۆی کوردی دەقەکەم نووسیوەتەوە، بەڵام لە (ی)ی ئیزافەدا، ئەگەرچی بەشـی زۆریم لەبـەر روونـاکیی (کسرە)ی دەسنووسەکەدا نووسیوە، هەندێ جار (قیـاس) م کـردووە؛ بـۆ نموونـە تەماشـای ئـەم شیعرە بفەرموون.

تقریـرِ مذهب أهل حق کریا ئیجازەی تقریر طرزی‌تر دریا

وەک دەیبینن لە ژێر (ر)ی وشـەی (تقریـر)دا (کسـرە) هەیـە، کـەچی لـە ژێـر (ل)ی وشـەی (اهل)دا نییە؛ من بۆ یەکەمیان لەبەر ووناکیی (کسرە) کەدا (ی) م نووسیوە، و لە ژێر (ل)ی (اهل) یشدا بە (قیاس).

هەروەها سەیرێکی ئەم شیعرەش بفەرموون: -

لە خسوفِ عیب دناءت بری لە کسوف ریب خناءت عری

لە ژێر پیتی (ف)ی (خسوف)دا (کسره) دانراوە، کەچی لە ژێر پیتی (ف)ی (کسوف)ی بەرامبەریدا دانەنراوە، من (کسوف) م کردە (کوسووفی) لەبەر (کسره) کەی و (خسوف) م کردە (خوسووفی) بە قیاس.

یا تەماشا فەرموون حۆن مەولەوبی هەستیار لەم شیعرەی خوارەوەدا کێشی شیعرەکەی رەچاو کردووە:

والحاصل او بدر ظلمت زُدای لیل　　　او مهرِ أیام له ضیای او کیل

بۆ (ر)ی (مهر) نیشانەی (کسره)ی داناوە، کەچی بۆ (ر)ی بدر داینەناوە، چونکە کێشەکە لەنگ دەکات؛ منیش هەمان شتم چاودێری کردووە.

بە وردی سەیرێکی ئەم شیعرە بفەرموون: -

حدیث ضعیف ار پیی له ناوه　　　بم حدیثه کارْ مُنکرِ تواوه

ئەگەر (سکون)ی (مضاف) لای مەولەوی ئەسڵ بوایە، وەک زاراوی ئەهلی (سنه) و دەور و پشتی، پێوست نەدەبوو (سکون)، زەنە، بۆ (ر)ی کار بکات، بەڵام چونکە کەسرەی (مضاف) ئەسڵە لای و لە ترسی ئەوەی نەبادا خوێنەر لەسەر ئەو ئەسڵە بڕوات و کێشی شیعرەکە لەنگ بێت، (سکونی بۆ (ر)ی (کار) داناوە.

زۆربەی کەسرەکانی ئەم نوسخە دەستنووسە هەرەکۆنە، کە لەگەڵ تەواوبوونی دانانیدا نووسراوەتە باشترین بەڵگەی قسەکەمانە.

لە پایانی ئەم نووسخە دەستنووسەدا بە فارسی نووسراوە:-

«ترقیم پذیرفت عقیدهء مولوی از دست معرض محنت و جفا حسب الفرمودهء حضرت ابوالوفا ادام الله برکته علینا بحرمة نبیّنا المصطفی (ص) سنة ۱۲۸۱ لا اله الا الله، محمد رسول الله صلیالله تعالی علیه و سلّم».

واتە: عەقیدەی مەولەوی نووسرایەوە بە دەستی کەسێکی دووچاری ئازار و مەینەت، بەپێی ئەمری حەزرەتی (ابوالوفا) - شێخ عبدالرحمان کوڕی شێخ عوسمان سراجەدین (فاتح) - هەمیشە بەرەکەتی بەسەرمانەوە بێت لەبەتر خاتری پێغەمبەری هەڵبژاردەمان، دروودی خودا لەسەر خۆی و ئال و بەیتی، ساڵی هەزار و دووسەد و هەشتا ویەک.

لە پاڵ ئەم نووسینەدا [٨] شیعرە عەرەبی‌یەکەی (مەولەوی) خۆی نووسراوە، کە باسی ناونانی کتێبەکەی دەکات، کە لەوانەیە بوترێ نووسینەکەی لە نووسینی دەقی کتێبەکە جیاوازی هەیە و هەندێ لە شێوەخەت‌ناسان لایان وایە (مەولەوی) خۆی نووسیویە.

هەرچۆن بێ بەگوێرەی ئەم پایانە ئەم نوسخەیە لە ساڵی تەواوبوونی دانانی کتێبەکەدا نووسراوەتەوە، واتە ساڵی ١٢٨١ی کۆچی.

شایانی باسە لە لای چەپی ئەم پایانەوە ئەم چەند دێڕەیش بە شێوەی پەراوێز بە فارسی نووسراوە: -

«یکی از خراسانیان کە شاعر فائق و ملقب بشائق بود در وقت اتمام منظومە تشریف أرزانی فرمود بداهةً نثراً تاریخ را بتحریر رسانید (عقیدەء مولوی نوشتە گردید) ١٢٨٠».

واتە: یەکێکی خۆراسانی کە شاعیرێکی باڵا دەست و نازناوی (شائیق) بوو، لە کاتی تەواو کردنی دانانی کتێبە هەڵبەستەکەدا تەشریفیان هێنابوو، گورج تەڕدەستانە بە پەخشان مێژووی کتێبەکەی نووسی و وتی: «عقیدەء مولوی نوشتە گردید» عەقیدەی مەولەوی نووسرا.

پیتەکانی ئەم رستەیە بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە (١٢٨٠) واتە: ساڵی دەست کردن بە دانانی، نەک ساڵی تەواو کردنی، هەرچی ئەم دیوەودیوم کرد بۆم نەکرایە (١٢٨١) خۆیشی (١٢٨٠)ی نووسیوە. ئەڵبەت دەیەوێ بە شێوەی (مبالغە) بڵێت: هەر کە دەس بە دانانی کرا نووسرایەوە! واتە وەک ئەوەتە ساڵی دەست بە دانان کردن و ساڵی تەواوبوونی یەک بێت! بە دووری نازانم ئەم شاعیرە خوراسانی‌یە لە (تەوێڵە) و یەکێک لە موریدەکانی خوالێ‌خۆش‌بوو شێخی (سراج‌الدین) و حازری نووسینەوە و لێ‌بوونەوەی ئەم کتێبە بووبێت.

جێگای داخە نووسەرەوە ناوی خۆی نەنووسیوە و، تەنها بەم سێ وشە خاکینەیی‌یەی «معرض محنت و جفا» کۆتایی هێناوە.

بە هەرحاڵ کتێبەکە تێکڕا خەتی (مەولەوی) نییە، هی ئەو بوایە نەیدەوت «ترقیم پذیرفت عقیدەء مولوی»، بەڵکوو دەیوت (عقیدەام) واتە: عەقیدەکەم یا هەر عیبارەتێکی‌تر. نووسەرەوەی ئەم نوسخەیە یەکێکی زۆر خۆشنووس و لە کاری نووسیندا هەنەرمەند بووە؛ ڕێک و پێکیی دێڕەکان و وشەی دێڕەکان و ناوەناوە نەخش و نیگاری، ئەم راستییەمان بۆ روون دەکاتەوە.

بێجگە لەمەش تەعبیری «ترقیم پذیرفت» بۆ نووسینەوە زیاتر لەبارە نەک بۆ دانان.

وا دەردەکەوێ وەک دانانی کتێبەکە لە لایەن (مەولەوی) یەوە بە فەرمانی (ابوالوفا)ی پیرزادەی مەولەوی بووە، نووسینەوەشی لە لایەن ئەم نووسەرە هونەرمەندە ناوی خۆ نەبردووە و، هەر بە ئەمری (ابوالوفا) بووە.

من لام وایە، پاش یەکەمین نوسخەی دەستنووسی (مەولەوی) خۆی، ئەم نوسخەیە یا یەکەم نوسخەی عەقیدەی مەرزیەیە، یا یەکێکە لەو نوسخە هەرەپێشوانە کە راستەوخۆ پاش دانانی کتێبەکە نووسراونەتەوە.

خۆ ئەگەر بە ئەمری خوالێخۆشبوو (ابوالوفا) نوسخەی‌تر نەنووسرابێتەوە، ئەوا ئەم نوسخەیە ئیمتیازێکی تایبەتی دەبێت، ئەوەش ئەوەتە کە هەر وەک دانانی کتێبەکە بە ئەمر و حەزی ئەو بووە نووسینەوەی ئەم نوسخەیەش بە ئەمر و حەزی ئەو بووە.

هەر چۆن بێ ئەم نوسخە دەستنووسە، کە لە سالی تەواوبوونی دانانی کتێبەکەدا نووسراوەتەوە، زۆر کۆنترە لەو نوسخەی کە دەستنووسی خوالێخۆشبوو مەلا رەسوولی تووداریی نەقشبەندییە، کە سالی (١٣٠٨)ی ک نووسیویەتیەوە و سەرچاوەی سەرەکیی چاپەکەی خوالێخۆشبوو مامۆستا نعێمی‌یە، هەروەها کۆنترە لە نوسخەکەی زانای گەورە و بەرێز جەنابی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ، کە خوالێخۆشبوو شێخ مەعرووفی سیاگوێری سالی (١٣٠٣)ی ک لە پێنجوین نووسیویەتیەوە و، یەکێکە لە سەرچاوەکانی کتێبی (هەڵبژاردەیەک لە «عقیدة مرضیة»ی مەولەوی) لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی (بابەعەلی شێخ عومەر قەرەداخی) [٨].

### خوێنەری بەڕێز!

ئێستە، کە گەیشتوومە دوادوایی باسی ئەم نوسخە دەستنووسە، دەمەوێت سەرەڕای ئەوەی کە بە پێی پێویست لە پەراوێزدا دەربارەی سەرباسەکان نووسیومە دووبارەی بکەمەوە کە هیچ سەرباسێکی سەرەکی و هیچ وردەسەرباسێکم لەم دەستنووسەدا نەدی، تەنها لە هەندێ شوێندا جۆرە نەخش و نیگارێک هەیە، بێ‌گومان هێمایە بۆ ئەوەی باسی پێشوو تەواو بوو و باسێکی تازە دەس پێ دەکات، ئیتر نازانم خوالێخۆشبوو مامۆستا (محي الدين صبري نعيمي) چۆن ئەو سەرباسانەی داناوە؟ ئاخۆ نوسخە دەستنووسەکەی لەمەڕ (تووداری)ی لای ئەو، یا دوو نوسخەکەی‌تر سەرباسیان تێدا بووە، یان هەر خۆی بە زیرەکی و بۆچوونی خۆی شوێنی سەرباسەکانی دیاری کردووە و نووسیونی؟

تێکڕا من ڕەخنەم نە لەوە، نە لە باوکم کە سەرباس بنووسن، بـە تایبـەتی (شـرح) هەڵـدەگرێ سەرباسی؛ وەک بەشێک لە شەرح؛ تێدا بنووسرێت، چونکە دانانی سەرباسەکان خۆی بەشـێکە لـە لێکدانەوەی دەقەکە، من تەنها ئەوەنـدەم مەبەسـتە ئـەبێ هێمایـەک بـۆ ئـەوە بکرێـت کـە ئـەم سەرباسە گەورە یا ئەو نیمچە سەرباسە لە ئەسڵەکەدا هەبووە و لە سەری ڕۆیشتوون، یـا نـەبووە و بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست لێیان زیاد کردووە.

جا ئەگەر بڵێین [٥٢] ساڵ پێش ئەمڕۆ ماوەیەکی زۆرە و، مەرجەکانی لێکۆڵینەوەی کتێب وەک ئەمڕۆ پەیڕەو نەدەکرا و، بە تایبەتی لێکۆڵینەوەی بەرهەمێکی بێنازی لانـەوازی کـوردی بـۆ ئـەو سەردەمە و ئەو نامۆیی‌یە هەر بە دەم ئاسانە، ئەوا ئێمە لەم ڕۆژەدا، بـە سـەر پـێ‌یەکیشـەوە بـێ، پێویستە هێمایەکی بۆ بکەین.

## دواقسە و تکای لێبووردن

**خوێنەری ئازیز!**

شێوە لێکدانەوەکەی باوکم شێوەی مامۆستایەکی ئایینی قووڵ داچووی مزگەوت بوو، کە گەلێ رستە و وشەی ناکوردی تێدا بوو، چۆن بەدرێژایی زیاتر لە شەست ساڵ لەسەر دەرس وتنەوە بە فەقێ راهاتووە وەهای نووسیبووەوە، سەرەڕای ئەوەش بابەتی کتێبەکە خۆی بابەتێکی بیر و باوەڕیی ئایینی‌یە کە بە عەرەبی و غەیری عەرەبی بە سەدان، بگرە هەزاران، کتێبی تێدا دانراوە و بە سەدان جۆر پەراوێز و پەراوێز لەسەر پەراوێز و وردەکاریی تێدا بەکارهێنراوە، بێجگە لەو هەمووە زاراوە جۆراوجۆرە کە وەرگێڕانیان بۆ سەر کوردی ئاسان نییە، لەبەر ئەمانە بڕوا ناکەم دارشتنەوەکەم لە هەموو رووبەکەوە تەواو بێخەوش بێ، بە تایبەتی لایەنی گۆڕینی زاراوەکان.

من لە پیاچوونەوە و دارشتنەوەی کارەکەی باوکمدا دوو شتی گرنگم لە بەردەم خۆم داناوە و هەوڵی بەجێگەیاندنیانم داوە:

یەکەم: پاراستنی واتا و مەبەست و دەسکاری نەکردنی؛ چونکە خۆتان دەزانن بابەتی کتێبەکە بابەتێکی ئایینی بناخەییە، چۆن گەیێنراوە دەبێ وەها بگەیێنرێ و، کاری ئارەزووکاری نییە.

دووەم: دارشتنەوەی بە شێوەیەکی رەوانی کوردیی وەها کە تێکڕای خوێنەران، نەک تەنها ئەوانەی سەر و ساختیان لەگەڵ باسەکەدا هەیە، سوودی لێ وەربگرن و تێبگەن کە (مەولەوی)ی زانا و شاعیر و سۆفی چی وتووە و چی ویستووە.

بە دڵنیایی‌یەوە کاری یەکەمم بە دەستپاکی و بێ زیاد و کەم بەجێگەیاندووە و، لە هەر شوێنێکدا تووشی شتێکی ئاڵۆز بووبم دەستەوسان نەوەستاوم و تا نەگەیشتبمە بنج و بناوان وازم نەهێناوە...

بۆ دووەمیش ئەوی لە تواناما بووبێ کردوومە و کەم و کووڕیشم دەدەمە دەست چاوپۆشی و دڵفراوانیی ئێوە.

ئیتر من هەقم بەسەر ئەوەوە نییە کە ئەم مەسـەلە تایبەتییـە یـا ئـەو مەسـەلەیە بەڵـگەکەیان بەهێزە یا لاوازە. ئەمە کاری من نییە، کاری (ماتن) و (شـارح) ە، واتـە: حـەزرەتی (مەولـەوی) و باوکم؛ لەم جۆرە شتانەدا ئەوان بەرپرسیارن.

قسەیەکیش هەیە، ئەگەر دووبارە کردنەوەش بێت دەبێ بوترێت، ئـەوەش ئەوەیـە ئـەم جـۆرە کارانە کاری یەک کەسە نین و، لە راستیدا دەبێ بە کۆمیتەیەکی لە زۆر لاوە وریا و زانا بە ئـەنجام بگەیەنرێت، ئێمەمانانی تاکەکەس هەر ئەوەندەمان لە وزەدایە...

ئەم کتێبەی مەولەوی، وەک (فضیلە) و (فوایح) ەکەی سەرێکی هەیە و هەزار سـەودا؛ لایـەک ئایین و بیر و باوەڕی ئـایینی‌یـە، لەگـەڵ ئـەو هـەمووە ئـەملاولا و رێبـازە جیاوازانـەدا کـە لێـی بوونەتەوە. لایەک سۆفی‌یەتییەکەی ئەم شاعیرە بەرزەیە، کە مۆرکی بە گەلێک لە شـیعرەکانیەوە هەیە.

راستە عەقیدەی مەرزییەی مەولەوی و ئەوانی‌تریشی، ئەگەر بێینە سەر دانانیان لە خانەیەک لە خانـەکانی جـۆری شـیعردا، خانـەی شـیعری تـەعلیمییان بەردەکـەوێ، واتـە: زانیارییـەک لـە زانیارییەکان بە خەڵک فێر دەکات، کە لێرەدا زانیاریی کەلام و بـیر و بـاوەڕی ئـایینیی ئیسـلامە، بێ‌گومان ئەمانە وەک دیوانەکەی حیساب ناکەین، بـەلام لـە هـەر لایـەک سـۆزێکی هاتبـێ، لـە هەرلایە دەلاقەیەکی رووناکییە تایبەتییە شاعیرانەکەی لێ کرابێتـەوە، لـە هـەر سـاتێکدا تـاوێکی بەتینی بەرەکەتی خودایی بەسەریا باریبێ قەریحەی شیعری تەقیوەتەوە و هەسـتی ئەفسـووناوی کەوتووەتە کار و خۆیشی و خوێنەریشی نوقمی دەریای خەیاڵی قووڵی کردووە.

خۆ باسی بەهێزیی مەعنای گەلێک لە شیعرەکانی و بەکارهێنانی دەیان لایـەنی رەوانبێـژی و جوانکاری وشەئارایی ناکرێ، کە بە راستی گۆی لە مەیداندا بردووەتەوە.

مەولەوی ئازایانە و لێهاتووانە ململانێی لەگەڵ کەڵە شاعیراندا کردووە و بـەوجۆرەی ویسـتوویە یاری بە وشە کردووە، لە کوردیدا لـە زاراوە سـاکارەکەی تـاوەگۆزی شـاکاری هێناوەتـە کـار. لـە عەرەبیدا زیاتر گیانی (تحدّی) هەست پێ دەکەیت. خۆ فارسـییەکەی لـە کـوردی چـاکتر رامـی هونەری شیعرییەتی...

سەیری ئەم چەند بەیتە کوردییەی بکە، دەربارەی (سبب) و (مسبب) ـ هۆ و ئـەنجام ـ چەنـد ساکار و پڕمەعنان:

فــلان باوکــە، ئــەوە لــە ئــەولاد
لەدوای ئەولاد پێــی دەڵـێن ئـەحفاد
لە بوخارە هــەور، لــە هــەورە مەتـەر،
لــە مەتــەر گیــا ســەر دێرێتــە دەر
موقــەددەم نــاوی نریاگــە ســەبەب
بە موئەخخەریان دەڵێن موسـەببەب
هەر دوولا هەر خەلق ڕەببی هادی‌یە
ســەبەبی‌یــەتیان ئــەمری عــادی‌یــە
لە قودرەتی حەق عــادەت جاری‌یـە
ئـەو دێتــە وجــوود، ئــەم دیــاری‌یــە
(یمکن) ئار بوێ ئیحراق هــەر نــەوێ
یــا ئیحــراق وە بــێ‌ئــاگر هەڵــکەوێ

ئێستە وشکەنەزانی بەناو زانای وا هەیە باسی تەرتیبی هەڵم و هــەور و بــاران و گیــای لابکـەی لەوانەیە بە کوفری بزانێ، کەچی ئەو یەکسەر تێت دەگەیەنێت:

هەردوولا هەر خەلق ڕەببی هادی‌یـە
ســەبەبی‌یــەتیان ئــەمری عــادی‌یــە

هەروەها لە (فوایح)ەکەیدا لە باسی بینینی خودای گەورەدا دەفەرموێت:

تفضّل بالعجـل بالکـأس سـاقی!
صــفای مَـیْ نمایـد وجــهِ بــاقی
بکــوریّ دو چشــم اهــل انکــار
بکن کار و نوایی را در ایــن کــار
ز دیــده زنــگ ظلمــت را زُدایــد
دلــم تصــدیق رؤیــت را نمایــد
در ایــن نشــأة بامکــانش بگــویم
در ان نشــأة وقــوعش را بجــویم

ئەمە کورتە باسێکی یەکێکە لە مەسەلە ئایینییەکان، کەچی شیعرەکانی لێوانن لە رەوانبێـژی و وشەئارایی. واتاکەی بە کوردی دەڵێت:

دە فەرموو مەی بهێنە، زووبە مەیگێڕ!
لە رووناکیی مەیا رووی خـوا دیـارە [٩]
بـە کـوێرایی دوچـاوی ئـەهلی ئینکـار
بە ئـاواز بێنــە جـۆش ئـەم کـار و بـارە
لــە دیــدەم ژەنگــی تـاریکی بماڵــێ
دڵــم بـاوەڕ بکـا بــەو دیــنی خوایــە؛
بڵــێم بینــینی خــوا ئـا لــەم جیهانــە
(دروستە) و لـەو جیهـانیش دیتەکایـە

هەر لە (فوایح) ەکەیدا کە باسی خۆی دەکات لەبەر بارەگای خودادا دەڵێت:

ز بحــث خــود چــە عرضــی را رســانم
چە ســانم؟ از خســانم نــز کســانم [١٠]
خــودم را پرقصــور ار مــن نخــوانم
قصـــوری را از آن بـــدتر نـــدانم
خمیـــر از ردّ، ضـــمیر از بــد نــرُفتم
ز تـــو یـــاربّ و از خـــود در شـــگفتم
غنــای مطلــق از کــل، بــاز در بنــد
(تعـــالی الله) زهـــی أعـــلا خداونـــد
بــە آن محتــاج و هــر آن در معاصــی
(معــاذ الله) چــە قاســیّم چــە قاصــی
ببخش ای (بوالعجب) این (بوالعجب) را
بیـــــــاموزش رمـــــــوزات ادب را
نــە تــو یــابی چــو مــن ناپختــە کــاری
نــە مــن یــابم چــو تــو ئاموزگــاری

واتە:

دەربارەی خۆم چیت عەرزکەم کە چۆنم؟
چ جۆرم من؟ لە ریزی ناکەسانم نەک لە کەسانم!
ئەگەر من خۆم بە تاوانبار نەزانم
لەوە بەدتر چ تاوانێ بزانم
نە کارم لە هی بەد و، نە دەروونم
لە خدەی ناپەسەند پاک کردووەتەوە
خودایا من لە تۆ و لە خۆم سەرسام ماوم
لایەک موحتاجی کەس نیت و،
لایەک لە بەندی چاکە دای لەگەڵ خەڵکدا (١١)
چ خوایەکی بەرز و بالای
بەو موحتاجم، لەگەڵ ئەوەشدا
سەرکەشم، نوقمی گێژاوی گوناهم
پەنا بە خوا چەند دڵڕەقم؟
پەنا بە خوا چەند لێی دوورم؟
هۆی سەرسامی! ببوورە تۆ لەم سەرسامە
دروشمەکانی خووی پەسەندی فێر بکە
نە تۆ وەک من ناپوختە کارێکت دەس دەکەوێ
نە منیش وەک تۆ مامۆستایەکم دەس دەکەوێ.

خۆ باسی (فضیلە) عەرەبییەکەی ناکرێت کە چەند جوان و رێک و پێکە، راستە کتێبەکە تێکڕا، وەک وتمان، لە جۆری شیعری تەعلیمییە، بەلام خوا هەڵناگرێ تەنها (١٢٧) شیعری پێشەکییەکەی بەسە بۆ ئەوەی خوێنەوار لە توانای ئەم بلیمەتە سەرسام بێت. (١٢٧) بەیتە یا (١٢٧) گەوهەری نایاب؟!

هەر لە سەرەتاوە (بسم اللە...)ە عادەتییەکەی خۆمانی کردووەتە نیوە شیعر و، لە نیوەی دووەمدا بە (سەراحەت) سەرسامیی خۆی و هەموو دانایەک دەخاتە روو:

بســم الله الــرَّحمن الــرَّحیم
مَــن تــاهَ فیــه نُهیَــةُ الحَکـیم
معطی جلائل العطایـا والـنعم
مُـولی دقـائق المزایـا والکـرم
الحمـــد لله الـــذی أبـــدانا
من عدمٍ أرواحـاً أو أبـداناً (١٢)

لە پاشا گلەیی دواکەوتن لە خۆی دەکات و هـەروا بـە دەم قســەوە بانـگ و قامەتەکەشـت بـۆ دەکاتە شیعر:

إلی مَتی تخلّفی عن قـومی؟
یُومی الی نَومی أذانُ یَـومی!
فمرحبــاً بالقــائلین عـــدلاً،
و بالصــلاة مَرحبــاً و أهــلاً
فأذَّنـــا تأذینَـــهُ وَ ثَـــوَّبِ
یــا جَبلــی! لیاجبــالُ أوِّبــی
مبســـملاً مُحَمـــدلاً مصــلّیا
مُســـلّماً مســـلّیاً مُصـــلّیا
محـــوقِلاً وَ ســـائلاً وســـائلاً
مبـــتهلا باســـطَ کـفٍّ، قــائلاً:
فاحَ الصبا، لاح الصباحُ، راحـا
صبوحُنا، قم صاحِ! هاتِ راحا

سەیری کە چۆن سەبارەت بە کونهی زاتی خودای گەورە خۆیشی و خەلکیش نـوقمی دەریـای سەرسامی دەکات؟

جَــلَّ الــذی کَــلَّ نُهــی صِــفاتِهِ
فـــی زاتِـــهِ و فـــی عُــلا صِــفاتِهِ

مـــــا وَصَـــــل الازل لابتـــــداه
و مـــا انتهـــى الأبَـــدُ لانتهـــاه
وُجـــدَ، لا فَوَجَـــدَ أو ثـــم وَجَـــد
وجـــب فيـــه، کوجـــودِهِ وجَـــدَ
لاصـــبحَ لا يـــومَ لديـــه، لا مَسَـــا
و لـــم يکـــن حـــينٌ فِنـــاهُ لامِســـأ
و کـــانَ، آنَ کـــانَ، (کـــانَ) ليســـأ
ثوى بحيثُ لـيس (حيـثُ) أيسـأ
متـى (متـى) حتـى اتـى عليـه؟
مـن ايـنَ (ايـنٌ) ينتمـى اليـه؟
هل ساعدٌ يَصِلُهُ فـى کُـمٍّ (کـمْ)
و کيفَ لا کيفٌ مع الکيفِ يضمّ؟!

لێرەدا پاڵی لێ دەداتەوە و پشوویەکی بۆ ئەدات و ملکەچانە دەڵێت:

زُحزِحَ عن عقل الوَرى إلهُنا؛
فمنتهـى عقولِنـا إلـى هُنـا!
خالِقُنـــا معبودنـــا إلـــهٌ
جَـلّ عـن استحصـائنا إلاهُ

لە پاشانا دێتە سەر باسی ئەوەی کە چۆن خوالێخۆشبوو پیر و پیرزادەی پایەبـەرز شـێخ (بهـاء الدين) داوای دانانی ئەم کتێبەی لێ کردووە و، ئـەمیش خـۆگری کـردووە و دەردی لاوازی و دڵ نارەحەتیی خۆی و باری نالەباری ڕۆزگاری بۆ هەڵڕشتووە، ئـاخری هـەر ناچـار ئـەبێ لـە قسـەی دەرنەچێ و شان بداتە بەری و ئەم شاکارە دروست بکات:

أمرنـــى بنظمهـــا و حـــالى
تعللت عن حسـن الامتثـال
لآدَنـــى وِزرُ نـــوى خِلّـــانى
انقض ظهر السـرِّ مـا خلّـانى

کــان أبــو بــلاءی الــذبابا
فکلّمــا عنّــی ذُبَّ آبــا
مِــمَّ سُــدی ولحمــة البنیّــة
ذا الضعف تلکــم قــوّة البلیّــة
تحرقنــی تفرکنــی تصــلینی
کــأننی الفریــک تشــتهینی
حــولی بــدت ابخــرة اعصــار
رعــدٌ، صــواعق، و بــرق، نــار
فزلزلت ارض الحشا وَ رُجَّــتِ
ترجرجَتْ مدینتی وارتجّــت

أبی ســوی الــدررِ فالتزمتهــا
جمعتهــا رتبتهــا نظمتهــا
لعقــد جیــدالعرب الاتــراب
أبکــار افکــار أولــی الالبــاب
تفــوق مــا وســم سلســبیلا
للشرب والغسلة، سَل ســبیلاً

ئەو وشە عەرەبییانەی ئەم زانا شاعیرە هەڵکەوتووە لـەم شـیعرانەدا بـە کـاری هێنـاون، چەنـد وشەیەکی کەم نەبێ کە بە (اصطلاح)ی زانیاریی (سرف) لە (رباعی مجرد) ن، ئەوانیتریان هـەموو (ثلاثی مجرد و ثلاثی مزید) و وشەی سادە و ساکارن، وشەیەکی نامۆ یا دوور لـە (فەسـاحەت) یـا دەربڕینێکی دوور لە (بەلاغەت) یان تیا نابینرێت، هەر وشە عەرەبییە ئاسانەکانن ئەو رسـتە جـوان و بەدلاچوانەی لێ دروست کردوون.

ئێمە ئەبێ سەری رێز بۆ ئەم بلیمەتە و بلیمەتەکانی تری نەتەوەکـەمان دانـەوێنین، کـە چـۆن سەری کورد و کوردستانیان بەرزکردووەتەوە.

لە سایەی هونەری ئەم جۆرە هەڵکەوتووانەوە دەتوانین بڵێین: ئێمەی کوردیش لەگەڵ هەموو جەور و سزای چەرخی گۆناگۆن و لەگەڵ کوێرەوەریدا شاعیر و زانا و عاشقی وەک جزیری و شاعیر و فەیلەسووف و نەتەوەپەروەری وەک خانی و هەڵکەوتووی وەک نالی و مەولەوی و سالم و حاجی قادری مەزنمان هەیە. خاکی پاکی کوردستانی شیرینیش ماچ بکەین کە ئەم رۆڵانەی لە کۆشی خۆیدا بە شیری خۆی گۆش و پەروەردە کردووە و، ئەوانیش لەو کۆشە پیرۆزەدا سەری ئێجگارییان ناوەتەوە.

نەمریی بۆ (مەولەوی)ی سەرقافڵەی عاشقان

**فاتح عبدالكريم**

**١٩٨٦/٦/١٣**

***

١ـ یادی مەردان، بەرگی دووەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاریی عیراق، بەغدا، ساڵی ١٩٨٣، ل (٣٦٧).

٢ـ بڕوانە لاپەڕە (ب)ی (سەرەتا)ی دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و لەسەر نووسینی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، چاپخانەی (نەجاح) لە بەغدا (١٣٨٠)ی ک ـ ١٩٦١ی ز.

٣ـ العقيدة المرضية، تأليف العلامة فقيد العلم و الادب السيد «عبدالرحيم الحسنی الشهير بالمولوی المتخلص بالمعدوم»، مطبعة السعادة بجوار محافظة مصر ط ١ سنه ١٣٥٢.

٤ـ دیوانی مەولەوی، پیرەمێرد بە شیعر لە دوو بەرگا وەریگێراوەتە سەر دیالێکتی کرمانجیی خواروو، وە لە چاپخانەی (ژیان) لە سولەیمانی چاپی کردووە، بەرگی یەکەمی لە ساڵی ١٩٣٥ و، بەرگی دووەمی لە ساڵی ١٩٤٠دا.

٥ـ ئەوسا لە مزگەوت و قوتابخانە ئایینییەکانی کوردستاندا کە کتێبێکیان دەنووسییەوە، ئەگەر وشەیەک، دێڕێک، شیعرێکیان لە بیرچووبایە و، لە پاشاندا پێیان بزانیایە، لە قەراخ و بیجاخی دەقەکەدا یان لە پاڵ جێگەکەی خۆیدا، یان لە دوورەوە دەیانونوسییەوە و بۆ دیاریکردنی شوێنەکەی هێمایەکیان بە کار دەهێنا و، رستەی (صح) یان لەدوایەوە دەنووسی؛ واتە: بەم دێڕە یا بەم وشە یا بەم شیعرە دەقی نووسراوەکە راست دەبێتەوە و بێ ئەوە هەڵەیە، ئەمەشیان بۆیە دەکرد تا لە پەراوێزی جیا بکەنەوە، واتە ئەگەر (صح) ەکە نەبێ نازانرێت ئەو بە جیانووسراوە لە دەقەکەیە یان پەراوێزە. ئەم رێبازە نێستەش تا رادەیەک ماوە.

٦ـ (منه) کە بە (منهوات) کۆ دەکرایەوە، واتە: پەراوێزی خاوەن کتێب خۆی نەک کەسێکیتر، کەسیتر دەبێ ناوی خۆی دابنرێ، کە وتت (منه): لەوەوە، واتە: قسەی دانەر.

ئەگەر کەسێکی درشتکار پەراوێزی لە کتێبی خەڵک کردبێت و ناوی خۆی نەنووسیبێ و (منه)ی لێ دابێ و قسەی خۆی، لەبەر هەر هۆیەک، کردبێتە قسەی دانەر، بەوە قاعیدەکە تێک ناچێت، چونکە لە هەموو کارێکدا لە هێڵ دەرچوو هەر هەیە.

٧ـ نووسەرەوە لە هەمووی کتێبەکەدا چ بۆ (کاف) و چ بۆ (گاف) هەر یەک کەشیدەی نووسیوە بۆیە بەو پەراوێزە لە یەکی جیاکردوونەتەوە.

٨ـ (هەڵبژاردەیەک لە عەقیدە مەرزیەی مەولەوی) کتێبێکی تازەیە لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی بەڕێز بابەعەلی شێخ عومەری قەرەداخی‌یە، ساڵی ١٩٨٥ لە چاپخانەی ئیرشاد لە بەغدا بە یارمەتیی ئەمینداری‌یەتی گشتیی رۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان لە چاپ دراوە و (١٥٨) لاپەڕەیە. لەم کتێبەدا، وەک نووسەری بەڕێز خۆی لە پێشەکی‌یەکەیدا دەڵێت: نزیکەی دەیەکی عەقیدەکەی هەڵبژاردووە و لێکی داوەتەوە. لە راستی‌دا کتێبێکی بەنرخە و نیشانەی ماندووبوونی نووسەری پێوە دیارە و، بە هەموو شایانی‌یەکەوە چووەتە ریزی پێشەوەی ئەو رەنجانەی تا ئێستا دراون دەربارەی بەرهەمی حەزرەتی (مەولەوی).

٩ـ بابەت بینینی خودایە، مەی بێ‌خڵتەش وەک ئاوێنەیە لەگەڵ بینیندا دەگونجێ... مەبەست لەم (مەی)ە مەیی حەقیقی‌یە ئەوەی دەبێتە هۆی مەستی و نوقوم بوون لە دەریای خوداناسیدا.

١٠ـ نز: نە از.

١١ـ خوای گەورە لەم چاکەکردنەدا موحتاجی کەس نییە، بەلام (مەولەوی) ئەوە وێنە دەگرێ کە خودای گەورە هەمیشە لە چاکەکردندایە لەگەڵ بەندەگانی خۆیدا.

١٢ـ بڕوانە (الوسیلة فی شرح الفضیلة) للشیخ عبدالکریم محمد المدرس، الطبعة الاولی ١٣٩٢ـ ١٩٧٢، مطبعة الارشاد، بغداد ص (٤ـ٣٧).

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين. والصلاة والسلام على سيّدنا محمد و على آله و صحبه اجمعين واتباعه باحسان الى يوم‌الدين.

به قه‌ده‌ر ئه‌وه‌ی به نووکی خامه له رووی نامه نووسراوه و، به زمانی زمان پاراوان وتراوه و به بیری رۆشن‌بیران زانراوه، به‌لکو به قه‌ده‌ر ئه‌وه‌ی که فیکری خاوه‌ن‌فیکران پێی نه‌گه‌یشتوه و، عه‌قلی هوشیاران تێی نه‌گه‌یشتووه، سوپاس و ستایش بێ بۆ باره‌گای به‌رزی په‌روه‌ردگاری جیهان، ئه‌و په‌روه‌ردگاره‌ی به زات له پێش چاودا په‌نهانه و، به کردار و شوێنه‌وار لای دلی هوشیاران نومایانه، سوپاسێ که به‌رامبه‌ری هه‌موو نیعمه‌ته‌کان شان به شان بڕوا له‌گه‌ل بارانه ره‌حمه‌ته‌کان به ئاشکرا و به په‌نهان.

هه‌روه‌ها دروودی زۆری بێ‌سنوور بۆ ئاستانه‌ی فریشته پاسه‌وانی، ره‌هبه‌ری میهره‌بان، کلیلی که‌ره‌می یه‌زدان له هه‌ردوو جیهان حه‌زره‌تی (محمد المصطفى) دواهاوه‌ری ده‌زگا و دایه‌ره‌ی پێغه‌مبه‌ران، کانی هه‌موو بیر و باوه‌ڕی په‌سه‌ند و کرده‌وه‌ی شایسته‌ی هۆشمه‌ند و ره‌وشتی جوان و نایاب و بلندی ریزی به‌ختیاران. وه بۆ ره‌وانی هه‌موو ئه‌هل و به‌یت و ئال و یارانی فیداکارانی و، باقی په‌یڕه‌وانی یاسای قورئانی و فه‌رمووده‌ی جوانی و کرده‌وه‌ی پڕ له ئیحسانی، تا خۆری پڕته‌وداری میهره‌بان پڕته‌و ده‌خاته دلی دلداران، له زه‌مانا، له مه‌کانا، له به‌هه‌شتی جاویدانا، تا گول ده‌گه‌شێته‌وه و، دل به شنۆی ره‌حمه‌ت ده‌شنێته‌وه، بمنّه و فیضه و رحمته بالفضل و الاحسان.

پاش ئه‌مانه لای هوشیاران و زانیارانی کورد دیاری و نومایانه که هه‌لکه‌وتووی کۆڕی هونه‌روه‌ران، شاسواری مه‌یدانی ئه‌ده‌ب‌په‌روه‌ران، (سید عبدالرحیم)ی مه‌شهوور به (مولوی)

رەحمەتی خـودای لـێ بـێ لـە ئاسمـانی ئـەدەبدا چ ئەسـتێرەیەکی پرشـنگدار و، لـە جیهـانی نوکتەزانیدا چ سوارچاکێکی بە تەک و دەو بووە؟

ئەم تاقانەی رۆژگارە جگە لە هۆنراوە عەرەبییەکەی کە ناوی (فضیلە)یە و لـە بابـەتی ئوسـوولی دیندا نووسراوە و، بێجگە لە دیوانە غەزەلیاتەکەی کە تێکڕای غەزەلـەکانی لـە ئـەدەبی کـوردیدا لووتکەیان بەجێ‌هێشتووە [1]، دوو هۆنراوەی بەنرخی تری هەیە، یـەکێکیان بـە کوردییـە و نـاوی (عەقیدەی مەرزییە)یە و ئەویتریان بە فارسییە و ناوی (فـوائح)ە و [2]، بابـەتی هـەردووکیان بـیر و باوەڕی ئیسلام و ئوسوولی دینە.

جا لەبەر ئەوەی کاتی خۆی بە عەرەبی شەرحی (فضیلە) کەم کرد و کتێبێکم تیا دانا بـە نـاوی (الوسیلة فی شرح الفضیلة) [3] حەزم کرد شەرحی کوردییەکەش بکەم؛ بە هیوای ئەوەی ئەم کارە بچووکەی منیش هاوبەشییەک بێت بۆ تێگەیاندنی موسوڵمانانی کورد لـە بـیر و بـاوەڕی ئـاینی ئیسلامی پیرۆز و پاراستنی ئەم کەلەپوورە بە نرخە. لە لێکدانـەوەی ئـەم کتێبـەدا ئـەم ڕێبـازەی خوارەوەم گرتووە:

لە پێشدا چەند بەیتێک کە پێوەندییان بەیەکەوە بێت دەیاننووسم، دوای ئەوە بە پێی پێویسـت تاکە تاکەی وشە گرانەکان مەعنا لێ دەدەمەوە، ئەنجا تێکڕای مەبەست روون دەکەمەوە.

لەم کارەدا سوودم لە کتێبە گەورەکانی عەقائید وەرگرتووە، وەک شەرحی مەقاسیدی سەعدی تەفتازانی و شـەرحی مـەواقیفی (عضـد الـدینی ئیجـی) و شـەرحی (جەلالـەددینی دەووانی) لـە عەقائیدی (عضدیە) و شەرحی (سەعدی تەفتازانی) لە عەقائیدی نەسەفییە و هەندێ سەرچاوەی-تر [4]. لە خودای بەخشندە و میهرەبان دەپاڕێمەوە کە ئەم کارەم لێ قوبووڵ بکات.

لە تۆیش ئەی خوێنەری خۆشەویست تکای لێبووردن دەکەم، چاو بپۆشە لـە کـەم و کـووڕیی کارم؛ چونکە بێ‌گومان کاریوا بێ خەوش نابێ؛ مرۆیش، هەر چەند لـێ‌هـاتوو بـێ، دەسـتەلات و توانای سنوورێکی تایبەتی هەیە.

## به ناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

**مەولەوی فەرموویەتی:**

بسم الله الرحمن الرحيم

زوبــدەی عەقیــدە و خولاســەی کــەلام
هەر لە تۆ و بۆ تۆس حەمد و سـەنای عـام
هەر خۆتی بۆ خۆت بورهـان، دیتـر بـەس
بەشـی خـۆی تێکـەڵ نـاوێ بکـا کـەس
بۆ تۆس: بۆ تۆیە. دیتر: ئیتر. ناوێ: نابـێ.

مەولەوی سوپاس و ستایشی خودای گەورە دەکات و دەڵێت ئەوەندە مەیدانی ستایشت گەورە و فراوانە کەس ناتوانێ ستایشت تەواو بکـات، هـەر تـۆ دەتـوانی ستایشـی خـۆت بکـەیت، وەکـو حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی «لا أحصي ثناء عليك انت كما اثنيت على نفسك» (٥) هەروەها کەس ناگا بە ناسینی راستەقینەی تۆدا، تۆ هەر خۆت دەبیتە بورهانی قەتعی و دەلیلی راستەقینە لەسەر بوونی زاتی خۆت، هەر خۆت بەڕاستی خـۆت دەناسـیت، (مـا عرفنـاک حـق معرفتـک) مـەعنا و کرۆکی ئەم دوو واتەیە ئەوەیە ئەگەر ستایش و سوپاسی زاتی خودا لەسەر نیعمـەت بکرێـت ئـەوا نیعمەتەکانی خودا ئەوەندە زۆرن لە ژماردن نایـەن هـەتا سـوپاس و سـتایش بـە ئەنـدازەی ئـەو نیعمەتانە بێ، خۆ ئەگەر هەر بەرامبەر بە سیفەتە جوانەکانی خـودای گـەورە بێـت ئـەوا سـیفەتە جوانەکانی خودا لەو رووەوە کە سەرچاوەی کردەوەی بەنرخن ئەوەندە نەبڕاوەن ماوەی ئەوە نییە کە ئادەمزاد بیانژمێرێ و دیاریان بکات. هەروەها دەلیل و بورهان لەسەر بوونی زاتی خودا لەگەڵ دەرخستنی حەقیقەتیدا شتێکی مەحاڵە و نایەتە دی، چونکە هێزی سنووردار و بـڕاوەی ئینسـان

ناگات بە ناسین و زانینی راستیی کونهی زاتی (واجب‌الوجود) دا؛ کەوابێ هەر خۆی زاتی خۆی دەناسێت و بەس. ئەمە بوو مەعنای ئەم دوو واتەیە، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە کە دەلیل لەسەر بوونی خودای گەورە ناهێنرێتەوە؛ چونکە لە قورئانی پیرۆزدا لە گەلێ ئایەتدا ئەمر کراوە بە خوداناسین و ئیستیدلال بە (انفس) و (آفاق) لەسەر بوونی (واجب‌الوجود)ی ئافەریننەدە، بەڵێ باوەڕ بە بوونی (واجب‌الوجود) و، زانینی سیفات و ئاساری بە جۆرێ کە بگاتە پایەی (حق الیقین) بە هۆی (فەیض) و (تجلیاتی) خودای گەورە لەسەر دڵی ئینسانی چاکی پاکی بەختیار، کە پێی دەوترێ ئیمانی کەشفی و شهوودی، ئەمە بەرزترین پایەی ئیمانە بۆ هەرکەسێ رێک بکەوێ، وەکو خودای گەورە فەرموویەتی (والله یختصّ برحمته من یشاء والله ذوالفضل العظیم) (٦).

جا مەولەوی بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر قسەکەی خۆی دەڵێ:

کەنارەی سەحرا نادیارییە
بینایی عقوول ئاو مروارییە
(ضیق النفس)یە، هەناسەی نایە
دانش، دەلیل پێی (عرق النسا)یە
عرفان بەوانە حاسڵ کەی دەوێ؟ (٧)
بەو پێ ئەو سەحرا چلۆن تەی دەوێ؟
چاک واتە خەیاڵ بێتەقریب نەکەین
مەعلوومە تۆ تۆ و، ئێمەیچ خۆ ئێمەین

کەنارە: قەراخ. سەحراء: مەبەس مەیدانی مەعنەویی خوداناسینە. بینایی: مەبەستی چاوە. عقوول: هۆش و فام. ئاومرواری: نەخۆشییەکە تووشی چاو دەبێ رێگەی گەیشتنی رووناکی دەگرێ و نایەڵێ رووناکی بگاتە بیبیلەی چاو.

ضیق النفس: هەناسە توندی. دانش: عەقڵ، زانست. عرق النسا: رەگێکە لە ژوور رانەوە دەست پێ دەکات تا پاژنەی پێ، مەبەس ئەو نەخۆشییەیە کە تووشی ئەم رەگە دەبێ. دەوێ: دەبێت.

(کەنارەی سەحرا) موبتەدایە و (نادیاری‌یە) خەبەریەتی. هەروەها (بینایی عقوول) موبتەدایە و (ئاو مرواریيە) خەبەریەتی. لە بەیتی دووەمدا (دانش) کە دواکەوتووە موبتەدایە و (ضیق النفس... تاد) خەبەریەتی و، (دەلیل) موبتەدایە و رستەی (پێی عرق النسا) خەبەریەتی. لە وشەی

(سحرا)دا ئیستیعارەی موسەڕڕەحە هەیە، تەشبیهی خوداناسین کراوە بە سەحرا و قەرینە حالییەیە.

هەروەها لە وشەی عقوول دا ئیستیعارەی مەکنییە هەیە، عقوول (مشبّە)ە و، چاوی ئینسان (مشبّە بە)یە و، (اضافە)ی بینایی بۆ عقوول قەرینەیەتی. لە (دانش) یشدا ئیستیعارەی مەکنییە هەیە. چونکە تەشبیە کراوە بە ئینسان و (ضیق النفس) قەرینەیەتی. لە وشەی (دلیل)دا ئیستیعارەی مەکنییە هەیە و تەشبیە کراوە بە ئینسان و (اضافە)ی (پێ) بۆ دەلیل قەرینەیەتی و، (عرق النسا) تەرشیحە، واتە: قەراخی سەحرای خوداناسین ئەوەندە پان و بەرینە دەرناکەوێ و، چاوی هۆش و فامیش گیرۆدەی نەخۆشیی ئاومرواری بووە و هیچ نابینێ و، زانست تووشی هەناسەسواری بووە و هەناسەی دەرناچێ و، پێی دەلیل و بەڵگەیش تووشی نەخۆشیی (عرق النسا) بووە... جا ئیتر خوداناسین بەو هۆش و زانستە نەخۆشە و بەو عەقڵ و فامە کوێرە نابینایە چۆن جێبەجێ دەبێت و، ئەو دەشتە کاکی بە کاکییە بەو پێی دەلیلە کە گیرۆدەی (عرق النسا)یە چۆن دەبڕرێ؛ کەوابوو چاک وایە خەیالاتی بێسوود نەکەین، دیارە کە تۆ، ئەی خودای گەورە، تۆی و (واجبالوجود)ی و راستییەکەت نەزانراوە، ئێمەیش، بەندەگانی تۆ، هەر ئێمەین و، ئەم (ممکن)ە (خاصة) پڕ لە کەم و کووڕییەین، ئەوەندە بەسە باوەڕمان ببێ کە تۆ (واجبالوجود)ی.

***

١ـ دیوانی مەولەوی کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و لە سەر نووسینی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، ساڵی ١٩٦١ی زاینی ١٣٨٠ی کۆچی، چاپخانەی نەجاح، بەغداد.

٢ـ دەقی (عەقیدەی مەرزییە) کە ئێستە ئەم شەرحەی لێ کراوە لەگەڵ دەقی عەقیدە فارسییەکەیدا کە ناوی (فوائح)ە ساڵی ١٣٥٢ی کۆچی (١٩٣٤ی زایینی)، لە لایەن زانای خواڵێخۆش بوو مامۆستا محیی الدین سەبری نەعیمی کانی مشکانییەوە لە چاپخانەی (السعادة) لە میسر لە چاپ دراوە.

٣ـ ئەم کتێبە ساڵی ١٩٧٢ لە چاپخانەی ئیرشاد لە بەغدا چاپ کرا و، من سەرپەرشتی چاپ و راستکردنەوەی هەڵە چاپییەکانی بووم.

٤ـ (مقاصد) وەک لە ناو خوێنەوارە ئایینییەکانی کورددا مەشهوورە، یا (مقاصد الطالبین) ناوی کتێبێکە ناوەڕۆکەکەی زانیاریی کەلام و ئوسوولی دین و عەقائیدە. ئەم کتێبە و شەرحەکەی هەردوویان هی (مسعود)ی کوڕی (عمر) ن، کە بە (سعدالدینی تەفتازانی) و (سەعدی تەفتازانی) ناوی دەرکردووە کە لە ساڵی (٧٢٢)ی کۆچیدا لە دایک بووە و، لە (٧٩٣)دا وەفاتی کردووە.

(مواقف) ناوی کتێبەکەی (عبدالرحمن)ی کوڕی (احمد)ی کوڕی (عبدالغفار)ە کە بە (عضدالدینی ئیجی) ناوی دەرکردووە. ئەم زانایە سالی (٧٠٠) یا (٧٠١)ی کۆچی لە دایک بووە و سالی (٧٥٦) کۆچی دوایی کردووە. ناوەڕۆکی ئەم کتێبەش زانیاریی کەلام و ئوسوولی دینە.

شەرحی مەواقیفیش هی عەلیی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلیی جورجانییە کە بە سەیید شەریفی جورجانی مەشهوورە، سالی (٧٤٠)ی کۆچی لە دایک بووە و سالی (٨١٦) وەفاتی کردووە.

(عضدالدینی ئیجی) کتێبێکی‌تریشی هەیە ناوی (العقائد العضدیە) یە، (جلال الدینی) کوڕی (محمد)ی کوڕی (اسعد)ی دەووانی، کە سالی (٨٣٠)ی کۆچی لە دایک بووە و سالی (٩٠٧) یا (٩١٨) مردووە، شەرحی لێ کردووە.

عەقائیدی نەسەفییە هی (نجم الدین ابو حفص عمر)ی کوڕی موحەممەدی نەسەفیی سەمەرقەندییە، کە سالی (٤٦١)ی کۆچی لە دایک بووە و سالی (٥٣٧) وەفاتی کردووە.

سەعدی تەفتازانی شەرحی لەم عەقائیدە کردووە.

٥ـ سنن ابن ماجە / الجزء الثانی / ص ١٢٦٣ / تحقیق محمد فؤاد عبدالباقی / دار احیاء الکتب العربیة سنة الطبع ١٣٧٣ هـ ـ ١٩٥٤ م.

٦ـ ئایەتی (١٠٥) لە سوورەتی (بقرە).

٧ـ لە چاپەکەدا: (کەی حاصل دەوی) یە. ئەوەی نووسیومەتەوە بە پێی نوسخە دەستنووسەکەیە و راسترە.

## مبحث الصلاة والسلام [1]

هەورەکەی رەحمەت رووی سەمای کەرەم
سەلات و سەلام کەی کەم ئیستە کەم
بێری و بڕێژێ و بدا وەهەم دا
وەسەر مەزرەعەی رۆحی خاتەمدا
سەر واز کا سەراو وە هەر شەتاودا
وەسەر سەوزەی پاک ئال و ئەسحاودا
تا بدا پرتەو وەسەر وجوددا [2]
ئیمان لە ئەسرار ئەهل شهوددا

سەما: ئاسمان. کەرەم: بەخشش. کەی کەم ئیستە کەم: وشەیەکە لە تاوەگۆزی و هەندێ ناوچەیتری کوردستاندا بە کار دەهێنرێ، واتە سەرومڕ، بێوچان، بێبڕانەوە. دەڵێن: باران ئەبارێ کەی ئیستە کەم. بدا وەهەم دا: بدا بە یەکا و تێکەڵ بە یەکتر ببن. مەزرەعە: دێبەر: سەر واز کردن: تێپەڕکردن و لادان بەملا و لادا، سەرڕێژکردن. سەراو: ئاوی بە هێز لە سەراوردی دێبەرەوە. سەوزە: گیا و گوڵزار. پرتەو: پرشنگ. وجوود: بوون، مەبەست بووەکانە کە جیهانە و ئەوەی لە جیهاندایە. ئەسرار: پەنامەکییەکان، مەبەست دڵ و دەروونە. ئەهلی شهوود: ئەوانەن دڵیان وریایە و خاوەنی کەشفن.

لەپاش ئەوە کە سوپاس و ستایشی خودای گەورەی کرد، هاتە سەر پێشکەشکردنی درووود بە بارەگای خاوەنی پایەی بەرز(د.خ) و، فەرمووی: یا خودا خوا لە ئاسمانی بەرزی کەرەم و بەخششی خۆیەوە رەحمەت و ئیحسان بکا بە هەور و بارانی سەلات و سەلام بێنێ و بیدا بە یەکدا و بە درێژیی کات بیرژێنێ و بیبارێنێ بەسەر دێبەری خاوەن کەمالی گیانی پاکی حەزرەتی سەروەری جیهاندا کە (محمدالمصطفی) یە(د.خ)، ئەنجا ئاوی بە هێز و تاوی ئەو بارانە لە دێبەری

گیانی پاکی حەزرەتی رەهبەرەوە تێپەڕ بکات و بدا بەسەر سەوزەی پـاکی ئـال و یـارانیدا، هـەتا تیشک و رووناکیی بیر و بـاوەڕی جـوان لـە دڵ و دەروونی دەروونپاکانـەوە بـە گـورجی بەسـەر جیهاندا بلاودەبێتەوە.

لەم هۆنراوانەدا تەشـبیهاتی وەرگـەڕاو زۆرە، تەشـبیهی میهرەبـانیی خـودا کـراوە بـە هـەور و، تەشبیهی بەخشش کراوە بە ئاسمان و، تەشبیهی سەلات و سەلام کـراوە بـە بـاران و، تەشـبیهی رۆحانیەتی حەزرەت(د.خ) کراوە بە دێبەر.

(بعدُ) گشت ئەجزات بویَ بە دەمـاخ
کام دەماخ؟ وە بۆی یادی خودا چاخ
نەک نەفحەی دەمدەم (خالق الانـام)
یا فەیزی ئـەنفاس ئەسـفیای کـیرام
وە ناکاو بۆی بێت چابوک کـا گـوزەر
بویَ وە حەسرەت نەوی (٣) باخەبـەر

گشت: هەموو. ئەجزا: ئەندام، پارچەپارچە و بەشبەشـی لـەش. بـویَ: ببـیَ. دەمـاخ: لێـرەدا مەبەست ئەندامی بۆن کردنە. بۆی: بۆنی (٤). چاخ: ئامادە، قەڵەو، بەنیشات. نەفحە: بۆنی خـۆش. دەمدەم: جارجار. ناکاو: کوتوپڕ. چابوک: گورج. گوزەر: رابووردن. بویَ: ببیَ.

مەولەوی قسە لەگەڵ قوتابیانیدا دەکات، وشەی تاک بە کاردێنیَ و مەبەستی کۆیە، دەڵێت: یا هەموو پووره و بەشێکی لەشت ببیَ بە دەماخ و ئەندامی بۆن کردن، کام دەماخ؟ دەماخێکی وەهـا کە بە بۆنی یادی خوا قەڵەو و ئامادە و پەرداخت بیَ و ئامادە بیَ بۆ وەرگرتن و بـێنکـردنی بـۆنی خۆشی پێوەندی لەگەڵ خودای گەورەدا، هەرگیز بیَئاگـا مەبـە، نـەبادا بـۆنی خـۆش و نەشـئەی تاوتاوی بەرەکەتی ئافرینندەی جیهان، یا بەرەکەتی هەناسەی بەندە دۆستەکانی خودا لـە ناکـاودا تێپەڕ بکات و تۆش ئاگادار نەبیت و لەو بۆنە خۆشە بیَبەش بیت و، ئـەو بـیَبەشـییە ببێتـە هـۆی پەژارە.

هێمـــای هـــەوای ئـــەو قـــەدیم پەیمانـــە
پێمانـــە، وەک ئـــەهل هەواپـــەیما نـــە
دەلالـــێینەوە: ســـەریح، ئیمـــا نـــە
هـــای ســـاقی! ئامـــان بەحســـی ئیمانـــە

هــەر بــەهار نــاویَ، (دەی) لــە پــەیمانــە،
فرســـەت دەفـــەوتیَ دەی لـــە پەیمانـــە
تۆ سەبووی مەی پێت، جـام جانفیـدای ڕێـت
دڵ چاوی وا لێت، سـا بـا بێـت؛ تـا بێـت [٥]
زوان وە بـــیَ مـــن وەســـەر تـــەقریردا [٦]
خامــە وە بـیَ دەس وەســەر تـەحریردا [٧]

هێمای: هێشتا. هەوا: خۆشەویستی. قەدیم پەیمان: پەیمان و سوێندی ئەزەلیی (اَلَستُ بِـرَبِّکُم قالُوا بَلی) [٨] یا خۆ قەدیم پەیمانە واتە: پەیمانەی کۆن، کاسەی پڕ لە شـەرابی کـۆن کـە ئـەمیش شەرابی عەشقی خودایی‌یە. هەواپەیما: ئارەزووپەرست. نە: وشەی نەفیە، واتە نـەک وەک هـەوا و خۆشەویسـتیی ئەوانــەی دوای ئـارەزووی نـەفس کـەوتوون. دەلالـێینەوە: دەپاڕێینــەوە. ئیمـا: ئیشارەت. دەی: ناوی یەکەم مانگی زستانە. لە پەیمانە: وا بە شـوێنمانەوە، هـەر ئەوەنـدەت زانی گەیشت. دەی لە پەیمانە: زووکە پیالە پڕ کە. خامە: قەڵەم. سەبوو: گۆزەی مەی.

مەولەوی شـوکرانەبژێرە و باسـی نـاز و نیعمەتـەکانی خـودا دەکـات و دەڵـێت: ئێمـە هێشـتا خۆشەویسـتی ئـەو دۆسـتەی کـە لـە کۆنـەوە پـەیمانی دۆسـتیمان لەگەڵـدا بەسـتووە لامانـە و پەیمانەکەمان ڕاگرتووە وەکو ئینسانی ساغی بەوەفا، نەک وەکو ئەوانە کە دوای هـەوا و ئـارەزووی پڕوپووچ دەکەون، دیارە «قـەدیم پەیمانـە» ئیشـارەیە بـۆ پـەیمانی «الســت بـربکم...» هـەرووەها دەپاڕێینەوە بە سەراحەت و بیَ پێچ و پەنا نەک بە هێما و، دەڵێین، ئەی سـاقی! ئـەی مەیگێـڕی دڵ تێراوکەر! ئێمە واین لە باسی ئیماندا و پێویسـتیمان زۆرە بـە یارمـەتی، فرسـەتە هـەمووکاتیَ بەهار و گوڵ و گوڵزار و یار و دڵدار و بولبولی سەر شاخی گوڵـی نـازدار نابـیَ، مـانگی «دەی» لـە دواوەیە و دێت کە یەکەم مانگی زستانە، زووبە تا هەل لە دەس دەرنەچووە پیالەمان بۆ پڕ بکە بـا بخۆینەوە خۆ تۆ زەرەر ناکەیت گۆزەی شەرابی مەحبووبت پێیە و، ئەوەندە نـازدار و ناسـکی جـام کە بە دەستەوەیە گیان فیدای ڕێگەی تۆیە و، دڵی ئێمەش چاوی لە تۆوەیە، دەبا شەراب و جامی پڕ بێت هەتا بە شەرابی ڕاستەقینە و یادی دۆستی ڕاستەقینە وەها سەرخۆش ببین کـە زمـان بـە بیَ‌ئیختیاری من بێتە سەر باس‌کردنی مەسئەلەکانی زانستی (کلام) و، خامەیش بە بیَ یارمـەتیی پەنجەی من بکەوێتە سەر نووسینی قەواعیدی (عقائد) و، ئـەو عیلمـە وەهـا تێکـەڵ بـیَ لەگـەڵ چەشی ئەهلی (تەریقەت)دا بە بیَ کۆسپ باوەش بکا بە (حەقیقەت) دا.

(وَ مَــا خَلَقــتُ) هــەس لــە قورئانــدا
دەفەرمووت: لە خەلق جین و ئینساندا
حیکمــەت عیبــادەت (خــالق الخلــق)ە
ئــەویچ بــێ‌ئیمــان هــەبای موتلــەقە
بــەڵ ئــەر نەناســیە نــاوێ عیبــادەت
بەڵ طەردە لە فەیز فەوز و ســەعادەت
لەکەی مونافات «لِکَی أُعرَف» [٩] چــوو
دەســـەمل دەگــەڵ (لِیَعبُــدُون) بــوو

ئەویچ: ئەویش. هەبا: تۆز. نەناسیە: نەناسرێت. لەکە: چلک، خاڵی رەش. دەسەمل: دەست لە مل، واتە رێک و گونجاو و سازاو.

مەولەوی لەم بەیتانەدا رێگا خۆش دەکات بۆ باسی ئیمان و بــۆ ئــەوەی کــە پێویســتە هــەرچی هوشیارە ئیمان و خوداناسی‌یان هەبێ تا بتوانن بەندەیی خودا جێ‌بەجێ بکەن، هــەروەها چــارەی ئەو ناکۆکی و دژایەتییە دەکات کە لە بەینی ئایەتی (و ما خلقت الجن و الانس إلا لیعبدون) [١٠] و حەدیسی قودسیی «کنتُ کنزاً مخفیا فاحببتُ أن أعـرَفَ فخلقـت اللـقَ لِکَـی أعـرَفَ»دا دروسـت کراوە، گۆیا ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێت مەبەست لە دروست‌کردنی جین و ئینس عیبادەت کردنــە، کەچی حەدیسەکە ئەوە دەگەیەنێت مەبەست لە دروست‌کردنیان ئەوەیە خودای خۆیان بناسن.

جا مەولەوی بۆ چارکردنی ئەم ناکۆکییــە دەڵــێت: واتــای ئایەتەکــە ئەوەیــە کــە مەبەســت لــە دروست‌کردنی جین و ئینس بەندەیی‌کردنــە و، بەنــدەییش نــاکرێ ئەگــەر عیبــادەت‌بــۆکراوەکــە نەناسراو بێت، کەواتە جین و ئینس بە پێی توانا دەبێ خودا بناسن. بەم جۆرە مانای ئایەتەکــەیش وای لێ دێت: کە مەبەست لە دروست‌کردنی جین و ئیــنس خوداناســینە، وەک واتــای حەدیســە قودسییەکە، کەواتە: ئایەت و حەدیسەکە دژی یەک نین و، پێکەوە دەگــونجێن و دەس لــە ملــی یەکتر دەکەن.

شایانی باسە ئەم حەدیسە قودسییە، هــەر چەنــد لــە نــاو خەڵــکدا بــاوە و، مەعناکــەی لەگــەڵ ئایەتەکەدا رێک دەخرێت، لای (ابن الصلاح)ی شارەزۆری [١١] کە زانایــەکی پایــەبــاڵای حــەدیس بووە، ریوایەتەکەی سەنەدی نییە.

***

١ـ ئەم سەرناوە لە نوسخە دەستنووسەکەدا نییە، تەنها لە نوسخە چاپەکەدا هەیە.

٢ـ چاپەکە (وپرتاو = وەپرتاو)ە وابزانم هەڵەیە، ئەمەی ئێمە هی دەستنووسەکەیە.

٣ـ بە پێی پەراوێزی دەستنووسەکە هەڵدەگرێ (نەوێ) یا (نەوی) بێت.

٤ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا دەڵێت: هەڵدەگرێ (بۆ) بە واتای بۆن بێت، یا بە واتای بۆهاتن.

٥ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا چەند دێڕێک نووسراوە، تەنها ئەوەندەیم بۆ ساغ کرایەوە کە هەڵدەگرێ (بێت)ی دوایی فیعل بێ و (زوان) و (خامە) لە شیعری دواییدا فاعیل بن.

٦ـ لە چاپەکەدا (لەسەر)ە.

٧ـ لەم شیعرانەی پێشوودا کۆمەڵێک وشەئارایی هەیە. بۆ نموونە لە نێوان (پەیمانە) و (پەیمانە) و لە نێوان (ئیمانە) و (ئیما نە)دا جیناسی تەرکیب هەیە. لە نێوان (پێمانە) و (پەیمانە)دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە، لە نێوان (دەی) و (دەی)دا جیناسی تەواو هەیە. لە نێوان (ئامان) و (ئیمان) و، (بێت) و (ڕێت) و (لێت) و، (جام) و (جان) و، (سا) و (با) و، (تەقریر) و (تەحریر)دا جیناسی لاحیق هەیە. لە نێوان (پێت) و (بێت)دا جیناسی موزاریع و، لە نێوان (سەبوو) و (مەی) و، (جام) و (پەیمانە) و (زوان) و (سەر) و، (خامە) و (دەس)دا تەناسوب هەیە.

٨ـ ئایەتی (١٧٢) سوورەتی (اعراف).

٩ـ لە شێوەنووسی کۆندا (لەکەی) و (لِکَیْ) وەک یەک دەنووسران، لەو شێوەدا لە نێوانیاندا لایەک جیناسی موحەڕڕەف و، لایەک جیناسی موزاریع هەیە.

١٠ـ ئایەتی (٥٦) سوورەتی (الذاریات).

١١ـ حەدیسزانی پایەبەرز (تقی الدین أبو عمر و عثمان)ی شارەزووری ٥٧٧ـ٦٤٣ ی ک.

## مبحث الایمان [1]

تــەعریفی ئیمـــان، شـــرعاً تـــالبی،
تەسدیقە و ئیزعان، قوبوولـی قـەلبی
بمـــا قـــد عُلِـــمْ مُجـــیء النبـــی
بِـــهِ مـــن عنـــد البـــارِیء الـــربٍّ
ئیعتیقـــادی بـــێ یـــا خـــۆ عەمـــەلی
عیلمی زەروورەت بـوێ دەگەڵـی [2]
وا بـــەدیهی بـــێ بزانـــێ یـــەقین
عامیی تێکەڵیچ دەگـەڵ موسـلیمین

تەسدیق: باوەڕ کردن. ئیزعان: وەرگرتن و باوەڕکردن. زەروووریچ: زەروووریش، ئاشکرا و دیـار. بوێ: ببێ. دەگەڵی: لەگەڵیا. بەدیهی: ئاشکرا و دیار. تێکەڵیچ: تێکەڵیش.

واتە: ئەگەر دەتەوێ لە واتای (ئیمان) تێ بگەی، بـە پێـی شـەرع، بزانـە کـە ئیمـان بـاوەڕە و وەرگرتنی دڵە بـۆ ئـەو یاسـا و دەسـتوورانە و ئـەو راسـتییانەی کـە پێغەمبـەری نـازدار (محمـد المصطفی) درووودی خوای لێ بێ لای خواوە هێناونی، چ لە بابەتی بیروبـاوەڕ بـن وەک بـاوەڕ بـە بوون و یەگانەیی پەروەردگاری (واجبالوجود)، یا لە بابـەتی کـردەوە و رەفتـار بـن وەکـو نـوێژ و رۆژوو و زەکات و حەج، یا لە بابەتی خوو و رەوشت بن وەکو راسـتی و خـۆگرتن و شـەرم، یـا لـە بابەتی سەرگوزەشتە بن وەکو باسی نەتەوە پێشووەکان، یا لە بابەتی کاروباری ئایندە بن وەکو ئەو نیشانانەی لەمەولا دەبن. جا ئەو یاسایانە کە حەزرەت هێناونی پێویستە ئاشکرا و دیاری بن، نەک

هەندێ کەس بلێ ئەوشتە لەوانەیـە حـەزرەت بـەیانی کـردووە و هەنـدێ کـەس بڵـیت بـەیانی نەکردووە و، پێویستە ئەوەندە دیاری بن (عوام الناس) یش بیانزانن.

مەعنای تەسدیقیچ بزانە چییە:
ئیعتیقـاد بەمـە (خـیر البریّـە)
(فیما اخبر بهْ صـادق، مصـدّق)
(کَمَا أخبَر بِه) وا سابتە و حـەق

واتە: باوەڕ بەوەی کە حەزرەت هەرچی فەرمووە راستە و موافیقی واقیعە.

لە بابی عولووم مـەعاریف حیسـاب
نییە، بۆچ؟ کەسیر لە ئەهلی کیتاب
(عرفـــوا أن خیـــر المنـــذرین
رســـول، و قـــد کـــانوا کـــافرین)

واتە: ئەم ئیمانە کە تەفسیرمان کردەوە بـە تەسـدیق و بـاوەڕ لـە بابـەتی عـیلم و مەعریفـەت حسێب ناکرێ، چونکە گەلێ لە ئەهلی کیتاب زانیویانە کە حەزرەت(د.خ) رەسوولی خودایە و ئـەو زاتەیە کە پێغەمبەرانی پێشوو موژدەیان داوە بـە رەوانـەکردنی و، باسـی لـە کتێبەکانیانـدا بـووە، کەچی خودای گەورە بە کافری حسـێب کـردوون و، دەربارەیـان فەرموویـەتی: (الـذین آتینـاهم الکتاب یعرفونە کما یعرفون ابناءهم و ان فریقاً منهم لیکتمون الحق و هم یعلمون) [٣] دیارە ئەگەر ئیمان مەعریفەت و زانین بوایە پێویست بوو ئەوانە بە موسوڵمان بناسرێن، کـەچی خـوا بـە کـافر ناوی بردوون.

جا ئەوانەی کە دەڵێن ئیمان مەعریفەت و زانین نییە چەند بیرێکیـان هەیـە. یەکـەم: عـیلم و مەعریفەت تەسەوورە و ئیمان تەسەوور نیە. دووەم: عیلم و مەعریفـەت وا ئـەبێ کـە بـە ئیختیـار پەیدا ئەبێ وەکو ئەو تەسەوورانە کە لە بیرکردنەوە لە شتێک پەیدا ببێ، وایش دەبـێ نائیختیـاری دەبێ وەکو ئەو تەسەوورانە کە لە خۆیانەوە دێتە دڵی ئینسانەوە، بەڵام ئیمـان پێویسـتە هـەر بـە ئیختیار و کەسب پەیدا ببێ.

سێهەم: مەعریفەت و زانست لە کەیفیاتی نەفسانییەن و کەیفیاتی نەفسانییە غەیرە ئیختیارین، بەڵام ئیمان (مکلف بِهِ) ەو (مکلف بِهِ) پێویستە ئیختیاری بێت.

چوارەم: مەعریفـەت و زانسـت عیلمـە و ئیمـان تەسـلیمە، تەسـلیم کـاری دڵـە و لـە بابـەتی مەقوولەی عیلم نییە، کەوابێ مەعریفەت ئیمان نییە و ئیمان مەعریفەت نییە.

زانا بەرزەکان ئەم بیرەیان بە هەڵە داناوە لەبەر چەند بەڵگەیەک:

یەکەم: مەعریفەتی موفرەدات تەسەووره، بەڵام مەعریفەتی مورەککـەباتی تامـەی خەبەرییـە وەکو (خالید نووسەرە) و (غانم خاوەن هونـەرە) و (حـەزرەتی محمـد ـ د. خ ـ رەهبـەرە) ئەمانـە تەسدیقن، ئەگەر ئەمانە تەسدیق نەبن ئیتر تەسدیق لەناوا نامێنێ.

دووەم: بڕیاردانی ئەوەی کە پێویستە ئیمان کەسبی و ئیختیاری بێ هەڵەیە، چونکە فریشـتەی خودا بە بێکەسب و ئیکتیساب ئیمانیان بە خودا هەیە، پێغەمبەران بـە بـێکەسـب ئیمانیـان بـە خۆیان و بە خودا و باقی جیهەتەکانی ئیمان بووە، هەروەها ئەگەر بڵێین پێویستە ئیمان کەسبی و ئیختیاری بێ دەبێ ئەوکەسەی کە بە تەنها چاوپێکەوتنی پێغەمبەر(د.خ) ئیمانی پـێ بهێنـێ بـە (موئمین) نەناسرێ، کەچێ ئەم جۆرە موسوڵمانانە لە ریزی باڵا و بەرزی موئمینان دەژمێررێن.

سێهەم: راستە کە عیلم و مەعریفەت لە کەیفیاتی نەفسانییەن و نائیختیـارین، بـەڵام (مکلـف بە) پێویست نییە لە زاتی خۆیا ئیختیاری بـێ، بەڵـکو ئـەوە پێویسـتە کـە (مکلـف بـە) لەوانـەبێ ئەسبابەکانی بە دەست بهێنرێن و پەیدا بکرێن، ئیمانیش لەوانەیە، چونکە تەماشاکردنی (ئافـاق) و (انفس) و سەیرکردنی موعجیزەی پێغەمبەران، کە ئەسبابی ئیمانن لە ئـەفعالی ئیختیـارین و، بـە عادەتی ئیمانیش لەوانەی پەیدا ئەبێ.

چوارەم: موسەللەمە مەعریفەت و زانست عیلمە، بەڵام موسەللەم نییە ئیمان فیعلی قەلبی بـێ، بەڵکو ئیمان هەر عیلمە و تەسدیقە و ئیزعانی عیلمییە، تەنها ئەوەندە هەیە مەرجی ئەو تەسـدیقە تەسلیم و رەزای قەلبییە، وەکـو سـەعدی تـەفتازانی لـە کتـێبی شـەرحی مەقاسـیددا لـە پـاش درێژەیەکی زۆر لەم بابەتەوە قسەی کردووە.

ئەوەی کە زانا وردەکان لەم باسەدا پێی گەیشتوون ئەوەیە کـە ئیمـانی شـەرعی عیلمـە وەکـو خودا ئەفەرموێت: (فاعلم انّه لا الاهَ الّا الله) حەزرەتی پێغەمبـەریش(د.خ) فەرموویەتی (اللّهمّ ثبّـت قلبی علی دینک). هەروەها ئیمانی تەقلیدی کـە بەشـێکە لـە ئیمـان و، لای گـەلێ لـە زانایـانی ئوسوول جێگەی ئیعتیبارە، علیمە و تەسدیقی تەقلیدییە. ئەو ئیمانەش بە ئیستیدلال پەیدا بکرێ عیلمی یەقینییە، چونکە زانینی دوو موقەددیمە دەبێتە هۆی زانینی نەتیجە. بەڵێ ئەوەندە فەرق

هەیە کە (متعلّق) ئیمانی شەرعی خاسە، واتە ئیمان لـە شـەرع دا تـەنها باوەڕکردنـە بـەوەی کـە حەزرەتی (محمد المصطفی) لە لایەنی خوداوە هێناویەتی.

هەروەها لە ئیمانی لوغەوی و مەنتیقی‌دا تەنها تەسدیق و ئیزعانی عیلمی پێویستە، واتە: تـەنها باوەڕ ببێ بەوەی ئەو نیسبەتە کەلامییە موافیقی واقیعە، ئیتر بە دڵ ئەو نیسبەتەی خۆش بوێ یـا خۆ رقی لێ بێ، وەکو ئەوەی یەکێک باوەڕ بەوە دەکا کە فلان کەس ئەوەندە قازانجی کردووە لـە مامەڵەیەکدا، کەچی لە دڵدا زۆر زویر و دڵگرانە لەو قازانج‌کردنەی، بەڵام لە تەسـدیقی شـەرعی‌دا پێویستە لەگەڵ تەسـدیق و ئیزعانـە عیلمییەکـەدا ئیزعـانی فیعلـیش هـەبێ، واتـە: بـە دڵ ئـەو نیسبەتەی خۆش بوێ و نەفسی پێی شادمان بێ و، شتێکی واش نەکا کە موخالیف و مونـافی بـێ بۆ ئەو نیسبەتە یا بۆنی ئینکاری لێ بێت، هەروەها پێویستە خـاوەن ئیمـانی قـەلبی بـە زمـانیش (شهادتین) بڵێت و ئیعلانی ئیمانەکەی خۆی بکات.

لەبەر رۆشنایی ئەم بەیانەدا ئەبێ حوکمی خودای گەورە بە کوفری ئەو ئـەهلی کیتابانـە لەبـەر ئەوە بووبێ کە لە دڵدا رقیان لە حەزرەت بووە(د.خ) و دوژمنی دین و دەستووری ئـایینی ئیسـلام بوون، واتە: لەبەر ئەوە نەبووە کە عیلم و تەسدیقیان نەبووبێ بە پێغەمبەر؛ چونکە لە دڵا باوەڕیـان پێ بووە، بەڵام رقیشیان لێ بـووە و بـە ئاشـکرایش بەربـەرەکانییان لەگـەڵ کـردووە و فیتنـەیان هەڵگیرساندووە.

جـا ئەگـەر کەسـێ بڵـێت مـادام ئیزعـانی فیعلـی، کـە تەسـلیمە، شـەرتی ئیمانـە، بـۆچی حەزرەت(د.خ) ناوی ئـەو تەسـلیم و ئیزعـانی فیعلییـەی نـەبردووە و، لـە بـەیانی ئیمانـدا تـەنها فەرموویەتی: «قال فاخبرني عن الايمان، قال ان تؤمن بـالله و ملائكتـه و كُتُبـه و رُسُـله و بـاليوم الآخر و تؤمن بالقدر خيره و شرّه» (٤).

لە وەڵامدا دەڵێم لەبەر چەند شت:

یەکەم: ئەو تەسلیم و ئیزعانە فیعلییە شتێکی پەنامەکیە خودا نەبێ کەس نایزانێ و، حـەزرەتی رەهبەر هیوای ئەوەی بـووە هەرکـەس بێتـە نـاو کـۆڕی موسوڵـمانانەوە و نیـەتی سـاغ بـێ ئـەو تەسلیمەی هەیە و بە رابووردنی رۆژگار زیادیش دەکات.

دووهـەم: بـەکارهێنانی کەلیمـەی ئیسـلام لەگـەڵ ئیمانـدا، لـە حاڵـێکدا ئیسـلام مانـای فەرمانبەرداری و پێوەندیی راستەقینەی دڵە بە دینەوە، ئەمەی لێ پەیـدا ئـەبێ کـە پێویسـتە بـۆ

خاوەن ئیمان تەسلیمی دڵ و مەحەببەت و رەزای نەفسی ببێ بە حـەزرەت(د.خ) و بـەو ئایینـەی کە ئەو لای زاتی خوداوە هێناویەتی.

سـێهەم: ئەمەیـە کـە حـەزرەتی رەهبـەر(د.خ) رەوشـتی وابـووە هەرکـەس دوو کەلیمـەی شەهادەتی بە زبان وتبێ واتە: [اشهَدُ ان لا اله الّا الله و اشهدُ ان محمداً رسول الله] قەناعەتی پـێ کردووە. بە ئومێدی ئەوەی کە بە هۆی تێکەڵ بوون لەگەڵ باقی موسوڵماناندا لە هەموو واجبات و حەقیقەتی ئیمان حالی ئەبێ و بە جێیان دێنێ.

چوارەم: ئەوەیە کە ئیمانهێنان و قبووڵی ئیسلام بناغەیە بۆ قبووڵی هەموو ئـەحکامی ئیسـلام وەکو نوێژ و رۆژوو و زەکات و حەج و غەزا لە رێی خـودادا و بـۆ بەرزکردنـەوەی ئـایینی پیـرۆزی ئیسلام، دیارە کە جێبەجێ کردنی ئەم یاسایانە بە بێ تەسلیم و ئیزعـانی فیعلـی هـەرگیز نایێتـە جێ.

ئەم تەفسیلەم لە فەرموودەی زانا بەرزەکانی ئیسلام و عولەمای ئوسوولی دیـن وەرگرتـووە، بـە تایبەتی (سعدالدینی تەفتازانی) لە کتێبی شەرحی عەقائید و کتێبی شەرحی مەقاسیددا لە باسـی ئیماندا کە دەفەرموێ:

«وغایته انه یجب اشتراط امور کالاختیار و ترک الجحود والاستکبار». لە پاش ئەمەش دەڵـێت: «و لا محیص سوی تسلیم أنه، أی الایمان، من الکیفیات النفسیة الحاصلة بالاختیـار الخالیـة عـن الجحود والاستکبار». شایانی باسە «بالاختیار» بە پێی غالیبەتە، چونکە لە راستیدا زۆربەی ئیمان ئەوەیە کە بە ئەختیار و تێفکرین و ئیستیدلال بێ، ئەگەرنا (سعدالدین) خۆی لە کتـێبی شـەرحی عەقائیدی نەسەفییەدا [٥] دەفەرموێت بۆ ئیمان کەسب شـەرت نییـە. ئـەبێ ئـەوەش بـزانین کـە مەبەست لە (جحود) و (استکبار) هەموو جۆرە جحوود و ئیستیکبارێکە، چ نەفسی و چ حیسسی.

ئیمـــان لـــە بـــەعزێ جـــێ ئیجمـــالی‌یـــە
لـــە بـــەعزێ جێـــدا بـــە تەفســـیلی‌یـــە
بە موجمەل [٦] زانیاگ بـاوەڕیچ موجمـەل
موفەسســـەل زانیـــاگ بـــاوەڕ موفەسســـەل

زانیاگ: زانراو. باوەڕیچ: باوەڕیش.

واتە: ئیمان و باوەڕکردن بەوەی کە حەزرەتی (محمد المصطفی) هێناویە بـە دوو شـێوەیە: بـۆ ئەوشتانە کە کیتاب و سوننەت بە کورتی باسی کردوون ئیمان و باوەڕەکەیش کورتە و ئیجمالییـە

و، بۆ ئەو شتانە کە کیتاب و سوننەت بە تەفسیل بەیانی کردوون ئیمان و باوەڕەکەیش ئەبێ تەفسیلی بێ، بۆ نموونە ئەو ژمارە پێغەمبەرانە کە لە قورئاندا بە تەفسیل بەیان کراون بۆمان پێویستە یەکەیەکە بە تەفسیل بیانناسین، ئەو شتانەی کە بە کورتی هاتوون وەکو مەسئەلەی ئیمان بە عموومی (ملائیکە) ؛ بێجگە چەند یەکێکیان؛ کە بە ئیجمال ناسراون، لێرەدا بە ئیجمال ئیمانیان پێ دەهێنین.

ئەگەر کەسێ بڵێت لەم باسەوە دەردەکەوێ ئەگەر یەکێ عیلمی بە تەفسیلی (ما جاء به الرسول) نەبێ کافر بێ، کەچی ئەمە پێچەوانەی (اجماع) ە، لە وەڵامدا دەڵێین مەعنای پێویستیی تەفسیل لە شوێنی تەفسیلیدا ئەوەیە کە واجبە لەسەر ئینسانێ توانای زانینی تەفسیلی ببێ فێری ئەو شتە تەفسیلیانە ببێ و، جا ئەگەر کەم و کورتیی کرد لە فێربۆنیاندا ئەوا تاوانبار دەبێ، بەڵام بە کافر ناناسرێ، چونکە بە (اجماع) هەرکەس بە زمان (شهادتین)ی وت ئەوە موسوڵمانە، ئەگەرچی بە هۆی کەم و کورتیکردن لە فێربوونیاندا تاوانبار دەبێ.

ئەمما چون ئیمان ئەمری مەخفییە
موئمین لە غەیرە تەمییزی نییە
شەرتە تەلەففوز بۆ تەمییزی بەین،
(مع الاقتدار، بالشهادتین)

ئەم دوو بەیتە وەڵامی پرسیاری ئەوکەسەیە کە دەڵێت: مادام ئیمان تەسدیق و باوەڕە بەوەی کە حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) هێناویەتی لە لای خودای گەورەوە، ئیتر دوو کەلیمەی شەهادەت بۆچی پێویستن؟ پوختەی وەڵامەکە ئەوەیە:

ئیمان باوەڕە، باوەڕیش شتێکی پەنامەکییە و لە دڵدایە و خوا نەبێ کەس پێی نازانێ. بڕیاردراوە ئەوانە کە خۆیان بە خاوەن ئیمان دائەنێن بە زوبان دوو کەلیمەی شەهادەت بڵێن، هەتا جیاوازی هەبێ لە نێوان موئمین و ناموئمیندا و، ئەحکامی ئایینی ئیسلام بەسەر ئەوکەسانەدا جێبەجێ بکرێ کە ئیمانیان هێناوە، واتە: هەر بەو مەرجەی موسوڵمان توانای هەبێ پێویستە بە هۆی ئەو دوو کەلیمەوە ئیمانی خۆی دەربڕێ، دیارە دوو کەلیمەکەش بریتین لە (اشهد ان لا اله الا الله و اشهد ان محمداً رسول الله) واتە: بە دڵ باوەڕم هەیە و، بە زوبان ئیقرار دەکەم و دانی پیا دەنێم کە پەرستراوی راستەقینە نییە، خوا نەبێ، بە دڵ باوەڕم هەیە و بە زوبان ئیقرار دەکەم و دانی پیا دەنێم کە (محمد)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (عبدالمطلب) پێغەمبەری

خودایە و، خودای گەورە ناردوویەتی بۆ تەمێ و تەربیـەی جـین و ئیـنس و بـۆ تێگەیانـدنیان لـە بەختەوەری و کامیابیی دنیا و قیامەت.

شایانی باسە دەربارەی حەقیقەتی ئیمان چەندە بیر و را هەیە، ئەوانەیان شایسـتەی بـاس بـن چوارن:

یەکەم: بیروڕای ئەهلی حەدیس و سەلەفە، ئەمانە فەرموویانـە ئیمـان تێکەڵـە لـە سـێ شـت: تەسدیق بە دڵ، ئیقرار بە زوبان، عەمەل بە ئەرکان، واتە: ئەندامەکانی لەش. بە کـورتی: لـە دڵـدا باوەڕی هەبێ و، بە زوبان ئەم باوەڕە دەرببڕێ و، بە ئەندامەکانی لەشـیش واجبـەکان جـێبـەجێ بکات.

دووەم: بیروڕای هەندێ لەو ئیمامانـە کـە دەڵـێن ئیمـان مورەککەبـە لـە دوو روکـن: بـە دڵ باوەڕکردن و بە زوبان ئیقرارکردن. روکنی یەکەم پێویسـتە هەمیشـە ببـێ، بـەڵام روکـنی دووەم لەوانەیە جار و بار نەمێنێ وەکوو لە کـاتی ترسـی گیانـدا. ئـەم رایـە لـە ئەبووحەنیفـە و هەنـدێ زانایانیترەوە ریوایەت کراوە.

سێهەم: بیری (کرّامیە)یە کە دەڵێن ئیمان بەسیتە و یەک شتە ئەویش ئیقرارکردنە بە زوبان.

چوارەم: بیری زانا ئەشعەرییەکانە کـە دەڵـێن ئیمـان بەسـیتە و یـەک شـتە ئـەویش بـە دڵ باوەڕکردنە، بەڵام بە زوبان ئیقرارکردن شەرتە بۆ جێبەجێ کردنی ئەحکام بەسەر ئەوکەسەدا کـە خاوەن ئیمانە، هەروەها شەرتە ئیستیکبار و جحودی لەگەڵا نەبێ، یا بـە واتەیـەکیتـر بـۆ ئیمـان شەرتە کە ئیزعانی فیعلیی لەگەڵدا بێ.

زانا بەرزەکانی ئوسوولی دین بیر و بڕوای ئەشعەرییەکانیان پەسەند کـردووە و، بەرپـەرچی رای یەکەمیان بەوە داوەتەوە کە ئەگەر کردەوە روکنی ئیمان بێ دەبێ ئینسانی موسوڵمان بە تـەرکی واجب یا بە کردنی حەرام کافر ببێ و لە (ئیمان) دەربچێ، کەچی وانییە؛ ئەوەتـە خـودای گـەورە ئەو موسوڵمانانەی بـە (مـؤمن) نـاوبردووە کـە شـەڕدەکەن لەگـەڵ یـەکا و لـە یـەکتر دەکـوژن، فەرموویەتی: (و ان طائفتان من المؤمنین اقتتلـوا فأصـلحوا بینهمـا...) الآیـة [٧] هـەروەها بـیری دووەمیان بەوە بەرپەرچ داوەتەوە کە ئەگەر ئیقرار بە زوبان روکن بوایە نەدەبوو جار و بار بفـەوتێ، روکن نابێ هەندێ جار ببێ و هەندێ جار نەبێ، کـەچی بـۆ ئینسـانی (مکـرە) زۆر لێکـراو ئیقـرار پێویست نییە، بەڵکو ئیقرار بە پێچەوانەی ئیمان زیانی نییە وەکوو دەردەکەوێ لە ئایەتی (الّا مـن اکره و قلبه مطمئن بالایمان) کە ئیقرار نەکردن زیانی نییە لە کاتی ترس و بیمدا.

رای سێهەمیش چاکتر غەڵەتە، چونکە ئیمان کە بناخەی زەحمەتکێشان و جیهاد و خۆڕاگرتنە لەسەر هێزی دڵ دائەمەزرێ نەک لەسەر واتەی دەم.

هەروەها بەڵگە زۆرە لە سەر ئەوەی کە ئیمان تەسدیق و باوەڕی دڵە؛ خودای گەورە لە قورئاندا فەرمویەتی (أولئک کتب فی قلوبهم الایمان) [۹]، وە فەرموویەتی (و قلبه مطمئن بالایمان) (و لمّا یدخل الإیمان فی قلوبکم) [۱۰]. حەزرەتی پێغەمبەریش(د.خ) فەرمویەتی: «یا مقلّب القلوب ثبت قلبی علی دینک»[۱۱].

به دەلیلی عەقڵیش پێویستە ئیمان بنکە و بناخە بێ بۆ تێکۆشان لە ڕێگای خودادا و بۆ بەرزکردنەوەی ئایینی ئیسلام و راهێنانی نەفس و مەنع کردنی لە ئارەزووی خراپ و، خووگرتن بە خوو و ڕەوشتی بەرز و بەمایە و، خزمەتکردنی موسوڵمانان. بێگومان ئەم جۆرە نیشانە گەورانە هەر لەسەر دڵ و بیروباوەڕی دڵ دادەمەزرێ، کەوابێ ئیمان باوەڕ و تەسدیقە بە دڵ، ئیقرار بە زمان شەرتی جێبەجێ کردنی ئەحکامی ئیسلامە بە سەر ئەوکەسەدا.

ئیمان عەرەزە و کەیفی نەفسانی
نەک بە ئیختیار فیعلی ئینسانی
بەڵام ئەسبابی تەحسیلی یەکسەر
گشت ئیختیارین وەک سەرفی نەزەر
تەکلیف بە ئیمان بێئیختیاری
لە هەوری سەتوەت (باری) ئەر باری
وەبادی تەکلیف بەو ئەسباوەسە
ئیمانیچ سەوزەی ئەو سەراوەسە[۱۲]
وەردی هەفت گاسن زۆر نەختی تەوێ
بێ دۆچ و هەرێز، شۆرەکات نەوێ
سا ئەر سەوزی کرد فەزڵێکە هەیە[۱۳]
وەرنە چ لزووم؟ مەزرەعەی خۆیە

عەرەز: بەو شتە دەڵێن کە بێ بەڵام پێویستی بە غەیر بێ تا بە هۆی ئەوەوە راوەستێ، وەکو رەنگ و بۆ؛ بە پێچەوانەی (جەوهەر) کە ئەوەیە خۆی بە خۆیەوە راوەستابێت و موحتاجی غەیری

خۆی نەبێ، وەکو دار، بەرد، ئینسان... تاد. کەیف نەفسانی: سیفەتی نەفس وەک زیندوویەتی، زانست، خواهیش، خواست. سەرفی نەزەر: هەڵسووڕانی فکر بۆ پەیداکردنی تەعریف و دەلیل.

هەور: هەوری ئاسمان. سەتوەت: هێز و توانا. باری: پەروەردگار. ئەر باری: ئەگەر باری بەسەر عەرزا بە فەرمانی خودا. وەباد: بە باد، بە هۆی (با) وە. ئەسباو: ئەسباب. ئیمانیچ: ئیمانیش. سەوزە: گیا وگوڵی عەرز. سەراو: شوێنی ئاو و کانی دار. وەرد: زەوییەکە کێڵرابێ و ئامادەکرابێ بۆ تۆو تیاکردن لە لایەن جووتیارەوە. گاسن: ئامێری جووتکردنە. تەوێ: ئەیەوێ. دۆچ: گیایەکی ریشەدارە وەکوو هەرێز دوژمنی کشتوکاڵە، پێی دەڵێن (سەرە رەشە). هەرێز: گیایەکی ریشەدارە ریشەکەی دەڕواتە خوارەوە بە عەرزا و زیان لە کشتوکاڵ دەدا. شۆرەکات: زەوییەکە خوێدار بێ و کشتوکاڵ سەوز نەکات. نەوێ: نەبێ. ئەر: ئەگەر. وەر: وە ئەگەر.

واتە: ئیمان باوەڕە و باوەڕ کەیفی نەفسییە، کەیفی نەفسیش ئیختیاری نییە، کەوابوو تەکلیف لە ئینسان ناکرێ بە ئیمان؛ چونکە پێویستە (مکلف بە) کارێکی ئیختیاری بێ، کەچی لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەردا گەلێ جار تەکلیف بە ئیمان کراوە، وەکو (یا أیّها الذین آمَنوا آمِنوا باللە و رسولِە والکتاب الذی أنزل علی رسولە...) [١٤]. مەولەوی بۆ چاری ئەم ئیشکالە ئەفەرموێ: هەر چەند ئیمان عیلمە و عەرەزە و کەیفی نەفسییە و ئیختیاری نییە، بەلام ئەسبابی پەیدابوونی ئیمان، وەک تەماشاکردن و بیرکردنەوە لە جیهان و لە نەفسی ئینسان خۆی و، بیرکردنەوە لە موعجیزەکانی حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) هەموو کردەوەی ئیختیارین، جا ئەگەر تەکلیف بە ئیمان کە شتێکی نائیختیارییە لە هەوری دەسەلاتی خودای گەورەوە بەسەر موکەللەفین‌دا باری ئەوە مەبەست تەکلیف کردنە بە جێبەجێ کردنی ئەسبابەکانی ئیمان، واتە: ئەمر بە ئیمان ئەمرە بە تێفکرین و بە دوای دەلیل‌دا گەڕان بۆ پەیدا کردنی ئیمان.

لەم باسەدا مەولانا ئەحمەدی خەیالی[١٥] لە پەراوێزی شەرحی عەقائیدی نەسەفییەدا فەرموویەتی پێویست نییە کە خودی (مکلف بە) کە ئیختیاری بێ، بەڵکو تەنها ئەوەندە بەسە کە قابلیەتی ئەوەی هەبێ پەیدا بکرێ، ئیتر لە کردەوە ئیختیارییەکان بێ، وەک هەستان و دانیشتن و جم و جووڵ، یا لە کردەوە نائیختیارییەکان بێ وەک زانست (علم)، لەسەر ئەم رایە ئیتر پێویست نییە کە تەکلیف بەو شتە نائیختیارییە ببەینەوە سەر تەکلیف بە ئەسبابی ئەو شتە.

(مەولەوی) لەم هۆنراوانەدا سەنعەتێکی جوانی هێناوەتە پێشەوە کە تەشبیهی توانا و هێزی خودای کردووە بە هەور و، تەشبیهی تەکلیفەکەی کردووە بە باران و، تەشبیهی دڵی خاوەن بیر و

هۆشی کردووە بە عەردێ کە باران دەبارێ بە سەریا، هەر وەکوو پەیدابوونی هەور پێوەندی هەیە بە "با"وە و، کە "با" هەڵ دەکات هەور کۆ دەبێتەوە، وەها تەوجیهی ئەمر و فەرمان بۆ لای تەحسیلی ئەسبابی داناوە بەو "با"یە کە هەوری لێ پەیدا ئەبێ.

هەروەها تەشبیهی دڵ و دەروونی بنیادەمەکانی کردووە بە عەردێک کە جووتیار وەردی بڕیبێ و ئامادەی کردبێ، تەشبیهی گومان و خەیالاتی خراپی کردووە بە دۆچ و هەرێز و، تەشبیهی راستی و چاودێریی حەقیشی کردووە بە کێلانی عەرد جار لە پاش جار، واتە: وەکوو عەردێ کە جووتیار چەند جار وەردی دابێتەوە هەتا دۆچ و هەرێزەکەی بفەوتێ و، عەردەکەش شۆرەکات نەبێ، وەها پێویستە دڵی ئینسانە موکەللەفەکەش نوورانی بێ و لە دڵە باشەکان بێ و، بە هۆی زیکر و یادی خودا خەیالاتی خراپ و هیچ و پووچی نەمێنێ.

سەرەڕای ئەمانەش هەموو سەوزبوونی ئیمانەکە و سوودی سەرەنجامی دەگەڕێتەوە بۆ میهرەبانیی خودا و تەوفیقی، واتە: ئەگەر بەجێ هات فەزڵ و گەورەیی خودایە و، ئەگەر بەجێش نەهات خودا خۆی موختار و فەرمانداره.

باقیی مەباحیس ئەحوالی ئیمان:
وەک دەوێ یا نە زیاد و نوقسان؟
مەخلووقە ئایا یا مەخلوق نییە؟
مورەککەبە، یا بەسیتە، چییە؟
(ثنائی)یە خەیر یا (ثلاثی)یە
عەمەل داخیلییە یا خاریجییە
دورسە ئیستیسنای یا نە، تا نەیکەین؟
ناگونجێ لەگرە دەس لە مەتڵەب دەین

دورسە: دروستە.

واتە: چەند باسێ ماون لە باسەکانی ئیمان ناگونجێ لەم هۆنراوە کورتەدا دەستیان لێ بدەین، ئەو باسانەش ئەمانەن:

ئایا ئیمان زیادبوون و کەمبوونەوە هەڵدەگرێ یا نە؟ هەندێ لە پێشەوایان، وەک ئیمام ئەبووحەنیفە؛ خودای لێ رازی بێ؛ فەرموویانە: ئیمان زیادە و نوقسان هەڵناگرێ، چونکە پێویستە ئیمان تەسدیق و باوەڕی جازم بێ، کە جەزم پەیدا بوو ئیتر لە ژوور جەزمەوە پایە نییە، بە پێی

ئەم ڕێبازە ئەو ئایەت و حەدیسانە کە زیـادیی ئیمـان ئەگـەیێنن دەبـڕێن بەسـەر زیـادبوونی ئـەو ئەحکامانەدا کە یەک لە دوای یەک تەشریع کراون و ئەسحابەکان ئیمانیان پێ‌هێناوە، وەک ڕۆژوو لە پاش نوێژ و حەج لە پاش ڕۆژوو، ئەمەیش هەر بۆ زەمانی حەزرەت(د. خ) بـووە ئیتـر لـە پـاش وەفاتی حەزرەت وەحی بڕاوەتەوە، یا ئەبـڕێن بەسـەر دڵـگەرمی و تێکۆشـان لـە بـەجێ‌هێنـانی مەئموورات و وازهێنان لە مەنهییات، وەکوو موافقی بیروڕای داخڵ‌بوونی ئەعماله لە ئیماندا.

بەڵام ئەهلی تەحقیق فەرموویانە ئیمان قابلی زیادی و کەمییـە، چونکـە هەرچەنـد لـە ئیمانـدا جەزم پێویستە ئەو جەزمە گەلێ پایەی زۆری هەیە وەکوو بینایی چاو و هێزی دوور و نزیک دیتن و، وەکو هەستی عەقڵ و، وەکو پڕتەوی چرا؛ ئەمانە هەموو پلەیان زۆرە، بێ‌گومان هەر موسوڵمانێ تەماشای حاڵی خۆی بکا لەمە تێدەگات، مەلا سەعدی تەفتازانی ئەم ڕایەی پەسەندکردووە.

باسی دووەم: ئیمان دروست‌کراو و حادیسە، یا دروست‌کراو و حادیس نییە؟

ئیبنوحەجەری هەیسەمی لە کتێبی (فتح المـبین)دا فەرموویـەتی: ئەوانـەی وتوویانـە ئیمـان مەخلووق نییە و قەدیمە، وتوویانە خودا ناوی خۆی بردووە بە (مؤمن) و ئیمانی هەیە بە زات و بـە سیفەتەکانی خۆی، دیارە زات و سیفاتی خودا قەدیمن و ئیمان بەوانیش قەدیمـە، بـەڵام ئیمـانی غەیری خودای گەورە بە خودا ئەوە دروست‌کـراو و حادیسـە، چونکـە خـاوەن ئیمانـەکان خۆیـان حادیسن و هەرچی سیفاتیان هەیە حادیسە، چ ئیمـان و چ غـەیری ئیمـان، کـەوابێ ئـەم نیزاعـە لەفزییە.

باسی سێهەم: ئەوەیـە ئیمـان بەسـیتە یـا مورەککەبـە، ئەگـەر مورەککـەب بـێ لـە دوو شـت مورەککەبە یا لە سێ شت؟ ئیمە لە پێشەوە بە دووروودرێژی باسـی ئەمـەمان کـرد و، پوختەکـەی ئەمە بوو: لای (کرّامیە) بەسیتە و هەر ئیقرارەکەیە، لای ئەشعەرییەکان بەسیتە و تەنها باوەڕە بـە دڵ و، ئیقرار بەشێکی ئیمانەکە نییە، تـەنها شـەرتی جـێ‌بـەجێ کـردنی ئەحکامـە. هەنـدێکیش ووتوویانە بەسیتە و تەنیا کردەوەیە. بەڵام لای ئیمـام ئەبوحەنیفـە مورەککەبـە لـە دوو شـت کـە تەسدیق و ئیقرارن. لای ئەهلی حەدیسیش مورەککەبە لە سێ شت: تەسـدیق و ئیقـرار و کـردار؛ دیارە ئەم ڕایە باش نییە و ئەوە دەگەیەنێت کە ئینسان بە تەرکی واجبێک یا بە کردنی حەرامێک کافر ببێت ئەمەیش وا نییە، جگە لەمەش عەتف‌کردنی ئەعمال لەسەر ئیمـان لـە گـەلێ ئایـەت و حەدیس‌دا ئەوەمان پێشان دەدات کە ئیمان و کردار لە یەک جیان، واتە کردار بەشـێک نییـە لـە ئیمان، بەڵێ کردنی حەرام و تەرکی واجب نیشانەی ئەوەیە کە کـابرا ئیمـان لـە دڵـیدا نـەبێ یـا

ئیمانەکەی ئەوەندە بێهێز و لاواز بێ کە کردەوەی لێ پەیدا نەبێ، چونکـە مـەعنای نییـە هـۆدە چرای داگیرساوی تیابێ، کەچی هۆدەکە تارێک بێ، جا ئەو ئایەت و حەدیسانەی ئەوە دەگەیەنەن کە ئینسان بە تەرکی نوێژ یا کردنی حەرامی وەک خەڵک کوشتن کـافر دەبـێ، دەبـڕرێن بەسـەر حاڵێکدا کە کابرا ئەو شتە بە حەڵاڵ بزانێ، یا بە سووک و بێترس تەماشای گوناە بکا، یـا دەڵـێین مەبەست لەو ئایەت و حەدیسانە هەڕەشەکردن و سەرزەنشـتە، یـا مـەعنایان ئەوەیـە ئـەو شـتانە نیشانەی ئینسانی بێئیمانن. ئەم باسـە ئیمـامی نـەوەوی لـە کتێبەکەیـدا (شـەرحی سـەحیحی موسلیم) بەیانی کردووە.

چوارەم: باسی ئیستیسناکردنە لەسەر ئیمان، وەکوو بڵێ »من موسوڵمانم ان‌شـاءالله» کـە ئـەم باسەش زۆر درێژەی پێ دراوە. لە راستیدا ئەگەر ئەو ئیستیسنایە لەبەر ئەوە بێ کـە کـابرا دوودڵ بێ لە ئیمانەکەیدا ئەوە بە بێگومان کوفرە، وە ئەگەر بۆ تەبەڕڕوک بێ یا خۆ بۆ رەبت‌دانی ئیمـانی و رزگاریی ئاخر نەفەس بێ، چونکە ئەنجامی ئینسان دیار نییە، ئـەوە زۆر مـەعقوول و موناسـبە و قەی ناکات.

موکتەسەب دەوێ ئیمـان بـێتەردیـد
لە کەشف، لە دەلیل، یا خۆ لـە تەقلیـد
ئـــەووەڵ ئەعلایـــە، دووەم ئەوســـەتە
تەقلیـــدی ئـــەدنا روتبـــەی مونحەتـــە
روتبەی تەقلیدی دەگـەڵ جـەزمی دڵ
سەحیحە و حاسڵ هیچ نییە موشـکیل
بـە قـەولی موختـار هەیـە موعتەبـەر
ئەرچی عاسـی وێ بـە تـەرکی نـەزەر

واتە: ئیمان کە باوەڕی دڵە بە یارمەتیی خودا لە سێ رێگاوە کەسب دەکرێ، یەکەم لە رێگـای کەشف و دەرکەوتنی حەقیقەتەوە بە هۆی داباریني پرتەوی رەحمەتی خودا بەسەر دڵی ئینساندا، ئەوانەی کە هەوڵ دەدەن بۆ پاککردنەوەی دڵیان لە بیروباوەڕی نابار و، پێوەندی بە شتی پەست و بێنرخەوە و بۆ وەرگرتنی خوو و ڕەوشتی جوان لە هاوڕێیی و هاوڕازیی ئادەمزادی پاک نییهاد و پایەبەرز و، تەمێ و تەربیە وەرگرتن لە مـەردانی راسـتەوە لەگـەڵ دەوامـی پەیـڕەویی حـەزرەتی رەهبەری جیهان پێغەمبەری ئاخر زەمان(د.خ).

بە تاقی‌کردنەوەی هوشیاران دەرکەوتووە کە هیچ شتێ نییە بە قەدەر هاوڕێیەتیی راستی ئینسانی دڵپاک بەسوود بێ بۆ نوورانی بوونی دڵ و، بۆ دامەزرانی ئینسان لەسەر کردەوەی باش و وەرگرتنی هۆی پیرۆزی و بەختیاری. ئەم خاوەن کەشفانە ئەگەنە پایەیەک کە وجوودی پەروەردگار دەکەن بە دەلیل لەسەر حدووسی جیهان و هەرچی لە جیهاندا هەیە و روودەدات، واتە: (مؤثر) دەکەنە دەلیل لەسەر (أثر) و (خالق) لەسەر (مخلوق).

دووەم: ڕێگەی ئیستیدلالە بە بەڵگە و دەلیلی بەهێز، کە لە موقەددیمە یەقینییەکان پێک‌هاتوون و دەبنە هۆی ئەوەی کە ئینسان بێ‌گومان و بێ‌دوودڵی باوەڕ بکا بە مەقسوودی خۆی. ئەم ئیستیدلال و بورهانە بۆ ئەو زانایانە دەست دەدا کە دڵیان وەک شیر پالاوتووە و لە شتی بێگانە پاکیان کردووەتەوە، واتە ئەم زانایانە قسەی راست لە لار و شتی بەنرخ و بەکار لە شتی پووچ و نابار جیا ئەکەنەوە و، لە ئەنجامی ئەم ئیستیدلالە باوەڕ بە زات و سیفاتی پەروەردگار و بە پێغەمبەران و، بە هەر شتێ تر کە پێویست بێ باوەڕی پێ بکەن، پەیدا دەکەن.

سێهەم: ڕێگەی تەقلیدە واتە دواکەوتنی بیروباوەڕی ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پێ دەکرێ. جا زاناکانی ئایین لەم ئیمانە تەقلیدییەدا چەند بیروڕایەکیان هەیە:

یەکەم ئەوەیە کە ئیمانی تەقلیدی بێ‌سوودە بۆ دنیا و قیامەت، ئەم رایە نیسبەت دراوە لە شێخ (ابوالحسن)ی ئەشعەری(ر.خ).

دووەم ئەوەیە کە ئیمان و باوەڕی تەقلیدی بۆ دنیا و قیامەت بەسوودە و، دەبێتە هۆی رزگاریی خاوەنەکەی.

بەڵام بیری راست لەم شوێنەدا، هەر وەکو (تاج الدینی سوبوکی) فەرموویەتی، ئەوەیە کە تەقلید دوو جۆرە، یەکەم بریتییە لە دواکەوتنی بیروڕای خەڵک بێ‌ئەوەی کە خاوەن تەقلیدەکە جەزم و باوەڕێکی توندی بۆ پەیدا ببێ، بێ‌گومان ئەم جۆرە تەقلیدە سوودی نییە و بە ئیمان دانانرێ. دووەم بریتییە لە دواکەوتنی بیروڕای خەڵک و وەکو ئەوان ئیمان بهێنێ بەڵام بیروباوەڕێکی جازم و خاوەن هێزی ببێ و دوودڵی و گومانی لە دڵا نەمێنێ. ئەم جۆرە تەقلیدە بە راستی بەسوودە و جێگەی ئیعتیبارە و، کەس دژی نییە (ابو هاشم)ی موعتەزیلە نەبێ، ئەویش واتەکەی هەڵە و بێ‌قیمەتە. بەڵام ئەم موقەللیدانە ئەگەر وەکو خەڵکی هەڕەمە بتوانن ئیستیدلال بکەن و، هەر لەبەر تەمەڵی ئیستیدلال نەکەن ئەوە تاوانبارن؛ چونکە ئەم جۆرە ئینسانانە لەسەریان واجبە ئیستیدلال بکەن و ئیکتیفا نەکەن بە دواکەوتن و تەقلیدی خەڵک، بێ‌گومان

بەسیرەت و بەرچاورۆشنی بۆ ئینسانی هۆشیار لە هەموو مەبەستێکدا پێویستە بە تایبەتی لە ئیما-ندا.

بێدار بن: هەندێ لە زانایان فەرموویانە ئەو ئیستیدلالەی کە پێویستە بۆ هەرِ ەمەی موسوڵمانان ئەوەندەیە کە بەقەدەر پایە و شانی خۆیان بێ، واتە: ئەوەندە بزانێ کە باخێکی جـوانی رازاوە بـێ-گومان باغەوانێ بووە کە دارەکانی ناشتبێ و خزمەتی کردبێ تا پێ‌بگات، زەوی و کـەژ و کۆسـاری جوان، گیا و گوڵاڵەی هەمەرِەنگ، مانگ و رۆژ و ئەستێرەی خاوەن پرتەوی ئاسمـان، بـێ‌شـوبهە، یەکێ هەیە دروستی کردبن و، ئەم جیهانەی رازاندبێتەوە پێیان، ئیتـر پێویسـت نییـە لەسـەریان وەک ئەهلی (مەنتیق) و (فەلسەفە) کە فەرزی کیفایەیە لە هەموو مەسافەی دوو رۆژە رێگەیەکـدا لە وڵاتی ئیسلامدا کەسێکی وا ببێ بتوانێ بـەم شـێوە ئیسـتیدلال بکـات لەسـەر بـوونی خـودای (واجب‌الوجود) و باقی بیروباوەری موسوڵمانان، تا ببێ بە هۆی پاراستنی ئایینی ئیسلام لە شـوبهە و گومانی موخالیف و ناحەز. دیارە ئەو ئیستیدلالە کە بۆ هەرِەمەی ئادەمزادی وشیار بشێ هـەموو ئینسانێکی ژیر ئەتوانێ بیکات و ئاسانە و، کەس نییە ئەم جۆرە دەلیلەی لا نەبێ.

جارێکیان لە ئینسانێکی دەشتەکییان پرسی: دەلیلت چییە ئەم جیهانـە پـەروەردگاری هەیـە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: ئەم جیهانە وەکوو خانوویەکی پان و پڕ وایە، مانگ بە شـەودا و خـۆر بـە رۆژدا چرای خودان بۆ ئەم خانوویە، جا ئەگەر ئێوە لەماڵی خۆتاندا چرایـەکتان دیـوە کـە کـەس هەڵی‌نەگیرساندبێ ئەوا بڵێن خودا نییە، ئەگەرنا پێویستە بۆ ئـەم دوو چرایـە پـەروەردگارێ ببـێ هەڵی‌گیرساندبن.

لە زەلامێکی شارەزووری‌یان پرسی: دەلیلت چییە کە خودا یەکێکـە؟ وتی: دەلـیلم ئاشـەکەی (بێسان سوور) ە[١٦]، هەتا یەک ئاشەوانی بوو شەو و رِۆژی دە تـەغاری دەهـارِی، ئێسـتە کـە دوو ئاشەوانی هەیە یا ناگەرِێ یا کەم ئەهارِێ! ئیتر لە جیهاندا قەت نابینی ئینسـانێ ببـێ موسوڵـمان بێ و، دەلیلێکی عەوامانەی نەبێ لەسەر وجودی خالیق و پەروەردگار، مەگەر یەکێک شێت بێ یـا دەماخی ناساغ بێت، ئەوانەش جێگای تەکلیف نین، کـەوابوو لـەناو هوشـیاراندا موقەللیـدی رووت نییە. بێ‌گومان ئەگەر ئینسان بە راستی لەم قسە ورد بێتـەوە بـۆی دەردەکـەوێ کـە قسـەیەکی راست و رەوانە.

گفت‌وگۆی خیلاف هەس لە نەزەردا
لە سیوای ناسـین دانـای ئەکبـەردا

بەڵــێ لەوێــدا بشــنەو بــێ نیــزاع
وجووبی نــەزەر هەیــە بــە ئیجمــاع
(لکِــــن ذَلِــــکَ الوجـــــوبُ هنـــــا
عقــلاً لــدی بعــض، شــرعاً عنــدنا)

هەس: هەیە. بشنەو: ببیسە.

واتە: لە نێوان زانایانی عیلمی ئوسولدا ئیختیلاف هەیە لە پێویستیی بیرکردنەوە و تێفکـرینـدا بۆ ناسینی غەیری خودای گەورە؛ هەندێکیان ئەڵێن ئەم تێفکرینە پێویست نییـە؛ چونکـە دەبێتـە هۆی ئازاردانی نەفس بە بێسوود، هەندێکیش دەڵێن فکرکردنەوە پێویستە لەسـەر هەرکـەس بـە قەدەر حاڵی خۆی بیربکاتەوە بۆ ناسینی حەقائیق، بۆ جـێبـەجێ کـردنی هـۆی ژیـانێکی باشـتر؛ چونکە عـەقڵ و هـۆش لـە گـەورەترین نیعمـەتی خودایـە لەسـەر هـەموو ئـادەمزاد و، سوپاسـی نیعمەتیش واجبە، دیارە بەکارهێنانی عەقڵ و بیرکردنەوە بۆ وەرگرتنی ئاسار و تایبەتییەکانی کان و گژوگیا و گیانلەبەر بە سوپاسی نیعمەتی عەقڵ و هۆش دادەنرێ.

خودای گەورە فەرموویەتی: (هو الذی خلق لکم ما فی الارض جمیعـاً) [١٧] وە فەرموویـەتی: (و جعل لکم الارض ذلولاً فامشوا فی مناکبها و کلوا من رزقه) [١٨] لەسەر ئەمە پێویستە ئـادەمزاد بـە پێی توانا بە هۆی بیرکردنەوە لە شتەکان و بە هۆی بەراورد و لێکۆڵـینەوە ئاسـاری کـان و گیـا و گیانلەبەر بزانێ، لە ئەحواڵی دەریای گەورە و بچووک و لـە ئەحواڵـی هـەوا و هەڵـم و ئەحواڵـی ئەستێرە و مانگ و رۆژ تێبگات و، بە شوێنی هەموو شتێکی بەسووددا بگەڕێ، چ بـۆ ئـابووری و چ بۆ بەرگری و چ بۆ فێرکردن و خۆێنەوار کردن، یا رامکردنی گیانلەبەران بـۆ سـوودی گشـتی، یـا تەمێ و پەروەردەی نەفسی.

ئادەمزاد لە بەرەبەیانی مێژووەوە هەوڵی داوە و کۆششـی کـردووە بـۆ ئـەوەی کـە لـە هـەموو روویەکەوە پێش بکەوێ و توانیویەتی خۆی لە دوژمن بپارێزێ و بەسەریا زاڵ ببێ.

لەبەر رۆشنایی ئەم قسەیەدا زانایانی ئایینی ئیسلام زانـین و فێربـوونی هـەر پیشـەیەکیان کـە نرخی هەبێ بۆ ئادەمزاد بە فەرزی کیفایە داناوە و، لە گەڵێ کاتدا بە فەرزی عەینیان ژماردووە.

بێگومان هەرکەس لەسەر یاسای بیرکردنەوە بڕوات سەربەرز و بەختیارە و، سوودی نەبڕاوە بـۆ خۆی و هاونیشتمانانی و بۆ سەرجەمی بەرەی ئادەمزاد مسۆگەر دەکات، بە پێچەوانەوە هەرکـەس ڕێگای بیرکردنەوە نەگرێتە بەر ئەوە دوژمنایەتی لەگەڵ خۆی و لەگەڵ بەرەی ئادەمزاددا دەکـات

و، لای خودای گەورەش بێنرخە، چونکە بە پێچەوانەی ئەو رێ و شوێنە دەجوولێتەوە کە خودای گەورە بۆ بەرەی ئادەمزادی داناوە.

بیرکردنەوە بۆ ناسینی زات و سیفەتی خودا بـە ئیجمـاع واجبـە، لای ئـەهلی حـەق تـەنها بـە دەلیلی نەقلی، بەلام لای موعتەزیلە بە دەلیلی عەقلی و نەقلـی. جـا ئێمـە دوو رێگـەمان هەیـە: یەکەم ئیستیدلال ئەکەین بە زاهیری ئایەت و حەدیس، وەکو ئایەتی (فاعلم انه لا الـه الا الله) [١٩] وە ئایەتی (ان فی خلق السموات والأرض واختلاف الليـل و النهـار لآيـات لأولـی الالبـاب) [٢٠] وە ئایەتی (افلا ينظرون الیالإبل کيف خلقت، و الیالسماء کيف رفعت، و الیالجبـال کيـف نصـبت، و الیالأرض کيف سطحت) [٢١] وە ئایەتی (الم تر الی ربک کيف مَدَّ الظلَّ و لو شاء لجعله سـاکنا ثـم جعلنا الشمس عليه دليلا) [٢٢] و غەیری ئەمانـەیش. ئەمانـە هـەموو ئـادەمزادێکی هوشـیار بانـگ دەکەن بۆ خوداناسین، بۆ ئەوە ئاسار بکات بە دەلیل لەسەر (مـؤثر) و تێفکرێـت کـە ئەسـەر بـێ-موئەسسیر نابێت، موئەسسیریش بە بێ زیندوویی و زانسـت و خواسـت و توانـایی مـومکین نییـە ئاساری رێک و پێـک و نیزامـی لـێ پەیـدا ببـێ، کەواتـە بـە بـێگومـان پێویسـتە ئـەم جیهانـە پەروەردگارێکی (واجبالوجود)ی خاوەن کەمالی دوور لە کەم و کووڕیی هەبێ.

دووهەم: سەیرکردن و بیرکردنەوە و تێفکرین (مقدمه) و پلەیە بۆ گەیشتن بە (واجبـی مطلـق) کە ناسینی خودای گەورەیە، هەر شتێکیش (مقدمه) بێ بۆ (واجبی مطلق) و ئەو واجبە بە بێ ئـەو نەیەتە جێ واجبە، کەوابێ بیرکردنەوە و تێفکرین بـۆ ناسـینی (واجـبالوجـود) لەسـەر ئـادەمزاد واجبە.

شایانی باسە: ئێمە کە ئەڵێین بیرکردنەوە و تێفکرین بۆ ناسینی خودا واجبە مەبەسمان ئەوەیە هەرکەس توانای تێفکرینی هەبێ و نەیکا ئەوە تاوانبارە، مەبەسمان ئەوە نییە ئەگـەر تـێنـەفکرێ ئیمانی نابێ و بە کافر دەناسرێ؛ چونکە لە پێشەوە وتمان ئیمانی تەقلیدی بە شێوەی ئیعتیقـادی جازم دادەمەزرێ.

بەلام (معتزله) کان لایان وایە ئەگەرچی دەلیلـی نەقلـی ئـەوە دەگەیـەنێت کـە تێفکـرین لـە پێناوی ناسینی خودادا واجبە، لەگەڵ ئەوەشدا پێویسـتە بـەوە وازنـەهێنرێ و دەلیلـی عەقلیشـی بخرێتە پاڵ، ئەگەرنا رەهبەر ناتوانێ ئادەمزاد موکەللەف بکا بە خوداناسین و ناچـاری بکـا، چونکـە کاتێ کە وتی: ئەی ئادەمی بیربکەرەوە و تێفکرە بۆ ناسینی خـودا، بـە شـەرع ئـەم بیرکردنـەوە و تێفکرینە واجبە لە سەرت، ئەتوانێ بڵێ: من تێنـافکرم هـەتا تێفکـرین واجـب نـەبێ لـە سـەرم،

واجبیش نابێ لە سەرم هەتا خۆم تێنەفکرم، ئـەنجام وای لـێ دێـت: تـێنـافکرم تـا تـێنـەفکرم، ئەمەیش دەبێتە هۆی (توقف)ی تێفکـرین لەسـەر تێفکـرین خـۆی، واتـە: (دەور) کـە دەوریـش مەحاڵە و نابێ، کەواتە پێویستە لە رێگەی عەقڵەوە بۆی بڕۆین هەتا ناچار بـێ تێفکـرێ و رەهبـەر غاڵب ببێ بە سەریا.

ئێمە بە دوو جۆر ئەم دەلیلە رەد ئەکەینەوە، یەکەم: موعتەزیلەکان لە موقەددیمـەی دووەمـی دلیلەکەدا بە هەڵەدا چوون؛ ئەوە راستە کە «تێنافکرم هەتا تێفکرین واجب نەبێ» بەڵام ئـەوەیان هەڵەیە کە دەڵێت: «واجب نابێ لەسەرم تا خۆم تێنەفکرم» چونکە واجببوونی تێفکرین لەسـەر تێفکرینی ئەو رانەوەستاوە، بەڵکو عیلم بە واجبیەتی تێفکرین لەسـەر تێفکـرینی ئـەو راوەسـتاوە واتە: تێفکرین بۆ ناسینی خودا واجبە ئەو تێفکرێ یا نا.

خۆ ئەگەر یەکێ بڵێت ئەم قسەیە ئەوە دەگەیـەنێت کـە تـەکلیف لـە غـافڵ بکرێـت ئـەوەیش مەحاڵە، لە وەڵامدا دەڵێین غافڵ ئەو کەسەیە مەعنای تەکلیف تەسەوور نەکات و نەفامێ تەکلیف چییە و بە چێ ئەڵێن، نەک کەسێک کە باوەڕی بەوە نەبێ کە خۆی موکەللەفە.

دووەم: بە موعتەزیلییەکە دەڵێین ئـەم دەورە کـە ئێـوە دەیڵـێن لەسـەر قسـەی ئێـوەش بـە وجووبی عەقلی هەر دێتە جێ، چونکە واجببوونی تێفکرین بەدیهی نییە، واتە: کابرای موکەللەف ئەتوانێ بڵێ من تێنافکرم هەتا بە عەقڵ واجب نەبێ، واجبیش نابێ بـە عـەقڵ هـەتا تـێنـەفکرم، کەوابوو چار هەر ئەوەیە بڵێین واجبیەتی تێفکرین لەسەر تێفکـرین رانەوەسـتاوە، بەڵـکو زانـینی واجبیەتەکە لەسەر تێفکرین راوستاوە، بەمەش موشکیلەکە چارەدەکرێ.

***

١ـ ئەم سەرباسە لە نوسخە دەستنووسەکەدا نییە، تەنها لە نوسخە چاپەکەدا هەیە.

٢ـ لە دەستنووسەکەدا (ضرورت = زەروورەت) ە، هی چاپەکە (ضەروریچ)ە.

٣ـ ئایەتی (١٤٦) سوورەتی (بقرە).

٤ـ صحیح مسلم بشرح النووی جـ ١ ط ١ ص ١٥٧ / المطبعة المصریة بالازهر، ١٣٤٧هـ ١٩٢٩ م.

٥ـ کتێبی (العقائد النسفیة) هی (نجم الدین ابو حفص عمـر)ی نەسـەفیی سـەمەرقەندییە٥٣٧-٤٦١ی‌ک ئـەم کتێبە سەعدی تەفتازانی شەرحی لێ کردووە.

٦ـ لە چاپەکەدا (موجمەل) ە، (بە) کەی نییە.

٧ـ ئایەتی (٩) سوورەتی (حجرات).

٨ـ ئایەتی (١٠٦) سوورەتی (نحل).

٩ـ ئایەتی (٢٢) سوورەتی (مجادله).

١٠ـ ئایەتی (١٤) سوورەتی (حجرات).

١١ـ الجامع الصحيح، و هو سنن الترمذي، تحقيق ابراهيم عطوة عوض الجزء الرابع ط ١ ص ۴۴۸، شركة مكتبة و مطبعة مصطفى البابي الحلبي و اولاده بمصر سنة ۱۹۶۲.

١٢ـ تەناسوبێکی وردە کۆکردنەوەی (باری) و (هەور) و (باد) و (سەوزە) و (سەراو). شایانی باسە: لە چاپەکەدا لەباتی (بەو ئەسباوەسە) نووسراوە (بەو ئاسیاوەسە). ئاسیاو واتە: ئاش، زۆر دوورە، هی دەستنووسەکە راستە.

١٣ـ چاپەکە دەڵێت: فەزلێکی.

١٤ـ ئایەتی (١٣٦) سوورەتی (نساء).

١٥ـ ئەحمەدی کوری مووسای کوڕی شمس‌الدینی خەیالی، سالی ٨٦٢ ی کۆچی وەفاتی کردووە و ئەم زانایە (حاشیە)ی لە شەرحی عەقائیدی نەسەفییە کردووە، عەقایدەکە هی نەسەفییە و شەرحەکەی هی سەعدی تەفتازانی‌یە.

١٦ـ «بێسان‌سوور» دێیەکە سەر بە ناحیەی عەربەتی سەر بە پارێزگای سلێمانییە.

١٧ـ ئایەتی (٢٩) سوورەتی (بقره).

١٨ـ ئایەتی (١٥) سوورەتی (ملک).

١٩ـ ئایەتی (١٩) سوورەتی (محمد).

٢٠ـ ئایەتی (١٩٠) سوورەتی (آل عمران).

٢١ـ ئایەتی (٢٠-١٧) سوورەتی (غاشیە).

٢٢ـ ئایەتی (٤٥) سوورەتی (فرقان).

## مبحث الوجود والوجوب [1]

نـــەزەر (عــادةً) مەعریفــەت دەدات
تەسدیق بە وجوود بە وجووبی زات
بە سیفاتی پاک سەلبی و ســبووتی
بە قەدەر تاقەت قــووەی ناســووتی
هیچ بە موعەللیم حاجەت ناکەوێ
ئەگەرچی بە ئـەو ئاسـان‌تـر دەوێ

لەم شوێنەدا چەند باسێک هەیە، یەکەم: (نظر) لە عورفی زانایانی ئوسوولدا سرنجدانە لە شـتی زانراو بۆ زانینی شتی نەزانراو، جا ئەگەر زانراوەکە (تصوّری) بێ ئەوە دەبێتـە هـۆی زانـینی شـتی (تصوّری) وەک (تعریف) کە دەبێتە هۆی ناسینی (معرَّف) بۆ نموونە: بە (الحیوان الناطق) ئینسان ئەزانرێ، خۆ ئەگەر زانراوەکە (تصدیقی) بێ ئەوە دەبێتە هۆی زانینی نـەزانراوی (تصـدیقی) وەک دەلیل کە دەبێتە هۆی زانینی (نتیجە) بۆ نموونە دەڵێین: (کسب العلوم مهـم و کـل مهـم لائـق بالجهد، فکسب العلوم لائق بالجهد).

دووەم: کە دەڵێت «نەظەر (عـادةً) مەعریفـەت دەدات» بەرپـەرچی قســەی ئەوکەسـانەیە کـە وتوویانە (نظر) لە عەقلییاتدا سوودی نییە و نەزانراوی پێ نازانرێ، تەنها لـە (حسّـیّات)دا سـوودی هەیە. هەروەها ڕەددی قسەی ئەو کەسانەیشە کـە وتوویانـە (نظـر) لـە عەقلییاتـدا بەسـوودە بـە مەرجێک لە ئیلاهییاتدا نەبێت وەکو باسی زات و سیفاتی خـودای گـەورە، چونکـە لەبـەر زۆریـی جیاوازیی بیروڕا و ناکۆکیی بێ‌ئەندازەیان سوودی نابێ. دیسان ڕەددی قسەی ئەو کەسانەیشە کـە وتوویانە (نظر) لە عەقلیاتی ئیلاهی‌دا سوودی هەیە، بەڵام بەو مەرجە مورشید ئەو نەزەرە بکات یـا لە ژێر چاودێریی ئەودا بێ، چونکە هەر مورشیدی مەعسووم ڕێگەی نەزەر و ئیستیدلال ئەزانێ.

پوختەی قسەو ڕەدکردنەوەی قسەی موخالیفەکان ئەمەیە: کە (نظر) واتە تەعریف و دەلیل لە هەموو شتێکدا قازانجی هەیە و بەسوودە، چ لە حسییاتدا بێ یا لە عەقلییاتدا، عەقلییاتی ئیلاهی بێ یا غەیرە ئیلاهی، مورشیدی لەگەڵ بێ یا بێمورشید بێ. سوود و قازانجی تێفکرین و بیرکردنەوە بۆ زانینی شتی نەزانراو شتێکی بەدیهی و ئاشکرایە. بێگومان هەرکەس تەماشای حالی خۆی بکات کە لە نەزانینەوە سەر ئەکەوێ بۆ زانین، چ لە مەحسووسات و چ لە مەعقوولات، ئیلاهییات یا غەیری ئیلاهییات، بەیارمەتی بێ یا بێیارمەتی، بۆی ڕوون دەبێتەوە کە موخالیفەکان هەموویان بەهەڵەدا چوون، ئیتر جیاوازیی بیروڕا نابێتە بەڵگەی بێسوودیی تێفکرین، چونکە زۆربەی ئەو جیاوازیی بیروڕایانە لە بێشعووری و نەخۆشیی هۆشی خاوەنەکانیانە. ئینسان کە نەخۆش کەوت دەمی تاڵ ئەبێت و شتی شیرین لە دەمیا تاڵە، یا یەکێ گێژ بێ وادەزانێ دنیا بە دەوریا هەڵدەسووڕێ، ئایا ئەم گومانە فاسیدانە ئەبن بە هۆی ئەوەی کە هێزی چەشتن و دیتن لە جیهاندا نەبێ، بێجگە لەوەیش زۆربەی جیاوازیی بیروڕا لە سەرسەختی و دوژمنایەتی و تەقلید و تەعەسسوبەوە پەیدا دەبێ. تەماشاکەن ڕەهبەرانی ئایینی فریشتەخوو چ جۆرە یاسایەکی هێمن و ئارامیان هێنا بۆ ئادەمزاد، هەروەها موجتەهیدە پاکدڵەکان چەند حوکمیان دەرخست بۆ پیرۆزیی و بەختیاریی بەرەی ئادەمزاد، زانا هوشیارەکان چەند شتیان داهێنا و چەند نهێنی و تایبەتییەکانی کان و گیا و گیانلەبەر و غاز و هەوا و فەزایان دۆزییەوە، ئەم هوشیارانە لەگەڵ ئەم دۆزینەوانە، لەگەڵ ئەم هەمووە داهێنانانە ڕێگەیان بەوە بردووە کە دەبێ ئەم جیهانە پەروەردگارێکی (واجب‌الوجود)ی هەمیشەیی بێسنووری هەبێ.

داوای مورشیدکردن بۆ ئەم ئیفادە و ئیستیفادەیە هەرچەند موافیق بێ بۆ ئاسانیی سلووک؛ بەلام بە شێوەی وجووب نییە، ئەگەرنا ئەی مورشیدی یەکەم لە کێ ئەو عیلمەی وەرگرت؟ ئەگەر ئەڵێیت لە عەقڵ و هۆشی خۆیەوە ئەوا خەڵکیتریش عەقڵ و هۆشی هەیە، خۆ ئەگەر ئەڵێیت ئیلهامی پەروەردگارە ئەوا پەروەردگار ئامادە و پایەدارە، بێجگە لەمەیش ئەو مورشیدە کە دەڵێت من مەعسوومم ئەبێ موعجیزە و بورهانی هەبێ، ئەو موعجیزە و بورهانە دەبێتە دەلیل لەسەر ڕاستیی ئەو، کەوابێ هەر بورهان و دەلیل لە نەزەریاتدا بەکار و بەسوودە.

سێهەم: لەفزی (عادةً) لە بەیتەکەدا مەعنای وایە کە لە بەینی تێفکرین و زانینی ئەوەی دەمانەوێ، واتە لە بەینی زانینی دەلیل و زانینی نەتیجەدا (لزومی عادی) هەیە، واتە: خودای گەورە وای کردووە بە عادەت کە پاش ئەوەی زانینی دەلیلی لە دڵی خاوەن دەلیلدا دروست کرد

بێدرێژەکێشان زانینی نەتیجەیش لە دڵیا دروست دەکات، ئەگەرچی مومکینیشە ئەم زانینی نەتیجەیە دروست نەکات، ئەم رایە دراوەتە پاڵ شێخ (ابوالحسن)ی ئەشعەری (ر.خ). ئەم زاتە رای وایە هەر شتێ پەیدا ببێ یەکسەر و بە بێواسیتەی (فی التأثیر) نیسبەت دەدرێ لە خودای گەورە، خودا موختارە و ئارەزووی بە دەستی خۆیەتی لە دروستکردنی هەر مومکینێ لە مومکینات و، هەرگیز (وجوب) روو ناکاتە زاتی خودای گەورە.

هەروەها بەرامبەر ئەم رایەی (ابوالحسن)ی ئەشعەری سێ رای تر هەیە:

رای موعتەزیلە، رای حوکەما، رای ئیمام (فخرالدین)ی رازی.

بیروڕای موعتەزیلەکان ئەوەیە کە لە بەینی ئەو دوو زانینەدا لزوومی تەولیدی هەیە، واتە ئادەمزاد خۆی بە زات و سیفەتیەوە دروستکراوی خودایە، بەڵام کردەوە ئیختیارییەکانی وەکو هەڵسان و دانیشتن و جموجووڵ و ئارامگرتن ئادەمزاد خۆی دروستیان دەکات، خۆی هەڵئەستێ و خۆی دادەنیشێ و، ئەم کردەوانە کردەوەی (بالمباشرە) ن و، هەر کارێ لەمانەوە پەیدا ببێ پێی ئەڵێن کردەوەی (تولیدی). بۆ نموونە لە هەستانەوەدا سەری بدا لە دارێک و دارەکە بکەوێتە سەر شتێکی تر و بیشکێنێ، بەم کەوتن و شکاندنە دەڵێن کاری تەولیدی، بەمجۆرە موعتەزیلەکان ئەڵێن عەبد خۆی راستەوخۆ تێدەفکرێ و واتە دوو موقەددیمەی دەلیلەکە رێک دەخات و، لەم کارەوە کە راستەوخۆ و موباشیر کردوویە زانینی نەتیجە واجبە پەیدا ببێ و مەحاڵە ئەو زانینە پەیدا نەبێ.

حوکەما دەڵێن لەبەینی ئەم دوو زانینەدا لزوومی ئیعدادی هەیە، واتە: کاتێ کە خودای گەورە زانینی دوو موقەددیمەکە لە ئادەمزاددا دروست دەکا ئەو زانینە هۆشی ئادەمزادەکە ئامادە دەکات بۆ زانینی نەتیجەکە و، واجبە ئەم زانینە دروست بکات؛ ئەگەرنا دەبێتە بەخیلی و رژدی و، بەخیلی و رژدیش بۆ خودای گەورە مەحاڵە و نەبووە و نابێت.

بەڵام بە لای ئیمام (فخرالدین)ی رازییەوە[٢] لە بەینی ئەم دوو زانینەدا لزوومی عەقلی هەیە، واتە: زانینی نەتیجە لازمی زانینی دوو موقەددیمەکەیە و بە قەتعی دەبێ ببێ، ئەگەرچی هەردوو زانینەکە خودای گەورە (بالذات) دروستی کردوون، واتە: بە بێ ئەوەی کە زانینی یەکەم هۆ بێ بۆ زانینی دووەم، چونکە خودای گەورە ئیرادەی بوونی مەلزووم و لازمەکەی بەیەکەوە کردووە و، لەوکاتەدا ئیرادەی دروستکردنی جەوهەرێکی کردووە ئیرادەی دروستکردنی عەرەزەکانیشی کردووە و، خودا (بالذات) موختارە لە دروستکردنی هەردوو لایاندا.

ئـەو دوو یاسـا کـە مەشـهووره لای ئەشـعەری ئیعتیبـار کـراون یەکـەم: خـودا موختـاره لـە دروست‌کردنی هەموو شتێکی مومکین و بوودەنی‌دا و، هەموو دروست‌کراوێکی خودایش یەکسـەر و بێ‌واسیتە نیسبەت ئەدرێ بۆ لای خودای گـەوره، واتـە: هـەرچی (سـبب) ەکـانی پەیـدابوونی شتەکان هەن هەموو ئیرادەکراون وە هەموو (مسبب) ەکانیش ئیرادەکراون و، هەر کاتێ بێنـەجێ هەردوویان وەکوو یەک (بالذات) نیسبەت لە خودای گەوره دەدرێن.

دوو شت هەن کە لای ئەشـعەری موعتەبـەرن و بـاوەڕ پێکـراون، یەکـەم: خـودا موختـاره لـە دروست‌کردنی هەموو مومکینێک‌دا. دووەم: هەموو دروست‌کراوێ یەکسەر و بێ‌واسـیتە نیسـبەت دەدرێ لە خودای گەوره، واتە: هەرچی ئەسـباب و موسـەببەباتە هـەموویان خواسـت و ئـیرادەی خودایان لەسەره و، هەر کاتێ بێنەجێ هەردووکیان وەکوو یەک لە خودا نیسبەت دەدرێن.

(فخرالدین)ی رازی ئەم رای ئەشعەرییەی گێڕاوەتەوە بۆ سەر راکەی خـۆی چونکـە رەوا نییـە ئینکاری پێوەندی بکرێ لە نێوان ئەو شتانەدا کە خودا وەهای دروست کردوون کە بە یەکەوە بن. وەک جەوهـەر و عـەرەز، وەک زانـینی دوو موقەددیمـە و نەتیجـە. ئیسـماعیلی گەلەنبـەوی لـە حاشیەی عەقائیدی جـەلالی دەووانیـدا ئەڵـێت: ئـەم مەزهـەبی رازییـە راسـتەقینەی مەزهـەبی ئەشعەرییە.

روتبـــەی ئەووەڵـــیچ ئەوەنـــد ئەعلایـــە
دەســـی ئـــارەزووی مـــن لێـــی کۆتایـــە
چ یـــارای روتبـــەی کەشـــف و حالـــیمە
تەمـــەننای روتبـــەی ئیســـتیدلالیمە
بەڵـــکم هەڵـــکەوێ لـــە زەمانیـــــدا
ســـەرپەنجەی عەقڵـــم وە بورهانیـــدا
بـەو هەوڵـکەوتنە (مەعـدووم) راجییـە:
هـــەوای دا ئـــەناو فیرقـــەی ناجییـــە
هـــەر هەفتادوســـێ گشـــت وا لـــە ئـــاردا
لـــە رووی عەقیـــدە ئـــەو وا لـــە کـــاردا
(علمـــاً، عمـــلاً) موخـــالیف نـــاون،
لەسەر رەویەی پاک نـەبی و ئەسـحاون

روتبە: پایە. ئەووەڵیچ: ئەووەڵیش. دەس: دەست. کۆتا: کـورت. یـارا: توانـا، هێـز، ئازایـەتی. هەوای دا: فڕێی دا. ئەناو: بۆ ناو. فیرقە: کۆمـەڵ. ناجییـە: رزگـار. ئـار: ئـاگر. مەعـدووم: نـەبوو، نازناوی حەزرەتی (مەولەوی) یە.

واتە: پایەی ئیمانی کەشفی ئەوەندە بەرزە دەستی ئارەزووی منی پێی ناگـا، مـن توانـای ئـەم پایەم نییە و شایانی نیم، تەنیا ئارەزووی پایەی ئیستیدلالیم هەیە، بەڵکو بـە هـۆی ئیسـتیدلالەوە سەرپەنجەی عەقڵم هەڵکەوێ لـە دەلیلێکـی بورهـانی، ئـەنجا بـەو هەڵـکەوتنە مەعـدووم (واتـە مەولەوی) هیوا و ئارەزووی ئەوەیە فڕەی بدا بـۆ نـاو ئـەو کۆمەڵـە کـە مەشـهوورن بـە (فیرقـەی ناجییە)، واتە کۆمەڵی رزگار بـوو لـە ئـاگری دۆزەخ کـە کۆمەڵـێکن لـە بـیر و بـاوەڕ و ئومـووری ئیعتیقادیدا لەسەر حەقن و پەیڕەوی رێگای حەزرەتی (محمد المصطفی) ن، دروودی خودای لـێ بێ، هەروەها بە رێگای یارانی پێغەمبەردا دەڕۆن.

لە چوار کتێبی (سحاح)دا بە ئیسناد ریوایەت کراوە لە (ابن عمر) ەوە، خودایـان لـێ رازی بـێ، کە حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی (...و ان بنی اسرائیل تفرقت علی اثنتین و سبعین ملـة، و تفتـرق أمتی علی ثلالث و سبعین ملّة، کلّهم فی النار الا ملّةً واحدة قالوا و من هی یا رسولَ الله! قـال: مـا انا علیه و اصحابی) [٣].

روتبەی ئیستیدلال وەختی هاتە بەین
بـا وەقـەد تاقـەت نەقڵـێکی بکـەین
لە ئەنفاسی پـاک ئەئیمـەی ئـەعلام
لە گـرۆی ئەشـرەف تائیفـەی کـەلام
گوڵـچنم جـارێ، جـارێ خۆشـەیێ،
برسـیم، لـە هـەرلا تێـرم تۆشـەیێ
مـوورێکم سـاکین زەیقـەت خانـەیێ
دەکێشـم لـە هـەر خەرمـەن دانـەیێ
لـە دووی ئەنفاسـم، (و لا سـیّما)
ئەنفاسی ئەنفوس [٤] قودسـیی ئـەولیا
(خصوصـا منـهم شـیوخ الارشـاد)
حـەق بەرەکـەتیان زیـاد کـا زیـاد

بێ ئەوان نـاوێ، بـە قـەولی فحـوول،
نە عیلم و عەمەل، نە روتبەی وصـوول
مونتـــەهای علـــووم عیلمـــی ئەوانـــە
موقتـــەدای عەمـــەل ئـــەوان بزانـــە

گرۆ - گرۆە، کۆمەڵ. گوڵچن: ئەو کەسەیە لە پـاش درەو هـەر گوڵـێ کـەوتبێ هەڵـیدەگرێ. جارێ: کەڕەتێ. جاڕێ: هەر جاڕە گەنمێ. خۆشە: گوڵێکە دانەی تێدابێ. تۆشە: زاد بۆ خـواردن. مووری: مێرووڵەیێ. زەیقەت[ضیقت]خانە: خـانووی تـەنگ. خەرمـەن: خـەرمان. لـە دووی: لـە شوێن.

واتە: کە باسی پایەی ئیمانی ئیستیدلالی هاتە بەینەوە بـا بەقـەد توانـای خۆمـان قسـەی لـێ بکەین و لـە زمـانی ئـەو پێشـەوایانەوە بیگێڕینـەوە کـە خـاوەنی دەروونی پـاکن و لـە کۆمەڵـی گەورەکانی عیلمی کەلامن، من وام بـە دوای ئەوانـەوە وەک گەدایـەک گولـۆچنی بکـا لـە دوای خاوەن زەراعەتەوە، لە هەر جاڕە گەنمێکدا بۆم رێک بکەوێ گوڵێ هەڵـئەگرم، برسـیمە لـە هـەر لایە بۆم رێک بکەوێ تۆشەیەک وەرئەگرم، مێرووڵەیەکم لە یانەیەکی تەنگـدام و بـە خەرمانـەکانا دەگەڕێم و لە هەر خەرمانێ دانەیێ بۆ خۆم رادەکێشم، کەوتوومەتە شوێنی ئـەو خـاوەن نفووسـە پاکانە کە قازانجیان بۆ هاوڕێیانیان هەیە؛ بەتایبەتی مەشـایخی ئیرشـاد؛ خـودا بەرەکـەتیان زیـاد بکات، کە بە پێی قسەی زانایان بە بێئەوان هیچ بۆ کەس پەیدا نابـێ نـە عیلمـی بـەسـوود و نـە عەمەلی جوان، نە پایەی گەیشتن بە نووری حەق، ئاخر پلەی زانسـت زانسـتی ئەوانـە، پێشـەوای خاوەن کردەوەی شیاوی حزووری بارەگای خودای گەورە ئەوانن.

عیلمـی ئـەفواهی و قـالی و ئیسـتیدلال
عیلمی ئیلاهی و کەشفی و زەوقی و حال
عەمـەلی خودسـەر دەگەڵـی ئوسـتاد
(کَیـف اسْـتَوَیا یـا أهـل الرشـاد؟!)
بۆ جۆگـەی عـیلم و بـۆ نەقـدی عەمـەل
مەنبـەع و کـانن ئـەولیای کوممـەل [۵]
لـەویوە نـەوێ جۆگـە هـەر لێڵـە
نەقـدی کـان نـەوێ لـە رەواج وێڵـە

ئیسباتی مەتڵەب، سەد لێـت زەحمەتـە،
ئـــاخر هـــەر موحتـــاج وە کەرامەتـــە
نـــــەبی و مـــــوعجیزە وا رابگــــــردن
مـــاوە تەشـــەببوس بـــە وەلی کـــردن

رابگردن: رابووردن، ڕۆیشتن.

مەولەوی لە پێشەوە فەرمووی: بە بێئیرشادی ئەولیا و بە بێپاککردنەوەی دەروون بە تەمێ و تەربیەی ئەوان زانستی بەسوود و کردەوەی پەسەند نایێتە جێ. وا لێـرەش بـەم دوو شـیعرە کـە ئەڵێ: «عیلمی ئەفواهی...تاد» ئەو باسە پێشووە دووباد دەکاتەوە، واتە: زانسـتێ کـە لـە مامۆسـتا وەربگیرێ، چ نەقڵی بێ بە شێوەی (قال فلان) یا بە شێوەی دەعوا و دەلیـل بـێ لەگـەڵ زانسـتی خـودایی و شـێوەی ڕێگـای کەشـفی دەروونی و زەوق و حـاڵدا زۆر جیـاوازن، هـەروەها کـاری سەربەخۆ هەرگیز هاوسان نابێت لەگەڵ کارێکدا کە لە ژێر چاودێری مامۆسـتای ڕۆحیـدا ئـەنجام بدرێ. هەروەها دوو شیعری پاش ئەوان کە دەڵێت: «بۆ جۆگەی عیلم و بۆ نەقدی عەمەل...تـاد» هێز دەدەن بە مەعنای دوو شیعرە پێشووەکە، واتە: دۆستەکانی خودا سەرچاوەی زانستی ڕاسـتن و، کانی نەقدی کردارەکانن، ئەو جۆگەی زانستە کە لەو سەرچاوەوە نـەبێ هـەرگیز سـاف نابـێ و لێڵە، ئەو نەقدەی لە کانی ئەوانەوە نەبێ بێڕەواجە و نرخی نییە.

لە دواییدا دەفەرموێ: ئیسباتی مەتڵەب، کـە بریتییـە لـە بـوونی خـودای (واجـبالوجـود) و سیفاتی سەلبی و سبووتی، پێویستی هەیە بە کەراماتی ئەولیا هەتا بـە شـێوەیەکی ڕۆحـی وەری-بگرین، چونکە لە زەمانی حەزرەتی ڕەهبەردا ئەو حەقائیقە کـە ئـەو دەیگەیانـدن بـە ئۆمـەت بـە موعجیزە سابت دەبوون، ئێستە کە زەمانی ئەوان نەماوە ئێمـە موحتـاجین بـە کـەراماتی (أولیـاء الله).

خەڵـقم زەحمـەتدا، بـووگم بـێئـەدەب
با بـەس بـێ، چاکـە بێمـە سـەر مەتڵـەب
هیممـــــەتی (ابوالوفـــا) وەفـــای کـــرد
ئـەم خدمەتییـە بـە مـن جـێ ئـاورد،
وەرنـــە مـــن و عـــیلم بـــەم گرانییـــە؟!
فـــەهمی بـــێچـــارە بـــەم نەزانییـــە؟!

خـــاتر لـــە تـــەعیین مەبـــدەء فـــەرامۆش
لە سەدای تەشـخیس خاتیمـە بـێ‌گـۆش
عەسری قوولەقوول خـەم لـە گـەردەلوول
دڵ دوور لە مەدلوول، مەحەببەت عەجوول
وتی: بـــۆ تـــەعیین پـــەکت ناکـــەوێ
(فـــیض رحمـــان بـــۆی و مبـــدء دوێ)
تـــەعیینی مەبـــدەء بـــە گوێتـــەدا چـــوو
خاتیمـــەیچ بـــزان وەختـــێ (فـــارغ) بـــوو
دڵ لـەم موژدەیـە عیجـزی چـوو لـە بـیر
لـــە مەقســـوودەدا هاتـــەوە تـــەقریر

(ابوالوفا) کونیەی پایەبەرز (حـاجی شـێخ عبـدالرحمانی)ی کـوڕی پایەبـەرز شـێخ عوسمـانی (سراج‌الدین)ی تەوێڵەیی‌یە، خوای گەورە لێیان رازی بێ. ئەم زاتە لە ئیرشاد و رووناک‌کردنـەوەی دڵی موریدان‌دا شوێنێکی بەرز و دیاری بووە، دووەم کوڕی بـاوکی بـووە، لەگـەڵ پایەبـەرز شـێخ (محمد بهاءالدین)دا کە یەکەم کوڕی شێخی (سراج الدین)ە بە وەسیەتی باوکیـان ڕێگایـان دراوە لەسەر ڕێبازی نەقشبەندی ئیرشادی موسوڵـمانان بکـەن، هـەروەها لـە زانیارییـە ئـاینیی‌یەکانـدا دەستێکی بالای هەبووە، دیوانێکی هەیە. لەگەڵ (مەولەوی) دا، کـە خـاوەنی ئـەم (عەقیـدە) یـە، دۆستایەتی و پێوەندییەکی ئێجگار توندی هـەبووە. ئـەم زاتـە سالـی (١٢٥١)ی کـۆچی لـە دێـی (بیارە) کە تابیعی قەزای هەڵەبجەیە لە پارێزگـای سـلێمانی لـە دایـک بـووە و سالـی (١٢٨٤)ی کۆچی لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانە بچوکەکەی دراوسێی گڵکۆی پایەبـەرز (عبدالقادر)ی گەیلانی بە خاک سپێردراوە (طیّب الله ثراهم و جعل الجنة مثواهم).

مەولەوی ئەفەرموێ هیممەتی (ابوالوفا) وەفای کرد و میهرەبانیی خۆی پیشان دا و ئەم کـارەی پێ جێبەجێ کردم، ئەگینا من و عیلم بەم گرانییە و، فامی خامی مـن بـەم بـاری نەزانییـەوە، چ یارایەکی کتێب‌دانانم هەیە؟

منێ کە ئاگام لە سەروبنی خۆم نییە و خۆم ناناسم، لە حاڵێکا بـووم نەمئـەزانی کـەی بـۆم ڕێ ئەکەوێ دەست بەم کارە بکەم و بۆ کەی لێی ئەبمەوە.

لە حاڵێکا کە زەمانە پڕە لە هەرا و ئاژاوە و قوولەقوول و قسەی بێسەروبەر، خەم و خەفەت لـە هەموو لایەکەوە گەردەلوول ئەکا و لە تۆزی خۆیا خنکاندوویەنی، دڵ هیچ مەعنا و مەبەستێکی تیـا نییــە و لــە هــەموو تێگەیشــتنێ دوورە...لــە حاڵــێکی وادا بــوو خۆشەویســتیی (ابوالوفــا) و ئارەزوونــەکردنی قســە دانــە دواوە و دڵشــکاندنی پێــی وتم بــۆ دیــاریکــردنی ســەرەتای دەستپێکردنی کارەکە هیچ دانامێنی و پەکت ناکـەوێ و (فـیض رحمـان بـوی و مبـدء دوی) و بەرەکەتی خوا ئەبێ بە سەرەتای کار و، کە سـەرەتای کـارت زانی هـەر ئەوەنـدەیش دەزانی لـێ بوویتەوە. ئیتر دڵ بە بیستنی ئەم مژدەیە نەتواناییی خۆی لە بیر چووەوە و دەسـتی کـردەوە بـە تەقریرکردنی مەتڵەبەکەی کە نووسینی کتێبەکەیە.

ئەم رستەی (فیض رحمان بوی و مبدء دوی) بـە حیسـابی جومـەل ئەکاتـە ١٢٨٠ کـە ساڵـی دەستپێکردنی کتێبەکەیە بە ساڵی هیجری، وەک چۆن وشەی (فـارغ) یـش کـە ئەکاتـە ١٢٨١ ساڵی لێبوونەوەی ئەگرێتەوە. واتە خۆشەویستی (ابوالوفا) مژدەی ئەوەی دامێ کە بـە ساڵـێ لـە کارەکە ئەبمەوە.

ئەوەیشمان لەبیرنەچێ کە وشەی (رحمان) هەروەک ناوی خوای گەورەیە، ئیشارەتێکیشی بـۆ ناوی (عبدالرحمن ابوالوفا) تیایە.

ئاســار مووســیلە بــۆ لای چشــتی دوور
ئیســتیدلال جیهــەت مەجهوولــە زەروور
حەق، بێژە، کەی بوو مەجهوول و مەفقوود
(تعــــالی عنــــە، واجــــبالوجــــود)
دەلیل بوو لەسەر بـوونی کـەون و، کـەون
لەســەر ئــەو دەلیــل، (بینهمــا بَــوْن) !!
عەقیــدە جگــێ و دەلیــل جگێیــە
دەلیلــی فــەقیر دارینــە پێیــە
بەڵ بۆ قەبز و بەسـت زیهـن و قوولـەقوول
(أقــــول: کــــذا قــــرّر الفحــــول)

جگێ: جیا. جگێیە: جیایە. دارینە پێ: پێی دارینی دەستکرد و بێهێز.

(مەولـەوی) خـودای لـێ رازی بـێ، بـە هـۆی رووناکیی دڵـیەوە و، بـە پیرۆزیـی هاوڕێیـەتی دۆستەکانی خواوە و بە هۆی بەشداربوونی لە نووری ئیمانی کەشفی و زەوقی رۆحـی و، بـە هـۆی نوقم بوونی لە نێو ورشەی نووری خوداییدا ئەڵێت: هەی هاوار! ئـەم خەڵـکە چـۆن داوای دەلیـل لەسەر بوونی خودای گەورە ئەکەن کەچی دەلیل هێنانەوە بۆ ئەوەیە کە ئینسان شتێکی نادیـاری و نەزانراو بزانێ و، شتێکی نادیار پەیدا بکات و بیدۆزێتەوە؟! خۆتـان و ئینسـافتان خـودای گـەورە کەی نەزانراو بووە هەتا بە هۆی دەلیلەوە بزانرێت؟ کەی ون بووە تا بگەڕێن بە شـوێنیا، بـە ئاسـار دەلیـل هێنانـەوە بـۆ ئەوەیـە کـە ئینسـان شـتێکی دوور لـە بـیر و هـۆش بزانـێ و بدۆزێتـەوە. پەروەردگاری جیهان، دروستکەری لەش و گیان و ئەرز و ئاسمان، پەروەرندەی نەفسـی ئینسـان کەی لە عەقڵەوە دوور بووە هەتا بە هۆی دەلیل و بەڵگەوە پێـی بگـەین؟ ئـەو خـۆی مەشخەڵـی نووری بوونی دڵی دڵدارانە، ئەو خۆی چرای رووناکیی جیهانە و، هۆی دۆزینەوەی هەموو شـتێکی نادیاری و پەنهانە، ئەو خۆی دەلیلی داماوان و بێدەستەلاتانە، لەسەر بوونی هەرچی بووانە، هـۆی چارکردنی گیر و گرفتەکانە، ئێستە تۆ بێی مادە و خەوش و خاڵ بکەی بـە بەڵـگە لەسـەر بـوونی ئەو، چەنی بە چەنە؟! ماوە لە بەینی ئەم دوو دەلیلەدا؛ خودای گەورە و مادده؛ زۆر دوورە، (تعـالی الله عن المجهولیة والمفقودیة ذات واجبالوجود المشهود لکل شاهد مسـعود، و هـو الـدلیل لکـل مدلول فلا یکون ذاته تعالی مدلولاً الا لعقل معلول).

مەبەستی (مەولەوی) ئەوەیە خودای گەورە، چونکە (واجـبالوجـود)ە و، هـۆی بـوونی هـەموو بوویەکە و، هەرچی هەیە ئەنجام و بەری پرتەوی خواست و ئارەزووی ئـەوە، هـەر خـودا جێگـەی ئیعتیبارە، هەر ئەو بەڵگەی ئاسارە، واتە: ئـەو هـۆی بـوونی ئـەرز و ئاسمانـە، هـۆی ژیـانی دڵ و گیانە... لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا ئێمە بێین جیهان بکەین بە بەڵـگە و دەلیـل لەسـەر بـوونی زاتی پاکی ئەو؟! ئەم دوو شێوە فەرقیان زۆرە و ماوەی بەینیان گـەلێ دوورە، نـەک بـە قـەدەر زەوی و ئاسمان، بەڵکو بە قەدەر زانست و نەزانینی ئینسـان. کەواتـە ئیمـانی بـەنرخ ئەوەیـە ئینسـان لـە پێوەندیی (ممکنات) خۆی رزگار بکات و، بە خاوێنی و رووناکیی دڵ و گیان باڵ بگرێتەوە و، بگاتە بورجی ئیمای (مشهود)، چونکە پاش بەراوردی هەزار جارە دەرکەوتووە کە هێلانەی (امکان) پـڕە لە موور و مار، پڕە لە دڕندە و گیانلەبەری زیاندار و، بۆ ئەوە ناشێ ببێتە هێلانەی شابازی خاوەن ئیمتیاز.

جا کە لەو شوێنە بەرزەدا ئارامی گرت ئەوسا بە خەڵاتی نەبڕاوەی ئیمانی شـهوودی دەگـات و، کـە بە ساغی ئیمانی بە بوونی مەبدەئی راستی پەیداکرد ئەتوانێ ئەو لەخۆوەبوونە (وجود بالذات) بکاتە دەلیل لەسەر لەغەیرەوەبوون (وجود بالغیر)، ئەتوانێ ئـەو دەوڵـەمەندییە بـێسـنوورە بکاتـە دەلیل لەسەر موحتاجیی هەموو مومکینات، ئەزانێ و بۆی روون دەبێتەوە کە هەموو زەڕڕەیەک لە زەڕڕەکانی هەموو مومکینات لە پرتەوی خواست و ئارەزووی خوداوە دەبـێ و، بـێ خواسـتی ئـەو هیچ شت نابێ، ئەزانێ خودای گەورە دەلیلـە و جیهـان مـەدلوول. بـیر و بـاوەڕی سـاغ ئەمەیـە، ئەگەرنا ئیسـتیدلال بە خەلق لەسەر خالیق، بە مومکینات لەسەر (واجبالوجود) وەکوو سـواربوونی ئەسپەدارینەیە بۆ برینی دەشتی کرکی بێبەرودوا، بێگومان ئەسپەدارینە دەشـتی پـان و بیابـانی زانین و ناسینی زاتی خودای گەورە نابڕێ....

لە راستیدا بیر و باوەڕی جێگیر و دامەزراو و شایانی ئیعتیماد زۆر جیاوازە لەو دەلیل و بەڵـگانە کە تووشی ئیشتیباه دەبن. خودا بە میهرەبانیی خۆی دەرگای کەشف و شهوود بۆ دڵمان بکاتـەوە و رووناکی بخاتە دڵ و گیانمان بە پایەی ئەو رەهبـەرەی کـە دوا پێغەمبـەرە، درووودی خـودا لـە خۆی و ئال و بەیت و لە یاران و پەیڕەوانی.

بەڵام ئێستە کە ئێمە پایەمان هەر پایەی قسەکردن و غەوغایە، بۆ خاتری قەبز و بەستی زیهنی خۆم و خەڵک، کە هەمیشە گیرۆدەی قسە و باس و قوولەقوولە و بە غەیری دەلیـل و ئیعتیبـارات قەناعەت ناکات، دەست بە داوێنی زانایانی بەرزەوە دەگرم و دەڵـێم: «کـذا قـرّر الفحـول» و بـالله التوفیق:

عەقڵی ساحیب سوود بۆ ئەدای مەقسـوود
لە دوای تەسـەوور مەعناکـەی مـەوجوود
(قـــال: الموجـــود علـــی نـــوعین
یـــأبی معنـــاهُ عـــن غیـــرِ ذَیـــنِ)
یـەکێکیان، ئەگـەر تـەعریفی دەکـەی،
ئەوەتـــە، نـــەزەر ئـــەباڵ زاتی خـــۆی،
ئـارەزووی عـــەدەم وە گشـــت گـــوزەردا
جـــائیز نییـــە پێـــی بنێـــت وەســـەردا

دڵ لـــــەم تەعریفـــــە وا مەعلوومییـــــە
کـە ئەسڵـەن عـەدەم بـۆی جـائیز نییـە
هـــەرچی ناجـــائیز نـــەزەر بـــە زاتـــە
(بـــالنظر للغیـــر) دیســـان هـــەم واتـــە
وە ئیللا دەکەین بـە خدمـەت مـەعرووز:
لازم تـــێ لەمـــە (خـــلاف المفـــروض)
ئـەو یـەک ئەوەتـە نـەزەر ئـەپاڵ زات
عـەدەم جـەوازی هەیـە رووی تـێکـات
مونـــافی نییـــە، خاســـی بکـــە ســـەیر،
(مـــع الامتنـــاع بـــالنظر للغیـــر)
وەک دەڵێن لە بەحس مـومکینی قـەدیم
بینـــا لـــە تەقـــدیر ســـبوتی و تەســـلیم

دەکەین بە خدمەت مەعرووز: عەرزی خزمەتتان دەکەین، پێتان دەڵێین.

(مەولەوی) تێکڕای (موجود) ئـەکات بـە دوو بەشـەوە، یەکـەم: مەوجوودێکـە کـە (ممکـن)ی (خاس) ە، کە بوون و نەبوونی وەک یەک بن. دووەم: مەوجوودی (واجب) ە، کـە پێویسـتە ببـێ، جا ئەو مومکینە ئەکاتە دەلیل لەسەر بوونی واجب، ئیتر باسی (ممتنع)ی نەکردووە، چونکە لێرەدا مەبەست نییە، بەڵام لە راستیدا ئەوەی دێتە زیهنی ئینسانەوە سێ بەشـە؛ هـەرچی بێتـە زیهـنی ئینسانەوە یا نەبوونی موقتەزای زاتە، واتە: هەر لەبەر خۆی، نەک لەبەر شتێکی تر، نابێ ببێـت، یـا نەبوونەکەی موقتەزای زاتی نییە. یەکەمیان، واتە ئەوەیان کـە نەبوونەکـەی لەبـەر زاتی خۆیـەتی پێی دەوترێ (ممتنع)ی (بالذات) وەکوو (لا شیء) و (اجتماع النقیضین) وەک کۆبوونەوەی بـوون و نەبوون لە یەک شتدا، یا وەک (اجتماع الضدین) وەک کۆبوونـەوەی رەشـیەتی و سـپییەتی لـە یەک شتدا. دووەمیان، واتە ئەوەیان کە نەبوونەکەی لەبەر زاتی خۆی نییـە، یـا بوونەکـەی لەبـەر زاتی خۆیەتی، یا خۆ نە بوون و نە نەبوونی لەبەر زاتی خۆی نییـە، یەکـەمیان واجبـە و دووەمیـان (ممکن)ی (خاس)ە وەک ئینسان.

بەهەرحاڵ مەولەوی دەفەرموێت: ئەو عەقڵ و هۆشە کە خـاوەن‌سـوود بـێ بـۆ بـەجێ‌هێنـانی مەبەستی خۆی لە پاش بیرکردنەوە لە مەعنای (وجـود) واتـە: بـوون، یـا ئەوشـتەی کـە دەبێتـە مەبدەئی ئاسار، حوکم ئەکات بەوەی کە (موجود) دوو جۆرە:

واجب و مومکین، ئیتر مەعنای (وجود) مانیعە لەوەی جۆری سێهەمی هەبێ.

بەشێ لەو مەوجوودە، کە واجبە، تەعریفەکەی ئەوەیە کە لەبەر زاتی خۆی نەبوون لێـی نزیـک نەبێتەوە، واتە نەبوونی (محال) بێ، دیارە کە نەبوون لەبەر زاتی خۆی رووی تێ نەکات، لە ڕێگـای غەیری زاتی خۆیشیەوە رووی تێ ناکات، کەواتە (واجب) ئەوەیە کە نابێ، نە بە هۆی زاتی خۆی و نە بە هۆی غەیری خۆیەوە نەبوون رووی تێ بکات، خۆ ئەگەر بە هۆی غەیرەوە نـەبوون رووی تـێ بکات خیلافی مەفرووز روودەدات؛ ئێمە بڕیارمان دا ئەوەی لە ڕێگای زاتی خۆیـەوە نـەبوون رووی تێ‌نەکات لە ڕێگای غەیریشەوە رووی تێ ناکات.

بەشەکەی‌تری مەوجوود کە مومکینە ئەوەیە زاتی خۆی نەبوون قـەبووڵ بکـات، ئەگـەرچی بـە هۆی شتێکی لە زات بەدەر نەبوونەکەی (محال) بێت وەکوو مومکینێکی مـەوجوود کـە خواسـتی خودا لەسـەر بوونی بێ، یا وەکو لە باسی مومکینی قەدیمدا دەڵێن ئەم شتە (ذاتاً) لەوانەیە نـەبوون بە سەریا بێت، بەڵام لە بەر ئەوەی نەبوونەکەی دەبێتە هۆی کەم‌وکووڕی لە زات‌دا نابـێ نـەبوونی بەسەردا بێت، وەکو سیفەتەکانی خـودای گـەورە، لەسـەر ئـەو رایـەی کـە زیـادن لەسـەر زات و مومکین.

پێی دەوێ پێی ئەم بەحس و بەیانـە[٦]
عیللەت حودووسە یـا خـەیر ئیمکانـە؟
یــەکێکیچ دەڵــێ: مەجمووعیانــە
(شــطراً او شــرطاً) راس کامیانــە؟

واتە: ئەم مەسەلەیە کەوا ئاخۆ ئیحتیاجی مومکین بە عیللەت لەبـەر ئیمکانەکەیـەتی یـا لەبـەر حودووسەکەیەتی، باسێکی ئەوەندە دژوار و سەختە، تەنانەت ئەگەر پێیشی ببێ پێی بڕوا بەڕێوە و چار بکرێ، ئەو پێ پێی ئەوێ لەسەری راوەستێ.

درێژەی باسەکە ئەمەیە: پاش ئەوە کە زانراوە (ماسوی‌الله) پێویستی بە عیللەت هەیە، هەنـدێ لە زانایان فەرموویانە: ئەو عیللەتە کـە شـتێ موحتـاج بکـات بـە فاعیـل حدووسـە، چونکـە هـەر

هوشیارێ تەماشا بکات و بیر بکاتەوە کە حادیس بێموحەدیس نابێ جەزم ئەنێ بەوەدا کە حادیس موحتاجە بە فاعیل چ تەماشای ئیمکان بکا یا نەیکا؟

هەندێ لە زانایان فەرموویانە ئەو عیللەتەی شتێ موحتاج بە فاعیل بکات ئیمکانە، چونکە هەر هوشیارێ بیری لەوە کردەوە کە غەیری (واجب)، بێجگە (ممتنع)، بوون و نەبوونی وەکو یەک وایە جەزم بەوەدا دەنێ کە هەموو مومکینێک موحتاجە بە فاعیل هەتا تەرجیحی وجوود بەسەر عەدەمدا بدات، یا تەرجیحی عەدەم بەسەر وجووددا بدات، تەماشای حودووس بکات یا نا؟

هەروەها هەندێتر لە زانایان فەرموویانە: ئەو عیللەتەی کە شت موحتاج دەکات بە فاعیل هەردوو سیفەتەکەیە بە تێکڕایی، واتە: حودووس و ئیمکان هەردووکیان.

هەندێکیتریش وتوویانە عیللەتەکە ئیمکانە بە شەرتی حودووس.

لەم شوێنەدا هەندێ لە زانا بەرزەکان فەرموویانە: ئەم دەلیلانە کە لە هەردوو لاوە هێنراون شوێنی خۆیان نەگرتووە، چونکە ئەمانە هەموو دەلیلن بۆ جەزمی ئینسان بەوە کە مومکینات موحتاجی عیللەتن، واتە: ئەو دەلیلانە دەلیلی ئیحتیاجیی مومکیناتن لە زیهندا، دیارە هەر کام لەوانە بکەین بە دەلیل ڕەوایە، ئەگەرچی (ئیمکان) فراوانترە و هەموو مومکینێک دەگرێتەوە چ قەدیم و چ حادیس.

ئێمە لەم شوێنەدا مەبەستمان دەرخستنی عیللەتی (نفس الامر)ە بە بێسەیر کردنی ئیعتیقاد و ئیعتیباری خۆمان، واتە: چ شتێ هەیە لە (نفس‌الامر)دا عیللەت بێ بۆ ئیحتیاجیی مومکینات ئەلای فاعیل، جا ئەگەر تەماشای (نفس‌الأمر) بکەین دەردەکەوێ کە ئەو عیللەتە ئیمکانە و بەس؛ چونکە ئاشکرایە کە واجیب عیللەتی ناوێ و، مومتەنیع زاتەکەی قەبووڵی تەئسیری فاعیل ناکات، تەنیا مومکینی خاسە کە موحتاجە بە عیللەت و، عیللەتی ئیحتیاجەکەی ئیمکانە، چون یەکیی بوون و نەبوون هۆی پێوەندیی مومکیناتە بە فاعیلەوە تا تەرجیحی لایەک بدات بەسەر لایەکی تردا... ئیتر (بالفعل) تەئسیرەکە بکا یا نا.

نەوعی ئەووەڵمان هەر واجب بزان
چونکە بۆ عەدەم ناوێ وە نیشان
تەلی خەتەرەی غەیریچ بێتەردید
دەیپاچێ مەودای بورهانی تەوحید

نـەوعی سـانیمان هـەر مومکینـە و بـەس
عەدەم وەک هەرەس هەر ئەو دەکا پـەس
چون مەوقووفە سیدق ئـەم دوو حوکمانـە
لەسـەر وجـوودی ئـەم دوو نەوعانـە
چاک واتـە دەستێ ئـەو تـەحریر بـدەین
ئیسـباتی وجـوود هـەردوویان بکـەین

غەیریچ: غەیریش. دەیپاچێ: دایئەپاچێ و ئەیبڕێ. مەودا: دەمی تێغ. هەرەس: داڕمانی بەفر پاش توانەوەی بەشی ژێرەوەی. پەس: پەست.

واتە: جۆری یەکەم لەو دوو جۆرەی مەوجوود کە ئەوە بوو، بوونی موقتەزای زات بێ و نـەبوونی بەسەردا نەیەت، هەر (واجبالوجود)ە و ئەبێ هـەر تاقـە یـەکێکیش بـێ، چونکـە تـەلی خەیالـی هاوشانی ئەو دەمی شمشێری دەلیلی تەوحید دایئەپاچێ و ئەیبڕێ، وەک چۆن تێغی تیژ شریت ئەبڕێ.

جۆری دووەم لە دوو جۆرەکەی مەوجوود هەر مومکینە واتە: ئەو شتانە کـە بـوون و نـەبوونیان وەک یەکن و، هەرەسی نەبوون هەر بەسەر ئەوانەدا دێت.

وتمان ئەوەی کە هەیە دوو بەشە، یەکەم: واجبە، دووەم مومکینە، ئـەنجا بـۆ پـێسـەلماندن و سەپاندنی ئەم راستییە باش وایە دەس بدەینە قەڵەم و بەڵگەی بوونی ئەم دوو جۆرە بنووسین:

ئەرچی حەقاییق ئەشیا سابیتە
(والعلـمُ بهـا مـن حـق نابـت)ە
وەک رەددی نەحوی سەفسەتەی سەرشێت
(عِنـدی) و (عِنـادی) (لا ادری) دەیوێـت
تـەعریف و تەقسـیم مـەقوولات، هـەر دە،
تۆ بیدە بە شەرح ئـەم هـەردە و هـەردە[٧]
مـەعلومیی وجـوود بـۆ مـومکین دەدات
شـهوودی عـەدەم بـەعزێ مـەوجوودات
ئایـا عـەدەمی سـابیق یـا لاحیـق
یـا هـەردوو عـەدەم لاحیـق و سـابیق

بـۆچ؟ ئـەو ئـەحکامی وا جونبـوش دەکـات
لـــە موشـــاهەدەی حالـــی جوزئیـــات
وەســـەر نـــەفس‌دا و پێـــی دەوێ نـــوورین
ئـــەو ئەحکامانـــە هـــەموو زەرووریـــن
عـــیلم بـــە وجـــوود مـــومکین تـــەمام بـــوو
وا بـــەدیهی بـــوو. ئەمـــە تـــەمام بـــوو

تەمام بوو[ی یەکەم]= تەماعم بوو: بە تەمای بووم.

واتە: ئەگەرچی حەقیقەتی شتەکان هەیە و، زانینی ئەحوالی ئەو حەقیقەتانەیش بە پێی توانای ئادەمزاد هەیە، بەڵام من لەم ڕێگەوە ناڕۆم بۆ ئیسـباتی ئـەوەی کـە مـومکین هەیـە؛ چونکـە لـە لایێکەوە پێویستە بە ڕەدکردنەوە و بەرپەرچدانەوەی بیروبـاوەڕی هەڵـەی ئەوانـەی کـە خـاوەنی زانستی رووکەشن، چ لە تاقمی عینادییە بن کە دەڵێن هیچ حەقیقەتێک وجوودی نییە و، هـەموو هەر خەیالات و ئەوهام و پڕوپووچن، یا لە تاقمی عیندییە بن کە دەڵێن حەقیقەتەکان هەن، بەڵام تابیعی بیروباوەڕن، واتە باوەڕت وابێ ئەو شتە بەردە ئەوە بەردە، ئەگـەر بـاوەڕت وابـوو دارە ئـەوە دارە، یا باوەڕت وابوو زیوە زیوە، یا خۆ لە تاقمی (لا ادری)یە بـن کـە دەڵـێن هـیچ نـازانین و لـە گومانی خۆمانیشدا گومانمان هەیـە، هـەروەها پێویسـت دەبـێ بـە تەقسـیمی حـەقاییق بـۆ لای جەوهـەر و عـەرەز و تـەعریف‌کردنیـان و تەقسـیم‌کردنیـان بـۆ هـەموو بەشـەکانیان و تـەعریفی هەریەکەیان، ئەم باسانەیش بـۆ ئـەم هـۆنراوە کورتـە دەسـت نـادەن و، پێویسـتە باسـی ئـەم دە مەقوولەیە بدەی بە کتێبە گەورەکان تا بە تەواوی ئـەم‌دیـو و ئـەودیوی پـێ بکـەن و لـە هـەموو لایەکی بکۆڵنەوە و، هەر یەکەی لە شوێنی تایبەتی خۆیدا باس بکەن....

بەڵێ لەو ڕێگایەوە ناڕۆم بۆ سەپاندنی ئەوەی کە مومکین هەیە، بەڵکو ئەڵێم: تۆ گومانـت نییـە لەوەی کە ئەم عالەمەی لە پێش چاوتدایە نەبوون رووی تێ دەکات، چ نەبوونی پێشوو چ نـەبوونی دوایی، واتە نەبوونی پێش بوونی و، نـەبوون و لـەناوچوونی پـاش بـوونی، یـا هـەردوو نەبوونەکـە پێکەوە، لە بەرچاوتە کە نەبووە و پەیدا دەبێ و، لە پاش بوونیش لەناو دەچێ و نامێنێ.

شتێکی ئاشکرایە ئەم نەبوونە کە ڕوودەکاتە بەشەکانی جیهان دەلیلە لەسەر ئەوەی ئەم جیهانە هەمووی لەبەرەی مومکیناتە و قابیلی بوون و نەبوونە و، فـەرقی بـوون و نـەبوون بـۆ ئـەو نییـە و هەردووکیان بۆی ئەشێن بە شێوەیەکی ئاشکـرا چونکـە کاتـێ ئینسـان تەماشـای حاڵـی هـەموو

بەشەکانی جیهانی کرد حوکمێکی عام دەڕژێ بەسەر دەروونیدا بە بەداهەت، بەمجۆرە بوونی مومکین کە بەتەما بووم ئیسپاتی بکەم بە ئاشکرایی دەرکەوت.

کەس دەس بۆ سەبەب عەدەم نەماشێ
عەدەم نەفیی سیرف بۆ ئەسەر ناشێ
چون عیبارەت لەو نەفی سیرفەسە
عەدەمی وجوود سەبەبی بەسە
تەقریر بینا لەم تەحریرە دەکەم
(عَدَم العلّة علّة العَدَم)
موئەسسیر ناوێ ئیللا مەر مەوجوود،
هیچ ئەسەر ناوێ مەگەر هەر وجوود
پەس وجوودی ئەم نەوعی دووەمە
کەوا سابیت بوو جائیز عەدەمە
ئەڵبەت بە نەزەر زاتی خۆی نییە
وەرنە واجبە مومکین بۆ چییە؟
پەس ئەو وجوودە لە سەبەبێکە
دەلیلی ئێمەیچ نەختێ گوێ لێکە

دەس نەماشێ: دەست نەگیرێ. گوێ لێکە: ببیسە.

واتە: پاش ئەوەی کە بەشی مومکین سابت بوو با بگەڕێین بە شوێنی ئەو شتەدا کە هۆی نەبوون یا بوونی مومکینە، جا با کەس هەوڵ نەدا و بە دوای هۆی نەبووندا نەگەڕێ؛ چونکە نەبوون (نەفی)ە و (نەفی)ی خالیس نابێتە ئەسەری فاعیل، هۆی نەبوونی مومکین تەنها ئەوەیە کە هۆی بوونەکەی نییە، وەکو مەشهوورە (عدم العلة علة العدم) لای هەموو وشیارێکیش ئاشکرایە کە هەر مەوجوود دەبێتە موئەسسیر و هەر وجوودیش دەبێتە ئەسەر، واتە بوونی مومکین لە خۆیەوە نییە؛ ئەبێ فاعیلێکی ببێ کە بوونەکەی واجب بێ، چونکە بوونی ئەو مومکینە کە نەبوونیش رووی تێدەکات لە زاتی خۆیەوە نییە و لە غەیری خۆیەوەیە، ئەگەر بوونەکەی لە خۆیەوە بوایە واجب دەبوو نەک مومکین.

هەرچی وجوودی (لذاتە) نەوێ

نـــاویٚ بـــیٚســـەبەب، ســـەبەبی تـــەویٚ
سەبەبی چلۆن؟ مەوجوود نـە مـەفقوود
نـاویٚ بـە مووجیـد چشـتی نامـەوجوود
ئـــەم موقەددیمـــە تـــەواو مەعلوومـــە
تەئســـیری نـــاویٚ هـــەرچی مەعدوومـــە
لە چـاوی دڵـدا وەک خـۆر مەشـهوودە
مەرتەبـــەی ئیجـــاد بەعـــدەز وجـــوودە
ئـەو مەوجوودیچـە، خاسـت لەبـەر ویٚ،
لە سیلسیلەی نەوع مومکین ئەودەر ویٚ

نەویٚ: نەبیٚ. سەبەبی تەویٚ: سەبەبی دەویٚ. بەعدەز = بعد از: لـە پـاش. خاسـت لەبـەر ویٚ: چاک لەبەری بکە، لە بیرت نەچێتەوە. ئەودەر ویٚ: بەدەر بیٚ.

واتە: دەلیلەکەم بۆ پیٚسەلماندنی بوونی واجب ئەمەیە: هـەر شـتیٚ بـوون و نـەبوونی لـە زاتی خۆیەوە نەبیٚ، واتە (واجبالوجود) نەبیٚ، ئەوە بە بیٚسەبەب نابـیٚ، سـەبەبەکەیش ئـەبیٚ مـەوجوود بیٚ، چونکە شتیٚ خۆی وجوودی نەبیٚ هیچ شـتیٚ ناهێنێتـە دی، ئـەم قسـەیە شـتێکی ئاشـکرا و زانراوە: شت کە خۆی نەبیٚ شت ناهێنێتە وجوود، پایەی دروسـتکـردن و وجوودبەخشـین پـاش پایەی بوونە، ئەو بووەیش کە مومکین دروست ئـەکات پێویسـتە لـە زنجـیرەی مومکینـات و لـە جۆری مومکین بەدەر بیٚ؛ چونکە لە پێشەوە دەرکەوت کە مومکین بوونی لەبەر زاتی خۆی نییـە، دروستکەرێکیش لە جۆری مومکین بەدەر بیٚ بیٚگومان (واجبالوجود)ە.

کـــەلام لـــە نەوعـــە، ســـەرت نەیێشـــیٚ
تەسدیع بۆ ئیبتال تەسەلسـول کێشـیٚ
مـــەر وەختـــیٚ جیلـــوەی بـــاڵای بـــەلادا
ســـەلای ئیســـتیجلا و دادی جـــەلا دا
تەرتیب دا ئەفراد سیلسیلەی میشـکین
تاتـــای تەسەلســـول نـــە دەور جـــەمین
وە شـــانەی تـــەتبیق پێیـــدا بێتـــەوە

دڵ هـــای بەتوولـــە تـــا ببڕێتـــەوە

تەسدیع: سەرئێشاندن. جیلوە: خۆ دەرخستن و خۆ نواندن. بالا: قەد و قامەت. بەلا: بەلادا. دا: بدا. سەلا: بانگەواز. ئیستیجلا: حەزکردن لە دەرکەوتن. داد: هاوار. جەلا: دەرکەوتن. هەروەها جەلا و ئیستیجلاء لە زاراوەی ئەهلی (تلوف)ن[٨].

واتە: لەو دەلیلانە کە هێنامنەوە بۆ پێ سەلماندنی بونی (واجب) و بوونی بە عیللەت بۆ بوونی (ممکن) باسم لە (نوع)ی مومکین بوو نەک لە فەرد فەردەکانی، دەلیلەکەم وەها رێکخست: مەوجوود یا واجبە یا مومکینە. بەشی مومکینم ئیسپات کرد و وتم مادام بەشی مومکین بوونی لەبەر زاتی خۆی نییە عیللەتێکی لە مومکین بەدەری دەوێ، ئەو عیللەتەیش لە نەوعی مومکین بەدەر بێ هەر (واجبالوجود) ە، ئیتر باسی یەکەیەکەی مومکینەکانم نەکردووە هەتا بڵێیت:

لەوانەیە مومکینی دوایین لە مومکینی پێشووەوە پەیدا بێ و ئەویش لە مومکینی پێش خۆیەوە پەیدا بێ، هەروەها بەرەو ئەزەل بڕوات، ئەنجا تۆیش بکەویتە ئازار و سەرئێشە هەتا تەسەلسولەکە بەتاڵ بکەیتەوە.

شایانی باسە ئەم شیعرانەی مەولەوی دوو واتا هەڵدەگرن واتایەکی ئاشکرا و عیشقگۆنە و واتایەکی نهێنی و زانیارییانە، واتای یەکەم ئەوەیە لە کاتێکدا موحتاجی بەتاڵکردنەوەی تەسەلسول ئەبیت کە یارە گوڵڕوخسارەکەت بێت و بەرامبەرت رابوەستێ و جوانیی بەژن و باڵای نازداری دەربخات و بانگەوازی خۆنواندن و جوانی دەرخستن بدات و رووی خۆی وەک هەتاو بدرەوشێنێتەوە و تاتای زولفەکانی بە دەوری روویا رێک بکات و بڵێت زولفی من تاتای نەبڕاوەن، نە ژمارەی تاتاکانی دەبڕێتەوە و نە درێژیی تاڵەکانی دوایی دێت، ئەوجا تۆیش بکەویتە سەرئێشاندنی بێسوودی خۆت و بە (بورهانی تەتبیق) بڕانەوەی ژمارەی تاتاکان و دواهاتنی درێژیان ئیسبات بکەیت، هەتا یار کەمێ بێدەنگ بێت.

واتای دووەم: کابرای موقابیل بڵێت ئەفرادی مومکینەکان زنجیرەیێکی نەبڕاوەیە هەر لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد دەڕوات و، هەر دواکەوتووێ مەعلوولە بۆ ئەو فەردەی راستەوخۆ لە پێشیەوەیە، ئیتر پێویست بە موئەسسیری خارج لە خۆیان نییە، لە سەرەوە (لا متناهی) و لە خوارەوە لە سنوورێکدا ناگیرسێتەوە. ئەوجار تۆیش سەری خۆت بئێشێنی و (بورهانی تەتبیق) رێک بخەی بۆ پوچکردنەوەی دەعواکە و بڵێیت لە مەعلوولی دواییەوە رشتەیەک دەگرم بەرەوژوور هەتا هەر بڕوا و سەرکەوێ، لە عیللەتی ئەو دوامەعلولەیشەوە رشتەیەک دەگرم، واتە:

بەم کەم و زیادە یەک رشتەکە بوو بە دوو رشتە. ئەنجا هەردوو رشتەکە لـە دوامەعلوولـەوە ڕێـک ئەکەم، واتە عیللەتەکەی دەهێنمە بەرامبەری و، وای دادەنێم هەر تاقێ لـە مـەعلوول بەرامبـەری تاقێک بێ لە عیللەت و بەرەو ئەزەل بڕۆن، لێرەدا دەڵێم ئەگەر هەردو رشتەکە وەک یەک ئـەڕۆن و نابڕێنەوە ئەوا زۆروکەم وەکوو یەک دەبن، کـە ئەمـە شـتێکی مەحاڵـە. ئەگـەر کەمەکـە، واتـە رشتەی عیللەتەکان، نابڕێتەوە و زۆرەکە واتە رشتەی مەعلوولەکان، ئەبڕێتەوە، ئـەوەی لـێ پەیـدا دەبێ کە کەم لە زۆر زیاتر بی، ئەمەیش مەحالە. خۆ ئەگـەر کەمەکـە زوو دەبڕێتـەوە ئـەوا دەبـێ زۆرەکەیش ببڕێتەوە چونکە فەرقی لەگـەڵ کەمەکـەدا بـە تاقـە یەکێکـە، دیـارە هـەر شـتێ بـە ئەندازەیەکی سنووردار و براوە زیادەی بەسەر شتێکیتردا هەبێ دەبێ ببڕێتەوە، ئـەنجام رشـتەکە بڕایەوە و دوایی هات، کە ئەو لای خۆی بڕیاری دابوو نابڕێتەوە و دوایی نایەت.

بەمجۆرە دەرکەوت کە نەبڕانەوە و دوانەهاتنی ئەفرادی مومکینەکان شتێکی پووچ و هەڵەیە.

لێرەدا بە بۆنەی بەتاڵ کردنەوەی تەسەلسولەوە هەندێ لە قسـەی زانایـان بـاس دەکـەین کـە دەلیلن لەسەر بەتالیی تەسەلسول:

یەکەم: بورهانی (تضایف) واتە: ئەڵێین: ئەم تاکانە کە یەک لە دوای یەک لە سـەرەوە هـاتوون هەر یەکێکیان لە پێشووەکەیەوە پەیدا بووە و دەبێتـە هـۆی پەیـدابوونی ئـەوەی لەدوایـەوە دێ، واتە: هەر یەکێکیان هەم مەعلوولە و هەم عیللـەت، دیـارە واجبـە ژمـارەی وەسـفی عیللییـەت و مەعلوولییەت بە قەدەر یەک بن، دێین مەعلوولی ئاخر جیا دەکەینـەوە و تەماشـای پێشـووەکەی دەکەین، جا لەبەر ئەوەی هەر یەکێ لەو فەردانە سیفەتی عیللییـەت و مەعلوولییـەتی تێدایـە لـە ژمارەدا وەکوو یەک دەبن، وە لەبەر ئەوە لە ئاخرەوە مەعلوولێکمان هەیە واجبە لـە ئەووەڵیشـەوە عیللەتێکمان هەبێ کە مەعلوول نەبێ بۆ هیچ شتێک و لە هیچ شتێکەوە پەیدا نەبووبێ، دیارە کـە عیللەتی رووتی نامەعلوولت دەس کەوت ئەوە واتە سیلسیلەکە بڕایەوە.

دووەم: ئەم تاکە یەک لە دوای یەکانە مـادام بوونیـان پەیـدا کـردووە ئـەوا لـە (نفـس‌الامـر)دا (موجود) ن، هەر ژمارەیەکیش لە (نفس‌الامر)دا مەوجوود بێ یا جووتە یا تاقە، جـا ئەگـەر جـووت بێ ئەوە کەمترە لە ژمارەیێ تاق کە لە ژووریەوە بێ، ئەگەر تـاق بـێ ئـەوە کـەمترە لـە ژمارەیـێ جووت کە لە ژووریەوە بێ (حسب التصور) کەوابێ ئەنجام سیلسـیلەکە دەبڕێتـەوە کـە وا دانـراوە نەبڕاوە بێ.

سێهەم: ئەم زنجیرەیە لە (نفس‌الامر)دا مەوجوودە، هەموو مەوجوودێکی (نفس‌الامر) یش ئەبێ (متعیّن) و (متشخّص) بێ، بۆیە نابێ (لامتناهی) بێ چونکە شتێ (لامتناهی) بێ (تعیّن) وەرناگرێ، کەواتە واجبە زنجیرەکە ببڕێتەوە.

چوارەم: یەکەیەکەی ئەم زنجیرەیە یا هەموویان قەدیمن یا هەموویان حادیسن، یا هەندێکیان قەدیمن و هەندێکیان حادیسن، باری یەکەم بەتاڵە چونکە هەندێکیان بە بینین دەبینین حادیسن، باری سێهەمیش بەتاڵە و (تەرجیح)ی (بلا مرجّح)ی لێوە پەیدا دەبێ، واتە بۆ دەبێ هەندێکیان حادیس بێ و هەندێکی‌تر قەدیم؟ ئەی بۆ پێچەوانە نەبێ؟، کەوابێ هەر باری ناوەڕاست دروست و ڕاستە واتە: هەمووی حادیسە، کە هەمووی حادیس بوو دەبێ یەکێکی‌تری لە زنجیرەی مومکینات بەدەر، ببێتە بکەر و دروستکەری ئەو زنجیرەیە، کەواتە زنجیرەکە پێویستە بڕاوە بێت.

خاریجیچ لەو سیلک نەوعی مەعهوودە
ئەلبەت هەر زاتی واجب وجوودە
وجوودی واجب ئەویچ لەم لاوە
ئەوا سابت بوو خاس شەوقی داوە
شک نەما لە سیدق هەردوو حوکماندا
بۆچ؟ مەوجوود حەسرە هەر لەو دواندا[٩]
کە ئەم یەک نەبوو ئەو (معیّن)ە
وجوودی واجب (مُتَیَقَّن)ە

واتە: ئەو بکەرەیش کە لە بەرەی مومکین بەدەر بێ بێ‌گومان هەر زاتی (واجب‌الوجود) ە، وا وجوودی (واجب‌الوجود) یش لەم لاوە دەرکەوت و پرشنگی دایەوە و، گومان نەما لە ڕاستیی ئەو دوو حوکمەی کە باسمان کردن، واتە: بوویەک کە بوونەکەی لە زاتی خۆیەوە بێ واجبە و، بوویەک کە بوونەکەی لە غەیرەوە بێ مومکینە، ئەم دوو بەشەیش هەردوو مەوجوودن. (والحمد لله علی ذلک حمداً یوافی نعمه و یکافی فضله و احسانه).

شایانی زانینە کە بابەتی بوونی (واجب‌الوجود) و دان‌نان بە بوونی پەروەردگاری تەواو و بێ-خەوشدا گرنگترین شتێکە کە پێویستە ئادەمزاد بیزانێت؛ چونکە هەر بوونی (واجب) بناخەی یاسا و هەست بە لێپرسراوییە بۆ بەجێ‌هێنانی داد و دادگەری لە جیهاندا.

بەر لە هەموو شتێ هەرکەس تەماشای خۆی کرد و تەماشای جیهانی کرد بێ‌گومان ئەزانێ خۆی هەیە و لەبەر چاومانە ئەرز و ئاسمان هەن، ئەنجا فیکر دەکاتەوە ئەم کۆمەڵە بووانە خۆی و غەیری خۆی ئاخۆ هەڵکەوتێکی بێ‌سەروبەرن و لە خۆوە بوون، یا خۆ بوونیان لەسەر قانوونێکی رێک و پێکە. کە ئینسان بیری بخاتە کار باوەڕێکی بەتین پەیدا دەکات بەوەی کە ئەم کائیناتە بە هەڵکەوت (صدفە) پەیدا نەبووە؛ چونکە ئەگەر ئەسڵ بە هەڵکەوت بێ دەبێ فەرعیش بە هەڵکەوت بێ، کەچی ئەگەر بیربکەینەوە و تێفکرین دەبینین زەڕەیێکی کائینات نابینین کە لەسەر قانوونێ نەبێ، دەبینین ئەم هەمووە ئەستێرانە گەورە و بچووک، دوور و نزیک هەر یەک لە عاستی خۆی لەسەر مەدارێکی تایبەتی دەسووڕێتەوە بە شێوەیەکی دیاری و سنووردار لە پەلە و ئارامی، دەبینین مەجموعەی شەمسی بە دەوری خۆردا ئەسووڕێتەوە لەسەر شێوەیەکی تایبەتی و هیچ کام لەم ئەستێرانە لەو ئەندازەی بۆی دانراوە بە قەدەر موویەک زیاد و کەمییان نییە، ئەستێرەیەک لە ئەستێرەیەک ناکەوێ، هەرکام لەمانە سنوورێکیان هەیە بۆ نزیکی و دووریان لە ئەستێرەیەکی‌تر، هەزاران هەزار ساڵە لە یاسای خۆیان لایان نەداوەو خۆر بووەتە دایکانە وەکو عالەمێکی نووری سەربەخۆ دەسووتێ بە جوری کە ئینسان لەو نوورە جیهانگیرە و لەو پرتەو فرێدانە حەیران و سەرگەردانە، نازانێ چۆن لەسەر ئەو حاڵە ماوەتەوە و، چ جازیبەیەکە ئەم ئەستێرانەی خستووەتە شوێنی، چ هێزێکە حەرەکەی دائیرییان پێ‌ئەدا. بۆچی ئەم یاسای دوور و نزیکییە لە خۆرەوە هاتووەتە ئاراوە، بۆچی ئەم هێزانە ماندوو نابن؟

تۆزێ وەرە خوارەوە بۆ جیهانی هەوا، دەریا، وشکی، کانەکان، گیا و دارەکان، گیانلەبەرەکان، قانوونی جەزب و دەفعیان، قانوونی تێکەڵی و ژن و مێردی و نێر و مێیی و زایین و زۆر بوون، قانوونی (تلقیح و تطعیم) لە ناویانا، قانوونی خۆشەویستی لەبەینی بن و لق‌وپۆپدا بۆ مانەوەی (نەوع)، یاسای خۆ لە دوژمن پاراستن، هەوڵی بێ‌وچانی گیانلەبەر لە پێناوی رۆزی پەیداکردندا، بۆ دەرمانکردنی برین لەگەڵ ئەوەدا کە بە بێ‌عەقڵ ناسراون!!

ئەمجا لایەک لە خۆت بکەرەوە، تەماشای پێوەندی جمگەکان و تێهەڵکێشی رەگەکان و هات و چۆی هەناسە لە رێگای خۆیەوە، سافکردنی خواردەمەنی لە گەدەدا، وەرگرتنی خەوش و خاڵ بەجیا و خۆینی ساف بەجیا، بەش‌بەش‌کردنی ئەو خوێنە و ناردنی بۆ هەموو بەشێکی لەش، سەیری هێزی بیستن، بینین، بۆن‌کردن، هێزی چەش، هێزی لێکەوتن و هەست بە نەرمی و زبری کردن بکە، تەماشای جیهازی تێ‌گەیشتن بکە: دەماغ و نوخاعی شەوکی و کاریان لە

تێگەیشتن و هەڵس‌وکەوت و خەیاڵ و خوتوورەی ئـادەمزاددا، سـەیری هێـزی زانـین، خواسـت، خـواهیش، پەرموونـەوە و قارەمـانی، نووچـدان و ترسـنۆکی، غـیرەت، بـێ‌غـیرەتی، بەخشـش، پیسکەیی، لەخۆبایی بوون، هـەرکام لەمانـە لەسـەر قانوونێـک و بـە رێـک‌وپێکـی هەسـتیان پـێ دەکەین، ئاخۆ دەچێتە عەقڵەوە ئەم هەمووە کار و نیشانانە لە شتێکەوە رووبدەن کە بە هەڵکەوت پەیدابووبێ؟، نەخەیر! هیچ مێشکێ باوەڕ ناکات ئەم کائیناتە پڕ لە نهێنی و نیشـانانە بـێ بناخـە و بێ‌قانوون پەیدا بووبن! هەر مێشکێ کە نەخۆش نەبێ ئەوە دەزانێ کە ئەم جیهانە لەسـەر قـانوون دامەزراوە و بە قانوونی راست پایەدارە.

جا کە زانیت ئەم جیهانە بە خۆی و هەموو پارچەیەوە لەسـەر قـانوونی عیللـەت و مـەعلوول و سەبەب و موسەببەب هاتووە و موحتاجە بە هێزێ کـاری تـێ‌بکـات، بـە وردبوونەوەیـەکی ژیرانـە دەرکەوت: ئەم عالەمە یا خۆی (واجب‌الوجود)ی (بالذات)ە و بوونی لە فاعیلەوە وەرنەگرتووە، یاخۆ مومکینە و لە خۆیەوە نەبووە و بوونی لە غەیرەوە وەرگرتووە، ئاشکرایە کە (واجـب‌الوجـود) نییـە، دیارە ئەم جیهانە تێکەڵە لە مەوادی بەرز و بالا وەک ئەستێرەکان و ئەسیر و لە مەوادی خواروو وەک کان و گیا و گیانداران، تێکڕای ئەمانە بوونێکی تەواو و پایەداریان نییە؛ خۆڵ ئەکرێ بە تـۆز، ئاو دەبێ بە هەوا و هەڵم، هەوا دەبێ بە ئاو و باران، گیا و دار و درەخت ئەبن بە پووش و پـەڵاش، کانەکان کاری زۆریان تیا دەکرێ، بێ‌گومان مـەوادی ئـا بـەمجـۆرە لەگـەڵ وجـووبی وجـووددا ناگونجێن، چونکە لە هەر شێوەیەکی (نوعی)دا بێنەجێ، لەوانەیە ئەو شێوەیە بگۆڕێـت و ببـێ بـە شێوەیەکی‌تر، واتە: هەموو شێوە (نوعی) یەکان تووشی گۆڕان دەبن.

نەفسی ماددەکانیش کە شوێنی شێوەکانن تێکەڵن لە بەش و پارچـەکانیان و پێویسـتیان بـەو پارچە و بەشانە هەیە و بێ‌ئەوان نابن، هەرچیش موحتاجی غەیری خۆی بێ ئەوە واجب نییە و لـە مومکینات ئەژمێررێ و موحتاجە بە (واجب‌الوجود).

لە لایەکی‌ترەوە هەموو بەشەکانی سەر و خواری ئەم جیهانە هەموویان رام کـراون و خراونەتـە ئیش بۆ کارێکی تایبەتی و بەردەوام بەو ئیش و کارەوە خەریکن کە بۆیـان تـەرخان کـراون، هـەر شتێکیش کە بەمجۆرە رام کرابێ ئەبێ هێزێ بە سەریەوە بێ، سەرپەرشتی بکا و کاری تـێ بکـات ئەو هێزە (مؤثر) و (فاعل) و (واجب)ە و، ئەم کائیناتە کە لە ژێر چاودێریی ئەودان هەموو مومکینن و بوون و نەبوونیان لەو خاوەن هێزەوە وەرگرتووە.

هەروەها دەتوانی بلێیت: مەجمووعی ئەم مومکیناتە، هیچ بەشێکی لێ دەرنەچێ، هەمووی مومکینە و پێویستە عیللەتێک هەبێ کاری تێبکات، جا ئەگەر عیللەتەکە نەفسی خۆی بێ یا جوزئێک لە خۆی بێ ئەوەی لێ پەیدا دەبێ کە شت لە خۆی پێش بکەوێ چونکە پێویستە عیللەت لە پێش مەعلوولەوە بێت، گومانیش لەوەدا نییە کە پێشکەوتنی شت لەسەر نەفسی خۆی نەبووە و نابێ، کەوابوو واجبە عیللەتەکە زاتێک بێ لە مەجمووعی مومکیناتەکە هەمووی بەدەر بێ، ئەوەیش لە هەموو مومکینات بەدەر بێ واجبە.

بە عیبارەتێکیتر یا هەموو بەشەکانی جیهان قەدیمە، یا هەمووی حادیسە، یا هەندێکی قەدیمە و هەندێکی حادیسە، باری یەکەم بەتاڵە چونکە بە ئاشکرا هەندێکی حادیسە باری سێهەمیش بەتاڵە، چونکە ناچێتە عەقڵەوە کە کۆمەڵێکی ئەجزا لەیەکچوو هەندێکی قەدیم و هەندێکی حادیس بێ؛ کەوابێ هەمووی حادیسە، دیارە هەرچی حادیس بێ پێویستی بە دروستکەر هەیە، پێویستی بە (مؤثر) یکە کە لە زنجیرەی حادیسەکان بەدەر بێ و سیفەتی ئیمکانی نەبێ، ئەوەیش تەنها (واجبالوجود)ە.

ئەوجۆرە کەسانەی کە دەڵێن تەبیعەت (سروشت) کاردەکات و، بە بۆچوونی خۆیان بە زاتی «واجبالوجود» موحتاج نابن، ئەمانە بە هەڵەدا چوون؛ چونکە ئەگەر مەبەست لەو سروشتە سیفەتێکە کە بە ماددە و حەقیقەتی کائیناتەوە راوەستاوە ئەوە ئاشکرایە هەتا حەقیقەت و ماددەکە نەبێ سیفەتەکە کە سورشتەکەیە نابێت، واتە سیفەتەکە موحتاجی مەوسووفەکەیەتی، دیارە ناچێتە عەقڵەوە ئەو سیفەتە کار لە مەوسووفەکەیدا بکات مەوسووفەکەیش ناچێتە عەقڵەوە بە کاریگەر دابنرێ، چونکە ئەجزاکانی، ئەوەی کە دەستی ئێمەی پێ ئەگات، هەمووی موحتاجی غەیری خۆیەتی، واتە خۆی کاری تێکراوە و کاریگەر نییە، بۆیە چار نییە ئەوە نەبێ کە ئەم کائیناتە کردەی زاتێکی خاوەنکەماڵ بێ کە لە هەموو کەموکوورییەک دوور بێ، نە ماددە بێ و نە ئیحتیاجی بە ماددە بێ، هەموو زەمان و مەکان و هەرچی بووەکانی ترە لە ژێر کار و توانا و دەستەڵاتی ئەودا بێ، ئەوە لە عەقڵدا بە واجبالوجود ناو ئەبرێ و لە عورفی ئایینیدا ناوی (الله)یە و، پەروەردگاری جیهانە، هەموو شت موحتاجی ئەوە و، ئەو موحتاجی هیچ شتێ نییە.

بەڵام ئەگەر یەکێ حەقیقەت و راستیی ئەو زاتە بێهاوتا و بێخەوشە نەزانێ و پەی پێ نەبا ئەوە شتێکی سەیر نییە، چونکە هیچ حەقیقەتێ بە ئاسار و نیشانەکانی نەبێ دەرنەکەوتووە و دەرناکەوێ، بۆ نموونە: ئینسان ئەزانێ بینین بە هێزی چاوە، بیستن بە گوێچکەیە، بۆنکردن بە

لووتە، کەچی کەس نازانێ حەقیقەتی ئەم هێزانە چییە، هەموو کەس ئـەزانێ هێـزی تێگەیشـتنی هەیە بەلام نازانێ حەقیقەتی ئەم هێزە چییە... ئەزانێ گیان (روح)ی هەیـە و نازانـێ حەقیقـەتی گیان چییە، بێ‌گومان نـەزانینی حەقیقـەتی شـت نابێتـە کۆسـپ لـە رێگـای دان‌نـان بـە بـوونی شتەکەدا، بۆیە قورئانی پیرۆز هەمیشە خەڵک بانگ ئەکات لە رێگای ئاسارەوە و بە هـۆی بینـینی نیشانەوە دان بە بوونی خودای گەورەدا بنێن (سنریهم آیاتنا في الآفاق و في انفسهم حتی یتبیّن لهم انّه الحق) [١٠].

لە راستیدا دەلیلە فەلسەفییەکان کە لەسـەر رێ و شـوێنی (عیللـەت و مـەعلوول) دامـەزراون تەنها بوونی (مؤثر) ەکە دەرناخەن.

بەڵێ رێگای رووناکی ئیسلامی پیرۆز کە ئینسان بانگ ئەکات بۆ زیکری خودا، هەتا بـەو زیکـرە دڵی هێمن بێ و ئارام بگرێ، چاکترین رێگایە (ألا بذِکر الله تطمئنّ القلوب) [١١].

بینـــا لـــەو تـــەقریر بـــە گوێتـــەدا چـــوو
کـــە (واجـــب بالـــذات) عـــەدەمی نـــەبوو
زاتی هـەر (بالـذات) مەعلوومـە و مەشـهوود
مەبدەئـە و مەئخـەز بـۆ ئـەخزی وجـوود
بـــە ئـــەمرێکی تـــر زیـــادە لـــە زات،
وەک مومکین، حاجەت هیچ لێی روو نـەدات

واتە: لەسەر ئەو تەقریرەی کە بیستت کە (واجب‌الوجود)ی (بالذات) عەدەمی نیە بـۆ ئینسـانی وشیار دەردەکەوێ کە زاتی خودای گەورە خۆبەخۆ زانراوە و دیارییـە و سـەرچاوەی بوونـە و، لـە بوونەکەی‌دا پێویستی نییە بە هیچ هۆیـەکی لـە خـۆی بـەدەر، بـەلام مومکینـەکان لـە بوونیانـدا پێویستیان بە (مؤثر) و پەروەردگارە کە زاتی خودای گەورەیە.

پاش ئەمە حەزرەتی مەولەوی دەست دەکا بە باسی ئەو خیلاف و ناکۆکییەی [کـە] لـە نێـوان (حکماء) و (متکلمین) دایە، حوکەما ئەڵێن: بوونی واجب عەینی زاتە و بـوونی مـومکین غـەیری زاتە. موتەکەللیمینیش ئەڵێن: بوون غـەیری زاتـە چ لـە واجیبـدا و چ لـە مومکینـدا، شـێخ (ابـو الحسن)ی ئەشعەریش فەرموویەتی: بوون عەینی زاتە لە هەردووکیاندا.

هەروەها وەلامی ئەو رەخنەیە دەداتەوە کە دێتە سەر حوکەما کە چۆن ئەبێ وجوودی بە مەعنای کەون و سبووت، عەینی زات بێ؟ دەڵێ ئەوانە کە لایان وایە وجوود عەینە مەبەسیان لە وجوود کەون و سبووت نییە، بەڵکو مەعنایەکی ترە.

بەلام جوان وابوو مەولەوی لە پێش ئەم وەلامەدا باسی خیلاف و جیاوازیی بیرورای حوکەما و موتەکەللیمینی بکردایە وەک ئەم چەند شیعرە کە من لەم شوێنەدا نووسیومن:

ئیختیلاف هەیە ئەی برای ئەمین!
لەناو حوکەما و موتەکەللیمین
حوکەما وجوود دائەنێن بە عەین
بۆ زاتی واجب (ربُّ المَشرِقَین)
بەلام بە غەیری دائەنێن لە بۆ
زاتی مومکینات، ئاگادار بە تۆ
لای موتەکەللیم زیادە لەسەر
زاتی واجب و مومکینات یەکسەر
لە لای ئەشعەریش عەینە بۆ هەموو
واجب و مومکین، لە هەر بەشێ بوو

جا لە پاش باسی ئەم ئیختیلافە وەلامی رەخنەکەی بدایەوە و بهاتایەتە سەر ئەم شیعرانەی کە دەفەرموێ:

ئەوکەس دەڵێ: زات واجبی مەعبوود
عەینی وجوودە، قەسدی بە وجوود
ئەو سبووت و کەون مەشهوورە نییە
بۆچ؟ ئەوە مەعلووم ئەمری زیهنییە
ناوێ بۆ هیچ شەیء خارجی بە عەین
چ جایێ واجب (ربّ المشرقَین)؟
بەڵکو بە وجوود ئەو کەس قەسد دەکات
ئەوە کەواها زاتی ئەو (بالذات)

مەبـدەئی ئـەخزە بـۆ کـەونی مـەعهوود
کــە مەعنایێکــە شــائیع بــۆ وجــوود

واتە: ئەو کەسە کە ئەڵێ وجوود عەینە بۆ زاتی واجب مەبەستی لـە وجـوود کـەون و سـبووتی ئیعتیباری نییە، چونکە ئەو کەون و سبووتە ئەمرێکی زیهنی و ئیعتیبـارێکی عەقڵـییە و وجـوودی نییە لە خارج دا، کەواتە شیاوی ئەوە نییە ببێ بە عەین بۆ هیچ شتێکی خـاریجی، چ جایـێ ئـەوە کە ببێ بە عەین بۆ زاتی باریتعالی. بەڵکو مەبەس لە وجوود ئەو شتەیە کە مەبدەئـە بـۆ ئـەخز و ئینتیزاعی وجوودی ئیعتیباری کە مەعنای مەشهووری وجوودە.

پوختەی وتارەکە ئەوەیە کە خودای گەورە (بالذات) بـەبێ هـیچ هۆیـەک دەبێتـە سـەرچاوەی وەرگرتن و لابردنی وجوود و، ئەم بـوون بـە سـەرچاوەییـە سـیفەتیەتی، بـەلام مـومکین هـەتا ئافەریدگار دروستی نەکات نابێتە سەرچاوەی وەرگرتنی بوون، کەوابێ بوونی بە مەعنای مەبدەء و سەرچاوە عەینە بۆ زات لە واجبدا و غەیرە لە مومکیندا.

قەســدی ئـەم مــەعنا ناتگەســە بــەین
(آلــــا لاحــــدی تــــین الجهتَـــین)
یــا لەبــەر ئەمــە بیزانــە تــەمام
مەوجوود مەشهوورە لە لای خـاس و عـام
ئیتلاقــی ئەســەر چشــتێ دەکــەوێ
مەبــــدەئی ئاســــار خاریجییــــە وێ
خــۆ ماهییــەتی (مــن حیــث هــی)یــە
لەبــەر ئیشــتیراک ئــەو تــەرزە نییــە
کــەونی بــەدیهیچ خــۆ بەدیهییــە
نــاوێ...بــۆچ؟ ئــەمری ئیعتیبارییــە
یــا لەبــەر ئەمــە وجــوودی بــاری
ئــەر حــەقیقی وێ یــا ئیعتیبــاری
کــە وەهــا وێتــە زیــاد وێ لــە زات
لــەم دوو مــەحزوورە یــ ێ روودەدات

(تقـدّم) بـە بـوون لەسـەر بـوونی خـۆی
موحتاجی بە غەیر لە بـوون‌دا دەکـەی[١٢]
پـەس وجـوود ئـەمرێ حـەقیقی دەوێ
رێـک بـە (مبـدء الآثـار)ی کـەوێ [١٣]
زەریفـی لـێ بێـت بـوون بـە عـەینی زات
حاجـەت بـۆ واجـب بـە هـیچ روونـەدات
(وَ مَـاذا اَلّـا مَـا کـانَ کـذا
أی بذاتـه کـان مأخـذا)
بـۆ ئـەو سـبووتی ئیعتیبارییـە
ئەویچـە ئەڵـبەت زاتی بارییـە
(لـم یحـتج فـی أخـذ ذالکـون عنـە
الـی غیـره، جـلّ شـانه)

ناتگەسە بەین: نەهاتووەتە ناو. وێ: بێ. وەها وێتە: وەها بێت. ئەویچە: ئەویشە.

واتە: حوکەما تەنها لەبەر دوو شت قەسدی ئەم مەعنایەی وجوودیان کردووە:

یەکەم: دیارییە لە لای هەموو وشیارێ بە شتێ دەوترێ (موجود) ببێتە سـەرچاوەی (وجـود) و شیاوی ئەوە بێ ئاساری دەرەکی لێـوە پەیـدا بێـت، دیـارە (ماهیـەت) خۆبـەخۆ وا نییـە چونکـە هاوبەشە لە نێوان (موجود) و (معدوم) دا، واتە: بۆ هەردوویان بە کار دەهێنـری، دەوتـرێ (ماهیّـة زید موجودة) و (ماهیة العنقاء معدومة) کەوابێ ماهییەت بە کاری ئەوە نەهات لـە خۆیـەوە ببێتـە سەرچاوەی ئاسار.

(وجود)ی بە مـەعنای کـەون و سـبووتی ئیعتیبـاریش ئـەمرێکی زیهنییـە و نابێتـە مەبـدەء و سەرچاوەی ئاسار. مایەوە وجوود بە مەعنای (ما یصلح لان یکون مبدءاً لأخذ الوجود الاعتباری).

دووەم: ئەگەر وجوود بە مەعنای حەقیقی یا ئیعتیباری، واتە بە مەعنای (مبدء الاخذ والانتـزاع) یا بە مەعنای کەون و سبووتی ئیعتیباری، زیاد بێ لەسەر زات ئەبێ بە زاتەکەوە بەند و بەسـتراو و پایەدار بێت، هەر شتێکیش بە زاتەوە بەند بێ بە شێوەیەک کە عەینی زاتەکە نەبێ و غـەیری بـێ ئەبێتە مومکین، مومکینیش فاعیل و دروست‌کەری ئەوێ، فاعیل و دروست‌کەریش پێویستە پێش ئەوەی کە کار لە شتێکی‌تردا بکات خۆی خاوەن بوون بێ، چونکە پایەی ئیجـاد لـە پـاش پایـەی

وجوودەوەیە، جا ئەگەر فاعیلی وجوود خودی ماهییەتی خـودای گـەورە بـێ ئەنجامەکـەی ئـەوە دەبێ کە (وجود) پێش خۆی بکەوێ ـ ئەگەر بڵێین وجووده مەعلوولەکە عەینی ئەو وجوودەیە کە سیفەتی ماهییەتەکەیە. خۆ ئەگەر بڵێین غەیری ئەو وجوودەیە ئـەوا (تسلسـل) لـە وجوودەکانـدا پەیدا ئەبێ؛ چونکە ئەو وجوودەیش کە لە پێشدا بووە ئەویش فاعیلی ئەوێ.

هەروەها ئەگەر دروستکەری ئەم وجووده غەیری ماهییەتی خودای گـەورە بـێ ئەنجامەکـەی ئەوە دەگەیەنێت کە خودای گەورە لە بوونیا موحتاجی غەیری خۆی بێ، ئەمەیش بۆ ئـەو ناشـێ و مەحاڵە، کەواتە پێویستە مەعنای وجوود سـەرچاوە و مەبـدەئی وەرگـرتنی (وجـود)ی بـە مـەعنا کەون و سبووت بێ. وجوودیش بەم مەعنایە شیاوە کە عەینی زات بێ و، هیچ کەمی و موحتـاجی بۆ خودای گەورە پەیدا نابێ.

هەروەها دەرکەوت کە زاتی خودای گەورە خۆی بە خۆی سـەرچاوە و مەبدەئـە بـۆ ئینتیزاعـی کەونی ئیعتیباری بە پێی پێوەندی بە خاریجەوە.

جا لەبەر ئەوە کە رەخنە دێتە سەر بیری حوکەما و، بەم رەنگە پێویستە لەسەر ئەم مەعنایـەی رابوورد بڵێیت: [ذات الباری تعالی وجود] و، نابێ بڵـێیت [ذات البـاری تعـالی موجـود] ئەمـەیش پێچەوانەی ئەوەیە بڕیار درا، وەڵامی دایەوە و فەرمووی:

پەس لەفزی (موجود) لە (وجود) موشتەق
(علـــی الواجـــب، تعـــالی، یُطلـــق)
مـــن حیـــث أنّ ذاالوجـــود بـــه
قـــام قیـــام الشـــیء بنفســـه
و غیـــرُ الواجـــب یُطلـــق علیـــه
لان الغیـــــرَ ینســـــب الیـــــه
پەس وا ئیتلاقـی مـەوجوود بـەر هـەر دوو
بـــە ئیعتیبـــاری یـــەک مـــەعنا نـــەبوو

پەس: کەواتە. بەر: لەسەر.

واتە: نایسەلمێنم لەسەر ئەم مەعنایە پێویستە بڵێین: (الباری وجـود) و دروسـت نییـە بڵـێین (الباری موجود) چونکە گەلێ جار کە نیسبەتی (مەحموول) لە (مەوزووع) ئەدرێ لەبەر ئەوەیە کە مەوزووعەکە مەوسووفە بە مەبدەئی ئیشتیقاقی مەحمولەکە، وەکـوو ئەڵـێن: «الشـمسُ مضـیئة»

ئێستە راستیی ئەم حوکمە لەبەر ئەوەیە کە (شمس) خۆر مەوسووفە بە (ضوء) رووناکی و، رووناکییەکە زیادە لەسەر زاتی خۆر. جارجاریش لەبەر تایبەتییەتی (موضوع) ەکەیە، وەک ئەڵێن: «الضوء مضیء» دیارە لێرەدا (ضوء) رووناکی خۆبەخۆ (مضییء) رووناککەرە نەک لەبەر ئەوەی ئەو (ضوء)ە خاوەنی سیفەتە (ضوء)ێکی زیاد لەسەر زاتە واتە: ئەم (ضوء)ە زاتی مەوزووعە نەک وەسفی زائید لەسەر زات.

جا لەسەر ئەم ئەساسە ئەتوانین بڵێین (الباری تعالی موجود) واتە: زاتی خودا خۆی وجوودە بەو مەعنا کە رابوورد نەک مەوسووفە بە بوونی زیاد لەسەر زات، بەلام غەیری خودای گەورە (موجود)ی حەمل ئەکرێتە سەر بەو ئیعتیبارەی کە مەوسووفە بە (وجود)ێکی زیاد لەسەر زات، لەبەر ئەوەی بوونەکەی لە خوداوەیە، واتە: خودای گەورە وای لەو مومکینە کردووە ببێتە مەبدەئی وجوود.

وا دەرکەوت کە نیسبەتی مەوجوود لە خودای گەورە و نیسبەتی مەوجوود لە مومکین لەسەر یەک مەعنا نەبوو. هەروەها دەرکەوت کە موتەکەللیمین لە واجب و مومکیندا مەعنای (هو موجود) وا بەیان ئەکەن: ئەو زاتە، واجب بێ یا مومکین، سیفەتی (وجود)ی هەیە، واتە سەرچاوەی ئەخز و انتزاعی کەون و سبووتە بە مەعنای ئیعتیباری و عەقلی. ئەوەش دەرکەوت کە ناکۆکیی نێوان حوکەما و موتەکەللیمین ناکۆکی و نیزاعێکی مەعنەوییە نەک لەفزی، وەک هەندێ نەزان وتوویانە ئەم نیزاعە لەفزییە؛ چونکە ئەگەر وجوود بە مەعنای کەون و سبووتی عەقلی بێ زیادە لەسەر ماهییەتی واجب و مومکین و، ئەگەر بە مەعنای مەبدەئییەت بێ بۆ ئەخز و ئینتیزاعی کەون و سبووت ئەوە عەینی زاتە چ لە واجب و چ لە مومکیندا.

پوختەی ردەدەکە ئەمەیە هەردوولا لە (وجود) مەعنای دووەم ئەگرن، بەلام وجوود بە مەعنا مەبدەء عەینە بۆ زاتی خودای گەورە چونکە ئەو زاتە مەبدەئە لە زاتییەتدا سەربەخۆیە، کەچی مەبدەئییەت بۆ مومکین مەعنایێکە زیادە لەسەر ماهییەتەکەی و بە هۆی خالیقی راستەقینەوە پەیدا بووە کە خودای گەورەیە.

شایانی باسی زیادیی وجوود لەسەر ماهییەتی مومکین بیروڕای حوکەما (مشائی)یەکانە، (اشراقی)یەکان لایان وایە وجوود عەینی ماهییەتە چ بۆ واجب چ بۆ مومکین، فەرق لە بەینی واجب و مومکیندا ئەوەیە ئەو وجوودە کە عەینی ماهیەتە لە واجبدا سەربەخۆیە و لە غەیرەوە وەرنەگیراوە، بەلام ئەو وجوودەی عەینە لە مومکیناتدا لە خالیقەوە وەرگیراوە، بەلگەیش ئەوەیە

هەموو مومکینێ لە ژێر دەستەڵاتی هێزی مان و نەماندایە و بە فەوتان یا بە هێشتنەوە کاری تیا ئەکرێ. مەولەوی پاش ئەوەی ڕێبازی حوکەمای باس کرد وەڵامی موتەکەللمین بۆ حوکەما باس دەکات و دەڵێت:

(نـــاقلینَ عَـــن أحبـــارٍ کُمَّـــلْ)
جواویـان داگـە لـە وەجهـی ئـەووەل:[١٤]
(لا نســـلّمُ) موتلـــەق ماهیـــەت
نـــاوێ سـلووحی بــۆ مەبدەئییـــەت
ئــەر مــەوجوود واجــب (لذاتــە) یــە
ماهییـەتی ئـەو (مـن حیـث هـی)یـە
موتەحەققیقـــە خـــۆی (بـــذاتها)
(لا بتـــأثیر الفاعـــل فیهـــا)
(بالـذات) مەبدەئـە بـۆ ئـەخزی وجـوود
بـەو مـەعنا کـەوا شـائیعە و مـەعهوود
(مـن حیـث هـی) یـە، وا بـێ ئیفتیقـار
دەوێ بـــە مەبـــدەء ئـــەحکام و ئاســـار
(بـــل هـــی المبـــدء لکـــلّ اثـــر
و مـــا ســـواها مجلـــی و مظهـــر)
(و ان کـــان ذا امـــرأ آخـــرا
غیـــرَ الواجـــب خـــالقِ الـــوری
فلانتســـاب ذا الامـــر الآخـــر
الـــی جنـــاب الواجـــب الاکبـــر
بانتِســـــابٌ یصـــــیرُ بِـــــهِ
مبـــدأ اخـــذ الکـــون البـــدیهی
صـــحّ کونـــە بـــلا کـــدورة
ایضـــأ، کمثـــل تلـــک المـــذکورة،

مبـــدأ الآثـــار، مظهـــرَ الاحکـــام؛
اذ المـــدارُ فـــی هـــذا المقـــام):
ئـــەو تەحـــەققوقی خاریجییەتـــە
نیشـــانەی چییـــە؟ بڵـــێ ئەمەتـــە
مەبدەء بوون بۆ ئەخز ئەمرەکەی مـەعهوود
ئەو ئەمرە بە عـورف پێـی دەڵـێن وجـوود
مەبـدەئی ئاسـار (کمـا قـد سـبق)
حقیقـــةً زات واجبـــە بـــە حـــەق
بـۆ غـەیری ئـەویچ هـەم حیسـابییە
بـــە ســـەبەبی ئـــەو ئینتیســـابییە
ئەرچی ماهییەت (مـن حیـث هـی) یـەی
ناوێ بـە مەبـدەء وەک وجوودەکـەی (١٥)

ئەویچ: ئەویش. ئەرچی: ئەگەرچی

واتە: زانایان لە زوبانی زانا پیشووە بـەرزەکانی موتەکەللیمینـەوە دەگێڕنـەوە کـە لـە وەڵامـی حوکەمادا فەرمووویانە: نایسەلمێنین کە تێکڕا ماهییەت، واجـب بـێ یـا مـومکین، ناسوڵـحێت بـۆ ئەوەی ببێتە مەبدەء و سەرچاوەی ئاسار، چونکە ئەگـەر ماهییـەت ماهییـەتی واجبـە و خۆبـەخۆ پەیدا بووە نەوەک بە کاری (فاعل) ئەوە خۆی بە خۆی دەبێتە سەرچاوەی وەرگرتنی وجـوود بـەو مەعنا کە مەشهوورە و مەعلوومە کە کەون و سبووتە، هەروەها خۆبەخۆ دەبێتە سەرچاوەی ئاسـار، چونکە هەر ئەو بە راستی سەرچاوەی ئاسارە و هی‌تر تەنها دیمەنە.

خۆ ئەگەر ماهییەت ماهییەتی ناواجبە ئەوا ئەو ماهییەتە پێوەندی بە خودای گـەورەوە هەیـە و ئەو دروستی کردووە و دەبێتە مەبدەء بـۆ وەرگـرتنی بـوون، هـەر لەبـەر ئـەو پێوەندییـە دەبێتـە سەرچاوەی ئاسار.

وا دەرکەوت کە ماهییەتی واجب و ماهییەتی مومکین هەردوو مەبدەئن بۆ وەرگرتنی (بوون)ی بە مەعنا کەون و سبووت، واجب خۆبەخۆ بێ‌هۆ و، مـومکینیش بـە هـۆی پێوەنـدی لەگـەڵ زاتی خوای گەورەدا، ئەگەرچی ماهییەتی مومکین خۆبەخۆ، نە خۆی، نـە وجودەکـەی نابنـە مەبـدەئی بوون و ئاسار.

بۆچ؟ ماهییەتی (من حیث هی)یـە [١٦]
نەسولـــــحیانی بـــــۆ مەبدەئییـــــە
نـاوێ بـە مووجیـب بـۆ نەسولـحیان
دەگـەڵ ئینتیسـاب بـە واجـب دیسـان

ناوێ: نابێ. دەگەڵ: لەگەڵ.

مەولەوی درێژە بـە باسـەکە دەدات و، دەیـەوێ بەڵـگە بـۆ مەسـەلەکە بهێنێتـەوە و دەڵـێت: نەگونجانی ماهییەتی مومکین خۆبەخۆ بـۆ مەبدەئییـەت ڕێگـا لـەوە نـاگرێ کـە ئـەو ماهییـەتی مومکینە بە هۆی پێوەندی بە خودای (واجبالوجـود) ەوە ببێتـە مەبـدەئی ئاسـار، واتـە خـۆی و بوونەکەی لە خۆیانەوە نابنە بناخەی بوون و ئاسار.

بەڵام لەبەر ئەوەی خودای گەورە دروستی کردووە و بوونی داوەتـێ بـە هـەردووکیان بوونەتـە بناخەی بوون و ئاسار.

پوختەی قسە ئەوەیە کە ماهییەتی واجب و ماهییەتی مومکین هەردوو مەبدەئن بۆ وەرگـرتنی (وجود)ی بە مەعنا کەون و سبووت، بەڵام واجب خۆبەخۆ بە بێهۆ دەبێتە مەبدەء و، مـومکین بـە هۆی پێوەندییەوە بە (واجبالوجود) ەوە.

پەس لە وجوودا [١٧] وەجهـێ شـک دەوەی
عـودوول لـەو مـەعنای شـائیعە دەکـەی
دەڕۆی بـــۆ چشـــتێ تەســـەوور نـــەکرێ
ســـەردیی تەکـــەللوف مەگـــەر دایگـــرێ
پـــەس ئێمـــە مـــەوجوود علـــی الطـــرفَین
(بمعـــنی واحـــد) ئیتلاقـــی دەکـــەین
شـــەئنی ئیشـــتیراک مەعنـــەوی بنـــاس،
مەعلوومـە مووجیـب وەحـدەتی مـەعناس

واتە: پاش ئەوەی روونمان کردەوە کە ماهییەت بە کەڵکی مەبدەئییەت دێت ئەگەر ماهییـەتی واجب بێت خۆبەخۆ و، ئەگەر ماهییەتی مومکینیش بێت لەبەر ئەوەی خـودا دروسـتی کـردووە و کردوویەتی بە مەبدەء ـ ئیتر با واتای (وجود) هەر مەعنا بـاوە ئاشـکراکەی بـێ کـە پێـی دەڵـێن (کَون) و (ثبوت). هیچ هۆیەک نییە بۆ ئەوەی لەو واتا باوە لابدەیت و واتایەکیتری نەگونجاوی بۆ

دابنێیت! کەوابوو (موجود) بۆ خودا بەکار دێنین و دەڵێین (الله موجود)، بۆ مومکینیش بـە کـاری دێنین و دەڵێین (زید موجود)، مەبەستمان لە (وجود) ەکەیش کـەون و سـبووتەکەیە، ئەمـەیش هیچ هەڵەیەکی تێدا نییە، چونکە (موجود) وشەیەکی (مشترَک)ە لـە نێـوان واجـب و مومکینـدا، بەڵام کەون و سبووتی خودا لە خۆیەوەیە و، کەون و سبووتی زەید لە خواوەیە.

جـــواوی وەجهـــی ئەووەڵـــت زانی
بێینــە ســەر جــواو بــۆ وەجهــی ســانی
لــە زیــادیی وجــوود بــە ئــەم مەعنایــە
بــەر زاتی واجــب هــیچ لازم نایــە [١٨]
حاجـەت مـەر ئەوسـا بـە سـەبەب کـەوێ
کــە وجــوود ئــەمری خاریجییــە وێ
(یعـرض فــی الخــارج علــی ذاتالحــق
و لــیس کــذا کمــا قــد ســبق)
بــۆچ بــەو مەعنایــە چــاک دیارییــە
ئینتیزاعییــــــە و، ئیعتیبارییـــــە
ئــەر بڵــێی ئەمــە، ئەمــە لازمیــە
مـومکین هـەم موحتـاج بـە فاعیـل نییـە
جـــواوی دەدەیـــن (بـــلا ســـماجة):
کـە دەڵـێن مـەوجوود مـومکین موحتاجـە
(فـــی وجـــودهِ) ئەباڵـــی ســـەبەب
لـــەو عیبارەتـــە ئەمەتـــە مەتڵـــەب
(أی فـــی مبـــدء اخـــذ ذاالوجـــود
منشـــإ نـــزع ذاالکـــون المعهـــود)
کـە وەختـێ نـەوێ مـومکین بـە مەبـدەء
وە بـــێئینتیســـاب نـــەوێ وە مەنشـــەء

ئیســـــناد دەدرێ وجـــوود ئــــەباڵ ئـــەو،
بــەڕێی تەجــەووز، لێــت نــەوێ وە شـــەو
موحتــاجیی مــومکین ئــەوا بــوو مەشــهوود
(لکنّـــــە لا فـــــی نفــــس الوجـــــود)
بۆچ؟...نەفسی وجوود، ئـەر هـەی باخەبـەر،
نــاوێ بــۆ تەئســیر فاعیــل بــە ئەســەر
ئەمرێکـــە مـــەوجوود (متحقـــق بـــهْ)
ئەســـەری تەئســـیر فاعیـــل (فانتَبِـــە)
( أمّـــــا مبـــــدأ الانتـــــزاع فـــــی
ربّنـــا الواجـــب ذی اللطـــف الخفـــیّ)
ئەســـەری تەئســیر هـــیچ فاعیـــل نییـــە
(إذ هُـــــوَ ذاتُـــــە بذاتـــــە) ییـــــە...
(فـــــلا یکـــــون محتاجـــــاً الیـــــە
فـــی وجـــــودە، فاعتمِـــــد علیـــــە)

جواوی: جوابی، وەلامی. کەوێ: بکەوێ. وێ: بێ، ببێ. بلا سماجة: بلا قباحة. ئەباڵ: بـۆلای. لێت نەوێ وە شەو: لێت نەبێ بە شەو، بـا بـەرچاوت تاریـک نـەبێ. ئـەو هـەی باخەبـەر: ئەگـەر خەبەرداری.

واتە: کاتێ وەلامی دەلیلی یەکەمی حوکەماتان زانی، با بێین بـۆ وەلامـی دەلیلـی دووەمیـان، دەلیلەکە ئەمە بوو مادام وجوود زیاد بێ لەسەر زات ئەوا پێویستی بە فاعیل دەبێ، ئەو فاعیلـەیش گەر نەفسی ماهییەتی واجب بێ پێویستە لە پێش ئیجـاددا وجـوودی هـەبێ، لەمـەوە لازم دێـت وجوود پێش بکەوێ لەسەر خۆی، خۆ ئەگەر فاعیلەکە ماهییەتی خودای گەورە نەبێ ئـەوا ئـەنجام وای لێ دێ کە زاتی واجب لە ئیتتیساف بە وجوددا موحتـاجی غـەیر بـێ، (تعـالی الله عنـە علـواً کبیرا).

دیارە ئەم دەلیلە شوبهەی تێدایە و؛ وەختێ ڕاست دەبوو کە (وجود)ی زیاد لە زات حەقیقـەتێ بوایە لە حەقائیقەکان، بەلام وا نییە چونکە ئەو (وجود)ە زیادە شتێکی ئیعتیبارییە و فاعیلی ناوێ.

جا ئەگەر بلێین مادام (وجود) بەم مەعنا فاعیلی نەویێ ئەبیێ مومکینیش فاعیلی نەویێ و ئەمەیش هەڵەیە، لە وەڵامدا ئەڵێین مومکین لە (وجود)ە ئیعتیبارییەکەیدا پێویستی بە فاعیل نییە، بەڵکو لە زات و حەقیقەت و ماهییەتەکەیدا پێویستی پێی هەیە، واتە: تا ئافەریدگار نەبیێ ئەو ماهییەتە مومکینە کە بوون و نەبوونی وەک یەکە نابێت بە حەقیقەت و بە مەبدەء بۆ ئاسار و نیسبەتدانی وجوود بۆ لای ئەو (مەجاز) ئەبیێ، ئیتر مەبەست لە ئیحتیاجی مومکین بۆ فاعیل ئەوە نییە کە فاعیلی پێویستە هەتا کار بکات لە وجوودە ئیعتیبارییەکەیدا، چونکە ئەو ئەسەرەی لە فاعیلەوە پەیدا ئەبێت پێویستە شتێکی سابیت و خاوەن حەقیقەت بیێ و، ئەمری ئیعتیباری وەک وجوودی ئیعتیباری سابیت نییە و عەین نییە.

بەڵام (وجود)ی بە مەعنا (مبدا الانتزاع) لە زاتی خودای گەورەدا ئەسەری کاری فاعیل نییە، چونکە زاتی خودای گەورە خۆبەخۆ هەیە و، هەر لە خۆیشیەوە بە بیێ هیچ جۆرە پێوەندییەک بە غەیری خۆیەوە وجوودی بە مەعنا کەون و سبووتیشی دەدرێتە پاڵ.

ئەوا تەواو بوو ئەم تەقریریچە
بشنەو دوور نییە ئەم تەحریریچە
(أن قیل الوجود له معنیان
حقیقیان أو مقابلان)
(أو کما یقال علی ذا المعنی
أعنی الکون الذی ذکرنا)
(کَذا یقالُ ذا بلا غبار
علی ما هو مَبدأ الآثار)
(إمّا مطلقاً، و لعلّهُ
مرادُ الذی قالَ إنَّهُ)
(کانَ فی الکلِّ عین الماهیه)
یا مەبدەئەکە کە حەقیقییە
ئەم قەولە بێنی لە بینی دەدات
(مثل ما یقال فی باقی الصفات)
(إذ کما تطلق علی الاضافات

التـــی مـــن شـــأن مبـــادی الصـــفات)
(کـــذاک تطلـــق علـــی المبـــادی
نوضِـــحُهُ لـــک، والله الهـــادی)
بالمثـــالین؛ فحیـــث یقـــال
الله عـــالم بکـــلّ الأحـــوال
مـــوراد نـــە مەبـــدەء ئینکیشـــافەکەس
لەگرەدا، بە عیلم، بـەڵ ئیزافەکـەس [١٩]
مـــوراد ئـــەر بڵـــێی عیلمـــی عەینییـــە
ئیزافـــە نییـــە بـــەڵ مەبدەئییـــە
پەس دوور نییە عەقڵ قبووڵـی دەکـات
کـە بڵـێی وجـوود عەینـە لـە بـۆ زات
مـــوراد بـــە وجـــوود مەبدەئـــە موتلـــەق،
یـا مەبدەئەکـەی حـەقیقی بـەر حـەق.
(فـــی «هـــو موجـــود» الفکـــرُ الصـــافی
یریـــدُ بِـــهِ الکـــونَ الإضـــافیّ
الـــذی یصـــلح مِـــن غیـــر مِریـــة
للمأخذیّـــــة والمبدئیّـــــة
للإتصـــــاف و للإشـــــتقاق
کمـــا فـــی الصـــفات بـــلا إفتـــراق)

ئەم تەقریریچە: ئەم تەقریریشە. ئەم تەحریریچە: ئەم تەحریریشە. بشنەو: ببیسە. بێنی: بۆنی. بینی: لووت. ئینکیشـافەکەس: ئینکیشـافەکەیە. لـەگرەدا: لێـرەدا. بـەڵ: بەڵـک. ئـەر: ئەگـەر. ئیزافەکەس: ئیزافەکەیە.

(مەولەوی) تا ئێستە لەسەر ئەوە ڕۆیشت کە (وجود) بە مەعنای بوون بە سەرچاوەی وەرگرتنی کەون و سبووتی ئیعتیباری و پەیدابوونی ئاساری عەینی بێ.

ئێستە لەسەر ئەوە دەڕوات کە (وجود) بە مەعنای (مبدء الآثار) بێ، واتە: هەر وەکوو وجوود بـۆ ئەو مەعنا پێشووە بەکاردێ، کە بریتی بوو لە (كونُ الشيء مبدء لِإنتزاع الكَون والثبوت الإعتبـاری) هەروەها بۆ خودی (مبدءالآثار) یش بەکاردێ، چ (مبدء الآثار)ی موتڵەق بێ، واتـە: (مبـدءالآثار)ی بە ئیجاد و ئیبداع، یا (مبدءالآثار)ی (بالعادة والإكتساب)، کە بەم مەعنا دەسـت ئـەدا بـۆ واجـب و مومکین، یا (مبدءالآثار)ی کامیل بێ کە تەنها واجبە. جا ئەڵبەت ئـەو کەسـەی دەڵـێت (وجـود) عەینی ماهییەتە مەبەستی لە (وجود) عەینی مەعنای (مبدءالآثار)ە.

تەماشای ئەم دوو مەعنا بکە، کە یەکەم برتییە لە (كـونُ الشـيء منشـأ لـِإنتزاع الوجـود والآثـار الخارجية) و دووەمیش بریتییە لە (مبـدءالآثار)، بـۆنی ئـەم دوو مەعنایـە دەدا لـە لـووتی خـاوەن هەست سەبارەت بە سیفەتەکانی خودای گەورە؛ بۆ نموونە: عیلم بـە دوو مـەعنا هـاتووە، یەکـەم (كشف) و دەرخستنی مەعلومات کە مەعنایێکی (اضافی) یە، بەم مەعنایە دەبێتـە (مشـتق منـە)، فیعلی وەک (يعلم) و ئیسمی فاعیل و ئیسمی مەفعوولی وەک (عالیم) و (مەعلووم)ی لێ دروسـت دەکرێ.

هەروەها بە مەعنای ئەو سیفەتە هاتووە کە سەرچاوەیە بۆ ئەو کەشف و ئیزاحە...

دیارە ئەو کەسە کە دەڵێت عیلم عەینی زاتـە مەبەسـتی ئـەم مـەعنا دووەمەیـە نـەک مـەعنا مەسدەرییەکە.

هەر بەو ڕەنگە دوور نییە عەقل ئەوە وەربگرێت: ئەو کەسە ئەڵێت وجوود عەینی زاتە مەبەستی مـەعنای (مبـدء الآثـار) بێـت و ئـەو کەسـەی ئەڵـێت وجـوود غـەیری زاتـە مەبەسـتی مـەعنا مەسدەرییەکە بێ. جا بەم مەعنایە ئیشتیقاق لە (وجـود) ئـەکرێ و ئـەتوانی بڵـێی (هـو موجـود) وەکوو لە سیفەتی عیلمدا بێجیاوازی.

***

١ـ ئەم سەرباسە تەنها لە نوسخە چاپەکەدا هەیە.

٢ـ (فخر الدين)ی رازی ٥٤٣ یا ٥٤٤ ـ ٦٠٦ی کۆچی.

٣ـ صحيح الترمذي/ ج ٩ ص (١٠٩ـ ١١٠) الطبعة الاولى / مطبعة الصاوي بمصر. سنة الطبع ١٣٥٣ ه ـ ١٩٣٤م.

٤ـ بە پێی پەراوێزی دەستنووسەکە دەتوانین بە (ئەنفەس) یا (ئەنفوس)ی بخوێنینەوە.

٥ـ لە نێوان (جۆگە) و (نەقد) لە لایەک و، (مەنبەع) و (کان) لە لایەکیترەوە لەف و نەشری مورەتتەب هەیە.

٦ـ «پیبدَوی پیی» شێوەنووسی دەستنووسەکەیە.

٧ـ «ام هرده او هرده» شێوەنووسی دەستنووسەکەیە. دەبێ بەمجۆرە بخوێنرێتەوە: (ئەم هەردە و هەردە) واتە: بیدەرە دەستی لێکۆڵینەوە و ئەمدیو و ئەودیو کردن و رای ئەم و رای ئەو. من بە دووری نازانم (ئەم هەردا و هەردە) بووبێت، هەر بە هەمان واتا.

٨ـ بڕوانە: العقيدة المرضية. الطبعة الاولى ١٣٥٢ هـ مطبعة السعادة. بجوار محافظة مصر. ص ٩ فی الهامش. لە پەراوێزی دەستنووسەکەیشدا هێما بۆ ئەمە کراوە، هەروەها دەڵێت بڕۆ لە کتێبی ئەواندا بۆی بگەڕێ.

٩ـ چاپەکە دەڵێت: (لە هەر دواندا).

١٠ـ ئایەتی (٥٣) سوورەتی (فصّلت).

١١ـ ئایەتی (٢٨) سوورەتی (رعد).

١٢ـ واتە: موحتاجی دەکەی بە غەیر لە بووندا.

١٣ـ واتە: ڕێک کەوێ...تاد.

١٤ـ لە نوسخە دەستنووسەکەدا (احبار) ە، لە چاپەکەدا (اخبار) ە، لەوانەیە (اخیار) بووبی. هەرچۆن بێ هی دەستنووسەکە تەواوە.

١٥ـ لە نوسخە دەستنووسەکەدا بەمجۆرەیە کە من نووسیومەتەوە. لە چاپەکەدا نووسراوە: (هیە) = هییە و (وجودیە) = وجوودییە.

١٦ـ لە نوسخە چاپەکەدا ئەم بەیتە و بەیتی دوایین پاش و پێش کراون. ئەمەی ئێمە وەک نوسخە دەستنووسەکەیە، وابزانم ئەمە ڕاستە.

١٧ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لە پاڵ وشەی (وجود)دا نووسراوە: «فيه لطافة». واتە: هەڵدەگرێ (وجود) بە واتای (جیهان) و هەڵیش دەگرێ هەر (وجود)ە کە بێت کە باسی دەکەین. بەڵێ (سعدی)ی شیرازیش (وجود)ی بە واتای جیهان بەکار هێناوە و دەڵێت:

«بە جان زندەدلان (سعدیا) کە مُلک وجود

نیرزد انکە دلی را ز خود بیازاری»

١٨ـ ئەمەی کە دەیبینی هی دەستنووسەکەیە، لە نوسخە چاپەکەدا (بەر زات ئیحتیاج...) ە، بەڵام لە دەستنووسەرەدا لەسەر کەلیمەی (واجب) نووسراوە (احتياج ب) واتە [(احتياج) بدل (واجب) ] واتە: دروستە لەباتی (واجب) وشەی (احتياج) دابنرێت. گومان لەوەدا نییە کە (ئیحتیاج) پڕ بە پێستی شوێنەکەیە، بەڵام ئەگەر (واجب) یش بێ هەر مەعنای دێت و دەبێتە (مضاف اليە) بۆ (ذات)، لەم حاڵەدا کەلیمەی (هیچ) واتای (ئیحتیاج) دەبەخشێت؛ واتە: لە زیادبوونی وجوودی ئیعتیباری لەسەر زاتی باری هیچ جۆرە کەم و کوورییەک روو نادات، کەم و کوورییەکەیش هەر ئیحتیاجی بە فاعیلە.

١٩ـ واتە: موراد بە عیلم مەبدەئی ئینکیشافەکە نییە، بەڵکو ئیزافەکەیە.

## مبحث الوحدة [1]

گەردەلوول[2] تۆز کەسرەت هەڵـی‌کـرد
سـەفای لـە رووی جـام دەروونم لابـرد
دڵ خەفــەس لــە نــاو تــۆز و خاکــدا
بـــێ وەســـەر تەوحیـــد زاتی پاکـــدا
ئـەرچی بـۆ وجـوود نـەوعی دووەمـین
یـەک واجـب وجـوود کافیـە یـەقین
لەبـەر ئیسـتیغنا بـەو یەکـە بـێ‌شـک
بە خودا ناون هەردوو یـا ئـەم یـەک[3]
لاکین ئـەووەڵ جـار کـە پێـی نیـا نـاو
عـــەقل تەعـــەددود تێرێتـــە بـــەرچاو
بـــۆ لابـــردنی تـــۆزی وەسواســـە
نـــەفیی تەعـــەددود بکریـــە خاســـە

ناون: نابن. تێرێتە بەرچاو: دەهێنێتە بەرچاو. بکریە: بکرێ، بکرێت. خاسە: چاکە، باشە.

واتە: بـە هـۆی درێـژەدان بـە باسـی عەینییـەت یـا زیـادەی وجـوود لەسـەر ماهییـەتی زاتی (واجب‌الوجود) گێژەڵووکەی تۆزی مەعنەوی هەڵی کرد و سـافی و روونی لـە رووی جـامی دڵـم لابـرد، دڵ خەفەیـە لـە نـاو تـۆز و خاکـدا، کەواتـە وەرە بـۆ سـەر باسـی تەوحیـدی زاتی پـاکی پەروەردگار:

جا هەرچەند بۆ دروست‌کردنی جۆری دووەمی (موجود) کە (ممکـن)ە یـەک (واجـب‌الوجـود) بەسە، ئەگەر کەسێ واجبێکی دووەم بکات بە هاوبەشی (واجب‌الوجـود) ەکـە، قەسـەم بـە خـودا،

لەبەر ئەوەی تەنها (واجب‌الوجود)ە راستەقینەکە بەسە، نە هەردوو واجبەکە بە یەکەوە و نە واجبە دووەمەکە نابن بە خودا و ئافەریدگار، بەڵام یەکەمجار کە عەقڵ پێی خستە مەیدانەوە و بیری کردەوە لە مەعنای (واجب) وای دادەنێ ئەفرادی زۆرە؛ بۆیە پێویست دەبێ لە پێناوی لابردنی تۆزی وەسوەسە و دوودڵی و ڕاڕاییدا یەکیەتیی خودای گەورە بسەلمێنرێ.

زانایانی زانستی (کلام) وتوویانە نابێ واجب نە بەشەکانی زۆر بن و نە تاکەتاکەکانی زۆر بن، واتە ئەبێ هەر یەک بێ، وتوویانە نابێ واجب تێکەڵ و راستییەکی خاوەن بەش بێ؛ چونکە هەموو شتێکی ئەجزادار موحتاجی ئەجزاکانیەتی، ئەجزاش بە غەیرە حسێب ئەکرێ و، هەرچیش موحتاجی غەیر بێ (ممکن)ی (خاس)ە و نابێ (واجب) بێ.

بە شێوەیێکی تر وتوویانە: ئەگەر (واجب) لە بەشەکانی تێکەڵ بێ یا بەشەکانی هەموویان یەکە یەکە (واجب‌الوجود) ن، ئەمەیش واتە زۆر بوونی واجب. خۆ ئەگەر بەشەکانی (واجب‌الوجود) نەبن ئەوەی لێ پەیدا ئەبێ کە واجب موحتاجی مومکین بێ، دیاریشە ئەو شتەی موحتاجی مومکین بێ زیاتر شایانی مومکینییەتە، چونکە موحتاج لە (محتاج الیە) پەستترە و ئەم ئیحتیاجییە پایەی زۆر دەهێنێتە خوارەوە.

هەروەها بە شێوەیێکی تر وتوویانە ئەگەر (واجب) لە پارچەپارچە و بەش‌بەش پێک‌هاتبێ ئەو بەش و پارچانە یا پێویستییان بە یەکتر هەیە یا نا، ئەگەر پێویستییان بە یەکتر بێت ئەوە واتە مومکینن، ئەنجامی ئەمەیش ئەوە دەبێ کە واجبەکەیش مومکین بێ، چونکە شتی لە مومکینات پێکهاتوو مومکینە.

خۆ ئەگەر ئیحتیاجییان بە یەکتر نەبێ ئەوا نابێ حەقیقەتێکی تەنها لەو بەشانە دروست بێ؛ چونکە بەشەکانی مورەککەبی راستەقینە پێویستە هەموو موحتاجی یەکتر بن.

دەربارەی زۆریی ئەفراد وتوویانە: نابێ (واجب‌الوجود) ئەفرادی زۆری هەبێ؛ چونکە ئەگەر ببێ پێویستە هەر تاکێک دیاری و جیاواز بێ لەوی تر. هۆی ئەم دیاری بوون و جیاوازییەش نابێ خودی ماهییەتی واجب یا شتێکی لازمی ماهییەتی بێ، ئەگەر وابوایە ئەفرادی ئەو ماهییەتی (واجب‌الوجود)ە زۆر نەدەبوون.

کەوابوو هەر ئەوە دەمێنێتەوە کە هۆی دیارییەتی و جیاوازیی ئەو ئەفرادانە شتێکی لە ماهییەتی واجب بەدەر بێ، ئەمەیش مەحاڵە چونکە ئەوەی لێ دێتە ئەنجام کە (واجب‌الوجود) واجب نەبێ، دیاریشە هەر شتێ موحتاجی لە خۆی بەدەر بێ هەرگیز (واجب‌الوجود) نابێ.

بە شێوەیەکی‌تر فەرموویانە ئەگەر (واجب‌الوجود) زیاتر لە فەردێکی هەبێ پیویستە هەر فەردێکی دیارییەتی هەبێ، لەم کاتەدا یا لە نێوان دیارییەتی و وجووبی وجوودیا لزووم ئەبێ یا نا، ئەگەر لزووم لە نێوانیاندا نەبێ ئەبێ دروست بێ کە وجووبی وجوود بە بێ دیارییەتی (تعین) ببێ، ئەمەیش مەحاڵە، چونکە هەموو (واجب‌الوجود) دەبێ دیاری (متعین) بێ. هەروەها ئەبێ دروست بێ دیاریەتی (تعین) بە بێ(وجوب) ببێ، ئەمەیش مەحالە چونکە وجووب لەو ماهییەتە دیارییە جیا نابێتەوە و ماهییەتی واجب هەمیشە لەگەڵ وجووبدایە، بەڵکو ئەنجامی (تعین)ی بێ‌وجووب ئەوە دەبێت کە ماهییەتی واجب مومکین بێ. وە ئەگەر لە نێوان وجووب و (تعین) ەکەدا لزووم هەیە و لە یەکتر جیانابنەوە، لەم بارەدا ئەگەر وجووب لە (تعین) ەکەوە پەیدابووبێ ئەنجامەکەی دەبێتە پێشکەوتنی وجووب لەسەر خۆی، چونکە پێویستە بوون و وجووبی عیللەت لە پێش بوونی مەعلوولەوە بێت، واتە: ئەو (تعین)ە کە هۆی وجووبە ئەبێ لە پێش وجووبدا لەگەڵ ماهییەتی واجبدا هەبێ، بێجگە لەمەیش خراپەیەکی‌تری لێ پەیدا دەبێت ئەوەیش ئەوەتە کە عیللەتی وجووبی واجب غەیری زاتی واجب بێ. خۆ ئەگەر (تعین) ەکە لە وجووبەوە پەیدا ببێ یا (تعین) و (وجوب) هەردووکیان لە زاتەوە پەیدا ببن، لەم حاڵەدا پێچەوانەی ئەوە دێتە جێ کە بڕیار دراوە؛ تۆ وات بڕیار دابوو کە واجب ئەفرادی هەیە، کەچی کە (تعین) لازمی زات بێ قابیل نییە ئەو ماهییەتە دوو فەردی ببێ.

وە ئەگەر (وجوب) و (تعین) هەردووکیان بە شتێکی لە زات جیا پەیدا ببن ئەوا ئەنجامەکەی ئەوە دەبێ کە واجب واجب نەبێ، چونکە (تعین) و (وجوب) ەکەی لە شتێکی لە واجب جیا پەیدابوون و، ئەو واجبە موحتاجی شتە جیاکەیە، دیارە هەر شتێکی موحتاج بە ئەمری جیا لە خۆی مومکینە.

زانای پایەبەرز مەلا جەلالی دەووانی لە شەرحی (عقایدی عضدیە)دا دەفەرموێ: «لای حوکەما (وجود)ی خودای گەورە و (تعین) ەکەی عەینی زاتی خودایە، کە (تعین) و (وجود) عەینی زات بێ پیویستە ماهییەتی خودای گەورە (جزئی)ی (حقیقی) بێ و ماهییەتی (کلّی) نەبێ، نە ماهییەتی نەوعی و نە ماهییەتی جینسی، چونکە ئیسبات کراوە ئەگەر (تعین)ی (حقیقەت) عەینی حەقیقەتەکە بێ ئەوا ئەو حەقیقەتە جوزئییی حەقیقی دەبێ، وە ئەگەر (تعین) ەکەی زیاد بێ لەسەر ماهییەت ئەوا حەقیقەتەکە (کلّی) ئەبێ، جا ئەگەر (تعین) ەکە لازمی ئەو ماهییەتە بێ

ئەوا ئەو ماهییەتە (كلّی منحصر فی الفرد) ئەبێ، خۆ ئەگەر (تعین) ەكـە لازمـی ماهییـەت نـەبێ ئەوا ماهییەتەكە (مشترک) دەبێ لە نێوان ئەفرادی زۆردا. ئەمەیش شتێكی ئاشكرایە».

جا مەولەوی؛ رەحمەتی خودای لێ بـێ؛ بـۆ گوشـادكردنەوەی مەیـدانی ئـەم باسـە تـەنازولی كردووە لەوە و بڕیاری ئەوە ئەدا كە ئەگـەر واجـب (كلـی) یـش بـێ هـەر پێویسـتە (منحصـر)ی (فی‌الفرد) بێت، وەكوو لەم هۆنراوانەی خوارەوە دەرئەكەوێ كە ئەفەرموێ:

(واجـــبالوجـــود) كـــونهی مەخفییـــە
راســـە نـــایزانین، زانیـــاگ نییـــە،
لاكـین دەزانـین یـەک حەقیقەتـە [٤]
ئـــەم زانینیچـــە بـــە حەقیقەتـــە
بۆچ؟ حاكی لە ئـەو هـەر مەفهوومێكـە
یەقینـە ئەڵـبەت، مـەحكیچ یەكێكـە
بۆچ؟ ئەو یەک مەعنا ئەرسـەد كوللییـە
تەســـەووری مـــەنع شـــەریكی نییـــە
ئایـا زاتی وێ بـۆ (ماتحـت)ی خـۆی
یـا عـەرەزی وێ، تـەفاووت نەكـەی،
حیكایـەت نـاكرێ، زەریفـی بشـنەو،
ئومـووری كەسـیر موختـەلیف بـە ئـەو
مەر موشتەریک ون لە چشتێدا گشـت؛
لە گشتیاندا مـەوجوود وێ ئـەو چشـت
هەر ئەو یەک چشتە مەحكییە (بالذات)
حیكایـەت لـەوان (بـالتبع) دەكـات
لەمـەدا چ تـۆز شـوبهە و شـكێكە [٥]
مـەحكیی ئـەو تـەنیا مـەعنا یەكێكـە
هەرگاه كە مەحكی یەک حەقیقـە بـوو
چونكـە حـاكیی ئـەو بـەو تەریقـە بـوو

ئەگــەر بــۆ فــەردی بــوێ تەکەســـور
(خارجـــاً کمـــا حیـــث التصـــور)
پــەس بــە ئەمرێکــە تــەمیزی ئــەفراد
لـــەو ماهییەتـــە موشـــاعە زیـــاد
تەعــەیون بــە نــەفس ئــەو ماهییەتــە
ناوێ؛ ماهییــەت چونکــە یــەک چشــتە
تەعەییون ئــەر لــەو تــەرەتتوب کــەوێ
چلــۆن تەعــەددود بــۆ فــەردی دەوێ
لــە تەعــەییون‌دا ئــەوا بــوو ئیســـبات
حاجــەت بــە ئــەمرێ زیــادە لــە زات
تەعـــەییونیچ خـــۆ راســـە و جازیمـــە
دەگەڵـــــی وجـــــوود موتەلازیمـــــە
لازم بـــوو نـــەبوو واجـــبی مـــەعبوود
(ذاتُـــهُ بالـــذات) مەبـــدەء بـــۆ وجـــوود
(هَــف) یــانی: (هــاذا): ئــەم لازمییــە
(خلــفٌ): خــیلافی فــەرزی ئیمەیــە [٦]
پایـــانی ئەمـــە بـــە باتیـــل زانـــە
بــۆچی؟ ئیحتیــاج (خاصــە)ی ئیمکانــە

زانیاگ: زانیاو. زانینیچە: زانینیشە. ئەرسەد: ئەگــەرچی. وێ: بــێ. بشــنەو: ببیســە. موشــاع: موشتەرەک. ناوێ: نابێ. ئەر: ئەگەر. کەوێ: بکەوێ، لێی پەیدا بێ. زانە: بزانە.

واتە: کونهی حەقیقەتی (واجبالوجود) لە ئێمە پۆشراوە و نایزانین، بەلام بە راستی ئەزانین کە یەک حەقیقەتە، چونکە (حاکی) و گەیێن و روون‌کەرەوەی ئەو حەقیقەتە تەنها شتێکە موناســب و گونجاو بۆ حەقیقەتی ئەو، ئەوەیش (واجبالوجود)ە. جا مادام (حاکی) یــەک مەفهوومــە پێویســتە (محکی) یش یەک شت بێت. (واجبالوجود)، ئەگەرچی (کلّی)یە و (تصوّر)ی (کلّی) مــانیع نییــە لەوەی کە ئەفرادی زۆر تێیدا هاوبەش بــن، چ زاتی بــێ بۆیــان یــا عــەرەزی، نابێتــە (حــاکی) لــە

ئەفرادی زۆر وەک زەید و عەمر...تاد، مادام (حاکی) یەکە ئەبێ (محکی) یش یەک مەفهووم و یەک چشت بێ.

بۆ نموونە ئەگەر بلێین (واجبالوجود) حاکییە و مەفهوومی (الباری تعالی) مەحکییە و لە ژێر مەفهوومی (الباری تعالی)دا چەند فەردێکی واجب هەیە، ئێمە بە دەلیل ئیسباتی ئەوە دەکەین کە مەحاڵە مەحکی واتە (الباری تعالی) چەند فەردی هەبێ، ئەڵێین ئەگەر ئەو مەحکییە لە خاریج و واقیعدا ئەفرادی زۆری هەبێ، وەک لە (تصوّر)ی عەقڵدا ئەبێ ئەو ئەفرادانەی (متمیّز) بن و لە یەک جیا بکرێنەوە، (تعیّن) و جیابوونەوەیەک کە لە ماهییەتی مەحکییە موشتەرەکەکە زیاد بێ و عیللەتەکەیشی نەفسی ماهییەتە موشتەرەکەکە نەبێ؛ چونکە ئەو ماهییەتە موشتەرەکە یەک چشتە، ئەگەر هۆی (تعین) ئەو بوایە ئەفرادی زۆری نەدەبوو، کەوابوو ئەبێ هۆی ئەو (تعین)ە شتێ بێ بەدەر لە ماهییەتە موشتەرەکەکە، خۆ لای حوکەمایش (تعین)ی (باری) و (وجود) ەکەی (متلازم) ن، لێرەیش ئەنجام وای لێ هات مادام (تعین)ی ئەو ماهییەتە لە شتێکی خاریجەوە بێ ئەبێ (وجود) ەکەیشی لە شتێکی خاریجەوە بێ، ئەوا دەرکەوت ئەگەر ماهییەتی واجب ئەفرادی هەبی ئەبێ (تعین) و (وجود)ی لە غەیری زات و حەقیقەتی واجبەوە وەربگرێ و (واجبالوجود) مەبدەء نەبێ بۆ (وجود) و (تعین)ی خۆی و لە غەیرەوە وەریانبگرێ، ئەمەیش پێچەوانەی ئەوەیە ئێمە بڕیارمان دا کە (واجب) خۆی (بالذات) مەبدەئە بۆ (وجود) و (تعین)ی نەک شتێکیتر و بەڵکو هەر عەینی زات بن. هەروەها لازم هات کە (واجبالوجود) مومکینی خاس بێ چونکە دەرکەوت کە لە (وجود) و (تعین) یدا پێویستی بە غەیری خۆی هەیە، هەرچیش لە وجوود و تەعەییونیدا پێویستی بە غەیری خۆی بێ مومکینی خاسە.

بەڵ ئەر تێ فکری دیسان لازم هات،
هەروەک ئیحتیاج، تەرەککوب بۆ زات
(أي ممّا بە الاشتراکُ کان
و ممّا بە الامتیازُ بان)
ئەگەر بپرسی بۆچی (واجبَین)
یەک ماهییەت ون یا موختەلیفەین
لە وجووبدا شەریکن هەردوو
ئەویچ یەک مەعناش خۆ لێت مەعلووم بوو

کە مەئخووز ناویٚ یەکیٚ لە ئەمرەین
مەگەر لە چشتیٚ (مشترک فی البین)
بویٚ وە مەئخەز مەبدەء بیٚ‌گومان
ئەو چشتە بۆ ئەو یەک مەعنا وتمان
کە ئیشتیراکت لەویٚدا دا ساز
ئەمریٚ تر (لابدّ) بوو بۆ ئیمتیاز
بۆچ؟ شەیئی واحید قەد ناویٚ بە عەین
لەبۆ ئەمرەینی موتەغایرەین
لەبەر یەک حاکی مەحکی واحید بوو
ئیمتیاز بە ئەمر لە زات زائید بوو
لازم هات تەرکیب (بلا تردّد)
وەک حاجەت (بنا علی التعدد)
بەم خولفە لە گەرد کەسرەت لازم بوو
وا گەردی کەسرەت لە رووی دڵ لاچوو
لەسەر دۆشەکەی لە کەسرەت پاکی
گویٚ رادێر خۆش‌خۆش لە مەحکی و حاکی
بنوو وە تەوحید ئەو بیٚ‌چوونەوە
وە گۆڕ شوبهەی (بن کمونە) وە
ناگونجیٚ دیتر تەقریری زائید
کەلام بێتە سەر بەحسی عەقائید
سەردی مەسائیل بویٚ وە تەفسیل
ئەغلەب بیٚ‌دەلیل، جارجاریٚ دەلیل
تەهزیبی کەلام نەکەین زەریفە
بەحسی سیفات و زاتی شەریفە

قەنـد تـا موکـەڕڕەڕ، موشـک تـا وەکـۆتر
مـــەزاق شـــیرین‌تـــر، دەمـــاغ خۆشـــبۆتر

بەڵ: بەڵکو. ون: بن. ئەویچ: ئەویش. گوێ رادێر: گوێ رابگرە. بنوو: بخەوە. دا سـاز: ساز دا. وەکۆتر: بە کۆمەڵتر.

واتە: ئەگەر باش ورد ببیتەوە هـەروا لازم دێ کـە ماهییـەتی واجـب مورەککـەب بـێ لـە (ما بەالاشتراک و ما بەالامتیاز) جا ئەگەر ئەپرسی بۆچی؟ ئەڵێم لەبەر ئەوە کە دوو واجـب، چ فـەردی یەک ماهییەتی نەوعی بن وەک زەید و عەمر بۆ ئینسان، یا بەشی دوو ماهییـەتی نـەوع جیـا بـن وەک ئینسان و شێر، مادام لە وجووبی وجووددا هاوبەشن، ئەویش یەک مەعنایـە کـە تـەعبیر لـە زاتی باری ئەداتەوە و ئەویش یەک مەعنایە، یەک مەعنا لە دوو شـت وەرنـاگیرێ ئـیللا بـە هـۆی چشتێکەوە کە موشتەرەک بێ لە بەینی ئەو دوانەدا و ببێتە (محکی)ی (بالذات) بۆ ئەو (حاکی)یـە کە وتمان. مادامیش ئیشتیراکی ئەو دوو واجبەت لەو (محکی) یا سازدا پێویستیشـت بـە (ممیـز) دەبێ بۆ جیابوونەوەی هەرکامیان لەوی تر؛ چونکە تاقە شتێکی موشتەرەک نابێتە حەقیقـەتی دوو فەردی (مختلف الهویة) چ جایێ دوو فەردی (مختلف النوعیة) ئـەوا بـەبێ تـەڕەددوود ئـەوە لازم هات کە (واجب‌الوجود) تێکەڵ بێ لە موشتەرەک و مومەییز، هەروەها لازم هات واجب موحتـاجی غەیر بێ، ئەمانەیش بە ئاشکرا بۆ واجب مەحاڵن.

جا بە هۆی ئەم خولف و فەسادەوە کە لە تـۆزی زۆریـی ئـەفرادی واجبـەوە لازم هـات، تـۆز و گەردی زۆری ئەفرادی واجب لە دڵما نـەما و بـاوەڕم کـرد کـە بـە راسـتی (واجـب‌الوجـود) تاقـە فەردێکە.

جا پاش ئەو شادی و دڵگوشادییە لەسەر دۆشـەکەی پـاک لـە قەرەباڵـغی زۆری بـە خۆشـی و رێک‌وپێک گوێ لە مەحکی و حاکی بگرە و بە باوەڕی خودا بە یەک ناسینەوە بخەوە، ئەو خودایە کە بێ‌چەند و چۆن و مانەند و وێنەیە، ئیتر گوێ مەدەرە ئەو قسە پڕوپووچانەی لە (ابن کمونـە)ی جوولەکەیەوە دەگێڕنەوە.

گوایا (ابن کمونە) وتوویەتی: ئیحتیمـالی ئـەوە هەیـە ئـەو دوو فـەردی واجبـە دوو ماهییـەتی واجبی بەسیت بن و وجوود و تەعەیون عەینی زاتیان بێ، دیارە کە بەسیت بن (ما بە الاشـتراک) و (ما بە الامتیاز) پێویست نییە.

بەرپەرچ دانەوەی ئەم شوبهەیە لەبەر رووناکیی کەلامی مەولەوی بەوە ئەبێ کە (حـاکی) وەک مەفهوومی (واجبالوجود)، زاتی بێ یا عەرەزی حیکایەت لە یەک مەعنای وا دەکا کـە بـریتی بـێ لە حەقیقەتی (واجب تعالی) چونکە واجبالوجود وەها تەماشا ناکرێ کە مـەفهوومێکی ئیعتیبـاری بێ وەک (مطلقالوجود) یا (مطلقالموجـود) بەڵـکو وەهـا ئیعتیبـار ئـەکرێ کـە تـەعبیر بـێ لـە حەقیقەت و زاتی خودای گەورە، جا مادام ئەو دوو فەردە لەو حەقیقەتەدا هاوبـەش بـن پێویسـتە هەرکام لەوان (ممیز) ێکی تایبەتیی راستەقینەی هەبێ کە لە فەردەکـەیتـری جیابکاتـەوە، بـەم شێوە تەرکیب لە حەقیقەتی واجبدا پەیدا ئەبێ، ئەوەیش مەحاڵە.

بێجگە لەمە کابرا هەر تەماشای لزوومی تەرکیبی کردووە، ئیتر خۆی لـەوە گێـل کـردووە کـە وجووبی وجوود لە سیغەی (الواجب)دا شیعاری کەمالی موتلەقە و، کەمالی موتلـەق مانیعـە لـەوە بەرامبەر بەو واجبێکی دووەم هـەبێ. هـەروەها کـەمالی موتلـەق ئەوەیـە کـە بـە هـەموو حالـێ واجبالوجود (محتاج الیه) بێ، دیارە لە حالەتێکدا دوو واجب پێکەوە بـن دەبـێ هـەر یـەک لـەو دوانە (محتاج الیه) بێ؛ چونکە واجبالوجودە وە لـە هـەمان کاتـدا (مسـتغنی عنـە) بـێ، چونکـە ئیکتیفا بەویتریان ئەکرێ، وا لە یەکەیەکەی ئەو دوو واجبـەدا کۆبوونـەوەی دوو دژ رووئـەدا کـە ئیحتیاج و ئیستیغنایە و، کۆبوونەوەی دوو دژیش مەحاڵە.

هــەروەها تەماشــای ئــەوەی نــەکردووە مــادام ئــەو دوو ماهییەتــە بەســیتە هــەردووکیان (واجبالوجود) ن وجووبی وجوود (اخس) و (الـزم)ی ئەشـیایە بۆیـان چـۆن ئـەبێ ئـەو دوو زاتـە پێوەندییان بە یەکەوە نەبێ و حەقیقەتێکی شامیل بۆ هـەردووکیان نـەبێ ئێمـە تەماشـا ئەکـەین مادام زەید و عەمر لە ئەوسافدا موتەناسیبن ئەڵێین هەردووکیان ئینسانن، وە مادام ئینسان و شێر هەردووکیان حەسساسن ئەڵێین هەردووکیان حەیوانن، وە مادام ئینسان و درەخت هـەردووکیان نەشـونوما دەکـەن ئەڵـێین هـەردووکیان جیسـمی نەشـونوماکەرن، وە مـادام ئینسـان و نـەفس هەردووکیان (قـائیمی بالـذاتن) خۆبـەخۆ هـەن و بـە شـتێکەوە نـەلکاون ئەڵـێین هـەردووکیان جەوهەرن، وە بەم جۆرە مادام ئـەو دوو زاتـە هـەردووکیان (واجـبالوجـود) ن ئـەبێ حەقیقـەتی شامیل بۆ هەردووکیان ببێ وەکو (الاله) یا وێنەی ئەو.

ئەگەر رەخنەگر بڵێت: قابیلـە ئیشـتیراکی ئـەو دوو زاتـە بەسـیتە وەکـو ئیشـتیراکی زەیـد و کەیفیاتی نەفسییەی ئەو بێ لە وجووددا و هیچ زاتییەک نییە بۆ ئـەو دوانـە، لـە وەلامـدا ئەڵـێم: وجووبی وجوود عەرەز نییە و ئیشتیراکی زەید و عەمرە لە (الحیوان النـاطق) دا، وە ئـەو کەسـەی

ئەڵێت وجووبی وجوود عەینی ماهییەتی خودای گەورەیە مەبەستی وجووبی بە شێوەی عەرەز نییە، بەڵکو مەبەستی لە وجووب زات و حەقیقەتە.

شایانی باسە لە فەرموودەکەی (مەولەوی) دا، کە دەڵێت «گوێ رادێر خۆش‌خۆش لە مەحکی و حاکی»، لەتافەت هەیە، یەکێ لە مەعناکانی ئەوەیە کە لە پێشەوە باسی کرد: حاکی مەفهوومی (واجب‌الوجود) و مەحکی ئەو حەقیقەتە بوو کە موشتەرەکە لە بەینی دوو زاتە واجبە بەسیتەکەدا.

مەعنای دووەم: حاکی نەفسی (مەولەوی) خۆیەتی و مەحکیش ئەو تەقریرە جوانەیە کە لە بابی تەوحید و رەد دانەوەی قسەکەی (ابن کمونە)دا بۆی گێڕاینەوە.

دوور نییە مەبەستیش ئەوەبێ: مادام بەم باسە کە من بۆم کردی لە ئیشکال و شوبهەی ئەم جۆرەکەسانە رزگار بووی ئیتر بۆ خۆت بە دڵخۆشی بنوە و گوێ بگرە لە حیکایەت‌خوانێ حیکایەتت بۆ بکات هەتا باش خەوت لێ بکەوێ.

لێرەدا چەند دەلیلێکی جوان بۆ یەکیەتیی زاتی خودای گەورە لە زانایانی (متکلمین) ەوە دەگێڕنەوە:

یەکەم: ئەگەر دوو خودا ببن، کە هەردووکیان خاوەنی سیفاتی تەواو بن، کاتێ کە نیازی دروست‌کردنی شتێکیان کرد. وەکو جووڵانەوەی زەید لە شوێنێک لەم حاڵەتەدا یا ئەو جووڵانەوەیە بە هەردووکیان ئەکرێ ئەمەیش دەبێ شتێکی تەنها لە ژێر دەسەڵاتی دوو تەواوای تەواودا بێ، ئەمەیش مەحاڵە چونکە هێزی خودایی بەش‌بەش ناکرێ و کەم و زیادی نییە و بۆ ئیجادی هەر مومکینێ لە مومکینات تەعەللوقی پێیەوە کافییە. وە ئەگەر بە یەکێ لەو دوانە ئەبێ لازم دێ (تەرجیحی بلا مرجّح) چونکە ئەوەی دەبێتە هۆی قادریەت زاتی خودایە و هۆی مەقدوورییەتیش ئیمکانی مومکینە و نیسبەتی مومکینات بۆ لای ئەو دوو خودایە یەکسانە و بێ‌فەرقە، کەوابێ ئیش‌کردنی یەکێکیان بە تایبەتی هەڵەیە.

دووهەم: ئەگەر دوو واجب ببن کاتێ کە یەکێکیان خواستی جووڵانی زەیدی هەبوو، ئەویتریان خواستی لەسەر جووڵانی نەبوو لەم حاڵەدا یا خودای دووەم ئەتوانێ دەست بێنێتە رێی یەکەم و مەنعی بکات یا نا، ئەگەر نەتوانێ واتە: بێ‌دەسەڵات و داماوە، بێ دەسەڵاتییش بۆ خودا مەحاڵە، ئەگەر ئەتوانێ مەنعی بکات یا ئارەزوو خواستی هەردووکیان دیتە جێ لەمەوە لازم دێ (اجتماع الضدین) واتە کۆبوونەوەی دوو دژ، یا هیچ خواستێ نایەتە جێ، ئەمەش واتە بێ‌دەسەڵاتیی

هەردووکیان، یا یەکێکیان ئەبێ، کە مانای وایە ئەویتر بێدەستەڵاتە، هـەروەها دەبێتـە (ترجیحـی بلا مرجّح) ئەم دەلیلە پێی دەڵێن (دلیل التمانع).

ئایەتی پیرۆزی (لو کان فیهما آلهة الا الله لفسدتا) هێمایە بۆ ئەم دەلیلە.

ئەگەرچی لای هەندێ کەس دەلیلێکی ئیقناعییە و بورهان نییە گوایـا لەسـەر یاسـای عـادەت دامەزراوە، ئەگەرنا لەوانەیە ئەو دوو خودایە بکەونە یەک و هـەر ئیشـێ کـە بیکـەن بـە خواسـتی هەردووکیان بێ.

بەڵام ئەگەر بە راستی تەماشای ئەم ئایەتە بکرێت بورهانە و دەلیلێکی قەتعییە، چونکـە ئەگـەر دوو خودا ببن لە حەدی زاتی خۆیاندا تـەمانوع لـە ناویانـدا مومکینـە، هـەر چەنـد (بالفعـل) ئـەو تەمانوعە نەبێ، ئیتر لە ئیمکانی تەمانوعیانەوە ئیمکـانی عیجـزی هـەردووکیان دێتـە جـێ و لازم دێت کە هیچیان خودا نەبن، چونکە بێدەستەڵاتی بۆ خودا مەحاڵە، جا کە هیچیان خودا نـەبوون دیارە ئەم جیهانە بە بێ کردگار و فاعیل نابێ و، دەبوا هەرگیز ئەم جیهانە نەبوایە، خـۆ ئاشکرایشـە کە جیهان هەیە و لەبەر چاودایە، کەوابوو خودا هەیە و تاقە خوداییێکیشە.

سێهەم: ئەگەر دوو (واجبالوجود) ببن، ئەگەر هەر دوو رێک بکەون و پێکەوە کار بکـەن ئـەوە مەعنای ئەوەیە دوو فاعیل لەسەر یەک کار کۆ ئەبنـەوە، ئەگـەر نـاجۆریش بـن و هـەر یـەک بـە لایەکدا رای بکێشێ تەمانوع روو دەدا، دیارە ئەم دوانە هەردووکیان تەوارود و تەمانوع مەحاڵن.

چوارەم: هەر کاتێ تاقە (واجبالوجود) ێ هەبێ ئەوە بۆ هەموو ئیبداع و ئیجادێ ئیکتیفای پـێ ئەکرێ، ئیتر واجبی دووەم زیادە و بێسوود دەردەچێ، شتی زیاد و ئیحتیاجی پـێ نـەبوویش بـۆ خودایەتی ناشێ.

پێنجەم: مادام ناردنی پێغەمبەران لەسەر یەکیـەتی خـودا رانەوەسـتاوە دروسـتە بـەو دەلیلـە (سمعی) یانەی لە پێغەمبەری خۆمان و پێغەمبەرانیتر بیسراون یەگانەگیی خودا بسـەلمێنرێت و (دَور) روو نادات؛ بۆیە دەتوانین بڵێین بە پێی رەهنومایی قورئان و پێغەمبەران، کە راستگۆییان بە موعجیزە سابت بـووە، خـودا یەکـە؛ چونکـە ئەمانـە هـەموو لەسـەر یەگانـەگیی خـودای گـەورە پێکهاتوون.

شەشەم: کە یەگانەگی نەبێ ژمارە دێتە پێشەوە، کە تەرجیح بۆ عەدەدێ نییە پێویستە هـەموو عەدەدێ بەتاڵ بێت و بڕیاری تاکی و تەنیایی خودای گەورە بدرێ.

لە پاشاندا (مەولەوی) دەفەرموێ: «ناگونجێ دیتر تەقریر زائیـد» واتـە: لەمـە زیـاتر تـەقریری دەلیلی تەوحید لێرەدا ناگونجێ، چونکە ئەم هۆنراوە کورتە کتێبێکە جێگەی درێـژەدان بـە بـاس نییە، با ئیتر باسی بیروباوەڕ و ئەرکانی ئیمان بکەین و مەسەلەکان بهۆنینەوە بە رەسایی، لە گەلێ شوێندا بێدەلیل و جارجاریش لەگەڵ دەلیلدا، لەم باسانەدا زۆر تەهزیبی کـەلام نەکـەین چاکـە، چونکە شوێنی باسی سیفاتی خودای گەورەیە و پێویستە بە ڕووناککردنەوە، بێگومان ئـەم باسـە وەک قەند وایە تا سافتر بێ شیرینی زۆرتر ئەبێ و، وەک میسک وایە تا بـەکۆمـەڵتـر بـێ بـۆنی خۆشتر ئەبێ.

***

١ـ ئەم سەرباسە لە دەستنووسەکەی بەردەستماندا نییە، خوالێخـۆشبـوو محیـیالـدین سـەبری نعیمـی لـە چاپەکەی خۆیا نووسیویە، دوور نییە لە نوسـخە دەستنووسـەکەی بەردەسـتی ئـەودا بووبێـت. شـایانی باسـە ئـەو سەرباسەکەی خستووەتە دوای «گەردەلوولی تۆز» بەلام ئێمە پێشخستنیمان بەڕاست زانی.

٢ـ لە دەستنووسەکەدا (گردَە لولْ) نووسراوە، ئەگەرچی چاپەکە (گەردەلوولی) نووسیوە.

٣ـ لە دەستنووسەکەدا لە پاڵ وشەی (بەخودا)دا نووسراوە (فیه لطافة) واتە: بە خودا قەسەم، یـان هـەردووکیان نابنە خودا...تاد.

٤ـ لە چاپەکەدا «دیزانین» = (دەیزانین) ە، دەستنووسەکە تەواوترە.

٥ـ چاپ و دەستنووسەکەیش «چە» یان نووسیوە. کە بە ڕێنووسی ئەمڕۆی کوردی دەبێتە (چ).

٦ـ (هف) شێوەنووسێکی کۆنە و کورتکراوەی (هذا خلف)ە و، لەباتی (هذا) پیتی (هـ) و لـەباتی (خلـف) پـیتی (ف) دانراوە. (هذا خلف) واتە: ئەمە پێچەوانەی ئەوەیە کە بڕیارمان دابوو. (مەولەوی)ی زانا، هـەر لـە شـیعرەکەدا، بێگوێدانە تەسکیی ڕێ و شوێنی شیعر، واتای (هف)ی بۆ ڕوون کردووینەتەوە، دەڵێیت ئەمڕۆی لە بـەرچاو بـووە بۆیە مەعنای لێ داوەتەوە ئەگینا ئەوسا ئەم مەعنالێدانەوەی نەویستووە.

## مبحث الایمان بالله تعالی [1]

دەمـێ دووبـارە لـە ئیمـان بـدەین
موتەعەللـەقی ئیمـان بـەیان کـەین
ئەرچی پێی ئیجمال ئـەر بێرینـە بـەین
موسـتەفاد دەوێ لــە شــەهادەتەین
لاکـین موافیـق حەدیسـی رەسـوول
مونحەسیر بووگە لەسەر شەش ئوسوول

واتە: ئەگەرچی لە پێشەوە تەعریفی ئیمانمان کرد با دووبارە دەمێکی لێ بـدەین و روکنـەکانی بەیان بکەین، واتە ئەو شتانەی ئیمان پێیانەوە بەسراوە بەیانیان بکەین... جا ئەگەرچی ئەگەر پێی ئیجمال بهێنینە مەیدان و بمانەوێ لە کورتی بیبڕینەوە ئـەوەی ئیمـان پێوەنـدی پێیـەوە هەیـە هەمووی لە دوو کەلیمەی شەهادەتەوە دەردەکەوێ؛ چونکە کەلیمەی یەکەم ئیمـان بـە خـودای تێدایە و کەلیمەی دووەم ئیمان بە پێغەمبەری تێدایە و ئیمان بە پێغەمبـەریش دەکێشـێتەوە بـۆ ئیمان و باوەڕ بە هەرچی ئـەو فەرموویـەتی، بـەلام بـە پێـی فـەرموودەی پێغەمبـەر(د.خ) ئیمـان کۆکراوەتەوە لە شەش ئەسڵدا وەکوو فەرموویەتی:

«الایمان أن تؤمن بالله و ملائکته و کتبه و رسله و بالیوم الآخر و بالقدر خیرِه و شرّه».

[الاصـــل الاول مـــن الاصـــول الســـتة][2]

ئەسڵـــی ئەووەڵـــمان بـــزان بـــە یـــەقین
بـــاوەڕە بـــە حـــەق (رب العـــالمین)
چلـــۆن بـــاوەڕێ؟ ئینکـــار مـــەلوول کـــا
وە رووی کـــوفرەدا چـــاک گـــەردەلوول کـــا
نەســـیمی ئونســـی لێـــت دا لەســـەردا

خاشـــــاکی نەفســــــی لاوا لەبـــــەردا
شـــــەفەوی لــــە دەم دڵـــــت بســـێنێ
یـــادی لێـــوار و کـــەنار نـــەمێنێ [٣]
لـــە گـــەردی نوختـــەی ســـیاه و ســـفید
پاکـــت کـــا هـــەروەک کەلیمـــەی تەوحیـــد
ئـــــەر هاتییـــــەوە بـــــاز وە بـــــەقاوە
وە بـــــۆی موحەممـــــەد رەسولوڵـــــلاوە
ئـــەر ســـەد کـــەنارە و دەوێ شـــەفەوی
قـــابیلی نوختـــەی تەعـــەللوق نـــەوی
دانیشـــە لەســـەر ســـەجادەی ئیرشـــاد
بـــۆ تەزکییـــەی نـــەفس تـــەکمیلی عیبـــاد
(لی مـــــع الله...) وەک مەلـــــەکووتی
جێبێڵ، بێر ئەسەر[بێرە سەر] وەسفی ناسووتی

شەفەوی: ئەو حەرفانەی بە لێو ئەوترێن وەک فێ، میم، بێ. ئەرسەد: ئەگـەرچی. گـەرد: تـۆز. سیاه: رەش. سفید: سپی. لێوار، کەنار: قەراخ (حافّە). باز: دووبـارە. جـێبـێڵ: جـێبهێڵـە. بێـر ئەسەر: وەرە بۆ سەر.

واتە: ئەسڵی یەکەممان باوەڕە بە پەروەردگاری جیهان، باوەڕێکی ئەوەندە بـەهێز و بـە تـەوژم بێ، ئینکـار و بـێبـاوەڕی ئاڵـۆز بکـات و هەڵـیبڕێ و بیـڕفێنێ و بـە رووی کـوفر و بـێئیمانیـدا گەردەلوول بکات و سەری لێ تێک بدات و لە ناوی بەرێت. جا لە پاش لە ناوبردنی ئینکار و کـوفر لە خەلات و بەراتی ئەم سەرکەوتنەدا سـروەی نەسـیمی پێوەنـدی لەگـەڵ خـودای گـەورەدا لـە ئاسمانی قودسەوە بەسەرتا ببارێ و بدا لە کشتوکاڵی هەستیت و، هەرچی خەوش و خاڵی کـار و کرداری نەفسی ئەممارە هەیە لە بەردەمتا لای ببا، هەروەها ئـەو نەسـیمە قودسـییە ئـەو حەرفـە (شَفَوی) یانەی کە بۆنی پێوەندییان بە غەیری خواوە لێ دێ، لە دەم و زمـانی دڵـت وەربگـرێ و ماوەی ئەوەت نەدا کە حەرفی شەفەوی بە زمانی دڵتا بێت، بتخانە ناو دەریـای (توحیـد) ەوە بـە جۆرێ کە یادی لێوار و قـەراغی دەریـای (توحیـد) کـە سـەرەتای جیهـانی ئیمکـان و مەیـدانی مەخلووقاتی خودایە لە لات نەمێنێ و بە یەکجاری لە دەریای تەوحید و گەورەیی زاتی خودادا ون

بیت و (فنا) ت بەسەرا بێت، لە گەرد و تۆزی نوختەی رەش و سپی کە نیشانەی گۆڕانە و دروشمی پێوەندییە بەم و بەوەوە پاکت بکاتەوە، وەک چۆن کەلیمەی تەوحید (لا اله الاّ الله) پاکە لە گەردی نوختە.

ئەم فەرموودەی (مەولەوی)یە ئیشارەیە بەوەی کە زانایان فەرموویانە: ئیمانی دامەزراوی تەواو ئەوەیە ئینسان بخاتە نێو دەریای خوا بە یەک زانینەوە بە شێوەیەک کە پێوەندی بە غەیری خوداوە نەمێنێ، یادی لێوار و قەراخی ئەو دەریا نەکات، کە لەوانەیە لە (ما سِوَیالله)ی نزیک بکاتەوە، ئیمانێکی وەها کە دڵی ئینسان لە گەرد و لەککەی نوختەی رەش و سپیی گومان و دوودڵی پاک بکاتەوە، وەک چۆن کەلیمەی توحید (لا الە الا الله) حەرفی نوختەدار و حەرفی (شەفەوی) بە دوو لێو موحتاجی تیا نییە، ئەمەیش هێمایە بۆ ئەوەی کە لە خودا بە یەک ناسین‌دا ئینسانی خودا بەیەکناس نابێ پێوەندی بە غەیری خوداوە بمێنێ، پێویستە ئینسانی خودا بەیەکناس دوور بێ تەنانەت لە بەکارهێنانی حەرفێ موحتاجی دوو لێو بێت، هەتا (توحید) ەکەی بە گفت و بە واتا (توحید) بێت.

بەلام رستەی (محمدٌ رسول‌الله) حەرفی شەفەوی تێدایە، ئەگەرچی حەرفی نوختەداری تێدا نییە، ئەمەیش هێمایە بۆ ئەوەی کە ئیمان و باوەڕ بە رەهبەری گەورە(د.خ) پێوەندی غەیری خودای تێدایە و، بە بێ‌پێوەندی و دڵ بە حەزرەتەوە بەستن رێک ناکەوێ، هەر وەکو حەرفە شەفەوییەکانی کە دوو میمەکانن بە بێ دوو لێو ناوترێن، لەگەڵ ئەمەیشدا پێویستە ئەو ئیمان بە پێغەمبەرەیش لە نوختەی گومان و دوودڵی دوور بێ، چونکە هەر کارێ کە بە دڵ بکرێ ئەبێ بە دوودڵ و ڕاڕایی نەبێ و پێویستە لەگەڵ عەزم و دڵنیاییدا بێت.

هەروەها (مەولەوی) دەفەرموێ: «ئەر هاتییەوە باز وە بەقاوە... تاد». واتە: ئەگەر لە پاش ون‌بوون لە دەریای خودا بەیەکناسیندا بە مەعنای راستی کە حالی (فناء فی‌الله) یە، هۆشت بە بەرا هاتەوە و کەوتیتەوە حالی تێکەڵی لەگەڵ جیهاندا، کە حالی (بقاءالله)یە و، ویستت بە هۆی عەتری پێوەندی بە (رسول‌الله) و مەیلی شوێن‌کەوتنی سوننەت و رەفتاریەوە بێیتەوە بۆ ناو جیهانی (مُمکِنات)، ئەگەرچی پێوەندی بەویشەوە کەناری دەریای خودا بەیەکناسینە و لە کاتی (توحید)دا هەرگیز رەوا نییە تەماشای غەیری خودا بکرێ چ رەهنوما بێ یا رێبڕەو، لەم بارەدا ئاگات لە خۆت بێ بە هۆی ئەو دوو حەرفە شەفەوییەوە کە دوو میمەکەی (محمد) ە(د.خ) نوختەی پێوەندی بە غەیری حەق و حەقیقەتەوە قبووڵ نەکەیت، تەماشای حەزرەتی پێغەمبەر

بکە کە وەسیلەی وسوولە و رابیتەی نیسبەتی بەندەگانە بە خوداوە؛ چونکە خودا بەیەکناسینی ساف و ئیسلامەتیی ساغ ئەوەیە کە ئینسانی موسوڵمان پێوەندی بە پێغەمبەرەوە لەگەڵ باوەڕدا بێ بەوەی کە رەهبەرە بۆ لای خودا، بۆ ئەوە دەستەودامانی ببێ کە خودای پێ بناسێ نەک بە شێوەی (غلوّ) و لەحەقلادان بێ.

جا کە بەم شێوە شیرینە هاتیتەوە بۆ جیهانی مومکینات و پێوەندی خۆت لەگەڵ حەزرەتی پێغەمبەری رەهبەردا بەست بۆ خۆت لەسەر بەرماڵی ئیرشاد دانیشە و خەڵک شارەزا بکە بۆ رێگەی راستی خوداناسی و، بۆ پاککردنەوەی نەفسی نابار لە بیروباوەڕی ناهەموار و، بۆ تەمێکردن و پێگەیاندنی ئەوانەی ئەیانەوێ تێ بگەن و پێبگەن، ئیتر پایە و مەقامی «لی مع الله وقت لا یسعنی فیه مَلَک مقرّب و لانبیّ مرسل» کە پایەی نوقومبوونە لە نوور و تدجەللیياتی خودادا و پایەی بێپێوەندی لەگەڵ عالەمدا جێ بهێڵە و وەرەوە سەر خوو و ڕەوشتی پیاوە بەرزەکان کە خزمەتکردنی خەلقی خودایە.

(مەولەوی) لەم شیعرانەدا گەلێ شتی بەسوودی نیشان دا:

یەکەم: ئیمان و باوەڕ بە خودا پێویستە وابێ کە ئینسان غەیری خودای لە بیر بچێتەوە و، مەعنای (لا اله الا الله) وا بە ئیستیغراقەوە وەربگرێ کە کەس نییە (واجب‌الوجود) بێ و بۆ خودایەتی بشێ و، کەس نییە پەرستراو بێ و عیبادەتی بۆ بکرێ و، کەس نییە دروستکردن و داهێنانی بە دەستەوە بێ غەیری زاتی خودا.

پێویستە ئەم بیر و باوەڕە ساف بێ لە نوختەی رەش و سپیی گومان و دوودڵی و پاک بێ لە پاڵ دانەوە و پشتبەستن بە غەیری خودا، وەک چۆن رستەی (لا اله الا الله) لە نوختە پاکە و حەرفی شەفەوی تێدا نییە کە بە لێو گۆ بکرێت بەوجۆرەیش نابێ خودا بەیەکناسین تەنها شەفەوی بێ، واتە نابێ هەر بە زمان بێ، بەڵکو ئەبێ بە دڵ بێ، چونکە ئەوانەی کە خودا بەیەکناسینیان تەنها بە لێوە «کأنّهم علی شفا جرفٍ هار».

دووەم: پێوەندی لەگەڵ حەزرەتی پێغەمبەری رەهبەردا پێویستە و، بە بێ دواکەوتن و پەیڕەوکردنی رێبازی ئەو هیچ کەس بە پایە و مایە ناگات، چونکە پێغەمبەر هۆی گەیشتن بە خودایە، بەڵام پێویستە ئەم پێوەندییە لەسەر ئەو بناخە بێ کە پێغەمبەر فوروستادەی خودایە و بۆ تەمێ و پەروەردەکردن و شارەزاکردنی خەڵک نێرراوە، پێویستە بە هیچ جۆرێ ئیفرات و تەفریتی تێدا نەبێت، واتە نە لە پایەی شایستەی پێغەمبەرایەتی کەم بکرێتەوە و نە بەرز بکرێتەوە بۆ پایەی

ئولوهییەت... بە کورتی پێوەندی لەگەڵ حەزرەتی پێغەمبەردا(د.خ) لەبەر رووناکیی ئیرشاد و ئامۆژگاریی خودی پێغەمبەردا بێت.

سێهەم: حاڵەتی نوقومبوون لە باوەڕ و خوداناسیدا بە زاراوەی ئەهلی تەسەووف پێی ئەڵێن (فناء فی‌الله). گەڕانەوە بۆ حاڵەتی ئیعتیدال و پێوەندی لەگەڵ خەڵکیش پێی ئەڵێن (بقاء بالله). ئەم حاڵانە پێویستە لەگەڵ نیسبەتی حەزرەتدا بێ(د.خ). ئەو حاڵەتی خەڵوەت و پێوەندی تایبەتی بە خوداوە بووە، وەک حاڵەتی تێکەڵی و پێوەندی لەگەڵ خەڵکدا بووە «لی مَعَ الله وقتٌ لا یَسَعُنی فیهِ مَلَکٌ مقرَّبٌ و لا نبیٌّ مرسل». پێویستە دۆستانی خودا و زانایانی رەببانیش ئەو رێگایە بگرن؛ خودا فەرموویەتی (لقد کَانَ لکم فی رسول‌الله أسوة حسنة لمن کان یرجو الله والیوم الآخر و ذکرالله کثیراً) [٤].

بێ‌ئەمری مەناس، حوزوور کە مەناس
خاس بگرە ئە دڵ تەفسیری ئیخلاس
ئیجمالی دەوێ بۆ قەلبی سەلیم
لە «بسم الله الرحمن الرحیم»
لاکین (قُل) بلێ بێ وە تەفسیلدا
خاک بکە وەسەر جەبریی زەلیلدا
کە هەڵسیدا (قُل) قول وە کەناردا
کەفی جەبری رێت بەمدیو لێواردا
ئەمرت کە زانی هەر لە موختارە
دیتر حالی جەبر بێ‌حاڵ دیارە

مەناس: مەناسە. کە مەناس: بکە بە مەناس، پەنا. دەوێ: دەبێ. بگرە ئە دڵ: بگرە دڵ. قول: قولپی ئاو لە کاتی کوڵاندا. رێت: رژا. دیتر: ئیتر.

ئەم هۆنراوانە تا ئاخری ئەم ئەسڵی یەکەمە هەموو بەیانی باوەڕکردنە بە خودای گەورە و ئەوە نیشان دەدەن کە پێویستە ئینسانی موسوڵمان سوورەتی ئیخلاس بکاتە سەرمەشق بۆ ئیمانی خۆی، جا کەواتە ئەی خاوەن ئیمان! هەرگیز بێ‌ئەمری و نافەرمانیی خودا مەناسە و حزوورو ئاگاداری و نزیکی لە خودا بکە بە پەنا بۆ خۆت و، تەفسیری سوورەتی ئیخلاس بە باشی بگرە دڵ. جا دەفەرموێ بە شێوەیەکی کورت تەفسیری سوورەتی ئیخلاس لە (بسم الله الرحمن الرحیم)

دەرئەکەوێت؛ چونکە پێشخستنی «بسم الله...» بۆ ئیهتیمامـە و بـۆ حەسـری ئیعتیمـادە لەسـەر خودای گەورە، ئەمەیش بە تەواوی مانای دوورکەوتنەوەیە لە هاوبەش بۆ خودا دانـان، نـاوی (الله) کە ناوە بۆ زاتی (واجبالوجود)ی خاوەنی کەمالات و مانیع لـە کـەم و کـووڕی و خـەوش دەبێتـە هۆی باوەڕ بە زاتی خودا و بـە هـەموو سـیفاتی نەفسـی و سـەلبی و سـبووتی، بـە دوو سـیفەتی (الرحمن الرحیم) ئیمان بە هـەموو سـیفەتە فیعلییـەکان دەگەیـەنێ وەکـو (وهّـاب) و (کـریم) و (معطی) و (مانع) و (قابض) و (باسط) هۆی ئەوەی کە لـە ئایـەتی (بسـم الله الـرحمن الـرحیم)دا تەنها سیفەتی فیعلییەی رەحمەتی بەیان کردووە ئەوەیە دەیەوێ پیشـانمان بـدات کـە سـیفەتە فیعلییەکانی ئیحسانی لە سیفەتە فیعلییەکانی غەزەبی زۆرترە، هەر لەبەر ئەمەیشە لـە سـەرەتای هەموو سوورەتەکانی قورئانی پیرۆزدا (بسم الله الرحمن الرحیم) نازڵ بووە.

جا هەرچەندە تەفسیری سوورەتی ئیخلاس لە (بسم الله الرحمن الرحیم)دا بە کـورتی دەسـت دەکەوێت، بەڵام تۆ تەنها بەوە قەناعەت مەکە و، تەواوی سوورەتەکە بێنە پێش چاوی خـۆت و بـە دڵ و زمان لەفزی (قل) بڵێ و خەریکی تەفسیل و لێکۆڵـینەوەی مـەعنا و پێداویسـتییەکانی ئـەو ئەمرە ببە و خاک بەسەر ئینسانی جەبریباوەڕی داماودا بکە کە لە ژێر چەپۆکی ئەهریمەن دایـە و دەیەوێ بە ئارەزوو خۆی لە مەیدانی تەکلیف دەرکات؛ گوایا لە ئیش و کارا بێدەستەڵات و بێ-خواست و ناتووانایە، هەروەها بڵێ بەو جەبریباوەڕە: مادام مەعنای ئەمر بە لەفزی (قل) کەوتە ناو دڵی هوشیارەوە و بە ئاگری عەقڵ کوڵا و قوڵیدا، کەف و خەوش و خاڵی جەبری بەمدیـو لێـواری دڵدا دەڕژێـت، ئـەو خـەوش و خاڵـە لـەناو دڵـی بـەختیاردا نامێنـێ، چونکـە ئـەمر روو دەکاتـە قسەلەگەڵکراوی خاوەنعەقڵی خاوەنئیختیار، واتە ئینسانی ژیری خاوەنئیعتیبار، ئیتر باوەڕ و عەقیدەی جەبری نامێنێ و بێحاڵ و زەبوون دەرئەکەوێ بۆ هەموو هوشیارێ.

جا مەولەوی دێتە سەر مەعنای (هوالله احد) و ئەفەرموێ:

تۆ، ئەرچی (هو) مەشهوورە و راسە<br>
یانــێ: بزانــە شــان و حــاڵ واســە،<br>
بڵـــێ ئەوەتـــە (الله) ئـــەو زات<br>
ئولووهییــەتی بــۆ هەیــە ئیســبات<br>
ئولووهییەتیچ لای (بعض الفحـول)

(وجوب الوجود) بۆ ئـەوە مـەدلوول
خالقییـەتیچ وەک مەعبوودییـەت
خاسّەی لازیمەن بـۆ ئولووهییـەت
ئـەو ئەوییەتـە کـەوا راجیعـە
(هُـوَ) ئـەباڵ ئـەو بـۆ دڵ سـاتیعە
بەلام چێ بکەین لـەو بـێچاوییـە
ناوینـێ تـەعتیل دەوێـژێ نییـە

واتە: ئەگەرچی وا مەشهووره کە لەفزی (هو) لەم ئایەتەدا زەمیری شـەئنە و بـە جوملـەی (الله احد) تەفسیر دەکرێتەوە کە لە پاشیەوەیە و، مەعنای ئایەتەکە ئەوەیە: تۆ ئەی موحەممـەد! بڵـێ شەئن و حاڵ ئەوەیە کە (الله) تاق و تەنیایە لە زاتدا و لە سیفاتدا و لە کرداردا. بەلام تـۆ زەمـیری (هو) بە زەمیری شەئن مەزانە و وای حیسـاب کـە زەمیرێکـە دەگەڕێتـەوە بـۆ مەرجـەعێکی زۆر دیـاری و ئاشـکرا کـە پێویسـتی بـە هـیچ جیاکردنـەوە و دیـاریکردنـێ نییـە کـە حەقیقـەتی (واجبالوجود)ە هەر وەکو دۆستانی خودا لە ئەهلی تەسەووف، فەرمویانە: لە کائیناتدا (موجود) ێ کە بوونی لە خۆیەوە بێ هەر زاتی خودایە و هیچ (موجود) ێکیتر بێجگە ئەو وەهـا نییـە، کـەوابێ مومکینات بە بەراورد لەگەڵ زاتی واجبدا دیار نـین و نـەبوون، ئـەنجا لـەفزی (هـو) ئیشـارەیە و دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تاقە زاتە کـە هـەر خـۆی (موجـود) ە، کەواتـە تـۆ بڵـێ: ئەوەتـە (الله) واتـە: ئیشارەبۆکراو تەنها یەک تاکە کە (الله)یە و (احد)ە و تاق و تەنیایە.

پایەبەرز (مەولەوی) ئەم مەعنایەی لە فەرموودەی زاناپانی ئـەهلی (تسـوف) ەوە وەرگرتـووە و، ئیمام فەخری رازیش لە تەفسیرەکەیا باسی ئەم مەعنایەی کردووە.

هـەروەها هەڵـدەگرێ کـە زەمـیری (هـو) بگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو مەرجەعـەی کـە لـە قسـەی قورەیشەکاندا لە کاتی پرسیاردا رابوورد، وەکوو مەشهووره کافرەکان هـاتن و وتیـان: «یـا محمـد صِفْ لَنَا رَبَّک» واتە: ئەی محمد وەسفی خوای خۆتمان بـۆ بکـە. پێغەمبـەریش بـۆ وەلامـی ئـەم پرسیارە سوورەتی «ئیخلاس»ی بۆ رەوانە کرا، لەم حاڵەتەدا «هُـوَ» دەگەڕێتـەوە بـۆ «ربّ» واتـە: بڵێ ئەو رەببە (الله)یە و، ئەو رەببە تەنیایە، بەم شـێوە رسـتەی «هـو الله» موبتـەدا و خەبـەرە و «احد» خەبەری دووەمی «هو»ەیە.

با بگەڕێینەوە بۆ سەر مەبەست:

پایەبـەرز (مەولـەوی) دەفـەرموێ: ئەوەتـە (الله) ئـەو زاتـە خودایـەتیی بـۆ ئیسـبات کـراوە، خودایەتیش وجـووبی وجـوود دەگەیـەنێت، ئافەریـدگاری و پەرسـتراوی لـە لـەوازیمی مـەعنای خودایەتین.

بەڵام بە بیری من لەفزی جەلالەی (الله) عەلەمە بۆ زاتی (واجبالوجود)ی جامیع بـۆ کـەمال و مانیع لە نوقسان، وجووبی وجوودیش لای حوکەما بە مەعنای مەبدەء بـە عـەینی زاتی دادەنـێن، ئولووهییەت و خالیقییەت و مەعبوودییەت هەموو لە لەوازیمی ئەو زاتـەن کـە (الله) عەلەمیـەتی، خۆ ئەگەر وجووبی وجوود بە زیاد دابنێین لەسەر زاتی باری لەم سـوورەتەدا وجـووبی وجـوودیش وەکو ئولووهییەت و خالیقییەت و مەعبوودییەت هەموو لازمـی زاتـن. ئیمـامی فـەخری رازی لـە تەفسیرەکەیدا ئیشارە دەکات بۆ ئەم باسـە و دەفـەرموێت لـەفزی (الله) دەلالـەت لـەو سـیفەتانە دەکات کە پێوەندییان بە غەیرەوە هەیە وەکو (عالم، مرید، خلاق)، لەفزی (احد) یش دەلالەت لـە هەموو سیفەتە سەلبییەکان دەکات، چونکە جیاوازیی لە غەیری خودای لێ دەردەکەوێ.

زاناکانی زانستی ئوسوولی دین فەرموویانە: تەوحیدی کامیل تەوحیدە لە وجـووبی وجـووددا و لە مەعبوودییەتـدا و لـە خالیقییەتـدا، واتـە: بێجگـە زاتی (الله) کـەس خودایـەتی نییـە، کـەس (واجبالوجود) نییە، کەس شایانی ئەوە نییە بپەرسترێ، کەس ئافەریدگار نییە.

مەولەوی کە دەڵێت: «ئەو ئەوییەتە... » بەیانی ئەوە دەکا ئەو شتەو ئەو زاتە بە وشەی (ئـەوە) ئیشارەی بۆ دەکرێ و دەبێتە (مشار الیه) بۆ وشەی (هو) یا دەبێتە مەرجەع بـۆ وشـەی (هـو) بـۆ دڵی هوشیار درەخشان و رووناکە، بەڵام من چی بکەم لەو بێچاوییە کە تووشـی ئـەهلی تـەعتیل بووە و ئەو زاتە دیاری و ئاشکرایە نابینن و ئەڵێن نییە! شایانی باسە ئەهلی تەعتیل ئـەو کافرانـەن کە دەڵێن جیهان ئافەریدگار و پەروەردگاری نییە و پێویستی پێی نییە (پەنا بە خوا).

ئەحـــەد کـــە ناکـــاو مـــەوجێکی داوە
پووشـی شـیرک و نـەقس دەداتـە لاوە
بۆچ؟ مەعنای: یانێ تـەنیاس لـە زاتـدا،
لە گشت ئەفعالدا، لـە گشـت سـیفاتدا،
لــە هــەموو ئـەنواع تەرکیبــە بــەری،
لە گشت کەسرەت و تەعەددود عـەری

پاکـەو مونەززەهــ لـە هـەموو چشـتێ،
کـەوا بـۆی کەریـە ئیمکـانی لـێ تـێ،
وەکــو تەحــەییوز، وەکــو جیســمییە
وەک موشــارەکەی (حیــث الماهیــة)

ناکاو: لەپڕ، کتوپڕ. تەنیاس: تەنیایە. عەری: رووت. لێ تێ: لێ دێ.

جیاوازیی (احد) و (واحد) بە چەند شتێکە. یەکەم: (واحد) داخڵ ئەبێ لـە مـەعنای (احـد) دا، بەلام (احد) داخڵ نابێ لە مەعنای (واحد) دا؛ چونکـە مـەعنای (واحـد) یەکێکـە، بـەلام مـەعنای (احد) هەڵدەگرێ یەک بێ یا زیاتر لە نێر و لە مێ لە عـاقڵ و غـەیرە عـاقڵ، بـۆ نموونـە: ئەگـەر بڵێیت (لا یقاومُ فلاناً واحدٌ) هەڵدەگرێ دووکەس یا زیاتر موقاوەمەی بکەن، بـەلام ئەگـەر بڵـێیت (لا یقاومه احد) واتە کەس بەرامبەری ئەوی پێ ناکرێ، نە یەک، نـە دوو، نـە زیـاتر، بۆیـە ئەڵـێن ئیستیغراقی (احد) لە جوملەی نەفیداردا لە ئەستیغراقی (واحد) فراوانتـر و شـامیلتـرە. دووەم: (واحد) لە نەفی و ئیسباتدا وەک یەک بەکاردەهێنرێت، بەلام وشەی (احـد) بـە زۆری لـە نـەفیا ئیستیعمال ئەکرێ، وایش ئەبێ لە ئیسباتا بەکاردێ و ئیستیعمالی لە ئیسباتا سێ جۆرە: یەکەم لە پاڵ عەشەراتدا وەکو (احد عشر) و (احد و عشرون). دووەم لە کاتی ئیزافەدا کە دەبێتە موزاف و لە شوێنی ئەووەڵدا بە کاردێت وەکو (أمّا احدکما فیسقی ربّه خمراً) [٥] واتە: (أمّا اوّلکمـا، أی السـائل الاول) یا دەبێتە (مضاف الیه) وەکو (یوم الاحد) بە ئیزافەی بەیانییە، واتە: رۆژی یەکشەممە.

سێهەم لە وەسفییەتدا یا لە خەبەرییەتدا تەنها بۆ خودا، بـو نموونـە: نـاتوانی بڵـێیت (الـدرهم الأحد) یا (الدرهم أحد) بەلام دەڵێیت (الله الأحد) یا (الله أحد).

شایانی باسە زۆربەی زانایانی زمانی عەرەبی ئەڵێن: (احد) کە لە نەفیدا بەکار بێت هەمزەکـەی لە ئەسڵی کەلیمەکەیە و بەدەلی هـیچ حـەرفێک نییـە، بـەلام ئەگـەر لـە ئیسـباتدا بـەکار بێـت هەمزەکەی بەدەلی (واو)ە و ئەسڵەکە (وحد)ە، بۆ بەڵگە لەسەر ئەمـە دەڵـێن (احـد) لـە شـوێنی نەفیی عامدا بە مەعنا ئینسانە بە ئیتتیفاق، بەلام لە ئیسباتدا بە مەعنا فەردێکە لە عەدەد لـە هـەر جنسێ ببێ. جا مادام لە مەعنادا موخالیفی یەک بن موناسب وایە کە لە ئیشتیقاقیشدا موخـالیفی یەک بن.

سێهەم (واحد) بەکار دێ بۆ بەیانی یەکیەتی لە ژمارەدا، بەلام (احد) بەکار دێ بۆ یەکیـەتی لـە زات و لە سیفات و لە ئەفعالدا، وەکوو لە کاتێکا سیفەت بێ بۆ واجبالوجود یا خەبەری بێت، وەک

بلێیت: (الله الاحد) یا (الله احد) واتە: تاقە لە زاتدا، هاوزاتی نییە، تاقە لـە سـیفەتدا، هاوسـیفەتی نییە، تاکە لە کرداردا، کاری ئەو بە ئیجادە و، غەیری ئەو کاری بە ئیجاد نییە بەڵکو هەر بە کەسبە یا بە بێئیختیارە.

ئەنجا بۆ روون‌کردنەوەی ئەوە کـە لـەفزی (احـد) یەکیـەتیی موتڵـەق دەگەیـەنێت مەولـەوی ئەفەرموێ «ئەحەد کە ناکاو مەوجێکی داوە... تاد» واتە: لەفزی (احد) کە شەپۆلی دا بە مـەعنای خۆی پووشی شیرکی خستە لاوە و نەفیی هاوبەشـیی لـە خـودا کـرد و خـەوش و خالـی کـەم و کووڕی دایە لاوە، بۆچی؟ چونکە مەعنای (الله احـد) ئەوەیـە کـە خـودا تەنیایـە لـە زاتـدا، واتـە: خودایەکی تری لەگەڵدا نییە، تەنیایە لە کردارەکاندا، واتە: کەس ناتوانێ وەک ئەو کردەوە بکـات، ئەو بە ئیبداع و ئیجاد لە نەبوونەوە دەیانهێنێتە حالی بوون، بەڵام کردەوەکـانی غـەیری خـودا یـا عاریزێکە بەسەر شتەکەدا هاتووە: وەک داری بجووڵێتەوە، بەردێ تل بێتەوە و بەرەو خوار بڕوات، ئەگەر پێوەندیشی بە فاعیلەوە هەبێت هەر تەنیا بە کەسب و موباشـەرەیە نـەک دروسـتکـردن و ئیبداع، هەروەها خودا تەنیایە لە سیفاتدا، واتە سیفەتەکانی خودا وەک زیندوویی، زانین، خواسـت، توانا و سیفەتەکانی تری ئەزەلی و ئەبەدی و تـەواو و شـامیلن، سـیفەتەکانی غـەیری خـودا تـازە پەیدابوو بێدەوام و کەم‌وکووڕن.

خودا لە هەموو جۆرە تێکەڵییەک دوورە نە تێکەڵیی زیهنی نە تێکەڵـیی خـاریجی لـە ئـەجزا، چونکە ئەگەر لە زیهندا تێکەڵ بێ دەبێتە هۆی تەرکیبی خاریجی، تەرکیبی خاریجیش لـە ئـەجزا بەتاڵە وەک لە پێشەوە لە باسی تەوحیددا روونمـان کـردەوە. دیـارە کـە لـە تـەرکیبی زیهـنی و خاریجی دوور بوو لە زۆریی ئەفرادیش دوور دەبێت. پوختەی قسە: خودای گەورە دوورە لـە هـەر شتێک کە بۆنی بـەدی ئیمکـانی خاسـی لـێ بـێ، واتـە: وەک (واجـب) بەرامبـەری (ممکـن) و (ممتنع)ە پێویستە سیفەتەکانیشی لە سیفاتی مومکینی خاس نەچن چونکـە دژایـەتیی لـە زاتدا دەبێتە هۆی دژایەتی لە سیفاتیشدا، بۆ نموونە: مومکینی خاس (تحیّز)ی هەیە، واتە پێویستی بـە شوێن هەیە، مومکینی خاس جیسمە، هەر فەردێکی لەگەڵ فەردێکی هاوچەشـنیدا هاوبەشـن لـە (نوع)دا وەک هاوبەشیی زەید و عەمر لە ئادەمییەتدا، یا هەر نەوعێکی بگریت لەگـەڵ نـەوعێکی - تری (متجانس)دا هاوبەشن لە (جنس)دا وەک شێر و ئادەمزاد کە هەردوو (حیوان) گیـان‌لەبـەرن، بەڵام خودای گەورە نە هاونەوعی هەیە و نە هاوجینس، هەروەها خودای گەورە قەدیم و ئەزەلییە،

دەمێنێتەوە و ئەبەدییە، خۆی بە خۆی هەیە و موحتاجی کـەس نییـە، هاووێنـەی نییـە، کـەچی غەیری خودا هەموو تازە پەیدابوون و دەبڕێنەوە و موحتاجن و وێنەدارن.

پـێ بنـێ وە چـاو ئەهرەمـەنیدا (٦)
وە موجەسســـیمە و وە وەســـەنیدا
ســـەنەوی شـــەق دە هـــەتا دیـــارە،
موعتەزیلـــە هـــیچ؛ زوو بەرکـــەنارە!
ئەر شیرکی جەلی ئەگەر پەنهان وێ
ئەر نەقسی پـەنهان وەر نومایـان وێ
بـێدرۆ بیـدروو لەسـەر ڕێتـەدا (٧)
نـەک بچـوێ درک وە ژێـر پێتـەدا

شەق دە: شەقی تێهەڵدە. بەرکەنار: فڕێدراو، گوێ‌پێنەدراو. ئەر: ئەگەر. وەر: وە ئەگەر. وێ: بێ. بێدرۆ: بەڕاستی. بیدروو: دروێنەی بکە، ورد و خاشی بکە. بچوێ: بچێت.

واتە: مادام بە ڕستەی «الله احد» تاق و تەنیایی خودای گەورەت وەرگرت و بـاوەڕت پـێ کـرد ئیتر پێ بنێ بە چاوی ئەو کافرە موشریکانەدا کە پێیان دەڵێن (ئەهرەمەنی) و باوەڕیان وابووە کـە خودای چاکە و خراپە هەیە؛ (ئەهرەمەن) شەڕ و خراپە دروست دەکات و (یەزدان) خێر و چاکە.

هەروەها پێ بنێ بە چاوی (مجسّمە) دا، ئەوانەی باوەڕیان وابـووە کـە خـودا جیسـمە؛ چونکـە جیسمییەت و تێکەڵیی و موحتاجیی بە بەش و پارچە لەگەڵ (واجب‌الوجود) یدا ناگونجێت.

پێ بنێ بە چاوی (وثنی) یەکاندا کە بتپەرستن، چونکـە کـەی ئینسـانی هوشـیار بـەوە رازی دەبێ کە خۆی بەردێ بتاشێ و بیپەرستێ؟!... گرۆهی ثەنەویش بدەرە بەر شـەق تـا لـە بـەرچاو دیارە، ئەمانەش باوەڕیان وابووە کە جیهان دوو پەروەردگاری ئەزەلی هەیە، یەکێکیان کاری خێـر و بەسوود دەکات، ئەوی‌تر هەر ئیشی بێ‌سوود و زیان‌دار دەکات، بە یەکەم دەڵێن: نوور یا یەزدان و بە دووەم دەڵێن زوڵمەت و تاریکی یا ئەهریمەن یا شـەیتان، دیـارە خودایـەکی تـاق و تـەنیا و بێ‌وێنە، کە (واجب‌الوجود) و بێ‌خەوش و تەواو بێت، دەتوانێ خێر و شەڕ، چاکە و خراپە دروسـت بکات، ئیتر پێویست نییە دوو خودا هەبێ...

موعتەزیلەکانیش، کە دەڵێن ئینسـان خـۆی دروسـتکـەری کـرداری خۆیـەتی ئـەوانیش زوو بەرکەنار بوون، چونکە ئەگەر ئینسان دروستکەری کرداری خۆی بوایە بێجگـە لـە چاکـە هیچـی دروست نەدەکرد.

پوختەی قسە: شەریکدانان بۆ خودا، چ ئاشکرا بێ وەکوو شیرکی کافرەکان، یان پەنامەکی بێ وەکوو شیرکی ریابازەکان، هەروەها کەموکووڕی بۆ خودا هەر جۆر بێ بە بێدرۆ و دەلەسە درەوی بکە و لە ڕێی ژیانی خۆتا لای بدە هەتا دڕکی نامورادی نەچێ بە ژێر پێتا.

اللە الصـــــــمد: محتـــــــاجٌ اليـــــــه
کُـــلُّ مـــا ســـواه، فعـــوِّلْ عليـــه(٨)
حـەق بـە زاتی خـۆی غـەنیی موتڵـەقە
مەخلووق بە گشت وەجهـ موحتاجی حەقە
تیکـراری (اللە) دەفـەرمووت بـێ لـۆچ؟
ئەگـــەر وا نـــەوێ ئولووهییـــەت بـــۆچ؟

واتە: هەر زاتی خودایە پەنا بۆ براوە، پەنا هەر بۆ ئەو دەبرێ، دروستکـراوان هـەموو موحتـاجی ئەون و، ئەو موحتاجی کەس نییە.

ئەگەر بپرسی بۆچی لەفزی (اللە) دووبارە کراوەتەوە؟ ئەڵێم: زانایانی ئایین فەرموویانـە: ئەگـەر (اللە) لەگەڵ (الصمد) نەبوایە دەبوو (صمد) وەکوو (احد) نەکیرە بوایە، یاخۆ (احد) وەکوو (الصمد) مەعریفە بوایە، والحاڵ بە پێی زانستی بەلاغە پێویستە (احد) نەکیرە و (صمد) مەعریفە بێ، لە بەر ئەوە کە لە کاتی هاتنی ئەم سوورەتەدا خەڵکی ئەو وڵاتە باوەڕیان بەوە هەبووە کە خـودا پەنایـە و هاواری بۆ دەبرێ، بەڵام باوەڕیان نەبووە کە تاقە یەکێکە بەڵکو شەریکیان بۆ دانـاوە، هـەروەها لـە لایەکیترەوە لایان وابووە هەرچی مەوجوود بێ مەحسووسە و هەرچیش مەحسووس بـێ خـاوەن ئەجزا و خاوەن تەقسیمە و، مەوجوودی بێئەجزا و خاوەن ئەحەدییەت لای ئەوان نـەبووە...؛ جـا لەبەر ئەوە کە ئەحەدییەت لە لایان غەیرە مەعهوود بـووە و سـەمەدییەت مـەعرووف و مـەعهوود بووە موناسبی (احد) وابووە بە نەکیرەیی باس بکرێ و موناسبی (صمد) وابووە بە مەعریفەیی باس بکرێ؛ تا بزانرێ (اللە) ئەو (صمد) ەیە کە عالەم پەنای بۆ ئەبا؛ جا لەبەر ئەمە فەرمووی: (اللە احـد* اللە الصمد) تا ببن بە دوو جوملە و، لە هەر یەکێکیاندا موبتەدا و خەبەری موناسب بەکار بهێنرێن.

جگە لەوەیش لە هەر کەلامێکدا موبتەدایەک کـە ناسـراو بـێ دووبـارە بکرێتـەوە ئـەوە لەبـەر ئیهتیمام دانە بەو کەلامە لەبەر نوکتەیەکی موناسب وەکوو حەزرەتی (مەولەوی) دەفەرموێ:

«تیکراری (الله) دەفەرمووت بێ لۆچ؟
ئەگەر وا نـەوێ ئولووهییـەت بـۆچ؟»

واتە؛ بۆیە (الله) دووبارەکراوەتەوە لەبـەر ئیهتیمـام بـە کەلامەکـە بـەم مـەعنا پێویسـتە (الله) سەمەد بێ، ئەگەرنا چۆن شایانی خودایەتی دەبێ...

ئەگەر کەسێ بڵێت: ئەی بۆچی واوی عەتف لەسـەر جوملـەی (الله الصـمد) نییـە ئەڵـێم ئـەم جوملە وەکوو نەتیجەیەکی لازمە بۆ (الله احد) وەک چۆن جوملەی (لم يَلِد) و جوملەکانی دوایـی نەتیجەی لازمن بۆ (الله الصمد) و لە نێوان چەند جوملـەی بـە تـەواوی بەیەکـەوە لکـاودا مـاوەی عەتف نییە.

بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە دەڵێم: «الله» عەلەمە بۆ زاتی (واجبالوجود) کە هەموو تەواوییەک کۆدەکاتەوە و هەموو کەمی و کووڕی و خەوشێک لادەدا، مەبەس لە (احد) یش تاق و تەنیاییە لە زات و سیفات و کرداردا؛ لەبەر ئەمە جوملەی (الله احد) ئەوە دەگەیەنێت کە خـودای گەورە خاوەنی هەموو سیفاتی کەماڵە و لە هەموو کەمی و کوروڕییەکەوە دوورە، ئەم مەعنایـەیش ئەوە دەگەیەنێ کە خودا (صمد)ە و هەموو کائینات موحتاجییـەتی و ئـەو موحتـاجی هـیچ شـت نییە، هەروەها ئەوە دەگەیەنێت کە خودای گەورە لە جینسی غەیری خۆی نییە، کەوابێ (لم یلـد و لم یولد)، تا دوایی سوورەتەکە، دەبێتە لازمی (الله الصمد) ئا بەم جۆرە شێوەی عەتف لە بـەینی (الله الصمد) و پاش و پێشیدا ناگونجێت؛ چونکـە شـێوەی عـەتف جیـاوازیی نێـوان مـەعتووف و مەعتووف عەلەیهی دەگەیەنێت.

(لم یلـد) ؛ ژن یـا وەلــەد بۆچییــە؟!
بۆچ؟ بۆ هیچ شەیئێ موجـانیس نییـە
هیچ موحتـاج نییـە، عـەدەمی نـاوێ،
موعین و خەڵەف بۆچ بێن ئەم نـاوێ؟
نـایگرێ بـە خـۆی نـە کـەژ نـە سـارا
ماخۆلیـــای قـــەول گـــرۆی نەســـارا

عەدەمی ناوێ: نەبوونی نابێ. ئەم ناوێ: ئەم ناوە. سـارا: سـەحرا، دەشـت. گـرۆێ: کۆمەڵـی. نەسارا، (نصارا): فەلە. لە نێوان (نە/ سارا) و (نەسارا)دا جیناسی تەرکیب هەیە.

واتە: ئەو زاتە کە (صمدیە)ی هەیە کەسی لێ نەبووە و ژنی نەهێناوە و نەوەی لێ نەبووەتـەوە، ئەو زاتە ژن و منالی بۆچییە کە لەگەڵ هیچ شتێکدا هاوجینس نییە؟

ئەو زاتە کە سەمەدە و موحتاجی کەس نییە و نەبوونی بەسەردا نایـە ئیتـر جێگـر و یاریـدەر و وەچەی بۆچییە و بۆ بێنە ئەم ناوە؟!

ئەو واتەی لە گاورەکانەوە دەرچووە کە وتوویانە عیسا کوڕی خودایە واتەیەکی ئەوەندە قورس و گرانە نە کەژ و کێو هەڵیدەگرێ، نە لە بیاباندا جێی دەبێتەوە.

هەروەها قسەی جوولەکەکانیش کە وتوویانە (عوزەیر) کوڕی خودایە، قسەیەکی پووچ و بەتاڵـە و لە نەزانی و تێنەگەیشتنی مەعنای (واجبالوجود) ەوە پەیدا بووە؛ زاتـێ کـە (واجـبالوجـود) و ئەزەلی و ئەبەدی و لەگەڵ مومکیناتدا بێ موناسەبە بێ چـۆن پێوەنـدی سـکوزا و ئەسڵـییەت و فەرعییەت لەگەڵ (حوادث)دا دەبێ؟! (تعالی الله عن ذلک علواً کبیرا).

ئەگەر بۆ عیللـەت ئەمـە مـەدلوول وێ
کە موناسەبەی دەگـەڵ مـەعلوول وێ
کەوا حـەکیم پێـی تەلـەففوز دەکـات
مەفهوومە لە لەفز (موجَب)ی (بالذات)
پێـی مەڵـێ عیللـەت زاتی موعـەللا؛
ئـەم نیسـبەتە و ئـەو؟ (حاشـا و کلّـا)

وێ: بێ.

حەکیمەکان ئەڵێن: خودا (واحد)ی (بالذات)ە و (متعدد) نییە، یەکیش تەنها یەکێکی لێ پەیدا دەبێ، ئەویەکەیش کە لە خوداوە پەیدا دەبـێ پێویسـتە لەگـەڵ (واجـب)دا موناسـەبەی هـەبێ و بگونجێ، جا لەم رووەوە دەڵێن وەک (واجب) رووتە لە مادده (عقل) ەکانیش رووتن لـە مـاددە و، مادام وجوود خەیرە دروستکردنی یەکێکی رووت لە مـاددەی وەک عەقڵـی یەکـەم لەسـەر زاتی خودا واجبە... وەک لە شوێنی خۆیدا ئەمە بە درێژی باس کراوە.

جا مەولەوی لەم بابەتـەوە دەفـەرموێ: ئەگـەر مـەعنای لـەفزی عیللـەت، وەک حەکیمـەکان دەڵێن، مەبدەئی لەگەڵ مەعلوولدا گونجاو بێ ئەوا من دەڵێم:

(حاشا و کلّا) هـەرگیزاو هـەرگیز زاتی (واجـبالوجـود)ی بـالا لەگـەڵ (عقـول)ی (مجـردە) و موجەڕەداتدا موناسەبەی نییە و ناگونجێت، چ جایێ ماددە و ماددییات، چونکـە ئەمانـە هـەموو (ممکنات)ی (خاسە) ن و کەموکووڕی روویان تێدەکات و لەگەڵ زاتی (واجبالوجـود)ی دوور لـە خەوش و کەموکووڕیدا ناگونجێن. هەروەها (ایجاد)ی (بالایجاب) واتە دروستکـردنی بـە زۆر بـۆ خودای گەورە ناشێ، خودا خۆی کاربەدەستە و ئارەزووی بە دەستی خۆیەوەیە و هەرچی دروست کردووە و دروست دەکات بە ئارەزوو و خواستی خۆیەتی و کەس زۆری لێ نەکردووە و هیچ شـتێ لەسەر خودا واجب نییە.

هەروەها ئەو دروستکراوانە، چ ماددی و چ موجـەڕەد، هـەموو (حـادث) ن و لـەپاش نـەبوون پەیدا بوون و خودا بە ئارەزووی خۆی دروستیان دەکات، بە بێئەوەی هیچ هۆیەک کار بکاتە سـەر خواستی خودا، دانانی هەندێ شتیش بـە هـۆی کاریگـەر هەڵـەیە و ئـەو شـتانە تـەنها ئەسبابی عادەتین.

دەلیلـی (و لم یولـد) بـەیان کـەم:
لـەو زاتـە سـەبقی نەبووگـە عـەدەم
چ بۆیێکی خۆش لـەم عیللەتـە تـێ
حەق مەعلوول نییە بۆ هیچ عیللەتێ

نەبووگە: نەبووە. تێ: دێ.

واتە: ئەو زاتە (واجبالوجود)ە کە مەوسووفە بە ئەحەدییەت و سـەمەدییەت، ئـەوەی کـە ژن و خێزان و نەوەی نییە، لە باب و دایک پەیدا نەبووە؛ چونکە ئەو زاتە قەدیمـە و نـەبوونی لـێ پـێش نەکەوتووە، بۆیە ناچێتە عەقڵەوە لە ئەسڵێکەوە پەیدا بووبێ، هەموانیش دەزانن کە خودا بوونی لـە خۆیەوەیە، کەوابێ نابێتە مەعلوول بۆ هیچ عیللەتێ.

شایانی باسە ئەم ئایەتانە رەددی قسەی ئەو کافرانەن کە وتوویانـە مەلائیکـە کچـی خـودان و، رەددی قسەی ئەو جوولەکانەن کە وتوویانە عوزەیر کوڕی خودایە، یا ئـەو گاورانـەی کـە وتوویانـە عیسای مەسیح کوڕی خودایە، بۆیە جوملەی (لم یلد) پێش جوملەی (لم یولد) کەوتووە، ئەگـەرنا پێچەوانە موناسب دەبوو چونکە کەس هەتا لە دایک نەبێ نابێتە ئەوەی کە نەوەی لێ پەیدا ببێ.

واتە: لە کاتی هاتنی ئەم ئایەتانەدا کەس نەیوتووە خودای گەورە لە باوک و دایک پەیدابووە، هەروەها هۆیەکی‌تر بۆ دواکەوتنی (لم یولد) ئەوەیە ببێتە دەلیل لەسەر مەعنای (لم یلد)، دیارە کە خودا قەدیم بوو و لە ئەسلێکەوە پەیدا نەبوبوو پێویستی نابێ بە نەوە هەتا جێگەی بگرێتەوە.

کالای ئەو بالاس ئەزەل تا ئەبەد
(و لم یکن لَهُ کُفواً أحَد)

کالا: قوماش و پارچەی بەنرخ. ئەو بالاس: ئەو بالایە. کورد بۆ جێگا و پایەی یەکێکی شایستە دەڵێ: کالا لەقەد بالایە، واتە پڕ بە پێستیەتی.

واتە: مەعنای (و لم یکن لَهُ کُفواً أحَد) کالایەکە لە ئەزەلەوە تا ئەبەد بە بالای زاتی خودای گەورە بڕاوە... دیارە بەکارهێنانی وشەی «بالا» بۆ خودا بە پێی زانستی بەیان ئیستیعارەی موسەڕڕەحەیە و جوملەی (و لم یکن لَهُ کُفواً أحَد) قەرینەیە و لە مولائیماتی شوبهێنراوە کە زاتی خودایە و، لەفزی «کالا» تەرشیحە.

ئیمامی رازی لەم شوێنەدا فەرموویەتی:

خودای گەورە لێرەدا بە لەفزی (احد) هەرچی زۆری و تەعەددودێ کە بە خەیاڵدا بێ، لە زات و سیفات و ئەفعالدا لە خۆی نەفی کردووە. واتە: زاتی خودا تاکە و کەس سیفەتی وەک ئەوی نییە و کەس و کار و کاریگەریی وەک ئەوی نییە. هەروەها هەرچی کەموکووڕی و موحتاجییە بە کەلیمەی «سمد» لە خۆی دوور خستووەتەوە. بە جوملەی (لم یلد و لم یولد) هەرچی عیللییەت و مەعلوولییەتێک کە لە زاوزێوە پەیدا بێت لە خۆی نەفی کردووە، هەرچی موماسەلە و لێچوونیشە بە جوملەی (و لم یکن لَهُ کُفواً أحَد) نەیهێشتووە.

لە «عَلَی عینی» وەک «یدالله»ی
بێ‌فەڕ حاڵی بوو، وەک ساهی و لاهی،
موشەببیهـ حەقی نەدی لە ناودا؛
دەسی تەشبیهی دا وەناو چاودا

بێ‌فەڕ: بێ‌خێر، بێ‌مایە. حاڵی‌بوو: تێگەیشت. ساهی: بەسەهوا چوو. لاهی: غافڵ و بێ‌ئاگا. موشەببیهـ= (مشبّە): ئەو تاقمەن کە خودا بە مومکینات دەچوێنن.

ئەم دوو شیعرە وەڵامی رەخنەی ئەوانەیە دەڵێن: کە خودا وێنەی نییە ئەی چۆن نیسبەتی دەست و چاوی داوە لە خۆی، وەک ئایەتی (ولتصنع علی عینی) [٩] و (ید الله فوق ایدیهم) [١٠] و

هی‌تر، کە لە قورئانی پیرۆزدا زۆرن، دیارە ئەو کەسانە کە تەشبیهی خـودا دەکـەن بـە مومکینـات ئەو جۆرە ئایەتانە دەکەنە بەڵگە.

واتە: ئەو گرۆهەی تەشبیهی خودایان کردووە بەو مومکیناتەی دەست و چاو و تەنشتیان هەیە، ئەوانەی پێیان دەڵێن موجەسسیمە و موشەببیهە و ئەم جـۆرە ئایەتانـەیان کـردووە بـە بەڵـگەی قسەکەی خۆیان، ئەوانە زۆر خراپ و بێ‌کەڵک لە مـەعنای ئـەو ئایەتانـە گەیشـتوون و بەسـەهودا چوون و لە راستی بێ‌ئاگان؛ چونکە بەڵگەی بێ‌گومان لەسەر ئەوە هەیـە کـە خـودای گـەورە لـە مومکینات ناچێ و وێنەی نییە، ئەو ئایەتانەی ئـەوان دەیکەنـە بەڵـگە لـە (متشـابهات) ن، یـا بـە مەعنایەکی گونجاو مەعنایان لێ دەدرێتەوە، یا مەعناکانیان دەدرێتە دەست زانینی خودای گەورە و مەعنا دیارەکانیان مەبەست نین، چونکە خودای گەورە (واجـبالوجـود) و (احـد) و (صـمد)ە و وێنە و مانەندی نییە.

لێرەدا، کە باسی (محکم و متشابە) هاتە ناو، بە پێویسـتی ئـەزانم نـەختێک درێـژە بـەم باسـە بدەم:

دوو کەلیمــەی (محکــم) و (متشــابە) لــە هەنــدێ بەکارهێنانــدا دژی یــەک دەرئــەچن و لــە هەندێکیاندا دەکەونە یەک، بۆ نموونە: ئایەتی وا هەیە ئەوە دەگەیەنێ قورئان هەمووی موحکەمـە، هی وایش هەیە ئەوە دەگەیەنێ قورئان هەمووی موتەشابیهە.

نموونەی یەکەم: وەک ئایەتی (الــر کتـاب احکمـت آیاتـە) [11] کـە ئـەوە دەگەیـەنێ هـەموو ئایەتەکانی قورئان موحکەمن، واتە ئایەتەکانی هەموو راست و دامەزراو و موتابیقی واقیعن.

نموونەی دووەم: وەک ئایەتی (...کتاباً متشابهاً مثانی تقشعّر منه جلودالـذین یخشـون ربّهـم) [12] دیارە ئەمەیان ئەوە دەگەیەنێ کە ئایەتەکانی هەموو موتەشـابیهن، واتـە: ئایەتـەکانی قورئـان هەموو وەک یەک ئادەمزاد و جیننی بۆ حەق و راستی و خوداپەرستی بانگ دەکەن. لەسـەر ئـەم مەعنایانە (متشابە) و (محکم) دەستیان لە ملی یەک کـردووە و مـوافیقی یەکـدین و دژی یـەکتر نین.

بەڵام وەک وتمان لە هەندێ جاردا بە دوو مەعنای دژی یـەک بـەکاردێن، وەک ئایـەتی: (هـو الذی أنزل علیک الکتاب، منه آیات محکمات هن امّ الکتاب و أخر متشابهات) [13] ئەنجا لە مـەعنا لێدانەوەی ئەم دوو وشەدا زاناکان گەلێ رایان دەربڕیوە؛ هەندێ دەڵێن: موحکـەم ئـەو ئایەتانەیـە کە مەعناکەیان روونـاکە و، پێویست نییە بە تێفکرین و زەحمەتکێشان وەک ئایەتی (و أنـزل مـن

السماء ماء فاخرج به من الثمرات رزقاً لكم) (١٤) یا ئایەتی (و جعلنا من الماء كل شيء حيّ) (١٥) یا ئایەتی (ثم خلقنا النطفة علقة...) (١٦) بەڵام موتەشابیهـ ئەو ئایەتانەن كە مەعناكانیان پێویستی بە لێكدانەوەیەكی زۆر هەبێ وەكوو ئایەتەكانی زیندووكردنەوە و رۆژی قیامەت.

هەندێ تر دەڵێن هەر ئایەتێک لەوانە بێ ئادەمزاد بیزانێ چ بە دەلیلێكی ئاشكرا و رووناک یا بە دەلیلی پەنهان ئەوە موحكەمە و، هەر ئایەتێک رێگای پێ نەبرێ و بە دەلیل نەزانرێ موتەشابیهە، وەكوو پەیبردن بە ئەندازەی تۆڵە و پاداشت سەبارەت بەوانەی موكەللەفن، یا وەک بەرپابوونی رۆژی قیامەت.

ئیمامی رازی لە تەفسیرە گەورەكەیدا لە مەعنا لێدانەوەی ئایەتی (منه آیات محكمات هن امّ الكتاب و أخر متشابهات)دا دەفەرموێت:

هەر لەفزێ بۆ مەعنایێ دانرابێ ئەگەر بێجگە لەو مەعنایە مەعنایەكی‌تری هەڵنەدەگرت ئەوە پێی دەڵێن: (نصّ). خۆ ئەگەر مەعنایەكی تری هەڵدەگرت لەم حاڵەدا ئەگەر یەكێ لەو مەعنایانە لەوی تریان بەهێزتر بوو ئەوە بۆ مەعنا بەهێزەكە پێی دەڵێن (ظاهر) و بۆ مەعنا لاوازەكە پێی دەڵێن (مُؤَوّل)، بەڵام ئەگەر هەردوو مەعناكە وەک یەک بوون و هیچكامیان لەوی تریان بەهێزتر نەبوو ئەوە نیسبەت بە هەردووكیان پێكەوە پێی دەڵێن (مشترک) و، بۆ یەكەیەكەی دوو مەعناكە پێی دەڵێن (مجمل)، ئەنجا ئەو لەفزە كە (نصّ) یا (ظاهر) بێ موحكەمە و، ئەو لەفزەی كە مووئەووەل یا موجمەل بێ موتەشابیهە. خۆ ئەگەر وا رێكەوت مەعنا زاهیرەكە بەتاڵ بوو و دروست نەبوو ئیعتیبار بكرێ ئەوا ئەویش هەر دەبێتە موتەشابیهـ و مەعنا مەرجووحە بێ‌هێزەكە چاودێری دەكرێت، وەكو ئایەتی (و اذا أردنا أن نهلک قرية أمرنا مترفيها ففسقوا فيها فحق عليها القول فدمّرناها تدميرا) (١٧). ئێستە زاهیری ئەم ئایەتە ئەوەیە كە دەستڕۆیشتووە جێ‌وڕێ‌دارەكان ئەمریان پێ كراوە بە فیسق، ئەوەش بەتاڵە چونكە ئایەتی موحكەم هەیە دەفەرموێ: (قل إنّ الله لا يأمر بالفحشاء) (١٨) لەبەر ئەوە پێویستە ئەو موتەشابیهە بە تەئویل بگەڕێتەوە بۆ سەر موحكەمەكە. وەكوو فەرموویانە تەقدیری عیبارەتەكە بەم جۆرەیە (أمرنا مترفيها بالطاعة فعصوا و فسقوا فيها) گوایا جارِ و مەجروور و فیعلێكی (معطوف عليه) حەزف كراوە.

ئیمامی غەزالی ـ خودای لێ رازی بێ ـ لە كتێبی (مستصفى)دا فەرموویەتی: موحكەم ئەوەیە مەعناكەی دیاری و روون بێ بە جۆرێ كە هیچ ئیحتیمال و گیروگرفتێ رووی تێ نەكات،

موتەشابیهـ ئەوەیە کە چەند مەعنای دژبەیەک هەڵبگرێ وەک ئەو ئیسـمانەی کـە موشـتەرەکی لەفزین، بۆ نموونە (قُرء) کە حەیز و پاکیی ژن هەڵدەگرێ، (لمس) کە دەس‌لێدان و جیماع‌کـردن هەڵدەگرێ. هەروەها موتەشابیهـ بەو لەفزانـەش دەوتـرێ کـە لـە سـیفەتەکانی خـودادا هـاتوون ئەوانەی کە بە ڕواڵەت جیهەت و جیسم دەگەیەنن و موحتاجی تەئویلن.

بەڵام ئاخۆ ئەم موتەشابیهانەی سیفاتی خودا بـۆ ئـادەمزادی زانـا و پایەبـەرز دەزانـرێن و ڕوون دەبنەوە، یا دەدرێنە دەست زانینی خودا؟

لەم بابەتەوە (سەلەف)ی زانایانی ئیسلام رایان وایە کـە کـەس مـەعنای موتەشـابیهێ کـە لـە چەشنی ئایاتی سیفات بێ نازانێ و حەواڵەی عیلمی خودا دەکرێـت، زۆربـەی زانـا حەنەفییـەکان لەسەر ئەم رایەن و ئەڵێن: موتەشابیهـ ئەوەیە کە تەنها خودا خۆی دەیزانێ و هیچ رێگایەک نییـە بۆ زانینی.

بەڵام ئیمامی غەزالی (ر.خ) لای وایە کە لە قورئانی پیرۆزدا موتەشـابیهی وەهـا نییـە مـەعنای نەزانرێ، غەزالی دەفەرموێ: قورئان بـۆ رێنومـایی هـاتووە و پێویسـتە هـەموو زانایـەکی وریـا و پایەبەرز مەعنا و تەئویلی ئایەتەکانی بزانێ؛ بۆیە لە ئایەتی (...و ما یعلم تأویلـه الا الله والراسـخون فی العلم) [19]دا پێویستە لە دوای «فی العلم» وەقفە بکرێ؛ تا مەعناکەی وای لێ بێ: بێجگە خودا و ئەوانـەی لـە زانـین‌دا بـە دەسـتەڵات و سـەرامەدن کـەس تـەئویل و مـەعنای مەبەسـتی ئـەو موتەشابیهانە نازانێت. هەروەها ئەو ئایاتی سیفاتە کـە خەڵـک بـە موتەشـابیهیان دەزانـن هـەموو کینایە و مەجازێکن کە لای عەرەب مەعنایان دیاری و ئاشکرایە.

سەرەتای هەندێ لە سوورەتەکان، کە حرووفی پچرپچڕن ناوی سوورەتەکانن.

بەڵێ ئەو موتەشابیهانەی کە باسی کات و ساتی زیندووبوونەوە و رۆژی قیامەتن زانینی مەعنا و مەبەستیان حەواڵەی عیلمی خودایە و هەر ئەو دەیانزانێ. لەسەر ئەم بارە دروستە بەلکو پێویسـتە لە ئایەتە پێشووە باسکراوەکەدا لەسەر کەلیمەی (الله) وەقفە بکرێ، چونکە کـاتی قیامـەت خـودا نەبێ کەس نایزانێ.

زۆربەی (خلف) واتە: زاناکانی سەردەمی دوایی ئایینی ئیسـلام رایـان بـەم جۆرەیـە و دەڵـێن (راسخون) تەئویلی ئایەتە موتەشابیهەکان دەزانن و ئەم ئایەتانـە بـە نـەزانراوی نامێننـەوە. زانـای پایەبەرز (سیف الدین)ی ئامیدی [20] لەگەڵ رای خەلەفدایە و، لـە کتـێبی (احکـام الاحکـام) ی‌دا هاوبیریی خۆی لەگەڵ ئەوان و لەگەڵ ئیمامی غەزالی‌دا دەردەبڕێ.

هەندێ لە زانایان دەڵێن لە پاش وردبوونەوە لە بەش‌کردنی لەفزی خاوەن مەعنا ئەلای (نـص) و زاهیر و موئەووەل و موجمەل، وەک ئیمامی رازی لە تەفسیرەکەیا فەرموویەتی، دەرئەکەوێ کـە موتەشابیهـ چەند جۆرێکە:

یەکەم: زاهیرێ کە ویستنی مەعنا دیارەکـەی بـەتاڵ بـێ و شـاریعیش مەبەسـتی خـۆی لـەو کەلیمەیە دیاری نەکردبێ.

دووەم: موئەووەل کە بریتییە لە لەفزێک مەعنا نادیارەکەی لێ مەبەست بێ کـە ئیحتیمـالێکی بێ‌هێزە.

سێهەم: موجمەل کە هاوبەشە لە بەینی چەند مەعنایەکدا کە نیشانەیەک نەبێ لەسـەر دیـاری کردنی هیچ کامیان.

چوارەم: ئەو ئایەتانە کە مەعنا دیارەکانیان دژی یەک بن و پێویستیان بە رێـک‌خسـتن هـەبێ وەک ئایەتی (و اذا أردنا أن نهلک قریة أمرنا مترفیها ففسقوا فیها..) لەگەڵ ئایـەتی (قـل انّ الله لا یأمر والفحشاء...).

پێنجەم: ئەو ئایەتانەی بە زاهیر مەعنایەک دەگەیەنن ئینسان نەتوانێ بە درێژی بیانزانێ وەکوو پەنامەکییەکانی قەزاوقەدەر و ئەنـدازەی سـزا و پاداشـی ئەوانـەی موکەللـەفن، یـا کـاتی هـاتنی قیامەت، یا ئەو عیبارەتانەی خلوود و ئەبەدییەت دەگەیەنن. بەڵێ ئەم بەشە دوایینە تەنها خـودای گەورە دەیانزانێ و بەس؛ چونکە رێگەی پەیداکردنی زانینی ئەوانـە لـە ئـادەمزاد بەسـراوە. ئـەنجا نیسبەت بەم بەشە پێویستە لە ئایەتی (و ما یعلـم تأویلـه الا الله و الراسـخون...)دا وەقفـە لەسـەر کەلیمەی گەورەی (الله) بکرێ؛ چونکە زانایانی بەدەستەلات لەم بەشـەدا مـاوەی زانینیـان نییـە، ئەگەرچی قابیلە و مومکینی زاتییە کە خـودای گـەورە بـە فـەیز و بەرەکـەتی خـۆی هەنـدێ لـە دۆستانی خۆی لە پێغەمبەران(د.خ) و لەخوداترسانی ئوممەت ئاگادار بکات تا بـە مـەعنای ئەوانـە زانا و ئاشنا ببن، ئەمەیش دژ نابێ لەگەڵ مەسەلەی وەقفە لەسەر کەلیمـەی (الله) چونکـە ئەمانـە خۆبەخۆ زانا نین، بەڵکو خودا ئاگادار و زانای کردوون.

هەروەها بەشی یەکەمیش کە مەعنا زاهیرەکەی بـەتاڵ بـێ و شـاریعیش مـەعنای مەبەسـتی دیاری نەکردبێ ئەگەر لەو بابەتە بێت کە پێوەندی بە غـەیبیاتی شـاراوەوە بێـت ئـەویش خـودای گەورە نەبێ کەس نایزانێ.

بەلام بەشەکانی تر هەموو لەوانەن کە زانایانی بەدەستەلات تەئویلیان بزانن لەگـەڵ جیـاوازیی پایەی زانینیان و پەیپیبردنیان.

دیارە نیسبەت بەم بەشانە وەقفە لەسەر (والراسخون فی العلم) ئەکرێت.

وا دەرکەوت کە وەقفە لەسەر هەردوو شوێنەکە شیرینە. وەقفە لەسەر کەلیمـەی (الله) لەسـەر ئەوەیە کە موتەشابیهـ لەو بەشە بێ کە رێگەی کەسبی عیلمی تێدا نیـیـە، وەقفـە لەسـەر (العلـم) لەسەر ئەوەیە کە موتەشابیهـ لە بەشەکانی تر بێ.

جا ئەگەر کەسێ بڵێت چۆن ئەبێ لە قورئاندا موتەشابیهی وەها ببـێ کـە بێجگـە خـودا کـەس نەیزانێ، ئەی سوود لە ناردنی ئەو جۆرە ئایەتانەدا چی دەبێ؟

وەلامی دەدرێتەوە کە مەبەس لە ناردنی ئەو جۆرە ئایەتانە هەر تـەنها ئـەوە نییـە کـە خەڵـق تێیان بگات و خۆی کەسبی زانینەکەی بکات، بەڵکو سوودی تری زۆری هەیە؛ یەکەم ئەوەیـە کـە خودای گەورە دەتوانێ مەعنای ئەو موتەشابیهانە بە وەحی و ئیلهام لـە هەنـدێ دۆسـتانی خـۆی بگەیەنێت. دووەم: دەرکەوتنی بەرزیی پایەی قورئان، کە شتی وای تێدا باس کـراوە زانایـان رێـی پێ نابەن و تێـی ناگـەن، کـەچی داڕشـتنی ئایەتـەکان و کەلیمـەکانیان زۆر جـوان و موناسـبن. سێهەم: هاندانی خاوەنبیران تا بکەونە کۆشش و بە پێی توانا بۆ زانـینی ئەوانـە هـەوڵ بـدەن و خۆیان ماندوو بکەن، چونکە زانینی ئەوانە ئەگەرچی بە عادەت مەحالە بەلام ئینسان لە سـەرەتاوە نازانێ کە ئەو جۆرە ئایەتانە مەعنایان نازانرێت. چوارەم ئەوەیە کە پێویست نییە لە هەموو ئیبـداع و تەسەڕروفاتی خودای گەورە هەموو عالەم ئیستیفادە بکات، تەماشا بکە هەزاران ملیار ئەستێرەی دروست کردوە، هەزاران جۆرە گیا و دار و بەرد و گیانلەبەری وەهـای دروسـت کـردووە کـە بـە زاهیری قازانج و سوودی ئادەمزادیان تێدا نییە، بەلام خودا خۆی دەزانێ سوود و قازانج چییە و لە کوێ دایە.

گوێ مەکە لە کەس هـەر بـەم مەعنایـە
بـــاوەڕت بـــوێ: خـــودا خودئایـــە،
یانـــێ وجـــوودی (لذاتـــه) ییـــە؛
بووگەو هـەس، دەوا و مووجیـدی نییـە
هــەر ئـــەوە (بالـــذات واجـــبالوجـــود)
(ذو الالوهیّـــة) و خـــالیق و مـــەعبوود

مەقسوود و مەوجوود بە حەق هەر ئـەوە
بێموعین، تـەنیای موتلـەق هـەر ئـەوە
بێشەریک و میسل، بێشیبهـ و نـەزیر
بـۆ موتیـع بەشـیر، بـۆ عاسـی نـەزیر

گوێ مەکە لە کەس: گوێ لە کەس مەگرە. بووگە: بووە. هەس: هەیـە. دەوێ: دەبـێ. بـوێ: ببێ. خودئایە: لە خۆیەوە هاتووە.

واتە: بە قسەی کەس مەکە لەوانەی کە لە زات و سیفەتی خودا بێئاگـان و هـەرچی بـەدەمیانا دێت لە تەشبیهـ و تەجسیم موبالاتی پێ ناکەن، بەمجۆرە کە بۆت بەیان ئەکەم بـاوەڕت ببـێ کـە خودا خۆی لە خۆیەوە هاتووە، واتە: خودا بوونی لە زاتی خۆیەوە هەیە و لە غەیری خۆیـەوە نییـە، لە ئەزەڵدا بووە بێ ئەوەی نەبوونی بەسەردا هاتبێ، ئێستەش هەیە بە بـێگـۆڕان و هـەروا دەبـێ هەتاهەتایە، مووجید و دروستکەری نییە، هەر تەنها ئەوە بە بێپێوەندی بە غەیر (واجـبالوجـود) ە، هەر ئەو خاوەنی سیفەتی (الوهیەت)ە. هەر ئەو پەروەردگارە و پەرسـتراوە و کـڕنووشبـۆبراوە. هەر ئەو رووی نیازی تێ دەکرێ و پەنای بۆ دەبرێ. هەر ئەو بووە بـوونێکی خۆبـەخۆیی راسـت و کۆمەک و یارمەتیدەری ناوێ. هەر ئەو تەنیای موتڵەقە، واتـە: تەنیایـە لـە زاتـدا شـەریکی نییـە، تەنیایە لە سیفەتدا کەس سیفەتی وەک سیفەتی ئەوی نییە، تەنیایە لە کرداردا. هەر ئەو دەتوانـێ کار بکات، غەیری ئەو یا شوێنی کارە و بێئیختیارە یا تەنها پێوەندی کەسبی هەیە. بـێشـەریکە، بێوێنە و هاوشانە. بۆ ئەوانەی فەرمانبەرن موژدەدەرە، بۆ ئەوانەی نافـەرمانن ترسـێنەرە و لەسـەر ئەم رێ و شوێنەیش رەهبەرانی بۆ لای خەڵک ناردووە.

حەقیقەتێکـە بـێچەنـد و چوونـە
لە دائیرەی عەقڵ مەخلووق بیروونە
هرچـــی بشــــنۆیە یـــا بوێنییــــە
یـــا بزانییـــە ئـــەوە ئـــەو نییـــە
بـــۆ ماســـیوای ئـــەو زاتـــە تەعریفـــە
بـــۆ ئـــەو وا نییـــە بیـــزان لەتیفـــە
(و لا یشـــــــبهُ و لا یَشـــــــتَبِه
لا هـــو بشـــیء و لا شـــیء بـــه)

(ظـــاهرٌ لکـــن بـــاطن الاســـرار
بـــاطنٌ) ئـــەممـــا (ظـــاهر الآثـــار)

بیروونە: بەدەرە، خاریجە. بشنۆ: ئەوەی ببیستریّ، بـوێنی: ئـەوەی ببینـریّ. بـزانی: ئـەوەی بزانریّ. ئەمما: بەلام، لاکین.

واتە: حەقیقەتی زاتی خودا بیّئەندازە و بیّچۆنیەتی و بیّوێنەیە و لە دائـیرەی هـۆش و بـیری مەخلووق خاریجە و دوورە، چونکە مەخلووق هەموو هۆش و توانایـان مەحـدوودە و ئەندازەیـەکی تایبەتی بڕاوەیان هەیە، بـەلام زاتی خـودا نامـەحـدوودە و نەبڕاوەیـە، بـیّگومـان هێـزی بـڕاوە و سنووردار بۆ زاتی نەبڕاوە و بیّسنوور ناشیّ و شایان نییە.

هەرچی ئینسان بە گویّ ببیسیّ یا بە چاو ببینـیّ یـا بـە عـەقل و هـۆش بیزانـیّ و مـاددەی تەعریفی لیّ وەربگیریّ، ئەوە هەر بۆ غەیری خودایە و بۆ غەیری خودا دەبێتـە تـەعریف، بـۆ زاتی خودا نابیّ بە تەعریف؛ چونکە زاتی خودا لە جینس و نەوعی بیسراو و بینراو و زانراو نییـە تـا بـەو دەسکەوتانە تەعریف بکرێت، هەر لەبەر ئەمەیە زانا بەرزەکان فەرموویانە بەسە بۆ ئینسـان بـاوەڕی بەوە ببیّ کە زاتێکی (واجبالوجود)ی خاوەن‌کەمال و دوور لە نەقس هەیە ئەو جیهانەی دروسـت کردووە و، هەرچی خواستی لەسەر بیّ ئەیکا و هەرچی خواستی نەبیّ نایکات، ئیتـر کۆڵـینەوە لـە حەقیقەتی خودا بۆ ئێمە سوودی نییە.

خودای گەورە لە هیچ شتیّ ناچیّ و، هیچ شتیّ لەو ناچێت، بە ئاسار و کردار دیارییە بۆ هۆشیار و ئەسراری زاتی خودا لە ئێمە شاراوەیە، حەقیقەتەکەی شاراوە و نادیارییە، بـەلام ئاسـاری هێـز و تەوانایی ئەو دیاری و ئاشکرایە.

ئـــەزەلی و ئـــەووەڵ بـــە بـــیّبیدایـــەت
ئەبـــەدی و ئـــاخیر وە بـــیّنییهایـــەت
ئەزەل پەیمانی دەگەڵ [۲۱] ئەبـەد کـرد
ئـــەزەل هەڵـــبگرد، ئەبـــەد دابگـــرد،
ئـەو سـەر بـەراو ژوور تـا قـووەتی بـوو
ئـەم سـەر بـەراو ژێـر تـا تاقـەتی چـوو
ئـــەو دەڵـــیّ: فریـــاد، (ایـــن ابتـــداه؟)
ئـەم دەڵـیّ: هـەی داد، (ایـن انتهـاه؟)

دەگەڵ: لەگەڵ. هەڵبگرد: هەڵبەزی، چوو بەرەو ژوور. دابگرد: دابەزی، چوو بەرەو خوار.

واتە: خودا ئەزەلییە، مەعنای ئەزەلیش ئەووەڵی بێئەووەڵە کە هیچی لێ پێش نەکەوتبێ، هەروەها ئەبەدییە، واتە ئاخری بێئاخرە و لە پاش هەموو شتێکەوەیە و بوونی بڕانەوەی نییە. ئەنجا مەولەوی بە شێوەی ناسک و خەیاڵاوی دەیەوێ زیاتر شتەکە روون بکاتەوە؛ بۆیە دەفەرموێ ئەزەل و ئەبەد لەناو خۆیانا پەیمانیان بەست و ویستیان لە خۆیان حاڵی ببن، بۆ ئەم مەبەستە ئەزەل سەربەرەوژوور کەوتەڕێ و ئەبەدیش سەربەرەوخوار و تا هێزیان تیابوو ڕۆیشتن، لە ئەنجامدا ئەزەل هاواری لێ هەڵسا و وتی: کوا سەرەتا؟... ئەبەدیش بانگی لێ بەرز بوویەوە: کوا نیهایەت و ئەنجام... مەولەوی ئەیەوێ بفەرموێ: تەنانەت ئەزەل و ئەبەدیش ئەم ڕێگەیان پێ نابڕێ و دەستەوئەژنۆ لێی دانیشتوون...

زۆر جوانە، زۆر ڕاستە؛ ئەزەلییەت و ئەبەدییەتی خودای گەورە ئەو ئەزەلییەت و ئەبەدییەتە نییە کە ئێمە بۆمان داناوە، ئەو وەسفەی ئینسان داینێت وەک ئینسان کورتە...

(من جهة الذات) لە ئەشیا تەریک،
من (حیث الصفات) بە گشتی نزیک
ئیشارە ڕێگەی ئەلای ناکەوێ
بە (هُنا) لەگرە، بە (ثَمّە) لەوێ
«لم یَکَد اصلاً یتحد بشیء»
عالەم بەو قایم ئەو قایم بە خۆی[٢٢]
نە جوزء نە جوزئی، نە کول نە کوللی
بەعیدە لە عەیب حاڵ و مەحەللی
بۆ حەوادیسات هیچ مەحەل نییە
لە کوفوو، لە ضید، لە نید بەرییە
نە شەکل و سوورەت نە هەیوولایە
نە مورەککەبیچ لە هەردوو لایە
لە جیهەت کەنار، لە حەییز ئەودەر
(لیس بعرض و لا بجوهر)

(لـــــــیس بجســـــــمٍ و لا جســـــــمانی
و لا بــــــــــــروح و لا روحــــــــــــانی)
نـــە لـــە زەمینـــداس، نـــە لـــە ئاسمـــان
(لـــیس فـــی الزمـــان و لا فـــی المکـــان)
دوورە لــە مــەتا و کــەم و کــەیف و ئــەین
حەرەکە و سکوون وەسل و فەسل و بــەین

تەریک: دوور. لەگرە: لێرە. مورەککەبیچ: مورەککەبیش. کەنار: گۆشەگیر، مونعەزیل. ئەودەر: بەدەر، خاریج. نە لە زمینداس: نە لە زەویدایە. مەتا: کەی. کـەم: چەنـد. کـەیف: چـۆن. ئـەین: کوێ. حەرەکە: جم و جووڵ. سکوون: دژی حەرەکە. وەسل: شت بلکـێ بـە شـتێکەوە. فەسـل: بەین، جیابوونەوە.

ئەم چەند بەیتە دووبارەکردنەوەی ئەوەیە کە زاتی خودا لەو شـتانەوە دوورە کـە دەبنـە هـۆی کەم و کووڕی و خەوش، ئەگینا پاش ئەوەی بڕیار درا خودا وێنەی نییە و (واجـبالوجـود)ە دیـارە نابێ لەم شتانەوە نزیک بێت.

واتە: خودای گەورە لە رووی زات و حەقیقەتەوە لە هەموو شتێ دوور و تەریکە. بەڵام بە هـۆی سیفەتەکانیەوە لە هەموو شتێکەوە نزیکە، ئەوەتە زانا و ئاگادارە لە هـەموو شـتێ، خواسـتی رووی کردووەتە هەرشتێ کە ویستوویەتی، توانا و دەستەڵاتی بەسەر هەموو مومکیناتدا هەیـە، هـەموو دەنگێ دەبیسێ، هەموو رەنگێ دەبینێ. ئیشارە بە (هنا) واتە لێـرە، بـۆ شـوێنی نزیـک، هـەروەها ئیشارە بە (ثَمّ) واتە: لەوێ، بۆ شوێنی دوور نیسبەت بە خودا ڕێگای نییە؛ چونکە خودای گەورە لە شوێندا نییە تا هێمای بۆ بکرێ. هەرگیز لەگەڵ شتێکدا یەک ناگرێ و نابن بە یەک، جیهـان بـەو ڕاگیراوە و ئەو بە خۆیەوە ڕاگیراوە، نە جوزئە بۆ کول وەک چاو لە لەشدا و، نە جوزئییە بـۆ کـوللی وەک فەردی نەوعێ بۆ نموونە: زەید بو ئینسان، نە کوللە بۆ ئەجزا وەک لەش کە کۆمەڵە ئەندام و چەند بەشێکە، نە کوللییە بۆ جوزئییـات وەکـو ماهییـەتی ئینسـان کـە جوزئییـاتی هەیـە؛ خـودا پێوەندی بە تەرکیبی خاریجییەوە نییـە هـەتا ببێتـە جـوزء یـا کـول، پێوەندیشـی بـە تـەرکیبی زیهنییەوە نییە هەتا ببێتە جوزئی یا کوللی.

خودا نەبووە و نابێ بە شوێنی عەواریزی حادیسە کە لە پاش نەبوون پەیدا بووبێ، چونکـە هـەر سیفەتێ کەمال بێ لە ئەزەلەوە تا ئەبەد سابتە بۆ خودا و هەر سیفەتێکیش نەقس بێ لە ئەزەلـەوە

تا ئەبەد خودا لێیەوە دوورە، ئەو سیفەتە ئەگەر کەمال بوایە لە ئەزەلا دەیبوو، مادام کەمال نییە ئێستەیش دروست نییە عاریزی ببێ و بۆی پەیدا ببێ.

خودا شەکلی نییە نە سێ‌گۆشە و نە چوارگۆشە و نە غەیری ئەمانە؛ چونکە شەکل لەوەوە پەیدا ئەبێ کە شت سنووری هەبێ، خودایش ماددە نییە و سنووری نییە.

سوورەتی جەوهەری نییە کە (بالفعل) جیسمی پێ پەیدا ئەبێ، هەیوولا نییە کە ماددەی جەوهەرییە و دەبێتە شوێنی سوورەت و (بالقوة) جیسمی پێ پەیدا ئەبێ. خودا لە شەش لاکانەوە دوورە؛ نە ژووری هەیە و نە خوار، نە راستی هەیە و نە چەپ، نە پشتی هەیە و نە بەردەم، لە (حیّز) یا (مکان) و شوێنی ئارام‌گرتن دوورە و بێ‌پێوەندییە، خودا عەرەز نییە تا پێویستی بە جەوهەرێ ببێ بچێتە سەری و پێیەوە راوەستێ، جەوهەر نییە کە ماددەی (قائم بالذات)ە و دەبێتە شوێنی عەرەز و حاڵ، خودا جیسم نییە کە لە ئەجزای ماددی تێکەڵ بێت. جیسمانی نییە کە عاریز ببێتە سەر جیسمێک، رۆح واتە نەفسی ناتیقە نییە کە پێوەندی بە لەشی ئینسانەوە هەیە، رۆحانی نییە، واتە شتێک نییە کە رۆح پێوەندی پێیەوە هەبێ، خودا نە لە زەوی‌دایە و نە لە ئاسماندا، نە لە زەماندایە و نە لە مەکاندا، زاتێک لە زەمان و مەکاندا دەبێت کە خاوەن سنوور بێ و ئەم‌لا و لای دیاری بێت، خودا لە سنوور و گەمارۆدانی زەمان و مەکانەوە دوورە. خودا لە (مَتی) وە دوورە، واتە ناپرسرێ: کەی بووە یا کەی پەیدا بووە؟

دوورە لە (کم) و پرسیار لە چەندییەت؛ خودا نە ژمارەیە و نە ئەندازەیە، پرسیار بە (کم) یش بۆ ئەمانەیە. دوورە لە پرسیار بە (کیف) چونکە خودا کەیفییاتی نییە.

دوورە لە پرسیار بە (این) چونکە جێگای نییە. دوورە لە حەرەکە و سکوون و لکان بە شتێکەوە و لێ‌جیابوونەوەی.

ئەوە (مؤثر فی‌الوجود) و بەس
جَلَّ، تعالی، عَزَّ، تقدّس
بێ‌وێنە و ماددە، بێ‌موددە و ئالەت
وە بێ‌ماندەگی و عیجز و مەلالەت
ئاوردییە وجوود گشت ئەجزای عالەم
لە عەدەم، دیسان دەیواتەو عەدەم [٢٣]

له ئەزەل ئەو بوو، نه هیچ بوو، نـه کـەس
به بێچوون دەگەڵ هەموو چشتێ هەس
ئـاخریچ هـەر ئـەو دەمێنێـت و بـەس
یەعنی غەیری حەق دڵ به هیچ مەبـەس
(کمـا فـی الأزل فـی مـا لا یـزال)
پاکـه و موقـەددەس لـه نـەقس و زەوال

واته: هەر خودای گەورەیه کار لـه بوونـدا دەکـات و بـوونی داوه بـه ماهییەتـەکان و وای لـێ کردوون بوونیان هەبێ، واته ئەو ماهییەتانه نەبوون و خودای گـەوره ئاشـکرای کـردن و دروسـتی کردن و کردنی به سەرچاوەی ئاسار، به جۆرێ که ئینسان تەماشایان بکات دەتوانێ بلـێت ئەمانـه هەن.

خۆ ئەگەر وجوود عەینی زات بێ ئەوکاته مەعنای قسەکه بەم جۆره دەبێ:

هەر خودا وجوودی داهێناوه و له نەبوونەوه دەریکردووه بۆ بوون و وەک خۆر رووناکی بەسـەر جیهاندا پەخش دەکات.

خودا به بێئەوه که وێنەی جیهان بگرێ، بێئەوه که ماددەیەکی قەدیمی لا بێ، بێ هیچ جۆره ئامێرێکی داهێنان و دروستکردن، بێ ماندووبوون و زویری، بێئەوەی زەمانێکی پێویست بـێ بـۆ پێگەیشتنی ئیستیعداد و قابلییەت [24] هـەموو ئـەجزای جیهـانی دروسـت کـرد و لـه نادیـاریی نەبوونەوه هێنایه ژێر رووناکیی بوون، دیسان کاتێ نەیویست پایەدار بن دەیانباتەوه بۆ نەبوون.

خودا له ئەزەلدا هەر ئەو بوو، هیچ شتێکی ناعاقڵ و هیچ کەسێکی عاقڵ له ئارادا نـەبوو. خـودا به بێچۆنی و به بێپێوەندیی ناڕەوا بەڵکو بـه سـیفەتی ئافەریـدگاری و ئاگـاداری لەگـەڵ هـەموو شتێکدا هەیه.

له ئەنجامیشدا هەر خودا دەمێنێت و بەس، واته دڵ به هـیچ شـتێکەوه مەبەسـته بـه خـوداوه نەبێ، کائینات هەمووی له بەردەستی هێزی خودایه و پایەدار نییه و بـۆ ئـەوه ناشـێ دڵـی پێـوه ببەستی.

مەبەس لەم قسەیه ئەوەیه که ئەم جیهانی ئەنانییـەت و خۆپەرسـتی و خراپەکارییـه نامێنـێ و سەری سەرداران بێتاج و ناونیشان ئەکەوێ... مەبەس ئەوه نییه که هیچ مەوجوودێ له جیهانـدا

نامێنێ، چونکە بە نەسسی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) بەهەشت و دۆزەخ ئەمێنن و دانیشتووەکانیشیان هەر ئەمێنن.

هەروەها زاتی خودای گەورە بە بێ‌گۆڕان لە پاشەڕۆژدا دەمێنێتەوە بەو جۆرەی کە لە ئـەزەلدا بووە، پاکە و بێ‌خەوشە و لە کەموکووڕی و لەناوچوونەوە دوورە.

مەوسووف بە ئـەسما و سـیفاتی کـەمال
چە وەسفی جەلال، چە وەسفی جـەمال
چـە سـیفات زات بـێ‌شیبهـ و میسـال
چە سیفات پاک حەمیـدەی ئـەفعال [٢٥]
زاتی گشت قەدیم لـە حـودووس سـافی
وجـوودی و فیعلـی، حـادیس ئیـزافی
وەکـو خـەلق و رزق، وەکـو ئینتیقـام
ئیحیـا و ئیماتـە و ئیهانـە و ئیکـرام
(تعلّقـاتُ وصـفِ قدرتِـهِ
بکـونِ المقـدور کـلٌّ فـی وقتِـهِ)
لـە دڵـی پـڕ زەوق بـێ‌ئیعتیسـافدا
هـیچ مـەحزوور نییـە لـەم ئیتتیسـافدا
ککـون الحـقِ تعـالیَ وحـدە،
قبـل العـالم، معـە، بعـدە.

واتە: زاتی خودای گەورە مەوسووفە بە ئەسماء و بە سیفاتی کەمال. جارێ با باسی ئەوە بکەین کە خودای گەورە مەوسووفە بە ئەسماء: ئەگونجێ مەبـەس ئـەوەبێ کـە خـودا بـەو موشـتەققانە تەوسیف بکرێ کە لە ناوەکانی خودا پەیدا ئـەبن وەکـو مـوئمین و وەههـاب و رەززاق و عـەلیم و قادیر و موحیی و مومیت و غەیری ئەمانـە، بـەڵام ئـەم ئیحتیمالـە بـاش نییـە و دەبێتـە دووبـارە کردنەوە چونکە وەسفدارکردنی بە سیفاتی کەمال چ سیفاتی زاتی و چ سیفاتی فیعلی ئەم جـۆرە وەسفدارکردنە دەگەیەنێ. لەوانەیشە مەبەس ئەوە بێ کە خودای گەورە مەوسـووفە بـەوەی کـە خاوەن ناوە و ناودارە وەکوو لەمەولا؛ ئەگەر خوا حەز بکات؛ باسی ئەکەین.

شایانی باسە سەبارەت بە ناوی خودای گەورە چەند باسێک هەیە:

یەکەم: ئایا ناو خودی خاوەن ناوە یا نا؟ زاناکان فەرموویانە: لێرەدا ئیسم هەیە، موسەمما هەیە، تەسمییە هەیە؛ بۆ نموونە: (محمد) ئیسم واتە: ناوە، پیاوێکی دیاری کە ئەم ناوەی بۆ دانراوە موسەممایە، واتە: ناونراو. کاری ناولێنانەکەیش تەسمییەیە. بێگومان ئەم ناوە واتە (محمد) کە وشەیە و دەنگە و بەدەمدا دێ غەیری زاتەکەیە کە ئینسانێکی تایبەتی و دیارییە.

کەوابێ خیلاف لەوەدا کە ئیسمی خودی موسەممایە یا نا؟ بۆ واتای ئیسمەکە دەگەڕێتەوە؛ دەتوانین بڵێین ئەو ئیسمە کە تەنیا دەلالەت لە زاتی خاوەن ناوەکە دەکات، وەکو لەفزی پیرۆزی (الله) کە ناوە بۆ زاتی ئافەریدگار بە پێی واتاکەی خودی خاوەن ناوەکەیە؛ چونکە واتای کەلیمەی (الله) زاتی ئافەریدگاری گەورەیە.

بەڵام ئەو ئیسمەی کە واتاکەی حاڵ و کارە وەک (نافع) و (رءووف) و (لطیف) ئەوانە غەیری موسەممان؛ چونکە بۆ نموونە لەفزی نافیع زاتێکی نادیاری دەگەیەنێت کە سیفەتی رەئفەتی هەبێ، بێگومان ئەم مەجموعە غەیری موسەمماکەیە؛ چونکە موسەمما تەنها زاتی خودای ئافەریدگارە.

ئەو ئیسمانەیش کە واتاکانیان لە سیفەتە زاتییەکانن وەکو (عیلم) و (قادر) ئەوانە نە عەینی زاتن و نە غەیری، چونکە لە واتای (عیلم)دا (علم) دەردەکەوێ کە لە سیفەتە زاتییەکانە، سیفەتە زاتییەکانیش لای ئەشعەری نە عەینی زاتن و نە غەیر، وەکوو لەمەودوا باسی دەکەین، بەڵام لای موعتەزیلە و حوکەما عەینی زاتن، ئەوان لایان وایە سیفەتە زاتییەکان زیاد نین لەسەر زات و عەینی زاتن.

دووەم: ناوە مەشهوورەکانی خودای گەورە نەوەد و نۆن، یەکێ لەوانە کە لەفزی (الله)یە ئیسمی زاتە و عەلەمە بۆ زاتی خودای پەروەردگار، بەڵام ناوەکانی تر ئیسمی زاتی تێکەڵ لەگەڵ سیفاتن وەک (عیلم) کە ناوە بۆ زاتی خودا بە سیفەتی عیلمەوە، واتە: دەلالەت ئەکات لە زات لەو لایەنەوە کە خاوەن سیفەتی زانستە، یا (لطیف) کە ناوی خودایە بەو سیفەتەی کە میهرەبانە لەگەڵ مەخلووقاتدا. هەتاد.

دەلیل لەسەر ئەم نەوەدونۆ ناوە فەرموودەی پێغەمبەرە کە لە سەحیحی موسلیم و سەحیحی بوخاریدا باس کراوە: «إنّ لله تسعةً و تسعین اسماً مائه الا واحداً من أحصاها دخل الجنة»[٢٦].

واتەی «أحصاها»، وەکوو زانا بەرزەکان فەرموویانە، ئەوەیە بیانزانێ چەندن و باوەڕی بە مافی ئەم ناوانە هەبێ و پێی هەستێ. شایانی باسە ئەم ناوانە (ترمذی) باسی کردوون.

بێجگە لە ناوە مەشهوورەکان هەندێ ناوی تر هەن لە قورئـانی پـیرۆزدا نـاوبراون وەک: (ولـیّ، ناصر، غالب، قاهر، قریب، رب، اعلی، اکرم، أحسَنُ‌الخالقین، أرحم‌الـراحمین، ذی‌الطَـول، ذی‌القـوە، ذی‌المعارج).

هەندێکی تریش لە فەرموودەی پێغەمبەرا ناوهێنراون وەک (حنّان، منّـان) لـە ریوایـەتی (ابـن ماجە) یشدا چەند ناوی تر هاتوون وەک (تامّ، قدیم، شدید، کافی) و هەندێ ناوی تریش.

سێهەم: بەکارهێنانی ناو بۆ زاتی خودای گەورە ئاخۆ پێویسـتی بـە ئیجـازە و رێگـادانی شـەرع هەیە، یا پێویستی پێی نییە و لە خۆتەوە دەتوانی ناو دابنێیت و بەکاریبێنی بۆ خودای گەورە؟

قازی ئەبووبەکری باقلانی ئەڵێت: هەر لەفزێک مەعنایەک بگەیەنێت کە سابت بێ بـۆ خـودای گەورە ئەوە دروستە بەکاری بهێنی بۆی بە مـەرجێک کـە بـۆنی مـەعنای کـەموکـووڕی نـەدات، هەندێکی تر وتوویانە: بەو مەرجەیش کە گەورەیی خودای ئافەریدگار بگەیەنێت؛ کەوابێ دروسـت نییە (عارف، فقیە، عاقل، فطن، طبیب) بۆ خودا بەکاربهێنرێن؛ چونکە (عـارف) ئـەوە دەگەیـەنێت کە لە پێش مەعریفەتەکەدا بێ‌ئاگا بووبێ، (فقیە) بۆنی ئەوە دەدا کە لە پێشدا شتەکەی نەزانیبێت و لە پاشان تێی‌گەیشتبێ، (عاقل) بە یەکێ دەوترێ سیفەتی هەبێ بـانگی بکـات بـۆ ئیشـی نابـار بەلام بە هۆی عەقڵەوە خۆی لەو ئیشە نالەبارە رزگار بکات. (فطـن) بـۆنی ئـەوە دەدا کـە کـەمێ دوودڵ بووبێ لە شتەکەدا لە پاشا گورج تێی‌گەیشتبێ. (طبیب) ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کەسە بە خوێندن یا بە تاقی‌کردنەوە و بەراورد فێری ئەو زانستە بووبێت.

بەلام شێخ (ابو الحسن)ی ئەشعەری (ر.خ) لە سەر ئەوەیە بە قەتعی هـیچ ناوێـک بـۆ خـودای گەورە بەکارناهێنرێ هەتا لـە قورئـان و حـەدیس‌دا بەکارنـەهێنرابێ، وەکـوو ئـەو نـەوەدونۆ نـاوە مەشهوورە.

جا با بێینەوە سەر باسی سیفاتی کەمال؛ خودای گـەورە خـاوەنی سـیفاتی کەمالـە، واتـە ئـەو سیفەتانەی کە دەلالەت لەسەر زۆر گەورەیی ئەو ئەکەن لە هەموو بابەتێکەوە: چ وەسفی سـەلبی بن کە بە سـیفاتی جـەلال ناوئـەبرێن وەکـوو (قـدم) بـێ‌سـەرەتایی، (بقـاء) بـێ‌دوایـی، (وحـدة) بێ‌هاوتایی، (قیام بالذات) بێ‌ئیحتیاجی، (عدم المماثلة) بێ‌وێنەیی؛ چ وەسفی سبووتی کە سیفاتی جەمالیان پێ دەوترێ، ئەمانەیش چ سیفاتی زاتی بن بۆ زاتی بێ‌وێنە و بێ‌هاوتا وەکوو (حیاة، علم، ارادة، قدرة، سمع، بصر، کلام) واتە: زیندوویی و زانست و خواست و تەوانایی و بیسـتن و بیـنین و گۆیایی، چ سیفاتی پاکی ئەفعالی حەمیدە و کردەوەی پەسەند بن.

شایانی باسە حەزرەتی مەولەوی لێرەدا باسی سیفەتی نەفسی نەکرد وەک وجوود، لەسەر ئـەوە کە لە بیر و باوەڕی ئەهلی تەسەووفـدا وجوودی خودای گەورە عەینی زاتە و لە سیفات نییە.

جا ئەم سیفەتانە ئەوانەی کە سەلبیاتن بە ئیعتیبارییاتی (نفس الامـر)ی دەژمێـررێن، ئەوانـەی کە سبووتین و لە سیفاتی زاتییـەن وەک (حیـاة، علـم، ارادة...) گشـت قـەدیم و ئـەزەلین و لـە حدووس و پەیدابوون پاک و دوورن و هەموو وجوودین.

هەرچی سیفەتی سبووتیی فیعلیشە وەک (خلق، رزق، قهر، انتقام) هەموو حادیسـن و هـەرکام لە کاتێکی تایبەتی‌دا پەیدا دەبن، بۆ نموونە: ویستی زەیـد ببـێ لـە سـکی دایکیـا گیـانی بەبـەرا دەکات و، کاتێ ویستی بیمرێنێ ئەیمرێنێ، کاتـێ بیـەوێ سـەربەرزی بکـات گـەورەی دەکـات و بیەوێ سووکی بکات سەرنزمی دەکات.

دیارە ئەم جۆرە سیفەتانە هەروەک حادیسن لە ئومووری ئیزافین، واتە: پێوەندییان بە غەیرەوە هەیە، چونکە سیفاتی فیعلییە بریتین لە پێوەندیی سیفەتی قـودرەتی بـە وجـوودی مەقـدوورەوە هەرکام لە کاتی خۆیا، دیارە لە وەسفدارکردنی خودادا بەم ئیزافانە خەوش و کەموکـووڕی نییـە، چونکە سیفەتی ئیعتیبارین وەک بوونی خودا بە تەنیا خۆی لە پێش جیهاندا و لەگـەڵ جیهانـدا و لەپاش جیهان کە ئیعتیبارییاتن و بە سیفەتی حادیسی مەوجوود ناناسرێن.

ئەزەلییـــەت بـــۆ ئـــەسما ســـابیتە
لـە وەجهـی رجـووع ئـەباڵ قودرەتـە
ســـیفاتی زاتی هـــەروەکوو زاتـــن
خاریج لە دەرکـی گشـت مـەخلووقاتن
هیچ مەعلووم ناون بۆمان (کمـا هـی)
ئـــەزەلی و ئەبـــەد ناموتـــەناهی
با تەعـەللوقیان واحیـد (بالـذات)ن [۲۷]
(حیـــث التعلـــق) بـــێ‌نییهایـــاتن
گشت زائید لە زات نە عەین و نە غـەیر
(مـن حیـث الایجـاد آثارهـا خیـر)
وەک (مـا اسـابک) دەکـا، بـێ‌گومـان،

ئیما «ما تری فی خلـق‌الـرحمن...» (٢٨)

نـاون: نـابن. ئیمـا: ئیشـارە، هێمـا...

واتە: ناوە پیرۆزەکانی خودای گەورە هەموو ئەزەلین، چونکە هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ سیفەتی قودرەت کە سیفەتێکی ئەزەلییە بۆ نموونە: (خالق) واتە: تەوانا لەسەر دروستکردن، (رزاق) واتە: تەوانا لەسەر رزق و رۆزی دان...تاد.

پێویستە بزانن مەبەستی مەولەوی لێرە لە (اسماء) ئەو ناوانەیە کە بە موشتەق ناسـراون وەکـوو رەحمان و رەحیم و مەلیک و هاوچەشنەکانیان، نەک ئەو ناوانەی کـە بـۆ زاتی خـودا دانـراون لـە عەرەبیدا وەکو (الله) و لە کوردیدا وەکو (خودا).

هەروەها ئەم تەئویلەی مەولەوی لە زۆربەی ناوەکاندا دێتەجێ، ئەگینا ناوی‌وا هەیە دەگەڕێتەوە بۆ سیفەتی حەیات، عـیلم، ئـیرادە، سـەمع، بەسـەر، کـەلام، یـا بـۆ سـیفەتە سـەلبییەکان وەکـو قووددووس، سەلام، ئەووەل، ئاخیر، وەکـو لـە کتـێبی (شـەرحی مـەواقیف)دا لـە باسـی ئـەسمای حوسنادا باس کراوە.

سیفەتە زاتییەکان کە مەشهوورن بە سیفاتی مەعنی وەکوو حەیات و عیلم و ئیرادە و قـودرەت و سەمع و بەسەر و کەلام کە بە حرووفی جوملەی (أحِقّ سـبعک) ئیشـارەیان بـۆ دەکـرێ، واتـە: باوەڕم بە حەوت سیفەتەکەت هەیە، وەکوو زاتی خودان لەوەدا کە غەیری خـودای گـەورە کـەس کونهـ و حەقیقەتیان نازانێ و ئێمە پەی بە حەقیقەتیان نابەین. ئـەم سـیفەتانە وەک زاتی واجـب ئەزەلی و ئەبەدین، بێئەووەڵ و بێئاخرن و نابڕێنەوە. لەگـەڵ ئەوەیشـدا کـە پێوەنـدییان بـە زۆر شتەوە هەیە خۆیان لە خۆیاندا (واحد)ی (بالذات) ن، ئەوەتا عـیلم روو دەکاتـە هـەموو زانراوێـک، ئیرادە روو دەکاتە هەموو بووویک لـە مومکینـەکان، قـودرەت روو دەکاتـە هـەر مومکینێـک کـە خواستی لـە سـەری هـەبێ، بـەلام ئـەم سـیفەتانە یـەکن. هـەروەها ئـەم سـیفەتانە لـە لایـانی پێوەندییانەوە بڕانەوەیان بۆ نییە، ئەوەتا هیچ مەقدوورێ نییە کە قودرەت رووی تـێنـەکات، هـیچ مەوجوودێ نییە لە ناو مومکیناتدا بۆ ئەوە نەشێ ئیرادە رووی تێبکات.

ئەم سیفەتە زاتییانە هەموو زیادن لە سەر زاتی خودای گەورە، چونکە خودا خـۆی لـە قورئـانی پیرۆزدا ناوی خۆی بردووە بە (حیّ) و (عَلیم) و (قادر). حەملی هـەر موشـتەققێکیش لەسـەر زات ئەوە دەگەیەنێت کە سەرچاوەی موشتەققەکە سیفەتی زاتەکەیە، بـۆ نموونـە کـە تـۆ وتـت: (الله علیم) واتە: عیلم سیفەتی (الله) یە، جا ئەگەر سەرچاوەی موشتەققەکە شتێکی ئیعتیبـاری بـێ و

لە عەینییات نەبێ وەکوو ئیمکان لە جوملەی (زید ممکن) و حودووس لە جوملەی (زید حادث)دا ئەوە پێویستە کە لە زیهندا زیاد بێ لەسەر زات، بەڵام ئەگەر لە سیفاتی خاریجی بێ وەکوو عیلم و حەیات... ئەوە لازمە لە زیهن و لە خاریجدا زیاد بێ لەسەر زات، کەوابێ ئەبێ عیلم زیاد بێ لەسەر زات.

کە سیفات زیاد بن لەسەر زاتی خودای ئافەریدگار نابێ خودی زاتەکەی بن، چونکە عەینییەتی سیفات بۆ زات شتێکی ناجۆرە و پێچەوانەی بەدیهییە، بۆیە پێویستە غەیری زات بن، چونکە هەر شتێ نیسبەت بە شتێکی تر کە (عەین)ی نەبوو پێویستە (لاعین) بێ هەتا (رفع النقیضین) روونەدات. دیارە کە سیفەتەکانی خودای گەورە (لاعین) بوون، ئەوا غەیر دەبن، غەیریش دوو جۆرە، یەکەم ئەوەیە لە هاو غەیرەکەی جیا دەبێتەوە، وەک زەید کە جیایە لە عەمر، یا تەندروستی کە جیایە لە لەش. دووەم: جیابوونەوەی مەحاڵە وەک سیفەتەکانی خودای گەورە کە هەرگیز لێی جیا نابنەوە. ئەو غەیرییەتە کە گرنگ بێ بەشی یەکەمە، بەشی دووەم لەبەر ئەوەی جیابوونەوەی تێدا نییە وەک ئەوەیە کە غەیر نەبێت.

زانایان دەڵێن: (ابوالحسن)ی ئەشعەری [٢٩] فەرموویەتی: سیفەتەکانی خودای گەورە هەر وەک عەینی زاتەکەی نین، کە ئەمەیش ئاشکرایە، غەیری زاتەکەیش نین؛ چونکە نە ئەمان لە زات جیا دەبنەوە و نە زات لەمان جیا دەبێتەوە.

پوختەی باسەکە ئەوەیە سیفەتەکانی خودای ئافەریدگار لە راستیدا و لەسەر مەعنای بەرامبەری (عەین) بە غەیری خودای گەورە دەردەچن، بەڵام لەسەر ئەو مەعنایەی ئەشعەری لێی داوەتەوە غەیر نین، واتە: لە زات جیا نابنەوە. بەم حیسابە سیفەتەکانی خودا نە عەینن و نە غەیر.

سیفەتەکانی خودا لەو رووەوە کە خودا ئیشیان پێدەکات، واتە خودا بە خواستی خۆی زەید بەرز دەکاتەوە و عەمر نزم دەکاتەوە، بە قودرەتی خۆی تەندروستی بە فلان کەس دەبەخشێ و نەخۆشی بەسەر فیسارە کەسدا دەدات، هەموو ئاساری ئەو سیفەتانە خێر و حیکمەت و جوانن، ئەگەرچی بۆ ئەوەی کە ویستی نزمبوونەوەی کراوە یا ئەوەی نەخۆشیی بەسەرا دراوە مایەی ئازار و بێزارییە.

سیفەتەکانی خودا لەو رووەوە کە پێوەندییان بە خوداوە یا غەیری خوداوە هەیە وەکوو نیسبەتی (ما اسابک) وایە، واتە: ئەوەی لە لایەنی خوداوە بۆ تۆ نێرراوە و بە تۆ دەگات لە خۆشی و ناخۆشی هەمووی، لەو رووەوە کە خودای گەورە ناردوویە و ئەو دروستی کردووە، حیکمەتە و

باشە، لەو رووەیشەوە کە دەبێتە هۆی گۆڕانی حاڵی تۆ ئەگەر بە باشی بیگۆڕێ باشە و جوانە، ئەگەر بە خراپی بیگۆڕێ و، لات و لاواز و بێئاسایش و بێنومایشت بکات گەلێ پێی زویر ئەبی و لات خراپ و نالەبارە، بەڵام لە دروستکردنی خودای گەورەدا هەمووی هەر باشە؛ چونکە مادام مەبدەئەکەی لە خوداوەیە و، ئیشی خودایش پڕە لە حیکمەت، هەمووی باشە.

ئەم فەرموودەیە تەقریری ئایەتی (و ما أصابک من حسنةٍ فمنَ‌الله، و ما اصابک من سیّئةٍ فمنّ نفسک) [۳۰] لەگەڵ ئایەتی (ما تری فی خلق‌الرحمن من تفاوت) [۳۱] دەکات. واتە: سەبارەت بە حاڵی تۆ ئەوەی کە پێت دەگات هەندێکی جوان و هەندێکی ناجوانە، بەڵام سەبارەت بە دروستکردن و داهێنانیەوە لە لایەن خوداوە هەمووی جوانە و هیچ جیاوازییەک لە نێوانیاندا نییە.

باوجوود موکەللەف نییەین بەمانە
سیفاتی ئایا زائیدن یا نە؟
یا خۆ ئەمیانە عەینی ئەوەیە
یا تەغایوریان لە بەیندا هەیە
بۆ زاتی ئایا غەیرن یا خۆ عەین؟
حەواڵەی کەشفی ئەسفیای دەدەین [۳۲]
ئێمە مەحجووبین با لاچین لە بەین
قسەی لێ نەکەین چاکە و دەیچیکەین
بۆچ؟! ئەهلی هەوا غالبن تەواو
(لا علاج) ئینسان تێرنە ئەو جەواو [۳۳]

باوجوود: ئەگەرچی، لەگەڵ ئەوەشدا. نییەین: نین. دەیچیکەین: دەیشیکەین. لاعلاج: ناچار. تێرنە ئەو جەواو: دەهێننە جواب، ناچاری دەکەن قسە بکات.

واتە: ئێمە بە قەدەر حاڵی خۆمان قسەمان لە عەینییەت و غەیرییەتی سیفەتەکانی خودا کرد. ئێمە داواڵێکراوین کە باوەڕ بکەین بە بوونی خودا و بە بوونی زیندوویەتی و زانین و خواست و توانا و بیستن و بینین و قسەکردن بۆی؛ چونکە دژی ئەم سیفەتانە، کە مردن و نەزانین و بێ-خواستی و بێتوانایی و کەڕی و کوێری و لاڵییە، خەوش و کەموکووڕین و بۆ خودا دەست نادەن؛ نەک خودای گەورە تەنانەت هیچ ئینسانێک بەوە رازی نابێت یەکێ لەو سیفەتانەی لێ بسەنرێت.

ئیتر ئێمە داوای ئەوەمان لێ نەکراوە بزانین ئاخۆ سیفەتەکانی خودا عەینی زاتن یا زیادن لەسەر زات، یا سیفەتی عیلم ـ بۆ نموونە ـ عەینی سیفەتی ئیرادەیە یا جیایە لێی؟ لەسەر رای زانا بەرزەکانی ئایین مەسەلەی عەینییەت و غەیرییەتی سیفەتەکانی خودا حەوالەی بەرچاوڕوونی و دەروونڕووناکیی دۆستانی خودا بکەین باشترە. ئەوەتە پایەبەرز (جلال الدین)ی دەووانی ئەفەرموێت: لە هەندێ دۆستانی خودام بیستووە عەینییەت و غەیرییەتی سیفەتەکانی خودا بە غەیری کەشف بۆ کەس دەرناکەوێ، ئێمەیش کەشفمان نییە، کەواتە وا باشە لەم ناوەدا نەمێنین و ئەم مەیدانە بە جێ بێڵین و قسەی تیا نەکەین، ئەگەرچی هەر قسەیش دەکەین، چونکە ئەهلی هەوا زۆرن و قسەی هەڵەوپەڵە ئەکەن و ئینسان ناچار ئەکەن بێتە جواب و قسە بکات، وا منیش بە ناچاری دێمە جواب و بە چەشنی ئەهلی حەق چەند قسەیەک ئەکەم و ئەڵێم:

سیفەتەکانی زاتی (واجب‌الوجود) زیادن لەسەر زات؛ بە چەند دەلیل:

دەلیلی یەکەم رێگای پێشینانی ئەشعەرییەکانە کە بریتییە لە قیاسی غائیب لەسەر شاهید و حازر. دارشتنی ئەم دەلیلە لەسەر فەرموودەی (امام الحرمین) ئەوەیە کە بۆ راستیی قیاسی غائیب لەسەر شاهید پێویستە جامیعێ لەبەینی هەردووکیانا هەبێ و، بە بێ جامیع بە قەتعی حوکم نادرێ. تەماشاکەن ناتوانین قیاسی زاتی خودای گەورە لەسەر ئەو شاهیدانە بکەین کە فاعیلن و ئیش‌کەرن و جیسم و سنووردارن، چونکە جیسمییەت و سنوورداریی بۆ خودای گەورە مەحاڵە.

جامیع چوارە، یەکەم: عیللەت. دووەم: شەرت. سێهەم: حەقیقەت. چوارەم: دەلیل.

بۆ نموونە: مادام حوکمێ لە شاهیددا موعەللەل بوو بە عیللەتێ وەکو عالمییەت کە عیلم عیللەتەکەیەتی، یا خۆ حوکمێ لە شاهیددا مەشرووت بێ بە شەرتێک وەکو عالمییەت کە شەرتەکەی حەیاتە، یا خۆ حەقیقەتێ لە شوێنێکدا سابت بێ وەک ئەوە کە حەقیقەتی عالم بریتییە لە (من قام به العلم)، یاخۆ دەلیلێ بە عەقڵ دەلالەت لە مەدلوولێ بکات وەک دەلالەتی ئیحداس لەسەر موحدیس، پێویستە ئەمە گشتی بێ و لە غائیبەکەدا وەک شاهیدەکە هەبێ.

ئەنجا مادام سابت بوو لە شاهیدا کە حەقیقەتی (عالم) (من قام به العلم)ە و، حوکم بەوە کە عالم عالمە عیللەتی ئەوێ، پێویستە ئەم یاسایە لە غائیبەکەیشدا هەبێ. هەروەها کەلام و ئیرادە و قودرەت و سیفەتەکانی تریش.

جا ئەگەر کەسێ بڵێت ئەم ئەحکامە لەبەر ئیمکان و حدووس موعەللەلە لە شاهیددا، غائیبەکـە چونکە واجب و قەدیمە موعەللەل نابێ، لە وەڵامدا ئەڵێم وجووب و قیدەم مونافیی تـەعلیل نییـە، تەنها ئەوەندەیە واجب تەنها بە واجیب موعەللەل بێ و جائیزیش تەنها بە جائیز، ئیتر جیـایی لـەم حوکمانـەدا دژی مەبەسـتی ئێمـە نییـە؛ (عـالم) کـە پێویسـتە عـالم بێـت تـەنها لـە لایـەنی عالمییەتەکەوەیە نەک لەو لایەنەوە کە جەوهەر یا عەرەز یا حادیس یا قەدیم و شتی ترە.

دەلیلی دووەم ئەوەیە کە خودای گەورە عالمـە و هـەموو عـالمێکیش پێویسـتە عیلمـی ببـێ؛ چونکە تەسەوور ناکرێ لە (عالم) ئیللا کەسێ وەها کە عیلمی بۆ سابت بێت. سیفەتەکانی تـریش بەم جۆرە؛ بۆ نموونە: خودای گەورە (قادر)ە و هەموو (قادر) ێکیش پێویستە قودرەتی هەبێ.

جا ئەگەر کەسێ بڵێت: راسـتە خـودای گـەورە عیلمـی هەیـە، بـەڵام بـۆ دروسـت نییـە کـە عیلمەکەی عەینی زاتی بێ و زائید نەبێ لەسەر زاتی؟ لە وەڵامدا ئەڵێین:

ئەگـــەر ســـیفاتی نەفســـی زات دەوێ
لزوومـــی چەنـــدێ مـــەحاڵات دەوێ
ئـــەووەڵ: دەوێ حـــەمل (بـــلا افـــادە)
دووەم: مەســـــەلا عیلمـــــە ئـــــیرادە
سـێیـەم: عەقڵـی تـۆ دەشـێ جـازم بـێ
مەســـەلا بـــە بـــوون واجـــب عـــالم بـــێ
بێ حاجـەت ئـەباڵ ئیسـبات بـە بورهـان
چـــت نەفســـی خۆیـــە زەروورە و عـــەیان
چـارەم: بـوێ عـیلم (واجـبالوجـود)
(بالـــذات) ســـانیعی عالـــەم و مـــەعبوود
قســـەیچ لـــە نـــەحوی (عـــالِم)دا نییـــە
کـــــەوا حـــــەملیان (مواطـــاة) ییـــــە،
بەڵ قسـە لـە بـەحس نـەحوی (علـم)یـە
کـــــەوا حـــــەملیان ئیشـــــتیقاقییە
هەرگاهـــ کـــە نەفســـی زات بـــن ئەوانـــە

مەحالاتەکــــە زاهـــــیر بزانــــــە...
ئــەر دەڵـــێ ئەوســـا لێـــی لازم دەوێ
کـــە تـــەغایوری ئیعتیبـــار نـــەوێ
چـە مەحالـێ هـەس ئەگـەر بلـێ: (ذات،
حیـــث التعلـــق بـــذی المعلومـــات،
عـــالمٌ، بـــل علـــمٌ). (علـــی ذا القیـــاس)
تـــەقریری بـــاقیی ســـیفاتیچ هـــەر واس
مـــەعنای حـــەملیان یانییهـــای زاتی
(متعلّـــــــــــقٌ بالمعلومـــــــــــاتِ)
(و هکـــذا) وا فایـــدەی بـــوو عـــەیان
ئیفتیقـــاریچی بـــوو ئـــەبال بـــەیان
تـــەمایوزی بـــەین ئیعتیبـــارات بـــوو
تەکەسســـوریچ بـــۆ وجـــوود نەیـــدا روو
هەر وەک ئەو جوملە مەشهوورە لە بـەین:
ئەڵـــێن (الواحـــد نصـــفٌ للاثنَـــین)،
سولســـی ســـیانە، روبعـــە بـــۆ چـــوار،
تـــا هـــەرکوێ بـــڕۆت[٣٤] نایەتـــە شـــومار
دیـارە مـەوجوود هـەر واحیـد[٣٥] دەوێ
حـــەملی موفیـــدە و نیســـفییە جگـــێ
دەڵـــێین بـــوونی زات پـــاکی عەلییـــە
بـــە نـــەفس و عـــەینی ئـــەو تەعەللوقیـــە
باتیلییـــــــــــەتی زۆر بەدیهییـــــــــــە
(ککـــون الواحـــد نفـــس النصـــفیة)

(بـــل انَّمــا هـــو عـــالمٌ، قـــدیر،
حـــیٌ، مریـــدٌ، ســـمیع، بصـــیر)
پـــەس ئـــەوا مـــاوە لـــەم ڕەواقـــەدا
کـــەلام لـــە مەئخـــەز ئیشـــتیقاقەدا،
وەکـــو قـــودرەت و عـــیلم، (وَ إنَّـــە
معنـــیً زائـــدٌ لـــیس نفسَـــەُ)
بـــۆچ؛ میســـلی قـــودرەت (ربّ البریّـــة)
لـــە ئیعتیبـــارات عەقلییـــە نییـــە
بـــەڵ لـــە مـــەعانیی حەقیقییـــەن گشـــت
لـــەم دوو شـــیققانە یـــەکێ بگـــرە مشـــت
ئـــەر عەینـــەن عـــەودەت بـــۆ مەحالاتـــە،
وەر وەرای زاتـــەن مەتلـــەب ئیســـباتە
نییـــە دەلالـــەت ســـەمعی و عەقلییـــە
لـــە بـــۆ ئیزاحـــی مـــەعنای غەیرییـــە
(نَعَـــم فـــی صـــفات جنـــاب البـــاری)
هەیـــە ئیتتیفـــاق بـــۆ ئوممـــەت جـــاری
کـــە مـــەنعی ئیـــتلاق غەیرییـــەت دەکـــەن
ناویـــان بـــۆ زات وەک ئـــەغیار نابـــەن
(بنـــاء عَلـــی ذاکَ الإتّفـــاق
نحـــن نقطـــع بمنـــع الإطـــلاق)
تـــەعریفی غـــەیریچ وا کـــە مەشـــهوورە
بـــۆ بەڵـــەدییەت لـــەگرە زەروورە
غـــەیر ئینفیکاکیـــان لـــە بەینـــدا دەوێ
یـــا خـــۆ دوو زاتـــن ئـــەمیان ئـــەو نـــەوێ

قسەیچ: قسەیش. سیفاتیچ: سیفاتیش. واس: وایە. یانییهای: واتە، یەعنی. شومار: ژمارە. جگێ: جیا. لەگرە: لێرە. دەوێ: دەبێ. نەوێ: نەبێ. ئەگەر سیفاتی خودا نەفسی زات بن گەلێ مەحالات روو دەدات.

یەکەم: حەملی سیفات لەسەر زات بێفائیدە ئەبێ؛ چونکە حەملی شت لەسەر خودی خۆی بێسوودە، کەچی (الله عالم) جوملەیەکی سوودبەخشە.

دووەم: ئەوە روو ئەدات کە سیفەتی حەیات عیلم بێ، سیفەتی عیلم ئیرادە بێ... تاد، ئەبێ رەوا بێ بڵێین: (الحیاة علمٌ، والعلم ارادة) چونکە ئەگەر سیفەتەکان عەینی زات بن دەتوانین بڵێین: (الحیاة ذات، والذات علم؛ فالحیاة علم) یا بڵێین: (العلم ذات الباری، وذات الباری أرادة فالعلم إرادة) ئەمەیش بەتاڵە؛ چونکە (حیاة) واتە: زیندوێتی، سیفەتێکە سەرچاوەی هەست و جموجووڵە. (علم) واتە زانین سەرچاوەی دەرخستنی زانراوەکانە. (ارادة) واتە خواست هێزێکە سەرچاوەی دیاریکردنی یەکێ لە دوو شتە بۆ هاتنەدی.

سێهەم: ئەوە روو دەدات کە ئینسان باوەڕی جازمی ببێ بەوە کە خودا عالمە و لەم باوەڕەدا موحتاجی دەلیل نەبێت، چونکە کە سیفەت و زات یەک بن حەملی شت لەسەر خۆی موحتاجی دەلیل نابێت؛ کەچی پێسەلماندنی هەرکام لەم سیفەتانە و ئیسباتکردنیان بۆ زاتی خودا پێویستی بە دەلیل هەیە.

چوارەم: دەبێ دروست بێ بڵێین: عیلمی خودا (واجبالوجود) ە، سانیعی عالەمە، مەعبوودە، چونکە عیلم عەینی زاتە، زاتیش سانیع و مەعبوودە، کەواتە عیلم سانیعە و مەعبوودە، ئەمەیش بە ئاشکرا بەتاڵە.

جا ئەگەر کەسێ بڵێ: کاتێ ئەم مەحالانە روو دەدەن کە مەفهوومی زات لەگەڵ سیفەتەکان یەک بن، بەلام ئەگەر لە مەفهوومدا جیاواز بن، با لە زاتیشدا یەک بن، مەحاڵ روو نادات، وەکو ئەڵێیت: ئینسان کاتبە یا (الله عالم)، کە ئینسان و کاتب و (الله) و (عالم) لە زاتدا یەک و لە مەفهوومدا جیاوازن، لە وەڵامدا دەڵێین: ئێمە باسی (حيّ) و (عالم) و (مرید) و (قادر) ناکەین، کە بە شێوەی حەملی (مواطاة) حەمل دەکرێنە سەر زات و دەوترێت (الله حيّ) یا (الله عالم) تاد...، کە مەوزووع و مەحموول لە مەفهوومدا جیان و لە زاتدا یەکن، بەڵکو قسەمان لە (حیاة) و (علم) و (إرادة) و (قدرة) ە، کە مەبادیئی مەحموولاتەکانن، ئەمانە نە عەینی زات و نە غەیری زاتن، بەو جۆرەی کە باسمان کرد و، رەخنەکانیشمان هەر لەسەر ئەم ئەساسە بوو؛ دیارە ئەگەر حەیات و

عیلم و ئیرادە و قودرەت عەینی زات بن و بلێین: (الله حیاة) یا (الله علم) تاد... ئەو مەحالانـە کـە باسمان کردن روو دەدەن.

هەروەها ئەگەر کەسێ بلێت ئەو مەحالانە کاتێ روو دەدەن کە لەگەڵ عەینییەتی سـیفاتدا بـۆ زات جیاوازیی ئیعتیباری لە بەینیاندا نەبێ، بەلام ئەگەر جیاوازیی ئیعتیبـاری ببـێ قـەی‌ناکـا. بـۆ نموونە: هەر چەند عیلم و زات یەکێکن بەلام لە زاتا تەنها زات تەماشا ناکرێ، بەڵکو ئەڵـێن: زاتی خودا لەو لایەنەوە کە پێوەندی بە زانراوەکانەوە هەیـە عیلمـە و، لـەو لایەنـەوە کـە پێوەنـدی بـە مەقدووراتەوە هەیە قودرەتە... تاد. بەم‌جۆرە هیچی تیا نییە کە بلێین: زاتی واجب، لەو لایەنـەوە کە پێوەندی بە زانراوەکانەوە هەیە عالمە، بەڵکو عیلمە، وە لە لایەنی پێوەنـدی بـە مەقدووراتـەوە قـادرە بەڵـکو قودرەتـە، وە مـەعنای حـەملی عـیلم لەسـەر زاتی بـاری ئەمەیـە کـە زاتی بـاری موتەعەللیقە بە مەعلووم و مەقدوورەوە و حەملەکەیشی راست و موفیدە و پێویستیشی بە بورهـان هەیە و، تەمایوزیش لە ئیعتیباراتەکەدا هەیە وەکو ئەوە کە ئەڵێت «الواحد نصف الاثنـين و ثلـث الثلاثه و ربع الأربعة... الخ»، لە وەلامدا ئەڵێم مەعنای ئەم قسەیە ئەوەیە کـە زاتی واجـب بـریتی بێ لە تەعـەللوقات، چونکـە لـەم بەیانـەدا زات لەگـەڵ عیلمـدا یـەکن، عیلمـیش تەعەللوقـە بـە مەعلووماتەوە و، بوونی زات بە تەعەللوقات بەتاڵە وەک بوونی واحید بە نیسفییەت، چونکە واحیـد نیسفییەت نییە بەڵکو نیسفە و، زات عالم و قادر و موریدە نەک عیلم و قودرەت و ئـیرادە، ئـەمجا قسە دێنینە سەر ئەم عـیلم و قـودرەت و ئیرادەیـە کـە پێویسـتە مەعنایـەک بـن بێجگـە زات و، ناوبردنیان بە تەعەللوقات سوودی نییە، چونکە عیلم و قودرەت تەعەللوقاتی ئیعتیبارییە نین وەکـو ئیمکان و حدووس، بەڵکو لە حەقائیقن؛ کەوابوو یا ئەبێ بلێت عەینی زاتن و مەحاڵەکان بێنەجێ، یا ئەبێ بلێت زیادن لەسەر زات کە مەبەستی ئێمەیە و لای ئێمە ئەمە راستە.

بەلام ئاخۆ لەسەر ئەم رایە یەکێ لە زانـا ئەشـعەرییەکان پێیـان دەڵـێت غـەیری زاتی واجـب؟ وەلام: نە، واتە: نەمان بیستووە یەکێ لە ئەشعەرییەکان بلێت: سیفەتەکانی خـودا غـەیری زاتـن؛ چونکە لای ئەوان شتی غەیری یەک، دوو مەوجوودن دروست بێ لـە یـەکتر جیـا ببنـەوە، دیـارە سیفەتەکانی خودا و زاتی خوداش هەرگیز لە یەک جیا نابنەوە، نە زات بـە بـێ سـیفەتەکان و نـە سیفەتەکان بە بێ‌زات ئەبن.

تەقریری مەزهەب ئـەهلی حـەق کریـا
ئیجازەی تـەقریر تـەرزێ تـر دریـا [٣٦]

ئەمــــە تــــەحريرى ئوســــوولى دينـــــه
هەڵــگره بــه دڵ هـــەر كـــام يەقينـــه
(مثبتـــــو الصـــــفات) ئيختيلافيانـــــــه:
ســيفات زائيــدن (علــى الــذات) يــا نــه؟
ئەو كــەس وا قــەولى هــەس بــه زيــاده
لـــه ســـيفات خــــەواس دەكــــا ئـــيراده
خاسەى وەسفى عيلم دانستەن شــعوور
خاسەى ئيراده قەســدەكەى مەشــهوور
بۆ وەســفى قــودرەت خاســەى ئامــاده:
(تــــــأثيرٌ علـــــــى وفـــــــق الارادة)
چه حاجەت قەلــەم تــوولى پــێ بــدات؛
(فقِـــس عليهـــا ســـائرَ الصـــفات)
(و تلـــك الخـــواصّ ليســـت عينــــه،
و هـــــــو ظـــــــاهرٌ، و لا غيـــــــره)
بــۆچ؟ (فــى الوجــود الخــارجى) نييــەس
تـــــەمايوزيان لــــــه زاتى ئەقـــــدەس
(فَلـــــذا قـــــالوا، جـــــزاهمُ الخيــــر:
بـــان الصـــفات لا عـــينٌ، لا غيـــر).
(والغيريّـــــــــةُ التـــــــى اســـــــتبان
منهـــا الاســـتلزام لوصـــف الامكـــان)
(المفتقـــــــرُ المحـــــــوج العائـــــــل
فــــىالوجــــود الــــى تــــأثير الفاعـــل)
غەيرييەتێكـــــــه (ذات الاقتـــــــران
للتمـــــايز الخـــــارجى) بيـــــزان

ئـيرادە دەكـرێ خـەواسّ لـە ئەوسـاف
نـاوێ ئيتتيسـاف (بالفعـل)ی بـۆ زات
(كيـــف لا يكـــون مقصـــوراً عَلـــى
حصـــولِ تلـــك الخـــواصّ، و لا
شـــیء مـــن عـــالم مريـــدٍ قـــدير
بـــلا شـــعور قصـــدٍ او تـــأثير،
مـــثلاً، بهـــذا المعلـــوم المـــذكور
لهـــذا المـــراد، فـــی ذاك المقـــدور
عالمـــاً بـــه، مُريـــداً لَـــهُ،
قـــديراً عليـــه، فـــذرْ مـــن لَهُـــوا [٣٧]
و ليســـت نفـــسُ ذی المباديـــات
كـــذلك، فهـــی كانـــت عـــينَ الـــذات
و ان لـــم تكـــن عينهـــا يلـــزم
فـــی تلـــك الخـــواصّ لله الأعظـــم)
ئيحتيـاج ئـەباڵ غـەيری زاتی خـۆی
ئـەمرێ شـەنيعە، دەشـێ لێـی لادەی
(و اِن يَســـتَند ذا الغيـــرُ لَـــهُ
يعنـــی اليـــه، جـــلّ شـــأنُهُ)

نييەس: نييە. دەشێ: دەبێ، پێويستە.

واتە: لە باسی پێشوودا رێبازی ئەهلی حەق دەربـارەی سـيفەتە زاتييـەكانی خـودا دەربـڕرا. وا لێرەيشدا لە لايەن زاناكانەوە رێگای تەقريرێكی ترمان پێدراوە.

ديارە ئەم شوێنە شوێنی روونكردنەوەی بناخەكانی ئايينـە و پێويسـتە بـۆ يـەقين تێكۆشـين؛ خودای گەورە دەفەرموێ »و لا تقفُ ما ليس لک بـه علـم» واتـە: مەكـەوەرە شـوێنی شـتێ كـە يەقينت پێی نەبێ و، ئەو بير و باوەڕە وەربگرە؛ كە موافيقی زاهيری كيتاب و سوننەت بـێ؛ خـودا فەرموويەتی: (الذين يستمعون القول فيتبعون أحسنه) تەقريرەكەيش ئەمەيە:

ئەوانەی پێکهاتوون لەسەر بوونی سیفەتەکانی خودای گەورە لە ناو خۆیاندا بیروڕایان جیـاوازە: ئاخۆ ئەم سیفەتانە زیادن لەسەر زاتی خودا یان نـا؟ ئەوانـەی رایـان لەسـەر زیـادیی سـیفەتەکانە مەبەستیان لە سیفەتەکان خەواسی ئەو سیفەتانەیە؛ بۆ نموونە: خاسەی سیفەتی عـیلم زانسـت و هەستە، خاسّەی ئیرادە قەسد و ویسـتی دامـەزراوە، خاسـەی قـودرەت بـەجێهـاتنی مەخلووقـە لەسەر خواست. هەروەها سـیفەتەکانیتـریش وەک دەڵـێن خاسـەی سـەمع وەرگـرتنی دەنگـە، خاسّەی بەسەر وەرگرتنی رووناکی و رەنگە. دیارە ئەم خاسانە خودی زاتی واجب نـین، هـەروەها غەیریش نین بۆ زاتی واجب لە وجوودا؛ چونکە ئـەم خەواسـە ئومـووری ئیعتیبـارین و ئیـزافین و سەربەخۆ دیار نین هەتا بڵێین غەیری زاتن، بۆیە ئەشعەرییەکان فەرموویانە سیفەتەکانی خودا نـە عەینی زات و نە غەیری زاتن، واتە: ئەو غەیرە نین کە مومکینی خاس بن و پێویسـت بـە فاعیـل بن؛ چونکە ئەو جۆرە غەیرییەتە ئەبێ لەگەڵ بوون و دیارییەتیی خارجی بێت، ئەم خاسانەیش لـە ئیعتیبارییاتن و وجوودی عەینییان نییە هەتا بڵێین: ئەگەر ئەمانە واجبالوجـود بـن تەعـەددودی واجب روو دەدات، ئەمەیش کوفر و شیرکە.

دیارە ئەگەر مومکینی خاس بـن دەبـێ پێویسـت بـە فاعیـل بـن، جـا ئەگـەر فاعیلەکـە زاتی واجبالوجود بێ و بە ناچاری دروسـتی کـردبن، ئـەوا لازم دێ کـە خـودا ناچـار و بـێئیختیـار و بێدەستەلات بێ (تعالی عن ذلک علواً کبیراً) خۆ ئەگەر بە ئیختیار دروستی کردبن ئەوە لازم دێ کە ئەم سیفەتانە حادیس بن، چونکە بەرهەمی فاعیلی موختار پێویستە قەسـدی پـێش کـەوتبێ، هەرچیش قەسدی لێ پێش بکەوێ حادیسە. وە ئەگەر فاعیلی ئەم سیفەتانە غـەیری زاتی واجـب بێت، ئەوا ئەبێ خودای گەورە لە بوونی سیفەتەکانیدا موحتاجی غەیری خۆی بێت، خودایش لەوە گەورەترە کە موحتاجی غەیری خۆی بێت.

ئەگەر یەکێ بڵێ هۆی چییە کە زاناکان لە سیفەتەکانی واجـب خاسـەکانیان گرتـووە؟ ئەڵـێم هۆیەکەی ئەوەیە کـە بـە زاهـیری کیتـاب و سـوننەت خـودای گـەورە حـەوت سـیفەتی هەیـە، سیفەتیش ئەوەیە کە زاتی خودای گەورە پێی مەوسووف بێ، ئیتتیسافیش نابێ بە سـیفاتێ نـەبێ کە دەلالەت لەسەر مەعنای مەسدەری بکەن؛ چونکە هەر مەسدەرە قابیلە بۆ ئیشتیقاقی سـیفاتی مەحموولە. بۆ نموونە: لە (حیاة، علم، ارادة، قدرة، سمع، بصر، کلام) کـە مەسـدەرن (حـیّ، عـالم، مرید، قادر، سمیع، بصیر، متکلم) دروست ئەکرێن نەک لە (حیاة، علم، ارادة) یەک کە ئیسم بن بۆ مەبادیی ئەو مەسدەرانە؛ تەماشابکە (حجر) بە واتای بەرد نابێ بە سیفەت، بەلام کە مەعنای رەقی

و سەختی تیا ئیعتیبار کرا دەبێتە سیفەت و فیعلیشی لێ دروست ئەکرێ و ئەڵێیت (تحجّر الطین؛ ای تصلّب، و کیف لا تقصد تلک الخواص و کیف لا یکون الاتصاف مقصوراً علی حصول تلک الخواص، و لا شیء من عالم مرید قدیر بلا شعور و قصد و تأثیر؟).

دیارە نەفسی ئەو مەبادییانە بە بێئیعتیباری خەواس نابنە (مشتق منه)، چونکە ئەوانە ئیسمی جامیدن و ئیسمی جامید بۆ کردنە وەسف دەس نادات، لەم لایشەوە کە تەماشای ئەو مەبادییە ئەکەین هەرگیز لە زاتی واجب جیا نابنەوە، چونکە زاتی (واجبالوجود) پێویستە لەگەڵ کەمالی موتڵەق‌دا بێ و، هەرگیز کەس ناتوانێ زاتی واجبالوجود بە بێ‌کەمالات بە تەسەورێکی راست وەربگرێت وەکوو لە واقیع و ئەعیاندا بە بێ‌ئەوانە نابێ؛ لەبەرئەمە ئەو مەبادییانەیان بە عەینی زات داناوە. وە ئەگەر ئەو مەبادییانە کە سەرچاوەی خەواسەکانن بە عەینی زاتیان دانەنێن و بە غەیریان حسێب کەن ئەبێ ئەو خەواسە بە واسیتەی غەیری خودا ببنە سیفەتی خودا، ئەمەیش شتێکی ناشیرین و نالەبارە، تەنانەت ئەگەر غەیرەکەیش پێوەندی بە خوداوە هەبێ، دیارە لەم باسەی ئێمەدا کە مەبادییەکان بە غەیر دابنێین و خەواسەکان بە هۆی ئەوانەوە ببن بە سیفەت بۆ زات، ئەوە روو دەدات کە زاتی خودای گەورە لە ئیتتیساف بە سیفەتەکانی خۆی‌دا موحتاجی غەیری زاتی خۆی ببێ.

ئەو کەس کە دەڵێ سیفات عەینییە
قەسدی بە سیفات (پێ) مەبادییە[٣٨]
لاکین کام مەعنای لێ دەکەی تەما[٣٩]
(قل هذا المعنی و هو انّ ما
مَعْ تلکالصفات یَصدُر عن الذات
یصدُرُ عنهُ بدون الصفات
یَعنی: لا یحتاج الی الصفاتِ
و تلک الخواصّ لنفس الذات)
ئەگەر عەینییەت بەم مەعنا نەوێ
بلێ، بزانم بە چە رەنگ دەوێ
لە لای خۆی کەسێ تەسەوور بکات
کە موتتەحید وێ سیفەت دەگەڵ زات؟!

ئــەر چــاوی عەقڵــت بیــنش ئــالوودە،
دەویــنی ســیفەت وەک زات مــەوجوودە،
ئــەو بــە غــەیرەوە قیــامی هەیــە،
زات خــۆ قیــامی بــە نەفســی خۆیــە
(و مــــا یکــــونُ الــــی غیــــرِهِ
محتاجــــاً فــــی أن یقــــومَ بــــه
کیــــف یکــــونُ عینــــاً لِمــــا لا
یحتــــاجُ الــــی غیــــرِهِ أصــــلا؟!
لــــذا نفاهــــا رأســــاً ذو اعتــــزال
واثْبَــتَ الخــواصُّ ریمــت(٤٠) بــالأحوال
فیمــــا لســــان البیــــان قَــــرَّر
دَقِّــــقِ النظــــر الــــی ان یظهــــر
إنَّ المــــآلَ واحِــــدٌ فــــی الکــــلّ
والله أعلــــمُ بالــــدّقِ والجُــــلّ)

واتە: ئەو کەسەیش کـە دەڵـێت سـیفات عـەینی زاتـە مەبەسـتی لـە سـیفەتەکان خـەواس و مەسادیری ئیعتیباری نییە، بەڵکو مەبەستی مەبادییەکانـە. بـەڵام ئەگـەر پرسـیاریان لـێ کـردی مەبەستی بە عەین کام مەعنایە، تۆ بڵێ مەبەستی ئەوەیە ئـەو ئاسـارانەی کـە لەگـەڵ ئیعتیبـاری سیفەتەکاندا لە زاتی (واجبالوجود) ەوە پەیدا ئەبن بە بێسیفەتەکان لە زاتی (واجبالوجـود) ەوە پەیدا ئەبن؛ واتە: زات لـە هاتنـەدیی ئـەو هـەمووە ئاسـارەدا موحتـاج بـە سـیفات نییـە. ئەگـەر عەینییەت بەم مەعنا نەبێ بڵێ با بزانم بە چ ڕەنگێ قابیلە عاقڵ تەسەووری ئەوە بکات کە سیفەت لەگەڵ زاتدا یەک بێت؟ جا ئەگەر چاوی عەقل و تێفکرینت لەگەڵ چاوی بینینی دەرەوەدا تێکەڵ بووە و کاری لێ تێکچووە کە دەبینێ سیفەت لـە واقیـع و خاریجـدا هەیـە وەک زات و لەمـەوە دەکەویتە شوبهەی یەکیەتیی زات و سیفات، ئەوا پێویستە بزانی کە سیفەت بـە غـەیری خۆیـەوە ڕاوەستاوە و زات بە خۆیەوە ڕاوەستاوە، کەواتە چـۆن عـەقڵ قبـووڵ دەکـات شـتی بـە غـەیرەوە ڕاوەستاو لەگەڵ شتی بە خۆوە ڕاوەستاو یەک بن. بە وتەیەکی ڕوونتر چۆن شـتێ کـە موحتـاجی غەیر بێت عەینی شتێ دەبێت کە موحتاج بە غەیر نەبێت؟!

جا لەبەر وردیی ئەم باسە و پێویستیی بە لێکۆڵینەوە و لێوردبوونەوەی زۆر کۆمەڵی موعتەزیلە یەکسەر سیفاتیان نەفی کردووە و خەواسەکانیان ئیسبات کردووە وەک عالمییەت، موریدییەت، قادرییەت و لەباتی خەواس وشەی (احوال) بەکاردێنن و مەبەستیان خەواسە، لای ئەوان (احوال) شتێکن لەبەینی مەوجوود و مەعدوومدان، واتە: نە مەوجوودن و نە مەعدووم.

(مەولەوی) ئەفەرموێ: پاش تەقریری ئەم باسە ورد ببەرەوە هەتا حالّی ببیت کە ئەنجامی ئەم نیزاع و جیدالە دەبێتە ئەوە کە نیزاعی پێ ناوێ؛ چونکە هەموویان یەک قسەن لەوەدا کە خەواسی سیفەتەکان (زیندوویەتی، زانستی هەموو شت، خواستی ئەوەی ببێتە جێ، کاری هێزی لە هەموو مومکینێکی مەقدووردا) هەن، ئیتر نەفسی سیفات و مەبادی خەواس بڕیار بدرێن یان نا، وە لە کاتی بڕیارداندا زیاد بن لەسەر زات و بە غەیر دابنرێن یان نا، تەئسیرێکی وەهای نییە بۆ یەکێ باوەڕی بە خەواسەکان هەبێ.

جا پاش ئەوە کە مەولەوی بە ڕەحمەت بێ ئەم تەقریرەی پێشان دا منیش بۆ بەجێهێنانی ئەمانەتی عیلمی عەرزتان ئەکەم: هەر چەند تەقریرەکەی ئەو دەفعی هەندێ ئیشکال ئەکات، بەلام هەندێ شوبهە هەر دەمێنێتەوە؛ چونکە ئەوکەسە کە باوەڕی بە خەواس هەیە یان دان بە مەبادییەکاندا دەنێ یا نا، ئەگەر بە مەبادی قایل نەبێ ئەوە لازم دێ کە سیفەتەکانی خودا لە قەبیلی مەسادیر و لە ئوموورى ئیزافی و ئیعتیباری بن. وە ئەگەر لەگەڵ باوەڕ بە خەواس‌دا قایل بێ بە مەبادی، لەم کاتەدا مەعلوومە ئەو مەبادییە ئەوساف و حەقائیقی مەوجوودەن و قابیل نییە وەسف عەینی مەوسووف بێ. وە مادام ئەوساف عەینی مەوسووف نەبوون حەق وایە لێرەدا بڵێین سیفاتی خودای گەورە هەرچەند عەینی مەوسووف نین، بەلام لەبەر ئەوە کە لە زاتی خودای گەورە جیا نابنەوە ناویان نەبەین بە غەیری زات. وا ئەنجام گەڕایەوە سەر ئەوەی مەشهوورە لە ناوا، وە بۆ وەلامی شوبهەی موعتەزیلەکان ئەڵێین: سیفەتەکانی خودای گەورە (واجب)ی (لذاتها) نین هەتا زۆریی واجب رووبدات، بەڵکو (واجب)ی (لذات باری) ن و خۆیان لە خۆیانا لە مومکیناتن و پێویستیان بە فاعیل هەیە، ئەمجار یا ئەڵێین لازمی زاتن بە ئیجاب و ئیجاب لە سیفاتی کەمال‌دا کەمالە، یا خۆ مەنسووبن بۆ لای زاتی خودا بە ئیختیار و حدووسیشیان لازم نابێ، چونکە قابیلە لەسەر ئەو فکرەی کە (سیف الدین)ی ئامیدی دەری خستووە، هەر وەکوو تەقەددومی زات لەسەر قەسد و تەقەددومی قەسد لەسەر ئیجاد زاتییە، با تەقەددومیش بۆ ئیجاد لەسەر وجوود زاتی بێ، ئەنجام ئەوە دەبێ کە سیفات لە زاتەوە پەیدا دەبن بە ئیختیار لەگەڵ

قەدیمیشیاندا؛ (فالصفات ممکنات لازمة للذات قدیمة، و بما أنّها لیست تُعَدُّ أغیاراً له تعالی لا یلـزم تعدد القدماء المغایرة لذات الباری جلّ جلاله).

جـا کـە ئـەم بەیانـەتان بیسـت بـە دڵ لابکەنـەوە لـە فـەرموودەی زانـای گـەورە و زیـرەک (عبدالحکیم) [٤١] کە لە پەراوێزی شەرحی مەواقیفدا فەرموویـەتی: «لا یخفـی ان التسـتر ینـافی جعلها من الاعتقادیات. والذی عندی انَ ما وقع من الشیخ الأشعری هـو أن صـفاته تعـالی لیسـت غیر الذات لان الغیرین موجودان یجوز الانفکاک بینهمـا، والبـاقی مـن الحاقـات المشـائخ توجیهـاً لکلامه. و مقصوده ان صفاته تعالی لیست متأخرة عن وجوده لکونهـا مقتضـی ذاتـه کوجـوده. فـلا یکون ذاته تعالی فاعلة لها لأن الفاعل یجب تقدمـه بـالوجود علـی الـذات فـلا یکـون ذاتـه تعـالی بالقیاس الیها موجباً و لا مختاراً فلایلزم شیء من المحذورات. کما ان ذاته تعالی لیس موجبـا و لا مختاراً بالنسبة الی وجوده عند القائلین بزیادته. و کما ان الاربعة لیست بفاعلة لزوجیتها لا ایجاباً و لا اختیاراً بل الزوجیة مجعولة بجعلها... انتهی».

پوختەی ئەم فەرمووده ئەوەیە کە سـیفەتەکانی زاتی خـودای گـەورە وان لـە پایـەی (وجـود) ەکەیدا و، بە بێسیفەتەکانی کەمال زاتی خودا تەسەوور ناکرێ تەسەوورێکی وەها کە لەگەڵ زاتی واجبدا بگونجێ، کەوابوو سەبارەت بەم سیفەتانە ئیجاب و ئیختیار بۆ زاتی خـودا نابێـت، هـەروەها ماوەی عەینییەت و غەیرییەتیش نامێنێ. ئیتر بەم تەقریرە هەر قسەیەک لەم شوێنەدا کـراوە بـە زیاد دەردەچێت. من ئەم باسەم لە کتێبی (الوسیلة فی شرح الفضیلة) لە مەسـەلەی (کـل اثنـین غیران)دا بە درێژی نووسیوە و ئەمە باوەڕی خۆمە. هەروەها لە پەراوێزی ریسالەی حەمیدییەشدا نووسیومە، سەیرکردنیان بێسوود نابێت ان‌شاءالله.

***

١ـ ئەم سەرباسە لە دەستنووسەکەدا نییە، تەنها لە چاپەکەدا هەیە.

٢ـ ئەم سەرناوە تەنها لـە چاپەکەدایـە، لـە دەستنووسـەکەدا تـەنها هێڵـێک کێشـراوە ئـەمسـەر و ئەوسـەری نەخشێنراوە، وەک نیشانەی ئەوە بێ کە باسەکە باسێکی تازەیە.

٣ـ لە پەراوێزی هەردوو نوسخەکەدا، چاپ و دەستنووس، دوو دێڕ بە فارسی نووسراوە ئەمە تەرجەمەیەتی: «وشەی (لا اله الا الله) پیتی بە لێو گۆکراو و نوختەداری تیا نییە، لەمەیشدا چەند راز و نهێنییەک هەیـە تـەنها (ابرار) دەیزانن».

لە داوێنی دوو دێڕەکەدا (منه) نووسراوە، واتە هیی دانەر خۆیەتی کە مەولەوییە.

٤ـ ئایەتی (٢٠) سوورەتی (احزاب).

٥ـ ئایەتی (٤١) سوورەتی (یوسف).

٦ـ لە چاپەکەدا (پیَبنە) یە، لە شێوە قسەی سنەیی دەچێت.

٧ـ لە پەراوێزی نوسخەی دەستنووسەکەدا چەند دێڕێ بە فارسی نووسراوە و بە نیمچە رستەی (منـە) دوایـی هێنراون، واتە: هی دانەر خۆیەتی.

ئەمەیش دەقە فارسییەکەیە:

«یکی بمعنی درَو کردن و یکی بمعنی دروغ گفتن، ثانی را از اول و اول را از ثانی، یا ثانی را از ثـانی و اول را از اول بگیرد؛ تفاوت ندارد» [منه].

مەولەوی کە واتای رستەکەی لـەم دەقـەدا لێکداوەتـەوە (درەوکـردن)ی کردووەتـە یەکـەم و (درۆکـردن)ی کردووەتە دووەم، دیارە لە بەیتەکەیشدا دوو (بیدرو) هەیە؛ یەکەم و دووەم.

جا ئەفەرموێت: تۆ ئەی خوێنەر یەکەمی بەیتەکە بە (بیَدرۆ) و دووەم بە (بیـدرو) یـا یەکەمەکـە بـە (بیـدرو) و دووەمەکە بە (بیَدرۆ) لێک دەدەیتەوە ئارەزووی خۆتە.

ئەم جۆرە وردەکارییانە ئەوسا لە ناو فەقێ و مەلادا باوبوون.

سەرنج:

دەقی پەراوێزەکە ئەوە دەگەیەنێت کە (بیدرو) ەکان یەکێکیان بە مەعنا درەوکردنە و یـەکێکیان (درۆ کـردن). بەڵێ درەوکردنەکە تەواوە، بەڵام (درۆکردن) نا؛ چونکە (بیَدرۆ) درۆ نەکردنە، مەگەر بڵـێین دەقەکـە تـەنها باسـی (درو) دەکات بە بێ (بێ) کە (درۆ) و (درەو) یش هەڵدەگرێت. یا بڵێین (دروغ نگفتن) بووە و بـە هەڵـە کـراوە بـە «دروغ گفتن».

٨ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لەسەر رستەی «فعّول علیة» نووسراوە: «ای فاعتمد علی ان هذا المعنی حق، أو علی الله، لان الکل مما سواه محتاج الیه، و هو المحتاج الیه للغیر» [منه]. واتە: زەمیری (هـی)ی (علیـه) یـا بـۆ مەعنای (الله الصمد) یا بۆ (الله) دەگەڕێتەوە.

٩ـ ئایەتی (٣٩) سوورەتی (طاها).

١٠ـ ئایەتی (١٠) سوورەتی (فەتح).

١١ـ ئایەتی (١٠) سوورەتی (هود).

١٢ـ ئایەتی (١) سوورەتی (زمر).

١٣ـ ئایەتی (٢٣) سوورەتی (ال عمران).

١٤ـ ئایەتی (٧) سوورەتی (بقره).

١٥ـ ئایەتی (٢٢) سوورەتی (انبیاء).

١٦ـ ئایەتی (٣٠) سوورەتی (مؤمنون).

١٧ـ ئایەتی (١٤) سوورەتی (اسراء).

١٨ـ ئایەتی (١٦) سوورەتی (اعراف).

١٩ـ ئایەتی (٢٨) سوورەتی (ال عمران).

٢٠ـ (سیف الدین)ی ئامیدی (ابو الحسن علی) کوڕی (ابو علی) کوڕی مەحەممەد کوڕی سالم٥٥١ ـ ٦٣١ی کۆچی، خاوەنی کتێبی (احکام الاحکام).

٢١ـ لە نوسخە چاپەکەدا «له کل» = (لەگەڵ)ە.

٢٢ـ لە نوسخە چاپەکەدا «قائم» = قائیمە، مەبەست لە (قایم)ی دەستنووسەکەیش هەر (قائیم)ە.

٢٣ـ لە دەستنووسەکەدا (دیواته او عدم) = (دەیواته ئەو عەدەم) ە، کە شیعرەکەی پێ لەنگ دەبێت، یا ئەبێ بڵێین (أ) ناخوێنرێتەوە و، یا ئەبێ بڵێین لەوانەیە (دیوات او عدم) بووبێ کە ئەمڕۆ بە (دەیوات ئەو عەدەم) دەنووسرێت. بەڵام لە چاپەکەدا (دەیواتەو عەدەم)ە.

٢٤ـ ئەمە بەرپەرچدانەوەی قسەی فەلاسیفەیە کە وتوویانە: ماددە و موددە قەدیمن هەروا ئیستیعدادیش، وە پێویستە ماددە بە گوێرەی نەتیجە ئیستیعدادی هەبێ تا مەقسوود بێتەجێ.

٢٥ـ ئەم (چه) انه ئێستە بە (چ) ئەنووسرێن.

٢٦ـ سنن ابن ماجه / الجزء الثانی ص ١٢٦٩ / تحقیق محمد فؤاد عبدالباقی / دار احیاء الکتب العربیة / عیسی البابی الحلبی و شرکاؤه / ١٣٧٣ هـ ـ ١٩٥٤ م.

٢٧ـ بە پێی پەراوێزی دەستنووسەکە (با تەعەللوقیان) واتە ئەو سیفەتانە خاوەن پێوەندین وەک عیلم و ئیرادە.

٢٨ـ ایما = ئیما: شێوەنووسی دەستنووسەکەیە، چاپەکە (أما)ی نووسیوە. هی دەستنووسەکە راستە. واتە: ئایەتی (ما تری فی خلق الرحمن من تفاوت) یش هەر وەک ئایەتی (ما أصابک من حسنة فمنَ الله، و ما أصابک من سیئة فمنَ نفسک) ئیشارەت ئەکا و مەعنا ئەگەیەنێ. ئەو هێنمایە کە «و ما أصابک... الآیة» دەیگەیەنێت ئەوەتە (اسابه) کەی بەستووە بە ئادەمزادەوە. واتە: ئەوەی دێتە رێت لەو لایەنەوە کە پێوەندی بە تۆوە هەیە هەندێکی چاکە و هەندێکی زیانە، بەڵام هەر کارێ خودا بیکا لەو لایەنەوە کە ئەو کردوویە هەمووی چاکەیە و پڕحیکمەتە، خۆشی بێ (فضل)ە و سزا بێ (عدل)ە.

٢٩ـ (ابوالحسن)ی ئەشعەری، عەلیی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیسحاق، زانای شافیعیپەیرەو، پێشەوای ئەهلی سوننەت، وا مەشهوورە کە ساڵی (٣٢٤)ی کۆچی وەفاتی کردووە.

٣٠ـ ئایەتی (٧٩) سوورەتی (نساء).

٣١ـ ئایەتی (٣) سوورەتی (ملک).

٣٢ـ (دەدەین): لە چاپەکەدا نووسراوە «دەکەین».

٣٣ـ «جَواو» = جەواو: شێوەنووسی دەستنووسەکەیە، بەڵام زاراوی تاوگۆزی زێدی حەزرەتی مەولەوی (جواو)ە بە بێ فەتحەی ئاشکرا. هەڵبەت هاوجۆری لەگەڵ (تەواو)ی دوا وشەی نیوەی یەکەمدا رەچاو کراوە.

٣٤ـ لە نوسخە چاپەکەدا (برویت)ە. لە دەستنووسەکەدا «بروت»ە. لەوانەیە (ی) کەی لە نووسینەوەدا بە هەڵە رۆیشتبێ، یا (بروات) بووبێت و (ا) کەی بە هەمان دەرد چووبێ؛ لەوانەیشە لە ناوچەکەی (مەولەوی)دا (بڕۆت) بووبێ، دووریش نییە (بڕۆت) کورتکراوەی (بڕوات) بێت.

٣٥ـ لە پەراوێزی (واحد)دا لە دەستنووسەکەدا نووسراوە: «فیە لطافة» واتە (واحد) بە مەعنا یەک، یا بـە مـەعنا خودا.

٣٦ـ لە پێش ئەم شیعرەدا لە نوسخە دەستنووسەکەدا هیچ سەرباسێک نییە. لە چاپەکـەدا نووسـراوە: «مبحـث الحیاة و العلم» کە بێ‌جێیە. باوکیشم «مبحث العینیة والغیریة بوجە آخر»ی نووسیوە. لە راستیدا شوێنەکە شوێنی سەرباس نییە، خۆ ئەگەر بڵێین با هەر سەرباسێک ببێ، با هی مەولەویش نەبێ، ئەوا «مبحث العینیة والغیریة بوجە آخر» گونجاوترە.

٣٧ـ «لَهَوا» تێکەڵە لە فیعلی (لَها) و (واو)ی زەمیری جەمع. بەڵام لەبەر چـاودێری‌کـردنی قافیـە ئـەبێ (لَهُـوا) بخوێنرێتەوە.

٣٨ـ ئەم (پی)یە ئەگەر مەعنای هەبێ تەنها بەهێزکردنی (بە) کەیە. لەوە دەچێ تەنها بۆ راستکردنەوەی کێش بێت.

٣٩ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا نووسراوە «محرّف طمع» واتە: (طما = طەما = تەما) ئەسڵەکەی (طمع) بووە عەینەکەی کراوە بە ئەلف، بەڵام لە راستیدا موحەرڕەفی (طماع)ە و ئەلفەکەی لابـراوە، (طمـاع) یـش لـە ئەسڵـدا (طمع) بووە.

٤٠ـ لە چاپەکەدا (دعیت) ە، وا بـزانم هەڵـەیە. لـە دەستنووسـەکەدا (ریمـت) نووسـراوە و، لـە پەراوێزیشـیدا نووسراوە: «قصدت واریدت». دیارە مەعناکەی زۆر گونجاوە. شایانی باسە: ئەگەرچی هەمزەی «أثبت» هی قەتعە و نابێ لاببرێ، لێرەدا لەبەر کێشی شیعرەکە لادەبرێت.

٤١ـ (عبدالحکیم)ی سیالەکووتی، ساڵی ١٦٠٧ی کۆچی مردووە.

## مبحث الحياة [1]

بێینەوە[2] سەر بەحس لای سیفاتی زات
هەفتن یا هەشتن، یەکێکیان حەیات
سیفاتی قەدیم زۆر شەرەفناکن
لە بەرو دوا پاکیان پاکن
بەلام بە زوان عولەمای سوفات[3]
حەیات پێی دەڵێن: (أمام السفات)
بۆچ؟ سیفەتێکە مووجیبی سیححەت
بۆ سیفەتی عیلم، ئیرادە و قودرەت
(والحاسل) یانیٚ: زیندەگی هەیە
هەر ئەوە زیندگ بە زاتی خۆیە
تان و پۆی ئەوهام فاسید مەتەنە،
نەک بە رۆح و نەفس مەزاج و تەنە
لەو نەوعە وەهمە پاکە و موقەددەس،
بە ئەو زیندگە زیندگ هەرچی هەس

هەفتن: حەوتن. بەرودوا: پاش و پێش. پاکیان: هەموویان. تەن: لەش. زیندگە: زیندووە. زیندگ: زیندوو. هەس: هەیە.

واتە: با وازبێنین لە باسی یەکیەتی و جیایی سیفەت لە زات و بێینەوە سەر باسی ژمارەی سیفەتەکانی خودای گەورە و تەعریفیان و وتاری زانایان دەربارەیان.

ئـەو سـیفەتانە حـەوتن، ئەگـەر بـەقا و تـەکوین حسـێب نەکـەین. خـۆ ئەگـەر لەسـەر رای (ابوالحسن)ی ئەشعەری (بقا)، یان لەسەر رای (ابو منسور)ی ماتوریدی (تکوین) حسـێب بکـەین، ئەوە دەبنە هەشت.

سیفەتە قەدیمەکانی خودای گەورە هەموو بەنرخ و بەئیعتیبارن، هەموویان لـە بـەرودوا پـاکن، واتە: ناوترێ ئەوەیان لە پێشدا و ئەوەیان لە پاشدا بووە، چونکە هەموو ئەزەلی و ئەبەدین و لازمـی زاتی (واجبالوجود) ن و لێی جیانابنەوە، بەڵام بە زمان و زاراوەی زانایانی هەڵبژاردە و پاک و بێ-گەرد بە حەیات ئەڵێن (امام السفات) واتـە: پێشـەوا و سەرقافڵـەی هـەموو سـیفەتەکان، چونکـە حەیات، واتە: زیندوویی، سیفەتێکە دەبێتە هۆی راستی و دروستیی عـیلم و ئـیرادە و قـودرەت و سەمع و بەسەر و کەلام، واتە: ئەم سیفەتانە تەنها لـە زاتێکـدا دێنـە ٘جـێ کـە زینـدوو بـێ، بـێ-زیندوێتی هیچکام لەم سیفەتانە نابن.

پوختەی واتای زیندوویی خودای گەورە ئەوەتە کە خودا خۆبەخۆ زیندووە، زیندوێتی ئەو وەکو هەموو سیفەتەکانی تری لە غەیرەوە نییە، ئیتر بەرگێکی بێکەڵک بە تان و پـۆی خەیاڵـی خـاو و ئەوهامی بێئەنجام مەتەنە بـۆ دڵـی خـۆت و مەڵـێ زینـدوویی خـودا وەک زینـدوویی ئـادەمزاد موحتاجی لەش و مەزاج و گیانی حەیوانییە (حاشا و کلاّ) زیندوویی خودا پاکە لەو جۆرە خەیاڵ و وەهمە، خودا بە خۆی زیندووە و زیندوویەتیی هەموو گیان لەبەرێ لەوەوەیە.

***

١ـ ئەو عینوانە هەر لە چاپەکەدا هەیە.

٢ـ لە چاپەکەدا (بێنەوە) یە، لە دەستنووسەکەدا ئاشکرا نییە، بەلام دیارە شوێنەکە وا پێویست ئـەکا (بێینـەوە) بێ.

٣ـ لە دەستنووسەکەدا (صًفات) نووسراوە واتە بۆر لەسەر صادەکەیە. دیار (صًفات = صفاة): کۆی (صفی) یە.

## مبحث العلم [1]

دووەمین سـیفەت عـیلم و شـعوورە
لە سەبقی جەهل و تەفەککور دوورە
پاکــە، دەزانــێ هەرکــەس عاقیلــە
لــە قـەلب و دەمـاغ قـووەی عاقیلـە
واجب، مومتەنیع، مـومکین، ئاشـکار
پەنهان و کوللی و جـوزئی بەیـەکبار
زەڕڕەیــێ بــوێ لــە هــەر زەمــاندا
لــە زەمینـــەدا و لــە ئاسمانـــدا [2]
هـەموو لـە لای ئـەو تـەواو زاهـیرە
لە عیلمـی ئـەودا هـەمووی حـازیرە
(لا تَكُــن حربــاً، لكــن كُــن ســلماً
بكــــلّ شــــيء أحَــــاطَ علمـــــاً)

واتە: سیفەتی دووەمین لە حەوت سیفەتە سبووتییە زاتییەکانی خودای گەورە، کە بە (سیفاتی مەعانی) ناویان دەرکردووە، سیفەتی عیلم و شعوورە، کە هۆیـە بـۆ دەرخسـتنی خـۆی و غـەیری خۆی لە واجب و مومکین و مومتەنیع، ئەوەی بووە و هەیە و ئەبێ و ئەوەیش کە نییە یـا مەحاڵـە ببێ، بە زانستێ کە شایستەی زاتی خۆیەتی و مناسبی زانراوەکەیە.

عیلم و زانینی خودای گەورە وەکـوو عـیلم و زانـینی غـەیری خـودا نییـە، کـە نـەزانینی لـێ پێشکەوتبێ، یا بە بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوە پەیدا بووبێ، بەڵکو لە ئەزەلـەوە هـەتا ئەبـەد هەیـە و لەگەڵ زاتی واجب دایە ئەوەی (واجبالوجود)ە کە زاتی خۆیەتی، ئەوەی مومکینی خاسە و بـوون و نەبوونی لە خۆیا وەک یەکن، ئەوەی (ممتنع الوجود) ە، وەک (جمـع النقیضـین) یـا (اجتمـاع

الضدین) لەلای ئەو هەرکام بـە گـوێرەی وجـووب و ئیمتینـاع و ئیمکـانی خـۆی لای زاتی خـودا زانراوە.

ئەوەی ئاشکرا و دیارییە کە ناوی (عالَم الشهادە) یە، ئەوەی کـە پـەنهان و نادیاریيـە کـە نـاوی (عالم الغیب) ە، ئەوەی (کلّی)یە وەک جینس و نەوع و فەسڵ و عەرەزی عـام و عـەرەزی خـاس، ئەوەی جوزئییە وەک ئەوانەی بەر ئەو کوللییانە دەکەون، ئـەوەی وا دەردەکـەوێ لـە سـەرەوەیە وەک ئاسمـان و ئەسـتێرەکان، ئـەوەی وا دەردەکـەوێ لـە خوارەوەیـە وەک زەوی و دەریـا و گیانلەبەرانیان، هەموو لای خودا زانراوە. کەواتە ئـەی شـاگردی مـەرد! مەکـەوەرە جـەنگ دژی حەقیقەت و راسـتی و ئینکـاری زانـینی خـودا مەکـە. زانـینی خـودای گـەورە هـەموو شـتێکی گرتووەتەوە و هیچ شتێ لە دائیرەی بەربلاو و بێپایانی زانینی ئافەریدگار دەرناچێت.

رێبازی (متکلمین) بۆ بوونی عیلمی خودا بە هەموو شتێک ئەوەیە کە عیلمی خودا پێوەندی بە سوورەتی هەموو زانراوەکانەوە هەیە لە واجب و مومکین و مومتەنیع، کـوللی و جـوزئی، لـە تاقـە سوورەتێکی وەهادا کە هەموو زانراوەکان و ئەوەی لە پاشانیش هەتاهەتایە رووئەدات دەگرێتـەوە. ئەم تاقە سـوورەتە سـوورەتی شـامیلەی عیلمییەیـە، کـە جیـاوازیی لەگـەڵ عیلمـی خـودادا بـە ئیعتیبارە؛ واتـە: لـەو ڕووەوە کـە سـیفەتی خـودای گەورەیـە نـاوی (علـم)ە و، لـەو ڕووەوە کـە مەکشووفە پێی ئەڵێن مەعلووم. ئەو سوورەتە عیلمییەیش نابێتە مەوجوودێکی عەینیی وەهـا کـە جیا بێ لە عیلمی خودا هەتا قەدیمی بۆ غەیری زات و سیفەتی خودا رووبدات.

پوختەی قسە: جیاوازیی نێـوان عـیلم و مـەعلووم بـە ئیعتیبـارە؛ (فمـن حیـث القیـام بالـذات الواجبالوجود علمٌ و من حیث نفسها معلوم) وەکو (جلال الدین)ی دەووانی باسی کردووە.

دیارە لە عیلمی خودای گـەورەدا کـات و شـوێن و ئەنـدازە و وەزع بـۆ هـەموو مـەوجوودێکی حادیس دیاری کراوە.

ئەو زانایانە کە وشەی ئیجمال و تەفسیلیان بەکارهێناوە، گۆیا وتوویانە مـەعلوومات لـە ئەزەلـدا سوورەتێکی ئیجمالییان هەیە و، یەکەیەکەی مەعلوومات لە (ما لایـزال)دا سـوورەتی تەفسـیلییان هەیە، مەبەستیان نزیککردنەوەی عیلمی خودایە لە عەقڵی ئێمەوە. ئەگەرنا عیلمی خـودا وەکـوو عیلمی ئێمە نییە، هەروا لە مەعلووماتی خودادا فەرق لە بەینی ئیجمالی و تەفسیلیدا نییە؛ چونکە مەبەس لە (علم) دەرکەوتنی تەواو و روونبوونەوەیە. ئەم روونبوونەوەیەیش لە ئەزەلەوە تا ئەبـەد

بۆ زاتی خودا هەیە، واتە: لە ئەزەلدا عیلمی چۆن بووە، تا ئەبەد بە هـەمان شـێوەیە و، هـەرگیزای هەرگیز ساتێ نابێ کە لەو ساتەدا لای خودا مەعلوومێ زیاد بکات یا مەعلوومێ کەم بکات.

لەمەوپێش ئاگاداربووی لەوەی کە زانایانی بەرزی ئەهلی کەلام فەرموودەی شێخ (ابوالحسن)ی ئەشعەرییان وا لێـک داوەتـەوە کـە سـیفەتەکانی زاتی خـودا، عـیلم و غـەیری عـیلم لـە پایـەی وجـوودیدان، هـەروەک سـەبارەت بـە وجـوودی خـاترخۆیی و ناچـاری نیسـبەت نادرێنـە لای، سەبارەت بە سیفەتەکانی و وابەستەی سیفەتەکانیشی نیسبەتی خاترخۆیی یا ناچاری لێ نادرێـت، هەروەک خودا لە ئەزەل و لە ئەبەددا بوونی هەیە سیفەتەکانیشی هـەن، عیلمەکـەی و سـوورەتە عیلمییەکەیشی هەیە، بەڵام عیلمەکەی و سوورەتە عیلمییەکەی جیاوازیی ئیعتیبارییان هەیە.

دیارە هەرشتێ لە (لایزال)دا پەیدا بێ، خودای گەورە ئاگای لە پەیدابوونەکەی هەیـە و عیلمـی خودای پێوە دەبەسترێت. ئەم تەعەللوقانە (اضافات) ن و نابنە هۆی گۆڕان لە عیلمی خودادا. ئـەم مەسئەلەیە پێویستە بە وردی وەربگرن تا ئەگەر خودا مەیلی لێ بێ بەرچاوروون بن.

گـــوێ رادێـــر لـــەوە مـــن وتم زەریـــف  
لابـــە ئەســـویلە[٣] و ئەجویبـــەی نـــەحیف  
وەکـــوو ئەمـــە: عـــیلم حەقیقییەیـــە  
یـــــا ئیزافییـــــــە و نیســـــــەبییەیە  
وەک ئەمە، تۆ بـێ گـوێ بـدێر لـە مـن،  
ســـوورەی عیلمـــی لازیمـــەی عـــیلمن  
ســـا ئـــەمجار ئەگـــەر ئـــەو ســـوورەتانە  
قـــائیمن بـــە زات یـــەکتای یەگانـــە  
لازم تـــێ، ئەگـــەر بـــۆ حـــەقی عـــازم،  
ئـــەم مـــەحزووره وا کـــە دەبـــێ لازم،  
بینـــا لـــە تەقـــدیر زیـــادەی مـــەبادی  
(و قیامهـــــا بـــــذات الهـــــادی)،  
کە شـەیئی واحیـد فاعیـل بـێ و قابیـل  
(لشـــــیء واحـــــد أیّهـــــا القائـــــل)

بۆچ؟ تەمایوز هەس، لە شەک ئـەو دەرە،
(حسـبَ ذا الوجـود) بـۆ ئـەو سـوورەتە
ئـەرچی وجوودیـان (فی الخـارج) نـەویَ
بـۆچ؟ ئـەمیچ تـەمیز خـاریجی تـەویَ
وەگـەر بـە خۆیـان قیـام حاسڵـە
قەولـە بـە موثـول، ئـەویچ باتڵـە
وەر بـە ئـەمریَکن قـائیم سـیوای زات
(کالآلة) بـۆ عـیلم حـەق بـە مـەعلوومات
لە عیلمەدا[٤] حەق موحتاج بوو بـە غـەیر
(سـبحان اللهُ عَمَّـا فیـهِ ضـیر)

گوێ رادێر: گوێ بگرە. گوێ بدێر: گوێ بگرە. یەکتا: یەک‌کەس. یەگانە: تاق و تەنیا. لە شک ئەودەرە: لە گومان بەدەرە، گومانی تێدا نییە. ئەرچی: ئەگـەرچی. نـەویَ: نـەبیَ. تـەویَ: دەویَ. وەگەر: وە ئەگەر. ئەویچ: ئەویش. وەر: وە ئەگەر. عیلم حەق: عیلمی حەق= زانینی خودا.

واتە: گوێ رابگرە لەوەی کە بۆم باس کردی کە عیلمی خودا بە هۆی تاقە سوورەتە عیلمییەکە هەموو شتێکی گرتووەتەوە و ئەو سوورەتە عیلمییە بە مەعنای (مبـدأ الانکشـاف) عـەینی عیلمـی خودای گەورەیە و جیایی لێی بەئیعتیبارە: (فمن حیث القیـام بالـذات علـم. و مـن حیـث کونهـا حاکیة عن المعلومات معلومة). ئیتر گوێ مەدە بەو پرسـیار و وەڵامـە لاوازانـە کـە لـەم شـوێنەدا مەشهوورن.

پوختەی پرسیارەکان ئەوەیە کە عیلمی خودای گەورە یا ئیزافە و نیسبەتە بۆ لای مـەعلوومات، یا حەقیقەتێکی سابت و (مبدأ الانکشاف)ە و زیادە لەسەر زات وەکوو تەقریرتان کـرد. جـا ئەگـەر عیلم ئیزافەیە ئەوا لەگەڵ ئەوەدا کە لازم دێ عیلمی خودا لە ئوموورى ئیعتیبارییە بـێ ئـەوە لازم دێ یا مەعلوومات کە (مضاف الیها) ن قەدیم بن یا ئیزافە بە بـێ (مضـاف الیـە) بێـت، ئەمانـەیش هەردوو بەتاڵ و پووچن.

خۆ ئەگەر عیلم سیفەتێکی حەقیقی و سـابتە، لـەم کاتـەدا سـوورەتی عیلمییـەی مـەعلوومات ئەگەر قائیمن بە زاتی خوداوە ئـەوە لازم دێ کـە خـودای گـەورە فاعیـل بـێ بـۆ ئـەو سـوورەتە عیلمییانە و قابیلیش بێ بۆیان، چونکە ئەو سـوورەتە عیلمییەیـە مـەوجوودە، خـودایش فاعیـل و

خالیق و مووجیدی هەموو مەوجوودێکە، هەروەها ئەو سوورەتە عیلمییانە ئەبنە سیفەت و سیفات مەقبوولن و مەوسووفەکەیان قابیلە بۆیان، دیارە تاقە شتێکیش نابێتە فاعیل و قابیل بۆ یەک شت.

وە ئەگەر سوورەتە عیلمییەکان قائیمن بە نەفسی خۆیانەوە ئەوا دەبێتە دان‌نان بە موثولی[کۆی میثال] ئەفلاتوونیدا، گۆیا ئەفلاتوون باوەڕی وایە کە هەموو نەوعێک لە بووەکان: ئادەمزاد، حەیوانات، گژ و گیا، کانەکان، ئەستێرە و نەوعەکانی تر فەردێکی هەیە [کە] رووتە لە عەواریز و ئەزەلی و ئەبەدییە و، هەرکام لەو فەردانە مەرجیع و بەڕێوەبەری کۆمەڵی خۆیەتی. عیلمی خودا بە هەریەک لەو فەردانە لەباتیی هەموو جوزئییاتی نەوعەکەی کافییە، واتە: عیلمی خودا بەو فەردە لە هەر نەوعێک عیلمە بە هەموو جوزئییاتی نەوعەکە.

ئەم بیر و باوەڕەیش بە بەڵگەی بڕندە و بەهێز بەتاڵ کراوەتەوە، چونکە ئەو تاقە شتە، کە بە رای ئەفلاتوون (ربّ النوع)ە و لە عالەمی موجەڕڕەداتی حسێب ئەکات، نابێ کوللی بێ، چونکە شتی کوللی لە خاریجدا نابێ، کەواتە ئەبێ جوزئی بێ. بە بەڵگەیش دەرکەوتووە کە هیچ فەردێ نابێتە ئاوێنە و وێنەگری حاڵ و سیفەتی فەردێکی تر، واتە عیلم بەو فەردە جوزئییە مەحاڵە ببێتە عیلم بە ئەحواڵی ئەفرادەکانی تر.

خۆ ئەگەر ئەو سوورەتە عیلمییانە قائیمن بە شتێکی خاریج لە خۆیان و غەیری زاتی خودا و، قیامیان بەو ئەمرە خاریجەوە دەبێتە هۆی عیلمی خودا بە مەعلوومات، لەم حاڵەدا لازم دێ خودای گەورە، بۆ ئەوەی کە عالم بێ بە مەعلوومات، موحتاجی غەیری خۆی بێ، ئیحتیاجیی خودایش بۆ غەیری خۆی شتێکی ناڕەوا و پووچ و بەتاڵە و؛ خودا نابێ موحتاج بێت.

جا (مەولەوی) دەفەرموێت: ئەوەی من تەقریرم کرد کە سوورەتی عیلمییە شتی عەینیی خاریج لە زات و سیفەتی باری نییە، بەڵکو سوورەتی عیلمییە هەر عیلمی خودایە، واتە: ئەو سوورەتی مەعلووماتە هەموو بە عیلمی خودا مەکشووفن و خۆیان وجوودی خاریجییان نییە، کەوابێ ئێمە ناڵێین عیلم ئیزافەیە لە بەینی عالم و مەعلوومدا، وە ناڵێین سیفەتی (ذات الاضافە) یە، وە ناڵێین مەوجووداتی عەینیی قائیم بە زاتی بارین، وە ناڵێین سوورەتی قائیمی (بالذات) ن وەکو بیرەکەی ئەفلاتوون، هەروەها ناڵێین ئەو سوورەتانە قائیمن بە غەیری خودای گەورەوە، بەڵکو ئەڵێین عیلمی خودای گەورە ئەو تاقە سوورەتەیە کە هەموو سوورەتی مەعلووماتی تێدایە. ئەو سوورەتە لای خودای گەورە حازرە، وەک ئینسانێک وێنەی شتێک وەرئەگرێ، ئەو سوورەتە

(من حیث الذات) مەعلوومە و (و من حیث اتصاف الذات بکشفها) عیلمە. ئیتر ئـەو ئیحتیمالانـەی باس‌کران هەموو بە غەیرە مەنزوور دەرئەچن و، ئەو رەخنانە هەرگیز روو ناکەنە ئێمە.

جـــواو دریاگـــە کـــە قیـــامی شـــەی
بە شەیئێ تر وێ یـا بـە نەفسـی خـۆی
فــەرعی وجـــوودی (فـــی الخـــارجِ) یـــە
ســـووەر خـــۆ وجـــوود خـــاریجی نییـــە
ئـــەر بڵـــێ لەمـــە ئـــەوا لازم بـــۆ
ئیتتیسافی حەق بە عیلم لە دەس چـوو
(اســـــتغفر الله) ئـــــەوا هـــــا رووی دا
نەفیی عیلمی حـەق بـە هـەموو ئەشـیا
دەڵـــێین قیامـــێ کـــەوا مەنفییـــە
ئـــەو قیامەســـە کـــە خارجییـــە
نـــەک ئـــەو قیـــامی ئیتتیســـافییە
کـــەوا ئەعەممـــە و لـــەودا کافییـــە
(ثبـــوت الوصـــفِ فـــی الجملـــة ولـــو
ذهنـــاً و علمـــاً) زەریفـــی بشـــنەو
قیامـــێ نییـــە بڵـــێی زەحمەتـــە
بـــۆچ؟ مـــەعنای قیـــام لـــەگرە ئەمەتـــە
یـــانی حاسڵـــن لـــە ئیـــدراکی‌دا
نـەک حاسـل لـە نـەفس زاتی پـاکی‌دا

جواو= جواب: وەلام. دریاگە: دراوە. وێ: بێ.

واتە: وەلامی ئەو پرسیار و رەخنانە بـەوە دراوەتـەوە: ئێمـە کـە کۆمەڵـی ئـەهلی سـوننەت و جەماعـەتین لـە (مـتکلمین) ئـەوەمان پەسـەند کـردووە کـە عیلمـی زاتی خـودا، وەک بـاقی مەبادییەکان، زیادە لەسەر زات. ئەڵێین عیلم بـە ئیزافـە دانـانیین، بەڵـکو بـە (مبـدء الکشـف)ی دائەنێین، ئەڵێین سوورەتی عیلمی هەیە و، قیامی شتێ بە شتێکی ترەوە یا بـە نەفسـی خۆیـەوە

لەوە پەیدا ئەبێ کە ئەو شتە قائیمە وجوودێکی عەینی و خاریجیی ببێ. ئەو سوورەتە عیلمییە وجوودی خاریجی نییە تا ئەو مەحزووراتە پێشوانە روو بدەن.

ئەگەر بڵێت: مادام سوورەتی عیلمی وجوودی خاریجیی نەبێ و موحتاج نەبێ بە قیام بە مەحەللەوە ئەوا لازم هات کە زاتێ باری عیلمی نەبێ بە مەعلومات چونکە ئیتتیساف بە عیلم بە ئەشیا پێویستیە بە وجوودی (ما تعلّق به العلم)، جا مادام سوورەتی عیلمی وجوودی خاریجیی نەبێ ئەو عیلمە بە ئەشیا نایێتە جێ، لە وەلامدا ئەڵێین: خۆ ئێمە ئینکاری قیامی سوورەتی عیلمیمان بە زاتی خوداوە نەکردووە تا بێعیلمی لازم بێ بۆ زاتی خودای گەورە (تعالی عن ذلک علواً کبیرا)، بەڵکو ئینکاری قیامێکمان کردووە وەکوو قیامی سپییەتی بە کاغەزەوە بێ، کە ئەو جۆرە قیامە لای ئێمە نییە. ئێمە قیامی ئیتتیسافیمان لایە کە قیامێکە لەو قیامە پێشووە عامترە و بریتییە لە پێوەندی نێوان قائیم و (ما قام به) چ وەکوو قیامی سپییەتی بێ بە کاغەزەوە یا وەکوو قیامی وجووب و قیدەم بێ بە زاتی خوداوە. قیامی مووجیب بۆ ئیتتیساف (فی الجملة) قیامێ نییە کە زۆر گران و نامەعقوول بێ، بەڵکو قیامێکە مەعنای ئەوەیە کە سوورەتی مەعلوومە، حاسڵە لە عیلم و ئیدراکی خودادا، با بەو شێوە بێ کە وتمان، خودا لە ئەزەلدا و هەتا ئەبەد یەک سوورەتی لایە کە هەموو مەعلووماتەکان دەنوێنێ، ئەو سوورەتە لەگەڵ عیلمدا جیاوازیی ئیعتیبارییان هەیە. ئیتر لازمیش ناکا ئەو سوورەتە عیلمییە بە شێوەی شتێکی خارجیی وەهای دابنێیت کە قائیم بێ بە زاتی پاکی خودای گەورەوە.

عەلاوەی ئەمە ئەر گوێ بکەی لێی
ئەو مەعنا کە حەق موتتەسیف بێ پێی
مەعنایێکە وا مەشهوورە و موعلەن
کە تەعبیر دەدرێ لێی بە (دانستن)
(والاتصاف بالمعنی المُظهَر
و ان یستلزم لتلک الصوَر)
لاکین ئیتتیساف خودا بەو مانا [٥]
کافییە لە بوون ئەودا بە دانا
(بلا افتقار لأن یَتّصف
بتلک الصّوَر ایضا، فأنصِف)

گوێ بکەی لێی: گوێی لێ بگری. دانستن: زانین. دانا: زانا.

واتە: بێجگە لەو وەڵامە پێشووە وەلامێ تر هەیە وەکوو ئەوە کە ئەڵێم: ئەو (علم)ە کە وەسفی لێ پەیدا ببێ وەکو (عالم) مەعنای (علم)ە ئیسمییەکە نییە کە (مبدأ الانکشاف) ە، چونکە ئیسم ئیشتیقاق هەڵناگرێ، بەڵکو (علم)ە مەسدەرییەکەیە کە مەعنای زانینە و، ئیتتیسافی خودا بەم زانینە هەرچەند مووجیب بێ بۆ مولاحەزەی (مُتَعَلَّق) ـ بە فەتحەی لام ـ کە سوورەتە عیلمییەکەیە، مووجیب نییە بۆ ئیتتیسافی خودا بەو سوورەتە عیلمییانەوە، بەڵکو مووجیبە بۆ ئیتتیسافی بە زانینی ئەوانەوە، کەوابێ لەوانەیە ئەو سوورەتە عیلمییە بە وجوودێکی (ظلّی)ی ناخاریجی لە عیلمی خودادا هەبێ و ئیتتیسافی خودا بە هۆی زانینی ئەو سوورەتەوە بێتە جێ، ئیتر کەوابوو ئەو رەخنە پێشووانە هەموو کەوتن.

ئەر بڵێن سوورەت زیهنی بێ مەقال  
مەئخووزە لە ئەمر عەینی یا میسال  
پەس لازم دەبێ عالەم قەدیم بێ  
یا (فی الأزل) حەق عیلمی عەدیم بێ  
بەم کائیناتی (لایزالی)یە  
شەئنی ئیلاهی لەمە عالییە  
قیلَ فی الجواب: کان کافیا  
فی علم الحق بتلک الأشیا  
عیلمی حزووریی سافی پاکی خۆی  
بە زات و سیفات شەرەفناکی خۆی  
بۆچ؟ هەرچی دەوێ لەم مومکیناتە  
زیلال و عکووس زات و سیفاتە  
پەس ئەوا بۆ تۆ زەریف بوو بەیان  
زات و سیفاتی میسالی ئەشیان

پەس: کەواتە. لە ئەسڵدا. واتە: لە پاش.

واتە: ئەگەر بە شێوەی ڕەخنەگرتن بڵێیت: سووەرە تەعیلمییەکان یا لە خودی مەعلوومات وەرگیراون یا لە میسالەکانیان؛ ئەگەر یەکەمیان بێ دەبێ عالەم قەدیم بێت، ئەگەر دووەمیان بێت دەبێ (معاذالله) خودا حەقائیق نەزانێت؛ چونکە میسالی شت عەینی شتەکە نییە.

لە وەڵامدا ئەڵێین: بۆ عیلمی خودا بە مەعلوومات لە ئەزەلدا ئەوەندە بەسە کە خودای گەورە عیلمی بە زات و سیفەتەکانی خۆی هەیە بە عیلمی حزووری، چونکە مادام خودا عیلمی بە خۆی و بەو سیفەتەی بوو کە سەرچاوە و عیللەتە بۆ هەموو شتێکی غەیری خۆی، لەم زانینەی زاتی خۆیەوە زانینی هەموو مەعلوولاتەکەی دێتە جێ. کەوابوو نە نەزانین بۆ خودا رووی دا و نە قیدەم و ئەزەلییەت بۆ عالەم؛ چونکە زات و سیفات وەکوو ئاوێنەن و میسال و وێنەی شتەکان تیایانا ئاشکرا و نومایانە. لە راستیدا بوونی ئەسلی و راستەقینە و واجب هەر بۆ زاتی خودایە، ئیتر مەوجوودەکانی تر هیچیان وجوودەکەیان زاتی نییە و لە ئیرادە و قودرەتی (واجب‌الوجود) ەوە وەرگیراوە. هەروەها لە لایێکەوە کە تەماشای زاتی واجبت کرد بناغە و سەرچاوەی هەموو بووەکانە، وەکوو ئاوێنە هەموو کائیناتی لێوە دەرئەکەوێت، لە لایەکیشەوە کە تەماشای مومکیناتت کرد هەموو وەکوو وێنە و سێبەر وان نیسبەت بە زاتی (واجب‌الوجود).

بە راستی ئەم وەڵامە زۆر بەنرخە و لەم رووەوە هەرکەس بە وردی بیربکاتەوە تێدەگات کە لە عیلمی خودادا نە عەینی مەعلووم پێویستە و نە سوورەتی مەعلووم؛ چونکە بێ‌گومان خودای گەورە بە زات و سیفەتەکانی خۆی ئەزانێ.

دیارە زانینی فراوان و پان و بەرین و هەموو شت گرەوە ئەوەیە خاوەن‌زانینەکە کونهــ و حەقیقەتی زانراوەکە و ئەو ئاسارانەی لێیەوە پەیدا دەبن هەموو بزانێ. کەوابێ زاتی (واجب‌الوجود)ی خاوەن کەمالاتی دوور لە خەوش و کەموکووڕی کە عیلمی بە خۆی بوو، عیلمی بە ئیرادە و قودرەت و سیفەتەکانی تری بوو، عیلمیشی بەوانە دەبێ کە لە دوارۆژا لە قودرەتی ئەو پەیدا دەبن. ئەم عیلمەیش نە پێویستی بە عەینی ئەو مەعلوومە دەبێ کە لەمەوپاش دروستی دەکات و نە بە سوورەتی ئەو عەینە. ئەوەی بۆ عیلم پێویست بێ دەرکەوتن و هەست‌پێ‌کردنە.

بۆ نموونە: یەکێ بە زیرەکی ئەزانێ سبەینی شتێ دەقەومێ، لە راستیشدا، وەک ئەو زانی، سبەی شتەکە رووی دا بە بێ‌ئەوەی لە کاتی عیلمەکەدا عەینی رووداوەکە یا سوورەتی بووبێ. خۆ زانینی خودای گەورەیش لەگەڵ زانینی کەس‌دا بەراورد ناکرێ.

پوختەی قسە: عیلمی زاتی خودای گەورە لە ئەزەلدا نە پێویستی بە عەینی مەعلووم هەیە و نە بە سوورەتی مەعلووم، چونکە زاتی (واجبالوجود)ی خاوەنی کەمالی موتلەق پێویستە زات و سیفەتی موحتاجی هیچ نەبێ و لە هەموو ڕەوویەکەوە تەواو و بێخەوش بێ. (الله لا الە آلّا هو الحیّ القیّوم).

ئەر بڵێی لە لای هەرکەس حاڵییە
ئەم کائیناتی ئیستیقبالییە
غەیرە مونتەهین خاریجن لە عەد
(لا تنتهی فی الوجود للحدّ)
پەس هەرگاهـ خالق جەمیعی ئەشیان
عالم بێ پێیان بەر لە وجوودیان
لەم تەحریری تۆ لازم تێتەوە
سوورەتی عیلمی نەبڕێتەوە
خۆ مەشهووریچە (برهان التطبیق)
بۆ لاتەناهی موبتیلە تەحقیق
ئەوا حەق عالم بە جەمیع نییە
ئەمە تەناقوز نەوێ بەس چییە؟
جواو دریاگە: عیلمی ئیلاهی
بە ئوموووراتی ناموتەناهی
بە تەفسیل نییە بەڵ بە ئیجمالە؛
تەناقوز لێرە وا بێمەجالە
بۆچی؟ مەعلوومە جەریانی دەلیل
لە فەرزی عیلمە بە وەجهی تەفسیل

حاڵی: تێگەیشتوو، فامدار. پەس: کەواتە. هەرگاهـ: هەرکات. دریاگە: دراوە.

واتە: ئەگەر تۆ بە شێوەی ڕەخنە بڵێیت: هەرکەس تێگەیشتوو بێ ئەزانێ ئەم جیهانە، ئاسمان و عەرزی، بەهەشت و دۆزەخی، خۆش و ناخۆشی، میوەی ئاوداری، ئازار و بێزاری... تاد لە بڕانەوە

نایەن و لە ژمارە بەدەرن و ئەندازە و سنوورێکی دیارییان نییە تیایا ببڕێنەوە، جا ئەمانە هەرچەند بورهانی تەتبیق لە زاتی خۆیاندا جاری نابێ چونکە وجوودیان پێکەوە نییە و تەسەلسول لە ئوموری نەبڕاوەی کۆدا مەحالە نەک لە ئوموری نەبڕاوەی بە مەعنا (لا یقف عند حدٍّ) دا، بەلام لە لایەن زانینی خوداوە بۆیان کۆن چونکە بڕیار وایە عیلمی خودا هەموو مەوجوودێ ئەگرێتەوە چ لە رابوردوو و چ لە ئێستا یا لە پاشەڕۆژدا. لەسەر ئەمە ئەگەر عیلمی خودای گەورە رووبکاتە هەموو ئەوانە (تناقض) پەیدا دەبێ، چونکە لەسەر ئەو بڕیارە کە عیلمی خودا هەموو شتێ دەگرێتەوە پێویستە ئەو شتانە لەگەڵ نەبڕانەوەیشیاندا زانراو بن، وە بە حوکمی بورهانی تەتبیقیش ئەبێ عیلم بە هەموویان نەبێ، ئەمەیش (تناقض)ە.

لە وەلامی ئەم رەخنەدا ئەڵێم: سوورەتی عیلمی دوو جۆرە، یەکەم تەفسیلی، دووەم ئیجمالی. ئەم سوورەتانە بە سوورەتی تەفسیل (لامتناهی) ن و نابڕێنەوە، بەلام بە سوورەتی ئیجمال (متناهی) ن و دەبڕێنەوە. عیلمی زاتی خودای گەورە پێوەندی بە سوورەتی عیلمی ئیجمالییەوە هەیە کە دەبڕێتەوە، ئەگەرچی بە شێوەی تەفسیل نابڕێتەوە، چونکە جاری بوونی دەلیلی بورهانی تەتبیق لەسەر بڕانەوەی سوورەتە عیلمییەکان، لەسەر فەرزی عیلمە بە مەعلوماتی لاموتەناهی بە تەفسیل نەک بە ئیجمال، لەبەر ئەوە کە سوورەتی عیلمی لە عیلمە ئیجمالییەکەدا مەجمووعەیەکی موتەناهییە و نابێ بە ئوموری لاموتەناهیی موفەسسەل.

(قیل: مردودٌ هذا الجوابُ
و ما یأتیکم هو الصوابُ
و هو إنّما یلزمُ ذلک
أي لاتناهي الصور هنالک
لو کانت تلک الأشیاء التي
لاتتناهي تخالَفَت
تخالفاً قد یستلزمُ ذاک
لتخالف الصور هناک
أمّا، بلاشکٍّ، لو تَمَاثلا
بعض من ذهي الأشیاء فلا[٦]

بەس بێ بەحسی ئـەم مونتەقەداتـە
نەوبەی بەحسی ڕەئس موعتەقەداتە

واتە: هەندێ وتوویانە ئەم وەڵامە هەڵەیە و، وەڵامێکی تر هەیە ئەو ڕاستە، ئەوەیش ئەوەیە کـە نەبڕانەوەی سوورەتە عیلمییە تەفسیلییەکان وەختـێ لازم دێـت کـە مەعلووماتـە نەبـڕاوەکان لـە سوورەتدا جیاواز بن و هەر مەعلوومێ سـوورەتێکی سـەربەخۆی هـەبێ و سـوورەتە عیلمییـەکان جیاواز بن، بەڵام ئەگەر هەندێ لـەو مەعلووماتـە لەیـەک بچـن و، هـەر چەنـد مـەعلوومێ یـەک سوورەتیان هەبێ، لازم نابێت کە سوورەتە عیلمییەکان (لامتناهی) بن، بەڵـکو (متنـاهی) و بـڕاوە دەبن.

شایانی باسە ئەم وەڵامەیش هەڵەیە، چونکە مـادام مـەعلوومات نەبـڕاوە بـن ئەگـەر بـە ملیـار ژمارەیشیان لە یەک بچن، بەوە مەعلوومات لە (لاتناهی) ناکەوێت.

حەق وایە لەم شوێنەدا بوترێ:

لەوانەیە (علم) بە شێوەیەکی (اجمالی) ڕووبکاتە زنجیرەی مەعلووماتی نەبـڕاوەی (مـن حیـث الاجتماع)، بەڵام ناگونجێ بە شێوەی تەفسیلی ڕووی تێ بکات، چونکـە مـەعنای (نەبـڕاوەی مـن حیث الاجتماع) موستەحیلە و نابێ، وەک چۆن دەگونجێ عـیلم پێوەنـدی ببەسـتێ بـە مـەعنای (ممتنع) و (جمع النقیضین) و (رفع النقیضین) ەوە، بەڵام ناگونجێ پێوەندی ببەستێ بە زاتی ئەم شتە مومتەنیعانەوە؛ چونکە زاتەکان موستەحیلن و نین.

فـەرموودەی (عبـدالحکیم)ی سـیالەکووتی، لـە حاشـیەی (خـەیالی)دا لـە دوادوایـی باسـی (والمحدث للعالم هو الله الواحد)دا پاڵپشتی ئەم قسەیە؛ کە فەرموویەتی: کە دەوترێ زانینی خـودا هەموو شت دەگرێتەوە مەبەست لە شت ئەوەیە کە پێوەندیی زانین پێیـەوە مـەحاڵ نـەبێ، وەک چۆن توانای فراوانی خودا شتێ دەگرێتەوە کە بوونی مومتەنیع نەبێ.

واتە: وەک چۆن قودرەت و توانـای خـودا ڕوو ناکاتـە (مسـتحیلات) و ئـەوەیش بـە ناتـەوانایی حسێب ناکرێ؛ چونکە ناتەوانایی ئەوەیە دەستەڵاتت بەسەر شتی مومکیندا نەشکێت نەک بەسـەر شتی نامومکیندا، هەروەها عیلمیش پێوەندی نابەستێ بە شتێکەوە کـە پێوەنـدیی عـیلم پێیـەوە مەحاڵ بێت، ئەمەیش بە (جهل) دانانرێت، چونکە جەهل نەزانینی شتێکە مـومکین بـێ بزانرێـت وەک (واجب) و (ممکن)ی خاس و مەعنای (ممتنعات) نەک نـەزانینی شـتێ کـە مومتـەنیع بـێ بزانرێت وەک زاتی مومتەنیعات و ئوموورى نەبڕاوەی کۆ.

پوختــەی قســە: زنجــیرەی مــەعلووماتی نەبــڕاوە بــە ئیجمــال مەعلوومــە و، بــە تەفســیل یەکەیەکەکانی مەعلوومن، بەلام مەجمووعی (من حیث المجموع) نییە تا عیلم رووی تێ بکـات و پێوەندی پێوە ببەستێ.

***

١ـ ئەم سەرباسەیش لە دەستنووسەکەدا نییە، تەنها لە نوسخە چاپەکەدا هەیە.

٢ـــ لــە دەستنووســەکەدا فەتحــە لەســەر نــوونی (زمینــدا) دانــراوە، واتــە (زەمینــەدا) دەخوێنرێتــەوە، وەک نووسیومەتەوە.

٣ـ دیارە مەبەست (اسئلة) یە، بەلام عیلمی سەرف نایگرێ.

٤ـ لە دەستنووسەکەدا (فتحە) لەسەر میمی (علم) دانراوە.

٥ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لەسەر ئەم وشەیە نووسراوە: (محرف معنی) واتە: مانا ئەسڵەکەی مەعنا بووە.

٦ـ کە شیعرەکە بکەیتە پەخشان بەم جۆرەی لێ دێت: (أمّا لو تماثل بعض من هذە الاشیاء فلا بلا شکّ).

## مبحث الارادة [1]

سـێیەم ئـیرادە یانێهـای خـواهیش
خواهیشی ئەبەد بـێ کـەم و کـاهیش
هەر فیعلێ لە هەر چشـتێ بـادی وێ
ئـەر تـەبیعی وێ، ئـەر ئـیرادی وێ
گشت مونبەعیسن لە ئـیرادەی حـەق
بـێ مەشـییەتی ئـەو نـاوێ موتلـەق
(مَـا شـاءاللە) ئەلـبەت هـەر دەوێ
(وَ مَـا لـم یَشَـاء) دەشـێ هـەر نـەوێ

خواهیش: خواست، ویستن، گەرەکبوون. کـاهیش: کزیـی، ناتـەواوی، کـەموکـووڕی. بـادی: زاهـیر، بـەدەرەوەبوو. وێ: بـێ. دەوێ: دەبـێ. نـەوێ: نـەبێ. مونبـەعیس، منبعـث: پەیـدابوو. مەشییەت: مەشیئەت، ویستن.

واتە: سێهەم سیفەت لە سیفاتی مـەعانیی خـودای گـەورە (ارادە)یـە کـە مـەعنای خواسـت و ویستە. ئەم سیفەتە لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد هەیە و کەموکـووڕیی بەسـەردا نایـەت و رووی کـردە هەر شتێ لە هەر کات و لە هەر شوێنێکدا و، هەر چلۆنێ بێ پێویستە ئـەو شـتە بـەو شـێوە بێتـە جێ. کەوابوو ئیرادە سیفەتێکە یەکێ لە دوو مەقدوور وەکوو راوەستان یا دانیشتن دیاری دەکـات بۆ هاتنە جێ. هەروەها هەر نیشانە و شتێکی پەیدا بوو چ سروشتی بێ وەکـوو نەشـونومای گیـا و گیانداران یا ئیرادی بێ وەکوو هاتوچۆی ئینسان هەمووی لە ئیرادە و خواسـتی خـوداوە پەیـدا ئەبێ و هەرگیز بە بێخواستی ئەو نابێ. ئەوەی خواستی خودای لەسەر بێ پێویستە ببێ و ئـەوەی

خواستی ئەوی لەسەر نەبێ هەرگیز نابێ، وەک لە فەرموودەی حەزرەتەوە دەردەکەوێ: «ما شاءالله کان و ما لم یشاء لم یکن».

شایانی باسە ئیرادە عیلم نییە چونکە ئینسان بە گەلێ شت ئەزانێ و، کەمێک لەوانە ئیرادە دەکات، هەروەها قودرەتیش نییە؛ چونکە قودرەت تەعەللوق دەبەستێ بە دوو شتی (ضدّ) ەوە بەڵام ئیرادە هەر بە لایەکیانەوە تەعەللوق دەبەستێ.

ئەبێ ئەوەیش بزانین کە ئیرادەی خودا قەدیمە، چونکە خودای گەورە نابێتە شوێنی سیفەتی پەیدابوو، بەڵام لە قیدەمی ئیرادەی خوداوە قیدەمی شتە ئیرادەکراوەکە روو نادات، چونکە ئیرادەکە وا روو دەکاتە موراد کە لە کاتێکی تایبەتیدا لە (ما لایزال)دا بیکات.

هەروەها هەرچی رووبدات، چاک و خراپ، هەمووی بە ئیرادەی خودایە، بەڵام لازم نییە کە بە رەزا و مەحەببەتی ئەو بێ، پێویستیش نییە هەر شتێ موراد بێ (مأمور بە) بێت، بەڵام (عام و خاس)ی (من وجە) ن، واتە: دەکەونە یەک و لە یەکیش جیا دەبنەوە. بۆ نموونە: ئیمان و باوەڕی (ابوبکر)ی (سدیق) - رەزای خوای لێ بێ- ئیرادە و ئەمر و رەزا و مەحەببەتی خودای لەسەر بووە، کوفری (ابوجهل) ئیرادەی خودای لەسەر بووە، بەڵام نە ئەمری پێ کردووە و نە خۆشی ویستووە و نە پێی رازی بووە، ئیمانهێنان و باوەڕکردنی (ابوجهل) بە ئیسلام ئەمرپێکراو و خۆشەویست بووە و خوا لێی رازی بووە، کەچی ئیرادەی نەکردووە.

***

١ـ ئەم سەرباسە لە دەستنووسەکەدا نییە، سەیر ئەوەیە کە لە چاپەکەدا (مبحث الارادة والعقیدة) ە، نازانم (عقیدە) کە چۆن هاتووەتە ناو، ئەی کتێبەکە هەمووی (عقیدة) نییە، بۆ ئەبێ هەر ئەم باسە (عقیدة)ی لەگەڵدا بێ؟!

## مبحث القدرة [١]

چــوارەم قـــودرەت تاممـــەی کامیلـــە
بـــۆ گشـــت مـــورادات خـــالیق شـــامیلە
مـــەنوارِ وە حـــەکیم بـــێئیعتیبـــاردا[٢]
وە بـــێ ئالـــەتێ بـــوێ لـــە کـــاردا
تەئسیـــری رووی کـرد وە هــەر عەدەمــدا
غونچەی وجوودی هەر ئـەودەم دەم دا[٣]
بـــازی ئـــیرادە و قـــودرەتی ئـــەزەل
بۆ سەیدی مەقـدوور دەوەشـێنێ پـەل[٤]
غـــەیری مومکینـــات جوســـتوجۆ ناکـــا
بـــۆ مومتـــەنیع و واجـــب روو ناکـــا
هـــەرچی لێـــی داوێ پڕتـــەوی وجـــوود
تکێکـــە لـــە بـــەحر قـــودرەتی مـــەعبوود

مەنوارِ وە حەکیم بێئیعتیباردا: سەیری حەکیمی بێنرخ مەکە. ئـەودەم: ئـەو هەناسـەیە. دەم دا: دەمی کردەوە. پەل: دەست و قاچی باڵندە. جوستوجۆ: هەوڵ، تێکۆشان. تک: نم، دڵۆپ.

واتە: چوارەمین سیفاتی مەعنای قودرەتە کە سیفەتێکە کاردەکات لە پەیـداکردنی مەقـدووردا لەوکاتەدا کە تەعەللووق دەبەستێ پێیەوە.

ئەم سیفەتە تابیعی ئیرادەیە و، ئیرادەیش تابیعی عیلمە. واتە: خودای گەورە بـە هـەموو شـت ئەزانێ و، ئەزانێ کامە لەگەڵ حیکمەتدا رێکە و لەبـەر روونـاکیی عیلمەکەیـدا ئـیرادە و خواسـتی رووداوەکاتە یەکێ لە دوو لای مەقدوورەکە، کە کردن و نەکردنە، لەسەر ئەو ئـیرادە و خواسـتەیش قودرەتەکەی شتەکە دەکات.

پوختەی قسە: سیفەتی قودرەت سەرچاوەی فیعل و تەرک واتە کـردن و نەکردنـە لـە هـەموو مومکینێکی زاتیدا، وە هیچ شتێک نییە کردنی یا نەکردنی لەسەر خودا واجب بێت، بەڵکو خودای گەورە لە کردن و نەکردنی هەموو مومکنێکدا موختارە و ئارەزووی بە دەستی خۆیەتی. جا لەگەڵ ئەوەیشدا کە (سنةالله) وایە، بۆ ئیش‌کردن ماددە و ئامادەیی و ئالەت پێویستە، خـودا ئـەتوانێ بـە بێ‌ئامادەیی و بە بێ‌ئالەت شت بکات. ئیتر لەم رووەوە گوێ مەدەرە قسـەی حـەکیم کـە دەڵـێت ئالەت پێویستە. بەڵێ بە بێ‌ئەوەی هیچ ئالەتێک لە کاردا بێت کە قودرەتی خودا رووی کردە هـەر نەبووێیک غونچەی ئەو نەبووە لە هەمان سات و کاتدا دەکرێتەوە و بوونی بەبەردا دەکرێت.

دیارە بازی بەهێزی ئیرادە و قودرەتی ئەزەلیی خـودای گـەورە هەمیشـە بـۆ مومکینـات پـەل دەوەشێنێ و هیچ مەقدوورێک لە بەردەستی ئەو دەرناچێت، ئیتر هێزی قودرەتی خودا روو ناکاتە (واجب‌الوجود) چونکە (واجب) ماوەی گۆڕانی تێدا نییە، هـەروەها روو ناکاتـە ئـەو شـتانەیش کـە مەحاڵی زاتین. ئەمەیش نابێتە عاجزیی و بێ‌دەستەلاتیی خودا؛ چونکـە بـێ‌دەسـتەلاتیی ئەوەیـە نەتوانێ مومکین جێ‌بەجێ بکات، خۆ واجب و مومتەنیع مومکینی خاس نین.

بێ‌گومان هەرچی لە جیهاندا پرتەوی وجوود لێی‌دابێ، هەمووی وەک نمەبارانێکـە لـە دەریـای بێ‌پایانی هێز و توانای خودای گەورەدا.

تەحریرێ بکـەین بـا جەمعییـەت وێ
دەلیلی سبووت هەر چار سـیفەت وێ
بـــەو تـــەقریرە وا بۆمـــان وتی زوو
کە ئیحتیاج بـۆ مـومکین سـابت بـوو
(الـــی الواجـــب القـــدیم الأعلـــی
و لـــیسَ فیـــه تعـــدّد أصـــلا)
ئـەوا سـابت بـوو (واجـب)ی (بالـذات)
مەبدەئە بۆ کـەون هـەموو مومکینـات
(و مـــن جملـــةِ تلـــک الممکنـــات
ذه الکائنـــــات والحوادثـــــات)
(فَـــإذَن لابـــدَّ لتخصیصـــها
بأوقاتهـــــا وتنصیصـــــها)

(مـــن أمـــرٍ بِـــهِ التخصـــيصُ يصـــحّ)؛
تـــا نـــەوێ تـــەرجیح (بـــلا مـــرجّح)

با جەمعییەت: لەگەڵ کۆبوونی دڵ و بێپەرێشانیدا یا لەگەڵ جەمعییـەتی ئـەهلی سـوننەت و جەماعەتدا بێت، یا جەمع بێ بۆ هەر چوار سیفەتەکە. ذِهِ، هذِهِ: ئائەمانە.

واتە: با لەم شوێنەدا شتێ بنووسین لەگەڵ دڵدامەزراویدا بێ، یا شـتێ بنووسـین لەگـەڵ رای ئەهلی سوننەت و جەماعەت بگونجێ، یا شتێ بنووسین هەر چوار سیفەتەکە بگرێتـەوە، ئـەوەیش ئەوەیە:

بەو تەقریرەی لە پێشەوە کردمان ئەوەمان ئیسبات کرد کـە مـومکینی خـاس موحتـاجی زاتی (واجبالوجود)ی تەنیای بێهاوتایە، هەر بەو تەقریرە بۆمان سابت بوو کە (واجبالوجود) سەرچاوە و ئافەریدگار و پەروەردگاری هەموو مومکینەکانە، ئەو رووداوانەی کە لە پـێش چاوتـانن بەشـێکن لەو مومکینانە.

جا پێویستە لێرە بیربکەینەوە لەوە بۆچی هەر یەکێ لەم رووداوانە لە کات و شوێنی تایبـەتی و، بە شێوە و وەزعێکی تایبەتی پەیدا ئەبێ؟ ئەمـە دەلیلـی ئـەوێ؛ چونکـە مـومکین دەسـتکـاریی هەڵدەگرێ و خودایش بەسەر هەموو مومکینێکدا توانایە، ئەگـەر هۆیـەک نـەبێ بـۆ بـوونی هـەر شتێک لە کات و شوێن و بە شێوەی تایبەتی (ترجیح)ی (بلا مرجّح) روودەدات.

جا بۆ بەیانی ئەو هۆ لایەنگرە گوێ بگرە لە بیری (حکماء) و (متکلمین) یەک لە دوای یەک:

پەس زەعمی بێجای حەکیم ئەمەیـە
ئـــەوە[٥] حەرەکـــەی ســـەرمەدییەیە
(الّتـــــی هِـــــیَ لَـــــا لَهـــــا أوَّل
فـــی نحـــو الماضـــی کمـــا تَقـــوَّل[٦]
فلأجـــــل کـــــون شـــــأن الحرکـــــة
التجـــــــدُّدَ بـــــــلا معرکـــــــة)
بۆ حەرەکە هەس ئەڵبەت جوزئییـات
لـــــە وجـــــوودەدا موتـــــەعاقیبات
(فهـــــیَ بِسَـــــبَب تجـــــدّدها
وَ تعاقـــــــب جزئیّاتهـــــــا

المُعِـــــدَّةِ الـــــی النهایـــــة،
الحادثـــــــةِ لا للبدایـــــــة)
بینـا لـەو عـوروە کـە بـۆ حەکیمـە
موسـتەعید دەویّ مـاددەی قەدیمـە
بـۆ وجـوودی ئـەم حەوادیسـاتە
کـە حەوادیسـات زەمانییاتـە
(کُـلٌّ) ئیسـتیعداد بـۆی دەویّ پەیـدا
(لوجـودِه) لـە وەخـتی خۆیـدا

واتە: قسەی بیّڕیّ و شوێنی حەکیمان ئەوەتە کە دەڵێن: ئەو (مرجِّح) و (مخصِّص) ە، ئەو هـۆ لایەنگرە، جووڵانەوەی سەرمەدیی فەلەکە، کە بە گومانی لاوازیان بەرەو رابـوردوو بـیّسـەرەتایە و هەر بووە.

ئەڵێن: لەبەر ئەوەی ئەو جووڵانەوەیە بریتییە لە تازەبوونەوە و، جوزئییاتی یەک لە دوای یەکی هەیە، ئەو جووڵانەوە تازە یەک لە دوای یەکانە ماددە ئامادە دەکەن بۆ رووداوی جۆراوجۆر، واتـە: جوزئیاتی جووڵانەوەکە دەبێتە (مخصِّص) و (مرجِّح) و لایەنگری بوونی هەر حادیسێک لە کات و شوێن و شێوەی تایبەتیدا.

پوختەی قسەکەیان ئەوەیە: (واجـبالوجـود) بـە بـیّوجـوودی ماددەیـەکی قـەدیمی خـاوەن ئیستیعداد بۆ حدووس، حەداویس دروست ناکات. واتە: پێویستە ماددەیێکی قەدیمی وەها بـیّ و مودده و ماوەیەکیش ببیّ کە ببێتە زەرفی پەیدابوونی پەیـدابووەکان. سـووڕانەوە و جووڵانـەوەی (فەلەک) یش ماددە ئامادە دەکات بۆ حەوادیس و، ئیستیعدادی پەیدابوونەکـە ئـەو جووڵانەوەیـە دروسـتی دەکـات و، جوزئییـاتی جووڵانەوەکـە دەبێتـە (مـرجِّح) و (مخصِّـص). مەولـەویش بـۆ رەدکردنەوەی ئەم رای حەکیمانە دەفەرمویّ:

(قُـــــل إنَّ العــــــروة لَمُعَتَّتَــــــة)
بـۆچی؟ جوزئییـات بـەو تـەرز موحدەسـە
(یســـبِقُ کلًـــا منهـــا اَلعَـــدَمُ
والســـبقُ علیـــه قـــد یســـتلزمُ)

بــۆ ســەبقی وەســەر جەمیعــدا یەکســەر
بــە رەنگــیٚ هیچــی لــیٚ نەچوێتــەدەر
جــەمیع بــەم مــەعنا ئــەمریٚ مەعقوولــە
بەڵیٚ، نەک بگری ئەم ریٚ مەع (قوولــە) [٧]
هــیچ فــەرقی نییــە ئــەر نــەوی لاهــی
ناموتــــــەناهی یــــــا موتــــــەناهی
(إذ بـــــلا نقصـــــان و لا إزديـــــاد
تلــكَ الجميــــعُ عــين تــى الآحــاد)
(ألمســـــبوق كـــلّ منهـــا بالعـــدَمْ
فالســـبقُ علـــى الجميـــع اســـتَلزَمْ)
ئــەم مەســبووقبوونــە، دەگــەڵ ئەمیچــە
موحـــویج بـــۆ (مخصِّـص)یٚ تریچـــە،
(مُنــــاف للكـــــون لا للبدايــــــة
قُــل يــا حكــيمُ فمــا دوايَــه؟) [٨]

معشّة: کرمۆڵ. نەچوێتەدەر: دەرنەچووبیٚ. بەڵیٚ: (نعم). مـع: لەگـەڵ. قوولـە: قیـل و قـال و قسەی پڕوپووچ. لاهی: دوای شتی بۆش و بیٚهوودە کەوتوو. دەگەڵ: لەگەڵ. ئەمیچە: ئەمیشـە. تریچە: تریشە. فَما دوایَ؟ دەرمانم چییە، چـارم چییـە؟ (هــ) کـەی هـی وەسـتانە و بـۆ کێشـی شیعرەکەیە.

واتە: ئەی شاگردی مەرد! بلیٚ بە حەکیم ئەوەی تۆ دەستت پێوە گرتووە و پشتت پیٚ بەستووە دارێکی کرمۆڵی قرۆڵە مۆرانە دایرزانـدووە، چونکـە جوزئیـات و یەکەیەکـەی حەرەکەکـە هـەموو حادیسن و نـەبوونیان لـیٚ پـێش کـەوتووە، کـە هـەموو فـەردێکیش نـەبوونی لـیٚ پـێش کـەوت مەجمووعەکەیشی نەبوونی لیٚ پێش دەکەویٚ، بەڵیٚ، ئەی حەکیم! بە موکابەرە و قیـل و قـال ریٚ لە خەڵک مەگرە و ئامانجت هەر دەرخستنی راستی بێـت، لـە هەرلایەکـەوە بێـت، هـیچ فـەرقی جەمعی موتەناهی و ناموتەناهی نییە، کە نەبوون کەوتە پـێش یەکەیەکـەی ئەفرادەکانـەوە دەبـیٚ نەبوون پێش مەجمووعەکەیش بکـەویٚ، چونکـە مەجمووعەکـە جەمیعەکەیـە و، جەمیعەکـەیش تەواوی ئەو یەکەیەکە فەردانەیە بیٚ زیاد و کەم؛ جا پێش‌کەوتنی نەبوون لەم یەکەیەکانە بە گشتی

دژی دەعواکەی تۆیە کە وتت جوولانەوەی فەلەک سەرەتای نییە. هەروەها جوولانەوەی پێشووی ئەو زنجیرەیە کـە ئیسـباتی حدووسـیمان کـرد خۆیشـی موحتـاجی (مخصِّـص)ی تایبەتییـە بـۆ پەیداکردنی لە ئەووەڵەوە.

بە کورتی: دەعوای بێسەرەتاییی جوولانەوەکان بە هەڵە دەرچوو، چونکە ئیسـباتی حدووسـی یەکەیەکەی جوولانەوەکان و مەجمووعەکەیشمان کرد. دەعوای بوونی یەکەیەکەی جوولانەوە بـە (مخصِّص) بۆ رووداوەکانیتریش هەر بە هەڵە دەرچوو، چونکـە بـە پێـی یاسـای خۆتـان یەکێک لە خودی یەکەیەکەی جوولانەوەکان بە بێ (مخصِّص) مایەوە! ئەمجا بە گاڵتەپێکردنـەوە بە حەکیم بڵێ: ئەی زانای حەکیم! پاش ئەم دەلیلە دەرمانی دەردم چییە و چارم چییە؟

جا کە بیری حوکەمامان بیست، با گوێ بۆ قسەی (متکلّمین) یش راگرین:

(ولَـــدى أهـــلِ الكـــلام القـــادة
ذلـــك الامـــرُ هـــو الارادة)
وا لـە شـەئنیدا تـەرجیح و تـەعیین
تەخسیسی موراد، بڵێ، بە کام حـین
(بَـــایِّ وقـــتٍ شـــاء مَـــن فَعَـــلَ
أن وَقَـــعَ الفعـــل فيـــهِ و حَصَـــل)
(فإنّهـــا القصـــد الـــى الفعـــلِ فـــى
وقـــتٍ معـــيَن فـــى العلـــم الـــوفى)
(أو مبدأ القصد) نەک وا گومان بـەین
ئەو قەسدی یەکێ لە دوو تەرەفـەین
(بخصوصـــــــــه لازمٌ لَـــــــــهُ
ليلـــــزَم ايجـــــاب؛ ذا لأنّـــــهُ)
(أی القصـــدَ، إن تَطّلـــعْ عليـــهْ،
تـــابعٌ لِلعلـــم الـــداعى إلَيـــهْ)
(ای الـــى القصـــدِ بـــلا إرتيـــابْ
لكِـــن لا عَلـــى ســـبيل الايجـــابْ)

واتە: لای ئەهلی کەلام (متکلمین) ئەوە کە رووداونی رووداوەکان بە کات و شوێن و بار و شـێوە و ئەندازەی تایبەتییەوە دەبەستێتەوە (ئیرادە)ی خودایە. ئـیرادە سـیفەتێکی تـابیعی عیلمـە کـە یەکێ لە دوو مەقدوور دیاری ئەکا بۆ بوون لە کات و سات و شێوە و باری تایبەتیدا. جا ئەو ئـیرادە خودی قەسد بێ یا سیفەتێ کە سەرچاوەی قەسد بێ، ئیتر وا مەزانـە کـە یـەکێ لـە دوو لایـەنی فیعل و تەرک لازمە لەسەر خودا و واجب ئەبێ هەر ئەوە بێتەجێ هـەتا ئیجـاب رووبـدات لەسـەر خودای گەورە. ئەو سیفەتە (مخصِّص)ە تابیعی عیلمە و، عیلمیش داعی‌یە بۆ ئەو بـەڵام نـەک بـە شێوەی ئیجاب و بەسەردا بڕین.

ئـەر دەڵـێی ئـەمیچ عیللـەتی چیـە
ئـەو عیلمـە ئـەوا قەسـد تابعیـە
(و لـو یکـونُ یُـری الفـاعلا
راجحیّـة الفعـلِ مـثلاً)
لاکـین بزانـە هـیچ شـکی نییـە
نـە مـوقیعی فیعـل نـە ئـی قەسـدیە
تەشبیهێ بکەین بۆت یەکجار بـەجێ
وەک ئیرائـەی رێ بـۆ سـالیکی رێ
(لا یسـتلزم سُـلوکَ الطریـق
بـل و لا القصـدَ لَـهُ بـالتحقیق)
(کـذاکَ العلـمُ السـابق بـلا مَـین
لا یوجِـب شـیئاً مـن المـذکورَین)
(فقـد یقصـد الفاعـلُ الفعـلا
مراعـاةً للمصـلحة فضـلاً)
(و قـد لا) بـۆچی؟ ئـەو موراعاتـە
غـەیرە لازمـە لـە بـۆ ئـەو زاتـە

واتە: ئەگەر ئەپرسی عیللەتی ئەوە چییە کە عیلم داعییـە بـۆ قەسـد و ئـیرادە بـە بـێ‌ئیلـزام و ئیجابی ئەو قەسدە؛ لە وەڵاما پێت ئەڵێم ئەو عیلمە کە داعییە بۆ قەسد و ئیختیاری یەکێ لـە دوو مەقدوور و قەسد دەکەوێتە شوێنی، ئەگەرچی باشییەتی و جوانیی فیعل یا تـەرک دەخاتـە پـێش

چاوی فاعیل، بەڵام بە بێ‌گومـان ئـەو عیلمـە کـار ناکاتـە فیعلەکـە و کـار ناکاتـە ئـەو قەسـدەی روودەکاتە فیعلەکە، چونکە عیلم و زانست سیفەتی کەشف و دەربڕینە، سیفەتی تەئسیر و تـەنفیز نییە.

بۆ روون‌کردنەوەی ئەم باسە (دوور لە خوا) تەشبیهی خودای گەورە بە ئینسانێکی زانای خاوەن خواست و توانا دەکەین کە دەیەوێ بە ڕێگەیەکدا بڕوات. تەماشا بکە هـەر چەنـد زانـینی کـابرای ڕێڕەو بە حیکمەت و باشیی سەفەرەکەی داعی و هۆیە بۆ ئیرادە و خواستی ڕێ‌کەوتن و ڕۆیشـتن بە ڕێگەکەدا، بەڵام ئەو ئیرادە و خواستە نابێتە موجیب بۆ ڕۆیشتن بە ڕێگەکەدا، تەنانـەت عـەزم و قەسدی ڕێگە ڕۆیشتنەکەیش هەر نابێتە موجیب بۆ ڕۆیشتن بەو ڕێگـەدا، هـەروەها ئـەو زانینـەی کەوتووەتە پێش ئیرادەکە ئـەویش نابێتـە مووجیـب نـە بـۆ ئـیرادە و نـە بـۆ مورادەکـە، کـە ڕێ رویشتنەکەیە.

(والحاصل) زانست دەربڕە، ئیرادە (مخصّص) و (مرجّح)ە و ئەمانە هیچیـان سـیفەتی مووجیـب نین.

جا کە عیلمی زاتی خـودا مووجیـب نـەبوو بـۆ رووکـردنی قەسـد و ئـیرادە بـۆ کـردنی فیعلـە مەقسوودەکە، جارجار فاعیلی موختار قەسدی کردنی کارە قازانج‌دارەکە دەکات و هەر بە لوتـف و فەزڵی خۆی چاودێریی قازانجەکـەی دەکـات. جـاری‌وایـش دەبـێ قەسـدی کـردنی ئـەو کـارە قازانج‌دارە ناکات و گوێ ناداتە قازانجی خاوەن‌کار و باشیی کارەکە. دیارە چاودێریی قازانج لەسـەر خودا واجب نییە و بۆ زاتی خودا ئەسلەح و غەیرە ئەسلەح وەک یەک وانە.

(و بـــذلک التحریـــر الســـدید
انـــدفع مـــا فـــی هـــذا الترديـــد:)
ئـەمرێ کـە نـاوی ئـیرادە دەبـەین
ئەگـەر نیسـبەتی ئـەباڵ تەرەفـەین
لـە فیعـل و لـە تـەرک (علـی السـوية)
لـە (مُـرَجِّح)دا تەسەلسـول هەیـە
ئەر بـۆ هـەردوویان وەکـو یـەک نییـە
بـەڵ خـاس بـە یـەکێک (بعینـه)یـە
پـەس لـەمیچ ئـەوا لازم هـات ئیجـاب

فەلسەفی کەیفی خۆش بوو بێ‌حیساب

واتە: بەم روون‌کردنەوە بـەهێزەی کـە نووسـیم و وتم: ئـیرادە تـابیعی عیلمـە و عـیلم فیعلـی قازانج‌دار دەردەخات و کەشفی دەکات، ئیتر نە مووجیبی فیعلە و نە مووجیبی قەسدی فیعلە، ئەو رەخنەیە رەد دەبێتەوە کە دەڵێت: ئەو شتەی ناوی (ئـیرادە)یـە ئەگـەر بـۆ دوو لایـەنی فیعـل و تەرک وەک یەک وایە ئەوا بۆ تەعەللوقی بە لایەکیانەوە پێویستی بە (مخصـص) هەیـە، پێوەنـدی ئەو (مخصص) ەیش بە بوون و نەبوونی ئەو لایەنەوە کە جیای کردووەتەوە ئەگەر هەر وەک یەک وایە ئەوا ئەمیش پێویستی بە (مخصص) ێکی تر هەیە و... هەروا تا بڕوا، بەمەیش تەسەلسـول روو دەدات لەو (مخصصات) ەی کەوتوونەتە پێش تەعەللوقی ئیرادەوە و، تەسەلسولیش مەحاڵە.

خۆ ئەگەر نیسبەتی ئەو ئیرادە بۆ هەردوو لایەنی فیعـل و تـەرک وەک یـەک نییـە و هـەر بـۆ لایەک رووئەکات، ئەوا ئیجاب بۆ خودا رووئەدات، واتە پێویستە خودا هەر ئەو لایەنە بکات و لێی لا نەدات، ئەمەیش کەم‌وکووڕییە بۆ خودای گەورە و نـاکرێ و (تعـالی الله عـن ذلـک علـواً کبیـرا).

بەرپەرچدانەوەی رەخنەکە بەم جۆرەیە:

ئەڵێین ئەتوانین باری یەکەم پەسەند بکەین کە ئیرادە بـۆ هـەردوو لای فیعـل و تـەرک وەک یەکە و موحتاجی (مخصص) ە، بەڵام تەسەلسول لـە (مخصصـات)دا روو نـادات. (مخصـص) ەکـە عیلمە چونکە ئیرادە تابیعی عیلمە، عیلمەکەیش لەبـەر ئـەوە کـە کەشـفی هـەردوو لا دەکـات لا چاکترەکە تەرجیح ئەدات، بەڵام تەرجیحەکەی بە ئیلزام نییە و بـە سـەریا نەسـەپێنراوە، وتمـان، ئەوا نە ئیجاب نە تەسەلسول هیچیان رووی نەدا.

ئەیشتوانین لقی دووەم پەسەند بکەین و بڵێین: ئیرادە هەر روو دەکاتە یەک لایـەنی تایبـەتی؛ چونکە تابیعی عیلمە و عیلم داعیی ئیرادەیە بۆ ئەو لایەنە و، ئیجـابیش روو نـادات، چونکـە عـیلم (کاشف) و (داعی)یە و (ملزِم) و (موجب) نییە.

لەم شوێنەدا رەخنەیەکی تر ئەڵێت: دیارە سیفەتی ئیرادە قەدیمە و ئەزەلییە و نیسبەتیشی بـۆ هەموو مومکینات وەک یەکە، هەر وەکوو لەوانەیە تەعەللوق ببەستێ بە یـەکێکی تایبەتییـەوە لـە دوو (ضدّ)، لەوانەیشە تەعەللوق ببەستێ بەوی تریانەوە.

هەر وەک مومکینە تەعەللوق ببەستێ پێیەوە لە کاتێکی تایبەتیدا، لەوانەیشە لـە کـاتێکی‌تـردا تەعەللوقی پێوە ببەستێت. جا ئەگەر ئەو تەعەللوقی ئیرادەیە ئـەزەلی بـێ ئـەوا دەبـێ حـەوادیس

قەديم بن، خۆ ئەگەر لە (ما لايزال)دا تەعەللوق ببەستێ ئـەوا پێويسـتە (مخسـس) ێ هـەبێ کـە ببێتە هۆی تەعەللوقى تايبەتى لەو کاتە تايبەتييەدا.

هەروەها قسە دەگوێزينەوە بۆ ئەو (مخسس) ە، جا يا قەديميى حـەواديس يـا تەسەلسـول لـە حەواديسدا لازم ديت.

وەلامى رەخنەکەيش ئەمەيە ئەتوانين بلێين تەعەللوقەکەی ئەزەلييە و قەديميى حەواديسيش روو نادات؛ چونکە ئەو تەعەللوقە ئەزەلييە وەها نەبووە کە ئەو شتە لە ئەزەلدا بێتەجێ، بەلکو وەها بووە کە لە پاشەڕۆژدا لە کات و شوێنى تايبەتيدا پەيدا ببێت.

ئەيشتوانين بلێين تەعەللوقەکەی حاديسە و پێويست نييە بە (مخسس) ؛ چونکـە تەعـەللووقى ئيرادەی فاعيلى موختار لەبـەر زاتى خۆيـەتى، واتـە لەبـەر زاتى ئيرادەکەيـە، بـەم مـەعنا ئـيرادە تەعەللووق دەبەستێ بە لايەنێکى تايبەتى فيعل يا تەرکەوە، بە بێ (مخصِّص) و (مـرجّح) بـۆ ئـەو لايەنە، وەکو راکردوو لە دڕندە يەکێ لە دوو ڕێگەی وەک يەک دەگرێ، يا تينوو لە يەکێ لە دوو کاسە ئاوی وەک يەک دەخواتەوە، ئەم بارە نابێتە هۆی ئيجاب، چونکە هـەر لـەو حالـەدا کـابرای ڕێڕەو دەتوانێ بە ڕێگەکەی تردا بڕوات، کابرای تينوويش دەتوانێ کاسە ئاوەکەی تر بخواتەوە.

(و مـــن ذلـــک المـــذکور يُعلَـــم
صـــفاتٌ اربـــع لـــرَبِّ العـــالم)
بلـێ پێکـەوە هـەر چـوار سـيفات[٩]
قودرەت، ئيرادە، عيلم دەگەڵ حەيات
بـــەعزێکيان تـــابيع ئـــەو بەعزيانـــە
ســـبووتى يـــەکێ ئـــى گشـــتيانە،
(فکأنّمـــــا الجميـــــعُ واحـــــد
مـــا نـــافى قـــولَ الحکـــيم اللّاحِـــد)

ئى: هى.

واتە: لەوەی کە لە پێشەوە باسمان کرد و نووسيمان چوار سيفەتى زاتى (واجبالوجود) مان بـۆ دەرکەوت، چونکە مادام خودای گەورە ئافەريدگاری هەموو رووداوەکانـە بـێگومـان ئـەبێ هێـز و توانای ببێ و بتوانێ دروستيان بکات، ئەو هێزەيش (قودرەت)ە. جا وەک وتمان قودرەت و توانـای بۆ هەموو مومکينێک يەکسانە، واتە: پێويستە سيفەتێکى ببێ کە يەکێ لە دوو لايەنى مومکينەکە

دیاری بکات تا قودرەتەکەی رووی تێ بکات، ئەو هێزەیش (ئیرادە) یە، دیارە ئیرادەکەیش یەکێ لەو دوو لایەنە دیاری دەکات کە لە عیلمی خودادا سابت بووە.

گومانیش لەوەدا نییە کە عیلم بە بێحەیات نابێت.

بە واتەیەکی روونتر قودرەت بێئیرادە نایکرێ و، ئیرادەیش بێعیلم نابێ و، عیلمیش بە بێحەیات هەرگیز سەرناگرێ.

کەواتە بوونی قودرەت یانێ بوونی هەر چوار سیفەتەکە، ئیتر مەبەستی مەولەوی ئەوە نییە کە بوونی هەریەک لەم سیفەتانە دەبێتە هۆی بوونی سیفەتەکانی تر. بۆ نموونە زیندوویەتی تەنها خۆی نابێتە هۆی توانا. بەڵام پاش ئەوەی بڕیارمان دا جیهان و هەرچی لە جیهاندایە هەمووی (حادث)ە و، نەبوونی لێ پێش کەوتووە و بە توانا دروست بووە، ئەم توانایە بێ خواست نابێت و، خواستیش بێ زانین نابێت و ئەمیش بێ زیندوویەتی نابێت(١٠).

شتێکی زۆر بەجێیە لێرەدا فەرقێکی رۆشن لە بەینی ئەم چوار سیفەتە دەربخەین:

سیفەتی حەیات، زیندوویی، خۆی لە خۆیا پێوەندی بە غەیری زاتەوە نییە و فەرقی لە باقی سیفەتەکان دیارە.

سیفەتی عیلم کە مەوجوودات و مەعدووماتی پێ کەشف ئەبێت لە ئەزەل و ئەبەددا، سیفەتی تەخسیس نییە کە تاقە شتێک هەڵبژێرێت، واتە: لە ئیرادە جیابوویەوە، سیفەتی تەئسیر و ئیجادیش نییە، واتە: لە قودرەت جیابوویەوە.

سیفەتی ئیرادەیش کاری تەخسیس و تەرجیح و دیاریکردنی یەکێ لە دوو لایەنی مومکینە. ئیتر ئیجاد و تەئسیر هی ئیرادە نییە و هی قودرەتە؛ وا قودرەتیش لە ئیرادە جیابوویەوە.

شایانی باسە کەوا مەشهوورە ئەڵێن «فەرقی ئیرادە و قودرەت ئەوەیە قودرەت بۆ هەموو مومکینات یەکسانە، بەڵام ئیرادە وەها نییە». دیارە مەعنای ئەم قسەیە ئەوەیە قودرەت روو دەکاتە هەموو شتێک و بە بێ (مخصّص) نابڕێ بە بارێکدا، بەڵام ئیرادە ئیشەکەی تەخسیس و دیاریکردن و هەڵبژاردنی لایێکە بە تایبەتی، جا یا لەبەر زاتی خۆی وەکوو واتەی گەلێ لە زاناکانە، یا لەبەر ئەوە کە تابیعی عیلمە بە مەسڵەحەت و هۆی حیکمەت وەکوو قسەی (ماتریدی) یەکان.

بەڵام ئەگەر مەعنای وەها لێ بدەینەوە کە قودرەت لە یەک کاتدا ڕوودەکاتە دوو (ضدّ) ئەوە هەڵەیە، چونکە کۆبوونەوەی دوو (ضدّ) مەحاڵە و قودرەت روو ناکاتە مەحاڵ.هەروەها ئەگەر

بلێین قودرەت روو دەکاتە هەموو مومکینێک بەڵام ئیرادە قابیل نییە روو بکاتە هەموو مومکینێک ئەمەیش هەر هەڵەیە، چونکە ئیرادەیش لەوانەیە روو بکاتە هەموو مومکینێک و بەم شێوەیە فەرق نەما لەناویاندا.

بەڵێ، وەک وتمان، کاری قودرەت تەئسیر و ئیجادکردنی مومکینە، هەر مومکینێ بێت، ئیتر پێوەندییەکی تایبەتی نییە بە لایەکەوە، تەنانەت هەرکام لە (ضِدَّین) بۆ ئەو وەک یەکە. بەڵام ئیرادە، ئەگەرچی لە خۆیا لەوانەیە روو بکاتە هەر شتێ، ئیشەکەی بریتیە لە تەخسیس و ترجیح و دیاریکردنی لایەک بۆ بوون.

قودرەت وەک تەشوێیەکە لای دارتاش کە هەموو دارێک دەتاشێ، ئیرادە وەک خواستی دارتاشەکەیە، هەر دارێک کە پێویستی بێ دەیتاشێ، لەبەر ئەمە (الله قادر علی کل ممکن) بە شێوەی عموم، نەک (الله مریدٌ لکلّ ممکن).

پوختەی قسە: ئەم چوار سیفەتە لە ئەنجام و ئاساردا جیان: حەیات هی مەبدەئییەتی زاتە بۆ ئاسار. عیلم بۆ کەشف و دەرخستنی مومکین و واجیب و مومتەنیعە. ئیرادە بۆ دیاریکردنی هەندێ مومکین. قودرەت بۆ دروستکردنی ئەو مومکینەیە کە ئیرادە جیای کردووەتەوە و دیاریی کردووە.

سیوای بۆی گوڵشەن ئەدیللەی سەمعی
کەوا لە دەماخ دڵ دەدا قەتعی
ئەم فیعلی موتقەن یەکجار عەجیبە
ئەم سونعی غەریب نەزم و تەرتیبە
ئەم مەلەکووتی و موڵکی بێ عەیبە
ئەم خەلقی و ئەمری شادەت و غەیبە
دەڵێن: نەزەرکەن زەریف دیارە
سانیعمان مەوسووف بە هەر چوارە
ئەم سیفەتانە سەریان بەراورد
ئیجابی (بالذات) پێی لەناو دەرکرد
زیندگە و دانا زاتی کردگار
موریــد و قادر فاعیلی موختار

سیوا: بێجگە. شادەت: شەهادەت، شتی دیاری. بەراورد: دەرهێنا. زیندگە: زیندووە. کردگـار: دروستکەر، خالیق، خوا.

واتە بێجگە بۆن و بەرامەی باغچە و بێستانی دەلیلە سەمعییەکان، کە لەبارەی بوونی ئەم چـوار سیفەتەوە یەقین و بێگومانی دەخەنە ناخی دەروونەوە، ئەم کارە رێختە و بـێڕەخنانـەی عـەرز و ئاسمانە، ئەم کارە نایابە جوانە بێگەردانە کە غەیری زانای بەرز کەس پەنامـەکی و نهێنییـەکانیان نازانێ، ئەم گۆی خۆرە کە (قطر) ەکەی (١٠٩) ئەوەندەی (قطر)ی گۆی زەوییە و، گەلێ لە گـۆی زەوی گەورەترە و بەمجۆرە پرتـەو بـە جیهـان دەبەخشـێت و لـە شـوێنی خۆیـدا دەگـرێ، ئـەو ئەستێرانەی بە دەوری خۆردا هەمیشە و لەسەر قانوون و رێ و شوێنێکی تایبـەتی دەسـووڕێنەوە، ئەم هەمووە ئەستێرە لە ژمارە نەهاتووە پرشنگدارانە کە هەریـەکی رەنـگ و شـێوە و پرتـەوێکی تایبـەتیی هەیـە، ئـەم دەریـا گـەورە بـێپایانانـە بـە هـەموو گیـا و گیـانلەبـەر و کـان و شـتە بەنرخەکانیانەوە، ئەم هەمووە گیانلەبەرانەی سەرزەوی، ئەم هـەمووە دار و دەوەنـە بـێشـومارانە بێبەر و بەردارییان، ئەم گوڵ و لالە رەنگاوڕەنگانە، ئەو هەمووە هێزە جوانە رێـک و پێکانـە ئـەوەی دیاری و نومایانە و ئەوەی لەمەوپاش دەدۆزرێتەوە، ئەمانە هەموو بە زمانی حاڵ بانـگ ئەکـەن لـە هوشیاران و ئەڵێن: بڕوانن زۆر ئاشکرایە پەروەردگاری ئێمـە هێـزی سروشـتی بـێهەسـت نییـە، چونکە یاسا لە بێیاساوە پەیدا نابێ، زانسـت لـە نەزانـەوە پەیـدا نابـێ. ئـەم کـارە نایابانـە کـاری پەروەردگارێکی تەواون کە ژیانی بەردەوامە و زانایە و خاوەن خواستە و هێز و توانادارە.

جا کە بە دەلیلی سەمعی و عەقلیی بەهێز و یەقینبەخش بۆمان دەرکەوت ئەم چـوار سـیفەتە سابتن بۆ خودا، بۆمان دەرکەوت کە سیفەتی (ایجاب)ی (بالذات) پێی لەناودا نەما، چونکە ئیجـابی (بالذات) بەوە دەبێ کە فاعیلە مووجەبەکە بەردەوام لەسەر یەک شێوە هێزی بکەوێتە کـار، بـەلام ئێمە کە تەماشای کائینات ئەکەین لەگەڵ ئەوەدا کە سروشت عەینی سروشـتە، لـە هـەر لایـەک ئاسارێکی تایبەتیمان بەرچاو دەکەوێت:

لایەک بە درێژاییی ساڵ یەخبەندانە، لایـەک گەرمەسـێرە، لایـەک سەردەسـێرە، لایـەک مـام ناوەندییە، لایەک ئاوە و خێر و بێر و پیت و بەرەکەتـە، لایـەک وشـکە و قـاتوقـڕی و لـە برسـانا مردنە!

هەر یەک لـەم شـوێنانە، بگـرە هـەر بسـتێ لـەم جیهانـە پـان و بەرینـە سـیفەتی تایبـەتی و بەرهەمێکی دیاری و جیاوازی هەیە.

لە راستیدا (ایجاب)ی (بالذات) و ناچاریی لە کار و کردەوەدا شایانی زاتی خودا نییە، ئەم ناچارییە کەموکووڕییە و کەموکووڕیش بۆ پایەی بەرزی خودایی ناشێت. بەڵام (ایجاب)ی (فی الصفات) بە تەواوی و چاکە حسێب دەکرێ و کەموکووڕی نییە.

بەڵێ ئەم هەمووە جۆراجۆرییەی جیهان و ئەم هەمووە نیشانانەی لە خۆمان و لە جیهاندا بە روونی دەیبینین هەموویان هاوار دەکەن کە:

زینـــدووە و زانـــا زاتی کردگـــار
موریـــدە و قـــادر فـــاعیلی موختـــار
(ألا لـــــهُ الخلـــــق والأمـــــر
تَبَـــارَک الله أحسَـــنُ الخـــالقین)
(و یُعلــم ایضـــاً) ئەگـــەر دەیبیهـــی
(حـــدوث العـــالم بالتمـــامْ بـــهِ)
(لِـــانَّ القصـــدَ یقـــرن العـــدم
ضـــرورة بهـــا الوجـــدانُ حکـــم)
مەڵێ تەقەددوم قەسد لەسـەر مەقسـوود
(بالذات)ە هەروەک ئیجـاد لـە مـەوجوود
بـۆچ؟ لـە لای زیهنـێ کـەوا حازیقـە
ئەمـــە قیاســـی (مـــع الفـــارقَ)ە
عالـــەم هـــەروەها حودووســـی راســـە
قابیلییـــەتی بـــۆ فـــەنایچ واســـە
عـــەدەمێ (قبـــل الوجـــود) مەشـــهوودە
هـــەر وەک عـــەدەمی (بعـــد الوجـــود)ە
تـــەمایوز نییـــە لـــە بەینیانـــدا
هـــیچ ئیختیلافـــێ نییـــە تێیانـــدا
ئەویان جائیز بوو ئـەمیان بـەو دوسـتوور
(ألَـــا الِـــی الله تصـــیر الأمـــور)

دەیبیهی: دەیبیسی. (بە): بەو باسەی لە پێشەوە نووسیمان، کە ئیرادە سـیفەتی تەخسیسـە و تابیعی عیلمە و... تاد. واسە: وەهاسە، وەهاتە، وایە.

واتە: هەر بەو باسەی نووسیمان دەربارەی وەزیفەی سیفەتەکان کە وتمان سیفەتی (مخصـص) ئیرادەیە کە تابیعی عیلمە و عیلم تابیعی حەیاتە و قودرەتیش تابیعی ئیرادەیە، ئەگەر لێم ببیسی، دەرکەوت کە جیهان هەمووی حادیسە بە حودووسی زەمـانی، واتـە: نـەبووە و لـە پـاش نـەبوون خودای گەورە بە ئیرادە و قودرەتی خۆی دروستی کـردووە بـەو شـێوە کـە خـۆی ویسـتوویەتی، ئەمەیش بە کورتی لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا باس کراوە و، زانا پایەبەرزەکانی ئیسلام باسـیان کردووە.

جا بۆ روونکردنەوەی ئەوەی کە ئـیرادە و قـودرەت ئـەوە دەگەیـەنێت کـە جیهـان حودووسـی زەمانیی هەیە و نەبوونی لێ پێشکەوتووە، دەفەرموێ: چونکە خودای گەورە بـە قەسـد و ئـیرادە ئیش دەکات، دیارە ئیرادەی دروستکردنی شتی نەبوو پێویستە لە پێش بوونەکەیـدا بـێ؛ ئـەگینا دەبێتە تەحسیلی حاسیل (پەیداکردنی شتێ کە خۆی پەیدایە و هەیـە) کـە ئەمـەیش مەحالـە و نابێت، وا دەرکەوت کە قەسد لە پێش مەقسوودەوە بوو، واتە: ویستی دروستکـردنی جیهـان لـە پێش بوون و دروستبوونی جیهانەوە بوو.

جا نەکەی وا بڵێیت: با پێشکەوتنی قەسد لەسەر مەقسوود کە دروسـتکردنەکەیـە بـە زمـان نەبێ بەڵکو بە زات بێ، واتە پێشکەوتنی ئیرادەی خودا لەسەر دروستکردنەکە بە زات بـێ وەک پێشکەوتنی ئیجاد لەسەر وجوود کە زاتییە و زەمانی نییە؛ چونکە قیاسی پێشکەوتنی قەسد لـە مەقسوود لەسەر پێشکەوتنی ئیجاد لە وجوود (قیاس)ی (مع الفارق) ە، واتە: قەسـد و مەقسـوود وەک ئیجاد و وجوود نین؛ هەرگیز ناتوانرێ ئیجاد بە بێوجوود یا تەئسیر بە بـێئەسـەر تەسـەوور بکرێ، شتی وا (ممتنع)ی (بالذات)ە.

بەڵام ئیرادە و قەسدی فاعیلی موختار لەوانەیە لەگەڵ مەقسووددا بەرامبـەر بـن و بـەرودوایان نەبێ ئیللا بە زات بەم شێوە: کە ئـەو جـوزئی ئـەخیرە لـە عیللـەت و ئـەمیش مەعلوولـە، دیـارە مەعلوول پاش جوزئی ئەخیر لە عیللەت ناکەوێ (بالذات) نەبێ، لەوانەیشە ئیرادە و قەسدی فاعیل پێش بوونی مەقسوود بکەوێ، ئەوندە پێش بکەوێ خودا نەبێ کەس نەزانێ چەنـدە، وەکـوو ئـەوە فاعیلی موختار ئیرادەی کردبێ ئەو مەقسـوود و مـورادە پـاش هـەزاران سـاڵ لـە فـلان وەختـدا

بێتەجێ...؛ کەوابوو قیاسی پێش‌کەوتنی قەسد لە مەقسوود کە ئیجادە، لەسەر پێش‌کەوتنی ئیجاد لەسەر وجوود، قیاسێکی ناڕاست و بێ‌سوودە.

بێجگە لەمە ئینسانی ورد و زانا تەماشای حەقیقەتی شتێکی کرد، پێویستە لە رشتەیەک موناسەبە لەگەڵ سەرەتا و ئەنجامی ئەو شتە حاڵی ببێ؛ ئێمە کە تەماشای پارچەپارچە و بەش‌بەشی جیهان ئەکەین هەرکامیان ئەگرین لەوانەیە لەناو بچێ و بفەوتێ، شاخ و داخ ئەڕووخێ و دەبێتە تەپ و تۆز، هێزی ئەتۆم لەوانەیەگەلێ شوێن تەخت بکات و شوێنەواری نەهێڵێت، گەلێ وڵات رۆدەچێ بە ناخی زەویدا، گەلێ دەریاچە وشک دەبێت و دەبێتە وشکانی. دەی هەروەکوو فەوتان و نەمانی پاش بوون رەوایە و راستە و دەبینرێ، با نەبوونی پێش بوونیش رەوا بێ، ناچێتە عەقڵەوە بە ساڵەهای ساڵ شتی بوو لەناوبچێت و نەبوونی بەسەردا بێت کەچی لە سەرەتاوە ئەزەلی بێ و لەگەڵ زات و قەسدی خودای گەورەدا بەرامبەر بێ و نەبوونی لێ پێش نەکەوتبێ، ئەنجام دەگەینە ئەوە کە جیهان لە نەبوونەوە پەیدا بووە و نەبوونیشی بەسەردا دێت و، هیچ جیاوازییەک لە نێوان نەبوونی پێش بوون و نەبوونی پاش دروست‌بووندا نییە و، هەروەک فەوتانی پاش بوون راستە، نەبوونی پێش بوونیشی راستە و، ئەمەیش لای خودای گەورە ئاسانە (ألَا اِلی الله تصیر الامور ایجاداً و وجوداً و عدماً قبل الوجود و بعده).

***

۱ـ ئەم سەرباسەیش هەر لە چاپەکەدا هەیە.

۲ـ ئەوەی من نووسیومەتەوە مەتنی نوسخە دەستنووسەکەیە. لە نوسخە چاپەکەدا «منوارّه و حکم»ە کە ئەکاتە (مەنوارە وە حوکم) یا (مەنوارەو حوکم) وەک خەڵقی تاوگۆزی دەیڵێن و ئەسڵەکەی (مەنوارە ئەو حوکم)ە.

۳ـ لە نێوان (عەدەم دا) و (دەم دا) و هەروەها لە نێوان (عەدەم) و (دەم)دا وشەئاریی هەیە و، لە نێوان (وجود) و (عەدەم)دا تیباق هەیە.

٤ـ شێوەنووسی دەستنووسەکە (ارادهُ = ئیرادەو) و، لە چاپەکەدا (ارادهٔ = ئیرادەی)ە کە تەواو نییە. لە نێوان (باز) و (سەید) و (پەل) یشدا تەناسوب هەیە.

۵ـ ئیشارەیە بۆ لایەنگر (مرجِّح) ەکە، وەک لە دەستنووسەکەدا ئیشارەی بۆ دانراوە.

٦ـ نحو: لا (جهة).

۷ـ لە نێوان (مەعقووله) و (مع قووله)دا جیناسی تەرکیب هەیە.

۸ـ چەند جوانە کۆکردنەوەی حەکیم و دەوا!

۹ـ لە دەستنووسەکەدا لە پاڵ وشەی (بلی)دا نووسیویە: بگۆ واتە: بلێ. وەک لە مەتنەکەدا نووسیومەتەوە.

١٠ـ لە نوسخە دەستنووسەکەدا لەسەر بەیتی «و من ذلک المـذکور یعلـم... الخ» پـەراوێزێکی کـەمێک درێـژ نووسراوە، لە دوادوایی ئەو پەراوێزەدا دەڵێت:

«و ما قاله الحکماء من ان الواحد لا یقتضی إلّا واحداً لان الاقتضاء لا یکون إلّا بمناسبة موجبة له، والشیء الواحد لا یناسب اموراً متخالفة، لا ینافی ذلک، بل یکاد ان یقویه؛ لان المناسبة للتابع مناسبة للمتبوع و بالعکس، و لـذلک قلنا «فکأنمّا الجمیع واحد».

جا لەبەر ئەوە کە شتەکە پێوەندی بە واتای «فکأنمّا الجمیع واحد»ەوە هەیە پوختەیەکیم بە کوردی نووسی:

پوختەی رەخنەکە: حوکەما دەڵێن یەک، کە خودایە، تەنها دەبێتە هۆی بوونی یەک شت چونکە بوون بـە هـۆ پێویستی بە بۆنە هەیە و یەک بۆنەی لەگەڵ چەند شتی لە یەک جیادا نییە!

پوختەی وەڵامەکەیش ئەوەیە: ئەم سیفەتانە چەند شتێکی لەیەکجیا نین؛ چونکە توانا تابیعی خواستە و بۆنەی لەگەڵ ئەودا هەیە، خواستیش تابیعی زانینە و بۆنەی لەگەڵدا هەیە، زانینیش تابیعی زیندوویەتییە و بۆنەی لەگەڵدا هەیە، ئەمیش تابیعی یەکەکەیە کە خودای گەورەیە، ئـەوەی بۆنـە و موناسـەبەی لەگـەڵ (تـابع)دا هـەبێ لەگـەڵ (متبوع) یشدا دەبێت؛ کەواتە ئەم سیفەتانە چەند شتی لەیەکجیا نین و بێبۆنـە نـین و، تەنانـەت لەسـەر قسـەی حوکەمایش وەک ئەوەتە یەک بووبێتە هۆی یەک.

## مبحث السمع والبصر والكلام [1]

پەنجەمین سەمعە و، شەشەمین بەسەر
هەفتەمین کەلام سێ وەسفن خودسەر
سابتن بۆ زات خالیق، زیادە
لە وەسفی قودرەت عیلم و ئیرادە
ئیرجاع بەوانە لە زاهیر دوورە
بۆچ؟ بێ زەروورە، کوانێ زەروورە؟
ئەگەر تۆ دەڵێی ئەم سیفەتانە
موحتاجن ئەباڵ ئەم ئالەتانە؛
وەک ئوزون و عەین، وەک حەلق و لیسان
ئەوە بۆ ئێمەس، نەک بۆ حەق، بزان[2]
چلۆن؛ سا دەشێ حەق عیلمی نەوێ
بۆچ؟ ئەویچ قووەی عاقیلەی تەوێ
بەڵێ بۆ ئیسبات هەر سەمعی ماگە؛
عەقڵی دیارە ژێر پێی کوتیاگە
(والحاصل) نەک وەک سیفاتی خەلقن
حاجەت بە گوێ، چاو، زوان و حەلقن
بەڵ لە چە وو چوون لە ئالەت بیروون
شنەوا و بینا، گۆیا بە بێچوون

دەشـــــنەوێ ئایـــا بەعیـــد ئـــەر نزیـــک
دەوینـــــێ ئایـــا ڕۆشـــــن یـــا تاریـــک

خودسەر: سەربەخۆ، گوێ بەکەس‌نەدەر. کوانێ: لـە کوێیـە. تـەوێ: دەوێ. ماگـە: مـاوە. بـۆ ئێمەس: بۆ ئێمەیە. کوتیاگە: کوتراوە (پێ‌کوتران ئەوەیە بە ڕۆیشتنی زۆر و مانـدووبوون ژێـر پـێ ئیلتیهاب دەکات و سوور دەبێتەوە یا تلۆقە دەکات و پیاو لە بە گورجی ڕۆیشتن دەکەوێ). چە وو چوون: چییە و چۆنە. بێ‌چوون: بێ‌وێنە.

واتە: پێنجەم لە سیفاتی مەعانی سەمعە، واتە: هێزی بیستن. شەشـەم بەسـەرە، واتـە: هێـزی بینین. حەوتـەم کەلامـە، واتـە: هێـزی وتـار. ئەمانـە هـەموو سـیفەتی سـەربەخۆن و هـی زاتی (واجبالوجـود) ن و، لـە سـیفەتی عـیلم و قـودرەت و ئـیرادە جیـاوازن، واتـە: سـەمع و بەسـەر ناگەڕێنەوە بۆ سەر عیلم بە مەسمووعات و موبسەرات، کـەلامیش ناگەڕێتـەوە بـۆ سـەر قـودرەت بەسەر وتاردا یا بۆ سەر ئیرادە و خواستی حاڵی‌کردنی موکەللەفین وەکوو لە هەندێ لە زانایانـەوە دەگێڕڕێتەوە؛ چونکە گێڕانەوەی ئەم سیفەتانە بۆ سەر ئەوانە دوورە لە زاهیری ئایەتەوە؛ خـودا لـە قورئانا دەفەرموێ: (و هو السمیع البصیر) یا (و هو الخبیر البصیر) یا (و هو السمیع العلـیم): دیـارە زاهیری ئەم ئایەتانە ئەوەیە خوا خاوەنی عیلم و سەمعە، یا خاوەنی عیلم و بەسەرە، ئەگـەر سـەمع و بەسەر عیلم بوونایە تـەنها دەیفـەرموو (عـەلیم) هـیچ ناچارییـەکیش نییـە بـۆ تـەئویل‌کـردنی ئایەتەکان و لادانیان لە مەعنای زاهیریان. شتێکی ئاشکرایە سەمیع یانێ: خاوەن سـەمع، بەسـیر واتە: خاوەن بەسەر. هیچ ناچاریش نین بەسیر و سەمیع لە مەعنای زاهیرییان لادەین.

خۆ ئەگەر دەڵێیت ئەم سیفەتی سەمع و بەسەر و کەلامە پێویستن بە ئەندام وەکوو گوێچکە بۆ بیستن، بیبیلەی چاو بۆ بینین، دەم و زوبان بۆ قسەکردن، لە وەلامدا دەڵێین ئـەو پێویسـتییە بـۆ ئێمەیە بۆ خودا نییە، ئێمە بە خودا ئەڵێین عەلیم، ئەگەرچی عیلمی ئێمە موحتاجی لەش و خوێن و دەماغ و هێزی زانینە؛ دیارە ئەم موحتاجییە بۆ عیلمی ئێمەیە، بۆ عیلمی خودا نییە. بەڵـێ لـەم شوێنەدا، واتە لە باسی سیفەتی سەمع و بەسەر و کەلامدا هەر دەلیلی سەمعی بـەکاردێ، چونکـە دەلیلی عەقڵی وەک زەلامێک وایە کە پێی کـوتراو و مانـدوو بووبـێ، واتـە لێـرەدا بـەکار نایـەت. پوختەی قسە: سیفەتەکانی خودای گەورە هەر لە ناودا وەکـوو سـیفەتەکانی ئێمـەن، بـۆ نموونـە دەوترێ عیلمی خودا، عیلمی ئینسان، یا زیندوویەتیی خودا، زیندوویەتیی ئینسان... تاد، ئیتر لـە ناوەڕۆک و ڕاستی‌دا زۆر لە یەک جیان؛ واتە: سیفەتەکانی خودای گەورە وەک سیفەتەکانی ئێمـە

پێویستییان بە ئەندام نییە. سیفەتەکانی خودا لە (چییە) و (چۆنە) و پێویستی بە ئەندام دوورن؛ زاتی خودای گەورە شنەوا و بینا و گۆیا و خاوەن وتەیە و بێوێنەیە، لە دوورەوە وەکوو لە نزیکەوە دەبیسێ، لە رووناکیدا وەک لە تاریکیدا دەبینێ.

شایانی باسە سیفەتی بیستن و بینینی خودای گەورە لە پێش بوونی حەوادیسدا تەعەللوق نابەستێ پێیانەوە، بەڵکو پاش پەیدابوونی پەیدابووەکان سیفەتی بیستن پێوەندی دەبەستێ لەگەڵ بیسراوەکە و سیفەتی بینین پێوەندی دەبەستێ لەگەڵ بینراوەکەدا.

تەعەللوق دەگرێ، (کما اشتهر)
سەمعی بە مەسمووع، بەسەر بە موبسەر
لاکین سنووسی (علیه الرحمه)
وەها دەفەرمووت، لێت نەبێ زەحمە،
سەمع و بەسەری زاتی (علّیه)
وەک سەمع و بەسەر مەخلووقات نییە
هەر خاسّ وێ وە دەرک بەعزێ مەوجوودات
وەک بۆ بەسەر لەون، بۆ سەمع ئەسوات
سەمع و بەسەری خالیقی مەعبوود
تەعەللوق دەگرن (بِکلِّ موجود)
ئەر دەنگ ئەگەر رەنگ، ئەر سیفەت ئەر زات
واجب و قەدیم یا خۆ حادیسات
(فی الأزل) جەناب زاتی پاکی حەی
بەو زات و سیفات وجوودییەی خۆی
(فی ما لایزال) بۆ زات و سیفات
وجوودییەی گشت فیرقەی کائینات
بە بێئیرتیاب شنەوا و بیناس
بڕیاوە کەلام سنووسی، بیناس

(بنـــــاء علـــــى مـــــا قَـــــد قَـــــرَّره)

موبســەری مــەسمووع، مــەسمووع موبســەره

(والحاصـــــل يعنـــــى يســـــمع بالبَصـــــر

يبصـــــر بالســـــمع فاســـــمع تبصَّـــــر)

شنەوا: ئەوەی ئەبیسێ. بینا: ئەوەی ئەبینێ، بیناس: بینایە، ئەبینێ. بڕیاوە: بڕاوە، تـەواو بـوو. بیناس: بیناسە، بیزانە.

واتە: بەڵێ بیری شێخی سنووسی (ر.خ) ئەوەیە کە سەمع و بەسەری زاتی خودا وەکوو سـەمع و بەسەری مومکینات نییە کە بە چاو هەست بە ڕەنگ و، بە گوێ هەست بە دەنگ بکـات؛ بەڵـکو سەمع و بەسەری ئافریدگاری پەرستراو پێوەندی دەبەستێ بە هەموو بوویێکەوە لە دەنگ و ڕەنگ و سیفات و زات، واجب، یا مومکین، قەدیم یا حادیس، واتە: هەر لە ئەزەلەوە زاتی (واجبالوجـود) بەو زات و سیفاتە وجوودییەی خۆیـەوە بـێگومـان شـنەوا و بینایـە بـۆ هـەموو جـۆر و ئـەفرادی کائینات. جا لەسەر فەرموودەی سنووسی دەبێ بینراوەکانی خودا بیسـراو بـن و بیسراوەکانیشـی بینراو بن، واتە: بە هێزی بیستن، بینین و بە هێزی بینین، بیستنی سابت بێت.

بەڵێ ئەم فەرموودەی سنووسـییە لەسـەر بناخـەی (ئیمکـانی زاتی) ڕاسـتە و دەبێتـە وێنـەی فەرموودەکەی شێخی ئەشعەری، کە دروسـتە کـوێر لـە وڵاتی (چـین)دا مێشـوولەی (ئەسـپانیا) ببینێ، بەڵام ئەگەر لەسەر عادەت و واقیع بڕوا پێویستە بە دەلیـل چ نەقڵـی و چ عەقڵـی چونکـە ئوموری ئیعتیقادی لەسەر ئیمکـان نـاڕوا و بـەس، بەڵـکو پێویسـتە بـە دەلیـل و بەڵـگە لەسـەر وقووعیشی، بۆیە غەیری سنووسی (ر.خ) ڕای لەسەر ڕای ئەو نییە.

(ثُـــــمَّ الكـــــلامُ وَصـــــفٌ أزَلـــــيّ

قـــــائِمٌ بـــــذاتِ رَبِّنَـــــا العَلـــــيّ)

لـــە بـــەر و دوا و تەجـــەززی و عـــەدەد

لە حەرف و لە سەوت پاک و موجەڕڕەد

وەسفێکی نەفسـی و پـاکیزە و قودسـی

مونـــافیی ســـکووت ئافـــەتی نەفســـی

واتە: پاش باسی ئەم شەش سیفەتە بزانە: کەلام سیفەتێکی ئەزەلییە و بە زاتی (واجبالوجـود) ەوە ڕاوەســتاوە، ئـەم سـیفەتە پاکــە و بەرییـە و دوورە لـە پارچەپارچـە بـوون و پـێش کـەوتن و

پاش‌کەوتنی هەندێ بەشی لەسەر هەندێ بەشی تری، چونکە جوزئی نییە هەتا ئەم وەزعانەی بەسەردا بێت و دووره لە حەرف و دەنگ، دووره لە ژمارە، بەڵکو وەسفێکی نەفسی و پاک لە خەوشە، دووره لە نیشانەی تازە پەیدابوون، قودسییە و سیفەتی خودایە و مونافییە بۆ بێ‌دەنگیی ئافات و، خەوش و نەخۆشیی نەفسی.

زاناکان فەرموویانە: هەر وەکوو ئینسانی وتووێژ رەوان و ئینسانی لاڵ و بێ‌زمان هەیە، هەروەها لە لایەن هێزی نەفسیشەوە ئینسانی خاوەن هێزی وتار رێکخستن و ئینسانی نەفس‌کوێری بێ‌هێزی لاڵ لە رێکخستنی کەلام لە دڵا هەیە، جا وتووێژ و گفتەبەدەرەوەبووە رێک‌خراوە بەرودوادارەکە ناوی کەلامی لەفزییە و بە تەواوی و بێ‌عەیبی و ئاسایی دەژمێررێ و دژی لاڵیی زاهیرییە کە بە عەیب حسێب ئەکرێت. جا هێزی رێکخستنی وتاری نەفسی (تکلّم)ی نەفسییە و وتارە رێکخراوە نەفسییەکە کەلامی نەفسییە و بە کەماڵ و بێ‌عەیبی مەعنەوی دائەنرێ و دژی بێ‌هێزییە لەسەر رێکخستنی وتاری نەفسی کە کەم‌وکوورییە و بە لاڵیی نەفسی دەژمێررێت.

ئەگەر ئینسان کەمێ وردبێتەوە تێدەگات کە ئینسانی عادەتی گەلێک هێزی هەیە کە هەریەکێ لەو هێزانە لە هێزەکەی تر جیاوازە؛ بۆ وێنە هێزی رۆیشتن بە ڕێگادا جیایە لە هێزی دەست وەشاندن، هێزی بیستن جیایە لە هێزی بینین، هێزی ئیملاء جیایە لە هێزی ئینشاء، هێزی قسەکردن جیایە لە هێزی خواردەمەنی هەزم کردن، هێزی بیرکردنەوە بۆ تەگبیر و راوێژکردن لە چارەکردنی ئیشێکی ناهەمواردا جیایە لە هێزی خۆگرتن لە کاتی رق‌هەستاندا، هەروەها هێزی زانست و هێزی خواست و هێزی وتاری نەفسی رێکخستن لە یەک جیاوازن، تەماشا دەکەین گەلێ ئینسانی خاوەن زانست و خاوەن خواست هێزی وتاری نییە، تەنانەت ئەگەر لێی بپرسی بۆچی وتارێکت نییە؟ لە وەلامدا دەڵێت دڵم خالییە و پێم ناکرێ بە زوبان شتێ بڵێم، بەڵام ئەگەر لە راستیدا هێزی نەفسیی ببێ ئەڵێت: بە خودا شتی زۆرم لە دڵایە و ئەیشتوانم قسە بکەم، بەڵام شوێن و کاتی قسە نییە.

ئەگەر ئینسان لەم رێبازەوە بڕوات تێ‌دەگات کە هێزی (تکلم)ی نەفسی و کەلامی نەفسی نە سیفەتی زانست و نە هێزی خواست و نە هێزی کردن و نەکردنی کارە، بەڵکو هێزێکی نەفسی تایبەتییە و بە کەماڵ و رەسایی خاوەنەکەی دەژمێررێت.

لەم ڕووەوە بە عەقڵ و لە ڕێگای ئیتیفاقی پێغەمبەرانەوە(د.خ) تێ‌گەیشتین کە زاتی خودای گەورە خاوەنی (تکلم) و (کلام)ی نەفسییە. جا لەبەر ئەوە ئەگەر کەلامی لەفزیش نەبێ و دەستوور ڕەوانە نەکرێ بۆ پێغەمبەران، ناردنی ڕەهبەران بێ‌سوود دەردەچێت و ماوەی دانانی یاسا و پەیڕەو نابێ. پێویستە باوەڕمان ببێ بەوە کە کەلامی لەفزیش هەیە بۆ خودای گەورە (جلّ جلالە).

لە لایەکی تریشەوە چونکە باوەڕ بە پێغەمبەر(د.خ) لەسەر (کلام) واتە قورئان ڕانەوەستاوە، بەڵکو تەنها دەرکەوتنی (معجزە) لێیەوە بەسە بۆ باوەڕپێ‌کردنی، ئەتوانین بە ئایەت و حەدیس ئیستیدلال بکەین لەسەر کەلامی خودا واتە:

لەسەر ئەوە کە خودا سیفەتی (تکلّم) و (کلام)ی هەیە. هەروەها لە نێو ئایین‌داراندا خیلاف نییە لەوەدا کە خودای گەورە (متکلّم) ە، بەڵێ خیلاف لە تەحقیقی کەلامی خودادا هەیە؛ ئایا سیفەتی کەلامی خودا چییە؟ نەفسییە یا لەفزییە، قەدیمە یا حادیسە، ئەم ئیختیلافەیش لەبەر ئەوەیە کە لەم شوێنەدا دوو دەلیل هەن کە نەتیجەکەیان ناکەوێتە یەک:

دەلیلی یەکەم: ئەوەیە کەلامی خودا سیفەتی خودایە، سیفەتی خودایش پێویستە قەدیم بێت؛ کەوابێ کەلامی خودا پێویستە قەدیم بێت.

دەلیلی دووەم: ئەوەیە کەلامی خودا تێکەڵە لە دەنگ و حەرفی ڕیزکراوی یەک لە دوا یەک هاتوو، هەرچیش وابێ ئەبێ حادیس بێت: کەوابێ کەلامی خودا دەبێ حادیس بێت...

لەناو جەماوەری ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا زانا ئەشعەرییەکان لەسەر ئەوەن کە هەردوو دەلیلەکە ڕاستن و ئەنجام و نەتیجەی هەردووکیان ڕاستە، بەڵام هەر یەک لەو دوو دەلیلە ڕێ و شوێنی خۆی هەیە؛ واتە دەلیلی یەکەم و نەتیجەکەی ڕاستە بە ئیعتیباری کەلامی نەفسی کە حەرف و سەوت نییە و قەدیمە، دەلیلی دووەم و نەتیجەکەی ڕاستی بە ئیعتیباری کەلامی لەفزی کە تێکەڵە لە حەرف و دەنگ و حادیسە. بەڵێ لەفزی (کلام) بە ئیشتیراکی لەفزی و بە حەقیقەت بۆ هەردوو مەعناکە بە کاردێت. جا لە هەر شوێنێکدا وەسفی کەلام بکرێ بە قەدیم ئەوە ئەڵێین مەبەست کەلامی نەفسییە، لە هەر شوێنێکیشدا بە جۆرە سیفەتێک وەسف بکرێ کە حودووس بگەیەنێ وەکو نەقش و لەفز و قیرائەت و حیفز و لەبەرکردن و وێنەی ئەمانە، ئەڵێین مەبەست کەلامی لەفزییە.

شایانی باسە لەگەڵ ئەمەیشدا ئەشعەرییەکان ئامۆژگاریی موسوڵمانانیان کردووە کـە چـاودێری ئەدەب بکەن و تەنانەت ناوی کەلامە لەفزییەکـەیش بـە (حـادث) نەبـەن نـەبادا زیهـنی ئینسـان بکەوێتە هەڵەوە و کەلامە نەفسییەکەی بە (حادث) بزانێ.

جا لەبەر ئەوە گەلێ کەس فەرقی کەلامی نەفسی و کەلامی لەفزییان نـەکردووە، یـا کـەلامیان هەر بە کەلامی لەفزی داناوە و دوورکەوتوونەتەوە لە ڕێگە و هەندێ ڕەخنەیان گرتووە. مەولـەوی (ر.خ) ڕەخنەکەیانی نەقڵ کردووە و وەڵامی داونەتەوە، بۆیە فەرموویەتی:

(قیـلَ): ئەگـەر حـەق موتەکـەللیم بـێ
قیـامی حـادیس بـە حـەق لازم تـێ
بـۆچ؟ دەڵـێن کـەلام بـەو مورەککەبـە
لـە حـەرفی حـادیس موتەعاقیبـە
ئـەم ئیتلاقیچـە بـە حەقیقەتـە
پـەس ئـەو لازیمـە راسـە و موسـبەتە
وەر فەقەت مەحموول لەسەر نەفسـییە
ناوێ ئەو مەسمووع لە دەم نەبییە(س)
(کـلام الله) وێ، ئـەمیچ بـە مـەئال
دەکێشـێ ئـەو لای کـافری و زەلال
دەڵـێین بـە سـەمعی ئەمـە ئیسـباتە
وەسـفی تەکـەللوم قـائیم بـە زاتـە
نـەک ئـەو کەلامـە کـەوا مەعرووفـە
مورەککەب لـە جـوزء لـەفز و حرووفـە
قیـامی بـە زات حەققـەوە نییـە
دیتر کـوا مـەحزوور پـێم بڵـێ چییـە؟

لازم تێ: لازم دێ. وەر: وە ئەگەر. وێ: بێ. ئەمیچ: ئەمیش. دیتر: ئیتر.

واتە: بە شێوەی ڕەخنە وتراوە: ئەگەر زاتی (واجبالوجود) بە (متکلم) دابنێین لازم دێ خودای گەورە ببێتە شوێنی حادیس، چونکە ئەو کەلامە کە سیفەتە بۆ خودا لە حەرف و دەنگی یـەک بـە

دوای یەکا هاتوو تێکەڵە، (کلام) یش بە حەقیقەت بە شتی تێکەڵ لە حـەرف و دەنگـی یـەک بـە دوای یەکا هاتوو دەوترێ، ئەوا لازم هات بە راستی کـە زاتی (واجـبالوجـود) مەوسـووف بـێ بـە حادیس و ببێ بە شوێنی حادیس، ئەمەیش بەتاڵە.

وە ئەگەر ئەڵێت: خودا (متکلم)ە و کەلام سیفەتی خودایە بەڵام مەبەس لە کەلامەکە کـەلامی نەفسییە، ئەوە تەوسیفی خودا بە حادیس روو نادات چونکە سیفەتەکەی قەدیمە، بـەڵام ئـەوە روو دەدات کە ئەوەی کە لە دەمی حەزرەتی (رسول الله) وە بیسراوە (کلام الله) نەبێ؛ چونکـە مـادام وتت کەلام کەلامی نەفسی قەدیمە ئیتر کەلامی لەفزی لە مەیدانا نەما، ئەمەیش دەکێشێتەوە بـۆ سەر کوفر و گومڕاهی، چونکە هەموو موسوڵمانان لەسەر ئەوەن کە ئەم کەلامە لەفزییە (کلام الله) یە.

جا ئێمەیش لە وەڵامی ئەم رەخنەدا دەڵێین بە بەڵـگە و دەلیلـی سـەمعی (واتـە: بیسـراو لـە پێغەمبەران ـ د. خ)، هەروەها بە دەلیلی عەقلی، کە پێویستە خودای گـەورە هـەموو سـیفەتێکی کەمالی هەبێت، دەرکەوت کە سیفەتی (تکلـم) قائیمـە بـە زاتی (واجـبالوجـود) ەوە، نـەک ئـەو کەلامە کەوا تێکەڵە لە حەرفە ریزبەستووە یەک لەدوا یەکەکان، تەکەللوم سیفەتێکی قودسـییە و دوورە لە عەیب و پاکە لە حودووس و، حەرف و دەنگ نییە و، لە ئەزەلەوە هـەتا ئەبـەد سـابتە بـۆ خودا.

لـەمیچ ئیـزنی ئـەم لزوومـە نـەدرێ
(کـلام الله) یـی لـێ سـەلب بکـرێ؛
بۆچ؟ بـۆ بـە کـەلام ئیلاهییـە بـوون
شەرت نییە قیام بـە زاتی بـێچـوون
حوججەتت دەوێ ها ئەوە حوججەت
ئیستیعمالی ئەهل گفتوگۆ و لوغەت
هەرکەس دەیزانێ ئەڵبەت دەیفامـێ:
بـە هـەر زوانـێ هەرکـەس کـەلامێ
تەکـەللوم پـێکـا، ئـەو کەلامییـە
ئیزافـەی ئـەباڵ ئـەو حەقیقییـە

بـا وجـوود قیـامی نییـە، بیشـنەو،
نە بە نەفسی ئـەو نـە بـە قـائیم بـەو
بۆچ؟ لەفز و کەلام مەعلومە ئـەوان[٣]
لە مەقوولەی سەوت قائیم بـە هـەوان
هەوایچ هەڵگرە زەریـف بکـە سـەیر
(مـا کـان الهـوی قائمـأ بـالغیر)
بەڵ لە مەقوولەی قیسمی جەوهـەرە،
قائیم بە نەفسـی خـۆی و خودسـەرە
(فـذاک الکـلام بـالهوا قـائم
لـیس قائمـأ بـالمتکلم)
(یضـاف الیـه لحصـوله
بـالتکّم القـائمِ بـهِ)

پیَ کا: پیَ بکات.

واتە: هەر لەوکاتەدا کە سیفەتی (تکلم) بڕیار ئەدەین بۆ خودا، کە سیفەتێکی بەسیت و قەدیمە و مەشهوورە بە کەلامی نەفسی، ناڵێین کەلامە لەفزییەکـە کـەلامی خـودا نییـە، بەڵـکو هـەر بـە کەلامی خودای ئەزانین، بۆچی؟ چونکە بۆ بوونی کەلامێ بە کەلامی خودا مەرج نییـە و پێویسـت ناکا ئەو کەلامە بە زاتی (واجبالوجود) ەوە راوەستابێت؛ ئەگەر لەسەر راستیی قسـەکەم بەڵـگەت دەوێ، بەڵگە ئەوەیە هەموو تێگەیشتوویەک ئەزانێ هەرکەس قسەیەک بکات، بە هەر زمانـێ بـێ، ئەو قسە و کەلامە بە حەقیقەت دەدرێتە پاڵی قسەکەرەکە و ئەڵـێن ئـەو قسـە و کەلامـە، قسـە و کەلامی ئەوە، کەچی ئەو کەلامیشە نە سیفەتێکی نەفسییە کە قائیم بێ بە نەفسی کـابراوە، وە نـە قائیمە بە شتێکەوە کە قائیم بێ بە نەفسەوە بەڵکو ئـەو قسـە و کەلامـە لـە بابـەتی دەنگـن و بـە هەواوە راوەستاون، ئەو هەوایە کە هـاتوچـۆ دەکـات بـە دەم و قـوڕگ و گـەرووی قسـەکەرەوە، شتێکی دیارییە ئەو هەوایشە خـۆی لـە قیسـمی جەوهـەرە و جیسـمێکی لەتیفـە و بـە خۆیـەوە راوەستاوە. وا بە ئاشکرا دەرکەوت ئەو کەلامـە کـە لـە بابـەتی دەنگـە بـە هـەواوە پێوەنـدە و بـە قسەکەرەکەوە قائیم نییە، جا ئەگەر ئەڵێیت ئەی بۆچی دەدرێتە پاڵ ئەو کەسە؟

ئەڵێم لەبەر ئەوە دەدرێتە پاڵی و دەوترێ کەلامی ئەوە چونکە ئەو کەلامی قائیم بە هەوایـە بـە (تکلم)ی کابرا پەیدا بووە، ئەو (تکلم) ەی کە سیفەتیەتی و بە نەفسی ئەوەوە قائیمە.

کەلامیچ دەگـەڵ وەسـفی تەکـەللوم
فەرقیان هەیە، لـە کـەس نییـە گـوم
تەکـەللوم تـەئلیف، ئـەو موئەللەفـە
موئەللەف مەنزووم دەوێ بەو وەسـفە
(فظهَـــرَ الفـــرق، فکـــذا الکـــلام
فـــی حـــق الله خـــالق الانـــام)
(لکـــن فـــرقٌ مّـــا لســـتَ بـــاللاّهی
بـــینَ مـــا بِنـــا و مـــا بـــالله)
(مـا بِنـا) بینـای ئـالی و مودەننـەس
(و مـــا بـــالله) پـــاک و موقـــەددەس

واتە: ئەگەر ئەپرسیت کـە فـەرقی ئـەم کەلامـە لەگـەڵ تەکەللومەکـەدا چییـە؟ پێـت ئەڵـێم فەرقەکەیان ئەوەندە ئاشکرایە لە کەس ون نابێ؛ چونکە (تکلم) واتە تەئلیف و ئیبداعی ئەو کەلامە موئەللەفەیە و ئەو کەلامە موئەللەفە بە هۆی سیفەتی (تکلـم) ەوە پێـک دێ، ئـەوا سـەبارەت بـە کەلامی ئێمە جیاوازی لـە نێـوان تەکـەللوم و کەلامانـدا دەرکـەوت، جیـاوازیی نێـوان کـەلام و تەکەللومی خودایش هەر بەم جۆرەیە، واتە: تەکـەللووم بـە سـیفەتە نەفسـییەکەی دەوتـرێ کـە مەنشەئە بۆ کەلام و کەلامی خودای گەورە لەو (تکلم) ەوە پەیدا ئـەبێت. بەڵـێ فـەرق هەیـە لـە بەینی کەلامی ئێمە و کەلامی خودای گەورەدا. کەلامی ئێمە پێویسـتی بـە ئالەتـە وەکـوو دەم و زوبان و بە هۆی تێکەڵی لەگەڵ گوناهـ و کردەوەی ناپەسەندا پیس بـووە، بـەڵام کـەلامی خـوای گەورە (جـلّ جلالـە) پاکـە لـە پێویسـتیی بـە ئالـەت و دەم و زوبـان و موقەددەسـە لـە عـەیب، هەڵدەگرێ قەدیم بێ و قائیم بە زاتی باری بە نەوعێ کە هەر خودا خۆی ئەیزانێ و بۆ ئێمە دەرک ناکرێ؛ ئێمە کە تەسەووری ئەلفاز ئەکەین بە شێوەی بەرودوا تەماشای ئەکەین، ئەمەیش دەبێتـە هۆی حدووس، هەڵیش‌دەگرێ کەلامە لەفزییەکە حادیس بێ بە (رقوم) لە (لوح المحفوظ)دا و بـە (لفظ) لەسەر زبانی جیبرائیل کە هێناویە بۆ حەزرەت(د.خ) وەک لەمەودوا، ئەگەر خودا مەیلی لێ بێ، باسی ئەکەین.

جا لەبەر ئەوەی هەندێ کەس رەخنە دەگرن و دەڵێن: چۆن ئەبێ فەرقی ئەلفازی ئێمە و ئەلفازی کەلامی خودا هەبێ لە لەفزایەتی‌دا؛ نەخەیر، فەرق نییە لە بەینی لەفزی ئێمە و ئەودا، لەفز هەر لەفزە لە هەر شوێنێکدا بێت، بینای لەسەر حەرف بە شوێنی حەرفا هاتنە کە شیعاری حودووسە، ئیتر لەفزی ئالی و غەیرە ئالی فەرقی چییە؟ لە وەڵامی ئەم رەخنەدا مەولەوی دەفەرموێ:

بـــوونی ئـــەلفازیچ قســـە بکـــەم بـــۆت
بـــەو تـــەرزە کـــەوا دەیێـــت و دەڕۆت
لەبـــەر ئەمەتـــە تێریتیـــە وجـــوود
لـــە هـــەوادا خـــەلق خـــالیقی مـــەعبوود
هەوایچ بەو دەســتوور لــە هــیچ مــەکانێ
قـــەراری نییـــە زۆرتـــر لـــە ئانـــێ
نـــەک لەبـــەر بـــوونی ئـــەلفازە (بالـــذات)
غـــەیرە موســـتەقیر وەهـــا بـــێ‌ســـەبات
ئـــەلفاز ئـــەر (بالـــذات) وەهـــا بوویایـــە
دەشـــیا شەخســـی دوور نەیشـــنەویایە
حوکمیچ بە میسلی مەسمووع بڵێم پێت
ئینســـاف ئەمەتـــە نامەسمووعـــە لێـــت
بـــێ‌دەلیـــل خـــیلاف زاهـــیر بـــە مەســـیر
نـــــاوێ، دەلیلـــــیچ ناکەوێتـــــە گـــــیر

دەیێت و دەڕۆت: دێت و دەڕوات. نەیشنەویایە: نەی‌بیستایە. ناکەوێتە گیر: دەست ناکەوێ. تێریتە: دەهێنێتە.

واتە: ئەی رەخنەگیر! ئاگادار بە لەوانەیە فەرق لەبەینی لەفزی ئێمە و لەفزی زاتی خودادا ببێ، ئەو بە بێ‌بەرودوا قائیم بێ بە زاتی خوای گەورەوە؛ چونکە بوون و دەرکەوتنی لەفز بەوجۆرە کە دێت و دەڕوات، حەرف لە دوای حەرف و تاک لە پاش تاک، لەبەر ئەوەیە کە خودای گەورە ئەم لەفزانە لە هەوادا دروست دەکات، هەوایش بە هیچ جۆرێ لە ئانێ زیاتر ئارام ناگرێت، کەوابێ حەرفەکانیش لەگەڵ ئەو هەوادا دەڕۆن، ئیتر لەبەر ئەوە نییە کە لەفز خۆی لە خۆیا ئارامیی

هەڵناگرێت و مانەوەی مومکین نابێ؛ چونکە لەفز ئەگەر خۆبەخۆ ئارام نەبوایە دەبوا ئینسانێکی دوور لە قسەکەر ئەو لەفزانەی نەبیستایە؛ دیارە چونکە شتی نائارام بڵاو دەبێتەوە و کوتوپڕ لە ناودەچێت، کەچی لە دووریشەوە دەبیسرێ!

خۆ ئەگەر تۆ بڵێیت: بەڵکو لەفز هەر نائارام بێ و، ئەوەی کە یەکێ لە دوورەوە دەیبیسێ ئەو لەفزە نەبێ کە لە دەمی قسەکەرەوە دەردەچێت، بەڵکو وێنەی ئەو لەفز بێت، ئەڵێم حوکمدان بەوەی کە بیسراوی تۆ لەفزی قسەکەر نییە بەڵکو وێنەکەیەتی، لێت قبووڵ ناکرێت و بە بێدەلیل دەعوای وەها ناڕواتە سەر، دیارە دەلیلیش نییە.

ئەمجار ئیجادی ئەلفاز و حورووف
بە قودرەتی حەق خالقی رەئووف
بەو تەرزە وتمان ئیحتیمال هەیە
بڵێین: حیکمەت و سیڕی ئەمەیە
(کَی لا تَختَلِط فَتَعَسَّرا
فهمنا لها، بَل تَعَذَّرا)
تەفسیلی کەلام[٤] ئەر لەگرە کەم بێ
راوێس حەواڵەی ئەسلی سێیەم بێ

کَی لا تَختَلطْ: کَی لا تَختَلطَ، زەنەکەی لەبەر وەزنی شیعرە. فتعسَّرا: فتتعسّرا. تعذّرا: تتعذّر. راوێس: راوەستە.

واتە: جا ئەگەر ئەڵێیت سیڕ و هۆی ئەوە چییە کە خودا لەفزی بە جۆرێ دروست کردووە راوەستابێ بە هەواوە و بەرودوا بێت و بڕوا؟ ئەڵێم سیڕ و هۆی ئەمە ئەوەتە تا حەرفەکان لە کاتی قسەکردندا تێکەڵی یەک نەبن و ئینسان بە ئاسانی لێیان حاڵی ببێت. بێگومان ئەگەر تێکەڵ بوونایە زەحمەت ئەبوو ئینسان لێیان حاڵی ببێ، بەڵکو هەر لە تواناڈا نەدەبوو؛ تەماشاکە تەنانەت یەکێ بە پەلە قسە بکات کەس لە قسەکەی ناگات.

پوختەی قسە: ئەلفاز لە زات و ماهییەتی خۆیدا ئارامگرتن و ئیستیقرار لازمی زاتی نییە، واتە لەوانەیە لەفز و کەلامی خودا بە شێوەی کۆمەڵ لای ئەو بێ، بەڵام بەرودوایی لە کەلامی ئێمەدا لەبەر شوێنەکەیەتی کە هەوایە، کاکڵی ئەمەیش ئەوەیە تا ئەوانەی وتار ئەبیسن لێی تێ بگەن، ئیتر وامەزانە کە ئارام نەگرتن (عدم استقرار) لازمی زاتی لەفزەکەیە و قابیل نییە بە شێوەی کۆ

گردببێتەوە لای زاتی خودا؛ خۆ ئەمانە لە شێوەی بە کۆمەڵی کائیناتی جیاجیا زیاتر نین، کە لە عیلمی یەکێکدا بە جارێ حازر ئەبن بەبێ ئەوەی شتێ لەو کۆمەڵە کەم بکرێتەوە یا لە زیهنی زاناکەدا مەیدانێ زیاد بکرێت.

مەولەوی (ر.خ) ئەڵێت ئەگەر ئەم بەیانە بە کەم و کوور دێتە بەرچاوت چاوەڕوان بە (ان شاء الله) لە باسی ئەسلی سێهەمدا بە درێژی باسی ئەکەین.

پوختەی فەرموودەی (مەولەوی) لەم باسەدا ئەمەیە: هەموو ئەهلی دین لەسەر ئەوەن کە خودای گەورە (متکلم) ە، دیارە (المتکلم من قام به التکلم) بەڵام زانایان لێرەدا گەلێ بیروباوەڕی جیاوازیان هەیە:

ئەشعەرییەکان لایان وایە کە خودای گەورە سیفەتی کەلامی نەفسیی قەدیمی هەیە کە لە رەگەزی حەرف و دەنگ نییە، هەروەها کەلامی لەفزیشی هەیە و، لەفزی (کلام) بە هەردووکیان دەوترێ، بەم جۆرە ئەڵێن (المتکلم من قامَ به التکلم)، تەکەللومیش سیفەتێکی ئەزەلی و قەدیم و بەسیتە و بەشبەش نییە و سەرچاوەی کەلامە و، ئەو کەلامەیش با قائیم نەبێ بە زاتی خواوە بە حەقیقەت هەر کەلامی خوایە؛ چونکە لە سیفەتی تەکەللومی خواوە پەیدا بووە. فەرق لەبەینی سیفەتی تەکەللوم و کەلامدا ئەوەیە کە تەکەللوم مەبدەء و سەرچاوەیە و کەلام لەو تەکەللومەوە پەیدا بووە، ئیتر حەقیقەتی کەلامەکە خودا خۆی ئەیزانێ، ئەگونجێ قائیم بێ بە زاتی خواوە بە جۆرێ کە خۆی ئەیزانێ، چونکە بەشبەشی و یەکلەدوای‌یەک هاتن بۆ کەلامی لەفزیی ئێمەیە، نەک بۆ کەلامی خودای گەورە.

تەماشاکەن ژیانی ئێمە بە لەش و مەزاجە، ژیانی خوا وا نییە. زانینی ئێمە بە هێزی نەفسی ناتیقەیە، زانینی خودا وا نییە. قودرەتی ئێمە بە تەکان و هاتوچۆ دەردەکەوێ و قودرەتی خودا وا نییە... واتە: با کەلامی ئێمە بە لەفزە یەکلەدوایەکە بەشبەشەکان بێت و کەلامی خودا وا نەبێ، هەروەها ئەیشگونجێ ئەو کەلامەی لە (تکلم) ەوە پەیدا بووە حادیس بێ بە نەقش لە سەر (لوح المحفوظ) و بە ئەلفازی وەرگێراو بۆ حەزرەتی جیبرائیل(د.خ)، وە مادام کەلامی خودا لە تەکەللومی خوداوە پەیدا بووە و پێوەندیی بە غەیری خوداوە نییە هیچ خاوەن عەقڵ و هۆشێک ناتوانێ بڵێت کەلامی خودا نییە. ئەوەی حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) بە هۆی جیبرائیلەوە وەری‌گرتووە و موسڵمانان لەویان وەرگرتووە تا ئێستا و هەتاهەتایە کەلامی خودایە و، هیچ

فەرقیان نییە، مەگەر وەک فەرقی (زید) لە بەغدا بێ یا لە باکووری بەغدا، دیارە بە جێگە و شـوێن یەکێک نابێتە چەند یەکێک. ئەمە بیروباوەڕی زانا ئەشعەرییەکانە ڕەحمەتی خودایان لێ بێت.

زانای پایەبەرز مەلا جەلالی دەووانی لە شەرحی کتێبی (العقائد العضـدیة)دا دەفـەرموێ: وەک ئەشعەرییەکان فەرموویانە (تکلم) سیفەتی زاتی خودای گەورەیـە و بەسـیتە و قەدیمـە، کـەلامی نەفسیی خودایش عیبارەتە لەو ئایەتە کە لە عیلمی ئەزەلیی خودای گەورەدا هەیە، ئـەو کەلیماتـە کە خودای گەورە عالمە پێیـان، لـە وجـوودی عیلمـی خـودادا بـەرودوایان نییـە هـەتا حـدووس ڕوویدات، ئەم کەلامە نەفسییە بەم مەعنا ئەزەلییە و وجوودی عیلمیی لازمی زاتی خودایە.

هەروەها خودای گەورە هەر لە ئەزەلەوە تا ئەبەد بە قسە و گفتوگۆی هەموو قسەکەرێک و بـە هۆنراوە و پەخشانی هەموو خاوەن هۆنراوە و پەخشانێ دەزانێ، بەڵام لە وجوودی زانـینی خـودادا بەرودوا و تەرتیب نییە وەک وجوودی خارجیی ئەو لەفزانـە، هـەروەها فـەرقی کـەلامی نەفسـیی خودای گەورە لەگەڵ کەلامی خەلکدا ئەوەیـە کـە کـەلامی نەفسـیی خـودا بـە هـۆی سـیفەتی تەکەللومی خۆیەوە مەوجوودە لە عیلمی خۆیدا، بەلام کەلامی خەلک لە تەکەللومی خوداوە پەیدا نەبووە، بەلکو لە کەسب و بیرکردنەوەی خاوەن کەلامەکە و بە خەلق و ئیجـادی خـودا، ئیتـر لـە وجوودی عیلمیدا هەموو وەک یەک حازرن، بەرودوا لەو لەفزانەدا هەیـە کـە خـودای گـەورە بـە ئیلقای ڕۆحی بە جیبرائیلی گەیاندوە(د.خ) بەبێ ئەوەی جیبرائیل دەسـتی تیایـا هـەبێ، ئـەویش چۆنی وەرگرتووە بە ئیلقای ڕۆحی لە زاتی (واجب‌الوجود) ەوە هێناویەتی بۆ فەخری عالەم(د.خ) و خوێندوویەتیەوە بە سەریا، ئەویش بە دڵ وەریگرتوەو بە زمان خوێندوویەتیـەوە و بـە سـوورەتی عیلمی ڕاگیری کردوون.

ئەم فەرموودەی مەلا جەلالە لەگەڵ فەرموودەی ئەشعەرییەکانی تردا فەرقی ئەوەیە ئەم ئەڵێت ئەو کەلامە نەفسییە کە بە هۆی سیفەتی تەکەللومەوە لە عیلمی خـوادا مورەتتـەب بـووە هـەموو ئەزەلییە، وە باش دانی بە قەدیمیی ئەم لەفز و کەلیمە مورەتتەبە عیلمییانەدا ناوە بـە جـۆرێ کـە شایانی زاتی خودا بێ.

بێگومان ئەم قسەیە زۆر جوانە و وەک ئەوە نییە کـە سـەعدی تـەفتازانی (ر.خ) دەفـەرموێت: ئێمە ناتوانین تەسەووری ئەلفازی مورەتتەب بکەین لەگەڵ قیامی بە زاتی خـوداوە، چونکـە مـەلا جەلال ئەوجۆرە تەرەتتوبە ناگرێت لەگەڵ تەعاقوبدا بێت وەکو لە خاریجدا، کە ببێتە هۆی نـەمانی

حەرفی پێشوو و هاتنی حەرفی دوایی، بەڵکو تەرەتتوبی عیلمیی غەیرە موتـەعاقیب ئـەگرێت بـە جۆرێ شایانی زاتی خودای گەورە بێت.

ئەگەر ئینسان کەمێ بیربکاتەوە ئەتوانێ قسەی ئەشعەرییەکانیش لەگەڵ قسەی مـەلا جـەلالی دەووانیدا یەک بخات، چونکە بێگومان خودا عیلمی هەیە بە هەموو کەلیمەکان؛ بلاو بن یا کۆ بن و تەئلیفی هەرکەس بن، هەروەها عیلمی هەیە بە کەلامی خۆیشـی، ئـەم عیلمـەیش بـە شـێوەی واقیعی ئەبێ موافیقی ئەو وەزعە بێ کە لە خاریجدا ئـەو حـەرف و موفرەداتـە لەسـەرینی وەکـوو پێشکەوتنی (قل هو الله احد) لەسەر (الله الصمد) بـەلام ئـەم تەرتیبـە عیلمییـە وەکـوو تـەرتیبی خاریجی نییە تا حەرفێ نەڕوات حەرفێکی تر نەیێت، هەروەها بەم شێوە ئەتوانی بڵـێیت کـەلامی نەفسی لەگەڵ سیفەتی تەکەللومدایە، ئەو مەنشەئە و ئەم ناشـیئە، ئـەم کەلامـە نەفسـییە جوملـە جوملە، ئایەت ئایەت، سوورەت سوورەت مورەتتەبە و حـازرە لـە عیلمـی خـودادا بـە شـێوەیەکی شایانی زاتی خودای گەورە و، ئەزەلییە لە وجوودی خاریجدا ئەبێتە ئەم لەفزانە کە بەرودوان.

***

١ـ ئەم سەرباسەیش لە نوسخە دەستنووسەکەدا نییە.

٢ـ لە چاپەکەدا (بیزان)ە.

٣ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا بە فارسی نووسراوە: ئەم وشەیە دەشێ (ئەوان) بێت یا (ئاوان) واتە ئاوەهان.

٤ـ لە دەستنووسەکەدا لە پاڵ ئەم (کلام) ەدا نووسراوە: «فیه لطافة» واتە: قسە یا عیلمی (کلام).

## مبحث البقاء والتكوين[١]

ئەشـعەری فـەرمووی: بـەقا هەشـتەمین
شێخ ئەبومەنسوور دەفـەرمووت: تـەکوین
تـەکوین لـە لای ئـەم، بـەقا لـە لای ئـەو
وەسـفی وجـوودین ئـەمما تـۆ مەشـنەو
حـەق واتـە: بـەقا لـە سـەلبییاتە
تـەکوین لـە جوملـەی ئیزافییاتـە
ئیـزافی بـۆ تـۆ کریاگـە تـەقریر
وادەی سـەلبییە بێرینـە تـەحریر
سـیفاتی سـەلبی نایەتـە دەفتـەر
(ککـون الله لـيس بجـوهر)
لاکـین تـۆ زەریـف بـێ ئـەم پەنجانـە
هـەر پـەنج بزانـە ئەسڵـی گشـتیانە
یـەکێ قیدەمـە، دووەم بەقایـە
قیـدەم سـەلبی سـەبق عـەدەم مەعنایـە
بـەقا یانـێ سـەلب لحـووقی عـەدەم
وەک ئـەزەلیی ئـەو، وەک ئەبـەدیی ئـەم
دەزانی کامـە سـیفەتی سـێیەم؟
خـۆی بـە مانـاوە بـەیانی بکـەم

(المخالفـــــــــة للحوادثــــــــــات)
سەلبی هاومیسلی دەگەڵ مـەخلووقات[۲]
(قیـــام بنفسِـــه) وەســـفی چـــارەمین
ســـەلبی ئیحتیـــاج مانایـــە یـــەقین
موفتـــــەقیر نییـــــە (ربّ الکائنـــات)
نـە بـە مەحـەللات، نـە موخەسسیسـات
پەنجـــەم خـــۆی مانـــای وەحدانییەتـــە
ســـەلبی تەعـــەددود، نـــەفیی کەســـرەتە
لـــە زات، لـــە ســـیفات، لـــە ئەفعالـــەدا
لـــە هـــەموو شـــەئن و هـــەموو حالـــەدا

دەفەرمووت: دەفەرموێت. مەشنەو: مەبیسە. کریاگە: کریـاوە، کـراوە. بێرینـە: بێنینـە. مانـا: مەعنا، واتا.

واتە: دوو ئیمامی ئەهلی سوننەت و جەماعـەت، لەگـەڵ حـەوت سـیفاتی مـەعانیی پێشـوودا، هەریەکی سیفەتێکی هەشتەمیان زیادکردووە: شێخ (ابوالحسن)ی ئەشـعەری (ر.خ) فەرموویـەتی بەقاء سیفەتی هەشتەمە، واتە: مانەوەی هەتاهەتایی بێ‌نەبوون. شێخ (ابو منسور)ی (ماتریدی) ش دەفەرموێت: تەکوین سیفەتی هەشتەمە کە واتای دروست‌کردن و داهێنانی حەوادیسە هەرکام لە کاتی خۆیا. ئەم دوو ئیمامە هەریەکێ لەوان ئەو سیفەتەی زیادی کردو وە بە سیفەتی وجـوودی و سابتی دائەنێت بۆ زاتی (واجبالوجود).

بەڵام زۆرتری ئەهلی سوننەت و جەماعەت هیچ کام لەم دوو سیفەتانەیان بە سیفەتی وجوودی دانەناوە و وتوویانە سیفەتی بەقاء لە سیفەتە سەلبییەکانە واتە: (عدم الفناء) و، تەکوین لە سـیفەتە ئیزافییەکانە؛ دیارە لەمەوپێش باسی سیفەتی ئیزافی کرا کە بریتییە لە پێوەندیی توانـای خـودای گەورە بە مەقدوورەکانەوە لە کاتی دروست‌کردن و داهێنانیاندا، واتە: ئەوەی ئیمامی ماتوریدی بـە سیفەتی وجوودی داناوە هەر پێوەندیی توانای (واجبالوجود)ە بـە مەقدوورەکانـەوە و سـیفەتێکی سەربەخۆ نییە.

شایانی وتنە سیفەتە سەلبییەکانی خودای گەورە، وەکوو (الواجب تعـالی لـیس بجـوهر، لـیس بجسم، لیس بعرض، لا فی مکان، لا فی زمان... الخ) ئەوەندە زۆرن نایێنە دەفتەر، بەڵام پاش لـێ

وردبوونەوە هـەموو دەگەڕێنـەوە سـەر پێـنج سـیفەت و، ئـەم پێنجـە بناخـەی هـەموو سـیفەتە سەلبییەکانن:

یەکەمیان: (قِدم) ە، ئەڵێن: خودا قەدیمە، واتە: نەبوونی لێ پێش نەکەوتووە و ئەزەلییە.

دووەم: (بەقاء) ە، باوەڕمان وایە کە خودا دەمێنێ و نەبوونی بەسەردا نایەت و ئەبەدییە.

سێهەم: (المخالفة للحوادث) ە، واتە خودا هاووێنـەی غـەیری خـۆی نییـە و لـە هـەموو پەیـدا بووەکان جیاوازە «لیس کمثله شیء».

چوارەم: (القیام بنفسه) یە، واتە خودا پێویستی و ئیحتیاجی بە هـیچ کـەس و بـە هـیچ شـتێ نییە، پێویستی بە شوێن نییە کە تیا دامەزرێت، پێویستی بە (مخصّص)ی خاریجی نییە بۆ ئـەوەی تەسەرڕوف بکات (یفعل ما یشاء و یحکم ما یرید).

پێنجەم: وەحدانییەتە، واتە: خودا هەرگیز (متعدد) نییە، زۆر نییـە، خـودا یـەک زاتـە، هاوتـا و هاوبەشی نییە، تەنیایە لە زاتدا خودایەکی تر نییە لەگەڵیا.

«وحده لا شریک له»، تەنیایە لە سیفەتەکانیا، واتـە: ئـەو سـیفەتانە ئـەو هەیـەتی کەسـی تـر نییەتی، تەنیایە لە کاردا، واتە: ئەو کارانەی ئەو دەیانکات کەس لەگەڵیا نییە و کەس ناتوانـێ ئـەو کارانە لە نەبوونەوە دەرکات بۆ بوون. «الله خالق کل شیء و هو علی کلّ شیء وکیل».

***

١ـ ئەم سەرباسەیش هەر تەنها لە چاپەکەدا هەیە.

٢ـ لە دەستنووسـەکەدا هەندی نیشـارەکاری کـراوە واتاکـەی ئەوەتـە: سـیفەتی سـێهەم: «المخالفـە...»یـە و مەعناکەی «سەلبی...»یە. شتەکە ئاشکرایە، تەنها مەبەستم دەرخستنی رەنجی پێشینان بوو.

## مبحث الاسماء [1]

ئـــەسمای (خـــالق الارض والفلـــک)
ئەرچی مەشـهوورن بـە هـەزار و یـەک،
بە شەرعیچ یەکێ کەم سەد مـەزکوورن،
لاکین وەک سیفات غـەیرە مەحسـوورن
بـۆچ؟ ئـەر ئەسمایـە، ئەگـەر سـیفاتە
مەنشـــەئی هـــەموو هـــەر کەمالاتـــە
خـــۆ کـــەمالاتی خـــالیقی ئەکبـــەر
غەیرە مەحسوورە و لـە غایـەت ئـەودەر
نایگەتێ هـەرگیز، ئـەمرێکی مـەحاڵ[2]،
بە پەیجـەی بورهـان سـوللەمی خـەیاڵ
هەر ئیسمێ کـە شـەرع ئیـزنی نـەداوێ
ئیتلاقـــی وەســـەر خـــودادا نـــاوێ
ئـەم قەولـە موختـار، یـەکجار زەریفـە
پـەس بینـای ئـەسما لەسـەر تەوقیفـە؛
ئیـــتلاق بـــە عەقڵـــی کـــێ دەیتوانـــێ
هـەر (خاسـە)ی شـەرعە ئـەدەب بزانـێ

ئەسما: ئەسماء.

واتە: ناوە پیرۆزەکانی زاتی خودای ئافەرینندەی ئەرز و ئاسمان ئەگەرچی بە هەزار و یەک نـاو مەشهوورن لە ناو موسوڵمانانندا و، لە قورئان و حەدیسدا بە نەوەدونۆ دیاری کراون، لە راسـتیدا لـە ژمارە نایەن وەک سیفەتەکانی خودا؛ چونکە ئەگـەر نـاوە و ئەگـەر سـیفەتە بناخـەی هـەموویان بڕیاری گەورەیی و بێخەوشیی زاتی خودایە، دیارە ئەم گـەورەیی و بـێخەوشـییەیش لـە ژمـارە نایەت ئەوەندە زۆرە، هەرگیز بە پەیژەی دەلیل و خەیاڵ پێی ناگەیت، بەڵام پێویسـتە بـزانن هـەر ناوێ کە شەرع ـ قورئان و حەدیس ـ ڕێگای نەدابێ بۆ خودای گەورە بەکار ناهێنرێـت. ئـەم قسـە هەڵبژاردە و راستە، کەوابوو بناخەی بەکارهێنانی ناو بۆ خودای گەورە (توقیف) ە، واتە ڕێگادان لە لایەن قورئان و حەدیسەوە، ئیتر کەس ناتوانێ بە ڕەهنومایی عەقڵ و هۆشی خۆی ناوێ بـۆ خـودا دابنێ و بەکار بهێنێ؛ چونکە هێزی عەقڵ ناگاتە پایەیـەک کـە ئـەدەب لەگـەڵ مـەقامی خـودای گەورەدا بە کار بێنێت، هەر شەرع دەگاتە ئەم پایە. (سبح اسم ربّک الأعلی * الذی خَلَقَ فَسـوّی * والذی قدّر فَهَدی) [٣].

لـە لای بـەعزێکی[٤] ئیـتلاق بـێ تـەوقیف
لـە ڕووی تەسمییـە نـاوێ، نـەک تەوسـیف
لـــە لای بـــەعزێتـــر ئیـــتلاق هـــەر دەوێ
ئەگـــــەر مـــــووهیمی نـــــالائیق نـــــەوێ
میســـــالی مـــــووهیم وەک (عـــــارف) بێـــــرە
هـــــەرگا کـــــە وا وێ جـــــائیز مـــــەدێرە
بـــەعزێتـــریچ هـــەن مەزهـــەبیان وەیـــە
ئیـــــتلاق (مطلقـــــاً) جـــــەوازی هەیـــــە
قـــەولی گشـــتیان ســـاحیب خەلەلـــە
هـــەروا کـــە وتمـــان موختـــار ئەووەلـــە
نیزاعـــــێ لەبـــــەین عولەماندایـــــە
نـــەک لـــە ئیتلاقـــی عەلەماندایـــە[٥]
بـــۆچ؟ هـــەر گرۆهـــێ تەماشـــا دەکـــەی
عەلـــەمێکی هـــەس بـــە لوغـــەتی خـــۆی

وەک لەفزی (الله)، وەک (خودا) و (یەزدان)
سـائیری ئـەعلام بـە بـاقی زوان
عەلـەمی ئیـتلاق عەلـەمی دەربـرد
لـە بوزرگانـدا کـێ ئینکـاری کـرد؟
مـەعلووم بـوو ئەمـە وا ئیجماعییـە
ئیجمـاعیچ بـۆ ئیـزن شـەرعی کافییـە
ئەویچـە کـە شـەرع مـانیعی ئەویـە
یـا خـود خـەیر مـانیع بـۆ مورادیفیـە
وەک ئـەوە کـە خـۆی یـا رەدیفـی ئـەو
چـرای ئیـزنی شـەرع بـۆی داگـە پرتـەو
بـۆ کەسـێ قسـە لەوێـدا چییـە؟
ئەڵـبەتە ئـەویچ جێـی نیـزاع نییـە
بەڵـکو نیزاعیـان لـە ئیسـمێکدایە
ئـەخز لـە وەسـف و فیعـل حـەق تەعالایـە
یـا بـۆ خـۆی یـا بـۆ رەدیفـی بـە شـەرع
واریـد نەبووگـە نـە ئیـزن و نـە مـەنع
هـەرچی کـە زاهـیر پێـی واریـد دەوێ
مـەعنای دەرحـەقی حـەق جـائیز نـەوێ
وەکـو (اسـتوا) و (یـد) و (وجـە) و (عـین)
لـە مـەعنای زاهـیر تـەنزیهی دەکـەین
ئـەمجار یـا تـەفویز دەکـەین وەک سـەلەف
یـا تـەئویل دەکـەین هـەر وەکـو خەلـەف
مەزهـەبی ئـەووەڵ ئەڵـبەت ئەسـلەمە
ئـەمما مەزهـەبی دووەم ئەعلەمـە

دەویَ: دەبیَ. نەویَ: نەبیَ. بێرە: بێنە. داگە: داوە: پڕتەو: تیشک، ڕووناکی. ئـەویچ: ئـەویش. هەرگا: هەرکات. واویَ: وابیَ، وەهابیَ. جائیز مەدێرە: ڕەوای مەبینە. تریچ: تریش. وەیـە: کـورت کراوەی (وایە) یە، یا بە مەعنای (ئەوە) یە. ئەویە: ئەوەیە. نەبووگە: نەبووە.

واتە: بەڵام هەندیَ لە زانایان ڕایان وایە بەکارهێنانی ناو بۆ خودا وەختیَ پێویستیە بە تەوقیف و ئیجازەی شەرع کە بە ئەسمای زاتی خودا بەکار بهێنریَ، بەڵام ئەگەر بۆ تەوسیف بـەکار بهێنـریَ، وەک بوتریَ (الله المنوّر للسماوات والارض والمطوّر للعالم والمدبّر للکائنات)، پێویستی بە تـەوقیف نییە.

هەندیَ لە زانایانی تر وتوویانە: بەکارهێنانی ناو، چ ناو بۆ زات و چ ناو بۆ تەوسیف، دروسـتە بـە مەرجیَ واتای ناشیرین و نەگونجاو نەخاتە دڵی ئینسانەوە، بۆ نموونە وشەی (عارف) بۆ خوا بـەکار ناهێنرێت؛ چونکە وشەکە ئەوە دەگەیەنێت کە لە پێشدا شتەکەی نەزانیوە و لە پاشان زانیویەتی.

هەندێکی تر لایان وایە: ئەتوانی بە ئارەزووی خۆت ناو بۆ خودا بەکار بێنیت چ بـۆ زات و چ بـۆ تەوسیف، گەیاندنی واتای نەگونجاو بە هۆی (قرینە) وە دەڕوات.

جا مەولەوی پاش ئـەوەی باسـی ئـەم ڕا جۆراوجۆرانـەی کـرد، دەفـەرمویَ ئـەم بـیر و ڕایانـە هەموویان ناتەواون و، ڕاست هەر بـیری یەکەمـە کـە نـاو بـەکارهێنان بـۆ خـودای گـەورە تێکـڕا پێویستی بە ئیجازەیە لە لایەن کیتاب و سوننەتەوە و، هەرچی ئەوان ڕێگایان نەدابیَ ڕەوا نییە بـۆ خودا بەکار بهێنریَ.

شایانی باسە ئەو ناکۆکی و خیلافەی لە ناو زانایاندا هەیە سەبارەت بە ناوی خـودا، لـەو ناوانـەدا نییە کە عەلەمن، واتە ئەو کەلیمانەی کە لای هەر کۆمەڵە ئادەمیزادێکدا کراون بە ناو (عەلەم) بـۆ خودا وەک: (الله) لە ناو عەرەبدا و (خودا) لای فارس و (خودا) و (خوا) لای کـورد و (تگـری) لای تورک و (گۆر) [شایەت مەبەستی «گاد» بیَ!] لای فەرەنگ، عەلەم ئالای خۆی هەڵـکردووە و لـە زانا گەورەکان کەس ئینکاری نەکردووە.

زانایانی ئیسلام هەموو لەسەر ئەوە کۆن کە بـەکارهێنانی عەلـەمی شەخسـیی خـودا بـە هـەر زمانێک ڕەوا و بەجێیە، ئەم ئیجماع و کۆبوونەیش وەک دەلیل بەس و کاریگەرە.

بیَ‌گومان بەکارهێنانی ئەو ناوانەیش کە شەرع ڕێگـای بـەکارهێنانی نـەداون نـە خۆیـان و نـە هاومەعنایان جێگەی نیزاع نییە و بڕاوەتەوە کە دروست نییە بەکار بهێنـرێن. ئـەو ناوانـەیش کـە

شەرع ڕێگای بەکارهێنانی خۆیان و هاومەعنایانی داوە، ئەوانیش جێگای نیـزاع نـین و دروسـت و ڕەوایە بەکار بهێنرێن.

بەڵێ نیزاع و خیلاف لە ناو زانایاندا لە بەکارهێنانی ئیسمێکدایە کە موشتەق بێ لە وەسـفێ یـا لە فیعلێ کە لە قورئان و حەدیسدا نیسبەت درابێتە پاڵ زاتی خودا وەکوو (مزوِّج) کە لە ئایەتی (و زوّجناهم بحور عين) یا (مقدِّر) کە لە ئایەتی (نحن قدّرنا بينكم الموت) یا (مبدِّل) کـە لـە ئایـەتی (على ان نبدّل امثالكم) یا (منشِيء) کە لە ئایەتی (إنّا انشأناهنّ إنشاء) وەرگیراون.

هەروەها پێویستە بزانن هەر لەفزێ لە ئایەت و حەدیسدا هاتبێ و نیسبەت درابێتە پاڵ خـودای گەورە و بە پێی ئایەتە (محکم) ەکان مەعنا زاهیرەکەیان بۆ خودا ڕەوا نەبێ وەک (اسـتواء، وجـه، يد، عين، جنب) ئەوە پێویستە ئێمە تەنزیهی خوای گەورە بکەین لەو مەعنا زاهیرییـە چونکـە بـە دەلیلی قەتعی و بە قورئان و حەدیس ئیسپات کراوە کە خوا شوێن و تـەختگای نییـە، ڕوخسـار و دەست و چاو و تەنیشت و وێنەی ئەمانەی نییە، ئەنجا پاش (تنزيه) یا ئەڵێین ئیمـان و باوەڕمـان پێیان هەیە و مەعناکەیان دەدەینە دەسـت عیلمـی خـوا و حەواڵـەی ئـەوی دەکـەین، ئەمـەیش ڕێگای پێشینانی موسوڵمانانە و سەلامەت و بێوەیترە، یـا خـۆ بـە جـۆرێ تـەئویلیان دەکـەین و مەعنایان لێ دەدەینەوە کە شیاوی زاتی (واجبالوجـود) بـێ؛ بـۆ نموونـە: ئەڵـێین مەبەسـت لـە ئیستیوا لەسەر عەرش ئیستیلای جیهانە و، مەبەس لە وەجهــ زاتـە و، مەبـەس لـە (یـد) هێـزی قودرەتە و، مەبەس لە عەین عیلم و ئاگادارییە و، لە جەنب پەنادارییە، ئەمەیش بـیروڕای زانایـانی چینی دوایی موسوڵمانانە، ئەم ڕێگایە زیاتر موحتاجی زانست و خوێنەوارییە و ئاگـاداریی دەوێـت، یا خۆ ئەم ڕێگایە بەهێزترە و زیاتر (٦) بە دڵی زاناوە دەچەسپێ؛ چونکە دوورە لە عەقڵ کە خـودای گـەورە ئایـەت بـۆ حـەزرەتی پێغەمبـەر(د.خ) بنێـرێ و کـەس مـەعنای نـەزانێ، یـا هـەر تـەنیا حەزرەت(د.خ) بیزانێ.

گەلێ لەم زانایانە ڕایان وایە کە واتای ئەو جۆرە کەلیمانە ئاشکرایە و لەسەر کینایـەی عـادەتیی عەرەب هاتوون، بەڵگەیش ئەوەیە هەرکەس ئەم جوملـە جوانانـە ئەبیسـێ ئـەو مەعنایانـەیان لـێ وەردەگرێت.

***

١ـ ئەم سەرباسە لە دەستنووسەکەدا نییە، هەر لە چاپەکەدا هەیە. لە راستیدا شوێنەکە شوێنی باسی تەنها ناوەکانی خودایە؛ کەواتە (مبحث الاسماء) بەسە، کەچی لە چاپەکەدا (مبحث الاسماء والصفات)ە.

٢ـ نایگەتێ: نایگەیتێ. شێوەنووسی هەردوو نوسخەکە (نایکتی)یە و سەروژێریشی بۆ کراوە. یا کورتکراوەی (تایگاتێ)یە و (بورهان) و (خەیاڵ) فاعیلینی، واتە بورهان بە پەیجەی و خەیاڵ بە سوللەمی نایگەنێ.

٣ـ ئایەتی ١ـ٣ی سوورەتی (اعلی).

٤ـ واتە: لە لای بەعزێ کەس.

٥ـ لە نێوان (عولەماندایە) و (عەلەماندایە) جیناسی موحەڕڕەف هەیە.

٦ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لەسەر وشەی (اعلم)ی مەتنەکە نووسراوە «أی احوج الی مرید علم، و کثیرا ما یقال (.......) اعلم ای احکم ای اکثر احکاما أی إتقانا والأول اولی (منه) » لە لێکدانەوەکەدا مەعنای (اعلم) بە هەردوو جۆرەکە لێدراوەتەوە.

## مبحث افعال الله و حكمته[1]

هـــەرچی ئـــەفعالی (ربّ العـــزة)ن
گشـــتی بـــێغـــەرەز، (بـــلا علـــة)ن
ئەمما پـڕ حیکمـەت، پـڕ مەنفەعـەتن
لـە عەبـەس خالـی پـڕ مەسلـەحەتن
تەئویلی دەکەین، وەک خۆش کـەلامان
هەر عیللـەتێ وەهـم بـبرێ لـە لامـان
فـــي الآيـــة أو فـــي الحـــديث افهـــمِ،
بالمصـــــــــــالحِ و بـــــــــــالحكمِ
هـــەرچی وجـــوودی، پـــێ دریـــاوێ
لـــە هـــەرچی و هـــەر تـــەرز دانریـــاوێ
(من حیثُ) کە عیلم حەق موتقینیـیـە
ئـیرادەی ئـەوی موخەسسیســیـیــە
قـــودرەتی ئـــەوە کـــە موبریزییـــە
ئـــەم ســـیفاتیچە نوقســـانی نییـــە
هـــەروەها دەوێ و مـــەوقیعی خۆیـــە
لـــەوە بـــەدیعتر نییـــە کـــە هەیـــە

واتە: هەرچی کار و کردەوەی خودای خـاوەن دەسـتە هـەمووی بـە بـێغـەرەز و بـێعیللـەت دروستی کردوون و، لە هەمان کاتدا هەموو پڕن لە حیکمەت و بەرژەوەندی و سوود، لەبـەر ئەمـە

هەر ئایەت و هەر فەرموودەیەکی پێغەمبەر(د.خ) بە زاهیر ئـەوە بگەیـەنێت کـە کـار و کـردەوەی خودا خاوەن عیللەت و خاوەن غەرەزن ئێمە تەئویلیان دەکەین و دەیانگێڕینەوە بۆ سەر ڕیعایـەتی حیکمەت و مەسڵەحەت، واتە ئەوەی وا دەردەکەوێ عیللەت و غەرەزە عیللـەت و غـەرەز نییـە و چاودێریی حیکمەت و مەسڵـەحەتە لـە لایـەن خـودای گـەورەوە، دیـارە بـە ئیتتیفـاقی هـەموو خوداپەرستێ کار و کردی خودای گەورە پڕن لە حیکمەت و مەسڵەحەت.

بەڵام لەم شوێنەدا پێویستە ئینسان بیرێ بکاتەوە و بـۆ دەسـتکـەوتنی ئـەنجام و بـە ڕاسـتی ئینساف بدات و چاودێریی ڕاستی بکات.

جا با لە پێش هەموو شتێکدا بزانین (غەرەز) چییە یا (حیکمەت) چییە؟

لەسەر قسەی زانایانی زانستی (کلام) غەرەز بە شتێ دەڵـێن کـە باعیسـی فاعیـل بـێ لەسـەر کردەیەک کە دەیکات، واتە: جووڵێن و بزوێنی یەکەم بێ بۆ ئەو کردەیـە، وەک تەماشـا دەکـەین مرۆڤ کاتێ تینوو بوو یا برسی بوو بەملاولادا دەگەڕێ بۆ ئەوەی نان و ئاوێکی دەست بکـەوێ، یـا یەکێ لە مارێ یا هارێ دەترسێ و ڕائەکات و خۆی دەشارێتەوە، یا دارێ، بـەردێ، چـەکێ پەیـدا دەکات بۆ دوورخستنەوە یان لەناوبردنیان؛ بۆیە زانایان فەرموویانە (غـەرەز) یـا (عیللـەی غائییـە) عیللەتە بۆ فاعیلییەتی فاعیل، وە مادام (غەرەز) ئەوە بوو کە باسمان کـرد تێدەگـەین کـە فاعیـل بێگومان پێویستی بەو غەرەزە هەیە و شەخسییەتی خۆی پێ تەواو دەکات.

بەڵام (حیکمەت) یا مەسڵەحەت و بەرژەوەندی تایبەتی یا گشـتی وەکـوو ئەوەتـە ئینسـانێکی خاوەنپارە بە بێفەرمانی کەس، هەر بە ویجدان و ئارەزووی خۆی خانوویەک دروست ئـەکات بـۆ حەسانەوەی داماوان، یا باغێ ئەنێژێ بۆ ئەوەی بێتە بەر و ڕێبواران سوودی لێ وەربگرن، ئەم کارە لە واجباتی سەرشانی ئەم کابرایە نییە، لە کـەس ناترسـێ، خـۆی پێویسـتییەکانی ئـایینی خـۆی بەجێ هێناوە، لە کاری حەرام و نابار و ناڕەوا خـۆی لاداوە، ئەگـەرچی لەوانەیـە پاداشـی چـاکیی قیامەت یا سوپاسی خەڵکی دنیا بەرامبەر بەم کارە چاکە وەربگرێ، بەڵام ئەو لە پایەیێکدایـە ئـەو سوپاس و ستایشە زۆر گرنگ نییە بۆی، ئەگەر ئەم خێر و چاکانەیش نەکات بـە پێـی زاهـیری بـە کردنی واجباتی سەرشانی و خۆپاراستنی لە گوناهـ لە ئازاری ڕۆژی دوایی ڕزگارە.

جا کە غەرەز بریتی بێ لەوە کە شەخسییەتی پێ تەواو بێ و، بێئـەو نـەقس و کـەم و کـووڕی ڕوو بکاتە خودا، هەرگیز عاقڵ باوەڕ ناکات بە بوونی غـەرەز لـە کـاری خـودادا چونکـە عـاقڵ دان بەوەدا دەنێت کە خودا (واجبالوجود)ە و خاوەنی کەمالاتە و دوور لە کـەموکووڕییـە، لـە هـەمان

کاتدا باوەڕیش دەکات بەوەی کە هەموو کارێکی خودا لەگەڵ مەسڵەحەت و حیکمەت و سوودی گشتی یا تایبەتیی مەخلووقاتدایە، ئەم حیکمەت و مەسڵەحەتیش لەسەر خودا واجب نین؛ کردەوەیەک کە لە عیلمی شامیل و خواستی تەواوی خوداوە پەیدا ببێ پێی ناوترێ (واجب). کردەوەی واجب ئەوەیە یا لە سروشتی بێهەستەوە پەیدا ببێت وەکوو کاری سووتاندن بۆ ئاگر یا پڕتەودان بو مانگ و خۆر، یا لە زۆری فاعیلێکی خارجی دەرچێ وەک تلکردنەوەی بەردێک بەرەو خوار، یا لە هێرشی ستەمکارێک وەک بێگاری بۆ زاڵمان، ئەگینا ئینسانێکی زانا بە ئیش و کار، خاوەن خواست کە شتێ بە سوودار بزانێ و بیکا ناوترێ کردنی ئەو شتە واجبە لە سەری، چ جایێ دروست کردن و داهێنانی خودای موختار (جلّ جلالە).

لەسەر ئەم روونکردنەوەیە هەر ئایەتێ، یا هەر فەرموودەیەکی پێغەمبەر(د.خ) کە بە زاهیر واتای ئەوە بگەیەنێت کە کاری خودا موحتاجی عیللەتە ئەوە بۆ تەعلیل نییە و بۆ بەیانی حیکمەت و بەرژەوەندی و سوودی گشتیی خەلک یا سوودی تایبەتیی هەندێ کەس یا هەندێ لایە، دیارە هیچ کەس ئینکاری ئەوە ناکات کە کردەوەی (واجبالوجود) هەمیشە لەگەڵ حیکمەت و مەسڵەحەتدایە، ئیتر ئەو حیکمەت و مەسڵەحەتە بۆ هەموو زانایان دەربکەوێ یان تەنها بۆ زانا تایبەتەکان، یا تەنها خودای گەورە خۆی بیزانێ. ئەمە باوەڕ و عەقیدەی ئێمەیە.

ئەوەی کە (مەولەوی) بە چوار بەیتە دوایینەکان گەیاندی ئیشارەیە بۆ ئەو رستە جوانەی لە غەزالییەوە(ر.خ) دەیگێڕنەوە کە فەرموویەتی «لیس فی الأمکان أبدع مما کان» واتە: لەوە جوانتر و نایابتر نابێت کە هەیە.

شایانی باسە هەندێ کەس لە واتا لێدانەوەی ئەم قسەی ئیمامی غەزالیدا بەهەڵە چوون، وا لێی حالی بوون کە ئیمکان لەو جوملەدا ئیمکانی عەقلی یا ئیمکانی زاتییە، ئەمەیش هەڵەیە، چونکە ئیمکانی عەقلی بریتییە لە قابیلییەتی شتێ بۆ هەر حالێ تەنها بە ئەحتیمالی عەقلی هەرچەند مەوهووم بێت، وەکو تەسەووری بوونی ئینسانێکی چوار دەستی دوو سەر! ئیمکانی زاتیش بریتییە لە قابیلییەتی شتێ بۆ حالێ لە وجوودی خۆی یا سبووتی سیفەتێکی خاریجی بۆی بە جۆرێ کە مەحالی زاتی نەبێت، وەکوو ئیمکانی فڕینی ئینسان بە ئاسماندا و رۆیشتنی بەسەر رووی دەریادا یا بڕینی ماوەی رۆژێ بە دەقیقەیەک!

بەڵێ ئیمکان لەو جوملەی ئیمامەدا ئەمانە نییە؛ چونکە بە بیرکردنەوەی عەقل مومکینە ئەم دنیایە بەهەشت بێ و هەرچی ئادەمزادە وەک فریشتە بە باڵ بفڕن و هاتوچۆ بکەن بە ناویا،

دیارە تەسەوور [بیرکردنەوە]ی رووت هیچی تێ ناچێت، هەروەها مومکینە ئەم سەرزەوییە هەرگیز شەڕ و ئاژاوەی تێدا نەبێ و، ئادەمزاد هەموو ژیر و فامیدە بن و دەستوور بە دادگەری بڕوات و جیهان قاتی و قڕی و نابارێی تیا پەیدا نەبێ و هەموو خەڵک پیاوچاک و خێرخواز بن!

بەڵکو مەبەستی ئیمامی غەزالی (ر.خ) ئەوەیە هەر حادیسێک لە جیهاندا پەیدابوو لەو رووەوە کە کاری کارا و بکەری تەواو و (واجبالوجود)ە و بە توانا و خواست و زانینی ئەو پەیدا بووە و کاری ئەویش هەمیشە لەگەڵ حیکمەت و مەسڵەحەتی تەواودایە، بۆمان دەرئەکەوێت ئەو حادیسە لەو کات و شوێن و وەزعەدا جوانترین مەوجوودە. کە ئەمە سەلمێنرا ئیتر مومکین نییە شتێ ببێ لەوە نایابتر و جوانتر بێت، خۆ ئەگەر لەباتی ئەم حادیسە حادیسێکی دژی پەیدا بوایە لەوبارەدا ئەو دژە، جوانترەکە ئەبوو.

ئیتر مەبەستی ئیمام ئەوە نییە کە مومکین نییە لەباتیی ئەم شتە شتیتر بوایە و ئەم حادیسە لە زاتی خۆیا (من حیث الذات) ئەبدەعی مەوجوودات‌ە، لەسەر ئەمە پێویستە ئەم فەرموودەی ئیمامە بە دڵ وەربگرین، بۆ نموونە: وەکوو چۆن هەر شتێ کە پەیدا بوو بە شەرتێ بوونەکەی وجووب وەردەگرێ وەکوو خودای گەورە فەرموویەتی: (اذا وقعت الواقعة لیس لوقعتها کاذبة) [٢] کەچی ئەو شتەیش لە زاتی خۆیا واجب نەبووە، هەروەها هەر حادیسێ خودا خەلقی کرد لە پاش خەلقەکەی، لەبەر ئەوە کە دروستکراوی خوایە دەرئەکەوێ جوانتر و نایابترە.

جا لەسەر ئەم بناخەیە مەولەوی ئەفەرموێت: (هەرچی) هەر شتێک (وجوودی پێ دریاوێ) خودا وجودی پێ دابێ (لە هەرچی) و هەر شوێنێ بێ (وە هەر تەرز دانریاوێ) وە بە هەر شێوەیەک دانرابێ (من حیث) ئەوە کە (عیلمی) خوای گەورە (موتقینیی‌یە) و بە ڕێکوپێکی کردوویەتی و (ارادە) ئیختیاری (ئەوی) ئەو زاتە واجبە (موخەسسیسی‌یە) دیاریی کردووە بۆ ئەو وەزع و کات و شوێنە و (قودرەتی ئەوە کە موبریزی‌یە) وە تەوانای خودا دەریخستووە بۆ وجوود و (ئەم سیفاتیچە) واتە: قودرەت و ئیرادە و عیلمی خودا (نەقسیان نییە) واتە عیلمی خوا بە هەموو مەسڵەحەتێک ئەزانێ و ئیرادە و خواستی بە شوێنی عیلمەکەیدا ئەو لایەنی مەسڵەحەتە دیاری ئەکات بۆ کارکردی قودرەت، بە واجبی ئەو شتە (هەروەها دەوێ) کە بووە و مەوقیعەکەی (مەوقیعی خۆیە) تی و (لەوە بەدیع‌تر نییە کە هەیە) وەکوو روونمان کردەوە.

(مالـک الملـک)ی بـە حـەقی بـێ ڕەیـب

حـەکیم و عـەلیم (بلانقـص) و عـەیب

قــودرەتی کــە دەس دەرێــرێ لــە جــەیب
تەسەڕڕوف کا مولک شەهادەت و غـەیب[٣]
بە قەبز ئەر بە بەست، زەحمەت یا رەحمـەت
ئەر لوتف و نیعمەت، ئـەر عونـف و نەقمـەت
هــەمووی حیکمەتــە و فەزلــە و عەدالــەت
مونەززەهــــ لــە زولــم، قــوبح و جەهالــەت
زولـــم و ســـــتەم و مــــالیکی عالــــەم؟!
هەی قسەی شـەتەت کـە دەردێ لـە دەم!!
قــەبیح و (ذو الفعــل) مــەحموود و مــەلیح؟!
ئەی وەهمی غەلەت، ئـەی لـەفزی قـەبیح!!
غــەیرە ئەبــدەع و حــەزرەتی حــەکیم؟!
(بــــالله عـــذنا مـــن کیـــد الـــرجیم)
وەزعــی بــێجێگــە و جــەنابی عــەلیم؟!
(نســـــــتغفر الله ربّنـــــــا العظـــــــیم)
(فعـــلاً و حکمـــاً) دوورە لــــە (فەحشـــا)
مولــکیچ مولــکی خــۆی (یفعــل مــا یشــا)

دەرێرێ: دەربهێنێ. کا: بکات. ئەر: ئەگەر. فەحشا: فەحشاء. یشا: یشاء.

واتە: خوایە کە خاوەنی مولکی جیهانە و پادشای پادشاهانە، کە بە راستی و بێگومـان خـاوەن حیکمەتە و هەر کارێ کە ئـەیکات پڕیـەتی لـە قـازانج، خوایـە کـە زانـا و بـێعەیبـە، کاتـێ کـە دەستەلاتی تەوانایی ئەو دەستی جیلوەداری خۆی لە بەرۆکی پەنهانی دەربێنێ و کار لـە مولـکی دیاری و نادیاریدا بکات، چ بە (قبض) دەستگرتنەوە یـا بـە (بسـط) و بەخشـش، بـە زەحمـەت و ئازاردان یا بە رەحمەت و میهرەبانی بێ، هەموو ئەو کارانە پڕن لە حیکمەت و فەزڵ و عەدالـەت و دادگەری و پاک و بێخەوشن و دوورن لە ستەم و ناشیرینی و نەزانین.

بێگومان زولم و ستەم دانە پاڵ پادشا و خاوەنی جیهان قسەیەکی پووچ و بێکاکلە لـە دەمـی نەزان و گەوجەوە دەردەچێت! چونکە ستەم بریتییە لە دەستخستنە کار و ماڵ و مولـکی غـەیر،

خوا کە جیهان دروستکراوی خۆیەتی هەرچی بکا هەقی خۆیەتی. زۆر قسەیەکی ناڕەوا و بێجێیە کردەوە ناشیرین و ناپەسەند بێت و خاوەنکردەوە حەمدکراو و مەدح کراو و کردەوەجوان بێت! چۆن ئەبێ خودای ئافەریدگاری زانا کار و کردەوەی جوانتر و نایابتر نەبێت؟ چۆن حاڵ و باری نەگونجاو و نامووناسب بۆ خودای حەکیم و کارزان و کارساز دادەنرێت؟!

(نعوذ بالله من الشیطان الرجیم، و نستغفر الله العلیّ العظیم).

بە کورتی: خودای گەورە لە هەر کار و کردەوەیەکدا کە دەیکات، لە هەر حوکمێکدا کە ئەیدات دوورە لە نالەباری و ناشیرینی و ناڕەوایی، جیهان یەکسەر موڵکی خۆیەتی هەرچی مەیلی لەسەر بێ ئەیکات.

ئەڵێن ڕۆژێک زانای بەناوبانگی ڕێبازی ئەهلی ئیعتیزال (قاضی‌القضاة عبدالجبار)ی هەمەدانی دەچێتە دیوەخانی وەزیر ساحیبی کوڕی عەبباد، لەوکاتەدا ئەبوئیسحاقی ئیسفەراینیی [٤] زانای پایەبەرزی ئەهلی سوننەت لەوێ دەبێ کە قازی عبدالجبار چاوی پێ دەکەوێ یەکسەر دەڵێ: (سُبحانَ مَن تنزّهَ عن الفحشاء) مەبەستی پلار تێگرتنی بووە، گۆیا ئەهلی سوننەت دەڵێن هەموو شتێ، چاک و خراپ، هەر خودا دروستی دەکات، ئەمەیش شتێکی ناڕەوایە، چونکە گەلێ کاری ناشیرین و شوورەیی هەیە شایان نییە بدرێتە پاڵ خودای گەورە، موعتەزیلەکان لایان وایە ئەم کارانە خودا دروستیان ناکات، ئەو کەسە دروستیان دەکات کە پێیانەوە خەریک دەبێ. ئیسفەراینی یەکسەر لە پلارەکەی هەمەدانی دەگات و بێڕاوەستان دەڵێت: (سبحان من لا یجری فی ملکه الّا ما یشاء) [٥].

واتە: خودا دوورە لەوەی ماوەی کەسێ بدا بە بێئیجاد و تەئسیری ئەو شتێ بکات، واتە: ئیجادی ئەو جۆرە ئیشانە قەبیح و ناپەسەند نییە، بەڵکو ناشیرینی و ناپەسەندی لە خەریکبووندایە بە کارەکەوە، خودا لە دروستکردنی ئەم کارانەدا حیکمەتی هەیە، ئەیەوێ ئینسانی بەدکەسب و خۆشکەسب دەربخات تا بە هۆی کەسبەکەی شایانی پاداشت و سزای ڕۆژی دوایی بێت.

***

١ـ ئەم سەرباسەیش هەر تەنها لە نوسخە چاپەکەدا هەیە.

٢ـ ئایەتی ٢-١ سوورەتی (واقعە).

٣ـ لە پاش ئەم شیعرە لە چاپەکەدا سەرباسی (مبحث الحسن و القبح) هەیە، کە لە دەستنووسەکەدا نییە. لە راستیدا شوێنەکە شوێنی سەرباس نییە؛ چونکە لە لایەنی مەعناوە ئەم شیعرە بە تەواوی بە شیعری پاشییەوە بەستراوە و ماوەی سەرباس نییە.

٤ـ عبدالجباری هەمەدانی (٤١٥)ی کۆچی وەفاتی کردووە. وەزیر ساحیبی کوڕی عەبباد (٣٨٥)ی کۆچی وەفاتی کردووە. ئەبووئیسحاقی ئیسفەرایینی (٤١٨)ی کۆچی وەفاتی کردووە.

٥ـ روضات الجنات / مطبعة مهراستوار؟ سنة ١٣٩٢هـ ص ١٧.

## مبحث الحسن والقبح[1]

بـــەر لـــە وروودی شـــەرعی موشـــەڕڕەف
حوسن و قوبحی فیعل شەخسی موکەللەف
کـــە ئەمـــە ســـەبەب مـــەدح و ســـەوابە
ئەویانـــــە ســـــەبەب زەم و عیقابـــــە
ئـــەو حوســـن و قوبحـــە نازانیـــە و نییـــە
شـــەرعە موســـبیت و موبـــەیینی‌یـــە
ئـــەوە ئـــەر گێـــڕای حەســـەن بـــە قـــەبیح
قوبـــوولْ کـــردنی واجبـــە ســـەریح
هەرگاهـ حوسـن و قـوبح بـەو مـەعنا وێتـە
عـــەقڵ بـــێ‌عەقڵـــە تێیـــەدا شـــێتە[2]
غـــەیری حـــەق نییـــە حـــاکم لەوێـــدا
نـــەک هـــەر لەوێـدا بـەڵ لـە گشـت جێـدا

نازانیە: نازانییێت، نازانرێت. بەو مەعنا وێتە: بەو واتایە بێت.

واتە: لە پێش هاتنی شەریعەتی پیرۆز، واتە کیتاب و سوننەتدا، جوانی و ناشیرینی، بـۆ کـاری مرۆڤی موکەللەف [لێ‌پرسراو] نییە، کە بڵێیت ئەم کارە پەسەندە و هۆیە بۆ ستایشی ئەو مرۆڤە لە جیهاندا و پاداش‌دانەوەی لە پاشەڕۆژدا، یا بڵێیت: ناپەسەندە و هۆی بە بەد ناوبردنیە لە جیهانـدا و هۆی ئازاردانیە لە دواڕۆژدا؛ چونکە جوانی و ناشیرینی، پەسەندی و ناپەسەندی بەو واتایەی وتمان شتێکی سەر بە شەریعەتە و تەنها خودای گەورە ئەیزانێ و هۆش و بیری کەس تێـی‌ناگـات. هـەر

خودا دەتوانێ کار بە چاک و پەسەند یا بە خراپ و ناپەسەند دابنێت. هەر بۆ ئەو رەوایە و شـایانی ئەوە پەسەند بکاتە ناپەسەند و ناپەسەند بکاتـە پەسـەند؛ چونکـە چـاکی و خراپـی و پەسـەندی و ناپەسەندیی کار دەگەڕێتەوە بۆ ئەمرپێ‌کردن و نەهی‌لێ‌کردن لە لایەن خوداوە و، ئەمر و نەهی لە لای خوداوە ناگەڕێتەوە بۆ پەسەندیی و ناپەسەندیی کارەکە، ئیتـر غـەیری خـودا کـەس ناتوانـێ بڕیاری چاکی و خراپی و پەسەندیی و ناپەسـەندیی کـار بـدات، خـوا نـەک تـەنها لـەم حوسـن و قوبحەدا حوکم دەکات، بەڵکو لە هەموو شتێکدا هەر خۆی کاربەدەست و فەرمانڕەوایە.

بەلام موعتەزیلەکان بە خیلافی ئێمە لایان وایە حوسن و قوبح، پەسـەندی و ناپەسـەندی، بـەم مەعنایەیش هەر عەقلییە و، شەرع یا موئەککیدە یا موساعید.

جا بۆ باش٨تر روونبوونەوەی ئەم بابەتە پێویستە باسی مەعناکانی حوسن و قوبح بکەین هـەتا شوێنی نیزاع روون بێتەوە:

حوسن و قوبح بە چوار مەعنا بەکار دەهێنرێن:

یەکەم: حەسەن واتا سیفەتی کەمال و تەواو وەکوو زانین، بەخشندەیی و بەدەهەنەیی، راستیی لە وتار و پەیمان راگرتندا، قەبیحیش واتـا سـیفەتی کـەموکـووڕی وەکـوو دژی ئـەو سـیفەتانەی باسمان کردن، دیارە حوسن و قوبح بەم واتایە شتێکی راست و (نفس الامر) ینە و، بـە ئیعتیبـاری موعتەبیر ناگۆڕێن، ئەوەی لای ئێمە کـەمال بـێ لـە لای خـودایش کەمالـە و، ئـەوەی لای ئێمـە کەموکووڕی بێ لای خودایش کەموکووڕییە، حوسن و قوبح بەم واتایە لای هـەمووماں عەقلـین و عەقڵ هەستیان پێ دەکات.

دووەم: حەسەن واتە کارێ لەگەڵ غەرەزی فاعیلەکەدا گونجـاو بێـت، قـەبیح کارێکـە لەگـەڵ غەرەزەکەدا نەگونجاو بێت، وەکوو ئامادەکردنی هۆیەکان بۆ گەیشتن بە مراز، ئەم ئامادەکردنە بـۆ ئەوەی خاوەن‌کارە جوانە و گونجاوە، بۆ دوژمنەکەی ناشیرین و نـەگونجاوە، حوسـن و قـوبح بـەم واتایە لە شتە ئیزافییەکان حسـێب ئـەکرێن و، بـە پێـی خەڵـک دەگـۆڕێن، وەک ئێسـتە وتمـان کارێکی تایبەتی بۆ ئەم باشە و بۆ ئەو باش نییە، ئەم واتا بـۆ زاتی خـودا نابێـت؛ چونکـە خـودا لـە غەرەز پاک و دوورە و وەک وتمان کارەکانی خودا خاوەن غەرەز نین. ئـەو کارانـەش، کـە نـە بـە گونجاو لەگەڵ٨ مەبەست حسێب دەکرێن و نە بە نەگونجاو، دەبنە شتێکی مامناوەندیی لە نێـوان چاک و خراپ (حسن و قبیح) دا. ئەم مەعنایـەیش دیسـان لای هـەمووماں عـەقڵ هەسـتی پـێ دەکات.

چوارەم: ئەوەتە کە لە لێکدانەوەی هۆنراوەکاندا وتمان، واتە حەسەن ئەو کارەیە کە لای خودا مەدحی فاعیلەکەی بکرێ و لە پاشەڕۆژا پاداشی باش و پایەی بەهەشتی پێ دەس بکەوێ، هەروەها بۆ دنیایش لای عەقڵەوە مەدح بکرێ. قەبیحیش ئەوەیە کە لە لایەن خودای گەورەوە زەم بکرێ و ببێتە هۆی سزای دوارۆژ، بۆ دنیایش لای عەقڵەوە زەم بکرێ. دیارە کارەکانی خودا لەم سیفەتانە بەدەرن. هەروەها بەم مەعنا کاری وا هەیە مامناوەندییە؛ نە حەسەنە و نە قەبیح چونکە کری حەیوانات و منداڵ و شێت و کاری حەلاڵ یا مەکرووهـ بە کەراهەتی تەنزیهی بەر هیچ کام لەم دوو سیفەتە ناکەون، بەلام ئەگەر بلێیت ئەوەی کە زەمی دنیا و سزای پاشەڕۆژی لێ پەیدا ببێ قەبیحە و غەیری ئەوە حەسەنە ئەوە هەموو ئەوانەی پێش نەختێ وتمان بەرناکەون [و] بەر حەسەن دەکەون.

جا لە حەسەن و قەبیحی بەم مەعنا چوارەمەدا لە نێوان ئێمەو موعتەزیلەدا جیایی هەیە؛ ئەوان ئەڵێن ئەم دوو سیفەتە بەم مەعنایشە هەر عەقلین، واتە عەقڵ خۆی ئەزانێ فلان کار حەسەنە و فلان کار قەبیحە، لایان وایە هەموو کارێ سیفەتێکی لازیمی هەیە کە دەبێتە هۆی باشی یا خراپی، گەلێ لە حەنەفییەکانیش لەسەر ئەم بیر و باوەڕەن، بەلام ئێمەی ئەشعەری لامان وایە حەسەن و قەبیح بەم مەعنایە شەرعین و عەقڵ پەیی پێ نابات لەبەر چەند بەڵگەیەک:

یەکەم: ئەگەر هەموو کارێ سیفەتێکی زاتی بوایە کە ببێتە هۆی باشی یا خراپیی کارەکە ئەبوا حەرام و حەلالیی هەر کارێ بە پێی شەریعەتە جیاجیاکان نەگۆڕایە، چونکە موعتەزیلە دەڵێن: ئەمر و نەهیی خودا بە پیی سیفەتی کارەکەن، سیفەتی کارەکەیش لازمیەتی و لێی جیا نابێتەوە و کە کارەکە بوو ئەویش دەبێت، کەچی وادەبێت حوکمی شەریعەتەکان لە یەک کاری تەنیادا جیاواز دەبن؛ ئەوەتە هەندێ مامەلە لە هەندێ ئایینی پێشوودا حەلاڵ بووە و لە ئایینی ئێمەدا حەرامە، بەڵکو هەر لە ئایینێکی تایبەتی‌دا حوکم دەگۆڕێ؛ ئەوەتە لە سەرەتای ئیسلامەوە جەنگ لەگەڵ دوژمنی دیندا حەرام بوو کەچی لە پاش کۆچی پێغەمبەر(د.خ) بۆ شاری (مەدینە)ی پیرۆز حەلاڵ کرا. دیارە وەلامدانەوەی ئەم دەلیلە بەوە کە لە رۆژە پێشووەکەدا سیفەتی کارەکە جۆرێ بووە و ئێستە جۆرێکی ترە وەلامێکی بێبایەخە چونکە ئەوان دەڵێن سیفەتەکە لازمی کارەکەیە، دیارە مەلزووم هەمیشە لەگەڵ لازمدا دەبێ و لێی جیا نابێتەوە.

دووەم: ئەگەر قسەی موعتەزیلە راست بوایە دەبوا ئەگەر شەریعەتیش نەبوایە ئادەمزاد لەسەر کردەوەی باش و خراپ پاداشی وەرگرتایە یا سزا بدرایە کەچی خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا

دەفـەرموێ: (و مـا كنّـا معـذّبینَ حتـی نبعَـثَ رسـولا) واتـە: ئێمـە تـا پێغەمبـەر نـەنێرین بـۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵک کەس سزا نادەین، دیارە تەفسیرکردنەوەی وشەی (رسول) بە (عقـل) تـا واتای ئایەتەکە وای لێ بێ: ئێمە کەس سزانادەین تا عەقڵی نەدەینێ، موخالیفی زوبـان و عـورفی خەڵکە و دەبێتە هۆی دەرگا خستنە سەر پشت کە هیچ (نص) ێک لەسەر مەعنای خۆی نەمێنێ، چونکە ئەگەر وابێ هەر (نص) ێک بکرێتە دەلیل کابرای دژ بە ئارەزووی خۆی واتای بـۆ دادەنـێ و لە مەبەستی لادەدات.

سێهەم: گریمان عەقڵ بتوانێ لە مەدح و زەمی دنیایی بگات، ئـەی چـۆن ئـەتوانێ هەسـت بـە مەدح و زەمی لای خودا بکات؟ گریمان هەستی بەمەیش کرد، ئەی هەسـت بـە پـاداش و سـزای دواڕۆژ چۆن دەکات؟! ئەبێ بە عەقڵ چ جیاوازییێ لـە نێـوان دواڕۆژی مـانگی ڕەمـەزان و یەکـەم ڕۆژی مانگی شەووال‌دا هەبێت، کە ڕۆژووی یەکەمیان واجبە و هی دووەمیان حەرامە؟

ئەگەر کابرای موعتەزیلی بلێ: خۆ ئێمە نەمان وتووە عەقڵ هەمیشە سـەربەخۆ بـە لایەنـەکانی حوسن و قوبح ئەزانێ، بەڵکو وتوومانە لە هەندێ شوێندا بە سەربەخۆیی و بە بێ‌هۆیەکی تر وەکوو زانینی جوانیی، ڕاستوتنی سووددار و، خراپیی درۆکردنی زیاندار، هەندێ جاریش بە هۆی بـەکار هێنانی دەلیل وەکـوو پێچەوانـەی ئـەو ڕووانـەی وتمـان، هەنـدێ جـاریش بـە هـۆی یارمـەتیی شەریعەت وەکو ڕۆژووەکە، بەلێ ئەگەر موعتەزیلە ئەم قسەیە بکات لە وەلامدا دەڵێین: ئەوا دانـت پیانا کە عەقڵ هێزی ڕەسا و تەواوی نییە کە بە لایەنەکانی جوانی و ناشیرینیی کار بزانێت، بـەلام بە ئیتتیفاقی هەردوولامان خاوەن‌شەریعەت ـ کە خوایەـ هەموو حەقیقەتێک دەزانـێ و ئاگـاداری قازانج و بەرژەوەندییە لە هەموو کات و شوێنێکدا، کەواتە واباشە حوکم بە دەستی شتێ بدرێ کـە سەربەخۆیە لە حوکم و لە زانینی حیکمەت و مەسلەحەتدا، نەک بە دەستی شـتێ جـارێ سـاغ و جارێ نەخۆش بێ، بێجگە لەمە ئەگەر ئینساف بدەن بۆیـان دەرئەکـەوێ ئـەو هەنـدە زانینـە کـە سەربەخۆ بە هی عەقڵـی ئـەزانن هـی عـەقڵ نییـە، هـی ئەوەیـە کـە عەقڵـەکە لەگـەڵ حوکمـە شەرعییەکاندا ڕاهاتووە، ئەگەرنا ئەگەر کاروباری غەیبی بە عەقڵ بزانرایە ئەو عەقڵە لـە بـارودۆخی دواڕۆژدا سەراسیمە نەئەبوو!

ڕاستەکەی ئەوەتە حوکم بە حوسن و قوبح، بە پەسەندیی و ناپەسەندیی کار بە واتای چـوارەم، تەنها شەرع دەیدا و بەس.

هەر چلۆنێ حوکم هەر حوکمی ئەویە
حوکمی کەسیچی بەسەردا نییە
دەشێ واجب‌گێڕ لەسەر حەق کێ وێ
وجووب مانای چی؟! بلێ، گوێم لێ وێ
واجب نییە هیچ لەسەر حەق یەقین
نە چشتی ئەسلەح بۆ دنیا یا دین
نە لوتف ئەو چشتە کە دوور خاتەوە
لە گوناهـ بە تاعەت نزیک کاتەوە
نە عیوەز لەسەر دەرد و ئازاران
نە ئەجر و سەواب تاعەت‌گوزاران
نە زەجر و عیقاب فیرقەی عاسییان
نە هیچ کامی تر لە باقیی ئەشیان
حەتتا بۆی هەیە عەزاب دا موتیع
سەواب تەسلیم کا بە عاسی و شەنیع
ئازار دا ئەتفال حەیوانی بێ‌وەی؛
مەملووک بە مالیک دەڵێ: چی دەکەی؟!
بەڵ ئەر سەواب دا بە تاعەت فەزلە
ئەگەر عیقاب دا بە عیسیان عەدلە

واتە: حوکم بە هەر رەنگێ بێ، بە (ندب) و (ایجاب) و (کراهة) و (تحریم) و (اباحة) بەوەی کە بکەر شایانی پاداشتە یا سزایە، ئەمانە هەموو حوکمی خودایە؛ چونکە ئەمر و نەهیی خودا تابیعی سیفاتی ئەفعال نین، بەڵکو سیفاتی ئەفعال تابیعی ئەمر و نەهین، هەر ئەمر و نەهیێک ئیتاعەیان بکرێت هی خودایە، حوکمی کەس بەسەر خودادا ناڕوات، عەقڵ باوەڕ ناکات کە شتی (حادث) پەیدابووی پاش نەبوون فەرمان بەسەر قەدیما بدات، یا عاقڵێ کە عەقڵ و تێگەیشتنی کەم و کووڕ بێ حوکم بەسەر عەلیم و حەکیمێکدا بدات کە سیفەتەکانی بێ‌خەوش و تەواو بن، ئەبێ ئەو کەسە کێ بێ کە شتێ لەسەر (واجب‌الوجود) واجب یا حەرام بکات.

هەروەها لەسەر (واجبالوجود) واجب نییە ریعایەتی ئەسلەح بکات، واتـە ئـەوی چـاکـتـرە بـۆ خەڵق ئەوە بکات، چ بۆ دین چ بۆ دنیا، ئەگەرنا کـافری دروسـت نـەدەکرد، ئینسـانی بەدشـێوە و نەخۆش و بێهۆشی دروست نەدەکرد.

ئەوپەڕی دەلیل بۆ پێویستبوونی چاودێری کردنی چاکتر ئەوەیـە کـە بلـێن خـودای گـەورە پێویستە لەسەری بۆ راگرتنی رێکوپێکیی جیهان ئەم چاودێرییە بکات، ئەم قسەیش ئەگەر وردی بکەیتەوە بێجێیە، چونکە کردەوەیەک کە لە ئیختیار و عیلمەوە پەیدا ببێ پێـی نـاوترێ واجـب، بەڵکو دەرکەوتنی ئاسار لەسەر ئەم یاسا مەعنای ئیختیار و ئارەزوو بـە دەسـتیی تـەواوە، ئەگـەرنا لازم دێ هەرچی موختارە ناچار بێ، ئەمەیش خیلافی بەداهەتی عەقڵە؛ چونکە واجب ئەوەیـە لـە نەفسی زاتەوە بێ ئیختیار پەیدا ببێت وەک گەرما لە ئاگرەوە، یا بە ئیرادەوە بێت بـەڵام هێزێکـی دەرەکی ئیرادەکەی داگیر کردبێ وەکوو ئینسانێ ناچارکرابێ بە کردنی کارێک، بێگومـان کـاری فاعیل، کە لەگەڵ توانا و خواست و بە قازانج زانیندا بێ هەرچەند فاعیلەکەیش لێی لانـەدا و هـەر بیکا، پێی ناوترێ ناچاری یا لەسەر واجب بوون، بەڵکو بە کەمال دەژمێررێ و بە ئیحسان و کـاری چاک دادەنرێت.

هەروەها واجب نییە لەسەر خودا لوتـف لەگـەڵ بەنـدەی خۆیـدا بکـات و نزیکـی بکاتـەوە لـە خوداپەرستی و دووری بخاتەوە لە گوناهـکاری، ئەگەر ئەمانەی کرد ئیحسانێکی رووتە.

لەسەر خودا واجب نییە پاداشی چاک بدا بە ئەهلی خوداپرستی یا خەڵکی تاوانبار ئـازار بـدات، ئەگەر یەکەمی کرد فەزلە، ئەگەر دووەمی کرد عەدلە، تەنانـەت دەتوانـێ بـە تـاوانبـار و گوناکـار پاداشی باش بدات و دڵسۆز و فەرمانبەردار سزا بدات، دەتوانێ منداڵ و گیانلەبەری بـێوەی ئـازار بدات، چونکە ئەمانە هەموو کار لە موڵـکی خـۆدا کردنـە، هـەرگیز نـەبووە مـەملووک رەخنـە لـە خاوەنەکەی بگرێت و بڵێت: ئەوە چی ئەکەیت؟! (و لله ملـک السـماوات والارض و هـو علـی کـل شیءٍ قدیر).

(و بالاتفــاق) لــە هــەموو لایــێ
خــیلاف لــە وەعــدەی خــودادا نایــێ
(و وعیــــدُهُ بالوعــــد مُلحَــــق
لکــن ذلِکــم لــدی اهــل الحــق)

ئیحتیمـــال هەیـــە ئایـــاتی وەعیـــد
مەحمووڵ ون هەموو لە ئینشای تەهدیـد

ون: بن.

واتە: بە ئیتیفاقی (متکلمین) خیلاف لە وەعدەی خودادا نابێ، وەعدە بەڵێندانـە بـە پاداشـی چاک بەرامبەر بە کردەوەی چاک یا بە خۆڕایی. هەروەها وەعیدی خوداش، واتە: هەڕەشە کردنی لە تاوانبار بە ئازاردانی بەرامبەر بـە کـردەوەی ناشـیرینی ناشـەرعی، ئـەویش وەک وەعـد وایـە و خیلافی بەسەردا نایەت و دێتە جێ؛ چونکە بەڵێن و هەڕەشەی خودای گـەورە ئیخبـارن و واتـای ئیخبارەکەیش دەبێ بێتە جێ، ئەگەرنا بە درۆ دەرئەچێ و درۆیش بۆ (واجبالوجود) مەحاڵە.

جا ئەگەر وەعد و وەعیدەکـە موتڵـەق و بـێقەیـدبوون ئـەوە بـەوجۆرە دێنـە جـێ، وە ئەگـەر موقەییەد بوون ئەوا لەسەر ئەو تەقییدە ئەڕۆن و بەوجۆرە دێنە جێ. بـۆ نموونـە: خـودای گـەورە بەڵێنی داوە بە جەزای بەهەشت بەوکەسانەی باوەڕیان هەبێ و کردەوەی باش بکەن، بـە شـەرتێ پایەدار و بەردەوام بن لەسەر ئەو باوەڕ و کردەوە چاکانە و لە دین وەرنەگەڕێنەوە بـۆ بـێئیمـانی. هەروەها هەڕەشەی کردووە لە تاوانباران ئەگەر پەشیمان نەبنەوە یا بەر لێ بووردنی خودا نەکەون (فیغفر لمن یشاء و یعذّبُ من یشاء).

پوختەی قسە: وەعد و وەعید، چ موتڵەق و چ موقەییەد دێنە جێ و دواناکەون، ئەمەیش نابێتـە هۆی ئەوە کە ئەم بەدیهاتنی وەعد و وەعیدە شتێک بێ لەسەر خوا واجب بێت؛ چونکە (وجـوب) ئەوەتە بە ئارەزوو و خواستی خۆی نەبێت، ئەمانە خودا خۆی فەرموویەتی دەبـن و، قسـەی خـۆی ناشکێنێ و دەیباتە سەر. ئەمە خۆی عەینی دەستەڵاتداریی و خاوەنئیختیارییە.

هەندێ لە زانایانی ئەهلی کەلام وتوویانە جێبەجێ نەکردنی هەڕەشـە ڕەوایـە و بەجێیـە و بـە کەرەم و بەخشندەگی دادەنرێت، گوایا بۆ پشتگیریـی لـەم ڕایـەیان دەڵـێن ئایەتـەکانی وەعیـد (ئینشاء) ن، ئیخبار نین تا پێویست بێ بێنەدی و ئەگەر نەهاتنەدی بە درۆ دەرچن! بەڵام ئەم ڕایە ڕاست نییە، کردنی ئایەتی هەڕەشە بە ئینشـاء خـیلافی زاهـیرە و مـەعنا لێدانەوەیـەکی نابـارە و دەبێتە هۆی گوێنەدان بەو ئایەتانـەی کـە هەڕەشـە لـە کـافران و تاوانبـاران دەکـەن، تەنانـەت ئەوەیش کە دەڵێن جێبەجێ نەکردنی هەڕەشە کەرەم و بەخشندەگییە نابێ ببێتە هـۆی ئـەوەی ڕێگای ئەوە بدەین کە گوایا لە قسەی خودای گەورەدا درۆ هەیە (والعیاذ باللە).

تەنانەت کردنی هەندێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ) بە بەڵگە لەسەر ئەم رایە فریای ناکەوێ، بەڵێ ئەگەرچی لەو فەرموودانەوە دەردەکەوێ کە خودای گەورە ئارەزووی خۆیەتی لە جێبەجێ‌کردنی هەڕەشەکانیدا و کەس زۆری لێ ناکات، بەلام کە لێک‌دراوەتەوە ئەو هەڕەشانە موتڵەق نین بەڵکو بە شەرتەوە پێوەندن وەک ئەوەتە کە فەرموویێتی: ئەو گوناهبارانە سزا ئەدەم ئەگەر بەر عەفوم نەکەون، یا کەس تکایان بۆ نەکات... واتە وەعیدەکە موتڵەق نییە و پێوەندە بە هەندێ مەرجەوە کە وەختی خۆی دایناون.

شەئن و حالاتی بێ حەد شەرەفناک
لە نیسبەت بە حاڵ مەخلووق پاک و چاک
(یَهدی و یُضِلّ، یَخفِض و یرفَع
یُعِزُّ، یُذِلُّ، یُعطی و یَمنَع)
دەمێ جەمالی، دەمێ جەلالی
مەشغوولی ناکا ئەم حاڵ لەو حاڵی

واتە شەئن و حاڵی زاتی (واجب‌الوجود) وەکوو شەئن و حاڵی مەخلووقات نییە کە سنووری هەبێ، بەڵکو دائیرەی تەسەڕروفاتی خودا گەلێ گەلێ گوشاد و فراوان‌ترە و، لەگەڵ بیرکردنەوەی ئێمەدا ناگونجێت.

هەر خودایە پایە ئەدا بە پایەداران و مایە ئەدا بە مایەداران. ئەم بەرز دەکاتەوە و ئەو دەهێنێتە خوارەوە. ئەم لات و گەدا دەکات و دەیخاتە سەر ساجی عەلی، ئەویتر دەوڵەمەند دەکات و هەزار ناز و نیعمەتی دەداتێ. دارایی و لاتی و بەرزی و نزمی هەمووی لە دەستی خوادایە. بەڵێ ئەگەرچی ئادەمزاد بە تەنیا یا لەگەڵ کۆمەڵدا بە پێی یاسای خوا دیاری کردوو بە دوای ئەسبابدا دەگەڕێت، بەلام گەلێ سەبەبی وا هەیە هەر تەنها خودا پێی دەزانێ، هەر ئەو دەتوانێ ئامادەی بکات و بەو ئاسان دەکرێت؛ کەوابێ پێویستە بنیادەم لەگەڵ تێکۆشان و دوای ئەسباب کەوتندا پشت بە خودا ببەستێ. هەر خودا مرۆڤ دەخاتە سەر رێگا و دەیگەیێنێتە پیرۆزیی نەبڕاوە. هەر ئەویشە مرۆڤ گومڕا دەکات و دەیخاتە چاڵە رەشی نائومێدی و زیانی نەبڕاوە، بەلام ئەبێ ئێمە تەماشای ئەوە بکەین کە بە دەلیلی عەقلی و نەقلی سابت بووە خودا لە هەموو میهرەبانێ میهرەبان‌ترە و بە بێ‌هۆ ئەمانە ناکا بە کەس. خودا ئینسان دروست ئەکات و عەقڵ و هەستی ساغ و سەلیمی پێ‌ئەدا و چاو و گوێی دەکاتەوە بۆ بینین و بیستنی دەنگ و باسی جیهان و رەنگ و

شێوەی ناشیرین و جوان، ڕەهبەران ئەنێرێ بۆ ئامۆژگـاری کـردنی، نیشـانەی گـەورەیی خـودا و ئاساری توانای دەردەخات و بەڵێن و هەڕەشەی پێ دەگەیێنێ.

جا ئەگەر ئەو ئینسانە (حواس)ی خۆی بەکار هێنا بۆ بیستن و بینینی شتی بەسـوود و، بـە دڵ تێکۆشا و، بیر و هۆشی خستە سەر کردەوەی باش و بیروبـاوەڕی پەسـەند، ئـەوە خـودای گـەورە یارمەتی ئەدا و زیاتر لە هەوڵی خۆی پێی دەگەیێنێ، تا بە پایەی بولەندی هیدایەت و بـەختیاری دەگات و دەست دەکاتە ملی پیرۆزیی هەمیشەیی و بەختیاریی نەبڕاوە.

خۆ ئەگەر حورمەتی ئینسـانییەت و هـۆش و ژیریـی خـۆی نـەگرت و، لـە شـتی بـێسـوود و پڕوپووچدا بەکاری هێنان و، گاڵتەی بە بیر و هۆشی هوشیاران و پەندی ئامۆژگاران کرد، ئـەوە بـا لەسەر پۆپەی کەیوان بێ، وەکوو گیانلەبەری گێژ هەڵی ئـەدێرێ و تووشـی بەدبـەختیی ئـەکات هەتا هەتایە. هەروەها بزانن کە زاتی (واجب‌الوجود) لە هەموو ڕۆژێکدا بەڵکو لە هـەموو ئانێکـدا وا لە بەکارهێنانی کار و شئوونی خۆیدا و تەسەڕڕوف ئەکا لە کائیناتدا، هەموو کاتێک لە شەئنێکدایە؛ چ شەئنی جەمالی واتە سبووتی، وەکوو لێشاو و بارانی ڕەحمەت؛ چ شەئنی جەلالی واتە سـەلبی، وەک لابردنی ئاسایش و ڕەحمەت و گەیاندنی ئازار و نیقمەت- پەنا بە خودا- جـا ئەگـەر بەشـی یەکەمە هەمووی ڕەحمەتە، ئەگەر دووەمە هەمووی هەر عەدالەتە، ئەمانەیش هەموو سەراسەر بـە پێی عیلمی خۆی حیکمەتە، هیچ لایەکیان ماتڵی ناکا لەو لاکەیان و بە ڕێکوپێکی ئاگای لە هـەر دوولایە.

خـودا بـە ئیحسـان، بـە میهرەبـانی
بە قـووەی قودسـی و جـەزبی ڕەببـانی
بـە هێـزی لوتـف و زاتی عـەزیزی
بمانخاتـە سـەر ڕێگـای پـیرۆزی
تـەوفیقمان بـدا بـە پایـەداری
بـۆ پایـەی بـەقا و لیقـای دیـداری
(بمنّـه و فضلـهِ و کرمـهِ آمـین)
مەوقیعی بەحسی خـەلقی ئـەعمال بـوو
لاکـین نـواڕیم خـاتر مـەلال بـوو

قەڵەم بێ سەریر، سوحف بێ‌ئەسەر بــوو
وابەستەی ئەسڵی قەزا و قــەدەر بــوو[٣]
(ن والقلـــــم و مــــا يســـــــطرون
إنَّ هــــذا حَــــقٌ كمــــا تبصـــــرون)

واتە: لەم شوێنەدا بە بۆنەی باسی سیفەت و کاری خوداوە کاتی ئەوە بوو کە باسی (مەسئەلەی خەلقی ئەعمال) بکەم، ئەوە ئیسبات بکەم کە هەر زاتی (واجــبالوجــود) خالیقــە و بەنــدە بێجگــە (کەسب) هیچی تری نییە، بەڵام کە تەماشای خۆمم کرد خاترم نارەحەت و ماندوو بوو، خامەم بێ ئاواز و بێ‌جیرە، کاغەزیش نەمابوو [لەوە دەچێت (مەولەوی) لەوکاتەدا کاغەز و مەرەکەبی نەمابێ، یاخۆ کینایەیە لە بێ‌تاقەتی و مەلوولی] بۆیە باسی (خەلقی ئەعمال) خرایە پاڵ ئەسڵی شەشەم کە (قەزاو قەدەر)ە. جا سوێند ئەخۆم بە دەواتی مەرەکەب و بە خامە، بەو مەکتووبە خۆش ئوســلووبە کە دەینووسن، ئەم قسە کە بۆم کردن راستە و لەگەڵ واقیع و (نفس‌الامر)دا جووتە، وەک ئــەوەی لەبەر چاوتانە و بەچاو ئەیبینن. (دیارە شیعری سێهەم ئیقتیباسە لە قورئانی پیرۆز).

***

١ـ ئەم سەرباسە، وەک لە پێشدا وتم: لە دەستنووسەکەدا نییە، لە چاپەکەیشدا، لە شوێنێکی‌تردا دانراوە، ئێمــە لێرەمان داناوە، لامان وایە ئەمەیان گونجاوترە.

٢ـ ئەمە نەسی نوسخە دەستنووسەکەیە، لە چاپەکەدا نووسراوە: «عقل بی عقله و هم تیدا شیته».

٣ـ لە دەستنووسەکەدا لە پاڵ (قەزا و قەدەر)دا نووسیویە: «فیە لطافة» واتە: خرایە پاڵ باسی قەزا و قــەدەر، یــا بە قەزا و قەدەر دواخرا.

## مبحث رؤیةالله تعالی[1]

روئیـــەتی دانـــای خـــەفی و ئاشـــکار
ئایـــا بـــۆ نـــائیم ئایـــا بـــۆ بێـــدار
(فـــــی ذِهِ النشـــــأة أو دارالقــــــرار)
جـــائیزە لـــە لای قەولەکـــەی موختـــار
ئـــەر جـــائیز نییـــە حـــەزرەتی مووســـا
لەبـــەرچی فـــەرمووی «ارِنـــی»؟، ئەوســـا
هـــیچ لـــە جـــواودا (خـــالق الـــوری)
فەرمووی (لَن أریک) یا خۆ (لـن أری)؟[2]
بـــە «لـــن ترانـــی» جـــواوی داوە
نـــاوینی تـــۆ مـــن وا بـــەم ئیمـــاوە
ئیساتە تـۆ تـۆی بـەم وەسـفە کـە هـەی
من قـائیم بـە خـۆم سـەرمەدیم و حـەی
راوێـس ئـەو نەشـئە بـا تەشـریف بێـرێ
ئیبقـای حـەق خەڵـات بـەقات بنێـرێ
بـــە چـــاوی فـــانی ناوینیـــە بـــاقی
بـــاقی دەوێنـــێ بـــاقی وە تـــاقی
(و لا سِــــیَّما لَــــدی ذی اســــتماع
لا یَـــدُلُّ النفـــی عَلـــی الامتنـــاع)

ناوینی: نابینی. ئیساتە، ئیساتە: ئەم ساتە، ئیستا. راوێس: راوەستە. بێرێ: بێنێت. ناوینیە، ناوینیێت: نابینرێ. باقی(ی یەکەم): شتی ماو و نەبڕاوە. باقی(ی دووەم): دیسان ماو و نەبڕاوە، بەڵام مەبەست خودای گەورەیە. وە تاقی: وە تەحقیق، بە راستی و وردی.

واتە: چاوپێکەوتنی ئەو خودایە کە ئاگاداری هەموو شتێکی ئاشکرا و نهێنییە، چ بۆ ئینسانی نووستوو لە کاتی خەودا و چ بۆ ئینسانی بێدار لە کاتی بێداریدا، چ لەم دنیای ئێستاماندا و چ لە قیامەتی نەبڕاوەدا، لەسەر رای هەڵبژاردە و پەسەندکراوی زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دروستە و رەوایە.

ئەگەر بینینی خودا دروست نەبوایە بۆچی حەزرەتی مووسا(د.خ) لە کاتی خۆیدا لە سەر کێوی (طور) داوای لە خودا کرد و فەرمووی (ربِّ أرِنی انظر الیک)؟[۳] داخۆ خودای گەورە لە وەڵامی مووسادا فەرمووی: «لن أرِیکَ» واتە: هەرگیز خۆمت پیشان نادەم؟ یا فەرمووی «لن أری» واتە: هەرگیز نابینرێم؟ نەخێر خودا هیچ کام لەمانەی نەفەرموو، بەڵکو بە «لن ترانی» وەڵامی دایەوە، واتە: تۆ بەم بارودۆخ و نیشانە و شێوەی ماددییەوە من نابینی، راوەستە با زیندووبوونەوەی دواڕۆژ بێتە پێشەوە و، بە ئەمری من خەڵاتی مانەوە و نەمریت بۆ بنێررێت، ئەوکاتە دەمبینی، ئێستاکە تۆ تۆی، واتە تۆ ئەم قەوارە ماددییە لاوازە بێهێز و بێبەقایەی و، من زاتی واجب و خۆم بۆ خۆم هەم و هەر بووم و هەتا هەتا ئەمێنم، ئیتر چاوی ماددی کە لەناودەچێ چۆن زاتی باقی و ئەبەدی ئەبینێت؟ چاوێ کە بمێنێتەوە و نەفەوتێ ئەوە بە راستی و دروستی بە بینینی خودای گەورە روون دەبێتەوە.

هەروەها ئینسانێک وریا و هوشیار بێت و لە واتای عەرەبی بگات دەزانێ واتای «لن ترانی» کە (تۆ من نابینی)یە ئەوە ناگەیەنێت کە بینینی خودا شتێکی مەحاڵە و نابێت، تەنها ئەوەندە دەگەیەنێت کە ئەو بینینەی مووسا بۆ خودا نایەتەجێ.

شایانی باسە زانایانی ئەهلی سوننەت لەسەر دروستبوونی بینینی خودا لە دنیا و لە قیامەتدا دەلیلی عەقلی و نەقلییان هێناوەتەوە.

دەلیلە عەقلییەکە ئەوەیە ئەڵێن: ئێمە لەم دنیایەدا بە چاوی سەر جەوهەر و عەرەز ئەبینین، رەنگ و رووناکی، ماددەی جۆراوجۆر، قورس، سووک، جوان، ناشیرین، کورت، درێژ تاد... بە چاو دەبینین، بێگومان دەبێ هۆیەکی هاوبەش ببێت لە نێوانی ئەمانەدا کە ببێتە هۆی بینراویی، هۆی هاوبەشی وامان دەست ناکەوێ (وجوود) نەبێ، واتە ئەمانە دەبینرێن لەبەر ئەوەی مەوجوودن، ئەم

(وجود)ەیش هەروەک بۆ جەوهەر و عەرەز و تێکڕای ماددییات هەیە بۆ خوایش هەیە، کەواتە وەک ئەمانە دەبینرێن خودای گەورەیش دەبینرێ.

دەلیلە نەقڵییەکەیش ئەوەیە کە حەزرەتی مووسا(د.خ) داوای بینینی لە خودای گەورە کرد و وتی: (رَبِّ أرِني أنظر اليک، قالَ لن تراني، و لکن انظر الیالجبل فان استقرّ مکانه فسوف تراني...) (٤).

ئەم ئایەتە لە چەند روویەکەوە دەلیلە لەسەر ئیمکان و جەوازی بینینی خودای گەورە.

یەکەم: ئەگەر چاوپێکەوتنی خودای گەورە جائیز نەبوایە و شتێکی مەحاڵ بوایە بۆ ئادەمزاد حەزرەتی مووسا(د.خ) داوای نەدەکرد، ئەوەتا داوای کرد، کەواتە رەوایە؛ چونکە فروستادەکانی خودا پێویستە زانا بن بە سیفەتەکانی خودا، کامە دروستە بۆی و کامە دروست نییە تا شتێ کە بۆ خودا نەشێ داوای نەکەن.

دووەم: خودای گەورە لە وەڵامی حەزرەتی مووسادا نەیفەرموو (لن أريک) واتە خۆمت پیشان نادەم یا نەیفەرموو (لَن أرى) واتە من نابینرێم، بەڵکو فەرمووی «لن تراني» واتەی ئەم رستەیەیش ئەوەیە ئێستە و لەم کاتەدا تۆ بەم سیفەت و ئەحوالەوە کە بێهێز و بێتوانای زاتی (واجبالوجود)ی منت بۆ نابینرێت، چاوەڕوان بە تا رۆژی قیامەت دێتە پێشەوە، ئەوکاتە خودا سیفەتی ئێوە دەگۆڕێ و حاڵی مانەوەی هەمیشەییتان پێ ئەدا، ئەوسا تۆیش ئەتوانی من ببینی. بە تایبەتی کە خوێنەوار سەیری رستەی (لن تراني) بکات کە ئەداتی (نەفی) لەسەر فیعلە بۆی دەرئەکەوێ رستەکە ئەوە دەگەیەنێ کە مووسا نایبینێ، ئەوە ناگەیەنێ کە بینینی خودا جائیز یا مومکین نییە.

سێهەم: خودای گەورە بینینی خۆی بەست بەو مەرجەوە کە کێوەکە لە شوێنی خۆیدا بمێنێتەوە، واتە ئەگەر مایەوە لە شوێنی خۆیدا ئەوا دەیبینێ (فان استقرّ مکانه فسوف تراني...). مانەوەی کێوەکەیش لە شوێنی خۆیدا مومکینی زاتییە و ئیمتیناعی تێدا نییە نە (بالذات) و نە (بالغير).

کارێکیش بە کارێکی وەها مومکینی (بالذات) ەوە ببەسترێ مومکینی (بالذات) ە، کەواتە بینینی خودا مومکینی (بالذات) ە، چونکە مەعنای (تعليق) واتە بەستنەوەی کارێک بە مەرجێکەوە، خەبەردانە بەوەی کە کارە موعەللەقەکە لە کاتی بەدیهاتنی مەرجە (معلق عليه) یەکەدا دێتەدی، دیارە کە (معلق عليه) مومکین بێ دەبێ موعەللەقەکەیش مومکین بێت.

رونیـەت، بـە خـیلاف ئەوکـەس جاحیـدە،
حەقیقەتەکـــەی نـــەوعی واحیـــدە
یـەعنی ئینکیشـاف و ئیـدراکی تـەواو[٥]
کـەوا حاسڵـە لـە دوای فـەتحی چـاو
لاکین (فی الشاهد) بـوونی هـەس مـەنووت
بـە موحـازات و سـائیری شـرووت
(مثـل خـروج النـور والشـعاع
أو بالارتسـام أی بالانطبـاع)
قیـاس لـە شـاهید پارچـەی کاسـیدە
تەنیاگـە تانتـەی لـە پـۆی فاسـیدە
بـا دەرحـەق بـە حـەق یـەکتای یەگانـە
حاسـڵ وێ ئـەو وەخـت بـێ ئـەو شـەرتانە
بۆچ؟ وەختێ کە نەفس وەردەی (ما) و (مَن)
دەرچـوو لـە هـەڕگاو زۆنگـی زەویـی تـەن
(مـن عـالم القـدس قـد تسـتمدّ
فتقـوی، تَکمُـل، و تسـتعِدُّ
لأن یخلـقَ الخـالقُ الأکبـر
فیهـا الادراک بِحِـسّ البصـر
بـلا ذی الشـروط و تلـک المحـن
بعـد الاعـادة لـذاک البـدن
فـاحفظ ذا الـذی کـان لاحقـا
یلائـمُ مـا مَـرَّ سـابقا)

تەنیاگە: تەنراوە. تانتە: ئەڵبەت مەبەستی (تان)ە کە هاوجووتی «پۆ»یە کە بە عـەرەبی پێیـان دەڵێن (لحمة) و (سدی). تان: کوردییـە، (تانـە) یـش فارسـییە، لەوانەیـە (تانتـە) یـش زاراوەی ناوچەی تاوەگۆزیی زێدی (مەولەوی) بێ. یەگانە: تاقانە. وەردە: دیـل و زەبـوون[٦]. (مـا) شـێت،

بێعەقڵ. (من) کەس، عاقڵ. هەڕگاو: قوڕاو. هەڕگ: قوڕ. زۆنگ: زەوییەکە هەمیشـە نمـدار بـێ.
تەن: لەش.

واتە: بینین یەک حەقیقەتی نەوعییە و بریتیە لەو دەرکـەوتن و شـت ڕوونبوونەوەیـە کـە بـۆ ئینسان پەیدا دەبێ لە پاش چاوکردنەوە و ڕوانین بۆ شتێ بیەوێ ببینێ، تەنها ئەوەندە هەیە ئـەم بینینە لە شتی ناوخۆمانا چەند مەرجێکی هەیە، وەک بەرامبەریی بیننده بـۆ بینـراو و دەرچـوونی نوور لە چاوی بیننده‌وە بو بینراو، یاخۆ جێگیربوونی وێنەی بینراوەکە لە چـاوی بیننـدەدا. دیـارە ئەم مەرجانە کە مەرجی عادەتین بۆ چاوپێکەوتن لە (شاهد) ا، لـەناو خۆمانـدا، بـۆ بینـینی خـودا پێویست نین، تەنانەت ئەگەر ئەوەیش بسەلمێنین کە ئەم مەرجانە مـەرجی عەقڵـین ئیحتیمـالی ئەوە هەیە کە هەر لە بینینی خۆمان و شتی ناوخۆماندا مەرج بن و لە بینـینی غـەیری خۆمـان و ناوخۆماندا مەرج نەبن؛ چونکە بینینی زاتی خودا وەک بینینی ئێمە نییە بۆ خۆمان لە دنیادا. ئـەو بینینە جۆرێکە و ئەمەیش جۆرێکی تر.

جا ئەگەر تۆ لەم حاڵەدا بێیت و (قیاس)ی غائیب، واتـە: لـە بـەرچاو نـەبوو کـە زاتی خودایـە، بکەیتە سەر حازر، واتە خۆمان و شتی ناوخۆمان، ئەوا قیاسەکەت بێکەڵک دەبێت، واتە: ئەگەر تۆ بڵێیت خودای گەورە؛ کە لە بەرچاو نییە؛ مەقیسە و، ئەم شتانە کە لە بەرچاوماندان (مقيس عليه) ن و، سیفەتی هاوبەش کە لە هەردووکیاندا هەیە بینراوییە، کـەوابێ مەرجـەکانی بینـینی حـازر ئەبێ لە غائبیشدا هەبێ، واتە: ئەبێ خوا بەرامبەری بیننده بێ و وێنەی لـە چـاودا جـێگیر بـێ و، تیشک لە چاوەوە دەرچێ بۆ زاتی خودا، بەڵێ ئـەو قیاسـەت قیاسـێکی نادروسـت و بـێڕەواجـە، قوماشی ئەم قیاسەت تان و پۆکەی ڕزیو و بێکەڵکە، چونکە لەوانەیـە یـا (نـوع)ی بینینـەکان لـە یەک جیا بن، یا ئەگەر (نوع) ەکەیشیان یەک بێت شەخسییەتیان جیاواز بێ، واتە بینینی خودا لە قیامەتدا و بینینی ئێمە لە ناو خۆماندا لە مەرجدا جیـاواز بـن، هـۆی جیاوازییەکـەیش ئـەوە بـێ ئادەمزاد لەم جیهانەدا هێز و هەستی عەقڵیی کزە و، لە شتی ماددیدا نەبێ ئیشێکی بـەرزی پـێ ناکرێ، بەڵام کاتێ ئەم نەفسە، کە لەم دنیایەدا گیرۆدەی پێوەندی هەموو هوشیار و بێهۆشـیکە و لە گێجاوی دەردا گیری خواردووە، لە قوڕاوی زەویی زۆنگـی ئـاوەزێی لـەش دەرچـوو و گەیشـتە جیهانی دوایی کە جیهانی مان و نەمرییە و، تیشکی نووری خودا ڕووی تێکرد، ئیستیفادە دەکات لە زاتی خودا و بە تەواوی ئامادە دەبێ بۆ ئەوەی خودا لە چاویا هێزی بینینی زاتی خۆی دروسـت بکات، بێ ئەو مەرجانەی کە لە دنیادا پێویست بوون، وەک بەرامبەری و وێنە و تیشک... تاد. ئەم

قسە بە وردی وەربگرە، زۆر جوانە و لەگەڵ ئەو قسەی لە باسـی (لـن تـرانی)دا کردمـان گـەلێک گونجاو و لەبارە.

ئەگینا ئەگەر سیفەتەکانی ئینسان لە قیامەتدا وەک هی دنیا بن، چۆن مرۆڤ لە قیامەتدا هـەتا هەتایە دەمێنێ، کەچی لە دنیادا ماوەیەک دەژی و پاش ئەوە ماڵئاوایی لێ ئەکات؟ چۆن هەرگیز نەخۆش ناکەوێ؟ چۆن شەرابی پاک دەخواتەوە و سەرخۆش نابێت، خوو و خدەی پەستی نابێـت، هەرچی دەخوات دەبێتە ئارەق و لە لەشیەوە دەرئەچێت؟ چۆن موسوڵمان لـە بەهەشـتەوە قسـە لەگەڵ ئەهلی دۆزەخ دەکات؟ ئەمانە هەموو بەڵگەن بۆ ئـەوەی کـە سـیفەت و حـاڵ و ئامـادەیی ئەهلی بەهەشت وەکوو هی ئەم جیهانە بڕاوەیە نییە.

بەڵکو لە خزمەت شێخی ئەشعەری
بۆ ڕۆحی ڕەحمەت لەغایەت عەری
ئـەو شـرووتانە کـەوا موسـبەتن
ئەسبابی عـادیی خـەلقی روئیـەتن
ئیسـتەیچ جـائیزە خـالیقی وەدوود
بێ ئەوان روئیـەت بێرێتـە وجـوود
دەلالـەت دەکـا لـەم قسـە تـەمام
ئیختیلافی جەمع سەحابەی کـیرام
(فـــی وقوعهـــا لیلَـــة الإســـرا
لـــهُ علیـــهِ صـــلاةٌ تتـــری)

عەری: رووت. ئیستەیچ: ئیستەیش. بێرێتە: بێنێتە. تتری: یەک لەپاش یـەک بێـت. الاسـرا: الاسراء، لەبەر ناچاریی شیعر هەمزەکەی قرتاوە.

واتە: بەڵکو لای شێخی ئەشعەری، یاخوا ڕەحمەتی بێپایان لـە گیـانی پـاکی بێـت، وایـە ئـەو شەرتانەی کە خەسم دایان ئەنێ بۆ چاوپێکەوتنی شتێ و، ئێمـەیش دانیـان پیـا ئـەنێین، هـەموو شرووتی عادەتین و عەقڵی نین، دیارە شرووتی عادەتی لەوانەیە نەیێنـە جـێ. کەواتـە هـەر لـەم دنیایەیشدا لەوانەیە خودای میهرەبان بە بێ ئەو شەرتانەیش بینینی خۆی برەخسێنێ.

دەلیلێکی تـر لەسـەر جـەوازی بینـینی خـودا هـەر لـەم دنیایـەدا جیـاوازیی قسـەی هـاوڕێ بەڕێزەکانی پێغەمبەرە(د.خ) سەبارەت بە بینینی خـودای گـەورە لـە لایـەن پێغەمبـەرەوە(د.خ).

ئەوەتە هەندێکیان فەرموویانە: لە شەوی میعراجدا خودای دیوە، هەندێکیشیان فەرموویانە: نەء، نەیدیوە. بێگومان جیاوازی و یەکنەگرتنی کۆمەڵێکی وشیار و هەڵبژاردە لە روودانی شتێکدا بەڵگەیە لەسەر ئیمکان و جەوازی روودانی ئەو شتە.

شایانی زانینە: بڕیاردانی شێخی ئەشعەری (ر.خ) لەسەر ئەوە کە ئەم شەرتانە عادەتین و، لەوانەیە نەیێنەجێ، ئەوە دەگەیەنێت کە زاناکانی تر ئەو شەرتانە بە عەقڵی دائەنێن، بەڵام ئەڵێن: بەڵکو ئەم شەرتانە لە قیامەتدا پێویست نەبن، واتە: لازم ناکا شتێ لە دنیادا شەرتی عەقڵی بێ بۆ بینین لە قیامەتیشدا هەر شەرتی عەقڵی بێ، بەڵکو نەوعی بینینەکان یا شەخسییەتەکەیان جیا بن و، ئەو شەرتانەی لە دنیادا شەرتی عەقڵین بۆ قیامەت شەرتی غەیرە عەقڵی بن، عیبارەتی حاشیەی ئیسماعیلی گەلەنبەوی لەسەر شەرحی عەقائیدی (عضدیّە) کە هی زانای پایەبەرز جەلالی دەووانییە ئەم واتایە دەگەیەنێت کە ئێمە باسمان کرد.

(مەولەوی) پاش باسی بیروباوەڕی شێخی ئەشعەری (ر.خ) خۆیشی دوو دەلیلی تر دێنێتە پێشەوە و ئەفەرموێ:

بۆچ عیلم و روئیەت دەخەی تەفاوەت؟
ئاخر نەوع کەشف و عیلمێکە روئیەت
عیلمت بە خالیق بێجیهەت بۆچ هەس؟
دین بێجیهەت هەس بۆت تەعەللوق بەس(٧)
ئەگەر دەوینێ بێموقابەلە
با بوێنیە چە موجادەلە؟
(لو یَری) بۆچی بێ چەند و چوونە؟
(لو یُری) بۆچی بە چۆن مەقروونە؟

دەخەی تەفاوەت: بە چاوێ سەیریان ناکەی. بۆ هەس: بۆ هەیە. دین: دیتن. دەوینێ: خودا ئێمە دەبینێ. بوێنیە: بوینیێ، ببینرێت. (لو یَری): کە خودا ئینسان ببینێت. (لو یُری): کە ئەو ببینرێت. بە چۆن: چلۆنی وەک بەرامبەری.

واتە: بۆ بەڵگە لەسەر بینینی خودا دوو دەلیلی تر هەن:

یەکەم: ئەوەیە کە بینین وەک زانینە، کە تۆ بە بوونی پەروەردگار دەزانیت بە بێ لا و بەرامبەری، بە بێ هەندێ مەرجی عادەتی؛ دەبا بینینی بێ‌لا و بێ‌بەرامبەریش هەبێت، بۆچ ئەم دیتنە ببەسترێ بە هەندێ مەرجی عادەتییەوە؟

دووەم: مادام خودای گەورە بە بێ‌بەرامبەریی ئەو لە گەڵماندا ئێمە دەبینێ، وەکو فەرموویەتی: (لیس کمثله شیء و هو السمیع البصیر) [8] دەبا ئێمەیش بێ بەرامبەریی ئەو ببینین. ئیتر موجادەلەی ناوێت. بۆ رەوایە ئەو ئێمە ببینێ بە بێ چەند و چۆن بەڵام رەوا نییە ئێمە ئەو بە بێ چەند و چۆن ببینین؟

ئەمجار (مەولەوی) بە بۆنەی باسی بینینی خوداوە لە حاڵی بێداری‌دا باسی بینینیش دەکات لە خەودا و دەفەرموێت:

نَقَلَ القاضی عِیاضُ السَّرِیّ
هەیە لە خەودا ئیجماع لە سەری
تا ئیستە لەسەر جەوازی رۆیین
لە وقووعیچی با نەختێ بدوین
خەلاتی وقووع روئیەتی باری
بەم چاوی سەرە و حاڵی بیداری
دەس نادا بۆ کەس لەم دنیایەدا
هەر بە شانی خەتم ئەنبیایەدا
حەتتا روئیەتێ کە بۆ ئەویچ بوو
دەڵێن وەختێ بوو لە دنیا دەرچوو
ئەر (وەلی) ئیزهار دینی فەرمووگە
ئەوە شهوودی غەلەبە بووگە؛
مەستی گێجی‌دا و خستیە مەلە
وتی روئیەتە، یا موئەووەلە
بەڵێ بە نەقڵی تەشکیک نەماگە
بۆ زۆر بوزورگان بە خەو رووی‌داگە

ئەنبیایەدا: ئەنبیای ئەدات. دینی: بینینی. فەرمووگە: فەرمووە. بووگە: بووە. نەماگــە: نــەماوە. رووی داگە: رووی داوە. بەڵێ: نَعَم، بەڵام[٩].

واتە: بەڕێز و پایەبەرز قازی عیاز وتویەتی: ئیجماع هەیە لەسەر بینینی خودای گەورە لە کـاتی نوستوویی‌دا بە شێوەی خەوبینین. ئەم ئیجماعەیش لەسەر (جواز) و (وقوع)ی دیتنی خودایــە لــە خەودا، ئاسار لەسەر ئەم دیتنە زۆرە و پێویستی بە بەیان نییە.

دیارە تا ئێستە باس باسی (امکـان) و (جـواز)ی بینـینی خـودا بـوو، بـا کـەمێ باسـی روودانی بینینەکەیش بکەین.

خەلاتی بەدیهاتنی بینینی خودای گەورە بە چاوی سەر و لە حاڵی بێـداری لـەم دنیایـەدا بـۆ کەس دەست نادات، شتێکە تەنها شایانی شان و شکۆی حەزرەتی خاتم‌الانبیایە(د.خ) و خوا هـەر بەوی بەخشیوە. تەنانەت ئەو بینینەی ئەویش کـە لـە شـەوی میعراجـدا دەسـتی‌کـەوت زانایـان دەفەرموون لە کاتێکدا بوو کە لە سنووری ئەم دنیایە دەرچوو، کە ئەرز و ئاسمان و عەرشی بـەجێ هێشت و خودای گەورە بە جازیبەی قودسی بەرزی‌کردەوە بۆ پایـەیێک کـە لـە توانـای ئـادەمزاد بەدەر بوو، ئەو بە تەجەللیاتی زاتی خودا سەرکەوت و لە حاڵی مـاددی و عـادی دەرچـوو ئـەوجار خودای گەورەی بە چاوی سەر دی، ئەمەیش حاڵێکە وەکوو بینینی خودایە لە رۆژی قیامەتدا و بۆ ئێمە بەیان ناکرێ. بەم لێکدانەوەیە بۆت دەرکەوت مەبەستی (مەولەوی) لە رستەی «وەختێ بـوو لە دنیا دەرچوو» وەختی وەفاتی حەزرەتی پێغەمبەر نییە، بەڵکو بەو جۆرەیـە کـە ئێمـە باسمـان کرد.

قسەی ئەو وەلی و پیاوچاک و خوداناسەی کە ئیددیعای چاوپێکەوتنی زاتی خودای کردووە لـە بیداری‌دا واقیعی نییە، بەڵکو شهوود و حـزوور و پرتـەوی نـوور و تەجـەللیی زاتی خـودا هێرشـی هێناوەتە سەر و مەستیی گیانی گێژی داوە و لە دەریـای ئـەنواردا خسـتوویەیتە پـێ‌مەلـە و، لـە حاڵێکی ناعادەتیدا بە بینینی زانیوە و ئەو ئیددیعایەی کـردووە، ئەگـەر وا نـەبێ ئـەبێ قسـەکەی تەئویل بکەین و بە جۆرێک مەعنای لێ بدەینەوە کە لەگـەڵ رێبـازی ئایینـدا بگونجێـت، چونکـە ئاسۆ و ماوەی توانا و پایەی وەلییەکان تەسک‌تر و نزم‌ترە لە پایە و ئاسۆی توانـای پێغەمبـەرەکان، پێغەمبەرەکانیش تێکڕا پایەیان لە پایەی حەزرەتی (محمدالمصطفی) نزم‌ترە. جا لە لایـێ هـەموو جەماوەری زانایانی ئایین دان بە رونیەتی خودا بۆ حەزرەتدا نـەنێن و ئیختیلافیـان هـەبێ، چـۆن دان بەوەدا دەنێن کە (اولیاءالله) لە دنیادا خودا دەبینن؟!

بەلێ بە نەقڵ لە زانایانەوە گومان نەماوە کە لە خەودا خودا بینین بۆ گەلێ لـە زاتـە پایەبـەرزە خوداناسەکان رووی‌داوە (والله ولیّ الفیض والاحسان).

وقـــووعی روئیـــەت رۆژی قیامـــەت
دەوێ بە دەلیـل کیتـاب و سـوننەت
ئـەر کەسـێ بڵـێ: تاریکـە چـاوم
تووشـیاری دەلیـل، زەحمەتـە نـاوم،
لەبەر (لیلـة البـدر) ئـەر دەوێنـێ[۱۰]
(الـــی ربهـــا نـــاظرة) خوێنـــێ
ئـــەمرێ جـــەوازی شـــکی نـــەماوێ،
مـــوخبیری ســـادیق خەبـــەری داوێ
کە واقیـع دەوێ، راسـە بـە تـەحقیق
واجبە بەوە گشـت بکـەین تەسـدیق
لـەم مەتلـەبەدا ئیجمـاعی ئوممـەت
بەر لە حودووسـی ئینکـار و بیدعـەت
بووگـە لـە سـەری وقـووعی روئیـەت
کەوا موستەلزیم جەوازە و سـیححەت
لەســەر ئەمیچــە ئایــەی زاهــیرە
مــەحموول لــە زاهــیر موتــەبادیرە
ئــەو ئیجماعیانــە زۆر موعتەمــەدە
لەو ئیجماعە دەر رێگـەی پـێ مـەدە

دەوێ: دەبێ. تووشیار: لە دەستنووسەکەیش و لە چاپەکەیشدا بە یەک وشە نووسـراوە، واتـە (تووش) و (یار) نییە. کەواتە بە پێی شوێن ئەبێ (تووشیار) بە مەعنای ئەوەبێ کەسـێ تەسـادوفی کەسێ بکا لە رێگەیەکا یا لە کارێکا یارمەتیی بدا. ئەگەر (تووش‌یار) یش بێ مەعنای رستەکە هـەر دێ و وای لێ دێتەوە: تووشی دۆستێکی رێ‌پیشـاندەر نـابم، زەحمەتـە تووشـی بـبم، بـەلام بـە هەرحاڵ مەعنایان ئەبێتەوە بە یەک. ناوم: نابم. دەوێنێ: دەبینـێ. خوێنـێ: بخوێنـێ. نـەماوێ:

نەمابێ. داوێ: دابێ. دەوێ: دەبــێ. بووگــە: بــووە. ئەميچــە: ئەميشــە. زاهــيرە: پشــكووتو. لــەو ئيجماعەدەر: ئەو كەسە يا ئەو رايە لەو ئيجماعە دەربچێت و لابدات.

واتە: بينينی زاتی خودا (جلّ جلاله) لە رۆژی قيامەتــدا دەبێــت و ئــەم بوونــەيش بــە دەليلــی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر و ئيجماع، پێش پەيدابوونی ئەهلی بيدعەت، جێگير بووە.

ئەگەر كەسێ بڵێ بەرچاوم تاريكە و بەڵگەی ئەم بينينەم دەست ناكەوێ يا بۆم ناخوێنرێتــەوە، پێی بڵێين با لەبەر رووناكيی مانگەشەوی چواردەدا راوەستێ و قورئانی پيرۆز بگرێ بە دەســتەوە و ئايــەتی (وجــوه يومئــذ ناضــرة الــی ربّهــا نــاظرة) [١١] بخوێنێتــەوە... فەرموودەكــەی مەولــەوی ئيشارەيەكی ورد و جوانی تێدايە بۆ فەرموودەكەی پێغەمبەر(د.خ) كە فەرموويەتی «إنكم ســترون ربكم كما ترون هذا القمر... الحديث»[١٢]. شايانی باسە ئــەم حەديســە بيســت و يــەک كــەس لــە هاوڕێ بەڕێزەكانی پێغەمبەر(د.خ) گێڕاويانەتەوە.

هەروەها دەفەرموێ: شتێ كە لە ئاييندا مەبەست بێ و لە دروستبوونيا گومان و دوودڵی نەبێ و، (مخبری سادق) كە پێغەمبەرە(د.خ) وتبێتی ئەبێ، بــە راســتی دێتــەجێ و واجبــە هــەموومان باوەڕی پێبكەين.

ئەفەرموێ: هەر وەكوو قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر بوون و روودانی ئــەم بينينــە دەگەيــەنن زانايانی ئيسلاميش، پێش پەيــدابوون و سەرهەڵــدانی ئــەهلی بيدعــەت، كۆبوونەتــەوە و يــەكيان گرتووە لەوەدا كە لە رۆژی قيامەتدا خودای گەورە دەبينرێ؛ كەواتــە ئيمكــان و وقــووعی بينــينی خودا لە رۆژی قيامەتدا بووە بە شتێكی (مجمع عليه) لە ئايينی ئيسلامدا، ئەم ئيجماعــەيش بــووە بە دەليل لەسەر ئەوەی كە (نظر) لە ئايەتی «وجوهٌ يومَئذٍ ناضرة الی ربها ناظرة»[١٣] لەسەر مــەعنا دياريیەكــەی لــێ بدەينــەوە كــە تەماشــاكردن و بينينــە، ئيتــر ئەگــەر ئايەتەكــە يــا حەديســەكە خەياڵێكيان تێدا بكرێت بۆ لادانيان لە مەعنای (ظاهر) ديــاری، ئــەم ئيجماعــە رێگــا لــەو خەياڵــە ئەگرێت. پوختەی قسە: دەليلی پشتپێبەستراو لێرەدا ئيجماعە و هەر كەس و هەر رايــەک لــەم ئيجماعە لابدات گوێی پێ نادرێت و دەدرێتە دواوە.

بــا بــەس بــێ دەليــل عولــەمای كاميــل
بێينــە ســەر دەليــل جەرگــەی ئــەهلی دڵ
چەند كەس هەن دەرچووگ لە دەس نەفسانی
موســەففا لــە رەنــگ وەســفی ئينســانی

ئـــار و دووی وجـــوود ســـووژیاگ نـــەویٚ
نییـــە لـــە لایـــەن هـــیچ رۆژ و شـــەویٚ
پێـــی دڵ لـــە زنجـــیر (مـــا ســـوی) موتلـــەق
موشـــــتاق دیـــــدار مـــــەحبووب بەرحـــــەق
بەهەشت جێی سـروور غـەم لێـی ئـەودەر وێ
دەردی ئینتیـــــزار مـــــەوتی ئەحمـــــەر وێ
راســـــە بـــــێباکـــــە و ئیتســـــیغنای دەوێ
رێـی رەحمـی مـەحبووب بەرحـەق ناکـەوێ
پـــــەردە لـــــە جـــــەمال نەدیڕێتـــــەوە
خـــــۆی لـــــە موشـــــتاقان بشـــــێڕێتەوە

جەرگە: کۆڕ و کۆمەڵ. دەرچووگ: دەرچوو، دەربازبوو، رزگار بـوو. ئـار: ئـاگر. دوو: دووکـەڵ. سووژیاک: سووتاو. مەوتی ئەحمەر: بە تێغ کوژران. رێ رەحم: شایانی میهرەبـانی. نەدیڕێتـەوە: لانەدا. بشێڕێتەوە: بشارێتەوە.

واتە: با دەلیلی زاناکانی عیلمی زاهیر بەس بێ، با بێینە سەر دەلیلی کۆمەڵـی ئـەهلی دڵ، کـە ئەهلی تەسەووف و خاوەن ئیدراکی قەلبین.

مەولەوی دەفەرموێ: گەلێ کەس هەن بە هێزی خواپەرستنی هەمیشەیی و پەیـڕەویکـردنی قورئان و حەدیس بە دڵسۆزی و، بە هۆی هاورێیی مامۆستایان و رەهبەرانی بەهرەمەند و تـەمێ و تەربیەی دۆستانی خوداوە، لە چڵک و خووی بەدی نەفسانی پاک بوونەتەوە و، ئەوەندە خـەوش و خاڵی حاڵی فاسیدیان بە ئاگری ریازە و چلەکێشان و رەنجکێشان سووتاندووە، شەویان بریتییە لە دووکەڵی خووی بەدی سووتاو و رۆژیان بریتییە لە تیشک و پڕتەوی کڵـپەی ئـاگری دەروونیـان، پێی دڵیان لە زنجیری پێوەندی بە غەیری خوداوە بەرەڵایە و، هەمیشە ئارەزوومەنـدی بـە یـەک گەیشتن و دیدار بینینی خۆشەویستی راستەقینەن کە خودای گەورەیـە، جـا ئـەم زاتـە فریشـتە سیفاتانە کاتێ لەم ئاگری عیبادەت و ریازەتـەدا دەسـووتێن و ئـەمرن و گیانیـان وەکـوو پەروانـە دەکەنە فیدای شەمعی جوانیی دۆست و، دەخرێنە بەهەشتی رەحمەتەوە کـە (فیهـا مـا تشـتهیه الأنفس و تلذّ الأعین) [١٤].

دیارە ئینسان لەسەر چ حاڵێ بمرێ لەسەر ئەو حاڵە زیندوو دەکرێتەوە و هەر بەو جۆرەیش حەشر دەکرێ و دەڕواتە بەهەشت، بێگومان ئەمانە موشتاقی دیداری زاتی دۆستی خۆیانن، هەرچەند خودای گەورە بێباک و بێنیازە لە جیهان، بەلام کەی شایستەی میهرەبانیی خودای (ارحم الراحمین)ە ئەو عاشقە دڵگەرمە بەسۆزە موشتاقانە لە دەشتی چاوەڕوانیدا ماتڵ بکات، کە چاوەڕوانی لە مردنی سوور و لە خوێنا تلانەوە ناخۆشترە، چۆن خۆی بەوان پیشان نەدا و، پەردە لە رووی جوانیی ئەبەدیی خۆی لانەدا و خۆی بشارێتەوە لێیان و ئەم سووتاوانە چاویان بە خودا نەکەوێ و دیدەیان روون نەبێتەوە؟!!

حاشا سەد هەزار مەرتەبە دوورە
عاشق شاد نەبێ بەو شۆڵەی نوورە؟
بە حەق بە لیقای (باقی) شاد ئەبن
هەر بەو لیقاوە دڵئازاد ئەبن
رزَقَنا الله بفضله
و حفظنا من آثار عدله
پشتی ئەم ئەسڵە ئیستیفابێزە
دامنەی لایقە بەم پەراوێزە[١٥]
وەسف ئەر جێبێڵی تالیبی زات بی
لە فەرزێ (شاە) بی دەشێ هەر (مات) بی

پشت: رووی پۆشاکە، کە بەدەرەوەیە، بەرامبەری (پشت)ی پۆشاک (بەر) ەکەیەتی. لە عەرەبیدا بە پشت (وجه) و بە بەر (بطانە) دەڵێن. ئیستیفابێز، وەک لە چاپەکەدا نووسراوە، ناوی جۆرە قوماشێکی دیاری بووە. لە فەرهەنگەکاندا هیچم لە بارەیەوە دەست نەکەوت. وادیارە وشەکە لە دوو وشە تێکەڵ کرابێت: (ئیستیفا) کە ناوی قوماشێکی جوان بێت و (بێز) واتە لەبەرچاوخەر، کەواتە ئیستیفابێز واتە: ئیستیفا لەبەرچاوخەر، واتە ئەوەندە جوانە قوماشی جوان و نایابی (ئیستیفا) لە بەرچاوی ئینسان دەخات. هەرچۆن بێ وا پشتی ئەسڵی یەکەم، کە باوەڕ بە خودایە، بوو بە قوماشی (ئیستیفابێز) و مەولەویش بۆ ئەوەی جوانتر و رازاوەتری بکات پەراوێزێکی شەش شیعریی پێوە دەنێت.

پەراوێز: ئەو پارچە تەسکە درێژەیە کە لە دیوی ناوەوە بە قەراخی کەوا و سەڵتە و شتی‌تریانـدا دەدووری کە بە زۆری لە پارچە ئەسلییەکە جیا ئەبێ.

عیلمی کـونهی زات بـۆ کـەس روونـادا
نـــە لـــە دنیـــادا نـــە لـــە عوقبـــادا
ئـەر بڵـێی روئیـەت بـۆ دەلیـل چییـە؟
روئیـــەت موفیـــدی حەقیقـــەت نییـــە
زاتـــێ نیشـــانەی بـــێ‌نیشـــانی وێ
دەشێ عیلمی کەس چی لـێ زانیـوێ؟
ئـەوە بێتـە زەبـت زیهـن و مەعریفـەت
هەر وجوودە و سەلب، ئیزافە و سـیفەت
بێ‌نەوع و جینسە ناگونجـێ (مـا هـو؟)
(تَقَـــدَّسَ مَـــن لَـــیسَ إلا هُـــو)

واتە: ئەو قوماشەی کە کراوە بە پشتی ئەسڵی یەکەم، کە باوەڕ بـە خودایـە، قوماشـی جـوان و قەشەنگی (ئیستیفابێز) ە، شایانی ئەوەیە کـە داوێنەکـەی بـەم پـەراوێزە داهـاتووە بڕازێنرێتـەوە، پەراوێزەکەیش ئەمەیە:

ئینسان پێویستە قەناعەت بەو ئەندازە مومکینە بکا کە دەستی عیلم و کشووفاتی پێ‌گەیشـتووە و، داوای زانینی کونهی زاتی خودا نەکات، چونکە تۆ ئەگەر واز لە ناسینی سـیفەتەکان بهێنیـت و بە دوای ناسینی زاتدا بگەڕێیت، گریمان وەک (شا) بەدەستەڵاتیش بی هەر گەدا و (مات) و کـز و بێ‌دەستەڵات ئەبی. ئەوەی بە تەمای ناسینی تەواوی زاتی خودایە دوای شتێکی مەحاڵ کـەوتووە و هەرگیز پێی ناگات.

لە راستیدا پەی‌بردن بە کونهی زاتی (واجب‌الوجود) لە توانا و دەستەڵاتی کەسـدا نییـە نـە لـە دنیا و نە لە قیامەتدا. وە ئەگەر بڵێیت بۆچی بینینی زاتی خـودا لـە رۆژی قیامەتـدا نابێتـە هـۆی زانین و ناسینی کونهی خـودا؟ ئەڵـێم بینـینی هـیچ زاتێـک نابێتـە هـۆی دەرخسـتنی کونهـ و حەقیقەتی ئەو شتە. بۆ نموونە: کاتێ تەماشای میوەیەک ئەکـەیت وێنەکـەی وەردەگـری، کاتـێ تەماشای ئینسانێکیش بکەیت تەنها وێنەکەی وەردەگری، ئیتر حەقیقەتی ناناسیت.

زاتێ کە نیشانە و شیعاری بێ‌نیشانی بێ، دەبێ عیلم و مەعریفـەتی سـنووردار و کـەم‌وکـووڕی ئادەمزاد چی لێ بزانێ؛ ئەوەی بێتە ناو دائیرەی زانین و ناسینی هۆشـی ئینسـانەوە سـەبارەت بـە خودای گەورە هەر بوونیەتی کە باوەڕت بێ هەیە، لەگەڵ باوەڕ بەوەی کە سیفەتە سـەلبییەکانی نییە، وەک حدووس، فەنا، تەعەددود، موحتاجی، وە سـیفاتی مـەعانیی هەیـە وەکـو زینـدوویی و زانین و خواست و توانا و بیستن و بینین و گۆیایی، لەگەڵ سیفەتە ئیزافییەکانـدا وەک پێوەنـدی زانینی خودا بە زانراوەکەوە و پێوەندی خواستی بە خواستراوەکەوە و، پێوەنـدی توانـای بـە کـارە جێ‌بەجێ کراوەکانیەوە، یا پێوەنـدی هێـزی بیسـتنی بـە بیسـراوەکانیەوە و هێـزی بینـینی بـە بینراوەکانیەوە و هێزی گۆیایی بە ئـەمرپێ‌کـراو و نـەهی‌لـێ‌کراوەکانیـەوە... تـاد. ئیتـر کونهـــ و حەقیقەتی خودا نەزانراوە و نازانرێت؛ چونکە خودا بێ (نوع) و بێ (جنس)ە و، ناگونجێ دەربـارەی بە (ماهو؟) پرسیار بکرێ؛ چونکە پرسیار بە (ماهو) دەربارەی تاقە شـتێک واتـە داوای حەقیقـەتی تایبەتیی ئەو شتە، حەقیقەتیش کە (جنس) و (فصل)ە بۆ خودا نییە (فتقدّس عن عیب الترکیب و ریب النقص من لیس فی الوجود واجب إلّا هو)، جا بیروباوەڕی هەندێ لە زانایان لەسەر ئەوەن کە لە تواناdا هەیە بەڵام رووی نەداوە و روونـادا. هـەروەها زانـینی کـونهی سیفەتەکانیشـی جێگـای خیلافە، هەندێک دەڵێن هەرگیز مـومکین نییـە، هەنـدێکیش دەڵـێن مومکینـە بـەڵام هـەرگیز رووی‌نەداوە.

بەڵێ واجبە ئێمە باوەڕمان بە بینینی خودای گەورە هەبێت، هەرچەند وەکوو زیندووییەکـەی و زانینەکەی و سیفەتەکانی تری کونهەکەی نازانین.

***

١ـ ئەم سەرباسە تەنها لە نوسخە چاپەکەدا هەیە.

٢ـ «لن أریک» شێوەنووسی نوسخە دەستنووسەکەیە کە دەبێتە (لن ارِیَکَ) وەک من نووسـیومەتەوە. ئـەمیش لەبەر ناچاریی کێشی شیعرەکە یا دەبێتە (أرِیک) بە زەنە (سکون)ی (یێ) و (کاف) ەکە، یا هەر هیچ نـەبێ دەبێتـە (أرِیَک) تەنها بە زەنەی (کاف).

لە رستەی (لن أرِیَکَ) یشدا (مفعول بە)ی دووەم لابراوە؛ ئەسڵەکەی (لـن اریـک نفسـی) بـووە؛ دیـارە مووسـا وتوویەتی: (ربِّ أرنی أنظر الیک) کە دەکاتە «ربّ أرنی نفسک أنظر الیک» واتە: خودایا خۆتم پیشان دە تا بتبیـنم، خودایش فەرموویەتی نامبینی... تاد.

مەولەوی، بۆ ئیسپاتکردنی ئەوەی بینینی خودای گەورە شتێکی جائیزە، دەڵێت کە مووسا عەرزی خودای گەورەی کرد و، وتی خودایا خۆتم پیشان دە بتبینم، خودای گەورە لە وەڵامیدا نەیفەرموو خۆمت پیشان نادەم، یا نەیفەرموو نابینرێم، بەڵکو فەرمووی نامبینی. ئاشکرایە نەبینینی خودا لە لایەن مووساوە نابێتە بەڵگەی نەبینینی ئێجگاریی خودا.

من لەبەر رووناکیی دەستنووسەکەدا مەعنای شیعرەکەم دارشتەوە؛ چونکە هی چاپەکە (لن اراک) ەیە و هەڵەیە.

٣ـ ئایەتی (١٤٣) سوورەتی (اعراف).

٤ـ ئایەتی (١٤٣) سوورەتی (اعراف).

٥ـ هەمزەی (ئینکیشاف) لەبەر کێشی شیعر دەبێ قووت بدرێ.

٦ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لە پاڵ وشەی (وەردەدا) نووسیویە: (ئەسیر و زەلیل) لە فارسییشدا (بەردە) بە مەعنای خولام، کەنیزەک، زەرخرید و دیلە.

٧ـ بە پێی پەراوێزی دەستنووسەکە دەتوانین بڵێین: مەعنای ئەم نیوە شیعرە ئەمەیە: دیتنی بێجیهەت بۆ تۆ هەیە، تەنها بریتییە لە پێوەندی. یا بەم جۆرەیە: ئەی دیتن وەرە، جیهەت هەیە بۆ تۆ، جیهەتەکەیش تەنها پێوەندییە، واتە وشەی (بێ) هەڵدەگرێ بە واتای (دون)ی عەرەبی بێ یاخۆ بە واتای (وەرە) بێت.

٨ـ ئایەتی (١١) سوورەتی (شوری).

٩ـ لە پەراوێزی نوسخە دەستنووسەکەدا لەسەر کەلیمەی (بەڵێ) نووسیویە: لاکین، دیارە (بەڵێ)ی بە واتای (نعم) لە شوێنی (لاکین)دا بەکار دەهێنرێت.

١٠ـ هەمزەی (ئەر) ناخوێندرێتەوە لەبەر کێشی شیعرەکە.

١١ـ ئایەتی (٢٢ و ٢٣)ی سوورەتی (قیامة).

١٢ـ «کنا جلوساً عند النبی(ص) إذ نظر الی القمر لیلة البدر قال: إنکم سترون ربکم کما ترون هذا القمر لا تضامّون فی رؤیته، فان استطعتم ان لا تُغلَبُوا علی صلاة قبل طلوع الشمس و صلاة قبل غروب الشمس فافعلوا». صحیح البخاری، الجزء التاسع ص ١٥٦، مطبعة مصطفی البابی الحلبی و اولاده بمصر، ١٣٤٧هـ

١٣ـ ئایەتی (٢٢و٢٣)ی سوورەتی (قیامة).

١٤ـ ئایەتی (٧١)ی سوورەتی (زخرف).

١٥ـ ئەمەم لەبەر رووناکیی شێوەنووسی دەستنووسەکە نووسیوەتەوە، بە پێی هی چاپەکە (دامنەی لاییق بەم)ە.

١٦ـ دیارە مەولەوی بۆ جوانکاریی دوو وشەی (شا) و (مات)ی بەکار هێناوە کە (شا) لە یاریی شەترنجدا بەکار دێت و دۆڕانی یارییەکە بە مردنی (شا) تەواو دەبێ. هەر چەند لێرەدا مەعنای مردن مەبەست نییە.

## مبحث وصف الملائكة[1]

ئەسلی سانیمان لە شەش ئەسڵەکان
باوەڕکردنە بە مەلائیکان
بە فارسی پێیان دەڵێن فریشتە
جیسم نوورانی و لەتیف سروشتە
پاک و بێ گوناهـ فەرمانبەردارن
موتیع بۆ فەرمان پەروەردگارن
هەر ئەمرێ بکا، هەرچی فەرمووگە
نافەرمانییان ناوێ و نەبووگە
ئەو قسەی دەگەڵ (ربّ العالم) بوو
پرسین لە حیکمەت خەلقی ئادەم بوو
تا حالی بووون گشت لە حیکمەتی
هیچ کام نەمێنێ عوقدەی شوبهەتی
نە رەخنە لە فیعل (رب العزة) بوو
نە دەرحەق ئادەم تەعن و غەیبەت بوو
عەلاوەی ئەمە تەسەوور ناوێ
غەیبەت بۆ کەسێ لە عەدەمدا وێ
(و ما کان ذا رجماً بالظنون)
حالی کردبوون تەعلیمی بێ چوون

(فمــا قــال مِــن لســانِ المَلَــک
خالقَنــا مــن «نحــن» الــی «لــک»)
نە تەزکییەی نەفس نە عوجبیـان بـوو
تەتیممەی تەقریر شوبهەی خۆیان بوو

«نحن» الی «لک» ئیشارەتە بۆ ئایەتی: (و نحن نسبّح بحمدک و نقدس لک) [۲].

واتە: ئەسڵی دووەم لە شەش ئەسڵەی ئیمان باوەڕکردنە بە مەلائیکەکانی خودای گـەورە. ئـەم مەلائیکانە جیسمیان نوورانییە و بە ناسکیی دروست کراون، لە نەفس و خووی خـراپ و ڕەوشـتی بەد پاک و خاوێنن، بێ‌تاوانن، فەرمانبەرداری خودان و هەمیشە مل‌کـەچن بـۆ خـودای گـەورە و ئامادەی پەرستنن، خودا هەر فـەرمانێکی بەسـەریاندا داوە ئـەو فریشـتانە نافـەرمانییان نـەبووە و نابێت.

جا ئەگەر کەسێ بڵێ مادام ئەم فریشتانە فەرمانبەرداری خودان ئەی ئەو قسە و باسە چی بـوو لە خزمەتی خودادا کردیان لە کاتێکدا کە خودای گەورە ویستی ئادەم و ئـادەمزاد دروسـت بکـا و فەرمووی: (انی جاعل فی‌الأرض خلیفة) [۳] ئـەوانیش وتیـان: ئـەی خـودای ئێمـە! چـۆن جـۆرە مەخلووقێک دروست ئەکەیت کە لەسەر عـەرزا خراپـەکاری ئەکـەن و خـوێنی ناحـەق دەڕێـژن، کەچی ئێمە گرۆهـ و کۆمەڵە مەخلووقێکی باشین و تەسـبیحاتی تـۆ ئەکـەین، هـەموو سـوپاس و ستایشی تۆ ئەکەین؟

ئایا ئەم قسانە ڕەخنەگرتن نەبوون لە کاری خودا؟ تانە و تـوانج و غەیبـەت نـەبوون دەربـارەی حەزرەتی ئادەم و ئادەمزاد؟ لەولایشەوە کە باسی خوداپەرستییەکەی خۆیـان دەکـەن تەزکییـەی نەفس و خۆبەباش‌زانین نەبوو؟ ئیتر چۆن ئەگەر گرۆهێ بێ‌تاوان بن ئەمانەیان لێ ڕووئەدات؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین: کاتێ کە خودا بە فریشتەکانی فەرموو من دەمەوێ لە عەرزا گرۆهێ دروست بکەم و بیانکەمە خەلیفە و کار پێ سپێرراوی خۆم، ئەو گرۆهە لە مادەی گۆشت و ڕەگ و ئێسقان و خوێنن و لە خاک دروسـت ئـەکرێن، قـابیلی هـەموو سـیفەت و کردەوەیـەکن، ئیستیعدادی فەرمانبـەرداری و بـێ‌گـوێی‌یـان هەیـە، ئـارەزووی نـەفس و رق و کینـەیان هەیـە، گوێ‌ڕایەڵی و خواپەرستی و بەندەگیشیان هەیە، فریشتەکان بە شێوەی پرسیار لە حیکمەتی ئـەم دروست‌کردنە پرسیاریان کرد و وتیان حیکمەت چییە لە دروست‌کردنی گرۆهـی وەهـادا؟ ئەگـەر تەسبیح و سوپاس و ستایشت ئەوێ ئێمە ئەیکەین، ئیتر ئەم جۆرە مەخلووقە ئەبێ سـوودی چـی

بێ؟ ئەمەیشیان بۆیە پرسی هەتا هیچ کامیان گرێ و گۆلی لە دڵدا نەمێنێ، ئیتر نە مەبەستیان رەخنەگرتن بوو لە کاری خودای گەورە و نە تانە و توانج و غەیبەتکردنی ئادەم و ئادەمزاد بوو و نە خۆبەباش زانین و لەخۆبایی‌بوونیش بوو. هەروەها پرسیارەکەیان لە پاش ئەوە بوو کە خودای گەورە ئەحواڵ و چۆنیەتیی ئادەم و ئادەمزادی بۆ دەرخستن، بۆیە قسەکەیان گومان‌بازی نەبوو تا ببێتە هۆی رەخنە لە پاکی و خاوێنیی فریشتەکان.

ئەر (مَلکینِ) هارووت و مارووت
کەس بۆ ئیعتیراز ناوێستێتە رووت[٤]
وەر مەفتووحە (لام) ئەمە جوابە:
ئازاریان عەزاب نییە، عیتابە
قیسسەی سیحریان کەوا شەهیرە
مەردوودی خدمەت جەمعێ کەسیرە
سەبەب لە ئینزال بەعسی ئەواندا
سیحر ئینتیشاری بوو لەو ئەواندا
تەشخیس بۆ عەوام هیچ نەدەدریا
ساحیر و نەبی فەرق نەدەکریا
(جاءا باذن الملک المنّان
لابتلاء الناس أی الامتحان)
(یُعلّمانِ النَّاسَ السحرَ کَی
یمتاز الرشدُ لهم مِن الغَیّ)
حیکایەتەکەیچ درۆ بزانە،
یا خەیر رمووزی قەدیمیانە
ئیبلیس چون لەناو مەلەکاندا بوو
لە سوحبەتیاندا خەیلێکی پێ چوو
بە تەغلیب ناوی بە مەلەک بریا
ئیستیسنای لە جەمع ساجیدان کریا

وەرنــە خــۆ (جــنّ)ە ئــەو (الخنــاس)ە
شــاهیدیچی قــەول ئیــبنی عەبباســە
فەرمووگیــە جینــنن، ئــەو زومرەیانــە
وەلــەدیان دەوێ و، ئیبلــیس لەوانــە
خسووســـەن زاهـــیر کـــەلامی بـــاری
(کان من الجن) چـاک دەدا یـاری [٥]

ناوێسێتە رووت: لە رووتـا ناوەسـتێ و موجادەلـەت لەگەڵـدا ناکـات. وەر: وە ئەگـەر. ئەوانـدا: ئەودووانەدا، هارووت و مارووت. لەو ئەواندا: لەو کات و سەردەممەدا. خەیلێکی پێچـوو: زۆری پـێ چوو، زۆر مایەوە. نەدەدریا: نەئەدریا. شاهدیچی: شاهیدیشی. فەرمووگیە: فەرموویەتی.

واتە: ئەگەر رەخنەگر بڵێ: ئەی ئەو دوو فریشتە چی لێ ئەکەیت کە ناویان هارووت و مـارووت بوو سیحر و جادوویان فێری ئادەمزاد دەکرد، کە فێرکردنی سیحر گوناهە و، رەفتـار پـێکـردنی و باوەڕ بە تەئسیری لە حەقائیق دا کوفرە؟ ئەڵێم (ملکین) لە ئایەتی (و ما أنزل علی الملکـین ببابـل هاروت و ماروت) [٦] بە دوو قیرائەتی سابت خوێنراوەتەوە:

یەکەم: (مَلِکَین) ە، واتە: دوو پادشا، دیارە لەسەر ئەم قیرائەتە رەخنەکە جێگـەی خـۆی نییـە، چونکە ئێمە باسی بێگوناهیی فریشتە ئەکەین.

دووەم: (مَلَکَین) ە، واتە: دوو فریشتە، لەم بارەدا وەڵامت ئەوەیە کـە لـە زەمـانی قەدیمـدا لـە وڵاتی (بابل)دا سیحر و جادوو بە رادەیەک باو بوو خەڵک سەریان لێ شێوابوو فەرقی بەینی سیحر و موعجیزەیان لا نـەمابوو، وایـان گومـان دەبـرد کـە مـوعجیزەی پێغەمبـەرانیش هـەر سـیحر و جادوویە؛ بۆیە خودای گەورە دوو فریشتەی نارده سەر خاکی بابل بۆ ئەوەی ئادەمزاد فێری سیحر بکەن، تا بزانن فەرق لەبەینی سیحر و موعجیزەدا زۆرە؛ سیحر لەو زانیارییانەیە کە پەیـدادەکرێ و بە فێربوون دەست ئەکەوێ و هەرکەس بیخوێنێ فێری دەبێ و پێوەندی بە رۆحەوە نییـە؛ بـەڵام موعجیزەی پێغەمبەران(د.خ) کارێکی لە عادەتبەدەر (خارق العادە)یـە و، لەسـەر نـەریت و رێ و شوێنی ماددی نییە، لە موعجیزەدا رێگای کەسب و خوێندن و عـادەت نییـە، شـتێکە زاتی خـودا دەیبەخشێ، خاوەنی ئەو موعجیزەیە لە لایەن خودای گەورەوە بە بـەهرەی بیروبـاوەڕی راسـت و کردەوەی بەسوود و پاک، بۆ خۆی و بۆ خەڵکی تر یارمەتی دراوە.

جگە لەمەیش ئەو فریشتانە هەرکەسیان فێری سیحر بکردایە لە پێشا ئامۆژگارییان دەکرد و پێیان دەوتن: هاتنی ئێمە بۆ فێرکردنی ئەم هونەرە زۆر شتێکی گرنگە، هەر کەسێ فامیدە و دامەزراو نەبێ تووشی کردەوەی نالەبار و بیروباوەڕی ناشیرین دەبێ، ئاگاتان لە خۆتان بێت ئەم زانیارییە بۆ ناچاری و بۆ رزگاریی خۆتان نەبێ بەکاری نەهێنن، وامەزانن کە بە بێخواستی خودا ئەم سیحرکردنە سوودی هەیە و، بە بێ قودرەت و خواستی ئەو هیچ شتێ رووناداتت.

ئیتر ئەو حیکایەت و باسەی کە لە بابەتی گیرۆدە بوونی ئەو دوو فریشتەیەوە دەیگێڕنەوە کە گوایا خودای گەورە بە هۆی هەندێ تاوانەوە سزای دان ئەوە زانا پایەبەرزەکانی تەفسیری قورئانی پیرۆز بە راستی نازانن، وەک (فخرالدین)ی رازی و، (قاضی بیضاوی) و (شهاب‌الدین أبوالثنا)ی بەغدادی لە تەفسیرەکانیاندا باسیان کردووە و وتوویانە ئەو دەنگ و باسە دژی ئایەتی پیرۆزی (لا یعصون الله ما أمرهم و یفعلون ما یؤمَرون) یە[٧]. ئەوا گریمان شتێ بووبێتە هۆی دوچاربوونیان ئەوە خودای گەورە بە شێوەی سەرزەنشت لەگەڵیاندا جووڵاوەتەوە نەک بە شێوەی سزادان لەسەر تاوان.

خۆ ئەگەر لە لایەنی پەند و عیبرەتەوە تەماشا بکرێ ئەم باسە لەو جۆرە رەمزانەیە کە پێشینان بەکاریان هێناوە، واتە: ئینسان هەرچەند پایەی مەعنەوییاتی بەرز بێ دوو فریشتەی عەقڵی نەزەری و عەقڵی عەمەلیی ئەو لە دەسیسەی نەفس رزگار نابێ، ئەگەر خودا یارمەتی نەدا دەکەوێتە چاڵی تاریکی ئارەزووی نەفس و گیرۆدەی ئازاری رەفتاری نابار ئەبێ (و لا حول و لا قوة الا بالله العلی العظیم).

خۆ ئەگەر بڵێیت: ئیبلیس فریشتە بوو، (استثنا)ی لە گرۆهی مەلائیکە لە ئایەتی (فسجد الملائکة کلهم اجمعون، إلّا ابلیس ابی ان یکون مع الساجدین) [٨] دەلیلە لە سەر ئەوە کە لەوان بوو، کەچی ئەو بێگوێییە نابارەی کرد و خودای گەورە نەفرینی لێ کرد و ئێجگاری لە رەحمەتی خۆی دەری کرد.

لە وەڵامدا ئەڵێین (ئیبلیس) لە فریشتە نەبوو، بەڵکو لە گرۆهی (جن) بوو، فریشتە نوورانین و لە نوور دروست کراون، (جن) دووکەڵدارن و لە ئاگر دروست کراون؛ خودا فەرموویەتی: (والجان خلقناه من قبل من نار السموم) [٩] بەلام لەبەر ئەوە کە ماوەیەکی زۆر لە ناو کۆمەڵی فریشتەکاندا بوو بە (تغلیب) ناوی بە مەلائیکە برا و خودا (استثنا)ی کرد، وەک یەکێک بێ لەوان، ئەگەرنا ئەو خەنناسە فڕی بە فریشتەوە نییە و لە گرۆهی (جنّ)ە.

هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، (ر.خ) ریوایـەتی کـردووە کـە ئیبلـیس لـە زومـرەی ئـەو جینی‌یانەیە کە مناڵیان ئەبێت.

لە هەمووی بەهێزتر ئایەتی (...کان من الجنّ ففسق عن امر ربه...)یـە [١٠] کـە بـە ئاشـکرا دەری‌دەخات ئیبلیس جیننی‌یە و فریشتە نییە.

بەم دەلیلانە رەخنەکە درایە دواوە و بە ڕوونی دەرکەوت کـە مەلائیکـە پـاک و خـاوێن و بـێ-تاوانن.

مەلەک نەک لە تەرز ئینسـان و پـەرین
لــە ژن و شــوویی و زاو و زوو بــەرین
نە نێر، نە مێنگـە، نـە سـاحێب منـداڵ
بە پێی روتبە و حاڵ ساحێب پەڕ و بـاڵ
باڵــیان بــە ئایــەت وەهــا دیــارە:
دوو دوویە، سـێ سـێ و، چـوار چـوارە
بەڵێ پێغەمبـەر کـە بـۆ میعـراج چـوو
دیگیە جیبرەئیل شەش‌سەد باڵـی بـوو
گشت لەسـەر فیعلـی عـەجیب قـادرن
لـە هـەر شکڵـێدا حەزکـەن زاهـیرن
جیبرەئیل لە شـکڵ دوحیـەدا دەهـات
بـە خدمـەت حـەزرەت (علیـه الصـلاة)

واتە: فریشتە لە چەشنی ئینسان و جین نین کە هەندێکیان نێر و هەندێکیان مێ بـن؛ ئەمانـە لە ژن و مێردی و لە نەوەخستنەوە دوورن، دروست بوون و لە ناوچوونیان تابیعی ئەمری خودایـە، بەپێی زاهیری ئایەتی (جاعل الملائکة أولي أجنحة مثنی و ثلاثَ و رُباع) [١١] بە پێی پایەیان پەڕ و باڵیان هەیە، هەندێ دوو، هەندێ سێ، هەندێ چوار باڵیان هەیە، وە بە زاهیری ئایەتی (یزید فـی الخلق ما یشاء) [١٢] لەوانەیە لەو ئەندازەیش باڵیان زیاتر بـێ؛ چونکـە ریوایـەت کـراوە لـە شـەوی میعراجدا حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) جیبرەئیلی بە شەش‌سەد باڵەوە دیوە.

فریشتە مەئمووری خودان، بە ئیزنی خودا دەتـوانن گـەلێ کـاری بایەخـدار و سەرسـووڕهاوەر جێ‌بەجێ بکەن، خودای گـەورە دەربـارەی جیبرەئیـل فەرموویـەتی (ذی قـوة عنـد ذی العـرش

مكين) [١٣] وە فەرموویەتی (علّمە شديد القوى) [١٤]. لە هەر وێنە و شێوەیەكی بەڕێز و گونجاو و لەباردا دەتوانن خۆیان دەربخەن، حەزرەتی جیبرەئیل جارجار لە شێوەی (دحية) دا، كە پیاوێكی ڕێكوپێك و شێوە جوانی عەرەب بوو، دەهاتە خزمەتی حەزرەتی پێغەمبەر و (وحی)ی بۆ دەهێنا.

زۆرترن لە گشت ئەنواعی عالەم
(بأعـــدادهم الله أعلـــم)
لە مەكان و قورب، لە مەكانەتدا
لە ئیمتیسالدا و لە مەعریفەتدا
لە (كلام الله) وا دەوێ مەفهووم
(لكـلٌ مـنهم مقـام معلـوم)

واتە: فریشتە لە هەموو جۆرە گیانلەبەرێک زۆرترن (و ما يعلم جنود ربّك إلّا هو) [١٥] خودا نەبێ كەس نازانێ ژمارەی سوپای خودا چەندە؟

پایەی ئەم فریشتانە وەک یەک نییە، وەک خودای گەورە بە زمانی ئەوانەوە دەفەرموێ (و ما منّا إلّا له مقام معلوم) [١٦] خۆیان لە خۆیانەوە هیچ نازانن، هیچ ناتوانن، خودای گەورە بە گوێرەی ئەو فەرمانەی داویە بەسەریاندا زانست و هێزی پێداون و، بە بێفەرمانی خودا هیچ ناكەن.

لە ئاسماناندا نییە جێی یەک پێ
ئیللا مەلەكێ حازرە لەوێ
بەعزێ بەدەوام قائیم و خاشیع
بەعزێكیچیان هەمیشە راكیع
بەعزێ دائیما وا لە سجوودا
بەعزێ لە گێجاو بەحری شهوودا
غەفلەتیان نییە ساتێک یا دەمێ
خەبەریان نییە لە هیچ عالەمێ

واتە: لە ئاسمانەكاندا جێگەی پێیەک نییە چۆڵ بێ و فریشتەیەكی تێدا نەبێت، ئەو فریشتەیەیش بەو شێوەیە كە بۆی بڕیار دراوە خەریكی پەرستنی خودایە جا هەندێكیان هەمیشە راوەستاون و لە ترسی جەلالی خودا ملكەچن، هەندێكیان لە باری ركووعدان و چەماونەتەوە،

هەندێکیان لە باری سجووددان و کوڕنووشیان بۆ خودا بردووە، هەندێکیشیان لە گێژاوی دەریای تەجەللای خودادان، ئیتر نەک سەعاتێک بەڵکو بە ئەندازەی هەناسەدانێکیش لە یادی خودا غافڵ نین و ئاگایان لە کەس نییە تەنها خەریکی کاری خۆیانن.

چونکە بۆ تەبلیغ خەیلێ لائیقن
واسیتەی مابەین خالیق و خەلقن[١٧]
بەعزێ مەبعووسن سەر نەوعی خۆیان
بەعزێ سەر بەعزێ لە ئادەمییان
هەرچی لە عەدەم هاتوێ و بێتەدەر
فریشتەیێکی تایینە لەسەر
بە وەفقی فەرمان پادشای خەبیر
تەسەڕڕوفاتی تێدەکا و تەدبیر
ئایا سەماوات ئایا هەساران
بەحر و تەم و هەور، با و بەور و باران
تکتکی باران، کولووکولووی بەور
تەڵتەڵ گیا و لق گەڵای دار بەوتەور
زەمینە کەژ و دەشت تەمام جەمادات
حەیوانات یەکسەر، هەموو نەباتات
هەرچی نەموت و تەفسیلی دەوێ
نییە فریشتەی مووەکەل نەوێ
بۆ هەر فەردێکی فیرقەی موئمینین
بە حەدیسی پاک (خیر النبیّین)
سەدوشەست مەلەک حافیزە یەقین
(دفعاً لاختطاف رهط الشیاطین)

هاتوێ: هاتبێ. تايينە: تەعيينە، دياری كراوە. هەساران: ئەستێرەكان. بەور: بـەفر. تـكـتـك: دڵۆپ دڵۆپ، قەترە قەترە. كولوو كولوو: پارچە پارچەی بەفر، كولـوو بـۆ بـەفر وەک دڵـۆپەيە بـۆ باران.

واتە: فريشتە ئامادە و بەكارن بۆ گەياندنی فەرمان و خواستی خودا بە جيهانـدا لـە عـەرز و لـە ئاسماندا و، بە ياسای تەسەڕروفاتی خودا لـە جيهانـدا واسـيتەن لـە بـەينی خـودا و مـەخلووقاتی خودادا؛ هەندێ لەو فريشتانە نێرراون بۆسەر هەندێ فريشتەی تر، هەندێكيان بۆسـەر بنيـادەم بـۆ ئيلهام و پێ‌گەياندن و نەشئونمايان.

هەروەک چۆن شەيتانەكان وەسوەسە وتوويرەی نابار دەخەنە دڵی ئادەمزادەوە ﴿إنّ الشـياطين ليوحون الی أوليائهم ليجادلوكم...﴾ [١٨] وەها فريشتەيش بيروباوەڕی جوان و پيرۆز دەخەنـە دڵـی موسوڵمانانەوە ﴿إن الذين قالوا ربنا الله ثم استقاموا تتنزل عليهم الملائكة آلّـا تخـافوا و لا تحزنـوا و أبشروا بالجنة التی كنتم توعدون﴾ [١٩].

هەروەها هەرچی لە جيهاندا خودا دروستی بكات و لە نەبوونەوە سـەر بێنێتـە ەر فريشـتەيەک دياری دەكرێ بـۆ چـاودێری و پـەروەردەكردنی، بـە پێـی فـەرمانی خـودا ئـەو فريشـتە تـەدبير تەسەڕروف دەكات لەو شتەدا، وەكو خودای گەورە فەرموويەتی ﴿والسابحات سبحاً فالسابقات سبقاً فالمدبّرات امراً﴾ [٢٠] واتە: قەسەم بەو فريشتانەی كە بە وێنەی مەلەوان لە نـاو دەريـادا بـە رەوانی دەرۆن و پەلەئەكەن و پێش ئەكەون بۆ بەجێ‌ێنانی فەرمانی خـودا، قەسـەم بـەو فريشـتانەی كـە لەسەر فەرمانی من تەدبيری ئيش و كاری مەخلووقات ئەكەن.

ئەم ئايەتە پيرۆزە دەليلە بۆ ئەوەی كە كاروباری ئاسمان و ئەستێرەكان و هاتوچۆيـان لەسـەر ميحوەر و مەداری تايبەتی و لەسـەر ميـزانی موناسـب، هـەروەها كاروبـاری دەريـا، داگيركـردنی وشكانی و كشانەوەی بۆ ناو، هەستانی هەور بە گێژ و سووڕی بای وەشت، تـەم و مـژی كۆسـاران، هەڵم و هەڵچوونی و بوونی بە هەور، بەفر و تـەرزە و بـاران، شـەونم و ئاونـگ، هەرچەنـد لەسـەر ياسای تايبەتيی جيهان دێنە رووی كـار، هـەموو ئەمانـە فريشـتەی خـودا مـەئمووره لەسـەريان، تەنانەت تكتكی باران، كلووكلووی بەفر، دانەی تەرزە، تەڵ تەڵی گيـا و، لقـی دار، گـەڵای داران، گوڵی باخان هەموو وان لە ژێـر چـاودێری و پـەروەردەكردنی فريشـتەی خـودای گـەورەدا و بـە ويستی خودا خۆی.

(مەولەوی) دەفەرموێ: هەرچی من لەم ریسالەدا نەموتووە یـاخۆ بـە کـورتی باسـم کـردووە و درێژەپێدانی دەوێ، هەموویان فریشتەیان لەسەرە.

لە راستیدا (زەڕڕە) یەک لە (کائینات) بە بێزانست و خواست و توانای خـودا نایێتـەجێ و، بـە دەوام خواست و دەستەڵاتی خودا پێوەندی پێوە هەیە و، لەسەر ئەو یاسـا و رێ و شـوێنە کـە بـە حیکمەتی خۆی دیاریی کردووە لە جیهانـدا و لـە نـاو کائینـاتدا ئـەم فریشـتانە فەرمانبـەرداریی خۆیان جێبەجێ ئەکەن. ئەمانە هەموو ئەسبابی عادەتین بۆ بەجێهـاتنی خواسـتی خـودا (جـلّ جلاله).

هەروەها (مەولـەوی) دەفـەرموێ: بـە پێـی فـەرمودەی پێغەمبـەر(د.خ) هـەموو ئینسـانێکی موسوڵمان سەدوشەست فریشـتە پاسـەوانیی دەکـەون و نایەڵـن شـەیتانەکان بیفـڕێنن. لەسـەر فەرموودەی زانایان مەبەس لەم فڕاندنە تەنها فڕاندن نییـە، گـەلێ شـتی تـریش هەیـە پێویسـتە ئادەمزادیان لێ بپارێزێ وەک دەسبردن بۆ عـەقڵ و هۆشـی و ئـازاری تـر. خـودای گـەورە لـە قورئاندا فەرموویەتی: (و هو القاهرُ فوقَ عباده، و یرسـل علـیکم حفظـةً) [٢١] واتـە: خـودا زۆردار و غاڵبە بەسەر بەندەکانیدا و چەن پاسەوان دەنێرێت بۆتان. هەروەها فەرموویـەتی: (إن کـلُّ نفـسٍ لمّا علیها حافظ) [٢٢] واتە هەموو نەفسێ پاسەوانێکی خودای لەسەرە، وە فەرموویەتی: (له معقبات من بین یدیه و من خلفه یحفظونه مـن امـر الله) [٢٣] واتـە: چەنـد فریشـتەیەک هـەن ئـادەمزاد دەپارێزن، لە هەر حاڵێکدا بێ، ئەو فریشتانە یەک لە دوای یەک لە پشـتیەوە و لـە بەردەمیـەوە و لای راست و چەپیەوەن و، بە فەرمانی خودا لە زیان و شـتی نالـەبار دەیپـارێزن. جـا بـە راسـتی هەرکەسێ تەماشای حاڵی خۆی بکات لە ماوەی ژیاندا و لە کاتی نووستندا و لە کاتی بێدەستی و داماویدا و، وردبێتەوە لە کارسازیی خودا بۆ ئینسان و پاراستنی لە گـەلێ مەترسـیی ئـاگر و ئـاو و زیانی ئینسانی ناپیاو و لە مار و مێروو و کرمـی پیسـی ژاراوی، زۆر چـاک بـاوەڕ بـە میهرەبـانی و چاودێریکردنی خودای گەورە دەکات؛ هەزار رەحمەت لەوەی وتوویە:

تا خوا یارە مەترسە لە کەس　　　لە یارییش دەرچوو نییە فریادڕەس

بێگومان ئەم فریشتانە وەک هەموو هۆیەکانی تر چەند هۆیەکی عادەتین، ئەگینا خوای گەورە خۆی پارێزگارە و، ئەو نەبێ کەس ناتوانێ هیچ بپارێزێ.

بـــەعزێ بـــۆ بەهەشـــت خەزێنـــەدارە
لەناویانـــــدا ریـــــزوان ســـــەردارە

بــــەعزێ خەزەنـــــەی دۆزەخ و نـــــارە
بــۆ ئـــەو دەســـتەیچە مالیــک ســـالارە
زەبانیــــە یانــــێ: نەســـــەقچیی ســـــەقەر
یـــا ئـــەو خەزەنـــە وتمـــان لەمەوبـــەر
حـــــەق فەرمووگیــــە «تســـعة عشَـــرْ»
نــــۆزدە ســــینفن یـــا نـــۆزدە نەفـــەر
حەفـــــەزە یانـــــێ: کەتەبــــەی کــــیرام
دوو بە شەو، دوو رۆژ راس و چـەپ مـەقام
ئی راس خێرنویس، ئی لای چەپ شـەروور
ئی لای راس ئەمیر، ئی لای چەپ مەئموور
دەڵێ: تا هــەفت سـات مـەینویس جـارێ
بــەڵ تەســـبیحێ کـــا یـــا ئیســـتیغفارێ
ئـــی راس چـــون کـــەرەم حـــەق بـــێپایانــە
چاکــــە دەنویســـــێ بـــــە دە چەندانــــە
فریشــــتەی ســــوئال عـــــەزابی قــــەبران
چـە بـۆ موسولـمان چـە بـۆ کـافران[٢٤]
دوو شەخســـن ناویـــان مونکـــەر و نـــەکیر
یـــا بـــۆ موسولـــمان موبەششـــیر، بەشـــیر

خێرنویس: خێرنووس. شەروور: جەمعی شەڕە، مەبەست ئەوەیە هــی لای چــەپ شەڕنووســە. دەستەیچە: دەستەیشە. نەسەقچی: ئازاردەر. فەرمووگیە: فەرموویە، وتوویــە، بــۆ گــەورە بــە کــار ئەهێنرێ. ئی: هی. سات: سەعات. مەینویس: مەینووسە.

واتە: هەندێ لە فریشتەکان خزمەتکردنی دانیشـتوانی بەهەشـتیان پـێسـپێرراوە، سـەرۆکی ئەمانە ناوی (رضوان) ە، هەندێکیشـیان سـزادانی دۆزەخییـەکانیان دراوەتـە دەسـت و، خـەریکی ئازاردانی ئەوانن، سەرۆکی ئەمانە ناوی (مالک) ە، وەک خـوای گـەورە فەرموویـەتی: (و نـادوا یـا مالک لیقضِ علینا ربک قال انکم ماکثون) [٢٥] واتە ئەهلی دۆزەخ بانگ لـە مالیـک دەکـەن: ئـەی

مالیک! تکایە عەرزی بارەگای خودا بکە بەڵکو بە تەواوی لە ناومان بەرێ و شوێنەوارمان نەهێڵێ؛ ئێمە بەرگەی ئەم سزایە ناگرین، ئەویش وەڵامیان ئەداتەوە و ئەڵێت: ئێوە ماونەتەوە لە دۆزەخدا و دەبێ بمێننەوە.

فریشتەی زەبانییە واتە: ئەوانە کە نەسەق‌چین، یانێ ئازاردەر و خەڵک ریسواکەرن و، کاروباری رێک‌وپێکیی سزای دۆزەخیان پێ سپێرراوە، جا ئەم زەبانیانە چ ئەوانەی پێشوو بن یان غەیری ئەوان بن نۆزدە تائیفە یا نۆزدە کەسن وەک خوا فەرموویەتی: (علیها تسعة عشر) [٢٦] واتە: لەسەر دۆزەخ نۆزدە تائیفە یا نۆزدە شەخس مەئموور و کاربەدەستی سزادانن، والله اعلم.

هەروەها حەفەزە بەو فریشتانە دەوترێ کە کردەوەی ئادەمزاد زەبت دەکەن و نووسەری دەفتەری کردەوەین، دوان لە شەودا و دوان لە رۆژدا، یەکێ لەسەر شانی راست و یەکێ لەسەر شانی چەپ وەک خودای گەورە فەرموویەتی: (و أن علیکم لحافظین * کراماً کاتبین) [٢٧].

فریشتەی لای راست نووسەری کردەوەی چاکەیە و ئەوی لای چەپ هی کردەوەی بەد. یەکەم فەرماندارە و دووەم فەرمانبەر، یەکەم ئەمر بە دووەم دەکات کاری خراپ نەنووسێ تا ماوەی چەند سەعاتێک؛ بەڵکو کابرا لەوماوەدا لەو تاوانبارییە پەشیمان بێتەوە، ئەوی لای راست لەبەر زۆریی میهرەبانیی خودا هەر کردەیەکی چاکە بە دە چەندان دەنووسێت.

بۆ پرسیار لە مردوو لە گۆڕدا، چ موسوڵمان و چ کافر، دوو فریشتە تەرخان کراون، واتە: بۆ موسوڵمان دوو، بۆ کافر دوو، ئەو دوانەی پرسیار لە موسوڵمان ئەکەن ناویان (مبشّر) و (بشیر) ە، هی پرسیار لە کافرانیش ناویان (مُنکَر) و (نکیر) ە، بەڵام فریشتەی سزادانی مردوو لە گۆڕدا زۆر زۆرن، هەر خودای گەورە ئەزانێ چەندن.

شایانی باسە: مەبەس لە پرسیاری گۆڕ پرسیارە لە مردوو پاش ئەوەی دەسبەرداری خەریک‌بوونی لەشەکەی ئەبن، ئیتر لە گۆڕدا بێ یا لە دەریا، یاخود بسووتێنرێ، تەنانەت تۆزەکەیشی بدرێتە دەم باوە و هەر تۆزقاڵێکی لە شوێنێکدا بنیشێتەوە.

بەعزێ سەر بەعزێ هەیە شەرەفیان
بەڵێ ئەفزەلی گشت مەلائیکان
ئەوانە پێیان دەوێژن (خواصّ)
کە چوار سینفن دەگەڵ چوار ئەشخاس

چـــوار ســـینفەکان موقــــەڕڕەبوونن
نزیکـــی حـــەزرەت بارگـــەی بێچـــوونن
(کەڕڕووبی) ن مەلەک عـەزاب و نیقمـەت
(رووحانی) ن مەلەک رەحمەت و نیعمەت،
حەمەلـــەی عەرشـــن یانـــیٚ ئەوانـــە
عەرشـــی عـــەزیمیان هـــەر لەســـەر شـــانە
ئەمـــڕۆ چـــوارن وەخـــتی جەمالـــە
لـــە قیامەتـــدا وادەی جەلالـــە
هەشت کەسن یا هەشت سینفی بێشومار
(جَـــلَّ جـــلالُ الواحـــد القهّـــار)

بەعزێ سەر بەعزێ: بەعزێ لەسەر بەعزێ. دەوێژن: دەڵێن. دەگەڵ: لەگـەڵ. بارگـە: بارەگـا. بێچوون: زاتی خوا. بێشومار: زۆر، لە ژمارە نەهاتوو.

واتە: نەوعی فریشتە خودا وای دروسـت کـردوون هەنـدێکیان پلـە و پایـەیان لـە هەنـدێکیان زیاترە. گەورەترینی فریشـتە چـوار سـینف و چـوار شەخسـە، ئەمانـە پێیـان ئەڵـێن (خـواس)ی مەلائیکە.

سینفی یەکەم لەو چوار سینفە پێیان دەڵێن (مقرّبون) واتـە: نزیکـانی بارەگـای پـەروەردگار و بەڕێز لە حوزووری خودای گەورەدا.

سینفی دووەم: (کەڕڕووبی) یان پێدەڵێن کە مەئمووری ئازارن و سزایان پێ سپێرراوە.

سینفی سێهەم: (رووحانی) یان پێ دەڵێن، کە فریشتەی خێر و پیرۆزین.

سینفی چوارەم: ئەوانەن کە عەرشی خودایان هەڵگرتووە.

چـــوار شەخســـەکان یـــەکێ جیبرەئیـــل
ســـاحیبی وەحـــی و پـــەیغام و تـــەنزیل
میکائیـــل بـــۆ قـــەبز بـــۆ بەســـتی زەمـــین
بـــۆ تـــەعیـ نی رزق بووگـــە بـــە ئـــەمین
عیزرائیل بۆ نەبز رۆح ساحیب دوستوور
ئیسرافیل ساحیب ئەمری نـەفخی سـوور

(صور) یچ شاخێکە فووی دەکا پێدا
بە عەدەد ئەرواح کونای وا تێدا
دووجار فووی پێدا دەکا حەوالە
(بین‌النفختین) موددەی چل سالە
لە نەفخەی ئەووەڵ بەرزان دەون پەس
زیڕووح گشت دەمرن نامێنێ هیچ کەس
کە نەفخەی دووەم ناکاو سەدای بێ
دووبارە هەموو گیانیان پێدا تێ
ئەمما حەمەلە و چوار شەخسەکان
لە هەر دوو نەفخە ئەوان موستەسنان
دەمرن و زیندگ دەونەوە سەرجەم
پاشتر لە ئەووەڵ، پێشتر لە دووەم
بەعسیان وەک خەلق بەر لە گشتانە
مردنیچیان لە دوای هەموانە

پەیغام: نامە، راسپێری. بووگە: بووە. کونا: کون. بەرزان: شوێنە بەرزەکان. دەون: دەبن. پەس: پەست، نزم. ناکاو: لەپڕ، کوتوپڕ. زیندگ: زیندوو. مردنیچیان: مردنیشیان.

واتە: ئەو چوار شەخسەیش یەکەمیان جیبرەئیلە کە ئەمینی خودای گەورەیە بۆ گەیاندنی کتێبی خودایی کە مەشهوورە بە (وەحی) بۆ لای پێغەمبەران(د.خ).

خودای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ (نَزَل به الروح الأمین علی قلبک لتکون من المنذرین بلسان عربی مبین) (۲۸).

دووەمیان: میکائیلە کە فەرمانی دان و گرتنەوەی رزق و رۆزی و فەڕ و بەرەکەت و قات و قڕیی سەرزەویی پێ سپێردراوە.

سێهەمیان: عیزرائیلە کە مەئمووری گیان‌کێشانی هەموو گیان‌لەبەرانە و، مەئموور و بەردەستی زۆریشی هەیە وەک خودا دەفەرموێت (توفتهم رسلنا و هم لا یفرطون) (۲۹).

چوارەمیان: ئیسرافیلە، ئەمیان ئەوەی پێ سپێردراوە فوو بە (صور)دا بکا، ئەم سوورە شاخێکە بە ژمارەی گیان‌لەبەران کونی تێدایە. حەزرەتی ئیسرافیل دووجار فوو بەو شاخەدا دەکات، بە

یەکەم فوو هەموو گیان‌لەبەران ئەمرن و، هەرچی کەژ و کێو هەیە هەموو تـەخت دەبـن، هـەرچی گیان‌لەبەریشە هەموو دەمرن، بە فووی دووەمیش هەرچی مـردووە زینـدوو دەبنـەوە، بـەلام ئـەو فریشتانەی هەڵگری عەرشن و ئەو چوارەی کە باسمـان کـردن (جیبرائیـل، میکائیـل، عیزرائیـل، ئیسرافیل) ئەمانە مردن و زیندووبوونەوەیان بەم دوو فووە نییـە، ئـەمان لـە پـاش مـردنی هـەموو گیان‌لەبەران دەمرن و لە پێش زیندوو بوونەوەیان زیندوو دەبنەوە.

خەواســی مەلــەک هەیــە فەزلــیان
وەســەر بەشــەردا ســیوای ئــەنبیان
عــەوامی بەشــەر ســولەحا و ئــەولیا
فەزلی هەس وەسەر عەوامی مەلـەکدا
عەوامی مەلەک فەزلی هـەس وەســەر
گونەهکارانــدا لــە فیرقــەی بەشــەر
(و فــی مــا بــین الخــواص کــلام)
بــەر نــەبی و ئــەوان ســەلات و ســەلام

شایانی باسە و پێویسـتە بـزانن کـە (خـواس)ی بنیـادەم پێغەمبـەرانن(د.خ)، جـا لـەم رووەوە مەولەوی ئەفەرموێ (خواس)ی بنیادەم کە پێغەمبەرانن پایـەیان لـە پایـەی (خـواس)ی فریشـتە بەرزترە، هەروەها (خواس)ی فریشتە پایەیان لە پایەی (عـوام)ی بنیـادەم بـەرزترە. مەبەسـت لـە عەوامی بنیادەم ئەولیا و پیاوچاکانن کە بە پێی شەرع (عادل) بن و لەخواترس بن، جا ئەم عەوامی بنیادەمە پایەیان بەرزترە لە عەوامی فریشتە، واتە غەیری چوار سینف و چوار شەخسەکە.

عەوامی فریشتەیش پایەیان لە پایەی بنیادەمی موسوڵـمانی ناعـادل و گوناهبـار بـەرزترە. کـە دەڵێین (خواس)ی فریشتە لە (عـوام)ی ئـادەمزاد پایەبـەرزترن، بەڵـگەمان قورئـانی پـیرۆزە کـە دەفەرموێ فریشتە (معصوم) ن، بەلام نەیفەرمووە (عوام)ی ئادەمزاد (معصوم) ن.

فەزڵ و گەورەیی خەواسی ئادەمزاد کە پێغەمبەرانن بەسەر خەواسی فریشتەدا، هەروەها فـەزڵ و گەورەیی عەوامی ئادەمزاد کە پیاوچاکانن بەسەر عەوامی فریشتەدا ئەوە لەبەر چەند بەڵگەیەکە:

یەکەم: خودا ئەمری فەرموو کە فریشتە کوڕنووشی ڕێز بەرن بۆ حەزرەتی ئادەم (علیەالسـلام).
دیارە ئەوەی کە تێی بگەین ئەوەتە کە خوا ئەمری فەرمووە نزم کوڕنووش بۆ بەرز بەرێ.

دووەم: هەموو زانایان دەزانن بۆیە خوا هەموو زمانەکانی بە ئـادەم فێرکـرد هـەتا فـەزڵ و پایـە بەرزیی ئەو بەسەر فریشتەکاندا دەربخات.

سـێهەم: ئـادەمزاد گیـرودەی ئـارەزووی نـەفس و خـوو و خـدەی ناپەسـەندە، وەک رق و حەسـوودی و قـینهەڵـگرتن و بەرچاوتـەنگی... تـاد، کـە فریشـتە لەوانـەوە دوورە. بـێ گومـان خوداناسین و خواپەرسـتی و خـاوێنی لەگـەڵ بـوونی کۆسـپدا ئـەجر و پاداشـی زۆر زیـاترە لـە خواپەرستی و خواناسینی ئەوانەی کۆسپیان لەرێدا نییە.

دیارە فەزڵ و گەورەیی عامەی فریشتە بەسـەر گوناهبـارانی ئـادەمزاددا شـتێکی ئاشـکرایە و بەڵگەی ناوێ.

ئەم باسەی کە نووسیم لەبەر رووناکیی نووسینی زانای پایەبـەرز سـەعدی تەفتازانییـە کـە لـە شەرحی کتێبی (عقائد)ی (نەسەفی)دا نووسیویەتی.

باسی گەورەیی و بچووکیی فریشتەکان لە ناو خۆیاندا، ئایا کـام لـە چـوار سـینفەکە گـەورەترە لەوانی تر، یا لە ناو چوار شەخسەکەدا کامیان لەوانی تر گەورەترە؟ قسـەی تێـدا کـراوە و، ئـەوی بیەوێ زۆرتری لێ بزانێ کتێبە درێژەکان دەخوێنێتەوە.

***

١ـ لە چاپەکەدا سەرباس (مبحث وصف الملائکة)ە. لە دەستنووسەکەدا سەرباس نییە بێجگە نەخش و نیگارێک کە باسێک لە باسێک جیا دەکاتەوە، من سەرباسەکەی لەمەڕ چاپەکەم دانا، ئەگـەرچی دەبـوا (الاصـل الثـانی مـن الاصول الستة الایمان بالملائکة) بوایە، وەک لە یەکەم بەیتەوە دەردەکەوێ.

٢ـ ئایەتی (٣٠)ی سوورەتی (بقره).

٣ـ ئایەتی (٣٠)ی سوورەتی (بقره).

٤ـ ئەمە شێوەنووسی چاپەکەیە، دیارە کە شیعری دوایین باسی (مفتوحی)ی لامەکەی دەکـات لێـرەدا لامەکـە (مکسور) ە، بەڵام تێکڕا داڕشتنەکەی تەواو نییە. هی نوسخە دەستنووسەکە (ملکیین) ە، کـە هەڵـەیە. مـن لەبـەر رووناکیی ئەم شێوەنووسە هەڵەیە وای بۆ دەچم کە راستەکەی (مَلکینن) = (مەلیکەینن)ە بـەم جـۆرە (هـارووت و ماڕووت) دەبنە موبتەدای دواکەوتوو و (مەلیکەینن) دەبێتە خەبەری پێشکەوتوو.

٥ـ لە نوسخە چاپەکەدا «چاک دا دیاری»یە.

٦ـ ئایەتی (١٠٢)ی سوورەتی (بقره).

٧ـ ئایەتی (٦)ی سوورەتی (تحریم).

٨ـ ئایەتی (٣٠) و (٣١)ی سوورەتی (حجر).

٩ـ ئایەتی (٢٧)ی سوورەتی (حجر).

١٠ـ ئایەتی (٥٠)ی سوورەتی (کهف).

١١ـ ئایەتی (١)ی سوورەتی (فاطر).

١٢ـ ئایەتی پێشوو.

١٣ـ ئایەتی (٢٠)ی سوورەتی (تکویر).

١٤ـ ئایەتی (٥)ی سوورەتی (نجم).

١٥ـ ئایەتی (٣١)ی سوورەتی (مدثر).

١٦ـ ئایەتی (١٦٤)ی سوورەتی (صافّات).

١٧ـ بۆ هاوتایی ئاخری هەردوو نیوە بەیتەکە ئەبوو بیوتایە (خەلق و خالیقن)، بەلام چ لە دەستنووس و چ لە چاپدا وا نووسراوە کە ئێمەیش لێرەدا نووسیومانەتەوو. دیارە لەبەر ئەوە (خالیقی) پێش خستووە کە خالیق خوایە و لە پێش خەلقەوە بووە و واسیتەکەیش لە لای ئەوەوە دێ بۆ لای خەلق.

١٨ـ ئایەتی (١٢١)ی سوورەتی (انعام).

١٩ـ ئایەتی (٣٠)ی سوورەتی (فُصِّلت).

٢٠ـ ئایەتی (٣، ٤، ٥)ی سوورەتی (نازعات).

٢١ـ ئایەتی (٦١)ی سوورەتی (انعام).

٢٢ـ ئایەتی (٤)ی سوورەتی (طارق).

٢٣ـ ئایەتی (١١)ی سوورەتی (رعد).

٢٤ـ (چە)ی یەکەمین شێوەنووسی چاپەکەیش و دەستنووسەکەیشە کە بە شێوەنووسی ئەمڕۆ (چ) دەنووسرێت. هی دووەم لە چاپەکەدا (چو) وە، بەلام هەڵەیە. ئەویش لە راستیدا هەر (چە) یە.

٢٥ـ ئایەتی (٧٧)ی سوورەتی (زخرف).

٢٦ـ ئایەتی (٣٠)ی سوورەتی (مدثر).

## مبحث الايمان والتصديق بجميع الكتُبُ السّماوية[1]

ئەســـــلی سالیســــــمان تـــــاقی بزانـــــه
تەســـــدیقه بـــــه جـــــەمع ئـــــەو کتێبانـــــه
بـــه نەقشـــی حـــادیس عەجـــەب شـــەرەفناک
مەنقووش له رووی ساف سەفحەی تەختەی پاک
یـــا بـــه ئـــەلفازی مورەتتەبـــەی خـــۆش
بـــه زوبـــانی پـــاک فریشـــتەی بـــێغـــەش
(رحمـــةً) خـــالیق گشـــت عالـــەمییان
نـــاردگنی ئەســـەر بـــەعزێ ئـــەنبیان
ســـەد و چـــوارن بـــه قـــەولی مەشـــهوور
تـــۆ لـــەو عـــەدەددا مـــەیانزان مەحســـوور
ده ئەســـەر ئـــادەم، پـــەنجاه ئەســـەر شـــیس
ســـی نـــازڵ بووگـــه ئەســـەری ئیـــدریس
ده ســـەر ئیـــبراهیم ســـەده تـــەواوه
ئەمانـــه هـــەر ســـەد ســـوحوفیان نـــاوه
زەبـــوور بـــۆ داوود، تـــەورات بـــۆ مووســـا
ئینجیـــل هاتەســـەر حـــەزرەتی عیســـا

فورقـــــان بــــۆ حــــەزرەت (ســــــیدالانام)
(علیــــــه الصــــــلاة، علیــــــه الســــــلام)

تاقی، تاقیق، تەحقیق: بە راستی. ناردگنی: ناردوونی. مەیانزان: مەیانزانـە. ئەسـەر: بـۆ سـەر. بووگە: بووە.

واتە: ئەسڵی سێهەم لە شەش ئەسڵی ئیمان باوەڕکردنە بـە هـەموو ئـەو کتێبانـەی کـە خـودا ناردوونی بۆ سـەر هەنـدێ لـە پێغەمبـەرە رەهبـەرەکان(د.خ). ئـەو کتێبانـەی کـە بـە نەخشـی (حادث)ی جوان لەسەر رووی تەختەی سافی بێ‌گـەردی (لـوح المحفـوظ) نـەخش کـراون و بـە لەفزی ریزکراوی خۆش لە سەر زوبانی فریشتەی ناسک سروشت کە جیبرەئیلی ئـەمینی وەحیـە بە سەر پێغەمبەرە رەهبەرەکاندا خوێنراوەتەوە.

مەشهوور وایە ئەم کتێبانە سەد و چوارن، بەڵام تۆ وامەزانە کە هەر ئەم ژمارەنـە، چونکـە خـودا خۆی فەرموویەتی: (و ان من أمة إلّا خلا فیها نذیر) [٢] واتـە: هـیچ کۆمەڵـە ئـادەمزادێ نییـە لـە جیهانـدا کـە خـوا رەهبـەرێکی نەناردبێتـە سـەریان بـۆ ئـەوەی لـە ئـەنجامی نافـەرمانیی خـودا بیانترسێنێ، واتە ژمارەی پێغەمبەران گەلێ زۆرە (منهم من قصصنا علیک و منهم من لم نقصـص علیک) [٣] لەبەر رۆشنایی ئـەم ئایەتانـەدا وادیـارە زۆر لـە پێغەمبـەرەکان(د.خ) نـە خۆیـان و نـە کتێبیان باس نەکراون و ژمارەی کتێبەکانیان دیار نییە.

لەو سەد و چوار کتێبە مەشهوورە (دە) هاتووە بۆ حەزرەتی ئادەم، (پەنجا) بۆ حەزرەتی شـیس، (سی) بۆ حەزرەتی ئیدریس، (دە) بۆ حەزرەتی ئیبراهیم. ئەمانە سەدن. ئەم سـەدە لە قورئانـدا بـە (صُحُف) ناوبراون.

هەروەها زەبوور بۆ حەزرەتی داوود، تەورات بۆ حەزرەتی مووسا، ئینجیل بـۆ حـەزرەتی عیسـا، قورئان بۆ حەزرەتی (محمد المصطفی) ؛ دروودی خوایان لەسەر بێ؛ هاتووە.

ئەم زاتانە کە کتێبیان هەبووە لە شەریعەتدا بە رەسـوول ناوئـەبرێن، چ سـەربەخۆ بـۆ خۆیـان هاتبێ یا خۆ لە پێشدا بۆ پێغەمبەرێکی تر هاتبێ و، خودا لە پاشاندا بە پێغەمبەرێکی‌تر بڵـێت بـەو کتێبە پێشووە رەفتار بکە، وەکوو گەلێ لە پێغەمبەرەکانی بـەنی ئیسـرائیل کـە هـەر بـە تـەورات رەفتاریان کردووە.

ئەو پێغەمبەرانەش کە کتێبیان نەبووە و ئەمریان پێ نەکراوە بە تەبلیغ بە (نبیّ) ناوبران. ئەمانە ژمارەیان گەلێ زۆرە.

تەسـدیقت بـوێ کـە هـەموو حـەقن
کـەلامی قـەدیم حـەقی موتڵـەقن
سـیفەتی قـائیم بـە زاتی بـێڕەنـگ
نییەن لە قەبیل جینسی حەرف و دەنگ
نـە لـە زیهـن و حـەفز، نـە لـە زوانـدا
نـە لـە لـەفز و گـوێ نـە لـە بەیانـدا
لـە هـیچ کامیـدا نییـە حولوولیـان
بـا لـەوانیچ بـێ ئـەوە فامینیـان
غەیرە مەخلووقن بە بـێڕەیـب و شـەک
نە بەستەی نەبیان نە بەستەی مەلـەک

واتە: تەسدیق و باوەڕت ببێ کە ئەم کەلامانە هەموو حەق و سابت و موافیقی واقیعن و کەلامی قەدیمی زاتی (واجبالوجود)ی موتڵەقن و سیفەتێکی بێڕەنگن بە زاتی بـێڕەنگـەوە راوەسـتاون، ئەم کەلامە بە ئیعتیباری مەبدەئەکەی کە زاتی قودسییە لە بابەتی حەرف و دەنگ نییە، لە زیهنی کەسدا، لە حیفزی کەسدا، لە زوبانی کەسدا، لە گوێی کەسدا، لە بەیان و تـەعبیری کەسـدا نییـە، هەر چەند ئێمە قابیلییەتی ئەوەمان هەیە لێی تێ بگەین و واتاکەی بزانین.

هەروەها ئەم کەلامە قەدیمە و نەبوونی لێ پێش نەکەوتووە و نەبوونیشی بەسـەردا نایـەت، نـە پێوەندی بە پێغەمبەرانەوە هەیە و نە بە فریشتەوە.

بەڵام بە ئیعتیباری کەلامە لەفزیەکە ئەوا ئەو کەلامە دەبیسرێت و دەخوێنرێتەوە و هەر حاڵـێ بۆ لەفز مومکین بێ بۆ ئەمیش مومکینە.

هـەر چییـان تێـدا هەیـە یەکسـەری
هەموو راس، لـە کیـزب لـە خـولفن بـەری
بـۆ تەخـەللوفی بـەعزێ وەعیـدات
ئەگـەر بشـنەوی هەیـە تـەوجیهات؛
مەشرووت بە چەند شەرت جەلییە یا خەفی
بـەعزێ لـە شـەرتان دەوێ مونتـەفی

یـــا خـــۆ موقەییـــەد بـــە مەشـــیئەتە
عـــەزابی دا عـــەدل، نەیـــدا رەحمەتـــە
یا خولف مەخسووسی وەعـدە نـەک وەعیـد
بـە نـەقڵ و بـە عـەقڵ بـۆی هەیـە تەئییـد
یـــا یـــەعنی: عاســـی خـــۆ موســـتەحەقە[٤]
بـە عـەزاب، ئـەمما عـەفوی حـەق حەقـە
یـــا خـــۆ ئینشـــایە بلـــێ نـــەک خەبـــەر
ئـــەر بەخەبـــەر بی وتمـــان لـــەگرەو بـــەر
ئـــەم تەوجیهیانـــە بـــە چـــاکتر بنـــاس
کـە لـە عوموومـات مـەعفوو موستەسـناس

ئەر بەخەبەر بی: ئەگەر ئاگادار بی. لەگرەوبەر: لەمەوپێش.

واتە: هەرچی لە ناو ئەو کەلامانەدا هەیە هەموو راستن و، هـەرچی (وعـد) و (وعیـد) بەڵـێن و هەڕەشەیان تێدایە هەموویان دێنە جێ و لە نەهاتنەدی دوورن.

جا ئەگەر کەسێ بڵێت سابت بووە لە دینا کە گەلێ لەو تاوانبارانە ئازار نادرێن و عـەفو دەکـرێن کەوابوو هەندێ لەو هەڕەشانە نایەنەجێ و ئەمەیش ـ خوا نەخواستە ـ دەبێتە درۆ، لە وەڵامدا دەڵێم ئەو رەخنەیە بە چەند جۆرێک دەدرێتە دواوە:

یەکەم: ئەو هەڕەشانە لە مەعنادا بەسراون بە چەند شەرتێکەوە، بۆ نموونە:

تاوانبار سزا دەدرێت ئەگەر کەس (شفاعت) تکای بۆ نەکات، یا ئەگـەر لـەو تاوانـەی پەشـیمان نەبێتەوە و بڕیار نەدا کە نەگەڕێتەوە سەری، یا ئەگەر کارێکی چاکی وەها نـەکات کـە کـارە بـەدە گوناهەکە رامالێت و لای بات؛ خودا فەرموویەتی: (و من أحیاهـا فکأنمـا أحیـا النـاس جمیعـاً) [٥] بێگومان ئەو نەفس رزگارکردنـەی گوناهـەکانی دادەپۆشـێ (إنّ الحسـنات یـذهبن السّـیئات) [٦] هەروەها فەرموویەتی: (إلّا من تابَ و آمن و عمل عملا صالحاً فأولئک یبدّل الله سیئاتهم حسـنات و کان الله غفوراً رحیما) [٧]. پێغەمبەریش(د.خ) فەرمویەتی «و من سنَّ فی الاسـلام سـنَةً حسـنةً فله أجرها و أجر من عمل بها بعده من غیر أن ینقص من أجورهم شیء الحدیث»[٨].

دووەم: ئەوەیـە کـە بـەجێهێنـانی ئـەو هەڕەشـانە بەسـتراوە بـە خواسـتی خـوداوە؛ ئـەوەتا دەفەرموێ: (فیغفر لمن یشاء و یعذّب من یشاء) [٩] یا دەفەرموێ: (إن الله لا یغفر ان یشرک بـە و

یغفر مادون ذلک لمن یشاء) [۱۰] سیرری ئەوەیش کە خودا سزادانی بەستووە بە خواستی خۆیەوە ئەوەتە کە هەرچی هەیە و بووە و دەبێ هەمووی مولکی خۆیەتی؛ دیارە خاوەن‌مولک دەتوانێ تەسەرروف لە مولکی خۆیا بکات، جا ئەگەر سزای تاوانبار بدات عەینی عەدالەت و دادپەروەرییە و، ئەگەر عەفویشی بکات ئەوا رەحمەت و ئیحسانە.

سێهەم: ئەوەیە خیلاف‌کاری لە وەعدەدا عەیبە نەک لە وەعیددا بە دەلیلی عەقلی و نەقلی؛ دەلیلە عەقلییەکە: بە پێی هەلس‌وکەوت و داب‌ونەریتی خەلکی ژیر کەسێ هەرەشە لە کەسێ بکات و لە پاشا عەفوی بکات ستایشی دەکەن و دەلێن فلان دلپاک و سینە گوشاد و خاوەن کەرامەتە، بەلام ئەگەر کەسێ بەلێنێ بدات بە کەسێ و لە پاشا بەجێی نەهێنێ ئەلێن فلان رژد و بێ‌قەول و باوەرپێ‌نەکراوە.

دەلیلی نەقلیش ئەوەتە کە لە ئەنەسی کوری مالیک دەگێرنەوە، خودایان لێ رازی بێت، کە حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی «من وعد الله تعالی عملە ثواباً فهو منجز له، و من أوعده علی عمله عقاباً فهو الخیار».

چوارەم: ئەوەیە کە عیبارەتی ئەو هەرەشانە، ئەگەرچی بەدیمەن (ئیخار) ن بەلام بۆ (ئینشا)ی هەرەشە بەکار هێنراون، واتە عیبارەتەکە هی هەرەشەیە، هی ئەوە نییە کە لە کاتی خۆیدا سزاکە بدات، بەلام ئەم وەلامە بێ‌هێزە چونکە نرخێک بۆ هەرەشە ناهێلێت!

پێنجەم: ئەوەیە واتای هەرەشەکان ئەوەتە کە تاوانبارەکان شایانی سزادانن، واتە: ئەو کەسە کە بۆ نموونە، نوێژ بفەوتێنێ موستەحەقی فلان سزایە، بەلام لەگەل ئەوەیشدا کە ئیستیحقاقەکە هەیە ئەگەر خودای گەورە عەفوی بکات و لێی ببوورێ قەیناکا، چونکە بەجێ‌هێنانی سزاکە یا چاوپۆشی لێ‌کردنی مافی رەوا و شایستەی زاتی خودایە، ئەتوانێ بەجێی بهێنێ و ئەیشتوانێ لێی ببوورێ.

شەشەم بەلگەیەکە [کە] لە هەموو وەلامەکان باشترە؛ ئەوەیش ئەوەیە هەرکەسێ عەفو بێ لە سزا و ئازاردان لە راستیدا (مستثنی) دەرکراوە لە عموومی ئەو کەسانەی کە هەرەشەکەیان لێ کراوە، جا ئەگەرچی ئیستیسناکە لە رستەکەدا نەوتراوە، بەلام لە عیلمی خودادا هەیە و لە تێکرای کەلامیشدا نیازی کراوە؛ دەلیل لەسەر ئەم ئیستیسنایە ئەوەتە لە گەلێ ئایەتی قورئاندا لێبووردن و سزادان بە خواستی خواوە پێوەند کراوە وەک ئایەتی (فیغفر لمن یشاء و یعذب من یشاء) [۱۱]

دیارە ئەم پێوەندکردنە دەبێتە نیشانەی ئـەوەی هەرکـەس لـە سـزا عـەفو بکـرێ بـەر عومـوومی هەڕەشەکان ناکەوێت.

بی مانیع هەرگیز (نصوص) لانـەدەی
لە زاهـیر؛ دەشـێ ئیحتیـات بکـەی!
ئەو موددەعیی مەحز مەعنای باتینـە
ئیلحـــاد و کـــوفری تێـــدا کامینـــە
ئەو کەسیچ ئـەوا هـیچ تـێ نـافکرێ،
لە هەموو هەر مەحز زاهیری دەگـرێ
تەشبیهـ و تەجسیم هەڵدەگیرسـێنێ
لـــە زۆر قـــوڕاوی‌تـــردا دەمێنـــێ
قائیـــل بـــە زاهـــیر دەگـــەڵ ئیشـــارە
ئـــەوە ســـەفوەتی دڵـــی دیـــارە
هوەیداس کـەمال وەسـفی عیرفـانی
جیلوەی حەقیقـەت ئەسڵـی ئیمـانی
(طـــوبی لِمـــن فـــاز بـــذی الفضـــائل
هـــم أهـــل الفنـــا والبقـــا الکامـــل)

هووەیدا: ئاشکرا، هووەیداس: ئاشکرایە.

واتە: بە بێ مانیعێکی دیاری و ئاشکرا، دەخیلـت بم، هـەرگیز نەسـسی فـەرموودەی خـودا لـە مەعنا ئاشکراکەی لا نەدەی بۆ مەعنا نائاشکراکەی، چ لە ئایەتەکانی بیر و باوەڕدا و چ لە حـوکم و ئەخلاقدا؛ چونکە فەرموودەی خودا بۆ پێغەمبەران نێردراوە و بە زمانی کۆمەڵەکەی بۆ ئـەوەی بـە ئاسانی وەری‌بگرن و پەیڕەوی بکەن، دیارە لادانی نەسسی فەرموودەکە لـە مـەعنای ئاشـکرا دژی ئەو مەبەستە بەنرخەیە.

بەڵێ ئەگەر وشەیەکتان دی کە مەعنا ئاشکراکەی لەگەڵ مەعنای ئایەتە (محکم) ەکاندا رێـک نەدەکەوت، ئەوە بە ناچاری پێویستە تەئویل بکرێ و ببرێتەوە سەر مەعنای ئایەتە موحکەمـەکان؛ چونکە خودای گەورە ئایەتە موحکەمەکانی بە (ام الکتاب) واتە سەرچاوە و مەرج داناوە.

بێ‌گومان ئەوکەسە کە دەڵێت: فەرموودەی خودا مەعناکەی پەنهانە و کەس نایزانێ پێشەوای تایبەتی نەبێ ئەو کەسە لە دین لادان و کوفر و ئینکاری راستی لە دڵیدا و لە قسەکەیا شاردراوەتەوە و، مەستی ئەوەیە بەم فرۆفێڵانە خەڵکی لە رێگا لادات و، بە ئارەزووی خۆی مەعنا بۆ کەلامی خودا دابنێت. قورئان و کتێبە خوداییەکان لەفز و مەعنایان رووناک و ئاشکرایە؛ بۆیە خەڵک‌لادان لە رووناکی بۆ تاریکی ئەنجامی مل‌شکاندن و گومڕایی‌یە.

هەروەها ئەو کەسەیش کە هیچ تێ‌نافکرێ لە واتای ئایەتەکان هەتا بزانێ کام نەسسی فەرمووده زاهیرەکەی مەبەستە و کام نەس زاهیرەکەی مەبەست نییە و، لە هەموو نەسێ هەر مەعنا زاهیرەکەی ئەگرێ، ئەگەرچی دژی ئایەتە موحکەمەکان و عەقڵی عاقڵان بێ، ئەو کەسیشە ئاگری فیتنەی تەشبیهـ و تەجسیم هەڵدەگیرسێنێ، واتە: ئەیەوێ خوا بباتە سەر وێنەی مەخلووقات و (واجب‌الوجود) بخاتە سەر رێ و شوێنی مومکینات، کە ئایەتە موحکەمەکان دژی ئەوەن وەک ئایەتی (لیس کمثله شيء) یا (...لم یلد و لم یولد و لم یکن له کفواً أحد).

بێجگە لەوە ئەگەر لە هەموو ئایەتێکدا مەعنای زاهیر بە دەستەوە بگرێ و نەکەوێتە سەر باری رێک‌خستن و گونجاندن لەگەڵ ئایەتە موحکەمەکان‌دا خۆی لە ناو قوڕ و لیتەی تێک‌چوون و تێکداندا دەبینێتەوە.

ئەو کە بڵێت خودای گەورە دەست و چاو و روخسار و تەنشتی هەیە و تەماشای زاهیری ئایەتەکە بکات ئەبێ دان بەوەدا بنێ کە خوا لە ئاسماندایە و، لە هەمان کاتدا کە لەسەر عەرشە، هەروەها لە زەویدایە و، لە پاڵ هەموو زیندوویێکدا و، لە رەگی بناگوێی ئینسان نزیکترە و، بە راسەری هەموو نەخۆشێکەوە حازرە و، ئینسان روو لە هەر لایەک بکات خودا لەوێدایە، بێ‌گومان ئەوەی لەسەر ئەم رێبازە بڕوات دەکەوێتە گێژی دەریای موستەحیلات و، بە هیچ جۆرێ لە گیروگرفت رزگار نابێت. دیارە لە بەر ئەوەی تووشی مەحاڵ نەبێ پێویستە ئەو ئایەتانە بە جۆرێ لێک بداتەوە کە لەگەڵ ئایەتە موحکەمەکاندا بگونجێ، پێویستە واز لە مەعنای زاهیری بهێنێت.

بەڵێ ئەگەر زانایەکی هوشیار و بەختیاری دڵ و دەروون پاک و پڕ لە نوور ئەو مەعنایەی وەرگرت کە لە زاهیری ئایەتەکە دەردەکەوێت و لەگەڵ ئەوەیشدا حیسابی ئەوەیشی کرد کە ئەو ئایەتە ئیشارەیە بۆ هەندێ مەعنای ناسک و موناسبی وا کە دژی شەرع و ئایین نەبێ[۱۲]، دیارە ئەو زاتە دڵی ساف و نوورانییە و، فام و مەعریفەت داگیری کردووە و پرتەوی تیشکی ئیمان دڵ و سینەی پڕ کردووە. خوزگەم بەو کەسە کە گەیشتووەتە ئەم عیلم و گەورەیییە، بێ‌گومان ئەو

جۆرە ئینسانانە لە کۆمەڵی ئەهلی بەقا و فەنان، لەوانەن کە هەموو هێزی ماددییان تابیعی نەفسی (مطمئنه) یانە و، نەفسیان لە ئارەزووبازی و خووی ناپەسەند بە ئێجگاری دوور کەوتووەتەوە و خۆیان کردووەتە قوربانی خۆشنوودیی خودای گەورە، خودایش لەباتی ئەوە حاڵەتی بەقا و (خلود)ی (فی الشهود)ی پێ خەلات کردوون.

زۆر نزیکە مەبەستی (مەولەوی) لەم (فنا) و (بقا)یە ئەو دوو مەقامە بێت کە لە ناو سۆفییەکاندا باوە و لە سیفەتە دیارییەکانی (مرشد) رابەری (کامل) تەواون، واتە: ئەو زاتە خاوەن ئیشارانە لە ئەهلی فەنا و بەقان و لە دۆستە بێخەوشەکانی خودان و ئیشارەیان جێی بڕوا و متمانەیە.

هەرچی لە ئەحکام شەرعییە داڵە
رەددی لێ مەدە؛ کوفر و زەلالە
موتەشابیهیان سیرڕی ئیلاهین
لە مەعنایاندا مەخلووقات لاهین
بەعزێ ئاگاهی حەق دەدا پێیان
بەعزێ لەو سیرڕە کەشف دەکا لێیان
ئیمان بێرانە تۆ بە گشتیان
بێدەنگ لە مەعنا و لە کەیفییەتیان
هەروەکوو وتمان ئەر دەکەی تەئویل
باز هەم زەریفە ئیجمال یا تەفسیل

ئیمان بێرانە: ئیمان بێنە، باوەڕ بکە. باز هەم: دیسان هەم.

واتە: هەر ئایەتێک لەسەر بەیانی حەزرەت(د.خ) دەلالەت لە حوکمێکی شەرعی بکات دەخیلە رەددی نەکەیتەوە و ئینکاری نەکەیت، چونکە ردەکردنەوەی دەبێتە هۆی کوفر و گومڕاهی.

هەر ئایەتێکیش بە بیر و باوەڕی زانایانی ئایین لە ئایەتە موتەشابیهەکان بێت وەکوو سەرەتای هەندێ لە سوورەتەکان (الم، حم، حم عسق) تاد... بزانن ئەوانە نهێنییەکن لە نهێنییەکانی خودا و هەر ئەو مەعنایان دەردەخات و خەڵقی عادەتی ناتوانن روونی بکەنەوە، مەگەر هەندێ کەسی وەها کە خودای گەورە بە فەیز و ئیحسانی خۆی ئاگاداریان دەکا و هەندێ لەو نهێنیانەیان بۆ روون دەکاتەوە...؛ کەواتە تۆ باوەڕت بێ بە هەموویان، جا یا وەکوو پێشینانی دەروونپاک و کردارچاک بیاندەرە دەس عیلمی خودا و باسی روونکردنەوەی واتاکانیان مەکە و خۆت لە واتا و

چۆنیەتییان بێدەنگ بکە، یا وەکوو زانایانی ئایینی پاش ئەوان تەئویلیان بکە و، بە هێزی دەلیلی رووناکی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر بیانخەرە سەر مەعنایەکی راستی وەها کە لەگەڵ کرۆکی ئاییندا بگونجێت.

لــە بــەعزێ ئایــات ئــەو کتێبانــدا
لە لەفز یا لە حوکم یا لە هەردوانــدا
بۆ خاتری چەند فائیدە و حیکمەت
نەســخ جــائیزە و واقیعــە ئەڵــبەت
بە یەقین لە جــەمع بــاقی کتێبــان
وەجهی ئیمتیــاز بــۆ قورئــان بــزان
ناسیخە بۆ گشت؛ تێیدایــە یــەقین
عیلمی ئەووەلین عیلمی ئــاخیرین

واتە: هەندێ ئایەتی ئەو کتێبانە کە خودای گەورە ناردوونی بۆ پێغەمبــەران(د.خ) بــە تایبــەتی هەندێ ئایەتی قورئــانی پــیرۆز نەســخی هەنــدێ ئایــەتی تــر دەکەنــەوە، لەبــەر چەنــد فائیــدە و حیکمەتێک.

شایانی زانینە (نسخ) لە زمانی عەرەبدا واتــە: لابــردنی شــتێک و، لــە عــورفی زانســتی (اصــول فقە)دا واتە: لابردنی حوکمێکی ئایینی کە بە قسەی (شــارع) یــەعنی خــودا ســابت بووبــێ چ بــە خیتابی شاریع خۆی یا خیتابی پێغەمبەر(د.خ) واتە حەدیس، ئیتر ناسیخ و مەنسووخ نەس بن یــا خۆ لە مەفهوومی موافیق یا مەفهوومی موخالیف بن. بەڵێ لەمەوە کە باسمــان کــرد دەردەکــەوێ کە نەسخ بە چوار شت دێتە جێ و چوار گۆشەی هەیە: نەسخ، ناســیخ، مەنســووخ، منســوخ عنــە. دیارە نەسخ لابردنی حوکمە شەرعییە پێشووەکەیە بە دەلیلێ کە ببێتە هۆی لابردنی ئەو حوکمــە و دانانی حوکمێکی تر لــە شــوێنیدا. ناســیخ ئــەو دەلیلەیــە کــە حوکمــە پێشــووەکە لا دەبــات و حوکمێکی تازەی لە جێگەدا دادەنێ.

مەنسووخ حوکمە پێشووەکەیە کە بە شەرع جێگیر و سابت بووبــوو. (منســوخ عنــە) یــش ئــەو ئینسانە موکەللەفەیە کە حوکمە پێشووەکەی لەسەر هەڵگیراوە.

نەسخ چوار مەرجی هەیە:

یەکەم: ئەبێ مەنسووخەکە حوکمی شەرعی بێ نەک حوکمی عەقڵی وەکوو بەرائەتی ئەسڵی[١٣].

دووەم: ئەبێ نەسخەکە بە خیتاب بێ، واتە: نەمانی حوکم بە هۆی مردنی موکەللەفەکەوە نەسخ نییە.

سێهەم: ئەوەیە کە حوکمە مەنسووخەکە لە کاتی خۆیا نەبەسترابێ بە کاتێکەوە کە ئەو کاتە هات حوکمەکە نەمێنێ وەکو ئایەتی (و أتموا الصیام الی اللیل) کە ئەوە دەگەیەنێت ڕۆژوو لە سەرەتای بەیانەوەیە تا شەو.

چوارەم: ئەبێ ئەو دەلیلە کە نەسخی حوکمە پێشووەکەی کردووە لە حوکمە مەنسووخەکە دواکەوتبێ.

هەروەها شایانی زانینە لەو ئایەتانەدا کە حوکم دەگەیەنن وا ئەبێ خوێندنەوەی نەسخ بووەتەوە و حوکمەکەی ماوە. وایش دەبێ حوکمەکەی نەسخ دەبێتەوە، بەڵام هێشتا هەر دەخوێنرێتەوە، جاری وەهایش هەیە کە حوکمیش و خوێندنەوەیش نەسخ دەبنەوە.

نموونەی یەکەم: وەک نەسخی ئایەتی ڕەجم «والشیخ والشیخة اذا زنیا فارجموهما البتة» ئێستە ئەم ئایەتە لە قورئانا نییە و ناخوێنرێتەوە، بەڵام لە دیندا حوکمەکەی ماوە.

نموونەی دووەم: وەک نەسخی ئایەتی (کتب علیکم اذا حضر أحدکم الموت إن ترک خیراً. الصیة للوالدین والأقربین بالمعروف حقاً علی المتقین)[١٤] بە ئایەتەکانی ئیرس لە سوورەتی (نساء) دا، یا وەک نەسخبوونەوەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێ ژن لە پاش مردنی مێردەکەی دەبێ ساڵێکی تەواو بمێنێتەوە، واتە دوای ئەوە ئەتوانێ شووبکات، بەو ئایەتەی دەفەرموێ ئەو مێردانەی دەمردن ژنەکانیان چوار مانگ و دە ڕۆژ بمێننەوە، ئەوسا شووبکەن.

نموونەی سێهەم: کە خوێندنەوە و حوکم هەردوو نەسخ کرابنەوە، وەک ئەوەی کە مەشهوورە و لە حەزرەتی عایشەوە دەیگێڕنەوە کە فەرموویەتی: «أنزل فی‌القرآن (عشر رضعات معلومات) فنسخ من ذلک خمس و صار الی (خمس رضعات معلومات)، فتوفیَ رسول‌الله(ص)، والأمر علی ذلک»[١٥].

ئێستە ئایەتی تەئسیری دە جار شیرخواردن لەفز و خوێندنەوە و حوکمی هیچ کامیان نەماون.

هۆ و مەبەست لەم نەسخەیش چاودێریی بەردەوامیی شەریعەتی خودا و چاودێریی قازانج و بەرژەوەندی خەڵکە.

ئەبێ ئەوەیش بزانین کە نەسخ لە بیر و باوەڕە سەرەکییەکانی ئاییندا نەبووە و نابێت.

واتە: هەموو پێغەمبەران لە باوەڕ بە خودا و فریشتە و پێغەمبەرانی خودا و کتێبەکانی خودا و ڕۆژی قیامەت و قەزاوقەدەردا هەموو یەکن و بێ‌خیلافن و هیچ دینێک یەکێ لەم شتانەی دینێکی تری نەسخ نەکردووەتەوە؛ بەلام دەسکاری حوکمە فەرعییەکانی کردووە و لێی لابردوون یا لێی زیاد کردوون یا هەر بە تەواوی نەیهێشتوون، وەکوو چۆن قورئانی پیرۆز گەلێ لە ئەحکامی دینە پێشووەکانی لابردووە. هەروەها ئەبێ ئەوەیش بزانین کە قورئان و ئەحکامی قورئان بە هیچ دینێکی تر نەسخ نابنەوە و لە پاش دینی ئیسلام دینێکی تازە پەیدا نابێ. دینی ئیسلام و قورئان هەموو دین و کتیبە پێشووەکانیان نەسخ کردووە و قورئانی پیرۆز عیلمی ئەووەلین و ئاخیرینی تێدایە.

گشتی شەوی قەدر مانگی ڕەمەزان
لە لەوح هاتووەتە ئەووەڵ ئاسمان
لەودووا بە وەفق مەسلەحەتی حاڵ
نازڵ بوو وەخت بە بیست و سێ ساڵ
ساحیبی ئایات موفەسسەلاتە
بوزورگترینی گشت موعجیزاتە
ئەم تەرتیبە وا ئێستە مەلحووزە
بە وەفقی تەرتیب (لوح المحفوظ)ە
بشنەو ئەگەر هەی بە دەلیل مائیل
نەقلی حەزرەتی عوسمان و سائیل
بەوتەورە بووگە لە عەهدی حەزرەت
هەر هەیە و دەوێ تا بە قیامەت
بە بێ تەحریف و زیادە و نوقسان
بێ سەهو و غەلەت تەغییر و نیسیان

واتە: هەموو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز یەکەم جار لە رووی (لوح المحفوظ) نوسراوە وەک خودا فەرموویەتی: (بل هو قرآن مجید فی لوح محفوظ) [١٦] وەک کتێبەکانی تری خودا لەوێدا نووسراون. ئەمجا هەمووی قورئان بە فەرمانی خودا لە شەوی قەدرا کە شەوێکی پیرۆزە لە مانگی

رەمەزان لە (لوح المحفوظ) وەرگیراوە، هێنراوە بۆ ئاسمانی یەکەم لە شوێنێکدا کە مەشهوورە بە (بیت العزّة) دانراوە. دوای ئەوە بە فەرمانی خودا حەزرەتی جیبرەئیل کە ئەمینی وەحیە لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا بە پێی پێویست لە (بیت العزّە) وەریگرتووە و هێناویەتیە خوار و بەسەر حەزرەتی (محمد المصطفى) دا(د.خ) خوێندوویەتیەوە، ئەویش بە دڵ و هۆش و ئیختیار وەریگرتووە و تێی‌گەیشتووە، لە پاش تەواوبوونی وەحیەکە، کە حەزرەت گەڕاوەتەوە بۆ حاڵی عادەتی، ئایەت بە ئایەت بەسەر هاوڕێکانیدا خوێندوویەتیەوە، ئەو نووسەرانەیش کە حازر بوون نووسیویانەتەوە بۆ حەزرەت و بۆ خۆیشیان، هاوڕێکانی تری پێغەمبەریش فێری بوون و هەندێکیان لەبەریان کردووە، بەمجۆرە تا هەموو قورئان هاتووەتە خوارەوە. حەزرەتی جیبرەئیل کەمێ جار لەسەر شێوەی خۆی هاتووە بۆ لای حەزرەت و بە چاو دیویەتی و خەڵک نەیان‌دیوە، جار جار دەنگێ هاتووەتە گوێی حەزرەت وەک زڕەی زەنگ، تەنها حەزرەت بیستوویە و کەسی تر نەیبیستووە، دوابەدوای ئەو دەنگە قورئانی بەسەرا خوێندووەتەوە.

جاری واش بوە لە شێوەی کوڕێکی سیماپاکی عەرەبدا کە ناوی (دحیە) بووە خۆی بە حەزرەت پیشان داوە و قورئانی بەسەردا خوێندووە.

یەکەم ئایەت لە قورئان کە هاتووە بۆ پێغەمبەر ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی عەلەقن (بسم الله الرحمن الرحيم * إقرأ باسم ربک الذی خلق * خلق الانسان من علق * إقرأ و ربک الأکرم * الذی علّم بالقلم * علّم الانسان ما لم يعلم) ئەمەش لە [17]ی مانگی رەمەزاندا لە ئەشکەوتی (حراء)دا بوو، هەروەها دوا ئایەتیش کە بۆ پێغەمبەر نێردرا ئایەتی (اليوم اکملت لکم دينکم و اتممتُ عليکم نعمتی و رضيت لکم الاسلام دينا) [17] بوو، کە لە رۆژی عەرەفە لە سەفەری (حجة الوداع)دا بۆی هات. هەندێ کەسیش دەڵێن دوا ئایەت ئایەتی (واتقوا يوماً ترجعون فيه الى الله ثمّ توفّی کل نفس ما کسبت و هم لا يظلمون)ە [18]، کە لە مەدینەی مونەووەرەدا کەمێک لە پێش وەفاتیدا بۆی هاتووە.

هەر بەم تەرتیبە کە ئێستە هەیە حەزرەت وەها بڕیاری‌داوە؛ چونکە بە هۆی نازڵ‌بوونی «بسم الله الرحمن الرحيم»وە حەزرەت ئاگادار بووە لەوە کە ئەمە سوورەتێکی تایبەتییە و پارچەیەکی ترە لە ئایەتەکانی خودا و، حەزرەتی جیبرەئیل عەرزی کردووە ئەم ئایەتە بەستراوە بە فلانە ئایەتەوە و بەو جۆرە ئەسحابەکانی فێر کردووە.

لەم بەیانەوە دەرکەوت کە تەرتیبی قورئانی مەجید لە پێشکەوتنی سوورەت لەسەر سـوورەت و ئایەت لەسەر ئایەت هەمووی بە فەرمانی حەزرەت بووە، هەر چەند زۆربـەی سـوورەتە گـەورەکان کە وان لە پێشەوە لە مەدینە نازل بوون، بەڵام ئەم تەرتیبە موافیقی فەرمانی حەزرەتە(د.خ).

هەندێ دەڵێن تەرتیبی سوورەتەکان بە ئیجتیهادی هاوڕێکانی پێغەمبەر بووە، بەڵام ئـەم رایـە راست نییە، تەنانەت ئەگەر ئەوانیش وەها ریزیان کردبـێ لەسـەر فـەرمانی حـەزرەت کردوویانـە، دەلیلی ئەمە ئەوەیە یەکەم جار کە حەزرەتی ئەبووبـەکر؛ خـودای لـێ رازی بـێ؛ ئـەمری فـەرموو قورئان کۆ بکەنەوە هەتا هیچ ئایەتێ لە قورئان نەفەوتێ، بۆ ئەم مەبەستە ئەمری فەرموو بە زەیدی کوڕی سابت؛ کە نووسەری وەحی بوو و لای حەزرەت خۆشەویسـت بـوو و ساڵـێ پـێش وەفـاتی حەزرەت دوو جار تەواوی قورئانی پیرۆزی بۆ حەزرەت خوێندبۆوە و حـەزرەت تـەقریری کردبـوو پێی رازی بوو؛ لەبەر رووناکیی ئەو نووسراوانەی کـە لای زەیـد بـوون قورئـان کۆکرایـەوە و، ئـەم تەرتیبەیش موافیقی تەرتیبی (لوح المحفوظ)ە.

وا مەشهوورە یەکێ لە حەزرەتی عوسمانی پرسی (ر.خ): بۆچی سوورەتی ئیخلاسـت لـە دوای سوورەتی (لهب) ەوە نووسیوە؟ حەزرەتی عوسمان دەستێکی هێنا بە چاوی کـابرادا، لـەم کاتـەدا کابرا دی کە لە (لوح المحفوظ) یشدا بەو تەرتیبە نووسراوە.

بە هەر حاڵ هاوڕێ سەربەرزەکانی پێغەمبەر(د.خ) لەم کۆکردنەوەی قورئانە ئاگادار بوون، هـەر بەو جۆرە کە بووە و ئێستە هەیە هـەتا رۆژی قیامـەت ئـەم قورئـانی پـیرۆزە دەمێنیتـەوە؛ خـودا فەرموویەتی: (انا نحن نزلنا الذكر و انا له لحافظون) [19]. هەرگیز خودای گـەورە مـاوەی بـە هـیچ سەرکەش و بێباوەڕێک نەداوە کە قورئان بگۆڕێ و، لێی کەم بکات یا لێـی زیـاد بکـات! ئەمـەش تایبەتیی گەورەیی ئایینی حەزرەتی (محمد المصطفى) یە، درورودی خودای لەسەر.

تەمام ئینس و جین مەلەک بەو دوستوور
ئیجمـاع کـەن میسـلی نایەرنـە زوهـوور
هـەموو فوسـەحا و بولـەغای عـەرەب
سـاحیب فەسـاحە و بەلاغـەی عەجـەب
وەک ئایـەتێکیان نـەدا ئـەو بـیروون
لـە موعـارەزەی هـەموو عـاجز بـوون

ئــەم عاجزیچــە بــەوان مولحەقــە
بـە مـەحزی تەئسـیر قـودرەتی حەقـە
یـا بـەم سـەبەبە کـە ڕۆیگەسـە دەر
روتبـەی بەلاغـەی لـە تـەوقی بەشـەر
یـا سـیاقەکەی یەکسـان غەریبـە
نـەوعێکی بـێمیسـل یـەکجار عەجیبـە
با وجوود تەرکیبی لـە حـەرفی هیجـاس
مـاددەی تـەرکیبی قسـەی بولـەغاس
نە نەزم و نـە نەسـر، نـە وەک سـەجعانە
نـە تـەرزی رەجـەز، ئینسـان حەیرانـە
لابـە عەقیـدەی کـافری بـێپـیر
(و قـل إنـه بشـیرٌ نـذیر)
(قـولٌ مـن الحـق فرقـانٌ و فَصـل
لا قـولُ کـاهن، لا شِـعرٌ، لا هَـزل)
(لا تقـوُّلٌ، وَ لا أسـاطیر
بلـل للعـالمین هـدیً و تـذکیر)

نایەرنە: ناهێننە. نەدا ئەو بیروون: دەڕنەبڕی، دەرنەخست. ڕۆیگەسەدەر: دەرچووە. هیجـاس: هیجایە، دیارە هیجا یا حوروفی هیجا. واتە: پیتەکانی ئەلیف، بێ... تاد. بولەغا: جـەمعی بەلیغـە، واتە: رەوانبێژەکان. رەجەز: جۆرە شیعرێکە، لەسەر سەنگی شەش کەڕەت (مستفعلن).

واتە: ئەگەر هەموو ئادەمزاد و پەری و فریشتە کۆ ببنەوە ناتوانن کەلامێکی وەها دابنێن. هەموو ئەدیب و قسەزان و هەستیاران و خوێندەوارانی عەرەب سەرانسەر نـەیانتوانی نـەک وەک هـەموو قورئانی پیرۆز، بەڵکو بە ئەندازەی سوورەتێکی، بگرە بە ئەندازەی [١٠] ئایەتی یـا یـەک سـوورەتی کەمتر لە ئایەتێکی درێژ دابنێن و، بەرامبەریی پێ بکەن لەگـەڵ قورئـانی پـیرۆزدا. ئەگـەر پێیـان بکرایە ئەیانکرد و لە جیهاندا بلاویان دەکردەوە و دۆست و دوژمن پێی دەزانی؛ هـەر لەبـەر ئەمـە بوو وازیانهێنا و کۆڵیاندا لە بەربەرەکانێی قورئان بە وتار و پەنایان بردە بـەر جـەنگ و سـزادان و

ئازار، دیارە دوژمن کە بە زانست و ئەدەب دەرەقەتی بەرامبەرەکەی نەهات دەست دەداتە گێرەشێوێنی و ئاژاوە و بێشەرمی کردن لەگەڵیا.

زانا پایەبەرزەکان لە باسی ئیعجازی قورئاندا فەرموویانە: یا ئەم قورئانە لە رادەیەکدایە دەتوانرێ بەرامبەری بکرێ، بەڵام خوا دەستی دوژمنەکانی بەستووە و رێی‌لێ‌گرتوون، ئەم شێوە (سەرفە) یە، واتە: خودای گەورە لە پێناوی دەرخستنی پایەی قورئاندا لای‌داون و رێی‌لێ‌گرتوون ئەوەی ئەتوانن بیکەن، وەکوو من لە کتێبی (بارانی رەحمەت)دا وتوومە:

میسالی وایە بە قووەی قودسی

نەیەڵێت کەسێ وەرگێڕێ دەسی

یاخۆ قورئانی پیرۆز لە وزە و توانای پیاوە بەرزەکان دەرچووە، بۆیە بەربەرەکانێیان پێ ناکرێ و ناتوانن وێنەی دابنێن، لەم بارەیاندا چەند شتێکی ورد دەرخراوە:

یەکەم: قورئانی پیرۆز ئەوەندە نهێنی و نوکتەی بەلاغەی تێدایە کەس ناتوانێ ئەوەندە نوکتە و وردەکاریی رەوانبێژی بخاتە وتاری خۆیەوە. ئەم راستییە بۆ ئەو زانایانە دەرئەکەوێ کە زانستی رەوانبێژی دەزانن. بێ‌گومان سوودی خوێندن و فێربوونی ئەم زانستە ئەوەتە کە بە هۆیەوە دەزانرێ قورئانی پیرۆز ئەوەندە بەلیغە لە توانای غەیری خودادا نییە چەشنی بڵێ.

بەڵێ ماددەی ئەلیف و بێ کە وشەی لێ پێک دەهێنرێ لای مرۆی ساغ و سەلیم هەیە، دەتوانێ هەزاران وشە و رستە بهۆنێتەوە، بەڵام هەرگیز ناتوانێ وتارێکی بەرزی وەک قورئانی پیرۆز رێک بخات.

دووەم: شێوەی تێکەڵیی وشە و رستە و ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان لە شێوەی تێکەڵیی وشە و رستەی ئەهلی جیهان نییە و لایان غەریبە و بەرامبەرییان پێ ناکرێ.

سێهەم: قورئانی پیرۆز گەلێ ئوموری غەیبی و نادیاری دەربڕیوە کە لەمەوپێش بوون وەکو سەرگوزەشتەی عاد و سەموود یا نووح و پێغەمبەرەکانی تر، یان هێرشی رۆم بۆ سەر دوژمنەکانیان و، گەلێ کارەساتی تر. بێ‌گومان زانینی شتی پەنامەکیی وەها لە توانای غەیری خودای گەورەدا نییە و بۆیان دەرنابڕدرێ.

چوارەم: قورئانی پیرۆز گەلێ لە پەنامەکییەکانی کار و باری ئاسمانی و ئەستێرە و هەڵسووڕانی ئەستێرە گەڕۆکەکان و دەرەقەت نەهاتنی شەپۆلەکانی (ئەسیر) بە هێزی خودایی و، چۆنییەتی پێوەند (تەلقیح) کردنی گیا و دار و درەخت بەهۆی با و هەوا و گەلێ پەنامەکیی تری دەرخستووە

کە ساڵەهای ساڵ زانایان پێی نەگەیشتوون و نەیاندۆزیوەتەوە. بێگومـان شـتی وەهـا لـە توانـای غەیری خودادا نییە.

پێنجەم: ئەوەتە هەر زانایەکی پایەبەرز ئەبینی تەنها لە بابەتێکدا دەستی هەیە، بـەڵام قورئـانی پیرۆز مەدح و زەم و موژدە و هەڕەشـە و، کاروبـاری بەڕێوەبەرایـەتی و راویـژ و یاسـا و کاروبـاری دارایی و دڵی خزم راگرتن و خۆش‌ویستنی خەڵق و خوو و رەوشـتی بـەرز و ئامۆژگـاری و روون کردنەوە و باس‌کردنی هۆیەکانی بەختەوەری و روو لە رەزای خودا و شتی بەنرخ و نەبڕاوە و گەلێ شتی تری تێدایە.

شەشەم: هەر وتارێکی بـەرز و جـوان ئـەبینی، چ شـیعر و چ پەخشـان هـەموو بـە موبالەغـە و زیادەڕەوی جوان کراوە، بەڵام قورئانی پیرۆز بێ موبالەغەیە و بە شێوەیەکی عـادەتی باسـی شـتە جۆراوجۆرەکان دەکات، کەچی لە رەوان‌بێژی و پلەی جوانی‌دا ئەوپـەڕی گرتـووە، دیـارە کـەلامێ وەها بێ کەلامی خودایە و هی غەیری ئەو نییە؛ بۆیە کەس ناتوانێ وێنـەی دابنێـت و بەرامبـەریی قورئانی پێ بکات.

حەوتەم: قورئان بە رادەیەک کار دەکاتە سەر هۆش و هەسـتی مـرۆڤ و دەیخاتـە جیهـانێکی ویجدانی و غەیبییەوە کە بە دەم باس ناکرێت، دیارە ئەم حاڵە لە جیهـانی غەیبـەوە و لـە لایـەن خوداوە دێت.

پاش هەموو شت ئینسانێکی نەخوێنەوار، بەتایبەتی لە وڵاتێکی دوور لـە شارسـتانی و دوور لـە دەرس و تەعلیم چـۆن دەتوانـێ کـەلامێکی وەک قورئـانی پـیرۆز دابنـێ کـە لـە مـاوەی چەنـد سەدەیەکدا زانایان لە دەرخستنی نهێنییەکانیدا سەرسام بن.

کەواتە ئەی برادەری ئاشنا بە رۆشنایی عەقڵ دوور بکەوەرەوە لە بیروڕای بێ‌نرخی کافری بـێ-رابەر و، بڵێ ئەم کەلامە موژدەدەرە بە هوشیاری بەختیار، ترسێنەر و هەڕەشـەکەرە لـە تاوانبـاری بەدکار، نە بە درۆ دانراوە، نە ئەفسانە و قسەی پروپووچ بێ‌میزانە، رابەر و رێ‌پیشاندەرە بۆ جیهـان، واتەیێکی پیرۆز و راستە هەق و ناهەق لە یەک جیا ئەکاتەوە، قسـەی کاهینـە ریـازەت‌کێشـەکان نییە، شیعری هەوەس‌بازان نییـە، گـەپ و گاڵـتە نییـە، بەڵـکو رەحمـەت و حیکمەتـە و مایـەی پیرۆزیی و بەختیارییە.

***

١ـ ئەم سەرباسە لە دەستنووسەکەدا نییە، لەباتی ئەمە تەنها نەخش و نیگاریێ هەیە کە باسێک لە باسێکی تر جیا دەکاتەوە.

٢ـ ئایەتی (٢٤) سوورەتی (فاطر).

٣ـ ئایەتی (٧٨) سوورەتی (غافر).

٤ـ «یا یەعنی» بە پێی شێوەنووسی دەستنووسەکەیە، چاپەکە دەڵێ: «یا بەعزێ» بێگومان هی دەستنووسەکە راستە. وشەی «خۆ» یش لەوانەیە لەگەڵ (یا) کەدا بووبێ، واتە یا خۆ یەعنی عاسی موستەحەقی عەزابە... تاد. یا کورتکراوە (خۆی) بێ واتە: یا یەعنی عاسی خۆی موستەحەقە... تاد. یا خۆ کورتکراوەی (خود)ە و لەگەڵ (موستەحەقە)دا وشەیەک پێکدێنن؛ واتە: یا یەعنی عاسی خود موستەحەقە... تاد.

٥ـ ئایەتی (٣٢) سوورەتی (مائدە).

٦ـ ئایەتی (١١٤) سوورەتی (هود).

٧ـ ئایەتی (٧٠) سوورەتی (فرقان).

٨ـ مختصر صحیح مسلم للحافظ المنذری، تحقیق محمد ناصرالدین الالبانی. الدار الکویتیة للطباعة والنشر، الطبعة الأولی ١٣٨٨ هـ ـ ١٩٦٩ م الجزء الاول ص ١٤٦.

٩ـ ئایەتی (٢٨٤) سوورەتی (بقرە).

١٠ـ ئایەتی (٤٨) سوورەتی (نساء).

١١ـ ئایەتی (٢٨٤) سوورەتی (بقرە).

١٢ـ وەک لە مەعنای «ان الملوک اذا دخلوا قریة أفسدوها... الآیة» بێجگە مەعنا دیارەکەی بلێت مەبەس لە (ملوک) هێزی شەڕ و ئارەزووی نەفسە و مەبەس لە (قریة) دەروونی مرۆڤە.

١٣ـ مرۆڤ پێش هاتنی شەریعەت موکەللەف نییە، کە شەریعەت هات و بێتەکلیفییەکەی گۆڕی بە موکەللەفی، ئەم گۆڕینە نەسخ نییە.

١٤ـ ئایەتی (١٨٠) سوورەتی (بقرە).

١٥ـ الجامع الصحیح، و هو سنن الترمذی، الجزء الثالث ص ٤٥٦ تحقیق محمد فؤاد عبدالباقی، مطبعة مصطفی البابی الحلبی و أولادە بمصر، سنة ١٣٧٧ هـ ـ ١٩٥٨ م.

١٦ـ ئایەتی (٢٢ـ٢١) سوورەتی (بروج).

١٧ـ ئایەتی (٣) سوورەتی (مائدە).

١٨ـ ئایەتی (٢٨١) سوورەتی (بقرە).

١٩ـ ئایەتی (٩) سوورەتی (حجر).

## مبحث فی تحقیق کلام الله تعالی [1]

ئەگـــەر تـــۆ بڵـــێی: تـــەنزیل و ئـــیترال،
موعـــارەزە و نەســـخ، مـــازی و ئیســـتیقبال،
لەبـــــــــەرکردنیان، تیلاوەتیـــــــــان،
شـــــــــــنەفتنیان، کیتابـــــــــــەتیان
گشت لەســەر حــودووس وەجهــی قــەویمن
تـــۆ چلـــۆن دەڵـــێی: کـــەلام قـــەدیمن؟
ئـــەرچی تـــەقریری زووتـــر کریاگـــە،
ســاحیب دەرک و هــۆش جــواو دریاگــە[2]
ئـــەمما تـــەرزێ‌تـــر تێرینـــە ئەبـــەین
بــۆ تــۆ (تفصــیلاً) تــەحقیقی دەکــەین:[3]
دەڵـێین ئەگــەرچی هــیچ ســیفاتی حــەق
بــە ســیفەت مــەخلووق ناشــوبهێ موتڵــەق
بەڵـــێ لـــە لای خـــەلق تەحقیقمانـــە
نموونـــەیان هـــەس، ئـــەو نموونانـــە
بـــۆ ســـیفاتی حـــەق رێ دەدەن پێمـــان
بــە (وجــەُمّــا) یــێ مــەعلووم بــن لێمــان
تــۆ هەرگاهــ بکــەی قەســدی کــەلامێ،
خەبـــەرێ، ئـــەمرێ، یـــا ئیســـتیفهامێ

مـــەعنایێک هەیـــە ویجـــدانی لـــە لات
غـــەیری عیلمتـــە و ســـائیری ســـیفات
بـــە ئـــەلفازی خـــۆت تـــەعبیری دەدەی
لەگوێی سـامیعدا و زیهـنی جێـی دەکـەی
بـــەو مـــەعنا دەڵـــێن: کـــەلامی نەفســـی
نـــە عەرەبییـــە و نـــە کـــوردی و فارســـی
بەسـیتە و واحیـد، نـە کـەم، نـە کەسـیر
قائیمـــە بـــە زات تـــۆوە بـــێ‌تـــەغییر
ئـــەمیچیان کـــەلام تۆیـــە و لەفزییـــە
موتەعەددیـــــــدە و موتەجەززییـــــــە
موختـــەلیف دەوێ، بەڵـــێ بـــێ‌گومـــان
دەلالـــەت دەکـــا لـــەو مـــەعنا وتمـــان
بـێ‌تەشبیهـ کـەلام نەفسـی حـەق واتـە
غـــەیری عیلمیـــە و بـــاقی ســـیفاتە
غـــەیرە مەخلووقـــە و بەســـیت و قـــائیم
بـــە زاتی حـــەق و، قـــەدیم و دائـــیم
مونـــافیی لالـــی و ســـکووت و ئافـــەت
پاک لە حەرف و سەوت، بەری لە کەسرەت
نـــە عەرەبییـــە و، نـــە ســـوریانییە
نـــە یۆنانییـــە و، نـــە عیبرانییـــە
لـــە لـــەوازیمات حـــادیس بەرییـــە
لـــە هـــیچ شـــەیئێدا حولـــوولی نییـــە
بـەو سـیفەتە حـەق بـێ‌حـودوود و حـەد
موتەکەللیمـــە ئـــەزەل تـــا ئەبـــەد

بـــەری لـــە وەسمـــەت ســـکووتی ســـابیق
عـــەری لـــە توهمـــەت خامۆشـــیی لاحیـــق

شنەفتنیان: بیستنیان. کریاگە: کـراوە. دریاگـە: دراوە. بەڵـێ لـە لای خـەلق: لـە پـەراوێزی دەستنووسەکەدا لەسەر «بەڵێ» نووسیویە: «ای لکن». واتە: بەڵام.

واتە: ئەگەر بە شێوەی رەخنەگرتن بڵێیت سیفەتی تەنزیل و ئیتزال و موعارەزە کردن و نەسخ و ناسیخ و مەنسووخ، باسی رابوردوو و ئیستە و لەمەوپاش، لەبـەرکردن و خوێندنـەوە و بیسـتن و نووسینەوە بەڵگەن لەسەر ئەوە کـە ئـەم کـەلامی خودایـە حادیسـە، کەواتـە تـۆ چـۆن دەڵـێیت قەدیمە؟

لە وەڵامی ئەم رەخنەدا دەڵێم ئەگەرچی زووتر بۆم باس کـردی و کـەلامی قـەدیم و حادیسـم جیاکردەوە، بەڵام لێرەدا بە جۆرێکی تر قسەت لەگەڵ دەکەم تا باش تێبگەیت. ئەڵێم ئەگـەرچی سیفەتەکانی خودای گەورە ناشوبهێنە سیفەتەکانی خەلـق، بـەڵام لای ئێمـە نموونـەیێ بـۆ ئـەو سیفەتانە هەیە شارەزامان دەکات و دەمانخاتە سەر رێگای جیاکردنەوەی سیفەتەکانی خـودا. بـۆ نموونە تۆ هەر کاتێ ویستت کەلامێ دابنێیت، خەبەری بێ یـا ئـەمر یـا ئیسـتیفهام، مەعنایـەکی ویجدانی وا هەیە لە لات، ئەگەر بە وردی لێـی تێفکـری، ئـەزانی نـە حەیاتـە، نـە عیلمـە، نـە لـە سیفەتەکانی ترتە، بە قسە و وشە و رەستەکانت رایاندەگەیـەنیت و بـە خەڵـقیان دەڵـێیت و، لـە گوێچکەی شنەوادا جێی دەکەیتەوە، ئەو مەعنا و سیفەتە کە هەستی پێ دەکەیت نـاوی کـەلامی نەفسییە، نە عەرەبییە و نە کوردی و فارسی، وەسفێکی بەسیتە پێی ناوترێ کەم یـا زۆر، بـە تـۆوە راوەستاوە. ئەو وتارەیش ئەو رستە و وشانەیش کە ئەو مەعنایەی پێ دەردەبڕی، کەلامی لەفزییە، دیارە ئەم کەلامە لەفزییەیش فرەبەشە: ئیخبارە، ئینشایە، ئینشاکەی ئەمرە، نەهیـە، ئیسـتیفهامە، تەعەججوبە، نیدایە. ئەم بەشانە دەلالەت لەسەر مەعنا ویجدانییەکان دەکەن.

ئەمانـە نیشـانەن، ئـەوان نیشـانەکەرن، واتـە: ئـەم کەلامـە لەفزییـە ئەسـەرێکی لـە کەلامـە نەفسییەکەوە پەیدا ئەبێ وەک دووکەڵ لە ئاگر، ئەم جۆرە دەلالەتە پێی دەڵێن دەلالـەتی عەقلـی و هیچ گومانی تیدا نییە.

جا (بلاتشبیە) کەلامی نەفسی خودای گەورە ئەویش سـیفەتێکی نەفسـییە غـەیری حـەیات و عیلم و ئیرادە و قودرەت و سەمع و بەسەر، مەخلووق و حادیس نییە، بەڵکو قەدیمـە و بەسـیتە و

بە زاتی خواوە راوەستاوە و دژی لاڵی و بێدەنگیی نەفسییە، واتە: بێکەلامی. پاکـە لـە حـەرف و دەنگ، دوورە لە زۆری و کەمی، نە عەرەبییە، نە عیبرییە، نە سـوریانییە. دوورە لـەو شـتانەی کـە پێوەندییان بە (حدوث) ەوە هەیە، بێئەندازە و سنوورە. خودا لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد بەو کەلامـە موتەکەللیمە و بێدەنگی پێش و پاشی نەکەوتووە؛ چونکە سیفەتی لازمی زاتە، ئـەو کەلامانـەیش کە لەو سیفەتە نەفسییەوە پەیدا دەبن ناویان کەلامی لەفزییـە و بەشـی زۆری هەیـە. بـەمجـۆرە کەلامی نەفسی لە کەلامی لەفزی جیا بکەرەوە.

ئەنجا با باسی جیاوازیی کەلامی نەفسی و سیفەتەکانی تر بکەین:

جیاوازیی کەلامی نەفسی لە حەیات و سەمع و بەسەر ئاشـکرایە و پێویسـتی بـە دەلیـل نییـە؛ بەڵام جیاوازیی لەگـەڵ عیلمـی تەسـەووریدا لەبـەر ئەوەیـە ئـەو کەسـەی شـک و گومـانی لـە نیسبەتێکدا هەبێ تەسەووری نیسبەتەکە دەکات، کەچی کـەلامی نەفسـییەکەی لـە لا نییـە کـە نەیەوێ خەبەر لەو نیسبەتە بدات، واتە ئەگەر ئەو عیلمە تەسەوورییە کەلامی نەفسی بوایـە دەبـوا کە مادام تەسەوورەکەی بوو ئیخباری بەو نیسبەتەیش ببوایە کەچی وەها نییە.

دەلیلی ئەوەیش کە ئەو کەلامە نەفسییە عیلمی تەسدیقی یـەقینی نییـە ئەوەتـە کـە زۆرجـار ئینسان خەبەر لە نیسبەتێ دەدات کەچی یەقینی پێی نییـە بگـرە یـەقینی بـە پێچەوانـەی ئـەو نیسبەتە هەیە.

دیارە عیلمی تەسدیقیی تریش نییە وەک زەننی، تەقلیدی، جەهلی مورەککـەب؛ چونکـە ئـەم جۆرە عیلمانە بۆ خودای گەورە ناشێ و مەحاڵە.

هەروەها کەلامی نەفسی (ئیرادە) نییە؛ چونکە:

یەکەم: ئیرادە بۆ دیاریکردنی (احد المقدورین)ە و، پێوەنـدی بـە کـاری ئێسـتە و لەمـەوپاش (حال و استقبال) ەوە هەیە، بەڵام کەلام پێوەندی بە رابوردوو و ئێستە و لەمەوپاشـەوە هەیـە، بـە شتێکەوە کە ببێ یا نەبێ یا هەر مەحاڵ بێ.

دووەم: ئیرادە بۆ ئەوەیە مومکینێک دەسنیشان و تەخسیس بکات بە بوونەوە، بـەڵام کـەلامی نەفسی پێوەندی نییە بەم دەسنیشـان و تەخسـیسکردنـەوە، تـەنها مەنشـەئە بـۆ ئیخبـار، واتـە گێڕانەوەی رووداوی رابوردوو و ئێستە و لەمەوپاش، یا بۆ ئینشاء، واتە ئەمر، نەهی، پـرس و دوعـا و داخوازی... و تاد. ئەم کەلامە تەنها بۆ (وقوع) نییە، بەڵکو باسی واقیـع و نـاواقیع، بگـرە واجـب و مەحاڵ و قەدیم و حادیسیش دەکات.

سێهەم: وا ئەبێ ئەو مەعنا کە لە دڵی ئامیر[ئەو کەسەی ئەمر دەکات]دایە ئیرادە رووی تێ ناکات، وەک یەکێ ئەمر ئەکات بە خزمەتکارێکی بێگوێی سەرکەشی کە ئیشێک بکات، کەچی ئیرادەی ئیشەکەیش ناکات؛ بەڵکو حەز ئەکا نەیکات، تەنها مەبەستی ئەوەیە نافەرمانی و بێ-گوێیی خزمەتکارەکەی دەربکەوێ، هەروەها رێکدەکەوێ کە یەکێ نەهی لە شتێک دەکات کەچی پێچەوانەی ئەو شتەشی ویستووە، ئەوەتە خودای گەورە نەهیی ئادەمزاد دەکات لە گوناهـ لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانێ ئەو ئادەمزادە بەگوێی ناکات و گوناهەکە دەکات، دیارە خودایش ئیرادەی گوناهەکە ئەکات.

هەروەها کەلامی نەفسی قودرەت نییە؛ چونکە قودرەت سەرچاوەی کردەوەی ئاشکرایە وەک جووڵاندنەوەی ئەندام و کردنی کاروباری جۆراوجۆر؛ بەڵام کەلامی نەفسی بەتایبەتی سەرچاوەی دەربڕینی کەلامی لەفزییە، دوو شت کە ئاساریان جیا بێت خۆیشیان جیان. بێجگە لەوە ئەگەر کەلامی نەفسی قودرەت بوایە ئەبوا هەرکەس توانای کاری گران و نالەباری ببێت توانای کۆکردنەوەی کەلامی نەفسی و دەربڕینی بە کەلامی لەفزی ببوایە، کەچی زۆرکەس هەن توانای کردەوەی گرانیان هەیە، بەڵام لە لایەنی کەلامی نەفسی و لەفزییەوە ئەوەندە بێهێز و بێتوانان مەگەر هەر خودا بزانێ.

خۆی سیفەتێکە لە کەسرەت دوورە
بەڵێ نیسبەتی غەیرە مەحسوورە
حوسنی ئارەزووی نومایش دێنێ
هەردەم بە تەرزێ خۆی دەنوێنێ
زەبووری ناوە لە سوریانیدا
تەوراتی ناوە لە عیبرانیدا
نیسبەت بە نەزمی عەرەبی مەعرووف،
بە موعجیزی گشت موعاریز مەوسووف،
کەوا بە تەواتور گەیشتگە لامان،[٤]
دەلیلی شەرعە و تەمام ئەحکامان،
مەسسی حەرامە لە بۆ موحدیسان،
هاتووە بۆ حەزرەت، پێی دەڵێن: قورئان.

نیسبەت بە مەحکی بە خەبەر مەعلووم،
بە غەیری مەحکی بە ئینشا مەوسووم
ئەمری پێ دەڵێن نیسبەت بە مەئموور
نیسبەت بە مەنهی بە نەهی مەزکوور
(والباقی کذا بهذا القیاس)
هەر بە لیباسێ بە ئیسمێ بیناس[٥]
بە ئیعتیباری ئەم زهووراتە
کەلامی لەفزی و سوحف و تەوراتە،
زەبووره و، ئینجیل، قورئانی مونزەل
موتشابیهـ موحکەم، مازی و موستەقبەل
مەککی و مەدەنی و وەعدە و وەعیدە
قەسەسە و ئەحکام، ئەمسال، عەقیدە
ئەخبار، ئەمر و نەهی، تەحریم و تەحلیل،
ناسیخ و مەنسووخ، تەسبیح و تەهلیل
ئەرچی لە وەحدەت نەوعی ناکەوێ
تەعەددودی شەخس و تەجەززیی دەوێ
هەرچی کوتوب و سوحفی مونزەلەن
گشت لەو سیفەتە تەنیا یەک پەلەن
شاهیدی سیدقە بە بێ جەرح و رەد
«لنفِد البحر قبل ان تنفد»
بەو هەموو لیباس زۆر عەجیبەوە
بەم نیسبەتەوە و بەم تەرکیبەوە
نە کەسرەت دەدا گەرد لە وەحدەتی
نە تەرکیب تۆزێ لە بەساتەتی

واتــە: کــەلامی نەفسـیی ئــەزەلی تاقــە سـیفەتێکە لــە تەعــەددود دوورە؛ بــەڵام نیســبەت و تەعەللوقاتی گەلێ زۆرە، واتە کە کەلامی لەفزی پەیدا بـوو بەشـی زۆری لـێ پەیـدا دەبـێ وەکـو ئیخبار، ئینشاء، مەوعیزە، ئیرشاد، ئەمر، نـەهی، ئیسـتیفهام... تـاد. دیـارە ئـەم بەشـانە کـە هـی کەلامی لەفزین لەورووەوە کە کەلامی نەفسی سەرچاوەی کەلامی لەفزییە دەبنە بەشـی کـەلامی نەفسیش، چونکە ئەم بەشانە هی کەلامی لەفزین و، کەلامی لـەفزیش زادەی کـەلامی نەفسـییە. بەڵێ ئا لەم رووەوە کە کەلامی نەفسی سەرچاوەی کـەلامی لەفزییـە، ئـەتوانی بڵـێیت پێوەنـدی پەیدا دەکات بە رابوردوو و ئێستە و ئایندەوە، دەبێت بە ئەمر و نـەهی و دوعـا و نیـدا و هـی تـر. بەڵام گەلێ لە زانایانی عیلمی کەلام رازی نین بە جۆراوجۆریی و فرەچەشـنیی کـەلامی نەفسـیی ئەزەلی و دەڵێن ئەم کەلامە نەفسییە ئەزەلییە هەرگیز بەش و جۆری نییە و ئەم بـەش و جۆرانـە هەموو هی کەلامی لەفزین.

هەروەها مەولەوی دەفەرموێت شۆخ و شەنگیی کـەلامی نەفسـی کاتـێ ئـارەزووی نومـایش و خۆدەرخستنی هەبێ لە هەر ساتێکدا بە جۆرێ خۆی دەنوێنـێ و خـۆی پیشـانی جیهـان دەدات؛ ئەوەتە لە ناو سوریانییەکاندا بەرگ و زینەتی (زەبوور) لەبەر دەکـات، لـە نـاو عیبرییەکانـدا خـۆی دەکات بە (تەورات). ئەویش کە بە زمانی عەرەبی هاتووە و بەوە ناسراوە کـە مـوعجیزە و هـەموو نەیارەکانی شکاندووە و کەس ناتوانێ وێنەی دابنێ و بە شێوە و رێگای (تەواتور) پێمان گەیشتووە و، سەرچاوە و دەلیلی شەریعەت و حوکمی ئایینە و، بۆ بێدەستنوێژ و لەشپـیس دروسـت نییـە دەستی لێ بدەن، چونکە (لا يمسّه إلّا المطهّرون)، ئـەوەی کـە بـۆ حـەزرەتی (محمـد المصـطفی) هاتووە، ناوی قورئانە. ئەم قورئانە پیرۆزە لەو لایەنەوە کە شتی رابوردوو دەگێرێتـەوە پێـی ئـەوترێ (خەبەر). لە لایەنی گەیاندنی واتای نیدا و ئیستیفهام داوای کار و تـەرکی کـارەوە پێـی ئـەوترێ (ئینشاء). ئەگەر داوای کردنی کارێکی کرد پێی دەوترێ (ئەمر). ئەگـەر داوای نـەکردنی کـارێکی کرد پێی دەوترێ (نەهی).

کەلام لەم حاڵی خۆنواندنەدا ناوی کەلامی لەفزییە. لـەم رووەوە سـوحوف، تـەورات، ئینجیـل، زەبوور، قورئان دەرئەکەون. لە قورئاندا موتەشابیهـ موحکەم، ئیخبار، ئینشـاء، تـەحریم، تـەحلیل، ناسیخ، مەنسووخ، تەسبیح، تەهلیل، وەعد و وەعید، حیکایەت، ئەحکام، پەند و ئامۆژگاری و بـیر و باوەڕ هەیە، هەر لەم رووەوە هەندێکی مەککی و هەندێکی مەدەنییە.

ئەم کەلامە لەفزییە یەک نەوعە و لە وەحدەتی نـەوعی ناکـەوێ کـە کـەلامی لەفزییـە. بـەڵام ئەوانەی ئەیخوێننەوە زۆرن و جیاجیان. ئەوەی قورئان‌خوێنی قورئان‌ڕەوان دەیخوێنێتەوە، جیایـە لەوەی کە قورئان‌خوێنی عادەتیی تەجویدنـەزان دەیخوێنێتـەوە. هـەروەها ئـەجزاکانی زۆرن، بـۆ نموونە سوورەتی ئیسراء غەیری سوورەتی کەهفە.

هەموو ئەو کتێبە ئاسمانی و سەحیفانەی بـو پێغەمبـەران نێـرراون، پـەلێکن، واتـە لقـێکن لـە کەلامی نەفسیی ئەزەلی، لەو رووەوە کە هـەموویان لـەو سـیفەتە نەفسـییەوە پەیـدابوون. بەڵـێ ئەمانە هەموویان تاقە پەلێکن لەو کەلامە نەفسییە پەیدا بوون، ئەگینا کەلامی خودا لـە تـەواوبوون نایە و لە وزەی هیچ هێزێکدا نییە بیژمێرێ. بەڵگەی راستی رەدنەکراوە بۆ راستیی ئەم مەبەسـتە ئایەتی پیرۆزی (قل لو کان البحر مداداً لکلمات ربی لنفد البحر قبل ان تنفـد کلمـات ربـی، و لـو جئنا بمثله مدداً) [٦] هەروەها ئایەتی پیرۆزی (و لو أن ما فی الأرض من شجرة اقلامٌ والبحر یمـدّه من بعده سبعة أبحر ما نفدت کلمات الله إن الله عزیزٌ حکیم)ە [٧].

چەند لام ناسک بوو فەرموودەی زانایەک لە لێکدانەوەی ئەم ئایەتـەدا کـە فەرموویـە: خـودای گەورە لەسەر بیر و هۆش و تێگەیشتنی ئێمە ئەمەی فەرمووە؛ ئەگینا تکە تکەی ئـاوی دەریاکـان هەرکام لە زاتی خۆیا بۆ نووسینی سەرگوزەشتی نەفسی ئەو تکە ئاوە خۆی بەش ناکات کـە کـەی پەیدابووە و لە چەند شـەپۆلدا جـوولاوە و لەگـەڵ چەنـد تکـی تـردا بـووە و لـەو دەریـادا چەنـد کارەساتی دیوە! چ جایێ ئەحوالی شتی تری پێ بنووسرێت! بەڵام کەلامی نەفسـی بـەم هـەمووە بەرگەوە و بەم هەمووە نیسبەتانەوە کە لە کەلامی لەفزیدا دەبینرێن، خۆ کـەلامی لـەفزییش لـە کەلامی نەفسییەوە پەیدا ئەبێ، نە ئەم زۆرییە تۆز قالێک لە یەکیەتییەکـەی دەگـۆڕێ و، نـە ئـەم هەموە تێکەڵییە تۆزێ کار دەکاتە بەسیتییەکەی. بە عیبارەتێکی تر ئەم زۆری و تێکەڵییە بەسـەر کەلامی لەفزیدا دێن نەک بەسەر کەلامی نەفسیدا.

(حاسل الکـلام) وەک بـاقیی ئەشـیان [٨]
چوار وجوودی هەس بـۆت بکـەم بـەیان
یـــەکێ عەینییـــە و، یـــەکێ زیهنییـــە،
یـــەکێ لەفزییـــە و، یـــەکێ خەتتییـــە
لـــە حدیســـییەتی عـــەینی بـــێ‌رەنگـــە
ئایینەکـــەی پـــاک لـــە گـــەرد و ژەنگـــە

له جیهــەت وجــوود زیهنییــە مــەحفووز
بە لەفزی و خەتتی مەکتووب و مــەلفووز
لازیمەی حودووس وەک نەسخ و بەدەل
روو ئــەم ســیانە دەکــا نــەک ئــەووەل
لازیمــــەی قیـــدەم بـــە پێچەوانـــە
رووی لــە ئەووەڵــە نــەک لــەم ســیانە

واتە: پوختەی قسە ئەوەیە کە کەلامی نەفسی وەکوو شتەکانی تـری جیهـان چـوار وجـوودی هەیە:

یەکەم: وجوودی عەینی

دووەم: وجوودی زیهنی

سێهەم: وجوودی لەفزی

چوارەم: وجوودی خەتتی

دیارە وجوودی خەتتی دەلالەت دەکات لەسەر وجـوودی لـەفزی، وجـوودی لـەفزی دەلالـەت دەکات لەسەر وجوودی زیهنی، وجوودی زیهنیش دەلالەت دەکات لەسەر وجوودی عەینی.

وجوودی عەینیی کەلامی نەفسیی خودای گەورە ئەو سیفەتەیە کە بە زاتی خوداوە راوەسـتاوە کە قەدیم و ئەزەلی و یەکە. وجوودە زیهنییەکەی ئەو وشـانەیە کـە قورئـانلەبـەرەکان لەبـەریان کردووە. وجوودی لەفزییەکەی ئەو لەفزانەیە کە ئێمە دەیانخوێنینەوە. وجـوودی خەتتیشـی ئـەو نەخش و پیتانەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا نووسراون.

جا کەلامی نەفسی لە لایەنی وجوودە عەینییەکەوە کە بـە زاتی خـودای گـەورەوە راوەسـتاوە یەکە و قەدیم و بێخەوشە و دوورە لە رەنگ و شێوە و نیشانەی (حدوث) و ئاوێنەی پـاک و بـێ-گەردە و تۆز و ژەنگی زۆری و تەعەددود و حادیسـییەتی پێـوە نییـە، بـەڵام لـە لایـەنی وجـوودە زیهنییەکەیەوە لەبەردەکرێت. لە لایـەنی وجـوودە لەفزییەکەیـەوە دەخوێنرێتـەوە و لـە لایـەنی وجوودە خەتتییەکەیەوە، دەنووسرێتەوە.

ئەوانەی کە نیشانەی حدووسی کەلام بن، وەکوو مەنسـووخییەت و ناسـخییەت، لەبـەرکردن و نووسینەوە، روو دەکەنە یەکێ لەم سـێ وجـوودە دواییـنـەی، روو ناکەنــە وجـوودە عەینییەکـەی. قەدیمی و وەحدەت و بەسیتیش روودەکەنە وجوودە عەینییەکە نەک ئەم سیانە دواییە.

شایانی باسە مەولەوی ـ بە رەحمەت بێ ـ لەم فەرموودەدا، واتە لە بڕیاردانی چوار جۆر (وجود)دا بۆ کەلامی نەفسی دوای فەرموودەی زانای پایەرز (تەفتازانی) کەوتووە کە لە شەرحی (عەقائیدی نەسەفییە)دا باسی کردووە.

ئێمە ئەگەر لەسەر زاهیری ئەم قسەی تەفتازانییە بڕۆین تووشی رەخنە دەبین؛ چونکە نە سوورەتی خەیاڵیی ئەلفازی قورئان وجودی زیهنیی کەلامی نەفسییە و نە ئەو لەفزانەی دەخوێنرێتەوە وجوودی لەفزیی کەلامی نەفسین، بەڵکو وجوودی عەینیی کەلامی نەفسی ئەو سیفەتەیە کە بە زاتی خوداوە راوەستاوە، وجوودی زیهنیی ئەو کەلامە نەفسییەیش سوورەتی هەمان کەلامی نەفسییە لە زیهنی کەسێکدا، ئەگەر بتوانێ تەسەووری بکات. هەروەها وجوودی لەفزیشی بریتییە لە نەفسی لەفزی (الکلام النفسی)، وجووده خەتتییەکەیشی نەخشی حەرفەکانی (الکلام النفسی) یە، وەک چۆن وجوودی عەینیی (خالد) زاتەکەیەتی و، وجووده زیهنییەکەی سوورەتی (خالد)ە لە دڵدا و، وجوودی لەفزیی بریتییە لە لەفزی (خالد)، وجووده خەتتییەکەیشی نەخشی نووسراوی (خالد)ە کە چوار پیتە.

لە راستیدا کەلامی لەفزی جیایە لە کەلامی نەفسی، چونکە وەک لەمەوپاش باسی دەکەین وشەی (کەلام) موشتەرەکی لەفزییە لە نێوان کەلامی نەفسی و کەلامی لەفزیدا. هەروەها کەلامی لەفزی چوار وجوودی هەیە: وجوودی عەینی کە خودی ئەو لەفزانەیە دەخوێنرێنەوە، وجوودی زیهنی سوورەتی ئەو دەنگەیە هاتووەتە دڵەوە، وجوودی لەفزی وشەی (الکلام اللفظی) یە، وجوودی خەتتیش بریتییە لە نەخشی نووسراوی (الکلام اللفظی) کە لەسەر قاقەز بنووسرێ.

حەق وابوو لەم باسەدا بیفەرمووایە: لەفزی (الکلام) دوو واتای هەیە، یەکەم کەلامی نەفسییە کە قەدیم و بەسیتە. دووەم کەلامە لەفزییەکەیە کە لە دەمی قسەکەردا یەک لە دوای یەکە و خەڵک دەیبیسێ، جا هەرچی سەر بە قەدیم بێ وەک بەساتەت ئەوە هیی کەلامە نەفسییەکەیە، ئەوەیش کە سەر بە حودووس بێ دەگەڕێتەوە بۆ کەلامە لەفزییەکە کە دەنووسرێتەوە و دەخوێنرێتەوە و دەکرێتەبەر، بەڵێ ئەوەندە هەیە ئەم کەلامە لەفزییە لە سوورەتی (فاتیحە) وە هەتا دوایی سوورەتی (ناس)، سەبارەت بە دەلالەت کردن لەسەر کەلامی نەفسی، وەکوو وجوودی لەفزیی کەلامە نەفسییەکە وایە، کە وەک دەلالەتی ئەسەر لەسەر موئەسیر دەلالەت لە کەلامە نەفسییەکە دەکات؛ چونکە ئەم لەفزانە زادەی کەلامە نەفسییەکەن.

قورئان وەها وەزع بۆ لەفزی دەكرێ [٩]
بۆ نەفسی دیسان هەم دادەنرێ
لەفزی وەک نەفسی بۆ حەق سیفەتە
چون لەسەر نەفسی (ذُو دَلاَلَة)ە
تەفاوتی بەین هەیە ئاشكار
نەفسی (بالذات)ە، ئەو بە ئیعتیبار
هەروەها سیفەت بۆ خودان هەردوو
بە (كلام اللة) موسەممان هەردوو
لە ئیزافەدا فەرقیان هەیە؛
ئیزافەی لەفزی مەعنای ئەمەیە: [١٠]
كە مەحزی تەئلیف (ربّ البشر)ە
لە تەسەرروفی مەخلووق ئەودەرە
(لا كسبَ لَهم فیهِ واكتساب
تنزیلٌ من العزیز الوهّاب)
ئیزافەی كەلام نەفسی مەعرووفە
ئیزافەی سیفەت ئەباڵ مەوسووفە

واتە: وشەی (قران) موشتەرەكی لەفزییە بۆ كەلامی نەفسی و لەفزی و بە شێوەی حەقیقەت، نەک مەجاز، بە هەردووكیان دەوترێت و، هەردووكیان سیفەتی خودای گەورەن، جیاوازییان لەوەدایە كە كەلامی نەفسی سیفەتێكە راستەوخۆ بە زاتی خوداوە راوەستاوە، بەڵام كەلامە لەفزییەكە لەو رووەوە سیفەتی خودایە كە دەلالەت لە كەلامە نەفسییەكە دەكات وەک دەلالەتی ئەسەر لەسەر موئەسیر، كە دەلالەتێكی عەقڵییە. واتە: هەروەک كەلامە نەفسییەكە، كە موئەسیرە، سیفەتی خودایە، كەلامە لەفزییەكەیش، كە ئەسەرەو لەوەوە پەیدا بووە، سیفەتیەتی.

هەروەها هەردووكیان ـ نەفسی و لەفزی ـ ئیزافە دەكرێنە لای خودای گەورە، بەڵام ئەم دوو ئیزافەیە لە مەعنادا جیاوازن؛ ئیزافەی كەلامی نەفسی كە دەڵێت (كلام الله) واتە: كەلامێكە لە كەلامە نەفسییەكەوە پەیدابووە و پێوەندی هەر بە خوداوە هەیە، بێجگە خودا كەس دەستی نییە

لە دانانیدا و، بە گەیاندنێکی خودایی بە جیبرەئیل گەیێنراوە، کە فریشـتەی وەحیـە، ئـەویش بـە حەزرەتی پێغەمبەری گەیاندووە(د.خ).

کە نەفسی و لەفزی لێـت بـوو موحەققـەق
بـزان ئیتتیفـاق هـەس بـۆ ئـەهلی حـەق
لەمـــەدا ئـــەووەڵ قەدیمـــە و ئەقـــدەس
جـــەوازی حـــودووس تـــەعللوقی هـــەس
بەڵـــێ خیلافیـــان هـــەس لـــە دووەمـــدا:
بـــەعزێ نـــەس دەنـــێن وەســـەر قیدەمـــدا
بـــەعزێ تـــەک ئـــەولای بەداهـــەت دەدەن
حوکم بە خەلقی و حودووســی دەکـــەن[١١]
بـــــەعزیکیچیان، حـــــەق بیانبەخشـــــێ،
دەڵـــێن لـــە تەقـــدیر حدووســـیچ دەشـــێ
غایـــــەتی ئـــــەدەب ریعایـــــەت بکـــــەی
نـــاوی بـــە مـــەخلووق بـــە حـــادیس نەبـــەی
نـــەک لـــە داللـــەوە زیهنـــت لـــوول بـــدا
نیســـبەتی حـــودووس بـــە مـــەدلوول بـــدا
ئـــەم هـــەم بـــە قـــەدیم بگـــرە بـــە مەحکـــەم
(و هــــــذا هــــــو الأســــــلم الأقــــــوم)

واتە: پاش ئەوە کەلامی نەفسی و لەفزیت بۆ دەرکـەوت بزانـە ئـەهلی سـوننەت لەسـەر ئـەوە یـەکیان گرتـووە کـە کـەلامی نەفسـی قەدیمـە و بـە زاتی خـودای گـەورەوە راوەسـتاوە وەکـو سیفەتەکانی تری، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ئەم کەلامە یەک سیفەتە و نەبوونی لێ پـیش نەکـەوتووە دروستە پێوەندی هەبێ لەگەڵ واجب و مومتەنیع و مومکیندا. ئەم پێوەندییە لە کاتی گێڕانەوەی رووداوێک یـا لـە کـاتی داوای کـردن یـا نـەکردنی کارێکـدا پەیـدا دەبێـت. بـەڵام بـە لای زانـا پایەبەرزەکانی زانیاریی کەلامەوە ئەم پێوەندییە هی خودی کەلامە نەفسـییەکە نییـە، بەڵـکو بـە هۆی کەلامە لەفزییەکەوەیە کە لە کەلامە نەفسییەکە پەیـدابووە، لـە کـەلامی لەفزیـدا ئیخبـار و ئینشاء هەیە، لە ئیخبارەکەدا رابوردوو و ئێستە و ئاینده هەیـە، لـە ئینشاکەشـدا ئـەمر و نـەهی و

ئیستیفهام و نیدا و تەعەججوب هەیە، ئەگەرنا لە کـەلامی نەفسـیی ئـەزەلیدا رابـوردوو (ماضـی) تەسەوور ناکرێت.

ئەمجار مەولەوی ئەفەرموێت: بەڵێ زانایان لە قەدیمی و حادیسیی کەلامی لەفزیدا خیلافیـان هەیە؛ هەندێ لە ئەهلی سوننەت وەکوو زاناکانی ڕێبازی حەنبەلی لایـان وایـە ئـەویش ئـەزەلی و قەدیمە، واتە هەر وەکـوو کەلامـە نەفسـییەکە قەدیمـە، کەلامـە لەفزییەکـەیش قەدیمـە و، ئـەم بەرودوایە لە ئەلفازی ئێمەدا هەیە لە کەلامی خودادا نییە، ئەوەیش پێویسـت نییـە کـە چۆنیـەتی ئەوەمان بۆ دەرکەوێ هەر خـودا خـۆی دەیزانـێ، هـەروەک چۆنیـەتی سـیفەتەکانی تریمـان بـۆ دەرناکەوێت.

هەندێکیش لە زانایانی ئەهلی سوننەت لایان وایە حادیسیی کەلامە لەفزییەکە شتێکی بەدیهی و ئاشکرایە، ئەوەتا حەرفەکان و وشـە و رسـتەکان پـاش و پێشـن و یـەک لـە دوای یـەک دێـن، هەروەها ئەم کەلامە لە (لوح المحفوظ)دا نووسراوە، لەوحیش حادیسـە هـەرچیش لەسـەر شـتی حادیس نووسرابێ حادیسـە، هـەروەها خـودای گـەورە لـەفزەکانی دروسـت کـردووە لـە رۆحـی حەزرەتی جیبرەئیلدا، ئەویش هاتووەتە خوار بۆ لای حەزرەت(د.خ) و خوێندوویەتیەوە بە سەریا، حەزرەتیش بە تەواوی لێی وەرگرتووە و بە جیهانی گەیاندووە، لەگەڵ ئەمەشدا هەر بـە راسـتی و حەقیقەت (کلام الله) یە، واتە بێجگە خودا کەس پێوەندی بەو کەلامەوە نییە، نە فریشتە نە پەری نە ئادەمزاد.

هەندێکیش دەڵێن: حادیسیی لەفزەکان حادیسیی راسـتەقینە نییـە، چونکـە ئـەو لەفزانـە لـە عیلمی خودادا بوون و، وەک شتێ نین ماوەیەک لەمەوپێش نەبووبێ و لـە پاشـاندا پەیـدا بووبـێ، کەوابێ حاڵەکەیان (تقریر الحدوث)ە نەک حادیسیی راستەقینە.

بەڵام ئەگەر ئینسان لایەنی ڕێز و ئـەدەب بگـرێ، تەنانـەت لەسـەر رای ئەوانـەش کـە دەڵـێن کەلامی لەفزی حادیسە، حەق وایە ناویـان بـە حـادیس نـەبات، نـەبادا بـە هـۆی دانـانی کەلامـە لەفزییەکەوە بە حادیس، کە ئەسەری کەلامە نەفسـییەکەیە، زیهـنی ئینسـان گێـژ ببـێ و سـوور بخوات و بازبدا بـە سـەر لەفزەکـەدا و؛ کەلامـە نەفسـییەکەش ـ کـە مـەدلوولی عەقڵـیی کەلامـە لەفزییەکەیە ـ بە حادیس حیساب بکات، کە بە رای هەموو ئەهلی سوننەت قەدیمە.

کەواتە با ئەم باوەڕە رابگرین و کەلامە لەفزییەکەش بە قەدیم دابنێین؛ ئەم بیر و باوەڕە راسـت و بێگەردە و لە هەموو بیرێکی تر سەلامەتترە بۆ ئایین و ئەهلی ئایین.

جا منیش لێرەدا ئەڵێم لەمەوپێش بیروڕای مەولانا جەلالـەددینی دەووانـیم بـۆ گێڕانـەوە کـە وتوویە: کەلامە لەفزییەکە، کە کەلامی لەفزییە و تابیعی سیفەتی تەکەللوومی خودایـە، قەدیمـە و لە عیلمی خودادا بە تێکڕایی سابیتە و هەرگیز حادیس نییە، ئەوەی حادیس بێ گەیاندنەکەیـەتی بە جیبرەئیل و نووسینەکەی (لوح المحفوظ) یەتی و هێنانیەتی بـۆ حـەزرەتی (محمدالمصـطفی) دوروودی خودای لەسەر، لەگەڵ خوێندنەوەی ئێمەدا، نابێ کەلامی لەفزیی خودای گەورە لەگـەڵ کەلامی لەفزیی دروستکراوانی خودادا بەراورد بکرێ. هـی خـودا قەدیمـە و نـەبوونی لـێ پـێش نەکەوتووە، هی مەخلووقیش حادیسە، لـە پێشـدا نـەبووە و تـازە بـوون رووی تـێکـردووە، ئیتـر ماهییەتی کەلامی لەفزیی خودا بە ئێمە روون ناکرێتەوە و لە توانـا و وزەی هـۆش و بـیری ئێمـە بەدەرە، تەنها ئەوەندە بەسە باوەڕت هەبێ بە قـەدیمیی کـەلامی نەفسـی و لـەفزیی خـودا، وەک باوەڕت بە قەدیمیی بیستن و بینینی هەیە.

هەندێ لە زاناکانی عیلمی کەلام فەرموویانە بیروڕای شـێخ (ابـو الحسـن)ی ئەشـعەریش هـەر ئەمەیە کە ئێستە باسمان کرد، بەڵێ ئەشعەری فەرموویەتی:

«کەلامی خودا مەعنایێکە بە زاتی خوداوە راوەستاوە». مەبەستی ئەشعەری لـە (مـەعنا) تـەنها واتای لەفز یا تەنها سیفەتە نەفسییەکە نییە، بەڵکو مەبەستی لە (مەعنا) ئەمری قـائیمبەزاتەوەیـە، چ سیفەتە نەفسییەکە، کـە بـە ئیتتیفـاقی هـەموو لایـەک قەدیمـە و چ کۆمەڵـە لـەفزەکان، کـە ئەوانیش بە شێوەیەکی شایستەی زاتی خودا پێـوەی راوەسـتاون، ئیتـر نابـێ بـیر لـە بـەرودوایی حەرف و لەفز و ئایەتەکانی بکرێتەوە، ئێمە حەقیقەت و کونهی زیندوویەتی و زانـین و خواسـت و توانا و بیستن و بینینی خودای گەورەمان بۆ دەرناکەوێ و داوای ئەوەشمان لێ نەکراوە. ئەوەنـدە پێویستە باوەڕمان هەبێ بەوەی کە خودا هەموو دەنگێ ئەبیسێ، هەموو رەنگێ ئـەبینێ، زینـدووە، زانایە، خاوەن خواستە، توانادارە، خاوەن کەلامە، ئەم سیفەتانەیش هەموویان قەدیمن و نـەبوونیان لێ پێش نەکەوتووە.

تەماشا بکەن خودا فەرموویەتی (و علّم آدم الاسماء کلّها) دیارە ئەو ناوانە کە بە حەزرەتی ئادەم فێرکراون دوو پیتی و سێ پیتی و چوار پیتی و زیاتریشیان تیایە، بە یەک جار وێنەی ئەو ئیسمانە لە (حافیزە)ی حەزرەتی ئادەمدا حازربوون بێبـەرودوایی، بـەرودوایی لـە خۆیندنەوەیانـدا هەیـە، هەروەها هەرچی وشەی کتێبە ئاسمانییەکانە لە (ئادەم) ەوە تا (خاتەم) دروودی خودایان لەسـەر، هەر لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد لە عیلمی خودادا حـازر بـوون و حـازرن و (مەعییـەت) لـە (وجـودی

عیلمی)ی هەموویاندا هەیە و بووە... ئیتر هیچ زیانێ لەوەدا نییە لە کاتی نووسین لە (لوح المحفوظ) یا لە کاتی ئیترال و تەنزیلدا شێوە و وەزعی وا هەبێ لەگەڵ عادەتی ئێمەدا بێتە جێ.

من خۆم لە بابەتی کەلامی لەفزییەوە بیر و باوەڕم وایە کە قەدیمە و بە زاتی خوداوە راوەستاوە بە جۆرێ کە شایانیەتی و خۆی کونهەکەی دەزانێت. (هذا اعتقادی و علی الله اعتمادی).

بینا لە تەقریر تەفسیلی سابیق[۴]
ناشنەویە کەلام ئەزەلیی خالیق
ئیمجار سا زەریف بدوێ ئاگاهی[۱۲]
مانای (سمعتُ کلام اللة)ی
یانی بهیستم نەزمی موئەللەف
دال لە کەلامی ئەزەلیی ئەشرەف
یا فامیم کەلام ئەزەلیی خودا
لە حەرف و ئەسوات مەسمووعە و سەدا[۱۳]
لە هەردوو سوورەت وا دیاری دا
بۆ گشت ئەنبیا و مەخلووقی دنیا
مومکینە کەلام حەق بشنەوییە
تەخسیسی مووسا بە تەکلیم چییە؟
دەڵێم سەماعێ و ئەو داگیە روو
ئەوە بە تەریق خەرقی عادەت بوو
بیلا سەوت و حەرف، بیلا کەیفییەت
هەر وەکوو روئیەت رۆژی قیامەت
یا بیستی بە حەرف سەوت و سەداوە
ئەمما بە گشت (عضو) لە هەموو لاوە
یا لە یەک لاوە نەک ئەو سەدا وێ
کە تێیدا دەخڵ بۆ ماسیوا وێ

وەک تەوەســــوتی مەلـــەک و کیتـــاب
هەر سێیان بە وەجهــ تەخسیســن حیسـاب
واتـــە تەلـــەقیی جیبریلـــی ئـــەمین
بـــۆ وەحیـــی حـــەزرەت (ربّ العـــالمین)
وەهـا بـوو سـەماع سـاحیب تـەخت و تـاج
بـــۆ کـــەلامی حـــەق شـــەوەکەی میعـــراج
(فالحمـــــدُ لِلـــــه علـــــی نِعمتِـــــه
خَـــصَّ مَـــن یشـــاء بِمَرحَمتِـــه
ثـــم الصـــلاةُ مَـــع ســـلام تـــامّ
علـــی النبـــیّ و آلـــهِ الكـــرام)

ناشنەویە = ناشنەویێ: نابیسرێ. بدوێ: بتبێ. بهیستم: بیستم. فـامیم: تێـی‌گەیشـتم، لێـی حالی بـووم. بشـنەوییە = بشـنەویێ: ببیسـرێ. داگیـە روو = داویـە روو: رووی‌داوە. وێ: ببـێ. ماسیوا: غەیری خودا.

واتە: لەسەر ئەو تەقریرە درێژە پێشووە، کە کەلامی نەفسی سیفەتێکە قەدیم و بە زاتی خوداوە راوەستاوە، ئەو کەلامە نەفسییە ئەزەلییە نابیسرێ، جا کە لەمە حالی بووی بزانە: واتـای «سمعـت کلام الله» ئەوەیە ئەو کەلامە لەفزییە تێکەڵ لە پیت و دەنگەم بیست کە دەلالەت لەسەر کەلامـە نەفسییە ئەزەلییەکەی خودا دەکات، یا خۆ واتاکەی ئەوەیە کە لەو پیـت و دەنـگ و ئـاوازەوە کـە بیستم لە کەلامە نەفسییە ئەزەلییەکەی خودا حالی بووم و تێگەیشتم.

جا کە واتای (سمعت کلام الله) ئەوە بوو دیارە ئەم بیستنی کەلامی خودایە بەم شێوە بۆ هەموو مرۆیەکی شنەوا دەس دەدات و مومکینە کەلامی خودا ببیسرێت، ئیتر ئەبێ هـۆی جیاکردنـەوە و هەلاوێردنی حەزرەتی مووسا بۆ گفتوگۆ کردن لەگەڵ خودادا چی بێت؟

واتە: کەلامی نەفسی خۆبەخۆ نابیسرێت، ئـەوەی دەبیسـرێ کەلامـە لەفزییەکەیـە، جـا لەبـەر ئەوەی ئەم کەلامە لەفزییە دەلالەت دەکا لە کەلامـە نەفسـییەکە بیسـتنی کەلامـە لەفزییەکـە و لێ‌حالی‌بوونی وەک بیستنی کەلامە نەفسییەکە و لێ‌حالی‌بوونیەتی و، مووسا و غەیری مووسـاش ئەمەیان لێ دێت، ئیتر بۆ حەزرەتی مووسا جیاکراوەتەوە و بە (کلیم‌الله) دانراوە؟

جا مەولەوی دەفەرموێت ئەو بیستنی کەلامی خودایـە بـۆ حـەزرەتی مووسـا ڕێکـەوتووە، بـە پێچەوانەی عادەتی خەڵک بووە و تێکدانی ئەو عادەتە بـووە، بـەبێ پیـت و دەنـگ و بـەبێ لـوول خواردنی هەوا و گەیشتنی بە گوێ جێبەجێ بووە بۆی، وەک چاوپێکـەوتنی خـودای گـەورە لـە ڕۆژی قیامەتدا، کە باوەڕمان وایە بەبێ بەرامبەری، بێ جیسم، بـێ لا، بـێ مەرجـە عادەتییـەکانی بینین موسوڵمانان لە ڕۆژی قیامەتدا خودای گەورە دەبینن (وجوه یومئذٍ ناضرةٌ الـی ربهـا نـاظرة)(١٤).

یان حەزرەتی مووسا(د.خ) کەلامی خودای بە هۆی پیت و دەنگەوە بیست، بەڵام لە یـەک لاوە نەبوو، وەک عادەت وایە، بە تەنیا گوێچکە نەبوو، بەڵکو بە هەموو ئەندام و لە هـەموو لاوە بیسـتی، ئەمەیش خیلافی عادەتی خەڵکە؛ چونکە شنەوا بە گوێ وتـار و گفتوگـۆ ئەبیسـێت و لـە لایـەکی تایبەتییەوە دەنگەکە وەردەگرێت.

یان حەزرەتی مووسا فەرموودەی خودای لە یەک لاوە بیست، بەڵام بە پیت و دەنگێ نەبوو کـە دەخڵی غەیری خودای تێدا بێت، واتە: دەنگێکی تایبەتی بوو کە جیاواز بـوو لـە دەنـگ و ئـاوازی مرۆ لەم جیهانەدا. بە هۆی فریشتەیشـەوە نـەبوو، وەک ئـەوە نـەبوو کـە جیبرەئیـل قورئـانی بـۆ حەزرەتی (محمد المصطفی) هێنا.

جا هەرکام لەم سێ شێوە وەربگری ئەوەمان بۆ دەردەخات کـە چـۆن حـەزرەتی مووسـا(د.خ) جیاکراوەتەوە و بە (کلیم الله) دانراوە؛ چونکە هیچ کام لەم شێوانە عادەتی نییە و (خرق العادە)یە.

پێویستە بزانن کە وەرگرتنی فریشتەی وەحی بۆ کەلامی خودا هەر بە یـەکێ لـەو سـێ شـێوە بووە، گفتوگۆی خودای گەورەیش لەگـەڵ پێغەمبـەری نـازدارا لـە شـەوی (معـراج)دا و بیسـتنی پێغەمبەر بۆ کەلامی خودا بە یەکێ لەو سێ شێوە بووە، بەڵام لەبەرئەوە کە هەر لە تاقە شەوێکدا بووە و بۆ حەزرەتی مووسا زۆر جار بووە، حەزرەتی (موحەممەد) دروودی خودای لەسەر، بە (کلیم الله) ناوی دەرنەکردووە و ئەم ناوە تەنها هی حەزرەتی مووسایە.

هەر بۆ خودایە ستایشی بێپایان لەسەر ناز و نیعمەتی بـێشـومار و فـراوانی خواسـتی لەسـەر پیرۆزی و بەختەوەریی هەرکەس بوو بە تایبەتی ڕووی ڕەحمەتی خۆی تێدەکات.

هەزاران درووود بۆ ڕەوانی پاک و خاوێنی پێغەمبەران بە تایبەتی حەزرەتی (محمـد المصـطفی) کە دواهاوەری پێغەمبەرانە، هەروەها بۆ ڕەوانی هەموو دەستە و بەستە و یاران و پەیـڕەوانی هـەتا هەتایە.

***

١ـ ئەم سەرباسە لە دەستنووسەکەدا نییە، هیچ ئیشارەیێکیش نییە بۆ ئەوەی سەرباس لەم شوێنەدا ببێ. لە چاپەکەدا لە پێش بەیتی «ئەمما تەرزێ تر...» دا دانراوە، بەڵام ئەگەر سەرباس پێویست بێ و ببێ، ئەمە شوێنیەتی کە باوکم دایناوە.

٢ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا نووسراوە: «فی بحث صفة الکلام» واتە: ئەم تەقریرە لە باسی سیفەتی کەلامدا وتراوە.

٣ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا نووسراوە:

«هذا هو ما أحاله الناظم بقوله:

تەفسیلی کەلام ئەر لەگرە کەم بێ

راوێس؛ حەواڵەی ئەسڵی سێیەم بێ»

٤ـ «کوا بە تواتر» شێوەنووسی نوسخە دەستنووسەکەی بەردەستمانە، کە نیوە شیعرەکەی کەمێک پێ قورس دەبێت بەڵام لە نوسخە چاپەکەدا (کوا تواتر)ە. بەم جۆرە شیعرەکە سوار دەبێ و، رستە بەندییەکەی بێهێز. نازانم بۆ نەیفەرمووە (کە بە تەواتور... تاد)؟ بە دووری نازانم (کۆ تواتر) بووبێت کە دەبێتە (کە وە تەواتور) و ئەلفەکەی بە هەڵە نووسرابێ.

٥ـ دەستنووس و چاپەکە هەردوو (هر بە لباسی) یان نووسیوە، بە پێی بوچوونی من دەبوا (بە هەر لباسێ) بوایە.

٦ـ ئایەتی (١٠٩) سوورەتی (کهف).

٧ـ ئایەتی (٢٧) سوورەتی (لقمان).

٨ـ لە دەستنووسەکەدا لەپاڵ وشەی (کلام)دا نووسراوە: «فیه لطافة»، واتە: مەبەست لە «کلام» قسەیە، واتە پوختەی قسە... تاد، یا مەبەست کەلامە نەفسییەکەیە.

٩ـ لە نوسخە چاپەکەدا (دها) = (دەها) یە، دیارە هەڵەیە.

١٠ـ لە چاپەکەدا ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو پاش و پێش کراون، ئەمەی ئێمە کە ڕێکی دەستنووسەکەیە ڕاستە، هی چاپەکە هەڵەیە.

١١ـ لە چاپ و دەستنووسدا (خەلقی) نووسراوە وا بزانم ئەبوا (خەلق) بوایە. کە بەم جۆرەی لێ دەهات (حوکم بە خەلق و حودووسی دەکەن).

١٢ـ لە دەستنووسەکەدا (بیدوی) یە، چاپەکە (بدوی) = (بدوێ) یە.

١٣ـ لە چاپەکەدا (لە حەرف و سەوتی... تاد)ە.

١٤ـ ئایەتی (٢٣ـ٢٢) سوورەتی (قیامە).

## مبحث الأنبياء والرسل عليهم السلام [1]

ئەسڵــــی چـــوارەم بـــەبێ قوولـــەقوول
ئیزعانـــە بـــە جـــەمع نـــەبیی و رەســـوول
لـــە شـــەریعەتدا بـــە قـــەولی موختـــار
رەســوول شەخسـێکە راس‌فیعــل و گوفتــار
لـــە بـــەنی‌ئـــادەم ســـاحیب فـــەزائیل
ئـــازاد، موزەککـــەر، پـــاک لـــە رەزائیـــل
ئەکمـــەل و ئـــەفزەل عقـــلاً و خُلقـــاً
قـــــوةَ رأيٍ، فطنـــــــــة، خَلقـــــــاً
بــە شــەجاعەت و بــە حیکمــەت و جــوود
عیففەت و تـەقوا و خەشـیەت لـە مـەعبوود
بە عیلم و بـە حـیلم لـە گشـت هاوعەسـران
ســـیوای ســـینفی خـــۆی یانـــێ ئـــەنبیان
(بنَســـــبِهِ قَــــــطُّ لـــــم تَقُـــــم
دنـــــــــاءة الأب، خنـــــــــاءةُ الأمَّ)
پاک وێ، هەر لە وەخت ئیبتیدای بەعسـەت
تـــا بـــە ئیســـتیقرار ئـــەمری نوبـــووەت،

لە گـولی، لالـی و کـوێری و هـەر ئافـەت[٢]
کـەوا تـەبعی خەڵـق لێـی بکـا نـەفرەت
بـەری وێ لـە عـەیب کـەمیی مـورووەت
لـە دوونیـی سـەنعەت وەکـوو حەجامـەت
عوقـــدەی زوانی مووســای زوو لابــرد
حـەق لـەو وەختـەدا کـە رەوانـەی کـرد
(و لایــــردُ بــــلاء أیّــــوب
و عَمـــی نحـــوِ حضـــرة یعقـــوب؛
إذِ المقــــارن کــــانَ ذا الإضــــرار
و همـــا کانـــا بَعـــدَ الاســـتقرار)

واتە: ئەسڵی چوارەم لە شەش ئەسڵەی ئیمان، بەبێ هەرا و هۆریا و شەڕەقسە، بریتیەە لە باوەڕ بە هەموو (انبیاء) و (مرسلین) واتە: ئەو رەهبەرانەی کتێبیان نییە و پێ‌گەیاندنیان پێ نەسـپێرراوە و، ئەو رەهبەرانەی کتێبیان هەیە و پێیان سپێرراوە بە خەڵکی راگەیێنن، واتە: بـاوەڕت ببـێ کـە ئەم زاتانە خودا هەڵی‌بژاردوون لە ناو ئادەمزاددا و کردوونی بە شوێنی نووری میهرەبـانیی خـۆی و دڵی پیرۆزی رووناک کردوونەتەوە و رەهبەرە خاوەن کتێبەکانی کـردووە بـە رابـەر و رەهنومـای ئادەمزادەکانی تر تا رێگەی بەختەوەری و سەربەرزیی هەتاهەتایان پیشان بدەن.

بە پێی شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام (رەسول) ئینسانێکی وەهایە لە وتار و رەفتاردا راسـت بێـت، درۆ نەکات و لە کار و کردەوەدا فڕوفێڵ نەکات، خاوەن فەزیلەت بێت، ئازاد بێـت، بەنـدە نـەبێت، نێرینە بێت.

رەهبەر نابێ ژن بێت، پێویستە پاک بێت لە خوو و رەوشتی ناپەسەند، وەک لـە خۆبـاییبـوون، رق و کینە و بەخیلی بە خەڵک بردن و تەماعکاری. پێویستە لە خوو و رەوشتی بەرز و لـە هێـزی بیر و تێگەیشتن‌دا لە ئادەمزادەکانی تر تەواوتر بێت.

پێویستە لە سەر و سیمادا جوان و رێک‌وپێک بێت. پێویستە ئازا و چاونەترس و دانا و پەسـەند کار و بەدەس و دەهەندە بێت، داوێن‌پاک و پارێزگار و لەخوداترس بێت. پێویستە لە زانسـت و لـە سەرخۆیی و سینگ‌فراوانیدا لە هەموو هاودەم و هاوزەمانانی خۆی، بێجگـە پێغەمبـەران، بـالاتر و دیاریتر بێت.[٣]

پێویستە پێغەمبەر لەو خەوشانە دوور بێ کە دەبنە هۆی دوورخستنەوەی خەڵک لە پەیڕەوکردن و ئیمان پێهێنان، چ لە ڕشتەی باوک و باپیری و دایک و داپیری، وەک مەشهووربوونی یەکێکیان بە خوویەکی ناشایستە و مایەشەرم و، چ لە نەفسی خۆیا بێ وەکوو ناپیاوی و کار و پیشەی پەست و بێنرخ. هەروەها پێویستە هەر لە سەرەتای پێغەمبەرییەوە تا دامەزران و جێگیربوونی، دوور بێ لە کەچەڵی و لاڵی و گوڵی و بەڵەکی و گەڕۆڵی و نەخۆشی تری وەها کە ببنە هۆی دوورکەوتنەوەی خەڵک لێی و باوەڕنەکردنیان پێی.

جا ئەگەر لەم ڕووەوە بە لاڵیی حەزرەتی مووسا و نەخۆشی و زاماریی حەزرەتی ئەیووب و کوێربوونی حەزرەتی یەعقووب(د.خ) رەخنە بگیرێت، لە وەڵامدا ئەڵێم: کاتێ کە خودای گەورە حەزرەتی مووسای کردە پێغەمبەر و ناردی بۆ سەر بەنیئیسرائیل و فیرعەون و قیبتییەکان حەزرەتی مووسا داوای لێ کرد ئەو گرێ و گۆڵەی زمانی لاببا و هاروونی برایشی بکاتە پێغەمبەر و وەزیر و یاریدەری، خودای گەورەش داواکەی جێبەجێ کرد و گرێی زمانی کردەوە.

نەخۆشی و کەنەفتیی حەزرەتی ئەیوب و کوێربوونی حەزرەتی یەعقوبیش لە پاش دامەزرانی پایەی پێغەمبەرایەتییان بوو؛ ئەوەی زیانی هەیە ئەوەتە کە لە کاتی هاتنی خەڵاتی پێغەمبەرایەتیدا تووش ببن.

ئەو سیفەتانەی کە وتمان پێویستە لە پێغەمبەراندا هەبن هەموو خوو و ڕەوشتێکی بەرزن و شایانی پێغەمبەرانن، کتێبەکانی زانیاریی کەلام و عەقائید لە ناو ئەم سیفەتانەدا چواریان زۆر بە موهیم داناوە کە بریتین لە ڕاستی و، داوێن پاکی و، زیرەکی و، دەستپاکی. واتە: پێویستە پێغەمبەران ڕاستگوفتار و خاوەن نامووس و داوێنپاک و زیرەک و دەستپاک و باوەڕپێکراو و جێی متمانە بن بۆ ئەوەی حوکمەکانی خودا بە خەڵک ڕابگەیێنن، پێچەوانەی ئەم چوار سیفەتە بۆ پێغەمبەران ناشایستە و ناجۆر و مەحاڵن. ئیتر هەرچی سیفەتە عادەتییەکانی ئادەمزادە، وەک خواردن و خواردنەوە و خەوتن و نەخۆش کەوتن و حاڵاتی تر، وەک خەڵکی تر هەیانە بۆ ئەوانیش ڕەوایە و شتێکی عادەتییە.

مەعسووم بێ لە گشت گوناهان سەرجەم
لەدوای نوبووەت لەوێوبەریچ هەم
(عَلى المختار، بل هو الصواب
فی «الفتح المبین» قالە الشهاب) [٤]

هـەرچی لـە قەسـەس تەفسـیردا هەیـە
لـــە موخـــالیفی ئـــەو مەزکوورەیـــە
ئـــەرچی نـــاقیلی شـــەئنی قـــەوی وێ
وەکـــو ئەوحـــەدی[٥] یـــا بەغـــەوی وێ[٦]
(فَـــارْدُدْهُ و لا تَعتَمِـــد عَلَیـــه،
إن کـــان الآحـــاد، لا تنظـــر إلیـــه)
(و مـــا تـــواتر کمـــا فـــی القـــرآن
مـــن أثبـــات الظلـــم و نحـــو العصـــیان)
(و مَـــن عتـــاب بعـــضٍ مـــنهُمُ
علـــی أمـــورٍ هـــم بهـــا هَمّـــوا)
خـــاترت جـــەم بـــێ تـــۆ، لـــەو بابەتـــە
هـــیچ خەلـــەل نییـــە، بـــۆچ؟ لـــەو بابەتـــە
سەیید دەگەڵ عەبـد مـەملووک، یەقینـە،
بـــە هـــەرچی خیتـــاب دەکـــا شـــیرینە
(و مِـــن بـــاب أن عَاتَـــبَ المـــولی
عبَـــدهُ علـــی خـــلاف الأولـــی)
وەک موعاتەبـــەی ئـــەهلی خەتییـــەت
لەسـەر ئیقـتیراف ئیسـم و مەعسـییەت
إذ شُـــهِرَ مَـــن کـــان مَحرمـــاً[٧]
فبنقطـــــةٍ صـــار مُجرمـــاً
حەسـەنەی ئـەبرار بـا شـەوق و ئـەدەب
سـەییئەس لـە لای گـورۆی موقـەڕڕەب
لێی گەڕێت، چاکە، بێسەفای مـەحجووب
لە ئەسراری بەین موحیب و مـەحبووب[٨]

أدّى ذا الخــــلاف بتلـــــک الألفــــاظ
جنـــــابُ الحـــــقّ زجـــــراً للأيقـــــاظ
بـــۆچ؟ ئـــەلفازی وا دەرحـــەق ئـــەکابیر
تەهدیـدە و عیـبرەت دەرحـەق ئەسـاغیر
ئـــەنبیای کـــیرام (علـــیهم ســـلام)
ئـــەفزەلن لـــە گشـــت مـــەلائیک تـــەمام
ئـەفزەل لـە مەعسـووم لـەملا مەعلوومـە
ئەڵـبەت بـە تـەریق ئـەولا مەعسـوومە
بەڵـــکو بـــۆ ئـــادەم عیتـــابیچ نـــەبوو
(إنّـــی جاعـــلٌ) بـــە گوێتـــەدا چـــوو
هـــات بەســـەریاندا ئـــەوە کـــە وا هـــات
(لکَـــی يُتحَفـــوا بفضـــل مـــا فـــات)

لەوێوبەریچ: لەوەوپێشیش. خاترت جەم وێ: دڵنیا بە. (لەو بابەتە)ی یەکەم: لەولایەنەوە، لـەو خسووسەوە. (لەوبابەتە)ی دووەم: لەوبابەیە، تە: یە. دەگەڵ: لەگەڵ. سەییئەس: سەییئەیە. گورۆ - گورۆهـ: کۆمەڵ.

واتە: پێغەمبەران(د.خ) مەعسوومن و دوورن لە هەموو گوناهێکی گـەورە و بچـووک، لـە پـێش پێغەمبەرایەتی و لە سەردەمی پێغەمبەرایەتییاندا. ئەمەش لەسەر هەڵبژاردەی فەرموودەی زانایان بەڵکو هەر ئەم فەرموودەیە راستە و جێگای متمانەیە.

شایانی باسە لێرەدا بۆ ئەوەی برادەرانی موسوڵمان زیاتر ئاگادار بن و لـە کـورۆکی مەسـئەلەکە حالی بـن پێویسـتە بیروبـاوەڕی زانیـاریی کـەلامتان بـۆ بـەیان بکـەم، پـاش ئـەوە فـەرموودەی مەولەویش لەگەڵ سەرچاوەکەیا دەگێڕمەوە بۆتان:

را و بیری خاوەنی کتێبی (مەواقیف) و خاوەنی کتێبی (مەقاسید) بە کورتی ئەمەیە:

سەعد لە شەرحی مەقاسیدا دەڵێت:

ئەوەی گومان ببرێ لە پێغەمبەرانەوە روو بدات و بە باش و جوان نەزانرێت یا دژی ئەوەیـە کـە موعجیزە دەلالەتی لەسەر دەکات، یا نا؟[٩] یەکەم یا کوفرە یـا شـتی تـر، ئـەوەی کـوفر نییـە یـا

گوناهی گەورەیە وەکوو مرۆکوشتن و هاوچەشـنی، یـا گونـاهێکی بچـووکی وەهایـە ببێتـە هـۆی دوورخستنەوەی خەڵک لە پێغەمبەر و پەیڕەوکردنی، یا وەها نییە. هەموو ئەم جـۆرە گوناهانـەش یا پێش بوونی بە پێغەمبەرە یا لە کاتی پێغەمبەرایەتیدایە.

جەماوەری زانایانی کەلام، لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەر ئـەوەن کـە پێغەمبـەران لـە پاش وەرگرتنی خەلاتی پێغەمبەرایەتی لە هەموو گوناهێک پارێزراون کە دژی دەلالەتی موعجیزە بێت، واتە: موعجیزە دەلالەت دەکات لـە سـەر ئـەوە کـە پێغەمبـەران راسـتگۆ و راسـتکـردار و داوێن‌پاک و خاوەن‌متمانە و زیرەک و وشیارن و لـە گەیانـدنی ئایینـدا بـە خەڵـکی دەس‌پـاک و ئەمینن. کەواتە هەر گوناهێ دژی ئەم سیفەتانە بێت پێویستە لە پێغەمبەران روو نەدات و پارێزراو بن لێی.

هەروەها پێویستە پێش بوون بە پێغەمبەر و لە کاتی پێغەمبەریدا لە هەر شتێ کە دژی ئیمـان بێ پارێزراو بن، پێویستە لە کاتی پێغەمبەریدا لـە هـەموو گونـاهێکی گـەورە پـارێزراو بـن، چ بـە دەسەنقەست و چ بە سەهو. هەروەها پێویستە لە گوناهی بچووکی دەسەنقەست پـارێزرابن، بەڵـام ئەو گوناهە بچووکانەی پەستی و دەنائـەت بـن، ئەوانـە چ بـە دەسـەنقەسـت و چ بـە سـەهو نابـێ لێیانەوە رووبدەن.

ئەمە هەتا ئێرە بیر و رای جەماوەری زانایان بوو. بەڵام بیروبـاوەڕی زانایـانی خـاوەن تـەحقیق لەسەر ئەوەیە کە پێغەمبەران(د.خ) لە هەموو گوناهێکی گەورە و بچووک پارێزراون، چ پێش بوون بە پێغەمبەر و چ لە کاتی پێغەمبەرییاندا.

وا لێـرەدا لـە بـەر ئـەوەی کـە حـەزرەتی مەولـەوی قسـەکەی داوەتـەپاڵ شـێخ ئەحمـەدی ئیبنوحەجەری هەیسەمی لە کتێبی (فتح المبین) دا، من قسەکەی ئـەو وەردەگێـرم بـۆ کـوردی، ئەو قسەی کە لە شەرحی حەدیسی دووەمدا وتوویە:

ئیبنوحەجەر دەفەرموێ:

«لە ئەرکانی ئیمانە باوەڕ بکەی بە پێغەمبەرانی خودا، واتە: باوەڕ بکەی بەوە کە خودای گـەورە رەوانەی کردوون بۆ سەر خەڵکی لێ‌پرسراو هەتا رێ‌نموونییـان بکـەن بـۆ رێگـای پـیرۆزی و بـۆ تەواوکردنی هۆیەکانی خۆشی و بەختیاریی دنیا و قیامەتیان. خـودا بـە مـوعجیزە یارمـەتیی ئـەم پێغەمبەرانەی داوە، کە دەبێتە دەلیل لەسەر راستییان، ئەوانیش فەرمانی خودایـان گەیانـد و، بـە هەموو دەست پاکی و خاوێنییەکەوە ئەوەی خودای گەورە ناردبووی بە خەڵکیان گەیاند.

پێویستە لەسەر هەموو کەس ڕێز لەو پێغەمبەرانە بگرێت و، لە ئەسڵی پێغەمبەرایەتی (نبـووەت و ریسالەت) و ئیمان پێهێنانیان‌دا فەرق نەکا لە بەینیاندا و باوەڕی بەوە ببێت کە خـودای گـەورە هەموو ئەوانی دوورخستووەتەوە لە هەموو عەیب و کەموکووڕییەک و، ئەوانە مەعسووم و پارێزراون لە گوناهی گەورە و بچووک، چ لە پێش نبووەتدا و چ لە کاتی نبووەتدا، ئەمـەیش لەسـەر قسـەی هەڵبژێرراو بگرە لەسەر قسەیەک کە هەر ئەوە راستـە و لەگەڵ حەقدایە. ئیتر ئەو قسـەو باسـانەی کە لە حیکایەتی هەندێ لە (مفسرین)ی قورئاندا هەن یا لە کتێبی (قصص الانبیـاء)دا نووسـراون، لەوانەی دژی ئەو بیره راستە بن کە وتمان، پشتیان پێ نابەسرێت و جێگای بڕوا نـین، ئەگـەرچی ئەوانەی گێڕاویانەتەوە پیاوی گەورە بن، وەک (بەغەوی) یا (ئەوحەدی).

ئەوەی لە قورئانی پیرۆزدا بەرچاو دەکەوێ کە ئادەم لە ئـەمری خـودا سـەرپێچی کـردووە، یـا خودای گەورە لەسەر هەندێ کردەوە (عتاب)ی لە هەندێ رەهبەر کردووە ئەوە وەک ئەوەتـە کـە خاوەن (سیّد) دەتوانێ بە هەر جۆرێ بیەوێ قسە لەگەڵ بەندە (عبد)ی خۆیا بکات، وەک ئەوەتـە کە خودا سەرزەنشتی بەندەی خـۆی بکـات لـە سـەر ئـەوەی کـە (خـلاف الاولی)ی لـە دەسـت دەرچووە[١٠] وەکوو چۆن سەرزەنشتی غەیری ئەوان دەکات لەسەر گوناهـ و تاوان.

لەمەوپێش باسمان کرد کە پێغەمبەران لە (خواص)ی فریشتە گـەورەترن، جـا کـە ئـەمان لـە فریشتەی بێگوناهـ گەورەتر بن چاکتر ئەبێ بێگوناهـ و پارێزراو بن».

(تەرجەمەکە تەواو بوو).

جا مەولەوی دەفەرموێت: پێغەمبەران(د.خ) مەحرەمن بە بارەگای خودای گەورە، (محرم) یش بە تاقە نوختەیەک دەبێ بە (مجرم). کەوابێ لەوانەیە خودا لەسەر (خـلاف الاولی) یـەک (عتـاب) یان لێ بکات.

لە لایەکی ترەوە رەهبەران موقەڕرەبی بارەگای خـودان و پایـەیان ئەوەنـدە بـەرزە و جێگـە و ڕێگەیان ئەوەندە دیارییە کـە کـرداری چاکـەی پیاوچاکـان ئەگـەر لـەوان بوەشـێتەوە بـە تـاوان دەژمێررێت.

لەپاشاندا مەولەوی دەفەرموێت:

ئەو کەسەی چاوی (بەسیرەت)ی بینا نەبێت و ڕێگای بینـینی نهێنییـەکانی خـۆش‌ویسـتن و خۆشەویستی لێ گیرابێت واباشـە واز لـەم باسـە بهێنێـت، پێغەمبـەران خۆشەویسـتی خـودان و

پێوەندییەکی تایبەتی لە نێوانیاندا هەیە و خودای گەورە بـە چـاوێکی تایبـەتی و جیـاواز لـە هـی خەڵکی تر کردەوەیان هەڵدەسەنگێنێ.

ئەگەر بڵێیت: کە کردەوەی پێغەمبەران لە بابەتی (خلاف الاولـی) بـووە ئـەی بـۆچی خـودای گەورە ئەو (خلاف الاولی)یە بە گوناهـ و لەبیرچوونەوە و بێ عەزمی و وێنەی ئەمانە ناو ئەبات؟

لە وەڵامدا ئەڵێم: بۆیە خودای گەورە بەو نـاوە قورسـانە نـاوی (خـلاف الاولـی)ی بـردووە بـۆ هەڕەشـە و ئاگادارکردنـەوە و ترسـاندنی غـەیری ئـەوان، چونکـە دەربـڕینی وەهـا رووبـەڕووی پێغەمبەرانی نزیک لە خودا و دۆستی خودا دەبێتـە هەڕەشـە و ترسـاندن و پەنـد بـۆ بچووکـان و ئەوانەی پایە و مەقامیان وەک پایە و مەقامی پێغەمبەران نییە.

لە لایەکی تریشەوە عیتاب رووی نەکردووەتەوە حەزرەتی ئادەم. بـە ئایـەتی (إنّـی جاعِـلٌ فـی الأرض خلیفة...) [11] خوا رێزی لە ئادەم گرتـووە، چونکـە پایـەی خیلافـەتی خـودا پایـەیێکی زۆر بەرزە.

روودانی ئەو (خلاف الاولی) یانە لە هەندێ لە ڕەهبەرانەوە هەر بۆ ئەوە بووە کە خودای گـەورە پێغەمبەرەکان ئاگادار بکات لە فەزڵ و شەرەف و گەورەیی ئەو لایەنە (اولی)یە کە لەکیسیان چوو، واتە: ئەگەر خودای گەورە باسی ئەو (خلاف الاولی) یەی نەکردایە ئەوان حاڵی نەدەبوون کام کـار زۆر بەنرخترە بۆ ئەوان.

واجبە لەسەر موسوڵمان بە دڵ رێز لە هەموو پێغەمبەران بگرێت و، باوەڕی وەها بێت کـە ئـەم پێغەمبەرانە پوختەو خولاسەی ئادەمزاد، بگرە پوختە و خولاسەی هەموو مەخلووقاتی خودا بـوون، پێویستە تەماشای ئەوە بکات کە خودا بە شێوەیەکی گشتی فەرموویەتی: (قل الحمد الله و سـلام علی عباده الذین اصطفی...) [12]، وە فەرموویەتی (سبحان ربّک ربّ العزّة عما یصفون و سلامٌ علـی المرسلین) [13]، وە فەرموویەتی (الله یصطفی من الملائکة رسلاً و مـن النـاس) [14]. هـەروەها لـە پیاهەڵدانی هەندێکیاندا فەرموویەتی (إن الله اصطفی آدمَ و نوحاً و آل ابـراهیم و آل عمـران علـی العالمین) [15]، وە دەربارەی حەزرەتی ئیبراهیم و نووح و گـەلێ لـە پێغەمبـەران فەرموویـەتی: (و وهبنا له إسحق و یعقوب کلاّ هدینا و نوحاً هدینا من قبلُ و من ذرّیّتـه داودَ و سـلیمانَ و ایّـوب و یوسفَ و موسی و هارون و کذلک نجزی المحسنین، و زکریّا و یحیی و عیسی و الیـاسَ کـلٌ مـن الصالحین و اسمعیلَ و الیسعَ و یونسَ و لوطاً و کلّاً فضّلنا علی العالمین) [16].

هەروەها دەربارەی حەزرەتی یووسف فەرموویەتی: (انه من عبادنا المخلصین) [۱۷]، بە حەزرەتی داوودیش دەفەرموێ: (یا داود إنا جعلناک خلیفة فی الأرض) [۱۸]، وە فەرمویەتی: (و خسّرنا مع داود الجبال یسبحّن والطیر و کنّا فاعلین) [۱۹]، وە فەرموویەتی (واذکر عبدنا داودَ ذا الأید انه أوّاب. إنّا سخّرنا الجبال مَعَهُ یسبحّن بالعشیّ والاشراق. والطیر محشورةً کُلٌّ لە أوّاب. و شددنا ملکه و آتیناه الحکمة و فصل الخطاب) [۲۰]، وە فەرموویەتی (و إنَّ له عندَنا لزلفی و حسنَ مآب) [۲۱]. دەربارەی حەزرەتی سولەیمانیش فەرموویەتی: (و أنّ له عندنا لزلفی و حسن مآب) [۲۲]، وە فەرموویەتی (و وهبنا لداود سلیمان نعم العبد إنّه أوّاب) [۲۳]. وە دەربارەی حەزرەتی (محمدالمصطفی) دروودی خودای لەسەر گەلێ ئایەت هاتووە، بۆ نموونە فەرموویەتی: (و ما ینطق عن الهوی إن هو الّا وحیٌ یوحی) [۲٤]، وە فەرموویەتی (و إنّک لَعَلَی خلقٍ عظیم) [۲٥]، وە فەرموویەتی: (یا أیّها النبیّ إنّا ارسلناک شاهداً و مبشّراً و نذیراً و داعیاً الیﷲ باذنهِ و سراجاً منیراً)[۲٦].

پوختەی قسە: پێغەمبەرانی خودا چەند دوڕڕێکن لە دەریای بەخشندەیی و میهرەبانیی خودا خۆیدا کە یەکەیەکە هەڵبژاردوون و لە رشتەی پێغەمبەرایەتیدا هۆنیونیەتەوە و کردوونی بە چرای پڕتەودار بۆ جیهانی پیرۆزی و، خوو و رەوشتی بە پایە و مایەی پێ بەخشیون و، ئەو پڕتەوە چین چین هاتووە تا گەیشتووەتە چرای عالەمتابی حەزرەتی دواهاوەری پێغەمبەران حەزرەتی (محمد المصطفی) درودی خودای لەسەر، کە بە موعجیزەی قورئانی کەریم یارمەتی داوە و دینەکەی تا دوارۆژی دنیا پایەدار کردووە و، موژدەی تکاکاریی رۆژی قیامەتی پێ بەخشیوە بۆ چارەکردنی دەردی تاوانبار و بۆ بەرزکردنەوەی پایەی چاکەکاران. ئەمانە هەمووی بە نەسسی نەقڵی و بە دەلیلی عەقڵی سابت بوون. کەوابێ لەسەر هەموو ئینسانێکی موسوڵمان فەرزە باوەڕی وابێ ئەم پێغەمبەرانە هەر لە ئەووەڵەوە تا ئاخر مەعسووم و لە گوناهـ پارێزراو و نزیکی بارەگای بەرزی پەروەردگارن.

صلی الله تعالی علیهم و علی آلهم و اصحابهم و اتباعهم بإحسان الی یوم‌الدین و آخر دعوانا ان الحمد لله رب‌العالمین.

مەحامیل زۆرن تەقریرم توول دا[۲۷]
بێین وە تەتیمەی حەددی رەسوول‌دا
(أوحـی الیـهِ شـرعاً المـولی
لـه کتـابٌ أنـزلَ أو لا)

(و قـــد صـــدر الأمـــرُ علیـــهِ
بتبلیغِـــه المـــوحی ألیـــهِ)
ئـەر بـە گەیانـدن پـێ مـەئموور نییـە
وەهـــا بزانـــە ئـــەوە نەبییـــە
بە قەولێ هەردوو هەر بە یەک مـەعنان
ئەمر بـە تـەبلیغ شـەرتە بـۆ هـەردوان
چون روسول دەڵـێ حەدیسـی ئیمـان
ئـەم قەولیانـە بـە چـاکتر بـزان
بـۆچ: ئـاخر ئیمـان واجبـە بـە کـول
فـەرقیان نییـە ئـەنبیا و روسـول
ئەرچی ئـەم قەولـە بـێ تـەئویل راسـە
بینـا لـە قـەولی موختـاریچ خاسـە
چون درووس نییە ئیمان بـە مورسـەل
ئیمان بە هەمووی ئـەر نـەوێ دەگـەڵ

مەحامیل: جەمعی مەحمەلە، واتە: تەویل و مەعنادانان. پێ مەئموور نییە: مەئموور نییە پێـی، ئەمری پێ نەکراوە بەو شتە. ئەر نەوێ: ئەگەر نەبێ. دەگەڵ: لەگەڵ.

واتە: تەئویل زۆرە بۆ ئەو ئایەتانـەی خـودای گـەورە گونـاهی تیایانـا داوەتـە پـاڵ هەنـدێ لـە پێغەمبەران و لە کتێبە ئایینەییەکانا بە درێژی لە سەریان نووسراوە و، منیش هەر چەند هـەموویم باس نەکردووە، لێرەدا زۆرم درێژە بە باسـەکەدا، ئیتـر لـەوە زیـاتر هەڵـناگرێ، بـا بێینـەوە سـەر تەواوکردنی (تعریف) و ناساندنی (رەسوول) چوونکە لەمەوپێش هەمووم باس نەکردووە:

بەڵێ (رەسوول) ئەو ئینسانە خاوێنە رەوشتبەرزە لەگوناهـ پارێزراوەیـە کـە خـودا وەحیـی بـۆ ناردبێت، ئیتر کتێبی سەربەخۆی بـۆ نێررابـێ، وەک ئـادەم، شـیس، ئیـدریس، نـووح، ئیـبراهیم، مووسا، یان کتێبی سـەربەخۆی بـۆ نـەنێررابێ، بەڵـکو لەسـەر کتـێبی پێغەمبـەری پـێش خـۆی مابێتەوە، بەومەرجەی پێی سپێررابێ و ئەمری پێکرابێ ئـەو وەحـی و کتێبـە بـە موکەللەفـەکان بگەیەنێت، چ کتێبی خۆی بێ و چ کتێبی پێغەمبەرە پێشووەکە. خۆ ئەگەر ئەمری پێ نەکرابێ بە موکەللەفەکانی بگەیەنێت ئەوە نەبییە.

پوختەی قسە نەبی و رەسوول هەردوو خاوەن شـەریعتن، بـەلام رەسـوول بـە کەسـێ ئەڵـێن ئەمری گەیاندنی ئەو شەریعەتەی بە موککەلەفەکان پێ کرابێ و، (نەبی) ئەو ئەمرەی پێ نـەکراوە، بەم جۆرە نەبی (عام) و رەسوول (خاس) ە، واتە: هەموو رەسوولێک نەبییە، بەلام هەموو نەبییەک رەسوول نییە.

لای هەندێکی تر رەسوول و نەبی یەک مەعنایان هەیە و ئەمر بە گەیاندنی شـەریعەت شـەرتە بۆ هەردوو. جا لەبەر ئەوە حەزرەت(د.خ) لە حەدیسی ئیماندا (و رُسُلِهِ) دەفەرموێت و بـەس، ئـەم قسە دووەمە لە قسە یەکەمەکە، بە چاکتر بزانە، بۆچی؟ چونکە واجبە موکەللەف باوەڕی هەبێ بـە هەموویان، رەسوول و نەبی و، لەم باوەڕ پێ بوونەدا فەرق لە بەینی رەسـوول و نـەبیدا نییـە، جـا ئەگەر رەسـوول و نـەبی یـەک بـن وەک خـاوەنی ئـەم رای دووهەمـە دەفـەرموێ لـە حەدیسـە شەریفەکەدا کەموکووڕی نامێنێت چونکە (رُسُلِهِ) رەسوول و نـەبییش دەگرێتـەوە، بـەلام لەسـەر رای یەکەم، کە عام و خاسن، حەدیسەکە بە شێوەی مـەجاز نـەبییش دەگرێتـەوە، واتـە (خـاس) وتراوە کە رەسـووڵە و، مەبەسـت عامـە، کـە نەبییـە. بـەم جـۆرە (و رُسُلِهِ) رەسـوول و نـەبییش دەگرێتەوە. پوختەی قسە لەسەر رای دووەم (و رُسُلِهِ) لە حەدیسەکەدا تـەئویل نـاکرێ و نـەبی و رەسوول دەگرێتەوە، بەلام لەسەر رای یەکەم دەبـێ تـەئویلی بکـەین و بلـێین زیکـری خاسـە و مەبەست عامە.

عـــــەددەیان وەهـــــا (ذو الاشـــــتهار)ە
کـــــە سەدوبیســـــتوچـــــوار هـــــەزارە
بـــــە ریوایـــــەتێ تـــــر وا دیـــــارە
کـــــە زیـــــاترن لـــــە ئـــــەم شـــــومارە
(فـــــالأولی قولُـــــک لکـــــل أحـــــد:
لا تـــــنصّ علـــــی شـــــیء مـــــن عَـــــدَد)
ســـــەلبی نوبـــــووەت دەکـــــەی لـــــە نـــــەبی
یـــــا موســـــبیتی بـــــۆ غـــــەیر نـــــەبی دەبی
(و بمـــــا قلنـــــا یشـــــیرُ الیـــــک:
رمـــــزُ «مـــــنهم مـــــن قصصـــــنا علیـــــک»)

مورســەل ســێسەدوســێزدە مەشــهوورە
ئـەویچ عـەدەدیان هـەر بـەو دوسـتوورە
عــەدەدی جــەمعی (اولــوالعزم) یــان
ئــەر (ابوالبشــر) نــەوێ دەگەڵــیان
مەشهوور پێنج کەسن: نووح و ئیـبراهیم
حەزرەتی مووسا مەوسـووف بـە کـەلیم
(عیســی بــنُ مــریم) پەیــدا (بــلا اب)
(کلمــــةُ الله) و (روح الله) لەقــــــەب
پێنجــەم موحەممـــەد (سَــید العـــالم،
صَــــلّی علیـــــهِ ربّـــــی و سَـــلّم)
(و علـــی البـــاقی مــــن النبیّــــین
وَ عَلــــی آل کــــلّ اجمعـــــــین)

شومارە: ژمارە. نەوێ: نەبێ.

واتە: ژمارەی پێغەمبەران(د.خ) وا مەشهوورە کە سەدوبیست‌وچوار هـەزاران، ریوایـەتێکی تـر دەڵێ لەوە زیاترن و دووسەدوبیست‌وچوار هەزارن؛ کەوابوو چاک وایە بە هەموو کەس بڵێیت بریار لەسەر ژمارەیەکی تایبەتی نەدات، چونکە ژمارەی راستەقینەیان نـەزانراوە، دیـارە لـەم حالـەتەدا ئەگەر زیاد لە ژمارەی راستی بڵـێیت ئـەوە ناپێغەمبـەر دەکەیتـە پێغەمبـەر، ئەگـەر لـە ژمـارەی راستیش کەمتر بڵێیت ئەوە هەندێ پێغەمبەر دەکەیتـە ناپێغەمبـەر، ئـەم دوو شـتەیش هیچیـان باش نین. ئایەتی پیرۆزی (...منهم من قصصنا علیک و منهم من لم نقصص علیک) [۲۸] ئیشـارەتە بۆ ئەمەی کە باسمان کرد.

لەم پێغەمبەرە بەرێزانە وا مەشهوورە سێسەدوسیانزەیان (رەسوول) ن، ژمـارەی رەسـوولیش وا چاکە دیاری نەکرێت.

ئەوانەیان لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەردا ناویان هەیە [۳۰] کەسن:

ئادەم، شیس، ئیدریس، نووح، هوود، ساڵح، ئیبراهیم، لووت، ئیسـماعیل، ئیسـحاق، یـەعقووب، یووسف، ئەیووب، شوعەیب، مووسا، هاروون، یووشەع، ئیلیاس، ئەلیەسەع، (ذوالکفـل)، شـەمعوون،

ئیشمەویل، یوونس، داوود، سولەیمان، زەکەریبا، یەحیا، عوزەیر، عیسا، محمدالمصطفی، صلوات الله و سلامهٌ علیهم أجمعین.

لە ناو ئەم مورسەلانەدا (أولواالعزم) ەکانیان، واتە: ئەوانەیان کە لە رێگای بڵاوکردنەوەی ئایینـدا زەحمەتیان زۆر کێشاوە و سزایان چەشتووە، ئەگەر حەزرەتی ئادەم حیساب کەین شەش کەسن و، ئەگەر حیسابی نەکەین پێنجن: نووح، ئیبراهیم، مووسا، عیسا، موحەممەدەلموستەفا. حەزرەتی مووسا لەقەبی (کلیم‌الله) یە؛ چونکە بەبێ هۆی جیبرەئیل خودای گەورە قسەی لەگەڵ کردووە. عیسای کوڕی مەریەم کە بە قودرەتی خودا بەبێ باوک لە دایک بووە و لەقەبی (کلمةالله) یە؛ چونکە بە ئەمری خودا و بەبێ‌هۆی عادەتی پەیدا بووە، هەروەها لەقەبێکی تری (روح‌الله) یە؛ چونکە پەیدابوونەکەی بە سەبەبی راستەوخۆی باوک و دایکەوە نەبووە؛ بەڵکو بە خەلقی زاتی خودا و بەبێ ئەسبابی عادەتی هاتووەتە دنیاوە. حەزرەتی موحەممەدی موستەفا (حبیب‌الله) و (رحمة للعالمین) بووە.

ئەمانە، لەسەر بەیانی قورئانی کەریم، لە پێناوی گەیاندنی نامەکەیاندا لە رێگای بیر و باوەڕیاندا و، بە هۆی هەوڵیانەوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینەکەیان زەحمەتی زۆریان کێشاوە، سەلام و دروودی بێ‌پایانی خودایان لەسەر بێت.

وا دەبێ پێیان ئیمان ئاوردن[٢٩]
باوەڕ بکەی: حەق هەڵیبژاردن
هەموویان بە مەحز فەزل و مەوهەبەت
بێ‌سەبەبی کەسب، تاعەت، ریازەت
بۆ نوبووەت و وەحی و شەرائیع
بۆ دەفعی ئیشکال، حەللی وەقائیع
بۆ رەهنومایی و ئیرشادی عیباد
بۆ ئیتمامی ئەمر مەعاش و مەعاد
(مبلّغین عن الله الحق)
کول موخبیر سادق، ناسیحی موتلەق[٣٠]
بە هەر تەرزێ حەق ئەمری پێ فەرموون
بەو تەرزە ئەژێر باری تەبلیغ چوون

دەگـــەڵ ئـــەو هـــەموو دوشمـــــنی زۆرە
ئـــەو تەعنـــە و لۆمـــە و ئـــەو شەڕوشـــۆڕە
گەیاندیان بە ســەعی بێ‌حــەدد و غایــەت
پـــەیغامی خـــودا ئایـــەت بـــە ئایـــەت
بـــــەیانیان فـــــەرموو بـــــەیانی مـــــوبین
(أصـــلاً و فرعـــاً) گشـــت ئـــەحکامی دیـــن
(طابـــــــت الـــــــدنیا بـــــــدعوتهم
جـــــــزاهم الله عـــــــن أمـــــــتهم)
لـــە ئەسڵـــی ســـبووت نوبووەتیانـــدا
تـــــــەفاوت نییـــــــە لەبەینیانـــــــدا
هـــەر کەســـێ تـــەکزیب بکـــا یـــەکێکیان
ئیمـــانی نییـــە بـــە هـــیچ کامێکیـــان

واتە: ئیمان‌هێنان و باوەڕکردن بە پێغەمبەران(د.خ) چەند خاڵێکە: یەکـەم: بـاوەڕ بـەوەی کـە ئەو پێغەمبەرانە خودای گەورە هەڵیبژاردوون لەناو کۆمەڵی ئادەمزاددا بۆ ئەوەی بیانکا بە ڕەهبـەر و ڕانومای هەرکەسێ کە تەکلیف ڕووی تێ بکات، خودای گەورە ئەمانەی تەنها بە کەرەم و لـوتفی خۆی هەڵبژاردووە، بەبێ ئەوەی کەسبی ئەوان یا وەرزشی نەفسییان بووبێتـە هـۆی ئـەم بـەش و بەهرەیە. هەروەها ناردنی پێغەمبەرانیش بۆ تەمێ و تەربییەی خەڵک هـەر لـە کـەرەم و لوتـف و نەوازشی خوداوەیە.

سوود و چاکەی ناردنی پێغەمبەران زۆر شتە، وەکـوو چـارکردنی گـیر و گـرفتی ئـادەمزاد لـە پەرستیاری‌دا؛ چونکە ئەگەر پێغەمبەران نەبوونایە هەرکەس سـوودی لـە شـتێک دەس بکەوتایـە ئەوەی دەپەرست وەک ڕۆژ و ئاگر و ئاو و ئەستێرە و گا و مانگا و ژن، کە هۆی جـێ‌بـەجێ بـوونی بەرهەم و بەردەوام‌بوونی ژیان و ئاوەدانین، یا وەک ئەوەی هەندێ کەسی زیرەک لە نـاو خەڵـکدا هەڵکەوتوون لە کاتی ژیانیاندا سوودیان بۆ کۆمەڵ زۆر بووە، پاش مردنیان خەڵک لە بـەرد و دار و ئاسن و مس و شتی وا پەیکەریان بۆ کردوون و ڕێزیان لێ گرتـوون و لـە ئەنجامـدا کارەکـە وردە وردە بووەتە بت‌پەرسـتی؛ بـەڵام کـە پێغەمبـەران نـاوە هـاتوون ئادەمزادیـان لـەو نادانییـە دوورخستووەتەوە و تێیان گەیاندوون ئەو شتە پەرستراوانە و سـوود و قازانجیـان هـەموو خـودای

گەورە دروستی کردوون، تەنها بە عادەت بوونەتە هۆی خێر و خۆشی، ئەمانە بەبێ خواستی خـودا نە سوودیان هەیە و نە زیان، ئەمانە خۆیان رام و راهـاتووی دەسـتی هێـزی پـەروەردگارن، بـەلام پەروەردگاری راستەقینە هەر بووە و هەر ئەبێ و ئاگاداری هـەموو ئاشـکرا و نهێنییەکـە، بـە سـەر هەموو کەسێکدا و هەموو شتێکی مومکیندا دەسەلاتی ئەشکێ و، بەبێ خواستی ئـەو هـیچ کـەس هیچی پێ ناکرێ.

پێغەمبەران گەلێک گیر و گرفتی ئادەمزادیان چارکردووە کە بـە هـۆی سروشـت و ئـارەزووی نەفس و چاولێکەرییەوە لە ناودا باو بووە. پێش پێغەمبەران دەسـتدار دەسـتدرێژیـی کردووەتـە سەر مال و گیان و ناموسی خەلک، ئەگەر یەکێکی گەورە بکوژرایە لەباتی ئـەو تاقەکەسـە چەنـد کەسیان ئەکوشتەوە و هەزاران شتی لەوانـە خراپتـر رووی‌داوە. کـە خـودای گـەورە بـە لوتـف و کەرەمی خۆی پێغەمبەرانی نارد قانوون و دەستووریان هێنا و بە خەلـکیان گەیانـد و لـە پێنـاوی بلاوکردنەوەیدا رەنجیان دا و بوونە مەشخەلی کۆمەل، ریبازێکیـان بـۆ خەلـک هێنـا کـە گیـان و ناموس و سامانیان بپارێزێت و بە بەختیاری و سەرفرازی بژین و، روو بکەنە ئاسانەی پـەروەردگار و داوەری رۆژی پاداش.

سوودی پێغەمبەران یارمەتی‌دانی هۆش و ئاوەزی ئادەمزادە بۆ رێکخستنی هۆی پیرۆزیی دنیا و دین، وەک پەیڕەوی یاسا و بەرگری و پارێزگاریی ولات لـە دوژمنـان و ئـاوەدانکردنـەوەی بـە خوێندەواری و بازرگانی و پیشەسازی، بە دانانی رێ و شوینی رێـکوپێـک بـۆ مامەلـە و کـڕین و فرۆشتن، بـە نەهێشـتنی غـەش و خەلـەتاندن و دلـڕەقی لـە نـاو خەلـکدا و، بـە رێگـاگرتن لـە قەدەغەکردنی رزق و رۆزیی ئادەمزاد و برەودان بە میانەڕەوی (اعتدال) لە هەموو روویەکی ژیاندا.

سوودی ناردنی پێغەمبەران بلاوکردنـەوەی میهرەبـانی و پتـەوبوونی پێوەنـدی نێـوان خـزم و خـوێش و بێگانـە و گـەورە و بچـووک و پـیر و جـوان و مامۆسـتا و شـاگرد و بـاوک و دایکـە، بلاوبوونەوەی گیانی دۆستایەتی و هاوکارییە لە ناو ریزەکانی کۆمەلدا.

سـوودی هەرەگـەورەی پێغەمبـەران ئەوەیـە نـوور و رووناکییـان خسـتووەتە دل و دەروونی ئادەمزاد و، بەو نوورە ئەو دل و لەتیفەی وجوودەیان برژاندووە و ئامادەیان کردوون بۆ بیرکردنـەوە لە پەروەردگاری جیهان، تا وایان لێ دێ دلنیا بن کە هەمیشـە خـودا حـازرە لـە لایـان و ئاگـای لێیانە، هیچ چاک و خراپێکی لێ ون نابێ، هەروەها پێغەمبەران ئادەمزادیان حالی کردووە کە ئەم جیهانە مادەییکی رامە بۆ هێز و دەستەلاتی پەروەردگار، لە نەبوونەوە دەرکراوە بۆ بوون، لـە رۆژی

دواییشدا ئەم جیهانە کە بەم وەزعە دەبینرێ تێک‌دەچێ و جیهانێکی تازە دێتە پێشەوە، کە حسێب لەگەڵ هەموو ئادەمزادێکی ژێردا دەکرێت و بە قەدەر تۆزقاڵێ چاکە و خراپە ون نابێ، تۆڵەی تاوانباران ئاگر و سزای دۆزەخە و پاداشتی خێرومەندان بەهەشتی هەرگیز نەبڕاوەیە.

دووەم: باوەڕە بەوەی کە هەموو پێغەمبەران راستگۆن و لەگەڵ خۆیان و لەگەڵ خودا و لەگەڵ هەموو خەڵکدا راستن و دڵسۆزن و ئامۆژگاری هەموو ژیرێک دەکەن، بێ ئەوەی چاوەڕوانی پاداش بن لە کەس، پاداشیان لای خودایە.

سێهەم: باوەڕە بەوەی کە پێغەمبەران ئەمینن و، لە گەیاندنی فەرمانی خودادا بە موکەللەفین، بەوجۆرە کە خودا ئەمری پێ‌کردوون، خیانەت ناکەن و بێ گوێ‌دان بە دوژمنان و داخ‌لەدڵان و ئاژاوەگێڕان ئایینیان بە جیهان گەیاندووە.

چوارەم: باوەڕ بەوەی کە پێغەمبەران داوێن‌پاکن و لە هەموو کارێکی شەرمئاوەرەوە دوورن، ئەمانە چرای رووناک کردنەوەن، لە باوک و برا میهرەبان‌ترن، کەوابێ پێچەوانەی عیففەت لەوانەوە تەسەوور ناکرێت و، هەموو ئەم پێغەمبەرانە هۆی خێرن بۆ جیهان، دنیا سەرانسەر بە دەعوەتی ئەوان رووناک بووە. خودا بە میهرەبانیی خۆی جەزایان بداتەوە.

شایانی باسە ئەم پێغەمبەرانە لە ئەسڵی پێغەمبەرایەتییەکەدا جیاوازییان نییە (لا نفرّق بین أحدٍ من رُسلِه) [31] بەلام لە سیفەتەکانی تری غەیری پێغەمبەریدا جیاوازییان هەیە؛ (تلک الرسل فضّلنا بعضهم علی بعض) [32].

دیارە هەرکەس باوەڕی بە یەکێ لەو پێغەمبەرانە نەبێ ئەوە وەک ئەوەیە کە باوەڕی بە هیچ پێغەمبەرێک نەبێت؛ چونکە باسی راستیی پێغەمبەرایەتی هەموو پێغەمبەرێکی کردووە، واتە هەرکەس باوەڕی بە یەکێ لەوان نەبێ ئەوە هەموو پێغەمبەرەکانی بە درۆ خستووەتەوە (أعاذنا الله بفضله و کرمه، و رزقنا الایمان به و بهم و أذاقنا حلاوة الایمان بهم أجمعین).

حەق هەموو بۆ سیدق دەعوای نوبووەت
دا بە موعجیزات باهیرە قووەت
موخالیف پێیان گشت لە کار دەرچوو
تاب موعارەزەی ئەوانیان نەبوو[33]

حەق: خودا. تاب = تاو: هێز، توانا.

واتە: خودای گەورە بۆ ئیسپات کردنی راستیی قسەی پێغەمبەران هەمویان پشتی گرتن و هێزی پێدان بە هۆی دەرخستنی (معجزه)ی گەورەوە لە سەر دەستی ئەو پێغەمبەرانەدا، ناحەزەکانیان کاتێ (معجزه) کانیان دی گشتیان پێیان لە کار کەوت و جموجوولیان نەما و توانای بەربەرەکانێی ئەوانیان نەبوو، بە کورتی خودای گەورە بە بەخشندەیی و میهرەبانیی خۆی یارمەتیی پێغەمبەرانی دا بەوەی کە موعجیزەی بۆ دروست کردن و دوژمن و نەیارەکانی پەکخستن نەیانتوانی بەرامبەریی پێغەمبەران بکەن:

لێرەدا حەزدەکەم نەختێ باسی موعجیزە و کەرامەت و مەعوونە بکەم، لەگەڵ سیحر و ئیستیدراج و ئیهانە:

١ـ موعجیزە کارێکە لەعادەت بەدەر لە کەسێکەوە دەربکەوێ کە ئیددیعای پێغەمبەری دەکات و دەڵێ: من لای خوداوە رەوانە کراوم، لە کاتێکدا دەر بکەوێ کە رووبەڕووی ناحەزەکانی دەوەستێ، ئەوانەی کە باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتیی ئەو نییە، واتە دەڵێت من پێغەمبەرم و ئەمەیش بەلگەمە، ئێوە چ بەلگەیەکتان هەیە؟ بە مەرجێ بەو کارە دەوترێ موعجیزە کە لەسەر رێرەوی کەسب و فێربوون و خەریکبوونی ئەسباب نەبێت و بە جۆرێ جێبەجێ ببێ کە لەگەڵ ویستی پێغەمبەرەکەدا بگونجێ.

٢ـ کەرامەت رووداوێکە لە عادەت بەدەر لە کەسێکەوە دەربکەوێ ئیددیعای پێغەمبەریی نەکات، یا ئیددیعای پێغەمبەری بکات بەلام لە کاتی تەحەددی و بەرامبەریدا نەبێ.

٣ـ مەعوونە = یارمەتی: جۆرە یارمەتییەکی ئاشکرای خودایە بۆ هەندێ مرۆی دڵپاک و کردەوە چاک وەک لەناوبردنی دوژمنانیان و ئاسانکردنی گیروگرفتی ژیانیان... تاد.

٤ـ سیحر یا جادوو: رووداوێکە بە کەسب و خوێندن و پەیداکردنی پێشەکی و مەرجەکانی پەیدا دەکرێت، وەک ئەو کارە سەیرانە کە جادووگەرەکانی فیرعەون بەرامبەری حەزرەتی مووسا(د.خ) کردیان.

٥ـ ئیستیدراج: رووداوێکی لەعادەتبەدەرە کە بۆ هەندێ ئینسانی ناپاک و ناپارێزگار و لە خوانەترس و بەدخووی دوور لە کاری شەرعیی نزیک لە کردەوەی ناشەرعی پەیدا دەبێت.

٦ـ ئیهانە: کارێکە بە پێچەوانەی ئارەزووی خاوەنحاجەت روودەدات، وەک ئەوەی دەیگێڕنەوە کە (مسیلمه)ی (کذّاب) تفی کردە بیرێکی سوێر هەتا ئاوەکەی شیرین بکات کەچی ئاوەکەی بە

تەواوی وشک بوو! هەروەها دەگێڕنەوە دەستی هێنا بە سەرێکی کەچەڵدا بە نیازی ئەوەی چاکی بکاتەوە، کەچی بە تەواوی داڕزا و کرم تێی‌دا!!

راسی ویلایەت، وەلیّ[٣٤] بـە کەسـبە
کەسبی موحتەمیل بۆ عەزل و نەسبە
بەڵـێ نوبـووەت بـە مـەحزی فەزڵـە
مەنسـەبی نـەبی بـەری لـە عەزڵـە
دائـــیم موراقیـــب پـــەروەردگارن
لە عەینی خـەودا گشـت دڵ بێـدارن
(ظاهیراً) نەوعـە مـەماتێکیان هـەس
لە گۆڕدا نەوعـە حـەیاتێکیان هـەس
خـاک نارِزێنـێ جیسـمی پاکیـان
هـیچ زەرەر نـادا لـە ئیـدراکیان
لە حەدیسدا هەس کە نـوێژ دەکـەن
تەشریفیان بە حەج (بیت‌الله) دەبەن

واتە: پایەی ویلایەت و دۆستایەتیی خودا راستە و هەیە، بـەڵام ئـەم ویلایەتـە کەسبییە و بـە پەیداکردنی رەزامەندیی خودا دەست دەکەوێ، رەزامەندییەکەیش لە پەیڕەوی کردنی حـەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) و لە بەجێ‌هێنانی ئەحکامی ئایین و بـەدەس‌هێنـانی خـوو و رەوشـتی پەسـەند و لابردنی خووی ناپەسەند و، بە دلسۆزی و رووکردنە خودا پەیـدا دەبێـت، خـودای گـەورەیش بـە نەوازش و میهرەبـانیی خـۆی یارمـەتییان ئـەدات و، لەسـەر دەسـتی ئەوانـدا کەرامـەت و کـاری لەعادەت‌بەدەر دەرئەخات، وەکوو فەرموویەتی (و هو یتولی الصالحین) [٣٥] یان دەفەرموێ: (ألا إنّ اولیـاءالله لا خـوفٌ علـیهِم و لا هُـم یحزنـون) [٣٦] ئـەم پایـەی ویلایەتـە لەوانەیـە لـە وەلییەکـە بسەنرێتەوە؛ بەڵام پایەی نوبووەت و پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەران بە کەسب نییە و، تەنها بەخشش و کەرەم و میهرەبانیی خودایە و هیچی‌تر نییە؛ (الله اعلم حیث یجعل رسالتهِ) [٣٧].

ئەم پێغەمبەرانە(د.خ) پایەی پێغەمبەرایەتییەکان هـەرگیز لـێ ناسـێنرێتەوە و لەسـەر پایـەی خۆیان دەمێننەوە.

پێغەمبەران(د.خ) ئاگایـان لـە (تجلیّـات)ی خـودای گەورەیـە و چـاوەڕوانی لێشـاوی چاکـە و میهرەبانیی ئەون و هەرگیز لە خوا بێ‌ئاگا نین، تەنانەت لە کاتی نووستنیشـدا دڵـیان خەبـەردارە؛ ئەوەتە حـەزرەت(د.خ) فەرموویـەتی: «إنّ عینـیّ تنامـان و لا ینـام قلبـی»[٣٨]. دڵـیان هەمیشـە چاوەڕوانی بارانی میهرەبانیی خودای گەورەیە.

بەڵێ وەک هەموو گیان‌لەبەرێک دەمرن، بەڵام لە گۆڕە پیرۆزەکەیاندا جۆرە زیندوویەتییـەکیان هەیە، جۆرە ئاگادارییەکی بەرزەخییان هەیە زیاتر لە ئاگاداریی سیددیقین و شـەهیدەکان، لەشـی موبارەکیان ناڕزێت؛ لە حەزرەتەوە دەگێڕنەوە(د.خ) کە فەرموویەتی «إنّ الله حَـرَّمَ علـیالأرض أن تأکل أجسادَ الأنبیاء»[٣٩]، بە هۆی مردنەوە زیان بە هەست و هۆشـیان ناگـات؛ ئیمـام ئەحمـەدی کوڕی حەنبەل(ر.خ) دەگێڕێتەوە، (حاکم) یش حەدیسەکەی لە لایەنی ئیسـنادەوە بـە (صـحیح) داناوە، کە حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی «إن لِله ملائکـةً فـیالأرض سـیّاحین یبلّغـونی مـن امتـی السلام»[٤٠] هەروەها کردەوەی پەیڕەوەکانی پیشان دەدرێت و، حەزرەت(د.خ) تکای لێ‌بـووردن و بەخشینی تاوانبارەکانیان دەکات لە خودای گەورە (لَقَد جاءکم رسولٌ مِن أنفُسِکُم عزیـزٌ علیـهِ مـا عَنِتّم حریصٌ علیکم بالمؤمنین رئوفٌ رحیم) [٤١].

ریوایەت کراوە کە پێغەمبەران(د.خ) لە قەبردا نوێژ ئەکەن و لە کاتی حەجدا دەچن بۆ حەج.

ئیمامی ئەحمەد (ر.خ) دەگێڕێتەوە: کاتێ کە حەزرەت(د.خ) لـە سـەفەری (حجـةالوداع)دا بـە شیوی عەسافاندا رابوورد فەرمووی هوود و سالح بـە سـواریی دوو وشـتری جـوانی نەوسـاڵ، کـە دەستگری هەوسارەکەیان (لیف) بوو، ئیحرامیان بەستبوو بـۆ حـەج، حـەجی (بیـتالعتیـق) یـان ئەکرد. لە ریوایەتی موسلیم لە حەدیسی (ابن عباس) ەوە دەڵێت: کاتـێ کـە حـەزرەت(د.خ) لـە سەفەری (حجةالوداع)دا بە (وادیالازرق)دا تێدەپەڕی فەرمووی: وەک بڵێی چاوم لێیـە وا مووسـا لە ددانەی ئەو شاخەوە دێتە خوار و هـەردوو پەنجـەی خسـتووەتە گـوێی و بـەم (وادیالازرق)دا رادەبوورێ و بە (لبیّک لبیّک) دەنگی بەرز کردووەتەوە و لە خودای گەورە دەپاڕێتەوە.

ئێمە کە ئەم باسانە وەردەگرین مادام لە (نص) ێکی دامەزراوەوە بـن پێویسـتە بـە دڵ و گیـان باوەڕمان بە راستییان هەبێت؛ چونکە هەموو ئەمانە لە کار و باری (روح) ن و رۆح لەسەر پەیـڕەو و رێبازی ئەهلی سوننەت نەمرە و، ئەم رۆحانەش لە لایەنی نزیکی لە خودا و خوداپەرستییەوە وەک یەک نین؛ تەنانەت گیانی پێغەمبەرانیش لەم بـەهرە و نزیکییـەدا جیـاوازن و وەک یـەک نـین و هەندێکیان لە هەندێکیان جێگەدارترن، وەکوو لای زانایانی گەورە و پایەدار دیارییە.

هیچ کەس لە مەلەک، لە جین، لە ئینسان
نەگەیگە و ناگـەت ئـە روتبـەی ئـەوان[٤٢]
بەلـێ شــەرەف هــەس لــە نــاو خۆیانــدا
بــۆ بــەعزێ بــە ســـەر بەعزێکیانـــدا
(حَســبَ ازدِیــادِ)ی ئــاداب و حەســەب
بــە ئیســتیفای ئەســڵ تاییفــە و نەســەب
بـــە ئیعتیبـــاری عومـــوومی دەعـــوەت
غەڵــەبەی حــیلم و عــیلم و مەعریفــەت
لــــە ئیســـــتیمراری موعجیزاتـــــەدا
لــــە زۆریــــی ئـــەحکام فرووعاتـــەدا
لــە حەدیســییەتی کەســرەتی ئوممــەت
بـــە مەتانـــەت و تـــوولی شــــەریعەت
بـــە خەســـائیس و کــــەراماتی چەنـــد
مومتــاز بــێ و، زیکـر و شـوهرەتی بولـەند
(فَلِــذا) حــەزرەت ســەیدی ســەروەر
فەزڵی هــەس وە ســەر هــەموودا یەکســەر
(أولــوالعزم) یــان لــە غــەیر و، مورســەل
لــە غــەیرە مورســەل بــزان بــە ئــەفزەل
ئــەووەڵ لــە ئــەووەڵ ئــەنبیا ئــادەم
لــــە نوبـــــووەتی قەڵـــــەم دەدا دەم
بــۆ ئــادەم هەیــە نوبــووەت ئیســبات
(بالکِتــــاب إذ تـــــدلّ الآیـــــات)
(عَلـــی أنّـــهُ قـــد أمِـــر، نُهـــی
و لا نبـــــیٌ فـــــی زمانِـــــهِ)

پەس بۆ غەیری وەحی هـیچ مەبـە سـاعی
(کـــــذا بالســـــنّة و بالاجمــــاعِ)
ئینکــــاری مەکـــە وەک بەراهیمــــە
کـــــوفر و زەلالی یـــــەکجار قایمـــــە

نەگەیگە: نەگەیشتووە. ناگەت: ناگات. ئە روتبەی: بە روتبەی. پەس: پاش، کەواتە.

واتە: هیچ کەس لە فریشـتە و پـەری و ئـادەمزاد نەگەیشـتووە و ناگاتـە پایـە و پلـەی بـەرزی پێغەمبەران، ئەوان لە هەموو کەس پایەبەرزترن، بەڵام پێغەمبەران لە نـاو خۆیانـا هەنـدێکیان لـە هەندێکیان گەورەتر و پایەبەرزترن بە پێی رەفتاری بـەرز، خـوو و رەوشـتی چـاک، هەڵـبژاردەیی رشتەی باوباپیر، ئەوەی پێغەمبەرایەتییەکەی بـۆ هـەموو ئـادەمزادە گـەورەترە لـەوەی بـۆ تـەنها کۆمەڵێکە، ئەوەی کە دەعوەتی کۆمەڵی گـەورەی کـردووە گـەورەترە لـەوەی کـە کۆمەڵـەکەی بچووکتر بووە، یا بە پێی زۆریی ئارامی و حیلم و لەسەرخۆیی، یا بە پێی زۆریی زانست، یا بە پێـی بەردەوامیی موعجیزە؛ ئەوەیان موعجیزەی بەردەوام بێ گەورەترە لـەوەی کـە موعجیزەکـەی زوو برابێتــەوە، ئــەوەی شــەریعەتەکەی زۆرتــر بــێ گــەورەترە لــەوەی کــە حــوکم و لــق و پــۆپی شەریعەتەکەی کەمتر بێ، یا بە پێی زۆریی موعجیزە و کاری لەعادەتبەدەر، یا بەپێی ناوبانگی لـە جیهاندا.

جا لەبەر رووناکیی ئەوەی وتمان حەزرەتی (سـید الانـام محمـد المصـطفی) دروودی خـودای لەسەر، لە هەموو پێغەمبەران گەورەتر و پایەبەرزترە، هەروەها پێغەمبـەرە (أولـوالعزم) ەکـان، کـە شەشن یا پێنجن[٤٣]، لە غەیری (أولوالعزم) گـەورەترن، مورسـەلین- واتـە ئەوانـەی کـە فـەرمانی گەیاندنی شەریعەت و ئایینیان پێ دراوە- لە نامورسەلەکان گەورەترن.

بـەر لـە هـەموو شـتێک قەڵـەم دەم لـە باسـی حـەزرەتی ئـادەمی یەکـەمی پێغەمبـەران و پێغەمەرایەتیی ئەو ئەدات.

بەڵێ حەزرەتی ئادەم(د.خ) پێغەمبەر بووە؛ چونکە زۆر ئایەت لە قورئاندا ئەوە دەگەیەنێت کـە ئادەم لای خوداوە ئەمر و نەهیی بۆ هاتووە و، لەوکاتەدا غەیری خـۆی پێغەمبـەرێ تـر نـەبووە تـا بڵێین ئەو ئەمر و نەهیەی لە یەکێکی ترەوە پێ‌گەیشـتووە، کـەوابوو هـەر لـە لای خـوداوە و بـە شێوەی وەحی بۆی هاتووە، هەروەها بە فەرموودەی پێغەمبەر بە ئیجمـاع و یـەکگـرتنی هـەموو

ئوممەت و زانایانی ئیسلام حەزرەتی ئادەم پێغەمبەری خودا بووە و، نێرراوە بۆ سەر نەتەوەی خۆی لەو سەردەمەدا؛ نەخەڵەتابی ئینکاری پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی ئادەم بکەیت! وەک بورەهمەنەکان ئینکاری دەکەن، ئینکاری پێغەمبەرایەتیی ئادەم کوفر و گومڕاهییە.

دووەم لە خاتەم ئەنبیا و روسول[٤٤]

(خیر المرشدین لخیر السبل)

ئاخیر مووئەخخەر، ئەووەڵ موقەددەم

(ذو الغِنی) و (ذوالفقر) ئەکمەل و ئەتەم

هادی‌یو مەهدی، مونتەفیع، نەففاع

عەبدی موتیع و سەییدی موتاع

حەقیقەتێکی مەجهوول و مەعلووم[٤٥]

مەنسووس و مەنتووق، موقتەزا و مەفهووم

موجەسسەم، موزلیم، موکەییەف، کەسیف

(نورٌ و روح جوهرٌ لطیف)

ئایینەی وەسفەین جەلال و جەمال

(بالغ بأقصی غایات الکمال)

موکەڕڕەڕ ئەمما شیرین موکەڕڕەڕ:[٤٦]

(من شجر الکون و منه الشجر)

(عینَهُ أستفاض من بحر اللاهوت

غینَهُ أفاض لزرع الناسوت) [٤٧]

(مرحباً فی‌الأمر أبٌ الأجدادِ

عجباً فی‌الخَلق مِن‌الأولادِ)

(بالقول بالفعل و بذی الأحوال)

شەرع و تەریقەت حەقیقەت مەئال

(قالبـــاً، جســـماً، صـــورةً) فەرشـــی
(قلبـــاً و روحـــاً وَ سِـــرآ) عەرشـــی
بۆ دەریای وەحدەت هیممەت ناری فولـک
زیبی سـەرای غـەیب مەلـەکووتی مولـک
لە هەرجێ بۆی هەس ئیسمی موجـەددەد
(حکمةً): ئەحمەد، مەحموود، موحەممـەد،
(قمـــرٌ لَـــهُ المَنـــازِلُ قُـــدِّر
بـــل شـــمسٌ تجـــری الـــی مَســـتَقَرّ)

دووەم جاریش قەڵەم دەم لە باسی ئاخری پێغەمبەرانی مورسـەل و غـەیرە مورسـەل دەدا کـە حەزرەتی (موحەممەد)ە و لە ناو پێغەمبەرەکانا لە هەموویان گەورەترە و، ڕێگایـەکی پیشـان داوە لە هەموو ڕێگاکان چاکترە، واتە پایەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە پایەی هەموو ئایینەکان بەرزترە. بە کورتی لە ڕشتەی پێغەمبەراندا ئادەم سەری سەرەتای گرتووە و حەزرەتی موحەممـەد سـەری پایانی، بەڵێ حەزرەتی موحەممەد لە جیهانی جیسم و مـاددەدا دواکـەوتووە، بـەلام لـە جیهـانی ڕۆحدا پێش کەوتووە، لە لایەک لە هەموو کەس زیاتر موحتاجی خودایە و لە عاستی بەخشـندەیی و میهرەبانیدا چاوەڕوانە، لە لایەکیتریشەوە لە هەموو کەس دەوڵەمەندترە و لە خەڵک بـێنیـازە، بێگومان ئەم نیازمەندییە بە نەوازشی خودا و بێنیازی لە خەڵکە، پایەیەکی ئێجگار بەرزە و، هـیچ کەس لەم دوو خووەدا نەگەیشتووەتە پایەی حـەزرەتی موحەممـەد، لـە لایـەک ڕێنیشـاندەری موکەللەفان بووە و، لە لایەکەوە لای خوداوە ڕێی پیشان دراوە، سوودی ڕۆحی لە خودا وەرگرتووە و قازانجی مـاددی و مەعنـەویی بـە خەڵـک گەیانـدووە، بەنـدەی فەرمانبـەرداری خـودا بـووە و، خەڵکیش فەرمانی ئەویان بەجێ هێناوە.

زاتی پێغەمبەر حەقیقەتەکەی لە لایەک زانراوە و خەڵک لێی تـێدەگـات، کـە لایەنـە ئاشـکرا ماددییەکەیەتی، لـە لایـەک شـاراوە و نـەزانراو و پـەیپـێنـەبراوە، ئـەوەیش لایەنـە مەعنەوییـە ڕۆحییەکەیەتی.

هەروەها مەولەوی دەفـەرموێ: حەقیقـەتی حـەزرەت مەنسووسـە و مەنتووقـە و موقتەزایـە و مەفهووم...

لێرەدا ئەمەوێ نەختێ درێژە بەم باسە بدەم، ئەم فەرموودەی مەولەوییە بەبێ تەئویل و واتا بـۆ دۆزینەوە روون نابێتەوە؛ چونکە ئەم چوار وشەیە لە ئیستیلاحاتی عیلمـی ئوسـوولی فـیقهن و لـە بابەتی دەلالەتی ئەلفاز، حەقیقەتی زاتی پێغەمبـەریش(د.خ) لـەو بابەتـە نییـە، بۆیـە بـەم چەنـد جۆرەی خوارەوە لێکی دەدەینەوە:

یەکەم واتە: حەقیقەتی حەزرەت و پێغەمبەرایەتییەکـەی لـە هەنـدێ لـە کتـێبی پێغەمبـەرە پێشووەکاندا مەنتووق و مەنسووس بووە وەک لە ئینجیلی حەزرەتی (عیسی)دا کە موژدەی تیایـە بە هاتنی پێغەمبەرێ ناوی (ئەحمەد)ە. هەروەها ئەو حەقیقەتە لە (سفر)ی (شەعیا)ی پێغەمبەردا مەفهووم و وەرگیراوە، چونکە باسی پێغەمبەری ئاخرزەمان دەکات.

پێغەمبەرایەتییەکەشی موقتەزای لوتفی خودایە و، بۆ رانومایی و خیر و خۆشیی دنیا و قیامەتی خەلکە.

دووەم واتە: حەقیقەتی حـەزرەت و پێغەمبەرایەتییەکـەی لـە قورئـانی پـیرۆزدا مەنسـووس و مەنتووقە، وەک لە ئایەتی (ما كان محمداً أبا أحدٍ من رجالِكُم و لكِن رسول‌الله خاتم‌النبيـين...)دا (سوورەتی احزاب).

هەروەها لە گەلێ ئایەتی تردا مەفهوومە و وەردەگیرێ، بۆ نموونە: (تبـارکالـذی نـزَّلَ‌الفُرقـان علی عبدِهِ...) (سوورەتی فرقان). یا ئایەتی (لقد جاءكم رسول من أنفسكم...) (سوورەتی توبە).

ئـەم پێغەمبەرایەتییـەی حـەزرەتیش موقتـەزای دوعـا و نـزای حـەزرەتی ئیبراهیمـە کـە فەرموویەتی: (ربنا وابعث فیهم رسولاً منهم یتلوا علیهم آیاتک...) (سوورەتی بقرە).

سێهەم: (بلا تشبیە) وەکوو کەلامی خودا مەنسووس و مەنتووق و مەفهووم و موقتـەزای هەیـە وتاری حەزرەتیش ئەمانەی هەیە، ئەمەیش لای زانایانی ئوسوولی فیقهـ و حەدیس زانراوە.

چوارەم: دیمەنی حەزرەت(د.خ) وەک مەنسـووس و مەنتووقی کەلام دیاری و زانراوە. بۆ ئەهلی دەرک و دڵرووناکان گەلێ پەنامەکیی رۆحیی لێ وەردەگیـرێ و لـە هاورێیەتییـەوە گـەلێ شـت دەست کەوتووە.

هەروەها لە تێگەیشتنی زاهیری کردەوەیەوە هەرچی دژی کردەوەکانی ئەون روون دەبنـەوە و دەبێ نەکرێن. پێغەمبەرایەتییەکەیشی موقتەزای رەحمەتی خودایە.

هەروەها مەولـەوی درێـژە بـە باسـەکە دەدات و، لـە وەسـفی حـەزرەت و بـەیانی گەورەییـدا دەفەرموێ: لە لایەک بە دیمەن جیسمە و ماددەیە و ئەو سیفەتانەی هەیـە کـە مـاددە هەیـەتی،

وەک کەسافەت، خواردن، خواردنەوە، نووستن، بێداری، ساغی و ناساغی... تاد. لە لایەکی تـرەوە نوورە و ڕۆحە و لەتافەتە. ئەو زاتە خوو و ڕەوشت جوانە پایەبالایە لەبەر ئـەوە نومایشـگای نـووری خودایە بووەتە ئاوێنە و سیفەتی جەلال و جەمالی تیا دەبینرێ، واتە: سیفەتی رق و غەزەبی خودا و سـیفەتی بـەزەیی و میهرەبـانی، یەکـەمیان بەرامبـەر بـە کـافران و دووەمیـان بەرامبـەر بـە موسولـمانان، ئـەم پێغەمبـەرە سـەروەرە گەیشـتووەتە لای ژوورووی پلـە و پایـەی ئـادەمزادی تێگەیشتووی پێگەیشتوو و تەواو بوو بە دوا دانەی بەنرخی زنجیرەی پێغەمبەرایەتی... ئەمەش لە جیهانی ماددەدا.

(عین)ی موحەممەد، حەقیقەتی زاتی موحەممەد، سەرچاوە ڕۆحییەکەی لە دەریای ڕەحمـەت و بەخشندەیی خودایی بەهرەی وەرگرتووە، بەلام (غین) ەکەی واتە: (غمام) ەکەی، هەورەکـەی، سێبەرەکەی، بوونە ماددییەکەی بە ڕێژەن باران دەبارێنـێ بەسـەر جیهـانی (ناسـوت) مـاددەدا و بووەتە هۆی بەرزی و بەختیاری و سەربەرزیی دنیا و قیامەتی خەلک.

مەرحەبا لەو زاتە پایەبەرزە کە لە عالەمی (ئـەمر) واتـە لـە عالـەمی (روح)دا یەکەمـە و بـاوکی باپیرانە، چەند عەجایەبە لەگەڵ ئەوەشدا کە یەکـەمی عالـەمی ئـەمرە لـە عالـەمی (خـەلق) واتـە ماددەدا یەکێکە لە ئەولادی ئادەم و دواکەوتووە و خاتەمی پێغەمبەرانە.

ئەم پێغەمبەرە گەورەیە بە گوفتار و کردار و ئـەحواڵ شـەریعەت و تەریقـەت و حەقیقـەتی بـە جیهاندا بلاو کردەوە، فەرموودەکانی بۆ ئەحکامی عیلمی و عەمـەلیی ئـایینی ئیسـلام، کـردەوە و بەجێهێنانی بۆ لقوپۆپی ئایین، ئەحواڵە بەرزەکان و خوو و ڕەوشـتە جوانـەکانی بـۆ تەریقـەت و حەقیقەت.

شایانی باسە: نابێ وا تێبگەن کە شەریعەت و تەریقەت و حەقیقەت سێ شتی لە یەک جیـان، نەخەیر؛ تێکڕای ئەوەی کە حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) لای خـوداوە هێناویـەتی و، هـۆی پیرۆزیـی هەمیشەی بەرەی ئادەمزادە، مەشهوورە بە ئایینی ئیسلام و بە شەریعەتی موحەممەد(د.خ).

بەڵێ هەرچی ئـەو هێناویـەتی و بـە گوفتـار و کـردار و ئـەحواڵ دەریبـڕیوە ئـایین و یاسـای ئیسلامە، بەلام خودای گەورە هەرگیز داوای شتێکی نەکردووە کە لـە توانـای ئـادەمزاددا نـەبێت، دیارە هەموو ئادەمزادێ توانای ئەوەی نییە هەموو ئەو ڕەوشتانەی هـەبێ کـە پێغەمبـەر بـوونی و هەموو ئەو کارە چاکانە بکات کە ئەو کـردوونی و هـەموو ئـەو حاڵـە مەزنانـەی هـەبێت کـە ئـەو حەزرەتە مەزنە بوونی. ئەوانەی ئەو لە وزەی هەموو ئادەمزادێکدا نییـە، کـەس ناتوانـێ وەک ئـەو

تێکۆشێت، بۆیە خودای گەورە بەپێی توانـای خەڵـکی هەڕەمـە داوای بـاوەڕ و کـردەوە و خـوو و ڕەوشتیان لێ دەکات و، ئەم ئەندازەیە کـە خـودای گـەورە دەیـەوێ لـە خەڵـکی هەڕەمـە نـاوی (شەرع)ە، ئەو زیادە کردەوانە کە حەزرەت(د.خ) کردوونی، وەک چاکەی زۆر و وەرزنـدانی نـەفس و شەونوێژی دوور و درێژ و بیرکردنەوە و ناوی‌خوداهێنان و خوداپەرستیی گران و، ئەو کردەوانەی کە تەنها لێبراوان و مرۆڤە هەرەباشە زۆر لەخواترسەکان دەیکەن، ناونراون (تەریقەت) و ڕێباز.

ئەو خوداناسی و هەمیشە لەگەڵ خودا بوونە و پێوەندی بەهێز لەگەڵیدا و، ئامادەکردنی ڕۆح بۆ وەرگرتنی نوور و بەرەکەت لە خودا، ناوبراوە بە (حەقیقەت).

ئەگەرنا هەموو ئەمانە بە شێوەیەکی گشتی هەر (شەریعەت) ن و هەر لە حەزرەتـەوە(د.خ) بـە خەڵکی جیهان گەیشتوون.

حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) بە هەیکەل و لەش و شێوە (فەرشی)یە واتـە خاکییـە و ئـەهلی ئـەم سەرزەوییە و بە ناوەڕۆک و ڕۆح و نوورە پەنامەکییەکانی سینە و لـەتائیفی نایـابی (عەرشـی) یـە، واتە: دوورە لە ئادەمزاد و، لە ئەهلی تەخت و پایـەی پێغەمبەرایەتییـە و، لـە نزیکـان و دۆسـتانی خۆشەویست و نزیکی بارەگای خودای گەورەیە، شایانی باسە (ڕۆح و قەلب و سـیڕ و تەریقـەت و حەقیقەت) زاراوەی ئەهلی تەسەووفن.

هیممەتی ئەم پێغەمبەرە پایەبەرزە لە دەریای بێ‌بن و پایانی بانگ‌کردن بۆ خوداناسـی و تـەنها خوداپەرستن و خودابەیەک‌زانیندا ئاگر و سووتەمەنی و گەردانی کەشـتییە و، ئـەوە دەیگەیێنێتـە کـەناری سـەلامەتی و بەختـەوەری. بەڵـێ: شـەریعەت و ڕێـڕەوی حـەزرەتی موحەممـەد(د.خ) کەشتییە و خوداناسین و خودابەیەک‌زانین دەریایە و ئەوانەی دەیانەوێ دەریای خوداناسی ببڕن و بە سەلامەتی بگەنە کەنار سواری ئەو کەشتییە دەبن، کە کەشتیەوانەکەی پێغەمبەری دواهاوەری پێغەمبەرانە و، هیممەتی بـەرزی پشـت بـە خـودا بەسـتووی سـووتەمەنیی کەشـتییەکەیە و، بـە سەلامەتی دەیانگەیێنێتە ئامانج...

حەزرەت(د.خ) زینەت و جوانیی سەرا و بارەگای مولکی غەیب و مەلەکووتە.

لە هەر شوێنێ ناوێکی تایبەتیی هەیە؛ لە جیهانی هەرە بەرز(الملأ الاعلی)دا نـاوی (احمـد)ە و، لە ئاسماندا ناوی (محمود)ە و، لە عەرزا ناوی (محمد) ە(س).

ئەنجا مەولەوی (اقتباس)ی کردووە لە قورئانی پیرۆز و ئەفەرموێ: حەزرەت مانگی درەخشـانە و خودا دەیان پایە و پلەی داوەتێ، نەخەیر ئافتابی عالەم‌تابە و بەو جـۆرە خـوا بـۆی دانـابوو، لـەو

ڕێگایەوە بۆی دیاری کردبوو هات و ڕۆیشت و جیهانی ڕووناک کردەوە، (والشمس تجری لمستقرٍّ لَها ذلک تقدیر العزیز العلیم. والقَمرُ قدَّرناهُ منازل...) [٤٨].

لەوانەیشە واتای بەیتەکە ئەوە بێت کە پێغەمبەر(د.خ) وەک مانگ و خۆر کە ڕێرەوی تایبەتی و پلە و پایەی دیارییان هەیە، هەر لە حەزرەتی ئادەمەوە(د.خ) تا (عبداللە)ی باوکی پشتاوپشت بەڕێز و پایەبەرز و جێگەدار بووە و، ڕشتەی باوباپیر و داوداپیری هەموو پاک و خاوێن و خوابەیەک ناس و خوو و ڕەوشت بەرز و بەڕێز بوون.

مەککە مەشریق و، مەدینە مەغریب
باوک عەبدوڵلا عەبدولموتەللیب
دایک ئامینە کەنیشکی وەهەب
لە (کلاب)دا (ملاقی النَسَب)
نەسەبی هەر تا عەدنان مەشهوورە
تیعدادی لەگرە غەیرە زەروورە
زەروور ئەمەتە دەم لەمە بدەین
ئیزهاری پاکیی سیلسیلەی بکەین
بینا لە تەحریر نیحریری (رازی) [٤٩]
خودا و پێغەمبەر لێی بووون رازی
(و قد وافَقَ ذلک الامام
جماعةٌ مِن کرامٍ أعلام)،
ئابا و ئوممەهات سەییدی عالەم
هەر لە والیدەین هەرتا بە ئادەم
(بِأدِلَّةٍ کالقصر المَشید)
بێ شیک و زەلال کول (علیالتوحید)

کەنیشک: کچ. هەر: تەنها. لەگرە: لێرە. تەحریر: نووسین. نیحریر: زانای زۆرزانا. زانای پایەبەرزی ئیسلامی ئیمام (فخرالدین)ی رازی. بووون: ببن. هەرتا: هەتا.

لە شیعری پێشوودا فەرمووی: پێغەمبەر هەتاوە و بە ڕێگای دیاریی خۆیا دەڕوات، دیارە هەتاو خۆرهەلات و خۆرنشینی هەیە، هەلاتن و ئاوابوونی هەیە، وا لێرەدا دەڵێ: لە شاری مەککەی پیرۆز هەلات و لە شاری مەدینەی نوورانی ئاوا بوو، بەڵێ لە مەککە لە دایک بوو، لە مەدینە کۆچی دوایی کرد، کەواتە بۆ پێغەمبەر(د.خ) مەککە بوو بە مەشریق و مەدینە بوو بە مەغریب.

جا مەولەوی دێتەسەر باسی رشتەی باوباپیری حەزرەت و دەفەرموێ: باوکی حەزرەت (عبدالله)ی کوڕی (عبدالمطلب) ە، ئەویش کە باسی نەکردووە ئاشکرایە و گەلێک لە خەلکی موسڵمان ئەیزانن، وا ئێمەیش لێرەدا باسی دەکەین (عبدالله) کوڕی (عبدالمطلب)ی کوڕی (هاشم)ی کوری (قصی)ی کوڕی (کلاب)ی کوڕی (مرّة)ی کوری (کعب)ی کوڕی (لؤی)ی کوڕی (غالب)ی کوڕی (فهر)ی کوڕی (مالک)ی کوڕی (نضر)ی کوڕی (کنانە)ی کوڕی (خزیمە)ی کوڕی (الیاس)ی کوڕی (مضر)ی کوڕی (نزار)ی کوڕی (معدّ)ی کوڕی (عدنان)ە.

دایکی حەزرەتیش ئامینەی کچی وەهەبی کوڕی زوهرەی کوڕی عەبدولمەنافی کوڕی کیلابە، بەڵێ لە کیلابدا رشتەی نەسەبی باوک و دایکی یەک دەگرنەوە.

هەروەها مەولەوی دەفەرموێ ژماردنی رشتەی باوباپیری حەزرەت لێرەوە پێویست نییە، ئەوە پێویستە کە پاکیی رشتەی باوباپیری حەزرەت، چ سەری دایکی و چ سەری باوکی، لە کوفر و شەریک بۆ خودا دانان دەربخەین و ئیسباتی بکەین کە خاوێن بوون.

بەڵێ بەپێی نووسینی زانای گەورە ئیمام (فخرالدین)ی رازی، کە گەلێکی تر لە پێشەوایانی گەورەی ئایین هاوبیرنی، باوک و باپیری حەزرەتی موحەممەد(د.خ) هەر لە دایک و باوکیەوە تا حەزرەتی ئادەم و حەووا لە هاوبەش‌بۆخودا دانان و کافری پاک بوون و کەسیان کافر نەبوون. ئەم راستییە بە بەڵگەی بەهێز و باوەڕپێ‌کراو ئیسبات کراوە.

هەندێ رەخنەیان لەم رایە گرتووە بەوەی کە باوکی حەزرەتی ئیبراهیم، کە لە رشتەی نەسەبی پێغەمبەردایە، کافر بووە، وەک لە قورئاندا دەفەرموێ (و إذ قال إبراهيم لِأبيهِ آذر أتتخذ أصناماً آلِهةَ...) [٥٠] یا (و ما کان استغفار ابراهيم لِأبيهِ إلاّ عن موعدة وعدها إيّاه، فلما تبيّن لهُ أنّهُ عدوٌّ لِلّه تبرّء منه إنّ ابراهيم لأوّاهٌ حليم) [٥١].

بەلام وەلامی ئەم رەخنە دراوەتەوە بەوەی کە ئازەر مامی حەزرەتی ئیبراهیم بووە و باوکی نەبووە، لەوانەیە بەکارهێنانی ناوی باوک بۆ مام لەو رۆژەدا شتێکی باو بووبێ، یاخۆ چونکە

ئیبراهیم مناڵ بووە باوکی مردووە و لای ئازەری مامی بووە، بە باوک بانگی کـردووە و بـەو جـۆرە زوبانی راهاتووە.

خوسـووس والیـدەین ماجیـدەینی ئـەو
ئەسلـەینی نـەجیب ناجییـەینی ئـەو
عەقیـدەت بـویَ (علـى التحقیـق)ە
ئـەهلی نـەجاتن بـەم سـێ تەریقـە:
ئـەووەڵ نەگەیشـت ئـەلایان دەعـوەت
لەبـەر بوونیـان لـە وەخـتی فـەترەت
دەگـەڵ ئەمیچـە جـوان بـوون مـردن
ئیمکانیـان نـەبوو بـۆ سـەفەر کـردن
حوکمی کەسێکیچ پێی نەگەت دەعوەت
نەجاتـە، داخـل بوونـە بـە جەننـەت
دووەم بـوون لەسـەر دیـنی ئیـبراهیم
بوون لەسەر تەوحید، بێتەردیـد، مـوقیم
سالیس: ئیحیای حەق مەرحەمەتی کرد
زینـدگ بوونـەوە، ئیمانیـان ئـاوورد
ئـــەم گوزارشـــە مـــانیعی چییـــە؟
(عقـلاً و شـرعاً) مومتـەنیع نییـە

دەگەڵ ئەمیچە: لەگەڵ ئەمیشە. نەگەت: نەگات. زیندگ: زیندوو. ئەم گوزارشە: ئەم قسەیە.

واتە: بە تایبەتی باوک و دایکی بەرێزی حەزرەت، کە بە فـەرموودەی حـافیز عـەلائی و حـافیز ئیبنوحەجەری عەسقەلانی و جەلالەددینی سیووتی، باوکی حەزرەت لـە تەمـەنی (١٨) سالـیدا لـە شاری مەدینەی مونەووەرە کۆچی دوایی کردووە و لەوکاتەدا پێغەمبەر لە سکی دایکـا بـووە و دوو مانگانە بووە. دایکیشی لە تەمەنی (٢٠) ساڵیدا لە (ئەبواء) لـە بـەینی مەککـە و مەدینـەدا وەفـاتی کردووە و حەزرەت لەو رۆژەدا شەش سالان بووە.

ئەم دوو زاتە بەرێزە ئەهلی نەجاتن و لە ئازاری پاشەڕۆژ دوورن بە سێ دەلیل:

یەکەم: دەعوەتی ئیسلامەتییان پێ نەگەیشتووە؛ چونکە سەردەمەکەیان سەردەمی (فترة) بووە، واتە جیهان لەو کاتەدا پێغەمبەری تێدا نەبووە، بە نەسی ئایەتی قورئانی پیرۆزیش ئەو کەسانە کە لە زەمانی (فترة)دا بوون سزای قیامەتیان نییە (و ما کنّا معذّبین حتی نبعث رسولاً) [٥٢].

خۆ ئەگەر بڵێن ئەیانتوانی بە شاران و دەوروبەردا بگەڕێن، تا ئەگەیشتنە زانایەکی شارەزای ئایین و فێری دین ئەبوون، ئەڵێم ئەم دووانە بە گەنجی مردوون، لە تەمەنی هەژدە و بیست سالیدا و، چاویان نەکرابووەوە بۆ هاتوچۆ و سەفەرکردن.

دووەم: ئەم دوو زاتە بەڕێزە لەسەر ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم بوون، بەڵێ ئەگەرچی دینی ئیبراهیم بە تەفسیل لە ناوا نەمابوو بەلام ئەسلی خوداپەرستی و خودابەیەکزانین هێشتا هەر لە ناودا مابوو، هەبوو لە تەوحید لای دابوو، هەیشبوو هێشتا هەر (موحّد) بوو، باوک و دایکی پێغەمبەر لەم (موحّد) انە بوون.

سێهەم: پێغەمبەر لە خودا پاڕایەوە باوک و دایکی زیندوو بکاتەوە. خودای گەورەیش میهرەبانیی لەگەڵ پێغەمبەر کرد و زیندووی کردنەوە و ئیمانیان بە خودا و پێغەمبەر هێنا و بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەهرەیاب بوون. لە حەزرەتی عایشەوە دەگێڕنەوە(ر.خ) فەرموویەتی: حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی: «سألتُ ربّی فأحیا لی أمّی فامَنت بی، ثمّ ردّها، أی الی ما کانت علیه من الموت». هەروەها عوروە لە عایشەوە دەگێڕێتەوە، خودایان لێ رازی بێت، «ان رسول‌الله (ص) سألَ ربّهُ أن یُحیی أبویه فأحیاهُما له فآمنا به ثمّ أماتهُما».

ئەم باسی زیندووبوونەوەی باوک و دایکی پێغەمبەرە لە لایەنی شەرعەوە دەلیلێک نییە بەرپەرچی بداتەوە. بە عەقڵیش لەوانە نییە کە مومتەنیع بێ؛ هیچ مەحاڵ نییە ئەگەر خودا لەبەر خۆشەویستیی پێغەمبەر دایک و باوکی زیندوو بکاتەوە ئیمان بێنن و بمرنەوە.

لە دەست [(محل)ی ئیمان (بعد الموت)
هیچ نەفعی نییە] ناوێ بوی فەوت؛
مەحەللی غەیری خوسووسییەتە،
سیوای کەرامەت ئی مەنقەبەتە [٥٣]
ئیحیابوونەوە لە دوای مردن
مایەی ئیمانی پێ عەتا کردن

بە روتبـەی بوڵـەند تـا بـوون موتحـەف
بـەو زیـادەی فـەزڵ، کـەماڵ و شـەرەف
بــوێ بــۆ ئــەوان فــەرق و تــەفاوت
دەگـەڵ سـائیرین لـە ئـەهلی فـەترەت
هــەر موخالیفــێ کــە پێــی هاتــە بــەین
ئەگــەر زەعیفــە قســەی لــێ نەکــەین،
وەرنــــە (إن أمکــــن فقــــد یــــؤوّل)،
یــا مەنســووخە، یــا (متــروک العمــل)
(کمــا یفعــل فــی بعــض المســألة[٥٤]
اذا تعـــــــارض فیهـــــــا الأدلّــــــــة)
حەدیســی زەعیــف ئــەر پێــی لــەناوە
بــەم حەدیســە کــار مــونکیر تــەواوە
(فیــــە یقــــولُ، جَــــلَّ وَعَــــلا
إنّــــی حَرَّمــــتُ ألنّــــارَ عَلــــی)
(صُــــلبٍ أنزَلَــــک، بطــــنٍ حَمَلَــــک)
(حجــر کفَلَــک، فمــا بَقــی لَــک؟!)

مەحەل: حولووڵ. بوی: ببی. ئە: هی. بووون: ببن. بە روتبەی بوڵەند تـا بـوون موتحـەف: تـا موتحەف ببن بە روتبەی بوڵەند. موتحەف: دیاریی بۆ برا.. مەنقەبە: گەورەیی.

واتە: بە قسەی ئەوەی کە ئەڵێ (حولوولی ئیمانی پاش مردن سوودی نییە) نابێ بشکێیت و لـە مەیدان هەڵبێیت، چونکە ئەو بێسوودییە وەختێکـە کـە زیندووکردنـەوە و ئیمـان هێنانەکـە بـە تایبەتی نەبێت و بۆ دەرخستنی گەورەیی و جێگەداری نەبێت. لێرەدا خودای گەورە، بە تایبەتی و بۆ دەرخستنی رێز و پایەی پێغەمبەر، باوک و دایکی زینـدوو کـردەوە ئیمانیـان پـێ هێنـا؛ بەمـە شەرەف و گەورەیی حەزرەت زیاتر و جوانتر دەردەکەوێ کە خوا کارێکی وای کرد زیندوو ببنـەوە و موسوڵمان ببن. بەڵێ ئەگەر خسووسییەت نەبێ ئیمانی کاتی ناهومیدبوون لە ژیانیش سـوودی نییە، چ جایێ ئیمانی پاش مردن!

بەڵێ زیندووی کردنەوە و نیعمەتی ئیمانی پێ بەخشین تا ئەم روتبە و پایە گەورە بەرزەیان بە دیاری بۆ بنێرێت و، بەو زیادە شەرەف و رێزلێگرتنە ئەم باوک و دایکە بەڕێزانە لە خەڵکی تر جیا بکاتەوە، واتە لە خەڵکی سەردەمی (فترة)، ئەگینا بەپێی زاهیری ئایەتی قورئان، کە دەفەرموێ (و ما کنّا معذّبین حتّی نبعث رسولا...) هەموو ئەهلی فەترەت لە سزای رۆژی دوایی رزگارن.

ئەگەر رەخنەگر بڵێت: ئەو حەدیسەی هێناتەوە بۆ بەڵگە ناشێت چونکە (ضعیف) ە، ئەڵێین: هەموو ئەهلی حەدیس دەڵێن حەدیسەکە زەعیفە و ناڵێن (موضوع) ە، حەدیسی زەعیفیش لە باسی کەرامەت و فەزیلەتدا بەکاردێت، بەتایبەتی ئەگەر تێکڕای بەڵگەکانی تر لەگەڵیا بن.

ئیتر ئەگەر دەلیلێکی دژی حەدیسی رزگاربوونیان لە سزا پێی هێنایە مەیدان، ئەو دەلیلە ئەگەر حەدیسی زەعیف بێ ئەوە گوێی نادەینێ چونکە زەعیف ناتوانێ زەعیف بەتاڵ بکاتەوە، ئەوپەڕەکەی ئەوەیە بەربەرەکانێی بکات، ئەوەیش نرخی نییە چونکە حەدیسە زەعیفەکەی ئێمە، کە بۆ ئیسپاتی رزگاربوونیان لە سزا بە هۆی زیندووکردنەوەیان باسمان کرد، بەهێزترە؛ ئەوەتە زاهیری ئایەتی قورئانی پیرۆز پشتگیریی لێ دەکات کە دەفەرموێ (و ما کنّا معذّبین حتّی نبعث رسولاً) [٥٥].

بێجگە لەمە زیندووکردنەوەی باوک و دایکی پێغەمبەر(د.خ) کە شتێکی لەعادەتبەدەرە، وەک کوژراوەکەی بەنیئیسرائیل کە خودا زیندووی کردەوە بۆ دەرخستنی ئەوەی کوشتوویەتی، یا حەزرەتی عوزەیر(د.خ) کە خودا مراندی و لەپاش سەد ساڵ زیندووی کردەوە، یا پەلەوەرەکانی حەزرەتی ئیبراهیم(د.خ) کە لەپاش مردنیان خودا زیندووی کردنەوە، یا وەک موعجیزەی حەزرەتی عیسا(د.خ) کە بە ئیزنی خودا مردووی زیندوو دەکردەوە، شتێکی سەیر نییە و بۆ توانای خودا زۆر نییە کە لە پێناوی رێزگرتن لە پێغەمبەردا باوک و دایکی زیندوو بکاتەوە ئیمان بە پێغەمبەر و بە ئایینی ئیسلام بهێنن و دوایی بە ئیمانەوە بمرن.

خۆ ئەگەر دەلیلی بەرانبەر بەهێز بێ و ئەوە بگەیەنێت کە لە زنجیرەی پشتی باوک و باپیری حەزرەتدا کافر هەبووە، کەوابوو با باوک و دایکیشی وەک ئەوانە بن، وەکوو ئەوەی کە دیوی ئاشکرای ئایەتی (و إذ قال ابراهیم لأبیه آذر... الآیة) [٥٦] دەیگەیەنێت کە باوکی ئیبراهیمی باپیرە هەرەگەورەی حەزرەت کافر بووە، ئەوا بۆ پەرچدانەوەی دەلیلێکیوا (تأویل) دەکەین، بۆ نموونە: ئەڵێین ئازەر باوکی حەزرەتی ئیبراهیم نەبووە، مامی بووە و، لەو سەردەمەدا باو بووە بە مامیان

وتووە: (بابە)... یا حەزرەتی ئیبراهیم هەر لە منالییەوە زمانی وا راهاتووە، یا باوکی خۆی مـردووە و ئازەری مامی بەخێوی کردووە و پێی وتووە بابە، چونکە لەجێی باوکی بووە... تاد.

جا ئەگەر رەخنەگر هەر بـێدەنـگ نـەبوو، بەڵـکو بـەو حەدیسـە زەعیفانـە بەربـەرەکانێی لـە رزگاربوونیان دەکرد، ئەوا ناچار دەبێ رابکات، چونکە ئێمەیش حەدیسی قودسیمان بەدەسـتەوەیە کە خودا بە پێغەمبەر دەفەرموێ: «إنّي حرّمت النارَ علـى صـلبٍ أنزلـك و بَطـنٍ حملَـك و حجـرٍ كفلك» أي حضن احتضنك. واتە: من ئاگری دۆزەخم حەرام کردووە لەو پشتەی تۆی تیا بوویـت و لەو سکەی هەڵیگرتیت و لەو کۆشەی بەخێوی کردیت، وەک کۆشی دایک و دایەنی، ئیتر ئـەی رەخنەگر لە بەڵگە بێهێزەکانت چیت پێ ماوە دەری‌ببڕە!

والحاسڵ ئەو بەدر زولـمەت‌زیـدای لـەیل
ئەو میهری ئـەییام لـە زیـای ئـەو کـەیل
وە بـــــورجی ئەســــلاب تەییباتــــەدا
وە دارەی ئــــــەرحام تاهیراتــــــەدا
هەمووی ئەوجی بورج سەعادەت، شەرەف
حـــەزیز بەرکـــەنار، وەبـــال بەرتـــەرەف
رەئــــس و زەنــــەبی زەلالی تــــەکدا
ســـەر و دووچکـــەی رووی بـــە یـــەکدا
لــە نیشــانە و جێـی ئـەو زاتی پـڕ نـوور
راســـی لـــە تـــیری نوقســـانی مـــەهجوور
لــە خوســووفی عــەیب دەنائــەت بــەری
لــە کوســووفی رەیــب خەنائــەت عــەری
تلـــووعی ســـەردا و غـــورووبی ئـــاورد
حەرەکــە و ســەیر و دەوری تــەواو کــرد

زیدا: پاک‌کەرەوە. زولمەت‌زیدا: تاریکی لابەر. خۆر. کەیل: پڕ، لێوان. بـورج: قـەڵا. دارە: ئـەو شوێنەی کە بە دائیرە دەورە درابێ[٥٧]. ئەوج: زۆر بەرز، دوورترین خاڵی دووریی مانـگ لـە گـۆی زەوی. حەزیز: زۆر نزم، بنی کێو، دژی ئـەوج. بەرکـەنار: دوورکـەوتوو، لادراو. وەبـال: مەینـەت، تەنگانە، ناخۆشـی. بەرتـەرەف: لـەناوبراو، لادراو. راس: سـەر. زەنـەب: کلـک، دوو نوختـەن کـە

ئاسمان‌ناسانی کۆن وتوویانە مانگیان تیا دەگیرێ. تەک‌دا: دوورخستەوە. سەر و دووچکە: سـەر و کلک. رووی بەیەک‌دا: تێکچوو. راسی: راستی، یا راسی- رەئسی: سـەری. تـیر: تـاریری، تـیری پەیکان، ئەستێرەی (عطارد) کە ئاسمان‌ناسانی کۆن وتوویانـە هـۆی خـۆرگیران ئەوەیـە (عطـارد) دەکەوێتە بەینی ئێمە و خۆر(٥٨). خوسووف: مانگ‌گیران. کوسووف: خۆرگیران. رەیب: توهمـەت و گومان. خەنائەت: داوێن‌پیسی. سەردا: دەرخست. ئاورد: هێنا.

واتە: پوختەی قسە ئەو حەزرەتی موحەممەدەی کە مانگی چواردەی تاریکیی‌شەو لابـەرە، ئـەو حەزرەتی موحەممەدەی کە خۆری نووربەخشە و رۆژ لە نووری ئـەو لێوانـە (مەبـەس لـە تـاریکی تاریکیی کوفر و بێ‌ئیمانی و مەبەس لە نوور نووری ئیمان و ئیسلامەتییە) لە بورجی پشـتی پـاکی باوباپیرانیەوە و لە مندالّدانی دایەگەورە بێ‌خەوشەکانیەوە کە هەمووی لە بورج و قـەلاّی شـەرەف و کەرامەت‌دا ئەوج بوون و لای سەروو بوون و لە خالّی پەستی و نزمی دوور بوون و، لە مەینەت و دەردی گومڕاهی پاک بوون. ئەم حەزرەتی موحەممەدە(د.خ) لەم ڕێڕەوەدا خـودای گـەورە وای بۆ رێک خست کە نە (رەئس و زەنەب)ی گومڕاهی بتوانێ تووشی خوسووفی بکات، نە (تیر) یـش توانی بکەوێتە بەینی ئەو و نووری خاوێنی ریسالەت و تووشی کوسووفی بکات، بەهۆی بەرەکـەتی نوتفەی خاوێنی خاوەن ریسالەتەوە(د.خ) سەر و کلکی گومڕاهی چوون بـە یەکـدا و لـە مەیدانـدا خۆیان نەگرت، لە نیشانە و جێگەی ئەو زاتە خاوەن‌کەرامەتـەدا راسـتی لەگـەلّ حـەق‌دا ئەوەنـدە بەهێز بوو لە تاریکیی گومڕاهی دوورکەوتەوە و، لە عەین و دەنائەتی رشتەی نەسەب پارێزرا(٥٩)، لە کوسووفی توهمەت و گومانی داوێن‌پیسی دوور خرایەوە. بەم شێوە شیرینە پشت بە پشت و سک بە سک هات بە پاکی و خاوێنی، هـات و لـە ئاسـۆی باوباپیریـەوە ئـاوا بـوو و رێـڕەوی خـۆی بـە شێوەیەکی عادەتی بڕی و، کاتی ئـەوە هـات کـە شـەبەقی بەختـەوەری و سـەرئەفرازیی بـەرەی ئادەمزاد لە ئاسـۆی جیهانـەوە سەرهەلّـبدات و ئـارامی و دلّـنیایی و بـاوەڕ سەرانسـەری جیهـان بگرێتەوە و، بە لەدایک‌بوونی ئەم رابەرە پایەبەرزە لاپەڕەیەکی پڕ لە شانازی لە مێـژووی ئینسـاندا هەلّبدرێتەوە.

"تـا بـە شـنۆی بـۆی نەسـیمی ئـەزەل
لـە وەخـتی رەبیـع (ربیـع الأول)
بـە سـەد نەزاکـەت لـە تـۆی پـەردەوە
غونچـەی وجـوودی خەنـدە کـەردەوە

عەجەب خەندەیە حیکمەت چەند تەرز کەرد
غولغولــەی گریــەی بولبــولان بــەرز کــەرد
بــەو راســتیی ســەروی بالاکــەی ئــالا
توخمی چەفتیی بـەخت تـەزەروان کـالا(٦٠)
شێوە و شیمە پـاک، رەسـم و رەویـە چـاک
ئایینــەی بــێ گــەرد، ئــایین شــەرەفناک
بــاتین لــە زاهــیر چاکــە عــەجیبتــر
خـەلوەت لـە جـەلوەت ئـەدەب غـەریبتـر
کــردار حەمیــدە، پەســەندیدە حــاڵ
عــومری شــەریفی گەیشــتە چــل ســاڵ

شنۆ: شنە: سووکە بزووتنەوەی با، بۆ: بۆن. نەسیم: بای نەرم. رەبیع: بەهار. خەندە: پێکەنین. چەند تەرز: چەند جۆر. غولغولە: خۆیندن و سەرگەمبوونی بولبول و باڵندەی تـر. گریـە: گریـان. ئالا: بەیداخ. توخم: تۆو. چەفتیی بەخت: لاریی بەخت، بەدبەختی، یا جفتیـی بـەخت: جـووتیی بەخت، وتە بەختیاری. تەزەروان: جەمعی تەزەروە کـە جـۆرە چۆلەکەیـەلی رەنگاوڕەنگـە. کـالا: چاند. شیمە: خوو و رەوشت. رەسم: ئاداب. رەویە: بیرکردنـەوە. ئایینـە: ئاوێنـە. ئـایین: دیـن. خەلوەت: تەنهایی. جەلوەت: دەرکەوتن، خەلوەت و جەلوەت و حاڵ لە زاراوەی تەسەووفن.

باس باسی سەرەتای لەدایکبوونی پێغەمبەرە لەگەڵ تیکڕای پێگەیشتنی تا دەگاتە چل ساڵ و وەحیی بۆ دێت، واتە: بە شنەی بۆن و بەرامەی نەرمـەبای ئـەزەلی [ئـیرادە و قـودرەتی ئـەزەلیی خودای پەروەردگار] لە وەرزی خۆشی بەهاردا، لە مانگی (ربیع الاول) بە سەد نەزاکـەت و ناسـکی غونچەی وجوودی بۆنداری حـەزرەت(د.خ) لـە نـاو پـەردەی حـەیا و شـەرمدا پێکـەنی و دەمـی کرایەوە و گەشایەوە.

وا مەشهوورە کە لە بیستی مانگی نیسـانی رۆمـی و لـە وەرزی بـەهارا رێکـەوتی دوانزەهـەمی مانگی (ربیع الاول) شەوی دووشەممە دەمەوبەیان حەزرەت لەدایک بـووە و بـە هـاتنی پـیرۆزی جیهانی ئاوەدان کردووەتەوە.

هەروەها (مەولەوی) دەفەرموێ: ماشەڵلا چ پێکەنینێکی نایاب بـوو؟ چەنـد جـۆرە حیکمـەتی تێدابوو، بە پشکووتنی غونچەی وجوودی ئەو هاوار و گریان و فوغانی بولبولانی گیرۆدەی جـوانیی

ئەو بەرز بوویەوە، بە راستیی بالای وەک ئالای ڕێک و جوانی کە گرەوی لە داری (سەرو) بردووەتەوە، تۆوی بەدبەختیی (تەزەرو) چاندرا، چونکە ئەم باڵندەیە عاشقی داری سەروە و بالای حەزرەتیش لە (سەرو) جوانتر بوو بۆیە تەزەرو بەدبەختیی بۆ مایەوە.

خۆ ئەگەر وشەی (چەفتی) لە بەیتەکەدا (جفتی) بێت ئەوکاتە مەعناکەی وای لی دێت: بە ڕێکی و راستیی سەروی بالای پێغەمبەر تۆوی بەختیاریی تەزەروی عاشقی پیغەمبەر(د.خ) چاندرا، بەم مەعنایە مەبەست لە تەزەرو ئەو خاوەن دلانەیە کە عاشقی رەفتار و کردار و رەوشتی حەزرەتن(د.خ).

ئەم پێغەمبەرە گەورەیە خوو و رەوشتی بەرز و هەڵسوکەوتی چاک بوو، ئاوێنەی بێگەرد و پاک بوو، ئایینەکەی شەرافەتدار بوو، چاکەی دڵ و دەروونی لە چاکەی دەرکەوتوو و بەرچاوی عەجایەبتر بوو، ئەدەبی تەنهاییی لە ئەدەبی ناو خەڵکی غەریبتر بوو، کردەوە و رەفتاری شایانی ستایش بوو، ئەحوالی پەسەند بوو.

بەڵێ بەم پێگەیشتنە بەرزە و بەم بێگەردییە و بەم خۆشەویستییە مایەوە هەتا تەمەنی گەیشتە چل ساڵ.

تەعلیمیی نامووس دیسان پێراوە[٦١]
وەرەقێ تری بۆ هەڵگێراوە
ئەو هات، ئەم ڕۆیی و گوم، ئەو دیاری
(انا الحق) لە کوێ و «من نییەم قاری»[٦٢]
خوم حەوسەڵەی کرد، ئەربەعین بگرد[٦٣]
مەی ساف بوو بێ دورد، ئەهلی مەشرەب گرد
جام نیشتە سەر دەس، ساقی هەڵساو پێ،
هەموو ئەجزای گوێ، سەدای: دەی کەی تێ؟
رەشحەی نەوای ساز حیجازی ئاورد[٦٤]
ئیبراهیمی نار ئاهەنگی سەرد کرد
راس نەورۆزی بوو، موخالیف حەزین
(بُعِثَ الی الخلق أجمعین)

نامووس: جیبرەئیلی فریشتەی وەحی. دیسان: دووبارە. پێڕاوە: هاتەوە. وەرەقێ تر: لاپەڕەیەکی تر، کتیبێکی تر. بۆ هەڵگێڕاوە: هەڵگێڕاوە، وەک ئەڵێیت هەناسەیەکی بۆ دا، نانێکی بۆ خوارد، پاڵێکی بۆ دایەوە. ئەو هات: ئەو ئاییینەی جیبرەئیل هێنای هات. ئەم رۆیی و گوم: جەهالەت رۆیشت و ون بوو. ئەو دیاری: جیبرەئیل دەرکەوت. (انا الحق) کینایەیە لە داوای خوایی کردن و لەخۆ بایی بوون. من نییەم قاری: من خوێندەوار نیم، ئیشارەتە ئەلای (لست بقاریء) کە پێغەمبەر(د.خ) یەکەم جار بە جیبرەئیلی وت، مەبەست خۆبەکەمزانین و خاکینەییە. خوم: کووپەی شەراب و دۆشاو و شتی وەک ئەمانە. حەوسەڵە: سەبر. خۆڕاگرتن. ئەربەعین: چلە، واتە چل ساڵەیی تەمەنی پیرۆزی پێغەمبەر کە تیایا کرا بە پێغەمبەر(د.خ). بگر: رابوورد، تێپەڕی. (ئەمە زاراوەی ناوچەی تاوەگۆزیی مەڵبەندی مەولەوییە). بێدورد: بێخڵتە و ساف. ئەهلی مەشرەب: ئەهلی زەوق، ئەوانە کە ئەیانەوێ بخۆنەوە، مەبەستی ئەوانەیە کە چاوەڕوانی شەرابی راستەقینەی خودا دۆزینەوە و خوداناسین. گرد: کۆن، حازرن، پێکەوەن. جام نیشتە سەر دەس: ئەوانە بەتەمان هەرکەس بەشی خۆی وەربگرێ و جامیان لەسەر دەستە و چاوەڕوانن. ساقی: پێغەمبەر کە خێر و بەرەکەتی خوداناسیی بەسەر خەڵکدا دابەش دەکات. هەڵساوە سەر پێ: ئامادە بوو بۆ وەرگرتن، بۆ گەیاندنی پەیام، پێگەییبوو. هەموو ئەجزای گوێ: هەموو ئەندامی پێغەمبەر بووبووە گوێ و چاوەڕوانی و، دەنگی (کەی فریشتەی وەحی دێ؟)ی لێوە دەبیسرا، یا هەموو ئەندامی یەکەیەکەی کۆمەڵە چاوەڕوانەکە بووبووە گوێ و، دەنگی (کەی پێغەمبەرێ، رابەرێ، نەجاتدەرێ دێت؟) دەبیسرا. رەشحە: عارەق. نەوا: ئاواز. ساز: جۆرە ئالەتێکی مۆسیقایە. حیجازی: حیجاز مەقامێکی مۆسیقایە، ئیشارەیە بۆ ئەوەی قورئان بە زمانی خەڵکی حیجاز هاتووە[٦٥]. ئیبراهیمی ناز: ئەو ئاگرەی بۆ سووتاندنی حەزرەتی ئیبراهیم تاودرابوو لە ئاهەنگی کوفر و بتپەرستیدا. راس، راست: چاک و سەرڕاست. نەورۆزی بوو: رۆژی بوو، لە خۆشیدا بوو. موخالیف: دز. حەزین: خەمبار. (نەوا، ساز، حیجاز، ئیبراهیمی، نەورۆز، راس، موخالیف، حەزین) هەندێکیان ئاواز و هەندێکیان ئالەتی مۆسیقان و، کۆکردنەوەیان بە قانوونی زانستی بەدیع تەناسوبی تێدایە.

ئەمەش واتای تێکرای یەکەیەکەی شیعرەکانە: فریشتەی وەحی جارێکی تر- پاش نەمانی حەزرەتی عیسا و تێکچوونی ئایینەکەی- هاتەوە مەیدان و پەڕەی کتێبێکی تری هەڵگێڕایەوە، کە قورئانی پیرۆزە. ئەو ئایینە تازە کە هاتە رووی کار، کوفر و بتپەرستی رۆیی و گوم بوو؛ لەخۆبایی

بوون، و خۆبەخوازانینی زۆرداری کافر لە کوێ و خاکینەیی پێغەمبەر لە کوێ کە لە وەلامی حەزرەتی جیبرەئیلدا وتی: من خوێنەوار نیم.

کووپەی شەراب کۆن بوو خۆی گرت و چلەی بەسەردا رابووردـ چل ساڵ، نەک چل رۆژ ـ [مەبەست پێغەمبەر و تەمەنیەتی کە لە چل سالاندا بوو بە پێغەمبەر] شەراب ساف و بێخلتە بوو، ئەهلی زەوق کۆ بوون. چاوەڕوانان هەموو جام بەدەستەوە و چاوەڕوانی بەشە شەرابی خوداناسیی خۆیان بوون، مەیگێڕ (پێغەمبەر) لە سەرپێ و ئامادەی گەیاندنی پەیام بوو، هەموو ئەندامی ئەو و ئەوان گوێ بوو، لە هەموولایەک دەنگی (دەی نەی دێ؟) بوو. تەنها تکێک عارەق لە کاتی ئەو ئاوازەی کە لە سازی حیجازییەوە بەرزبوویەوە ئەو ئاگرەی ساردکردەوە کە وەک ئاگرەکەی بۆ سووتاندنی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ ئاهەنگی کوفر و بتپەرستی خۆش کرابوو (قلنا یا نار کونی برداً و سلاماً علی ابراهیم) [٦٦].

مرۆی راستوچاک رۆژی بوو، لە خۆشیدا بوو، نەیار و حەز لە دادوخواپەرستی نەکردوو خەمبار بوو، حەزرەتی موحەممەد کرا بە پێغەمبەری گشت عالەم هەتا خەڵک بە بەختەوەری بژین.

ئیددیعادی مەنسەب نوبووەتی کرد
بۆ سیدقی شاهید موعجیزەی هاورد
ئیسباتی هەردوو بە تەواتورە
مونکیری یەقین ضالّ و کافرە
موعجیزە ئەمرێس خاریقی عادەت
زاهیر لە ساحیب دەعوای نوبووەت
(عند تحدّی فرقة الانکار)
بە وەفقی دەعوای ئەوان کا ئیزهار
مونکیرین هەر چەند تەقالا بدەن
مومکینیان نەوێ موعارەزەی کەن
لەودوا عیلمی قەتعی بە تەحقیق
حاسڵەو بۆ شەخس واجبە تەسدیق
ئیحتیمالاتی عەقڵی و وەهمییە
مونافیی عولووم قەتعییە نییە

(ألَــــیسَ کمـــا قــــالَ ذوالجـــــلال:
صَـــدَقَ عبــدی فـــی کـــلّ مقـــال)؟

ئەمریس: ئەمریکە. کا: بکا. کەن: بکەن.

واتە: حەزرەت(د.خ) ئیددیعای پایەی پێغەمبەرایەتیی کرد و بۆ سەلماندنی راستیی قسـەکەی بە خەڵک موعجیزەی نیشـان دان و، هـەر کـەس ئیـددیعای پایـەی پێغەمبەرایـەتی بکـات و بـە موعجیزە بە خەڵکی بسەلمێنێ ئـەوە پێغەمبـەری خودایـە[٦٧]. (کـوبرا)ی دەلیلەکـە ئاشـکرایە و (سوغرا) کەیشی بە تەواتور بۆمان سابت بووە.

لە راستیدا بە تەواتر دەرکەوتووە کە حەزرەت(د.خ) ئیددیعای پێغەمبەرایـەتیی کـردووە و، لـە کاتی بەربەرەکانێی لەگەڵ قەومەکەیدا موعجیزەی نیشان داون، وەک لە کتێبـەکانی (سـیرەت)دا باس کراوە. ئەم ئیددیعای حەزرەتە و ئەم پیشاندانی موعجیزانە چین بە چین تـا ئەمـڕۆ کۆمەڵـە ئادەمزادێک گێڕاویانەتەوە کە بە عەقڵ مەحاڵی عادەتییە هەموو ئەوانە چـین بـە چـین و کۆمـەڵ پاش کۆمەڵ بە درۆ ئەم قسەیان گێڕابێتەوە.

شایانی باسە: موعجیزە رووداوێکی (لەعادەتبەدەرە) کـە دژی رووداوە عادەتییـەکانی جیهـان بێت، لە کەسێکەوە رووبـدات کـە ئیـددیعای پێغەمبەرایـەتی بکـات و، لـە کـاتی بەربـەرەکانێ و (تەحەددی)دا بۆ مەبەستی دەرخسـتنی راسـتیی ئیددیعاکـەی پیشـانیبدا و بـەوجۆرە بـێ کـە دەیەوێت، هەروەها خەڵکە دژەکەیش نەتوانن کاریوا پیشان بدەن و (موعارەزە)ی بکەن.

کە وتمان موعجیزە کارێکی (لەعادەتبەدەرە) سیحر، واتە جادووی جادووگـەران پێـی نـاوترێ موعجیزە؛ چونکە جادوو یا چاوبەست (لەعادەتبـەدەر) نییـە و بـە دەرز دەخـوێنرێ و هەرکـەس بیەوێ و بۆی بلوێ فێری دەبێت.

کە وتمان: لە کەسێکەوە رووبدات ئیددیعای پێغەمبەری بکات مەعنای ئەوەیە ئەگـەر یـەکێک ئیددیعای پێغەمبەری بکات و کارە لەعادەتبەدەرەکە لە یـەکێکی تـرەوە بوەشـێتەوە ئـەوە پێـی ناوترێ موعجیزە، چونکە کاری لەعادەتبەدەر پایەی خاوەنەکەی دەرئەخات نەک پایەی یەکێکی تر.

کە وتمان کارەکە لە کاتی (تحدّی)دا دەربکەوێت ئەوە دەگەیەنێت کە کاری لەعادەتبـەدەری بێ (تحدّی) کەرامەتە و موعجیزە نییە.

کە وتمان کارەکە لەگەڵ ئیددیعاکەدا بگونجێت ئەوە دەگەیەنێت کـە (اهانـە) مـوعجیزە نییـە؛ مەشهوورە کە (موسەیلەمەی کەززاب) دەستی هێنا بەسەر کەچەڵێکدا تا چـاکیبکاتـەوە کـەچی سەری کابرا بە تەواوی داڕزا!

کە وتمان (دژەکان نەتوانن چەشنی ئەو کارە لەعادەتبەدەرە بکـەن) مـەعنای ئەوەیـە ئەگـەر دژەکان توانییان چەشنی ئەو کارە بکەن ئەوا بە کارەکـەیان ناوترێـت مـوعجیزە چونکـە خەڵـکی تریش توانای کردنی ئەو کارەیان هەیە.

لە راستیدا بە هۆی دەرکەوتنی موعجیزەوە بەو شـێوە کـە باسمـان کـرد بـۆ ئەوانـەی خۆیـان دیویانە یا بە تەواتور بیستوویانە، عیلمی قەتعی پەیدا دەبێت، بێگومان ئەم وەزعە وەک ئەوەیە کە خودای گەورە بە خەڵکی راگەیاندبێت: ئەم بەندەیەم راست دەکا و، هەر قسەیە کـە دەیکـات لـە جێی خۆیدایە و درۆ و دەلەسە نییە.

جا ئەگەر کەسێ رەخنە بگرێت و بڵێت لێرەدا چەند ئیحتیمالێک هەیە؛ بـۆ نموونـە ئـەگونجێ ئەم کارە لەعادەتبەدەرە بە هەڵکەوت (صدفە) بووبێت، یاخۆ هۆیـەکی پەنامـەکی هـەبێت ئێمـە پێی نەزانین، لە وەڵامدا ئەڵێین زانـینی راسـت و بـێدرۆ رێگـا لـە ئیحتیمـالی عەقڵـی و خـەیاڵ هەڵبەست ناگرێت، بۆ نموونە: وا دەبێ تو خانووەکەت بـەجێ دەهێڵـیت و زۆر چـاک دەزانی کـە قاسەیێکی پڕ لە پارەی تێدا نییە، کەچی ئیحتیمالی ئەوە هەیە کاتـێ کـە تـۆ لـە مـاڵ نـەبوبیت یەکێک هاتبێت و قاسەیەکی پڕ لە پارەی لەوێ دانابێت!

دڵ وەک پـــەروانان حـــائیرە و دائـــیر
لـــە دەوری چـــرای ئـــەهلی بەســـائیر
ئەو چیهرەی سـیمای مونـەوورەی ئـەو
ئەو خولق و سیرەت موتەههـەرەی ئـەو
ئەو دەریای حیکمەت پڕ دوڕڕ و گەوهەر
لـــە مەنبـــەعی لـــەفز ئـــەو دەهاتـــە دەر
ئیزهـــار و بـــەیان ئـــەو حەقائیقـــە
ئـــەو مەعاریفـــە و ئـــەو دەقائیقـــە
ئـــەو نیکاتانـــەی کـــە جۆشـــیان داورد
حوکـــەما ســـەریان لـــێ دەرنـــەدەکرد

با وجوود ئەو قەومە ئەو بـوو تێیانـدا[٦٨]
نەشـــئونومای بـــوو لـــە ناویانـــدا
ئـوممی و جاهیـل و ناخۆنـدەوار بـوون
بەعید لە ئـەهلی عـیلم و ئـەحبار بـوون
لە کەسـێکەوە هـیچ بـۆی نـەبوو (قـطّ)
تەعلیم و تەئدیب، مومارەسـەی (خـطّ)
ئـــەو ســـەخاوەتە و، ئـــەو فوتووەتـــە،
ئـــەو شـــەجاعەتە و، ئـــەو موررووەتـــە
ئـــەو ســـەباتە و ئـــەو ئیســـتیقامەتە
ئـــەو بـــەقای ئاســـار تـــا قیامەتـــە
ئـەو زوهـد و وەرعـە و نەوعـە عیبـادە
ئەو تەکمیلی نـەفس دەرحـەق عیبـادە
ئـەو تەسـلیکە و ئـەو تـەرزە ئیرشـادە
ئەو ئـال و ئەسـحاب، ئـەو ئیستیرشـادە
ئەو لە گشـت دنیـا سـەردی و سـولووە
(قبـــل النبـــوّة، بعـــد النبـــوّة)
بـەبێ مـوعجیزە و دەردیسـەریی ئـەو
بەس بوو بۆ ئیسـبات پێغەممـەریی ئـەو
لەمـە عـەجیبتـر مـوعجیزە مەشـنەو:
ئۆمی و[٦٩] عەللامـە، هـەتیو بـە ئـەدەو

چیهرە: ڕوومـەت. داورد: دەهـاورد، دەهێنـا. (عیبـادە)ی یەکـەم: عیبـادەت، خوداپەرسـتی. (عیبادە)ی دووەم: عیباد(ە) لەگـەڵ بەنـدەگانی خـودا. تەسـلیک: خەڵـک خسـتنە سـەر ڕێگـا. ئیستیرشاد: داوای بەڕێی ڕاسـتدا ڕۆیشـتن لـە خەڵـک. سـولوو: لەبیرچوونـەوە. دەردیسـەری: سەرئێشە و ماندووبوون. مەشنەو: مەبیسە. ئۆمی، ئوممی: نەخوێنەوار. بە ئەدەو: بە ئەدەب.

واتە: دڵم بە وێنەی پەروانەی سەرگەردان بە دەوری چرای خاوەن‌بەسیرەتاندا دەسووڕێتەوە، کە هەر تەماشای سیفەتە زاتییە شەخسییەکانی حەزرەتیان کردووە و، هەر ئەوانەیان کردووە بە دەلیل لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی.

واتە: ئەو ناچاوان و سیما نوورانییەی ئەو، ئەو خوو و رەوشتە پاکەی، ئەو شەخسییەتەی کە دەریای زانیاری بوو و پڕ بوو لە دوڕ و گەوهەری واتەی بەنرخ، ئەو دوڕڕانەی کە لە دەم و زوبانی شیرینی ئەو دەرئەچوون، ئەو نوکتە ورد و بەهێزانەی کە زانا بەرزەکان سەریان لێ دەرنەدەکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا کە دەورویشتی نەخوێندەوار و نەزان بوون و لە ئەهلی زانست دوور بوون، هەروەها ئەو بەخشندەییەی، ئەو جوامێرییەی، ئەو ئازایی و نەبەزییەی، ئەو سەبر و خۆگرتنەی لە تەنگ و چەڵەمەدا بەرامبەر بە دوژمن و ئازار[ەکان]ی و بەرامبەر تانە و توانج و سەرزەنشتی نامەردان، ئەو بە ئێجگاری دنیا لەبیرچوونەوەی، ئەو پارێزکردنەی لە شتی سووک و بێ‌نرخ، ئەو هێزی رانومایی و خەڵک ئاگادارکردنەوەیەی، مانەوەی دین و ئایینە پیرۆزەکەی کە لە بەر هەموو گێژەڵووکەی باری نالەباری گەردوون و چەرخی ناهەمواردا خۆی گرت و سەرکەوت، هەموو ئەمانە بۆ مرۆی ژیر و تێگەیشتوو لە موعجیزە باشتر دەلیلن لەسەر پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی موحەممەد(د.خ).

لە دواییدا مەولەوی دەفەرموێت: باشترین موعجیزە ئەوەیە پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ ئەوەیشدا کە نەخوێندەوار بوو زانایەکی زۆر زانا بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا کە هەتیو بوو زۆر بەئەدەب بوو، بە باشترین شێوە چاودێریی ئاداب و نەریتی کۆمەڵایەتیی دەکرد. دروودی خودا لەسەر خۆی و لەسەر ئال و هاوڕێ سەربەرزەکانی.

***

۱ـ لە دەستنووسەکەدا لەباتی ئەم عینوانە تەنها نەخشێک هەیە کە تەواوبوونی باسی پێشوو و هاتنی باسی تازە پیشان دەدات.

۲ـ لە نوسخە چاپەکەدا (لە گولی و)ە.

۳ـ لەناو (بەنی ئیسرائیل) ەکاندا رێک کەوتووە کە دوو پێغەمبەر هاوچەرخ بوون.

٤ـ لە چاپەکەدا (شهاب) ە، هەرچۆن بێ مەبەست (ابن حجر)ی (فقیە)ە.

٥ـ مەبەست واحیدیی نیسابوورییە کە ناوبانگی بە نەحوزانی و لێکدانەوەی واتای قورئانی پیرۆز دەرکردووە. بەلام بۆم روون نەبوویەوە ئەوحەدی کێیە؟

٦ـ ئەبوموحەممەد حوسەینی کوڕی مەسعوودی کوڕی موحەممەد، فەڕائی بەغەوی، زانای ئایینیی شافیعیپەیڕەو، لە (٥١٠) یا (٥١٦)ی کۆچیدا مردووە، کتێبی (مصابیح السنة)ی داناوە لە زانیاریی حەدیسدا، لەگەڵ کتێبی (معالم التنزیل) لە زانیاریی لێکدانەوەی واتای قورئاندا.

٧ـ واتە (مەحرەم)ی ئەسرار بە خاڵێک گومان لە بەرچاو دەکەوێ و دووردەکەوێتەوە. واتە ماوەی بەینی گوناهبار و بێگوناهـ زۆر کەمە. یا وشەی (محرم) بە خاڵێک لە ژێر (ح)دا دەبێتە (مُجرم). هەورەها (مُحرِم) ئەوەی ئیحرامی حەجی بەستووە نابێ گیان لەبەر سەر ببڕێ و ئەگەر ئەوەندەی خاڵێک خوێن بڕێژێت دەبێتە تاوانبار.

٨ـ لێی گەڕێت: شێوەنووسی دەستنووسەکە (لیی کریت)ە. لە چاپەکەدا « لیکرێت»ە کە دەکاتە (لێ‌گەڕێت).

شایانی باسە هەندێ هێماکاریی نووسینی کۆن لەم نیوە شیعرەدا هەیە ئەوە دەگەیەنێت کە (بێ سەفای مەحجووب لە ئەسراری بەین موحیب و مەحبووب) فاعیلی (لێی گەڕێت) بێت دیارە «بێ سەفای... تاد» واتا کەسی دڵنەکراوەی بێئاگا لە نهێنییەکانی نێوان خوا و بەندەی لەخوداترس.

٩ـ پاش نەختێ دەلالەتی موعجیزە و دژی دەلالەتەکەیت بۆ روون دەکرێتەوە.

١٠ـ (خلاف الاولی) ئەوەتە (نهی)ی (غیر مقصود) رووی تێبکات. بۆ نموونە بە شێوەی (امری استحبابی) ئەمرکراوە بەوەی کە نوێژکەر لە کاتی نوێژدا چاوی لە سوجدەگاکەی بێ.

لەمەوە دەردەکەوێت کە نەهی کراوە لەوەی چاوی لە جێگایەکی تر بێت.

١١ـ ئایەتی (٣٠) سوورەتی (بقرە).

١٢ـ ئایەتی (٥٩) سوورەتی (نمل).

١٣ـ ئایەتی (١٨١-١٨٠) سوورەتی (صافات).

١٤ـ ئایەتی (٧٥) سوورەتی (حج).

١٥ـ ئایەتی (٣٣) سوورەتی (آل عمران).

١٦ـ ئایەتی (٨٦-٨٤) سوورەتی (انعام).

١٧ـ ئایەتی (٢٤) سوورەتی (یوسف).

١٨ـ ئایەتی (٢٦) سوورەتی (ص).

١٩ـ ئایەتی (٧٩) سوورەتی (انبیاء).

٢٠ـ ئایەتی (٢٠-١٧) سوورەتی (ص).

٢١ـ ئایەتی (٢٥) سوورەتی (ص).

٢٢ـ ئایەتی (٤٠) سوورەتی (ص).

٢٣ـ ئایەتی (٣٠) سوورەتی (ص).

٢٤ـ ئایەتی (٤ـ٣) سوورەتی (نجم).

٢٥ـ ئایەتی (٤) سوورەتی (قلم).

٢٦ـ ئایەتی (٤٦ـ٤٥) سوورەتی (احزاب).

٢٧ـ لە چاپەکەدا (محامد)ە لەباتی (محامل). دیارە هەڵەیە.

٢٨ـ ئایەتی (٧٨) سوورەتی (غافر).

٢٩ـ لە چاپەکەدا دەڵێ (وا دەوێ).

٣٠ـ لە نوسخە چاپەکەدا ئەم دوو نیوە پاش و پێشن.

٣١ـ ئایەتی (٢٨٥) سوورەتی (بقره).

٣٢ـ ئایەتی (٢٥٣) سوورەتی (بقره).

٣٣ـ بەپێی شێوەنووسی دەستنووسەکە ئەبێ (تابی) بنووسین، بەلام نیوەشیعرەکە لەنگ دەبێ.

٣٤ـ لەوانەشە (وەلێ) نەبێت و (وەلی) بێت و (مضاف الیه) بێت بۆ (ویلایەت) واتە راستی ویلایەتی وەلی بە کەسبە... تاد. بەلام شێوەنووسی مەتنەکە تەواوترە.

٣٥ـ ئایەتی (١٩٦) سوورەتی (اعراف).

٣٦ـ ئایەتی (٦٢) سوورەتی (یونس).

٣٧ـ ئایەتی (١٢٤) سوورەتی (انعام).

٣٨ـ صحیح البخاری الجزء الثانی ص ٦٧، مطبعة مصطفی البابی الحلبی و أولاده بمصر، شهر رجب ١٣٤٥ هـ

٣٩ـ سنن ابن ماجه ج ١ ص ٥٢٤، تحقیق محمد فؤاد عبدالباقی، دار احیاء الکتب العربیة ١٣٧٢ هـ ـ ١٩٥٢ م.

٤٠ـ المسند للامام احمد بن حنبل شرح احمد محمد شاکر دارالمعارف للطباعة والنشر بمصر ١٣٦٧ هـ/ ١٩٤٨ م جـ / ٥ ص ٢٤٤.

٤١ـ ئایەتی (١٢٨) سوورەتی (توبه).

٤٢ـ «ناگەت ئە روتبەی...» ئەمە لە بەر رووناکیی دەستنووسەکەدایە، لە چاپەکەدا «ناگەت مەرتەبەی...»ە، هی دەستنووسەکە راستە.

٤٣ـ حەزرەتی ئادەم حسێب بکرێ لەگەڵیان شەشن، نەکرێ پێنجن.

٤٤ـ لێرەدا هیچ جۆرە سەرباس لە دەستنووسەکەدا نییە و، هیچ نیشانەیەکی ئەوەیش نییە کە شوێنەکە شوێنی سەرباس بێ؛ بە تایبەتی لە پێش چەند شیعرێکدا وتی: «ئەووەڵ لە ئەووەڵ ئەنبیا ئادەم... تاد» و سەرباسیش نەبوو، ئێستەیش دەڵێت: «دووەم... تاد» ئیتر بۆ ئەبێ سەرباس بێت؟! کەچی چاپەکە نووسیویە «مبحث حضرة الرسول علیه الصلاة والسلام».

لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لەم شوێنەدا سێ شیعری فارسیی نووسراوە و لە پایاندا نووسراوە: «لناظمها». واتە: ئەوانیش هی مەولەوین. شیعرەکان ئەمانەن:

چو دانه دان ورا عالم شجر شد
شجر را باز آن دانه ثمر شد
بمعنی مستفیض از بحر لاهوت
بصورت ابر بارنده به ناسوت
بامر اندر (اب الاجداد) آمد
بخلق اندر (من الاولاد) آمد

واتە: پێغەمبەر وەک دانەیە بزانە کە جیهان دارێکە و لەو دانەوە سەوز بووە و، جارێکی تر هەر ئەو دانەیە بووەوە بە بەری ئەو دارە.

لە مەعنا و حەقیقەتدا لە دەریای لاهووتەوە فەیزی وەرگرت، بە شێوە و دیمەنیش هەوری بارشە و باران بە سەر ناسووتدا دەبارێنێت. لە جیهانی (امر) و (روح)دا باوکی باپیرانە، لە جیهانی بەرچاوی دروست بووندا لە ریزی نەوەکاندایە.

٤٥ـ لە نوسخە چاپەکەدا «حقیقتیکە»یە کە دەکاتە (حەقیقەتێکە).

٤٦ـ لە فەرهەنگی بورهانی قاتیعدا دەڵێت قەندی موکەڕەڕ کینایەیە لە لێوەکانی دلدار، تەعبیرەکەی مەولەوی رەوانبێژانەترە؛ (شیرین) لە (قەند) فراوانتر و فرە مەعناترە.

٤٧ـ غینة: غیمَةٌ. عین: حقیقَتُهُ، أو نبعُهُ.

٤٨ـ ئایەتی (٣٩ـ٣٨) سوورەتی (یس).

٤٩ـ لە چاپ و دەستنووسدا هەردووکیان (تحریر) ن، بەڵام وا بزانم هەردوو نوسخەکە بە هەڵەدا چوون؛ یەکەم (تەحریر) و دووەم (نیحریر)ە.

٥٠ـ ئایەتی (٧٤) سوورەتی (انعام).

٥١ـ ئایەتی (١١٤) سوورەتی (توبە).

٥٢ـ ئایەتی (١٥) سوورەتی (اسراء).

٥٣ـ ئی: هی نوسخە دەستنووسەکەیە، لە چاپەکەدا (وای) ە، هەڵەیە.

٥٤ـ ئەبوا بیوتایە: (بعض المسائل). دیارە سەنگی شیعرەکە ناچاری کردووە، ئەگەرچی ئەیتوانی بفەرموێ: (کما یجری فی بعض المسائل. اذ تعارضت فیها الدلائل).

٥٥ـ ئایەتی (١٥) سوورەتی (اسراء).

٥٦ـ ئایەتی (٧٤) سوورەتی (انعام).

٥٧ـ لە دەستنووسەکەدا لە پاڵ «دارە»دا نووسراوە «دائرە». لە فەرهەنگی بورهانی قاتیعیشدا دەڵێت (دارە) سووک کراوەی (دائیرە) یە.

٥٨ـ باسی رەئس و زەنەب و ئەم باسی (تیر)ی بە مەعنا (عطارد) مم لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا بەرچاو کەوت، کە لام وایە هی (مەولەوی) خۆیەتی.

٥٩ـ یا راسی بە مەعنا راستی نییە و، راسی رەئسە، واتە: سەر، ئەو وەختە مەعناکەی وای لێ دێت: نیشانەی جێگەداری و پایەبەرزیی پێغەمبەر بوو کە سەری موبارەکی لە تیری کەم و کووڕی دوور و پارێزراو بوو. هەرچۆن بێ لە کۆکردنەوەی (بەدر و میهر و تیر و رەئس و زەنەب و کسوف و خسوف)دا تەناسوب هەیە.

٦٠ـ لە دەستنووسەکەدا (چفتی)یە کە دەکاتە چەفتی، چەوتی. بەڵام لە چاپەکەدا (جفتی)یە واتە جووتی.

٦١ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا بە فارسی لە روون‌کردنەوەی واتای ئەم وشەدا نووسراوە: «باز آمد»، واتە: گەڕایەوە، جارێکی تر هاتەوە.

٦٢ـ لام وایە مەبەستی (مەولەوی) لە وشەی (ئەو) فەیز و بەرەکەتی خودایی و حالەتی نوقوم بوونی دەریای وەحیە، هەروەها مەبەستی لە (ئەم) زاتە ماددییەکەی پێغەمبەرە(د.خ).

لێرەدا (مەولەوی) زیرەکانە زاراوەیەکی سۆفییانەی بەکار هێناوە کە (انا الحق)ی حالی (فنافی‌الله)یە و بەراوردی دەکات لەگەڵ باری ماددی و ئادەمزادییەتیی پێغەمبەردا(د.خ) کە لە سەرەتای هاتنی وەحیدا وتی «لست بقاریء...» واتە: نازانم بخوێنم؛ خوێنەوار نیم!

بە کورتی دەڵێت بەرەکەتی خودایی هات و ڕێ‌وشوێنەکەی داگیرکرد و، لایەنە ماددییەکەی پێغەمبەر ون بوو و لە تین و تاو و بەرەکەتی وەحیدا توایەوە... بەهـ... بەهـ؛ حالەتی (فنافی‌الله)ی پاش بە پێغەمبەربوون لە کوێ و حالەتی زەبوونی و بێ‌دەستەڵاتیی «لست بقاریء...»ی سەرەتای وەحی بۆهاتن لە کوێ؟

لە ڕاستی‌دا وتنی (انا الحق) لە سەردەمی (جەهالەت)دا لە لایەن زۆردارانەوە باو نەبووە، بەڵێ وتوویانە (أنا ربکم الأعلی) یا (أحیی و أمیت) و هاوچەشنی ئەمانە.

بێجگە لەوەش (انا الحق)ی بە واتای کافری و داوای خودایی کردنی دەست ڕۆیشتووە پێشووەکان لەگەڵ «لست بقاریء...»دا بەراورد ناکرێ و، هیچ هۆیەکی گونجاو نییە بۆ بەرابەری و دژایەتیی ئەم دوانە....

ئەهلی تەسەووف، بە مەولەوییشەوە، کە وتنی (انا الحق) و (فنافی‌الله) بۆ چاکانی پەیڕەوانی پێغەمبەر(د.خ) ڕەوا بینن چۆن بۆ پێغەمبەری خاوەن پەیغامی ڕەوا نابینن؟!

(مەولەوی) دەفەرموێ:

ئەگەر مەسەلە (حضور)ی هێزی بەرەکەتی ئیلاهی و ون‌بوونی وزەی ماددیی نەبێ، چۆن پێغەمبەرێکی بنیادەم بەرگەی وەحی دەگرێ... بەڵێ جارێک نوقمی دەریای نووری خودایییە و جارێکیش بنیادەمە عادەتییەکەیە.

٦٣ـ بە دووری نازانم ئەم «ئەر بە عین بگرد» ئیشارەیش بێت بۆ بارودۆخی دەروونیی حەزرەت لەو چڵ ڕۆژەدا کە جیبرەئیل لە سەرەتاوە پێی لێ بڕی...

٦٤ـ وشەی (ڕەشحە)ی بە واتای عارەق ئیشارەی تێدایە بۆ باری دەروونیی و لەشیی حەزرەت(د.خ) لە کاتی هاتنی وەحیدا، کە وەک لە حەدیسدا هەیە لەشی دەنیشتە سەر عارەق و ماندوو دەبوو.

٦٥ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا دەڵێت وشەی (حجازی) و (ابراهیمی) ئیشارەن بۆ ئەوەی کە قورئان بە زمانی ئەهلی حیجاز هاتووە، هەروەها بۆ ئەو ڕیوایەتەی دەڵێت پێغەمبەر پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەر، لەسەر ئایینی ئیبراهیم بووە.

٦٦ـ ئایەتی (٦٩) سوورەتی (انبیاء).

٦٧ـ «حەزرەت...» هەتا «نیشان‌دان» بە پێی زانستی مەنتیق سوغرای دەلیلە و «هەرکەس...» هەتا «خودایە» کوبرایە. (نەتیجە) واتە ئەنجامی دەلیلەکەیش دەبێتە ئەوەی کە حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەری خودایە.

٦٨ـ لە چاپەکەدا (تیاندا) نووسراوە.

٦٩ـ لە دەستنووسەکەدا لێرەدا (اومی) نووسراوە کە دەکاتە (ئۆمی)، بەڵام لە بەیتی (ئوممی و جاهیل و... تاد)دا (امّی) نووسراوە.

## مبحث الخاتميّة [1]

(دَليــــلُ كـــونِ ذلـــك الجنـــاب
خـــاتمهم مـــا كـــان فـــي الأحـــزاب) [2]
(و فـــي الحـــديث مـــا لـــهُ يهـــدى
وذا قـــولُ «لا نبـــيَّ بعـــدى»)
ئايينـــەی دڵ وا بـــە ژەنـــگ جـــەفاوە
بـــێ وە ئیســـتیدلال ئـــەهلی ســـەفاوە:
بەهرەی شەرع دەعوەت خەڵق ئەلای حەقـە
حـــەللی موشـــکیل و مەســـئەلەی رەقـــە
رەهنومایيـــــە و ئیرشــــادی عیبــــاد
ئـــەباڵ مەســـالیح مـــەعاش و مـــەعاد
(و إعلامُهُـــــم تلكُـــــمُ الأمـــــور
يعجـــز عنهـــا عقـــول الصـــدور)
تـــەقریر و تـــەحریر ئەدیللـــە و حوجـــەج
ئیزالـــەی شـــوبهەی پـــڕ زەیـــغ و عیـــوەج
تەبشـــیر و تـــەرغیب فیرقـــەی مـــوئمینین
ئیـــزار و تـــەرهیب عوســـبەی کـــافیرین
ئیحکـــامی ئـــەحکام ئەســـڵ و فـــەرعی دیـــن
ئیتمـــامی ئـــەخلاق حەســـەنە و ئـــایین

ئـەم شـەرعە خـۆ بـۆ ئەوانـە سـەرجەم
(بـالطرز الأكمـل والوجـه الأتـم)
(مَتَكَفِّـلٌ مُحكَـمٌ سـديد
حيـث لا يُعقَـل عليـه مزيـد)
(يَـدُلُّ عَلـى ذاكـم يقينـا
«اليـوم» حتـى تبلـغَ «دينـا»)
نـەما ئيحتيـاج ئـەهی زەمانـە
(حـق) (نـبی) یـێ تـر بکـا رەوانـە
مـەعلووم بـوو لـە لای هەرکەسـێ بینـاس
(محمّـد) بـێشـک (خـتم الأنبيـا) س

وە ئستیدلال: بە ئیستیدلال. بیناس: بینایە.

واتە: بەڵگەی ئەوەی کە ئەو جەنابە پایەبەرزە بەڕێزە دواهاوەری پێغەمبەرانە و، لە پاش کۆچی دوایی ئەو تا ڕۆژی قیامەت پێغەمبەرێکی تر نایەت، ئایەتەکەی سوورەتی ئەحزابە کە دەفـەرموێت «ما كان محمّدٌ أبَا أحَدٍ من رِجالِكُم و لكن رسولَ اللهِ و خاتمَ النبيّين و كان اللهُ بكلِّ شيءٍ عليما».

هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەردا هەیە «لا نبيَّ بعدي».

مەولەوی پاش ئەم دوو دەلیلەی قورئان و حەدیس بە خۆی دەفەرموێت: ئاوێنەی دڵـم ژەنگـی جەفا و مەینەت دایپۆشـیوە، کەواتـە وەرە و دەلیلـی دڵڕووناکـان لەگـەڵ خـۆت بهێنـە بـۆ پـێ سەلماندنی خاتەمییەتی پێغەمبەر(د.خ)، دلیلەکـەیش ئەوەیـە: تەماشـا دەکـەین بـەش و بـارەی شەریعەت و ئایین بۆ جیهان ئەوەتە کە خەڵک بۆ پەرستنی خودای گـەورە بانـگ بکـات و گـیر و گرفتەکانیان چار بکات و ڕێگەی پیرۆزی و بەختیاری ژیانی ئەم جیهانە و ئاسایشی پاشەڕۆژیان بۆ دیاری بکات و، لەو شتانەیان ئاگادار بکاتەوە کە لە وزەی عەقڵ و هۆشـی ئـادەمزاددا نییـە، وەکـو ئەنجامی ئەم جیهانە و ئەنجامی ئادەمزاد پاش مردن، موژدە بـە خوداپەرسـتان بـدات بـە پایـەی بەرزی پاشەڕۆژ و، لەخودانەترسانیش بە سـزای دواڕۆژ بترسـێنێت و، بناخـەی ئـایین بـە پتـەوی دامەزرێنێت و خوو و ڕەوشتی چاک و پاک پیشانی خەڵک بدات بە جۆرێ کە تاک و کۆمـەڵ بـە خۆشی و بەختیاری بژین.

ئەم ئایینی ئیسلامەیش کە حەزرەت(د.خ) بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و عادەتی ئەوانەی وتمـان گرتوونیەتە ئەستۆی خۆی بە جۆرێ کە زیاتر لەوە بە عەقلا نایەت، ئەمەی وتمـان ئایـەتی (الیـومَ اکملتُ لکُم دینکُم و أتممتُ علیکُم نِعمتی و رضیتُ لکم الاسلام دینا) [٣] بەڕوونی دەریدەخـات. ئیتر پێویستی بەوە نییە کە خـودای گـەورە پێغەمبـەرێکی تـر و ئـایینێکی تـری تـازە بنێرێـت. بێ‌گومان هەرشتێک کە ئادەمزاد بیەوێت و لەگەڵ پایەی مرۆڤایەتیی تـەواودا بگونجێـت، ئـایینی ئیسلام وەری دەگرێت، هەر زانست و پیشەیەک بەسوود بێت، هەر هەنگاوێکی ئاوەدان‌کردنەوە بۆ ئەم جیهانە کە خێر و قازانجی هەردوو دنیای ئادەمزادی تیا بێت ئایینی پـیرۆزی ئیسـلام زۆر بـە خۆشی وەریدەگرێت، ئایینی ئیسلام هەرگیز ڕێگا لە زانست ناگرێت، بەڵـکو بـۆی تـێ‌ئەکۆشـێت، هەمیشە هەوڵ‌ئەدات بۆ کار و کۆشش، بۆ عارەق‌ڕشتن، بـۆ بـەرگری لـە وڵات و لـە دارایـی و لـە نامووس، ئادەمزاد بانگ ئـەکات بـۆ سـەربەرزی و بـەختیاری، بـۆ پێشـکەوتنی تـاک و کۆمـەڵ و راوێژکردن لە پێویستییەکانی ژیاندا لە بناخەوە تا دوایی، کە وا بێ ئـەم ئایینـە بـەم شـێوەیە کـە هەیە بەسە بۆ مرۆڤ و بۆ مرۆڤایەتی، بۆ دین و بۆ دنیای.

لـە ئـەمری عیسـا هـیچ پەشـێو نـەبی
بـەر لـە موحەممـەد بووگـە بـە نـەبی،
کـە هاتـە خـواریچ هـیچ شـوبهەی نییـە
هـەر تـابیعی شـەرع موحەممەدییـە
شەرعی خۆی مەنسـووخ، تـازەی بـۆ نایـە
خەلیفـەی جـەناب رەسوولولـلایە
هیچ دینـێ قبـووڵ ناکـا لـە هـیچ کـەس
ئـیللا ئـەم دیـنی ئیسـلامە کـە هـەس
ئەهلی کیتـاب گشـت پێـی تێـرن ئیمـان
سـەلیب دەشـکێنێ لا دەبـا خووگـان
وەک عەسری ئەو خۆش کەس نایشـنەوێ
دەڵـێن ژن تێـرێ و وەڵـەدی دەوێ
وەختێ کە دەمرێ بە ئـەمری بـێ‌چـوون
دەکرێ لە خدمـەت حەزرەتـدا مـەدفوون

بووبـــەکر و عومـــەر دەکەونـــە ئەبـــەین
(تـــوبی للشـــیخین بـــین النبیـــیّن)
چ فەزلێکـــە (حـــەق) داگیـــە بـــەم خاکـــە
ئەسڵـــە بـــۆ ئـــەم گشـــت گەوهـــەری پاکـــە
ئاسمان لە روتبەی عولوی چـــی کـــەم بـــوو
نـــەبوو بـــە مەدفـــەن بـــۆ عیســـا، ئـــەم بـــوو؟
قـــەتعی نـــەزەرت جـــارێ لـــەولا کـــە
مەنشەئو مەدفـــەن خـــەلات (لـــولاک)ە (٤)

خواریچ: خواریش. تێرن: دێنن. تێرێ: دێنێ. خووگ: بەراز. ئەبەین: لەبەین، نێـوان. زاراوەی ناوچەی تاوەگۆزییە. داگیە: داویە. لەولا کە: لەولا بکە. (لولاک): ئیشارەەیە بۆ «لولاک لولاک لما خلقت الافلاک».

واتە: وەکو بۆم باس کردن حەزرەتی (محمد المصطفی) دروودی خودای لێ بێـت، دواهـاوەری هەموو پێغەمبەرانە و لەپاش کۆچی دوایی ئەو هیچ پێغەمبەرێ نابێ، جا ئەگـەر کەسـێ رەخنـەی لەم قسەیە گرت و، وتی بـە فـەرموودەی پێغەمبـەر(د.خ) لـە نزیکـی دنیـا ئاخربوونـدا حـەزرەتی عیسا(د.خ) لە ئاسمان دێتە خوارەوە و فەرمان رەوا دەبێت، ئیتر چـۆن دەڵـێن لـەپاش حـەزرەتی (محمد) پێغەمبەری تر نابێت، تۆ لە وەڵامی ئەو رەخنەدا بڵێ: با کەس بەهۆی هاتنـە خـوارەوەی حەزرەتی عیساوە(د.خ) سەری لێ تێکنەچێت؛ چونکە ئەو زاتـە لـە پـێش سـەردەمی حـەزرەتی (محمد)دا بووە بە پێغەمبەر. کـە لـە ئاسمـانیش هاتـە خـوارەوە بـێ‌گومانـە پەیـڕەویی ئـایین و شەریعەتی (محمد) دەکات و بێجگە ئیسلام هیچ ئایینێکی تر قوبووڵ ناکات لە خەڵـک. هـەروەها جوولەکە و گاور ئیمانی پێ دەهێنن لەسەر بناغەی ئایینی ئیسلام و ئەویش [ئەوەیە کە] نیشانەی سەلیب(چەلیپا) ـ کە گاورەکان دەیکەنە ملیان ـ لە هەرلایەک ببینێ دەیشکێنێ و فـڕێی دەدات، فەرمان دەدات خووگ نێر و مێیان لە ولاتدا ناهێڵن، ئیتر کەس گۆشتیان نـاخوات. بـە ریوایـەتێ حەوت ساڵ و بە ریوایەتێ چل ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، ئەنجا وەفات دەکـات و لـە شـاری مەدینەی مونەووەرەدا لای گلگۆی پاکی حەزرەتی موحەممەددا لەولای ئەبووبەکر و عومەرەوە بە خاک دەسپێررێ.

فـەرموودەی پێغەمبـەر لـەم بابەتـەوە زۆرن، ریوایـەتی ئیمـام ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل و ئەبووداوود و حاکم لە ئەبووهورەیرەوە، خودایان لێ رازی بێت، دەڵێت:

«إن رسول‌الله(ص)، قال: لَیسَ بینی و بین عیسی، علیه‌السلام، نبیّ، و إنَّـه نـازل. فـاذا رأیتمـوهُ فاعرِفوهُ، رجل مربوع الی الحمرة والبیاض بین مُمَصّرتین (أی علیه ثوبان فیهما صفرة، کَـأنَّ رأسـه یقطر، و إن لَم یصبه بلل، فیقاتل الناسَ عَلی‌الاسلام)، فیدقّ الصّلیبَ و یقتل الخنزیر و یضع الجزیة و یهلک‌الله فی زمانه المللَ کلها إلّا الاسلام، و یُهلک المسیح الدجّال، ثـم تقـع الأمنـةُ علـی‌الأرض حتی ترتع الأسد مع الابل و النمار مع البقر و الذئاب مع الغنم و تلعبُ الصـبیان بالحیّـات فیمکـث عیسی فی‌الأرض اربعین سنة، ثم یتوفی فیُصلّی علیهِ المُسلمون». رواهُ أبـوداوود والحـاکم والامـام احمد رضی‌الله عنهم.

و قال عبدالله بن سلام رضی‌الله عنه «مکتوب فی التوراة صفة محمد و صفة عیسی‌بـن مـریم و یدفن عیسی مع محمد (ص) رواهُ الترمِذی بِسَندِ حسن».

لەم ریوایەتانەوە دەرکەوت کـە حـەزرەتی عیسـی (علیه‌السـلام) وەکـوو یـەکێ لـە خولـەفای راشیدین خزمەتی ئایینی بەرزی ئیسلام دەکات و، بەم ئایینە رەفتار دەکـات و کاروبـاری خەڵـک بەڕێوە ئەبات.

جا بەم بۆنەوە کە پێغەمبەری خۆمان و حەزرەتی عیسا و پێغەمبـەرانی تـر و هـەموو چاکـان و خوداناسانی بەرەی ئادەمزاد لەسەر ئەم خاکە ژیاون و هەر لە توێی ئەم خاکەیشدا شـاردراونەتەوە، مەولەوی دەفەرموێت: «چ فەزڵێکە (حەق) داگیە... تاد». واتە: ئەمە چ بەش و بارەیـەکی بـەرزە کە خـودا داویـەتی بـەم زەوییـە کـە بووەتـە بناخـە و مەڵـبەندی گەوهـەری وجـوودی هـەموو پێغەمبەرەکان و خاوەن‌پایەکان؟

ئاسمان چی لێ قەوماوە؟ کەڵکی ئەوەی پێوە نییە حەزرەتی عیسای تیا بمرێ و لـەوێ دەفـن بکرێ، ئەوەتە دێتە خوار و زەوی دەبێتە ئارامگای.

هەروەها دەفەرموێ: ئەی خوێنەری وشیار، ئەی شاگردی بەختیار! ئێسـتە واز لـە مەسـئەلەی حەزرەتی عیسا بهێنە و لـەولاوە بـە رێـز و قـەدرەوە داینـێ، سـەیری ئـەوە بکـە کـە حـەزرەتی (محمدالمصطفی) کە لەم زەوییەدا هاتووەتە دنیـا و پـەروەردە بـووە و هـەر لـە زەویشـدا لەشـی پیرۆزی دەفن کراوە. حەدیسی قودسی «لولاک لولاک لمـا خلقـت الارض والافـلاک» دەربـارەی ئەوو پایەی بەرزی ئەوە.

***

١ـ لە دەستنووسەکەدا ئەم عینوانە نییە، لە نوسخە چاپەکەدا خراوەتە پێش «ئەما ئیحتیاج ئەهلی زەمانە». جـا ئەگەر بڵێین بووە، ئێرە شوێنیەتی نەک ئەو شوێنەی لە چاپەکەدا بۆی دانراوە.

٢ـ لە پەراوێزی «ما کان»دا، لە نوسخە دەستنووسەکەدا نووسراوە: «فیه لطافة» واتە: هەڵ دەگرێت (ما) ئیسمی (موصول) بێت و (کان) (صله)ی بێ، واتە: ئەوەی لە سوورەتی ئەحزابدایە. هەڵیش دەگرێت رستەی (ما کـان)ی سوورەتی ئەحزاب بێ کە سەرەتای ئایەتی (ما کان محمد أبا أحد مِن رِجالِکُم وَ لکِن رسول الله و خـاتم النبیـین. و کَانَ الله بکلّ شیء عَلیماً) یە.

٣ـ ئایەتی (٣) سوورەتی (مائدە).

٤ـ خەلات (لولاک) ە: ئەو کەسەی کە «لَولاکَ لَولاکَ لَمَّا خَلَقتُ الافلاکَ» کراوە بە خەلاتی.

## مبحث الاسراء والمعراج للرسول(ص) [1]

فەلـەک نەقشـی پێـی دی لـە زەمینـدا
خـوێی گـرینی هـات وە رووی برینـدا
چاوگەی چاوەکەی لێڵ و حەسرەتمەند
(لَیتَنـی کُنـتُ ترابـا)ی دەخوێند
هەرچی ریفعـەت و عیـزز و هەسـتی وێ
فیدای نـەبوونی و خـواری و پەسـتی وێ
حـەق رەحمـی ئـاورد بـەو سـۆز و تـاودا
دەقیقـی[2] پـەردەی لابـرد لـە نـاودا
سورمەی گـەردی پێـی کێشـا وە چـاودا
بەو چاوی پـڕ ئـێش دووری و بـێخـاودا
ئێشی چاوی چوو نـەختێ پـڕ خـەو بـوو
لە حیکمەت میعراج ئەو یەکێ ئەو بـوو[3]

گرینی: گریانی. چاوگە: سەرچاوە، کانی. وێ: ببێ، بێ. ئیسرا: شەوڕەوی پێ کردن.

لێرەدا مەبەس ئەوەیە کە خودای گەورە بە شەو حەزرەتی لە مەسجیدی حەرامەوە بەڕێ کـرد بۆ مەسجیدی ئەقسا. ئەم شەوڕەوی پێکردنە بە ئایەت سابت بووە. خوا ئەفەرموێ (سبحان الـذی أسرى بِعبدِهِ ليلاً مِنَ‌المسجدِالحرامِ الىِ‌المسجدِالاقصَى الّذی باركنا حولَهُ لِنُرِيَهُ من آياتِنـا إنَّـهُ هـو السميع البصير) [4]. دیارە ئینکاری ئەمە کوفرە؛ چونکە ئینکاری (نص)ی قورئـانی پـیرۆزە. بـەڵام میعراج لە ئیستیلاحی ئاییندا بەرزبوونەوەی حەزرەتە بە دە پایە لە بەیتی موقەددەسەوە تـا ڕۆژی حەوت ئاسمانەکان و لەوێیشەوە تا (سدرة المنتهى) و، لەوێیشەوە تا عـەرش و ئـەو شـوێنەی کـە

حەزرەت(د.خ) کەلامی زاتی خودای تیا وەرگرت و پێنج فەرزەی نوێژ لەسەر خۆی و ئوممەتی فەرزکرا. ئەم میعراجە بە حەدیسی سەحیحی بوخاری ئیسبات بووە و ئینکارکردنی بیدعەتە و دەرچوونە لە ریزی ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

ئەم ئیسرا و میعراجە لە کاتی بێداریدا و بە تەواوی جیسم و رۆح بووە وەکوو هاتوچۆی ئینسان بۆ ئیش و کاری خۆی. لە راستیدا ئینسان کە تەماشای نەسی ئایەتی (سبحان الذی أسری بعبده...) و تەماشای ئەو فەرموودەی پێغەمبەرە بکات کە بوخاری باسی کردووە، لەگەڵ ئەوەیشدا تەماشای داو و دەزگای ئەم جیهانە بکات، کە گۆی زەوی بەو هەمووە قورسی و گەورەییە لە ماوەی [٢٤] سەعاتدا بە دەوری خۆیدا ئەسووڕێتەوە، هەروەها تەماشای جوولانەوەی ئەستێرە گەڕۆکەکان بکات، کە هەریەکەیان ریز و ماوەی هاتوچۆی خۆی وەرگرتووە و بە قەدەر موویەک لە قانوون و رێڕەوی خۆی لانادات، باوەڕێکی تەواو پەیدا دەکات کە خودای گەورە دەتوانێ لە کەمترین کاتدا بە هەزاران ئادەمزاد بەرز بکاتەوە بۆ لای ژوورووی هەموو کائینات....

مەولەوی بە شێوەیەکی ئەدەبی و ناسک ئەم باس و خواسەی رازاندووەتەوە و ئەفەرموێت: زەوی لەبەر ئەوەی خۆی بە کەم زانی و ملکەچ و بارەبەر بوو خودای گەورە سەربەرزی کرد، کردی بە شوێنی پەیدابوون و بناخەی درکەوتنی رەهبەران، بەلام ئاسمان کە بەرز بوو، خۆی بە بالا و زل دەزانی، بێبەش بوو، هەتا جارێک ئەم ئاسمانە بەرزە سەیری نەخش و شوێنپێی حەزرەتی پێغەمبەری کرد و بەزەیی بە خۆیا هاتەوە و دەستی کرد بە گریان و فرمێسکی سوێری بەسەر برین و هۆی گرینەکەیدا کە زەوییە رشت و، هەموو جار دەیگوت: خۆزگا منیش خاک بوومایە، نزم بوومایە! هەرچی بەرزی و گەورەیی و پایە و مایە هەیە بە قوربانی پەستی و خاکینەیی بێت.

بەڵێ کە ئاسمان گریا و بە سۆز فرمێسکی رشت، خودای گەورە رەحمی پێکرد و پەردەی حیجابی لە ناوا لابرد، حەزرەتی لە شەوی میعراجدا سەرخست بۆ ئاسمان و ئاسمان تۆزی پێی حەزرەتی لەباتی سورمە هێنا بە چاوانیا کە پڕبوون لە ژانی دووری و بێخەوی، بەو بەیەک گەیشتنە ئازاری چاوەکانی لاچوو، خەوی لێ کەوت و حەسایەوە....

(مەولەوی) بە شێوەیەکی شاعیری دەفەرموێت: هەروەها ئەم میعراجە دڵدانەوەی ئاسمان و شادکردنی بە دیداری حەزرەتی پێغەمبەریشی تیابوو.

لەراستیدا میعراجی حەزرەت لە کاتێکی زۆر موناسـبدا رووی‌دا، ئـەوەبوو ئـەو رۆژانـە گەرمـەی ئازاردانی پێغەمبەر بوو لە لایەن کافرەکانی قورەیشەوە، هەروەها حەزرەت بەهۆی کـۆچی دوایـی دوو کەسی زۆر بەکەڵک بۆی کە یەکەمیان (ابوطالب)ی مامی بوو کە پشـتگیر و یارمەتیـدەرێکی بەهێزی بوو و دووەمیان (خەدیجە)ی خێزانی بەڕێز و پایەبەرزی بوو؛ خودای لێ رازی بێت؛ گەلێ ماندوو بوو[٥] ؛ خودای گەورە بەم میعراجە و بەم گەشت و شەوڕەوییە پڕ لە شانازییە دڵـی خـۆش کرد و ئازاری رەواندەوە و سەبووریی خستە دڵی.

هەروەها بەم کارە لەعادەت‌بەدەرەی، کە لە ماوەیەکی کەمدا لە مەککەوە بـردی بـۆ قـودس و، لەوێوە بۆ ئاسمانەکان و، بەهۆی چاوپێکەوتنی پێغەمبەرەکانـەوە لـە بـەیتی موقەددەسـدا هێـزی مەعنەویی زۆر زیاد بوو، بەوەی کە خودای گەورە دەیەوێ یارمەتی‌بدات و پێی‌بگەیەنێت هـەتا لـە کەس نەترسێت و لە کەس نەپرسێت....

لە لایەکی ترەوە جیهانی فریشتەی ئاسمان و (بیت‌المعمور) و عەرش لە شـەوی میعراجـدا بـە زیارەتی پێغەمبەر شەرەفمەند بوون.

تێی هەڵدە مەزهەب فەلسەفەی خیـداج
ئیمـان بێرانـە بـە قیسسـەی میعـراج
هـەیوولا و سـوورەت لاوە لـەم نـاوێ
بۆ ئیسباتی جوزء زەحمەت کـێش تـاوێ
جـەوازی هەیـە خـەرق و ئیلتیـام
چونکـە تەماسـول هەیـە بـۆ ئەجسـام
(مـا یمکـن لِـذا یمکـن للأخیـر
والله علـی الممکـنِ قـدیر)

خیداج: هەر شتێکی ناتەواو، بەچکەوشتری نابەکام کە بە ناتەواوی لە دایک بـوو بێـت. بێرانـە: بهێنە. لاوە. لابە. لەم ناوێ: لەم ناوە.

واتە: فەیلەسووفەکان لایان وایە جیسم بریتییە لـە هـەیوولا و سـوورەت[هـەیوولا بریتییـە لـە ماددەی جەوهەر و، سوورەت شێوەکەیەتی] ئـەم دوو بەشـە پێکـەوەن و لـە یـەک جیـا نابنـەوە، هەیوولای جیهان قەدیمە و نەبوونی لێ پێش نەکەوتووە، سوورەتی قەدیمن و، لەوانە نییە خـەرق و ئیلتیام، واتە دڕان و دووبارە پێکەوە لکان رووی‌تـێ بکـات؛ کـەوابێت سـەرکەوتنی ئـادەمزاد بـە

ئاسماندا و دڕانی ئاسمان لە کاتی لێ تێپەڕبوونیدا و پێکەوە لکانی دڕاوەکە دوای بەجێهێشتنی مەحاڵە، ئەنجام میعراج مەحاڵە.

بەڵام زانا پایەبەرزەکانی ئیسلام دەفەرموون: هیچ بەشێک لە جیهان قەدیم نییە و، خودای گەورە هەموویانی لەپاش نەبوون دروست کردووە، جیسمیش تێکەڵە لە وردە جەوهەری بەش‌نەکراو، واتە وردە پارچەی وەها کە بە هیچ بارێک کەڵکی بەش‌کردنیان پێوە نییە، نە لە راستی و بەرچاودا لەوانەیە بەش بکرێن و نە بە عەقڵدا دێت بەش بکرێن، ئەم پارچانە هەموو وەک یەکن، کەواتە جیسمەکانیشیان هەموو وەک یەکن، جا هەر وەکوو دڕان و پێکەوە لکانەوە بۆ زەوی و ئاو و هەوا هەیە بۆ ئاسمانیش هەیە، کەواتە میعراج شتێکی مومکینە و کارێکی ئاسانە و خودا ئەتوانێ بێکات وەک هەموو مومکینێکی تر.

جا مەولەوی دەفەرموێ: شەق هەڵدە لە بیروباوەڕی کاڵ و ناکام و ناتەواوی فەلسەفە و، باسی هەیوولا و سوورەت لابە لەم ناوە و، کەمێ زەحمەت بکێشە بۆ ئیسپاتکردنی (جزء)ی (لا یتجزا) واتە وردە پارچەی هەرگیز بەش‌نەکراو، هەتا تێبگەی کە هەموو جیسمەکان وەک یەکن و، مومکینە بدڕێن و جارێکی تر بلکێنەوە بە یەکەوە، خودایش دەستی بەسەر هەموو مومکینێکدا ئەڕوات.

بێجگە لەمانە زانا بەرزەکان فەرموویانە لێرەدا ئەوە موهیم نییە جیسم پێک هاتبێ لە هەیوولا و سوورەت، یا لە وردە پارچەی بەش‌نەکراو، ئەوە موهیمە قودرەت و ئیختیاری خودای گەورە ئیسپات بکرێت، بێ‌گومان ئەوەیش بە بەڵگەی کارێگەر و گومان‌لابەر سابت بووە و سەلمێنراوە کە خودا دەستی بەسەر هەموو مومکینێکدا دەڕوات، میعراجیش یەکێکە لەو مومکینە سادانە، ئەوەتا ئەمڕۆ ئەبینین مرۆڤ بە هێزی زانیاری و پێشکەوتن دەریا و ئاسمان و هەوا دەبڕێت و ئەم گەشتانەی لا ئاسانە و شتێکی عادەتین.

(ما کان ما بی یکفی بحمده؛
سُبحانَ الَّذی أسری بعبده)
زاهیری «أسری بعبدِه» دەکات
میعراج (بالیقظة) و (بالشخص)ی ئیسبات
نەک بە خەو یا خێر (بالروحِ فقط)
ئەوە زەعمێکە بێ‌مەزە و سەقەت

چلـۆن، ئـەر بـە رۆح یـا مـەنام دەبـووَ؟
باعیســـی ئینکـــار بــۆ عــەوام دەبـــوو
تــەحریرێ کــەوا شــیرین بــێ و (أحــق)
(بــــین الأحادیــــث بــــذا یوفّــــق)
موکــەڕڕەڕ بووگــە میعــراج[٦] و فتــووح
(مــــرّةً بالشـــخص کــــرّةً بـــالروح
لــیلاً) ؛ شــەو خەڵــوەت بــەینی یارانــە
جێـــی راز و نیـــاز دەردەدارانـــــە
فرســەت غەنیمــەت، مــاڵ بــێئــەغیارە
عالـــەم نووســــتگ، دۆس خەبــــەردارە
نەک رۆژ (ظـلّ) بـەم لا، یـا بـەولادا وێ
یـا ژێـر پـێ لـە وەخـت ئیسـتیوادا وێ
وەک مەولید شەو بوو عورووجی یـەقین
(صـــار رحمـــةً علـــی العـــالمین)
بـــۆ ژێــرزەمین و ئـــەفلاکی بـــەرین
ســوللەی ئــەووەلین، ســوللەی ئـاخیرین
مـــن المســـجد الحـــرام الأنفـــس
الـــی المســـجد الأقصـــی المقــدّس
تــا ئــەگرە قــەتعی و نەســی کیتابــە
ئینکـــاری کـــوفرە دائـــیم عەزابـــە
(منـــهُ للســـما و منـــــهُ الـــــی
ماشـــاءالله مـــن حِلـــی العُلـــی)
ســابت بــە خەبــەر مەشــهوورە و ئاحــاد
ترتیبـــاً ئینکـــار بیدعەتـــە و فەســـاد

لادە لــە ڕێگــەی بیدعــەت و مونکــەر
بێرە ســەیری ســەیر ســەییدی ســەروەر

بێمەزە: بێتام. سەقەت: بێکەڵک، پەککەوتوو. بەرین: گەورە و گوشاد. ئەگرە: ئێرە. سەیری: تەماشاکردنی. سەیر: ڕۆیشتن.

واتە: ئەو هێز و وزەی من هەمە بەشی ستایشی خودا گەورە ناکات، هەر ئەوەندەم لێ دێت بڵێم: پاکی و بێخەوشی بۆ ئەو خودایە کە شەوڕەویی بە بەندەی خۆی کرد، کە موحەممەدە، لە مەسجیدی حەرامەوە تا مەسجیدی ئەقسا و، بەو ماوە کەمە ئەو ماوە زۆرەی پێ بڕی.

ئەنجا مەولەوی دەفەرموێت: ڕستەی «... أسری بعبده...» بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم شەوڕەوییەی بە شەخسی پێغەمبەر کراوە بە لەش و گیان بووە، نەک بە خەوبینین یا خۆ هەر تەنها بە (ڕۆح) گیان؛ چونکە وشەی «اسری» بەستراوە بە وشەی (عبد) ەوە، واتای (عبد) یش لەش و گیانە، مەعنالێدانەوەی «اسری بعبده» بەوەی کە هەر بە ڕۆح بووە و لەشی پێغەمبەر لە مەککە بووە، یا خۆ پێغەمبەر لە خەودا ئەم کەین و بەینەی دیوە و بە ئاشکرا نەبووە گومانێکی بێتام و بۆچوونێکی بێکەڵکە، ئەگەر تەنها بە ڕۆح بوایە یا خەوبینین بوایە تەنانەت هەڕەمە خەڵکەکەیش ئینکاریان نەدەکرد؛ چونکە بەرزبوونەوە و نزیکبوونەوەی (ڕۆحی) بۆ زۆر مرۆی چاک و خاوێن خوداناس هەڵدەکەوێت، هەروەها خەوبینینیش ئەوەندە موهیم نییە کە ببێتە هۆی ناکۆکی و گێرەو کێشە.

هەروەها ئەو ڕیوایەتانە ئەکرێنە بەڵگە لە سەر ئەوەی کە شەوڕەوی و بەرزبوونەوەی حەزرەت تەنها ڕۆحی بووە بەرامبەر بە نەسی ئایەتی پیرۆزی (سُبحانَ الَّذی أسری بِعَبدِهِ لَیلاً... الآیة) خۆیان ناگرن. بەڵێ هەندێ لە زاناکان فەرموویانە: لەبەر ئەوەی نەسی ئایەتی (سُبحانَ الَّذی أسری بِعَبدِهِ لَیلاً... الآیة) هەیە، کە دەلالەت لە شەوڕەوی و بەرزبوونەوەی لەش و گیان دەکات، لەگەڵ ئەمەیش گەلێ ڕیوایەت هەن دەلالەت لە شەوڕەوی تەنها بە گیان دەکەن، جا بۆ یەکخستنی ئایەت و حەدیسەکان و بۆ ئەوەی ناکۆکی لە نێوانیاندا نەمێنێت باشتر ئەوەیە بڵێین: ئەم ئیسرا و میعراجە چەند جارێ ڕووی‌داوە؛ جاری‌وا بووە بە ڕۆح و لەش، جاری وەهایش بووە تەنها بە ڕۆح.

ئەنجا مەولەوی بە شێوەیەکی شاعیرانە و گیانێکی سۆفییانە باسی ئەوە دەکات کە ئەم ڕووداوە گەورەیە لە شەودا بووە چونکە شەو کاتی ئارامی و کاتی بەیەکگەیشتنی یارانە لە شوێنی چۆڵ و

تایبەتیدا، شەو کاتی دەربڕینی راز و نیازە، کاتی هەڵڕشتنی دەردی دڵی بریندارانە، شەو هەڵە و کاتی نالینە، خەڵک هەموو نووستوون و دۆست بە تاقی تەنیا بە خەبەرە و دلدار بە شێنەیی دەتوانێ رازی نیهانی دەربڕێ. شەو بۆ ئەم بەیەک‌گەیشتنە باشە نەک رۆژ کە سێبەری پێغەمبەر بەهۆی تیشکی خۆرەوە یا لەملا و لەولایەوە دەردەکەوێت یا لە کاتی ئیستیوادا دەکەوێتە ژێر پێیەوە و بەهۆی ئەم سێبەرەوە دەردەکەوێت، مەبەس ئەوەیە ئەم بەرزبوونەوە و بەیەک‌گەیشتنە تا پەنهان و نادیارتر بێت چاکترە.

بەڵێ حەزرەت(د.خ) لە شەودا لە دایک بوو، ئیسرا و میعراجەکەیشی هەر لە شەوا بوو، گەیشت بە پایەیێکی بەرز و بوو بە رەحمەت و خۆشی و سەرفرازی بۆ هەموو جیهان، بۆ خەڵکی زەوی، بۆ خەڵکی ئاسمان، بۆ خەڵکی پێشوو، بۆ بەرەی داهاتوو.

هەروەها مەولەوی دەفەرموێ:

شەوڕەویی پێغەمبەر(د.خ) لە مەسجیدی حەرامەوە بۆ مەسجیدی ئەقسا (نص)ی قورئانی پیرۆزە و ئینکار کردنی کوفرە و هۆی سزای دوارۆژە.

بەڵام بەرزبوونەوەی لە بەیتی موقەددەسەوە تا هەر حەوت ئاسمانەکان و لە ژووری ئاسمانەکانەوە تا سیدرەی مونتەها و لەوێوە تا ئەو شوێنەی ئەمر کرا بە راوەستان و کردنەوەی ماوەی گفتوگۆ و راز و نیاز و سکالا لە خزمەتی خودای گەورەدا ئەمە بە حەدیسی مەشهوور و حەدیسی ئاحاد سابت بووە و ئینکارەکەی ئەگەرچی کوفر نییە؛ بەڵام بیدعەتە و فەسادە و لادانە لە راستەڕێی ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

بـارەی ناسـووتی لـە مەیـدان ئـاورد
حەی کرد و نەی کرد، پەی کرد و تەی کرد
لـە گـەرمیی سـەمووم نزیکـی ئـەو رەوت
دای لـە جیبرەئیـل (لـو دنـوت) کـەوت
پێـی ناسـووتی سـووت، مەلـەکووتی مـات
(هـاتِ الکـؤوس)ی[٧] لاهـووت ئـەلای هـات
هەرچەنـد کـە قـەدەم قوربـەتی دەنـا
لـەو: نـەوای «أدنُ»، لـەم: «ثـمّ دنـی

فَتَــدلّی» تــا لاچــــوو پـــێ و قـــەدەم
حــودووس بــە ئــەدەب هاتــە پێــی قیــدەم
(فکــــان قـــابَ قوســــین(۸) أوأدنـــــی)
مابـــەینی ئیمکـــان وجـــووبی ئەســـنا
«فـــأوحی الـــی عبـــدِه مـــا أوحـــی
و فـــاحَ مـــا فـــاح علیـــهِ فوحـــا»
فەلــەک پــڕ مەلــەک، ســیدرە غــەوغا بــوو
«مـــازاغ البَصَـــر»، «وَ مَـــا طَغـــی» بـــوو
ویســـــعەتی مەشـــــرەب ناموتـــــەناهی
هـــیچ لـــە ئاگـــاهی نەیـــدەکرد لاهـــی

قەدەم قوربەتی دەنا: پێی نزیکیی دادەنا.

واتە: لە شەوی میعراجدا بەش و بەهرەی (ناسووت) ئینسانییەتی هێنایە مەیـدان و، حـەزرەت لەو هێزە ئینسانییەی خوڕی بۆ سەرکەوتن، بەڵام ئەو هێزە نەیتوانی و نەیکرد، جا حـەزرەت ئـەو هێزەی پەی کرد، واتـە دەسـت و پێـی بڕیـەوە و رووی کـردە هێـزی رۆحـی و مـاوەی ژووری ئاسمانەکانی (طیّ) کرد، واتە بـڕی، بـە کـورتی سـەرکەوتنی حـەزرەت لـەو شـەوەدا بـە هێـزی ئینسانیی ماددی نەبوو، بەڵکو بە هێزی رۆحانییەت بوو.

جا پاش ئەوە کە تا (سدرة المنتهی) لەگەڵ جیبرەئیلدا رۆیشتن، گەرمای سۆزندەی نزیکی لـە پایە و بارەگای خودایی دای لە جیبرەئیل و، رستەی «لو دنوتُ قدر أنملة لاحترقت»ی وت و خپ کەوت و کەلکی رۆیشتنی پێوە نەما، بەم جۆرە پێی ئادەمزاد سووتا و بەرگەی نەگرت، هێزی سەر بە جیهانی مەلەکووت، کە جیبرەئیلە ئەویش مات و بێدەنگ بوو، لەم کاتی نزیکییەدا، لەم حاڵـی تەنیاییەدا دەنگی (هاتِ الکـۆوس) لـە بارەگـای خوداییـەوە هاتـە گـوێی حـەزرەت، دیـارە کـاتی وەرگرتن و خواردنەوەی شەرابی حەقیقەت و نزیکـی لـە خودایـە، هـەر چەنـد پێغەمبـەر نزیـک دەبوویەوە لە لایەن خوداوە دەنگی (نزیک بەرەوە) دەهـات، ئـەمیش هـەر نزیـک دەبوویـەوە لـە پایەی موناجات و لەخوداپاڕانەوە، تا گەیشتە رادەیەک پێوپلی (حادث) نەما، حادیسییەت زۆر بـە ئەدەبەوە کەوت بە سەر پێی قـەدیمیدا و سـەری گـەورەیی بـۆ دانەوانـد و کوڕنووشـی بـۆ بـرد، پێغەمبەر(د.خ) ئەوەندە نزیک بوویەوە مابەینی مومکین، کە پێغەمبەرە و، واجب، کە خودایـە، بـە

قەدەر مابەینی ناوەڕاستی ژێی کەوان و دوو سەری کەوانەکە بوو ـ دیارە ئەمە کینایەیە لە پایــەی پێغەمبەر لای خودای گەورە و، مەبەست نزیکیی ماددی نییە، ئەگینا مومکین لە کوێ و واجب لە کوێ؟

بەڵێ ئا لەم کاتی نزیکییەدا لەم پایەو پلە تایبەتییەدا خودای گەورە ئەوەی شایانی گــەورەیی و میهرەبانیی خۆی بێت و ئەوەی شایانی پێغەمبەری خۆشەویستی بێــت بــە وەحــی پێــیگەیانــد و تێیگەیاند.

دەڵێن ئەوەی لەو شەوەدا پێغەمبەر(د.خ) بە وەحی وەریگرتووە سێ جۆر بووە:

یەکەم: هەموو زانایەک تێیگەیشتووە وەکو پێنج فەرزەی نوێژ کە لەو شەوەدا لەسەر حەزرەت و ئوممەتەکەی فەرزکرا.

دووەم: حەزرەت و زانایان و (خواص)ی ئوممەتەکەی تێیگەیشتوون نەک هەرەمــەی خەڵــک، وەکوو ئەسراری رۆحی و مەعنەوی.

سێهەم: هەر پێغەمبەر(د.خ) توانای تێگەیشتن و راگرتنی بــووە، وەک ئــەو پەنامەکییانــەی بــۆ بڵاوکردنەوە ناشێن لە ناو خەڵکدا.

هەر لەبەر ئەمەیــە ئایەتەکــە دەفــەرموێ (فَــأوحي لــي عبــده مــا أوحــي) و کەلیمــەی (مــا)ی مەوسوولەی بەکار هێناوە کە واتاکەی شتێکی دیاری نییە و زۆر شت دەگرێتەوە.

لەو موناجات و خەڵوەتەدا (فاح عليه ما فاح فوحا) واتە بــۆن و بەرامــەی دۆســتایەتی و لوتــف و نەوازشی خودایی بەسەر دڵ و دەروون و سینە و (لطائف)ی حــەزرەتی (خــاتمالأنبیــا)دا هــات بــە جۆرێ کە بە دەم ناوترێت.

[بۆ ئاگاداری]:

زانایانی تەفسیر لە باسی ئیسرا و میعراجدا هەر ئایەتی (سُبحانَ الَّذي أسری بِعَبدِهِ لَیلاً... الآیــةِ) یان گرتووە بە دەستەوە و دەوروبەری ئەم بابەتەیان بە فەرموودەی پێغەمبەر تــەواو کــردووە، لــە ریوایەتی بوخاری و موسلیم و زانایانی تری حەدیس. ئیتر واتای ئایەتەکانی سوورەتی (النجم) یان بردووەتەوە سەر حەزرەت(د.خ) و حەزرەتی جیبرەئیل، چونکە مەعنا دیارەکەی «ثمَّ دنی فتدلّی» و [فكان قابَ قوسين] شتی سەر بە مادە و جیسمە و بۆ زاتی خودای گەورە ناشێت. بەڵێ هەندێ لە (مفسّر) ەکان و لە زانایانی خاوەن (سفا) فەرموویانە ئەم ئایەتانە چۆنیەتیی رووداوەکانی شــەوی

میعراج دەرئەبڕن و شتی بەعەقڵاچوویان لە شوێن شتی بەچاوبینراو داناوە؛ بۆیە ئەم شتە سەر بە ئەو مادده و جسمانە باس کراون، منیش لەسەر فەرمووده و بۆچوونی ئەوان ڕۆیشتم.

هەروەها مەولەوی لە پیاهەڵدانی حەزرەتدا باسی ئەوەش دەکات و دەفەرموێ:

ئاسمانەکان پڕ بوون لە فریشتە و (سدرة المنتهی) جمەی دەهات و دەنگی حەمـد و ستایشـی خودای گەورە گوێداری کەڕ دەکرد، بەڵام حـەزرەتی پێغەمبـەر چونکـە نـوقمی دەریـای نـووری خودایی بوو هەرگیز گوێی نەدەدایە ئەو هەرا و قەرەباڵغە و ئەو ڕووداوە سـەیرانە، چـاوی ئـەملا و ئەولای نەدەکرد و لە حاڵی تەبیعی لای‌نەدەدا و بە بینینی ئەو شتانە پڕ نەدەبوو بە جۆرێـک ئیتـر شتی تر نەبینێ، نەبڕاوەیی و زۆریی بەهرە و تەجەللیاتی نووری خودایی وای لێ نـەدەکرد ئاگـای لە هیچ نەمێنێ، واتە: هەم نوقمی دەریای نـەوازش و نـووری خـودایی بـوو، هـەم دڵ و دەروونی ئاگادار و وریا بوو، بە لەسەرخۆیی مایەوە، دروودی خودا لەسەر خۆی و ئال و بەیت و هاوڕێیانی.

ئومووری قودسی لـە دڵ دەدەن سـەر
(ثـــم تنتقـــل منـــه للبصـــر
بـــل لســـائر الحـــسّ والقِـــوی
بـــل لِعـــالَم الخلـــق والسَّـــوِی)
بە هەر وەجهێ دڵ عیرفانی پێـی بـوو
بـەو ڕوو بـۆ بەسـەر ڕوئیـەتی دای‌ڕوو
بەسـیرەت ناسـی، بەسـارەت بـینی
دڵ بـێنی درۆی نـەدا لـە بـینی

بـەو ڕوو: بـەوجۆرە. دای‌ڕوو: ڕووی‌دا، هاتـەجێ، بەسـیرەت: بینـینی دڵ و تێگەیشـتنی دڵ. بەسارەت: بینینی چاو. بینی: چاوی‌پێ‌کەوت. بێنی: بۆتی. بینی(ی دووەم): لووت کـە ئەنـدامی بۆن‌کردنە.

زانایانی ئیسلام سەبارەت بە چاوکەوتنی پێغەمبەر(د.خ) بە زاتی خودای گەورە (جلّ جلاله) لـە شەوی میعراجدا دوو قسەیان هەیە:

یەکەم: کەلامی خودای گەورەی بیستووە بەڵام زاتی خودای نەبینیوە.

دووەم: وەک کەلامەکەی بیستووە زاتەکەیشی چاوپێ‌کەوتووە، بەڵام چۆنیـەتیی ئـەو چاوپـێ-کەوتنە بۆ ئێمە باس ناکرێت و لە وزەی ئێمە بەدەرە.

جا مەولەوی دەفەرموێ: کاروباری قودسی. واتە: ئەو حاڵـەی پێوەنـدی بـە غەیبـەوە هـەبێ و ئینسان تیایا بەشدار بێت، یەکەم جار دەچێتە دڵـەوە و، لـەوێوە سـەرهەڵدەدات، پاشـان لـەوێوە دەچێت بۆ چاو و ئەندامەکانی تری هەست، بۆیە بە هەر جـۆرێ کـە دڵـی حـەزرەت لـە شـەوی میعراجدا خودای گەورەی ناسی چاویشی هەر بەوجۆرە خودای بینی، واتە یەکەم جار بەسـیرەتی دڵی حەزرەت(د.خ) خودای ناسی و، دووەم جار بینایی چـاو زاتی خـودای گـەورەی بـینی، ئیتـر هەرگیز دڵ چاوی حەزرەتی نەخستەوە بە درۆوە، نەیوت نەتدیوە، بەڵکو بـاوەڕێ پـێ کـرد و وتی ڕاست دەکەیت؛ چونکە دڵ و چاو و حەواسەکانی تر بە جارێک باوەڕ بە ڕاستی دەکەن.

ڕێـی چەنـد هـەزار سـاڵ، تـەی چەنـد حیجابـات،
زاتی حـــەق، کـــەلام، ســـوئاڵ، جـــەوابات
چـــوو، بـــوو، دیـــی، بیســـتی، کریـــا، دریـــاوە.
هاتـــــەوەو حەڵـــــقە هـــــەر دەڵـــــەریاوە
هەی تەڵ! هەی تێیگەی؟! پێیگەی؟! هەی نەیخۆی!
وەک مـــاری زامـــدار هـــەر پـــێچدا لـــە خـــۆی!
فـــەرقیان، هـــەی فـــام ئـــەبنای زەمانـــە!
هـــەر لـــە ســـەرزەمین تـــا ئاسمانـــە
شۆڵـــەی ئـــەو بـــەدرە لـــەو دەورە ئەوشـــەو
شـــەونم لـــەو هـــەورە بـــەو تـــەورە ئەوشـــەو
دای وە دەشـــــتی دڵ گشـــــت ئەســـــفیادا
وەشـــت وە کشـــتی ســـیر گشـــت ئـــەولیادا
«أشـــــرقَتِ الأرض...» تـــــەئویل دریـــــاوە
«مـــــاءة حبّـــــةٍ...» تەفســـــیر کریـــــاوە
پـــەردەی زوڵـــمانیی نەفســـانی لاچـــوو
تـــۆمی وەردی عـــیلم عیرفـــان ســـەرئاو بـــوو
خەنـــدەی غونچـــەی کەشـــف کـــەونی و ئیلاهـــی
ســـــەوزەی کـــــەرامات ناموتـــــەناهی

هـــەر یـــەک بـــە تـــەرزێ خـــۆی نومـــایش دا
باغچـــــەی ئـــــەولیای پـــــێ ئـــــارایش دا

لە دوو شیعری یەکەم و دووەمدا لەف و نەشری مورەتتـەب هەیـە، واتـە: حـەزرەت(د.خ) لـە شەوی میعراجدا رێی چەند هەزار ساڵ (چوو)، چەنـد حیجابـات تـەی (بـوو)، زاتی حـەقی (دی)، کەلامی خودا (بیستی): کەلامی خودای بیسـت. سـوئال لەلایـەن خـوداوە لـە حـەزرەت (کـرا)، جەوابات لە لایەن حەزرەتەوە (دریاوە)، پاش ئەمانە حەزرەت(د.خ) لە ژووری عەرشەوە هاتەوە بـۆ شاری مەککە و هێشتا ئەڵقەی زنجیری دەرگایماڵی (أمّ هانیء)ی پووری، کە لەوێوە ڕۆیشـتبوو، هەر دەلەرییەوە.

واتە: لەو ماوە کەمەدا ئەو هەموو شتە زۆرانە روویاندا، دیارە کاری وەها لـە عـادەت بـەدەرە و، ئەگەر هێزی خودایی لە پشتەوە نەبێت لە وزەی ئادەمزاددا نییە، بگرە مرۆڤ ناتوانێ بیریشـی لـێ بکاتەوە.

پاش بەیانی رووداوی شەوی میعراج بانگ لـە تـەلی تـەلگراف دەکـات و دەڵـێت: هـەی تـەل نەخەڵەتابیت وابزانیت دەتوانیت وەک ئەوەی شەوی میعراج دەنگ‌وباس وەربگـری و بیـدەی، نـە تێیدەگەیت و نە پێیدەگەیت، هەی لەززەت و خۆشیی ئەو پایە و مایەیە نەخۆی، تـۆ لـە کـوێ و ئەو لە کوێ؟! دە لێیگەڕێن با ئەو تەلە وەک ماری زامدار پێچ لە خۆی بدا و بـە دەردی خۆیـەوە بتلێتەوە.[لەوانەیە مەولەوی تەلەفوونی دیبێ کە لاستیکەکەی پێچاوپێچە].

ئەنجا روو دەکاتە هاوچەرخانی خۆی و دەڵێت: ئەی کوڕانی رۆژ، ئەی خـاوەن فامـان! فـەرقی مابەینی چوون و هاتنەوەی شەوی میعراج لەگەڵ گەیشتنی دەنگ‌وباس و قسە بە تـەلگراف وەک فەرقی مابەینی عەرز و ئاسمانە.

هەروەها (مەولەوی) دەفەرموێ:

پڕتەوی مانگی چواردەی روخساری پێغەمبەر(د.خ) لەو خول و هات‌وچۆی شـەوی میعراجـەدا دای لە دەشت و سارای دڵی هەموو پیاوچاکـان و خوداناسـان، شـەونمی کـەرەم و بەخشـندەیی خودا لە هەوری رەحمەتی ئاسمانی ئەوشەوە پیرۆزەوە بەسەر کشت‌وکاڵـی دڵ و دەروونی گشـت دۆستانی خودادا باری.

بە هۆی پڕتەوی نووری حەزرەتەوە، کە لە نـووری تەجـەللیاتی خوداییـیەوە جیهـان و ئـەرز و ئاسمانی رووناک کردەوە، واتای ئایەتی پـیرۆزی «و أشـرقت الأرض بنـور ربّهـا» دەرکـەوت، واتـە

رووناکبوونەوەی گۆی زەوی بە نووری خودای گەورە لە رۆژی قیامەتـدا وەک روونـاکبوونـەوەی زەوییە لە شەوی میعراجدا.

هەروەها لە لێشاوی رەحمەتی خودا بەسەر جیهاندا لـە شـەوی میعراجـدا، کـە لـە حیسـاب و ژماردن نەدەهات، واتای ئایەتی پیرۆزی [مثل الذين ينفقـون أمـوالهم فـي سـبيل الله كمثـل حبـة أنبتت سبع سنابل في كلّ سنبلة مائة حبة...][٩] دەرکەوت.

پەردەی تـاریکی لەسـەر نەفسـی ئینسـانی بـەختیار لاچـوو، تـۆوی زەوییـەوەردی زانسـت و خوداناسین تێراو بوو، یەکەم لە پرتەوی مانگی چواردەی روخساری نازاری پێغەمبـەر و دووەم لـە شەونمی هەوری رەحمەتی شەوی میعراج.

لە ئەنجامدا خەندە و کرانەوەی غونچەی کوشووفاتی خودایی و پـێوتـنی شـتە پەنهانـەکان و سەوزەی جوانی کەرامەتی نەبڕاوەی خوداناسـان هەریـەک بـە جـۆرێ ئارایشـی خـۆی دەکـرد و باغچەی دۆستانی خودای گەورەی رازاندبۆوە.

شایانی ئاگادارییە لە نێوان بەیتی «شـۆلەی ئـەو...» تـاد... و چـوار بـەیتی پاشـەوەیدا (لـفّ) و(نشر)ی (مرتّب) هەیە، واتە: نیوەی یەکەمی هەریەک لەو چوار بەیتە سەر بـە نیـوەی یەکـەمی بەیتی «شۆلەی ئەو...» و، نیوەی دووەمیان سەر بە نیوەی دووەمیەتی، مەسەلەکە تەنها کـەمێک لێ وردبوونەوەی دەوێت.

***

١ـ لە دەستنووسەکەدا ئەم سەرباسە نییە. لە چاپەکەدا تەنها (مبحث المعراج)ە و لە دوای (فەلەک...) دانـراوە. ئەگەر بووبێ ئەمەی ئێرە شوێنیەتی.

٢ـ لە دەستنووسـەکەدا (دقیقی= دەقیقی) یە، لە چاپەکـەدا (دقیقـەء = دەقیقـەیێ) یـە. شـێوەی دەسـتنووکە راستە، دەقیق واتە ئارد، ئیزافەی دەقیق ئەلای پەردە ئیزافەی لامییەیە یا سیفەت و مەوسووفن. پوختەی قسە: خوا تۆزی پەردەی لابرد لە چاوی ئاسمان و ئەمیش سورمەی تۆزی پێی پێغەمبـەری هێنـا بـە چاویـا کـە بـۆ میعـراج سەرکەوت. دەقیق بەرامبەری سورمەیە.

٣ـ «لە حیکمەت... تاد»: یەکێک لە حیکمەتەکانی میعراجی پێغەمبەر ئەوە بوو...

٤ـ سوورەتی (اسراء) ئایەتی یەکەم.

٥ـ حەزرەتی خەدیجەی حەرەمی و (ابوطالب)ی مامی دە ساڵ پاش بوونی بە پێغەمبەر، واتە بە دوو ساڵ پێش کۆچکردنی بۆ مەدینەی مونەووەرە وەفاتیان کرد.

٦ـ لە دەستنووسەکەدا لەسەر جیمی میعراج (بۆر) و لە ژێریدا (ژێر) هەیە، واتـە دەتـوانی بـە (میعـراج و) و بـە (میعراجی) بخوێنیتەوە؛ بەلام لە چاپەکەدا تەنها (معراج و) نووسراوە.

٧ـ لە نوسخە دەستنووسەکەدا کەسرە لە ژێر (س)ی (الکؤوس)دا دانراوە، لە نوسـخە چاپەکـەدا ئـەم کەسـرەیە نییە.

٨ـ لە نوسخە دەستنووسـەکەدا لەسەر نوونی (قوسین) فەتحە دانراوە، مەبەسـتی ئەوەیە بەم جۆرە بخوێنرێتـەوە (قەوسەینەوەدنا).

٩ـ ئایەتی (٢٦١) سوورەتی (بقرە).

## مَبحَثُ الكَرامات [1]

مــوعجیزەی نــەبی ئــەر موحەققەقــە
لــە کــات کــەرامات ئــەولیایچ حەقــە
وەلی شەخســـێکە (عـــارفٌ بـــاللە)
(مـا أمكـن) بـە زات بـە سـیفات ئاگاهــ
بیکێشـی بـە سـەنگ هـەر سـێ تـەقوادا
بــە تــرازووی شــەرع موویــێ لانــادا
موازیـــب لەســـەر ئـــەدای تاعاتـــە
ســاحیب ئــەجتیناب لــە شــەناعاتە
کەرامــەت ئــەمرێس خــاریقی عــادەت
زاهـیر بـێ لـەو، بـێ دەعـوای نوبـووەت
بــۆ حەقییــەتی[2] تەشــکیکت نــەوێ
ئەگــەر هــەر دەڵــێی: دەلــیلم تــەوێ
(قُـــم الـــی التـــی تواتَرتـــو قَـــم
عـــن کثیـــر الصـــحب وَ مَـــن بعـــدهم)
بە وەجهێ کە بێی ئەر گوێی پـێ بـدەی
مومکینـــت نـــاوێ ئینکـــاری بکـــەی
ئەمری موشتەرەک خوسووس لە یـاد وێ
تەفاسـیل بـۆ خـۆی بـا هـەر ئاحـاد وێ

(علـــــی أنّــــــه إن ســــــمعت الحـــــق
بظهــــــور مـــــــا الكتـــــــابُ نطـــــق)
لـــه دوای ســـبووتی وقـــووع و عـــەیان
چ حاجــەت بـــەیان ئیســـباتی ئیمکـــان؟

ئە: ئەگەر. ئەولیایچ: ئەولیایش. ئەمرێس: ئەمرێکە. نەوی: نەبێ. تەوێ: دەوێ. ناوێ: نابێ.

واتە: ئەگەر (معجزە)ی پێغەمبەرانت(د.خ) لاراستە و بـاوەڕت پێیـەتی (کرامـات)ی دۆسـتانی خودایش هەروا راستە.

وەلیی: کەسێکە، پیاو بێ یا ئافرەت، یا خۆ یەکێکە، ئادەمزاد یا جیننی کە خودا بناسـێت و بـە ئەندازەیەکی عادەتی زانا و ئاگادار بێ لە زات و سیفاتی خودای گەورە، ئەگەر بێیـت و بیروبـاوەڕ و رەفتار و گوفتاری لە ترازووی شەرعدا بەرامبەر بە سەنگی هەر سێ جۆری (تقـوی) لەخوداترسـی بکێشیت بە ئەندازەی موویەک لانەدات.

زانایانی ئایین و مەعنالێدەرەوەکانی قورئان فەرموویانە تەقوا سێ جۆرە:

یەکەم: خۆپاراستن لە کوفر، واتە لە هەر شتێکی پەنامەکی یا ئاشکرا کە ببێتە هۆی کـافربوونی خاوەنەکەی.

دووەم: خۆپاراستن لەو گوناهـ و تاوانانە کە ئینسان لە عەدالەتی شەرعی دوور دەخەنەوە.

سێهەم: خۆپاراستن لە پێوەندی بە هەر شتێکەوە کە ئینسان لە خودای گەورە دوور بخاتەوە.

پوختەی مەبەست: وەلی دەبێ موسوڵمان و عادیل و خوداویست بـێ و لەسـەر بـەجێهێنـانی واجبەکان و سوننەتەکان بەردەوام بێ و خۆی لە هەموو بـیر و بـاوەڕ و کردەوەیـەکی ناشـیرین و ناشایستە بپارێزێت.

کەرامەتیش کارێکە لەعادەتبەدەر لەو جۆرە موسوڵمانەوە دەردەکەوێت کە باسمان کرد، بـێ-ئەوەی ئیددیعای پێغەمبەرایەتی بکات.

کەرامەت شتێکی راستە و جێی گومان نییە، خۆ ئەگەر داوای دەلیلی شەرعی دەکەیت سەیری ئەو کەرامەتانە بکە کە لە یـارانی حـەزرەت و شـوێنکـەوتووانیان و خەڵـکی موسوڵـمانی تـرەوە گێڕراونەتەوە، کە ئەگەر گوێیان پێبدەی هەرگیز ناتوانی ئینکاریان بکەی، دیـارە ئـەو کەرامەتانـە کە لەوانەوە گێڕراونەتەوە هەرچەند یەکەیەکەیان ریوایەتی ئاحادە، بەڵام قەدەری موشـتەرەک لـە بەینیاندا (متواتر)ە و شتیش کە گەیشتە رادەی (تواتر) ئینکار ناکرێت.

بێجگە لەمانە، ئەگەر ئەتەوێ راستی ببیسی، قورئانی پیرۆز لە گەلێ سوورەتدا باسی کەرامـەتی کردووە، ئیتر پاش ئەوەی سـەلمێنرا کـە کەرامـەت (واقیـع) بـووە موحتـاجی ئـەوە نـین باسـی (ئیمکان)ی بکەین.

یەکێک لەو کەرامەتانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا باس کراون بەسەرهاتی (اصحاب الکهـف)ە کـە سێسەد و نۆ ساڵ لە ئەشکەوتەکەدا نووستن و بێدار نەبوونەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا لەشیان بە سـاغی مایەوە، کەچی ئەگەر نەخۆشێ مانگێک لە یەک شوێندا بکەوێ لەشی وای لێ دێ کە هێزی تێـدا نامێنێ یا بریندار دەبێت!

هەروەها یەکێکی تر لەو کەرامەتانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا باس کراون بەسەرهاتی حـەزرەتی مەریەمی دایکی حەزرەتی عیسایە، کە هەموو جار رۆزی و ژیواری لەلا بوو (کلّما دخل علیها زکریّا المحرابَ وَجَدَ عندها رزقاً قالَ یا مریم أنّی لکِ هذا قالت هو مـن عنـدالله إنَّ الله یـرزق مـن یشـاء بغیر حساب) [٣].

یا وەک ئەوە عیسای ساوا بانگی لە دایکی کرد: لقی دارخورماکە رابوەشێنێ تا خورمـای تـەڕ و تازەی بەسەردا داوەرێت (و هزّی الیـکِ بجـذع النخلـة تسـاقِط علیـک رطبـا جَنیّـا...) [٤] لەگـەڵ ئەوەیشدا حەزرەتی مریەم پێغەمبەر نەبووە، چونکە پێغەمبەر لە ژناندا نابێـت. ئەمـە ئیرهاسـە بـۆ عیسا و کەرامەتە بۆ مریەم.

یا وەک بەسەرهاتەکەی ئاسەفی کوڕی بەرخیا لە هێنان و حازرکردنی تەختی بلقەیسی شاژنی مەملەکەتی سەبەء لە ماوەی چاوبەیەکادانێکا لە سـەبەئەوە بـۆ قـودس. بـێ گومـان لەوکاتەیشـدا زانست ئەوەندە پێش کەوتوو نەبووە کە شتی وەهای پـێ جـێ بـەجێ بکرێـت، ئەگـەر وابوایـە لـە مێژوودا باس ئەکرا... (قال الذی عنده علم من الکتاب أنا آتیک به قبل ان یرتدَّ الیک طرفک فلمـا رآه مستقِراً عنده قال هذا من فضل ربی لیبلونی أأشکر أم أکفر و من شکر فانمـا یشـکُر لِنفسِـهِ و من کفرَ فإنّ ربّی غنیٌّ کریم) [٥]. ئەم کارە گەورەیە بـۆ حـەزرەتی (سـولەیمان موعجیزەیـە و بـۆ ئاسەف کەرامەتە).

***

١ـ ئەم سەرباسە لە دەستنووسەکەدا نییە، تەنها لە چاپەکەدا هەیە.

٢ـ لە نوسخە چاپەکەدا نووسراوە (حقیقەتی= حەقیقەتی).

٣ـ ئایەتی (٣٧) سوورەتی (آل‌عمران).

٤ـ ئایەتی (٢٥) سوورەتی (مریم).

٥ـ ئایەتی (٤٠) سوورەتی (نمل).

## مبحث الخوارق [1]

خـــەواریق شەشـــن، تەعـــدادی بکـــەم
ئیرهـــاس، مـــوعجیزە، کەرامـــەت سـێیەم
مەعوونـــە چـــارەم، ئیهانـــە پەنجـــەم
ئیســـتیدراج ماگـــە ئەویچـــە شەشـــەم
بەحســـی ئەقســـامان گشـــت مەلالەتـــە
مەتڵـــەب مـــوعجیزە یـــا کەرامەتـــە
شـــەرحی ماهییـــەت کریـــا بـــۆ هـــەردوو
لـــە بـــەعزێ ئـــەفراد کەرامـــەت بـــدوو
وەک تـــەیکـــردنی مەســـافەی تـــەویل
لـــــە زەمـــــانێکی کۆتـــــادا و قـــــەلیل
زوهـــووری لیبـــاس تـــەعام و شـــەراب
وەخـــتی زروورەت حاجـــەت بـــە ئەســـباب
(طیـــران فـــی الهـــوا و مشـــی فـــی المـــا)
هـــەر وەکـــو کـــەلام جـــەماد و عـــەجما[2]
وەک زیکری قەلبی بـەل ئـەجزائی گشت،
بـــەل ماســـیوائی عالـــەم دەور و پشـــت
بـــە لـــەفزی فەســـیح ســـەریح ئاشـــکار
بـــۆ ئـــەهلی ســـەفای (ســـلطان الأذكـــار)

له (مەدینــه) وه و جــێ لــه ســەر (مینبــەر)
جەیش له (نەهاوەند) روئیەت بــۆ (عومــەر)
ســـەمعی (ســـاریه) بـــۆ خیتـــابی ئـــەو
جـــەرەیانی (نیـــل) بـــه کیتـــابی ئـــەو
وەک شــوربی (خالیــد) ســەم وه بــێزەرەر
ئەمســـــالی ئەمـــــه نایێتـــــه دەفتـــــەر
شـــوهرەتی زوهـــوور کـــەرامات چووگـــه
نزیـــک بـــه زوهـــوور مـــوعجیزات بووگـــه
چـــه عەجـــەب ئینکـــار ئـــەهلی نەفســـانی
خۆی نەیبوو تۆیچی هەروەک خــۆی زانی؟!

ماگە: ماوە. کۆتادا: کورتدا. چووگە: چووە، رۆیشتووە. بووگە: بووە. تۆیچی: تۆیشی.

واتە: کارە لەعادەتبەدەرەکان شەشــن، بــا بیــانژمێرم بــۆت: ئیرهــاس، مــوعجیزە، کەرامــەت، مەعوونە، ئیهانە، ئیستیدراج.

وەکوو لەمەوپێش بۆم باس کردی (سیحر) کاری لەعادەتبــەدەر نییــه، چونکــه بــه خوێنــدن و فێربوون پەیدا دەبێت، هەروەها (ئیستیدراج) یش له هەموو ماددەیێکدا؛ بەر کاری لەعادەتبــەدەر ناکەوێت چونکه ئەگەر ئیستیدراج بەوە بێتەجێ که ئینسانێکی تاوانبــاری ناپــاک مــاڵ و ســامان و ئەولاد و جێگا و پایەی دەست بکەوێت، ئەوە هەموو ئەسبابێکی عادەتییــان هەیــه،... خــۆ ئەگــەر چاوبەست و شەعوەدە بێت ئەوا ئەویش هەر له ئەنجامی خــەریکبــوون و خوێنــدن و فێربوونــەوە پەیدا دەبێت وەک سیحر.

هەروەها مەعوونه بۆ موسوڵمانه پیاوچاکەکان و، ئیهانەیش بــۆ ناحــەزانی ئیســلامه و، پێویســت نییه بگەنه رادەی کاری لەعادەتبــەدەر، بــەلام (مەولــەوی) لەبــەر دوو شــت ئەمانــەی بــه کــاری لەعادەتبەدەر حسێب کردووە:

یەکەم: کەسێ نەزانێ ئەم سیحرە به کەسب و خوێنــدن پەیــدا دەبێــت، یــا ئــەم چاوبەســت و شەعوەزە به هەندێ شتی کەسبییەوە بەستراوە وائەزانێ ئەمانه کاری لەعادەتبەدەرن.

دووەم: بە شێوەی (تەغلیب) واتە مادام ئیرهاس و موعجیزە و کەرامەت کاری لەعادەتبەدەرن سـیحر و شـەعوەزەیش کـە سـیڕڕەکەیان دیـار نییـە بـە زۆر دەخرێتـە نێـو ریـزی کـاری لەعادەتبەدەرەوە.

جا مەولەوی ئەفەرمویت باسی ئەم هەموو بەشانە دەبێتە هۆی ماندووبوون لە بـەر ئـەوە تـەنها گویّ بە موعجیزە و کەرامەت ئەدەین، دیارە لەمەوپێش ماهییەتی ئەم دووانەیش لێکدراوەتەوە.

بەڵام پێش.ئەوەی بێینە سەر باسی نموونەکانی کەرامەت با هەندیّ باسی ئیرهاستان بۆ بکـەم: ئیرهاس ئەو کارە لەعادەتبەدەرەیە دەبێتە هۆی بناخەدانان بۆ پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەرێک، کـە لە پێش بوونی بە پێغەمبەر و هـاتنی وەحـی بـۆی روو بـدات، وەک سـێبەرکردنی هـەور بەسـەر حەزرەتدا پێش بوونی بە پێغەمبەر. ئەم ئیرهاسە بناخەدانانە بۆ پێغەمبەرایـەتیی ئـەو پێغەمبـەرە؛ چونکە هەر کەس لە سەرەتای تەمەنیەوە ئەو کارە گەورانەی بۆ روو بدات مەعنای ئەوەیە خـودای گەورە لە پاشەڕۆژدا پایەی بەرزی پیّ دەبەخشێت.

لێرەدا دەگەڕێینەوە سەر باسی نموونەکانی کەرامەت؛ یەکێک لەو نموونانـە بـڕینی مەسـافەی دووردرێژە لە ماوەیەکی کەم و کورتدا. یەکێک لەوانە پەیدابوونی بەرگ و پۆشاک و خواردەمەنی و ئاوە بۆ ئینسانی خودادۆست و چاککردار لە کاتی داماویدا، یا وەک فڕین بە هـەوادا و ڕۆیشـتن بەسەر ئاودا، یا وەک قسەکردنی دار و بەرد و گیانلەبەر لەگەڵ ئینساندا، بەڵیّ لەم بابەتانە نموونـە زۆرن و، لە کتێبە بەنرخەکاندا کە جێگای بڕوا و ئیعتیبارن باس کراون. بـیّگومـان ئـەم نموونانـە ئەگـەر یەکەیەکـەیان نەگەیشـتبێتە رادەی (تـواتر) تێکـڕایان و (قـەدەری موشـتەرەک) یـان گەیشتووەتە ئەوڕادەیە و دەبنە هـۆی بـاوەڕکردن و دڵـنیابوونی ئینسـانی موسوڵـمان، وەک ئـەو نموونانەی لە قورئانی پیرۆزدا پیشاندران.

یەکیّ تر لە جۆرەکانی کەرامەت زیکرکردنی دڵی ئینسانی موسوڵمانە، ئـەو موسوڵـمانەی کـە ئادابی رابەری کامیلی وەرگرتبێت. ئەم جۆرە کەسانە بەهۆی بەردەوامیی ناوبردن و یادی خـودا و پەیڕەویی حەزرەت(د.خ) دڵیان نوورانی دەبێت و فێری زیکری خوا دەبێت، بە جۆریّ کە خـاوەن دڵەکە زیکرەکەی ئەبیسێت، وایش دەبێت هەموو ئەندامی لەشـی زیکـر دەکـات، بەڵـکو جاروبـار دەگاتە حاڵەتێک ئەو کەسە لە هەر شوێنێکدا بێت شتە وشکە بیّگیانەکانی دەوروپشتیشی دوای- دەکەون و لەگەڵیدا زیکر دەکەن، وەکوو یەکێک کارەبا گرتبێتی ئەگەر کەسیّ دەستی لـیّ بـدات

ئەویش کارەبا دەیگرێت. ئەم زیکرە لەم پایەدا ناوی (سلطان الأذکار)ە و، هەرکەس نزیکی ئەمانە بێت ئیستیفادەی نوورانییەتیان لێ دەکات، مەگەر یەکێ کە مانیعێکی نەفسیی تێدا بێت.

یەکێکی تر لە نموونەی کەرامەت ئەوەتە کە خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتتاب رۆژی جومعە بەرچاوی روون بووەوە و سوپای ئیسلامی دی گەمارۆ دراوە، بۆیە لەسەر مینبەرەکەوە بانگی لە (ساریە)ی سەرلەشکر کرد و وتی: «یا ساریة الجبلَ» ساریەیش ئەم قسەیەی بیست و کەوتە خۆی و دەستی دایە بەرەنگاریی دوژمن هەتا سوپاکەی لەو گەمارۆیە رزگار کرد.

ئەم کەرامەتە لە راستیدا دوو کەرامەتە: یەکێکیان هی حەزرەتی عومەرە و ئەویتریان هی (ساریە) یە.

وا مەشهووە هەر لە کۆنەوە لە میسر هەموو ساڵێ کچێکیان دەرازاندەوە و دەیاندا بەدەم نیلەوە، ئەوسا نیل بەرز دەبوویەوە و ئاوەکەی دەگەیشتە دەشت و دەر و دێبەر و وڵاتی پڕ دەکرد لە پیت و بەرەکەت. حەزرەتی عومەر لە سەردەمی خەلافەتیا نامەیەکی نووسی خستیانە نیل، ئیتر ئەو وەزعە پێشووە نەما واتە کچ بەدەم نیلەوە نەدەدرا. ئەمەی مەولەوی ئیشارەیە بۆ ئەوە[٣].

یەکێ تر لەو کەرامەتانە ئەوەتە کە خالیدی کوڕی وەلید(ر.خ) (بسم الله)ی کرد و پیاڵەیەک زەهری خواردەوە هیچ زیانێکی پێ نەگەیشت.

پوختەی قسە: دەنگ و باسی کەرامەتی ئەولیا وەک موعجیزەی پێغەمبەران بڵاوبووەتەوە و، هی ئەوە نییە ئینسانی هوشیار ئینکاری بکات، لەگەڵ ئەوەیشدا هەندێ هەوەسباز و شوێن ئارەزووی نەفس کەوتوو ئینکاری کەرامەت دەکەن، خۆیان ئەو سیفەتە بەرزەیان نییە و خەڵکیش وەک خۆیان حسێب دەکەن و دەڵێن ئەوانیش کەرامەتیان نییە.

لە راستیدا ئادەمزاد لە باریا هەیە پایەی بەرز بێتەوە و لەوانەیشە نزم بێتەوە، یا مامناوەندی بێت؛ بۆیە ئەگەر لەسەر کردار و رەفتار و گوفتاری جوان و خاوین بەردەوام بوو، هەمیشە خەریکی یادی خودا بوو، بە هێچ جۆرێ لەم رێگا راستی لای نەدا لەوانەیە بەرز ببێتەوە و ببێتە دۆستی راستەقینەی خودا (إن اولیاؤه الا المتقون...) [٤] (ألا إن اولیاءالله لا خوفٌ عَلَیهِم وَ لا هُم یَحزَنون)[٥].

خۆ ئەگەر دایە باری لاساری و لارێگری و لەخودانەترسان و ئارەزووبازی، ئەوا بەرەبەرە نزم دەبێتەوە تا بە تەواوی دەچێت بە ناخی گومڕاهیدا و لە نووری خودا دووردەکەوێتەوە (اعاذنا الله).

لەو شەخسە زوهــوور کەشـف و کـەرامات
موشتەبیهـــ نـاوێ دەگـەڵ مـوعجیزات
نـــــەبییو وەلی فـــــەرقیان نـــــەوێ
یـــا خــــەیر ئــەنبیا وەقعیـــان نــەوێ
وەلی کــەی دەعــوای نوبــووەتی کــرد؟
یــا ئیســـتیقلالی کــەی لــە دڵ ئـاورد؟
ئــەو زوهـــووره ئــەر مولاحـــەزه کــەی
موعجیزەش نیسبەت بە رەسوولی خـۆی؛
ئــەو رەســووله چەنــد بولەندمەرتەبــەس
لــە ئوممەتیــدا شەخســێکی وا هــەس؟
ئـــاخر یەکێکـــە لـــە ئوممـــەتی ئـــەو
تـــابیعی ئـــەحکام شـــەریعەتی ئـــەو
بــۆ ئــەو شەخســیچە فــەزلی جەلییــە
زاهـــیر دەوێ پێـــی ئەمــــە وەلییـــە
ئەگــەر بێــت بکــا دەعــوای ئیســـتیقلال،
موتتـــەبیع نــــەوێ، کەوتگـــە زەلال،
کەشـــف و کـــەرامات بنـــێ ئـــەولایێ،
بــۆی ویلایــەتیچ هــەرگیز بــۆی نایــێ(٦)

بنێ ئەولایێ: لەولاوە دای بنێ، هەر باسی مەکە. «بۆی»ی یەکەم: بۆنی. «بۆی»ی دووەم: بـۆ ئەو.

لەبەر ئەوەی لەم شوێنەدا هەندێ رەخنەیان گرتووە لە دەرکـەوتنی کەرامـەت لـە ئـەولیاوە و، وتوویانە: ئەگەر کەرامەت لە ئەولیاوە دەرکەوێت فەرقی کەرامەت و موعجیزە نامێنێ و، یـەک لـە یەک دەچن و سەر لە ئینسان چەواشە دەبێت، ئەمەیش دەبێتە هۆی ئەوە فەرق لە بەینی نەبی و وەلیدا نەمێنێ یا خۆ نەبی جێگا و پایەی لە ناو خەڵکدا نەبێت، حەزرەتی مەولـەوی وەلامـی ئـەو رەخنەیە دەداتەوە و دەڵێت:

دەرکەوتنی کەشف و کەرامەت لـە دۆسـتی خـوداوە نابێتـە هـۆی تێکـەڵاوبوونی مـوعجیزە و کەرامەت، نابێتە هۆی ئەوەی فەرق لە بەینی دۆستی خـودا و پێغەمبـەردا نـەمێنێت و پێغەمبـەر هەیبەتی لە ناو خەڵکدا نەمێنێت، چونکە وەلی کەی ئیددیعای پێغەمبەرایـەتیی کـردووە؟ کـەی ئیددیعای سـەربەخۆیی کـردووە؟ ئـەو خـۆی بـە خزمـەتکاری شـەریعەت و پەیـڕەوی دڵسـۆزی پێغەمبەر دەزانێت و، ئەم کەرامەتە کە بۆی هاتووە لە بەرەکەتی حەزرەتی پێغەمبـەرەوە دەسـتی کەوتووە، لە راستیدا کەرامـەتی وەلی مـوعجیزەی پێغەمبەرەکەیـەتی؛ چونکـە خەڵـکی دەڵـێن: (ماشاءالله) ئەو پێغەمبەرە چەند پایەبەرزە؛ لە ئوممەتی ئەودا مرۆڤی وەها خاوەن کەرامەت هەیە و ئەم شەخسە بەڕێزە یەکێکە لە پەیڕەوانی شەریعتی ئەو، هـەروەها کەرامەتەکـە بـۆ وەلییەکـەیش گەورەییە و نیشانەی پایەبەرزییەتی و، مەعنای ئەوەیە لە ئەنجامی پەیڕەویی ئەو پێغەمبەرەوە ئەم کەرامەتەی پێ بەخشراوە.

ئەگـەر کەسـێکت دی ئیـددیعای سـەربەخۆیی دەکـرد و پەیـڕەویی شـەریعەتی پێغەمبـەری نەدەکرد، دەخیل سەد دەخیل نەکەی دوای بکەوی، ئەوە گومڕایە، باسی کەشف و کەرامەت هـەر مەکە، ئەو بۆنی دۆستایەتیی خودای هەرگیز لێ نایەت! (أعاذنا الله من شرّه).

(والحاسـل) ئـەمری خـاریق بـۆ عـادەت،
بـە نیسـبەت ئـەباڵ سـاحیب نوبـووەت
مـوعجیزەس، ئایـا لـە خـۆی کـا زوهـوور
یـا لـە ئوممـەتی یـەکێ بـەو دەسـتوور
بـە نیسـبەت ئـەباڵ وەلی کەرامـەت
نییـە لەگەڵـی دەعـوای نوبـووەت
بـەڵ ویلایـەتیچ ئیـددیعا ناکـا
ئیزهـاری خـاریق(٧) تەمـەننا ناکـا
بەڵـکو وەلی هـەس، هـیچ شـوبهەی نییـە
خـۆیچی نازانـێ کـە خـۆی وەلییـە
(یعرفونـە) نـەک بـۆ ئەوانـە
(لا یعـرفُهُم) لیباسـیانە

بـــۆ وادی (طـــوی) بـــێ نەعلـــەین دەڕۆن
چی پێ کەن[٨] کەشفی کەونی کەفشـەکۆن؟
بـــە شــــەرعی لـــە لای ئـــەهلی دیرایـــەت
کـــــەرامات نییـــــە شــــــەرتی ویلایـــــەت
شــــەرتی پاکییـــــە لـــــە گشـــت رەدییـــــە
ئیتتیبـــــــاعی شـــــــەرع موحەممەدییـــــــە

یا لە ئوممەتی یەکێ: یا لە یەکێ لە ئوممەتی. چی پێ کەن: چی پـێ بکـەن یـا چـی لـە پـێ بکەن. کەفش: کەوش.

واتە: پوختەی قسە ئەوەیە: کاری لەعادەتبەدەر کە دەرکەوت نیسـبەت بـە نەبییـەوە دەبێتـە موعجیزە، چ لە خۆیەوە دەربکـەوێت یـا لـە یـەکێ لـە ئـەفرادی ئوممەتەکەیـەوە کـە پەیـڕەوی شەریعەتەکەی بکات، هەر ئەم کارە لـەعادەت بـەدەرە نیسـبەت بـە وەلییەکـە کەرامەتـە، ئـەبێ ئەوەیش بزانین کەرامەت لە یەکێکەوە روونادات کە ئیددیعای پێغەمبەرایەتی بکات و لـە راسـتیدا پێغەمبەر نەبێ، چونکە بە پشکنینی مێژوو دەرکەوتووە قـەت نـەبووە یـەکێک بـە درۆ ئیـددیعای پێغەمبەریی کردبێت و کاری لەعادەتبەدەری لەدەست هاتبێ.

دۆستی خودا هەرگیز لافی ئەوە لێ نادات کە وەلییە و دۆستی خودایە، چ جایـێ پایـەی لـەوە بەرزتر، وەلی ئەوەندە مل‌کەچە لە بارەگای خوداپەرستیدا هەرگیز ئـاواتی ئـەوە ناخوازێـت کـاری لەعادەتبەدەری لێوە رووبدات، بەڵکو گەلێ وەلیی وا هەیە خۆی بە خۆی نازانێ کە وەلییـە، ئـەم جۆرە کەسانە لەوانە نین کە خەڵک بیانناسێت، بەڵـکو گۆشـەگیری و کـەس‌نەناسـین پۆشـاک و دروشمیانە. ئەمانە خودا نەبێ کەس ناناسن. خودایش نەبێ کەم کەس دەیانناسێت.

ئەمانە بەپێی پەتی و سەری قۆتی بەرە و شیوی پیرۆز بانگ دەکرێن و راز و نیاز لەگەڵ خودای گەورە دەردەبرن، چی لە کەشف و کەرامەت یا دەرخستن و پێزانینی رازی ئەم دنیا کەوشـەکۆنە بکەن؟ بەڵێ دنیا بێ‌کەڵکە و بێ‌ئەنجامە و ئەوەی بەکار دێت پێوەندی لاهووتییە.

ئەم عیبارەتەی مەولەوی بێجگە جیناس و وشەڕازاندنەوە ئیقتیباسیشە لە ئایەتی قورئانی پیرۆز (إنّی أنا ربّک فاخلِع نعلَیکَ إنّک بالوادِی المُقدسِ طُوی...) [٩] لە راستیدا بـەپێی شـەرع کەشـف و کەرامەت شەرتی ویلایـەت نییـە، شـەرتی ویلایـەت خۆلەخراپەپاراسـتن و خوداپەرسـتن و دڵـی خاوێنە، خوو و رەوشتی بەرز و جوانە، پەیڕەوی کردنی شەریعەتی حەزرەتی (محمدالمصطفی)یە.

***

١ـ ئەم سەرباسە لە دەستنووسەکەدا نییە، تەنها لە چاپەکەدا هەیە.

٢ـ لە دەستنووسەکەدا (عُجما) یە، هەڵەیە، عَجما راستە ئەسڵەکەی (عَجماء) بووە، وا بزانم مەولەوی هەمزەکەی ئەم و (ماء) یشی لەبەر وەزنی شیعر لابردووە. جا ئەم (عجماء)ە دوو مەعنا هەڵدەگرێ: لمێک کە داری تیا نەڕوێ، یا گیانلەبەری مێنگە.

٣ـ ئەمەیش نەسی نامەکەی حەزرەتی عومەرە (ر.خ): «من عبدِاللهِ عمربنالخطاب الی نیل مصر، أمّا بَعدُ، فان کنت تجری مِن قِبَلِکَ فلا تجرِ، وَ إن کانَ الله یُجریکَ فأسأل الواحد القهار أن یجریک».

بۆ ئەوەی لەمە زیاتر دەربارەی ئەم باسە بخوێنیتەوە بڕوانە: (جلال الدین السیوطی. تاریخ الخلفاء. تحقیق محمد محیالدین عبدالحمید. مطبعة المدنی القاهرة ١٩٦۴ ص ١۴٨).

٤ـ ئایەتی (٣٤) سوورەتی (انفال).

٥ـ ئایەتی (٦٢) سوورەتی (یونس).

٦ـ لە نوسخە چاپەکەدا دواکەلیمەکانی دوو نیوی ئەم بەیتە بەم جۆرەیە: (ئەولای) و (ناوی).

٧ـ لە نوسخە چاپەکەدا (خالیق) ە، هەڵەیە، ئەمەی ئێمە راستە کە لە نوسخە دەستنووسەکەدایە.

٨ـ لە پەراوێزی نوسخە دەستنووسەکەدا بە فارسی دێڕێک نووسراوە ئەمە تەرجەمەکەیەتی: «هەڵدەگرێ (پێ کەن) بە واتای (چی پێبکەن، چی لێبکەن) بێت، یا بە واتای (چی لە پێبکەن) ».

٩ـ ئایەتی (١٢) سوورەتی (طه).

## مبحث امتحان الأولياء [1]

موشـــــتەری! تـــیرت وا لـــە کەمانـــدا
بـــۆ نـــەزارەی مانـــگ لـــە بـــورج میزانـــدا
بـــێنی تـــرازووی شـــەرع وە بـــێ‌ئەنـــدێش
سەرناکا بێ فێڵ دەست راس هەڵـکێش!
کافییـــە، راس بـــوو کەففـــەی میـــزانی،
خۆت مـــەدە لـــە ســـەنگ بـــە ئیمتیحـــانی
«لِیَبْلُـــوَکُم» هـــــەر بـــــۆ خودایـــــە
عەبـــد و ئیمتیحـــان (أصـــعب الـــدا)یـــە
نەشـــــود؛ (خـــــالق الأرض والســـــما)س؟
تووخـــودا چـــی بکـــا تـــا بڵـــێی خـــوداس؟
نەشـــود مـــوعجیزەی «وانشـــق‌القمـــر»
تـــەدبیرێ! بـــوێ تـــا بـــە پێغەمبـــەر؟
ئـــەولیایچ مەزهـــەر ســـیفاتی حـــەقن
نـــائیبی نـــەبی لـــە قەیـــد موتڵـــەقن
هیممـــەت تەڵـــەب کـــە لـــە رۆحانییـــان
ســـــەممی قاتیلـــــە ئیمتیحانیـــــان!
ئەمـــە تـــۆ دەیکـــەی راس تەحەددییـــە
تەحـــەددی لـــە حـــەد وەلی‌دا نییـــە

بـۆ نـەبی (لابـدّ) بـویٚ؛ چـار چییـە؟
عیلمـی بـە بـوونی خـۆی کـە نەبییـە
قەسـدی ئیزهـاری خاریقـاتی خـۆی
حوکمی بە مووجەب مـوعجیزاتی خـۆی
ئیحاتـەی خەڵـقی بـدا یەکسـەری
گشـت ئیقـرار بکـەن بـە پێغەمبـەری
ئـەر بـە کـار نـەهات خـاریق و بورهـان
(بـارِقُ السـیوف، خـارقُ السِـنان)
ئەمانـە هیچکـام بـۆ وەلی هەیـە؟
نـە، هـەر تـابیعی رەسـوولی خۆیـە

موشتەری: ناوی یەکێکە لە ئەستێرە سەییارەکانی ئاسمان. هەروەها واتە: کڕیار. میزان: ترازوو، ناوی بورجێکیشە لە دوازدە بورجەکانی ئاسمان بە پێی زانیاریی کۆنی ئاسمانناسی، گوایا ئەهلی تەقویم وتوویانە هەر کاتێ ئەستێرەی موشتەری لە خالی (أوج)دا بێت و، مانگیش لە بورجی میزاندا، وا دێتە پێش چاو کە موشتەری وەک راوچی بەرامبەری مانگ راوەستاوە و ئەیەوێت تیری تێگرێت! نەشود: نشد، وشەیەکی فارسییە، واتە: نەبوو.

مەبەستی (مەولەوی) لێرەدا لە وشەی (موشتەری) ئەو مونکیرەیە کە دەیەوێت وەلی تاقی بکاتەوە! مەبەستی لە (مانگ) یش وەلییەکەیە، وشەی (میزان) یش لە لایەکەوە بە واتای بورجی میزانە و، لە لایەکی ترەوە بە واتای ترازووی شتکێشانە. دیارە مەبەست کێشانەکردنی کردەوەی وەلییەکەیە؛ جا لەم رووەوە ئەڵێت:

ئەی کڕیاری رەخنە! ئەی مونکیری ویلایەت! تیرت لە کەواندایە و گوللەت لەسەر پێیە و ئامادەیت بۆ رەخنەگرتن و لەکەدارکردنی وەلی و تاقیکردنەوەی، مادام مەبەستت ئەوەیە ئینسافت ببێ ترازووی شەرع بێنە و بێترس کرداری وەلی بەو ترازووە کێشانە بکە، دڵنیابە ئەگەر فێڵ نەکەیت ئەم ترازووە هەرگیز سەرناکات؛ کەواتە دەستت راس هەڵکێشە ئەگەر تای ترازووەکە راست بوو ئەوە بەسە بۆ ئیسپاتی ویلایەتی، ئیتر خۆت مەدە لە بەردی سەختی تاقیکردنەوەی؛ چونکە بەرد ناشکێت، تۆ دەشکێیت «مَن جَرَّبَ المجرّب حَلَّت به النَدامة» [٢].

رستەی «لِیَبلوَکُم » ئیشارەیە بۆ ئایەتی (لِیَبلوَکُم أیُّکُم أحسَنُ عَمَلا).

واتە: ئەی مونکیر! تۆ وەلیی تاقی مەکەرەوە؛ تۆ لەوانە نیت بتوانی وەلی تاقی بکەیتەوە؛ چونکە سەنگ و سووکیی کردەوە بە پێی نییەت و نیازە، نییەت و نیازی بەندەیش هەر خـودا دەیزانێـت، کەوابێ (لِيَبلوَكُم أيُّكُم أحسَنُ عَمَلا) هەر بۆ خودایە، هەر ئەو دەتوانێت بـەراوردی کـردەوە بکـات؛ بەندە و تاقی‌کردنەوەی کردەوەی خەڵک بارێکی گرانە و هەرگیز لـە وزەی مرۆڤـدا نییـە. ئـەنجا (مەولەوی) بە شێوەی پرسیاری گاڵتەئامێز دەفەرموێت: ئەوا تاقیت کـردەوە و نـەبوو، ئـەوەی تـۆ ویستت نەهاتە دی، بۆچی ئەم وەلییە داماوە خالیقی ئەرز و ئاسمانە تا بـە دڵـی تـۆ بزانێـت؟! یـا هەرچی تۆ بتەوێ جێبەجێی بکات؟! تو خودا پێم بڵێ ئەو وەلییە داماوە چی بکات تـا تـۆ خـۆت کافر بکەیت و بە خودای بزانیت؟ ئەوا گریمان موعجیزەی مانگ لەت‌کردنی بۆ جـێبـەجێ نـەکرا چاری چییە تا ببێتە پێغەمبەر؟

ئەم تاقی‌کردنەوەیەت بێ‌شعووری و سەرگەردانییە؛ وەلی بـێ‌چـارە نەخودایـە و نـە پێغەمبـەر، بەندەی خودایە و پیاوی ماڵ و حاڵی خۆیەتی، ئەگەر خودا یارمەتی نەدات لە من و تـۆ دامـاوتر و بێ‌دەستەڵات‌ترە.

ئەگەر راستت ئەوێ وەلییەکان بە هۆی خوداپەرستی و دڵسوزییەوە بوونەتە دیدگاهی سـیفاتی زاتی خودا و جیلوەگای هێز و بەرەکەتی (جەمالی) و (جەلالی).

ئەگەر خودا بییەوێ دوعای خێر بکەن پڕتەوێ لە سـیفاتی جـەمالیی خـۆی ئـەنێرێ بۆیـان و، ئەگەر بییەوێ بێزار بن لە خەڵک و بێ‌موبـالات بـن پڕتـەوێ لـە سـیفاتی جـەلالییان بـۆ رەوانـە دەکات.

دۆستەکانی خودا جێ‌نشینی حەزرەتی پێغەمبەرن و، لە داوی تـاقی‌کردنـەوەی زەیـد و عـەمر ئـازادن، روویـان لـە خودایـە و بـەس، چـاوەڕوانی بەرەکـەت و نەوازشـی ئـەون، تـۆیش لـەباتی تاقی‌کردنەوەیان داوای هیممـەت و یارمـەتی لـە رۆحانییـەتیان بکـە، تـاقی‌کردنـەوەیان ژەهـری کوشندەیە و مرۆڤی ژێر خۆی نادا لە قەرەی ژاری کوشندە.

ئەوەی تۆ لەگەڵ ئەوانی دەکەیت (تحدّی) و بەرانبەرکێیە، وەلی کاری بە بەرانبـەرکێ نییـە و، وەک زووتر باسم کرد ئەوان (تحدّی) ناکەن، ئیتر تۆ بۆچی بە تەحەددی دەچیتە مەیدانیان؟

بەڵام پێغەمبەر چاری نییە، ئەبێ بە خۆی بزانێت کە پێغەمبـەرە، ئـەو بـۆ راگەیانـدن نێـرراوە، پێویستە قەسدی دەرخستنی کاری لە عادەت بەدەر بکات و موعجیزە پیشان بدات و بـە خەڵـکی بسەلمێنێ کە راست دەکات و پێغەمبەرە و خودا ناردوویەتی بۆ سەر خەڵک، پێویستە بە تـەواوی

تێکەڵی خەڵکی موکەللەف بێت و هەوڵ بدات ئیمانیان بە پێغەمبەریی خۆی پێ بێنێ تا پەیڕەویی ئایینەکەی بکەن.

جا ئەگەر کاری لەعادەتبەدەری دەرخست و خەڵک مل کەچ نەبوون و پەیڕەوییان نەکرد ئامۆژگارییان بکات، ئەگەر ئەوەیش بە کار نەهات و سوودی نەبوو پێویستە دەست بداتە شیر و تیر و چەک و رووبەڕوویان بوەستێ و بجەنگێ و ئایینەکە بڵاوبکاتەوە؛ چونکە بەرامبەر بە مرۆی نادانی لەسەر تاوان بەردەوامی کەللەڕەق بێجگە شمشێری ئاوداری کۆڕی مەیدان و سەرەڕمی تیژی بێئامان هیچیتر بەکارنایەت و سوودی نییە.

بەڵێ ئەم تەحەددی و دەستدانە شیر و تیرە هیچی بۆ وەلی نییە، ئەو هەر لە بیر و باوەڕ و کردار و گوفتاردا پەیڕەوی رەهبەری خۆیەتی.

خۆ ئەگەر هەر دەستبەردار نابی و دەڵێیت پێویستە وەلی کەرامەت و کاری لەعادەتبەدەر پێشان بدات ئەوا دەڵێم:

خوێن بە دوو شاهید کریاگە ئیسبات
سادات عولەمای قادات دووسەد هات
شەهادەتیان دا گشت یەقینی بوو
بوو بە تەواتور، لە شوهرەت دەرچوو
کە شێخ خاریقی چەند هاتە زوهوور
پەنهان، هووەیدا، لە نزیک، لە دوور
بەشی دنیایی زاهیر بۆ کەس هەس
شاهیدی بدا بە ئیفتیرا کەس؟
ناوینی کوورەی دینی چەند گەرم کرد
چەند دڵی لە بەرد رەقتری نەرم کرد
ئیکسیری نەفەس مەسیحا تەرسیم
چەند مسی قەڵبی کرد بە زەڕ و سیم
ئیحیای جەماعات، بێداریی شەوێ
ئەدەب، زیکر و فیکر، دیتر چیت دەوێ!

کریاگە: کریاوە، کراوە. هووەیدا: ئاشکرا. ناوینی: نابینی. مەسیحا تەرسیم: دەسکاری عیسا. دیتر: ئیتر. قادات: جەمعی (قادة)ی جەمعی (قائد)ە.

واتە خۆ کەرامەت و کاری لەعادەتبەدەری ئەولیا، لەبارەی ئیسپاتبوونەوە، لە پیاوکوشتن موهیمتر نییە، کە بە دوو شاهید ئیسپات ئەبێت، ئەوا لێرە چەند شاهیدی باوەڕپێکراو لە زانایان و گەورەپیاوان و پێشەوایانی ئیسلام شایەتی دەدەن لەسەر دەرکەوتنی کەرامەت لەو وەلییەوە، بەڵکو لەبەر زۆریی شاهیدکار لە شایەتی تێپەڕیوە و بووەتە تەواتور کە دەبێتە هۆی یەقین و دڵنیایی. دیارە لەم تەواتورەدا ناگونجێت بەرامبەر (مخبر) ەکان بەدگومان بین و بڵێین لەوانەیە درۆبکەن، چونکە تەواتور لەسەر زۆریی ژمارە راوەستاوە، لە هەر جینس و هەر نەوع و هەر سینفێ بن، بێجگە لەوەیش ئەمانە هیچ بەشێکی ئاشکرای دنیایی و هیچ بەخشششێکیان دەست ناکەوێت بەرامبەر بە گێڕانەوەی باسی ئەم کەرامەتانە، ئیتر بۆچی درۆ ئەکەن؟ ناچێتە عەقڵەوە پیاوی ژیر بە بێسوود درۆ هەڵبەستێ و پیاوەتی و چاکی و کەرامەت بۆ یەکێکی تر ئیسپات بکات!

تەماشاکە ئەو پیرە چۆن کوورەی ئایینی گەرم کردووە؟ چۆن دڵانی وەهای نەرم کردووە کە لە بەرد رەقتر بوون؟ بە هۆی ئیکسیری فووی وەک فووی حەزرەتی عیسای نەخۆشیلابەر چەن دڵی بێکەڵکی بێڕەواجی وەک (مس)ی گۆڕی و کردی بە زێڕ و زیو، واتە خستنیە سەر رێگای خوداپەرستی و خوداناسی و ئەدەب و رەوشتی بەرز، لە غەفڵەتەوە بۆ یادی خودا، لە نوێژ نەکردنەوە بۆ جومعە و جەماعەت، لە بێئەدەبییەوە بۆ ئەدەب و خوو و خدەی پەسەند، لە خودپەسەندییەوە بۆ خاکینەیی، لە نەفامییەوە بۆ فام و هەستی بەرز، ئیتر لەمە زیاتر تۆ چیت لە وەلی دەوێ؟

ئەم تەحریرتە ئەڵبەت مەلحووزە
نەبی مەعسوومە و وەلی مەحفووزە
(تقدیراً) چشتێ ئەر لێی دا دیار
دەفعێ[3]، بۆ دەفعی دەکا ئیستیغفار
ئەو تەنەززولەیچ حیکمەتی تێداس
تەرەققییاتی کەو چەند لە پێداس؟
(فعلاً وقولاً) گشت بێخەلەلن
هەموو (لا یُسأل عمّا یفعل) ن [4]

کەو: وشەی تەعەججوبە بە مەعنای (ئاخۆ).

واتە: ئەڵبەتە سەرنجی ئەو مەسەلەت داوە کە دەڵێت: پێغەمبەران لە گوناهـ مەعسوومن وەک باسمان کرد بەڵام ئەولیا مەعسووم نین و، دوور نییە گوناهیان لێ بوەشێتەوە، بەڵێ لە میهرەبانیی خودا و بە هۆی دەرکـەوتنی نـووری رەحمەتیـەوە لـە گوناهــ دەپـارێزرێن، جـا ئەگـەر وەلی بـە قەزاوقەدەر گوناهێکی لێ وەشایەوە زووبەزوو بۆ لابـردنی ئـەو تاوانـە تەوبـە دەکـات و پەشـیمان دەبێتەوە و داوای لێبووردن لە خودای میهرەبان دەکات.

ئای ئەم تەنەززول و نزمبوونەوەی پایەیە چەند حیکمەتی تێدایە، چونکە هـەر لـە رێگـای ئـەم گوناهــەوە کـە تۆبـەی لـێ دەکـات و هەسـت بـە ناتـەواویی خـۆی دەکـات، رێگـای راسـتی و بەرزبوونەوەی پلەی دۆستایەتیی خوای بۆ تەخت ئەبێ و پایـەی بـەرز ئەبێتـەوە. ئـەو دۆسـتانەی خودا کە باسمان کردن خوار و خێچی و ناتەواوی لە کردار و گوفتاریاندا نییە و خودا پاراسـتوونی، لە لایەن ئەو موریدانەیانەوە کە خاوەن هەست و وریان و، لەسەر دەستی ئەوان پەروەردە بـوون و، بە هۆی ئەو زیکر و فیکرەی لێیان وەرگرتوون (لطائف) یان نوورانی بووە، (لا یُسأل عن مـا یفعـل) ن؛ چونکە پرسیار گەر لەسەر شێوەی پرسیار لە حیکمەت نەبێت بـە نـادانی دادەنرێـت و، وەکـوو ئەوەیە قوتابییەک جۆرەها هونەر و پیشە لەسـەر دەسـتی مامۆسـتاکەیدا فێـر ببێـت و زۆر بـاش بزانێت کە مامۆستاکەی زانایەکی زۆر زانا و سەرامەدە، کەچی لە ئاسانترین مەسئەلەیەکی سـادەدا موناقەشەی لەگەڵ بکات!!

جا هەروەک بۆم روون کردنەوە مەبەستی (مەولەوی) لەم پرسیار لێ نەکردنە بۆ ئەو کەسـانەیە کە شاگرد و پەروەردەی ژێر دەستی ئەو وەلییانەن، نەک بۆ زانایانی ئایینـە بـە تێکـڕایی؛ چونکـە دۆستانی خودا لە هەر پایەیەکدا بن وان لە ژێر فەرمانی شەریعەت و ئاییندا، خوانەخواستە، ئەگـەر فەرمانێکی بە پێی شەرع نارەوایان لێ رووبدات، لەسەر زانایانی ئایین واجبە ئامۆژگارییان بکـەن و ئاگاداریان بکەنەوە؛ چونکە شەریعەت بۆ هـەموو کەسـێکی موکەللـەف هـاتووە و نابـێ کـەس لـە چوارچێوەی دەربچێت.

(فرضـاً) ئـەر لێیـان سـادر بـوو مونکـەر
بۆچ وە بێجیهەت خۆم بکـەم مـن کـەر[٥]
تـــەئویلی دەکـــەم ئەگـــەر تـــوانیم
یـــا حـــەملی دەکـــەم لەســـەر نـــەزانیم

موریــد بی و قــالی[٦]، بــێ‌تاقــەت نــەوی؛
یــا حالــیت دەکــەن یــا حالــی دەوی
کــە ســەبرت نــەبوو بــزان وە تــاقی
میهمــانی خــوانی «هــذا فــراق»ی
وەلای لاڕێــدا[٧] پێــت راســت گەڕیاگــە
بــەنی تــرازووی شــەرعت بڕیاگــە
لــە نوقلــی نەقلــی لــەززەتێ نــاوەی
پەس‌مەندەی عەقلــی ســەربەخود دەخــۆی
وەهمــی بــێ‌نالــت جڵــەو بەرداگــە
وە زبرانــدا: «ئــەهل تەئســیر نەماگــە[٨]،
ئەگەرنــە دەیبــوو تەئســیری جــەلی
مــنی بــە تــاقی دەکــرد بــە وەلی
یــا خــەیر ئــەم شەخســە ئەگــەر وەلییــە
بزانــێ لــە دڵ فلانــدا چییــە؟!
ســوئالێ دەکــەم ئاســان بــێ یــا رەق
جــواوێ بــدا راس بــێ و موتابــەق!»
مــەکر و کەیــدی زۆر، قســەی لــۆق و لــەق
لاوە، کەڕ[٩] نییــەی گــوێ بگــرە لــە حــەق
کۆتــەرەی داری، پیــوەی دار نییــەی
لــە بــەردو چــەخماخ گلــەیی دەکــەی؟!
ئەم گشــت حیجابــە و ئــارەزووی تەئســیر؟!
بــەلێ[١٠] چــی بڵــێم؟! (الله قــدیر)
خوســووس کەســێ حــەق بەشــی نــەداوێ
مەزهــەری قــەهر و تــەردی خــودا وێ

خــەتم و غیشــاوەی[١١] دانشــی کــرد گــوم
«أأنـــــــذرتهم أم لـــــــم تنـــــــذرهم»
تەقلیــدی حــەق کــە، حیکمــەت بــەلاوە
عــــەقلت عەقیلـــە و هیممـــەت بـــلاوە
(ابـــــوالحکم)ت حیکمـــــــەتی ئـــــاورد
(فیـــــە شـــــفاء) ئـــــازارداری کـــــرد
(سیددیق) لـە خـەرمان تەقلیـد بـاری بـوو
ژار مـــار توریـــاک ژاری مـــاری بـــوو
«وَ فـــوق کـــلّ ذی علـــم علـــیم»[١٢]
الـــــی حضـــــرة العلـــــیم الحکـــــیم
«و مـا أوتیـتم»[١٣]، «و لا یحیطـون...»[١٤]
هەیــە لــە ئەغلــەب دلانــدا مــەکنوون

وە بێجیهەت: بە بێ هۆ. قالی: تووڕە، زویر. گەڕیاگە: وەرگەڕاوە. بەن: پـەت. بڕیاگـە: بـڕاوە. نوقـل: شـیرینی. نەقلـی: دەلیلـە نەقلییـەکان وەک قورئـان و فـەرموودەی پێغەمبـەر و بابەتـە ئاینییەکانی تر. ناوەی: نابەی. پەس‌مەندە: پاشماوە. بێنال: ئەسپی بێنـال. بەرداگـە: بـەرداوە. زبران: زەویی سەخت و کڕێن و بەردەڵان. نەماگە: نەماوە. بەتاقی: بە تەحقیق. پیوە: پیفوو، قـاو، پووشو، مـاددەیێکی نـەرمی وەک لۆکەیـە لـە کلـۆری پـیرەدار دەردەهێنـرێ و بـۆ ئاگرکردنـەوە پارچەیەکی لێ دەخرێتە سەر بەردە چەخماخ و بە چەخماخەکە لە بەردەکـە دەدرێـت و، پرشـی ئاگری لێ دەبێتەوە ئەگەر بەر پیفووەکە بکەوێت دادەگیرسێت. دانش: زانین و تێگەیشتن.

واتە: ئەوا گریمان کارێکی ناشەرعی لە وەلییەکە رووی‌دا، بۆ بە بێ‌هۆ من خۆم بکەمـە پیـاوێکی دژ و رەخنە بگرم، بەڵکو ئەگەر گونجا تەئویلی ئەو کـارە ناشـەرعییەی دەکـەم و دەیگێڕمـەوە بـۆ سەر کارێکی شەرعی، یا دەڵێم من نایزانم و تێی ناگەم. تۆ ئەگەر پەیـڕەوی ئـەو وەلییـە بیـت و تووڕە و بێ‌تاقەت و تەنگەجیکڵدان نەبیت یا وەلییەکە دێت و تێت دەگەیەنێ، یا خۆت لە پاشـاندا تێ‌دەگەیت.

بەڵام ئەگەر خۆگر نەبوویت و دانت نەگرت بە خۆتا ئەوا بێگومان وەک حەزرەتی مووسات لێ دێت و دەبیتە میوانی خوانی «... هذا فراق بيني و بينك...» ئەوە بوو حەزرەتی مووسا(د.خ) لەگەڵ ئەوەیش کە لە پێغەمبەرە (اولو العزم) ەکان بوو، چونکە خۆی نەگرت تا حەزرەتی (خضر) نهێنی ڕووداوەکانی پێ بڵێت و، دەستی کرد بە رەخنەگرتن لە کارەکانی حەزرەتی (خضر)، لێی جیابووەوە و پێکەوە نەیانکرا.

ئیستە تۆ بەلای لاری و خواریدا دەڕۆیت پێت بەرەو لارێ وەرگەڕاوە و، ئەو پەتەت کە ترازووی شەرعی پێ دەخەیتە کار بچڕاوە و گوێ ناگریت بۆ ئەو قسە جوان و شیرینانەی کە دەماودەم بۆت دەگێڕرێنەوە، خەریکی پاشخوانەخۆریی عەقڵی سەربەخۆی خۆتی.

تۆ جڵەوی ئەسپی بێناڵی خەیاڵت بەرەلای دەشتێکی کرێن و بەردەلان کردووە کە بێگومان زووبەزوو قاچی دەسوێت و لەکەڵک دەکەوێت... هەر لە خۆتەوە دەڵێیت: پیاوی خودای خاوەن تەئسیر و بەرەکەت لە دنیادا نەماوە، کەچی ئەمە حوکمێکی دوور و بێئەساسە و ئەهلی تەئسیر لە دنیادا زۆرن.

هەروەها دەڵێیت ئەگەر ئەهلی تەئسیر بمایە و فلان کاریگەر بوایە منی دەکرد بە وەلی ئیتر ئەوە نازانی کە خۆت هەوڵت نەداوە و ئامادەییت نییە بۆ ئەوەی هەنگاوێک پێش کەویت.

یاخۆ دەڵێیت: فلانە وەلی ئەگەر راستی وەلییە با بزانێ چی لە دڵی مندایە، با پرسیارێکی لێ بکەم، ئاسان یا گران و ئەویش، وەلامێکی راست و رێکوپێکم بداتەوە!

ئەی برای خۆم! واز لە فڕوفێڵ بێنە، دەست لە قسەی هەلەق و مەلەق هەڵبگرە، خۆ تۆ کەڕ نیت؛ جارێ گوێ لە قسەیەکی حەق و راست بگرە.

تۆ کۆتەرەداری تەڕیت، پیفوو نیت، ئامادە نێت بۆ داگیرسان و گلەیی لە بەرد و چەخماخ دەکەیت، گوایا ئاگریان نییە، نەخەیر ئەوان ئاگریان هەیە، تۆ ئامادە نیت ئاگر بگریت، فلانە وەلی لەوانەیە پیاوی خودا بێت، ئەهلی دڵ بێت، بەڵام دڵی تۆ نوور و بەرەکەت وەرناگرێت.

تۆ ئەم هەمووە گیر و گرفتانەت هەیە، نەفسی بەد، تەمەڵی و تێنەکۆشین، یاخیگەری و سەرکەشی، کەچی بە تەمای ئەوەیشیت زوو داگیرسێیت و ببیتە چرای عالەمتاب! بڵێم چی هەر ئەوەتە خودا توانای هەیە ئەگەرنا یەکێکی وەکوو تۆ گرانە ئەم ئارەزووانەی بێتە دی، بە تایبەتی کەسێ کە خودا بەشی لە نوورانییەت و دڵ خاوێنیی نەدابێت و، رق و غەزەبی رووی تێکردبێت

و، دڵی مۆر کرابێت و لێڵایی بەسەر چاویا هاتبێت کە ڕێگای زانین و بینینی لێ گرتبێت، ئەوانەی کە هەڕەشە لێکردن و هەڕەشە لێ نەکردنیان وەک یەک بێت و باوەڕ ڕوو نەکاتە دڵیان.

ئەی برای خۆم! وەرە دوای حەق و ڕاستان بکەوە و، شوێن‌پێی ئەوان هەڵگرە، حیکمەت و زانست لای ئەوانە، شوێن عەقڵی دەستبەستە و سنوورداری خۆت مەکەوە، دوای وەهم و خەیاڵ مەکەوە، وەهم و خەیاڵ سەرگەردانن!

تەماشاکە ئەبووجەهل کە ناوی عومەر و ناوبانگی (ابوالحکم) بوو، بە خەیاڵی خۆی عەقڵ و حیکمەتی بەکار هێنا و دژایەتیی لەگەڵ پێغەمبەردا کرد، کەچی بە بەدبەختی و سیاچارەیی سەری ناهومێدیی نایەوە و، ئەو عەقڵەی کە دەبێ شیفا بێ بۆ ئادەمزاد بوو بە هۆی ئازار و نەگبەتیی ئەو، بەڵام حەزرەتی ئەبووبەکری سیددیق (ر.خ) نەکەوتە دوای تەنها عەقڵی خۆی و پەیڕەویی پێغەمبەری کرد و، لە خەرمانی تەقلیدی ئەو بەهرەی وەرگرت و کۆڵی پڕ کرد، ئەوە بوو کە لە ئەشکەوتی (ثەور)دا مار پێوەیدا، خودا بە میهرەبانیی خۆی تفی موبارەکی دەمی حەزرەتی بۆ کرد بە دەرمان و وەک توریاک چاکی کردەوە. دەڵێن وەک زەهری مار کوشندەیە بۆ ئینسان تفی دەمی ئینسانیش کە بکەوێتە دەمی مار دەیکوژێ، کەواتە تفی دەمی حەزرەت بۆ کوشتنی مار وەک ژاری مارە، بەڵام بۆ ئەبووبەکر (ر.خ) بوو بە هۆی شیفا.

دیارە نابێ وابزانیت کە نەبی یا وەلی هەموو شت دەزانن و دەستەڵاتیان بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت، نەبی و وەلی بەندەی خودان، ئادەمزادن، خودا نین، هەموو خاسییەتێکی ئادەمزادیان تێدایە: بێ‌هێزی، بەهێزی، ساغی، نەخۆشی، زانین، نەزانین، مردن، ژیان... تاد روویان تێ‌دەکات.

زانستی ئادەمزاد سنورێکی هەیە، هەر زانایەک بگری یەکێکی تر هەیە لەو زاناتر بێ، تا دەگاتە خودای زانا و کارساز، کە لەو زاناتر کەس نییە.

ئەو بەهرەی زانینە کە خودا بە ئادەمزادی بەخشیوە کەمە و زۆر کەمە و، ئەوەیشی کە دەیزانێ لە خۆیەوە نییە و لە خواستی خودای گەورەوەیە.

نەختێ خۆت بدە ئەو ڕۆشنایی
نەبیی و وەلی و داوای خودایی؟!
عەبد و بەرمومکین کول توانایی؟!
عەبد و (بِکلّ الاشیا) دانایی؟!

ئــەرچی هــەویری ئینســـانی کـــامڵ
بە هـەردوو دەسـان شـێلیاگە گـش دڵ
مەزهەرە بـۆ وەسـف جـەلال و جـەمال
مەتلــەبی ئــەنوار ئاســـارە و ئـــەفعال
لاکـین دەمـێ بەسـت زوهـووری هەیـە
دەمــێ سەڵــتەنەت قــەبزی نەوبەیــە
نییــە وجــوودی کەســێ لــە بــەردا
هــەرچی لـە مەنبــەع ســەر دا لەســەردا
هــەر بــەو ئەنــدازە راس دەیداتــە دەر
دەهەنــەی میفتــاح کــارێزی مەزهــەر
ئـیرادە و رەزای خــۆی گشــت وەبـادە
ئــــــیرادە و رەزای (ربّ العبــــــاد)ە
هــــەرچی پێــی نــەکا بیکــا ناتوانــێ
پێـــی نــــەزانێنێ، بـــزان، نایزانـــێ
ئـەر پێـی نیشـان دا فـەزل و رەحمەتـە
ئەر لێـی پـەنهان دا عـەدل و حیکمەتـە
بۆی کرواس چەند دوور دای لە دەماخی
زانین لە نزیک دیـت لێـی بـوو یـاخی؟!
نــەبی خەبــەری نــەبوو لــە نــاو بــیر
وەلیچ ناو دڵی تـۆی نـەوێ لـە بـیر[١٥]

ئەو رۆشنایی: بەر رۆشنایی. بەر مومکین کول: بەر کول مومکین، لەسەر هـەموو مومکینێـک. شێلیاگە: شێلراوە. گش دڵ: گشت دڵ، بە هەموو دڵ، بە دڵ و گیـان. سـەر دا: سـەر هـەڵ بـدا، دەربکەوێت. لەسەردا: لای ژووروو، لە خوداوە. وەبادە: بەربادە، بـێنرخـە، فـەوتاوە، بـا بردوویـە. وەلیچ: وەلیش.

واتە: لە تاریکیی نەزانی دەرچۆ و، نەختێ خۆت بدەرە بەر ڕۆشنایی هـۆش و زانسـت تـا بـۆت دەرکەوێت نەبی و وەلی و داوای خودایی دوورن لە یەکەوە، بەندەی خودا و توانایی بەسەر کردنی هەموو شتێکی مومکیندا یا زانینی هەمووشت زۆر لەیەکەوە دوورن، بەندە دروست‌کراوی خودایـە و زات و سیفەتی دیاری و سنووردارە، لەوەی بۆی دیاری‌کـراوە سـەری موویـە ناتوانێـت لابـدات. خوایە هەموو شت دەزانێ، خوایە هەموو شت دەتوانێ.

ڕاستە هەویری وجوودی ئینسانی تەواو و وەلیی ڕابەر بە هەردوو دەسـتی بـەهێزی سـیفەتی جەمالی و جەلالیی خودا بە دڵ و گیان شێلراوە و کاڵی و خـاویی تیـا نـەماوە، ئەگـەر چـی وەلی شوێنی دەرکەوتنی نیشانەکانی سـیفەتی جـەلالی و جـەمالیی خودایـە، لـەودا نـوور و نیشـانەی میهرەبانی و کردەوە پڕ حیکمەتەکانی خودا دەردەکەوێت، بەلام وەلی حالی (قـبض) و (بسـط)ی هەیە، لە کاتی بەستدا فتووحات و بەرەکەت بەسەریا دەڕژێ و لە کاتی قەبزدا لێی دەگێڕرێتەوە.

کاتی بەست، کە بەرەکەت لە سەرچاوەی خوداییەوە سەردەکات و دەردەچێت و، لە سـەرەوە بەرەو دڵی وەلی دێت، کەس نییە لەبەریا، کەس ناتوانێ ڕێگای لێ بگرێت و لێی زیاد وکەم بکات، بەخشندەیی کلیلی کارێزی دڵی وەلییەکەیش، کە شوێنی دەرکەوتنی نـووری خودایـە، چەنـدی لایە هەر ئەوە دەردەدات و دەیگەیێنێتە دڵی خەڵک و ناتوانێ لێی زیاد و کەم بکات، چونکـە هـی خۆی نییە هی خودایە، خواسـت و حـەزی وەلی بـەربادە، خواسـت و حـەز هـی خـودای خالقـە، هەرچی خودا پێی نەکات و بۆی نەڕەخسێنێت ئەو ناتوانێ بیکات، دڵنیا بە و زۆر باش برانە ئـەوی خودا بە وەلییەکەی فێر نەکات وەلییەکە هیچی لێ نازانێت.

جا ئەگەر خودای گەورە نهێنییـەکانی پیشـان دا بـە وەلی ئـەوە بەخشـندەیی و میهرەبـانی و گەورەیی خۆیەتی، ئەگەر لێیشی شـاردەوە ئـەوە داد و زانیـاریی خۆیـەتی، خـۆی دەزانـێ کـەی دەیبەخشێت و کەی دەیگرێتەوە. ئاگات لێیە بۆن و بەرامەی کراسەکەی حەزرەتی یووسف چەند لە دوورەوە دای لە دەماخی حەزرەتی یەعقووبی باوکی؟ (و لمّا فصّلت العیر قال ابوهم إنّـی لأجِـدُ ریح یوسفَ لو لا ان تفنّدون)[١٦] کەچی کاتی خۆی کە براکانی یووسف یووسـفیان خسـتە بـیری کەنعانەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا کە شـوێنەکە لـە حـەزرەتی یەعقووبـەوە دوور نـەبوو پێـی نـەزانی و ئەوەندەی خەم خوارد لێلایی بەسەر چاویا هات؛ جا کە پێغەمبەرێکی وەکوو حـەزرەتی یـەعقووب ئاگای لە بەسەرهاتی کوڕی خۆشەویستی خۆی نەبێ لە بیرێکـی نزیکیـدا، هـیچ عەجایـەب نییـە ئەگەر وەلی ئاگای لە دڵ و دەروونی تۆ نەبێت!

«مــا اتّخــذَ الله ولیّــاً» مەشـــهوور
جاهیل لە مەعنای «جاهلاً» مەهجوور
دەڵـــێ: یانییهـــای (جــاهلاً) بەمـــە
دزیاگ و گومبــووگ لــە ماڵــی هەمــە
(جاهلاً) بە مێـرد کــەی ژانــێ تێـرێ؟
(جاهلاً) بــە ژن کــەی وەڵــەد بێـرێ؟
(جاهلاً) بە عــەزل بــە نەسـبی ئــەمیر
(هکــذا) تــا خــوار نابێتــە تــەحریر
شــوعووری نییــە؛ یــەعنی (جــاهلا)
بــە زات و سـیفات حــەق (جـلّ، عَـلا)
(وَ بمــا یَجــب علمُـــهُ فـــیالّـــدین)
کــەوا لــە حــەددی دەزانیــە یــەقین

هەمە: هێمە، ئێمە. ئەم وشەیە لە ناوچەی (تاوگۆزی) و دەوروپشتی بە کاری دەهێـنن. حـەد: تەعریف، ئیستیلاحی ئەهلی مەنتیقە. دەزانیە: دەزانییێ، دەزانرێت.

واتە: هۆی سەرلێ شێوانی هەندێ کەس سەبارەت بە پایەی پیاوی خودا ئەسەرێکی مەشهوورە کە دەڵێت: «ما اتّخذَ الله ولیّاً جاهلاً» کە وای تێگەیشتوون مەعنای ئەوەتە پێویستە وەلی گـەلێ شت بزانێت، بۆ نموونە: دەبێ بزانێت فلانە شت لە ماڵی ئێمە دزراوە، یـان فلانـە شـت ون بـووە، دەبێ بزانێت فلانە پیاو کەی ژن دەهێنێت؟! فلانە ژن کەی منداڵی دەبێت؟! دەبێ بزانیـت فلانـە ئەمیر کەی دادەمەزرێت یا کەی دەستی لە کار دەکێشرێتەوە؟! هەروەها گەلێ شتی تر...

بەڵام ئەم بۆچوون و لێکدانەوەیە شتێکی هەڵەیە و نەزانیی دەگەیەنێت، واتە: ئەمانە هیچیـان پێویست نین بۆ وەلی، واتای ئەسەرەکە بەو جۆرە نییە کە ئەوکەسانە وتوویانە، بەڵکو مەبەست لەو ئەسەرە ئەوەتە: خودا دۆست و خۆشەویستێکی وەهای نییە پێویستییەکانی بیر و باوەڕی ئیسـلام و ئایین نەزانێت، دۆستی خودای گەورە، واتە وەلی، پێویستە بە قەدەر توانا زات و سـیفەتی خـودا بناسێت، ئەوەی دین پێویستی کردووە بزانرێت بیزانێت، بەو جۆرەی زانایان لـە تـەعریفی وەلیدا وتوویانە و، وەک مەولەوی خۆی لە پێشەوە وتی: «وەلیی شەخسێکە (عارف بـالله)... تـاد»، ئیتـر شەرت نییە ئاگای لە کون و قوژبنی کائینات بێ و بە هـەموو شـت بزانــێ، تەنانـەت شـەرت نییـە

هەموو بنکەکانی زانستی (عقائد) و هەموو حوکمێکی لق و پۆپەکانی ئایین بزانێت، بەڵام وەک یەکێکی مامناوەندی ئەوەی ئەهمیەتی هەیە دەیزانێت و، بۆ ئەوانەیشی کە نایانزانێت دەتوانێ لە زانایانی ئایین بپرسێت و فێریان ببێت.

عەلاوەی ئەمە مەلوول مەکە دڵ
دیزەی غیرەتیان ئەر بێ بێتەو کوڵ[١٧]
پەردەی سەتتاری لابدەن لە بەین
موفتەزەحە چی وا هەین و وا هەین،
بپارێزە خۆت؛ زەریف ئاگایە
مۆئمین (ینظرُ بنور الله)یە
ئەمما تێی ناگەی تۆ ئەی بێئەدەب!
نایەڵێ سەبقەت رەحمەت لە غەزەب
دەڵێی ئەڵبەتە هەر هیچ نازانێ
وەرنە بۆچ نایدا سا لە رووم، کوانێ؟
تێی، دەڕۆیەوە، قەدرێ دەوی گوم
بە «آمَنّا»وە «إنّا مَعَکُم»[١٨]
مەتڵەبت مەکرە و سوئالی بێجا
بۆ تەرویجی خۆت هەتکی ئەولیا
هەر مەکر و کەیدی خۆتت تۆ لە گوێس!!
(و الله خیر الماکرین) لە کوێس؟!

دیزە: مەنجەڵی لە گڵی سوورەوەکراو دروستکراو. ئەر بێ: ئەگەر بێت.

بێتەوکوڵ: بێتە کوڵ، بکوڵێت. کینایەیە لە رقهەستان. چی: هەرچی، وا هەین: کە مەوجوودین. وا هەین: وەها بەم چەشنە کە هەین [١٩] کە بەدکردار و بەدنیاز و بەدخووین. وەرنە: ئەگەرنە. نایدا سا لە رووم: سا نایدا لە رووم. بێجا: بێجێگە و بێمەعنا. لە گوێس: لە گوێیە. لە کوێس: لە کوێیە؟

واتە: ئێمە باسی ئەوەمان کرد کە زانینی هەندێ شت بۆ وەلی پێویست نییە، بەڵام تۆ نابێ دڵت پەرێشان بکەیت و وا تێ بگەی کە وەلییە (کامل) و (مکمِّل) ەکان، ئەوانەی پایەی رابەریيان

پێ دراوە، بێئاگا و بێبەسیرەتن، ئەوەتا لە نەسی قورئاندا دەبینی خودا دەربارەی ئـەو بەنـدە کـە حەزرەتی مووسا پێی گەیشت، ئەفەرموێ: «فوجدا عبداً من عبادنا آتیناه رحمةً من عندنا و علّمنـاه من لَدنّا علماً» [۲۰] یا لە باسی هێنانی تەختی بەلقیسـی شـاژنی سـەبەئدا بـۆ حـەزرەتی سـلێمان دەفەرموێ: (قال الذی عنده علمٌ من الکتاب... الآیة) [۲۱].

هەروەها لە سەحیحی موسلیمدا هەیە: «مازال عبدی یتقـرّب الـیَّ بالنوافـل حَتّـی أحِبَّـهُ فـاذا أحببتُهُ کنتُ سمعه الذی یسمع به و بصره الذی یبصر به... الحدیث».

بێجگە لەمانە گەلێ ئاسار هەیە دەلیلن لەسەر ئەوەی هەندێ موسوڵـمانی لـەخوداترس فـام و فەراسەتێکی تایبەتییان هەیە و هەسـت بـە حەقیقەتـەکان دەکـەن؛ واتـە دەبـێ بزانیـت وەلییـە رابەرەکان لە بەرەکەت و نیعمەتی خوا بێبەش نین، کاتێ کە تووڕە بـبن و مەنجەڵـی غیرەتیـان بێتە کوڵ و پەردەی داپۆشینی تاوان لە ناوا نەمێنێ هەرچی ئەوانەی کە هەین و بەو جـۆرەی کـە هەین بە خۆمان و کار و کردەوەی بەد و خوو و خدەی ناپەسەندمانەوە دەردەکـەوین و ئابـڕوومان دەچێت.

خۆت بپـارێزە لـە ئینکـاری دۆسـتی خـودا، دۆسـتی لەخوداترسـی خـودا زۆر بـاش ئاگـادارە، موسوڵمانێ کە دۆستی خودای گەورە بێ بە چاوی سەر سەیری خەڵک ناکات؛ بەڵـکو بـە نـووری خودایی سەیریان دەکات.

تۆ دەڵێیت دیارە ئەم وەلییە بە کار و کردەوەم نازانێ، ئەگەرنا جارێ دەیدا لە رووم و بە ئاشکرا پێی دەوتم؟! راستەکەی ئەوەیە تۆ تێناگەیت، وەلی لە حەزرەتەوە ئەدەبی وەرگرتـووە و ئـەویش لە خودای گەورەوە و، رەحمەت و بەزەییان پـێش رق وتـووڕەیی دەکـەوێت. ئـەم پێشـکەوتنی بەزەییە بووەتە هۆی ئەوەی نەیدەن لە رووی، نەک نەزانینیان.

تۆ ئەی مونکیری ئەولیا! بە دوودڵییەوە دێیت بۆ لای وەلی و دەڕۆیتەوە و ماوەیەک خـۆت ون دەکەیت، کە دێیتە لای وەلی و پەیڕەوەکانی دەڵێیت لەگەڵتانم باوەڕم پێتانە، کـە دەیشـڕۆیتەوە بۆ ناو کۆمەڵەکەی خۆت دەڵێیت هەر لەگەڵ ئێوەم!

وەکوو دوودڵەکانی سەردەمی حەزرەت(د.خ) کە خوا لە بارەیانەوە ئەفەرموێت:

(و اذا لقوا الذین آمنوا قالوا آمنّا و اذا خلوا الی شیاطینهم قالوا إنّا معکم انمّـا نحـن مسـتهزئون) [۲۲].

تۆ هەر مەبەستت فڕوفێڵ و پرسیاری بێ ڕێ و شوێنە بۆ بڕەودان بە بیر و باوەڕی خۆت و ئابڕووبردنی دۆستانی خودا، بەڵام تەنها ئاگات لە مەکری خۆتە، ئیتر مەکر و رقی خودای گەورەت خستووەتە پشت گوێ! دیارە خودا لە هەموو کەس چاکتر دەس ئەوەشێنێ!

سوئالی «و ما ربّ العالمین»
موتابەق ناوێ جواوی یەقین
کە تۆ سوئالت لە ئاسمان وێ
جواوت دەشێ لە ڕێسمان وێ
یانییهای سەلاح خۆتت لێ گومە
حاسڵت چەنەی بێ سەر و دومە!
بۆچ هۆشت نییە خالیقی مەعبوود
تۆی بۆ چە کارێ ئاوردە وجوود؟!
بچۆ بسووژێن دەماخ لەو کاردا
هەرتا نەسووژێی ئاخر لە ئاردا
عەقڵ بۆ خاتر عوبوودییەتە
نەک بۆ دەرکی سیڕ روبووبییەتە
عەقڵ ئەوەتە هەرتا بتوانی
هەر حوسن و قوبحی شەرعی بزانی[٢٣]
عەقڵ ئەوەتە بە عیلم و عەمەل
نەیێڵی[٢٤] دیوار دین بوێ خەلەل

ناوێ: نابێت. جواوی: جوابی. وێ: بێ، ببێ. ڕێسمان: تاڵی بەن و دەزوو. یانییهای: یانێ، واتە. چەنە: قسەی زۆر. دوم: کلک. سەر و دوم: سەر و کلک، بەرودوا. بسووژێنە: بسووتێنە. نەسووژێی: نەسووتێی. لە ئاردا: لە ئاگردا.

واتە: مرۆڤ کە فامی بەهێز بوو گەیشتە ڕادەی تێگەیشتن پێویستە بە پێی توانا بۆ وەرگرتنی زانست هەوڵ بدات و، ئەو شتانەی نایانزانێت فێریان ببێت، واتە: ئەو شتانەی کە زۆر پێوەندییان بە ئادەمزادەوە هەیە چ لە لایەنی ئایین و چ لە لایەنی ژیانەوە، هەروەها زانینی ئەو شتەی دەبێتە هۆی دەرچوون لە پایەی نزم و گەیشتن بە پایەی بەرز بخاتە پێش زانینی شتێ کە سوودی کەم

بێت، یا زانینی شتێ کە لە وزەیدا نەبێت، وەک پرسیاری شاگردی سەرەتایی لە بابەتی کیمیا و فیزیا و جەبر و موقابەلە، یا پرسیاری مرۆڤ لەو شتانەی لە سروشت بەدەرن (ماوراء الطبیعة)، یا پرسیار لە نهێنیی نوور و رووناکیی دڵی پێغەمبەران و دۆستانی خودا، یا پرسیار لە چۆنیەتیی دەرکەوتنی زاتی خودا خۆی کە لە وزەی ئادەمزاددا نییە؛ چونکە هێزی ئادەمزاد کەم و کورتە و لە رادەیەکی تایبەتی و دیاری بەولاوە بڕ ناکات و، ناتوانێ پەی بە شتی بێسنوور بەرێت.

ئەوەتا فیرعەون کە پرسیاری لە حەزرەتی مووسا کرد(د.خ) و وتی (و ما رب‌العالمین) واتە: حەقیقەتی خودای هەموو جیهان چییە؟ حەزرەتی مووسا وەڵامی بەوە نەدایەوە کە بڵێ چییە، بەڵکو وەسفەکانی بۆ هێنایەوە و فەرمووی خودای (رب السموات والارض و ما بینهما ان کنتم موقنین). فیرعەون کە وەڵامەکەی مووسای بە دڵ نەبوو «قال لمن حوله الا تسمعون» واتە: بە دەور و پشتەکەی خۆی وت: نابیسن کە وەڵامەکەی مووسا لەگەڵ پرسیارەکەی من چەند ناجۆر و نەگونجاوە؟ ئەمجار حەزرەتی مووسا فەرمووی (ربکم و ربّ آبائکم الأوّلین). دووبارە فیرعەون تووڕە بوو (قال ان رسولکم الذی ارسل الیکم لمجنون) واتە: وتی ئەم پێغەمبەرەی بۆ ئێوە نێرراوە شێتە، بەڵام مووسا هەر بە باسی سیفەتەکانی خودا وەڵامی فیرعەون ئەداتەوە، تا دواجار دەفەرموێت (ربّ المشرق والمغرب و ما بینهما ان کنتم تعقلون) واتە: خودای خۆرهەڵات و خۆرنشین و ناوبەینیان، ئەگەر عەقڵتان هەیە؟! چونکە نە فیرعەون و نە قیبتییەکان و نە حەزرەتی مووسایش لە وزەیاندا نەبوو حەقیقەتی زاتی خودا دەربخەن و بیزانن.

وەکوو مەولەوی دەفەرموێت پرسیاری فیرعەون لە حەزرەتی مووسا(د.خ) بە رستەی (و ما رب العالمین) کە پرسیارە لە حەقیقەتی زاتی خودا، وەڵامەکەی بە دڵی فیرعەون نابێت و لەگەڵ پرسیارەکەدا دەق بە دەق نابێت؛ فیرعەون پرسیاری حەقیقەتی زاتی خودای لێ دەکات و ئەمیش بە وەسفەکانی خودا وەڵامی دەداتەوە، چونکە مووسای لێپرسراو ناتوانێ ئەو حەقیقەتە روون بکاتەوە و وەڵامی بداتەوە.

مەولەوی دەفەرموێت: تۆ کە پرسیارت دەربارەی ئاسمان بێت و داوای روونکردنەوەی شتێ بکەیت بەرز و دەستپێنەگەییو، لە وزەدا نەبوو بێت وەڵامت دەبێ لە رێسمان بێت، واتە پێویستە بە بەنی دەسڕێسی ژنان پەتێک دروست بکەین و دەست و باڵی تۆی پێ ببەستینەوە، چونکە شێت دەبێ ببەسرێتەوە.[٢٥] ئەمەیش واتە تۆ بەرژەوەند و قازانجی خۆت نازانی و لێت ون بووە و کارت لە دیاندا قسەکردنی بێسەروبەر و بێبەرودوا و چەنەدانی بێسوود و بێکەڵکە.

بۆ بیر ناکەیتەوە لەوەی کە پەروەردگار تۆی بۆچی دروست کردووە؟ بـڕۆ دەمـاخی خـۆت بـەو کارەدا بسووتێنە کە خـودا تـۆی بـۆ دروسـت کـردووە؛ هـەتا لـە ئەنجامـدا لـە ئـاگری دۆزەخـدا نەسووتێیت.

ئەگەر خۆت بە ژیر دەزانی ژیری بۆ ئەوەیە بەندەیی خودای پێ بکەیت، نـەک بـۆ ئەوەیـە کـە پەی بە نهێنیی حەقیقەتی خودا بەری؛ ئەوە لە وزەی ژیریی سنووورداری تۆدا نییە و خـۆتی پێـوە ماندوو مەکە.

عەقڵ و ژیریی بۆ ئەوەیە لە رووی شەرعەوە جوانیی و ناشیرینیی کردەوەی پێ جیا بکەیتـەوە، کە وەک وتمان کاری جوان ـ بە پێی شەرع ـ ئەوەیە ببێتە هۆی ستایشـی دنیـا و پاداشـی دوارۆژ، کاری ناشیرینیش ئەوەیە ببێتە هۆی زەممی دنیا و تۆڵە و سزای دوارۆژ، کە ئەمانـەت زانی کـاری جوان بکەیت و لە کاری ناشیرین دوور بکەویتەوە.

عەقڵ و ژیریی بۆ ئەوەیە بە زانست و کردەوە هەوڵ بدەیت و نەیەڵیت دیواری ئایین لەق بێـت و کەلەبەری تیبکەوێت و زیانی پێ بگات.

لابـــە لـــە حـــوزوور ئـــەربابی ئـــەلباب
(لا یعنـــی) ســـوئال بـــێ‌مـــەعنی خیتـــاب
هەرکـەس بـە ئیمـان ئیسـلام و ئیحسـان
موتەحـــەللی وێ پێـــی بلـــێ ئینســـان
لـــە خدمەتیـــدا گشـــت ئـــەجزات دڵ وێ
ئـەو دڵـە بـۆ فـەیز گۆشـەی وەکـوڵ وێ
یەک لەحزە سوحبەت ئەو تەرزە شەخســە
بەوتـــەرزە، تـــەنخوای عومرێکـــت بەســـە
ئەر نەفسـت ناسـی (ناسـی) و [٢٦] لەئیمـە
(فارتمنّهـــــا بـــــذی الرّتیمـــــة)
ئینکـــاری ئـــەحواڵ ئـــەولیای کیبـــار
نـــەفیی کـــەرامات ئـــەحراری ئـــەبرار
بـە فـەرموودەی چەنـد شـوهبی ثـاقیبـە
(یـــــؤدّی الـــــی ســـــوء العاقبـــــة

أعلِهِم ربّی! بِرمّتِهِم
وارزقنا رضاک بِهمّتِهِم
أمِتنا علی مَحَبّتِهِم
واحشُرنا طراً فی زُمرتِهِم)

لایعنی سوئال: پرسیاری بێمەعنا و بێسوود. بێمەعنی خیتاب: قسەی بێ ڕێ و شوێن. موتەحەللی: ڕازاوە. گۆشە: بە لەهجەی هەورامی دیزەی چێشتلێنانە[٢٧]. وەکول: گەرم و بە جۆش و کوڵ. تەنخوا: لەباتی، بەشی. (ناسی)ی یەکەم کوردییە، لە ناسینەوە و هاتووە. (ناسی)ی دووەم عەرەبییە، لە نیسیانەوە هاتووە. ڕەتیمە: تاڵە دەزوویەکە لە پەنجەوە دەبەسترێت بۆ ئەوە شتێک کە مەبەستە لەبیر نەچێتەوە، کە تەماشای دەزووەکە کرا شتەکە دەکەوێتەوە بیر.

واتە: لە بەردەم ئەو زاتە پایەدارانەدا کە خاوەن دڵن وەک دۆستەکانی خودا و زانایانی لەخوداترس و ناودار پرسیاری بێسوود و قسەی بێجێ مەکە و خۆت لە خێر و بەرەکەت ناهومێد مەکە، هەموو کەس ئەو کەسە نییە کە سوودی لێ وەربگریت، بەڵکو ئەو ئینسانە خاوەنباوەڕ و دڵسۆزی و ئیحسانە، کە هەمیشە لە ئاگاداریدایە و چاوەڕوانی نوور و بەرەکەتە لە لای خوداوە، تەنها ئەوە شایانی ئەوەیە پێی بڵێیت ئینسان، جا دیارە لە بەردەمی ئەم جۆرە چاکانەدا نابێت پرسیاری بێسوود و قسەی بێجێ بکەیت، بەڵکو پێویستە هەموو ئەندامی لەشت بکەیت بە دڵ، بە کام دڵ؟ ئەو دڵەی وەک دیزەی سەر ئاگر هاتبێتە جۆش و کوڵ و چاوەڕێی ئەوە بکەیت بە (توجّهات)ی دەروونی و بە ئەنفاسی قودسی بروانن ئەو دیزە بەجۆشە و نمەکی تەمکین و تامی چەشی شیرینی تێ بکەن؛ بێگومان ساتێ لەگەڵ ئەواندا بەو چەشنە تایبەتییە بەشی عومرێک دەکات.

جا ئەگەر نەفسی خۆتت ناسی و زانیت کە بێکەرامەتە و ئامۆژگاریی باشی لە بیر دەچێتەوە، پێویستە ئاگاداری بکەیت و ئەم دەزووەی بکەیتە پەنجە، مەبەستی لە دەزووەکە واتای دوو شیعرەکەیە «ئینکاری ئەحوالی...» تا «سوء العاقبة». واتە: هەموو جار بیدە بەگوێیدا کە بە فەرموودەی زانایانی خاوەن هۆش و وریا کە وەک ئەستێرەی پرشنگدار لە ئاسمانی زانیاریدا دەدرەوشێنەوە ئینکارکردنی ئەحوالی ئەولیای گەورە و دانپێنەنان بە کەراماتی دۆستە نزیکەکانی خودادا مرۆڤ ڕادەکێشێت بۆ ئەنجامی خراپ و بەدبەختی؛ چونکە ئینکاری ئەوان ئینکاری ڕۆحانییاتی پاکە، ئینکاری ڕۆحانییەتیش ئینکاری غەیبە، باوەڕ بە غەیبیش سەرمەشقی قورئانی

پیرۆزە و لادان لە خەتی قورئانی پیرۆزیش لا دانە لە ئیسلام و ئیمان (اعاذنا الله برحمتە و اعاننا بإحسانە و مغفرتە).

خودایا پایەی دۆستەکانت بەرزبکەرەوە و، ڕەزامەندی خۆت بکە بە رزق و ڕۆزیمان و، لەسەر دۆستایەتی و خۆشویستنی ئەوان بمانمرێنە و، لەگەڵ کۆڕی ئەواندا حەشرمان بکە.

هەرکەسێ بە دڵ لەگەڵ دڵداران
بژی و بمێنێ لە ڕۆزگاران
بێگومان ساتێ لە دنیا دەرچوو
لەگەڵ ئەوانا ئەکا هات و چوو
لە ڕۆژی حەشرا و لە کاتی نەشرا
لەگەڵ یارانا وەرئەگرێ بوشرا
(کما تحیون انتم تموتون
و کما متم حقا تبعثون)

***

١ـ ئەم سەرباسە لە نوسخە دەستنووسەکەدا نییە، لە نوسخە چاپەکەدا دوو سەرباس نووسراوە، یەکەم (مبحث الامتحان)ە کە لە پێش شیعری (لیبلوکم...) و، دووەم (مبحث الاولیاء)ە کە لە پێش بەیتی (ئەولیایچ...) دانراوە. ئێمە یەک سەرباسمان دانا و، لە پێش بەیتی (موشتەری...) دامانناو، چونکە سەرباس هەبێ ئەمە شوێنیەتی.

٢ـ لە لایەکیتریشەوە ئەوە دەگەیەنێت ئەگەر ئینسان خۆی لە سەنگەکە بدات کە دەخرێتە تایەکی ترازووەکە، کێشانەکە راست دەرناچێت. بێجگە لەوەیش کۆکردنەوەی وشەکانی موشتەری، میزان، مانگ، بورج، تیر، کەوان، سەنگ، ترازوو تەناسوبی تێدا هەیە.

٣ـ دەفعێ: سووککراوی (دەفعەیێ) یە.

٤ـ بە رای من ئەم عیبارەتە، هەرچۆن تەئویل بکرێ و مەعنای لێ بدرێتەوە، نەدەبوو لێرەدا بە کار بهێنرایە، چونکە لە قورئانی پیرۆزدا تەنها بۆ خوای گەورە بەکار هێنراوە.

٥ـ من کەر: ئەمە شێوەنووسی دەستنووسەکەیش و چاپەکەیشە. کەواتە دوو وشەیە (من) و (کر) کە یا بە (کەر) یا بە (کەڕ) ئەخوێنرێتەوە. هەرکامیان بێ ئەگونجێ و، بەیتی پاشەوەیش هەر ئەمە روون ئەکاتەوە.

٦ـ لە دەستنووسەکەدا (مورید بی و قالی) یە. لە چاپەکەدا (مورید بی قالی و) نووسراوە.

٧ـ لە دەستنووسەکەدا بە پەراوێز (لاری) لە (لاریدا) بە دوو جۆر مەعنا لێدراوەتەوە، یەکەم: لاری: خواری، دووەم: لاڕێ.

٨ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا دەڵێت: لە «ئەهلی تەئسیر»ەوە تا سەرەتای «مەکر و کەید» قسەی کابرای پرسیارکەرە.

٩ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا دەڵێت: (ڕ)ی (کەر) هەڵدەگرێ موخەففەف بێ یا موشەددەد. واتە: کەر یا کەڕ، بەلام کەڕ جوانترە.

١٠ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لەسەر (بەڵێ) نووسراوە: لاکین.

١١ـ لە دەستنووسەکەدا (غیشاوەی)، لە چاپەکەدا (غیشاوە)یە ئەم بەیتە ئیقتیباسە لە ئایەتی(٦) و (٧)ی سوورەتی (بقرە).

١٢ـ ئایەتی (٧٦) سوورەتی (یوسف).

١٣ـ (قل الروح من امر ربی و ما أوتیتم من العلم الا قلیلاً). ئایەتی (٨٥) سوورەتی (اسراء).

١٤ـ ئایەتی (٢٥٥) سوورەتی (بقرە).

١٥ـ لە کۆکردنەوەی دوو (بیر)ی هەریەک بۆ واتایەکدا جیناس هەیە.

١٦ـ سوورەتی (یوسف) ئایەتی (٩٤).

١٧ـ لە نوسخە دەستنووسەکەدا «بیتە أو کول» نووسراوە کە دەبێتە (بێتە ئەو کول)، لە نوسخە چاپیەکەیشدا بەهەمان شێوەیە، بەلام بێ سەر و زەنە، تەنها بۆرێک لەسەر (ل) ەکە بەهەڵە نووسراوە، چونکە هی (ک)ە کەیە.

هەر چۆن بێ ڕستەکە بە لەهجەی تاوگۆزی و دەوروپشتی (بێتەوکول)ە و، ئەسڵەکەی (بێتە ئەو کول) ە، ئەگەر وا نەخوێنرێتەوە کە ئێمە دامانناوە نیوەدێڕەکە لە نیوەی پێشووی درێژتر دەبێت.

١٨ـ لە نێوان دوو نیوی ئەم شیعرەدا (لف) و(نشر)ی مورەتتەب هەیە؛ (بە امنـاوە) پێوەندی بە (تێـی) و (إنّـا معکم) بە (دەڕۆیەوە...) وە هەیە.

١٩ـ ئەمە لەبەر ڕووناکیی شێوەنووسینی نوسخە دەستنووسەکەیە، کە (فتحە) لەسەر هەردوو (هێ) کە دانراوە و، لە پەراوێزیشدا واتای شیعرەکەی بەم جۆرە لێداوەتەوە.

٢٠ـ ئایەتی (٦٥) سوورەتی (الکهف).

٢١ـ ئایەتی (٤٠) سوورەتی (نمل).

٢٢ـ ئایەتی (١٤) سوورەتی (بقرە).

٢٣ـ لەبەر ڕووناکیی پەراوێزی دەستنووسەکەدا (بتوانی) و (بزانی) یا (بتوانێ) و (بزانێ) هەردووکیان دروستن.

٢٤ـ بە پێی پەراوێزی دەستنووسەکە بە (نەیێڵێ) و (نەیێڵی) یش دەخوێنرێتەوە.

٢٥ـ فەرهەنگی بورهانی قاتیع ئەڵێت: «ئاسمان و ڕیسمان قسەیەکی نەستەقە، لە شوێنیکا ئەوترێت یەکێ بەرامبەر بە قسەیەکی بە عەقڵاچوو وەلامێکی کەس‌نەوتوو بداتەوە» جەوهەری مەبەستی مەولەویش هەر ئەمە ئەگرێتەوە، بەلام لەگەڵ نەختێ جیاوازیی شوێنی بەکارهێنانا. دوور نییە بناخەی ئەم قسەیەیش ئەوە بێ کە ئاسمان زۆر بەرزە و گوریسیش کورتە، بەو گوریسە کورتە مەحاڵە بە ئاسمان گەیشتن، هەروەها دوور نییە ئەم ڕستەیە وەختی خۆی لە نێوان دوو خوێنەواردا وترابێ و مەبەست ئەوەبێ (ئاسمان و ڕیسمان) ئەگەرچی حەرفەکانیان و شێوەنووسینەکانیان تا ڕادەیەک لەیەک ئەچن، لە مەعنادا زۆر لە یەکەوە دوورن.

٢٦ـ لە کۆکردنەوەی (ناسی) و (ناسی)دا جیناسی تەواو هەیە.

٢٧ـ دووریش نییە هەر گۆشەی بە مەعنا (زاویە) بێت واتە گۆشەی کـەنارەگیریی سـۆفییان کـە بـیر لـە خـودا دەکەنەوە.

## مبحث الخلفاء والصحابة [1]

خـــەیری ئـــەو زەوات (ذاتُ الكرامـــە)
فیرقـــەی عەلییـــەی ســـەحبی کیرامـــە
ئەوانـــەن ئـــەوان، چاکیـــان بنـــاس،
(خیـــر أمّـــةٍ أخرجـــت للنـــاس)
ئەدەس ئەوان کەوت دەرەجـەی قوبـوول
ڕەزامەندیی حـەق، سـوحبەتی ڕەسـوول
بکـــە بـــە چـــاوی دڵ تەماشـــایان
لـــە قورئانـــەدا مـــەدح و ثـــەنایـــان
ئینســـافت بـــوێ نـــەزەر کـــە وردورد
چلۆنـە شەخسـێ خـودا ثـەنـای کـرد
نەک هەر لە جایێ[2]، جا یەکێ، جـا دوو،
ڕاس وە بـێجـادوو (جاهـدوا، جـادوا)
بـــە موجاهـــەدەی ئەســـغەر و ئەکبـــەر
بە جوودی مەیسوور یا مەعسوور یەکسـەر
بە جەلای فیتـرەت لـە ژەنگـی فـەترەت
بە جەلای مەوتین مـەئلووف و هیجـرەت
بـە نـەفس و بـە مـاڵ (في سـبیل‌الله)
(بـــا الله، مـــع الله، فـــي الله، لله

وَالله اشـــــتری و هـــــم قـــــد شَـــــرَوا
مـــا لهـــم، بـــل مـــا لهـــم، مـــا عَتَـــوا)
ناکـەت چـە حاجـەت پێـوان بـە (اوان)
سـەد هـەماری غـەیر بـە مشـتی ئـەوان
هـای لـەو تەسـدیقە و عـەزم و ئاهەنگـە
لـەو بـەزلی مـاڵ و ڕۆحـە بەوڕەنگـە
لـەو قەولـە، فکـری چـاک لـێ کـەرەوە،
لـە گەرمـەی جەنگـدا داتـە دەرەوە -
(مـــن فـــمِ الانصـــار والمهـــاجرة:
«إمّـــا الغنیمـــة إمّـــا الآخـــرة»)
هـــیچ واریـــد نـــەوێ لـــە شـــەئنیاندا
بەســـن بـــۆ دەلیـــل لـــە فەزلـــیاندا

راس: راست. وە بێجادوو: بێسیحر، بێفێڵ. فەترەت: ئەو ماوەی کە شـەریعەتی پێغەمبـەری پێشوو نەماوە و کز بووە و پێغەمبەری تازەیش نەنێرراوە. (جەلا)ی یەکەم: پاکبوونەوە. (جەلای) دووەم: دەرچوون و بـەجێهێشـتنی شـوێن. داتـە دەرەوە: دەهاتـە دەر، دەردەهـات. ناکـەت چ حاجەت: چ حاجەت ناکات، پێویست ناکات. اوان: یا (اوانی)ی جـەمعی (آنیـە)یـە و (آنیـە) یـش جەمعی (أناء)ە واتە دەفر. ئەوان: زەمیری جـەمعی غائیبـە (هُـمْ) واتـە: یـارانی پێغەمبـەر(د.خ). هەمار: عەمار، شوێنی هەڵگرتنی دەغل و دان و رزقی زستان لە مالا.

واتە: چاکترین دۆستانی خودا و، بالاترین کەسانی خاوەنکەرامەت تیپی پایەبەرزی هاوڕێیـانی پێغەمبەرن، باشیان بناسن، ئەوانەن کە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەربارەیان فەرموویەتی: (کنتم خیر أمة أخرجت للناس تأمرون بالمعروف و تنهون عنالمنکر و تؤمنون بالله...) [٣] ئەوانەن کە پایەی قوبووڵیان لای خوداوە دەست کەوتووە و، خودای گەورە لێیان رازییە و، بە هاوڕێیـەتیی پێغەمبەر شەرەفیاب بوون.

بە چاوی دڵ، بە قووڵی تەماشایان بکە، ورد بەرەوە کـە چـۆن خـودای گـەورە گـەلێ جـار لـە قورئانی پیرۆزدا ستایشی کردووون، جاری وا هەیە تەنها ستایشی یەکێکی کـردووە، وەک ئایـەتی

(ثانی اثنین إذ هما فیالغار اذ یقول لصاحبه لا تحزن انّالله معنــا...) [٤] کـه ستایشـی حـەزرەتی ئەبوبەکری تێدایە[٥].

جاریوایش هەیە ستایشی کۆمەڵێکیانی کردووە وەک ئایەتی (و یطعمـون الطعـام علـی حبّـه مسکینا و یتیماً و أسیراً) [٦] لە ستایشی حەزرەتی عەلی و فاتمەی حـەرەمیدا، یـا وەک ئایـەتی: (والذین آمنوا و هاجروا و جاهدوا فی سبیلالله والذین آووا و نصروا أولئک هم المؤمنون حقّـاً لهـم مغفرة و رزق کریم) [٧] ئەو هاوڕێ پایەبەرزانەی حەزرەت(د.خ) بە راستی، نەک بە فڕوفێڵ جیهـاد و غـەزایان کـرد لـە رێگـەی خـودادا و سەروماڵـیان بەخشـی بـۆ دامەزرانـدنی ئـایینی ئیسـلام، جیهادەکەیان دوو جۆر بوو: جیهادی ئەکبەر کە پاککردنەوەی نەفسە لە خوو و خدەی ناپەسـەند و رازاندنەوەیەتی بە رەوشتی پاک و بەرز. جیهادی ئەسغەر کە بریتی بـوو لـە شـەڕکردن لەگـەڵ کافران لە پێناوی ئایینی ئیسلامدا و بەخشندەیی و دەهەنەییان بە شتی ئاسان و گـران بـوو. بـە هۆی نووری ئایینی ئیسلامەوە دڵ و دەروونیان لە ژەنگی ماوەی بێپێغەمبـەریی پـاک بوویـەوە و زاخاودرا، هەروەها لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئایینی خاوێنی ئیسلامدا ماڵ و حاڵ و جێگا و رێگای خۆیان و باو[و با]پیریان بە جێ هێشـت، تێکـڕا (مهـاجرین) و (انسـار) بـە نـاوی خـودا و لەگـەڵ یارمەتی خودا و لە رێگای خودادا و، هەر بۆ خودا، بۆ هیچی تر نا، سەروماڵیان دەبەخشی.

نەک هەر ماڵ، بەڵکو هەرچییان هەبوو لە ماڵ، لە پایە و ناو، لە هێز و توانا، بێدرێغ فرۆشـتیان بە خودا و خودا لێی کڕین؛ بۆیـە وەک لـە کتێبـەکانی حـەدیسدا بـاس کـراوە، پێغەمبـەر(د.خ) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێ بەقەدەر کێوی ئوحود لە رێگای خودادا باخت بکات ناگاتە پایەی مشتێ کە ئەو هاوڕێیانە لە رێگای ئیسلامدا دایان، جا لەم رووەوە پێویست نییە کێشـانە و پێوانـە بهێنیـە کایەوە؛ مشتێ لە خێراتی (اسحاب)ی پێغەمبەر(د.خ) بەرابەر بە عەمارێکە لە خێراتی خەڵکی تر.

ئای لە باوەڕی بتەویان بە ئایین، ئای لە بەخشندەیی و بە دەسـت و دەهەنـەییان کـە سـەر و ماڵ و سامانیان لە پێناوی ئاییندا باخت دەکرد، ئای لە مەعنا و واتای بە نرخی ئەو قسەی کە لـە دەمی هاوڕێکانی پێغەمبەر، بە موهاجیر و ئەنساریانەوە دەردەچوو لە گەرمەی جەنگدا، کـە کـاتی تاقیکردنەوەی خۆگرییە، کە دەیانفەرموو یا سەردەکەوین و دوژمن دەشکێنین و بە پێی یاسـای جەنگ و ئایینی ئیسلام ماڵیان دەبەین، یا لەم رێگا پیرۆزەدا گیانمـان باخـت دەکـەین و شـەهید دەبین.

بێگومان ئەگەر هیچ ئایەت و حەدیسێکیش لە ستایشی ئەمانەدا نەهاتبێ، تەنها ئەم سیفەتانە و ئەم رەوشتە بەرزانە بەسن بۆ دەلالەت لەسەر گەورەیی و بەرزیی پایەیان.

دەزانی، نەکەی ئەر لە حەق عودوول،
(ذوو اجتهادٍ(٨) كلّهُم، عدول)
(ليسَ لهم مِن أحَدٌ مُعادِل
وَ لِما جَرى مِنهُم مَحامِل)
(بهوى النفسِ أصلاً ما التحق
بل كان للحق في الحق على الحق)
کوژیاگ و بکوژ وان لە گوڵگەشتدا
لە گوڵگەشتی دەشت سەحرای بەهەشتدا
بۆی دەبێت هەر یەک بە قەدەر نەسیب:
ئەجرێ بۆ موخطیء، دوان بۆ موسیب
جوننەی ئیجتیهاد ئەسحابی جەننەت
نایبا تیری تەعن ئەربابی جیننەت
بوغز و شەتمیان، سەب، تەعن و لەعنەت
یا کوفرە، ئەڵبەت، یا فیسق و بیدعەت
ئەدووی هەرکامێ لەوانە کەوی
توشیاری یەکێ لەمانە دەوی

ئەر: ئەگەر. عودوول(ی یەکەم): لادان. نەکەی ئەر: ئەگەر نەکەی. عودوول(ی دووهەم): جەمعی (عادل)ە واتە ئینسانی راست و بڕوایێکراو و دادپەروەر. کوژیاگ: کوژراو. گوڵگەشت: گوڵزار. جوننە: قەڵغان، سوپەر، پارچە ئاسنێکە وەک ساجی نان کردن شەڕکەری ئەوسا لە کاتی شەڕا رووبەرووی دەم و چاوی گرتوویە بە دەستیەوە و خۆی پێ پاراستووە لە شیر و تیری دوژمن. جەننە: بەهەشت. جیننە: شێتی. ئەدووی: دوای، شوێنی. کەوی: بکەوی. تووشیار: تووش، گورفتار، دووچار. لەوانە: ئیشارەیە بۆ ئەو سیفەتانەی لە نیوەی یەکەمی بەیتی پێشوودا ناویان هێنرا. لەمانە: ئیشارەیە بۆ ئەو سیفەتانەی لە نیوەی دووهەمیا ناویان هێنرا.

واتە: ئەگەر لە ڕێگەی ڕاست و ڕەوا لانەدەیت دەزانی هەموو یارانی حەزرەت(د.خ) عادیل بوون و کەس لە ئێمەمانان هاوتایان نییە، ئەو شەڕ و شۆڕ و شتانەیش کە ڕوویانداوە لـە ناویانـا بـارێکی وایان بۆ دەدۆزینەوە کە کار نەکەنە سەریان؛ بێگومان ئەو شـەڕانە کـە لەبەینیانـدا ڕوویداوە لـە ئارەزووی نەفسەوە نەبووە و لە ڕێگەی خودادا بووە و بۆ خودایان کردووە و هـەردوولایان بـە پێـی بۆچوونی خۆیان لەسەر حەق بوون، ئەوانـەیان کـوژراو و ئەوانـەیان بکـوژ بـوون هـەردوولایان لـە گوڵـزاری بەهەشــتدان، هــەردوولایان پاداشـیان دەدرێتــەوە؛ ئەوانــەیان موسـیب بــوون و بۆچوونەکەیان ڕاست بووە دوو پاداشیان هەیە و، ئەوانەیان موختی بـوون و بۆچوونەکـەیان ڕاسـت نەبووە تەنها یەک پاداشیان هەیە.

تیر و تانەی ئەو شێت و نەفامانەی دوژمنی ئایینن کار لە قەڵغانی ئیجتیهاد (بۆ چـوون)ی ئـەو بەهەشتییانە ناکات.

ڕق هەڵگرتن لەوان، جنێو پێدانیان، تانە و تەشەر لێدانیان، لەعنەت لێکردنیان ئەنجامەکـەی یا کوفرە یا فیسق و بیدعەتە، واتە: ئەگەر کەسێ ئەوانە بە حەڵاڵ بزانێ و بیانکـات کـافر دەبێـت، خۆ ئەگەر بە حەرامیان بزانێت بەڵام هەر بیانکات ئەوا فاسق دەبێت و دەبێتە ئەهلی بیدعەت.

***

١ـ ئەم سەرباسە تەنها لە نوسخە چاپەکەدا هەیە، لە دەستنووسـەکەدا نییە.

٢ـ لە نوسخە چاپەکەدا (نەک لە هەر جای) ە، دیارە هەڵەیە.

٣ـ ئایەتی (١١٠) سوورەتی (آل عمران).

٤ـ ئایەتی (٤٠) سوورەتی (توبە).

٥ـ ئەم ئایەتە لە چوار لاوە مەدحی حەزرەتی ئەبوبەکری تێدایە،

یەکەم: بوون لە ئەشکەوت لەگەڵ پێغەمبەردا(د.خ) لەخۆبووردن ئەگەیەنێ.

دووەم: تەعبیری (ثاني اثنين) واتای پایەی تێدایە.

سێهەم: نیوە ڕستەی (لصاحبه) پیاهەڵدانە.

چوارەم: مسۆگەر بوو خوایان لەگەڵدایە و دەستی یارمەتیی غەیب یاریدەریانە (لا تحزن إن الله معنا).

٦ـ ئایەتی (٨) سوورەتی (انسان).

٧ـ ئایەتی (٧٤) لە سوورەتی (انفال).

٨ـ لە چاپەکەدا (ذو اجتهادٍ) ە، ئەوەی ئێمە نووسیومانە هی دەستنووسەکەیە و هەر ئەوەیش ڕاستە.

## مبحث (یزید) [1]

لـەعنی یەزیـدیچ بەحسـی نـەدەین تـوول
ئیمـان پەنهانــە و خاتیمــە مــەجهوول
راســە ئــەفعالی قــەبیحی زۆر کــرد
بەڵــێ چــووزانی ئیمــانی نــەبرد؟!
لەعنــەت یانێهــای تــەردیکی ئەبــەد
لـە رەحمـەتی حـەق رەحیمـی سـەرمەد
بێبورهان، دەخیل! کەی جـائیز بـوو کـەی
حـوکم بـە لـەعنی خوسووسـی بکـەی؟!
ئــەر قــوبحی فیعلــی زاهــیر دەلیلــە
ســەد وەک مــن و تــۆی تێــدا زەلیلــە
نـە لـەعنی یەزیـد بـێحوججـەت بکـەین
نــە لافی ئــیخلاس بـۆ حوسـەین بـدەین
چەند کـەس هـەن بـاغیض بـۆ زاتی یەزیـد
مەوسووف بە وەسفی یەزید (بل یزیـد) ![2]
مــوحیبن بــۆ زات حوســەینی شــەهید
نـەفوور لـە سـیفات حوسـەینی شـەهید
ئــازاردەر بــە حــاڵ ئــەولادی حوســەین
تــالانکــەری مــاڵ ئــەولادی حوســەین

باغیضـــی بـــە دڵ ئـــەولادی حوســـەین
دوشمـــن و قـــاتڵ ئـــەولادی حوســـەین
زاتی یەزیـــد و ئەوســـافی حوســـەین
پیاگێکییـــان لـــێ تـــەرکیب دەکـــەین
یـــەکێکیچ لـــە زات حوســـەینی شـــەهید
لـــــە رەزائیلـــــی یەزیـــدی پەلیـــد
ئـــەو ببـــوغزێنن، ئـــەم بحـــوببێنن[٣]
بـێن ئـەو کـەرە لـەو هەرگـە[٤] دەرێـنن
ئەمـــە دیـــن نییـــە، پێـــی دەڵـــێن گەمـــە
خـــودا عالمـــە چـــی دەکـــەن ئەمـــە
شـــیعەیێ وتی: بـــە کەعبـــەی ئـــەعزەم
تـــا بمێنـــێم لـــەعن یەزیـــد هـــەر دەکـــەم
وتم: بـــە کـــەلام حـــەزرەتی (علـــیم)
تـــا بمـــرم (مُحِـــبِّ) حـــەزرەتی (علـــی) م[٥]

یەزیدیچ: یەزیدیش. بەڵێ: بەلام، لاکین. یانێهای: یانێ. (بل یزید): سیفەتی بەدی لـە یەزیـد زیاترە. پیاگێکیان: پیاوێکیان. یەکێکیچ: یەکێکیش. پەلید: مردار، پیس. بمێنێم: بمێنم.

واتە: با درێژە نەدەین بە باسی لەعنەتکردن لە (یەزید)ی کوڕی حەزرەتی موعاویە کـە دووەم خەلیفەی ئەمەوی بوو؛ ئێمە لەعنـەتی لـێ ناکـەین، لەعنـەت لـە هـیچ موسوڵـمانێکی بـەدکردار ناکەین، ئیمان شتێکی پەنهانە، بەچیدا ئەزانی ئەو بنیادەمە بەدکردارە ئیمانی نییـە، سـەرەنجام و دواڕۆژی ئینسانیش نازانرێ، بە چیدا بزانین کاتێ مردووە ئیمانی دەرنەبردووە، واتە: بـە ئیمانـەوە نەمردووە؟

لەعنەت: واتە دەرکردنی هەتاهەتایی لە رەحمەتی خودای گەورەی بەخشـندە، کـەوابێ چـۆن رەوایە بە بێبەڵگە لەعنەت لە یەکێکی تایبەتی بکرێت، بەڵێ لەعنەت بـە شـێوەیەکی گشـتی لـە کۆمەڵێک دەکرێت، وەک بڵێیت «لەعنەت لە کافران».

ئەگەر دەڵێیت لەبەر بەدکرداری لەعنەتی لێ دەکەم کەوابێ دەبێ لەعنەت لە سەدانی وەک من و تۆ بکرێت چونکە کردەوەی ناشیرینمان زۆرە؛ کەواتە نە بە بێهۆ لەعنەت لە یەزید بکەین و، نە بە درۆ لافی خۆشویستن و دڵسۆزییش بۆ حەزرەتی حسێن لێ بدەین.

گەلێ کەس هەن دەڵێن رقمان لە یەزیدە بەڵام خوو و رەوشتی ناشیرین و کرداری خراپیان لەو زیاترە، لافی خۆشویستنی حەزرەتی حسێن لێ دەدەن، کەچی زۆر دوورن لە خوو و ڕەوشتە بەرزەکانی ئەو وەک لەخوداترسی و خوداپەرستی و بەخشندەیی و دڵنەرمی و دڵسۆزی لەگەڵ موسوڵماناندا، بەڵکو رقیانە لە ئەولادی حسێن و ماڵیان تالان دەکەن و دەیانکوژن!

یەکە یەکەی ئینسان لە زات و ماهییەتدا یەکن، فەرقیان لە کردار و خوو و رەوشتدایە، لای ئایینی پیرۆزی ئیسلام خووی لەخوداترسی و خۆلەگوناهپاراستن و قازانج بەخەڵکگەیاندن تەوەرەی خۆشویستنە، هەرکەس لەخوداترس و خێرخواه بوو پێویستە خۆشمان بوێ، هەرکەس لە خراپە کۆی نەکردەوە و لە خودا نەترسا پێویستە رقمان لێی بێت.

باشە، ئەوا گریمان زاتی یەزید خوو و رەوشتە بەرزەکانی حەزرەتی حسێنی بوو، زاتی حەزرەتی حسێنیش، خوا نەخواستە خوو و رەوشتە پەستەکانی یەزیدی بوو، هەرگیز رەوای هەقە کە رقتان لە یەکەم بێت و دووەمتان خۆش بوێ، تەنها لەبەر ئەوەی یەکەم زاتی یەزیدە و دووەم زاتی حسێن. (دە وەرە ئەم کەرە لەم قوڕە دەربێنە!!).

ئینسان کە رقی لە یەزید بێ دەبێ رقی لە کردار و رەوشتە ناپەسەندەکانی بێت و لێیان دوورکەوێتەوە، هەروەها کە حەزرەتی حسێنی خۆش ویست دەبێ کردارە بەرزەکانی و رەوشتە نایابەکانی خۆش بوێ و هەتا دەتوانێ لێیان نزیک بێتەوە.

ئەمەیە کردەوەی بە گوێرەی ئایین.

هەر بە بۆنەی گوێنەدان بە زاتی رووت و گوێدان بە کردار و خوو و ڕەوشت (مەولەوی) دەفەرموێ: شیعەیەک وتی:

قەسەم بە ماڵی گەورەی خودا، واتە: کەعبە، هەتا بمێنم لەعنەت لە یەزید دەکەم [قسەکەی ئیشارەیە بۆ ئەوەی کە لە سەردەمی یەزیددا کەعبە هەندێ کەم ئیحتیرامی رووی تێکرد].

منیش وتم: قەسەم بە کەلامی خودای زانا منیش تا ماوم دۆست و خۆشویستی حەزرەتی عەلیم [ئەمەیش ئیشارەیە بۆ ئەوەی کە حەزرەتی عەلی (کرّم الله وجهە) لە جەنگی سیففیندا رێزی لە قورئان گرت و رازی بوو بە تەحکیمی بۆ برانەوەی جەنگی نێوان خۆی و موعاوییە و

پەیڕەوانیان کە هەردوولایان موسوڵمان بوون و گەلێکیشیان لە هاوڕێیـانی پێغەمبـەر(د.خ) بـوون ئەگەرچی لە ئەنجامدا بە زیانی خۆی دەرچوو].

تەعنە لـە ئەسـحاب سـەییدی سـەروەر
تەعنــە لــە دینــە، نییــەی باخەبــەر؟[٦]
ئــاخر ئــەم دیــنی ئیســلامی پاکــە
باعیســی چاکــەی دنیــا و عوقبــا کــە
لەوانـــەوە هـــات گەیشـــتە ئێمـــە
بــەوان پــاراو بــوو ئــەم زەویــی دێمــە
ڕوواتی ثوقـــات عـــودوول ئـــەوانن
موجتەهیـــدینی فوحـــوول ئـــەوانن
خــودا و ڕەســوول وان لــە مەدحیانــدا
مــونکیر وان لــە (ذمّ) لــە قەدحیانــدا
تــو خــودا بــێ بڵــێ پــێم وە پــەنهانی:
قســەی کــام لایــان بــە ڕاس دەزانی؟
هَــی لای مُنکِــر هَــی وَی لَبُــوت لَــولا
وَیلَـــهُ بُـــوتْ «أولـــی لَـــکَ فَـــأولی»
لــە تەنقیســی ســەحب دەکەویتــەو دەر
تەنقیســی جــەناب خــودا و پێغەمبــەر
لابـــە عەقیـــدەی ناپەســـەندیدە
(نعــوذ بـــالله مـــن ذی العقیـــدة!) [٧]
کافییـــە بۆمـــان ســـوننەت و کیتـــاب
(أمسِـــکُوا إذا ذکـــر الاصـــحاب)
(أفضـــل تلـــک الفرقـــة العظـــام)
چوارەی لە پێنج، هەزار ســاڵ تــەمام،[٨]

بـەر لـە ئـادەم بێـت وەلای فەرشـەوە،
ئـەنوار بـوون لـە لای راسـتی عەرشـەوە
بۆی راس مەر ئەو وەخت بۆت ئامشۆ کـا
دەماخـــت خەبـــەر توففاحـــە بـــۆ کـــا

مەر ئەو: مەگەر ئەو. ئامشۆ: ئاموشۆ، هاتوچۆ.

واتە: تانە و تەشەر و توانج گرتنە یـارانی پێغەمبـەر(د.خ) تانەیـە لـە ئـایینی ئیسـلامی پـیرۆز؛ چونکە ئەم ئایینە کە هۆی بەختیاریی هەردوو دنیایە لەوانەوە بـە ئێمـە گەیشـتووە، ئـەم زەوییـە دێمە بێئاوە کە بریتییە لە دڵ و دەروونی ئەم خەڵکە نەزانە لەوانەوە تێراو بوو و ئایینی وەرگـرت، ریوایەتکەری باوەڕپێکراوی ئایین ئەوانن، موجتەهیدی خاوەن پایە و مایـە ئـەوانن، جـا ئەگـەر، خودا نەخواستە، ئەوان پیاوخراپ دەرچن ئیتر کـێ دەمێنێتـەوە بـۆ گەیانـدنی ئـایینی ئیسـلام و قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر(د. خ).

بێجگە لەمە خودای گەورە لە گەلێ ئایەتدا ستایشی کردوون وەک (کنـتم خیـر أمـةٍ اخرجـت للناس...) ⁽⁹⁾ یا (والسابقون الأوّلون من المهاجرین والانصار والذین اتبعوهم باحسان رضیالله عـنهم و رضوا عنه...) ⁽¹⁰⁾ یا (لقد رضیالله عن المؤمنین إذ یبایعونک تحت الشجرة فعلم ما فـی قلـوبهم فانزل السکینة...) ⁽¹¹⁾ یا (محمد رسولالله والذین آمنوا معه أشدّاء علی الکفّار رحماء بینهم تـراهم رکّعا سجّداً...) ⁽¹²⁾.

هەروا حەزرەتی پێغەمبەریش(د.خ) گەلێ ستایش و تەعریفی کـردوون، کـەچی بەرانبـەر بـەم ستایشە، ئەوانە کە مونکیرن زەمیان دەکەن! جا تو خـودا وەرە بـە پەنامـەکی پـێم بڵـێ- چونکـە ئەترسم لەبەر (تەقیە) بە ئاشکرا نەتوانی رازی دڵی خۆت دەربڕیـ- تـۆ کـام لـەم دوانـە بـە راسـت دەزانی؟ فەرموودەی خودا و پێغەمبەری خودا یا قسە و هاشە و هووشەی مونکیران؟!

جا ئەگەر لایەنی مونکیران دەگری و قسەی ئەوانت لا راستە، وا منیش پێت دەڵێم: هەی قـوڕ بە سەرت بۆ ئەو لایەی گرتووتە، ئەوەی پێت باشـترە وەیلـە بـۆت و، ئایـەتی (أولـی لـک فـأولی) مژدەی ئەوەت دەداتێ کە جێگات وەیلە کە چاڵێکە لە قووڵاییی دۆزەخدا ⁽¹³⁾.

ئەنجا مەولەوی دەفەرموێت کەموکووڕی دانان بۆ یارانی پێغەمبەر(د.خ) کەموکووڕی دانانـە بـۆ خودای گەورە و بۆ پێغەمبەری خودا؛ لە لایەکەوە ئەوە دەگەیەنێت کە خودا، لەگـەڵ ئـەوەدا ئـەو پێغەمبەرەی کردووە بە دواهاوەری پێغەمبەران و ئایینەکەی کردووە بـە ئـایینی هـەموو جیهـان،

پێی نەکرابێ کۆمەڵێک پەیڕەوی زانا و توانا و دڵپاک و ئازا و چالاک و کردەوەچاک دروست بکات بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو ئایینە، هەروەها ئەوە دەگەیەنێت کە پیاهەڵدان و ستایشەکانی یارانی حەزرەت لە قورئانی پیرۆزدا درۆ بن!

لەولایشەوە واتای ئەوەیە ئەو پێغەمبەرە گەورەیە ئاگای لە یارانی خۆی نەبووبێت و، هەر فەرمودەیەکی لە ستایشیاندا فەرمووبێت، خوانەخواستە، درۆ بووبێت، بێ‌گومان کەم‌وکووڕی و درۆ بۆ خودای گەورە و بۆ حەزرەتی پێغەمبەری دواهاوەری پێغەمبەران شتێکی مەحاڵە.

کەوابوو ئەی برایان بیر و باوەڕی ناپەسەند لابەن و بڕیار بدەن کە (نص)ی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) مان بەسە، کە ئەوانە بە ئاشکرا باسی گەورەیی و بەرزیی پایەی یارانی پێغەمبەریان کردووە، لە سەرتان پێویستە کاتێ کە باسیان کرا ئێوە دەمتان بگرن و قسەی ناپەسەند نەکەن و هەرگیز بیر لە باوەڕی ناهەموار نەکەنەوە!

ئەنجا پاش ئەوەی باسی گەورەیی یارانی پێغەمبەری کرد دەفەرموێت:

گەورەترین یار لە نێو یارانی پێغەمبەردا چوار یارن لەو پێنج جێ‌شینانەی پێغەمبەر، کە لەسەر فەرموودەیەک لە پێغەمبەرەوە دەیگێڕنەوە، هەزار ساڵ پێش ئەوەی حەزرەتی ئادەم بێتە سەر فەرشی زەوی و دروست بکرێت لە گڵ، ئەوان لای راستی عەرشەوە نوور بوون.

لەم بابەتەوە بۆنی خۆشی ساغ کاتێ سەرت لێ دەدات کە لووتت بۆنی حەدیسی (تفاحە) بکات، ئەمەیش پوختەی حەدیسەکەیە:

شیخ (ابن حجر) ڕەزای خودای لێ بێت دەفەرموێت:محبّی تەبەری لە کتێبی (الریاض) ەوە دەگێڕێتەوە (والعهدة علیه): «أنّ جبریل أخبَرَ النبی(ص) انّه تعالی لمّا خلق آدم و أدخل الروح فی جسده أمرنی أن آخذَ تفاحةً من الجنة و أعصرها فی حلقهِ فعصرتها فیه بقطرات، فخلقک الله تعالی من القطرة الأولی، و ابابکر من الثانیة، و عمر من الثالثة، و عثمان من الرابعة، و علیّاً من الخامسة... الی آخر الحدیث».

جا ئەم حەدیسە هەرچەند لە حەدیسە ئاحادەکانە و (ضعیف)ە و (ابن حجر) بارەکەی خستووەتە ئەستۆی محبّی تەبەری، لە بەر ئەوە کە باسی پایەبەرزیی یارانی پێغەمبەر دەکات نرخی بۆ دادەنرێت، بە تایبەتی لە باسی گەورەیی ئەو زاتانەدا کە دەنگ و باسی گەورەییان گەیشتووەتە رادەی (تواتر).

(صلّی الله علی سیّدنا و آله و صحبه وأتباعه إلی یوم الدین).

***

١ـ ئەم سەرباسە تەنها لە نوسخە چاپەکەدا هەیە و، لە نوسخە دەستنووسەکەدا نییە.

شایانی وتنە لە چاپەکەدا (الیزید) نووسراوە، کە دیارە هەڵەیە و (یزید) راستە چونکە عەلەمە و ئەداتی تـەعریفی ناچێتەسەر.

٢ـ لە نیوان (یەزید)ی ناو و (یزید)ی کاردا جیناسی تەواو هەیە.

سەرنج: بە پێی سەربۆری دەستنووسەکە (حُسَین)ی شـیعرەکانم هـەموو بـە (حوسـەین) نووسـیوە، بـەلام لـە شەرحەکەدا (حسێن)ە کوردییەکەیە.

٣ـ لە دەستنووسەکەدا (بغضینن) و (بحبینن) و (درینن)ە کە دەکاتە (ببوغزێنن) و (بحوببێنن) و (دەرێنن)، لە چاپەکەیشدا (بحبینین) و (درینین)ە.

٤ـ هەرگ: قوڕ. ئەم نیوە بەیتە پەندێکی کوردییە بۆ کارێکی ناپەسەند دەوترێت کە لە هەموولایەکەوە بەد بێت و چاری گران بێت.

٥ـ لە نێوان (علیم) کە ناوی خودای گەورەیە و، («علی»م)دا بە شێوەنووسی کۆن واتە (علـیم) جیناسـی تـەواو هەیە.

٦ـ لە دەستنووسەکەدا (باخەبەر)ە و لە چاپەکەدا (باخەوەر).

٧ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا وادەگەیەنێت: دروستە (ذی) لە (ذی العقیدة)دا بۆ ئیشارە بـێ، یـا بـە مـەعنا خاوەن بێت.

٨ـ لە دەستنووسەکەدا لە پەراوێزدا دەڵێت: «هەزار سال... تاد» سیفەتی (پێنج) ە، تەمییزی نییە.

٩ـ ئایەتی (١١٠) سوورەتی (ال عمران).

١٠ـ ئایەتی (١٠٠) سوورەتی (توبە).

١١ـ ئایەتی (١٨) سوورەتی (فتح).

١٢ـ ئایەتی (٢٩) سوورەتی (فتح).

١٣ـ شێوەنووسی شیعرەکە لە نوسخە دەستنووسەکەدا بێدەسکاری بەم جۆرەیە:

هَیْ لای مُنْکِرْ هَی وَی لَبُوتْ لولا
وَیْلَهْ بُوتْ اَوْلَا لَکَ فَاَوْلَا

پەراوێزێک لەسەر ئەم (اولا لک فاولا)یە هەیە لە خەتی مەولەوی خۆی ئەچێت، نووسیویە: «اولی لک فاولی ثـم اولی لک فاولی».

لەژێر ئەم نووسراوەیەشدا نووسیویە: «یعنی رسم را خوب ننوشـتە» واتـە مەبـەس لـەم پـەراوێزەم ئەوەیـە کـە نووسەرەوە لێرەدا مەتنەکەی بە هەڵە نووسیوەتەوە؛ ئەبێ وا بنووسرێ کە من نووسیومە.

(اولی لک فاولی) بەشێکە لە کۆمەڵە ئایەتێک لە باسی حالّی ئەوانەدا کە فەرمانبەرداریی خـوا ناکـەن و مـل لـە فەرمانی هەڵ ئەپێچن. ئەمەیش تەواوی ئەو ئایەتانە:

(فلا صَدَّقَ و لا صَلّی(۳۱) و لکن کذّب وَ تَولّی(۳۲) ثم ذهب الی اهله یتمطّی(۳۳) أولی لَکَ فَأولی(۳٤) ثُمَّ أولـی لکَ فاولی(۳٥) ) لە سوورەتی (قیامة).

ئیتر مەولەوی باسی لـە باشـەکە ناکـات، چونکـە کردەوەکـەی شـتێکی رەوایـە و پەیـڕەویکـردنی قورئـان و فەرموودەی پێغەمبەرە(د. خ).

## مبحث الخلافة والامامة[1]

حەقە[2] خیلافـەت ئەربەعـەی ئەشـراف
(بإجمـــاع الصـــحب و بالإســـتخلاف)
هـەر چلـۆن کـەوا بووگـە بـەو تـەرتیب
لـە لای موجتەهیـد (ذورأی)ی موصـیب
ئـای چلـۆن دالّـە لێـی ئـای شـامیخە
رەواســـی ســـونەن راس راســـیخە
(انظـــــر لکـــــلٍّ لِکـــــلِّ واحـــــد
إن فقـــــدتها فـــــلا تجاهـــــدْ)
(إذ کفـــی الاجمـــاعُ و هـــو معتمـــدْ
لـــم یکـــن إجمـــاع إلّـــا عـــن ســـند)
هەرگاهــ مـەفادی ئیجمـاع قـەتعی وێ
غـەیری تـەواتور بـا گشـت زەنـنی وێ
دەگـەڵ ئەمیچـە نییـە لـە ئوسـوول
ئیمامەت؛ با (ظنّ) تێدا وێ مـەعموول[3]

بووگـە: بـووە. ئـای(ی یەکـەم): ئـەداتی سەرسـوورمانە. ئـای(ی دووەم): جـەمعی ئایەتـە و عەرەبییە. دالّە لێی: دەلالەتی لێ دەکات. هەرگاهـ: هەرکات. دەگەڵ: لەگەڵ.

واتە خیلافەت (جێنشینیی)ی چوار یاری شەرافەتمەندی پێغەمبەر(د.خ) راست و بێگومانـە، بەڵگەی ئەمەیش ئیجماع و یەکگرتن و یەکقسەیی هەموو هاوڕێیـانی پێغەمبـەرە(د.خ) لەسـەر

جێنشینیی تێکڕای چوار جێنشینەکان، سەبارەت بە جێنشینیی حەزرەتی عومەریش، بێجگە یەکقسەییەکە حەزرەتی ئەبووبەکر وەسیەتی کرد و کردییە جێنشین. ئەم جێنشینییە بەو تەرتیبە کە بووە، واتە: ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی، بیر و باوەڕی هەموو (مجتهد) یکی خاوەن بیری راستە.

ئەنجا مەولەوی دەفەرموێت: ماشەڵلایان لێبێت سەیرکە چۆن ئایەتە بەرزەکانی قورئانی پیرۆز و فەرمووده راست و دروستەکانی حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) دەلالەت لەم خیلافەتە دەکەن.

هەروەها دەفەرمویٚ بۆ جێنشینیی هەریەک لەم چوار یارە بڕوانە بۆ ئایەت و بۆ حەدیس، جا ئەگەر دەستت نەکەوت قەیناکا، تۆ ئینکاری جێنشینییان مەکە، چونکە ئیجماعی لەسەرە، ئیجماعیش بەسە بۆ بەڵگەیی و جێگای باوەڕ و متمانەیە، چونکە ئیجماع پێویستە سەنەدی هەبێت. جا کە ئیجماع یەقین بگەیەنێت، دەلیلەکانی تر لە ئایەت و حەدیس با (ظن) یش بگەیەنن قەیناکا، چونکە لەهەر شتێکدا کە پێویستی بە دەلیل بێ، مادام دەلیلێکی یەقینبەخش هەبێ ئەوە بەسە. لەم باسەی ئێمەیشدا کە بەڵگەیەکی وەک ئیجماع هەبێ، ئیتر دەلیلەکانیتر هەرچۆن بن قەیناکا؛ مەسەلەی جێنشینی یا پێشەوایی لە ئوسوولی ئایین نییە و حوکمێکی فەرعیی سەر بە کار و کردەوەیە و، بۆ ئەم جۆرە حوکمە فەرعییانە بەڵگەی گومانبەخش بەسە.

سەرنج:

ئەمەی مەولەوی فەرموویەتی، کە بۆ هەر چوار یارەکە لە ئایەت و حەدیسدا بەڵگە هەیە، ئەگەر مەبەستی بەڵگە بێ سەبارەت بە گەورەیی و پایەبەرزییان، ئەوە تەواوە چونکە لە گەڵێ ئایەتدا ئەم شتە هەیە، بەڵام ئەگەر مەبەستی بەڵگە بێ سەبارەت بە جێنشینی، ئەوە دوورە؛ چونکە تەنها لەبارەی جێنشینیی حەزرەتی ئەبووبەکری سیددیقەوە ئایەتیان دۆزیوەتەوە.

یەکێک لەو ئایەتانە ئایەتی (یا أیها الذین آمَنوا مَن یَرتَدَّ مِنکُم عَن دینِه فَسَوفَ یأتی الله بِقَومٍ یُحِبُّهُم وَ یُحِبُّونَهُ أذِلّةٍ عَلی المؤمنینَ أعِزّةٍ علی الکافرین یُجاهِدُونَ فی سبیل الله و لا یخافُونَ لومةَ لائِم ذلکَ فضلُ الله یؤتیهِ مَن یَشَاء و الله واسِعٌ علیم)ە [٤]. ئیمامی بەیهەقی لە حەسەنی بەسرییەوە ریوایەتی کردووە فەرمویەتی (والله ئەو کەسەی سەرکردایەتیی ئەو (جهاد) ەی کرد ئەبووبەکری سیددیق بوو، لە کاتێکدا هەندێ لە عەرەبەکان لە دین وەرگەڕان و زەکاتیان نەدا، ئەوە بوو حەزرەتی ئەبووبەکر (ر.خ) بڕیاری جەنگی دژیان راگەیاند و سەرکردایەتیی ئەم جەنگەی کرد و هێنانیەوە ژێر ئاڵای ئیسلام).

یەکێکی‌تریان ئەم ئایەتەیە: (قُل للمخلَّفینَ مِنَ الأعراب سَتُدعَونَ إلی قَومٍ أولی بأسٍ شَدیدٍ تُقاتِلُونَهم أو یُسلمون فإن تُطیعُوا یؤتِکُمُ الله أجراً حَسنا و ان تَتَوَلّوا کما تَولَّیتُم مِن قبلُ یُعَذِّبکُم عذاباً الیما) [٥].

(ابوالحسن)ی ئەشعەری (ر.خ) کە ئیمامی ئەهلی سوننەتە فەرموویەتی لە ئیمام (ابوالعباس ابن شریح) م بیست فەرمووی: لەم ئایەتەدا ئەبووبەکری سیددیق مەبەستە، واتە لەبەر ئەوە کە ئەبووبەکری سیددیق موسوڵمانانی بانگ کرد و لەشکرکێشیی کرد بۆ جەنگ دژی ئەوانەی لە دین هەڵگەڕابوونەوە و زەکاتیان نەدەدا.

یەکێکی‌تریان ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: (وَعَدَالله الذینَ آمنوا منکم و عَمِلُوا الصاحات لَیَستَخلِفَنَّهُم فیالأرضِ کَما استخلفَ الذینَ من قبلهم ولَیُمَکِنَنَّ لَهُم دینَهُم الَّذی ارتَضی لَهُم وَ لَیُبَدِّلَنَّهُم من بعدِ خَوفِهم أمْناً یَعبُدونَنِی لَا یُشرِکُونَ بی شَیئاً) [٦].

(ابن کثیر) ئەفەرموێ واتای ئەم ئایەتە بە تەواوی لەگەڵ بەسەرهاتی سەردەمی جێنشینیی حەزرەتی ئەبووبەکردا دەگونجێ.

بەڵگەی چوارەم ئەم ئایەتەیە:

(للفُقَراء المُهاجِرینَ الذینَ أخرجُوا مِن دیارِهم و أموالِهم یَبتَغُونَ فَضلاً مِن الله و رِضواناً وَ یَنصُرُونَ الله وَ رَسُولَهُ وَ اولئِکَ هُمُ الصَّادِقُونَ) [٧].

چۆنیەتیی دەلالەتی ئەم ئایەتە ئەوەیە: ئەوانەی نیشتمانیان لە ڕێی خودادا بەجێ هێشت خودای گەورە بە ڕاستگۆی حسێب کردوون، ئەوەیش لە لای خودا بە ڕاستگۆ حسێب بکرێ لەگەڵ خودا و لەگەڵ موسوڵماناندا درۆناکات، کەواتە کاتێ (مهاجرین) و (أنصار) بەیعەتیان بە جێنشین کرد و بە سەرکردەی موسوڵمانانیان دانا، پەیماندەر و پەیمانپێدراو هەردوو ڕاستگۆ بوون لەگەڵ خۆیان و لەگەڵ خودای خۆیان، بە کورتی کە ئەمانە بە پێی واتای ئایەتەکە ڕاستگۆ و ڕاست بن ئیتر هیچ گیر و گرفتێک لە ناودا نامێنێ.

پێنجەم: ئایەتی (اهدنا الصراط المستقیم صراط الذین أنعمت علیهم)ە [٨].

چۆنیەتیی گەیاندنی ئەم ئایەتە بۆ مەبەستەکەمان ئەوەیە: وەک لە ئایەتەکەوە دەردەکەوێت ڕێگای ئەوکەسانەی خودا نیعمەتی ڕژاندوە بە سەریاندا ڕێگەیەکی باشە، هەروەها ڕێگەی نیعمەت پێدراوان ڕێگەی پێغەمبەران و زۆرڕاستگۆیان و شەهیدانە، دیارە کە ڕێگەی زۆرڕاستگۆیان ڕێگای ڕاست بێ ڕێگەی حەزرەتی ئەبووبەکر بە هەموو بارێکدا ڕاستە چونکە ئەویش لە زۆرڕاستگۆیانە.

هەروەها گەلێ فەرموودەی پێغەمبەر(د. خ) هەیە کە جێنشینیی حەزرەتی ئەبووبەکریان لێ دەرئەکەوێ. من لێرەدا یەکێکیان دەگێڕمەوە:

[أخرج الشیخان (مسلم والبخاری) عن ابی سعید الخدری، رضیالله عنه، قال: «خطب رسولالله الناس و قال: انّ الله تبارک و تعالی خَیَّر عبداً بین الدنیا و بین ما عنده، فاختار ذلک العبد ما عند الله. فَبَکی أبوبکر و قال نفدیک بآبائنا و أمّهاتنا، فعجبنا لبکائه ان یخبر رسولالله(ص)، عن عبد خیّره الله فکانَ رسولُالله هو المخیَّر، و کان ابوبکر أعلَمَنا فقال رسولِالله (ص)، إنّ من أمَنِّ الناسِ عَلَیَّ فی صحبتِهِ و ماله ابابکرٍ، و لو کنت متخذاً خلیلاً غیرَ ربّی لاتّخذتُ أبابکر خلیلاً، و لکنّ أخوّةَ الاسلام و مودّته. لا یبقینَّ بابٌ إلّا سُدَّ، الا باب ابیبکر». و فی لفظٍ لهما: «لا یبقینَ فی المسجد خوخة إلا خوخة ابیبکر». و فی آخر لابن عدیّ: «سدّوا هذه الابواب الشارعة فی المسجد إلا باب ابیبکر». و طرقه کثیرة منها عن حذیفة و انس و عائشة و ابن عباس و معاویة بن ابیسفیان، رضی الله تعالی عنهم].

زانایانی ئایینی ئیسلام لەم فەرموودەوە جێنشینیی ئەبووبەکریان وەرگرتووە؛ چونکە خەلیفە پێویستی بە نزیکی لە مزگەوت هەیە، خەڵک موحتاجی خەلیفەن بۆ نوێژ و غەیری نوێژ و دەبێ لێیانەوە نزیک بێ واتە: فەرموودەکە ئیشارەتە بۆ ئەوەی پاش وەفاتی حەزرەت(د. خ) ئەبووبەکر دەبێتە جێنشینی.

ئیجماعە وجووب مەنسووبیی ئیمام
لاکین ئیختیلاف هەس (بین الانام)
لەسەر (حەق) یاخۆ لەسەر بەرییە،
دەلیلی سەمعی یا خۆ عەقلییە؟
مەزهەبی ئەهلی حەقە بە قەتعی
واجبە لەسەر خەڵقی بە سەمعی
مەزاق تاڵ دەوێ لەم قسەی تاڵە؛
وجووب لەسەر (حق) ئەمرێ بەتاڵە
لەسەر (حق) بوویا، چاک بووە حاڵی،
زەمان لە ئیمام نەدەبوو خاڵی

خــۆ حوســن و قــوبحیچ هــیچ عەقڵــی نییــە؛
دەلیـــــل وا نــــەبوو ســــیوای ســــەمعییە
خــەیر، لاچــین لەســـەر ئــەم گفــتوگۆیــە،
یــا مەزهــەبی مــن یــا خــەیر ئــی تۆیــە
ئــــەر لەســــەر خــــودا واجبــــە وای کــــرد
وەر لەســــەر خەڵــــقە بــــە جێیــــان ئــاورد
ئــەر ئــیرادەی کــرد خــالقی بــێچــوون
ئیمــام عــەلی وێ و، خەڵــقی مــانیع بــوون[٩]
عەقڵــت بــۆ خــودا[١٠] ئــەوە بــۆچ تێــرێ
نــەتوانێ واجــب خــۆی بــە جــێ بێــرێ؟!
یــــا کەســــێ وەکــــوو حــــەزرەتی عــــەلی
ســــاحیب عیــــززەت و ریفعــــەتی جــــەلی
بــە ســەد چەندانــەی بووبــەکری ســیددیق
ساحیب عەشرەت وێ و شەوکەت بە تەحقیق
(و لاســــــــــــــیّما أســــــــــــــدُ الله) وێ
موجتەهیــــدی وا و لــــە (نــــص) ئاگــــا وێ
ئــەو کەســە چلــۆن لــە کــەس دەترســێ
یــا لــە تەقلیــدی کەســێ دەپرســێ؟!
بــۆچ دەگــەڵ ئــەو ســێ نــەیکرد دەس و بــرد
بــــۆچی دەگەڵــــی (معاویــــە)ی کــــرد
خــــودای تــــەعالا ئەڵــــبەت خودایــــە
حــــەزرەتی (علــــی) یــــچ (اســـد الله)یــــە
کــەس ئیمــام نــەبوو بــێ ئــەم بــە یــەقین
(کَــــــــــرَّمَ الله وجهَــــــــــهُ آمــــــــــین)

(حق): خودا. بەرییە: خەڵق. بوویا: بوایا، ببوایە، بوایە. خەیر، یا خەیر: یا خـود. موجتەهیـدی وا: موجتەهیدی وەها. ئەو سێ: ئەو سیانەکە (ئەبووبەکر، عومەر، عوسمان).

واتە: هەموو (مجتهد) ەکانی ئایینی ئیسلام لە سەر ئەوە یەکیان گرتـووە کـە دانـان و دیـاری کردنی ئیمام و پێشەوای گشتی (واجب) ە، بەڵام ئیختیلاف لەوە دایە ئاخۆ ئەم ئیمام دانانە لەسەر خودا واجبە یا لەسەر (مكلّفین)ی خەڵک؟ هەروەها دەلیلی واجبییەکەی نەقلییە و بیسراوە یا خۆ عەقڵییە؟ جەماوەری ئەهلی سوننەت لەسەر ئەوەن کە ئەم خەلیفە دانانە لەسەر خەڵـک واجبـە و بەڵگەیش بەڵگەی نەقلی و بیسراوە و وەک باسیان کردووە بریتییە لە چەند شتێک:

یەکەم: هاوڕێیانی پێغەمبەر یەکیان گرت لەسەر دانانی ئیمام و، لەپاش وەفاتی حـەزرەت ئـەم دانانەیان لە هەمووشت بە موهیم‌تر زانی تەنانەت خستیانە پێش دەفنی حەزرەتەوە. هەروەها هەر کاتێ ئیمامێ وەفاتی کردبێ دانانی ئیمامیان لە شوێنیدا خستووەتە پێش هەموو ئیش و کـارێکی ترەوە.

دەگێڕنەوە کاتێ کە حەزرەت(د. خ) کـۆچی دوایـی کـرد ئەبووبـەکری سـیددیق خوتبەیـەکی خوێندەوە و فەرمووی: «ایها الناس! من کان یعبد محمداً فان محمداً قد مـات. و مـن کـان یعبُـدُ رَبَّ محمدٍ فانَّه حيٌّ لایَموت. و لابدّ لهذا الأمر ممن یقوم به فـانظروا و هـاتوا آراءکـم رحمکـم الله، فتبادروا من کل جانب و قالوا صدقت و لکن ننظر فی هذا الامر». و لم یقل احد انه لا حاجـة إلـی الامام.

دووەم: ئایینی ئیسلام فەرمانی داوە بە جێبەجێ کردنی (حـدّ) وەک (حـدّ)ی زینـا و دزی... تاد، هەروەها فەرمانی داوە بە پاراستنی وڵاتی ئیسلام و سنووری و، بە ڕێکخستنی سوپا و، رزگار کردنی خەڵک لە زیان و ئازاری جەردە و ڕێگـر و پیـاوخراپ و، ڕاگـرتنی حـوکمی ئـایین لـە نـاو موسوڵماناندا، بێ‌گومان ئەمانەیش بە بێ‌بوونی ئیمام و پێشەوایەکی لێ هاتوو نابن؛ کەوابێ دانـانی ئیمام و پێشەوا پێویستە.

سێهەم: دانانی پێشەوا تێکڕا دەبێتە هۆی نەهێشتنی خراپە و زیان و بەدەست‌هێنـانی چاکـە و بەرژەوەند وەک ئاوەدان‌کردنەوەی وڵات و بڵاوکردنەوەی خوێندەواریی و ئامادەکردنی هۆی ژیـان و ڕێک‌وپێک کردنی دەرامەت و بوودجە و سامانی وڵات و... گەلێ شتی تر. دیارە ئەمانـەیش بـە بێ پێشەوا ناکرێن. بە واتەیێکی تر ئەم کار و بـارە پێویسـتانە لەسـەر بـوونی پێشـەوا راوسـتاون، هەرچی شتێکیش بوونی (واجبات)ی لەسەر راوەستابێت واجبە؛ کەواتە بوونی پێشەوا واجبە.

ئەنجا مەولەوی دەفەرموێ: دەم و چەشی مرۆڤ تاڵ دەبێت لەو قسە تاڵە بە تاڵـە کـە وتـراوە: گوایا دانانی ئیمام لەسەر خودا واجبە! هیچ شتێ لەسەر خودا واجـب نییـە، ئەگـەر دانـانی ئیمـام لەسەر خودا واجب بوایە دەبوا دنیا هەرگیز بێئیمام نەبوایە. کە شتێ واجب بـوو لەسـەر یـەکێک، دەبێ جێبەجێی بکات.

واتە: بۆ ئەوەی جیهان تووشی گیر و گرفت و نەگبەتی نەبێ لەسەر خودا واجب دەبوو هـەرگیز دنیای لە پێشەوای شایان و هەڵکەوتوو خاڵی نەکردایە، ئاشکرایشە شـتی وەهـا نییـە. دیـارە لای ئەهلی سوننەت جوانی و ناشیرینی عەقڵی پووچ و بەتاڵە، واتە جوانی و ناشیرینی شەرع دیارییـان دەکات، کەوابوو پێویستیی دانانی پێشەوا لە لایەن شەرعەوەیە نەک عەقڵ.

ئەنجا (مەولەوی) بۆ بۆڕدانی بەرانبەر بە ئێجگاری، دەڵێت:

با واز لە جیاوازیی باوەڕی من و تۆ بهێنین، دانانی پێشەوا لەسـەر خـودا واجـب بـێ، وەک تـۆ دەڵێیت، یا لەسەر خەڵک واجب بێ، وەک ئێمە ئەڵێین، ئەوا واجب جـێبـەجێ کـرا و، لـە پـاش مردنی حەزرەت(د. خ) جێنشین و پێشەوا دانرا، ئیتر بۆچی هەندێکەس ئەڵێن ئیمامی بە حـەق لە پاش حەزرەت دانەنیشتووە؟! ئاخۆ دەچێتە مێشکەوە خودا واجبی خـۆی جـێبـەجێ نـەکات؟ ئاخۆ دەچێتە مێشکەوە خودای گەورە بییەوێ (عەلی) ئیمام بێت، کەچی خەڵکی خوداکرد رێ لە کاری خودا بگرن و نەیەڵن عەلی ببێتە پێشەوا؟!

ئاخۆ دەچێتە مێشکەوە پیاوێکی وەک عەلی خاوەن جێگە و رێگـە و نەسـەب و هـۆز و خـزم و کەس و کار، پیاوێکی وەک عەلی شێری خودا ئازا و زانا و دانا و ئاگاداری (نسـوس) و خـاوەن را و ئیجتیهاد لە ترسی خەڵک داوای حەقی خۆی نەکات و نەبێتە پێشـەوا، یـا لەبـەر چاولـێکـەری و دوای قسەی خەڵک کەوتن خۆی نەبێتە پێشەوا و بەیعەت بە یـەکێکی تـر بکـات و مـافی رەوای خۆی لێ زەوت بکرێت؟!

بۆچی حەزرەتی عەلی لەگەڵ سێ جێنشینەکانی پێش خۆی هیچ ناکۆکیی نەبوو؟ بۆچ لەگەڵ (معاویة) جەنگا؟ دیارە چونکـە جـێنشـینیی ئەبووبـەکر و عومـەر و عوسمـانی لا رەوا و بـەجێ و شەرعی بووە، بۆیە نەچوو بە گژیاندا و بەیعەتی پێ کردن و بێڕەزای ئەو نەبوونە جێنشین، بـەلام دانی نەنا بە جێنشینیی (معاویة)دا بۆیە لێی راست بوویەوە و جەنگی لەگەڵ کـرد و، ئـەو هـەموو شەڕ و شۆڕە لەسەر جێنشینایەتی بەرپا بوو.

بــــێقســــه بکــــەین لــــه (أفضــــلیّە)
ئــــەو بــــه تــــەرتیبی خیلافــــەت نییــــه
چونکــــه دەلائیــــل (مــــن الجــــانبیَن)
(متعــارض) ن، بــه کــام عەمــەل کــەین؟
وەهایچــه نییــه خــۆ ئــەم مەســئەله
تــۆ بڵــێی شــەرته بــۆ ئــەو عەمەلــه
یــا ئــەر تــەوەققوف بــوێ تێیــەدا
واجبــێ روو کــات خەلــەل پێیــەدا
خوسووس ئیمامەت جائیز وێ و مەقبوول،
دەگەڵ وجــوودی (فاضــل)، بــۆ (مفضــول)
بــۆچ؟ (أفضــلیة) هــەر وەکــوو عیســمەت
نییــەن هــیچ کامیــان شــەرتی ئیمامــەت
بەڵــکو شــرووتی ســەرکاری ئیمــام
قودرەتــه لەســەر تــەنفیزی ئــەحکام
وەک تەجهیزی جەیش بۆ ئــەمری جیهاد
ئیقامــەی جومعــه و، جــەماعات، ئــەعیاد
ئیقامــەی حــدوود ئــەخزی ســەدەقات
ســەددی ثوغــوور و قــەتعی نیزاعــات
قــەتعی عیرقــی رەهــط موتەنەجیســه
موتەغەللیبــه و موتەلــەصصیصــه
حــەققی مەزلــوومان لــه زاڵــم ســێنێ
بــه (ضــبط) و بــه (ربــط) هــیچ دانــەمێنێ
موسلیم، حورِ، عــاقڵ، باڵــغ وێ و، زەکــەر
سائیس وێ و، زاهیر، مــەرجیع بــۆ بەشــەر

نـەک موختـــەفی وێ یـا خـۆ مونتـــەزەر
بیکێشـــی دەگـــەڵ عـــەدەم سەربەســـەر
بـــەڵ قورەشـــی وێ و پـــاکیزە ســـییەر
خـوا نەسـلی عـەلی، خـوا نەسـلی عومـەر
ئەگـــەرچی بــە فیســق مونعــەزیل نــەوێ
عەدلیچی هەر وەک شـەوکەت پـێ دەوێ
قـــووەتی رەئـــی و عیلمـــی دەگـــەڵ وێ
ئـەفزەل وێ یـا خـۆ غـەیری ئـەفزەل وێ

زانا پایەبەرزەکانی ئایین دەربارەی گەورەترینی چوار جێنشینەکانی پێغەمبـەر رای جیاجیـان هەیە؛ زۆربەی زانایانی ئەهلی سوننەت لەسەر ئەوەن کە پایەی گـەورەییان وەکـو پایـەی جـێ-نشینییەکەیانە، واتە: گەورەترینی پەیڕەوانی حەزرەت ئەبووبەکری سـیددیقە، دوای ئـەو عومـەر، دوای ئەو عوسمان، ئەنجا عەلی، ەزای خوایان لێ بێت. هەندێکی تر دەڵـێن عـەلی لـە عوسمـان گەورەترە.

هەندێکی تر لە زانایانی ئایین تیایا وەستاون و ناڵێن ئەمیان لەویان گەورەترە.

زانای پایەبەرز (سعدالدین)ی تەفتازانی لە شەرحی (عقائد)ی (نسفیە)دا دەڵـێت: «و امّـا نحـن فقد وجدنا دلیل الجانبین متعارضة، و لم نجد هذه المسألة مما یتعلـق بـه شـیء مـن الأعمـال أو یکون التوقف فیه مخلاً بشیء من الواجبات، و کَأنَّ السلفَ کانوا متوقفین فی تفضیل عثمـان علـی عليٍّ، رضی الله تعالی عنهما، حیث جعلوا من علامات السنّة والجماعة تفضـیل الشـیخین و محبَّـة الختنین... والانصاف انه إن أرید بالأفضلیة کثرة الثواب فللتوقف جهة، و إن أرید کثرة ما یعـدّه ذوو العقول من الفضائل فلا» انتهی.

مەولەوی لێرەدا بیرو راکەی (سعد الدین) باس دەکات و دەڵێ: با قسەیە بکەین لەوە کـە کـام لـەم جـێنشـینانە لـەوانی تـر گـەورەترە و گـەورەیی ئـەوانی تـر چۆنـە؟ وا دەرئەکـەوێت کـە گەورەترییەکە وەکوو تەرتیبی جێنشینییەکە نییە، ئێمـە دەبیـنین هـەردوولا بەڵـگەیان هەیـە و بەڵگەکانیان دژی یەکترن و نازانین بەگوێی کامیان بکەین. لە لایەکی تریشەوە ئـەم گەورەترییـە مەرجی کارێکی ئایینی وەک نوێژ و رۆژوو... تاد نییە، تا ئەگەر تیایا بوەسـتین و تـەفزیلی کـەس

نەدەین بەسەر کەسدا واجبێ لە واجبەکانی ئایین تێک بچێت، خۆ ئەگەر بڵـێیت پـاش و پێشـیی جێنشینییەکەیان بەڵگەی ئەفزەلییەتەکەیە دەڵێین وانییە چونک لەگـەڵ بـوونی (فاضـل) یشـدا ئیمامەتی (مفضول) دروستە؛ کەواتە دەگونجێ یەکێک لە جێنشینیدا پێشکەوتوو بێ کەچی لـە فەزیلەتدا دواکەوتوو بێت، بە کورتی ئەفزەلییەت مەرجی ئیمامەت نییە، هەروەک مەرجیش نییە ئیمام مەعسووم بێت، مەرجی ئیمام ئەوەتـە بتوانـێ ئـەحکامی ئیسـلام جـێبـەجێ بکـات، وەک ئامادەکردنی سوپا بۆ جیهاد و بەرپاکردنی نوێژی جومعە و جەماعەت و نوێژی جەژنەکان و جـێ-بەجێ کردنی (حدّ) لەسـەر زینـا و چەنـد تـاوانی تـر و، پاراسـتنی سـنووری وڵات و، چـارکردنی ناکۆکی و، ریشەکێش‌کردنی رێگر و پیاوخراپ و دز و جەردە، هەروەها بتوانێ مافی زۆرلێکراوان لە ستەمکاران بسەنێتەوە و، لەسەروبەر بەستنی کـار و بـاری موسڵـماناندا دەستەوسـتان نـەبێت، مەرج ئەوەیە موسوڵمان بێت، ئازاد بێت، وریا و کارامە بێت، نێرینە بێـت، بـەدەرەوە بـێ و خـۆی نەشاردبێتەوە، کەسێکی وەها نەبێ کە لە بەرچاو نـەبێ و کـەس نـەزانێ لـە کوێیـە یـا هەمیشـە چاوەڕوانی بکرێت، چونکە ئەوە لەگەڵ نەبوو هاوشان و هاوسـەنگە. هـەوەها لـە هـۆزی قـورەیش بێت، خوو و رەوشتی پاک و خاوێن بێت، ئیتر چ لە نەوەی عەلی بێ یا نەوەی عومـەر یـا نـەوەی قورەیشییەکی تر.

ئەگەرچی ئیمام و پێشەوای دامەزراو بە هـۆی روودانی فیسـق لێیـەوە دەسـتی لـە ئیمامـەت ناکێشرێتەوە، بەڵام یەکەمجار کە دەبێتە پێشەوا پێویستە (عادل) و (رشید) بێت و هێـزی زانسـت و بیر و راوێژی هەبێت، ئیتر لە خەڵکی سەردەمی خۆی پایەبەرزتر بێ یا نا.

ئەنجا مەولەوی، پاش باس‌کردنی ئەم بیر و رایە، گەڕایەوە بۆ سەر باس‌کردنی بیروڕای زۆربـەی ئەهلی سوننەت و دەفەرموێ:

لاکـــین ئەئیممـــەی فـــەحلی کەســـیرە
وەک فیرقـــەی ســـەلەف ســـەفی ســـەریرە
هـــەر بـــە تـــەرتیبی ئـــەمری ئیمامـــەت
حوکمیـــان هەیـــە بـــە ئەفزەلییـــەت
(فـــــاحکم ظـــــاهراً بـــــأنّهُمْ
لَـــو لَـــا سَـــنَدٌ لمَـــا حکمـــوا)

(والــــــزم دأبهــــــم بـــــــلا تعلّـــــــل
وَ فـــوّض الحـــق الـــیالحـــق وقـــل):
ئـــەفزەل ئەوکەســـە رەوزەی ئـــەزەلی
دای لـــە دەمـــاخی بـــۆی (لا یأتـــلِ...)
لـــە ئـــەوجی ســـەمای عـــالیی نبـــووەت
(«مـــا طَلَعَـــتِ» لَـــهُ طلعـــتْ)
ئیسمی دەگەڵ ئیسم گەورەی ئینس و جان
نویســـیاگە لـــە گشـــت ئاسمـــان
(روح القُـدُسْ) هـەرچی لـەو عـەرز و توولـدا
رژانـــدی بـــە دڵ پـــاکی رەســـوولدا
لە خـۆی هـەردوو دەس مەرحەمـەت بـەردا
پـێچ‌پـێچ خیگـەی فـەیز پـێچدا لـە سـەردا
فـەرقی نـەکردن (أصـلاً) لـە هیچـدا[11]
رژانـــدی بـــە دڵ ســـافی ئەویچـــدا
چـی دەڵـێی ئـەی دڵ پڕشـوبهە و پەلیـد!
دەگەڵ حوب هاوشـان کەلیمـەی تەوحیـد؟
ئـــەوە کـــە شـــوکری لەســـەر ئەنامـــە
ئـــەوە ســـەببی ئـــەو ســـەببی ئیســـلامە
هـــەر ئـــەوە (اتقـــی) و، ئـــەتقا ئەکرەمـــە
ئـــەکرەم ئەفزەلـــە و پایـــەی ئەعزەمـــە
«ثـــانِیَ اثنـــینِ» دەڵـــێ بـــە تـــەحقیق:
بەعـــدەز نبـــووەت تەســـدیقی ســـیددیق

رەوزەی ئەزەلی: باغچەی بێ‌سەرەتا: مەبەست قورئانی پیرۆزە. نویسـیاگە: نووسـراوە. خیگـە: پێستی مەڕ و بزنە کە خۆشە دەکرێت بۆ رۆن تیا هەڵگرتن، هیزەیشی پێ دەڵێن. پەلیـد: پـیس، چڵکن. بەعدەز: بعد از، لە پاش، فارسییە.

واتە: بەڵام زۆربەی زانایان و کەڵە مێردانی ئەهلی سوننەت، وەک کۆمەڵەی پێشینانی دڵپاک و بێگەرد، هەر لەسەر ریز و تەرتیبی جێنشینی حوکمیان داوە بە گەورەتری و گەورەییەیان و، لەم رووەوە بڕیاریان داوە کە گەورەترینی پەیڕەوانی پێغەمبەر(د. خ) ئەبووبەکری سیددیق و، دوای ئەو عومەری کوڕی خەتتاب و، دوای ئەو عوسمانی کوڕی عەففان و ئەنجا عەلی کوڕی ئەبووتالیبە، خودای گەورە لە هەموویان رازی بێت.

تۆیش ئەی مرۆی موسوڵمان باوەڕ بکە بەوە ئەگەر ئەو پێشینانە بەڵگەیان بە دەستەوە نەبوایە حوکمی وایان نەدەدا، تۆیش بۆ خۆت دوای ڕێبازی ئەوان بکەوە و، هیچ بەهانەیەک مەهێنەرەوە و، راستی و بنج و بناوانی کاریش بدەرە دەستی خودای گەورە و بڵێ:

گەورەترین هاوڕێی پێغەمبەر ئەو کەسەیە کە باغچەی کەلامی ئەزەلی بۆنی گوڵباغی ئایەتی «و لا یأتل...» داوە بە دەماغی دڵیدا، ئەمەش ئیشارەیە بۆ ئایەتی پیرۆزی (وَ لا یأتلِ أولُوا الفَضلِ منکم وَالسعةِ أن یُؤتُوا أولی القُربی وَ المَساکینَ والمُهاجِرینَ فی سبیلِ الله وَلْیَعفُوا وَلْیَصفَحُوا ألَا تُحِبُّونَ أن یَغفِرَ اللهُ لَکُم وَاللهُ غَفُورٌ رَحیم) (١٢).

واتە: با ئەوکەسانە کە خاوەن فەزڵ و خاوەن داراییین سوێند نەخۆن لەسەر ئەوەی هیچ نەدەن بە خزمەکانیان و بە هەژاران و ئەوانەی لە ڕێی خودادا مەککەیان بەجێهێشتووە و هاتوونەتە مەدینە، با لێیان خۆش بن و چاوپۆشییان لێ بکەن، حەزناکەن خوای بەخشندە لێتان ببورێ و لە گوناهتان خۆش بێت؟!

بەڵێ ئەم ئایەتە دەربارەی ئەبووبەکری سیددیق هاتووە پاش ئەوەی سوێندی خوارد: ئەو پارە و خەرجییەی تا ئەوکاتە دەیدا بە (مسطح) ناوی خزمی ئیتر نەیداتێ، جا کاتێ حەزرەت ئەم ئایەتەی بەسەر ئەبووبەکردا خوێندەوە کوتوپڕ لە سوێنەکەی پاشگەز بوویەوە و ئەوەی لەوەپێش پێی دەدا بۆی گەڕاندەوە و وەک جاران دەستی کردەوە بە دەسگرۆیی‌کردنی.

لەم ئایەتەدا ئەبووبەکری سیددیق بە خاوەن‌فەزڵ ناوبراوە، دیارە فەزڵ وەک دەس دەدا بۆ زیادەماڵ، بۆ گەورەیی و پایەبەرزیی لای خودایش دەس دەدات، خودای گەورە بەخشندەیی خۆی دەخاتە پێش چاوی و ئەویش گورج بە گوێی دەکا و داوای بەخششی لێ دەکات، هەروەها باسی ئەوە دەکات کە ئەبووبەکر بەخشندە بووە و یارمەتی خزم و کەس و کاری داوە، دەستی یارمەتی و پیاوەتیی بۆ کۆچکردووەکان درێژ کردووە.

هەروەها لە چەند ئایەتی تردا باسی ئەبووبەکری سیددیق کراوە وەک ئایەتی (...ثـانِیَ اثنَـینِ اِذ هُما فی الغَارِ اِذ یَقُولُ لِصاحِبِهِ لا تحزَن اِنّ اللهَ مَعَنا...) [١٣] کە هەموو زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەن مەبەست لە (ساحب) حەزرەتی ئەبووبەکرە، خودای لێ رازی بێت.

یا وەک ئایەتی (والذی جاء بالصِّدقِ وَ صَدَّقَ بِهِ اولئکَ هُمُ المُتَّقُونَ * لَهُم مَا یَشاءونَ عِندَ رَبِّهِـم ذلِکَ جَزاء المُحسِنین) [١٤].

بەززار و ئیبنوعەساکیر ریوایەتیان کردووە کە حـەزرەتی عـەلی لـە لێکدانـەوەی ئـەم ئایەتـەدا فەرموویەتی: «اِنَّ اَلَّذی جاء بِالصدّقِ هُوَ مُحَمَّدٌ (ص) وَاَلَّذی صدّق بِهِ ابوبَکر (رض) ».

یا ئایەتی: (وَ لِمَن خافَ مَقامِ رَبّه جَنَتان) [١٥] اخرج ابن حاتم عن ابـن شـوذب انهـا نزلـت فـی أبیبکر (رض) یا ئایەتی: (وَ شاوِرهُم فِی الأمر) [١٦].

حاکم لە رێگای (عبدالله)ی کوڕی عەبباسەوە دەگێڕێتەوە کە ئەم ئایەتە دەرحەق بە ئەبووبەکر و عومەر هاتووە. فەرموودەی پێغەمبەریش هەیە کە دەڵێت: «إنَّ اللهَ أمرنی ان أستشیر أبا بکـر و عمر» واتە: خودای گەورە ئەمری پێ کردووم کە راوێـژ بـە ئەبووبـەکر و عومـەر بکـەم، ئەمـەیش قسەکەی حاکیم بەهێز دەکات.

یا ئایەتی: (...فَأِنَ الله هُوَ مَولاهُ وَ جِبریلُ وَ صالِحُ المُؤمِن) [١٧] تەبەرانی لـە رێگـای عەبدوڵـلای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕێتەوە کە ئەم ئایەتە لە حەقی ئەو دوانەدا هاتووە. هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا باسی گەورەیی ئەبووبەکر کراوە، بۆ نموونە:

لە (ابوالدرداء) ەوە دەگێڕنەوە کە حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی: «ما طلعت الشمس و مـا غربـت علی أحد افضل من ابی بکر الّا ان یکون نبیّا» وەکوو (مەولەوی) دەفەرموێ لـە ئـەوجی ئاسمـانی بەرزی پێغەمبەرایەتییەوە حەدیسی (ما طلعت...) تاد تەنها بۆ ئەبووبەکر هاتووە.

هەروەها دەفەرموێ لە حەدیسدا هەیە کە ناوی ئەبووبەکر لەگـەڵ نـاوی گـەورەی ئـادەمزاد و پەریدا کە پێغەمبەرە(د.خ) لە هەموو ئاسمانەکاندا نووسراوە.

دوای ئەمانە مەولەوی هەر لە باسی گەورەیی و پایەبەرزیی حەزرەتی ئەبووبەکردا دەڵێت: (روح القدس) واتە جیبرائیل «لەو عەرز و توولدا...» واتە لە سەفەری کۆچی حەزرەت لـە مەککـەوە بـۆ مەدینە حەزرەتی جیبرائیل هەموو کاتێ حازر دەبوو بۆ یارمەتی و بۆ رژانـدنی نـوور بەسـەر دڵـی موبارەکی حەزرەتدا، جا هەر وەکوو یارمەتیی حەزرەتی ئەدا و نووری دەرژاندە دڵی چەند توانیویە یارمەتیی ئەبووبەکریشی داوە و نوور و بەرەکەتی رژاندووەتە دڵی، وەکوو یەکێ خیگەیەکی پـڕ لـە

ڕۆنی لەلا بێت بە هەردوو دەستی پێچی بدات بۆ دەرکردنی ئەوەی تێیدایە، لەو نوور و بەرەکەتەی لای بوو بێدرێغ بەشی حەزرەتی ئەبووبەکری دا.

ئیتر ئەی مونکیری دڵ پڕ لە شوبهەی ناپاک! چی دەڵێیت بەرامبەر بە یەکێک خۆشەویست و هاوڕێی ئەو پێغەمبەرە بێ کە شایەتی‌دان بە پێغەمبەریی ئەو هاوشانی کەلیمەی تەوحیدە. واتە: ئەو زاتە کە شەهادەت بەو هاوشانی شەهادەتە بە یەکیەتیی خودای گەورە بە دڵ و گیان ئەبووبەکری کردە دۆست و خۆشەویستی خۆی؛ جا تۆ لەگەڵ زاتی وادا چی دەتوانی بڵێیت؟ ئەو زاتە کەسێکە بەرامبەر بەو خزمەتانەی بە ئیسلامی گەیاندووە شایانی سوپاسە؛ وەک تەسدیق کردنی پێغەمبەر لە پێغەمبەرایەتیدا، لە ئیددیعای میعراجیدا، وەک خزمەت‌کردنی پێغەمبەر لە زەحمەتی مەککەیدا و لە سەفەری بۆ مەدینەیدا، وەک باخت‌کردنی مالی لە ڕێگای ئیسلامدا، وەک کۆکردنەوەی قورئان، یا جەنگی لەگەڵ ئەوانەی لە دینی ئیسلام هەڵگەڕانەوە، یا هەوڵ و کۆششی بۆ دامەزراندنی کاروباری جێ‌نشینی و، پرس‌کردنی بە گەورە پیاوانی (مهاجرین) و (انسار)، یا دانانی یەکێکی لێهاتووی وەک حەزرەتی عومەر بۆ جێ‌نشینی پاش خۆی.

بەڵێ ئەم کارانە کە ئەبووبەکر کردوونی کاری گەورە گەورەن و لە پێناوی ئایینی ئیسلامدا کردوونی، بۆیە سوپاسی لەسەر ئوممەتی ئیسلام واجبە.

بێ‌گومان زاتێکی وەها لە پایە و پلەیێکی بەرزی وەهادا هەر بە کەم بۆڕوانینێکی بەکەم‌ڕوانینە بۆ ئایینی ئیسلام خۆی.

ئەبووبەکری سیددیق بە پێی ئایەتی (و سَيُجَنَّبُهَا الأتقى الَّذى يُؤتِي مَالَهُ يَتَزكىّ) (۱۸) ئەتقا بووە، زۆر لەخوداترس بووە، چونکە ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو هاتووە، لە کاتێکدا بەندە موسوڵمانە سزادراوەکانی لە خاوەنە کافرەکانیان دەکڕییەوە و ئازادی دەکردن. هەروەها بە پێی نەسی (إنّ اکرمکم عندالله اتقاکم) یش (۱۹) ئەکرەمە، دیارە ئینسانی ئەکرەمیش گەورەترە لە غەیری خۆی و، لای خودای گەورە پایەی بەرزترە و لە هاوڕێکانی بەڕێزترە.

رضی الله تعالی عنه و عن جمیع من معه من اهل صحبة الرسول صلی الله تعالی علیه و علی آله و صحبه اجمعین.

زیکری سالحان ڕەحمەتی وا پێ
من لە کوێ، مەدحی سیددیقی لە کوێ؟!

زیکــری سالــحان کــە پێــی هاتــە بــەین
ســـەلای «حیّهـــل بعمـــر» دەدەیـــن
(ثـــانی الافضـــلین مـــن الأربعـــة
یصـــــافح الحـــــق اوّلاً معـــــە)
(هـــل غیـــرُهُ مَـــن وافَـــقَ الآیـــات،
ســـنن الرســـول، کـــذاک التـــورات؟)
بـــە ئایـــەت لەبـــەر جیبریـــل ئـــاوردن
هـــەر خاصّـــەی ئـــەوە تەلـــەففوز کـــردن
ئـــەو دەبـــوو، حـــەدیس دەڵـــێ رووبـــەڕوو،
بەعـــدەز پێغەمبـــەر، ئـــەر نـــەبیی دەبـــوو
(و لـــو لـــم یکـــن شمســـاً ســـاریة)
خـــەففاش! (أیـــنَ هُـــو وایـــنَ ســـاریة) [٢٠]
وجوودی و جـــوودی بـــەحری خیـــزەم بـــوو
بـــۆ وە لـــەو توغیـــان نیلـــی حیکـــەم بـــوو
بـــەس نییـــە خەبـــەر «یـــا خیـــرَ البَشـــر!
لِیبـــکِ الاســـلام» بـــۆ مـــەوتی عومـــەر

ڕەحمەتی وا پێ: ڕەحمەتی خوای پێیە، کار ئاسان ئەکات. سەلا: بانگەواز. لە بەر: بـەر لـە، لـە پێش.

واتە: ناوبردنی پیاوچاکان و بەندە لەخوداترسەکان، ڕەحمەتی خودای لەگەڵدایە و کار بـۆ مـرۆ ئاسان دەکات، ئەگینا من لە کوێ و ستایشی پایەی سیددیقیی ئەبووبەکری سـیددیق لـە کـوێ؟ کەی ئەم کارە لە وزەی مندایە؟ ئەنجا پاش ستایشی حـەزرەتی ئەبووبـەکر دێتـە سـەر ستایشـی حەزرەتی عومەر و دەڵێت:

کە باسی پیاوچاکان و خوداناسانی ڕاست هاتە ناو پێویسـتە بڵـێین: «حیّهـل بعمـر» ئەمـەیش ئیشارەیە بۆ ئەوەی تەبەرانی و حاکیم گێڕاویانەتەوە لە ئیبنومەسـعوودەوە کـە فەرموویـەتی: «اذا ذکر الصالحون فحیّهل بعمر. إنّ عمر کان أعلمنا بکتاب الله و أفهمنا فی دین الله».

عومەر دووەم کەسی گەورەیە لە چوار جێنشینەکانی پێغەمبەر، کە لە ڕۆژی قیامەتدا بەر لە هاوڕێکانی تری بە دیداری خودای گەورە شەرافەتدار دەبێت.

ئایا کەس هەیە، بێجگە عومەر، کە رای دەربڕیبێ و رادەی لەگەڵ ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر و، تەنانەت لەگەڵ تەوراتیشدا رێک بێت؟

بوخاری و موسلیم لە عومەرەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی:

«وافقتُ ربّی فی ثلاث، قلتُ: یا رسول الله لو اتّخذنا من مقام ابراهیم مُصَلّی، فنزلت: (واتخذوا من مقام ابراهیمَ مُصَلّی) (۲۱). و قلت یا رسول الله یدخل علی نسائک البرّ والفاجر فلو أمرتهنّ یَحتَجِبنَ، فنزلت آیة الحجاب.

واجتمع نساء النبیّ (ص) فی الغیرة فقلت عسی ربّه ان طلّقکنّ ان یبدله ازواجاً خیراً منکن فنزلت کذلک». هەروەها تا حەڤدە شوێن.

چوارەم: مەسەلەی دیلەکانی غەزای بەدر.

پێنجەم: حەرامکردنی شەراب.

شەشەم: هاتنی ئایەتی (فتبارک الله أحسن الخالقین) (۲۲) لە پاش (من سلالة من طین) (۲۳).

حەوتەم: مەنعی نوێژکردن لەسەر جەنازەی عەبدوڵلای کوری ئوبەی.

هەشتەم: داوای لێبووردن نەکردن بۆ کۆمەڵی دووڕووەکان.

نۆهەم: لە راوێژکردنی حەزرەتا بە هاوڕێکانی لە دەرچوونا بۆ بەدر، ئایەتیش هات و موافیق بوو لە سەری.

دەهەم: لە مەسئەلەی چوونی مێرد بۆ لای ژنی لە شەوی رەمەزاندا. هەروەها لە حەوت رووداوی تردا.

مەسئەلەی موافەقەی فەرموودەی عومەر لەگەڵ تەوراتدا ئەوەیە کە عوسمانی کوڕی سەعیدی دارەمی لە سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە دەگێڕێتەوە:

رۆژێ کەعبی ئەحبار وتی: «ویل لملک الارض من ملک السماء». گورج حەزرەتی عومەر فەرمووی «اَلّا من حاسب نفسه» هەر لەوێدا کەعبی ئەحبار سوێندی خوارد کە لە تەوراتیشدا ئەم ئیستیسنایە هەیە، عومەر لە خۆشیی ئەم قسەدا سوجدەی شوکری برد.

شایانی باسە وتنی هەندێ رستە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز پێش نازڵبوونی، بە تایبەتی تەنیا بۆ عومەر بووە، ئەوەندە دڵی نوورانی بووە کە (وحی) پێش نازڵبوونی هاتووەتە دڵیەوە.

یەکێکی تر لە بەڵگەکانی گەورەیی حەزرەتی عومەر ئەوەیە پێغەمبەر(د.خ) رووبەڕووی عومەر خۆی فەرموویە: «لو کان بعدی نبیّ لکان عمر الخطاب» واتە ئەگەر لە دوای من پێغەمبەرێکی تر ببوایە عومەری کوڕی خەتتاب دەبوو.

هەروەها لەبارەی گەورەیی حەزرەتی عومەرەوە (ر.خ) مەولەوی بە ناحەزەکانی دەڵێت: ئەی شەمشەمە بەرِۆژکوێرەکان! ئەگەر عومەر دڵی بە نووری خودای گەورە روونـاک نەبوایە چۆن دەیزانی کە (ساریە)ی سەرکردەی سوپا لە نەهاوەند گەمارۆ دراوە و، لە مەدینەوە لەسەر مینبەر بانگی لێ دەکرد: ساریە وریا بە شاخەکە بەرمەدە، ئەویش لەو ماوە دوورەوە گوێی لێ دەبوو و دەکەوتە خۆی و سەردەکەوت؟

ئەگەر ئەمە بە هۆی نووری خودایییەوە نەبێت عومەر و مەدینەی مونەووەرە لە کوێ و ساریە و نەهاوەندی لە کوێ؟!

حەزرەتی عومەر، چ بوونەکەی و چ جوود و بەخششی، وەک بەحری لێشاوکردوو وابوو. لەبەر ئەوە بوو حیکمەت وەک رووباری نیل لە بوونی ئەوەوە لێشاوی کرد و، رووباری نیل خۆیشی، وەک بەخششی ئەو، پاش تێفڕێدانی کاغەزەکەی، لێشاوی کرد.

یەکێکی تر لە نیشانەکانی گەورەیی عومەر ئەوەیە دەگێڕنەوە کە حەزرەتی جیبرەئیل عەرزی حەزرەتی کردووە: «یا خیر البشر لیبک الاسلام لموت عمر».

واتە: ئەی چاکترین خەڵکی خودا پێویستە ئایینی ئیسلام، یا خەڵکی موسوڵمان، لە کاتی مەرگی عومەردا بگرین. پشتگیریی ئەم قسەیە دەکات ئەوەی تەبەرانی لە عیسمەی کوڕی مالیکەوە ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی «و یحک اذا مات عمر فان استطعت ان تموتَ فمت».

جا ئەگەر هەندێ لەم ریوایەتانە بێهێز بن قەیناکا؛ چونکە ئەم حەدیسانە دەربارەی شەرەف و مەناقیب هاتوون، لەبەر ئەوە چاوپۆشی لە بێهێزییان دەکرێ.

فارووق مرد، زوڵمەت داگرت [٢٤] خافیقەین

پێی دەوێ زیای چرای (ذی النورین)
شەبیهی دوو شەخس حەبیبی جەلیل،
(ختم النبیّین)، جەنابی خەلیل
(زوجُ نَیّرِی أوجِ ذا الفَلَکْ)

ئەر دەبوون تا چل بۆی دەبوون یەک یەک
(لَـــهُ کَـــرَّتَین «مـــا عَلَـــی عثمـــان...»[٢٥]
و هـــو مَـــرَّتَین اِشـــتری الجنـــان) [٢٦]
(یَـــدُهُ یَـــدُ النَّبـــی الأبطَحـــی
منـــه الملائـــک طُـــراً تســـتحی) [٢٧]
(سَـــبعون الفـــاً کـــلٌّ اِســـتَوجَبْ
أن یـــدخل النّـــارَ و أن یُعَـــذَّبْ)
(بشـــفاعةٍ مـــن ذاک الجنـــاب
داخلـــو الجنـــة مـــن غیـــر حســـاب)
(کـــان لِلقـــا النبـــی خمیصـــاً
لـــذا مـــا خَلَـــعَ ذاک القمیصـــا)
(حَتّـــی لَقِـــیَ النَّبـــی سَـــعیداً
ذا مرتبـــةٍ أســـنا شـــهیداً)

واتە: تا حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب بەسەر زیندوو بوو، کار و بـاری دەوڵـەتی ئیسـلامی بەڕێوەدەبرد، رووناکیی دینداری و دادپەروەریی ئەو خۆرهـەڵات و خۆرنشـینی جیهـانی روونـاک کردبۆوە. کاتێ ئەو کۆچی دوایی کرد هەردوولا تاریکی دایگرت، جیهان پێویستی بوو بە رووناکیی چرایەک کە خاوەنی دوو نوور بێت، یەکێکیان بۆ خۆرهەڵات و یەکێکیان بۆ خۆرنشـین، ئـەو زاتـە خاوەن دوو نوورەیش حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەففان بوو، کە خاوەنی نووری ئیمـان و نـووری شەرم بوو، یا خاوەنی نووری بەخشندەیی لە پێناوی ئیسلامدا و نووری کۆکردنەوەی قورئـان بـوو، یا خاوەنی دوو نووری کچەکانی حەزرەتی (محمد المصطفی) (د. خ) بوو. ئەو دوو کچـە (رقیّـە) و (ام کلثوم) بوون کە یەک لەدوای یەک پێغەمبەر(د. خ) مارەیبڕین لێی.

ئەم زاتە بەشەرمە بە دەست و دەهەنە خووڕەوشـت بـەرزە پـاش ئیسـلام بـوونی ئەبووبـەکری سیددیق و خەدیجەی حەرەمی حەزرەت و عەلیی کوڕی ئەبووتالیب و چەند کەسێکی تر، لەسـەر داواکردنی ئەبووبکر ئیسلام بوو، واتە:

حەزرەتی ئەبووبەکر قسەی لەگەڵ کرد و ئەو بوو بە هـۆی ئیسـلام بـوونی، ئـەم پیـاوە بـەڕێزە دووجار کۆچی کرد بۆ حەبەشە و جاری سێهەمیش بۆ مەدینەی مونەووەرە، یەکێکە لە کۆچکردووە

پێشووەکان، یەکێکە لەو دە هاوڕێی پێغەمبەرە کە موژدەی بەهەشتی پێداون. هەروەها لە حەزرەتەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: شێوە و رەنگ و روخساری عوسمان لە هەموو کەس زیاتر لە شێوەی پێغەمبەر و حەزرەتی ئیبراهیم چووە. وەک وتمان مێردی دوو کچی حەزرەت بوو، کە وەک مانگ و خۆر سەربەرز و شەرافەتمەند بوون، حەزرەت(د. خ) یەکەم جار پێش بوونی بە پێغەمبەر (رقیە)ی لێ مارەکرد کە لە ساڵی (دوو)ی کۆچی لە کاتی غەزای بەدردا وەفاتی کرد، پاش ئەم (ام کلثوم)ی لێ مارە بڕی، کە ئەمیش ساڵی (نۆ)ی کۆچی کۆچی دوایی کرد[٢٨]، جا پێغەمبەر پێی فەرموو: ئەگەر چل کچم ببوایە هەر چلەکەم یەک لە دوای یەک لێ مارە دەکردی.

دوو جار حەزرەت(د. خ) دەربارەی عوسمان فەرموویەتی «ما علی عثمان ما عمل بعد هذه»، هەروەها عوسمان دوو جار بەهەشتی بۆ خۆی کڕی یەکێکیان بە کڕینی بیری رūومە. دووەمیان بە ئامادەکردنی سوپا بۆ غەزای تەبووک کە پێیان دەوت (جیش‌العسرة).

لە رووداوی حودەیبییەدا لە نزیکی (مکّە)ی موکەڕڕەمە کاتێ هاوڕێکانی پێغەمبەر(د. خ) دەستیان خستە ناو دەستی و بۆ بەگژاچوونی کافرەکانی مەککە بەیعەتیان لەگەڵ کرد، ئەگەر نەیەڵن تەوافی کەعبە بکەن و ڕێگای عەمرەیان لێ بگرن، بەڵێ لەوکاتەدا عوسمان نێررابوو بۆ مەککە؛ لە بەر ئەوە حەزرەت دەستێکی خۆی خستە ناو دەستەکەی تری و وتی: ئەمەیش لەباتی عوسمان. لەسەر فەرموودەی حەزرەت(د. خ) فریشتەکان شەرمیان لە عوسمان کردووە.

(ابن عساکر) لە ڕێگای حەزرەتی (ابن عباس) ەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی حەفتا هەزار کەس لەوانەی سزای دۆزەخ پاداشیانە خودای گەورە بە میهرەبانیی خۆی و بە تکای عوسمان لێیان خۆش دەبێ و دەچنە بەهەشت. دەڵێن حەزرەت(د. خ) پێی فەرمووە ئەو کراسەی دەیکەیتە بەرت دایمەکەنە هەتا بە من دەگەیت، جا لەسەر ئەم ئامۆژگارییە عوسمان زۆر تامەزرۆ و موشتاق بوو بۆ ئەو گەیشتن بە پێغەمبەرە(د. خ) ؛ ئەوە بوو وازی لە جێ‌نشینی نەهێنا هەتا شەهید کرا(ر.خ).

چرای (ذی النورین) ئەوا کوژیاوە
پاڵ دە؛ چار نییە، وەلای دەرگاوە[٢٩]
بابی مەدینەی عولوومی[٣٠] هودا
قالیعی بابی خەیبەری عیدا

وەلیـی مـوئمینین، ئوسـوە و موقتـەدا
مورتەزایـە و موجتـەبا و[٣١] موهتـەدا
چلـۆن فەزلـێکی وازیحـە و جـەلی
(مـن کنـتُ مـولاه مـولاهُ علـیّ)؟
(و عـن شـأنهِ العلـیّ یُجَلّـی:
أن رُدّتِ الشـمس لکـی یُصـلّی)
نـەوری حەدیقـەی گوڵشـەنی سـەفا
نـەوری حەدەقـەی عیرفـان و وەفـا
کەوکـەبی بـرووج ئەوسـافی جـەمال
ئەسـەدی بێشـەی نعـووتی جـەلال
(أخُ حبیـبِ الـرّبِّ المهـیمن
حبُّـهُ عنـوان کتـابِ المـؤمن)
(خُـصَّ بـه مـن حضـرةِ المختـار
انـتَ قسـیمُ الجنـة والنّـار)
(مـا أحـد عـن الصـراطِ جـازا
حَتّـی یُـرَقّن لـه الجـوازا)
درەخـتی سـاحیب میـوەی رائیقـە
فـەرق ناکـا میـوەی سـاحیب زائیقـە
(ألَـیسَ رأسَ بـدن الوجـود
رأسُ حبیـبِ حضـرة الـودود؟)
(مـا جـاء مـا جـا لَـهُ لأحَـدْ
مِـن صـحب النبـیّ؛ قالَـهُ أحمـد)

پاڵ دە: پاڵ بدە. نەور: گوڵاڵەی درەخت لە سەرەتای بەرگرتنیدا.

واتە: کە چرای ناوچاوانی درەخشانی عوسمانی خاوەن دوو نوور کوژایەوە و کۆچی دوایی کـرد چار نییە و پێویستە پاڵ بـدەی بـە لای ئیمـامی عەلییـەوە کـە دەرگـای شـاری زانسـتە وەکـوو

حەزرەت(د. خ) فەرموویەتی وەک تیرمیذی دەیگێڕێتەوە «انا مدینة العلم و علیٌ بابها»[۳۲] ئەم شیعرە واتایەکی‌تریش دەبەخشێت، واتە کاتێ تۆ لە هۆدەیەکدا بووی و چرایەکی تێدا بوو رووناکی دەبەخشی، کە چراکە کوژایەوە چار نییە ئەبێ پاڵ بە لای دەرگاوە بدەیت؛ هەتا لە رووناکیی دەرەوە سوود وەربگری... دیارە مەبەس لەم خانووە خانووی خیلافەتە و مەبەس لە چرای (ذی النورین) حەزرەتی عوسمانە و، مەبەس لە دەرگاکە حەزرەتی عەلیی کوڕی ئەبووتالیبە خودایان لێ رازی بێت. حەزرەتی عەلی (کرّم الله وجهه) لە تەمەنی دە سالیدا موسولمان بووە، هەرگیز سوجدەی بۆ بت نەبردبوو. ئەم زاتە پایە بالایە یەکێکە لەو دە هاوڕێیەی پێغەمبەر(د. خ) کە بە تایبەتی موژدەی بەهەشتیان پێدراوە.

کە لە شاری مەدینەی مونەووەرەدا پەیمانی برایەتی لە نێوان هاوڕێکانی پێغەمبەردا بەسترا پێغەمبەر(د. خ) عەلیی بە برای خۆی دانا[۳۳].

عەلی یەکێکە لە زانا هەرە گەورەکانی هاوڕێیانی پێغەمبەر. ئەو بوو لە غەزای خەیبەردا دەرگای قەلای خەیبەری هەلکەند، لە داوەری و بڕینەوەی دعوا و دەعواکاریدا یەکەم داوەر بووە.

خۆشەویست و پێشەوای موسولمانان بووە. جێگای رەزامەندیی خودای گەورە بووە. بە ئامۆژگاری و فێرکردنی لە لایەن پێغەمبەرەوە بە تایبەتی رێی رووناک و پیرۆزی خۆی دۆزیوەتەوە.

سالی (حجة الوداع) کە دوا حەججی پێغەمبەر بوو لە غەدیری خوم پێغەمبەر فەرمووی «مَن کنتُ مولاه فعلیٌّ مولاه، اللّهمّ والِ مَن والاه و عادِ من عاداه». زانایانی حەدیس وشەی (مولی) یان بە دۆست و یارمەتیدەر لێکداوەتەوە. بێگومان ئەم پایە بۆ حەزرەتی عەلی پایەیێکی ئێجگار بەرزە.

دەگێڕنەوە: رۆژێ لە پاش نوێژی عەسر حەزرەت سەری لە کۆشی عەلیدا بوو، لەوکاتەدا وەحیی بۆ هات و وەحیەکە درێژەی کێشا هەتا مەغریبی بەسەراهات، لەوێدا حەزرەت(د. خ) فەرمووی «اللّهم انه کان فی طاعتک و طاعة رسولک فاردد علیه الشمس فطلعت بعد ما غربت». ئەم حەدیسە تەحاوی و قازی عەیاز لە کتێبی (شفاء)دا بە (سحیح) یان داناوە. (ابو زرعة) یش لەگەڵ کۆمەلێکدا بە (حسن) یان داناوە و، بەرپەرچی قسەی ئەوانەیان داوەتەوە کە وتوویانە: (موضوع) ە، واتە هەلبەستراوە و راست نییە.

حەزرەتی عەلی هەلالەی رەنگاوڕەنگی باغچەی سەفادار و رووناکی گلێنەی چاوی وەفادارانە، ئەستێرەی بورجی سیفەتە جەمالییەکانی خودا بووە، واتە دیدگای ئەو سیفەتانە بووە و هەرکات دوعای چاکەی بۆ خەڵک کردبێ خودا قبوولی کردووە، هەروەها شێری بێشەی سیفەتی جەلالییەکانییەتی، واتە کە دوعای شەڕی لە هەرکەس کردبێ دوعاکەی گورج گیرا بووە، عەلی برای پێغەمبەری خۆشەویستی خودا بووە، خۆشویستنی عەلی نیشان و سەر لاپەڕەی دەفتەری باوەڕی موسوڵمانانە، بە واتایەکی تر خۆشویستنی ئەو نیشانەی ئینسانی موسوڵمانە. دەڵێن حەزرەتی عەلی(ر.خ) لە لایەن حەزرەتەوە(د. خ) تایبەتە بەوەی کە بێ ڕێدانی ئەو کەس لە (صراط) نەپەڕێتەوە و، هەروەها ئەو لە ڕۆژی خۆیا ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ لێک جیادەکاتەوە.

پاش ئەمە مەولەوی دەفەرموێت: درەختێ کە خاوەنی میوەی جوان بێ فەرقی سەر و خواری نییە، واتە: لە خانەدانی پێغەمبەریدا حەزرەت(د. خ) خۆی سەربەرزی ژوورەوە بووە، ئیمامی عەلی بن لقی خوارەوە بووە و، میوەی هەردوویان بە تام و شیرینە[٣٤].

هەروەها بە شێوەی (استفهامی انکاری) دەفەرموێت: ئایا پێغەمبەری خۆشەویستی خودا سەری لاشەی بوون و بووان نییە؟[٣٥]

هەروەک ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەفەرموێ: ئەوەندە حەدیس لە پیاهەڵدانی عەلیدا هاتووە بۆ کەسیتر نەهاتووە.

هَل زَوَّجْ (زهرا) غیرَ ذا الفتی؟!
هل أتی إلّا فیهِ (هل اتی)؟!
کێس گەیشتوێ تا ئەو نیهایە؟
لە شەئنیدا بێ تا سێسەد ئایە؟!
(ألَیسَ قالَ وَلَدُ الخطّاب،
مَعْ ذلک الفضل لِذاک الجناب)
پەناه بەو خودای (ذی الآلا) و مینەن
لەو موعزەلە بۆی نەوێ (بوالحسن)؟
کێ بوو قائیل وێ بە (والله ما
تنزّلتْ مِن آیة مِن سَما)

ئـــیللا دەیـــزانم یـــەک بـــە ئیســـبات
لە چی دا و، لە کویَ و، ئەسەر کیَ و، کەی هات؟
(و هـــــذا الکـــــلام لا تغفـــــل عنـــــه
«علــــیٌ منّـــــی و أنــــا منــــــه»)
(و بــــــذا الحـــــدیث علمُنــــــا حَصَــــل
«فـــی هـــذا الفتـــی مـــن عیســـی مَثَـــل») (٣٦)
شەمســـــی ئاسمـــــان عیـــــزز و تـــــەوقیرە
ئاســـــار کەســـــیرە ئـــــەنوار شـــــەهیرە
ئـــەر مـــەدحی بکـــەم مـــەدحی خۆمـــە فـــاش
نـــووری ئـــەو لـــە کـــویَ و بینـــایی خـــەففاش؟!
(إجتَــــــثٌ مِــــــنَ الــــــدنیا اجتثاثـــــا
وَ یایَنهــــــــا قلبــــــــاً ثلاثـــــــا)
(جـــادَ بـــالوُجوُد فـــی الـــرّبِّ المعبـــود
غاصـــت نفســـهُ فـــی بحـــر الشـــهود)
مـــورادی مـــوراد رەبـــبی هـــادی بـــوو
(مـــورادی) قـــازی بـــۆ مـــورادی بـــوو
طـــاعَ لأمـــــرٍ یمضـــــی وَ مَضـــــی
مَـــا راعَـــهُ مـــا قضـــاه القضـــا
(أســـــلَمَ وَجْهَـــــهْ لمـــــا جَبَهَـــــهْ)
(فکـــــرَّم الله تعـــــالی وجهـــــهْ)

واتە: حەزرەت(د. خ) کچی خۆشەویستی خۆی فاتیمەی زەهرای لە کیَ مارەکرد لە عەلی نەبیَ؟(٣٧)، دیارە ئەم دەستنیشانکردن و هەڵبژاردنەیش لەبەر ئەوە بووە کە حەزرەتی عەلی پیاویَکی دیاری و لیَهاتوو و خۆشەویستیَکی لەدڵاجیَگرتووی حەزرەت بووە.

تەبەرانی لە ئیبنومەسعوودەوە دەگیَڕیَتەوە کەوا پیَغەمبەر فەرموویە «ان الله تبارک و تعالی أمرنی ان ازوجّ فاطمةَ من علی».

هەروەها مەولەوی لە باسی گەورەیی پایـەی حـەزرەتی عەلیـدا بـە شـێوەی پرسـیار دەڵـێت: سوورەتی پیرۆزی (هَل أتي عَلي الإنسان حينٌ من الدَّهرِ) دەربارەی کێ هات بـۆ پێغەمبـەر(د. خ) ئەگەر دەربارەی عەلی نەهاتووە؟

ئەگێڕنەوە: هۆی هاتنی ئەم سوورەتە حەزرەتی عەلی و حەزرەتی فاتیمەی زەهرا بوون؛ ئیمـام فەخری رازی لە تەفسیرە گەورەکەیدا دەڵـێت: (واحـدی) کـە لـە کۆمەڵـی ئیمەیـە لـە کتـێبی (بسیط)دا ئەڵێت ئەم سوورەتە دەربارەی ئەوان هـاتووە، پوختـەی قسـەکەی ئەوەیـە حەسـەن و حسێن نەخۆش کەوتن؛ عەلی و فاتیمە و کەنیزەکێکیان، کە ناوی (فضّە) بوو، لە سەر خۆیان نـەزر کرد ئەگەر خودا شیفای ئەم دوو نەخۆشەی دا یەکی سێ رۆژ بەڕۆژوو بن، ئەوەبوو خودای شیفای دان و ئەوانیش نەزرەکەیان بەجێهێنا و بەڕۆژوو بوون، هەر رۆژێ لەو سێ رۆژە لە کاتی بـەربانگ کردنەوەدا گەدا و نەدارا ئەهاتنە بـەردەرگایان، ئـەوانیش ئـەوەی لـە بەردەسـتیاندا بووبـێ پێیـان ئەدان. دیارە تەنها لەبەر رەزامەندیی خودا، ئەنجا لە ستایش و پیاهەڵـدانی ئـەو حاڵـەتە جوانـەی ئەواندا ئەم سوورەتە پیرۆزە هاتووە بۆ پێغەمبەری گەورە(د. خ).

هەروەها مەولەوی دەفەرموێت ئاخۆ کـەس گەیشـتووەتە ئـەو پایەیـە کـە سێسـەد ئایـەت لـە قورئانی پیرۆز لە نەعت و ستایشی ئەودا نازڵ بێت وەک بۆ حەزرەتی عەلی نازڵ بووە؟

حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب(ر.خ) لەگەڵ ئەو هەمووە زیرەکی و لێهاتووییەدا کـە بـووی دەیفەرموو پەنا بە خوا لەوەی مەسئەلەیەکی گران لە ناومانا هەڵـبکەوێ و (ابـو الحسـن) ـ واتـە: عەلی ـ لێرە نەبێ چاری بکات، مەبەستی ستایشی حەزرەتی عـەلی بـوو لـە چـارکردنی مەسـئەلە گیروگرفتدارەکاندا.

(ابن سعد) لە حەزرەتی عەلییەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی هەر ئایەتێ لە ئاسمانـەوە هاتبێتـە خوار من دەزانم دەربارەی چی و لە کوێدا و دەربارەی کێ و لە چ کاتێکا هاتووەتە خوار.

حەدیسێکی‌تریش دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: «أنَّ عليّاً منِّي و انا منه و هو وليّ كـلّ مؤمن بعدي»[۳۸] مەبەس لەم فەرموودەیە پێوەنـدی رۆحیـی لەئەندازەبـەدەری نێـوان حـەزرەتی پێغەمبەر و ئیمامی عەلییە.

هەروەها مەولەوی لە ستایشی حەزرەتی عـەلی‌دا دەفـەرموێ: عـەلی پڕتەوبەخشـی ئاسمـانی سەربەرزی و شەرافەتە و نووری بە جیهاندا بڵاوە، ئەگەر من ستایشی بکـەم ئـەوە ستایشـی خـۆم دەکەم؛ یەکەم لە بەر ئەوەی کە خۆم لە نەوەی عەلیم کـە خـاوەنی ئـەم هـەمووە پایەبەرزانەیـە،

دووەم: چونکە لە ستایشی منەوە بۆ عەلی ئەوە دەردەکەوێت کە گوایا من مرۆڤێکی ورد و زیرەک و خاوەن‌هۆشم و دەتوانم ستایشی ئەم زاتە گەورە بکەم، بەڵام وانییە چونکە لە راستیدا پرتەوی رۆژی رووی ئەو بە شەمشەمەکوێرەیەکی وەک من نابینرێ...

بەڵێ حەزرەتی عەلی لە دنیا و سامانی دنیا بە تەواوی پچڕا و لە ناخی دڵیەوە دنیا و خۆشیی دنیای سێ بە سێ تەڵاق دا و گەڕانەوەی بۆ نەبوو.

گیانی خۆی لە پێناوی خودادا بەخشی و لە دەریای بێ‌بنی (شهود)دا نوقوم بوو.

موراد و مەبەستی ئەو موراد و مەبەستی خودا بوو؛ واتە خودای گەورە چی ویستووە عەلیش ئەوەی ویستووە؛ (عبدالرحمن)ی کوڕی مەلجەمی مورادی کە تاوانی کرد و حەزرەتی عەلی شەهید کرد لە راستیدا موراد و خواستی عەلیی جێ‌بەجێ کرد؛ عەلی ئەیویست بە شەهیدی و خوێن بەبەرگەوە بچێتە بارەگای خودای گەورە، ئەوەبوو (مورادی) مورادی هێنایەدی! مل‌کەچی خوداپەرستی بوو، سەری پێوە نەبوو بۆ هەر قەزا و قەدەرێکی خودایی و بە رەزامەندییەوە سەری بۆ قەزای خودا دادەنەواند و لێی نەدەترسا، قەزای خودای خۆش دەویست و بە دڵنیاییەوە خۆی دابووە دەستی خودا و ئەوەی لای خوداوە رووی تێ‌دەکرد. خودایش رووسووری دنیا و قیامەتی کرد.

***

١ـ ئەم سەرباسە تەنها لە چاپەکەدا هەیە.

٢ـ لە نوسخە چاپەکەدا (هەمزە) یەک لەسەر (هێ)ی (حقّە) نووسراوە کە دەکاتە (حەقەی) بێ‌گومان (حەقە) راستە، وەک لە دەستنووسەکەدا نووسراوە. دیارە (خیلافەت) موبتەدایەو (حەقە) خەبەریەتی.

٣ـ لە دەستنووسەکەدا لە ژێر (ی)ی (تێدا)دا چوار نوقتە دانراوە. دوور نییە (تێید) بووبێت و، بە هەڵە چۆکلەکەی تر نەنووسرابێت.

٤ـ ئایەتی (٥٤) لە سوورەتی (المائدە).

٥ـ ئایەتی (١٦) و (١٧) لە سوورەتی (فتح).

٦ـ ئایەتی (٥٥) لە سوورەتی (نور).

٧ـ ئایەتی (٨) لە سوورەتی (حشر).

٨ـ ئایەتی (٦) و (٧) لە سوورەتی (الفاتحە).

٩ـ بە پێی پەراوێزی دەستنووسەکە: هەڵدەگرێ واتاکەی: ئیمام عەلی بێت یا ئیمام عەلی ئیمام بێت.

١٠ـ بە پێی پەراوێزی دەستنووسەکە هەڵدەگرێ (بۆ خودا) یا (بەو خودا) بێت، کە ئەم دواییە قەسەم دەبێت.

١١ـ وا بزانم ئەم بەیتەی مەولەوی موبالەغەیەکی زۆری تێدایە، ئەوەندەی مەبەست بووە حەزرەتی ئەبووبەکر گەورە بکات بەلام جڵەوی تەعریفی لە دەس دەرچووە. ئەگینا پێغەمبەرێکی خاوەن پەیامی لە (اولو العزم)ی وەک حەزرەتی (محمد) و ئەبووبەکرێ کە یەکێکە لە ئوممەتی ئەو، (روح القدس) چۆن «فەرقی نەکردن (أصلاً) لە هیچدا؟!».

١٢ـ ئایەتی (٢٢) لە سوورەتی (نور).

١٣ـ ئایەتی (٤٠) لە سوورەتی (توبە).

١٤ـ ئایەتی (٣٣) و (٣٤) لە سوورەتی (زمر).

١٥ـ ئایەتی (١٥٩) لە سوورەتی (آل عمران).

١٦ـ ئایەتی (٤٦) لە سوورەتی (رحمن).

١٧ـ ئایەتی (٤) لە سوورەتی (تحریم).

١٨ـ ئایەتی (١٧) و (١٨) لە سوورەتی (لیل).

١٩ـ ئایەتی (١٣) لە سوورەتی (حجرات).

٢٠ـ هەمزەی (أینَ)ی دووەم لەبەر وەزنی شیعرەکە ناخوێنرێتەوە.

٢١ـ ئایەتی (١٢٥) لە سوورەتی (البقرە).

٢٢ـ ئایەتی (١٤) لە سوورەتی (مؤمنون).

٢٣ـ ئایەتی (١٢) لە سوورەتی (مؤمنون).

٢٤ـ لە دەستنووسەکەدا و لە چاپەکەیشا (داگرت) ە، بەلام ئەگەر (دایگرت) بوایە جوانتر دەبوو، بەم شێوە ئەمان نووسیویانە (زولمەت) موبتەدایە و (داگرت) خەبەریەتی و (خافقین) مفعوولی (داگرت)ە. بەو جۆرەی من ئەیلێم (خافقین) موبتەدای دواکەوتوو و (زولمەت دایگرت) خەبەری دەبوو.

٢٥ـ قال (عبدالرحمن بنُ خبّاب (ر): شهد النبی (ص) و هو یحثّ علی جیش العسرة، فقام عثمان فقال یا رسول الله علیّ مائة بعیر باحلاسها و اقتابها فی سبیل‌الله. ثمّ حضّ علی الجیش فقام عثمان فقال: یا رسول الله علیّ مائتا بعیر باحلاسها و اقتابها فی سبیل‌الله. ثم حضّ علی الجیش فقام عثمان فقال: یا رسول الله علیّ ثلاث‌مائة بعیر بأحلاسها و اقتابها. فأنا رأیت رسول الله (ص) ینزل علی المنبر و هو یقول «ما علی عثمانَ ما عمل بعد هذه، ما عَلی عثمان ما عمل بعد هذه»

منصور علی ناصف، التاج الجامع للاصول فی احادیث الرسول، بیروت، دار احیاء التراث العربی ١٣٨١ هـ ١٩٦٢ م، الجزء الثالث ص ٣٢٩.

وا بە پێی ئەم حەدیسە پێغەمبەر(د. خ) دووجار فەرمووی «ما علی عثمان ما عمل بعد هذه» وەک مەولەوی دەلێت (کە کرّتین «ما علی عثمان»).

٢٦ـ ئیشارەیە بۆ ئەم حەدیسە: (... قال رسول الله(ص): من یحفر بئر رومة فله الجنة فحفرها عثمان. و من جهّز جیش العسرة فله الجنة). هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٢٦. مەولەوی دەلێت حەزرەتی عوسمان بە پێی ئەم

حەدیسە دووجار بەهەشتی بۆ خۆی کڕی. بیری رومە تاقە بیرێکی ئاو شیرین بوو لە مەدینە عوسمان کڕیی بۆ موسوڵمانان.

٢٧ـ «... فقال الا استحیی من رجل تستحیی منه الملائکة...»، سەرچاوەی پێشوو ل ٣٢٧.

٢٨ـ بڕوانە: (جلال الدین السیوطی، تاریخ الخلفاء، تحقیق محمد محیالدین عبدالحمید، مطبعة المدنی، القاهرة،١٩٦٤ص ١٤٨).

٢٩ـ لە دەستنووسەکەدا لە پاڵ دەرگا (باب) نووسراوە، دیارە (باب)ی شیعری دوایی بەدەلە و مەبەست لە هەردووکیان حەزرەتی (عەلی) یە.

٣٠ـ لە دەستنووسەکەدا بۆ (م)ی (علوم) ژێریش و بۆریش کراوە، واتە: دەیشتوانی بە (عولوم و)ی بخوێنیتەوە، وەک لە چاپەکەدا نووسراوە.

٣١ـ لە دەستنووسەکەدا (محتبی) بە (ح) نووسراوە، کە دیارە هەڵەیە و نوسخە چاپەکە راستە. ئەم نیوە بەیتە بۆ ئەوەی کێشەکەی تەواو بێ بەمجۆرە دەخوێنرێتەوە: (مورتەزایە و موج تەبا و موهتەدا).

٣٢ـ و رواه ابن عبدالبر، و لفظه: «انا دار الحکمة و علیّ بابها». منصور علی ناصف، التاج الجامع للاصول فی أحادیث الرسول، بیروت، دار احیاء التراث العربی، ١٣٨٢هـ ـ ١٩٦٢، الجزء الثالث، ص ٣٣٧. انظر هامشه ایضا.

٣٣ـ قال ابن عمر: آخی النبی(ص) بین اصحابه. فجاء علیّ تدمع عیناه. فقال: یا رسول الله آخیتَ بین أصحابکَ و لم تؤاخِ بینی و بین احد. فقال له رسول الله(ص): أنت أخی فی الدنیا و الآخرة. سەرچاوەی پێشوو ل (٣٣٥).

٣٤ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا (منهُ) یەک بە فارسی نووسراوە ئەمەی خوارەوە پوختەی وەرگێرانەکەیەتی.

(واتە: ئینسانی خاوەن چەش لە نێوان بەری دارێکی میوەی نازکداردا جیاوازی ناکات، گوێ ناداتێ ئەو میوەیە بەری ئەم لقە بێ یا هی ئەو لقە، یەکەیەکەی میوەی ئەو دارە لە خۆشیدا وەک یەک وان؛ کەوابوو واتای بەیتەکە روون بووەوە و، ئیشارەیە بۆ مەعنای ئەو فەرموودەیە کە لە پێغەمبەریەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: من و عەلی میوەی یەک دارین).

٣٥ـ بە پێی ئەوەی کە باوکم لە لاپەڕە (٧٧٢)ی کتێبی (الوسیلة فی شرح الفضیلة)دا وتوویە، لەم بەیتە (ألیس راس بدن...) دەلیلێکی مەنتیقی دروست دەبێ (صغری) کەی باس نەکراوە، واتە: (عەلی وەک سەری پێغەمبەر وایە). لەم بەیتیشە (کبری) کەی وەردەگیرێ، واتە (سەری پێغەمبەری خۆشەویستی خوایش سەری لاشەی بوونە). دیارە (نتیجە) کەیشی دەبێتە (عەلی وەک سەری لاشەی بوون وایە). بناخەی ئەم دەلیلەیش ئەو فەرموودەیە لە پێغەمبەریەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: «علیّ منّی بمنزلة رأسی من بدنی».

شایانی باسە: مەولەوی لەم باسەدا و لە باسی گەورەیی حەزرەتی عوسماندا لە هەندێ شوێنی تردا شیعری ئەم (عەقیدە مەرزییە)ی بردووە بە (فضیلە) کەی و تۆزێ دەسکاری کێشەکەی کردووە تا لەگەڵ کێشی ئەوێدا بگونجێ.

٣٦ـ لە نوسخە دەستنووسەکەدا دوو نیشانەی وەک یەک لە ژێر (الحدیث) و (فی هذا التی)دا دانراوە، مەعنای ئەوەیە حەدیسەکە بریتییە لە (فی هذا الفتی مِن عیسی مَثَل) کە دەکاتە (فی هذا الفتی مَثَلٌ مِن عیسی) مەبەستی مەولەوی ئەوەیە: ئێمە ئاگاداری ئەو حەدیسەیشین کە دەفەرموێ (فی هذا الفتی مَثَلٌ مِن عیسی). جا بۆ ئەوەی

دەقی حەدیسەکەت بۆ دەرکەوێت سەیرێکی ئـەم عیبارەتـە بکـە کـە جەلالـەددینی سـیووتی لـە کتـێبی (تـاریخ الخلفاء)دا نووسیویە:

و أخرج البزاز و ابویعلی والحاکم عن عليّ قال: دعاني رسول الله(ص) فقال:«یا عليُّ إنَّ فیک مثلُ من عیسی، أبغضته الیهودُ حتی بَهَتوا أُمَّهُ، و أحبّتهُ النصاری حتی انزلوه بالمنزل الذی لیس به». ألا و انّه یهلک فيّ اثنان: مُحِبٌّ مفرطٌ یُقرِّظُني بما لَیسَ فيّ، و مبغض (مفترٍ) یحملُهُ شنئاني عَلی ان یَبْهتَني.

واتە: «ئەی عەلی! تۆ نموونەیەکی عیسات تێدایە، جوولەکە ئەوەندە رقیان لێ بوو تەنانەت بوختانیان بۆ دایکـی کرد. نەسرانییش ئەوەندەیان خۆش ویست پلەیەکیان بۆ دانا کە هی ئەو نەبوو».

ئەمە واتای فەرموودەکەی حەزرەت(د. خ) بوو. دوایی حەزرەتی عەلی دەفەرموێ: دوو کۆمەڵ بە هـۆی منـەوە بە فەتەرات دەچن: ئەوانەی زۆریان خۆش دەوێم و شتی وام پیا دەڵێن کە تیاما نییە و، ئەوانـەیش کـە زۆر رقیـان لێمە و ئەو رقە وایان لێ دەکات بوختانم بۆ هەڵبەستن.

۳۷ـ فاتیمە بە ساڵێ پاش بوونی حەزرەتی موحەممەد بە پێغەمبەر لە دایک بوو. حەزرەتی عەلی پـاش غـەزای بەدر ساڵی دووی کۆچی مارەی کرد، پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر بە شەش مانگ ئەویش وەفاتی کرد. سەرچاوەی پێشوو، ل ۳۷۷، پەراوێزەکەی.

۳۸ـ سەرچاوەی پێشوو، ل (۳۳۵).

## مبحث الحسن و الحسين رضى الله تعالى عنهما[1]

هـەرچی پـەنهان کـرد حـەق لـە شـەجەردا
دیـــاره لـــە فـــەرع نـــەور و ســـەمەردا
ئـــەولاد کـــە (اولی) و فـــەزلی جـــەلی بـــوو
ئـــەولا تـــاج (لـــولا)، ئـــەم لا عـــەلی بـــوو
نوانـــدی ئەوســـاف کـــەمالی ئەســـلەین
ئایینەکـــەی ســـاف حەســـەن و حوســـەین
ئـــەخلاقی حەســـەن نایەتـــە تـــەقریر؛
زوان کـــام کـــەلام؟ خامـــە کـــام تـــەحریر؟
لـــە وردەی هیممـــەت ئـــەو ئـــەر ئاگـــاهی
نەلەخشـــی و بەخشـــی مەرتەبـــەی شـــاهی
ئیســـلاحی حەســـەن (بـــین المـــؤمنین)
(أحیـــــاهم، أحیـــــاهُ الله آمـــــین)
فیعلـــــی (للعبـــــاد للمعبـــــود) دەوێ
مەهـــدی لـــە ئـــەولاد ئـــەو مـــەوجوود دەوێ
گوزەشـــت لـــە شـــاهی وەســـەر ئەشـــباحدا
فەرمانفـــەرما بـــوو وەســـەر ئەرواحـــدا
بـــەم تـــەحریره چـــاک موئەییـــەد دەوێ:
«قوتب هـــەر لـــە نەســـل موحەممـــەد دەوێ»

تەرەججیی حەزرەت چاک زوهووری کرد
ئاوڕووی بۆ رووی ئەمر موعاویە ئاورد
بەو موددەی شەش مانگ ئەو ساحیب فنوون
تمّ «الخلافة بعدی ثلاثون»

ئەولا: لەسەری دایکەوە. (تاج لولا): «لولاک لولاک لما خلقت الافلاک» تاجی بوو، مەبەست پێغەمبەرە(د. خ). ئەم لا: لە سەری باوکەوە. زوان: زوبان. خامە: قەڵەم. ئەر: ئەگەر. نەلەخشی: نەلەرزی، نەترسا. (للمعبود) دەوێ: بۆ خودای دەوێت. مەوجوود دەوێ: مەوجوود دەبێت. گوزەشت: وازی هێنا. فەرمانفەرما: فەرمانڕەوا، دەستەڵاتدار. ئاوڕوو: ئابڕوو. ئاورد: هاورد، هێنا.

واتە: هەر خێر و پیرۆزییەک کە خودای گەورە لە ئەسڵی درەختەکەدا دایناببوو، لە لق و هەلالە و بەری بەتامی ئەو درەختەدا دەری‌خست، واتە ئەو چاکی و پایەبەرزییانەی خودا لە حەزرەتی عەلی و حەزرەتی فاتمەدا شاردبوویەوە هەمووی لە ئەولادەکانیاندا؛ کە حەزرەتی حەسەن و حەزرەتی حسێن بوون؛ دەرخست، خودایان لێ رازی بێت، ئەمەیش شتێکی سەیر نییە.

ئەم نەوانە سەرێکیان پێغەمبەر و ئەوسەرەکەیان عەلییە، جێی خۆیەتی کە ئاوێنەی بی‌گەردی وجوودی حەسەن و حسێن گەورەیی و تەواوی و بێ‌خەوشیی پێغەمبەر و عەلی بە جوانی بنوێنێ.

با لە حەزرەتی حەسەنەوە دەست پێ بکەین؛ خوو و رەوشت و کردەوەی بەرزی ئەم زاتە لە وتن نایەت؛ چ زوبانێک هەیە بتوانێ بیڵێت؟ چ قەڵەمێک هەیە بتوانێ بیخاتە سەر کاغەز؛ ئەوەتە بە بێ‌ترس و لەرز لە دوژمن هەر لە پێناوی رەزای خودای گەورە و پاراستنی خوێنی موسوڵمانان‌دا پایەی پادشایەتیی خۆی بەخشی، واتە وازی لە خیلافەت هێنا بۆ حەزرەتی موعاویە، ئەم ناوبەین خۆش‌کردنە و ئەو کارە گەورەی حەسەن کە ئاژاوەی کوژاندەوە و ئاشتیی خستە ناو موسوڵمانان هەموو ئەو موسوڵمانانەی لە مردن رزگار کرد، خودای گەورە ژیانی ئەبەدیی پێ ببەخشێ.

ئەو کارەی کە حەزرەتی حەسەن بەدیمەن بۆ خەڵکی کرد لە پێناوی خۆشنوودیی خودای گەورەدا کردی، خودایش پاداشی بەوە دایەوە کە حەزرەتی (مەهدی) لە نەوەی ئەو بێت، حەسەن وازی لەوە هێنا کە ببێتە گەورەی ئەشباح (تارماییەکان)، بۆیە خودا کردی بە گەورەی جیهانی ئەرواح (گیانە نەمرەکان).

هەروەها مەولەوی دەربارەی پایەبەرزیی حەزرەتی حەسەن و تێکڕای کوڕانی حـەزرەتی فاتمـە دەفەرموێ: ئەوەی کە باسمان کرد یارمەتی ئەو قسەیە ئەدا کە لە نـاو ئـەولیا و عارفانـدا هەیـە و ئەڵێن (قطب)ی زەمان هەر لـە نـەوەی حـەزرەتی موحەممـەدا هەڵـدەکەوێت، دیـارە ئەمـەیش بەهرەیەکە خودا بەوانی داوە بە تایبەتی چونکە ئەوانیش رەزای خودایان ویستووە.

مەولەوی لەم ستایشەدا ئیشارە ئەکات بۆ ئەو حەدیسـە کـە دەربـارەی حەسـەن فەرموویـەتی کاتێ کە حەسەن هێشتا منداڵ بووە: «ابنی هـذا سـیّدٌ و لعـلّ الله ان یصـلح بـە بـین فئتـین مـن المسلمین» [٢] وەک بوخاری ریوایەتی کردووە، جا لەم بابەتەوە دەڵێت: خودای گـەورە تکاکـەی حەزرەتی(د. خ) هێنایە دی ؛ ئەوە بوو ئەم زاتە بوڵەندسیفاتە پاش شەهیدبوونی حـەزرەتی عـەلی لە کووفە موسوڵمانان بەیعەتیان پێ کرد و بوو بە ئیمام و پێشەوای بەحەقی موسوڵـمانان و چـووە ریزی (خلفای راشدین) ەوە، ئەم خیلافەتەی ماوەی شەش مانگ بەردەوام بـوو، پـاش ئـەوە وازی لێ هێنا بۆ حەزرەتی موعاویە و، ئەم کار و باری دەوڵەتی ئیسلامی گرتە دەست.

بە بوونی موعاویە بە خەلیفە لـە ئـەنجامی (تنـازل)ی حـەزرەتی حەسـەن‌دا ئابـڕوو و رێـز بـۆ روخساری ئەمر و نەهی و فەرمانڕوانیی موعاویـە پەیـدا بـوو، چونکـە لـە پـێش ئـەو (تنـازل) ەدا فەرمانڕەوای شەرعی نەبوو.

مەولەوی بـە وشـەی (امـر) ئیشـارە دەکـات بـۆ ئـەو فەرموودەیـەی لـە پێغەمبەریـەوە(د. خ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی بە موعاویە: [اذا حکمت فاعدل] ـ گوایا وشـەی (امـر) لـە شـیعرەکەدا ئیشارەیە بۆ وشەی (اعدل) لە حەدیسەکەدا کە فیعلی ئەمرە.

لە دوادوایی باسی حەزرەتی حەسەن‌دا مەولـەوی دەفـەرموێ بـەم شـەش مانـگ خیلافەتـەی حەزرەتی حەسەن[٣٠] ساڵی خیلافەت تەواو بوو ئەمەیش ئیشـارەتە بـۆ ئـەو فەرموودەیـە کـە لـە پێغەمبەرەوە ریوایەت کراوە کە فەرموویـەتی:«الخلافـة فـی أمتـی ثلاثـون سـنة ثـم ملـک بعـد ذلک»[٣].

خودا لـە حەسـەن و لـە هاوڕێیـانی تـری پێغەمبـەر و ئـال و بـەیتی پێغەمبـەر و لـە هـەموو پەیڕەوانیان رازی بێت.

قوربـــانیی کەعبـــەی وەفـــا: ئیســـماعیل
بـــورجی ســـەیری میهـــر ســـەیدی جـــەلیل

بـــەقای لازم بـــوو؛ تـــا تـــەمام بـــێ دەور
فیدای پێ دەویســت، چلـۆن؟ حوســەین تـەور
تـــەدبیری تـــەقریر (خـــالق الـــوری)
چ چـــاک تـــەعبیر دا لـــە «إنـــی أری..»:
رۆحی حوسەین هات، فەرمووی: های خـەلیل!
من بەدەل، نەیکەی، وەختی خۆی، دەخیـل[٤]
چون نیسبەت بـە فـەزل مەعریفـەی ئـەو زات
دەدوت بـەدەل بـۆی نـەکیرەی لـێ هـات[٥]
(قـــال، واصـــفاً، حضـــرةُ العلـــیم:
«و فـــدیناه بِـــذِبح عظـــیم»)
پـەز ئـەرچی چـەرای رەوزەی نـەعیم بـێ
دەشـێ بـۆچ لایـەق وەسـفی عـەزیم بـێ؟!
ئەڵـبەت ئـەو زەبحـە حوسـەین بـوو، راسـە
ئەســفیا هـــەرچی دەفـــەرموون واســـە[٦]
گوزەشـــتی[٧] زاهـــیر بـــاتین هاتـــە بـــەین
ئەو خاسەی حەسەن، ئـەم خاسـەی حوسـەین

پەز: مەڕ. چەرا: لەوەڕان. مەبەست لەوەڕخۆر یا لەوەڕگایە.

واتە: ئەو ئیسماعیلەی خۆی کردبووە قۆچی قوربـانی، ئـەو ئیسـماعیلەی بـڕیار درابـوو بکرێتـە قوربانیی کەعبەی وەفاداری، ئەو ئیسماعیلەی کە بورجی هاتوچـۆی نوتفـەی حـەزرەتی (رسـول الله) (د.خ) بوو، مانەوەی پێویست بوو، دەبـوا بژیایـە هـەتا ژن بێنـێ و بەشـە نوتفـەی حـەزرەتی محمد(د.خ) لە پشتی ئەوەوە بگوێزێتەوە بۆ کوڕ و کوڕەزای تا دەگاتە (عبدالله)ی باوکی حەزرەت و، دەورەی ئەو نوتفە لە مەداری باوک و باپیراندا تەواو بێت و خۆری روخساری نازداری پێغەمبـەر لە ئاسۆی ژیانەوە هەڵبێت و جیهان رووناک بکاتەوە.

ئەم مانەوەی حەزرەتی ئیسماعیلەیش فیدای دەویست، فیدایەکی حسێن‌ئاسا، مەزن و بـەنرخ. تەقدیر و رێکخستنی کار لە لایەن خودای گەورەوە چەند جوان بوو، چەند جوان خەونەکـەی بـۆ

ئیبراهیم پێغەمبەر لێکدایەوە، کاتێ کە وتی: (...یا بنـیّ اِنـی اری فـی المنـامِ أنّـی اذبحـک...) [٨] چەند بەجێ بوو کە گیانی پاکی حسێن ببێتە قوربانی لەباتی ئیسماعیل.

بەڵێ رۆحی حەزرەتی حسێن بوو کە دەستبەجێ هاتە گۆ و سەری لە پێناودا دانا و، بە بـاپیرە ئیبراهیمی وت: بابە گەورە! دەخیلت بم نەکەی، سەری نەبڕی، منم لەباتی ئەو، من قوربانیم!

جا لەبەر ئەوە (اسماعیل) عەلەمە و مەعریفەیە و (ذبح) کە مەبەست لێی حسـێنە نەکیرەیـە و، نەکیرەیش بەبێ ئەوەی تەخصیص بکرێت و مەبەست لێی شتێکی تایبەتی بێـت، نابێتـە بـەدەلی مەعریفە، خودای گەورە لە قورئانا وشەی (عظیم)ی کردە سیفەتی وشـەی (ذبـح) و فـەرمووی: (و فدیناه بذبح عظیم...) [٩].

بۆ جێبەجێ کردن و بەهێزکردنی ئەم رایە مەولەوی دەفـەرموێت: بـا ئـەو مـەڕە پـەروەردەی باخی بەهەشتیش بێ و لەوێ لەوەڕابێت، کەی شایانی ئەوەیە (عظیم) بکرێتە سیفەتی؟!

کەواتە ئەو قوربانییە، ئەو (ذبح)ە حەزرەتی حسێن بووە، بۆیە (عظیم) کراوەتە سـیفەتی، دیـارە قسەی دۆستانی خودا و دڵڕووناکەکان راستە، کە فەرموویانە گیـانی پـاکی حسـێن فریاکـەوت و لەباتی ئیسماعیل بوو بە قۆچی قوربانی.

لە باسی حەزرەتی حەسەن‌دا وتمان کە ئەو گوزەشتی لـە حوکمـداریی زاهـیر کـرد، تـا خـودا کردی بە فەرمانداری کاروباری مەعنەوی و رووناکیی دەروون.

حەزرەتی حسێنیش گوزەشتی باتینیی کرد، واتە گیانی خۆی کردە فیدا و قوربانی ئیسـماعیل و ئەو خۆباخـت‌کردنـەی لـە ژیـانی زاهیریـدا دەرکـەوت. ئـەم دوو زاتـە پایەبەرزانـە هـەر یـەک خاسییەتێکیان هەبوو؛ یەکێکیان وازی لـە حوکمـداری هێنـا و ئـەوی تریـان لـە گیـان، خـودای گەورەیش پاداشی شایانی هەردووکیان بداتەوە.

کـــە شـــەرەفناک بـــوون (مُقَـــدِّمَتَین)
حاجــەت هــەس باســی نەتیجــە بکــەین؟
بــۆ پــاکیی عیتــرەت موریــد، نــەک مەریــد،
هـــل یُریـــد غیـــر «اَنمـــا یریـــد...»؟
موعامەلـــە کـــەوت ئـــەو موباهەلـــە؛
موجامەلـــە کـــە نـــەک موجادەلـــە

دانـــا دەلیلـــی زیـــادتر[۱۰] نەویســـت
وەجهـــی تەسمییـــەی فاتیمـــەی بهیســـت
دەڵـێن: سـوئاڵ کـە تـا لێـت نـەبن گـوم
دەڵـــێم: مەعلوومـــە «لا أســـألکم...»[۱۱]
فائیـــدە نـــادات شایســـتەی ئـــەعماڵ
(إلاّ بالـــــذی یعـــــرف حـــــقّ الآل)
تـا سـەلات لەسـەر ئـاڵ و بـەیت نـەدەی
ئیـددیعای قبـووڵ دوعـای خـۆت نەکـەی
ئاگـات لـە خـۆت وێ، قـەدریان بـزان
(بغضـــهم نفـــاق، حـــبّهم إیمـــان)
ئیمـــان وە بـــێ‌حـــوب ئـــالی پێغەمبـــەر
ناکـا بـە دڵـی هـیچ کەسـدا گـوزەر
مەشـــرەبت ئەگـــەر بائینســـافییە
«إنّـــی تـــارکٌ فـــیکم...» کافییـــە
بچـــۆ صـــەواعیـــق بێـــران بیخوێنـــە
لـــە شـــەئنیاندا هـــیچ دامەمێنـــە
غـــەیری زاتی حـــەق (جَـــلَّ، تقـــدّس)
ســـیوای پێغەمبـــەر بزورگتـــەرێ هـــەس؟
خـــۆ ســـەرکاری حـــەق (بـــاری البریّـــة)
لـــە رەبـــت و نیســـبەت فرزەنـــد بەرییـــە
پـــەس لـــە لای فـــامین هەرکەســـێ کەســـە
وتـــت: ئـــەولادی پێغەمبـــەر بەســـە
ئـــەوانت لەبـــەر چاکـــە گەرەکـــە
مەعرەکـــەی نـــاوێ ئـــەو موشـــتەرەکە

ناشـــێ ویجـــدانت ئەمـــە نـــەزانێ
نیســـبەتی خاســـەی پێغەمبـــەر کوانـــێ؟
هەس ئەم مەسئەلە کەس لـە بـەری وێ[١٢]
فـەرعی بـێعەمـەل لـە بـەش بـەری وێ

مورید: لێرەدا مەبەست دۆستە. مەرید: بەدی شەڕانی. بهیست: بیست. بێران: بهێنـە. پـەس: کەواتە. فامین: تێگەیشتن. هەس: هەیە. لەبەری وێ: لەبەری بێت. فـەرع: ئـەولاد. بـەریی وێ: بێبەش بێت.

واتە: کاتێ بە بەرزی و گەورەیی دوو موقەددیمەکەت زانی، کە لە رشتەی دایکـەوە حـەزرەتی (محمد) ە(د. خ) و لە رشتەی باوکەوە شێری خودا عەلییە، یا کە بریتین لـە فاتیمـە و عـەلی، یـا بریتین لە جووتە پێشەوا حەسەن و حسـێن[١٣] ئیتـر پێویسـت نییـە باسـی شـەرەفی ئـەولادیان بکەین؛ گومان لەوەدا نییە کە دوو موقەددیمە چاک بوون نەتیجـە و بەرهـەمیش چـاک دەبێـت، دیارە یەکێ مورید بێ؛ خواستی لەسەر حەق و راستی بێ، نەک مورید و یاخی و سەرپێچ بـێ، بـۆ سەلماندن و باوەڕکردن بە پاکی و پایەبەرزیی نەوەی حەزرەت(د. خ) بێجگە ئایەتی پیرۆزی (انما یریدُ اللهُ لِیُذهِبَ عنکُمُ الرجسَ اهلَ البیتِ و یطهّرکم تطهیراً) [١٤] هیچی تری پێویست نییە.

هەندێ لەو زانایەنەی واتای قورئانیـان لێداوەتـەوە لەسـەر ئـەوەن کـە ئـەم ئایەتـە دەربـارەی حەزرەتی عەلی و فاتمە و حەسەن و حسێن هاتووە[١٥] چونکـە زەمـیری (کـم) لـە (عـنکم) و لـە (یطهرکم)دا بۆ جەمعی نێرینەی قسەلەگەڵکراو دایە، بەلام دەبێ بلێین تەغلیبە؛ هـەتا حـەزرەتی فاتمەیش بگرێتەوە. هەندێکیش وتوویانە دەربارەی حەرەمەکانی حەزرەت هـاتووە، بـە دەلالـەتی ئایەتی (... واذکرن ما یتلی فی بیوتکنّ...) [١٦] هەندێکی تریش دەڵێن بۆ هەردوولایانە بە گشتی.

هەروەها مەولەوی دەربارەی گەورەیی پایەی ئال و بەیتی پێغەمبەر دەفەرموێ: لـە سـەردەمی پێغەمبەردا(د. خ) کار لەگەڵ کافراندا گەیشتە موباهەلە و بوو بە شەڕە لەعنەت و، خـودای گـەورە پشتی پێغەمبەری گرت، ئەوەتە ئایەتەکە دەفەرموێ (فَقُل تَعَالَوا نَدعُ ابناءَنـا و ابنـاءکم و نسـاءنا و نساءکم و انفسنا و انفسَکم، ثم نَبتَهِل فَنَجعَل لَعنةَالله علیالکاذبین) [١٧] بەلێ ئەم ئایەتە دەربارەی ئال و بەیتی پێغەمبەر هاتووە[١٨]، کەواتە پێویست ناکات لەم رووەوە ململانێ بکەیت و قسە بـەگژ

قسەدا بدەیت، کاتی ئەوەیە بە گفت و لوتف و قسەی خۆش و بە ئەدەب و باوەڕەوە بێیتە مەیدان.

زەمەخشەریی[۱۹] خاوەنی تەفسیری (الکشاف عن حقائق التنزیل) دەفەرمویت دەلیل نییە لەم ئایەتە بەهێزتر بێ بۆ پێسەلماندنی گەورەیی ئەوانەی حەزرەت(د. خ) بە عەباکەیەوە پێچان، واتە عەلی و فاتمە و حەسەن و حسێن؛ چونکە کاتێ ئەم ئایەتە هات بۆ حەزرەت(د. خ) بانگی کردن و حسێنی بە باوەشەوە گرت و دەستی حەسەنی گرت، فاتمەیش لە پشتی حەزرەتەوە بوو عەلیش لە دوای ئەوانەوە دەهات بەڕێدا، وادەرکەوت کە مەبەست لە ئایەتەکە ئەمانن و، کوڕانی فاتمەی زەهرا بە ئەولادی مادی و نەسەبیی پێغەمبەر دەدرێنە قەڵەم.

بێ‌گومان ئینسانی ژیر و وریا کە زانی حەزرەتی (فاطمە) بۆچ ناونراوە (فاطمە) ئیتر دەلیل و بەڵگەی تری ناوێت بۆ سەلماندنی گەورەیی پایەی ئەم ئافرەتە مەزنە؛ دەڵێن: هۆی ناونانی بە (فاطمە) ئەوەتە کە خودای گەورە دووری خستووەتەوە لە ئاگر و ڕێگای ئاگری دۆزەخی لێ بڕیوە، کەلیمەی (فاطمە) یش لە (فطم) وەرگیراوە کە بەواتا (قطع) بڕینە؛ اخرج الدیلمی مرفوعاً: «إنّما سمیت ابنتی فاطمة لأن الله فطمها و محبیها عن النار».

دەڵێن دەربارەی ئەوانەی خۆش ویستنیان بۆ موسوڵمانان پێویستە پرسیار بکە تا لێت ون نەبن! دەڵێم پرسیاری ناوێ لێم روونە، مەعنای (قل لاأسألکم علیه اجراً إلا المودّةَ فی القربی)[۲۰] م لا ئاشکرایە، ئەوەتا زانایانی حەدیس ئەمەیان روون کردووەتەوە: (اخرج احمد والطبرانی و ابن ابی حاتم والحاکم عن ابن عباس ان هذه الآیة لما نزلت قالوا یا رسول الله من قرابتک هؤلاء الذین و جبت علینا مودّتهم؟ قال: علیٌّ و فاطمة و أبناهما).

هەر لەبەر ئەمەیە کردەوەی باش وەختێ سوودی بۆ خاوەنەکەی دەبێت کە قەدر ڕاگرتن و ڕێزلێ‌گرتنی ئالی پێغەمبەری لەگەڵدا بێت.

تا سەلەوات لەسەر ئال و بەیت نەدەیت دوعات گێرا نابێت.

ئاگات لە خۆت بێت قەدری ئالی پێغەمبەر بزانە، چونکە رق‌لێبوونیان و حەزلێ‌نەکردنیان نیشانەی منافقییە و خۆش‌ویستنیان دروشمی ئیمانە، ئیمان لە دڵی موسوڵماندا بە بێ‌خۆش-ویستنی ئالی پێغەمبەر دانامەزرێت.

ئەگەر بە زەوقی و خاون ئینسافی ئەم حەدیسەت بەسە «إنّی تارک فیکم ما إن تمسّکتم به لن تضلّوا بعدی، احدهما أعظمُ من الآخر کتاب الله حبل ممدود من السماء الی الأرض و عترتی اهلُ

بیتی، و لن یَتفرّقا حتی یَرِدَا عَلَیَّ الحوضَ فانظروا کیفَ تخلفونی فیهما» [٢١] سەنەدی ئەم حەدیسە بێهێز نییە.

ئەگەر دەیشتەوێ زیاتر بزانی بچۆ کتێبی (صواعق)ی ئیبنوحەجەر بێنە و بیخوێنەرەوە تا پایە و پلەی ئالی پێغەمبەرت بۆ دەرکەوێت.

مەولەوی، خودای لێ رازی بێت، لە رێگایەکی ترەوە دەچێتە ناو مەسەلەکەوە و دەفەرموێت: لە پاش خودای گەورە لە کائیناتدا لە حەزرەتی موحەممەد گەورەتر نییە، دیارە خودا لە نەسەب و ئەولاد بەرییە (لم یلد و لم یولد...) بەلام حەزرەتی پێغەمبەر ئەولاد و نەوەی هەیە، کەوابوو موسولمانی خاوەنفام کە بیستی یەکێ لە نەوەی پێغەمبەرە(د. خ) رێزی دەگرێت و بە چاوی حورمەتەوە سەیری دەکات.

خۆ ئەگەر بلێیت من نەوەی پێغەمبەرم لەبەر کردەوەی باش دەوێ، کە کردەوەی باشیان نەبوو منیش ئەوانم ناوێ، دەلێم ئەم قسەی تۆیە، واتە: ئەم کردەوە باشییە قەدەری موشتەرەکە لە بەینی ئەوان و غەیری ئەواندا و هەرکەس کردەوەی باش بێت ئەبێ خۆشت بوێ، بەلام ناشێ ویجدانت ئەمە نەزانێ کە پێوەندی ئال و نەوەی حەزرەت بە حەزرەتەوە دەبێتە هۆی ئەوە کە بە دڵ رێزیان لێ بگریت.

هەر بۆ جێگیرکردنی ئەم خۆشویستنە مەولەوی باسێکی زانیاریی (فرائض) واتە زانیاریی دابەشکردنی میراتی مردوو بەسەر میراتبەراندا دێنێتە پێشەوە و بە شێوەی پرسیاری تێکەڵ لەگەڵ باوەڕنەکردندا دەلێت:

داخۆ کەسێک هەیە مەسئەلەیەکی فەرائیز بابەتی وەهای لەبەر بێت کە بلێت ئەولادێ کردەوەی چاکیان نەبێ لە میراتی باوکیان بێبەش دەکرێن؟ دیارە، نەء؛ چونکە دابەشکردنی میرات لەسەر بناخەی چاکی و خراپیی ئەولاد نییە[٢٢].

(رَبِّ لا أحصی ثناء علیک
البدء والعود منکَ و الیک)
لە سەرمان شوکری تۆ بێحیسابە
بۆ ئەم نەبییە و ئال و ئەسحابە
فەرمانیان وەدەس سەفیری دین دا
وە تابیعین دا و موجتەهیدین دا

چ موجتەهیـــدین؟ ئەســـحابی ئـــەقوال
چ موجتەهیـــدین؟ ئـــەربابی ئـــەحوال
وەکـــو مەشـــایخ هـــەموو تـــەرائیق
(جـــــزاهم الله بـــــأجرٍ لائـــــق)
باوەڕمـــان هەیـــە تەســـدیعیان کێشـــا
لـــە ڕێـــی دینـــەدا گشـــت ســـەریان ئێشـــا
کول ئەهلی کەمال بـە تـەکمیل خـەریک
کول ساحیب سلووک مەشغوولی تەسلیک
دریغیـــان نـــەکرد لـــە شـــەرع و لـــە وەرع
چ زاهـــیری شـــەرع، چ بـــاتینی شـــەرع
بـەوان ئیحیـا بـوو ئەسـڵ و فـەرعی دیـن
(أحیـــــــــاهم الله ربّ العـــــــــالمین)

وە دەس سەفیری دین دا: دایە دەستی سەفیری دین. وە تابیعین دا: دایە دەستی تـابیعین. موجتەهیدین دا: دایە دەستی موجتەهیدین.

واتە: خودایا وەک تۆ خۆت مەدحی خۆت دەکەی، من هەرگیز ناتوانم مەدحت بکەم، سەرەتای بوونمان بە دەستی تۆیە، گەڕانەوەیشمان هەر بـۆ لای تۆیـە، بەرامبـەر بـەم نیعمەتـە گـەورە کـە پێغەمبەرە(د. خ) و، بەرامبەر بەم ئال و هاوڕێیانەی پێغەمبەر کە بنج و بناوان و ئـەحکامی ئـایینی ئیسلامیان دایە دەس ئەوانەی دەتوانن بە خەڵقی ڕاگەیێنن، واتە بـە تـابیعین و زانـا گـەورەکانی ئایین، ئەو زانا موجتەهیدانە، ئەو پیاوە گەورانە کە هەموو خاوەن قسە و ڕان لە ئاییندا، ئەوانـە کـە دەروونیان بە ناوهێنانی خودا و بیرلێکردنەوەی ڕووناک بووەتەوە و خـاوەن ئـەحواڵ بـوون، وەک ئەو پیرە لەخوداترسانە کە خاوەنی تەریقەت بوون و ئاگاداری ئەحکامی ئیلاهی بوون، چ هی بیر و باوەڕ، چ هی ڕەفتار و کردار و ئەحکامی فەرعی، ئەو بیر و باوەڕ و کردار و ڕەفتارە بووەتە خوویـان و ئەوەی پێویستە کردوویانە و ئەوی حەرامە خۆیـان لـێ پاراسـتووە و خـوو و ڕەوشـتی بـەرزە و لەسەر ئەم خەڵکفێرکردنە پاداشیان بداتەوە.

بەڵێ ئێمە باوەڕمان لەسەر ئەوەیە ئەم زاتـە گـەورە لەخوداترسـانە زەحمـەتیان کێشـاوە و لـە ڕێگای بڵاوکردنەوەو برەودانا بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام تووشی ماندوویەتی و ئـازار بـوون، هـەموو

خاوەن کەماڵ بوون و پەیڕەوەکانیشیان پێگەیاندوون، خۆیان ڕێگای خوداپەرستی و لە خوداترسییان گرتووەتە بەر و پەیڕەوەکانیشیان فێری ئەم سلووکە کردووە و، بە ڕێگای پاککردنەوەی نەفس لە خوو و خدەی بەد و ڕازاندنەوەی بە خوو و ڕەوشتی خاوێن و پەسەند پەیڕەوەکانیان تەمێ و تەربیە کردوون، نە لە ئیش پێکردنی حوکمە دیارییەکانی شەرعدا کۆتاییان کردووە و، نە لە (ورع) و لەخوداترسی و خۆپاراستن لە گوناهدا کەمتەرخەمییان کردووە.

بەڵێ بەم ئینسانە مەزنانە، بەم پێشەوا لەخوداترسانە، بەم زانا و دانا دڵ و دەروون پاکانە بناخە و لقوپۆپی ئایینی پیرۆزی ئیسلام زیندوو بوویەوە، خودای گەورە زیندوویەتی و سەربەرزییان پێ ببەخشێت.

***

١ـ سەرباسەکە هەر لە چاپەکەدا هەیە و، لە دەستنووسەکەدا نییە، سەیر ئەوەیە مامۆستا نعیمی بەیتی (هەرچی...) نەخستووەتە بەر ئەم باسە و لە پێشدا نووسیویە. باوکم باشی کردووە کە سەرباسەکەی پێش (هەرچی...) بۆ داناوە.

٢ـ منصور علی ناصف، التاج الجامع للأصول، فی أحادیث الرسول، بیروت دار احیاء التراث العربی ١٣٨٢ هـ ١٩٦٢ م، الجزء الثالث، ص ٣٥٦.

٣ـ سەرچاوەی پێشوو، ل (٤٠).

٤ـ ئەگەر بیکەینە پەخشان وای لێ دێت من بەدەل وەختی خۆی، دەخیل نەیکەی، واتە: من لە ڕۆژی خۆیدا لەباتی ئیسماعیل سەرئەبڕیم، دەخیل نەکەی سەری نەبڕی.

٥ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا ئەڵێت ئەم شیعرە عیللەتی شیعری دواییە.

٦ـ ئەمە تەرتیبی دەستنووسەکەیە، واتە «پەز...تاد» یەکەم و «ئەڵبەت...تاد» دووەم. چاپەکە ئەم دوانەی پاش و پێش کردووە، دیارە هەڵەیە؛ بەیتی دووەم وەڵامی بەیتی یەکەمە.

٧ـ «گُذَشتِ...تاد» کە دەکاتە (گوزەشتی) شێوەنووسی نوسخە دەستنووسەکەیە، واتە: لەم باسی حەسەن و حسێنە دوو گوزەشت و لێبووردن هاتە کایەوە یەکێ زاهیر و یەکێ باتین، یەکەم هی حەسەن بوو و دووەم هی حسێن.

٨ـ ئایەتی (١٠٢) سوورەتی (صافات).

٩ـ پوختەی ئەم لێکدانەوەی باوکم، وەک لە تێکڕای شیعرەکانەوە دەردەکەوێ، ئەوەیە کە (ذبح) بووە (بدل)ی ئیسماعیل و (بدل) بە پێی عیلمی نەحو ئەبێ لەگەڵ (مبدل منه)دا هاوجۆر بێ.

جا ئەگەرچی لێرەدا ئەو (بدل) و (مبدل منهُ) وە نەحوییە لە ئارادا نییە، بەلام هەر لەبەر ئەوە کە حسێن کرا بە بەدەلی ئیسماعیل گورج خرایە بەر ئیستیلاحە نەحوییەکە، دیارە لەوێدا (بدل) دەبێ وەک (مبدل منه) بێ، کەچی ئیسماعیل مەعریفەیە و عەلەمە، زیبحیش نەکیرەیە؛ لە بەر ئەوە (عظیم)ی هێنـا و کردییـە سـیفەتی (ذبـح) هـەتا (ذبح) لەو نەکیرەییە رزگار بێت و تەخسیس پەیدا کات و لە ئیمساعیلی مەعریفەوە نزیک بێتەوە هەتا بشێ ببێتـە بەدەل.

ئەمە وردەکارییەکی جوانە، بەلام دەیشتوانین هەر بە راستە رێگاکەدا بـڕۆین و بلـێین فیـدا و بـەدەل و بـاتیی ئیسماعیلی ناسراو و دیاری نابێ قۆچێکی نەناسراو بێ؛ بۆیە خوای گەورە سیفەتی (عظـیم)ی بـەدوادا هێنـا، دیـارە قوربانی و باتیی پیاوی گەورە دەبێ پیاوی گەورە بێ.

١٠ـ چاپەکە (زیاتر)ی نووسیوە.

١١ـ لە پەراوێزی دەستنووسـەکەدا لەسەر ئەم (لا أسألکم)ە نووسراوە (فیه لطافة) واتە: من لە وەلامتاندا دەلـێم پرسیارتان لێ ناکەم شتەکە ئاسانە، یا ئیشارەیە بۆ ئایەتی (قل لا اسألکم علیه اجراً... الآیة).

١٢ـ هەس...تاد: کەس هەس ئەم مەسئەلەی لەبەر بێ؟

١٣ـ باشترین بار باری دووەمە؛ واتە فاتیمە و عەلی دوو موقەددیمەکەن و ئەولادەکانیان نەتیجەن. ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە (مقدمة) و (نتیجه) ئیستیلاحی ئەهلی مەنتیقن.

١٤ـ ئایەتی (٣٣) سوورەتی (احزاب).

١٥ـ عن عائشة (ر) قالت: خرج النبی(ص) غداة، و علیه مرطٌ مرحّل [ای کساء یمنی منقوش] مـن شـعر اسـود، فجاء الحسن بن علیٍ فأدخله، ثم جاء الحسین فأدخله، ثم جاءت فاطمة فأدخلها، ثم جاء علی فأدخله، ثم قال: (انما یرید الله لیذهب عنکم الرجس اهل البیت و یطهرکم تطهیرا) رواهُ مسلم.

منصور علی ناصف، التاج الجامع للاصول فی أحادیث الرسول، دار احیاء التراث العربی، بیروت، الجزء الثالث، ص ٣٤٧.

١٦ـ ئایەتی (٣٤) سوورەتی (احزاب).

١٧ـ ئایەتی (٦١) سوورەتی (آل عمران).

١٨ـ و لما نزلت هذه الآیة «فقل تعالوا...» دعا رسول الله(ص) علیاً و فاطمة و حسناً و حسیناً و قال: اللهم هـؤلاء أهلی، رواه مسلم والترمذی. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٣٣.

١٩ـ ناوی مەحموودە و نازناوی (جارالله) و ناوبـانگی بـە (زەمەخشـەری) دەرکـردووە، زانایـەکی نـاودارە و لـە موعتەزیلەکانە لە (٤٦٧)ی کۆچی لە دایک بووە و سالی (٥٣٨) کۆچی دوایی کردووە.

٢٠ـ ئایەتی (٢٣) سوورەتی (شوری).

٢١ـ منصور علی ناصف، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤٩.

٢٢ـ لە راستیدا خوێنەری زیرەک لەم بەیتە دواییەی مەولەویدا هەست بـە موبالەغـە دەکـات و، قیاسـەکەی قیاسێکی تەواو نییە.

مەولەوی لەم بەیتەدا دەفەرموێ ئەولادی بێکرداری چاک لە میراتی باوک بێبەش ناکرێن، با بەدیش بن بەشی خۆیان هەر وەردەگرن، کەواتە ئەولادی پێغەمبەر(د. خ) با خوانەخواستە بەدکرداریش بن لە خۆشویستنەکە کە لە پێغەمبەرەوە بۆیان هاتووەتەوە نابێت بێبەش بکرێن.

ئەم فەرموودەیە زیاتر لە پەند و ئامۆژگارییەوە نزیکترە و زیادەڕەویی تیایە؛ خۆشویستن قیاس لەسەر میرات ناکرێ، چونکە دوو شتی لە یەک جیان، دەقی ئایەت و حەدیسی زۆریش هەیە کە بناخەی هەموو قەدر و حورمەتێ بە لەخواترسی و کردەوەی باش دادەنێت.

باشە بۆ زیاتر پتەوکردنی ئەم رایە بگەڕێینەوە سەر سێ بەیتی مەولەوی خۆی کە لە باسی یەزیددا وتی:

زاتی یەزید و ئەوسافی حوسەین
پیاگێکیان لێ تەرکیب بکەین .
یەکێکیچ لە زات حوسەینی شەهید
لە رەزائیلی یەزیدی پەلید
ئەو ببوغزێنن ئەم بحوبێنن
بێن ئەو کەرە لەو هەرگە دەرێنن!

پوختەی کەلام: ئەولادی چاک کرداری پێغەمبەرمان وەک هەموو موسولمانێکی خاوێن خۆش دەوێ و قەدریشیان دەزانین. خۆ ئەگەر خوا نەکەردە بەدکردار بوون خۆشمان ناوێن، بەلام تەنها لەبەر کردارە بەدەکە و بەس، ئیتر نابێ ئەو خۆش نەویستنەمان بکێشێتەوە بۆ خۆشنەویستنی حەزرەتی پێغەمبەر(د. خ) کە ئەنجامەکەی کوفرە.

## مبحث الأئمة في الاصول والفروع والطريقة و أقطابها [1]

له ئەسڵی دیندا دوو کەسن مەشهوور:
شێخی ئەشعەری و شێخ ئەبوومەنسوور
لە فەرعی دیندا هەر چەهار ئیمام
مەشهوورن لەبەین تەمام خاس و عام
ئیمامی ئەعزەم ئەووەڵ سەر مەزهەب
دووەم شافیعی قورەشی نەسەب
بە ئیمای حەدیس سەییدی سەروەر
عالەم بە عیلمی ئەو بوو مونەووەر
سێیەمین مالیک فەزڵی ئەکمەلە
چوارەم ئەحمەد نەجلی حەنبەلە
چونکە مەزهەبیان مودەووەن بووگە
تەقلید هەر بۆ ڕێی لای ئەوان چووگە
ئەرنە لە سایەی (سید البشر)
موجتەهید زۆرن هەموو پڕهونەر
ئەرچی ئیختیلاف ئوممەت ڕەحمەتە
تەقلیدی غەیری ئەوان زەحمەتە

چەهار: چوار. بووگە: بووە. چووگە: چووە. ئەرنە: ئەگەرنە، وەئیللا.

واتە: دوو پێشەوای زانا و گەورە و خاوەن ئیجتیهاد لە ئوسوولی دیندا ناوبانگیـان دەرکـردووە و بە سەرۆکی ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت حیساب کراون، ئەم دووانە یـەکێکیان ئەشـعەری و ئەویتریان ئەبوومەنسووری ماتوریدییە.

ئەشعەری ناوی عەلیی کوڕی ئیسماعیلە و کونیـەی (ابـو الحسـن)ە و لـە نـەوەی ابـو موسـای ئەشعەرییە کە لە یارانی حەزرەت بووە، ساڵی (٢٧٠)ی کۆچی لە شاری بەسرە لە دایک بووە، هەر لەوێ خوێندی و پێگەیشـت و، دژی بـیر و بـاوەڕی موعتەزیلـەکان و خـاوەن بیدعەتـەکانی تـر ڕاوەستا و بەرپەرچی بیر و باوەڕیانی دایەوە، لە پاشان هات بۆ شاری بەغدا. نزیکەی (٥٥) کتـێبی داناوە، هەمووی باسی بیر و باوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئـەکات و دژی ئـەهلی بیدعـەت دەوەستێ.

ساڵی (٣٢٤)ی کۆچی لە بەغدا کۆچی دوایی کرد، خوای لێ ڕازی بێت.

شێخی ماتوریدی ناوی موحەممەد کوڕی موحەممەد کوڕی مەحموودە و نازناوی (علم الهدى) و کونیەی (أبو منصور) ە، لە گەڕەکی ماتورید لە سـەمەرقەند لـە دایـک بـووە و، سالـی (٣٣٣)ی کۆچی هەر لە شاری سەمەرقەند کۆچی دوایی کردووە، ئەم زاتە زانا و گەورەیەش لە سـەمەرقەند و دەوروپشتی‌دا هەوڵێکی بێدریغی دا بـۆ بـرەودان بـە ڕێبـازی ئـەهلی سـوننەت و جەماعـەت و موسوڵمانان گەلێ سوودیان لێ وەرگرت، خودا پاداشی چاکی بداتەوە.

ئەمە دەربارەی بناخە و ئوسوولی ئایین. پێشەوا خاوەن ئیجتیهادەکانی ئەحکامی ئایین و لـق و پۆپەکانیشی چوار زانای بەناوبانگی پایەبەرز و دیارین.

یەکەم: پێشەوای هەرە گەورە (ابو حنيفە)یە کە نـاوی (نعمـان) کـوڕی (ثابـت)ە و، لـە شـاری کووفە ساڵی (٨٠)ی کۆچی لە دایک بووە و لە (١٥٠)ی کۆچی‌دا کۆچی دوایی کردووە و لە شاری بەغدا و لەو شوێنەی کە ئێستە پێی دەڵێن (اعظميە) نێژراوە، ئەم زاتـە گەورەیـە لـە (تـابعین)ە و شەش هاوڕێی پێغەمبەری دیوە. خوا پایەی بڵندتر کات.

دووهەم: مالیکی کوڕی ئەنەسە کە ساڵی (٩٥)ی کۆچی لە شاری مەدینەی پێغەمبەر لە دایـک بووە و ساڵی (١٧٩)ی کۆچی هەر لە مەدینە کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی پـیرۆزی (جنـة البقيع)دا نێژراوە، خودای گەورە لێی ڕازی بێت.

سێهەم: ئیمامی شافیعییە، کە ناوی موحەممـەدی کـوڕی ئیدریسـە و ڕشـتەی باوبـاپیری لـە (عبدالمناف)دا دەگاتە حەزرەت(د. خ). ئەم زاتە پایەبەرزە لە شاری غەززە یا لە عەسقەلان ساڵـی

(١٥٠)ی کـۆچی لـە دایـک بـووە، پـاش دوو سـاڵ بـراوە بـۆ شـاری مەککـەی موکەڕڕەمـە، کـە گەیشتووەتە تەمەنی خوێندن لە خزمەتی گەلێ لە زاناکاندا خوێندوویەتی، بە تایبەتی لە خزمەتی ئیمام مالیکی کـوڕی ئەنـەس لـە شـاری مەدینـەی مونـەووەرەدا و زۆر زوو پـێ‌گەیشـتووە، پـاش ماوەیەک هاتووەتە عیراق بۆ بەغدا و، ماوەیەک لە باکووری عیراق گەڕاوە، دیسان گەڕاوەتـەوە بـۆ بەغدا، کراوە بە (قاضی) لە یەمەن، پاش ماوەیەک بەغدا بـەجێ دێڵـێت و دەچێتـە میسـر، لـەوێ دووبارە سەیرێکی ئەو ئەحکامە ئاینییانەی کردووەتەوە کە وەختی خۆی لە بەغدا نووسیونی، ئـەو حوکمانەی لە بەغدا نووسیونی بە (قەولی قەدیم)ی شافیعی ناویان دەرکردووە و ئەوانەی لە میسر نووسیونی بە (قەولی جەدید). ساڵی (٢٠٤)ی کۆچی هەر لە میسر کۆچی دوایی کردووە و گـۆڕی موبارەکی لە (قەرافە) یە. خودای گەورە لێی رازی بێت.

چوارەم: ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی شەیبانییە، ساڵی (١٦٤)ی کۆچی لە بەغدا لە دایەک بووەو، ساڵی (٢٤١)ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە و لـە بەغـدا بـە خـاک سـپێردراوە...خـودای گەورە پاداشی چاکی بداتەوە.

ئەم چوار ئیمامە رێباز و پەیڕەویان نووسراوەتەوە و بـە وڵاتـەکانی ئیسـلامدا بـڵاو بووەتـەوە و، لەبەر ئەوە موسوڵمانان تەقلیدیان کردوون، واتە شوێنی ئەو رێباز و پەیڕەوە کەوتوون و کاریان پێ کردووە.

بێجگە لەم چوار ئیمامە زانای ئاینیی خاوەن ئیجتیهاد زۆر بوون بـەڵام لەبـەر ئـەوەی رێبـاز و پەیڕەویان نەنووسراوە و کۆ نەکراوەتـەوە و بناخـە و بنکـەیان لـە وەرگـرتن و داڕشـتنی حوکمـە ئاینییەکاندا نەزانراوە تەقلیدیان دروست نییە.

بەڵێ ئیمام داوودی زاهیری، رەزای خـودای لـێ بـێ، کـە قوتـابیی ئیمـام ئەحمـەدی کـوڕی حەنبەل بووە، ئەویش وەک چوارەکە رێبازەکـەی نووسـرایەوە و دواکەوتوویشـی زۆر بـوون، بـەڵام رێبازەکەی بڵاونەبوویەوە، ئێستە دواکەوتووی ئەم رێبازە زۆر کەم و نایابن. ئیتر تێکڕا کـە رێبـازی خاوەن ئیجتیهاد نووسرا و گەیشتە دەستی خەڵک تەقلیدی دروستە.

شایانی وتنە لە سـەر ئـەم بەیتـەی مەولـەوی کـە دەفـەرموێ «ئـەرچی ئیختـیلاف ئوممـەت رەحمەتە...تاد» پێویستە نەختێک درێژە بە باسەکە بدەین.

عیبارەتی (اختلاف امتی رحمة) وا مەشهوورە کـە فـەرموودەی پێغەمبـەرە، سـیووتی(ر.خ) لـە (الجامع الصغیر)دا بە ژمارەی (٢٨٨) حەدیسەکە بەم شێوە دەگێڕێتەوە:

«اختلاف امتی رحمة: نصر المقدسی فی الحجة والبیهقی فی الرسالة الاشعریة بغیر سند، واورده الحلیمی والقاضی حسین و امام الحرمین و غیرهم، و لعله خرّج فی بعض کتب الحفاظ التی لم تصل الینا... انتهی».

هەروەها لە کتێبی (فیض القدیر)ی شەرحی (الجامع الصغیر)ی مەناویدا دەڵێت: «وأسنده فی المدخل، و کذا الدیلمی فی مسند الفردوس، کلاهما من حدیث ابن عباس مرفوعاً بلفظ «اختلاف اصحابی رحمة» و اختلاف الصحابة فی حکم اختلاف الأمة، لکن هذا الحدیث، قال الحافظ العراقی، سنده ضعیف. و قال والده المحقق ابو زرعة: رواه ایضا آدم بن أیاس فی کتاب العلم والحلم بلفظ اختلاف اصحابی لأمتی رحمة و هو مرسل ضعیف. و فی طبقات بن سعد عن القاسم بن محمد نحوه... انتهی».

دیارە ئەگەر «اختلاف امتی رحمة» فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەر بێ(د. خ) مەبەست جیاوازیی خاوەن ئیجتیهادەکانی ئوممەت نییە لە (اصول)ی ئاییندا؛ چونکە جیاوازی و ناجۆری لە (اصول)ی ئاییندا شتێکی ناپەسەند و ناڕەوایە؛ خودای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت (واعتصموا بحبل الله جمیعاً و لا تفرقوا) [٢] هەروەها دەفەرموێت (و لا تکونوا کالذین تفرّقوا واختلفوا من بعد ما جاءهم البیّنات) [٣].

دیارە مەبەستیش جیاوازیی زانیاری و پیشە و جۆرەکانی کار و کاسبی نییە؛ چونکە جیاوازی لەم شتانەدا تەنها بۆ ئوممەتی پێغەمبەر نییە، بەڵکو ئوممەتی هەر پێغەمبەرێک لە پێغەمبەران(د. خ) ئەم جۆرە جیاوازییەیان هەبووە و، هۆیەک نابێت بۆ ئەوەی تەنها ئوممەتی حەزرەتی موحەممەد ناونووس بکرێت، تەنانەت ناموسڵمانەکانیش ئەم جیاوازییەیان هەیە.

کەوابێ مەبەست لەم جیاوازییە جیاوازیی زانا خاوەن ئیجتیهادەکانە لەو حوکمانەدا کە وەکوو لق و پۆپی ئایین و کردەوەن. لە راستیدا ئەم جۆرە جیاوازییانە لە ئیجتیهادکردندا کاتێک روودەدات کە لە حوکمێکی تایبەتیدا (نص) ێکی قورئان یا (نص) ێکی فەرموودەی پێغەمبەر لەسەر ئەو حوکمە نەبێت، یا خود (نص) ەکە لای هەندێ لەو زانا خاوەن ئیجتیهادانە سەلمێنرابێت و لای هەندێکیان نەسەلمێنرابێت، یا خۆ (نص) ەکە لای هەموویان سەلمێنرابێت بەڵام زاناکان هەر یەکێکیان لەبەر هەندێ بەڵگە بە پێی بۆچوونی خۆی مەعنای لێدابێتەوە، وەک ئەوە (نص) ەکە (عامّ) بێ، بەڵام یەکێک لە موجتەهیدەکان هەر بە (عامّ) مەعنای لێبداتەوە و، یەکێکیان بۆ حاڵێکی تایبەتی، یا وادەبێ (نص) ەکە (خاص)ە کەچی یەکێک هەر بەو

(خاص)ی و تایبەتییە دەیهێڵێتەوە و هەندێکیان دەیکەنە (عامّ)، یـا خـۆ کەلیمەکـە هاوبەشـە لـە نێوان دوو واتادا و هەریەک بۆ واتایەکی رادەکێشێت، یا خۆ کەلیمەکە بۆ واتایەک حەقیقەتـە و بـۆ واتایەکی تر مـەجازە، یـەکێ لـە موجتەهیـدەکان حەقیقەتەکـە پەسـەند دەکـات و ئـەوی‌تریـان مەجازەکە، یا خۆ کەلیمەکە لە زمانا واتایەکی بنەڕەتیی هەیە و واتایەکی زاراوەیی و، هەر یەک بـۆ لایەکی دەگێڕێتەوە. دیارە هەردوو لایان بەڵگە و پاڵپشتیان بۆ راکـەی خۆیـان ئامـادەکردووە... بەڵێ ئەمانە و گەلێ شتی تریش هۆی جیاوازیی بۆچوونەکانن، وەکوو لە سەرەتای کتـێبی (بدایـة المجتهد و نهاية المقتصد)ی ئیبنوڕوشدی ئەندەلوسی‌دا باس کراوە.

ئیجتیهاد کردن و هەوڵ دان بۆ وەرگرتن و دۆزینەوەی حوکمی شەرع لـە لایـەن حەزرەتـەوە، کە موعازی کوڕی جەبەلی بە شێوەی کاربەدەست نـارد بـۆ یەمـەن، جـێگیر کـراوە[٤]. هـەروەها فەرموودەیەکی پێغەمبەریش هەیە دەلالەت لە ڕەوایـی و بـەجێ‌یـی ئیجتیهـاد دەکـات؛ ئـەوەتا دەفەرموێ: «اذا حَكَم الحاكِمُ فاجتهدَ فأصابَ فله اجرانِ، و إذا حَكَم فاجتهَدَ فأخطَـأ فلـه أجـرٌ»[٥] واتە: ئەگەر داوەر حوکمێکی دا و، بە پێی توانای خۆی هەوڵی‌دا بگاتە حەق و، بـەوە حوکمەکـەی دا، ئـەوە دوو پاداشـی دەبـێ یـەکێکیان بەرامبـەر هەوڵـەکەی و ئـەوی‌تریـان لەبـەر ئـەوە کـە گەیشتووەتە حەق. خۆ ئەگەر لە حوکمەکەدا هەڵەی کرد ئەوە تەنها پاداشی هەوڵەکەی دەبێ.

دیارە کە ئیجتیهـاد ڕەوا بێـت و هـۆی جیـاوازیی را و بۆچـوونیش هـەبێت، جیـاوازیی حـوکم ئەنجامێکی عادەتی و گونجاوە و، ماوە نامێنێ بۆ ڕەخنەگرتن لە واتای حەدیسـی «اخـتلاف امتـی رحمة».

خۆ ئەگەر ئەو قسە مەشهوورە حەدیس نەبێ دیسان جیاوازیی نێوان زانایان لە راو بـۆ چـوون و دەرهێنانی حوکم‌دا شتێکی حەتمییە؛ چونکە زانایان لە هێزی زانسـتدا و لـە لێکدانـەوەی واتـای ئایەت و حەدیس‌دا وەک یەک نـین و بگـرە گـەلێ جیـاوازن، ئیتـر ئـەو فەرموودەیـە حەدیسـی پێغەمبەر بێ یا هەر قسەیەکی کاکڵداری مەشـهوور بـێ جیـاوازیی بـاری بۆچـوون و تێگەیشـتن ولێکدانەوەی واتا هەیە و گومانی تێدا نییە.

ئێمە کە تەماشای کاری ئیمامەکان دەکەین تێ‌دەگەین: جیاوازییان بـە ئارەزووکـاری نـەبووە، لەبەر ئەوە پێویستە باوەڕمان وابێ کە ئەم زاتە زانا و لەخوداترسانە ئەبووحەنیفە، مالیک، شـافیعی، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، سوفیانی سەوری[٦]، سوفیانی کـوڕی عویەینـە[٧]، ئـەوزاعی[٨]، داوودی زاهیری[٩]، ئیسحاقی کوڕی راهەوەیهـ و، ئیمامەکانی تر هەموو بەرچاوڕوونی و زانیارییان بووە و بۆ

بڵاوکردنەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و بۆ جێگیرکردنی حوکمی شەرع هەوڵیان داوە و بیری خۆیان خستووەتە کار و ئیجتیهادیان کردووە، نابێت هەرگیز گوێ بۆ قسەی بێ‌جێی ئەوانە بگرین کە تانە و پلاریان گرتووەتە ئەم زانا گەورانە، پێویستە باوەڕمان وابێت هەریەک لەم موجتەهیدانە لەسەر ئەو ئیجتیهادەی کردوویانە پاداشی چاکیان هەیە، جا ئەگەر پێکابووی و لەسەر حەق بوو، ئەوە دوو پاداشی هەیە و، ئەگەر نەیپێکابوو یەک پاداش.

(طریقــــةُ القــــوم کــــلٌّ منهــــا حــــق)
کول عەینی شەرعن، بەڵ لوببی موتڵەق
وەک موجتەهیدین زاهیر، ئیجتیهاد
سابتە، تاقی، بۆ شێخی ئیرشاد
چی بۆ موجتەهید هەس بەر موقەللید
لەسەر مورید هەس نیسبەت بە مورشید[١٠]
(بــل قــالوا: الشــیخ فــی شــیعته
کــان کــالنبیّ فــی أمّتــه) [١١]

تاقی: تەحقیق. هەس: هەیە. بەر: وشەیەکی فارسییە، واتە: لەسەر.

مەولەوی؛ بە ڕەحمەت بێ؛ لەگەڵ باسی پێشەوا خاوەن ئیجتیهادەکاندا، کە هەڵگری ڕاسپێریی گەیاندنی ئەحکامی ئایینن، باسی ڕێبازی ئەولیاکانیش دەکات و دەفەرموێت: «طریقـة القـوم کـل منها حق...تاد...».

واتە: ڕێگا و ڕێبازی کۆمەڵی ئەولیا و دۆستانی خودا هەموویان ڕاستن و لەگەڵ شەریعەتدا موویێ بە بەینیاندا ناچێت، بەڵکوو ناوەڕۆکی پوخت و پاڵفتەی شەریعەتن.

وەک[چۆن] زانا خاوەن ئیجتیهادەکانی شەرع حەقی ئیجتیهادیان هەیە، شێخانی ئیرشادی تەریقەتیش لە کار و باری خۆیاندا حەقی ئیجتیهادیان هەیە[١٢].

موقەللید بەرامبەر بە موجتەهیدەکەی (بۆ نموونە وەک شافیعییەک بەرامبەر بە ئیمامی شافیعی) چی لە سەرە، موریدێکیش بەرامبەر بە شێخەکەی ئەوەی لەسەرە، بە کورتی وەک چۆن شوێن‌کەوتوویەکی ئیمامی شافیعی پەیڕەویی ڕێگاکەی دەکات و لە عیبادەت و مامەڵە و شتی تردا دوای دەکەوێ، موریدێکیش دەبێ بەوجۆرە پەیڕەویی ڕێبازی پیرەکەی بکات.

نەک تەنها ئەوەندە و بەس، بەڵکو وتوویانە شێخ لە ناو کۆمەڵی موریدەکانیدا رابەرییان دەکات و رێی راستیان پیشان دەدات وەک پێغەمبەران رابەریی ئوممەتەکانیان دەکەن، بۆیە پێویستە گوێڕایەڵ بن بۆ شێخەکانیان.

ئەمە پوختەی واتای بەیتەکان بوو، بەڵام پێویستە بزانن، وەکوو لەمەوپێش باسمان کرد، ئایینی ئیسلام ئەوەتە کە لە قورئانی پیرۆزدایە بەو جۆرەی کە حەزرەت(د. خ) زانیویەتی، هەروەها ئەوەیە لە فەرموودە و رەفتار و خوو و رەوشت و (تقریر)ی حەزرەت دەردەکەوێ، بێ گومان ئەوەی پیرۆزی و چاکەی هەردوو دنیای خەڵکی تێدا بێت لەمانە بەدەر نییە.

بەڵێ لەوانەی لە قورئان و حەدیسدان ئەوەی کە بیر و باوەڕە و، ئەوەی حوکمی شەرعییە وەک بەجێهێنانی (واجب) و نەکردنی (حرام) و بەجێهێنانی (مندوب) و دوورکەوتنەوە لە (مکروه)، ئەمانە دەستوورێکن کە هەموو موسوڵمانان لەسەری دەڕۆن، هەرکەس ئەمانەی هەبێ بە (عادل) و پیاوچاک دەناسرێت.

بەڵام هەندێ (واجباتی شرعی) هەیە وەک پاککردنەوەی دەروون لە خووی خراپ و ناپەسەند، ئەگەرچی ئەمەیش لەسەر هەمووی موسوڵمانان پێویستە و، لەبەر ئەوە هەرکەس بەقەدەر حاڵی خۆی داوای لێ دەکرێت خەریکی ببێت و، پێوەندی بە تێکۆشانی ئینسانەوە هەیە، بەڵام فەرز نەکراوە هەموو کەس لەسەر یەک رێ و یەک شێوە پێیەوە خەریک بێت. لەم بەشەدا گەلێ لە ئوممەتی پێغەمبەر(د. خ) لەبەر رووناکیی ئایەتی (ألا بذکرالله تطمئن القلوب) و ئایەتی (واعبد ربّک حتی یأتیک الیقین) و فەرموودەی پێغەمبەر(د. خ) کە دەفەرموێ »تفکّر ساعة خیر من عبادة سنة«، لە پاش بەجێهێنانی (واجبات) و نەکردنی (محرمات) و سەروبەر خەریکی (مندوبات) بوون و، بە پێی توانا دوورکەوتنەوە لە (مکروهات)، بەڵێ بێجگە لەمانە هەمیشە ناوی خودا بەسەر زاریانەوە بووە و بیریان لە شوێنەوار و نیشانەکانی گەورەیی خودا کردووەتەوە و، لەو کاروبارانەی مرۆڤ لە خودا بێئاگاهـ دەکەن دوورکەوتوونەتەوە و، بە هەموو جۆرێک لە خودا ترساون و بە پێی واتای ئایەتی پیرۆزی (واتقوا الله و یعلمکم الله...) ئەوان لە خودا ترساون خوایش دەروونی ئەوانی رووناک کردووەتەوە و، لە خووی پەست و کاری ناشایستە پاکی کردوونەتەوە و، سینەفراوانی و دڵخۆشی پێبەخشیون، جۆرە زیکر و فیکرێکی خستووەتە دڵیانەوە کە بووەتە هۆی بەرزبوونەوەیان و بڕینی پلەکانی دڵڕووناکی و هەرگیز لە یادی خودای خۆیان بێ ئاگا نەبوون.

ئەمانە لە ناو خەڵکا بە (أولیاء الله) ناسراون، ئەو ڕێگە و ڕێبازە کە خودا خستوویەتیە دڵیان و، بووەتە هۆی پاک‌کردنەوە و ڕووناک بوونی دڵ پێی دەڵێن (طریقة) تەریقەت.

جا لەسەر ئەم بناخەیە شێوەی بە پەنامەکی ناوی‌خوداهێنان و بیرکردنەوە لە نیشانەکانی میهرەبانیی خودا و ئاگالەخۆبوون، کە شێوەکاری حەزرەتی ابوبکری سیددیق بووە و لەم ڕێگایەوە سوودی لە هاوڕێیەتیی پێغەمبەر(د. خ) وەرگرتووە، ناونراوە تەریقەتی سیددیقی. ئەنجا سەلمانی فارسی لە (ابوبکر)ی وەرگرتووە، لەسەلمانیشەوە گەیشتە قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی (ابوبکر) و، لەمیشەوە گەیشتە ئیمام جەعفەری سادیق(ر.خ)، لە گیانی ئیمام جەعفەریشەوە گەیشتە بایەزیدی بەستامی. ئیتر لە زەمانی ئەمدا ناوی بە تەریقەتی تەیفووری دەرکرد، چونکە تەیفوور نازناوی بایەزید بووە.

لە بایەزیدیشەوە گەیشتووە بە شێخ ابوالحسنی خەرقانی و، لەویشەوە بە شێخ (ابو علی)ی فارمەدی، لەویشەوە بە شێخ (ابو یوسف)ی هەمەدانی، ئەنجا بە شێخ (عبدالخالق)ی غەجدەوانی. لێرەوە ناونراوە بە تەریقەتی (خواجەگان) واتە گەورەکان[١٣]، ئەنجا بۆ خواجە عارف و لەویشەوە بۆ خواجە مەحموودی ئەنجیرفەغنەوی، لەویشەوە بۆ (ابو علی)ی رامیتەنی، پاش ئەو بۆ (بابا محمد السماسی)، پاش ئەویش بۆ سەیید ئەمیر کەلال و، لەوەوە بۆ سەیید موحەممەدی بوخارایی کە نازناوی (بهاء الدین)ە و بە (شاهی نەقشبەند) ناوبانگی دەرکردووە.

لەم زاتەیشەوە تەریقەتەکە بە تەریقەتی نەقشبەندی ناوی دەرکردووە؛ بەو بۆنەوە کە شاهی نەقشبەند بە هێزی گیانی نەخشی (الله) و ناوی خودای گەورەی لە دڵ و دەروونی موریدەکانیدا جێگێر کردووە، تا ئیستەیش ئەم تەریقەتە بەم ناوەوە بە ناو بانگە.

شێوەی ناوی خودا هێنان و وتنی (لا اله الا الله) بە ئاشکرا و ریازەت‌کێشان و ڕۆژووگرتن و مانەوە لە خەڵوەتدا و دوورکەوتنەوە لە ئەهلی غەفلەت شێوەی خوداناسیی حەزرەتی عەلیی کوڕی (ابو طالب)ە کە لە حەزرەتی فەخری عالەمەوە وەری‌گرتووە. لەویشەوە گەیشتووە بە حەسەنی بەسری و، لەویشەوە بە حەبیبی عەجەمی، لەویشەوە بە داوودی طائی، ئەنجا بە مەعرووفی کەرخی، لەویشەوە بە سەریی سەقەطی، لەویشەوە بە جونەیدی بەغدادی، ئەنجا بە (ابوبکر)ی شیبلی و، لەوەوە بە (عبدالواحد)ی تەمیمی، ئەنجا بە (ابوالفرج)ی تەرسووسی، لەویشەوە بە عەلیی حەکاری، ئەنجا بە (ابو سعید)ی مەخزوومی، ئەنجا گەیشتووە بە پایەبەرز (عبدالقادر)ی گەیلانی خودای گەورە لە هەموویان رازی بێت.

لەم زاتەوە و تا ئێستە ئەم تەریقەتە بە ناوی تەریقەتی قادری ناوی دەرکردووە.

هەروەها تەریقەتەکانی‌تریش وەک تەریقەتی سوهرەوەردی و کوبرەوی و چەشتی و... هی‌تر کە هەموویان لە خوداپەرستی و خوو و رەوشت و ئەحوالی حەزرەتی پێغەمبەرەوە وەرگیراون.

ئەم زاتە لەخواترسانە کە خاوەنی ئەم رێ و شوێن و تەریقەتانەن بە (ئەهلی تەریقەت) ناودەبرێن و، ئەو شێوە خۆپاراستن و لەخواترسان و خواپەرستییە (تەریقەت) و رێگایانە.

ئەمانە لەبەر ئەوەی هەمیشە دڵیان لای خودایە و نوور و بەرەکەت دڵ و دەروونی پڕ کردوون، دەگەنە پایەیێ کرۆکی کاری هەق و ناهەقیان لا دیاری و ئاشکرایە، هەست بە نهێنییەکانی ئایین و رووناکی و نووری کردەوەی چاک و تاریکی و ناشیرینیی کاری حەرام و بیدعەت و کردەوەی ناپاک دەکەن، دڵیان رووناکە و بە چاوی دڵ گەلێ شتیان لێ ئاشکرا دەبێت.

کە گەیشتنە ئەم پایە مەزاج و تایبەتییەتی موریدەکانی خۆیان دەزانن؛ ئەو جۆرە ناوی‌خودابردنە و بیرکردنەوە و وەرزشە گیانییانە کە لەگەڵ حاڵیاندا بگونجێ فێریان دەکەن؛ دیارە ئەم دۆستانەی خودا، ئەم مورشیدانە دەتوانن بە ئیجتیهادی خۆیان موریدەکانیان پەروەردە بکەن وەک زانا گەورە موجتەهیدەکانی شەریعەت، بەڵکو بەجێ‌هێنانی فەرمانی ئەم زاتانە لەسەر موریدەکانیان پێویستە، چونکە ئەو موریدانە بە ناساغیی دەروونی خۆیان دەزانن، ئەوەیش دەزانن کە پەروەردەکردنی مورشیدەکانیان بەسوودە بۆیان و لە نافەرمانی و بە گوێ نەکردنیانەوە گیرۆدەی گیروگرفتی دەروونی دەبن؛ لەبەر ئەوە وەک مردوو لە بەردەستی مردووشۆردا بکەوێ، لە بەردەستی مورشیددا دەکەون، لەبەر ئەمەیە مەولەوی دەفەرموێت: [«بل قالوا: الشیخ فی شیعته» ای تباعه و جماعته «کان کالنبیّ فی امته» أی فی وجوب اطاعته].

ئەم تەشبیهە بە پێی شەریعەت تەنیا بۆ مرید نییە بەرامبەر بە مورشیدەکەی، بەڵکوو هەرکەس کە بە دڵنیاییەوە بزانێ یەکێ لە واجبەکانی بۆ رێک ناکەوێت، بە پەیڕەوکردنی موسوڵمانێ نەبێ، پێویستە لەسەری بە گوێی ئەو کەسە بکات.

بۆ نموونە: یەکێک واجبە لەسەری خێزانێک بەخێو بکات و نەخۆش بێ و، لە ولاتەکەیدا دوکتۆرێکی زیرەک ببێ کە تاقی کردبێتەوە داو دەرمانەکانی بەسوودن، ئەم زەلامە واجبە لەسەری ئەو دەرمانانە بە کار بێنێت کە دوکتۆرەکە دەیداتێ و بێ‌گوێیی نەکات هەتا چاک بێتەوە و بتوانێ واجبەکەی جێبەجێ بکات، کە بەخێوکردنی خێزانەکەیەتی.

یا کەسێک خۆی و خێزانی تووشی دەرد و گیروگرفتێ دەبن، چاری ئەو گیروگرفتەیش هەر بە تاقە کەسێک دەکرێت لەو شوێنەدا، ئەم کەسە پێویستە لەسەری پەنا بۆ ئەوکەسە بەرێ تا لەو تەنگ و چەلەمەیە رزگاری بکات.

یا یەکێ لە حوکمەکانی ئایین نەزانێ، لەو ولاتەدا هەر تاقە زانایەک هەبێ ئەو حوکمانە بزانێ، پێویستە لەسەری بڕوا بۆ لای و لەسەر فەرمانی ئەو خەریکی فێربوونی حوکمەکانی ئایین ببێت، بە پێی قاعیدەی (ما لا یتم الواجب الّا به فهو واجب).

وەکوو باسمان کرد ئەو رێ و شوین و شێوە خوداناسیبە کە موریدەکان جێبەجێی دەکەن ناوی تەریقەتە. زانینی سیفەتەکانی قەلب و نەفس، پەسەند و ناپەسەندی، لەگەڵ چۆنیەتیی دەرمان کردنیان، زانینی ئەو نهێنییانەی کە لە خوداپەرستیی سەرومڕەوە پەیدا دەبێت، بەڵێ ئەم زانینە لە لایەن مورشیدەکانەوە ناوی عیلمی حەقیقەتە. تێکڕای هەر سێ بەشەکانیش، واتە: حوکمەکانی (واجب) و حەرام و مەکرووهـ و مەندووب و موباح بۆ هەموو موسوڵمانان، کە مەشهوورە بە (شەریعەت) هەوڵدان و وەرزشی دەروونی و راهێنانی دەروون لەسەر نارەحەتی، وەرگرتنی خوو و رەوشتی پەسەند و خووگرتن بە (عەزیمە) وە و خۆ پاراستن لە شتێک کە گومانی تێدا بێت، ناویخودابردن و بیرلێکردنەوەی و دوورەپەرێزی لە خەڵکی بێئاگا و خوێڕی، کە مەشهوورە بە (تەریقەت)، بەرزبوونەوە لەم پلە و پایەیش بۆ پلە و پایەی زانین و ئاگاداری لە خووەکانی دڵ و دەروون و، ئاگاداریی دڵ و بۆ دەرکەوتنی نهێنییەکان کە مەشهوورە بە (حەقیقەت) بەڵێ ئەم سێ بەشە هەر سێکیان لەو ئایینە پیرۆزەدان کە حەزرەتی پێغەمبەری خودا (محمد المصطفی) هێناویەتی بۆ ئوممەتەکەی. بێگومان زانستی ئەو حوکمانەی لە بابەتی بیر و باوەڕ یا لە هی کار و کردەوەن، جێبەجێ کردنی (واجب) ەکان و نەکردنی (حرام) و حەز لە سوننەت کردن و دووری لە کاری (مکروهـ) هەموویان لە قورئانی پیرۆز و حەدیسی پێغەمبەردا هەن.

هەروەها ناوهێنانی خودا و بیرلێکردنەوەی و بێئاگا نەبوون لە خودا و گەورەیی خودا، هاوکاری لەسەر چاکە و پیاوەتی، پاککردنەوەی دەروون لە خووی ناپەسەند و رازاندنەوەی بە خووی چاک و جوامێرانە، هەموو ئەمانەیش لە قورئانی پیرۆز و حەدیسی پێغەمبەری ئەمیندا هەن و ئاشکرا و دیارین.

پاراستنی دڵ لە غەیری خودا، چاودێری کردنی نزیکیی خودا و ئاگاداریی بەسەر هەموو شتێکدا (و هو معکم اینما کنتم) [١٤] (و نحن اقرب الیه من حبل الورید) [١٥] بە گوێ نەکردنی دڵمردوان (و لا تطع من أغفلنا قلبه عن ذکرنا واتبع هواه) [١٦] ئاگاداریی لە ئایەتی (إنّ ربّک لبالمرصاد) [١٧] ڕەفتارکردن بە ئایەتی (واعبد ربّک حتی یأتیک الیقین) [١٨] هەموو ئەمانە لە قورئانی پیرۆزدان، کەوابوو دەتوانین بڵێین ئایەتی (الیومَ أکملتُ لکم دینَکم و اتمَمتُ علیکُم نِعمتی وَ رَضِیتُ لکم الاسلامَ دیناً) [١٩] ئەوە ڕادەگەیەنێت کە هەرچی خێر و بەختیاری و چاکیی دنیا و قیامەتە هەمووی لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا هەیە، ئەگەرچی ئەوانەی ناوەڕۆکی ئایین بەجێ دێنن زۆر نایابن.

جا لەم شوێنەدا لەبەر ڕووناکیی فەرموودەی زانای گەورەی شەرعی وەک (ابن حجر)ی هەیسەمی (٩٠٩ ـ ٩٧٤)ی کۆچی لە (فتاوا)ی (خاتمە)دا عەرزتان دەکەم: ئەم زانیاریی ئادابی (اولیاءالله) یە، ئەم زانیاریی حەقیقەتە گەلێ پایەی بەرزە، ئاشکرایە گەورەیی هەر زانیارییەک بەپێی گەورەیی ئەو شتەیە کە پێی دەزانرێت، کەوابێ ئەو زانیارییەی پێوەندی بە زات و سیفات و ناو و کرداری خودای گەورەوە هەبێت لە هەموو زانیارییەک گەورەترە، دوابەدوای زانیاریی زات و سیفەتەکانی خودا زانیاریی حوکمە شەرعییە کردەوەیی‌یەکان، وەک نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج، مامەڵە، ژن‌هێنان... تاد؛ چونکە مەبەست لەم زانیارییە زانینی حوکمی شەرعە، لە حەڵاڵ و حەرام و ڕەوا و ناڕەوا و واجب و سوننەت و مەکرووهـ ئەم زانیارییە پێوەندی بەو کردارانەوە هەیە کە لە موکەللەفەکان داوا دەکرێن، ئیتر زانیاریی‌یەکانی تری سەر بە ئایین هەموویان هۆن بۆ ئەم زانیارییە کە ناسینی خودا و زانینی خوداپەرستییان تێدایە، بەڵێ بە پێی ئایەتی (و ما خلقت الجن والانس الّا لیعبدون) [٢٠] بنیادەم و پەری هەموو بۆ خوداپەرستی دروست کراون، دیارە پەرستنیش بە بێ‌ناسینی پەرستراو بە پێی توانا نابێت.

پوختەی قسە: هەرچی زانیاریی سەر بە ئایینی ئیسلام هەیە، کە لە بابەتی مەعنەوییات بێ، هۆیە بۆ زانینی حوکمە شەرعییەکان، زانینی حوکمی شەرعیش بۆ ڕەفتار و کاری ڕاست و ڕەوا کردنە، کار و کردەوەی ڕاست و ڕەوا و ڕەوانیش بۆ پەرستنی خودا و ڕەزامەندییەتی و، لەم ڕێگایەوە ئینسان لە خودا نزیک دەبێتەوە، دیارە نزیکبوونەوەیش بۆ ناسینی زات و سیفەتەکانی خودای گەورەی بێ‌هاوتا بە پێی توانای ئادەمزادە.

دیارە هەرکەس بە راستی ئەم هۆیانە جێبەجێ بکات دەگاتە مەبەستی سەرەکی و بەختیاری و کامەرانی و رزگاریی هەمیشەیی.

بەڵگەیەکی بەهێزی تر بۆ بەرزیی پلەی زانیاریی ناسینی خودا و، بۆ ئەوەی کە لە هەموو زانیارییەک گەورەترە، ئەوەتە کە زانیاریی ناسینی زاتی خودا و سیفەتەکانی خودا بە تایبەتی کاری ئینسانە پێگەیشتووە کردەوە بەرزە خوو و ڕەوشت جوانەکانە، بەڵام زانیارییەکانی تر هەموو کەس، هەموو چاک و خراپێک، تەنانەت ئینسانی بێئایین و بێڕەوشتیش، لەوانەیە بە ئاسانی فێریان ببێت؛ بۆیە هەموو زانیارییەک لەگەڵ خۆشویستنی دنیادا وەدەست دەهێنرێ بەڵکو وایش دەبێ بۆ ئایینەکەیش بەسوودە و خەڵک لێیەوە فێر دەبن، بەڵام هەرگیز نەبووە و نابێت لەگەڵ خۆشویستنی دنیا و لەخودانەترسان و نارێکیدا ئینسان بچێتە ریزی پیاوچاکانەوە؛ واتە زانیاریی خوداناسی لە کەسێکدا دێتە جێ کە بێکەم و کووڕی بە پێی حوکمەکانی شەرع کار بکات، لەخوداترس بێ، دوور بێ لە تەماع و ئارەزووی دنیا، خاوەن (ورع) بێ و دوور بێ لە کاری گومانلێکراو، بەڵێ ئەم جۆرە کەسانە رۆژبەرۆژ پایەی زانیاری و هوشیارییان زیاد دەکات وەک لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێ: (وَاتَّقُوا اللهَ وَ يُعَلِّمُكُمُ اللهَ وَ اللهُ بِكُلِّ شَيءٍ عَلِيمٌ) [٢١] ئەم خوداناسانە خۆیان لە پێش هەموو کەسدا سوود لە زانیارییەکەیان وەردەگرن و دەچنە ریزی پیاوچاکان و لەخوداترسانەوە، بەڵام زانایانی تر وا رێک دەکەوێت کە مریدەکانیان سوود لە زانیارییەکەیان وەردەگرن و پێی دەکەونە سەر رێگای چاکە، کەچی خۆیان بۆش و پووچن و لە هەموو خێر و پاداشێک بێبەشن و بێئاگان لە واجبەکانی سەرشانیان و دوورن لە خوداپەرستی و عومریان بە خۆڕایی بەسەردەبەن، مەگەر یەکێ، بە لوتف و میهرەبانیی خودا لە ئەنجامدا بیرێ بکاتەوە و رووبکاتە راستی و خوداپەرستی و بە دڵ و گیان پەشیمان بێتەوە و لە هەموو روویەکەوە لە خودا بترسێت.

زاناکان فەرموویانە زانیاریی خوداناسی واتە: زانیاری و رێو شوێنی خووگرتنی دەروون بە نزیکی لە خودا و بە پرتەوی ئیمان و باوەڕ و خووگرتن بە حاڵەکانی پێغەمبەرەوە(د. خ)، تەنها بۆ نموونە: لەو چەشنە نوور و پرتەوە کە لە دڵی موبارەکی ئەودا بووە یەک پلە لە هەزار پلە یا دوو لە هەزاری ئەوە لە دڵی ئینساندا پەیدا ببێت. بەڵام زانیاریەکانی تر زانیاری و رێ و شوێنە بۆ دۆزینەوەی رێگایەک ئینسان بەو پلانە بگەیەنێت، ئیتر کابرای زانا بەو رێگەدا بڕوا یان نا و، کە پێیدا رۆیشت بگاتە ئەو پلەیە یان نەگات.

ئەگەر بڵێیت ئەمەی وتت لەگەڵ بەسەرهاتەکەی حەزرەتی (موسی) و (خضر)دا ناکەونە یەک، لە سەر ئەوەی کە حەزرەتی (خضر) وەلیی بێت، ئەوەتە حەزرەتی مووسا بە رای هەموو لایەک لە (خضر) گەورەترە؛ چونکە مووسا یەکێکە لە پێغەمبەرە (اولوالعزم) ەکان و (خضر) تەنها وەلییە، کەچی حەزرەتی مووسا کەوتە شوێن (خضر) و دەیویست سوودی لێ وەربگرێ.

لە وەڵامدا دەڵێم: رەخنەگر لێی تێکچووە؛ حەزرەتی مووسا نەیویست دوای (خضر) بکەوێت هەتا (معرفةالله) پەیدا بکات، یا خۆ بە هاورێیەتیی ئەو دەروونی خۆی پاک و نوورانی بکات چونکە بێ‌گومان پایە و پلەی پێغەمبەران و دەستەڵاتیان لە بابەتی ناسینی خودا و نوورانییەتی رۆحدا گەلێ گەلێ لە پایە و پلەی دۆستانی خودا و پیاوچاکان زیاترە، بەڵکو هەر لەگەڵ یەک بەراورد ناکرێن، بەڵێ سەرەتا و هۆی ئەم بەسەرهاتە ئەوە بوو: جارێ لە حەزرەتی مووسا پرسیار کرا: ئەمرۆ کێ لە هەموو کەس زاناترە، ئەویش وا لە پرسیارەکە تێ‌گەیشت کە مەبەست زانستی ئایین و شەریعەتە و، لەم رووەوە کەسی لە خۆی بە زاناتر نەزانی و فەرمووی من لە هەموو کەس زاناترم، ئەمەیش لەبەر ئامۆژگاریی خاوەن پرسیار و وتنی راستی بوو، مەبەستی خۆهەڵکیشان و خۆبەزلزانین نەبوو. خودای گەورەیش تێی‌گەیاند: نەخەیر، تۆ هەرچەند پێغەمبەری منی و لای من پایە و پلەی تایبەتیی خۆتت هەیە، بەڵام من بەندەی وام هەیە گەلێ زانیاریی تایبەتی لایە کە لای تۆ نییە، ئەوە بوو ئەو بەیەک‌گەیشتنەی لەگەڵ حەزرەتی (خضر) بۆ رەخساند تا راستیی بۆ دەرکەوێ، ئەگەرنا پایەی زانین و ئاگاداریی رۆحیی حەزرەتی مووسا(د. خ) گەلێ لە هی (خضر) (ر.خ) بەرزترە.

پوختەی قسە: پایەی جێ‌بەجێ کردنی (واجبات) و خۆپاراستن لە (محرّمات) و بەجێ‌هێنانی کارە سوننەتەکان پایەی هەموو موسوڵمانانە، بەڵام پایەی وەرع و تەقوا و دووریی لە (شبهات) پایەی موسوڵمانە تایبەتییەکانە، واتە (خواس).

پایەی گەیشتن بە نووری ئیمان و ئیسلام پایەی ئەولیا تایبەتییەکانە، لەم پایەدا بە پێوەندی گیانی و بە ناسینی زات و سیفەتەکانی خودای گەورە، ئەو ئەندازەی بۆ غەیری پێغەمبەران دەست بدات، لە حەزرەتی پێغەمبەرەوە نزیک دەبنەوە.

ئەم سێ پایە و پلەیە هەمووی شەریعەت و ئایین و خوو و رەوشتێکن کە حەزرەت(د. خ) لای خوداوە هێناونی و بە خەڵکی راگەیاندوون و موسوڵمانان هەرکەس بە قەدەر خۆی پێیان نوورانی بوون.

(نوّرنا الله بنور شریعته و وفقنا علی السلوک فی طریقته، و هدانا الی الفـوز بصـفاته و سـیرته، و ختم أعمارنا علی محبته بمنّه و فضله و رحمته آمین).

ئـــەرچی ئـــەهلی حـــەق فەرمووگیانـــە:
ئەســـبابی عیلمـــی مـــەخلووق ســـیانە
حەواســـی ســـەلیم خەمســـەی زاهـــیرە
لەمس و، شەم، زەوقە و، سەمعە و، باسـیرە.
خەبـــەری ســـادق، عەقلـــە، ســـێ تـــەمام
نییـــە لـــە ئەســـباب مەعریفـــەت ئیلـــهام
لاکـــین بزانـــە، هـــیچ شـــوبهەی نییـــە،
ئـــەوە بـــە نیســـبەت عامّـــەی خەڵـــقییە
(خصوصـــاً) ئیلـــهام هـــەر وەک ویجـــدانی
ئیلزامـــی غـــەیری پـــێ نـــاتوانی
ئەگەرنـــە، عیلمـــی پـــێ دەوێ حاســـڵ
بـــدە بـــە حـــەدیس «أَلهَمَنـــی...» دڵ
«قلـــب المـــؤمن عـــرش الله» بخـــوێن
جـــامی «إســـتفتِ عـــن قلبـــک» بـــوێن
نەســـیمی «نَفَـــث فـــی روعـــی» کوانـــێ؟
«إلّـــا و قـــد صـــبّ» زۆر کـــەس دەیزانـــێ
حوججەتـــە لـــە لای ئەســـحابی ســـەفا
«خُـــــذ طـــــریقَهم إذ فیـــــه شـــــفا»

واتە: ئەگەرچی ئەهلی حەق فەرموویانە: هۆیەکانی زانینی ئادەمزاد سێ شتن و، ئـادەمیزاد لـە ڕێگای ئەم سێ شتەوە شت ئەزانێ:

یەکەم: پێنج هێزە هەستکارە ساغەکانی لەش، واتە هێـزی (لامسـە) کـە گـەرمی و سـاردی، زبری و نەرمی، تیژی و کولی، ڕەقی و شلی... تادی شـتی پـێ دەزانرێـت. هێـزی (شـامّە) واتـە بۆنکار کە بۆنی خۆش یا ناخۆش، توندوتیژی یا سووکی پێ هەست دەکرێت. هێزی (سامعە) کـە

دەنگی دوور و نزیک، بەرز و نزم، خۆش و ناخۆشی پێ دەبیسترێت. هێزی (ذائقە) چەش‌کار، کە تالی و شیرینی، سوێری و بێخوێیی تاد...ی پێ دەزانرێت. هیزی (باصرة) بینین‌کار، کە رەش و سپی و سەوز و سوور، جوان و ناشیرینی پێ دەزانرێت.

بێ‌گومان هەر یەک لەم پێنج هێزە هەست‌کارانە کە خودای گەورە لە لەشی ئینسانا داینـاون ئەوەی پێ دەزانرێ کە بۆی دانراوە و پێی دەکرێت، لەوانەیە چاو کاری بیستن بکـات، گـوێ وەک چاو شت ببینێت، بەلام خودای گەورە ئەمەی نەکردووە بە عادەت.

دووەم: لەو سێ هۆیانە خەبەری پێغەمبەرە(د. خ) کە ئینسانێکە داوای پێغەمبەرایەتیی کردووە و (معجزە)ی نواندووە. قسەی ئەم زاتە دەبێتە هۆی زانینی (استدلالی) واتە: دەڵێین ئەم خەبـەرە خەبەری کەسێکە دەڵێ پێغەمبەرم و بە موعجیزە راستیی خەبەرەکەی دامەزراوە، هەر خەبـەرێک وەها بێت راستە؛ کەوابێ ئەم خەبەرە راستە.

سێهەم هۆ: عەقڵە، جا ئەو شتانە کە ئەیزانێ ئەگەر پێویستیان نەبوو بە دەلیل بۆ هێنانەوە ئەوە پێی دەڵێن (علم)ی (بدیهی) ئیتر چ بە تـەنها ئـەوە پەیـدا ببـێ کـە ئینسـان تـەنها (موضـوع) و (محمول) ەکـە و (نسـبة)ی مابـەینیان بێنێتـە مێشـکیەوە؛ وەکـوو (النقیضـان لا یجتمعـان و لا یرتفعان) واتە: بۆ نموونە بوون و نەبوون نە پێکەوە کۆ دەبنەوە و نە پێکەوە لادەچن، دیارە شت یا دەبێ هەبوو بێت یا نەبوو، نابێ لـە یـەک‌کاتـدا هـەبوویش بێـت و نـەبوویش، هـەروەها نابـێ نـە هەبوویش نەبێت و نە نەبوو. ئەم جۆرە زانینە ناوی (أوّلیّات)ە.

وایش دەبێت بێجگە لەوەی (موضوع) و (محمول) و (نسبة) بێنیتە مێشکەوە پێویستت بە ئیش پێ‌کردنی یەکێک لە (حاسّة) کان دەبێت وەک بڵـێیت: (الـورد معطـر) ئـەم جـۆرە زانینـە نـاوی (حسّیّات)ە.

بەدیهیی وایشمان هەیە بەڵگەیەکی ئاشکرای هەیە کە هەرگیز لە پێوەندی نێـوان (موضـوع) و (محمول) جیا نابێتەوە، بەم‌جۆرە دەڵێن (فطریات) بۆ نموونە:

(الاربعة زوج) شتێکی بەدیهییە، بەلام بەڵگەیەکی لەگەڵدایە کـە هـەرگیز لێـی جیـا نابێتـەوە ئەوەیش ئەمەیە: (چونکە چوار ژمارەیە کە ئەکرێتـە دوو بەشـی وەک یـەک، هـەر ژمارەیـەکیش بکرێتە دوو بەشی وەک یەک جووتە، کەوابوو چوار جووتە. جۆرە بەدیهییەکیش هەیە بەڵگەیەکی پـەنهانی لەگەڵـدایە کـە بـە هـۆی پـڕبوونی گـوێ بـەو خەبـەرە پەیـدا دەبێـت، وەک دەڵـێیت ئەستەمبووڵ پایتەختی عوسمانییەکان بووە، ئەمەیان (متواترات)ە.

یا بەڵگەیەکی پەنهانی وەهای لەگەڵدایە کە لە تاقی‌کردنەوەی دووبارەبوونـەوەی حوکمەکـەوە پەیدابووە، وەک بڵێیت ڕۆن گەرچەک ئینسان ڕەوان دەکات. ئەم جۆرە پێی دەڵێن (تجربیّات).

یا بەڵـگەیەکی پـەنهانی وەهـای لەگەڵـدایە لـەوەوە پەیـدا دەبێـت کـە وردە وردە زیهـن لـە سەرەتاکانی حوکمەکەوە دەگاتە ئـەنجام، وەک بڵـێیت ڕوونـاکیی مانـگ لـە ڕوونـاکیی خـۆرەوە وەرگیراوە. ئەمەیش ناوی (حدسیات)ە.

وەک بۆت دەرکەوت ئەم پێنجە هەموویان لە بەشی بەدیهییات بوون.

خۆ ئەگەر زانینی مەبەست پێویستی بە بەڵگە بوو ئەوە پێی دەوترێ (عیلمی اسـتدلالی) واتـە: زانین بە هۆی بەڵگە و بەڵگەکارییەوە؛ وەک بڵێیت: جیهان تازە پەیدابووە، واتە نەبوونی لێ پێش کەوتووە. بەڵگەی ئەم شتە ئەوەتە: چونکە جیهان هەمیشە لە گۆڕاندایە، هـەرچیش هەمیشـە لـە گۆڕاندا بێ تازە پەیدا بووە، کەوابێ وەک وتمان جیهان تازە پەیدا بووە.

زانایانی زانیاریی کەلام (الهام) یان بە هۆی زانین دانەناوە، چونکە (الهـام) کـە بریتییـە لـەوەی مەعنایەک بخرێتە دڵی ئینسانەوە، کـە ئینسـانەکە وەک پێغەمبـەران(د. خ) لـە گوناهــ پـارێزراو نەبێت، جێگای بڕوا و متمانە نییە، چونکە لەوانەیە سەرچاوەی ئەو مەعنایە کـە خراوەتـە دڵـیەوە خودا نەبێت و، ئەو مەعنا خراوەدڵە هەڵە و شتێکی پووچ و بۆش بێت، لـە لایـەکی تریشـەوە ئـەو مەعنایە شتێکی ویجدانییە بۆ خاوەنەکەی نەبێ بە کەڵک نایە و ناسەپێنرێت بەسەر غەیری خۆیدا و ناکرێتە ماڵ بەسەریەوە.

بەڵام نەژماردنی (الهام) لە هۆیەکانی زانین بۆ هەڕەمەی خەڵکەکەیە، ئەگەرنا مـادام ئـەو شـتە کە خراوەتە دڵ دژی بنکەکانی شەریعەت نەبێت دەبێتە بەڵگە بۆ ئەو کەسە کە ئیلهامی بۆ کراوە، هەروەها دەیشبێتە بەڵگە بۆ ئەوکەسانە کە دواکەوتووی ئەو ئیلهامبۆکراوەن و ڕاسـتیی ئیلـهامیان تاقی کردووەتەوە، بە تایبەتی پێغەمبەر(د. خ) پشتگیریی کاری ئەم ئیلهامەی کردووە، بـۆ نموونـە لێیەوە ڕیوایەت کراوە: «الهمنی ربی» ئەگەرچی ئەمە ئیلهامی تایبەتی پێغەمبەرە و ئێمە قسەمان لەو نییە، هەروەها لە حەزرەتەوە(د. خ) دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: «قلب المؤمن عرش الرحمن» واتە: دڵی ئینسانی موسوڵمان بارەگای دەرکەوتن و درەوشـانەوەی نـووری میهرەبـانیی خودایـە، دیارە دڵێ کە دیدگای نووری خودایی بێت شەیتان ڕێگای پێ نابات کە شـتی خراپـی تـێ فـڕێ بدات و، ئیلهامەکان بە ڕاست و جێگای متمانە حسێب دەکرێن. خۆ ئەگەر بڵـێین بـۆ خەڵـک بـە گشتی بەکار نایەن، هیچ نەبێ بۆ خۆی و بۆ باوەڕپێ‌کردووان و دواکەوتووانی جێگەی متمانەن.

(روی عن وابصة بن معبد، رضی الله تعالی عنه، قدم عَلی رسـول‌الله(ص)، فـی عشـرة نفـر مـن قومه بنی اسد بن خزیمة سنة تسع، فأسلموا و رجع الی بلاده، ثم ترک الجزیـرة و سـکن بالرقـة و دمشق، و مات بالرقة و دفن عند منارة جامعها، قال: أتیت رسول‌الله(ص)، فقال: جئـتَ تسـأل عـن البِرّ، قلت: نعم، فقال استفتِ قلبک، و فی روایةٍ استفتِ نفسـک، البـرّ مـا اطمأنّـت علیـه الـنفس و اطمأنّ الیه القلب).

ئەم فەرموودە پیرۆزە بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێت کە لە کاتێکدا ئینسـانی موسولـمان دڵـی لـە خوو و خدەی خراپ و ناشیرین پاک کردەوە و بە چاکی شۆردی، ئەگەر لە لای غەیبەوە شـتێکی خرایە دڵەوە کە لەگەڵ بنکەکانی شەریعەتدا جۆر بێت، ئەوا ئەو شتە راسـتە و شـایانی باوەڕپـێ- کردن و نرخ‌بۆدانانە.

هەروەها مەولەوی بۆ ئیسباتی ئەوە کە ئیلـهام یەکێکـە لـە هۆیـەکانی زانـین، دەڵـێت: ئـەی سـروەی عیبـارەتی (نفـث فـی روعـی) کـوا کـە واتـە (خسـتیە دڵـم، ئیلـهامی کـردم) کـە لـە پێغەمبەرەوە(د. خ) گێڕراوەتەوە فەرموویەتی «ان روح القدس نفث فی روعی أن نفسا لـن تمـوت حتی تستکمل رزقها؟»

هەروەها دەڵێ: زۆر کەس ئاگای لە حەدیسی «ما صبّنی الله إلّا و قد صَبَّ فـی قلـب ابـی‌بکـر» هەیە، واتە: خودا هەرچی رژاندووەتـە دڵـی مـن رژاندوویەتیـە دڵـی ئەبووبـەکریش. دیـارە ئـەم لەدڵ‌رژاندنە بۆ ئەبووبەکر دەبێتە ئیلهام[22]. هەرچۆن بێ ئەم ئیلهامە بەو جۆرە کە بـاس کـرا لای ئەولیا دڵ‌سافە نوورانییەکان حوججەتە، دروستە بۆ خۆیـان و پەیـڕەوەکانیان بـاوەڕی پـێ بکـەن، تۆیش کە حەز لە زانین و ئایین و هاوڕێیەتیی پیاوچاکـانی لـەخواترس و دڵ‌پاکـان دەکـەی ئـەم رێگایە بگرە بەر، چونکە شیفای دەردی دەروونی تیایە.

(وَ لا سـیّما طریقَـةَ مَـن
مَـنَّ علـیهم جَنـابُ ذی‌المَـنّ
بـأنّهُمُ قَـد تَـأدّبوا
بـأدَب الشـرع، فیـه دَأبـوا
دأبهـم للشـیخ دَأب الصـحابة
لمـن طـاب مـن طیبِـهِ طابـة)

خامۆش و گۆیا و، خەمـەدە و شـواظ،
بێهۆش و هوشیار، رەقەدە و ئـەیقاظ
نزیـــک ئاشـــنا، دوور و بێگانـــە
غوییـەب و حـوززار، کانـە و بانـە[٢٣]
تەبەعـەی میشـکات میسـباحی بـاری
(وراء کـــلِ مســـلم، بخـــاری)
ئووەیسیی بە نەقش بێنەقشی پەیوەند
سـەرکاری عـالی شـاهی نەقشـبەند
قَـــدَسَ الله، تعـــالی، سِـــرَّە
أفـــاضَ علـــی المـــؤمنین بِـــرَّە
تـەریقی ئەنفـەس ئەقـدەس و ئـەعلا
ئـەحلا و ئەجمـەل، ئەجـەلّ و ئـەجلا
ئەتهـەر و ئـەنوەر، ئەتیـەب و نەسـەب
ئەنفەع و ئەرفـەع، ئـەفزەل و ئـەقرەب
مـەکتووبات نـەگری ئـەر لـە گوێتـەدا
(ابـن حجـر) بـەرد دەدا پێتـەدا[٢٤]
زاهـیری دەڵـێت وەک باتینییـە[٢٥]
تەریقـە لەمـە فـازیلتر نییـە
چ تەریقێکـە ئاوردیانـە بـەین؟
(جـــزاهم الله رَبُّ المشـــرقین)

طابە: مەدینەی مونەووەرە. شواز: بڵێسـەی بـێدووکەڵـی ئـاگر. خەمـەدە (خمـدە): جـەمعی (خامد) ە، کە گڕێکە نەکوژابێتـەوە، بـەلام بـێبڵێسـە. رەقـەدە (رقـدە) جـەمعی (راقـد) ە، واتـە نووستوو. غوییەب (غیّب): جەمعی (غائب)ە. حوززار (حضّار): جەمعی (حاضـر)ە. کانـە: جـەمعی (کائن)ە. بانە: جەمعی (بـائن) ە: جیـا. (مشـرقین): تەغلیبـە، وەک (والـدین) و (قمـرین) واتـە: مەشریق و مەغریب: خۆرهەلات و خۆرنشین.

واتە: نەخوازەڵا ڕێبازی ئەو دۆستانەی خودا کە جەنابی خودای خاوەن‌نیعمەت، بە میهرەبـانیی خۆی نیعمەتێکی گەورەی پێ بەخشین، ئەو نیعمەتەیش خووگرتنیانە بە خوو و ڕەوشتی ئایینی و ئەدەب‌وەرگرتنە لە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام و، بـەم خـووگرتن و ئـەدەب‌وەرگرتنـەوە گـەلێک ماندوو بوون. ئەمانـە ئـەدەب و هەڵسـان و دانیشـتنیان لەگـەڵ مورشـیدەکانیاندا وەک ئـەدەبی هاوڕێکانی پێغەمبەرە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە گەورەیەدا کە شاری (طابە) واتە: مەدینەی مونـەوورە بە بۆنی خۆشی ئەو بۆن‌دار بوو[٢٦].

ئەو زاتە موبارەکانە بە زمان خامۆش و بێ‌دەنگن، بەڵام بە دڵ گۆیـان و نـاوی خـودا دەهێـنن، بەدیمەن ئاگری دامرکاوی بێ‌بڵێسەن، بەڵام بـە دڵ و دەروون بڵێسـەی سـووری بـێ‌دووکەڵـن و نوقمی یادی خودان، لە ژێر کاری بەرەکەتی خودایی‌دا مەست و بێ‌هۆشن، بەڵام بۆ ئاگـاداریی لـە حاڵی دواکەوتووەکانیان و بۆ پەروەردەکردنیان هوشیارن، یا خۆ لە کاروباری دنیا و خۆش‌ویسـتنی پایە و مایەدا بێ‌ئاگان و نزیکیان ناکەون، بەڵام بۆ کاروباری ئـایینی و خـاوێن‌کردنـەوەی دەروونی موریـدان ئاگـادار وئامـادە و هوشـیارن. بەدیمـەن نووسـتون و بـە دەروون وریـا و خـەریکی بیرکردنەوەن لە گەورەیی خودا، نزیکن لە خودا و ڕەزامەندیی خودا، دوورن لە دنیـا و سـامان، یـا نزیکن لە موریدی دڵسۆز و دوورن لە ئینسـانی یـاخی و لـەڕێ‌لادەر. دۆسـت و ئاشـنای خـودا و دۆستانی خودان، بێگانەن لە دنیا و خۆشیی بڕاوە، یا لەگەڵ دەروون‌ڕووناکانـدا ئاشـنان و بێگانـەن لە دڵڕەشان، بە دڵ لە ناودا نین و خەریکی بیرکردنەوەن لە گەورەیی خـودای گـەورە، بـەڵام بـە لەش لە ناو خەڵکدان و هاوبەشن لە کار و بارياندا. ئەم خوداناسە لەخوداترسانە (کائن فی النـاس) ن و (بائن عن الناس)، واتە بە لەش لەناوخەڵکدان و لەگەڵیاندا دەژیـن، بـەڵام بـە گیـان لەگـەڵ خودای مەزن‌دان و بیر لە گەورەیی ئەو ئەکەنەوە و خەریکی پەرستنی ئەون[٢٧]. ئەو زاتانە پەیڕەو و دواکەتووی ڕووناکیی تاقێکن کە چرایەکی خودایی تیایە، چرایەکـە دواکـەتووی هـەموو ئـەهلی حەدیسێکی دیاریی وەک موسلیم و بوخارییە، زاتێکە پایەی وەک حەزرەتی (اویس)ی قەرەنییـە، وە یا وەک (اویس)ی قەرەنی (موراد) بووە (ئەم مورادە ئیستیلاحی ئەهلی تەسەووفە).

ئەو زاتە پێوەندی بە نەخشی دنیایی و (ماسوی الله) ییەوە نییە و، نەخشی ئەو بریتییە لە بـێ‌نەخشی و، ئەم بێ‌نەخشییە بووەتە نەخشی و، ناوبانگی بە شاهی (نەقشبەند) دەرکردووە، خوا دڵی لە غەیری خۆی پاک کاتەوە و بەرەکەتی بەسەر دڵی موسوڵماناندا بڕێژێ. ڕێ و شوێن و شـێوەی ڕێبازی ئەم زاتە لە هەرلایەکەوە تەماشای بکەی نایاب و هەڵبژاردەیە.

ئەنجا (مەولەوی) بۆ پاڵپشتی قسەکەی دەفـەرموێ ئەگـەر بـاوەڕت بـە کتـێبی (مکتوبـات)ی ئیمامی رەببانی(ر.خ) نەبێ، کە مەدحی رێبازی (نەقشبەندی) ئـەکات، حـەزرەتی (ابـن حجـر)ی هەیسەمی دەتداتە بەر بەرد و دڵت دەشکێنێ.

رێبازەکەیان ئەوەندە پاک و بێخەوشە سوێند دەخۆی کـە زاهیرەکـەی وەک باتینەکەیـەتی و رێباز لەمە گەورەتر نییە، نامەخوا لەم رێبـازە راسـت و رەوانـە، خـودای خۆرهـەڵات و خۆرنشـین پاداشی ئەوانە بداتەوە کە رەنگی ئەم رێبازەیان رشتووە.

عینـــادت نییـــە ئەگـــەر مونســـیفی
ئـــەوە «أفضـــلُ الـــذِّکرِ ألخفـــیّ»[٢٨]
ئەویچـــە ئیختیـــار ئیســـمی زاتی پـــاک
جـــامیعی ئـــەسما و ســـیفاتانە پـــاک
بـەر لـە مەشغوولـی بـە نـەفی و ئیسـبات
ئەڵـــبەتە کـــەو چەنـــد فەوائیـــد دەدات
نـــەک وەک ئیختیـــار دڵ، بـــە دڵ بـــزان
کــە لــە بەدەنــدا هــەر وەســە سولــتان
ئیســـــلاحی ئـــەوی ئیســـــلاحی گشـــتە
بەڵ بۆ شەش جیهـەت بـۆ هـەموو چشـتە
(بعـد ازان) کــە دڵ پــڕ بــوو لــە ســەفا
جـەلای رۆحــە و سـیڕ خەفییـە و ئـەخفا
هەروا بەو سلووک رەویە و شەرت و شـوێن
تـــــا (عَشَـــــرةٌ کامِلـــــة) دەڕۆن
کە لە کەڵ[٢٩] کەوکەب کـاملی سـووی‌دا
ئیمــــان و ئیســــلام حــــەقیقی رووی‌دا
ئــەو وەختــە دەڵــێن قۆڵــت هەڵماڵــە
ئــان هــــاوترازووی ســـەدهەزار ساڵـــە

(پاک)ی یەکەم: خاوێن. (پاک)ی دووەم: سەرپاک، هەموو. کـەو: ئـاخۆ. نـەک وەک ئیختیـار دڵ: نەخوازەڵا کە دڵیان بۆ ئەم زیکرە خەفییـە هەڵـبژاردووە. هـەر وەسـە: هـەر ئەوەسـە، هـەر ئەوەتە. بعد ازان: پاش ئەوە[ فارسییە]. سووی‌دا: دەرکەوت. هـاوترازوو: هاوتـا (معـادل). قۆڵـت هەڵماڵە: ئامادە بە.

مەولەوی(ر.خ) پاش ستایشی تەریقەتی نەقشبەندی و باسی شاهی نەقشبەند(ر.خ) باسی ئاداب و ڕێ و شوێنی موریدی ئەو تەریقەتە ئەکات و، ئەڵێت: ئەگەر سەرکەش نیـت و ئینسـافت هەیـە تەماشای یەکەم کاری موریدی نەقشبەندی بکە کە زیکرە بە دڵ و پایەی زۆر گەورەیـە و زاناکـان فەرموویانە: «أفضَلُ الذکرِ الخفيُّ» واتە: باشترین ناوی‌خوداهێنان ناوهێنانیەتی بە پەنهانی.

شایانی باسە لەم زیکری خەفییەدا گەلێ قسە کراوە؛ زانایان فەرموویانە زیکری خەفی یـا هـەر بە دڵ ئەبێ یا بە دڵ و زوبانە بەڵام خۆی نایبیسێ، یاخۆ خۆیشی و غەیریش ئەیبیسن، وەکو ئیبنو حەجەری هەیسەمی لە خاتیمەدا فەرموویەتی زیکرێ کە هەر بە دڵ بێ و زوبان بەشی تیـا نـەبێ، یاخۆ زوبان بەشی تیا هەبێ بەڵام خۆی نەیبیسێ پاداشی نییە. دوابەدوای ئەم قسەیە دەفـەرموێت دەبێ ئەم نەبوونی پاداشە لەو ڕووەوە بێ کە زیکـرە چونکـە زیکـر پیویسـتە بـە زوبـان بـوترێ و خاوەنەکەیشی بیبیسێ، بەڵام ئەگەر لەو ڕووەوە سەیری بکەین کە دڵ خەریکی زیکری (الله)یە و لە مەعناکەی ورد دەبێتەوە و، نوقمی دەریای نوور و بەرەکەتی خودایی دەبێ لـەو حاڵـەوە، ئـەوە گومانی تیا نییە کە پاداشی لەسـەرە؛ بـۆ بەڵـگە لەسـەر راسـتیی ئـەم قسـەیە فـەرمووده هەیـە: بەیهەقی ریوایەتی کردووە کە حەزرەت(د. خ) فەرموویەتی: (الذکر الذی لا تسمعه الحفظـة یزیـد علی الذکر الذی تسمعه الحفظة بسبعین ضـعفاً) جـا لەسـەر ئـەم ریوایەتـە مەولـەوی فـەرمووی: «أفضل الذکر الخفيُّ» هەروەها لەم زیکرە قەلبییەدا ناوی پاکی زاتی خوای گـەورە هەڵـبژێردراوە کە (الله) یە؛ چونکە (الله) عەلەمە بۆ زاتی (واجب‌الوجود)ی و هەموو تەواوییەکی هەیە و لە هەموو کەم و کووڕی و خەوشـێک دوورە و پاکـە، واتـە ئـەم ئیسـمی زاتـە هـەموو ئـەو کەماڵاتـەی کـۆ کردووەتەوە کە لە ناوەکانی خودا و سیفەتەکانییەوە پەیدا دەبن، چ سیفەتی نەفسی کە (وجـود)ە و چ سیفەتە سەلبییەکان (قدم، بقاء، قیام بالذات، مخالفة الممکنات)، چ سیفەتەکانی مەعنای، کـە پێشیان دەڵێن سیفاتی زاتی، وەک (حیاة، علم، ارادة، قدرة، سمع، بصر، کلام)، چ ئەو سـیفەتانەی کە پێیان دەڵێن سیفاتی مەعنـەوی. بـۆ نموونـە: وەک (کونـه حیّـاً، کونـه عالمـا... تـاد)، چ ئـەو

سیفەتانەی کە لە پێوەندیی سیفەتە زاتییەکانەوە پەیدا دەبن... دیارە ناوی (الله) کە ئـەم هـەموو سیفەتانە بگرێتەوە لە هەموو ناوەکان گەورەترە.

بێگومان زیکری (الله) بەر لە خەریک بوون بە زیکری (لا اله الا الله)وە کە پێی دەڵێن نەفی و ئیسبات، گەلێ سوودی تێدایە بو موریدی تازەدەس‌پێ‌کردوو، ئەم موریدە پاش ئـەوەی کـە دڵـی (ذاکر) بوو لەو سوودانە تێدەگات، نەخوازەلا کە دڵیان هەڵبژاردووە بۆ خەریک‌بـوون بـەم زیکـری خەفییەوە، نەک زوبان؛ چونکە دڵ لە لەشدا وەک پادشایە و سەرچاوەی فەرمان‌کردنە بە چاکـە و بە خراپە؛ حەزرەت(د.خ) دەفـەرموێ: «ألا إنّ فـی‌الجسـد مضـغةً إذا صـلحت صـلح الجسـد و اذا فسدت فسد الجسد ألا و هی القلب» کە چاک‌کردنی دڵ و رووناک‌کردنـەوەی (لطیفـە)ی دڵ بـۆ چاک کردنی هەموو ئەندامی لەش، بگرە بۆ هەر شەش لاکە سوودی هەیە، واتـە کاتـێ کـە دڵـی ئینسان نوورانی بوو ئەو نوورە دەبێتە هۆی راکێشانی خێر و بەرەکەت بۆی لە هـەر شـەش لاوە و، نایەڵێ لە هیچ لایەکەوە تاریکی رووی تێ بکات.

بە کورتی چاک‌کردنی دڵ و نوورانی‌بوون بە زیکری خودا دەبێتە هۆی چاک‌بوونی هەر شتێ لە ئینساندا کە پێویستی بە چاک‌بوون هەبێ؛ ئەڵێن کاتێ کە مرۆڤ دڵی نوورانی بوو هەموو گوفتار و رەفتارێکی، هەموو هەڵس‌وکەوتێکی دادەمـەزرێ و، خـوو و رەوشـتە جوانـەکانی گەشـەدەکەن و خووە بەدەکانی کز دەبن، جا کە مرۆڤ وای لێ هـات هـەموو دوژمنێکـی کـز و لاواز بـوو هـەموو دۆستێکی سەرفراز بوو ئەوا دەگاتە بەختیاریی نەبڕاوە.

پاش ئەوە کە لەتیفەی دڵ بە زیکری (الله) نوورانی بوو و (صفا)ی وەرگرت نۆبـەی روونـاکی و پاک بوونەوەی لەتیفەکانی رۆح و سیڕ و خەفی و ئەخفایە.

نەقشبەندییەکان ئەڵێن: جێگەی لەتیفەی رۆح سـەرگۆی مـەمکی راسـتە، بەرامبـەر جێگـەی لەتیفەی دڵ کە سەرگۆی مەمکی چەپـە، هـەروەها لەتیفـەی خـەفی لـە پـاڵ لەتیفـەی رۆحدا و لەتیفەی ئەخفا لە پاڵ لەتیفەی دڵدایە، لەتیفەی سیڕیش لە ناوەڕاستی ئەم لەتائیفانەدایە.

هەر بەمجۆرە موریدەکان بە بڕینی مەرتەبەکانی ئـەزکار بـەو مـەرج و شـێوەیە مورشـیدەکان بۆیان دیاری دەکەن هەر دە لەتیفەکانیان بە تەواوی نوورانی ئەبن، کە هەر دە لەتیفەکـە نـوورانی بوون موریدەکان پایەی (سلطان‌الاذکار) یان دەس ئەکـەوێ و هـەموو ئەنـدامی لەشـیان نـوورانی ئەبێ و بە پایەی (ویلایەتی سوغرا) دەگەن.

ئەو پێنج لەتیفانەی کە باسمان نەکردوون ئەمانەن:

یەکەم: لەتیفەی نەفسە کە لە (جەبهة) ناوچاواندایە، چوارەکەی تر لەتیفەی تەبیعەتن، واتە چوار رەگەزەکە (ئاو، ئاگر، خاک، هەوا).

ئیتر لەسەر ئەم تەرتیبە بەردەوام ئەبن هەتا چەند پلە ئەبڕن و، دەگەنە (فنا فی‌المرشد). جا ئەگەر خودای گەورە یارمەتی دان و لەم پلانە سەرکەوتن ئەوا دەگەنە پایەی (کەمال).

ئەمجا وەک (مەولەوی) دەفەرموێ کە ئەستێرەی (کەمال) لە ئاسۆی بەختیارییەوە سەری دەرهێنا ئیتر ئیمان و ئیسلامی حەقیقی لەگەڵ بارانی نوور و بەرەکەت دەبارێن بەسەر موریدا. کە وای لێ هات پێی دەڵێن (بسم الله) قۆڵت هەڵماڵە دەس بکە بە ئیش‌کردن، نوقمی دەریای خوداپەرستی و (مراقبە) ببە، زۆر باش بزانە کە لەم مەقامەدا (ئان) واتە ئەوکاتەی تۆی تیای بە قەد سەد هەزار ساڵە و، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ڕێڕەوی سەرکەوتوو گەلێ دەست‌کەوتی دەبێ، هەلە و لە کیسی مەدە.

لە لای مـن رەویـەی ئـەم بزورگانـە
ئەمیانە نەک وەک هـیچ کامێکیانـە[٣٠]
کـە رابیتـەی شـێخ تێرنـە نـەزەر
(طـوبی للـذی لـە ذا ظَهَـر)
شێخ هەردوو فەنای هەس بێ‌وەسوەسـە
پـەس بـۆ تـۆ (فنـا فی‌الشیخ)ی بەسـە
دەڵـێی ئیسـتیحزار سـوورەت بەتاڵـە
بەتاڵـە نـوێژ شـەرعیت چەنـد ساڵـە
عـەلاوەی خەلـەل کـاری عوقبـایی
دەشـێ بفـەوتێ کـاری دنیـایی
عولـەمای کامیـل مەزهـەب هـەر چـوار
ئەسـفیای بـزورگ (صـفیّ الاسـرار)
خـۆت شـارەزا وی یـا بـە واسـیتە
لێیـان دەشـنەوی حـەققیی رابیتـە
ئیشـارەیە هـەس لـە مەعییەتـدا

لـــە کیتابـــەدا یـــا لـــە ســـوننەتدا
ئـــەر فامـــت نـــەڕۆ و هـــەر نەیێتـــەوە
چـــاک رابیتـــەی لـــێ دەفامێتـــەوە
خۆلاســـە تـــەریق ئـــەم مەشـــائیخە
فەزلـــی (کالجبـــال) راســـی و شـــامیخە

مەولەوی؛ بە رەحمەت بێ؛ پێش نـەختێ باسـی ئـاداب و رێ و رەوشـتی ئـەولیای تەریقـەتی نەقشبەندی کرد و، فەرمووی: لای ئەمانە زیکری (الله) بە دڵ باوە هـەتا لەتیفـەی دڵ نـوورانی و زاکیر ببێ، هەروەها باسی نوورانی بوونی نۆ لەتیفەکانی تری کـرد. وا لێرەشـدا باسـی (رابیتـە)ی شێخ و مورشید دەکا و دەفەرموێ: لای من لە ناو ئادابـەکانی تەریقـەتی نەقشـبەندیدا (رابیتـە) شتێکی دیاری و بەکەڵکە و سوودی لە هەموویان زیاترە.

رابیتە لە ئیستیلاحی نەقشبەندییەکاندا بریتییە لەوە کە مورید وێنەی مورشیدی پـێگەیشـتوو پێگەیێنی خۆی، بەو شێوەی کە ئەو مورشیدەی فێری کردووە، لە دڵیا حازر ئەکا و داوای مەدەد و فەیز لە بەرەکەتی دەکا. هـەروەها مەولـەوی دەفـەرموێ: خۆشـا بـە حاڵـی ئـەو کەسـەی کـە سوورەتی رابیتەی بۆ دەردەکەوێ. مەشهوور وایە موریدی ئامادە و لێهاتوو بە هۆی بەردەوامبـوون لەسەر ئەم رابیتەیە حاڵێکی کەشفیی وای بۆ پەیدا دەبێ کە سوورەتی مورشـیدەکەی (عینـاً) لـە لای خۆیا دەبینێ و قسەی لەگەڵدا دەکا.

ئەنجا ئەفەرموێ: ئەی موریدی سوودوەرگرتوو لە رابیتەی مورشید! مورشیدەکەت پایەی (فنـا فی‌الرسول) و (فنا فی‌الله)ی هەیە؛ ئەو بە دەوامکردن لەسەر زیکر و فیکری خودا ئەو دوو پایە زۆر بەرزەی دەست کەوتووە، بەڵام تۆ لە سەرەتاوە بە هۆی رابیتـەکردنی شـێخەکەتەوە ئەگـەر هـەر تەنها (فنا فی‌الشیخ) ت دەست بکەوێ بەسە بۆت.

دوای ئەمانە مەولەوی ئاوڕ لەوانە دەداتەوە کە رەخنـەیان لـە رابیتـەکردن گرتـووە و وتوویانـە ئامادە کردنی وێنەی مورشید شتێکی بەتاڵە و دروست نییە، بەڵێ لـە وەڵامـی ئەمانـەدا ئەڵـێت: ئەگەر حازرکردن و ئامادەکردنی وێنە لە دڵدا شتێکی بەتاڵ بێ ئەبێ هەموو نوێژەکانی ئەم چەنـد سالانەت بەتاڵ بن، چونکە لە تەحییاتی هەموو نوێژێکدا جارێ یا دووجار دەڵێیت «السلامُ علیـک أیّها النبیّ و رحمةالله و برکاته» و وێنەی حەزرەت لە دڵتا حازر ئەکەیت.

هەروەها مەولەوی دەڵێت ئەگەر سوورەت ئامادەکردنی مورشید لە دڵدا و پەناپێبردنی، لە ڕێگای (رابطە) یا هەر ڕێگایەکی وەک ئەوەوە بەتاڵ بێت بێجگە تێکچوونی کاری ئینسان لەسەر پەنابەخەڵک بردن و داوای یارمەتی‌کردن لەم و لەو راوەستاوە.

ئاشکرایە کە تۆ داوای کتێبێ لە یەکێ بکەیت داوا لە ئێسقان و گۆشت و پێستە رووتەکەی ناکەی، داوا لە ڕۆحەکەی دەکەیت کە ئەندامەکانی بخاتە کار و کتێبەکەت بداتێ.

لە لایەکی ترەوە تۆ کە داوای یارمەتی دەکەی داوای یارمەتیی کەسبی دەکەی، کابرایش یارمەتی و کۆمەکی کەسبیت دەدا، نە تۆ داوای خەلق و ئیجاد لەو دەکەیت و نە ئەویش ئەتوانێ بێجگە لە (کسب) و (اکتساب) شتێ بۆ تۆ بکات.

مەولەوی بۆ یارمەتی و پشت‌گیریی لە شەرعییەتی رابیتە ئەفەرموێ: لە زانا بەرزەکانی هەر چوار مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و لە ئەولیا بەهرەدارەکان چ (بالذات) و چ (بالواسطە)، واتە راستەوخۆ لە خۆیانەوە یا لە کتێبەکانیانەوە، حەققانییەتی رابیتەتان بۆ روون ئەبێتەوە:

ئەوەتە گەلێ لە (مفسّر) ەکان، تەنانەت زەمەخشەریی خاوەنی تەفسیری (کشاف)، لەگەڵ ئەوەیشدا کە مەیلی ئەهلی ئیعتیزالی هەیە، واتای کەلیمەی (برهان)ی لە ئایەتی پیرۆزی (... لو لا أن رأی برهان ربِّه...)ی لە سوورەتی یووسفدا بەوە لێداوەتەوە کە وێنەی حەزرەتی یەعقووب هاتە بەرچاوی یووسف پەنجەی لێ دەگەزی[۳۱]، ئەوە بوو حەزرەتی یووسف زۆر (متأثر) بوو و قازانجی لێ‌کرد و نەکەوتە گێژاوی گوناهەکەوە.

شێخ (اکمل‌الدین)ی حەنەفی[۳۲] لە شەرحی (مشارق)دا لە لێکدانەوەی مەعنای حەدیسی «من رآنی فی المنام فقد رآنی، فان الشیطان لا یتمثّل بی»[۳۲]دا باسی ئەوە دەکا کە کۆبوونەوە و بەیەک‌گەیشتنی ئینسان لەگەڵ ئەرواحی پێغەمبەران و دۆستانی خوادا بە پێی ئەندازەی پاکی و نوورانییەتی و هێزی رۆحیی ئەو ئینسانەیە.

شێخ ئیبنوحەجەری هەیسەمی لە دوادوایی شەرحی کتێبی (شمائل)دا دەگێڕێتەوە کە جارێ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس(ر.خ) لە خەودا بە خزمەت حەزرەت گەیشت، کە بەیانی لە خەو هەستا و تەماشای ئاوێنەی کرد وێنەی حەزرەتی پێغەمبەری لە ئاوێنەکەدا چاوپێ‌کەوت نەک سوورەتی خۆی، سۆفییەکان بەمجۆرە حالاتە ئەڵێن (فنا فی الرابطة).

ئیمامی شەعرانی[۳۳] (ر.خ) لە کتێبی (النفحات القدسیة)دا دەفەرموێ: لە ئادابی تەریقەیە کە مورید بە خەیاڵ شەخسی مورشیدەکەی لە بەرچاوی خۆیدا رابگرێ.

هـەروەها لـە پێشـەوایانی ڕێبـازی حەنبـەلی حـەزرەتی شـێخ (عبـدالقادر)ی گـەیلانی(ر.خ) فەرموویەتی ڕێڕەوی ڕێبازی قەوم ـ مەبەستی سۆفییەکانە ـ پێویستە (رابطە) یەکی قەلبی هـەبێ و، بە هۆی ئەو (رابطە) وە سوود لە نووری مورشیدەکەی وەربگرێ؛ چونکە هەر موریـدێ رابیتـەی قەلبی لەگەڵ مورشیدەکەیدا نـەبێ سـوودی لـێ وەرنـاگرێ، ئـەم فەرموودەیـە شـێخ عوعـەمری سوهرەوەردی، لە بەشی هەڵس‌وکەوت و ئادابی مورید لەگەڵ شێخەکەیدا لە حەزرەتی غەوسـەوە نەقلی کردووە.

شێخ خەلیل[٣٤] کە یەکێکە لە زانایانی ڕێبازی مالیکی، دەفەرموێ: کـە وەلیـی لـە ویلایـەتدا پێی دامەزرا و جێی خۆی خۆش کرد دەتوانێ ڕۆحی خـۆی لـە چەنـد شـێوەدا دەربخـات. هـیچ کۆسپێ لە ڕێگای ئەم کارەدا نییە چونکە ئەو حەقیقەتی ڕۆحە، با یەکێک بـێ، ئـەتوانێ لـە چەنـد شێوەدا دەربکەوێ.

هەروەها مەولەوی دەفەرموێ لە ئایەتی پیرۆزی (یـا أیهـا الـذین آمنـوا اتقـوا الله و کونـوا مـع الصادقین)[٣٥] و، لە فەرموودەی شیرینی حەزرەتی پێغەمبەردا «المرء مع من أحَـبّ»[٣٦] ئیشـارە هەیە بۆ پێویستیی هاوڕێیەتی و لەگەڵدابوونی ڕاستگۆیان و پیاوچاکان، ئەگەر ئینسان هۆشـی لای خۆی بمێنێ و نەڕوات و مێشکی بەجێ بێڵـێت، لـەو ئیشـارانەوە رابیتـەی مورشـید وەردەگـرێ، چونکە بوون لەگەڵ ڕاستگۆیاندا ئەگەرچی مەعنا ئاشکراکەی بوونی ماددییە، بەلام هەق وایـە ئـەو بوونە بە بوونی ڕۆحی و مەعنەوی لێک بدرێتەوە، بێ‌گومان ئەگەر هـەزار سـاڵ بـە لـەش لەگـەڵ یەکێکدا بی تەنها تاقە سەعاتێ ناهێنێ کـە لەگـەڵ خـۆش‌ویسـتن و دڵسـۆزیدا بـە ڕۆح لەگـەڵ ڕۆحیدا بیت.

پوختەی قسە: ئەم دۆستە بەڕێز و بەنرخانەی خودای گەورە، گەورەییان و پایەبـەرزییان وەک چیای بەرزی دامەزراو دیارییە، بە تایبەتی بۆ یەکێ کە (تانە) سەرچاوی نەگرتبێ.

بـۆچ ئـەم تەریقــە هــەس بــەم تەریقــە؟
چونکــە نیســـبەت و حاڵـــی ســـیددیقە
نیســـبەت و حاڵـــەت (أفضـــل الامثـــال)
(أفضَـــلُ النَّسَـــب أفضـــل الأحـــوال)
ئـــەرچی شـــەریکن ئەســـحابی کـــیرام
(فـــی الفـــیض العـــامْ مـــن خیـــر الانـــام)

(لکـــن فـــی الفـــیض الخـــاص المحـــوّل
کلّهـــم مریـــد) خەلیفـــەی ئـــەووەل
(و هـــو ظـــاهراً باطنـــاً مُطـــاع
علـــی کلّهـــم لـــه اتّبـــاع)
(و مـــن نـــاره کُـــلٌّ مقتـــبس
و مـــن نـــوره کـــلٌّ ملـــتَمِس)
تەســدیق بەرزەخـــە (بـــین الطـــرفین)
هەر یەک لە جێی خۆی (کُلّ مـن الوصـفین)
روتبـــەی فـــاررووقی مائیـــل بـــە فەرقـــە
لـــە شـــهوودی شـــەرع شـــەریفدا غەرقـــە
ئەگـــەر دەبـــینی (بعـــد النبیّـــین)
روتبـەی سـیددیقین شـوهەدا بـبین[۳۷]
مـوددەی سـێیەمیچ، تـا ئـەکثـەری چـوو
ویلایـــەت هـــەر بـــەرگ نبـــووەتی بـــوو
ئیمجـار نوانـدنی کـەمێ گۆشـەی عـەین
مەرتەبـەی سـێیەم بـوو بـە (ذی النـورین)
چون لە چارەمدا جێی گرت، خـۆر دوسـتوور،
بـێپـەردە، عالـەم کـرد وە دەریـای نـوور
قـەوابیل[۳۸] یـەکیـەک هـات وەبـەرەوە
هـــەرچیهـــەرچی بـــوو دایـــە دەرەوە
فەسلێ سەوزە و گوڵ، یەک زەردی و مەلاڵ،
لـە یەمـەن عـەقیق، لـە بەدەخشـان لال.
سەلای[۳۹] «سلونی» خست ئـەو فەلـەک داد
(زدنـی) زیـاد کـرد (کُمیـل)ی (زیـاد) [۴۰]

ویلایـــەت پـــەردەی نـــەکرد ریعایـــەت
بـــۆ وە ناونریـــا (بـــاب الولایـــت) [٤١]
زاهیر بوو تـەریق سـیددیقی وەک خـۆی[٤٢]،
عـالی و پرمـەغزە، بـۆچی پـووچ دەکـەی؟

خۆر دوستوور: وەک خۆر. هەرچی: هەرشت، هەرکەس. هەرچی بوو: هەرچی لـە بـارەدا بـوو، هەر شـتێکی هـەبوو. دایـە دەرەوە: دەریدا، دەری خسـت. بەدەخشـان: ولاتێکـە لـە مابـەینی هیندوستان و خوراساندا بە لەعلی نایاب بەناوبانگ بووە. لال = لەعل: بەردێکی بەنرخە. بۆ وە: بـۆ ئەوە. لەبەر ئەوە.

واتە: ئەگەر ئەپرسی بۆچی ئەم تەریقەی سیددیقە ئەوندە بایەخدار و بـە نرخـە؛ دەڵـێم لەبـەر ئەوەیە ئەم تەریقەیە نیسبەت و ئەحواڵی حەزرەتی ئەبووبەکری سیددیقە، ئەم پیاوە پایەبەرزەیش گەورەترین هاوڕێی پێغەمبەر بووە(د.خ ) دیارە نیسبەت و حاڵـی چـاکـتـرین هـاوڕێی پێغەمبـەر چاکترین نیسبەت و حاڵە.

جا ئەگەر بڵێیت هاوڕێکانی پێغەمبەر(د.خ) هەموو لەم هاوڕێیەتییـەدا هاوبەشـن و وەک یـەک شەرەفیاب بوون، ئیتر بەڵگەت چییە بۆ ئەم جیاوازییە؟ ئەڵێم راستە هەموو هاوڕێکـانی پێغەمبـەر لە هاوڕێیەتی و بەرەکەتە گشتییەکاندا بێجیـاوازین، بـەڵام جیاوازییـان لـە بەرەکـەتی تایبەتیـدا هەیـە، کـە ئـەنجامی زیـادە دڵسـۆزی و زیـادە پێوەنـدی و زیـادە بەهرەدارییـە، ئـەی نـازانن حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی «ما رَجَحَ أبوبكر عليكم بكثرة صلاته و صومه، و انما رجـح بشـیء وقـر في صدره» واتە: ئەبووبەکر بە زۆریی نوێژ و رۆژووی لە ئێوەی نەبردووەتەوە، بەڵکو بە شتێ لێتـان پێش کەوتووە کە لە سینگیا جێگیر بووە.

هەر لەبەر ئەم خوسووسییەتە بوو کە بوو بە خەلیفە و جێنشینی یەکەمی پێغەمبـەر(د.خ)، جـا کە هەموو هاوڕێکانی پێغەمبەر بەیعەتیان پێکرد و بـە گـەورەی خۆیانیـان حسـێب کـرد و رازی بوون کە ببێتە جێنشینی حەزرەتی پێغەمبەر، هەموو بوونە موریدی و لە فەرمانی دەرنەدەچوون، هەموو لە ئـاگری حـەز و خواسـتی ئەبووبـەکرەوە دەسـتەچیلەیان وەرگـرت و، لـە نـووری دڵـی موبارەکی ئەو سوودیان وەرگرت.

بە راستی باوەڕت ببێ کە ئەبووبەکری سیددیق؛ خوای لێ رازی بێ؛ بەرزەخ بوو لـە بـۆ نـووری نبووەت و نووری ویلایەت، واتە لە سەردەمی جێنشینیی ئەودا هەیبەتی نـووری پێغەمبەرایـەتیی حەزرەت(د.خ) و هیمەتی نووری ویلایەتی ئەبووبـەکر دیـاری و ئاشـکرا بـوون، هـەردوو دیـاری بوون. کە رۆژی جێنشینیی عومەری فارووق هاتە پێشەوە فـەرق پەیـدا بـوو لـە نێـوان ئـەم دوو نوورەدا، واتە حەزرەتی عومەر زیاتر مەیلی بوو بۆ برەوپێدانی حوکمی زاهیری شـەریعەت لـە ژێـر پەردەی پێغەمبەرایەتیی حەزرەتدا. بەشـی زۆری مـاوەی جـێنشـینیی خەلیفـەی سـێهەمیش نووری ویلایەت هەر لە بەرگی هەیبەتی نووری نبووەتـدا خـۆی دەنوانـد. بـەلام دوایـی ویلایـەت کەمێ گۆشەی چاوی نواند و لە بـاقیمەنـدەی خیلافەتەکـەیدا دوو نـووری نبـووەت و ویلایـەت دەرکەوتن، پیاوە گەورەکان زۆرتر بۆ هەیبەتی نووری نبووەتیان دەڕوانی و خەلکیتر هەبوون کـە وا نەبوون.

لە سەردەمی جێنشینیی خەلیفەی چوارەمدا ویلایـەت وەک خـۆر بـە ناوەڕاسـتی ئاسمانـەوە خۆی نواند، دەوری حەزرەتی عەلی هاتـە پێشـەوە، چینـە پێشـووەکان نـەمان، پـەردەی نـووری پێغەمبەرایەتی هەلگیرا، نۆبەی ویلایەت هاتە پێشەوە و جیهانی پڕ کرد لە نوور. باری چەرخ گـۆڕا و هەر مادەیەک و هەر شەخسێ چی پێ بوو، چی لەبارەدا بـوو دەریخسـت و، وەک چـۆن هـەر زەمانێ و هەر وەرزێ جۆرە شتێکی تیا دەبێ؛ وەرزی بەهار گولە و گولزار و چیمەن و مێرغـوزارە، هاوین وەرزی کۆکردنەوەی بەرهەمی کشت و کالە، ولاتێ شوێنی عەقیقە وەک یەمەن، ولاتێکی-تر شوێنی دوڕی درەخشانە وەک بەدەخشـان، ئـەو سـەردەمەی حـەزرەتی عـەلیش سـەردەمی سەرهەلدان و پەرەسەندنی هەندێ شت بوو کە لـە سـەردەمی حـەزرەتی ئەبووبـەکر و عومـەردا نەبوون.

ئیتر ئەوە بوو حەزرەتی عەلی (کرّمالله وجهه) بەگوێرەی رۆژ و شوێن و بە قەدەر توانـا دەسـتی کرد بە خزمەتکردنی موسولمانان بە نووری ویلایەت و، کەوتە بلاوکردنەوەی ئامۆژگـاری لـە نـاو موسولماناندا، ئاوازی (سلونی) حەزرەتی عەلیی ئەگەیشتە ئاسمان و کومەیلی کوڕی زیـادیش کـە کاتبی بوو هەموو کات دەیوت: (زدنی، زدنی) بۆ وەرگرتنی زیـادە مـەعلوومات. دیـارە حـەزرەتی عەلی هەستی بە لێپرساوی کردووە بۆیە بە خەلکی فەرمووە چیتان هەیە، چی لە دلتانایە، لـێم بپرسن پێش ئەوەی بمرم و لە ناوتاندا نەمێنم، کومـەیلیش کـە بـە تـەنگ ئـەوەوە بـووە هـەموو ئامۆژگارییەکانی هەلبگرێ هەر داوای زیاتری لێ دەکرد.

بەڵێ لەم ڕۆژەدا ویلایەت پـەردەی لەسـەر خـۆی لادا و خـۆی بـە تـەواوی دەرخسـت؛ بۆیـە حەزرەتی عەلی ناونراوە بە (باب الولایة).

ئادابی ویلایەت لە حەزرەتی عەلییەوە گەیشتە حەزرەتی حەسـەنی بەسـەری و لەویشـەوە بـە جیهان‌دا بلاوبووەوە.

هەروەها لە کاتی خۆیدا حەزرەتی سەلمانی فارسیش ئادابی تایبەتی لە حەزرەتی ئەبووبەکرەوە وەرگرتبوو، چ بە زمان و چ بە هێزی هاوڕێیەتی و کاری گیانی.

سیلسـیلەی ریجـال ئـەم شـیمەی پاکـە
لایـق وەگـەردن[٤٣] شـێری بـێ‌باکـە
قەفقـەف هـات وەک ڕم تـا شـیری هینـدی
قـد قَـدْ قَـدْ کُـلٍّ (لـی)، (عِنـدی)
هەرکەس خەستەی زەهر گەستەی (هەوا) بوو
فـارووقی توریـاک بـۆ ئـەو دەوا بـوو
لـە فـەیزی قـەدیم لـوتفی ڕەببـانی
بـوو بـە موجەددیـد بـۆ ئـەلفی سـانی
خـەبیس لـە تـەییب بـەو کریـا تـەمیز
(قـدَّسَ الله سِـرَّهُ العزیـز)
موحتـاج بـە ئـەلفیت[٤٤] ئـەر نـەوی عـاتی
ئـەر عەشـەراتیت[٤٥] ئەگـەر میئـاتی
ئەگـەرچی دیجلـەی بەغـدادی ئیرشـاد
(منبـعُ الانهـار) مەزرەعـەی عیبـاد
مـەئوای نیسـبەتەین بـێ شـەینی سـیبتەین
غـەوس و شـاهباز سـاحیب جەناحـەین
مـەرجیعی فتـووح پەیـدا و نیهـانی
(الله أرضـاهُ بالرِضـا المبـین
أولاهُ الإلـه إلاهُ، آمـین)

فیـــووزات یەکســـەر ئـــەر زۆرە و ئـــەر کـــەم
تـــەمام لـــە خدمـــەت ئـــەودا دەوێ جـــەم
لاکـــــین موجەددیـــــد نـــــائیبی ئـــــەوە
وەکیلــــــی (ذو رأی) ســـــــائیبی ئـــــەوە
هـــەرچی کـــە وتمـــان جـــەم بووگـــە لـــەوێ
تەســـلیم بـــە ســـەرکار موجەددیـــد دەوێ
لەســـەر هـــەر شـــیمە و شـــێوەیە کـــە هـــەی
چـــار نییـــە دەشـــێ بـــەو تەشـــەببوس کـــەی
چونکـــــە وەکیلـــــی ئـــــەوەو نائیبـــــە
لـــــە نائیـــــب غائیـــــب ئەڵـــــبەت خائیبـــــە
بـــا بێینـــە ســـێوەر ئـــەم هـــەردوو هومـــا
(رَضِـــــــی الله الهـــــــادی عنهمـــــــا)

قَد: بە راستی. قَدّ: دوو لەتی کرد. قَدّ: بالا، قامەت. لی: هەمە. عندی: لامە. واتە: کار و بـاری نهێنی و رۆحی. هەوا: هوی، مەیل، خۆشەویستی. الاءُ: نِعَمهُ. جەم: کۆ. سێوەر: سێبەر.

واتە: زنجیرەی ئەم رەوشتە پاکە شایانی گەردنی شێری بێباکە، شـێرێ کـە خـاوەنی هێـزی گیانی بێ، شێرێ کە مەشرەبی قودسی بێ، شێرێ کە لەسـەر رەوشـت و رێ و شـوێنی فـەخری عالەم(د.خ) تەمێ و تەربیەی وەرگرتبێ.

ئەم زەنجیرە قەفقەف وەکوو رمی کاریگەر و نیشان پێک بێپچڕان یەک لە دوای یـەک هـات هەتا گەیشتە شێری بێشەی خواناسی و مـەردی مەیـدانی لـەخواترسـی و تازەکـەرەوەی ئـایینی ئیسلام، شمشێری بڕندەی هیندی حەزرەتی شێخ ئەحمەدی فارووقیی سەر هیندی (مجددّ الالف الثانی المشهور بالامام الربانیّ، قدّس سرّه العزیز [۹۷۱ ـ ۱۰۳۴ هـ]) ئەم زاتە فارووقیی نەسەبە کە رەوشتی حەزرەتی ئەبووبەکری سیددیقی پەیڕەو دەکرد، ئەم زاتـە گـەورە خواناسـە قامـەتی ئـەو درۆزنانەی لەت دەکرد کە بە گەزاف و خۆهەڵنان بیانوتایە ئێمە خاوەن بەهرەین و شت ئـەزانین و نهێنیمان لایە. دەستی کرد بە رێپیشاندانی خەڵـک و تیمـارکردنی دڵـی برینـدار. هەرکـەس خەستە و نەخۆشی ژاری ماری نەفسی ئەممارە بوایە توریاقی تەوەججوهـ و رووتێکردنی فـارووقی بۆی ئەبووە دەرمان و چاکی دەکردەوە.

ئەم زاتە لەخوداترسە لە میهرەبانی خودای گەورەوە بوو بــە تازەکــەرەوەی ئــایینی ئیســلام بــۆ هەزاری دووەمی مێژووی کۆچی. بە جۆش و خرۆشی کوورەی دڵی پڕ ئیمــان و نــوورانی خــووی بەد و ئارەزووپەرستی لە دڵ و دەروونی خەڵکی سروشتپــاک دوور خســتەوە و، تێــی‌گەیانــدن و پێی‌گەیاندن و، ئینسانی بەدخووی لە ئینسانی پاک و خاوێن جیاکردەوە.

تۆیش ئەی موریدی خواناسی حەز لە رووناکی کردوو لە دواکەوتنی رێ و شــوێنی ئــەم مــەردە مەزنە نوورانییە ئایین تازەکەرەوە سەرپێچی مەکە. تۆ ئەگەر خۆت بە زل نەزانی و لە خــۆت بــایی نەبی، چ لە دەیان بی و چ لە سەدان موحتاجیت بە هەزار. بــێ‌گومــان نــەزان موحتــاجی زانایــە و بێگانە موحتاجی ئاشنایە و (و فَوقَ کُلِّ ذی عِلم عَلیم) [٤٦].

جا لەبەرئەوە لەم شــوێنەدا لەوانەیــە یــەکێ رەخنــە بگــرێ و بڵــێت وا مەشــهوورە کــە پایــەی قوتبییەتی ئیرشاد بە ئەسالەت لە یەکەیەکەی ئیمامانی ئال و بەیتەوە هاتووەتە خــوار تــا ئیمــامی یازدەهەم و، لە پاش ئەو بە وەکالەت بووە تا زەمانی حەزرەتی عەبــدولقادری گــەیلانی ئیتــر ئــەم بووەتە قوتب بە ئەسالەت، لەپاش ئەویش دیسانەوە قوتبییــەت بــە وەکالــەت دەبــێ هــەتا هــاتنی حەزرەتی موحەممەدی مەهدی، کەوابێ چۆن تۆ مەرجیعییەتت بــۆ حــەزرەتی ئیمــامی رەببــانی بڕیاردا؟

مەولەوی وەڵامی ئەم رەخنە دەداتەوە و دەڵێت: ئەگەرچی ئەو زاتە کە دیجلەی ئیرشــادە لــەد بەغدا و لقێکە لە دەریای نبووەت و ریسالەت و مەشهوورە بە (غوث الثقلین) و سەرچاوەی هــەموو ئەو رووبارە گەورانەیە کە بۆ کشــت و کاڵــی خوداپەرســتی راکێشــراون، خــاوەنی دوو نیســبەت و پێوەندی بێ‌خەوشە، واتە لە رشتەی باوکیەوە دەڕواتەوە سەر حــەزرەتی حەســەن و لــە دایکــەوە دەچێتەوە ســەر حــەزرەتی حســێن (ر.خ)، بەڵــێ ئەگــەرچی حــەزرەتی عەبــدولقادری گــەیلانی مەرجیعی فتووحاتی ئەولیای جیهانە و فیووزاتی رۆحییە زۆر یا کەم لای ئەو کۆ دەبێتــەوە، بــەڵام ئیمامی رەببانی موجەددیدی ئەلفی سانی نائیب و جێگەداری ئەوە و لە ئیرشادی خەڵکا وەکیلــی ئەو بووە و هەرچی لە خزمەتی حەزرەتی غەوسی گەیلانیدا کۆ بووەتەوە دراوەتە دەستی ئیمــامی رەببانی، ئیتر تۆ لەسەر هەر شێوەیەک بی بە ناچاری دەبێ دەســت بــە پشــتێنیا بکــەی؛ چونکــە وەکیل و جێ‌نشینی غەوسە و هەرکەس لەگەڵ جێگری ئەودا سەر و ساختی نەبێ زەرەر دەکــات و هەناسەساردە.

کەواتە با بێینە ژێر سێبەری ئەم دوو (هوما) پیرۆزە بەڵکو بەو سایە بگەین بە پایە و مایە و بتوانین خزمەتی ئایینی ئیسلام بکەین. وا مەشهوورە ئەم باڵداری (هوما)یە سێبەر لەسەر هەر کەس بکات ئەبێتە پادشا (و الله قدیر یحکم ما یرید و یفعل ما یشاء، و یختصّ برحمتهِ من یشاء، والله ذوالفضل العظیم).

زانای گەورە موحەممەدی کوڕی یەحیای حەڵەبی، کە لە (۹٦۳)ی کۆچیدا وەفاتی کردووە لە کتێبەکەیدا کە ناوی (قلائد الجواهر)ە بەم جۆرە باسی رشتەی باوپیرانی حەزرەتی غەوس ئەکات:

«هو سیدنا شیخ‌الاسلام، مقتدی‌الاولیاء العظام، علم الهدی، الذی من انتمی الیه کان من السعداء، القطب الربّانیّ والفرد الجامع الصَّمَدانی، ذوالأصل الطاهر، محی‌الدین أبو محمد عبدالقادر بن أبی صالح جەنگی‌دوست موسی بن ابی عبدالله بن یحیی‌الزاهد بن محمد بن داوود بن موسی بن عبدالله بن موسی الجون بن عبدالله المحض (و ینعت بالمجلّ اخذه من الاجلال) بن الحسن المثنی بن امیرالمؤمنین ابی محمد الحسن بن أمیرالمؤمنین علیّ، رضی‌الله تعالی عنه و عنهم. و امِّه ام‌الخیر امة الجبار فاطمة بنت الشیخ عبدالله الصومعی الحسینی الزاهد، رحمةالله علیهم اجمعین. و هو ابن الإمام أبی جمال‌الدین السید محمد بن الإمام السید محمود بن الإمام السید ابی العطا عبدالله بن الإمام السید کمال‌الدین عیسی بن الامام السید ابی علاءالدین محمد الجواد، رضی الله تعالی عنه، ابن الإمام الهمام علیّ الرضا، رضی الله تعالی عنه، ابن الإمام الهمام موسی الکاظم، رضی الله تعالی عنه، ابن الإمام جعفر الصادق، رضی الله تعالی عنه، ابن الإمام الهمام محمد الباقر، رضی الله تعالی عنه، ابن الإمام الهمام علی زین‌العابدین، رضی الله تعالی عنه، ابن الإمام الهمام ابی عبدالله الحسین، رضی الله تعالی عنه و أرضاه.

و لسیدنا عبدالقادر، رضی الله تعالی عنه، اتصال بسیدنا ابی بکر الصدیق من جهة ام أبیه السیدّة ام سلمة. و له اتصال بسیدنا عمر الفاروق و بسیدنا عثمان ذی‌النورین من قبل أمهات اجدادهِ رحمهم الله تعالی...»

(نامی) لەم جێدا بۆ وەسڵی ئیسناد
چەن کەس ناو ئەبا لە ئەهلی ئیرشاد
لە (فاروقی) وە واسڵ بوو مەعلووم
بۆ نەجلی ئەرشەد (محمد معصوم)

لـەوێ هاتــە خــوار بــۆ تــەرویجی دیــن
دای لە دەروونی خواجە (سـیفالـدین)
ئــەمجار هاتــە خــوار زۆر بــە جــوانی
بــــۆ (نــــور محمّــــد اَلبَــــدَوانی)
لــەوەوە گەیشــت بــە جــانی جانــان
(حبیــــب الله مظهــــر الاحســـــان)
جــا گەیشــتە دڵ پــیری عەلــەوی
(عبــــدالله غـــلام علــــی دِهلَــــوی)
لـەوەوە هێنـای پایـەی عـیلم و عـەین
(مولانــا خالــد) شــای (ذو الجنــاحَین)
لــە (مولانــا) وە خەزانــەی ئــەمان
تەسلیم بوو بە دەس حەزرەتی عوسمـان

***

١ـ ئەم عینوانە لە نوسخە دەستنووسەکەدا نییە.

٢ـ ئایەتی (١٠٣) لە سوورەتی (آل عمران).

٣ـ ئایەتی (١٠٥) لە سوورەتی (آل عمران).

٤ـ وَ لمّا بَعَثَ النبیُّ(ص) مُعَاذاً إلی الیمنِ قال لَهُ: کیفَ تقضی؟ قالَ: أقضی بما فی کتابالله. قال: فإن لم یکن فی کتابالله؟ قال: فبِسُنّةِ رسولِالله(ص). قال فإن لم یکُن فی سُنّةِ رسولالله(ص)؟ قال: أجتهدُ برأیی. قـال: الحمـد لله الذی وَفّقَ رسولَ رسولِالله(ص). رواهُ الترمذی و أبوداوود. التاج الجامع للاصول، الجزء الثالث، ص ۶۶

٥ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٦ـ (سفیان ثَوری) لە هۆزی (بنی ثور)ی کوڕی (عبد مناة) کە لە خێڵی (مضر)ە (٩٧ـ١٦١)ی کۆچی.

٧ـ سوفیانی کوڕی عویەینە (١٠٧ـ ١٩٨)ی کۆچی پیـاوێکی بـڕواپێکـراو و حـەدیسلەبـەر و یەکێکـە لـە زانـا گەورەکانی عیلمی حەدیس.

٨ـ (عبدالرحمن)ی ئەوزاعی یەکێکە لە پێشەواکانی فیقهی ئیسلام (٧٠٧)ی زایینیی لە بەعلەبەک لە دایک بـووە و (٧٧٤)ی زایینی وەفاتی کردووە.

٩ـ داوودی کوڕی خەلەفی ئەسفەهانی خاوەنی ڕێبازی (ظاهریە) یە، لە شاری کووفە ساڵی (٨١٥)ی زایینی لـە دایک بووە، لە بەغدا پێگەیشتووە، لە کووفە و بەسرە خوێندوویەتی، ساڵی (٨٨٣)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە.

۱۰ـ ئەم بەیتە تەنها لە دەستنووسەکەدا هەیە، لە چاپەکەدا نییە.

۱۱ـ ئەگەرچی ئەم بەیتەی مەولەوی تەئویل هەڵئەگرێ و ئەتوانرێ بە جۆرێ مەعنای لێ بدرێتەوە کە لەگەڵ ڕاستەڕێی ئایینیدا بگونجێ، بەلام هەر خالی نییە لە زیادەڕەوی.

خۆی لە بناخەدا وەلی بۆیە وەلییە بە دڵ و گیان پەیڕەوی نەبییە و دڵسۆزی ئایینەکەیەتی و نوقمی دەریای لەخواترسانە. وەلیی بە ڕەفتار و بە کردار خەڵک بانگ ئەکات بۆ خواپەرستی، بۆ خۆشویستنی پێغەمبەری ئەمین و بۆ پەیڕەوکردنی، خۆی بە بچووکترین دڵسۆزی پێغەمبەر ئەزانێ. وەلی هەرگیز داوای نەکردووە و، ڕەوایش نییە داوا بکات، کەس بەم ڕادە هەڵیدا. بۆ پایەبەرزیی وەلی ئەوەندە بەسە کە لەخواترسە و لە تیشکی ئایینی بەرزی پێغەمبەر ڕووناکی وەرگرتووە و بەو ڕێگایەدا دەڕوا کە ئەو ڕەنگی ڕشتووە. بۆیە دەرگای تەعبیری وەها نەکرێتەوە باشە، ئەگینا زانا لەخواترسەکانیش ئایەتی پڕمەعنای وەک (إنمّا یخشی الله من عبادِه العلماء) و ئەسەری مەشهووری وەک «العلماء ورثة الانبیاء» و «علماء امتی کانبیاء بنی اسرائیل» دەرهەقیان هاتووە، کەواتە هەموو زانایەکی لەخواترس و ڕێپیشاندەر بۆ کۆمەڵەکەی وەک پێغەمبەرە بۆ ئوممەتەکەی.

۱۲ـ ئەبێ ئەم ئیجتیهادە جۆرە ئیجتیهادێکی تایبەتی بێ، ئەگینا ئیجتیهاد لە ئیستیلاحی عیلمی ئوسوولی فیقهدا ئەوەیە زانا چی لە توانادایە بە کاری بێنێ بۆ ئەوە (ظنّ) پەیدا بکا بە حوکمێکی شەرعی. بێجگە ئەمە لە شەریعەتدا شتێ نییە ناوی ئیجتیهاد بێ.

۱۳ـ لام وایە (خواجە) لە (خوداجۆ) وە هاتووە، واتە: ئەوەی خودای دەوێ، دوایی لە بەکارهێناندا مەعنای فراوانتر کراوە.

۱٤ـ ئایەتی (٤) سوورەتی (حدید).

۱۵ـ ئایەتی (١٦) سوورەتی (ق).

۱٦ـ ئایەتی (٢٨) سوورەتی (کهف).

۱۷ـ ئایەتی (١٤) سوورەتی (فجر).

۱۸ـ ئایەتی (٩٩) سوورەتی (حجر).

۱۹ـ ئایەتی (٣) سوورەتی (مائدە).

۲۰ـ ئایەتی (٥٦) سوورەتی (ذاریات).

۲۱ـ ئایەتی (٢٨٢) سوورەتی (بقرە).

۲۲ـ لەبارەی ئەم حەدیسەوە تەنها ئەوەندە ئەتوانین کە بگەڕێینەوە بۆ سەر دوو شیعری مەولەوی خۆی کە لەمەوپێش لە باسی مەدحی ئەبووبەکردا وتی:

(روح القدس) هەرچی لەو عەرز و توولدا
ڕژاندی بە دڵ پاکی ڕەسوولدا
لە خۆی هەردوو دەس مەرحەمەت بەردا
پێچ پێچ خیگەی فەیز پێچ دا لەسەردا

لە شەرحەکەیشدا باسی ئەوە کراوە کە ئەم بەرەکەتە و ئەم یارمەتی و دڵ قایمکردنە لە سەفەرەکەی هیجرەتی حەزرەتدا بووە لە مەککەوە بۆ مەدینە.

گومان لەوەدا نییە ئەگەر هەروەها بە عومووم سەیری مەعنای (ما صبّنی... الخ) بکەین زیادەڕەوییەکی زۆری تیا دەبینین؛ چونکە پێغەمبەر(د.خ) پێغەمبەرە و پایەیەکی تایبەتی هەیە، ئەبووبەکریش (ر.خ) یەکێکە لە پەیڕەوە هەرە دیارییەکانی و پایەی خۆی هەیە، بەڵام کە شتەکە بە سەفەری کۆچەوە ببەسترێتەوە نەختێ قورسایەتی زیادەڕەوییەکە سووک دەکات؛ چونکە ماوەکەی کەمە و، مەبەستەکەیش دیارییە.

٢٣ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا نووسراوە: «جمعا کائنٍ و بائن» واتە: (کائنة) جەمعی (کائن)ە و (بائة) جەمعی (بائن)ە.

٢٤ـ کۆکردنەوەی (ابن حجر) و بەرد جوانە و، بە دیمەن تەناسوبە.

٢٥ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لە ژێر رستەی (دلیت)دا نووسراوە: (میگوید) واتە: دەڵێت. لەسەر (ی)ی (باطنیّە) یش شەددە دانراوە. لەسەر بنەمای ئەم پەراوێزە مەعنای بەیتەکە بەو جۆرە لێدراوەتەوە کە لە شەرحەکەدا نووسراوە.

٢٦ـ ئەم بە راوردکردنە لە نێوان مورید و مورشید لە لایەک و، حەزرەتی پێغەمبەر و هاورێکانیدا لە لایەکی ترەوە خاڵی نییە لە موبالەغە و زیادەڕەوی.

٢٧ـ لە پەراوێزی نوسخە چاپەکەدا وەک لێکدانەوەیەکی واتای (کانە) و (بانە) ئەم شیعرە فارسییە نووسراوە:

«دل بحق، تن بغیر حق کائن
تن ز حق، دل ز غیر حق بائن»

واتە:

«دڵ لای خوایە، لەش لای شتی تر
لەش لە خوا جیا، دڵ لە شتی تر»

٢٨ـ ئەبێ هەمزەی وەسڵی (ألخفی) بخوێنرێتەوە؛ ئەگینا نیوە شیعرەکە لەنگ دەبێ.

٢٩ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لەسەر کەلیمەی (کەل) نووسراوە: «بکاف فارسی و کاف عربی بهردو معنیش خوب است». واتە بە کافی فارسی کە دەبێتە (گەڵ) و بە کافی عەرەبی کە دەبێتە (کەل) واتە: شاخ مەعنای دێت و بەجێیە.

٣٠ـ لە چاپەکەدا (هیچ کامیانە) یە.

٣١ـ پەنجەلێ‌گەستن: وەک هەڕەشە کردن، ئاگادار کردنەوەیە، لێرەدا واتە: نەکەی تووش بی، ئاگات لە خۆت بێ.

٣٢ـ البابرتی الحنفی الدمشقی شیخ الخانقاه الشیخونیة (٧١٠ـ ٧٨٦) هـ مسلم بن الحجاج، صحیح مسلم بشرح النووی، المطبعة المصریة و مکتبتها ١٣٤٩ هـ الجزء ١٤، ص ٢٤.

٣٣ـ ابو المواهب عبدالوهاب بن احمد الشافعی المصری المشهور بالشعرانی او الشعراوی وفاته (٩٧٣) هـ

٣٤ـ خليل بن إسحق بن موسى بن شعيب المعروف بالجندي ضياءالدين ابوالمودة المالكي المصري وفاته (٩٧٣) هـ

٣٥ـ ئایەتی (١١٩) سوورەتی (توبه).

٣٦ـ بروانه: (مسلم بن الحجاج، صحيح مسلم بشرح النووي، المطبعة المصرية و مكتبتها، ١٣٤٩، الجزء السادس عشر) ل ١٨٦.

٣٧ـ وابزانم ئیشارەیە بۆ ئایەتی (٦٩) لە سوورەتی (نساء) کە دەفەرموێ: (وَ مَن يُطِعِ اللهَ وَ الرَّسُولَ فَأولئِكَ مَعَ الّذينَ أنعَمَ اللهُ عَلَيهِم مِنَ النَّبِيِّينَ وَ الصدِّيقينَ وَالشُّهَداء وَالصَّالِحينَ وَ حَسُنَ أولئِكَ رَفيقاً).

ئەیەوێ بڵێت ئەوانە کە خودای گەورە ناز و نیعمەتی میهرەبانیی خۆی بەسەرا باراندوون، پاش پێغەمبەران(د.خ) سیددیقەکانن کە ئەبووبەکر سەرقافلەیانە، هەروەها شەهیدەکانی ڕێگای ڕاستی و خوداپەرستین وەک عومەر و عوسمان و عەلی.

٣٨ـ «قوابل» جەمعی «قابلة»ە، واتە: مامان، ئەڵبەت مەبەستی سالانی یەکلەدوایەکی ئەو سەردەمەیە. ڕستەی «دایە دەرەوە» لەگەڵ ماماندا ئەگونجێ.

٣٩ـ سەلا: بانگەواز. داد: فغان و هاوار. سەلای (سلّونی) خست ئەو فەلەک داد: سەلای (سلّونی) داد و فغانی خستە فەلەک. مەبەستی ئەوەیە ڕستەی (سلّونی قبلَ أن تفقدونی)ی ئیمام عەلی (ر.خ) ئەوەی گەیاندووە کە لە ناویاندا نامێنێ و ئەمرێ. چییان لە دڵایە با بپرسن؛ بۆیە تەنانەت ئاسمانیش کەوتە هاوار و شین و گریان.

بۆ زیادتر ڕوون بوونەوەی ئەم (سلّونی)یە سەیری ئەم عیبارەتەی خوارەوە بفەرموون:

«جاء في الآثار أنّ أميرالمؤمنين، عليه‌السلام، كان يخطب فقال في خطبته:

سلّوني قبل أن تفقدوني، فوالله لا تسألوني عن فتنة تضلّ مائةً و تهدى مائةً إلاّ أنبأتكم» [ابو منصور الطبرسي / الاحتجاج / منشورات دار النّعمان للطباعة والنشر. النجف الاشرف. ص٣٨٤].

٤٠ـ ئەم کومەیلە کومەیلی کوڕی زیادی کوڕی نەهیکی تابیعییە، لە هەرای (صفّین)دا لەگەڵ حەزرەتی عەلیی بوو، پیاوێکی شەرافەتمەند و بەگوێکراو و بڕوایپێکراو بوو، سالی (٨٢)ی کۆچی لە تەمەنی(٧٠) سالیدا کۆچی دوایی کردووە. ئەم زاتە پێوەندییەکی تایبەتیی لەگەڵ حەزرەتی عەلیدا بووە. مەولەوی دەفەرموێ زیادیش کە ئەم فەرموودەی لە عەلی بیست زیاتر لە کاروباری ئایین پرسیاری لێ دەکرد و چاوەڕوانی وەلامی دەکرد. بڕوانە کتێبی (الاصابة في تمييز الصحابة)ی ئیبنوحەجەری عەسقەلانی. چاپی (دار نهضة مصر). بەشی پێنجەم ل (٦٥٣).

٤١ـ «رعایت» و «ولایت» بەتێی درێژ شێوەنووسی هەردوو نوسخە چاپ و دەستنووسەکەن.

٤٢ـ بەپێی پەراوێزی نوسخە دەستنووسەکە (وەک خۆی) دوو مەعنا هەڵدەگرێ:

١ـ وەک خۆی: وەک حەزرەتی سیددیق خۆی.

٢ـ وەک خۆی: وەک تەریقەکە خۆی.

لەم باری دووەمەدا شوبهێنراو و پێشوبهێنراو یەک شتە وەک: فلان کەس وەک خۆی، یا خۆیئاسا.

هەروەها لە پاڵ (پووچ دەکەی)دا نووسراوە: «فاعرف معنية» واتە: ئاگاداری هەردوو مەعنا پێشووەکە بە کە لە لێکدانەوەی (وەک خۆی)دا وتمان.

٤٣ـ لە نوسخە چاپەکەدا (بەگەردنە) نووسراوە.

٤٤ـ لە چاپ و دەستنووسدا «ألفیت»ە: ئەلفیت.

من لەگەڵ ئەوەدا کە بە راستی لە مەبەستی مەولەوی نەگەیشتووم ئەم چەند بارە دائەنێم بەڵکو یەکێکیان بە راست دەرچێ:

١ـ موحتاج بە سەداقەت و دۆستی خۆشەویستیت ئەگەر دە بیت و ئەگەر سەد. لەم بارەدا (ئەلف) واتە: دۆستی.

٢ـ (ئەلف) لە بەکارهێنانی کوردیدا واتە: (ئەلیف) کە ناوی حەرفی (ا)ە. ئەم نیشانە بۆ دەیان و سەدانیش بەکار دێت (١٠) و (١٠٠). واتە ئەگەر (١٠) بی و ئەگەر (١٠٠) موحتاجی وێنەی حەرفی ئەلفی.

٣ـ دوور نییە (ئەلفی) بێت و (ئەلفی) یش بە مەعنای هەزارە، واتە پیاوی بەرامبەر بە هەزارکەس بەکار بهێنرێ، واتە: ئەگەر دەیان بی و ئەگەر سەدان موحتاجی یارمەتیدەری ئازا و لێهاتووی.

٤٥ـ لە نوسخە چاپەکەدا (عشرتیست) ە، هەڵەیە.

٤٦ـ ئایەتی (٧٦) سوورەتی (یوسف).

## مبحث حضرة الشيخ عثمان سراج‌الدين و أولاده(قدّس الله أسرارهم) [1]

شـوعله‌ی[2] ئـه‌و نیسـبه‌ت موجه‌ددیدییـه
(لِمَطلَعِهـــــا ألـــــفُ تحیّـــــةِ)
بـۆ ده‌فعـی زولـمه‌ت لـه نزیـک و دوور
ســه‌ره‌یانی کــرد بلــوور ئــه‌و بلــوور
تــا دای لــه بلــوور (أدنُ) شـــنه‌فته
شـــاره‌زای ســارای ئــه‌توار هه‌فتـــه
پـیری پـاک لـه گـه‌رد خـاکی ناسـووتی
مه‌نزلـگه‌ی سـه‌ربه‌رز سـه‌ر مه‌لـه‌کووتی
دڵ بــه نــه‌وای بــه‌زم جه‌بــه‌رووت ئـاوا
ســـێراوی ســـه‌راو لاهـــووتی مـــاوا
لـــه شـــه‌و هه‌وارگـــه‌ی فـــه‌نا بگـــردگ
پێـی هــه‌ردی بــه‌قا یاتاخگــه کــردگ
(جســــماً لَــــدَینا روحــــاً لَدَیـــهِ)
دائـــیره‌ی تـــه‌مام (منـــهُ، إلیـــهِ)
چون گوزه‌رگه‌ی بوو مـه‌راتیب هـه‌ر پـه‌نج
له گه‌نجی هه‌ر په‌نج بوو به گه‌وهه‌ر سـه‌نج
چـاو برِیگـه‌ی حـوکم ئـه‌مری قـه‌زاوه
دڵ بــه ده‌س ته‌ســلیم وه‌ســفی ره‌زاوه

پــێ لــە دەرەجــەی رەفیعــەی قبــووڵ
وەســـیلەی وثقـــای فەزیلـــەی وســـووڵ
واسـیتەی رێگـەی بـەینی عـیلم و عـەین
واریســـی حـــائیز حـــەیای (ذی النـــورین)
ســـیراجی وەهھـــاج شـــەرع و تەریقـــەت
ســـەرمایەی رەواج کـــاڵای حەقیقـــەت
(نـــورُهُ الســـاری مَـــلاً الکـــونین
منـــهُ إستَضـــی[٣] قلـــبُ الثقلـــین)
قـــوتبی زەمـــان و ضَـــمانی ئـــەمان
ئـــەمانی ئـــەوانی ئـــەوان و ئـــەمان
حورمـەتی نەیهێشـت گوسـتاخی کـردن
نـامی نـامیی ئـەو بـە سـەریح بـردن
لـەو دڵـی (نـاجنس) رەنگـێ تـر ئـاورد
(زنـدە)ی ئەبـەد بـوو تێیـدا زیـاد کـرد
ئـاخر لـەبڕێـز بـوو جـام وتی تـا کـەی
ئیمـا و موعـەمما؟ (صـریحاً) سـا دەی!
دائـیم رووبـەڕووی نیشـان بـێ گومـان
تیرەنـدەر[٤] کـەمان پـیری مـا عوسمـان
بێ‌تـەلوین[٥] لـە بـورج تەمکینـدا مـەکین
(رَوّحَ اللهِ روحَـــــــــهُ آمـــــــــین)
دەدا گـەردی خـاک رێگـەی دەروێشـان
نیشـانێ لـە شـان سـەرکاری ئێشـان
ئـەر خـۆت بـە تالـب سـەواب دەزانی
بخوێنـە قورئـان رەسمـی عوسمـانی

هَـــــل رَقَـــــب ذمَّـــــه؟ لا وَلاَ إلَـــــا
لا حَـــــــــــولَ وَ لاَ قُـــــــــــوَّةَ إلاَّ...

سەرەیان: لادان، گەیشتن، بلوور ئەو بلوور: جام بۆ جام، شیشە بۆ شیشە، واتە: دەست بە دەست. أدنیٰ: نزیک بەرەوە. شنەفتە: بیستوو. أدنیٰ: شنەفتە: ئەو کەسەی کە (أدنیٰ)ی بیستووە. گەرد: تۆز. ناسووتی: ئینسانی، جیهانی خاکی. مەلەکووتی: جیهانی بالا، جیهانی مەلائیکە. نەوا: ئاوازە.

جەبەرووت: دەست رۆیشتن. ئاوا: ئاوەدان. سێراو: تێراو. سەراو: سەرچاوە. لاهووتی: مەنسووب بۆ لای خوا. ماوا: جێگە و شوێن. شەو هەوارگە: هەوارگەی شەو، شوێن حەسەسانەوەی شەو. بگردگ: تێپەڕکردوو. پێی هەرد: داوێنەی کێو. یاتاخگە کردگ: بە مەنزڵ کردوو. فەنا: دوا پلەی رۆیشتن بۆ گەیشتن بە خوا و رەزامەندیی خوا. بەقا: سەرەتای بەهرەمەند بوون لە نووری هەق. ئەم دووانە لە ئیستیلاحەکانی ئەهلی تەسەووفن. گوزەرگەهـ: ئەو شوێنەی پیا تێدەپەڕن. گەوهەرسەنج: ئەوەی گەوهەر هەڵئەسەنگێنێ. ئەمان: هێمنی و ئاسایش. أوان: جەمعی ئانە، واتە کاتەکان. ئەوان و ئەمان: ئیشارەن بۆ ئادەمزاد و جینن. گوستاخی: جەربەزەیی، بێشەرمی. نام: ناو. نامی: نەشونوماکردوو؛ ئەگەر عەرەبی بێ، لەوانەیشە بە واتای نامدار ــ ناودار بێ. تیرئەندەر کەمان: تەعبیرێکی فارسییە، واتە تیری لە کەواندایە، مەبەستی ئامادەییەتی. بێ-تەلوین: بە یەک رەنگی و نەگۆڕان. مەکین: دامەزراو، جێگرتوو. ذمّة: پەیمان. إلّ: خزمایەتی، هاوسوێنی.

مەولەوی لەبەر ئەوە کە خۆی موریدی پایەبەرز شێخ عوسمان سیراجەددین بووە و، ئەم زاتە یەکێ بووە لە کەڵەپیاوانی تەریقەتی نەقشبەندی، لێرەدا بە بۆنەی باسی ئەهلی تەریقەتەوە ناوی هێناوەتە پێشەوە.

شێخ عوسمان سیراجەددین کوڕی خالید ئاغا کوڕی مەحموود ئاغا کوڕی عەبدوڵلا ئاغا کوڕی سەیید موحەممەد دەروێش، کوڕی سەیید زاهیر، کوڕی سەیید جومعە و لەسەییدەکانی نعێمن کە وەختێ خۆی لە ناوچەی بەغدا بوون، پاشان سەیید جومعە رێی کەوتووەتە هەورامان و لە دێی تەوێڵە نیشتەجێ بووە.

دایکی شێخ عوسمان ناوی حەلیمەیە و کچی فەقێ ئەبووبەکرە کە مەشهوور بووە بە فەقێ هەی‌بەکر. ئەم فەقێ ئەبووبەکرە لە نەوەی فەقێ ئەحمەد ناوێکی مەشهوور بە (غەزایی)یە کە هاتووەتە دێی تەوێڵە و بەپێی ئەو باسەی شێخ عەبدوسسەمەدی توودار لە کتێبی (نوور الانوار)دا نووسیویەتی، کوڕی شێخ موحەممەدی کوڕی شیخ عەبدولئەحەدی کوڕی شێخ عەبدولواحیدی کوڕی شێخ مەحمودی کوڕی شێخ عەبدوسسەمەدی کوڕی شێخ عەلیی کوڕی شێخ عەبدوڕڕەئووفی کوڕی شێخ نیعمەتولڵای وەلیی کوڕی شێخ زەکەریای خەڵکی دێی (کاکۆزەکەریا) یە، لە ناوچەی (کەلاتەرزان)ی سەر بە شاری سنە لە کوردستانی ئیران.

ئەم شێخ زەکەریایە لە ئەولادی شێخ ئەبولحەسەنی شازلیی حەسەنییە، کە لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا لە میسرەوە ڕۆیشتوون بۆ سووریا و لەوێوە هاتوونەتە عێراق و لە عیراقیشەوە ڕۆیشتوون بۆ کوردستان. وا بەپێی ئەم مەعلووماتە دەرکەوت کە حەزرەتی شێخ عوسمان لە سەری باوکەوە لە نەوەی ئیمام حسێنە و لە سەری دایکەوە لە ئەولادی ئیمام حەسەنە.

شێخ عوسمان لە هەزار و سەد و نەوەد و پێنجی کۆچی لە دێی تەوێڵەی سەر بە قەزای هەڵەبجە لە دایک بووە و هەر لەوێ ساڵی هەزار و دووسەد و هەشتا و سێی کۆچیماڵئاوایی لە دنیا کردووە و لە باخەکەی خۆیا دەفن کراوە. ئێستە ئەو شوێنە خانەقایە و مەزاری موریدانە.

جا بەم بۆنەوە مەولەوی دەفەرموێ: ڕووناکیی ئەو نیسبەت و پێوەندیی تەریقەی موجەددیدییە، هەزار درووود لە سەرچاوەکەی بێ کە حەزرەتی فەخری عالەمە، بۆ لابردنی تاریکیی دڵی موسوڵمانان لە دوور و نزیک پەرەی‌سەند و وردەوردە دەست بە دەست و دڵ بە دڵ هات هەتا دای لە شیشەی دڵی ئەو پیرمانە کە بە ڕۆحانییەت ئاوازی (أُدنُ منّـی)ی لە لایەن بارەگەی خواییەوە بیستووە، واتە: لێم نزیک بەرەوە. ئەو پیرە شارەزای ڕێگا و سلووکی ئەو حەوت تەورەیە کە لە ناو ئەهلی تەسەووفدا باوە (ورع، زُهد، صبر، توکلّ، جوع، عزلة، قناعة)، پیرێکە لە گەرد و تۆزی خاکی جیهانی ئینسان و ماددە پاکە و، مەنزڵگای بەرزی ئەو بورجی سەربەرزی پایەی عیززەت و شەرەفە.

ئەو پیرە دڵی بە بیستنی نەوا و ئاوازی بەزمی جیهانی جەبەرووت ئاوەدانە و تێراوی شەرابی سەراوی خوداپەرستییە.

ئەو پیرە پایەی فەنای بەجێ‌هێشتووە و لە پایەی بەقادا ماوەتەوە، یا لەو جیهانە فانییە بڕاوە بێ‌کەڵکە، کە ئەوەندە بێ‌سوودە ئەڵێیت شوێنی هەواری ناچاریی شەو بەبارەوە گیرخواردنە، ئا

لەم هەوارگە بێنرخە باری کـردووە و داوێنــەی هــەردی بــەقا و مانــەوەی بایەخـداری کردووەتـە مەنزڵگای خۆی، کە جیهانی گیانی وریای بە یادی خوا زیندووە.

ئــەو پــیرە بــە لــەش و بــە دیمــەن لای ئێمەیــە و لەگەڵـمانا ئــەژی و بــە گیــان لــە جیهــانی خوداپەرستیدا ئەژی و نوقمی دەریای بیرلێکردنەوەیەتی و لەگەڵ خوادایە. بۆ ئەهلی تەســەوفی ئەم سەردەمە خۆی بووە بە دائیرەیەکی تەواو؛ لەوەوە زیکر و فیکر و تەســەووف دائەمــەزرێ و بــۆ چاری گیر و گرفتەکانیش هەر بۆ لای ئەو ئەچن؛ واتە: خۆی ســەری هەڵـقە و ئـاخری هەڵـقەیە، مەبەستی ئەوەیە لەو زەمانەدا (کُلٌّ فی‌الکُل) بووە.

لەبەرئەوە کە بە ڕێبازی خۆی گوزەرگای بریتی بوو لە پێنج مەرتەبەی جیهانی زات و سیفات و ئەرواح و میسال و ئەجسام و هاتوچــۆی پیــاکردوون، لــە نێــو گەنجــە نهێنییــەکانی هــەر پێـنج جیهانەکەدا بووە بە مامۆستای زەرِنگەری گەوهەرسەنج و، هەر گەوهەرێکی لــە شــوێنی موناســبی خۆیا داناوە.

پیرەکەم چاوی بریوەتە فەرمانی قەزاوقەدەر و دڵی خۆی داوەتە دەستی سیفەتی ڕەزامەندی و پێخۆش‌بوونی هەرچی لای خواوە بەسەریا بێت.

پیرەکەم بەسەر هەموو پلەکانی قوبووڵدا سەرکەوت و پێی لە لووتکەی هەرەبەرز توندکرد و بوو بە رابەر و هۆی گەیاندنی موریدانی بە پایەی کەمال.

واسیتەی ڕێگە و ڕێرەوانە بۆ ئەوانەی بە دوای خواناسیندا وێڵن، ئەوانــەی ئەیانــەوێ لــە پلــەی (علم‌الیقین) ەوە، کە زانینە لە ڕێگای (حواسّ) و بەڵگەوە، بگەنە پلەی (عــین‌الیقــین) کــە زانــینی موشاهەدە و بە چاو بینینە.

ئەم زاتە میرات بەری حەزرەتی (عثمان)ی (ذی النورین)ە و شەرم و لەخواترســییەکەی ئــەوی بۆ بەجێماوە. چرای ورشەداری شەریعەت و تەریقەتە و، هۆی بایەخ پێدان و بــرەوی حەقیقــەتی خواناسییە.

نووری ئەو پیرە هەمیشە لە جم و جووڵدایە و هەردوو جیهانی پڕ کردووە و، بەهۆی ئــەو ڕێ و شوێنەوە ئەو دایناوە دڵی (إنس) و (جن) ڕووناک بووەتەوە.

ئەو زاتە گەورەیە قوتبی زەمانە و، بەهۆی ئەو تەمێ و تەربییەوە کــە دەیکــا ئاسایشــی هــەردوو جیهانی بۆ پەیڕەوانی مسۆگەر کردووە و هۆی هێمنی و ئاسایشی هەمیشەییانە، لە (انس) بن یا لە (جن).

دوای ئەمانە مەولەوی دەفەرموێ: تا ئێستە لەبەر حورمەت و پایەی گەورەی ئەم زاتە پڕکێشیم نەکرد ناوی بە ئاشکرا بهێنم؛ بۆیە بە شێوەی (معمّا) لەم بەیتەدا ناوی دەبەم واتە لە بـەیتی: (لـەو دڵی ناجنس تاد...)دا کە لە مەدحی‌دا وتوویە.

کەواتە بەیتەکە دوو مەعنای هەیە:

١ـ راستە مەعناکە.

٢ـ مەعنا موعەمماییەکەی کە ناوی (شیخ عثمان)ی لێ دەرئەهێنرێ.

بۆیە مەولەوی لە پەراوێزی ئەم بەیتەدا[٦] دەفەرموێ: راستە مەعنای بەیتەکە، بێ‌تەماشـاکردنی لایەنی موعەممایییەکەی، ئەوەیە: لە رەنگی گۆنای بەرەکەتی شێخەوە کە پڕە لە رەنگـی خـودایی و، رەنگێکی بێ‌رەنگی هەیە و رەنگەکانی تر زۆر لێیەوە دوورن. بەڵێ لەو رەنگـەوە کراسـی دڵـی ناجینس و نەگونجاو و نەساچاوی من، کە لێیەوە دوورە، رەنگێکی تری بەسەرا هات و لەو رەنگەدا زیندوویەتیی بێ‌برانەوەی دەست کەوت و سەرکەوت.

بەم بارە (لەوـ لە ئەو) ئیشارەتە بۆ (شیخ عثمان سراج الدین) و (ئەبەد بوو) بە معنای (ئەبەدی) یە، وەک لە لێکدانەوەکەیدا کە بە فارسی بۆی کراوەـــ کـە خسـتوومانەتە پەراوێزەوەـــ نووسـراوە (ابدي يافته).

مەعنا موعەممایییەکەیشی بەم جۆرەیە:

(دڵ) لەگەڵ (قلب) هاومەعنایە. (قلب) یا (قلب المكان) یش واتـە پـاش و پـێش پـێ کـردنی حەرفەکانی کەلیمەیەک. دیارە قـەلبی (نـاجنس) دەبێتـە (سـنجان). ئـەم (سـنجان) ەیـش بـە (تصحيف) واتە نوختە گۆڕین دەبێتە (شیخان). (زندە)ی ئەبەد، واتە بێ‌ئاخر، کە ئەکاتە (زنـدە)ی بێ هێ کە (زند) ە، حەرفەکانی بەرزتر بکرێنەوە و نرخی حیسابی ئەبجەدییان زیاتر بکرێ:

(ز) کە بە حیسابی ئەبجەد (٧) ە، ببێتە (٧٠) کە دەکاتە حەرفی (ع). (ن) یش کە بە حیسابی ئەبجەد (٥٠) یە، ببێتە (٥٠٠) کە دەکاتە حەرفی (ێ). هەروەها (د) یش کە (٤) ە، بێتە (٤٠) کە دەکاتە حەرفی (م). بەم سێ حەرفە (عێم) پێکدێ. کە لە نێو (شیخان)دا دابنرێ و بخرێتە نێـوان (شیخ) و (ان) ەوە، وشەی (شیخ عێمان) پێکدێ. بەم جۆرە پەرەدە لە ناوچاوانی تابانی (عێمـان) لائەدرێت.

ئەم دانانی (عثم)ە لە نێوان (شیخان)دا خاڵی نییـە لـە ئیشـارەکردنێک بـۆ شـوبهاندنی شـێخ عوسمان بە حـەزرەتی عوسمـان و دانـانی لـە ریـزی گـەورەپیاوانی تەریقەتـدا، وەک حـەزرەتی عوسمان لە ریزی حەزرەتی ئەبووبەکر و حەزرەتی عومەردا.

ئەگەڕێینەوە سەر مەعنالێدانەوەی شیعرەکانی مەولەوی کـە دەفـەرموێت: ئیتـر لـە ئەنجامـدا جامی دڵم سەرڕێژی کرد و وتی: تا کەی بە ئیشارە و موعەمما ناوی پـیرت دەهـێنی، دەس‌وبـرد کە، بە سەراحەت و بێ‌پێچ‌وپەنا نـاوی بهێنـە، منـیش ناچـار وتم: پیرەکـەم کـە هەمیشـە تـیری ئامادەی خستنە کەوانە و، رووبەڕووی نیشانەیەتی کە دڵی موریدانیەتی، ناوی عوسمانە و ئەیـەوێ بە (تەوەججوهـ) دڵی موریدەکانی دەرمان بکات و لە خەوش و خاڵـی پەرسـتنی مـاددە پاکیـان بکاتەوە.

ئەم زاتە لەخوداترسە بێ لەخۆگۆڕان، بەڵکو بە یەکڕەنگی و راسـتی، لـە قـەڵای بەختەوەریـدا دامەزراوە. (روح الله روحه. آمین).

مەولەوی پاش ئەوەی لە کـاری نـاوبردنی پیرەکـەی بـووەوە، بـە موعـەمما و بـە سـەراحەت، دەیەوێ ئیشارەیەک بۆ ئەوەیش بکا کـە خوێشـایەتی و پێوەندییـەکی تایبـەتی و خزمایـەتی لـە بەینی خۆی و سیراجەددیندا هەیە لەو رووەوە کە هەردووکیان سەییدن، یا خزمایەتیی رێبـاز کـە مەولەوی موریدی بووە، کـە بـە عـادەت دەبـوا ئـەم خزمایـەتی و پێوەندییـە دەورێکـی ببوایـە و پیرەکەی زیاتر چاودێریی بکردایە و بـە پایـەی بگەیاندایـە، کـەچی وەک بۆمـان روون دەکاتـەوە پیرەکەی لە لووتکەی تەجەڕڕود و خوداناسیدایە و خزمایەتی و شتی‌وا لە فەرهەنگی ئەوا نییە.

جا پێش ئەوەی بچینە نـاو مـەعنای سێ بەیتەکـەوە پێویسـتە مـەعنای چەنـد کەلیمەیـەک لێکدەینەوە کە لە شیعرەکاندان و پێوەندییان بە مەبەستەکەمانەوە هەیە:

(گەردی خاک... تاد): تۆزی خاکی ژێر پێی خواناسان کـە هەمیشـە بـە دوای مورشـیدەوەن، مەبەست لەم گەردە مەولەوی خۆیەتی. نیشان: نیشانە، یا ئەسەر. شـان: لای سـەرووی دەس یـا حاڵ. سەرکار: ئەو کەسەیە کار و باری یەکێکی لە خۆی گەورەتر دەبا بـە رێـوە، وەکـوو دەڵـێی: سەرکاری شا، سەرکاری وەزیر، سەرکاری ئاغا. ئێشان: وشەیەکی فارسییە واتە ئـەوان یـا (هُـم)ی عەرەبی، تێکڕای فارسی‌نووسەکان بۆ گەورەپیاوان و بەتایبەتی سۆفییەکانیان بۆ پیرەکانیان بـەکار هێناوە، کە لەبەر رێزلێ‌گرتنیان ناویان نەهێناون و بە شـێوی زەمـیری جـەمع باسـیان کـردوون. وشەی سەرکاریش هەر بۆ رێزگرتن لە گەورە وتراوە، بۆ نموونە: جاران ئەگەر نامەیەک بە فارسـی

بۆ پیاوێکی گەورە بنووسرایە نەیاندەنووسی (جناب فلان) بەڵکو دەیاننووسی (جناب سرکار عالی) مەبەستیش هەر کابرا عالی و پایەبڵندەکە خۆی بووە، گوایا ئەوان حەددی ئەوەیان نەبووە خیتاب لەگەڵ خۆیا بکەن، (کأنّه) قسە لەگەڵ سەرکارەکەی دەکەن. کەواتە لێرەدا مەبەست لە سەرکاری ئێشان شێخی سیراجەددینە کە پیری بووە.

واتای هەر سێ شیعرەکەیش بەم جۆرەیە:

من کە تۆزی خاکی ڕێگەی دەروێشانم نیشانەیەکم بە سەر شانی پیرەوە، هەمیشە بە دوایەوەم و لە کۆڵی نابمەوە. یا خۆ من کە تۆزی خاکی ڕێگای دەروێشانم بەئاستەم و بەئەدەب تۆزئاسایی لە نیشانەیەک دەدەم لەسەر شانی پیر کە ببێتە هۆی ئاوڕدانەوەی. یا منی تۆزی خاکی ڕێگای دەروێشان نیشانەیەکم پێوەیە لە شەئن و حاڵی پیر بەهۆی خزمایەتییەوە کە ئەو سەییدە و منیش سەییدم، یا بەهۆی پیر و موریدیەوە.

تۆیش ئەی ئەوەی کە ئەم شیعرانەی من ئەخوێنیتەوە، ئەگەر حەز لە پاداشی چاک دەکەی بڕۆ قورئانی شێوەنووسی حافز عوسمان بخوێنە یا قورئان بخوێنە بەو شێوی عوسمان سیراجەددین خوێندوویەتیەوە بە خوشووع و خوزووعەوە. یا ئەو قورئانە بخوێنە کە خەلیفەی سێهەم عوسمانی کوڕی عەففان (ر.خ) کۆی کردووەتەوە و تا ئێستەیش پایەدار و پارێزراوە. هەروەها بە دوای تەفسیرەکانی قورئاندا بگەڕێ بزانە لە سوورەتی (براءة)دا لە تەفسیری (براءة مِن اللّهِ و رسولهِ... الآیة) و ئایەتی (لا یرقبون فی مؤمن إِلًّا وَ لَاذِمَّةً)دا چییان وتووە؟ بزانە عەهد و پەیمانی نێوان موسوڵمانان و کافران لە پێشا لە چ بارودۆخێکدا بەسترابوو، لە چ حاڵێکدا پێوەندییان بە یەکەوە هەبوو؟ دوایی لە چ حاڵێکدا حەزرەتی پێغەمبەر و یارانی بە ئێجگاری بەرائەتیان لە کافران ڕاگەیاند؛ ئەوکاتە بۆت ڕوون دەبێتەوە کە سیراجەددینی پیرم لەگەڵ پێوەندیی خزمایەتی و ئاشنایەتیمان بە هیچ جۆرێ منی لە خەڵکی تر جیانەکردەوە و وەک ئەوانی سەیرکردووم و داومیەتە دەس کار و کۆششی خۆم[٧].

چە[٨] تەرزە دای بەر، ئەم تەرزە خەیار؛
کام دارە نەوری (قلبنا أنار)؟
(هو الشیخُ، هم وَلَدهُ الأبرار
هو الشیخُ، هم نجلە الأحرار)

(مضـــــاهرُ مـــــا فیــــه مســـــتَتَر
بطـــــورٍ أبــــرد وَ وَجـــــهِ أزهـــــر)
ســـەرکردەی ئەســحاب باوەفـا و ســەفا
یـــەکێ (بوالبهـــا)، یـــەکێ (بوالوفـــا)
دەشــێ چـی بلــێ لـە وەسـفیان کـەس
موحەممەدی خولـق، رەحمـانی نەفـەس
یـــەکێ ئایینـــەی فـــارووقی عومـــەر
یـــەکێ حەقیقـــەت ئەحمـــەدی ســـیەر
ســـابیت و ســـەییار بــورجی تەمجیــدن
نیشـــانەی ئـــەمان ســـەمای تەوحیـــدن
ســـــێوەری شــــەجەر موجەددیدییـــــە
حاسڵــــی هیممـــەت عـــالیی نەقشـــییە
رجام هەس بێرێ باریی پەست و بـەرز[۹]
بەو سیلسـیلە، ئـەم سیلسـیلە بـەم تـەرز
تـا وەخـتی نـزوول نوبـووەت (مەهـد)ی
تلـووعی کەوکـەب دەوڵـەتی (مەهـدی)
ئـــاخر هـــات بـــە زیکـــر ئـــەم بزورگانـــە
نیشـــانەی حوســـــنی خاتیمەمانـــــە[۱۱]

تەرز: تەرزی گیا، وەک لق وایە بۆ دار، ئەو بەسەر ئەرزا ئەکشـێ و ئـەم بـەرز ئەبێتـەوە. تـەرز: جۆر. خەیار: ئەوەی ئەخورێ، یا خییار: جەمعی خەیرە، واتە: چاکان. هـەرکامیان بـێ مەبەسـت هەر پیاوچاکانە. دای بەر: بەری دا بە خەڵک. نەور: گوڵاڵەی سپیی سەرەتای بـەرگرتنی هەنـدێ لە دار و درەخت کە وردەوردە بەر دەرکەوت ئەو ئەوەرێ. أبرَد: (أفعل التَّفضـیل)ە واتـە: بڕنـدەتر، کاریگەرتر. موحەممەدی خولق: ئیشارەیە بۆ ناوی شێخ بەهائەددین کە موحەممـەدە. هـەروەک رەحمانی نەفەسیش ئیشارەیە بۆ ناوی (أبوالوفا) کە (عبـدالرحمان)ە. ئـەمان: ئاسـایش. سـێوەر: سێبەر. مەهد: بێشکە. نوبووەت مەهـدی: ئـەوەی هـەر لـە بێشـکەدا نیشـانەی پێغەمبەرایـەتیی

پێوەدەرکەوتووە، عیسا. ئیشارەتە بۆ ئایەتی (قالوا کیف نکلّم من کان في المهد صبیّاً * قال إنّي عبدالله آتاني الکتاب و جَعَلَني نبیاً) (١٢) دەوڵەتی مەهدی: سەردەمی دەستەڵاتی حەزرەتی موحەممەدی مەهدی، کە هاتنی یەکێکە لە نیشانەکانی دواهاتنی ژیانی ئەم جیهانە.

واتە: ماشەڵلا چ تەرزە سەوزەیێکی ناو بێستانە کە ئەم جۆرە خەیارە سەوزە جوانەی گرتووە؟ یا خۆ چ تەرزە باوکێکە کە ئەم جۆرە کوڕە چاکانەی لێ بووە، کام داری بەرداره کە هەڵالەکانی دڵی ئێمەیان نوورانی کردووە؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە لە بەیتی دووەمدا دەڵێت: تەرزەکە شێخ عوسمانە و بەرەکەی کوڕەکانیەتی، دارگوڵەکەیش هەر شێخ عوسمانە و هەڵالەکانی کوڕەکانینی.

ئەم کوڕە بەڕێزانە مەزهەری ئەو خوو و ڕەوشتە بەرزانەن کە لە باوکیاندا شاررابوونەوە، لەماندا ئەو سیفەتانە دەردەکەون، بەڵێ ئەمان ئەو خوو و بەهرە بەرزە بۆ موریدەکانیان، بگرە بۆ هەموو خەڵک دەردەخەن، لەوانەیە ئەمان بە ئاشکراتر دەریخەن، چونکە ئەمان تێکەڵییان لەگەڵ خەڵکدا زیاترە.

ئەو کوڕە باشانە سەرکردەی سوپای ئەهلی وەفا و سەفان، یەکەمیان جەنابی شێخ موحەممەدە و نازناوی (بهاءالدین)ە و (أبوالبها) یە، ساڵی (١٢٥٢)ی کۆچی لە دایک بووە و، لە (١٢٩٨)دا لە دێی تەوێڵە کۆچی دوایی کردووە و لە تەنشتی قەبری خودالێخۆشبوو باوکیەوە نێژراوە. دووەمیان شێخ (عبدالرحمان)ە کە کونیەی (أبوالوفا) بووە و، لە (١٢٥٣)ی کۆچیدا لە دایک بووە و لە (١٢٨٥)دا وەفاتی کردووە و، لە گۆڕستانی گەیلانی لای خۆرئاوایەوە دەفن کراوە، وا ڕێکەوتووە لە لای سەریەوە گۆڕی خوالێخۆشبووان مەلا یەحیای مزووری و شێخ (هدایةالله)ی هەولێرییە کە مەنسووبی حەزرەتی مەولانا خالید بوون (اعلی‌الله مقامهم).

دەبێ ئینسان لە ستایشی ئەم دوو زاتە ڕەوشتپاکانەدا چی بڵێت کە یەکێکیان موحەممەدی ڕەوشت و ئەویتریان خاوەنی ئەنفاس و تەوەججوهاتی ڕەحمانییە؟

سێهەمیان ئاوێنەی خوو و ڕەوشتی حەزرەتی فارووق عومەری کوڕی خەتتابە، یا ئاوێنەی خوو و ڕەوشتی شێخ ئەحمەدی فارووقییە کە مەشهوورە بە ئیمامی ڕەببانی. ئەم زاتە موبارەکە کە ناوی عومەر و نازناوی (ضیاءالدین)ە ساڵی (١٢٥٥)ی کۆچی لە دایک بووە و لە (١٣١٨)دا کۆچی دوایی کردووە و قەبرەکەی لە ژوورێکدایە لە سووچی خۆرئاوای حەوشی خانەقای بیارە کە پێی ئەڵێن (مەرقەد).

چوارەمیان شێخ ئەحمەدە کە بە راستی ئەحمەدی رەوشتە. ئەم زاتە لەخوداترسە دیارییە ساڵی (١٢٦٦)ی کۆچی لە دایک بووە و ساڵی (١٣٠٧) کۆچی دوایی کردووە و بەرامبەری ئارامگای (سراج الدین)ی باوکی لە تەوێڵە نێژراوە و، چەمەکە کەوتووەتە بەینیان. (رحمة الله علیهم و علی جمیع المسلمین).

ئەم ئەولادانە لە بورجی تەمجید و خوداپەرستی‌دا وەک ئەستێرە گەڕۆکەکان و ئەستێرە سابتەکانن، پڕتەوبەخشن، جووڵان و هەڵس‌وکەوتیان و، نەجووڵان و ئارام‌گرتنیان هەر لەبەر خاتری خودایە و، بوونیان نیشانەی ئارامیی ئاسمانی خوابەیەک‌زانینە، واتە: بوونیان نیشانەی بەردەوامیی ئیسلامییەت و ئایینی خوابەیەک‌زانینە.

مەولەوی بە دوو کەلیمەی (ثابت) و (سیّار) ئیشارەی بۆ ئەوە کردووە کە هەندێ لەم زاتە عالی سیفاتانە لە شوێنی خۆیاندا ماونەتەوە و ئەملاولایان نەکردووە، وەک شێخ محمد (بهاءالدین) کە هەر لە دێی تەوێڵەدا ماوەتەوە تا وەفاتی کردووە؛ بەڵام شێخ عومەر (ضیاءالدین) لە دێی تەوێڵە دەرچووە و رۆیشتووە بۆ بیارە و لەوێ خانەقای دروست کردووە. هەروەها حاجی شێخ (عبدالرحمان) لە پاش وەفاتی (سراج‌الدین) چووە بۆ بەغدا و لە (باب‌الشیخ) ماوەتەوە تا کۆچی دوایی کردووە.

حاجی شێخ ئەحمەدیش تەوێڵەی بەجێ هێشتووە و رۆیشتووەتە دێی ئەحمەدئاوا لە نزیکی خورماڵ تا مردن لەوێ ماوەتەوە، پاش مردنی جەنازەکەی براوەتەوە بۆ تەوێڵە و لەوێ نێژراوە.

ئەم زاتانە سێبەری پیرەداری ئەو تەریقەیەن کە لە موجەددیدی هەزارەی دووەم ئیمامی رەببانییەوە پێیان گەیشتووە، بەری هیممەتی بەرزی نەقشبەندن.

تکام ئەوەیە کە خوا بە بەرەکەتی ئەو زنجیرە ئەولیا نەقشبەندییانە ئەم زنجیرەی ئەولادی شێخ عوسمان سیراجەددینە بەری نزم و بەرز بهێنن، واتە بەری نزم کە دەستی هەموو کەسی بگاتێ وەک کار و باری ماددی و، بەری بەرز کە هەردەستی پیاوە بەرزەکانی پێ بگات وەک کار و باری مەعنەوی و ویلایەت، هەتا ئەو وەختە کە حەزرەتی عیسای هەر لە بێشکەوە پێغەمبەری تیا دێتە خوار و ئەستێرەی دەوڵەتی موحەممەدی مەهدی(د.خ) هەڵدێ.

سوپاس بۆ خودای گەورە وا بە باسی چاکە و مەناقیبی ئەم ئەولیا پایەبەرزانە ئەسڵی چوارەم و ئەوەی پێوەندی پێوە هەیە تەواو بوو، ئەمەیش نیشانەی بەختیاری و ئاخرخێرییە؛ (فإن عند ذکر

الصالحین تنزل الرحمة). ئەیشتوانین بڵێین ئەوەیشی مەبەست بووە کە بڵێ لەگەڵ باس‌کردنی ئەم گەورەپیاوانەدا باسی رۆژی قیامەتیش هاتە پێشەوە و، ئەمە نیشانەی ئاخرخێریمانە.

***

١ـ ئەم سەرباسەیش لە دەستنووسەکەدا نییە.

٢ـ لە چاپەکەدا لەباتی (شوعلە) نووسراوە، ئەویش هەر بە مەعنا شوعلەیە.

٣ـ [استضی] شێوەنووسی چاپەکەیش و دەستنووسەکەیشە، راستەکەی (استضاء) یە، لەبەر وەزنی شیعرەکە کردوویە بە (استضا) و کە کردیشی بە (استضا) و (ء) ەکەی لابرد حوکمی ئەلفی مەقسوورەی دایێ. دیارە ئەمە لە داهێنانی مەولەوی خۆیەتی. ئەگینا ئەو هەمزەی وەسڵی (استضاء)ی بۆ هێشتەوە کە ئەبێ لابرێ و هەمزەی (لام الفعل) ەکەی بۆ حەزف کرد؟ باشتر نەبوو بیوتایە: «منە استضاء».

٤ـ «تیرەندەر» وەک ئەخوێنرێتەوە نووسیومەتەوە، ئەگینا (تیراندر)ە لە هەردوو نوسخەکەدا.

٥ـ «تلوین» مەقامی پشکنین و گەڕانە بە دوای ئیستیقامەت و رێگای راست گرتنەبەردا، بەلام «تەمکین» مەقامی جێ پێ پتەوکردن و دامەزران لەسەر ئەم ئیستیقامەتەیە. بەندەی خوداش هەتا بەڕێوە بێ و هێشتا نەگەیشتبێ خاوەن تەلوینە و لە حاڵێکەوە دەچێتە حاڵێک، بەلام کە گەیشت ئیتر دەبێتە خاوەنی حاڵی تەمکین.

ئەمە تەرجەمەی قسەی زانای گەورە سەیید شەریفی جورجانی بوو، ابن‌العربی تەلوین لە تەمکین بە بەرزتر حیساب دەکات. دیارە ئەم تەلوین و تەمکینە لە ئیستیلاحی سۆفییەکانە.

مەولەوی لە پیاهەڵدانی شێخ عوسمان سیراجەددینی پیریدا دەڵێت:

ئەم زاتە بێ‌ئەوەی بە مەقامی تەلویندا بڕوا لە مەقامی تەمکیندا جێگیر بوو. مەبەستی ئەوەیە ئەم تەمکینە یەکسەرییە بۆ هەمووکەس دەس نادات.

بۆ (تەلوین و تەمکین) بڕوانە: سەیید شەریفی جورجانی، کتێبی تەعریفات چاپخانەی خەیرییە لە میسر، ساڵی (١٣٠٦)ی کۆچی. ل (٢٩) و (٣٠).

٦ـ لە نوسخە دەستنووسەکەدا پەراوێزێ بە فارسی لەسەر بەیتی (لەو دڵی ناجنس...) نووسراوە کە بە (منە) دوایی پێ هێنراوە، واتە هی مەولەوی خۆیەتی. وا بۆ راگرتنی ئەمانەتی ئەدەبی و بۆ زیاتر روون‌کردنەوەی مەعنای بەیتەکەیش، مەتنەکەی ئەنووسینەوە.

ئەمە مەتنی پەراوێزەکە: «معنی بیتیه این است که از اثر خم فیوضات شیخ، قدّس سره، که خمی است پر از صبغةالله، و بجهت بی‌رنگی انواع رنگ‌ها ازان دوراست، جامهء دل ناجنس که ازان دوراست رنگ دگر آورد و، دران رنگ حیات ابدی یافته زیاد کرد و بترقیات رسید و معنی معمائیة همچنین: (دل) بعمل ترادف (قلب)، و قلب (ناجنس) (سنجان) است. رنگ دگر آورد عمل تصحیف وضعی است، (شیخان) می‌شود. (زندهء) ابد یعنی بی‌نهایت، یعنی حرف آخرش ساقط شود که (زند) ماند. هر حرفی ازان از رتبهء خود ترقی کرده در (شیخان) [...] مبارک

[...] (شیخ عثمان) نقاب از چهره تابان بگشاید». (ئەم دوو وشەیە کـە خـستوومانەتە بـەینی دوو کەوانـەی []ەوە، هەرچەندمان کرد لە دەستنووسەکەدا بۆمان نەخوێنرانەوە).

٧ـ بەش بە حالی لێکدانەوەی (هَل رَقَب... تاد) کە بە دووبەیتی پێشیەوە بەستراوە، ئەوەی خستمیە سەر ڕێگای ئەم مەعنایە پەراوێزێکی مەولەوی خۆی بوو کە لە نوسخە دەستنووسەکەدا بە عەرەبی لەسەر (هَل رَقَب) نووسرابوو و بە (مِنهُ) دوایی هاتبوو ئەو پەراوێزەیش ـ چەند کەلیمەیەک و تاکە شـیعرێکی نـەبێ ـ مەولـەوی لـە (قاشـانی)ی سۆفییەوە وەریگرتبوو.

پەراوێزەکە بەمجۆرە دەست پێ دەکات:

«الذّمّة: العهد. والالّ: القرابة والحلف.

قال القاشانی فی تأویل التفسیر علی مذاق اهل الاحوال فی سورة (براءة) لدی قوله تعالی (لا یَرقُبونَ فـی مُـؤمنٍ إلّا وَ لَا ذِمّةً)... الخ...»

ئەنجا مەولەوی پاش تەواوبوونی مەتنی قسەکەی (قاشانی) خۆی ئاسایی، بێ‌دامـان، بـەم فـەردە پەراوێزەکـەی دوایی هێناوە:

«فبعد العلم بذاک التأویل

الله یهدی لخیر السبیل»

پوختەی قسەکەی (قاشانی) ئەوەندەی پێوەندی بە مەبەستی مەولەوی و مەعنای شیعرەکەوە هەبێ ئەمەیە:

ئەگەرچی پێش نازڵ بوونی (بَرَاءةٌ مِنَ اللهِ وَ رَسولِهِ... الآیة) حەزرەتی پێغەمبەر و هاوڕێکانی لەگـەڵ کافرەکانـدا جۆرە بۆنە و پێوەندییەکیان هەبوو وەک خزمایەتیی هاوجینسی و سـوێند و پـەیمان، بـەلام کـە (بَـرَاءةٌ مِـنَ اللهِ وَ رَسولِهِ... الآیة) نازڵ بوو بۆنە و پێوەندی لە نێوان ئەوان و کافرەکاندا هەڵگیرا و خزمایەتیی هاوجینسـیيان لـە ئـارادا نەما و دژایەتی و ناجۆری و دوژمنایەتی و لەیەک جیابوونەوە جێگیر بوو، تەبـەڕرابوونی پێغەمبـەر و هاوڕێکـانی لـە کافران ڕاگەیێنرا، ئیتر ئەوەبوو کە موسوڵمانان بە زاهیریش لە کافران تەبەڕرا بوون وەک لە باتینـدا لێیـان تەبـەڕرا بوون عەهد و پەیمانیان بەدیمەن و سوورەتیش فڕێ‌درا و خرایە پشت گوێ وەک لە حەقیقەتیشدا فڕێ‌درا.

پێغەمبەر و هاوڕێکانی لەو مەقامەدا ئەوەندە مەشغووڵی یادی خودا بوون خوداپەرستی و لە خودا نزیک بوونەوە نەبێ هیچی تر لە دڵیاندا جێگای نەدەبوویەوە، نە خزم و نە دۆست و نە هاوپەیمان.

ئەنجا مەولەوی لەبەر ڕووناکیی ئەم تەفسیرەی قاشانیدا، کە ئەگەر تەنیا ڕاسـتە شـیعرەکە بگـرین خـۆی نـەبێ کەس پێی نازانێ و دەڵێت موعەممایە، لە ئایەتە پیرۆزەکە چەند کەلیمەیـەکی ئیقتیبـاس کـردووە و ئـەم جوملـە ئیستیفهامییە ئینکارییی لێ هێناوەتە کۆ کە بریتییە لە (هَل رَقَب ذمة؟ لا، وَلا إلاًّ) ئـەم عیبارەتـەی مەولـەوی لـە ئایەتی (لا یرقبون فی مؤمن إلاًّ و لا ذمّةً) ەوە ئیقتیباس کراوە. لەباتیی (یرقبون) ەی مـوزاریعی واوی جـەمع داردا (رقب) ەی مازی داناوە کە فاعیلەکەی (هُوَ)ی نادیارە. (إلاًّ و لا ذمّةً) یشی پاش و پێش کردووە. فاعیلی (یرقبـون) ەی ئایەتەکە واوی زەمیری جەمعە و بۆ کافرەکان دەچێتەوە. فاعیلی (رَقَبَ) ەی ئەم (هو)ی نادیـارە و بـۆ شـێخی سیراجەددین دەگەڕێتەوە.

تێکرای مەعنای ئایەتە پیرۆزەکە زەممە و هی ئەمەی ئەم مەدحە.

بەڵێ ئەم هەمووە ئاز و گویز و کاکڵەمستەی بۆ بەیانی پێوەنـدیی خـۆی و شـێخی سـیراجەددینی مورشـیدی کردووە، یا بە وتەیەکی سۆفییانەی وردتر بۆ بەیانی بێپێوەندیی ئەو مورشیدەی لەگەڵ غەیری خوادا و دەڵێت:

لەگەڵ وجوودی پێوەندی و خویشایەتیدا مورشیدەکەم لەبەر ئەوەی ڕێگای پێغەمبەر و هاوڕێکانی گرتووە، لەبەر تەجەڕرود و بێپێوەندیی لەگەڵ غەیری خوادا گوێ ناداتە خزمایـەتی و پێوەنـدیی تـر و، وەک هـەموو کەسـی تـر داومیەتە دەسی لێهاتوویی و زیرەکی و کۆششی خۆم.

ئەوەیش بڵێم کە لە دەستنووسەکەدا لە پاڵ (لا حول و لا قوّة الّا)دا (منة) یەکی تێکـەڵ لـە عـەرەبی و فارسـی نووسراوە ئەمە نەسەکەیەتی: «بالله العلی العظیم از فضلی که بُوَی عطا کرده شده. منـه» دیـارە عەرەبییەکـەی (لا حول و لا قوة الاّ)ی تەواو کردووە کە دەبێتە: (لا حول و لا قوة الاّ بالله العلی العظیم) فارسییەکەیشی واتە: لەو پایە و بەهرە گەورەیە کە بە مورشیدەکەم بەخشراوە، مەبەستی ئەوەیە کێ بێ بتوانێ ئەوەندە لە خەڵـک، تەنانـەت لـە خزم و ناسراویش، تەوەللا بێ و هەمیشە دڵی لای خودا بێ؟

٨ـ ڕێنووسی دەستنووسـەکە (چە) یە، ئەمڕۆ بە (چ) ئەنووسرێ.

٩ـ باریی پەست و بەرز واتە: دروستکەری بەرز و نزم، ئاسمان و زەوی، مەبەست خوای گەورەیە. لە پـەراوێزی دەستنووسەکەدا بە فارسی لەسەر ئەم بەیتە نووسراوە:

(بای بُو احتمال دو معنی دارد) واتە: (بێ)ی (بەو) دوو مەعنا هەڵدەگرێ: یەکەم: بەوجۆرە. دووەم بـە خـاتری ئەو... تاد.

تێکڕای مەعنای بەیتەکە بەمجۆرەی لێدێ:

تکام وایە خودای ئاسمان و زەوی و بەرزی و نەوی بە هەمان ڕێچکە و زنجیرەی نەقشبەندی، یا بە خاتری ئـەو زنجیرە نەقشبەندییە، زنجیرەی ئەم بنەماڵە بەم شێوە بهێنێ و پایەداری بکا هەتا حەزرەتی عیسـا(د.خ) دێتە خـوار و موحەممەدی مەهدی (ر.خ) دێتە سەر رووی کار.

١٠ـ ئایەتی ٢٩ و ٣٠ لە سوورەتی مەریەم.

١١ـ بە وردبوونەوە لەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی کە یەکەم بەیتی پارچەی بەشی داهاتووە، دەرئەکەوێ مەولەوی جگە لە ڕاستە مەعناکەیان ئەوەیشی مەبەست بووە لەم بەیتەدا بە وشەی (ئاخر هـات) ئـەو مەعنایـەیش بگەیـەنێ کەوا باسی (ڕۆژی ئاخیرەت) یش هاتە پێشەوە کە فەسلی داهاتووە و، لەویشا بلێ لـە سـایەی خـواوە، وەک چـۆن دوایی هاتنی باسـی پێشوو بە باسی شێخی سراج الدین و کوڕەکانی نیشانەی حوسنی خاتیمە و ئاخر خێریمان بوو، ڕۆژی قیامەتیشمان هەر بە یادی ئەوان بە ئەمینی و بێترس و لەرز بەسەرمانا تێئەپەڕێ.

## مبحث الايمان باليوم الآخر و علامات الآخرة[1]

(حَمـداً لَـه) بـەو يـاد دەڕۆت بـە ئـەمين
يـــەومی ئـــاخيريچ ئەسڵـــی پەنجـــەمين
(دارالعمـــــل)ە نەشـــــئەی ئوولـــــەوی
(دارالجـــزا)يـــە نەشـــئەی ئـــوخرەوی
نەوبـەی ئـەو روی[2]، نەوبـەی ئـەميچ تـێ
عـەلاماتی هـەن يـەكيـەک دەشـێ بـێ
يـەكێكيان بەعسـەت نـەبيی خۆمـان بـوو
ئـــاخر پێغەمبـــەر ئـــاخر زەمـــان بـــوو
خـورووجی مەهـدی لـە ولـدی حەسـەن
سـەرزەمين دەكـا پـر عـەدل و مەئمـەن
فـــی مُدَّتِـــه خُلـــفُ الأئمـــة
وَ قـــد يَـــؤُمُّ هـــذه الأمَّـــة
حـــەزرەتی عيســا هـــەم دەيێتــە خــوار
چـون تابيعــە بـۆ ســەييدی موختـار(س)
(إظهـــاراً لِـــذا) بـــۆ خـــەواسّ و عـــام
قـــد يقتـــدی والمهـــدیّ إمـــام
ئـەر بعـدەز[3] چەنـدێ لێيـان بـوو تـاقی
تابيعـــە و هـــەر شـــەرع خۆمانـــە بـــاقی

بینـا بــەر تەقــدیم فازیــل لــە مــەفزوول
عیســا ئیمــام بــێ جەمعێکــە مــەقبوول
(مــا أمکــن) لــە لای ئــەهالیی کــەمال
یــەقین چــاکترە ئیعمــال لــە ئیهمــال
خــورووجی دەججــال مەســیحی ئــەعوەر
تێــت بــە دنیــادا بــە ســواریی کــەر
یــەئجووج و مــەئجووج هــەم (دابّــة الارض)
دوخــان تــێ دەگــرێ دنیــا تــوول و عــەرز
لــــە مەغریبــــەوە هــــەلاتنی خــــۆر
سێ خوســووف دەبــەن بــا بیتبــێ[٤] خەبــەر
یەک لە لای مەشریق، لە لای مەغریب یەک
یــەک لــە جــەزیرەی عەرەبــدا بــێ شــەک
ئــارێ لــە یەمــەن هــەم دەیێتــە دەر
خەلــقی دەپێچــێ بــۆ تــەرەف مەحشــەر

بینابەر: بینا لەسەر. ئارێ: ئاگرێ.

واتە: سوپاس بۆ خودا بە یادی ئەو زاتە خاوەنبەرەکەتانەوە رۆژی دوایی و تـرس و لـەرزی، بـە ئەمینی بە سەرمانا تێئەپەرێ کە پایەی پێنجەمە لە شەش پایەکەی باوەڕ.

بەڵێ ئادەمزاد دوو جیهانی هەیە، جیهانێکی یەکەمی هی پێگەیشـتن و پەیدابوونیـەتی و هـی کار و کۆششە. جیهانی دواییش هی پاداشە و ئادەمزاد بەری کـاری دنیـای یەکـەمی ئەچنێتـەوە، ئەگەر چاکە و ئەگەر خراپ. ئەوا سەرەی یەکەمیان رۆیی. سەرەی دووەمیش بەڕێوەیە، مەبەسـت لە نۆبە رۆیشتن ئامادەییە بۆ رۆیشتن؛ چونکە شت کە لە نەبوونەوە پەیدابوو جارێکی تر ئەچێتـەوە بۆ نەبوون.

ئەم رۆژی دواییەیش نیشانەی زۆری هەیە کە ئەبێ هەموویان یەکەیەکە بێنەدی:

یەکەم نیشانەی رۆژی قیامەت و وێرانبوونی ئەم جیهانە رەوانەکرانی پێغەمبـەری خۆمانـە بـۆ سەر خەڵک هەموو؛ چونکە ئەم دوا پێغەمبەری ئاخر زەمانە.

دووەم پەیدابوونی موحەممەدی مەهدییە، کە زاتێکە سەییدە و لە نەوەی حەزرەتی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلییە(کرّم‌الله وجهه). ئەم پیاوە گەورە لە ڕۆژێکا دێتە سەر رووی کار کە جیهان پڕ دەبێ لە ئاژاوە و ئاشووب و پەرێشانی و، بە هێزی ئەو و پەیڕەوانی جیهان ئەگۆڕێ و پڕ ئەبێ لە ئەمن و ئاسایش و دادپەروەری و، زوڵم و زۆر نامێنێ. زانایانی ئایین دەربارەی ماوەی حوکم و دەستەڵاتی حەزرەتی موحەممەدی مەهدی رای جیاوازیان هەیە؛ هەندێ دەڵێن حەوت ساڵە و هەندێکی تر ئەڵێن زیاترە.

حەزرەتی موحەممەدی مەهدی کە بەیعەتی پێکرا دەبێتە سەرۆکی گشتی و پێشەوای هەموو موسوڵمانان. هەر لە سەردەمی حەزرەتی مەهدی‌دا حەزرەتی عیسایش لە ئاسمانەوە دێتە خوار بۆ شام نزیکی منارەی سپی.

جا لەبەر ئەوە کە حەزرەتی عیسا لەو سەردەمەدا تابیعی ئایینی حەزرەتی موحەممەدە(د.خ) لە پشتی موحەممەدی مەهدییەوە نوێژ دەکات کە لە ئوممەتی پێغەمبەرە(د.خ)، واتە: مەهدی ئیمام دەبێ و عیسا مەئمووم. پاش ماوەیەک کە شەخسییەتی حەزرەتی عیسا ناسرا و زانرا کە پەیڕەوی ئایینی ئیسلامە ئەوسا بە گوێرەی پێش‌کەوتنی گەورە لە بچووک لە ئیمامەتدا، لەبەر ئەوە کە عیسا پێغەمبەر بووە و لە مەهدی گەورەترە، ئەو دەبێتە ئیمام و مەهدی بە مەئمووم. بەم شێوە ئەو دوو ریوایەتە کۆ ئەکەینەوە کە یەکێکیان دەڵێ مەهدی ئیمام دەبێ و ئەوی‌تریان دەڵێ عیسا، واتە: هەردوو ریوایەتەکە راستن، بە گوێرەی ئوسوولی فیقهیش هەتا بتوانین دوو ریوایەتی دژی یەک کۆ بکەینەوە و کار بە هەردووکیان بکەین باشترە لەوە کە کار بە یەکێکیان بکەین و ئەوی‌تریان بخەینە پشت گوێ.

هەروەها لە سەردەمی حەزرەتی عیسا و موحەممەدی مەهدی‌دا دەججال هەڵدەسێ و لەگەڵ سوپای ئەم دووانەدا بە شەڕ دێت و لە ئەنجاما ئەکوژرێ و گیانی بە دۆزەخ شاد دەبێ.

یەکێکی تر لە نیشانەکانی ئاخر زەمان هێرشی سوپای یەئجووج و مەئجووجە کە لە خۆرهەڵاتەوە دێن بەسەر وڵاتی ئیسلاما و کوشتار و بەدکارییەکی زۆر دەکەن.

نیشانەیەکی تر دەرچوونی (دابة الارض) ە[٥] لە خاکی مەککەی موکەڕڕەمە لە وڵاتی حیجاز.

یەکێکی تر لەو نیشانانە دەرچوونی دووکەڵێکی خەستە کە سەرانسەی گۆی زەوی دادەگرێ.

یەکێکی تر گۆڕانی چەرخ و هەڵاتنی خۆرە لە لای خۆرنشینەوە، بە پێچەوانەی ئەوەی تا ئێستا دامەزراوە لە دنیادا.

نیشانەیەکی تر ئەوەیە کە لە سێ ناوچـەدا زەوی ئەتـەپێ و رۆئەچێتـە خـوارەوە، یەکـەم لـە خۆرهەڵات، دووەم لە خۆرنشین، سێهەم لە وڵاتی نیمچە جزیرەی عەرەب.

هەروەها یەکێکی تر لە نیشانەکانی ئاخرزەمان ئەوەیە ئاگرێک لە یەمەن دەکەوێتەوە کە بەرەو باکووری حیجاز ملدەنێ و خەڵکی لە ترسی سووتان بەرەو خاکی شام هەڵدێن.

فی شرح النسفیة: «قال حذیفة بن أسِید الغِفاری: اطلع رسول‌الله علینا، و نحن نتذاکر، فقال: ما تذاکرون؟ قلنا نذکر الساعة، قال: انها لن تقوم حتی تروا قبلها عشر آیات، فذکر الـدخان و الـدّجال والدابّة و طلوع الشمس من مغربها و نزول عیسی بن مـریم و یـأجوج و مـأجوج و ثلاثـة خسـوف: خسف بالمشرق و خسف بالمغرب و خسف بجزیرة العرب. و آخر ذلک نار تخرج من الـیمن تطـرد الناسَ الی محشرهم.

والاحادیث الصحاح فی هذه الاشراط کثیـرة جـدا، فقـد روی أحادیـث و آثـار فـی تفاصـیلها و کیفیاتها، فتطلب من کتب التفسیر والسیر والتواریخ إنتهی».

ئەم حەدیسە، کە حوزەیفـە لـە ئەسـیدی غیفارییـەوە دەیگێڕێتـەوە، موسـلیم و ئـەبووداوود و تیرمزی و نەسائیش لێیانەوە نەقڵ کردووە.

بێجگە لەم نیشانانە گەلێ نیشانەی تر لە فەرموودەکانی پێغەمبـەردا(د.خ) بـاس کـراون؛ وەک نەمانی زانیاریی ئایینی و زۆر بوونی فیتنـە و فەسـاد و، ئـازاردانی ئـەولاد بـۆ بـاوک و دایکیـان و، نەمانی شەرم و شۆ و، نەمانی ئاسایش لە دڵی ئینسـاندا و، زاڵبـوونی مـادە و بەرچاوبرسـییەتی و تەماعکاری و، رازیبوونی هەرکەس بە بیروڕای خۆی و، لەخۆباییبوون و، کەمبوونی میهرەبانی لە نێوان خزم و خوێشدا و، زۆربوونی سوێنی درۆ و شایەتیدانی بێئەساس و، بـاوەڕکردن بـە درۆزن و، باوەڕنەکردن بە ئینسانی راساڵ و، سپاردنی کاری گەورە بە کەسێ کە لە شانیا نـەبێ و پیـاوی ئەو بارە نەبێ و، نەمانی ئەمینی و دەسپاکی و، زۆربـوونی جوانکـاری و رازاندنـەوە لەسـەر رووی زەوی و، غەیری ئەمانە کە لە کتێبە گەورەکاندا نووسراون.

لە خودای گەورە دەپاڕێینەوە بمانپـارێزێ لـە بـەڵای ناگـەهان و شـەڕی شـەیتان و فیتنـەی ئاخرزەمان.

عـــەلامات زۆرن قســـەی لـــێ ناکـــەین
بـــەیانی ئـــەحواڵ بـــەرزەخ بێتـــە بـــەین

مـــەعلووم لـــە ئـــالای یـــەکێ حەیاتـــە
بەڵـــێ ئـــالای گشـــت ئـــالای مەماتـــە
وەســـــیلەی مـــــەهین (متـــاعٌ قلیـــل)
ڕێـــی دیـــنی مـــیهین (مطـــاعٌ جلیـــل)
خوسووس کە حەیات پەنجەی دا لە عـوود
هـەس نـەوای سـیوای لـە (أنـاالموجود)
نـە ئولووهییـەت حـەق‌حـەق هووەیـداس
نـــە عوبوودییـــەت خالیســـەی پەیـــداس
بـــێلان، دیـــت چلـــۆن دەنەوییـــەوە؟!
چەپـــە ڕاســـت بنێـــت بـــە زەوییـــەوە
سائیل و موجیب با حـەق هـەر خـۆی وێ
ڕوو بنوێنـــێ و کـــار مـــوددەعی تـــەی وێ
کـــە کەوتـــە لاوە ماســـی کـــەم نم بـــوو
تـــەقابول لاچـــوو چـــی زەڕڕە گـــوم بـــوو
مـــەوج و تەشـــاوی گشـــت چوونـــە لاوە
دەریا ساف، خورشید هەر وەک خۆی ماوە
چـــاوی بەســـــیرەت ئێمـــــە مژمـــــۆرە
ئەگەرنـــــە پێشـــــڕەو عیزرائیـــــل زۆرە
ڕویـــــنی یـــــاران گشـــــت وە دڵـــگیری
بگـــــردنی عـــــومر، زەعیفـــــی و پـــــیری
هـــەموو پێـــت دەڵـــێن: چـــاوت وا تێـــوە
تـــــەدارەک بکـــــە زوو بـــــێ بـــــە ڕێـــــوە

بەرزەخ: مابەینی دنیا و قیامەت. ئالای: نیعمەتەکانی خودا. ئالای گشت: ئەعلای گشت، واتـە: (ئالا) سووک‌کراوەی (ئەعلا) یە. ئالای مەماتە: ئەو نیعمەتانە لە مردنەوە دەڕژێن بەسەر ئینسـانی لەخواترسدا. مەهین: خوار و بێ‌نـرخ. ڕێـی: ڕێگـای. دیـن: بیـنین. مـیهین: گـەورەتر. عـوود:

ئالەتێکی موسیقایە. نەوا: ئاوازە. بێلان: لێی گەڕێ. دیت: بینیت. دەنەوییەوە: ئەچەمییەوە. ڕاست بنێت: لای ڕاستی بنێ. خۆی وێ: هەر خۆی بێ. ڕوو بنوێنێ: ڕوخساری خۆی پیشان بدا. مەوج: شەپۆل. تەشاو: ئاوێکە لە پاش شەپۆل لە قەراخدا دەمێنێتەوە. مژمۆر: نیمچە کوێر، چاوکز و پڕوپووشاوی. پێشڕەو: مقدّمە. ڕوێنی: ڕۆیشتنی. بگەردنی: تێپەڕینی. چاوت وا تێوە: چاوت لێیە؟

واتە: نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی قیامەت و نزیکبوونەوەی زۆرن، قسەیان لێ ناکەین، ئێستە باسی حاڵی مردوو دەکەین لە ماوەی نێوان مردن و هاتنی ڕۆژی قیامەتدا.

دیارە ژیان یەکێکە لە نیعمەتەکانی خودا، بەڵام لە هەموو نیعمەتەکانی بەرزتر نیعمەتی مردنە کە دەبێتە مایەی بەختیاریی نەبڕاوە و گەیشتن بە حوزووری زاتی خودای گەورە.

ژیانی ئینسان لە دنیادا هۆی دەستکەوتێکی کەم و بێنرخە، بەڵام ڕێگەی بینینی خوا کە لە قیامەتا ئەبێ بۆ موسوڵمانان، ڕێیەکی زۆر بەنرخە[٦].

بەتایبەتی کە ژیانی ئینسان دەستی گەیشتە تاری عوود و، کەوتە ناو ناز و نیعمەتەوە، لە عوودەکەی تەنها ئاوازی غوروور و (أناالموجود) دەنگ دەداتەوە، واتە ژیان و خۆشییە کاتییەکەی دەبێتە هۆی لەخۆبایی بوون؛ (إنّ الانسان لَیطغی أن رآهُ استغنی) نە خوایەتیی خودای گەورە چاودێری دەکرێت و نە بەندەگی و دڵسۆزی لە ناودا دەمێنێت.

دە واز بێنە با ئەم ژینە بەم لەخۆباییبوونەوە بڕوا تا کاتی پیری دێ، جا دەزانی چلۆن دەچەمیتەوە و دەمری وەها کە ناتوانی لە عەرز ڕاست بیتەوە و، لەشت وشک دەبێ و وەک کەوانی لێ دێ و، لە ناو گۆڕدا دەبیتە خۆڵ[٧].

واز بێنە با ڕۆژی قیامەت بێ ئەوسا خاوەن پرسیار و خاوەن وەڵام هەر خودا خۆی دەبێ. خۆی دەپرسێ: (لمن الملک الیوم؟) هەر خۆیشی وەڵام دەداتەوە: (للهِ الواحدِالقهّار).

لەم ڕۆژەدا خودا خۆی دەردەخات (وجوهٌ یومَئذٍ ناضرةٌ الی ربها ناظرة)، قسەی ئەو پێغەمبەرانە کە دەیانفەرموو خودا هەیە و کافران باوەڕیان نەدەکرد، بە ڕاست دەردەچێ، چونکە کە خودا بینرا ئیتر سەرپێچیی مونکیر بێجێ ئەبێ و دەعوا ئەپێچرێتەوە و خیلاف نامێنێ.

بەڵێ ئادەمزادی لەخۆبایی کە لە ئاوی ژیانی دنیای بڕاوەدا نەما و کەوتە لاوە، وەک ماسیی لە ئاو دەرهێنراوی لێدێ، هەروەها کە تیشکی خۆر نەما، کە ئەوسا زەڕڕە لەبەریا دەبینرا، ئادەمزادەکەیش ون دەبێ و نرخی نامێنێ. خولاسەی کەلام لە ڕۆژی دواییدا هەموو کەش و فشێ

فش دەبێتەوە، دەمێنێتەوە کرداری باش و بەس، شەپۆلی سامانی دنیا و پێوەندیی ژیان هەموو لە ناو دەچێ و جیهانێکی ساف و بێگەرد دەبێ و تیشکی تیژی عیلمی خـودا هـەروەک خۆیـەتی و هەموو کار و کردەوەی چاک و خراپی ئادەمزاد دەردەخات و هیچ جۆرە خۆشاردنەوە و فـڕوفێڵ و چاوبەستێک لە ئارادا نامێنێ تا فریای بکەوێ. ئێمە، ئەگەرچی چاوی سـەرمان هەیـە و دەبیـنین، بەڵام چاوی بینینی راستەقینەمان کز و بـێهێـزە، گـەلێ شـت نابینـێ، ئـەگینا نیشـانە و پـێش قەرەوڵی عیزرائیلی گیانکێش زۆرە، ئەم هەموو دۆست و برادەرانە کە بە ناکامی کـۆچی دواییـان کرد، تێپەڕینی تەمەن، بێهێزی و پیری، هەموو بە ئاشکرا پێت دەڵێن و دەیخەنەوە بیرت کە زوو کە، خۆت ڕێکخە، توێشوو هەڵگرە؛ سەفەرت لەبەرە.

***

١ـ ئەم عینوانە لە نوسخە دەستنووسەکەدا نییە، لە چاپەکەیشدا (مبحث علامات الآخرة) ە، عینوانەکـەی بـاوکم لەبارترە بە تایبەت بۆ شەرح.

٢ـ رُوِی: رۆیی. شێوە قسەی ناوچەی تاوگۆزیی زێدی مەولەوییە.

٣ـ بعد از، کە شێوەنووسی دەستنووسەکەیە بە (بەعدەز) دەخوێنرێتەوە وەک نووسیومەتەوە. بەعـد: دوا. ئـەز: لە، تێکرا بەعدەز: لە پاش، لەدوا.

٤ـ (بتبێ) سوارترە بەڵام (بیتبێ) بە شێوەی (بیت بێ) شێوە نووسینی نوسخەکان هەموویانـە. ئەڵـبەت (ی)ی (بیت) زەمیرە و بۆ ئەو نیشانانە دەگەڕێتەوە کە لە بەیتەکەدا باس کراون.

٥ـ دابة الارض من اشراط السعة تخرج بتهامة بین الصفا و المروة تنکت فی وجه الکافر نکتة سوداء، و تنکت فی وجه المؤمن نکتة بیضاء، فتفشو نکتة الکافر حتی یسودّ منها وجهه اجمع، و تفشو نکتة المؤمن حتی یبـیضّ منهـا وجهه اجمع. قیل طولها ستون ذراعاً ذات قوائم ووبر. (ابن منظور، لسان العرب، بیـروت، دار صـادر ١٩٥٥، المجلـد الاول، ص ٣٧٠).

٦ـ لە پەراوێزی نوسخە دەستنووسەکەدا لە پاڵ وشەی «مهین»دا بە فارسی نووسراوە: «خوار و بیقدر». لە پاڵ وشەی «دین»دا نووسراوە «رؤیت». هەروەها لە پاڵ «مِهـین» دا وشـەی «بـزرگ» دانـراوە. لـە نزیـک سـەرەتای بەیتەکەوە نووسراوە «استفهام» و لە دواییدا نووسراوە: «جواب: لا یَستوِیان».

واتە: مەهین: خوار و بێنرخ. دین: بینین. میهین: گەورەترین کـەس کـە خودایـە. بەیتەکـەیش بـە هـەردوو نیوەکەیەوە بە شێوەی پرسیارە و وەڵامی پرسیارەکەیش لەبەر تەنگیی ماوەی شیعر و لەبەر ئاشکرایی نەوتراوە. بـە کورتی مەولەوی دەڵێت:

ئایا ژیانی کورتی دنیا، کە هۆی بەدەس‌هێنانی مایەیەکی کەم و بێ‌نرخـە، لەگـەڵ مردنـدا کـە ژیـانی ئەبـەدی لەدوایە و ڕێگای بینینی خودای گەورەیە، وەک یەک وان؟ وەڵامەکەیش: نەخێر، هـەرگیز وەک یـەک نـین. بـەم حیسابە (و) یَکی عەتف لە نێوان هەردوو نیوە بەیتەکەدایە و لەبەر ماوە تەنگیی شیعر لابراوە.

٧ـ «چَپَە راس بنیت بە زَوِیَوَە» شێوەنووسی نوسخە دەستنووسەکەیە. لە چاپەکەدا نووسراوە: (چَپَە راس نبیـت بە زَوِیَوَە). دیارە ئەمە هەڵەیە. (چەپە) واتە: چەپ‌لەر، ئەوەی بە دەستی چەپ کاردەکـات، بـەلام مەبەسـتی پێـی بەدکارە، ئەنجا لە ڕووی قەواعیدی نەحوەوە ئەم (چەپە)یە دەبێتە (متنازع فیە) لە نێوان (دەنەوییەوە) و (بنێـت)دا و، هەر یەک دەیەوێ بیکاتە فاعیلی خۆی، واتە چلۆن چەپە دەنەوییەوە یا چەپە بنێت ڕاست بە زەوییەوە.

تێکڕای مەعنای بەیتەکە وای لێ‌دێت: وازبێنە بـا ئـەو بـەدکارە لای ڕاسـتی ڕوومـەتی لەسـەر تـەختی خـاکی گۆڕەکەی دانێت. نەتئەدی کاتێ بەسەر زیندوو بوو چۆن لەخۆبایی بوو و بە فیزەوە دەنەوییەوە؟ دیـارە موسوڵـمان لە پاش مردن لەسەر لای ڕاستی ڕووەو قیبلە دەنێژرێ.

## مبحث المنكر والنكير[1]

کــه مــردين ديتــر نامێنـــێ مــهجال
نهوبــهی مونكـــهره و نـــهكيره و ســـوئال
مـــردگ بـــاز رۆحـــی پێـــدا تێتـــهوه
(كمـــا فـــی الـــدنيا) وا دهوێتـــهوه
بــهد راكشــياگه وهک دهفــنی دهكــهی
چاک تێته سهر چۆک زهريف لهسهر خۆی
بــاری! يــاریدهر غـــهيری تـــۆ نييـــه،
دهڵێن رهببــت كـــێس؟ ديــنی تــۆ چييــه؟
(مــا فـــی قلـــبكم و مـــا فـــی فـــيكم)
(فـــی هـــذا الرجـــل المبعـــوث فـــيكم؟)
بــۆ (هــذا) مهحســووس موشــاههد دهوێ
دهشـــێ پێغهمبـــهر حـــازر بـــێ لـــهوێ
ئهر دهڵێی: ســاتێ چهنــد هــهزار دهمــرێ،
بوونی له گشــت جــێ تهســهوور دهكــرێ؟
له جوزئی دهرچــوو رۆح، كــه كــوللی بــوو،
مـــوحيط تێيـــهدا[2] موتهجـــهللی بـــوو،
ئـــهر لـــهو ســـاتهدا خـــۆی بنوێنـــێ
لــه چهنــد ســووهردا عهجــهب مــهمێنێ؛

(هـــذا صـــادِرٌ مـــن الأولیـــا
فمـــا ظـــنکم مَـــعَ الأنبیـــا؟[٣] )
هـــەر ئانـــێ خۆرشـــید موتەجەللییـــە
دووری و نزیکـــی تـــەفاوت نییـــە
جـواب هـەر تـەرز بـێ شـارەزای کوتـوب
لـــە تەفســـیلەدا نییەســـی حوجـــوب
حوســـنی خاتیمـــە مەجهوولـــە؛ بگـــری
واوەیـــلا لـــە حـــاڵ، هاهـــا (لا أدری)
تەماشـــای (کمـــا تَموتـــون) بکـــەی
دەڵـــێ چلـــۆن بـــووی وا جـــواو[٤] دەدەی
وەک سـوئال تـەعزیب فیرقـەی کـافیرین
تـــەعزیبی بـــەعزێ عاســـیی مـــوئمینین
تـــــەنعیمی موتیـــــع لـــــەگۆڕدا دەوێ
گشـت حـەقن ئیمـان (بالغیـب)ی تـەوێ

مردگ: مردوو. باز: دووبارە. دەوێتەوە: دەبێتەوە. بـەد. خـراپ. راکشـیاگە: راکشـاوە. بـاری: خوایا. تەوێ: دەوێ.

واتە: کاتێ کە مردین ئیتر ماوەی فڕوفێڵ نامێنێ، نۆرەی پرسیارکردنی ئەو دوو فریشـتەیە کـە ناویان مونکەر و نەکیرە؛ چونکە مردوو دووبارە گیانی بەبەرا دەکرێتەوە و وەک لـە دنیـادا ئاگـادار دەبێتەوە. لە کاتی شاردنەوەدا خراپ راکێشـرابوو، بـەڵام لـە دوایـیدا چـاک و بەئـەدەب راسـت دەبێتەوە و لەسەر چۆک دادەنیشێ و پرسیاری لێ دەکرێ.

ئەنجا مەولەوی جوملەیەکی موعتەرەزە بەکار دەهێنێ و دەفەرموێ: ئـەی خـوای گـەورە لـەو کات و شوێنەدا کەس نییە فریاڕەس بێ، هەر تۆی یارمەتیدەر.

فریشتەکان لێی ئەپرسن: خوات کییە؟ ئایینت چییـە؟ بەرامبـەر بـەم شەخسـە کـە نێررابـووە سەرتان و کرابوو بە پێغەمبەرتان چی لە دڵتانا بوو چی بەدەمتانا دەهات؟

بە بۆنەی وشەی (هذا) وە کە لە پرسیاری فریشتەکاندا ریوایەت کراوە مەولەوی دەفەرموێ: (هذا) بۆ ئیشارە بۆکراوی مەحسووس بەکار دەهێنرێ؛ وا دیارە حەزرەت(د.خ) لەو قەبرەدا حازر دەبێ.

جا ئەگەر بڵێیت لە سەعاتێکا هەزاران لەم ئوممەتی ئیسلامە ئەمرێ، ئیتر چۆن دەگونجێ تاقە رۆحێک لای ئەم هەموو مردووانە حازر بێ لە قەبرەکەیانا؟

لە وەڵامدا دەڵێین لە دەلیلە ئایینییەکانەوە دەردەکەوێ کە رۆح دوو جۆرە: رۆحی جوزئی کە بە رۆحێ دەڵێن قودسییەتی نەبێ و پێوەندی بە زاتی خودای گەورەوە کەم بێ، ئەم جۆرە رۆحە لە فەردییەت ناکەوێ، دووەم رۆحی کوللییە کە رۆحێکە قودسییەتی ببێ و پێوەندی بە خودای گەورەوە زۆر بێ، ئەم جۆرەیان با خۆی لە خۆیدا تاقە رۆحێک بێ؛ بەڵام خودا هێزی زۆربوونی شێوەی پێبەخشیوە و، ئەشێت لە یەک کاتدا بگاتە هەزاران شوێن و، بە هەزاران شێوە حازر بێ. ئەوەتە لە شەوی میعراجدا حەزرەت(د.خ) بە رۆحی گەلێ لە پێغەمبەران(د.خ) گەیشت لە (بیت-المقدس)، کەچی لە ئاسمانەکانیشدا پێیان گەیشت و لە هەمان کاتیشا هەریەک لەوانە پێوەندییان لەگەڵ قەبر و جێگەی خۆیشیانا هەبووە. جا مەولەوی کە ئەفەرموێ »موحیت تێیەدا موتەجەللی بوو» مەبەستی ئەوەیە کە رۆح لە جوزئییەت دەرچوو و بوو بە کوللی، ئیتر سیفەتی (احاطه) و بە گشت لا گەیشتنێکی تێدا دەردەکەوێ و دەدرەوشێتەوە. هەروەها دەفەرموێ ئەم جۆرە حاڵە لە ئەولیای ئوممەتەوە روودەدا کە لە پەیڕەوانی حەزرەتن ئیتر چۆن دەبێ شتی وا بۆ پێغەمبەران عەجایب بێ؟ دیارە کە خۆر دەرکەوت و تیشکی رووناکییەکەی بڵاو بووەوە پرتەوی هەموو شوێنێ دەگرێتەوە و دوور و نزیکی بۆ نییە، خۆی یەک شتە و ئاساری هەموو لایەک دەگرێتەوە.

بێگومان وەڵامی مردوو چاک بێ یا خراپ زانایانی کتێبە ئایینییەکان دەزانن پاداش چۆنە و هیچ شەرم و پەنهانییەکی تێدا نییە، دیارە ئەگەر باش وەڵام بداتەوە ئەوا شوێنەکەی گوشاد دەبێ و جێگەی خۆی لە بەهەشتا نیشان دەدەن، خۆ ئەگەر وەڵامی بە هاها؟ و (لا ادری) بوو، واتە: ها؟ و نازانم، پەنا بە خودا ئەوا گیرۆدەی مەرارەت و سزا دەبێ.

جا کە مادام ئاخرخێریی ئینسان نەزانراوە و کەس نازانێ ئاخری چۆن دەبێ چاک واتە بگریت بۆ خۆت ئەی برا، پێش ئەوە کە بمری تێبکۆشە و هەوڵ بدە و کردەوەت چاک بێ و ئامادە بە بۆ ئەنجامی باش.

تەماشای فەرموودەی حەزرەت بکەن کە فەرموویەتی: (کما تَحیَـونَ تَمُوتُـونَ، وَ کَمـا تَمُوتُـونَ تُبعَثُون) واتە: وەک چۆن لە دنیادا دەژین، وەهاش دەمرن و، وەک چۆن دەمرن، وەهاش زینـدوو دەکرێنەوە. جا کە تۆ باوەڕت بە زیندووکردنەوە لـەو دنیـادا ببـێ، بـۆ ئـەبێ بـاوەڕت بـە زینـدوو کردنەوە لە قەبردا نەبێ؟ بەڵگەی پرسیاری قەبر سیانە:

یەکەم: حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی دوعای (تثبیت) بکەن بۆ مردوو بەڵکو خـودای گـەورە لـە کاتی پرسیاردا زمانیان سابت بکا و نەبزڕکێنن.

دووەم: حەدیسێکە ئەبوو هورەیرە، خودای لێ رازی بێ، ریوایەتی کردووە:

«قال رسول‌الله (ص)، إذا قبر الرجل اتاهُ مَلَکان فَیَقولان: ما کنتَ تقـولُ فـی هـذا الرجـل الـذی بُعِثَ فیکم و فی الخلق اجمعین، فَیَقولُ: هو عبدالله و رسوله إن کان مؤمناً، و إن کان منافقـاً قـال: سمعت الناس یقولون فقلت مثله (لا ادری) » أی لا ادری فی الحقیقة انه نبیّ ام لا.

سێهەم: ئەو حەدیسەیە موسلیم لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەیگێڕێتەوە: «قال: قـال نبـیّ اللّه (ص)، انّ العبد اذا وضع فی قبره و تولّی عنه اصحابه إنه لیسمع قـرع نعـالهم، قـال: یأتیـه مَلَکـان فیقعدانه فیقولان له: ما کنتَ تقول فی هذا الرجل، قالَ: فأمّا المؤمن فیقـول أشـهد إنـه عبـدالله و رسوله، قال فیقال له: انظر الی مقعدک من النار قد أبدلک الله به مقعداً مـن الجنّـة، قـال نبـیّ الله (ص)، فیراهما جمیعاً، قال قتادة: و ذکر لنا إنه یفسح فی قبره سبعون ذراعاً و یملأ علیه خضراً الـی یومَ یبعثون»[٥].

پاش ئەمانە مەولەوی دەفەرموێ هەروەک لە گۆڕدا پرسـیار هەیـە سـزا و ئـازاردانی کـافران و موسوڵمانانی تاوانبار و خۆشحاڵیی موسوڵمانی لەخواترس و چاکیش هەیە، ئەمانە هەموو حـەق و راستن، تەنها ئەوەندەی ئەوێ ئینسان باوەڕی بە غەیب هەبێ.

ئەم سزا و ئازار و خۆشی و بەختیارییە لە قەبردا لە قورئـانی پـیرۆز و فـەرموودەی پێغەمبـەردا باس کراوە؛ ئەوەتە خوای گەورە دەربارەی کۆمەڵی کافرانی زەمانی حەزرەتی نـووح دەفـەرموێت (مِمَّا خَطیئاتِهِم أغرِقُوا فَاُدخِلُوا ناراً فَلَم یَجِدُوا لَهُم مِنَ دُونِ الله اَنصَاراً) [٦].

واتە: لەبەر ئەو تاوانانەی کردبوویان وەک کوفر و کوشتنی خەڵک، لە ئـاوی تۆفانەکـەدا غـەرق کران و، پاش ئەوە گورج خرانە ناو ئاگر. زاهیری ئایەتەکە ئەوەیە کە پاش خنکانـدنیان راسـتەوخۆ و بێ‌وچان خراونەتە ناو ئاگر.

هەروەها دەربارەی کۆمەڵی دەستە و دایەرەی فیرعەون دەفەرموێ (النارُ یُعرَضُونَ عَلَیها غُـدُوّاً وَ عَشِیّاً وَ یَومَ تَقُومُ السّاعَةُ أدخِلوا آلَ فِرعَونَ أشَدَّ العَذاب) (٧) زاهیری ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کـە ئەم سزادانە پێش ڕۆژی قیامەت، واتە: لە قەبردا بێت، چونکـە دوای «النـار...» «و یـوم تقـوم...» دێت، دیارە عەتف جیاوازیی بـەینی مـەعتووف و مەعتووفوعەلەیهـ دەگەیـەنێ و کـاتی ئـەم دوو سزایە لە یەک جیان.

دەربارەی حەبیبی نەججاریش فەرموویەتی (قیلَ ادخُلِ الجَنَّةَ، قالَ یا لَیتَ قَومي یَعلَمُـونَ بِمَـا غَفَر لی رَبّی وَ جَعَلَنی مِنَ المُکرَمین) (٨) زاهیری ئایەتەکە موژدەپێدانی پاش مردنیەتی ڕاستەوخۆ، دیارە موژدەپێدانیش یەکێکە لە نیعمەتەکانی خودا و لە بەرزەخدایە.

دەربارەی پرسیاری قەبریش دەفەرموێ: (یُثَبِّتُ اللهُ الَّذینَ آمَنُوا بِالقَولِ الثّابِتِ فی الحَیـاةِ الـدُّنیا وَ فـی الآخِـرَةِ وَ یُضِـلُّ اللهُ الظـالِمینَ وَ یَفعَـلُ مَـا یَشـاء) (٩) هـەروەها بـەرائی کـوڕی عـازەب لـە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی سزای قەبر نازڵ بووە کاتێ پرسیار لە مردووەکـە دەکـرێ: (مَن رَبُّکَ؟ فَیَقُولُ رَبِّیَ اللهُ وَ نَبِیّی محمد(ص)، فذلک قوله تعالی (یُثَبِّـتُ اللهُ الَّـذینَ آمنـوا بـالقول الثابت... الآیة) ) (١٠).

هەروەک وتمان لە فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا بەڵگە لەسەر ئەم سـزا و ئـازارە یـا خۆشـی و بەختیارییە هەیە: یەکێک لەوانە فەرموودەیەکی پێغەمبەرە کە بوخـاری و موسـلیم هـەردووکیان ڕیوایەتیان کردووە: «مَرَّ رسولالله(ص) علی قبرین فقال أما إنّهما لَیُعَذَّبانِ و ما یُعَـذَّبانِ فـی کبیـر زاد البخاری في روایة و انه لکبیر أمّا أحدُهما فکان یمشی بالنمیمة، و أمّـا الآخـر فکـان لا یسـتتِرُ من بولهِ و في روایة لا یستبرء...»(١١). (کان یمشي بالنمیمة) واتە دووزوبانیی دەکرد. مـەعنای «لا یستتر من البول»یش ئەوەیە کە کابرا عەورەتی نەدەشـاردەوە. بـەڵام مـەعنای «لا یسـتبرء مـن البول» ئەوەیە کابرا گوێی نەدەدایە بڕانەوەی تکەتکەی میزەکەی و پیس‌بوونی لەش و پۆشـاکی و پێش دڵنیابوون لە تەواوبوونی خۆی کۆ دەکردەوە.

بەیهەقی و (إبنُ أبیالدنیا) یش لە (إبن عمـر) ەوە ئـەم حەدیسـەیان بـە (مرفـوع)ی ڕیوایـەت کردووە «القبر حفرة من حُفَر جَهنَّمَ أو رَوضَةٌ من ریاض الجنة» واتە: گۆڕ یا ئەوەندە ناخۆش دەبێ دەبێتە چاڵێ لە چاڵەکانی دۆزەخ، یا ئەوەنـدە خـۆش دەبـێ دەبێتـە باغچەیـەک لـە باغچـەکانی بەهەشت.

موسلیمیش لە (إبن عمر) ەوە ریوایەتی کردووە: «أن رسول‌الله(ص)، قال: ان أحـدکم إذا مـات عُرض علیه مقعده بالغداة والعشیّ، إن کان من أهل الجنة فمِن أهل الجَنّةِ، و إن کان من أهل النار فمن اهل لانار، یُقَالُ هَذا مَقعَدُکَ حتی یَبعَثَکَ الله الیه یَومَ القیامَة»[١٢].

هەروەها لە سەحیحی موسلیم‌دا هەیـە کـە یـەحیای کـوڕی ئـەییووب و ئەبووبـەکری کـوڕی ئەبووشەیبە هەردووکیان حەدیسێکیان ریوایەت کردووە، وا لێرەدا بەشی دوایی ئـەو حەدیسـەتان دەخەینە پێش چاو:

«... ثم اقبل علینا بوجهه- أی النبی(ص) فقال: تعوّذوا بالله من عذاب النار، قالوا نعـوذُ بـالله مـن عذاب النار. فقال تعوّذوا بالله من عذاب القبر، قالوا نعوذُ بالله من عذاب القبر. قال تعـوّذوا بـالله مـن الفتن ما ظهر منها و ما بطن. قالوا نعوذ بالله من الفتن ما ظهر منها و ما بطن. قال تعوّذوا بالله مـن فتنةِ الدّجّالِ قالوا: نَعُوذُ بِالله مِن فِتنةِ الدّجّالِ»[١٣].

(إبن عمر) یش(ر.خ) لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە: «ما من مسلم یَمُـوتُ یَـوم الجمعـة أو لیلـة الجمعة إلّا وقاهُ الله فتنة القبر».

هەروەها لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە: «ان رسول‌الله(ص)، ترک قتلی بـدر ثلاثـاً ثـمّ آتاهم فقام علیهم فناداهم. فقال یا ابا جهل بن هشام، یا أمَیّة بن خلف، یـا عتبـة بـن ربیعـة،... یـا شبیة بین ربیعة! ألیسَ قد وجدتم ما وعد ربکم حقاً، فإنی قد وجدت ما وعدنی ربّـی حقـاً، فسَـمِع عمرٌ قول النبی(ص)، فقالَ یا رسول‌الله کیفَ یسمعون؟ وَ أنّی یجیبـوا و قـد جَیَّفـوا؟ قـال: والـذی نفسی بیدهِ ما أنتم بأسمَعَ لِما أقول منهم، و لکنّهم لا یقدرون أن یُجِیبُـوا، ثُـمَّ أمَـر بهـم فَسُـحِبُوا فَألقُوا فی قلیب بدر»[١٤].

تـەعزیب و تـەنعیم، لـە حـەق لامـەدە،
پێکـــەوە لەســـەر رۆح و جەســـەدە
لـە لای ئـەهلی حـەق راسـە و تاقییـە
رۆح بەعـدەز مـەوتی بـەدەن باقییـە[١٥]
وابـــزان ئەســـەح خەبـــەری داوێ
وەک عەجبی زەنەب[١٦] فەنای بـۆ نـاوێ
قول لە ئەمری رۆح هەڵنەکەی، بیبـەس!
(قُـل «الـروحُ مـن امـر ربّـی») بـەس

ئەمــە کــە دەڵــێن: مــەیيت جــەمادە
نــەحوی تــەعزیبی بــۆ نــاویٚ، بــادە
بــۆچ؟ بــا ئیجــاد کــا (معطــی للجــزا)،
لــە گشــت ئــەجزادا یــا بــەعزیٚ ئــەجزا،
(نوعــــاً مِــــن حیــــاة بِقَــــدرِ مــــا
یُــــــدرِکُ اللَّــــــذَّةَ أوالألَمــــــا)
(وَذا، لَعمــــــــری، لا یَســــــــتَلزِمَن
إعــــادة الــــروح لِــــذاک البَــــدَن)
(وَ لَــــا التّحــــرّک وَ لا الاضــــطراب
و لا أن یُــــری أثَــــرُ العــــذاب)
حەتتا مەسلووب و مـەقتوولی پـەڵپـەڵ
مـەئکوولی (فـی الـبطن یُحیـی و یُسـأل)
مونەعمــــەم دەویٚ، موعــــەززەب دەویٚ
هــیچ کەسـیچ چـاوی بـا پێـی نەکـەویٚ
(مُخفـی النـارِ فـی الشـجَرَ الأخضـر) [۱۷]
دەتوانــێ ئیخفــای ئەمانــە یەکســەر
ئــەم نەشــنەفتن و نــەدینی[۱۸] تۆیــە
نــاویٚ بــە (نــافی)ی ئــەم گفتوگۆیــە
دەلائیــــل زۆرن بــــاوەڕت بــــویٚ
تێفکــریٚ لــە لات کەســێ دەنــویٚ
لە خەودا دەگـری و دەڵـێ و دەشـنەویٚ
هەڵدەسـێ و دەڕۆت پێـی هەڵـدەکەویٚ
ئــــازاری دەویٚ یــــا شــــادمانی
تۆیچ هەر وای لە لای هـیچ پێـی نـازانی

(تَنَبَّـــــه الـــــى ذلـــــك التحريـــــر
«النـــوم أخ المـــوت» قـــد يشـــير) (١٩)
(قـــال فـــى الإحيـــا حجّـــةُ الاســـلام،
عليـــه الرحمـــة، فـــى هـــذا المقـــام)
مـــــەقاماتێ پـــــڕ شـــــيفا و ئيشـــــارات
(بعينهـــا اشـــرب دَفـــعَ الحـــرارات)

قول: قاچ، پێ. هەڵنەکەی: ئامادەی نەکەی بۆ گورج ڕۆیشتن و ڕاکـردن. ببیـەس: ببیەسـتە. بادە: بایە، بێنرخە، قسەی رووتە. تێفکرێ: ورد بەرەوە.

واتە: لە باسی سزای مردوو یا خۆشی و ئارامیی لە گـۆڕدا لـە ڕێگـای راسـتی حـەق لامـەدە و باوەڕت وابێ کە ئەم خۆشی و ناخۆشییە، ئەم ئازار و حەسانەوەیە بۆ تێکـڕای لـەش و گیانـە، واتـە ئەم دوانە پێکەوە ئازاریان پێدەگا و پێکەوە بێئازار و بـەختیار دەبـن؛ چونکـە لای ئـەهلی حـەق ڕۆح، واتە گیان، پاش مردنی ئینسانەکە هەر دەمێنێ، وای بزانە کە مـوخبیری راسـتگۆ خەبـەری داوە، وەک چۆن دەفەرموێ سەری کلێنچکە لە دوادوایی زنجیرەی بڕبڕەی پشتی ئینساندا ناڕزێ و دەمێنێتەوە، جا مادام ڕۆح باقییە و ماددەی لەشیش هەر هەیە سزا و خۆشی و ئازار و ڕەحـەتی بۆ لەش و گیانە هەردووکیان.

دەخیل سەد دەخیل نەکەی قولی لێ هەڵکەیت و، بڵێیت ڕۆح خوێنە یا تەڕاییـە و کاتـێ کـە ئینسان مرد ئەو خوێن و تەڕاییە نامێنـێ و وشـک و برینگـە و هەسـت بـە ئـازار و ناخۆشـی یـا ڕەحمەتی و بەختەوەری ناکات، ئیتر قولی بیرکردنەوەت ببەستە و مەیەڵە ئـەملاولا بکـات، تـەنها بڵێ نهێنیی گیان و چۆنیەتییەکەی کاری خودایە و هەر ئەو دەیزانـێ وەک لـە قورئـانی پـیرۆزدا خودای گەورە دەفەرموێ: (قُلِ الرّوح من أمر ربّی) بەپێی ئەم ئایەتـە حەقیقـەتی ڕۆح هـەر خـودا دەیزانێ و، لەوانەیە دەیان جۆری سزا و پاداش ڕووبکاتە گیان بێئەوەی کەس پێی بزانێ.

ئەو قسەیە دەیکەن و دەڵێن مردوو ماددەیەکی بێگیانە وەک داری وشک و بەردی ڕەقوتـەق، سزا و خۆشی ڕووی تێ ناکات و هەستی پێ ناکات، قسـەیەکی بـۆش و بـێکەڵـکە و وەک بایـە. لەوانەیە خوای گەورە هەست لە هەموو ئەندام و بەشبەشی لەشا یا لە هەندێکیانـدا دروسـت بکـا

ئەوەندەی هەست بە خۆشی و ناخۆشی بکات، لەمەیشەوە پێویست ناکا گیان بە تەواوی بۆ ئەو لەشە بگەڕێتەوە، یا مردووەکە جمەوجوڵ بکا، یا نیشانەی سزاکان بە لەشیەوە دیار بێ.

تەنانەت یەکێک کرابێ بە دارا، یا کوژرابێ و پەڵپەڵ کرابێ، یا دڕندەی کێوی خواردبێتی، یا نەهەنگی دەریا قووتی دابێ، هەر چۆن بێ و بە هەر حاڵێک بێ زیندوو دەکرێتەوە و پرسیاری لێ دەکرێ و هەست بە خۆشی و ناخۆشی دەکات، با هیچ کەسیش چاوی پێ نەکەوێ و کەس پێی نەزانێ.

ئەو خودا بە دەستەڵاتە کە بتوانێ لە داری تەڕا ماددەی ئاگر بشارێتەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ئاو و ئاگر دژی یەکن و پێکەوە نایانکرێ، دەتوانێ بە شێوەیەک لە شێوەکان، کە هەر خۆی دەیزانێ، مردوو زیندوو بکاتەوە تا پرسیاری لی بکرێ و هەست بە ئازار و خۆشی بکات.

ئیتر نەبینین و نەبیستنی تۆ بۆ ئەم پرسیار و سزا و ناسزای مردووە لە گۆڕدا نابێتە دەلیلی ئەوە کە نییە؛ ئەگەر بە چاوی باوەڕەوە سەیری مەسئەلەکە بکەی بەڵگە زۆرە.

نەختێ ورد بەرەوە یەکێک لە پاڵتا دەخەوێ، لە خەوەکەیدا کە خەو دەبینێ ئەگری، پێ دەکەنێ، قسە دەکا، قسە ئەبیسێ، هەڵئەسێ، دادەنیشێ، راست دەڕوات، یا پێی هەڵدەکەوێ، ئازاری پێ دەگا یا شاد دەبێ.

ئەمانە هەموو لە بن دەستتا روو دەدەن و تۆیش زەڕڕەیەک ئاگات لێ نییە، بەڵێ راستیان وتووە کە خەو برای مەرگە.

زانای گەورە و ناوداری ئیسلام ئیمامی غەزالی لە کتێبی (احیاء علوم الدین)دا لەم بابەتەوە چەند پایەیەکی باس کردووە کە دەرمانی دەردی بێباوەڕی و دوودڵییە، دە لەو سەرچاوە بخۆرەوە با تینوێتیت بشکێ و گڕی دڵت دامرکێتەوە.

بەڵێ ئیمامی غەزالی، خوای لێ رازی بێ، لەو کتێبەدا دەفەرموێ:

«لە باوەڕکردن بە وێنەی ئەم مەسئەلەیە سێ پایە هەیە، یەکەم ئەوەیە باوەڕت بێ بەوە کە مار لە پاڵ مردووەکەدا هەیە و پێیەوە دەدا، بەڵام ئێمە بە چاو نایبینین، چونکە چاوی ئێمە بە کاری بینینی ئەم جۆرە شتە نایەت؛ ئەم شتانە کار و باری غەیبین و زانینیان لە وزەی ئێمەدا نییە، نابینن یارانی پێغەمبەر(د.خ) باوەڕیان بەوە هەبوو کە جیبرەئیل دێت بۆ لای حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕیشیان بەوە هەبوو کە حەزرەت دەیبینێ، کەچی خۆیان هەرگیز نەیان دەبینی.

جا ئەگەر باوەرِت بەوە نییە کە جیبرەئیل هاتووەتە لای حەزرەت ئەوا برِۆ ئیمانی خۆت راست بکەرەوە، چونکە باوەرِ بەوە بایەخدارترە. خۆ ئەگەر باوەرِیشت بەوە هەیە ئەوا بزانە لەوانەیە هۆکانی ئازار و سزا و خۆشی و بەختیاریی مردوو هەبن و ئێمە پێیان نەزانین.

پایەی دووەم ئەوەیە کە تەماشای ئەحوالّی ئینسان بکەی کە لە خەودا تووشی مارێ دەبێ و پێیەوە دەدات، یا لەگەڵ کەسێکدا شەرِ دەکا و لە یەک دەدەن و بەو پەریشانی و ترسەوە خەبەری دەبێتەوە، ئەو کەسانەیش کە وان لە لایا هیچ نابینن.

گومان لەوەدا نییە کە نیسبەت بە کابرای نووستوو ئەو ئازارە راستە و خەیاڵ نییە و تیایا دەژی». ئای چەند پێی خۆشە کە خەبەری دەبێتەوە و لەو ئازارە رزگار دەبێ، ئاخۆ ئەگەر تا ماوەیەک یا تا رۆژی دوایی و زیندووبوونەوەی دووەم لەو خەوەدا بێ حالّی چۆن دەبێ؟

هەروەها ئیمامی غەزالی دەفەرموێ:

«پایەی سێهەم ئەوەیە باش بیر بکەرەوە کە زیانی مار لە زاتی خۆیدا نییە بەڵکو وا لە زەهرەکەیا، زەهرەکەیش بە هۆی ئێشەکەیەوە ئینسان پەرێشان دەبێ، جا ئەگەر ئەو نەوعە ئێش و ئازارە لە گیانی یەکێکدا ببێ بە بێ‌مار و ژار، راستە ئەگەر بڵێین فلان کەس ئێشی ژاری مار وا لە لەشیدا».

هەموو ئەم سێ پایەیە نیسبەت بە مردوو لە قەبرا شتێکی مومکینە و، هەرکەس باوەرِ بە یەکێ لەمانە نەکا لەبەر ئەوەیە فکری کورتە و ناگاتە مەعنا، ئەگەرنا هەموو سەهل و ئاسانن...

ئەر لە ئەدیللەی سەمعی گوێ بکەی
لەقی دەلیلان هەموو دەکەی پەی
ئەشرات و ئوموور بەرزەخی سابیق
واقیعاتی یەوم ئاخیری لاحیق
ئیمکانیان شکی تێدا نەماگە
بە وقووع سادیق خەبەری داگە
سەلەف باوەرِیان بووگە بە هەموو
(فلنقتدِین نحنُ بِهِمُ)

پەی: برِین. نەماگە: نەماوە. سادیق: راستگۆ، مەبەست حەزرەتە(د.خ). داگە: داوە. بووگە: بووە.

واتە: ئەگەر گوێ لە دەلیلە سەمعییەکان بگری، لە قورئان و سوونەتی پێغەمبەر(د.خ) کە بەلگەن بۆ ئیسباتی خۆشی و ناخۆشیی مردوو، ئەوەندە بەهێزن لقوپۆپی هەرچی دەلیلی بێ-باوەڕەکانە دەی‌بڕیتەوە و لە کەلکیان دەخەی.

نیشانە و کار و باری ماوەی بەرزەخ، پاش مردن و پێش قیامەت، ئەوانەی لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدەن لە خۆشی و ناخۆشی گومان لەوەدا نییە کە لە مومکیناتن، واتە: بوون و نەبوونیان شیاوە و لە خۆیانەوە نییە و لە شتە (ممتنع) ەکان نین. بۆ هاتنە دیشیان پێغەمبەری ڕاستگۆ خەبەری داوە. پێشینانی خواپەرست و لەخواترسیش باوەڕیان بە هەمووی بووە، دەبا ئێمەیش دوای ئەوان بکەوین و ئەو ڕێگایە بگرینەبەر کە ئەوان پیا ڕۆیشتوون.

***

١ـ ئەم سەرباسە لە نوسخە دەستنووسەکەدا نییە.

٢ـ ئەمە بەپێی شێوەنووسی دەستنووسەکەیە. بەپێی شێوەنووسی چاپەکە دەبێتە (موحیتی تێدا).

٣ـ چاپەکە (أولیاء) و (انبیاء)ی نووسیوە. شێوەنووسی دەستنووسەکە (اولیا) و (انبیا)یە کە دەبێتە ئەولیاء و ئەنبیاء. ئەم هەمزانە هیچ زیانێکیان نییە نازانم مەولەوی بۆ لای بردوون، بێجگە موراعاتی زیادەسواریی بەیتەکە هیچ هۆیە شک نابەم.

٤ـ لە چاپەکەدا (جواو) نووسراوە کە دەبێتە (جواوی).

٥ـ بڕوانە: صحیح مسلم بشرح النووی، ج ١٧، المطبعة المصریة و مکتبتها ١٣٤٩ هـ.

٦ـ ئایەتی (٢٥) سوورەتی (نوح).

٧ـ ئایەتی (٤٦) سوورەتی (غافر).

٨ـ ئایەتی (٢٦) و (٢٧) سوورەتی (یس).

٩ـ ئایەتی (٢٧) سوورەتی (ابراهیم).

١٠ـ بڕوانە: صحیح مسلم بشرح النووی، ج ١٧، سەرچاوەی پێشوو، ل(٢٠٤).

١١ـ هەمان سەرچاوە جوزئی (٣) ل(٢٠٠).

١٢ـ هەمان سەرچاوە جوزئی (١٧) ل(٢٠١-٢٠٠). واتە: هەریەک لە ئێوە کە دەمرێ بەیانی و ئێوارە شوێنی خۆی دەخرێتە پێش چاوی، ئەگەر بەهەشتی بێ لە بەهەشت و ئەگەر دۆزەخی بێ لە دۆزەخ، پێیشی دەوترێ: ئەمە شوێنتە تا ئەو ڕۆژەی خوای گەورە زیندووت دەکاتەوە و دەتنێرێ بۆ ئەوێ.

١٣ـ سەرچاوەی پێشوو، ل(٢٠٢).

١٤ـ سەرچاوەی پێشوو، ل(٢٠٧).

واتە: حەزرەتی پێغەمبەر سێ ڕۆژ کافرە کوژراوەکانی غەزای بەدری هێشتەوە، ئەنجا هاتە سەریان و پێی وتن: هەی ئەبووجەهلی کوڕی هیشام! ئومەییەی کوڕی خەلەف! عوتبەی کوڕی رەبیعە! شیبەی کوڕی رەبیعە! ئەو بەڵێنەتان دەس نەکەوت کە خوداتان پێی دابوون؟ بەڕاستی من ئەوەی کە خودام بەڵێنی پێدابووم دەسم کەوت. حەزرەتی عومەر گوێی لە فەرموودەکەی پێغەمبەر (د.خ) بوو و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوانە لە کوێ دەبیسن؟ وا بۆگەنیان کردووە؟ پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی بەو کەسەی گیانم بە دەستیەتی ئێوە قسەکانی من لەوان باشتر نابیسن، بەڵام ئەوان ناتوانن وەڵام بدەنەوە. ئەنجا ئەمری فەرموو لایانبەن و بیانخەنە قەلیبی بەدر کە ناوی بیرێکی کۆنە لەو شوێنەدا.

١٥ـ «بەعدەز» چۆن دەخوێنرێتەوە وەهام نووسییەوە، خۆی لە چاپ و دەسنووسەکەدا (بعد از) ە، واتە: لە پاش.

١٦ـ عَجبُ الذّنَب: بناخەی کلک لەوێوە کە دەس پێ دەکا. ئەوەی نووسیومەتەوە بەپێی نووسینی نوسخە دەستنووسەکەیە. لەوێدا (عَجبِ ذَنَب) نووسراوە و، ئەگەر شیعر نەبوایە دەیوت (عەجبی ذەنەبی... تاد). چاپەکە نووسیویە: (عەجبُ ذَنَب).

ئەوەیش کە وتوویانە دەمێنێ تەنها عەجبەکەیە، ئەگینا دەمانوت لەوانەیە (بۆری) (ب)ی (عَجبُ)ی چاپەکە واوی عەتف بێ و مەبەس ئەوەبێ عەجبیش و زەنەبیش دەمێنن، کەواتە نووسینی دەستنووسەکە تەواوە.

١٧ـ ئەمە ئیشارەیە بۆ ئایەتی (٨٠) لە سوورەتی (یس) کە دەفەرموێ: [الذي جعل لكم من الشجر الاخضر نارا فاذا انتم منه توقدون].

زانای گەورە ئالووسی (ر.خ) ئەفەرموێ: «المراد بهذا الشجر المرخ و هو ذكر الزندالاعلى و العفار و هو انثى الزندةالسفلى، و يسحق الاول على الثانى و هما خضراوان يقطر منهما الماء فتنقدح النار باذنِالله تعالى» بڕوانە: السيد محمود الآلوسي، روح المعاني، بولاق مصر، المطبعة الكبرى، سنة الطبع ١٣٠١هـ

١٨ـ دەستنووس و چاپ (نَدین) یان نووسیوە کە دەکاتە (نەدینی)، ڕاستەکەی دەبوا (نەدینی) بوایە، تا بە (نەدینیی) مان حیساب بکردایە.

١٩ـ بەپێی شێوەنووسینی دەستنووسەکە ئەگەر شیعرەکە بکەینە پەخشان و نەختێ روونتری بکەینەوە، بەمجۆرەی لێدێ: ـ

(تَنَبَّهْ، قد يشيرُ ما شاع بين الناس من أنَّ «النوم اخ الموتِ» الى ما حرّرناه) واتە: (النوم اخ الموت) فاعیلی (يشيرُ) یە.

## مبحث الآخرة و المعاد[1]

ئەر ئومـووری یـەوم ئـاخیر دەکـەی یـاد
(رُمْ تفلـــيلها؛ فمنـــــها المَعـــاد)
مـــوراد نـــە مـــەعاد رۆحـــانییەیـــە
بـــەڵ مـــوراد مـــەعاد جیســـمانییەیـــە
ئیجـادی ئـەجزای ئەسـلییـەی ئەجسـام
دووبـــارە (بَعْـــدَ الإفنـــا و الإعـــدام)
یـــاخۆ لـــــەدوای تەفـــــەرروقیان
پەرێشـــانییـــان، تەمـــــەززوقیان
جەمعی دووبـارە و بـە هـەم ضـەمکـردن
وەک ئـــەووەڵ ئـــەرواح پێـــدا ئـــاوردن
وەهـا شـەرع و عـورف ئەگـەر هەڵـکەون
پێیانـــدا بڵـــێن: ئەمانـــە ئـــەون
زەید ئەر ئیمسالـیچ زەیـد نییـە چییـە؟
گشـت کـەس دەزانـێ پارێنـە نییـە[2]
تەشەخخوســـێکی جگـــێچ دەوێـــنن
حـەقی پـاریچی هــەر لــێ دەسـێنن.

بە هەم ضەمکردن: خسـتنە پـاڵ یـەک. هەڵـکەون پێیانـدا: لووتیـان بتـەقێ بـە لووتیانـەوە.
ئیمسالیچ: ئیمسالیش. جگێچ: جگێش، جیایش. دەوێنن: دەبینن. پاریچی: پاریشی.

واتە ئەگەر بیر لە وەزعی قیامەت دەکەیتەوە تەفسیلەکەیم لێبپرسە تا بۆت باس بکەم، بەڵێ کاروباری قیامەت زۆرن. گەورەترین و بایەخدارترینی کارەکانی قیامەت مەعادە، واتە گەڕانەوە بۆ بوون پاش نەمان، گەڕانەوە و کۆبوونەوەی ئەندامەکانی لەش پاش بلاوبوونەوەیان، گەڕانەوەی گیان بو لەش پاش لێ دەرکردنی.

مەبەست لەم مەعادە مەعادی رۆحانی نییە، کە ئەوەتە رۆح بگەڕێتەوە بۆ حالی (تجرّد) و بێ پێوەندی لەگەڵ ماددەدا و، ئیتر سەروساختی لەگەڵ لەشدا نەمێنێ و بەو بێپێوەندییە بمێنێتەوە.

بەڵێ مەبەست لەم مەعادە مەعادی جیسمانییە، ئەوەتە کە خوای گەورە هەموو ئەندامەکانی لەش پاش فەوتان دروست بکاتەوە، وەک ظاهیری ئایەتی [قل یحییها الذی أنشأها أوّل مرّة][٣] دەلالەتی لێئەکا، ئەوەتە هەموو ئەو ئەندامانە کۆبکاتەوە کە پرش‌وبلاو بوون و هەریەکی کەوتووەتە لایەک، وەک ظاهیری ئایەتی [أیحسب الانسان ألّن نجمَع عِظامه. بَلی قادِرین عَلی أن نُسوِّیَ بَنانَه][٤] دەیگەیەنێ.

ئیتر بە هەر شێوەیەک لەم دوانە هەبێ ئینسانێکی وەها پەیدا ببێ بە شەرع و عورف بلێن ئەم ئینسانە فلان کەسە کە لە دنیادا بووە و لە کات و شوێنی تایبەتیدا ژیاوە.

جا ئەگەر کەسێ ڕەخنە بگرێ و بلێ: ئەگەر مەعاد بە دروستکردنی خودی شەخسە فەوتاوەکەیە ئەوا لازم دێ نەبوونێ بکەوێتە بەینی شت و نەفسی خۆیەوە و ئەمەیش مەحاڵە، چونکە شتێکی تایبەتی مومکین نییە و ناشێ ببێتە دوو شت تا نەبوون بکەوێتە بەینیانەوە. خۆ ئەگەر مەعاد بە کۆکردنەوەی پارچەپارچە جیاجیاکانە، ئەمەیش هەر مەحاڵە چونکە ئەو پارچەپارچانە نەماون تا کۆبکرێنەوە، وە ئەگەر بلێین ماون ئەمجا پێویستە بە تەرکیب و هێنانەوەی ماددەی گۆشت و ڕەگ و پێستە کە بۆ تەواوکردنی شەخسێ وەکوو شەخسی پێشوو، ئەمەش مەعنای وایە کە ئەم شەخسە موعادە عەینی شەخسی پێشوو نییە، بەڵکو وێنەیەتی، دیارە تەعذیب و تەنعیمی وێنەی شەخسی پێشوو موافیقی عەدالەت نییە.

خۆ ئەگەر هەر وێنەیەکی کابرای دنیا دروست دەکا لە مادە و ئەجزاییکی تر، ئەمەیش لەوەی پێشوو زیاتر لە عەدالەتەوە دوورە، چۆن دەبێ یەکێ لە دنیادا تاوانی کردبێ و وێنەی ئەو شەخسە لە قیامەتدا سزا بدرێ؟

ئەڵێم: وەڵامی ڕەخنەی یەکەم ئەوەیە کە گەڕانەوەی عەینی فەوتاوەکە نابێتە هۆی ئەوە کە نەبوون بکەوێتە نێوان شت و نەفسی شتەکە خۆی، تەنها ئەوەی لێ پەیدا دەبێ کە نەبوون بکەوێتە مابەین کاتی بوونی پێشووی کەسەکە لە دنیادا و کاتی بوونە دواییەکەی لە قیامەتدا، ئیتر کەس هەر عەینی کەسەکەی دنیایە؛ بوونی پێشووی ئەو شەخسە لە دنیادا و بوونی دوایی لە قیامەتدا دژی ئەوە نییە کە شەخسەکان یەک بن، دەبا زەید لە دنیادا ببێ و لە قیامەتیشا ببێ و نەبوون بکەوێتە بەینی ئەم دوو کاتە کە کاتی بوونی زەیدن لە دنیا و لە قیامەتا.

وەڵامی ڕەخنەی دووەم و سێیەمیش ئەوەیە هەموو موسوڵمانان باوەڕیان وایە کە ڕۆح خالیدە و هەتا هەتایە دەمێنێت و لەناو ناچێ، واتە هەرچەندە ڕۆح لە نەبوونەوە دروست کراوە، بەڵام پاش بوون نافەوتێ. لەڕاستیشا هەر ڕۆحە بناخە و ئەساسی ئیعتیبار وەرگرتنی ئاثار و خۆشی و ناخۆشی و ساغی و ئازارە. کە وابوو گێڕانەوەی ڕۆح بۆ بەدەنێ کە لە نەبوون دروست بکرێ، یا لە پارچەپارچەی پەرتوبڵاوی پێشوو دروست بکرێ، یا بۆ بەدەنێ کە وێنەی بەدەنی پێشوو بێ زیان نادا لە شەخسییەتی عەینی و عورفیو نیظامیی ئەو شەخسە کە ناومان نا(زەید)، ئەوپەڕەکەی ئەوەیە هەندێ عەواریضی تایبەتی بگۆڕێ، ئەوەیش نابێتە هۆی ئەوە کەشەخسەکەی ڕۆژی قیامەت شەخسەکەی دنیا نەبێ.

بۆ نموونە ئەگەر ساڵی پار پارەیەکت بە قەرز دابێتە یەکێک و ئەمساڵ داوای قەرزەکەی لێ بکەیتەوە کارێکی ڕەوایە و کەس ناڵێ بۆچ داوای قەرزەکەی لێ ئەکەی، خۆ ئەم شەخسە ئەوەکەی پار نییە؟ کەچی لای زانایان ئاشکرایە خەلییەکانی لەشی ئینسان هەمیشە لە گۆڕاندان و کۆن دەڕوا و تازە دێتە شوێنی.

به کورتی گۆڕانی لەش یا گۆڕانی وەسف نابێتە هۆی گۆڕانی شەخس و زۆر بوونی.

قسەی لای ئێمە ظەریف جەلییە
لە ئیجادی جەمع ئەجزای ئەسلییە
(مـن بعـد احـدی تَـيْنِ الصـورتین)
ئەرچی حەق واوێ تەوەققوف بکەین،
وەهمی تەناسوخ ئەوا غەلەط بوو
خواردنی ئینسان ئینسان سەقەط بوو

واتە: قسە و باسی مەعاد لای ئێمە زۆر ئاشکرایە، کە بریتی‌یە لـە دروسـت‌کردنـەوەی ئەنـدامی پێشووی مردوو پاش نەمان و لەناوچوونی تەواو، یا کۆکردنەوەی ئەنـدامی پێشـووی مـردوو پـاش پرش‌وبلاوبوونەوەی و لەهەردوو حالا گیان بەبەرداکردنەوەیان. ئەمەیش لەبەر رووناکیی ظـاهیری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز کە بۆ ئەم باسە هاتوون. ئەگەرچی ئێمە حەق وایە تەوەققوف بکەین لـە تەرجیحدانی یەکێ لەم دوو حالە بەسەر ئەوی‌تریاندا.

جا هەرکام لەم دوو شێوەی مەعادە بریار بدەین بۆچوون و رای هەلە و بـێ‌کەلـکی ئەوانـە کـە ئەلێن ئەو مەعادە ئایینی ئیسلام بڕیاری داوە(تناسخ)ە پووچ و بـێ‌نـرخ دەرچـوو. چونکـە ئـەهلی تەناسوخ ئەلێن پاش ئەوەی ئینسان مرد ڕۆحەکەی دەچێتە لەشـی بەچکـەی گیـان‌لەبـەرێ کـە لەگەڵ کردەوەی مردووەکەدا بگونجێ، بۆ نموونـە ڕۆحـی ئینسـانی فـێڵبـاز ئـەڕوا بـۆ بەچکـەی ڕێوییەک کە لە سکی دایکیا بێ و هێشتا لـە هێلکـە دەرنـەچووبێ! تـاد. ئیتـر لەشـی مردووەکـە لەگەڵ ئـەم لەشـە دواییـەدا، کـە ڕۆحەکـەی بـۆ ئـەچێ، هـیچ پێوەندییـەکی نابـێ، ئـەم جێگـا گواستنەوەی ڕۆحەیش هەر لە دنیادا دەبێ.

بەلام ئەو مەعادە کە ئێمە باوەڕمان پێی هەیە لـەم دنیایـەدا نییـە و لـە ڕۆژی قیامەتدایـە کـە جیهانی ژیانەوەی دوایی نەبڕاوەیە و، وەک لە پێشـەوە وتمـان مـاددەی ئـەم موعـادە لـە پارچـە ئەسلییەکانی مردووەکەیە کە خوای گەورە پاش فەوتان دروستیان دەکاتەوە، یا ئـەو پارچەپارچـە پرش‌وبلاوانەیە کە خوای گەورە پـاش پـرش‌وبلاوبوونـەوەیان کۆیـان دەکاتـەوە، دیـارە تەناسـوخ پێوەندی بە مەعادەوە نییە.

هەروەها بەهۆی رەچاوکردنی بەشە ئەسلییەکانی ئینسانەوە لە مەسئەلەی مەعاددا رەخنـە بـە خواردنی ئینسانێک بۆ ئینسانێکی تر رەد دەبێتەوە؛ گوایا رەخنەگر وتوویەتی ئەگەر ئینسانێک لـە دنیادا ئینسانێکی تر بخوا و گۆشتی خوراوەکە ببێتە ماددەی لەشـی بخـۆرەکـە، ئـەوە ئەگـەر لـە قیامەتا لە بخۆرەکەدا ئیعادە بکرێتەوە خوراوەکە مـەعادی نابـێ. ئەگـەر لـە خوراوەکـەدا ئیعـادە بکرێتەوە بخۆرەکە مەعادی نابێ. خۆ ئەگەر لە هەردووکیاندا ئیعادە بکرێتـەوە ئـەوەی لـێ پەیـدا دەبێ کە تاقەکەسێک دوو مەعادی ببێ، ئەمانەیش هەموو پووچ و بێ‌مەعنان.

بەڵێ ئەم رەخنەیەش رەد دەبێتەوە؛ چونکە ئێمە بۆ ئیعادە و سەرلەنوێ دروست‌کردنـەوە ئـەو ئەجزا ئەسلییانە ڕەچاو دەکەین کە لە کـاتی ژیانـدا پێویسـت بـووە بـبن و، لەوانەیـە ئـەو ئـەجزا ئەسلییانە خوا نەیانکا بە ئەجزای کابرای بخۆر و بیانپارێزێ.[٥]

ئەر بلّیٚ لە جوزء ئەصلی (یَحْتَمِـل)
نوطفــەیــە بــویٚ (وذاکَ مُشــکِل)
دەڵـــێم (لَعَــلَّ جَنــابَ البـــاری)
حیفظـی کـا وقـووع نـەدا دیـاری

واتە: ئەگەر بڵێت لەوانەیە هەندیٚ لەو ئەجزا ئەسڵییە کە کابرا دەیخوا ببێتە نوطفە بۆ مـاددەی ئینسانێکی تر ئەوا ئیشکالە پێشـووەکە دووبـارە روو دەداتـەوە، چونکـە وا ئـەو نوطفـەیـە بـوو بـە ئینسانێکی لیٚپرسراو، لە هەمان کاتدا چونکە بەشـێکە لـە ئەندامـە ئەسڵـییەکانی کـابرای خـوراو لەویشدا هەر لیٚپرسراو دەبیٚ، دیارە دوو مەسئوولییەت بۆ یەکێکی تەنیا لەسەر یەک شتی دیـاری ناچێتە عەقڵەوە. ئەم زەلامە یا دەبیٚ بە حیسابی پێشوو بەرپرسیار بیٚ یا بە حیسابی دوایی.

لە وەڵامدا دەڵێم بەڵکو زاتی خودای گەورە ئەو پارچانە بپاریٚزیٚ لەوە کە ببن بە بەش و نوطفـە و ئینسانێکی تریان لیٚ دروست بکریٚ و ئەم نموونەیە کە تۆ بە ئیحتیمال دایـدەنێی نەیەتـە جـیٚ، دیارە رەخنەی لەسەر ئیحتیمال دامەزراو بە وەڵامێکی لەسەر ئیحتیمال دامەزراو رەد دەدرێتەوە.

مەعاش تەنگ دەکـا ئینکـاری مـەعاد
(لَـــا تُنکِـــر کَمَـــا بُـــدِءنا نُعَـــاد)
بـۆچ؟ مـاددە قابیـل، بـەڵ قـابیلترە
قـودرەتی قـادر وەک خـۆی حاضـرە
(بَـــیْنَ الوجـــودَیْن أوِ الایجـــادَین)
چـە ئیختیلافـیٚ مەظـەننـە دەبـەین
ئـەر دەکـەی ئینکـار یـەکیٚ لەمانـە
تێڵـــێتە چـــاوت قورئـــان «بَنَانـــە»
پشـتشـکێنە بـار ئـەم طـەرزە فامـە
(هَـــلاَّ یَخَـــافُ المُنکِـــرُ عِظامَـــهُ؟
(فِرْقَـــةُ العِنـــاد قَـــد ماتَـــت، أیْهـــا..
فَـــاقْرَأنْ «یـــس» حتّـــی «یحییهـــا»

ئەر پێشەی سەردەس مەفتووتی (أَبیّ)
جـەوابی حـەڤـرەت تـەماشـا دەکـەی
تێژیی قـەطعیـی ئـەو طـەرزە دەلیلـە
برنــــدەی رەگــــی دلــــی تەئویلــــە

واتە: باوەڕ بە مەعاد نـەکردن ژیـان بـە ئینسـان تـەنگ دەکـا، تـەنگاوی دەکـا و تـەنگی پـێ هەڵدەچنێ ؛ دەخیل نەکەی ئینکاری زیندووبوونـەوە بکـەی! چـۆن دروسـت کـراوین وەهـایش دووبارە دروست دەکرێینەوە. ئەم زیندووکردنەوەیـە (فاعـل) و (قابـل)ی دەوێ، مـاددەی لەشـی ئینسان قابیل و لەبارە و بگرە لە کاتی دووبارە دروستکردنـەوەدا قـابیلترە، ئەوسـا لـە سـەرەتای دروستکردندا بوونی لێ پێش نەکەوتبوو، لە کـاتی مـەعاددا بـوونی لـێ پـێش کـەوتووە و زیـاتر ئامادەیە بۆ ئەوە کاری تێدا بکرێ. فاعیلیش راتی پـەروەردگارە و قـودرەت و توانـای وەک خـۆی حازرە و هەرگیز زەبوونی و بێهێزی رووی تێ ناکا. ئەڵبەت بۆ باسکردنی ئـەم راسـتییە خـودای گەورە دەفەرموێ: [هو الذی یَبْدَأ الخلقَ ثم یُعیدُهُ وَهُوَ أهوَنُ عَلَیْهِ][٦]

لە بەینی ئەم دوو بوونەدا، بوونی زەید لە دوێنێدا و بوونی لە ئەمڕۆدا، واتـە بـوونی لـە دنیـادا و بوونی لە قیامەتدا، یا ئەم دوو ئیجاد و دروستکردنە، ئیجادی دنیا و ئیجـادی دووبـارەی قیامـەت، هیچ جۆرە جیاوازییەک نییە.

جا ئەگەر ئینکاری (وجود)ی زەید دەکەیت لە کاتی مەعاددا، یا ئینکاری دووبـارە ئیجادەکـەی دەکەیت لەلایەن خودای گەورەوە، ئەوا قورئانی کـەریم سـەری پەنجـە بـە چاوەکانتـا دەکـات و دەیهێڵێتەوە تیایا. کەلیمەی (بنانە) ئیشارەیە بۆ ئایەتی [بلی قادرین علی أن نُسَوِّیَ بَنانَه][٧]

باری قورسی ئەم جۆرە تێگەیشتنە کە لەڕاستیدا تێنەگەیشـتنە، ئەوەنـدە قـورس و نالـەبارە پشتی ئینسان دەشکێنێ، مونکیری بێباوەڕ بـە مـەعاد ناترسـێ لـە ئێسـکی خـۆی، ناترسـێ لـە پاشەڕۆژی خۆی؟. ئەمەیش ئیشارەیە بۆ ئایەتی [أَیَحْسَبُ الإنسانُ أَلَّن نَجْمَعَ عِظَامَه][٨]

کۆمەڵی عەناد مردن، دەمێکە مردوون بە نەخۆشیی ئەم عەنادە، وەرە سوورەتی (یس) بخوێنـە تا دەگەیتە ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: [وَ ضَرَبَ لَنا مَثلاً وَ نَسِیَ خَلْقَه قَالَ مَنْ یُحیی العظـامَ وَ هِـیَ رَمیم. قُلْ یُحیِیهاالذی أنْشَأها أوّلَ مَرَّةٍ وَ هُوَ بِکلِّ خَلْقٍ علیم][٩]. ئەم قسەیش ئیشارەیە بۆ ئەوە کـە لە قورئاندا باسی زندووکردنەوەی مردوو هەیە و بۆ موسوڵمان ناشێ دوودڵ بێ تیایا.

هەروەها ئەگەر ئێسقانێکی رزیو بخەیتە سەر دەستت و بڵێی: ئەم ئێسقانە رزیوە چۆن گیانی پێدا دێتەوە؟ وەلامی راست لە پێغەمبەری خوداوە دەبیسی. ئەمەیش ئیشارەیە بۆ ئەوە کە رۆژێ (أُبَیّ) کوڕی (خَلَف) کە کافر بوو هەندێ ئێسکی رزیوی خستە سەر دەستی و بردی بۆ لای حەزرەت(د.خ) و بە سەرکەشی‌یەکەوە وتی: (هل تزعم أن الله یبعث هذا؟) حەزرەت لە وەلامدا فەرمووی «والذی نفسی بیده لیبعثنّک الله وَ لَیُدخِلَنَّکَ النار».

بە راستی ئەو ئایەت و حەدیثانەی دەربارەی ئەم مەسەلەیە هاتوون، ئەوەندە قەطعی و تیژ و بەهێز و کاریگەرن رەگی تەئویلیان بڕیوە و ماوەی ئەوە نادەن لە مەعنای راست و رەوانی خۆیان لابدرێن و، عەقڵ بە تەواوی رام دەبێ بۆ باوەڕکردن بە مەعادی جیسمانی، رَزَقَنا الله السعادة فی‌المعادِ بِرحمتهِ.

شیعەیێ وتی: خۆ یەقینی‌یە
لە لامان مەعاد جیسمانی نییە
بەدەنێ ترە (خالِقُ العباد)
دەیکاتەوە وەک ئەووەڵ جار ئیجاد!
وتم: لاشەی کێس بۆ لای نەجەف چوو
بەو بۆی خۆشەوە؟ خۆشی مەبهووت بوو!

زوو باسمان کرد مەعادی جیسمانی بە کۆکردنەوەی ئەو ئەجزا ئەسڵیيانە دەبێ کە لە دنیادا لە یەک جیابوونەتەوە، نەک بە دروستکردنی وێنەیان. جا بۆ پێ‌سەلماندنی ئەم قسە مەولەوی دەڵێ: رۆژێکیان شێعەیێ وتی لای ئێمە بڕاوەتەوە کە دووبارە دروستکردنەوەی مردوو بە کۆکردنەوەی پارچەپارچەکانی لەشی نییە، بەڵکو خودای گەورە وێنەی لەشە پێشووەکە دروست دەکاتەوە! منیش پێم وت: کەواتە ئەی بۆچی ئەم لاشە بۆن‌خۆشانەتان دەگوێزنەوە بۆ نەجەف؟ ئیتر پاش وەلامەکەم گورج کش‌ومات و بێ‌دەنگ بوو.

***

١ـ ئەم سەرباسەیش تەنها لە نوسخە چاپەکەدا هەیە.

٢ـ پارێنە: گوێرەکە کە سالێکی تەواوکردبێ و پێی نابێتە سالی دووی.

لە دەستنووسەکەدا لەپاڵ ئەم کەلیمەدا نووسراوە: (فیە لطافة) واتە: دوو مەعنا هەڵدەگرێ: یەکەم: قابیلە هەر زەیدی پار بێ و بەس و هی ئەمسال نەبێ؟

دووەم: ئەگەر زەیدەکەی پار نەبێ چییە؟ قابیلە پارێنە بێ؟!

تێکرا کەلیمەی (ئیمسال) ئیشارەیە بۆ ڕۆژی قیامەت و (پار) بۆ ڕۆژانی دنیا، کە بنیادەمەکان بە سەر زینـدوون، چونکە باسەکە حیکایەتی قیامەتە.

٣ـ ئایەتی(٧٩) سوورەتی (یس).

٤ـ ئایەتی(٤ـ٣) سوورەتی (قیامە).

٥ـ ئەوی ڕاستی بێ باسی ئەم سەرلەنوێدروستکردنەوەیەی ڕۆژی قیامەت بەم شـێوەیە و ئـەم ڕەد و بەدەڵـە بێبەرودوایە کە ئەجزای پرژوبڵاوی مردوو کۆدەکرێتەوە و سەرلەنوێ ڕۆحەکەی پێوە دەبەسرێتەوە، یا ئەجزای نەما و سەرلەنوێ دروست دەکرێتەوە، یا لە (عَجْبُ الذَّنَبَ) ەوە سـەرلەنوێ ژیان هەڵدەداتەوە، هەمووی فەرزییـاتێکن لـە خەیاڵدا نەبێ جێگایان نابێتەوە، نە دەلیل ئەو هێزەی هەیە و نە ڕەخنەگر ئـەزانێ چـی دەڵـێ و نـە ڕەددەکـەیش ئەزانێ چۆن دەس ئەوەشێنێ. (دەلیل دارینە پێیە، ڕەخنەگر بەتەواوی بێ‌پێیە).

مەسئەلەکە بەمجۆرە دەخرێتە پێش چاو: سـەرەتای مەسـئەلەکە (خـودا) یـە؛ ئـەوەی لـە بنەڕەتـدا و لـە تێهەڵچووندا باوەڕی بە خودای خالیق هەبوو، باوەڕی هەبوو کە دنیا و (مافیها) لە نەبوونەوە دروست بووە و، یەکێ دروستی کردوون نەبوونی لێ پێش نەکەوتووە و نەبوونیشی بەدوادا نایە، ئەبێ باوەڕیشی بەوە هـەبێ کـە جـارێکی تریش ئەو دنیایە دروست دەکرێتەوە، جا ئیتر چۆن دروست دەکرێتەوە ئەوە هەورازێکـە هـی بـڕین نییـە، هێـزی ئینسانیش ئەو هێزە نییە پەی بەو نهێنییە بەرێ، هەموو ئەوانەیش ئەم ڕێگا دوور و درێژەیان گرتووەتە بـەر دوایـی ناچار بوون ئالای بەزین هەڵکەن و کۆڵ بدەن و بگەڕێنەوە سەر ئەو دوو باوەڕەی باسمان کردن. پەی‌نەبردنیش بە حەقیقەتی ئەم مەسئەلەیە سەیر نییە، بۆچی خەلق یا ئیعادە کاری خودا نین؟ کەی کارەکانی خودا یا سیفەتەکانی خودا بە پێودانی کاری بەندە و سیفەتەکانی بەندە حسێب دەکرێن؟! ئینسان کە باسـی ئـەم ئـەجزا و ئـەجزاکاریی لەش و مەعادە دەخوێنێتەوە کارگای لەحیمسازی یا مێزی عەمەلییاتی نەخۆشی دێتە بەرچاو.

گەڕانەوە بۆ نەسی قورئانی پیرۆز تاقـە ڕێگایـە بـۆ ڕزگـاربوون لـەم سەرەسـوڕەیە، ئـەم جـۆرە لێکدانـەوە مەنتیقییە نامەنتیقیانە سەرلێ‌شێوان نەبێ هیچیان لێ نادووریەوە، سەیرێکی ئەم ئایەتانە بفەرموون: ـ

[و ضَرَبَ لَنا مثلاً و نَسِيَ خَلقَه، قالَ من يُحيِيالعِظام وَ هِيَ رَمِيم؟ قُل يُحيِيهاالذي أنشـأها أوَّلَ مـرَّة وَ هُـوَ بكـلّ خَلقٍ عليم] یا [ وَ قَد خلقتك من قبلُ وَ لَم تكُ شيئاً] یا [إن كُنتُم في رَيبٍ مِنَ البعث فإنا خلقناكُم مِن تـراب] یـا [فلينَظُرِالإنسانَ مِمَّ خُلِق] یا [وهُوالذي يبدءالخلق ثُمّ يُعيدُهُ وَهُوَ أهْوَنُ عليه.]

توخودا هەر بەپێی عەقڵـی کـورتی ئـادەمزاد و توانـای ئـاوەزی کـەموکـووڕی، کامیـان ئاسـانترە: یەکـەم دروستکردن یا دووبارەکردنەوە؟

٦ـ ئایەتی (٢٧) سوورەتی (روم).

٧ـ ئایەتی (٤) سوورەتی (قیامە).

٨ـ ئایەتی (٢) سوورەتی (قیامە).

٩ـ ئایەتی (٧٩ـ٧٨) سوورەتی (یس).

## مبحث الحساب والكتاب والصراط والميزان[1]

(منهــا المجــازاة) حيســاب و كيتــاب
ئەر دەکەی طەلەب حیکمەتی حیساب
تــا بــزانن گشــت ئــەهلی عــەرەصــات
فەضلی موتتەقین، فەضیحەی عوصات
تــەتميم بــێ لــەبۆ مەســەڕڕەی ئــەوان
بــۆ تەئەســسـوف و حەســرەتی ئــەوان
وەرنــــە(عَــــالِمُ الاشْــــياء بــــالمَرّةْ
لا يَعْــــزُبْ عَنْــــهُ مِثْقَــــالُ ذَرّةْ)
(وَمِنْهَــا الصِّــراط و كَــذَا الميــزان)
جــارێ نەوبــەتی صــیراطە بیــزان:
جیســرێکە بەســەر دۆزەخــدا تــا ســەر
(أحَــدّ مِــنَ السَّــيْفْ، أدَقّ مِــنْ شَــعَرْ)
بۆ تــەمامی خەڵــق یەکســەر مەعبــەرە
نموونــەی ڕێگــەی شــەرعی ئــەنوەرە
وریــا وە لــەم ڕێ نــەختێ کــل نــەوی،
لــەم ڕێگــە لاتدا لــەوێ دەکــەوی
طوولی پێ نــەدەین دیتــر گفــتوگــۆی
وا بەمــــدا دەڕۆی بــــەودایچ وا دەڕۆی

گــوزەر بــە عــادەت ئــەرچی مەحالــە
مومکینــە (بالــذات) قــودرەت لــە مالــە
ئــاخر بــۆ تــەعــذیب ناپاکــان دەویٚ
چاکــان و پاکــان پــەکیان ناکــەویٚ
تەنافبــاز ئیســتە کــەس بــۆچ ناکــەون
تەنافبازی چاک ڕێگــەی حــەق ئــەون
(فمِــنهمُ کــالبرق، و مِــنهُم کــالریح) [٢]
تــا ئــاخر[٣] دەڕۆن شــاد و موســتەریح

وریا وە: وریا بە، ئاگات لە خۆت بێ. لەم ڕێ: لــەم ڕێگــا، مەبەســتی ڕێگــای شــەرعە. کــل نەوی: لا نەدەی. بەودایچ: بەودایش، بەویشدا. قودرەت لە مالە: توانــای خــودا هــەر لــە شــوێنی خۆیدایە و ماوە. گوزەر: رابووردن. ئەون: مەبەســتی (ئەوانــەن) یــا (ئــەوانن)ە و دەگەڕێتــەوە بــۆ چاکان.

واتە: یەکێ تر لە ئەحواڵی ڕۆژی قیامەت دانەوەی پاداشــی کردەوەیــە لــە لایــەن خــودای گەورەوە، کە کتێب و دەفتەری کردار و ڕەفتــاری بەنــدە دەدرێتــەوە دەســتی وەک لــە قورئــانی پیرۆزدا دەفەرموێ: (وَكُلَّ إنسانٍ أَلْزَمْنَاهُ طـائرَهُ فـي عُنُقِـه، وَنُخْـرِجُ لَـهُ يَـوْمَ القِيَامَـةِ كتاباً يَلْقـاهُ مَنْشُوراً* إقْرَأْ كِتَابَكَ كَفى بنفسِكَ اليَوْمَ عَلَيْكَ حَسيباً]*[٤]. ئەم نامەی کردارە لەلای ڕاســتەوە بــە باشەکان دەدرێ و ئەوانیش بە دەستی ڕاست وەریدەگرن و، لــەلای چەپــەوە یــا لــە پشــتەوە بــە خراپەکان دەدرێ و ئەوانیش بە دەستی چەپ وەریدەگرن.

حکیمەتی ئــەم حیســاب و کیتابــە ئەوەتــە کــە بــەرزیی پایــەی موسولــمانان لای ئــەهلی عەرەسات دەرکەوێ و بەم پایەبەرزییە شــادمان بــبن، هــەروەها نزمــی و بــێئابــڕوویی خراپــەکان دەرکەوێ و ئەوانیش سەر دابخەن و شــەرمەزار بــبن، ئــەگینا خــودای پــەروەردگاری جیهــان بــە هەموو ئاشکرا و نهێنییێ دەزانێ و ئەوەندەی تۆزقاڵێکی لێ ون نابێ.

یەکێ تر لە ئەحواڵی قیامەت تێپەڕینە بەسەر پردی مەشهوور بە سیراطدا.

یەکێکی تریش کێشانەی کردەوەی چاک و خراپە بە ترازووی خێر و شەڕ. جــارێ بــا قســە لــە پردەکە بکەین، دوایی دەگەڕێینەوە بۆ سەر باسی ترازوو.

ئەم پردە ئەمسەر تا ئەوسەر بە سەر دۆزەخدا راکێشراوە و گوزەرگای هەموو ئینسانێکە کـە لە دنیادا تەکلیف رووی تێکردبێ، لە تاڵی موو باریکتر و لە دەمی شمشێر تیژترە. تێپەڕین بەسـەر ئەم پردەدا بەگوێرەی کردەوەی ئینسانە لە دنیادا؛ ئـەوەی رەفتـاری بـاش بووبـێ بـە ئاسـانی بـە سەریدا تێدەپەڕێ و ئەوەیش رەفتاری باش نەبووبێ لـەم تێپەڕینـەدا تووشـی ئـازار دەبـێ یـا لـە رابووردندا دەکەوێتە خوار بۆ ناو دۆزەخ.

تێپەڕین بەسەر پردی وەهادا ئەگەرچی بەعادەت مەحاڵە؛ بەڵام خـۆی لـە خۆیـدا (ممکـن بالذات)ە و بوون و نەبوونی وەک یەکە، دیارە توانـا و دەسـتەڵاتی خـودا بەسـەر دروسـتکـردنی پردێکی وا و لێپەڕینەوەیدا پایەدارە. سزا و ئازاریش بۆ ئینسانی بەدکردارە، ئینسانی پـاک پـەکی ناکەوێت و خودای گەورە رزگاری دەکات و بە ئاسانیش لەم پـردەی دەپەڕێنێتـەوە. ئـەی بـۆچی ئەمرۆ تەنافباز لەبەرچاوی خۆماندا بەسەر تەلێکدا هاتوچۆ دەکـا؟ یـا بەسـەر تـەلێکی تایبەتیـدا تێدەپەڕێ؟ هێزی خودای گەورە کە ئەمانەی هەموو دروست کردووە لەمانە هـەموو بـەتینتـرە و دەتوانێ بەندە راستاڵەکانی خۆی لەم پردە بپەڕێنێتەوە و لەم دەردەسەرییە رزگاریان بکا، وەکوو لـە فـەرموودەی پێغەمبـەرەوە(د.خ) دەردەکـەوێ کـە هەنـدێ موسوڵـمان وەک برووسـکە و، هەندێکیان وەک با و، هەندێکیان وەک سواری ئەسپی رەسەن بە سەلامەتی و بێئازار دەپەڕنەوە. باسی بوونی ئەم پردە و باریکی و تیژی و درێژی و پەڕینەوەی جۆراوجۆری خەڵـکی بەسـەریا لـە کتێبە حەدیسە بڕوایێکراوەکاندا هەیە.

وا نۆرەی باسی ترازوویش هات:

(أمّـــا الميـــزانُ فَلَـــهُ لِسَـــانْ
وكَفَّتَـــانِ وَلَـــهُ سَـــاقانْ
یەکێکـە، جـەمعی تەعظیمـە و شـەرەف
(وهـــذا لَـــدی بعـــضٍ مِـــنْ سَـــلَفْ)
قـەولێکیچ هەیـە قسـەی ئەمەیـە:
بـۆ کـوللی فـەردێ میزانـێ هەیـە
يُعْـــرَفُ بِـــهِ مِقْـــدارُ الأعمـــال
فَـــوّضْ أمـــرَهُ إلـــى ذیالجَـــلال

فَـــــلاَ تَبْحَـــــثْ عـــــن كيفيّتِـــــهِ
عَلـــى مـــا أُريـــدْ صَـــدّقنْ بِـــهِ
قيـــل: يُـــوزَنْ صُـــحُفُ العمـــل
بِـــهِ، ولَـــدى قـــولٍ قـــد يُجْعَـــلْ -
(حَسَـــناتْ) بـــە جیســـم پـــاک و نـــوورانی،
(ســیّئات) بـــە جیســـم بـــەد و ظولـــمانی
(وَعَلـــى هـــذا بـــلا قيـــل و قـــال)
مەدفووعـــە شـــوبهەی ئـــەهلی ئیعتیـــزال
ســوئال لــە حیکمــەت بکــەی بــۆ جــەواب
(حســابُ الحكمـــة كمـــا فـــیالحســاب)
عـــەلاوەی ئەمـــە لەســـەرمان نییـــە
وەجهـی حیکمــەتی فیعلـی حــەق چییــە؟
خەیر (فرضاً) ئەر فیعل حــەق موعەللــەل وێ
نـــــەزانینمان بـــــۆچی خەلـــــەل وێ؟
وایـــان فەرمووگـــە: میـــزانی عوقبـــا
عەکســـە بـــە نیســـبەت تـــرازووی دونیـــا
دەڕۆت لـــە وەخـــتی کێشـــانەی کـــردار
لای سەنگی بۆ ژوور، لای سەبوک بـۆ خـوار
لـــەم کێشـــانەدا مەکێشـــە خەفـــەت
بـۆ وەجهـێ (أوْمَـتْ)،«ثَقُلَـتْ»،«خَفَّـتْ»[٥]
(مِنْهـــا سُـــؤالُ الـــرَبَّ المُهَـــيْمِن
حـــينَ مـــا يُـــدْني عَبْـــدَهُ المـــؤمن)
یەکێتریچ حەوض، مەدحی و عەرض و طوول
طەلەب کە لە قــەول حــەضرەتی رەســوول.

واتە: یەکێکی تر لە ئیشەکانی ڕۆژی قیامەت ترازوویە کە زوبانێک و دوو لەپ و دوو لاقی هەیە وەکوو ترازووی عادەتی. ئیمامی تیرمیزی و حاکم حەدیسێکیان ریوایەت کردووە کە ئەم تەفسیلەی تێدایە، لە قورئانی پیرۆزیشدا باسی میزان زۆر کراوە وەکوو: [وَالوَزْنُ یَوْمَئِذٍ الحَقُّ](٦) یا [وَنَضَعُ المَوازینَ القِسْطَ لِیوم القیامة](٧) جا ئەم میزانە یەکێکە بۆ هەموو ئەهلی مەحشەر و، کە لە قورئاندا بە شێوەی (جمع) باس کراوە، وەک (موازین) ئەوە لەبەر ڕێزگرتن و بە گەورە پێشان‌دانی لێ‌پرسینەوەی ئەو ڕۆژە سامناکەیە. هەندێ کەسیش لایان وایە کە هەر موکەللەفێ ترازوویەکی هەیە؛ کەوابێ (موازین) ی ئایەتەکە لەجێی خۆیدا بەکارهێنراوە. چۆنیەتیی بەکارهێنانی ئەم ترازووە بدرێتە دەس عیلمی خودای گەورە باشترە؛ چونکە تەفسیلەکەی نەزانراوە؛ هەندێ دەڵێن دەفتەری کردەوەکان کێشانە دەکرێن، هەندێکیش دەڵێن: کرداری چاک دەکرێتە جیسمی پاک و نوورانی و هی خراپیش دەکرێتە جیسمی ڕەش و تاریک. بەگوێرەی ئەم قسەیە ئەو ڕەخنە دەفع دەبێ کە (معتزله) گرتوویانە و وتوویانە: کردەوە لە بابەتی (عَرَض)ە و کەڵکی وەزن و کێشانەی پێوە نییە.

جا ئەگەر پرسیار لە حیکمەتی کێشانەی کردەوە بکەی و بڵێیت: خودای گەورە ئاگای لە هەموو کردەوەکانە و هیچی لێ پەنهان نابێ، ئیتر کێشانە بۆ چییە؟ دەڵێین: حیکمەتی کێشانە وەک حیکمەتی حیساب و کیتابەکەیە کە پێش ئەمە باسمان کرد، واتە: بۆ دەرخستنی شەرەف و پایەبەرزیی هەندێک و ڕیسوایی و ماڵوێرانیی هەندێکی ترە. سەرەڕای ئەوەیش لەسەرمان نییە حیکمەتی کردەوەکانی خودای گەورە بزانین؛ چونکە پێویست نییە کردەوەکانی خودای گەورە (معلَّل) بن. گریمان موعەللەلیش بن نەزانینی ئێمە بەو حیکمەت و عیللەتانە زیانی نییە و هیچ ناگۆڕێ، کەی ماوەی زانینی ئینسان ئەوەندە فراوان و بەربڵاوە هەموو شت بزانێ؟

زانایانی ئایین فەرموویانە ترازووی قیامەت پێچەوانەی ترازووی دنیایە، واتە: تای قورسی بەرزدەبێتەوە و تای سووکی نزم.

یەکێکی تر لە کارە گەورەکانی ڕۆژی قیامەت پرسیاری خودای گەورەیە لە بەندەکانی خۆی گەورە و بچووک. لە حەدیسدایە: «یدنو أحدُکم من ربّه حتّی یضع کنفَهُ علیه، فیقول: أعَمِلْتَ کذا وکذا؛ فیقول: نعم، و یقول أعَمِلْتَ کذا وکذا؛ فیقول: نَعَمْ، فیقرّرُهُ، ثم یقول: إنی سترتُ علیک فی الدنیا و أنا أغفرها لَکَ الیومَ، ثمّ یُعطی صحیفةَ حسناته. وأمّا الکفار فینادی علی رؤوس الأشهادِ: هؤلاءالذینَ کذّبوا علی ربّهم ألاَ لَعْنَةُالله علیالظالمین»(٨).

هەروەها یەکێ لەو شتانەی لە رۆژی قیامەتدا روو دەدەن ئەوەیە کە موسوڵمانانی بێ گوناه پاش پەرینەوەیان لە سیرات و، ئەوانەیان چوونەتە دۆزەخ، پاش دەرچوونیان لە دۆزەخ دەچنە سەر (حوض‌الموردو).

بوخاری و موسلیم لە (عبدالله)ی کوری (عمر)ی کوری (عاس) ەوە دەگێرنەوە کە حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی: «حوضی مَسیرةُ شَهْر مَاؤهُ أبْيَضُ مِنَ‌اللَّبَنِ، وَ رِيحُهُ أطيَبُ مِن المِسكِ، وَ كيزانُهُ كنجوم السماء، مَن شرِبَ منه فلا يظمأ ابداً[٩] ».

واتە: ئەو حەوزە مانگەرێگایەک گەورە و بەرفراوانە، ئاوەکەی لە شیر سپی‌ترە، لە میسک بۆن خۆشترە. گۆزەکانی ئەوەندەی ئەستیرەی ئاسمانن، هەرکەس لێی بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێ.

وا مەعلوومە کە کیتاب و حیساب پێش کێشانەی کردەوەیە و، کێشانەیش پێش رابووردنە بەسەر سیراطدا و ئەمیش پێش گەیشتنە بە (حوض‌المورود).

کەوسەریش جۆگایەکە لە بەهەشتدا، رزقناالله تعالی الشرب مِنَ‌الحوض‌المورود و منە عند الورود بمِنَّةِ و فضلِهِ و كرمهِ آمين.

***

١ـ لەم شوێنەدا هیچ عینوانێ لە دەستنووسەکەدا نییە. لە نوسخە چاپەکەدا (مبحث الصراط والميزان) ە. ئەم عینوانەی باوکم لەگەڵ باسەکە گونجاوترە.

٢ـ ئیشارەیە بۆ حەدیسێکی پێغەمبەر(د.خ) لە باسی سیراتدا دەفەرمۆێ: «... فَيَمُرُّالمؤمنون كَطرْفِ العين و كالبرقِ و كالريح وَ كَالطيرِ وَ كَأجاويد الخيل والركاب، فناجٍ مُسَلَّمٌ و مَخدوشٌ مُرْسَل ومكدُوسٌ فی نار جهنم... الحديث»

(ناجٍ مُسَلَّمٌ): بە سەلامەتی دەرباز بوو. (مخدوشٌ مُرْسَل): برینداری لە داو بەرەلا کراو. (مكدوس فی نار جهنم): فرێدراو بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.

بروانە: (منصور علی ناصف، التاج الجامع للاصول فی أحاديث الرسول (ص)، دار إحياء التراث العربی، بيروت، الطبعة الثالثة، ١٣٨٢ هـ ـ ١٩٦٢ م، الجزء الخامس، ص ٣٩٥.

٣ـ بەپێی پەراوێزی دەستنووسەکە ئەم (تا ئاخر)ە هەڵدەگرێ بەمەعنا (تا دوایی حەدیسەکە) بێ. ئەوەیش هەڵدەگرێ بەمەعنا (هەتا هەموویان بەشێوەی جۆراوجۆر لە پردەکە دەپەڕنەوە) بێ.

٤ـ ئایەتی(١٣) و (١٤) سوورەتی (اسراء).

٥ـ اوْمَتْ: اَشَارَتْ: ئیشارەی کرد، دەلالـەتی کـرد. (ثَقُلَـتْ) و (خَفَّـتْ) ئیشـارەن بـۆ ئایەتـەکانی (٦،٧،٨،٩) لـە سوورەتی (قارعه)، واته: [فَأمّا مَنْ ثَقُلَتْ مَوازِينُهُ فَهُوَ في عيشَةٍ راضِيَة. وَأمّا مَنْ خَفَّت مَوَازِينُهُ فأُمُّهُ هاوية].

لای زانایانی قورئان و حەدیس « ثَقُلَتْ» له شتی خاوەن نرخ و مایەدا بەکاردەهێنرێ که شـکۆدار و بـەڕێز بـێ. (خَفَّت) یش بەپێچەوانەی (ثقلت) بەکاردەهێنرێ ؛ کەواته مەبەست له [من ثقلت موازینـه...] ئەوانەیـە کـە کـار و کردەوەیان بەنرخ و بەڕێزە و له کاتی کێشانەدا بەرز دەبنەوە. هەروەها مەبەست له [مَن خفّت موازینه...] ئەوانەیـە که کار و کردەوەیان له کێشانەدا بێنرخ و بێڕیزە و بەرەو زەوی نزم دەبنەوە.

مەعنای شیعرەکەیش بەم جۆرەیە:

له ئەنجامی ئەم کێشانەی رۆژی پاداشە، که قورس بەرز دەبێتەوە و، سووک نزم، خەفەت مەخۆ؛ چونکه (ثَقُلَتْ) و (خَفَّتْ) بۆ مەعنا و تەئویلێکی جوان ئیشارەیان کردووە و هۆی ئەنجامی ئەو کێشانەی بۆ روون کردوویتەوە.

٦ـ ئایەتی (٨) سوورەتی (أعراف).

٧ـ ئایەتی (٤٧) سوورەتی (انبیاء)

٨ـ بروانه: منصور علی ناصف، التاج الجامع للاصول فی احادیث الرسول(ص)، دار إحیاء التراث العربـی، بیـروت، الطبعة الثالثة، ١٣٨٢هـ ـ ١٩٦٢ م؛ الجزء الخامس ص ٣٦٩.

٩ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## مبحث الجنة والنار[1]

(وَ مِـــنْ تلكُـــمُ الجنـــة والنـــار)
ئەو لە بۆ ئـەبرار، ئـەم لـە بـۆ فوججـار
مەخلووقن ئەلئان خـۆت مەكـە نـادان
وە بـــێزەرووەت لـــە زاهـــیر لادان
هیچ مەبە بەتـەنگ تـیری کەسـەوە[2]
(أُعِـــدَّتْ) قەڵـــخان وا بەدەســـەوە
موعـاریز ئـەر چـوو ئـەناو (تلـكالـدار)
سـالمە ئـادەم ڕەوی و هاتـــە خـــوار
تـــەئویلات وەرای ئـــەو شـــەڕ و شـــۆڕە
لـــەو «نَجْعَلُهـــا» کـــەم نییـــە، زۆرە
کـــێ دەڵـــێ ئەمـــە خـــۆ بەدیهییـــە
دەوامـــی (أُكُـــلْ) (٣) بِعَيْنِـــهِ) یـ یـــە؟
نە، یانی: یـەکێک فـەنای هـات پێـدا
دەفعـــی یـــەکێکی ئـــەوا لەجێـــدا
ئەمیچـــە عـــاقڵ موســـەللەمییـــە
مونـافیی هـیلاک لـەحزەیێ نییـە[4]
عـەلاوەی ئەمـە لـەلای عەقڵـی پـاک
موسـتەلزیم نییـە بـۆ فـەنا هـیلاک[5]

(بَــلْ یَکْفــی الخُــرُوجْ عَــنِ الانتفــاعْ
المقصــــودِ مِنْــــهُ؛ فَــــاترُکِ النـــــزاعْ)
لــە فــەرزی تەســلیم مــوارده ئەمــە:
وجوودی مـومکین کـول (کالعَـدَم)ە[٦]

واتە: یەکێکی تر لە ئەحواڵی ڕۆژی قیامەت ئەوەتە خەڵکی پاش حیساب و کیتاب و کێشـانەی کردار دەکەون بە لایەکدا، یا لە بەهەشتی خۆشدا لەنا و ناز و نیعمەتدا جێگیر دەبن و ڕادەبوێرن، یا لە ئاگری دۆزەخدا بەدەم دەرد و ئازارەوە دەتلێنەوە. دیارە بەهەشت جێـی ئـارام و دوامەنزڵـی ئەوانەیە کە لە ژیانی دنیادا لـەخـوداترس و کردەوەچـاک بـوون، دۆزخ و ئـاگریش هـی ئەوانەیـە لەخودانەترس و پیاوخراپ بوون. هەروەک خودای گەورە دەفەرموێ: [إنّ الأبرار لفـی نعـیم. وَ إنَّ الفُجّار لَفی جَحیم][٧]

ئەم بەهەشت و جەهەننەمە ئێستە دروست کراون و ئامادەن بۆ پێشوازیی لـێ‌کـردنی خەڵـک، دەلیلیش لەسەر ئەمە فەرمودەی خودایە کە دەفەرموێ: [وسارعوا الی مغفـرة مـن ربکـم و جنـةٍ عرضها السَّمواتُ وَالأرضُ أعِدَّتْ للمتّقین][٨]

واتە: بە پەلە و گورج ڕاکەن بەخششی خودا وەدەس بێنن، ئەو بەهەشـتە بـۆ خۆتـان مسـۆگەر کەن کە پانایی ئەرز و ئاسمانەکانە و بۆ لەخواترسـان ئامـادە کـراوە. یـا دەربـارەی ئـاگری دۆزەخ دەفەرموێ: [واتّقوا النار التی أعِدَّتْ للکافرین][٩] واتە: خۆتان لـەو ئـاگرە بپـارێزن کـە بـۆ کـافران ئامادەکراوە کە باوەڕیان بە خودا نییە. ئەم دوو لەفزی (أعِـدَّتْ)ە بەشـێوەی مـازی بـە زاهـیری و ئاشکرایی مەبەستەکەی ئێمە دەگەیەنێ.

جا ئەگەر کەسێ موعارەزەی ئەم دەلیلەی تۆی کرد بە ئایەتی [تِلْکَ الّدارُ الآخِرَةُ نَجْعَلُها لِلَّـذینَ لا یُریدونَ عُلُواً فیالأرضِ ولا فَسَاداً وَالعَاقبةُ لِلْمُتَّقینَ][١٠] گوایا دەڵێ (نجعل) بە مـەعنای (نَخْلُـقُ) وە، واتە: ئەو ماڵـی دواڕۆژەیـش بـۆ ئەوانـە دروسـت دەکـەین کـە نایانـەوێ لـەم سـەرزەوییەدا خراپەکاری بکەن و، نایانەوێ لەخۆبایی بن و زوڵم و زۆر بکەن و، خۆیـان بـە گـەورەتر نـازانن لـە کەس. دەڵێ ئەم ئایەتە دەلالەت لەوە دەکا کە بەهەشـت لەمـەوپاش دروسـت بکـرێ. ئێمـە لـە وەلامی ئەم ڕەخنەدا دەڵێین ئەم ئایەتە لەگـەڵ ئایـەتی [أعِـدّت للمتّقـین] و [أعِـدَّتْ للکـافرین] موعارەزەی یەکتر دەکەن، بەلام ئیمە ئایەتی [وقُلنا یا آدمُ اسْکُنْ أنتَ و زَوْجُکَ الجَنَّـةَ... الآیـة][١١]

مان بە ساغی و سالمی و موعارەزە نەکراوی بۆ دەمێنێتەوە، کە بە ئاشکرا و بـێ‌تـەئویل دەلالـەت لەوە دەکا کە بەهەشت دروست کراوە و ئێستە هەیە.

بێجیگە لەوەیش بۆ «نَجْعَلُها»ی ئایەتەکە تەئویل و باری گونجاو زۆرە:

یەکەم: «نجعلها» واتە: (جعلناها) واتە موزاریعە و مەعنای مازی دەدات، شتی وەهایش زۆرە.

دووەم: «نجعلها» واتە (نصیّرها) نەک (نَخْلُقُها) واتە: ئەو خانووەی ئێستە دروست کراوە و هەیە دەیکەینە شوێنی ئەوانەی... تاد، بەکورتی بەهەشت ئێستە هەیە و لە دوارۆژدا دەکرێتە ئارامگـای ئەبەدیی ئەو موسوڵمانانە.

ئەگەر یەکێ رەخنە بگرێ و بڵێ بەپێی فـەرموودەی قورئـانی پـیرۆز دەبـێ خواردەمـەنی بەهەشت (بالعین) پایەدار بێ و هەرگیز نەبڕێتەوە [أُكُلُها دائِمٌ و ظِلُّها] لە لایەکی تریشەوە ئایـەتی [كُلُّ شَيْء هَالِكٌ إلاَّ وَجْهَهُ] نەسسە لەوەدا کە هەموو شتێ دەفەوتێ و بێجگە زاتی خودای گـەورە کەس نامێنێ، کەواتە نابێ ئێستە بەهەشت هەبێ، بەڵکو دەبێ لە پاشـەڕۆژدا و پـاش ئـەم دنیایـە دروست ببێ؛ چونکە ئەگەر لە پاشەڕۆژا بێ ئەبەدییەتی خواردەمەنییەکانی دروستە و لەگەڵ هـیچ ئایەتێکدا ناجۆر نابێ، بەلام ئەگەر ئێستە هەبێ دەبێ خۆیشـی و خواردەمەنییەکانیشـی بفـەوتێن ئەگینا ئایەتی[أُكُلُها دائِمٌ...] لەگەڵ ئایەتی [كُلُّ شَيء هَالِكٌ الاّ وَجهَهُ] پێکەوە نایانکرێ.

لە وەلامی ئەم رەخنەدا دەڵێم: نەء... مەعنای دەوامی خواردەمەنیی بەهەشت ئـەوە نییـە کـە هەرگیز فەنایان بەسەردا نایەت، بەڵکو مەعنای ئەوەیە کە یەک‌لەدوای‌یەک پەیدا دەبن و هـەرگیز بەهەشت خاڵی نابێ لە سەمەر، سەمەرێ دەڕوات و یەکێکی تر گـورج جێگـای دەگرێتـەوە. ئـەم فەوتانی یەک‌لەدوای‌یەکەیش هەرگیز موناقی دەوام و پایەداریی خواردەمەنی نییە.

هەروەها دەتوانین بڵێین شـەرت نییـە لـە هیلاکـەوە فـەنا روو بـدات، کافییـە هیلاکەکـە ئەوەندە بێ کە شتەکە بێ‌کەڵک بێ و هیچ سوودێکی لێ وەرنەگیرێ، هـیچ دوور و مـەحاڵ نییـە بەهەشت لە ماوەی سەعاتێکدا کەڵکی ئەوەی پێوە نەمێنێ سوود بە خەڵک بگەیەنێ.

وەلامێکی تر ئەوەیە: بەڵێ مەبەست لە هیلاک فەنایە، بەلام مەبەست لە [كلّ شيء هَالِكٌ إلاَّ وَجْهَهُ] ئەوەیە کە هەموو شتێکی مومکین وەک مەعـدووم وایـە، چونکـە بـوون و نـەبوونی لـە خۆیەوە نییە و لە زاتی خوداوەیە، ئیتر با خواردەمەنیی بەهەشت دائیم بێ ئەو لە مومکینی خـۆی ناکەوێ و مومکینیش وەک هالیک و مەعدوومە.

نەسسـێکی سـەریح هـیچ نییـە دیـار
لـەبۆ تـەعیینی جێـی جەنـنـەت و نـار
حـەق واتـە دەسـی هـیچ لـێ نـەدرێ
تەفویز بە حـەزرەت عیلمـی حـەق کـرێ
(لکِـنَّ الاکثـر) قسـە وا دەکـات:
جەننەت (تحـت العـرش فـوق السـماوات)
(وَمَکـانُ النّـارُ تَحْـتَ الأرْضـین)
باز[١٢] بێنەوە سـەر شـوبهەی مـونکیرین
کە بێت مەوجوود بن لەلات هەس یەقین
جەننەت پانە وەک گشت سەما و زەمـین
ئـەر لـە ئەفلاکـدا پێـی‌دەدەی[١٣] مـەقام
نـاوێ لەبـەر مـەنع خـەرق و ئیلتیـام
عونسـورێ لـەوێ سـا چلـۆن دەوێ؟
ئـادەم هـەر نـاوێ بجوولـێ لـەوێ
لـە عەناسـیردا جێـی ناوێتـەوە
عالـەمی‌تـریچ ئـەر بێـت پێتـەوە[١٤]
لازم تـێ لـەویچ وجـوودی خـەلا
(فی المـلا) دەڵـێم مەحالـە مـەلا![١٥]
دەڵـێین ئەمـە گشـت هـەر موزەخرەفـە
مەبنیی بـەر ئوسـوول پـووچی فەلسـەفە
موقـەددیماتی هـەموو واهییـە
(عنـدنا) هـیچ کـام موسـەللەم نییـە
ناگونجێ لەگرە دەس لە تەفسـیل دەیـن
لـە شـیققی سـالیس بـا قسـە بکـەین

ئــەر خـــەلا بـــوێ (بـــین العـــالَمِیْن)
بەل بە جیسمێ تـر پـڕ وێ ئـەو مابـەین
ئـــەو جیســـمیچە بـــا کـــورەوی نـــەوێ
کورەوییـــەت کـــوا بورهـــانی تـــەوێ؟
(وَعَلـی الاکثـر) بـەینی سـەما و عـەرش
بە سەففی ئیزام ئیشـکال دەڵـێ: عـەرش

واتە: لە قورئان و حەدیسدا شتێکی سەریحی بێپێچ وپـەنای وەهـا نییـە شـوێنی بەهەشـت و دۆزەخی دیاری کردبێ، کەواتە با باسی نەکەین و بیدەینە دەست عیلمی خـودای گـەورە. بـەڵام بەشی زۆری عولەمای دین فەرموویانە بەهەشت لـە ژووری ئاسمانەکانـەوە و لـە ژێـر عەرشـدایە، دۆزەخیش لەژێر چینەکانی عەرزدایە، هەروەها وتوویانە دەلیلی شوێنی بەهەشت ئـەم ئایەتانەیـە: [وَلَقَد رَآهُ نَزلَةً أُخرى. عِنْدَ سِدْرَةِ المُنْتَهى. عِنْدَها جَنَّةُ المأوى](١٦)

دیارە ئەگەر ئینسان کەمێ بیر بکاتەوە لە توانای خودا و، فراوانیـی ئـەو دروسـتکراوانـەی کـە ئێستە هەن، لەگەڵ بێسنووریی مـەوجوودات و دائیـرەی جووڵانـەوەی ئەسـتێرە گەڕۆکـەکان و، کەمێ بەراورد بکا لە نێوان ئەوانەی تا ئێسـتا زانـراون و ئـەر نـەزانراوە نادیارییانـە کـە تـا ئێسـتە پەیان پێ نەبراوە، بۆی روون دەبێتەوە کە کائینات جێگـای گـەلێ بەهەشـت و دۆزەخـی تێـدا دەبێتەوە و هێشتا زۆری بە خالییەتی دەمێنێتەوە.

ئەنجا مەولەوی دەفەرموێ: دووبـارە بـا بێینـەوە سـەر باسـی قسـە و گومـانی ئەوانـە دەڵـێن بەهەشت و جەهەننەم ئێستە نین و لەمەوپاش دروست دەکرێن:ـ

ئەوانە دەڵێن ئەگەر بێت و بەهەشت و جەهەننەم ئێسـتە بـبن جێگایـان نابێتـەوە چونکـە بـە ئیتتیفاقی هەردوولامان و بە نەسسی ئایـەت بەهەشـت بەقـەد ئاسمـان و زەوی پانـە، جـا ئەگـەر دەڵێیت لە ئاسماندان ئەوە مەحاڵە چونکـە دەبێتـە هـۆی دڕان و لکانـەوەی ئاسمانـەکان (خـرق والتئام) ئەمەیش بۆ ئەفلاک مەحاڵە، لە لایەکی ترەوە لە عونسـور دروسـتکـراوی وەک بنیـادەم چۆن لەوێدا جێگای دەبێتەوە، تەنانەت تاقە بنیادەمێکیش جێگای نابیتەوە و ناتوانێ بجووڵـێتەوە؛ شتی لەعونسور دروستکراو لەناو عەناسیردا دەژی.

ئەگەر دەیشلێیت ئەم بەهەشت و دۆزەخە لەناو عەناسیردان، واتە لە گـۆی زەویـدان ئـەوەیش هەر نابێ ؛چونکە بەهەشت بەتەنها خۆی پانی‌یەکەی بەقەد ئەرز و ئاسمانە، ئیتـر چـۆن لـە گـۆی زەویدا جێگای دەبێتەوە؟

خۆ ئەگەر عالەمێکی تر بێجگە ئاسمان و زەوی دروست کرابێ و ئەم بەهەشت و جەهەننەمـەی تێدا دانرابن، ئەو عالەمە یا لە خالێکدا لکاوە بە کورەی ئاسمانەوە یا نەلکاوە، ئەگەر لکـاوە ئـەوەی لێ پەیدا دەبێ بێجگە لەو خالی پێکەوەلکانە ئەوی هەمووی بۆشایی بـێ، ئـەوەیش نابـێ چونکـە بۆشایی(خلأ) مەحالە. خۆ ئەگەر نەلکاوە و دوورە لە ئاسمانەوە ئەوە خراپتر، چونکـە (خـلأ) زیـاتر دەبێ و (خلأ) یش مەحالە.

ئێمەیش لە وەلامی ئەم رەخنانەدا دەلێین:ـ

نایسەلمێنین ئاسمان قابیلی خەرق‌و ئیلتیام نەبێ. یـا مـاددەی عونسـوری لـە ئاسمانـدا جێـی نەبێتەوە و نەژی، ئەمانە هەمووی قسەی پووچن و هیچ دەلیلێکیان لەسەر نییە.

مەحالی‌یەتی (خلا) یش هەمدیسان بێ‌دەلیلە و شتێ نییە پشتگیری لێ بکات. ئێمـە شـوێنی بەهەشت و دۆزەخ دیاری ناکەین؛ نەسسێکی قەتعی نییە بیکەینە دەلیل و، ئەگەر شوێن زاهـیری ئایەتی [ولقد رآه نزلةً...(الآیة) ] بکەوین یارمەتیی بۆچوونەکەمان دەدات.

ئەم را و بۆچوونە یۆنانی‌یانە دەربارەی ئاسمان جێگـەی بـاوەڕ نـین، بەلـکو زانسـتی تـازە دەریخستووە هەلەن. زاهیری ئایەتەکانیش پشتگیریی ئەم دۆزینەوە تازانە دەکات و ئـەوەمان بـۆ روون دەکاتەوە کە جیهان دیار و نادیاری هەمووی رامـە بـۆ هێـزی بـێ‌سـنووری پـەروەردگار و، جێگای هەزاران گۆ و ئەستێرەی گەڕۆک و نەجوولاوی تێدا دەبێتـەوە و، بەهەشـت و دۆزەخـیش دوو عالەمن لەو کائیناتەی لە ژێر دەستەلاتی خودادان. (ألا لَهُ الخلقُ والأمر. الله خـالق کـل شـیء وهو علی کل شیءٍ وکیل)

هەروەها ئەگەر بەهەشت و دۆزەخ لە ژووری ئاسمانەکانەوە بن و، بۆشایی لە نێوان عالەمی ئاسمانەکان و عالەمی بەهەشتدا هەبێ قەیناکا با بە جیسمێکی تری غەیرەکورەوی پڕ بێتـەوە، بـا لە بەینی ئاسمانەکان و عەرشدا بن.

بەلێ ئەم بڕیارە راستە بە ریزی سوپای ئیشکال و رەخنە و رەخنەکاری دەلێت: (عەرش) واتە: ئێرە چۆل کەن، لەم ناوەدا مەمێنن.[٧] [وشەی (عەرش) لە هەندێ ناوچەی کـوردەواری‌دا ئـەمرە بە بەجێ‌هێشتنی جێگە و ماوا.]

دەڵـێی جەننـەت بـۆ جـەزای ثـەوابـە
نــاریچ بــۆ خـــاتر جـــەزای عیقابـــە
ئەوانیچـــە خـــۆ بـــەر لـــە قیامـــەت
ناون بـە ئیجمـاع موسـلیمی ئوممـەت
مەسڵـــەحەت فـــەوتا وا لـــەم میانـــدا
فائیـــــدە نییـــــە لـــــە خەلقیانـــــدا
دەڵێین ریعایەت مەسڵەحەت موتڵـەق
(عِنــدَنا) واجـب نییـە لەسـەر حـەق
(سَـلَّمْنَا) کردمـان ئـەوە ئیسـبات بـوو
فائیدە بۆچ حەسـر (فـیالمجـازاة) بـوو
(سَـلَّمْنَا) ئـەمیچ، لاچـۆ لـەم نـاوێ،
بـەر لـە قیامـەت جـەزا بـۆ نـاوێ؟
(حسـبَ حــدیێ[١٨] خیرالمرسَــلِینْ
عَلیْـــهِ اللّـــلاه دائمـــاً، امــــینْ)
گوشـادە دەکـرێ دەرگایـە نـاظیر
(فی قبرالمـــــؤمن او قبرِالکـــــافر)
ئی قەبری مۆئمین رووبـەڕووی نـەعیم
ئی قـەبری کـافر رووبـەڕووی جـەحیم
مۆئمین بە نەسیم بەهەشت سەرمەستە
کافر لە بـۆی گەنـد دۆزەخـدا خەسـتە

ناریچ: ناریش. ئەوانیچە: ئەوانیشە. ناون: نابن. ئەمیچ: ئەمیش. لەم ناوێ: لـەم نـاوە. نـاوێ: نابێ. گوشادە دەکرێ: دەکرێتەوە. دەرگایە ناظیر: دەرگایە دەڕوانێتە... ئی: هی. گەند: بۆگـەن. خەستە: نەخۆش، دەردەدار.

مەولەوی هێشتا هەر لەسەر مەسئەلەی رەخنە و وەڵامی ئەوانە دەڕوات کە دەڵێن بەهەشـت و دۆزەخ ئێستە دروست نەکراون و لە رۆژی دواییدا دروست دەکرێن، ئەوەتە دەفەرموێ ئێـوە ئـەی

ئەوانەی دان بە بوونی ئێستەی بەهەشت و دۆزەخدا نانێن ئەگەر رەخنەمان لێ بگرن و بلێن: بەهەشت بۆ پاداشی چاکە و دۆزەخ بۆ تۆڵەی خراپەیە، سەواب و عیقابیش لەپێش رۆژی قیامەتدا بە ئیجماعی هەموو موسوڵمانان نییە، کەوابوو هیچ مەسلەحەت و فائیدەیەک نییە لە دروست کردنی بەهەشت و دۆزەخدا پێش رۆژی قیامەت. لە وەڵامی ئەم رەخنەدا دەڵێین: پێش هەموو شتێ ریعایەتی مەسلەحەت لەسەر خودای گەورە واجب نییە؛ خودا موختارە لە کردنی هەر کارێکدا، قازانجی تێدابێ یا نە، گریمان ئەوا سەلماندمان کە ریعایەتی مەسلەحەت لەسەر خودا ـ خوانەخواستەـ واجبە، بۆ دەبێ مەسلەحەتەکە هەر تۆڵە و پاداش بێ؟ ئەی بۆ مەسلەحەتەکە ئەوە نەبێ کە بوونی ئێستای بەهەشت و دۆزەخ ببێتە هۆی دڵخۆشیی پاکان و دڵتەنگیی ناپاکان؟ ئەوەتە بەپێی حەدیسی پێغەمبەر(د.خ) لە گۆڕی موسوڵمان و کافردا هەر یەک دەرگایەک دەکرێتەوە، دەرگای گۆڕی موسوڵمان بەسەر بەهەشتدا دەڕوانێ و لەوێشەوە بە نەسیمی بۆنخۆش دەماخی چاخ دەکا، دیارە ئەم موسوڵمانە بە بینینی ئەو بەهەشتەی کە دەبێتە دوامەنزڵی دڵخۆش دەبێ. هەروەها دەرگای گۆڕی کافریش بەسەر دۆزەخدا دەڕوانێ و بۆی بۆگەنی بۆ دێنێ، بێگومان ئەم کافرە، بەپێچەوانەی موسوڵمانەکە بە بینینی ئەم جێگا ناخۆشە خەمبار و دڵتەنگ دەبێ.

***

١ـ ئەم سەرباسە لە نوسخە دەستنووسەکەدا نییە.

٢ـ تیر یا تیروکەوان چەکێکی ناسراوە. هەروەها (قەڵخان) یش کە وەک ساج بووە و یەکێک بووە لە ئالەتەکانی جەنگ و بۆ خۆپاراستن لە شیر و تیری دوژمن بەکارهێنراوە. تێکڕا مەعنای ئەم شیعرە و دوانی دوای ئاشکرایە و لە شەرحەکەدا باس کراون، بەڵێ هەندێ وردەکاری هەن دەبێ بخرێنە پێش چاو:

مەولەوی دەفەرموێ لە تیری هیچ کەس مەترسە، لەوانەی دەڵێن بەهەشت و جەهەننەم ئێستە نین و لەمەوپاش د.وست دەکرێن. تۆ قەڵخانی وەک ئایەتی (اعدّت للمتقین)ی بەهەشت و (اعِدّت للکافرین)ی دۆزەخت بەدەستەوەیە، شیرو تیری ئەوان کارت تێناکەن، «اعدت» فیعلی مازییە و رابوردوو دەگەیەنێ. «موعاریز ئەرچوو ئەناو(تلک الدار) بێجگە مەعنای شەرحەکە بەشێوەی لەتافەت ئەوەیش دەگەیەنێ کە ئەگەر ناحەزەکەت خۆی لەو ماڵەدا حەشار دا و لەپارێزتا بوو و ترساندیتی تۆ گوێی مەدەرێ؛ ئادەم(د.خ) چووە ئەو ماڵە و هاتیشە دەرەوە و وەک کەسی تیا نەبێ وابوو.

هەروەها (لَوْ)ی «لو نجعلها» بەپێی پەراوێزێکی مەولەوی خۆی لە نوسخە دەستنووسەکەدا دوو بار هەڵدەگرێ:ـ

یەکەم: عەرەبی بێ واتە (لو)ی شەرتی‌یە و (لو نجعلها) بەشێک نەبێ لە ئایەی [تلک الدار الآخرة...] و بەمعنا (لو نعملها) بێت، واتە: ئەگەر تەئویل بکەین ڕێگای تەئویل زۆرە.

دووەم: لەوانەیشە (لو) لەوی کوردی بێ، واتە (لە ئەو) و (نجعلها) یش هی ئایەتەکە بێ، واتە: لەو (نجعلها) یەدا کە لە ئایەتەکەدایە تەئویلات زۆرە.

عیبارەتی «لەدوای ئەو شەڕوشۆڕەش» لەگەڵ (تیر) و (قەڵخان) و «چوونە ناو تلک‌الدار» زۆر گونجاو و لەبار و جوانە.

٣ـ ئیشارەیە بۆ ئایەتی [مَثَلُ الجَنَّةِ التی وُعِدَ المُتَّقُون تَجْری مِنْ تَحْتِهَا الأنهارُ أُكُلُهَا دائمٌ و ظلّها تلكَ عقبى الّذين اتَّقوا و عُقْبى الكافِرينَ النّار]. ئایەتی (٣٥) سوورەتی (رعد).

٤ـ واتە: ئەم گورج هاتنەی نیعمەتێ لەجێی نیعمەتێکی فەوتاودا هەرگیز مونافیی هیلاک نییە. واتە: وا هیلاکیش بوو و دەوامیش بوو. بەم مەعنا (لەحزەیێ) واتە هیچ کات، هەرگیز. یا خۆ «لەحزەیێ» زەرفی «هیلاک»ە، واتە: ئەم دەوامی خواردەمەنییە بەم شێوەی یەک‌لەجێی‌یەک هاتنە مونافی نییە بۆ هیلاکی خواردەمەنییەک لە لەحزەیەک دا. بە هەرحاڵ هەردوو مەعناکە یەک مەبەست دەگەیەنن کە بەقای نەوع و فەنای فەردە.

٥ـ واتە: هیلاک موستەلزیم نییە بۆ فەنا.

٦ـ بەکورتی وەڵامی ڕەخنە بە ناکۆکیی نێوان[کل شیء هالک إلاّ وجهه] و [أکُلُها دائم...] سیانە:ـ

١ـ فەنای فەرد نابێتە هۆی فەنای نەوع.

٢ـ (هلاک) واتە: بێ‌کەڵکی و سوودلێ وەرنەگیراوی، نەک نەمان.

٣ـ (کل شیء) واتە (کل ممکن). هەموو مومکینێکیش خۆی لەخۆیدا وەک نەبوو وایە؛ چونکە بوون و نەبوونی لەخۆیەوە نییە.

٧ـ ئایەتی (١٣) و (١٤) لە سوورەتی (انفطار).

٨ـ ئایەتی (١٣٣) سوورەتی (ال عمران).

٩ـ ئایەتی(١٣١) سوورەتی (ال عمران).

١٠ـ ئایەتی (٨٣) سوورەتی (قصص).

١١ـ ئایەتی (٣٥) سوورەتی (بقرە).

١٢ـ باز: دیسان، دووبارە.

١٣ـ لە چاپەکدا (دوی) یە، هەڵەیە.

١٤ـ «پیتَوَە» شیوە نووسی دەستنووسەکەیە، لەچاپەکەدا (بیتوە) یە.

١٥ـ «فی‌الملا» یا (فی المَلأ) واتە: بەئاشکرا، لەناو خەڵکدا. مەلا: واتە مەلای مزگەوت لێرەدا مونادایە و حەرفی نیدا کە (یا)یە لابراوە. لە زوبانی کوردیدا لابردنی حەرفی نیدا زۆر زۆرە.

١٦ـ ئایەتەکانی (١٣،١٤،١٥) ی سوورەتی (نجم).

۱۷ـ وابزانم دارِشتنی واتای [وعلی الاکثر] بەینی سەما و عەرش... تاد] بەمجۆرە بێ گونجاوترە: (بینـا لەسـەر رای زۆربەی زانایانی ئایین مەسافەی مابەینی ئاسمانەکان و عەرش بە ریزی سوپای رەخنە و ئیشکالی دیاریکردنی شوێنی بەهەشت دەڵێ: ئێرە بەجێبێڵن، ئێرە شوێنی ئێوە نییە، شوێنی بەهەشتە).

۱۸ـ بەپێی چاپەکە (حەسبی حەدیثی) یە.

## مبحث بقاء الجنة والجحيم[1]

بەهەشت و دۆزەخ هەروەک ئـەهلیان
(باقِیَتـــــــانِ وَ لا تَفْنَیـــــــانْ)
یـــەعنی دائــیمن بـــە ئــەم مەعنایـــە
عـــەدْمـــی (مُسْـــتَمِرّ) پێیانـــدا نایـــە
لەحزەیی هیلاک ئـەر بـوێ چییـە؟[2]
مونـــافیی بـــەقا بـــەم مـــەعنا نییـــە
(مَـــعْ أنّكُـــمْ قـــد عَـــرَفْتُمْ مِنّـــا)
هـــیلاک موســـتەلزیم نییـــە بـــۆ فـــەنا
قـــــەولی فـــــەنایان (بـــــلا ارتیـــاب)
خـــیلافی ئیجمـــاع ســـوننەتە و کیتـــاب
باتڵە و لە تـام حـەق بـەری بـەری[3]
بێ حوججەت شوبهە نییە لەسـەری[4]

واتە: بەهەشت و ئەوانەی وان لە بەهەشتدا کە موسوڵـمانەکانن و، دۆزەخ و ئـێوانـەی وان لـە دۆزەخدا کە کافرەکانن هەتا هەتایە دەمێننەوە و نەمانیان بۆ نییە، مەعنای دەوامیـان ئەوەیـە کـە نەبوونی بەردەوام روویـان تـێناکـا، جـا ئەگـەر لەبـەر میسـداقی «کـلّ شـیء هالـک الاّ وجهـه» لەحزەیەک بفەوتێن پاش ئەو لەحزەیە دەبنەوە وەکوو خۆیان. رای ئەوانە کە دەڵـێن بەهەشـت و دۆزەخ نامێنن دژی فەرموودەی کیتاب و سوننەت و ئیجماعە. ئەم قسەی ئەوانە شوبهەیەک نییـە پشتگیری لێ بکات چ جایێ حوججەت.

***

۱ـ ئەم سەرباسە تەنها لەنوسخە چاپەکەدا هەیە.

۲ـ ئەم تەعبیری «لەحزەیێ هیلاک... تاد»ە یارمەتیی ئەو باری دووەمە دەدات کە لە پەراوێزی ژمارە(٤)ی (مبحث الجنة و النار)دا نووسراوە.

۳ـ بەری: بەریء بێبەش. بەری ئەو، ئەمەری ئەو. واتە: بەر و ئەمەری ئەم قسە لە تام و چەشی راستی بێبەشە.

٤ـ ئەم نیوە شیعرە وای لێدێتەوە: (بێشوبهە حوججەت نییە لەسەری) واتە: بێ‌گومان ئەم رایە هیچ حوججەتێکی نییە. یا واتە: ئەم رایە حوججەتێ نییە، نەک حوججەت بەڵکو شوبهەیەکیش نییە بۆ ئیسپاتی. ئەم دوو پەراوێزی (۳،٤)ە مەعنای پەراوێزێکی بەفارسی نووسراوی مەولەوی خۆینی کە لە نوسخە دەستنووسەکەدا هەیە.

## مبحث الشَّفاعة[1]

دوای ئەوەی مەولەوی باسی گەلێ لە حاڵ و ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەتی کرد هەر لە سەرەتاوە هەتا حیساب و کیتاب و سیرات و کێشانەی کردار و بەهەشـت و دۆزەخ، ئـەمجار نـۆرەی ئەوەیـە باسی تکا و تکاکاری بکات کە یەکێکە لە گەورەترین شتەکانی ڕۆژی قیامەت، بۆیە دەفەرموێ:

(مِنْهــــا الشَّـــــفاعَةْ و تُسْـــــتَبَانُ
لِمَــــــنْ أذِنَ لَـــــــهُ الرَّحْمـــــــانُ
مِــــنَ الأنبيــــاء، مِـــنَ المـــؤمنين
رَزَقَنــــــا الله منهـــــا أجمعـــــين)
لەو سەروەختی سەخت حەشر و داروگیر
پـیر وەسـە منـداڵ، منـداڵ دەوێ پـیر
ئـەنبیای عیـزام پـێش و پـەس یەکسـەر
کەس بـۆی دەس نـادا پـێ بنێتەوبـەر[2]
هــەر زەلزەلەیــە و وەلوەلــە و وەیوەی
نەفس نەفسی‌یە[3] هەرکەسـێ بـۆ خـۆی
تا سـاحیب روتبـەی مـەقامی مـەحموود
(ســراندر ســجود دل انــدر شــهود) [4]
(يَسْـمَعْ «إرْفَــعْ رأسَــكْ، قُــلْ تُسْـمَعْ،
إشْـفَعْ تُشْـفَعْ(٥) سَـلْ تُعْـطَ» فَيَرْفَـعْ[6] )

دەیێتە و دیار[٧]، چلۆن خۆر هەڵێ
ئەو هەر «أمّتی أمّتی» دەڵێ
(یَشْفَعُ یُشَفَّعْ(٨) فی کل الأنام)
مۆئمین و کافر تەمام خاس و عام
بۆ کافر بۆ فەسڵ قەزا بەتەعجیل
تەخفیفی سەختیی ئەو رۆژ و تەهویل
بۆ موئمین لەبۆ عەفوی سەییئات
بۆ زیادی و رەفع دەرەجەی جەننات
(شِفاء القلوب[٩] لکلّ المَرْضی
مِنَ ضَوْء الضّحی استَضِیء «فَتَرْضی»[١٠]
رەحمەت بۆ هەموو عالەم یانی: وا
مەقامی مەحموود ئەعزەم یانی: وا[١١]
لەودوا جلەو مورەخخەس دەکرێ
ئەزانی ئیزنی شەفاعەت دەدرێ
(کُلُّ نبیٌّ لأُمَّتِهِ
وَ کُلُّ شیخ لِشیعَتِهِ)
برا بۆ برا، سەدیق بۆ سەدیق
(هاکذا) تەحقیق واجبە تەسدیق
وەختێ دەس بڕیا لە هەموو لایێ
نۆگەی رەحمەتی حەق تەعالایێ[١٢]

لەو سەروەخت: لەوکاتەدا. سەخت: گران و نالەبار. داروگیر: بگرەوبەردە و گیروگرفت. وەسە: وەکوو ئەوەیە. دەوێ پیر: پیر دەبێ. پێش و پەس: بەرودوا. یەکسەر: تێکرا، هەموو. خۆر هەڵێ: هەتاو هەڵبێ. أذان: بانگ. ئەزان دەدرێ: بانگ دەدرێ. نۆگەی: نۆرەی، نۆبەی.

واتە: یەکێ لە رووداوەکانی رۆژی قیامەت تکاکردنی پێغەمبەری ئێمە و پێغەمبەرانی تر و غەیری ئەوانیشە لە دڵپاکان و لەخوداترسان، ئەوانەی کە خودای گەورە ئیزنی داون تکا بکەن.

لەوکاتە سەخت و نالەبارەدا کە کـاتی بگرەوبەردەیـە و ئەوەنـدە دژوارە پـیری دنیادیـدە وەک ساوای بێ‌هەستی لێ دێ و، منداڵ تیایا پیر دەبێ و لە ترس و بیمدا ریشـی سـپی هەڵـدەگەڕێ، هیچ کام لە پێغەمبەرانی زەمانی پێشوو وەک ئادەم و شیث و ئیدریس و هوود و ساڵح و نووح، یـا لە پێغەمبەرانی زەمانی دوایی وەک ئیبراهیم و پێغەمبەرانی نەوەی(د.خ) ناتوانن پـێ‌یـەک پـێش خەن و لە شوێنی خۆیان بجووڵێنەوە و لە حزووری خودای گەورەدا تکایەک بکەن، هەموو وان لە هاوار و وەلوەلە و گریان و فوغاندا، هەرکەس خەریکی دەردی خۆیەتی و ناپەرژێتە سەر کەس، تا خاوەنی مەقامی مەحموود حەزرەتی (محمد مصـطفی)، درووdی خـودای لەسـەر، کـە لەوکاتـەدا سەری لە سوجوودایە و دڵی نوقمی نووری تەجەللیاتی خودایە و چـاوەڕوانی ڕەحمەتـە، لەلایـەن بارەگای خوداوەندییەوە بانگ دەکرێ: ئەی (محمـد) ! سـەرت بەرزکـەرەوە، قسـە بکـە، قسـەت دەبیسرێ، تکا بکە تکات لێ وەردەگیرێ، داوای چی دەکەیت بیکـە، پێـت دەبەخشـرێ، ئـەویش (سمعاً وطاعةً) سەر هەڵدەبڕێ و وەک خۆر هەڵدێ، کـەچی لەوحاڵـەدا ئـەو هـەر (امّـتی امتّـی) یەتی، بیری لای پەیڕەوانی خۆیەتی، ئیتر تکا بۆ ئوممەتی خـۆی و بـۆ عامّـەی خەڵـق دەکـات و تکاکەی لێ وەردەگیرێ، تکا بۆ کافران دەکا کە لە سزای ڕاوەستان و چاوەڕوانی عەرەسات ڕزگـار بن و زوو موحاکەمە بکرێن و ئەنجامیان دیاری بکرێ و ترس و لەرزی ئەوساتە سامناکە نەمێنێ.

تکا بۆ موسوڵمانان دەکا خودای گەورە لە گوناهی تاوانبارەکانیـان خـۆش بـێ و، پایـە و پلـەی ئەوانە بەرز بکاتەوە کە تاوانیان نییە، وەک ئەولیا و ساڵحان و ڕەهبەران.

لە پرتەوی سوورەتی (واضحی) نـوور وەربگـرە، لـە ئایـەتی [وَلَسَـوْفَ يُعْطِيـكَ رَبُّـكَ فَتَرْضَـی] وردبەرەوە هەتا لە پلە و پایەی حەزرەتی پێغەمبەر بگەی، هەتا بۆت ڕوون بێتـەوە کـە پێغەمبـەر دەرمانی هەموو دەردێکە، هەتا تێبگەی کە پایـەی (رحمـە للعـالمین)ی ئاوەهـا دەبـێ، مـەقامی مەحموود کە مەقامی شەفاعەتە ئاوەها دەبێ، کە بـە حـەزرەت(د.خ) دراون، (وَرَزَقَنـا مـن شـفاعة بیمن انوار شریعته، و ثَبِّتنا علی طریقتِه باسرار لبّ حقیقته.]

برای موسوڵمان!

پێویستە بزانی شەفاعەت سابتە بە دەلیلی قورئان و فەرموودەی حەزرەت(د.خ) و بە ئیجمـاعی ئوممەتی ئیسلام پێش پەیدابوونی ئەهلی بیدعەت.

دەلیلی ئایەت وەکو [يَوْمَئِذٍ لا تَنْفَعُ الشَفاعَةُ إلا لِمَنْ أذِنَ لَـهُ الـرَّحْمنُ وَرَضِـيَ لَـهُ قَـوْلاً][١٣] یـا ئایەتی [مَنْ ذَا الذي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إلاّ باذنه][١٤] یا ئایـەتی [وَلا يَشْـفَعُونَ إلاّ لمَـنِ ارْتَضـى وَهُـمْ مِـنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُون][١٥].

فەرموودەی حەزرەتیش (د.خ) وەک ئەو حەدیسە کە جابیر لە حەزرەتـەوە ریوایـەتی کـردووە کە فەرموویەتی: «شفاعتي لِأهلِ الكبائر مِـن أمّتـي»[١٦]. ئـەم فـەرموودە تیرمیـزی لـە حەدیسـی ئەنەس وەریگرتووە و بە سەحیحی داناوە لە رێگای (عبدالحق) ەوە بەیهـەقی لـە کیتـابی (شـعب الايمان) دا. وە ئەبوو داوود و تەیالیسـی و ئیبنوماجـە لـە حەدیسـی جـابیرەوە وەریـان گرتـووە و حاکیم بە سەحیحی داناوە.

لە عەوفی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە کە حەزرەت (د.خ) فەرموویەتی: «أتاني آتٍ مِنْ عندِ ربّي فخيّرني بينَ ان يَدْخُلَ نِصفُ أمّتي الجنّةَ وَ بَـيْنَ الشَـفَاعةِ فـاختَرْتُ الشّـفاعَةَ وَ هِـيَ لِمَـنْ مـاتَ لا يُشْرِكُ باللهِ شيئا» رواهُ الترمذي[١٧].

ریوایەت کراوە لە حەزرەتی ئەنەسەوە کە حەزرەتی پێغەمبـەر(د.خ) فەرموویـەتی: ـ «أنـا اوّل الناسِ يَشْفَعُ في الجنة [أي في فتح أبوابها و في إدخال بعـض العصـاةِ فيهـا]. و أنـا أكثـر الانبيـاء تبعاً.»[١٨]

هەروەها لە حەزرەتی ئەنەسەوە دەگێڕنەوە وتوویە: «فكأنّي أنظُرُ الى رَسُولِ اللهِ(ص) قال: فَآخُـذُ بحلقة باب الجنة فَأُقَعْقِعُها فَيقالُ: مَنْ هذا؟ فَيُقالُ: محمد: فيفتحونَ لي وَ يُرَحِّبونَ فيقولـونَ مَرْحَبـاً فَأخِرُّ سَاجداً فَيُلْهِمُنيَ اللهُ مِنَ الثناء و الحمد فيقالُ لي إرفَع رأسك، سَلْ تُعْطَ وَاشْـفَعْ تُشَـفَّعْ وَ قُـل يُسْمَعْ لقولك وَهُوَالمقامُ المحمـودُ الـذي قـالَ الله عسـى أن يبعثـكَ ربُّـكَ مقامـاً محمـوداً» رَواهُ الترمِذيُّ في التفسير بسندٍ حَسَنٍ[١٩]

شـــەفاعەت واتـــە هـــاواربردن و تکـــاکردن لای خـــودای گـــەورە، لـــە لایـــەن حـــەزرەتی پێغەمبەرەوە(د.خ) یا لە لایەن پیاوچاکان و خودناسانی ئیسلام یا لە لایەن پێغەمبەرەکانی تـر یـا فریشتەکانی رەحمەتەوە، بۆ چاوپۆشی لە تاوانی تاوانباران، یا بۆ بەرزکردنەوەی پایە، یا بـۆ چوونـە بەهەشت بە بێ لێپرسێنەوە.

بێ گومان ئەم شەفاعەتە وەکوو دەبێتـە رەحمەت بۆ تکابۆکراوەکە، وەهایش پایەبەرزکردنـەوە و رێزگرتنە لە تکاکردووەکەیش.

بە فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) تکا و شەفاعەت کردنی پێغەمبەران بـۆ ئوممـەتیان و شەفاعەتی گەلێ لە پیلوە گەورەکانی ئەسحابەی پێغەمبەر و، شەفاعەتی دیندارە لەخوداترسەکانی تر غەیری ئەسحابە، هەروەها شەفاعەتی شەهید بۆ کەس و کاری سابت بووە.

لە حەزرەتی حەسەنی بەسەرییەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی: «يَشْفَعُ عثمانُ بنُ عَفَّانَ يوم القيامة في مثل رَبيعَةَ ومُضَر»[٢٠].

لە ئەبووسەعیدەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی: «إنَّ مِنْ أُمَّتي مَنْ يَشْفَعُ للفِئَامِ، و منهم من يَشْفَعُ للقبيلة، و منهم يَشْفَعُ للعُصْبَة، و منهم من يَشْفَعُ للرجل حَتى يـدخلوا الجنّـةَ». فئام: کۆمەڵێ زۆرە. قبیلة: لە فئام کەمترە. عُصْبَة: لە قبیله کەمترە[٢١].

(أبوالدرداء) ڕەزای خودای لێبێ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبـەرەوە(د.خ) کـە فەرموویـەتی يُشَـفَّعُ الشَّهيدُ في سَبْعينَ مِن أهل بيتِه[٢٢].

لە حەزرەتی عوسمانی کـوڕی عەففانـەوە ریوایـەت کـراوە کـە پێغەمبـەر(د.خ) فەرموویـەتی: «يَشْفَعُ في يوم القيامَةِ ثَلاثَةٌ الأنبياء ثمّ العلماء ثمّ الشهداء»[٢٣]

واتە سێ کۆمەڵ لە ڕۆژی قیامەتدا شەفاعەت دەکەن: پێغەمبەران، زانایان، شەهیدان.

هەروەها شایانی باسە کە شەفاعەت پێنج پایەیە:ـ

یەکەم: شەفاعەتی هەرە گەورەیە کە تکاکردنە بۆ هەموو خەڵق بۆ ئەوەی لە ترس و سامی ئـەو ڕۆژە و وەستانی عەرەسات ڕزگار بن و زوو حیساب و کیتابیان لەگەڵ بکرێ.

دووەم: تکایە بۆ ئەوەی هەندێ کەس بە بێحسـێب و لـێپرسـینەوە بچنـە بەهەشـت، وەکـوو تیرمیزی حەدیسێکی ریوایەت کردووە دەفـەرموێ: «وَعَـدَني رَبّـي أنْ يُـدْخِلَ الجنّـةَ مِـنْ أمّتـي سَبْعينَ ألفاً بِغَيْرِ حِسَاب» واتە خودای پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم حەفتا هەزار کەس لە ئوممەتم بێحیساب بخاتە بەهەشت.

سێهەم: بۆ زیادکردنی پلە و پایەی هەندێ کەسە لە بەهەشتدا.

چوارەم: تکایە بۆ کۆمەڵێ کە موستەحەقی ئاگری دۆزەخن، بەڵام بەهۆی ئـەو تکایـەوە ناچنـە دۆزەخ.

پێنجەم: تکایە بۆ ڕزگارکردن و دەرکردنی هەندێ گوناهبـار لـە ئـاگری دۆزەخ. لـەم پێنجانـە یەکەم و دووەمیان بەتایبەتی هی حەزرەتی پێغەمبەرە(د.خ). ئەو سیانەکەی تر ئەویش دەیکات و غەیری ئەویش لەدەستی دێ بیکات لەوانەی کە باسمان کردن. جا ئەگەر کەسێ بوو لـەلای ئـەم

تکاکارانە باسی دیار نەبوو و بەر تکا نەکەوتبوو، ئەوە خـودا خـۆی بـە لـوتفی خـۆی دەیبەخشـێ. ئەبووسەعیدی خدری لە حەدیسێکی درێژا دەگێڕێتەوە:«... فَیَقُولُ‌اللّه، عزّوَجلّ، شَفَعَتِ الملائکـةُ و شَفَع النبیّونَ وشَفَعَ المؤمنون، ولم یَبْقَ إلاّ ارحمُ الراحمین فیقبض قبضة مـن النـار فیخـرج منهـا قوماً لم یعملوا خیراً قطّ قد عادوا حُمَماً فیُلقیهم فـی نهـرٍ فـی افـواه الجنّـة یقـال لـه نهـر الحیـاة فیخرجون کما تخرُجُ الحِبَّة فی حَمِیلِ السیل... الحدیث[٢٤].

رەجـا و شـەفاعەت حـەزرەتی رەسـوول
بـۆ کـەبیرە وەک سـەغیرە مـەقبوول
ئەگـەر برسـیتە و دووری لـە تێـری
«واتقـوا یومـاً لا تَجْـزی» تێـری
جـووعی تـۆ بـەوە غـەیرە مەدفووعـە
(لا یُسْـمِنُ وَ لا یُغْنـی مِـنْ جُـوُع)ە
مەنعـە دەلالـەت، دەمـی بـۆ مـەماڵ،
لە عومـوومی (فـی الاشـخاص) و ئـەحواڵ
(لَـوْ سُـلّمْ) سـەلای تەخسیسـی دەدەیـن
ئێمە بەقـەدەر ئیمکـان جـەمع دەکـەین
موسبیت با[٢٥] نافی، خاس دەگـەڵ عامـە
ئەڵـبەت دەزانی موقـەددەم کامـە؟

(تێری)ی یەکەم: دژی برسی‌یەتییە. (تێری)ی دووەم: دەهێنی. دەمی بـۆ مـەماڵ: دەمـی بـۆ مەلێسەرەوە، خۆت بۆ خواردنی ئامادە مەکە. سەلا: بانگ. با نافی: لەگەڵ نافی.

واتە: تکای حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) چ بۆ بەخشینی گوناهی گەورە؛ بێجگە شیرک و کـوفر؛ چ بۆ گوناهی بچووک لای خودای گەورە قبووڵە؛ چونکە لـە لایەکـەوە خـودا بـە بەخشـینی گوناهـ زیانی پێ‌ناگا و توانایـە بەسـەر هـەموو مومکینێکـدا، لـە لایـەکی تریشـەوە خـۆی نـاوبردووە بـە (أرحم‌الراحمین) و لە هەموو میهرەبانێ میهربان‌ترە. هەروەها مادام گوناهبارەکـە خـاوەن ئیمانـە، ئیمانەکەی دەبێتە هۆی راکێشانی هەموو خێر و خۆشییەک بۆی.

بێجگـە لەمانـە هـەموو قبـووڵ‌کـردنی تکـا ئیسـپاتی گـەورەیی و شـەرافەتی حـەزرەتی (محمدالمصطفی) یە(د.خ) کە تکاکارەکەیە؛ ئەوەتە لە حاڵی حەیاتیـدا ئـەمری پـێ فـەرمووە کـە

داوای لێبووردن بۆ خۆیشی و بۆ ئوممەتەکەیشی بکات [واستغفر لذنبک و للمؤمنین والمؤمنات...][٢٦] یا فەرموویەتی [ولو أنّهم إذْ ظلَمُوا أنفُسَهم جَاءوکَ فاسْتَغفَروُالله واسْتَغفَرَ لَهُمُ الرسولُ لوَجَدُوالله توّاباً رحیماً][٢٧]

واتە: ئەگەر ئەو پیاوە بەدکارانە کە زوڵمیان لە خۆیان کرد بهاتنایە بۆ لای تۆ و داوای بەخشینیان لە خودا بکردایە و تۆیش داوای عەفوت بۆ بکردنایە خودا تەوبەی لێ قبووڵ دەکردن و میهرەبان دەبوو لەگەڵیاندا.

مەسئەلەی حورمەت‌گرتنی خودای گەورە لە پێغەمبەری خۆشەویستی شتێکی زۆر ئاشکرایە [وَمَا کانَ الله لیُعَذّبهم وَأنْتَ فیهم...][٢٨]

ئەو نەزانانە کە وتوویانە قبووڵی تکا و رجای قیامەت خراپە و دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵک بێ‌شەرم بێ و سوور بێ لەسەر گوناح‌کردن بە ئومێدی تکای خاترداران و شەفاعەتی شەفاعەت‌کاران، بەڵێ ئەو نەزانانە بەهەڵەدا چوون؛ چونکە ئەوەی کە تاوان دەکا و دوای ئارەزووی نەفس و شەیتان دەکەوێ لەو کاتەدا هەرگیز تکا و شەفاعەتی پێغەمبەری بەخەیاڵدا نایە، بێجگە لەوە دەلیلی قەتعی نییە کە ئەو شەفاعەتەی بۆ دەکرێ، یا شەفاعەتەکە دەربارەی ئەو قبووڵ دەکرێ.

تۆ ئەی مونکیری شەفاعەت ئەگەر برسیتە و قووتی رۆحیت نییە تا هێزی دڵت هەبێ و، ئایەتی [واتّقُوا یوماً لا تَجْزی نفسٌ عَن نَفْسٍ شَیْئاً وَ لاَ یُقْبَلُ مِنها عَدْلٌ ولا تَنْفَعُها شَفَاعَةٌ ولاَهُمْ یُنْصَرون][٢٩] دەکەیتە دەلیل لەسەر نەبوونی شەفاعەت و دەتەوێ بەوە خۆت تێر بکەی زۆر باش بزانە کە برسییەتی تۆ بەوە چارناکرێ و، ئەو ئیستیدلالە نە قەڵەوت دەکا و نە برسییەتیت لادەبا؛ چونکە ئەو ئایەتە عام نییە بۆ هەموو کەسێکی تاوانبار و بۆ بێ‌سوودیی تکا لە هەموو کاتێکدا، بەڵکو بۆ کافرانە کە شەفاعەت فریایان ناکەوێ، یا بۆ کافر و موسوڵمانە بەڵام بۆ ئەو کاتەی کە پێغەمبەر(د.خ) نەچووبێ بۆ تکاکردن. تەنانەت ئەگەر بە فەرز و تەقدیر بیسەلمێنین کە ئایەتی نەفیی شەفاعەتەکە عامە ئێمە تەخسیسی دەکەین بە دوو حاڵەوە کە وتمان؛ چونکە دەلیل لەسەر شەفاعەت زۆر زەبەندەیە، چ لە قورئان و چ لە حەدیسدا و، هەرگیز ئەو دەلیلانە بەتاڵ ناکرێنەوە، کەواتە تا بتوانین هەردوو جۆرە ئایەتەکان هی نەفی و هی ئیسبات بخەینە کار و کۆیان بکەینەوە باشترە لەوەی یەکێکیان لەکار بخەین و ئیش بە تەنها یەکێکیان بکەین. واتە: دەڵێین ئایەت هەیە نەبوونی شەفاعەت دەگەیەنێ، ئەمە هی حاڵێکە کە زەلامەکە کافر بێ، یا موسوڵمان بێ و

هێشتا پێغەمبەر(د.خ) تکای بۆ نەکردبێ. ئایەتیش هەیە بوونی شەفاعەت و کەڵکی دەگەیەنێ. بۆ ئەو حاڵانە خودای گەورە ڕێگا دەدات تیایاندا و تکاکارەکان دەکەونە لالانەوە و پاڕانەوە.

بێجگە لەمەش دەڵێین ئایەتی موسبیتی شەفاعەت خاسە، ئایەتی نافیی شەفاعەت عامّە، لە ئوسوولیشدا خاس دەخرێتە پێش عامّ.

لەوانەیشە ئەم بەیتی «موسبیت با نافی... تاد»ە ئیشارەیەکی لەتافەتاویی تێدابێ، گوایا: ئەوانەی دەڵێن شەفاعەت هەیە جەماعەتی تایبەتین و خاسن، واتە چاکن. ئەوانەی دەڵێن شەفاعەت نییە چاک نین و لە ڕێگە لایانداوە، خۆیشت دەزانی کام لە پێشە، تایبەتی و چاک یان لەڕێلادەر و ناچاک.

زۆر کەس هەن وە بێ حیساب و عەزاب
دەڕۆنە بەهەشت؛ (فَنِعْمَ‌الْمَآب)
کافر، موبالیغ، ئەر موعانیدە،
جومهوور دەفەرموون (فی‌النار) خالیدە
موئمین ئەر فاسق، ئەگەر موتیعە
خالید (فی‌الجنة) و ڕوتبەی ڕەفیعە
فاسق کەی؟ ئەوسا کە عەزاب بدرێ
یا عەفو بکرێ و بە جەننەت ببرێ
بەعزێ لە ئەعلام (ذوالعلم السّابغ)
دەڵێن کافری ساعی و موبالیغ،
لە ئیجتیهاددا هیچ نەیکرد تەقسیر
سەعیی کرد حەقی هەر نەبوو دەستگیر
چون تەکلیف ناکا حەق لە تاقەت ڕەد
ئەو موبالیغە ناوێ موخەللەد
قەولی غەزالیچ (علیه‌الرحمة)
لە بەعزێ جێگە نزیکە بەمە
(وَأَمّا الأطفال) دەڵێت نەوەوی،
مەورید بێ بۆ فەیز سووری و مەعنەوی،

سەحیح بەهەشتین تیفلـی موشـریکین
(فَـــنِعْمَ المــــولی رَبُّ العـــالمین)

واتە: ئینسان بە نیسبەت بەهەشت و دۆزەخەوە چەند جۆرن؛ زۆر کەس لە موسوڵـمانان بـەبێ سزا و بەبێحیساب دەڕۆنە بەهەشت و هەتا هەتایە تیایا دەمێننەوە. ماشەڵلا لەم بەشە باشە. ئـەو حەدیسەیش هەیە کە حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی خـودای گـەورە بەڵـێنی پـێداوم حەفتاهـەزار کەس لە ئوممەتی من بێسزا و حیساب بخاتـە بەهەشـت، وە (عکاشـە)ی هـاوڕێی پێغەمبـەریش یەکێکە لەوانە و باسەکەی مەشهوورە.

کافری بێئیمان چ ئەوەی سەعی بکـا و هەوڵـێکی زۆر بـدات بـۆ دۆزینـەوەی ڕێـی راسـت؛ چ ئەوەی سەرکەش و لەرەسەخت بێ و ئیمان نـەهێنێ، بـە نەسسـی ئایـەت و حـەدیس و بـە رای جەماوەری ئەهلی سوننەت و جەماعەت جێگایان دۆزەخی هەتا هەتایـە، سـزای ئەبـەدی پاداشـی کوفری ئەبەدییە وەک لە ئاییندا مەعلوومە.

موسوڵمانەکانیش چ فەرمانبەردار و گوێڕایەڵ و چ گوناهبار، دەچنە بەهەشت و هـەتا هەتایـە تیایدا دەمێننەوە، بەڵێ بێگوناهەکانیان یەکسەر و گوناهبارەکانیان پاش سزا و ئازاردران یـا پـاش عەفوکردنیان دەڕۆنە بەهەشت.

بـەڵام هەنـدێ لـە زانـا گـەورەکانی ئـاینی ئیسـلام رایـان وایـە هـەر کـافرێ کـە باسـی پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی پێنەگەیشتبێ وەک ئەوە کە لـە شـوێنێکی دور لـە ئـاوەدانی بـێ، یـا کەوتبێتە شوێنێکەوە مەجالی سەعی و ئیجتیهادی نەبێ ئەوە وەکوو ئەهلی (فترە) وایە و عـەزابی نییە.

هەروەها هەر کافرێ خوێندەوار بێ و زۆر تێبکۆشێ بۆ ئەوەی دیـنی بـۆ راسـت بێتـەوە و، لـە شوێنێکدا نەبێ دەستی بگاتە مەرجەع بۆ چارکردنی گیروگـرفتی عیلمـی و ئیعتیقـادیی خـۆی و، دینی بەساغی بۆ راست نەبێتەوە، ئەمەیش وەک ئەو کافرەیە کە دەنگ و باسـی پێغەمبەرایـەتیی پێغەمبەری پێنەگەیشتبێ و، لە رۆژی پاداشدا سزای نییە.

بەڵام پێویسـتە بـزانن ئـەم حوکمـە بـۆ زەمـانی لەمـەوپێش بـووە کـە ئەسـبابی گەیشـتنی دەنگوباس و بڵاوبوونەی کەم بووە، واتە ئا لەم زەمانـەی ئێمـەدا هـیچ کـافرێکی سـاغ و سـەلیم، بەتایبەتی خۆینەوار و رۆشنبیر عوزری لێ وەرناگیرێ و هەرکەس ملکەچ نـەبێ بـۆ نەسسـەکانی ئایەت و دەلیلەکانی تر و فەرمانبەرداری دینی ئیسلام نەبێ، بە کافری موتڵەق حیساب دەکـرێ و

له دۆزەخدا ئەبەدی دەبێ؛ چونکه داواکردنی ئیمان له کەسێکی وەها داواکردنی شتێکه له توانـای ئینساندا بێ و پێی‌بکرێ و، بەر (تکلیف بِهِ مالایُطاق) ناکەوێ.

ئیتر فەرموودەی ئیمامی غەزالی بۆ ئەو کافرانەیه که دەعوەتیان پێ‌نەگەیشـتبێ و هـەرگیز لـه تواناياندا نەبێ بگەنه حەق و حەقیقەت، نەک بۆ کافری رۆشنبیری وەها لەتوانایدا بێ بگاته راستی و له حەق تێ‌بگا، بەڵام کەم و زۆر خۆی ماندوو نەکا و گوێی خۆی لێ کەڕ کا.

ئـەنجا مەولـەوی دێتـه سەرباسـی منداڵـی کـافران کـه بـه منداڵـی دەمـرن و، دەربـارەی چارەنووسیان قسه دەکات؛ پوختەی باسەکه ئەوەیه منداڵی کافران، له کافرستاندا بن یا لـه وڵاتی ئیسلام، هەموو بەهەشتین؛ چونکه پێش ئەوە بگەنه تەمەنی تەکلیف و لێ‌پرسیاوی مردوون، واللّـه علی کلِّ شیء وکیل.

مومکینـــه لەســـەر ســـەغیره عیقـــاب،
گـەورە عـەفو کـا هـیچ نـەدا عـەزاب؛
فـەزلی[٣٠] دەفـەرمووت: کـەبیره نییـه،
عـەدلی[٣١] دەفـەرمووت: سـەغیره نییـه
(«یَغفِـرُ دُونَ» شِـرْکْ مِـنْ ذَنْـبٍ نَشَـا)
بـا بـێ‌تەوبـەیچ بـێ، (لِمَـنْ؟ مَـنْ یشـا) [٣٢]
بـەم شـەرته (مـادون) حـەلاڵ نـەزانێ؛
ئەگەرنـــه کـــوفرە، دەرمـــانی کوانـــێ؟
(عِنْـــدَنَا) کاســـیب گونـــای کـــەبیره
هـــەروەکوو کاســـیب گونـــای ســـەغیره
نـاوێ بـه خـاریج لـه وەسـفی ئیمـان[٣٣]
یاخەیر داخـڵ وێ بـه کـوفر و حیرمـان[٣٤]
لـــه جەهەنەمـــدا نییـــه موخەللـــەد،
بەڵ به مەحزی فەزڵ موخرەجه و موسـعەد
کـــەناریّ بگـــرە تـــۆ لـــه ئیعتیـــزال
کـەلامی خـاریج پووچـه و بـێ‌مـەئال

ئەسڵێکی مـەخووف زۆر هەیبـەتناکـە[٣٥]
گومـــانم خـــەتمی بـــەم تـــەرزە چاکـــە:
بـــێئەمـــە دەلیـــل شـــەرعیت وێ دەســـگیر
لـــە ئـــەهلی قیبلـــە کـــەس مەکـــە تـــەکفیر
ئەر (بَرّ) ئـەر (فـاجِر) فـەرق مەکـە، هـەموو
(صَـــــــــلُّ خَلْفَهُـــــــــمْ وَ عَلَـــــــــیْهِمْ)

واتە: بۆ خودای گەورەی پـەروەردگاری جیهـان ڕەوایـە سـزای ئینسـان بـدا لەسـەر گونـاهی بچووک، وەک ڕەوایشە بۆی لە گوناهی گەورەی خۆش ببێ، چونکە خەڵق هەموو بەندەی ئەون و لەژێر دەستەڵات و کاری ئەودان، لێبووردن و سزادانیش هەر لە دەستەڵاتی ئەودان، خودا فاعیلی موختارە و چی دەکات دەیکات (یفعل مایشاء و یحکم بمایرید).

ئەنجا با بێینە سەر درێژەدان بە باسی گوناهـ:

گوناه بەپێی ئەو ڕێوشوێنانەی لە ئایینەدا باس کراون دوو جۆرە: گـەورە و بچـووک، ئەگـەرچی ئیمامی حەرەمەین (عبدالملک)ی جووەینی دەفەرموێ گوناهی بچووک نییە؛ گوناهـ لەبەر ئەوەی نافەرمانی و بەگوێنەکردن و بێ ئەدەبییە بەرامبەر بە خودای پەروەردگار هەمووی گەورەیە.

عولەمای دین لە دیاریکردن و تەعریفکـردنی گونـاهی گـەورەدا قسـەیان زۆرە؛ هەنـدێکیان دەفەرموون: هەر گوناهێ خودای گەورە بەتایبەتی هەڕەشەی کردبـێ لـە سـەری ئـەوە گەورەیـە وەک خەڵککوشتن، زینا، سوودخواردن، ماڵیهەتیوخواردن، شەرابخواردن، دەسپیسیکـردن و خیانەتلەئەمانەت، ئازاردانی باوکودایک، بێئەدەبیکردن لە حەرەمی مەککەی موکەڕڕەمـەدا... هەندێکی تر دەفەرموون: گوناهی گەورە ئەوەیە یـا هەڕەشـەی لەسـەرکرابێ یـا حـەددی لەسـەر دانرابـێ. هەنـدێکیش دەفـەرموون: گونـاهی گـەورە ئەوەیـە دەلالـەت بکـا لـە بـێموبـالاتی و کەمتەرخەمیی خاوەنەکەی بە دین؛ وەکوو ئەوانەی لەمەوپێش باسمان کردن.

بەڵێ وەک مەولەوی لە سەرەتای ئەم بەشە شیعرانەدا فەرمووی کە سەیری گەورەیی دەریـای کـەرەم و میهرەبـانیی خـودای گـەورە دەکـەی گوناهـ هەرچەنـد گـەورە بـێ خـۆی نانوێنـێ و چاوڵێپۆشینی بۆ خودا شتێکی گران نییە.

کە سەیری عەدالەت و دادپەروەریی بکەی، کە بیر لەوە بکەیتەوە کە شەرملەخوداکردن چەند بەنرخە «فان لم تکن تراهُ فانه یراک»، ئەگەر بیر لەوە بکەیتـەوە کـە بـێئـەمریکـردنی خـودای

گەورە لە شتێکی بێنرخدا زۆر گەورەیە، دەڵێیت گوناهـ هەر گوناهە وسەرپێچی‌یە و، گـەورەیی و بچووکی بۆ نییە و، هەمووی گەورەیە.

بەڵام ئەم راستییە قاعیدەی گوناهی گەورە و بچووک تێک نادا؛ زۆر ئاشـکرایە کـە یـەک جـار تەماشاکردنی نامەحرەمێک فەرقی زۆرە لە زینایەک، یا لە کوشتنی بێ‌گوناهێک.

بێجیگە لەوەیش خۆپاراستن لە گوناهی گەورە دەبێتە هۆی بەخشینی گوناهە بچووکـەکان [إِنْ تجتَنِبُوا کَبائِرَ ما تُنْهَونَ عَنْهُ نُکَفِّرْ عَنْکُمْ سَيِّئاتِکُمْ][٣٦].

هەروەها دەشێ خودای گەورە هەموو گوناهێکی ئینسان ببەخشێ تەنها کوفر نەبێ؛ خودا خۆی فەرموویەتی: [إِنَّ‌الله لاَ یَغْفِرُ أَنْ یُشْرَکَ بِهِ وَ یَغْفِرُ ما دُونَ ذلِک لِمَنْ یشاء وَمَـنْ یُشـرِکْ بـالله فَقَـدِ افْتَری إثماً عظیماً][٣٧] ئیتر کابرای گوناهبار تەوبە بکات یا نەیکا؛ چونکە عەفو و بەخشـین حـەقی خودا خۆیەتی و خۆی موختارە لە بەکارهێنانی حەقی خۆی و چۆنیەتیی ئەم بەکارهێنانەدا. رَزَقَنـا الله عفوهُ و لطفه بِمنّهِ آمین.

ئایەت وحەدیس بۆ ئیسپاتکردنی ئەوەی وتمان زۆرن، بەڵام موعتەزیلـەکان وتوویانـە عـەفوی خودا وەختێ دەبێ کە گوناهەکە بچووک بێ، یا گەورە بێ و خاوەنەکەی تەوبەی کردبێ و ئەگـەر تەوبە نەکا لە گوناهی گەورە عەفو ناکرێ، دەلیلی ئەم ئیددیعایەیان دوانن:

١ـ ئەو ئایەت و حەدیسانەن کە دەربارەی گوناهباران  وتراون.

٢ـ ئەگەر تاوانبار بزانێ عەفو دەکرێ، بێشەرم دەبێ و لە گوناهـکردندا جەسارەت پەیدادەکا.

ئێمەیش دەڵێین وەڵامی دەلیلی یەکەمتان ئەوەیە ئەو ئایەت و حەدیسانە عام نین بـۆ هـەموو گوناهبارێ، ئەگەر عامیش بن دەبێ تەخسیس بکرێن بەوانەوە کە خواستی خـودا لەسـەر ئەوەیـە جەزایان لێ بسێنێ و تۆڵەی گوناهەکانیان لێبکاتەوە، ئەوانەیش کە عەفو دەکرێن لە عوموومەکـە دەربکرێن. تاکە ئایەتـەکان کۆبکەینـەوە نـەچن بـەگژ یـەکتردا؛ چونکـە تـا بتـوانین دەلیلـەکان کۆبکەینەوە و بیانخەینەکار و هەریەک تەئسیری خۆی بکا باشترە لـەوەی یـەکێ لـە دەلیلـەکان لەکاربخەین، وەکوو لەمەوپێش باس کرا.

وەڵامی دەلیلی دووەمیشتان ئەوەتە ئێمـە نایسـەلمێنین تـەنها جـەوازی عـەفو ببێتـە هـۆی خێرابوونی گوناهبار بۆ گوناهـ و تاوانکردن، بەهۆی ئەم جـەوازی عـەفووەوە تەنانـەت (ظـن) یـش پەیدا ناکا بەوەی کە سزا نادرێ چ جایێ عیلم و یەقین.

ئەوەیشمان لە بیر نەچێ وەختێ خودای گەورە گوناهـ دەبەخشێ کـە کـابرای گوناهکـار ئـەو گوناهە بە حەلاڵ نەزانێ، ئەگەر بە حەلاڵی زانی ئەوە پێی کافر دەبێ و، عەفو بۆ کوفر نییە.

شایانی وتنە: بەپێی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت گوناهی گەورە ئینسـان لـە دیـن دەرناکا و پێی ناچێتە ریزی کافرانەوە و، لە دۆزەخدا بەردەوام و تا هەتایە نابێ، بەڵکو بەرامبەر بەو گوناهە گەورەیە یا سزا دەدرێ یا دەبەخشرێ، سزاکەیش بەقـەدەر گوناهەکەیـە و کـە تـەواو بـوو دەچێتە بەهەشت.

لە مەزهەبی جەماعەتی خەواریجدا ئەوکەسە کە گوناهـ بکا، بچووک یا گەورە، پێی کـافر دەبـێ و، مەرتەبەیەک نییە مام ناوەندی بێ نە کوفر بێ و نە ئیمان.

بەلام موعتەزیلـەکان دەڵـێن خـاوەنی گونـاهی گـەورە نـە (مـؤمن)ە و نـە (کـافر) و دەڵـێن (منزلة)ی (بین‌المنزلتین) هەیە، واتە لە بەینی دوو سیفەتی کوفر و ئیماندا؛ بەلام مادام بـێ‌تەوبـە مرد بە ئەبەدی سزا دەدرێ.

دەلیلی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەر ئەوەی خاوەنی گوناهی گەورە لە دین دەرناچـێ و ناچێتە ریزی کافرانـەوە ئەوەیـە کـە ئیمـان بریتییـە لـە بـاوەڕکردن و تەسـدیق‌کـردنی ئـەوەی پێغەمبەری خودا(د.خ) هێناویەتی لای خوداوە. کە ئیمان بریتی بێ لەوە، ئینسـانی (مـؤمن) لـەو ئیمانە بێبەش نابێ مەگەر شتێ بکات کە دژی ئیمانەکەی بێ، بە تـەنها ئیقـدام لەسـەر گوناهـێ بەهۆی هێرشی ئارەزووی نەفس، یا شالاوی رق و کینەوە ئەو باوەڕ و تەسدیقە نافەوتێ، بەتایبەتی ئەگەر کابرا ئومێدی بە عەفوی خودای گەورە هەبێ.

بەڵێ هەندێ تاوان هەن کە لە دنیادا بە نیشانەی نەمانی ئیمان، وەک پۆشینی زەننار (صـلیب) یا بێشەرمی لەگەڵ موقەددەسـاتدا، یـا وتـنی کەلیمـەی کوفرـ پەنابەخوداـ ئەمانـە لـە بابـەتی قسەکەی ئێمە نین، ئەمانە لەبەر ئەوە کە نیشانەی بێ‌ئیمانین، کوفرن.

دەلیلێکی تر لەسەر قسەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوەیە کـە خـودای گـەورە بـە نـاوی (مؤمن) ناوی تاوانبـاران دەبـات وەک [وَ إِنْ طائِفَتـانِ مِـنَ‌الـمؤمِنینَ اقتتلـوا فأصـلحوا بینهمـا... الآیة][٣٨] واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵ لە موسوڵمانان گژان بە یەکدا ئێوە ئاشتیان بکەنەوە و ناوبژییـان بکەن. یا وەک [یا أیهاالذین آمنوا توبوا الی‌الله توبةً نصوحاً... الآیة][٣٩] یا وەک [یا أیهاالـذین آمَنـوا کُتِبَ علیکُم القصاص... الآیة][٤٠]

دەلیلێکی تر ئەوەیە هەموو موسوڵمانان پێکهاتوون لەسەر ئەوە کە نوێژی جەنازە لەسەر هەموو موسوڵمانێک بکەن و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەن، خۆ دیارە نە نوێژ و نە دوعا هیچیان بۆ غەیری موسوڵمان ناکرێن.

دەلیلی خەواریج لەسەر کوفری ئەهلی کەبائیر ئەو ئایەت و حەدیسانەن. دەلالەت لە کوفریان دەکەن، وەک ئایەتی [وَمَن لَمْ یَحْکُمْ بِمَا أنْزَلَ الله فأولئَکَ هُمُ الکافرون][41] یا حەدیسی [مَنْ تَرَکَ الصَّلَاةَ مُتَعَمّداً فَقَدْ کَفَرَ] و هی تریش.

وەلامی ئەم شوبهەیە ئەوەیە کە مەبەست لەو کەسانەی لەم جۆرە نەسسانەدا باس کراون ئەوانەن کە باوەڕیان نەبێ بەو حوکمانەی لای خوداوە هاتوون، یا نوێژنەکردنەکە بە حەلاڵ بزانن.

بێجگە لەوەیش ئەم نەسسانە ئەگەرچی مەعنای زاهیری خۆیان هەیە لەوانەن تەئویل بکرێن، بەلام ئێمە دەلیلی قەتعیمان هەیە لەسەر ئەوە کە خاوەنی گوناهی گەورە موسوڵمانە و کافر نییە و پێش پەیدابوونی خەواریج ئیجماع لەسەر ئەمە بووە.

موعتەزیلەکانیش دەڵێن پاش ڕێکەوتنی هەموو لایەک لەسەر ئەوە کە خاوەنی گوناهی گەورە فاسقە ئیختیلاف پەیدا بوو لەسەر ئەوە: ئەم فاسقە ئاخۆ (مؤمن) ە، وەک ئەهلی سوننەت دەڵێن، یان کافرە وەک خەواریج دەڵێن، یان مونافیقە وەک حەسەنی بەسەری وتوویە، ئێمەی موعتەزیلەیش ئەوەمان ئیختیار کرد کە لە بناخەدا لەسەری ڕێکەوتن کە فاسقییەکەیە، نە بە (کافر)ی دادەنێین وەک خەواریج، نە بە (مؤمن) وەک ئەهلی سوننەت، نە بە (منافق) وەک حەسەنی بەسەری وتوویەتی. ئێمە لە وەلامی موعتەزیلەدا دەڵێین: ئەم عەقیدەی ئێوە فاسیدە و لەگەڵ ڕاستیدا ناگونجێ، چونکە دروستکردنی ڕێگایەکە لەگەڵ ئیجماع و یەکگرتنی سەلەفی سالح ڕێک ناکەوێ، ئەوان ئەم (منزلة)ی (بین‌المنزلتین) ەیان لا نەبووە، کە مادام ئیمان باوەڕ و تەسدیق بێ هەتا ئەو باوەڕ و تەسدیقە لە دڵدا بمێنێ ئیمانەکە هەیە و خاوەنەکەی بە موئمین دەناسرێ.

حەسەنی بەسەریش، کە دەفەرموێ خاوەنی گوناهی گەورە مونافقە، مەبەستی لە (نفاق) کوفری داپۆشراوە لە دڵی کابرای تاوانباردا، واتە: حەسەنی بەسەری خاوەنی گوناهی گەورە بە کافر دادەنێ ئەوەندە هەیە کوفرەکەی ئاشکرا نییە، ئەویش لای وایە کە واسیتە لە بەینی کوفر و ئیمان‌دا نییە.

لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت دروست نییە هیچ شەخسێکی تایبەتی بە کافر دابنرێ و لەعنەتی لێ بکرێ تا بە دەلیلێکی قەتعی دەرنەکەوێ کە ئەو کەسە بە کافری مردووە، هەروەها رەوا نییە هیچ ئینسانێکی موسوڵمان کە خۆی بە ئەهلی قیبلە بزانێ بە کافر بدرێتە قەڵەم تا بە دەلیلی قەتعی مەعلووم نەبێ ئەو کەسە کافرە.

هەروەها رەوایە نوێژی جەماعەت بکەین بە ئیمامەتی هەموو پیاوێکی باش و هەموو پیاوێکی خراپ، هەرچەند مەکرووهە ئیقتیداکردن بە پیاوی فاسق.

رەوایە نوێژی جەنازە لەسەر هەموو مردوویەکی موسوڵمان بکەین، باش بێ یا خراپ؛ چونکە حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی [لا تَدَعُوا الصلاةَ عَلى مَنْ ماتَ من أهل القبلة]

لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت پێویستە ئینسان هەمیشە لەبەینی ترس و ئومێددا بێ؛ واتە لەلایەک ترسی لە غەزەبی خودای گەورە هەبێ و لەلایەک دڵی هەمیشە بە ئومێدی لوتف و میهرەبانیی خودا ئاوەدان بێ؛ چونکە ئەمینیی لە سزای خودا و ناهومێدی لە میهرەبانییەکەی هەردووکیان کوفرن، وا باشە ئینسانی موسوڵمان هەمیشە گومانی خێر و رەحمەتی بە خودا زیاد بێ؛ لە حەدیسی قودسیدا هەیە: «أنَا عِنْدَ ظنّ عَبْدي بي»

(لله) لیباس نەهی لە مونکەر
ئەمر بە مەعرووف زەریف کە[٤٢] لەبەر
کە چاوت پێ کەوت مونکەرێکی کرد
یەکێ[٤٣]، دەفعی کە[٤٤]، لە گەورە تا ورد[٤٥]
بە دەس، بە زوبان، یاخۆ بە جەنان
(وَهذا الآخر أضعفُ الایمان)
(نعوذ بالله) جەزای نەوێنی
ئەوحاڵە: مونکەر تۆ نەیبوغزێنی؛
(أضعف الایمان) کە ببڕێتەوە
هەر کوفرە دیتر بەسەر رێتەوە
پەناهە بەر خودا لەوەی کە نەدوێ،
عاجزیچ نەوێ، کەیفی پێ بجوێ!

ئایــــــەی شـــــــەریفەی «لا یَضُـــــرّکم»
لــــە ئیشـــتیباهدا زۆری کـــردن گـــوم[٤٦]
مـــــەعنایان تـــەواو نـــــەزانی چییـــــە؟
خســـووس بـــوینین ئـــەم شـــرووتی یـــە
(شـــــرطهٌ ان لا یـــــــؤدّی الــــــی
فتنــــــــة، وَ ظَـــــــنّ اَنْ تُقْــــــبَلا)
تـــۆ بـــێ ئـــازا وە چـــاک بکێشـــە تێــغ
تـــا تیــدا دەچـــی هـــیچ مەکـــە دریــغ

پەناهـ بەر خودا: پەنا بە خودا. دیتر: ئیتر. نەدوێ: قسە نـەکا. بجـوێ: بجوولـێ. کـەیفی پـێ بجوێ: پێی خۆش بێ. بوینین: ببینین. ئازا وە: ئازا بە. تا تێدا دەچی: تا دەمری.

واتە: تۆ هەر لەبەر رەزای خودای گەورە بەرگی ئەمربەچاکە و نەهی‌لەخراپە لەبەر بکە، واتە: با هەمیشە، وەک بەرگ، ئەم حالە باشەت پێوە بێ و بەپێی توانا ئەمر بە چاکە بکـە و رێ لـە خراپـە بگرە. هەرکاتێ و لە هەر شوێنێکدا چاوت بە یەکێ کەوت ئیشێکی ناشـەرعیی دەکـرد زوو هـەوڵ بدە بۆ نەهێشتنی ئەوکارە بەدە ناشەرعییە، لە هەرکەسێکەوە رووبدات، گـەورە یـا بچـووک. ئـەم هەوڵە بە دەست و بە هێز ئەگەر هەتبوو، یا بە زوبان و قسەکردن لەگەڵ خاوەن مونکـەردا و پێـی بڵێ: واز لەم کارە بێنە خودا ئەم جۆرە کارەی پێ ناخۆشە، ئەگەر بە دەست و زوبان نەیتوانی با بە دڵ ئەوکارەی پێ ناخۆش بێ و لە دڵی خۆیدا بڵێ: خودایا ئەم کارە ناڕەوایە و تـۆ پێـت ناخۆشـە؛ منیش پێم ناخۆشە و رقم لێیەتی. ئەم بەدڵ‌پێ‌ناخۆش‌بوونە بێ‌هێزترین پلەی باوەڕە. پەنا بە خودا لە سزای ئەوکەسەی خراپە ببینێ و پێی ناخۆش نەبێ و نەیبوغزێنێ. تۆڵەی ئەم بێ‌موبالاتییە زۆر نابارە؛ بێ‌هێزترین پایەکانی باوەڕ بەدڵ‌پێ‌ناخۆش‌بوونە کە ئەمەیش نەبوو بێجگە کـوفر چـی دێتـە رێگای ئینسان، واتە ئەگەر تۆ مونکەرەکەت پێ ناخۆش نەبوو، لە دڵدا رقت لێی نـەبوو، بترسـە لـە کافربوون، پەنابەخودا لە سزا و تۆڵەی ئەو کەسانە کە قسەیێ ناکەن بۆ لابـردنی مونکەرەکـە و بـە دڵیش پێیان ناخۆش نییە، بگرە شەوق و زەوقیان پێی دەبزوێ!

هەندێ‌کەس تەماشای ئایـەتی[یـا أیهاالـذین آمَنُـوا علـیکم أنْفُسَـکُمْ لا یضـرّکم مَـنْ ضَـلَّ اذا اهتَدیتم... الآیة][٤٧]ی کردووە و وتوویەتی مەعنای وایە هەرکەسێ بـۆ خـۆی بـاش بـێ و رێگـەی خێری گرتبێتە بەر ئیتر زیانی نییە ئەگەر بێ‌دەنگ بێ بەرامبـەر بەوانـە کـە گومـڕان، بـەلام ئـەم

کەسانە کەوتوونەتە ئیشتیباهەوە و مەعنای ئایەتەکە حالّی نەبوون، چونکە مەعنای (إذا اهتـدیتم) کاتێ دێتەجێ کابرا بەقەدەر حالّ مودافەعە بکا بە دەس و بە دەم و بە دلّ، ئەوسا موهتەدییە و بـە مونکیری کابرای مونکیر تووشی زیان نابێ. والحاسل: جوملەی «لا یضرّکم» بەستراوە بە جوملەی «اذا اهتدیتم»ەوە. مەعنای ئەم «اذا اهتدیتم»ەیش نایێتە جێ تا بەقـەدەر توانـا تـێنەکۆشـێ بـۆ لابردنی مونکەرات بەو سێ رێگە کە باس کران.

بەلاّم بۆ ئەم ئەمربەچاکە و نەهی‌لەخراپەیە پێویستە ئەم مەرجانە چاودێری بکرێن:

یەکەم: ئەو ئەمر و نەهیە نەبێتە هۆی فیتنەیەک بەقەدەر فیتنەی بێدەنـگ بـوون لـە عاسـتی خراپەکە یا زیاتر.

دووەم: کابرای ئامیر و ناهی گومانی وابێ ئەو ئەمر و نەهیەی لێ قبووڵ دەکرێ.

سێهەم: بزانی مەعنای مەعرووف یا مونکەرەکە چییە؟ واتە: بزانێ فلانە شـت چاکـە و ئـەمری پێ بکا، یا ئەوەی تر خراپە و نەهیی لێ بکا.

چوارەم: ئەگـەر نـەزانێ یـەکێکی وەک ئـەو یـا قسـەرەواتر خـەریکی ئـەو ئەمربەمـەعروف و نەهی‌لەمونکەرە بێ.

ئەنجا کە ئەم شەرتانە هاتنە جێ تۆ بێ هەروەکوو مەردێکی مەردانە تێغی خـۆت رووت بکـە و خەریک‌بە و درێغ مەکە تا گیانت تیایە و تینێکت هەیە.

(وَاللهُ سـتَّارٌ لاَ تَجسَّسُـوا
وَلاَ تـأمَنوُا وَلاَ تَيْأسُـوا)
تـەقوا بـەکارە بـۆ مـن و تـۆ و ئـەو
(ثُـمَّ نُنَجّـي الّـذينَ اتَّقَـوُا) (٤٨)
خولاسـەی تـەقوا کـە کەوتـە پێـوار
بـا نەوبـەی بۆتـەی تەوبـە بـێ ئـەمجار
سـیمی مەغشووشـت چـاک بتوێنـەوە
لـە دەس غـەل و غـەش خـۆت بسـێنەوە
(هَـدى إليهـا بإرشـادە
و يَقْبَلُهـا مِـنْ عبـادِە)

(فضلاً وَ رَحْمَةٌ جَنابِ الکریم
حبّذا اللطفُ الخفّی العَمیمُ)
تەفرەی ئەم تەوبەی واجیبە تا کەی؟
عومری سۆزوو کوا ئەو سۆزووی دەخەی؟!
موحیببی مەحبووب حەقیقیی ئەقدەس
حوببی تائیفەی تەواوبینی هەس[٤٩]
دەرمان دە لە رووی (قُروح) و (جُروح)
پەرۆ کە دڕیاگ بە تەوبەی (نَصوح)
ئەر باز نەفسی شووم تۆ لە ڕێ نابا
تاقی (إنّه کانَ توّاباً)
سەد تەوبەت شکاند خۆت مەشێرەوە
قاپی گوشادە باز هەم بێرەوە
تۆ مەچۆ لە خەت (فاسْتَقِمْ) ئەودەر
(مرحباً أهلاً سهلا یا قَدَرْ)
عەلاحیدە و سەخت ڕێی مەلاحیدە
ڕێواز[٥٠] کۆمەیی (نفسٌ واحِدَة)
ئەر سەد بار بێ بەیت هیچ مالت نەوێ[٥١]
لەناو عەشرەتدا پەکت ناکەوێ
خۆت لە هاوبەیتی هاومالان نەخەی
نیمە بەیتێکیچ هەر چاکە، سا دەی
(سائِقَ الأظْعانْ نحوَ حَیّ طَیّ!)
عەجَەلْ نەک مەهەلْ ڕێی پێ ناوێ تەی[٥٢]
حەرەکەت باز هەم حەرەکەت دەدا
(طَالَما کُنّا نَسْمَعْ طَعْنَنَا
مِنْ وُشاتِنَا فَسُقْ ظَعْنَنا) [٥٣]

پێوار: کەنار. کەوتە پێوار: کەوتە کەنار، واتە شاررایەوە و دیار نەما. تەفرە: دواخستن. سـۆزووو. سبەینێ. موحیببی مەحبووب: خۆشویست و خۆشەویست، مەبەستی خودای گەورەیـە. دەرمـان دە: دەرمان بدە. پەڕۆ کە: پەڕۆ بکە، پینەوپـەڕۆ بکـە. درپـاگ: دڕاو، شـڕووڕ. ئـەر: ئەگـەر. بـاز: فارسی‌یە، واتە دووبارە، دیسان. تۆ لە رێ نابا: تۆ بە ڕێگای ڕاستدا نابا. تاقی: تەحقیق، بـەڕاسـتی. سەد تەوبەت: مەبەستی ژمارەی (١٠٠) ە، واتە: ئەگـەر سـەد جـار تەوبـەت شـکاند، یـا بەمـەعنا هەرچەنـدە، ئەگـەرچی‌یـە. مەشـێرەوە: مەشـارەوە. ئـەودەر: دەر. مـەچۆ ئـەودەر: دەرمـەچۆ. عەلاحیدە: تەنها و تاک. ڕێواز: ڕێی کراوە. کۆمە: کۆمەڵ. ئەر سەد بار بێ بەیت: ئەگەر سەد جار بێ‌خانوو بێ، ئیشارەیشە بۆ شیعر. هاوبەیتی: هاومالی، دراوسێیەتی، هاوشـیعری‌یـش ئەگەیـەنێ. عەجەل: پەلە. مەهەل: لەسەرخۆ.

واتە: خودای گەورە سرپۆشە. ئێوەیش لەسەر ئەو شێوە ڕەفتار بکەن و مەکەونە شوێن عـەیبی خەڵک و، ئەگەر خەوشێکتان دی داپۆشن، ئەمین مەبن لە غەزەبی خودا و ناهومێدیش مەبن لـە بەخشندەیی و میهرەبانیی.

تێکۆشن بۆ بەدەستهێنانی تەقوا و پارێزگاری؛ خودای گـەورە حـەز لـە تـەقوا دەکـات، واتـە: خۆپاراستن لە کوفر، خۆپاراستن لە گوناهـ و تاوان، خۆپاراستن لە تێکەڵبوون لەگەڵ هەرشتێ کە غەیری خودا بێ.

تەقوا سوودبەخشە بۆ من و بۆ تۆ و بۆ غەیری ئێمەیش، بەهۆی تەقواوە خودا لە سزا ڕزگارمـان دەکات وەک فەرموویەتی: [ثم ننجّي‌َالذين اتقوا و نَذَرُ الظالمينَ فيها جثِياً].

جا کە بنیادەم تەقوای نەبوو و بوو بە موستەحەقی سزای دۆزەخ، ئەبێ بـۆ ڕزگـارکردنی خـۆی لەو سزایە چارەیەک بدۆزێتەوە. ئەو چارەیەش تەنها پەشیمانبوونەوەیە لـە گوناهـ و گەڕانەوەیـە بۆلای خودای گەورە. بەڵێ تەوبە وەکوو(بۆتە) وایـە کـە مـادەی زێـڕ و زیـو و هاوچەشـنی تێـدا دەتوێننە و شتی ساغ و بێگەرد لە شتی قەڵب و ناپوخت جیادەکاتەوە.

مەولەوی دەڵێت: ئەو بۆتەی تەوبە و پەشـیمانبوونـەوە بێنـە و کـرداری غـەش و غـەللاویت بتوێنەوە، واتە ئەو کردەوانەی کە تا ئێستا کردوونت و تێکەڵ لە کاری چـاک و خـراپن ئـەم جـار بەهۆی ئەم تەوبەوە یەک لایی‌یان بکەرەوە و جارێکی تر خۆت مەدە لـە قـەرەی کـرداری نابـار و ناپوخت و، شان بدەرە بەر کرداری ساغ و ڕەفتـاری پـاک و بـێ‌گـرێ‌وگـۆڵ. خـودای گـەورە بـە

میهرەبانیی خۆی خستینیە سەر ڕێگای تەوبە کردن و هەر ئەویشە کە بە لوتفی بێپایانی خۆی تەوبەکەمان لێ قبووڵ دەکات. ماشەڵلا لەم لوتف و میهرەبانییە بێ هاوتایەی خودای گەورە.

تۆ، ئەی برای موسوڵمانی دڵسۆز، ئەم تەوبە واجبە دوامەخە، تا کەی دوای دەخەی؟ عومری سبەینێ کوانێ؟ تۆ لەکوێ تا سبەی بە ساغی دەمێنی و عومری سۆزیت کەی مسۆگەرە تا کارەکەتی حەواڵە بکەی؟ کەواتە پەندی پێشینان واتەنی کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەینێ و گرێی دەست مەخەرە ددان.

خۆشویست و خۆشەویستی ڕاستەقینەی پاک و بێگەرد کە خودای گەورەیە کۆمەڵی تەوبەکارانی خۆش دەوێت.

بەتەوبە دەرمانی ئەو ڕێش و برینانەت بکە کە لە تاوان و گوناهەوە تووشی دڵت هاتوون، پینەوپەڕۆی ئەو کون و کەلەبەرانە بکە کە لە جلوبەرگی عیبادەتەکەتا یا لە تێکڕای بیروباوەڕتا هەن، بە تەوبەیەکی نەسووح و خالیس پینەیان بکە.

جا ئەگەر دووبارە نەفسی نەگبەتی (امّارە) ت وازی‌لێنەهێنایت و، لە ڕێی ڕاستەوە نەیبردی و هەر تووشی گوناهی کردی، بەڕاستی دڵنیابە کە خودای گەورە هەمووکاتێ پەشیمانیی بەندەی خۆی قبووڵ دەکا و، ئەگەرچی بەهۆی نەفس و شەیتانەوە تەوبەکەت شکاند، شەرم مەکە و خۆت حەشار مەدە؛ دەرگای میهرەبانیی خودای گەورە وەک دەرگای لەخودا یاخییەکان نییە، ئەو هەمیشە کراوەیە، دە وەرە لە بەردەرگای فراوانیدا ڕاوەستە و دوای لێبووردنی لێ بکە [قُلْ یا عِبادیَ الّذینَ اَسْرَفوا عَلی اَنفُسِهِم لا تَقْنَطُوا مِنْ رحمةالله، اِنَّ الله یغفرُ الذّنُوبَ جمیعاً اِنَّهُ هُوَ الغَفُورُ الّرحیم][٥٤]

تۆ لە هێڵی «فاستقم کما أمرت» دەرمەچۆ و لەسەر ڕێگا و باری باوەڕبەخودا و دڵسۆزی بەردەوام بە، ئیتر ئەگەر بە حوکمی قەزاوقەدەر تووشی گوناهـ بووی، ئەوا تۆیش بەندەیەکی وەک هەموو بەندەکانی خودا و لەوانەیە گرفتاری گیروگرفتی گوناهیش ببی، تەنها پێغەمبەران(د.خ) لە گوناهـ پارێزراون و خودا لوتفی تایبەتیی لەگەڵ کردوون. تۆیش ئەم جۆرە تووشبوونانە نابێ ببێتە هۆی ورەبەردان و ناهومێدیت لەدەریای پان و بەرین و بێبنی بەزەیی و میهرەبانیی خودای گەورە.

بەڵێ تۆ لە هێڵی ڕاست دەرمەچۆ، ڕێگای مونکیران و بێباوەڕان مەگرەبەر کە ڕێگایەکی سەخت و هەڵەت و ملشکێنە. ڕێگای کۆمەڵی (نفس واحده) بگرە. لەوانەیە مەبەستی مەولەوی

لە ڕێگای (نفس واحدە) ڕێگای حەزرەتی ئادەم بێ کە لەچاو بەرەی ئادەمزاددا یەکەم نەفس بـوو، ڕێگاکەی ئەو ئەوە بوو کە لـە بارەگـای خـوداوە، پـاش تـووش‌بوونەکـەی، چەنـد ئامۆژگارییـەکی وەرگرت و ڕێگای تەوبەی گرتە بـەر [فتلقّـی آدمُ مـن ربِّـهِ کلمـات فتـابَ علیـه إنّـه هـو التّـوابُ الرحیم][٥٥]

یا مەبەستی ڕێگای ئەوانەیە کە پەیڕەوی پێغەمبەران بوون، کـە لـە یـەک‌باوەڕیـدا وەک تاقـە نەفسێکن. ئەمانیش هەر ڕێگای تەوبە و پەشیمان‌بوونەوەیان گرتووەتە بـەر. یـا مەبەسـت ڕێگـای جەماوەری ئوممەتی پێغەمبەرە(د.خ) ئەوانەی کە ڕێگای کیتاب و سوننەتیان گرتووەتە بـەر و بـە (فرقە)ی (ناجیە) ناوبراون.

یا مەبەست ڕێگای (محمدالمصطفی)یـە کـە لـە جیهـانی پێغەمبەرایەتیـدا ئەوەنـدە جێگـە و ڕێگەدار و پایەبەرز بووە وەک تاقانە بووە و کەس پێی نەگەیشتووە.

جا کە تۆ ڕێگای ڕاست و ڕێبازی کۆمەڵت گرتە بەر، هەرچەند بێ خانەوبەرە و بێ سـەروەت و سامان بی، دڵنیابە لەناو ئەو کۆمەڵە ڕاستاڵە خوداناسەدا هەرگیز پەکت ناکەوێ.

مەولەوی بانگی خەڵکەکە دەکا ببنە دۆست و هاوڕێ و دراوسێی خوداناسان[واتقوالله وکونوا مع الصادقین][٥٦]

دیارە کە ئینسان لەناو کۆمەڵی خاوەن ئیمان و ئەهلی عیلم و کردارباشدا بوو تـەمێ وردەگـرێ و لە چاکانەوە سوودی دنیا و قیامەتی دەس دەکەوێ، کە گوناهێکی لێ قەوما گورج دەگەڕێتـەوە و پەشیمان دەبێتەوە و، ئەو چاکانە کـە لەناویانـدا دەژی ئامۆژگـاریی دەکـەن و دراوسـێیـەتییان کاری تێدەکات و دەبێتە خێر بۆی، وەک چۆن لێقەوماو لەناو هۆزدا باربوو دەکرێ و پیتـاکی بـۆ کۆ دەکرێتەوە، بۆیە دەڵێ: هەرچەند بۆت دەلوێ لە هاومالی و هاوسێیەتی و نزیکی لـە هاومـالان کۆتایی نەکەی. هەروەها وەک لەپێشەوە وتمان (بەیت) ەکەی مەولەوی ئیشارەیەکیشی بۆ شـیعر تێدایە؛ ئەوەتە دەڵێت: بە نیوە بەیتێکیش لێیان نزیک بیتەوە، هەر باشە. بـۆ ئـەم مەبەسـتەیش خۆی لەپێش خەڵکی تردا لە نیوە شیعرێکی (ابن الفارض) ی[٥٧] سۆفیی ناودار ئیقتیباسی کردووە و دەڵێت: «سائق الأضعانِ نحو حيِّ طيّ»... (ابن الفارض) یش وتوویە:

سائق الأضعانِ یطوی البیدَ طيّ
مُنعِماً عرِّجْ علـی کثبـان طَـيّ

هەرچون بی وا لەگەڵیدا بووەتە هاوبەیت و دەڵێت:

ئەی سەرقافڵەی کۆچی دڵداران بەرەو هەوارگەی دەس‌گوشادان! زوو بە، بە پەلە نەک بە سستی و خاوی، بە سستی بچین هەرگیز ناگەینە هەوارگەی یاران، بجووڵێ؛ جووڵان بەرەکەت دێنێ، بەرەکەتیش دیسان جووڵان دەهێنێ... زۆر جار بووین بە نیشانەی تیر و توانجی بەدکاران. دە تیژ لێخوڕە لە بارگە و قەتار هەتا دەگەینە دواقۆناغی بەختەوەری.

***

١ـ ئەم سەرباسە لە دەستنووسەکەدا نییە، تەنها لە نوسخە چاپەکەدا هەیە، ئەویش پێش بەیتی (یَسْمَعْ ارفع... تاد) دایناوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی پێشەوەیدا موو بە بەینیاندا ناچێ و توند بە یەکەوە شەتەک دراون، واتە: شوێنەکە شوێنی سەرباس نییە وەک عینوانێک. ئێرە شوێنیەتی وەک ئێمە دیاریمان کردووە.

٢ـ پێ بنێتەوبەر: پێ بخاتە بەر، یەک پێ بجووڵێ، چۆن دەخوێنرێتەوە وەها نووسیومانەتەوە، ئەگینا لە دەستنووسەکەدا (پی بنێتە اوبَرْ) نووسراوە، تەنها زەنەیەکی لەسەر واوەکە داناوە و پێمان دەڵێ چۆنی بخوێنینەوە.

٣ـ ئەم (تەفسی نەفسی)یە لە عەرەبییەوە هاتووە ئەسڵەکەی (نفسی، نفسی) بووە، واتە: هاوار بۆ نەفسی خۆم، هاوار بۆ نەفسی خۆم، ئیتر لەوەوە بووەتە کوردی، واتە: هەرکەس بۆخۆی خەریکە و کەسی تری بە خەیاڵدا نایە.

٤ـ ئەم دوو رستەیە فارسین، واتە: حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) لەو کاتەدا کە هاوار و فوغانی خەڵکی دەبیسێ سەری لە سوجدەدایە و دڵیشی نوقمی دەریای شوهوود و نووری زاتی خودایە و چاوەڕوانی لوتف و رەحمەتە.

٥ـ ئەمە بە خۆی و سەروژێرەوە شێوەنووسی دەستنووسەکەیە. عیبارەتەکە لەئەسڵدا (تُشَفَّعْ)ە. بێ‌گومان (تُشفَعْ) مەعنای (تُشَفَّعْ) نادات، لەبەر ناچاریی سەنگی شیعرەکە بەکاری‌هێناوە.

٦ـ واتە: فَیُرْفَعْ، لەبەر سەنگی شیعرەکە زەنە لەسەر عەینەکە دانراوە.

٧ـ دەیێتەو دیار: دەردەکەوێ.

٨ـ «یَشْفَعْ» لەفز و مەعنای تەواوە. «یُشْفَعْ» زەنەکەی لەبەر ناچاریی شیعرە. بەڵام بابە سەرفی‌یەکەی و مەعناکەی تەواو نییە دەبوا (یُشَفَّعْ) بوایە. مەولەوی مادام شیعر و وەزن ناچاریان کردووە هەندێ سەروژێر بگۆڕێ دەیتوانی بڵێ (یَشْفَعْ، یُشَفَّعْ) نازانم بۆ وا نەیگۆڕیوە؟

٩ـ واتە: (هُوَ شِفاءالقلوب) ئەم (هو) ەیش بۆ پێغەمبەر دەگەڕێتەوە(د.خ).

١٠ـ لە نوسخە دەستنووسەکەدا پەراوێزێکی مەولەوی بەعەرەبی لەسەر کەلیمەی (فترضی) نووسراوە، ئەمە مەتنەکەیەتی: «بدلٌ من (ضوءالضحی) أي اِسْتَضِيء من ضوء سورة الضّحی و هو کلمة (فترضی) في قوله تعالی [وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضى]. أو استَضِيء من ضوء ضحی الأدلّة بما نَقولُ وتُصَدّقُ به. منه».

واتە: ئەم نێوە شیعرە دوو بار هەڵدەگرێ:

١ـ (فترضی) بەدەل بێ لە (ضوءالضحی)، واتە: تۆ ئەی خوێنەوار رووناکی لە تیشکی سوورەتی (ضحی) وە وەربگرە، رووناکی لە (فترضی) وە وەربگرە، کەخودای گەورە بەڵێنی بە پێغەمبەر(د.خ) داوە و پێی فەرمووە: لەمەوپاش ئەوەندەت لوتف و کەرەم لەگەڵ دەکەم بەتەواوی رازی و شاد بی. دیارە ئەم تکا قبووڵ‌کردنەی رۆژی قیامەت لووتکەی رێز و پایەبەرزییە.

٢ـ یاخۆ بەدەل نییە و راستە؛ عیبارەتەکە مەعنای ئەوەیە: لە تیشکی چێشتەنگای دەلیلە بـەهێزەکان رووناکی وەربگرە هەتا رازی ببی و باوەڕ بە قسەکانمان بکەی... تاد.

١١ـ یانی: یەعنی. وا: وەها. یانی وا: یەعنی دەبێ وەها بێ، وەک دەڵێی پیاو دەبێ وابێ.

١٢ـ شێوەنووسی دەستنووسەکە (همولایی) و (تعالایی)یە کە دەبێتە (هەموو لایێ، تەعالایێ). راستە رێگاکـەی (هەمولایە، تعالایە) یە، بەڵام شێوەنووسینی (تعالایی) وام لێدەکات بڵێم دوور نییە ئەم(یـی)ی (تعـالا/یـی)یـە بـە مەعنا (دێت) بێ، دوورخستنەوەی (یی) کە بێکاکڵ نییە، واتە: نۆرەی تەنها رەحمەتی حەق‌تەعالا دێت.

١٣ـ ئایەتی(١٠٩) سوورەتی (طه).

١٤ـ ئایەتی(٢٥٥) سوورەتی (بقرە).

١٥ـ ئایەتی (٢٨) سوورەتی (انبیاء).

١٦ـ بڕوانە: (منصور علی ناصف، التاج الجامع للأصول فی أحادیـثالرسـول. بیـروت. دار إحیـاء التـراث العربـی، الطبعة الثالثة ١٣٨٢هـ ـ ١٩٦٢م، الجزءالخامس).لاپەڕەی (٣٨٣).

١٧ـ سەرچاوەی پێشوو. ل(٣٨٤)

١٨ـ سەرچاوەی پێشوو. ل(٣٨٤) لەگەڵ شەرحەکەیدا.

١٩ـ سەرچاوەی پێشوو. لاپەڕە(٣٨٦) لەگەڵ شەرحەکەیدا.

٢٠ـ سەرچاوەی پێشوو، ل(٣٩٢).

٢١ـ هەمان سەرچاوە. لەگەڵ شەرحەکەیدا.

٢٢ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٣ـ سەرچاوەی پێشوو، ل (٣٩٣).

٢٤ـ (حُمَم): جەمعی (حُمَمَە)ە کە خەڵووزە. فی أفواه الجنة: سەرەتای دەرگای بەهەشت. نهرالحیـاة: جۆگـای ژیان. (حِبَّة): ئەو دانەیە کە خۆی سەوز دەبێت، شتی وا زۆرە لە سروشتدا، ئەوەی کە خەڵک دەیچێنێ (حَبَّة) یـە. (حَمیل السیل) ئەوەی لافاوی باران دەیهێنێ لە کەف و لیتە. ئەو دانەی لەم لیتە و کەفاوەدایە زوو سـەوز دەبـێ و پێدەگا، ئەڵبەت ئەمانەش وەها زوو دەبووژێنەوە.

واتای حەدیسەکە: خودای گەورە دەفەرموێ: فریشتەکان تکای خۆیانیان کرد، پێغەمبەران تکای خۆیانیان کرد، موسوڵمانە پایەدارە رێدراوەکان تکای خۆیانیان کرد، ئەمانە هەموو هەریەک بەقـەدەر ئـەو توانایـەی پێـی درابـوو خەڵکی رزگارکرد. کەس نەماوەتەوە (أرحم الراحمین) نەبێ کە دەریای رەحمەتی دێتە جۆش پڕ چنگێ لە ئـاگری دۆزەخ دەگرێ بە دەستەوە؛ بەڵام چۆن چنگێ، کۆمەڵە خەڵکێکی لێ دەردێنێ کە بـە عومریـان رێیـان لـە چاکـە نەکەوتووە و بوونەتە پارچەی خەڵووز، فڕێیان دەداتە نێو جۆگایـەک لـە بـەردەمی بەهەشـتدا کـە پێـی دەوتـرێ جۆگای ژیان. لەو جۆگایە دەردەچن بە بووژاوەیی وەک ئەو دانەخودڕووەی لەگەڵ لیتە و کەفی لافاوی بارانـدا دێ و زوو سەوز دەبێ.

لێرەدا دەهەندەیی و بەخشندەیی بێسنووری خودای گەورە خۆی دەنوێنێ، بێگومان ئەوانەی بەم عەفوە مەزنە رزگار دەبن بەراورد ناکرێن لە زۆریدا لەگەڵ ئەوانەی بە تکای خەڵق رزگار بوون.

بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل(٣٩٦) لەگەڵ شەرحەکەیدا.

٢٥ـ لە چاپەکەدا «یا» نووسراوە، هەڵەیە. لە دەستنووسەکەدا (با)یە و مەعناکەیشی تەواوە.

٢٦ـ ئایەتی(١٩) سوورەتی (محمد).

٢٧ـ ئایەتی (٦٤) سوورەتی(نساء).

٢٨ـ ئایەتی (٣٣) سوورەتی (انفال).

٢٩ـ ئایەتی (١٢٣) سوورەتی (بقرە).

٣٠ـ واتە: فەزڵ و بەدەست و دەهەنەیی خودای گەورە.

٣١ـ واتە: عەدالەت و دادپەروەریی خودای گەورە.

٣٢ـ «یغفر دون» و «مَنْ یشاء» ئیقتیباسە لە ئایەتی (٤٨)ی سوورەتی (نساء).

٣٣ـ وەک کۆمەڵی موعتەزیلە دەڵێن.

٣٤ـ وەک خەواریج دەڵێن.

٣٥ـ واتە: ئەم ئەسڵی پێنجەمە کە ئیمان بە ڕۆژی قیامەتە، ئەسڵێکی زۆر بەسامە، وای بەباش دەزانم بە باسی تەکفیر نەکردنی خەڵک دوایی بهێنم، تا نەختێ ترسەکە سووک بێت.

٣٦ـ ئایەتی (٣١) سوورەتی(نساء).

٣٧ـ ئایەتی (٤٨) سوورەتی (نساء).

٣٨ـ ئایەتی (٩) سوورەتی (حجرات).

٣٩ـ ئایەتی (٨) سوورەتی (تحریم).

٤٠ـ ئایەتی (١٧٨) سوورەتی (بقرە).

٤١ـ ئایەتی (٤٤) سوورەتی (مائدە).

٤٢ـ کە: بکە.

٤٣ـ «یەکێ» فاعیلی «کرد»ە.

٤٤ـ کە: بکە.

٤٥ـ بەپێی پەراوێزێکی مەولەوی خۆی کە لە دەستنووسەکەدا نووسراوە، واتە: گوناهی گەورە یا بچووک، یا پیاوی گەورە یا عادەتی، یا پیر یا جوان.

٤٦ـ بەیتی پێشوو و ئەم نیوبەیتە بەستراون بە یەکەوە و مەعنایان پێکەوە تەواو دەبێ، ئەگەر نەختێ پاش‌وپێش و دەسکارییان بکەین وایان لێ‌دێت: مەعنای ئایەتی شەریفەی «لا یضرّکم»یان بەتەواوی نەزانی؛ چونکە کەوتنە شوبهە و هەڵەوە و بەهۆی ئیشتیباهەوە زۆر کەس گوم بوون و تیاچوون، یا زوو ڕێیان گوم کرد. ئەمەیش ئیشارەیە بۆ قسەیەکی حەزرەتی ئەبووبەکر(ر.خ) کە ڕۆژێ فەرموویەتی: [یا أیّهاالذین آمنوا علیکم أنفسَکم لا یَضُرکم من ضَلَّ اذا اهتدیْتُمْ]، (ئایەتی (١٠٥) سوورەتی (مائدە) ) وَ أنا سَمِعنا رسولَ‌الله(ص) یقول إنَّ الناسَ اذا رأوا الظالم فلم یأخذوا علی یَدیه أوشَکَ أن یعمّهم الله بعقاب، واتە: ئەی موسوڵمانینە! ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە و لە غەیری شوێنی خۆیدا دایدەنێن، یەعنی مەبەستە ڕاستەقینەکەی لێ وەرناگرن. ئێمە لە پێغەمبەرمان(د.خ) بیستووە

دەیفەرموو: کە خەڵک زۆردار ببینن زوڵم بکات و دەست نەهێننـە ڕێگـای و مـەنعی نەکـەن نزیکـە سـزای خـودا هەموویان بگرێـتەوە، زالمەکەیش و خەڵکەکەیش.

[هەندێ کەس لەو کەسانەی کە بە هۆی «لا یضرکم» گومڕا بوون و لاڕێ چوون خراپ لە] ئایەتەکە گەیشتوون کە ئەگەر ئینسان خۆی باش بێ و ڕێی ڕاستی گرتبێ گومڕاهیی خەڵکی خراپ زیـانی لـێنـادات و، کـەس حـەقی بەسەر کەسەوە نییە.

حەزرەتی ئەبووبەکریش ئاگاداری کردنەوە کە ئەوان خراپ تێگەیشتوون، ئەبێ هـەوڵ بـدەن و ڕێگـای ڕاسـت پیشانی خەڵک بدەن و چەوتی‌یان ڕاست بکەنەوە، ئەگینا شالاوی سـزای ئـەوان ئـەمانیش دەگرێـتەوە. بناغـەی ئاگادارکردنەوەکەی حەزرەتی ئەبوبەکر(ر.خ) لە ئایەتەکە خۆیدایە؛ خودا دەفەرموێ: گومڕاهیی ئەوان کاتـێ زیـانی نابێ بۆتان کە ئێوە، ڕێگای هیدایەتتان گرتبێتە بەر، ئەمربەچاکە و نەهی‌لەخراپەیش بەشێکە لەم ڕێگایە. بێ‌گومـان ئەگەر پیاوچاکان لە واجبی سەرشانیاندا کۆتایی‌یان نەکرد و ئەمربەچاکە و نەهی‌لەخراپەیان جێ‌بەجێ کرد گونـاهی خەڵکەکە زیانیان لێ‌نادات.

باوکم لـە شـەرحەکەدا نـەختێک ئـەم باسـەی ڕوون کردووەتـەوە، مایـەوە دەقـی بەیتەکـە؛ ئـەوا لـە نوسـخە دەستنووسەکەدا چۆن نووسراوە وەها دەیخەینە پێش چاوتان:

آیەء شریفەء (لا یَضُرُّکُمْ)

لە اشتباەدا زوری کردن کُمْ

من تەنها دوو واتام بۆ نیوەی دووەم دۆزییەوە کە لە سەرەتای ئەم پەراوێزەدا باسم کـرد. زۆریـش لێیـان دڵـنیا نیم، ئەگەرچی تێکڕای مەبەستەکە ئاشکرایە.

بۆ فەرموودەکەی حەزرەتی ئەبوبەکر بڕوانە: (منصور علی ناصف، التاج الجـامع للاصـول فـی احادیـث الرسـول، بیروت، داراحیاء التراث العربی ١٩٦٢م ـ ١٣٨٢ هـ الجزء الخامس) ل ٢٢٣.

٤٧ـ ئایەتی (١٠٥) سوورەتی (مائدە).

٤٨ـ ئایەتی (٧٢) سوورەتی (مریم).

٤٩ـ ئیشارەیە بۆ ئایەتی [إن‌الله یحب التوابین و یحبُّ المتطهرین] ئایەتی(٢٢٢) سوورەتی (بقرە).

٥٠ـ لە دەستنووسـەکەدا لەسـەر کەلیمـەی (ڕێـواز) بـە فارسـی دوو پـەراوێز نووسـراوە: یەکـەمیان مـەعنای لێ‌داوەتەوە و دووەمیان ئیعرابی کردووە. ئەمەیش تەرجەمەی هەردووکیانە:

١ـ ڕێواز بە کوردی بە ڕێگایەک دەڵێن کە هەمیشە ڕێرەوی کۆمەڵێ یا چەن کۆمەڵێکی تایبەتی بێ.

٢ـ کەلیمەی ڕێواز مەفعوولوبیهی فیعلێکی لابراوە کە (بگرەبەر) ە، واتە ئەو ڕێگایە بگرە بەر... تاد....

٥١ـ لە نوسخە چاپەکەدا (باکت)ە.

٥٢ـ پەراوێزێکی مەولەوی خۆی بە فارسی لەسەر ئەم نیـوە بەیتـە هەیـە، بـە نیوەشـیعرێ دوایـی پـێ‌هێنـاوە، دەفەرموێ: واتە: ڕێگا بە سستی و دواخستن و ئەمڕۆ و سبەی نابڕێ، کاری سبەی سبەینێ‌یەکی تـری دەوێ. یـا واتە: ڕێگا بەپێی زاهیری نابڕێ؛ بەپێی ڕۆح بڕۆ (بعد منزل نبود در سـفر روحـانی) لـە سـەفەری جیهـانی گیانـدا مەنزڵ دووری نییە.

٥٣ـ هەر خودا خۆی دەزانێ مەولەوی لەکاتی وتنی ئەم بەیتە و دواهێنانی ئەم باسەدا لە چ بارێکی نەفسی یا رۆحیدا بووە؟.

٥٤ـ ئایەتی (٥٣) سوورەتی (زمر).

٥٥ـ ئایەتی (٣٧) سوورەتی (بقرە).

٥٦ـ ئایەتی (١١٩) سوورەتی (توبە).

٥٧ـ عومەری کوری فاریز یەکێکە لە هەڵکەوتووەکانی ئیسلام و تەسەووف سالی ١١٨٠ی ز لە قاهیرە لەدایک بووە و، هەر لەوێش سالی ١٢٣٤ی ز کۆچی دوایی کردووە.

## مَبْحَثُ القَضَاء وَالقَدَر[1]

وەســـەر[2] هەوارگـــەی شەشـــەمینەدا
قەزاوقـــەدەر وان لـــە کەمینـــەدا
مەزهـــەبی قـــەومی ئەشـــعەرییەیە
قـــەزا ئـــیرادەی ئەزەلییەیـــە
بەســـتە بـــە ئەشـــیا تـــەمام و کـــەمال
لەســـەر هـــەرچی هـــەن (فـی مـا لایـزال)
قـــەدەر ئیجـــادی حـــەق تەعالایـــە
(فضـــلاً، رحمـــةً) بـــۆ ئـــەو ئەشـــیایە
لەسەر قەدرێکی مەخسووس و موتقـەن
بـە تەقـدیرێکی مەنسـووس موعەییـەن
(فـــی ذواتِهـــا فـــی وَصِـــفَاتِها
وأحْوالِهـــا فـــی أوقاتِهـــا)
یـــا قـــەزا (علـــم الحـــقّ عَـــزَّ، جَـــلّ
أوّلاً بـــذی الأشـــیا فـــی الأزل)
(کَمَـــا هِـــیْ عَلَیْـــهْ. وَ أمّـــا القَـــدَرْ)
ئیجادیان بە وەفق عیلمـی سەربەسـەر[3]
(ذا بَعْـــضٌ ممّـــا قـــالوا هُناکـــا
وَقَـــدْ فُسّـــرا بغیـــر ذاکـــا)

ئەمە باسی ئەسڵی شەشەمە لـە شـەش ئەسڵـەی ئیمـان کـە بریتییـە لـە ئیمـان و بـاوەڕ بـە قەزاوقەدەر.

لێرەدا مەبەستی راستەوخۆی مەولەوی ئەوەیە کە زانایانی ئـایینی ئیسـلام لەبابـەت بـاوەڕەوە شەش مەنزڵیان هەیە و، مەنزڵی شەشەمیان باسی قەزاوقەدەرە کە ئێستە پێـی گـەییوە. دەیـەوێ ئەوەش بڵێ کە من خۆم باسی قەزاوقەدەر دەکەم، کەچی قەزاوقەدەریش لە پارێزدایە بۆم.

دوور نییە نیمچە ئیشارەیەکیشی تێدابێ بۆ ئەوە کـە مەولـەوی خـۆی لـەو وەختـەدا کـە لـە دوادوایی کتێبەکەیدا بووە و خەریک بووە لێ‌بێتەوە، عەقدی شەشەمی تەمـەنی بـڕیوە و دەسـتی کردووە بە عەقدی حەوتەم و نزیکتر بووە لە قەزای مردنەوە، بۆیە بەکوڵ دەڵێ «فَسُقْ ظعننـا...» و «وەسەر هەوارگەی... تاد» ئیتر نایەوێ قافڵەکە لە هەوارگەی شەشەمدا بوەستێ چونکـە تـەواو بووە، وا ئەم پێی ناوەتە حەوتەم.

هەرچۆن بێ مەولەوێ دەفەرموێ: (قضا) لای زانا ئەشعەرییەکان بریتییە لە ئیرادە و خواسـتی ئەزەلیی خودا کە پێوەندە بە شتەکانەوە بەو حاڵ و جۆرە لە پاشەڕۆژدا و لە (مالایزال)دا لەسـەری دەبن. (قَدَر) یش بریتییە لە ئیجاد و دروست‌کردنی خودا بۆ ئەوشتانە هەریەک لـە کـات و وادەی خۆیدا و لەسەر ئەو ئەندازە کە بڕیاری داوە و لەسـەر ئـەو حـاڵ و سـیفەتانە کـە خواسـتی خـۆی دیاریی کردوون. بەڵام لای فەلاسیفە (قضا) بریتییە لە عیلمی خودا (بما ینبغی ان یکـون الوجـود علیه). ئەمەیش عەینی عینایەتی ئەزەلییەیە کە مەبدەئە بۆ فەیەزانی وجوود (علی احکم الوجـوه) و قەدەریش عیبارەتە لە دروست کردنیان.

قـەدەر موسـتەلزیم لـەبۆ قەزایـە
بۆ وە بە تەسریح حەدیس پێـی نایـە
ئیمـان بـە قـەدەر ئیمـان بەویچـە
بشنەو پێـی‌دەوێ ئـەم تەفسـیلیچە
ئەر فکرت بووێ زووم کرد ئیشارەت
تەهزیب ناکەم من هیچ بۆ عیبـارەت
ئـەم کـەلام دەگـەڵ فلانـە کـەلام
(أَوّلاً) هــەرتا تەکــەڕرور بــووێ
چـاکتر بـا چـاکتر تەقـەڕرور بـووێ

قسەی ناحـەقیچ کـە بـیٚ‌شـومار ویٚ
حەق هەر یەکیٚکە تەویٚ تەکرار ویٚ

تەویٚ: دەبیٚ، پیٚویستە.

واتە (قَدَر) موستەلزیمە بۆ (قضا)؛ چونکە (قَدَر) بریتییە لە دروست‌کردنی شتەکان هەریەک لـە شویٚنی خۆیدا، دیارە دروست‌کردن بە بیٚ‌عیلم بە دروست‌کـراو نابـیٚ. [ألا يَعْلَـمُ مَـنْ خَلَـقَ وَ هُـو اللّطيف الخبير][٤]. هەروەها ئیمان بە (قَدَر) موستەلزیمە بۆ ئیمـان بـە (قضـا) واتـە: کـە ئینسـان باوەڕی بە (قَدَر) هەبوو مەعنای ئەوەیە باوەڕی بە (قضا) یش هەیە، هەر لەبەر ئەمەیـە حـەزەرەت (د.خ) لەحەدیسەکەدا تەنها باسی (قدر)ی فـەرمووە و بـە سـەراحەت نـاوی (قضـا)ی نـەهیٚناوە و فەرموویەتی: «وَ تؤمنَ بالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشرّه... الحديث»[٥] ئەنجا مەولەوی دەفەرمویٚ: ئەگەر لەبیرت بیٚ من زوو لە باسی ئەسلی یەکەمدا بۆم باس کـردی کـە قـەدەر و ئیجـادی خـودای گـەورە بـۆ شتەکان عام و شامیلە بۆ هەموو شتیٚ، ئەوەبوو وتم:

ئەوە موئەسسیر (في الوجود) و بـەس
(جَـــلّ، تعـــالى، عَـــزَّ، تقـــدّس)
بیٚ ویٚنە و ماددە، بیٚ موددە و ئالـەت
وە بیٚ ماندەگی و عیجـز و مەلالـەت
ئاوردیە وجوود گشت ئەجزای عالـەم
لە عەدەم دیسان دەیواتـەو عـەدەم[٦]

هەروەها دەفەرمویٚ: من زۆر مەبەستم نییە کە قســە کـورت بکەمـەوە، جـا ئەگـەر قسـەیٚکم لەگەڵ قسەیٚکی پیٚشوومدا یەک بن و بتوانریٚ بە یەکیٚکیان ئیستیغنا لـەوی تریـان بکـریٚ گـویٚی نادەمیٚ و هەر دەیلیٚمەوە؛ یەکەم قسەکانم چاکن و بگرە بە چاکتریـان دەزانم، بـا قسـەی چـاکتر دووبارە بکریٚـتەوە هەتا باشتر لە میٚشکی خەڵـکیدا جـیٚگیر بـیٚ. دووەم خەڵـک قسـەی نـاڕەوا و نابەجیٚ زۆر دەکەن، قسەی راست و رەوا با یەکیٚکیش بیٚ پیٚویستە بـۆ بەرپـەرچدانـەوەی قسـەی ناڕەوا زۆر بوتریٚتەوە، لەبەر ئەمە ئەگەر لەم باسی ئیمان بە (قضا) و (قَـدَر) ەدا قسـەیٚکم کـرد کـە زووتر کرابوو سەرزەنشتم مەکەن و چاوپۆشیم لیٚ بکەن.

ئـــەوا لـــە دیـــوان (قضـــا) و (قَـــدر) دا
ســـەغیر و کـــەبیر گشـــت لـــە دەفتـــەردا

(مـــا ذر لــــه الكـــونُ بـــالمرَّة
حتـــــى خـــــردلٍ، حبّـــــةٍ، ذرّة)[٧]
اوْ لَمْحــــــةٍ أو لَفْتــــــة نــــاظر
اوْ خَطــــــرةٍ أو فَلْتَــــــةٍ خــــاطر)
(فـــى أمّ الكتـــاب فـــى لـــوح محفـــوظ
فـــى العلـــم المحـــيط كُلّهـــا ملحـــوظ)
ئـــيرادەی تـــابیع علیمـــــی ئامـــادەی
قـــودرەتی تاممّـــەی ئەوشـــۆن ئـــیرادەی
رووی کرد لە سـەرکەل سـەربەرزیی ئـەزەل
وەلای مومکینـــدا ئـــەولای موســـتەقبەل
تێرێتــــــه وجــــــوود (بإحســــــانه)
(كُـــلَّ واحـــدٍ فـــى زمانـــــه) [٨]
(حَضْـــــرُ الوجـــــوبِ ذا مُقْتَضـــــاهُ:
لَـــيْس خـــالقُ السِـــوى سِـــواهُ)
(أَلَـــمْ تَـــرَوْا المـــدَّ للفـــــىء؟)[٩]
فَهُـــو الخـــالِقُ لكـــلّ شـــــىء)
موریـــــد و فــــەععال (لمـــا یُریـــد)ە
چـاک، خـراپ، مەریـد ئەگـەر موریـدە[١٠]
حەسـەن ئـەر قـەبیح، نـافیع ئـەر (ذو ضـرّ)
کوفر ئەگەر ئیمـان، ئەگـەر خـەیر ئـەر شـەڕ
تاعەت و عیسیان، فیعل و قـەول و نـەفس[١١]
ئەر سەهو ئەر نیسیان (اَلْيَـوْمْ) غـەد و ئـەمس
تـــاڵ و شـــیرین و، عـــاجزی و ســـورروور
زیـــادی و کـــەمال، نوقســـان و قوســـوور

خـــویش و بێگانـــــه وەک نزیـــــک و دوور
حـــــەیات و مـــــەمات، زولومـــــات و نـــــوور
بـــاو بـــاران، هـــەور و بـــەور و گشـــت زەمـــین
ئاسمـــان یـــەک‌یـــەک تـــا عەرشـــی بـــەرین
ئـــیرادە و مەشـــیەت تەقـــدیری ئـــەوە
قـــەزا و حـــوکم و عـــەدل تـــەدبیری ئـــەوە

ئەوا لە دیوان: وان لە دیواندا. (ما) ئیسمی مەوسـوولە، واتـە: ئـەو شـتەی... (ذَرّ): دەرکـەوت. (الکون): بوون. بالمرّة: فی المرّة: یەکجار، تێکڕای ڕستەکە واتـە: ئـەو شـتەی یـەک جـار بـوونی دەرکەوتبێ. ئەوشۆن: دواکەوتوو، تابیع. بەور: بەفر.

واتە: هەمووشتێ گەورە و بچووک هەمووی لە دەفتەردایە و لە دیوانی(قضا) و (قدر)دا ئامادەیـە و ڕەچاوە. هەرشتێ جاریَ بووبێ تەنانەت خەردەلە، تۆوە وردەکەی تۆزقاڵی لـە هـەوادا بڵاوبـۆوە، ڕوانینی بەقـەدەر چاوبەیـەکادانێ، خەتـەرە و خەیاڵـی پـەرتی دڵ، هـەرچی گـورج بـە مێشـکدا تێدەپەڕێ، هەموو ئەمانە و لەمانە بچووکتر و گەورەتر لە (أمّ الکتاب)دا و لە لـەوحی مـەحفووزدا و لە عیلمی فراوانی خودای گەورەدا تەماشا کراون و پێیـان زانـراوە. ئـیرادە و خواسـتی خـودا کـە تابیعی عیلمی ئامادە و حازریەتی و قودرەت و توانـای کـە تـابیعی ئیرادەکەیـەتی لەسـەر کێـوی بەرزی ئەزەل، واتە هەر لە زووەوە، ڕووی‌کردە ئەو مومکینانەی کە لە پاشەڕۆژدا دەبن و دێنـەجێ، خودای گەورەی زانا و ئیرادەدار و بەتوانا بە فەزل و چاکەی خۆی هەر مومکینێ لـە مومکینـەکان کە خواستی بوونی هەبووبێ دەیهێنێتە وجوود.

دیارە کە تەنها خودای گەورە (واجب‌الوجود) بێ و بەس، دەبێ هەر ئەویش خـالق بـێ و شـتی لەئەوبەدەر ئەو دروستی بکات. نـابینن خـودای گـەورە سـێبەری شـتەکانی دروسـت کـردووە و ڕایکێشاوە، کە وەک (عارض) وایە بۆ خاوەنەکەی، ئەمە مەعنای ئەوەیە شتێ نییە خـودای گـەورە دروستی نەکردبێ یا دروستی نەکا.

بێ‌گومان خودای گەورە خاوەنی خواستە و خواستی لەسەر هەرشتێ ببێ دەیکا چـاک بـێ یـا خراپ، مورید و گوێڕایەڵ بێ یا یاخی و سەرکەش، جوان بێ یان ناشیرین، سـوودی هـەبێ یـان زیاندار بێ، سیفەتی کوفر بێ یان ئیمان، خێر بێ یان شەڕ، خوداپەرستی بێ یا بەدکاری، کـردەوە

بێ یان وتار یان هەناسە، ئەمڕۆ بێ یان سبەی یان دوێنێ، سەهو بێ یان لەبیرچوون، تاڵ بێ یان شیرین، زویری یا دلشادی و مەسرووری، زیادی بێ یان کەموکووڕی، نزیک بێ یان دوور، ئاشنا بێ یان بێگانە، ژیان بێ یان مەرگ، تاریکی بێ یان رووناکی، با و باران و هەور و بەفر و زەوی و ئاسمان یەک یەک تا عەرشی بالا، هەموو ئەمانە و، ئەوەی هەیە و ئێمە دەیزانین و ئەوەی هەیە و نایزانین، هەموو بە خواست و خەلقی خودای گەورە و بە قەزا و فەرمان و دادپەروەری و تەدبیری ئەوە.

بەڵێ چاوەکەم! تۆ خۆت دەیزانی
واهیمە دارە عەقڵی ئیمکانی
هەر سیفەتێ حەق بڵێ کەماڵە
گەورەی بزانی بۆ ئەو دەرماڵە
ئەو وەسفە بێران نیسبەت دە چاکە
(صلاةَ الأدب) باوکە! ئەدا کە[١٢]
(الله اکبَرْ) بڵێ بە یەقین
(الحمدُ لله رَبّ العَالَمینْ)
خەم بدەرە خۆت زەریف بوێنە
(سُبْحَانَ رَبّی العَظیم) بخوێنە
سەر بنێ زەوی جێگەی خۆمانە
(سُبْحَانَ رَبّی الأعْلی) بزانە!
ویردت لە دوای تەواوبوونی سەیر
(اسْتَغْفرُ الله بیدِه الخیر)[١٣]
ئەدەب لە کەلام (خواص البشر)
چلۆن دویگن بێرانە نەزەر
عەیبە بێمایەی، بێ بگرە بەها
لە «فأردتُ أن أعیبَها»[١٤]
لە «فأرادَ ربُّک» وە بێڕەنج
دەگەیتە «اشدّ» تێریتە دەر گەنج[١٥]

بــێبــاکم لــە دەرد ئێشــی نــەزانین
«إذا مَرضــــتُ فهُـــوَ یشــــفین»(١٦)
(رَبّ اَلخَیْــــرُ کُلُّـــهُ بِیَـــدَیْکْ) (١٧)
لکــنْ لَــیْسَ الشَــرّ یَعُــودُ الیــکَ) (١٨)
لوقمــەی ئیقتیــدای ئــەنبیا بجــوو(١٨)
(«فبــــداهم إقتَــــدِهْ» تَـــنْجُ...) (١٩)

عەقڵی ئیمکانی: عەقڵی ئینسان کە مومکینە. دەرماڵ: بارەگای خـودای گـەورە. خـەم بـدەرە خۆت: بچەمێرەوە بۆ (رکووع). بوێنە: ببینە. دویگن: دواون، قسەیان کردووە. بێرانە نەزەر: بهێنـە بەرچاو. بەها: نرخ. تێرێتەدەر: دردەهێنێ.

واتە: بەڵام چاوەکەم تۆ خۆت دەزانی عەقڵی ئێمە کە لە مومکیناتی خاسەین بەدگومانە و نابـێ بکەوێتە شوێن خەیالاتی پروپووچ، هەر سیفەتێ کە خودای گەورە بە کەمالی دابنێ بۆ خۆی وەک حەوت سیفەتەکان، یا وەک (خلق) و (ایجاد) کە ئاساری قودرەتن، تۆیش ئەو سـیفەتە بـە گـەورە بزانە و نیسبەتی بدە لە زاتی خودا ئەوە چاکە و لایقە بیدەیتە پاڵ خودای گەورە.

نوێژ بکە کە هەموو کار و گوفتارێـک لـە نـوێژدا بریتییـە لـە ئـەدەب و ڕێزگـرتن لـە خـودای پەروەردگار؛ کە نوێژ دادەبەستی دەڵێیت: (الله اکبر) و لە هەموو شت بـە گـەورەتری ناودەبـەیت، لەدوای ئەوە سوورەتی «الحمد» دەخوێنی کە پڕیەتی لە سیفەتەکانی خودا وەک ربّ و رەحمـان و رەحیم و مالیک و هادی و مونعیم و مەعبوود. کە دەچیتە رکووع دەڵێی: (سبحان ربی العظیم) کە سیفەتی (عظیم)ی تێدایە، بە دیققەت سەیری سوجدەگاهت بکە کوڕنـووش بۆخـودا دەبـەی، لەپاش رکووع دەچیتە سجوود و بە هەموو خاکینەییەکـەوە سـەری ڕێـزی بـۆ دادەنێـی لەسـەر خاکەکەی لای خۆمان کە لێی دروست کراوین و پاش مردن تیایـا دەنێـژرێین، دەڵـێی (سـبحان ربی الأعلی و بحمده) کە سیفەتی (أعلی)ی تێدایە، کە لە نوێژەکە بوویتەوە با ویردی پاش نـوێژت (استغفرالله العظیم ولا اله الا الله وحده لا شریک له، لهُ الملک و لهُ الحمـدُ یُحیـی و یُمیـتُ بیـده الخیر وَ هُوَ علی کلّ شیءٍ قدیر) بێ.

هەروەها مەولەوی لەسەر باسەکە دەڕوا و دەفەرمۆی: شوورەییە ئینسان بێسەرمایە بـێ، وەرە سوود و نرخ وەرگرە لە ئادەمزادە تایبەتەکان، واتە: لە پێغەمبەرەکانی خودا ئـەدەب وەربگـرە کـە چۆن قسە دەکەن و، لەوانەوە فێری قسەکردن ببە، چاوت لێیە حـەزرەتی خـزر(د.خ) کـە لەگـەڵ

حەزرەتی مووسادا قسە دەکا و تێی‌دەگەیەنێ وتی: «فـأردْتُ أن أعیبهـا» و نـەیوت (فـأرادَ الله أن یعیبها) واتە: ئەدەبی کرد، عەیبدارکردنی کەشتییەکەی دایە پـاڵ خـۆی و نەیدایـە پـاڵ خـودای خالیقی هەموو شت، کەچی لە باسی چاککردنەوە و راسـتکردنـەوەی دیـواری هەتیوەکانـدا بـە هیوای ئەوەی گەورە بن و بگەنە تەمەنی روشـد و خەزنەکـەیان دەربێـنن، وتی: [فـأرادَ ربُّـکَ أن یَبْلُغا أشدهما...الآیة:] و نەیوت (فأردتُ أن یبلغا... تاد) چونکە ئیرادەکە دیمەنیشی و ناوەڕۆکیشـی شتێکی جوانە و نیسبەتدانی ئەلای خودا رەوایە، وەک عەیبدارکردنەکە نییە کە بەدیمەن جـوان نییە، ئەگەرچی کاکڵەکەی شتێکی زۆر جوانە. جا ئەگەر تۆ تەماشـای ئـەدەبی تـەعبیری «فـأراد ربّک...» بکەی بە بێ‌ڕەنج و مەینەت دەگەیتە هێزی روشد و گەنجی ئەسرار وەردەگری.

ئەگەر نەزان بووی، بێ‌باک بە لە دەردی نەزانین و داوای شیفای ئەو دەردەت لـە خـودا بکـە و بڵێ «واذا مَرضْـتُ فَهُـوَ یشـفینِ»، لـە خـودا بپـارێرەوە و بڵـێ: (ربّـی الخیر کُلُّـهُ بیـدیک خلقـاً و إبداعاً،أصلاً و فرعاً، والّشرُّ لا یعودُ الیک لأنَّ کسبه مِنّا وَ خلقه علی أثر کسبنا، حکمة بالغـة و صـنع بالغ). هەروەها لەسەر ئەم شێوە دەوام بکە و، پەیڕەویی رەهبـەرانی ئـایین بکـەرە پـاروو و بـاش بیجووە؛ بە هیدایەتی ئەوان لە هەردوو دنیا رزگار دەبی.

نەقس هەرچی هەیـە خاسـەی عەدەمـە
مەعلوومـە عـەدەم ئەسڵـە بـۆ هەمـە[٢٠]
هەر خەیرێ کە هەس خاسـەی وجـوودە
وجـوودی واجـب هـەر بـۆ مـەعبوودە
مـــەعلووم دیـــارە عـــەدەم لێتـــەوە
هـەر شـەڕە و شـەڕی لـێ دەوێتـەوە
ئەگـەر چاکـەیێ لـە تـۆ مەشـهوودە
ئـەوە لـە ئاسـار ئەسڵـی وجـوودە[٢١]
بیـــدەرە لاوە عەقڵـــەکەی خۆمـــان
چاک چـاک مانـای «مـا أصـابک» بـزان
زاهـیر بـوو سـەواب بـە مـەحزی فەزڵـە
عیقـابی جـەناب حـەق عـەینی عەدڵـە

عەقڵــت وەسوەســە ئەگــەر کــەم ناکــا
هەردەڵێی[٢٢] قودرەت بۆچ چـاکم ناکـا؟
ئـەم قسـە چلـۆن سـا موسـەللەم بـێ:
قـودرەت نەیێلـێ ئەسلـت عـەدەم بی؟
قـــەلبی حـــەقایق ئەمرێکـــە بـــەتاڵ؛
تەئسیری قـودرەت بـۆ مـەحاڵ، مـەحاڵ
بـــۆ ماهییـــەتی مەعـــدوومی ناکـــەس
پۆشـــینی لیبـاس وجـوود بەســە بـەس
سەعیێ کا وجوود چـاک تێیـدا جـێ کـا
عـەدەم و ئیمکـان بەڵـکو ژێـر پـێ کـا
لێــی نــەیێرێ زۆر زوڵــمەتی عــەدەم
چـاوی رۆشـن بـێ بـە نـووری قیـدەم
تـا لــە عەمەڵــدا نــەیمێنێ قوســـوور
حەسبە رەزای حـەق لێـی بێتـە زوهـوور

واتە: ئەساسی ئێمە عەدەمە و هەرچی کەموکووڕییش هەیە هەر هی عەدەمـە، خـەیر و چاکـە ئەگەر هەبێ هی وجوودە، وجوودی واجبیش تەنها هـی خـودای گەورەیـە و وجـوودی شـتی تـر مومکینە و لەوانەیە نەبوون رووی تێبکا، کەواتە نابێتە سەرچاوەی راستەقینەی چاکە. نەبوون کـە بەدە و لێتەوە دیارە هەر شەڕ و بەدی لێ دەوەشێـتەوە، جا ئەگەر چاکەیێ لـە تـۆی مومکینـەوە بینرا ئەوە لە ئاساری ئەو کەسەیە کە بناخەی هەموو بوونێکە واتە: خودای پەروەردگار.

ئەمجار واز لە عەقڵەکەی خۆمان بێنە، باش لە مەعنای [ما أصابک مـن حسـنةٍ فمـن الله و مـا أصابکَ من سیئةٍ فمن نفسکـ] بزانە، تا بۆت دەرکەوێ کە نـەفس کـانی ئیمکانـە و دژی بوونـە و سەرچاوەی ئافەت و بەڵایە، بەڵێ وا دەرکەوت کە پاداشی خـودای گـەورە بـۆ بەنـدەکانی لەسـەر کردەوەی باش تەنها لە گەورەیی و بەخشندەیی و بەزەیی خۆیەوەیە؛ چونکە پاداشـی چـاک هـی کردار و رەفتاری چاکە، چاکەش لە وجوودەوە هەڵدەقوڵێ، وجـوودیش لـە بەخششـی خودایـە و، خۆی مەوجوودی راستەقینەیە و هی خەڵک سەرچاوەکەی ئەوە. هـەروا تۆڵـەیش لەسـەر کـار و کردەوەی خراپە عەینی عەدالەتە، چونکە تۆڵە بەرامبەری کردەوەی خراپەیە، کردەوەی خـراپیش

لە ماهییەتی کەموکووڕی ئینسانەوە پەیدا دەبێ کە مومکینی زاتی‌یە و ئەسڵەکەی نەبوونە و بوونەکەی لە خوداوەیە.

خۆ ئەگەر عەقڵی ناتەواوت هەر خەیالات دەکا و دەڵێیت قودرەتی خودا بۆ چاکم ناکا؟ ئەگەر بە وردی سەیری پرسیارەکەت بکەیت بۆت روون دەبێتەوە کە قسەیەکی هیچ وپووچ و بێ‌مەعنایە، چونکە تۆ یەکێکی لە مومکینە خاسەکان، ئەسڵ لە مومکینە خاسەکاندا نەبوونە و بوونیان پاش نەبوون هاتووە و، گۆڕینی ماهییەتی مومکین بە واجب مەحاڵە، دیارە کاری قودرەت لە مەحاڵدا مەحاڵە.

ئەو گەورەیی و بەهرەیە کە شایانی شانی تۆیە ئەوەیە کە خودای گەورە بەرگی بوونی بە بەردا کردووی. بێ‌گومان ئەم بوونە لەوانەیە بە تێکۆشان و بەردەوامی لەسەر خوداناسی و پاکی بە نووری وجوودی (واجبالوجود)ی ئەزەلی و ئەبەدی نوورانی بێ و خەوش و خاڵی نەبوون و ئیمکان و نیشانەکانیانی لێ دوور بکەوێتەوە.

دیارە ئینسانی خاوەن رەزیلە و گوناهبار کە لە گوناهـ و کرداری بەد پەشیمان بووەوە و خووی دایە خوداپەرستی و رەفتاری باش، ئاساری خراپەکارییەکەی پێوە نامێنێ و تاریکی ناشیرینی عەدەم و ئیمکان زۆری پێ ناهێنێ و تەنگاوی ناکا و، بە نووری قیدەم، نووری خودایی، دڵی رووناک دەبێتەوە و رەزامەندیی خودای دەستگیر دەبێ.

ئاخر ئیرادە و مەشییەت تەقدیر
(تَعَلّقَتْ بالخیرِ وَالشریرْ)
ئەمما ئەمر و حوب رەزای (ذوالمنن)
(مَا تَعلَقَتْ إلاّ بِالحَسَنْ)
تەقدیر مەشییەت ئیرادە و قەزا
موستەلزیم نییەن بۆ حوبب و رەزا
بە شەڕ نارازی بە خەیر رازییە
قەزا گشت خەیرن چون حەق قازییە
دڕک دای لە پێت شەڕە ؛دەڵێی: وەی،
خەیرە؛ پەرژینی باخی پێ دەکەی

ئـــار شـــەڕە؛ ســـووتا خەلــە و خـــەرمانت
خـــەیرە؛ باعیســـە بـــۆ چێشـــت و نانـــت
بـــەعزێ مـــورادات هەیـــە مـــەنهی‌یـــە
بـــەعزێ مـــەئموورات هـــەس مـــوراد نییـــە
لەبەر چەند نوکتە و مەسلەحە و حیکەم
(نَحـــــنُ لا نَعْلَـــــمْ، اللە أعْلَـــــمُ)
وا نـــەبوو، ئەمـــە وای کـــرد ئیفـــادە،
ئـــەمر موســـــتەلزیم لـــەبۆ ئـــیرادە
هەر حەقە، بـێ‌شـک، جـەوادی موتلـەق
(خَیْــر)ی مـــەحز و (غنـــیّ)ی بەرحـــەق
(لکـــن لـــم یُعْـــطِ إلاّ مـــا سَـــألْ
ألسِـــــــنَةَ اسْـــــــتعدادِنا، أجَـــــلْ)
ئوســـتاد زاخـــی خـــۆی بـــۆچ وەبـــاد دەدا؟
زاخ بـــــە موافیـــــق ئیســـــتیعداد دەدا
زاخـــــی دەبـــــان زاخ تێخـــــی دەبانـــــە
زاخـــــی خوراســـــان بـــــۆ خوراســـــانە
بـــۆ برســـی ئـــاو و[٢٣]، لـــەبۆ تینـــگ نـــان
عاقڵـــی هەڵســـە ســـا بۆیـــان بێـــران
(خُصوصـاً) حـــەکیم وا ســـاحێب شـــانێ
بـــێ قـــارووره و نـــەبز لـــە دەرد بزانـــێ
نییـــە لـــەگرەدا هـــیچ قســـە و باســـێ
دەســـکاری خـــۆینی چاکمـــان دەناســـێ
هەرگاهـــ کـــە وا وێ ئـــەوا مەعلوومـــە
هـــەرچی پێمـــان کـــا غـــەیرە مەلوومـــە

ئار: ئاگر. زاخ: بۆ زاخاوی خنجەر و شمشێر و تیغ بەکاردەهێنرێ. تیغ: تێغ. دەبان: جۆرە پۆلایەکی جەوهەرداره خنجەری لێ دروست دەکرێ. تینگ: تینوو. بێران: بهێنە. دەسکاری خۆینی: خودا خۆی دروستی کردووین. وا وێ: وەها بێ. پێمان کا: پێمان بکا.

واتە: خواستی خودا (ارادە) کەی، هەروەها دروستکردن (قدرة) ەکەی پێوەندی بە خێر و شەڕ و چاک و خراپەوە هەیە، بەڵام ئەمرکردن و خۆشویستن و ڕەزامەندیی خودا بە چاکەوە نەبێ پێوەندی نییە. «ولا یرضی لعباده لکفر» واتە: ئیرادە و قودرەت نابێتە هۆی خۆشویستن و ڕەزامەندی. خودای گەورە ڕازی‌یە بە خێر و خۆشی دەوێ، ناڕازی‌یە لە شەڕ و هەرگیز خۆشی ناوێ.

پوختەی ئەم بابەتە ئەوەیە کە خودای گەورە هەر لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد ئاگادارە لە هەموو شتێ، دەزانێ بەندەی موکەللەفی لە کاتی خۆیدا چی دەکا، بڕیاری داوە ئەو شتەی موکەللەفەکە دەیەوێ و هەڵیبژاردووە بۆی دروست بکا، کوفر بێ یا ئیمان، گوناهـ بێ یا خوداپەرستی. لەگەڵ ئەویشدا هۆش و فامیشی پێداوە و ڕێگای چاکە و خراپەی بۆ دیاری کردووە و ئەمری پێ کردووە چاکە بکا و نەهیی لێ کردووە توخنی خراپە بکەوێ. جا ئەگەر ئەوەی کابرای موکەللەف دەیکا چاکە بوو، ئەوا ئەو کارە مورادە و ئەمر بە کردنی کراوە و خۆشەویستە و خودا لێی ڕازییە. خۆ ئەگەر خراپە بوو، ئەوا مورادە؛ بەڵام نەهیی لێکراوە و خوشەویست نییە و خودای گەورە لێی ڕازی نییە. وا لێرەدا دەرکەوت هەندێ کاری ئەمرپێکراو موراد نین؛ چونکە خودا دەزانێ کە کابرای موکەللەف نایکا، هەروەها هەندێ کاری نەهی‌لێکراو مورادە؛ چونکە خودا زانیویە و دەزانێ کە موکەللەفەکە دەیکا. بەهەرحاڵ ئەوەی ئەمر بە کردنی کرابێ خۆشەویستە و خودای گەورە لێی ڕازی‌یە، ئەوەی نەهیی لێکراوە خۆشەویست نییە و خودا لێی ڕازی نییە.

هەروەها (قضا) چ بە مەعنای عیلمی خودا بێ یا بە مەعنای ئیرادە و خواستی بێ لەو لایەنەوە کە پێوەندی بە خوداوە هەیە واجبە ئینسان پێی ڕازی بێ، بەڵام لە لایەنی تەکلیف پێکراوەکەوە، واتە کە تەماشای خودی کراوەکە بکەین ئەگەر گوێڕایەڵی و چاکە بوو واجبە پێی ڕازی بێ و، ئەگەر بێ‌گوێ‌یی و گوناهـ بوو واجبە پێی ڕازی نەبێ.

بەڵێ قەزا لەو لایەنەوە کە ئەنجامی کاری خودای گەورەیە هەمووی خێرە و حیکمەتی تێدایە و خودا خۆی دەزانێ چی‌دەکا؛ داری دڕکاوی ئەگەر زیانی هەبێ بۆت و کە بدا لە پێت هاوارت لێ هەڵدەسێنێ، لە لایەکی ترەوە سوودی هەیە باخی پێ پەرژین دەکرێ و دەیپارێزێ. ئاگر

ئەگەر لە لایەکەوە خەڵوخەرمانت بسووتێنێ و زیانت پێبگەیەنێ، لە لایەکی ترەوە خێرە بۆت و بۆ خەڵکی تر؛ نانی پێدەکرێ، چێشتی پێ لێ دەنرێ، سەرمای پێ لا دەدرێ.

خودا دەوڵەمەندی موتڵەقە؛ واتە لە هەموو روویەکەوە دەوڵەمەندە و موحتاجی هیچ جۆرە شت و کەسێ نییە، بەڵام ئەو ئەوە بە بەندەکانی دەدا کە زمانی حاڵی ئیستیعدادیان داوای دەکات، شتێکیان پێ دەبەخشێ لەبارياندا بێ.

مەولەوی لێرەدا بە شێوەیەکی نوکتەئامێز و بۆ نزیککردنەوەی مەسئەلەکە لە مێشکی خوێنەواری موسوڵمان، تەشبیهی خودای گەورەی کردووە بە وەستای ئاسنگەری زاخاودەری خنجەر و دەفەرموێ وەستا بۆ زاخی خۆی بەخۆڕایێ لەکیس بدات و لە شوێنی نامولائیمدا بەکاریبهێنێ، زاخی دەبان بۆ تێغی دەبانە، زاخی خوراسان بۆ زاخاودانەوەی تێغی خوراسانە، واتە: نەک بۆ هەموو تێغێ.

هەر لە ئیشی زۆر عادەتیشدا لێکیبدەرەوە: ئەگەر ئازایت و لە تیروتوانجی خەڵک ناترسی هەڵسە بۆ ئینسانی برسی ئاو بێنە و بۆ ئینسانی تینوو نان، بزانە بە تانەوتوانج کاست ناکەن، برسی نانی دەوێ، تینوو ئاو. هەرکەس جۆرە قابیلییەتێکی هەیە و بۆ وەرگرتنی جۆرە بەهرەیەکی تایبەتی ئامادەیە، هەر نەخۆشێ جۆرە دەرمانێکی بۆ دەستنیشان دەکرێ، نەخوازەلا ئەگەر حەکیمەکە حاڵزانێکی خاوەن شکۆوشان بێ، بەبێ ئەوەی دوکتۆر بێ و نەبزی نەخۆش بگرێ و شووشەی دەرمانی پێ بێ لە دەردی دەردەدار بزانێ و دەرمانی بۆ دیاری بکا، کە زاتی خودای گەورەیە. لێرەدا شتەکە زۆر ئاشکرایە: ئێمە دەستکرد و دروستکراوی دەستی بەهێز و توانای خوداین کە هەموو ئاشکرا و نهێنییەکمان دەزانێ و هیچی لێ ون نابێ، خۆی دروستی کردووین و دەزانێ چۆنی دروست کردووین و بەو پێیە موعامەلەمان لەگەڵ دەکا؛ هەرچی بدا بە هەرکەس شتێکی زۆر عادەتییە و لەسر ئەو شتە سەرزەنشت ناکرێ... لۆمە و سەرزەنشت بۆ غەیری خودایە.

سُــؤْلِ الإِسْــتِعْدادُ لـَنَــا نـوعـانِ
أَمْــرُهُ، جَــلَّ عَــلاَ، أَمْــرَانِ)
سائیل بۆ ئەمرەین ئەڵبەت موتیعە
سائیل بۆ (اِفْعَلْ) فەقەت شەنیعە
پەس وا ئیتاعەت هەروەکوو عیسیان
هەردوو موقتەزان بۆ عەینی ئینسان

شەڕ لە نەقائیس حودووس و عەدەم
خەیر لە خەسائیس وجوود و قیـدەم
(وَمَــــا ذكرْنَـــا سِــــرٌّ للقَــــدَر
قَـــدْ أفشَـــيناهُ، واذا ظَهَــــر
يَـــومَ القيامَـــة مَـــا لامَ أحَـــدْ
إلاَّ نفسَـــــهُ كمَـــــا قَـــــد وَرَدْ)

واتە: خودای گەورە جەوادی موتڵەق و بەخشندەی بەرحەقە، بـەڵام ئـەوەی کـە دەیبەخشـێ بەپێی ئیستیعداد و قابیلییەتێکە کە خودا پێیداوە. جا ئیستیعدادەکە دوو جـۆرە، ئـەو ئـەمرەیش کە خودا دەیکا هەمیسان دوو جۆرە:

جۆری یەکەمی ئیسـتیعدادەکان ئامـادەیییـە بۆئـەوەی ئـەمر و نـەهی (اِفْعَـلْ) و (لاتَفْعَـلْ)ی تەوجیهـ بکرێ، ئەم جۆرە ئیستیعدادە لە هەموو ئینسانێکی بالغ و عاقڵدا هەیە، دیارە ئـەم جـۆرە ئیستیعدادە تەنها داوای یەک شت دەکا کە ئاراستەکردنی ئەمرەکە یا نەهیەکەیە.

جۆری دووهەمیان ئامادەیییە بۆ ئیجادی تەکلیفپێکراوەکە لـە لایـەنی خـوداوە، بێجگـە لـە ئامادەیی بۆ ئەوەی ئەمر و نەهیەکەی تەوجیهـ بکرێ. ئەم جۆرەیان دوو شت داوا دەکات.

هەروەها جۆری یەکەمی ئەمرەکەی خودا ئەمری تەکلیفییە کە بریتییـە لـە تەوجیهـکـردنی ئەمر و خیتاب بۆ موکەللەفەکە. دووەم ئەمری تەکوینییە کە بریتییە لە دروستکردنی ئەوەی کە داوای کردووە هەر لەلایەن خوداوە، جا ئەو کەسەی کـە قابیلییـەتی ئـەمری تـەکلیفی و ئـەمری تەکوینیی هەیە، واتە قابیلییەتی ئەوەی هەیە ئەمر و نەهی رووی تـێبکـا و قابیلییـەتی ئەوەیشـی هەیە خودای گەورە ئەمرپێکراوەکەی بۆ دروست بکا، خودا بـۆی دەکـات و بـە (مُطيـع) حسـێب دەکرێ، دیارە ئیستیعدادەکەی دوو شتی ویستووە. ئەوکەسەیش کە تەنها ئامادەیی و قابیلییـەتی ئەمرە تەکلیفییەکەی هەیە و هیچی تر، ئەوە هەر تەکلیفەکە رووی تـێدەکـا و، لەبەرئـەوە خـۆی لەخۆیا ئامادە نییە بۆ جێبەجێکردنی ئەمرەکەی خودا و، ئیستیعدادەکەی تەنها یـەک شـتی داوا کردووە بۆیە خودایش بۆی دروست ناکا و لە ئەنجامدا بە (عاسی) دەدرێتە قەڵەم.

وا لەم بەیانەوە دەرکەوت کە گوێڕایەڵـی و بـێگـوێیی، تاعـەت و مەعسـییەت هـەردووکیان سروشتی ئینسان خۆی ئیقتیزایـان دەکـات، بـەڵام بـێگـوێیی و گوناهـکردنەکـە لـە لـەوازیمی کەموکووڕیی حـودووس و نـەبوونی پـێش بوونەکەیـەتی و، گـوێڕایەڵـی و چاکەکردنەکـەی لـە

لەوازیمی بوون و بۆنەیەتی لەگەڵ زاتی ئەزەلی و ئەبەدیدا کـە بـە تـەوفیقێکی تایبـەتی دەسـتی کەوتووە.

ئەوەی لێرەدا نووسیمان نهێنیی‌کاری خودای گەورەمان بۆ دەردەخات لە کرداری بەندەکانیـدا، واتە: وەڵامە بۆ پرسیاری ئەو کەسەی کە دەڵێت: بۆچی خودای گەورە چاکـە بـۆ زەیـد دروسـت دەکا و خراپە بۆ عەمر، هەروەها مەعنای [قُلْ كُلٌّ يَعْمَـلُ عَلـى شـاكلتهِ]مـان بـۆ روون دەکاتـەوە، پوختەکەی ئەوەیە هەرکەس ئامادەیی‌یەکی تایبەتیی هەیە و، بەگوێرەی ئەو ئامادەیی‌یـە خـودای گەورە شتی بۆ دروست دەکا.

ئیتر لێرەدا هیچ پرسیارێ نەماوەتەوە، مەگەر ئەوە کە یەکێ بڵێت هۆ چییە کە خودای گـەورە ئامادەیی و ئیستیعدادی زەید و عەمری لە یەک جیا کردووەتەوە؟!

وەڵامی ئەوەیش ئەوەیە کە لە نەفسی خەلق و ئیجـاددا خـودای گـەورە سـوئالی لـێ نـاکرێ؛ چونکە خودایەتی و لووتکەی تەواوی و بێ‌خەوشی و (واجبالوجـود)ی مانیعـە لـەوە کـە خـودای گەورە شتی بێ‌حیکمەت بکا، مانیعە لەوە کـە پرسـیاری لـێ بکـرێ [لا يُسْـأَلُ عَمـا يَفْعَـلُ وَهُـمْ يُسْأَلونَ].

لەوەیشەوە وتمان کە ئیستیعدادی موکەللەف دوو جۆرە و ئەمری خودایش دوو جۆرە، مەعنای فەرموودەیەکی حەزرەتمان بۆ دەرکەوت کە فەرموویەتی: لـە رۆژی قیامەتـدا کـردەوەی خەڵـک دەردەکەوێ، جا ئەوکەسانەی خێریان دەس دەکەوێ با حەمد و سەنای خـودا بکـەن، ئەوانـەیش کە شەڕیان دەس دەکەوێ با هەر سەرزەنشتی خۆیان بکەن.

کـــوللی نیعمـــەتێ لـــەوەوە فەزلـــە
کـــوللی نیقمـــەتێ لـــەوەوە عەدلـــە
ئاگامـــان نییـــە، وەک تاریکەشـــەو،
نـە لـە علمـی ئـەو، نـە لـە عـەدلی ئـەو
بـۆی هەیـە تـەکلیف حـەقی (ذوالجـلال)
(بمـــا شـــاءهُ مِنّـــا مِـــنْ أفعـــال)
دەگـــەڵ ئەویچـــە هـــەم بکـــا تەقـــدیر
ئەســـبابی مـــەنعیچ؛ (إن هُـــوَ الخبيـــر)

لەبەرئــەوە وا تــەقریری بــۆت هــات[٢٤]
بــەعزێ لــە فیرقــەی عولــەمای ثوقــات
حــوکم بــە وجــووب ســکووتمان دەکــات
لە (لِمَ)ی ئەفعال لە (کیـف)ی سـیفات[٢٥]
ئــەر تــەختێ شــوعوور هەیــە پێتــەوە
کــــە وتــــت خــــوداس دەبڕێتــــەوە[٢٦]

واتە: مادام زاتی خودای گەورە (واجبالوجود)ە و، خاوەنی سیفاتی کەماڵە و بە هـەموو جـۆرێ دەتوانێ کار لە جیهاندا بکا و، هیچ شتێکی لـێ گـوم نابـێ و، هـەموو کردەوەکـانی جـانن، دەبـێ بزانین هەر نیعمەتێ بدا بە هەرکەس لە گەورەیی و چاکەکاری و میهرەبـانیی خۆیەوەیـە و، هـەر ئازارێ یا هەر دەرد و بەڵا و ناباریيەک بدا بەسەر هەرکەسێکدا عەداڵەت و دادپەروەریی خۆیـەتی، ئێمە ئاگادار نین لە عیلم و عەدلی خودای گەورە، بەڵکو هیچ سیفەتێکی ئـەومان بـە تـەواوی بـۆ دەرنەکەوتووە و بۆ ئەندازە و توانـای زانـینی ئێمـەی مـەخلووق جیهـان لـە بەرچاومانـدا وەکـوو تاریکەشەوە.

خودای گەورە دەتوانێ هەموو تەکلیفێ لە هەموو یەکێ لە ئێمە بکات، دەیشـتوانێ لـە عـەینی کـاتی تەکلیفەکـەدا هـۆی وەهـا دەربخـات کـە ببێـتە کۆسـپ لـە ڕێگـای بـوونی شـتە تەکلیفپێکراوەکەدا.

لەبەر ئەم تەقریرەیە هەندێ لە زانایانی خاوەنپایە و باوەڕپێکراو فەرموویانە هـەرگیز بەرامبـەر بە کارەکانی خودای گەورە ڕێگەی پرسیار نییە و نابێ بوترێ: خودایا بۆچی کردت؟ هەروەها نابێ پرسیار لە چۆنیەتیی سیفەتەکانی خودا بکرێ، تۆ ئەگەر کەمێ هەسـت و تێگەیشـتنت هەیـە کـە وتت خودا خودایە ئیتر قسە دەبڕێتەوە و هیچ مەیدانی «بۆچی» و «چییە» و «چۆنە» نامێنێت.

(قَـــــوْمٌ أفرَطُـــــــوا، قَـــــوْمٌ فَرَّطـــــــوا
أَذَّنهـــــم مِـــــنْ حَـــقٌ هَـــــلاّ قَرَّطـــــوا؟)
جــەبریی بــێحــاڵ و قــەدەریی مــەجووس
ئەو بۆ خوێنخۆر و ئەم بۆ سـروان جـووس[٢٧]؟
بـا بـێین لەبـەن بـین ئـەمما نـەک دەمـی
(نخــــرجْ مِــــــنْ بــــــینِ فَــــرْثٍ وَدَمٍ)

نـــە وەک لادێیـــی نـــە وەک شـــاری بـــین
خـــالیس بـــین ســـائیغ لـــەبۆ شـــاریبین

افرطوا: زیادەڕەوییان کرد. فرّطوا: کـەموکووڕییـان پیشـان دا. هَـلاَّ فرّطـوا: بـۆچی گوارەیـان نەکردە گوێ؟. جەبریی بێحاڵ: ئەوانە کە خۆیان بە ناچار دەزانن و حاڵیان بۆخۆیان بڕیار نەداوە. قەدەریی مەجووس: ئەوانە کە خۆیان بە خالیقی ئەعمالی خۆیان دەزانن و وەک مەجووسین.

مەولەوی لە پێشەوە باسی ئەوەی کرد کە هەرچی پڕتەوی بوون لێی داوە و مەوجوودە هـەموو خودای گەورە دروستی کردووە، دیارە کردەوەی ئینسانیش بەشێکە لە مەوجوودات و، بەپێی ئـەو قسەیە ئەویش خودای گەورە دروستی کردووە، بەڵێ ئەمە مەزهەب و ڕێبازی ئەهلی حەقە. بەڵام دوو مەزهەبی تری مەشهوور هەن:

یەکەم: مەزهەبی جەبرییەکانە کە لایان وایە ئینسان هیچ پێوەندییەکی بە کردەوەیەوە نییە و، دەربارەی کردەوەی وەک دار و بەردی بێدەنگ و سەنگە! بە هیچ جـۆرێ لـە کـرداردا کەسـب و پێوەندی بۆ ئینسان دانانێن.

دووەم: مەزهەب و ڕێبازی موعتەزیلەکانە کە بە قەدەری مەشهوورن و، لەبەر ئەوەی نیسـبەتی تەئسیر لە خۆیان دەدەن و خۆیان بە شـەریکی خـودا حیسـاب دەکـەن و، وەک دروسـتکـردنی خۆیان دەدەنە پاڵ خوا، دروستکردنی کردەوەکـانی خۆیـان دەدەنـە پـاڵ خۆیـان، بۆیـە وەکـوو مەجووسن. جا مەولەوی دەفەرموێ: (ئەو) واتە: جەبری بۆ خوێنخۆر بێ، بیری ناشیرین و پیسی وەک خوێن بخواتەوە؟ (ئەم) واتە موعتەزیلە بۆچی سڕوان جوو (...) خـۆر بێـت؟ دەبـا بەڕاسـتی ببینە شیر نەک تەنها بە دەم، یا شیرێک بین خوێناوی نەبێ و پاک و بێگەرد بێ، ئەو شیرە سـافە بین کە لە بەینی گەدەی پڕ لە پیسی و دڵی پڕ لە خوێن دەردەچێ، واتـە نـە جـەبری بـین و نـە قەدەری، نە وەکوو لادێیی بین کە لەبەر فەقیری و داماوی شیرەکەی ئەوەنـدە دەکوڵـێنێ کـەم دەبێتەوە و تووشی زیان دەبێ و تێکرا دەیشیفەوتێنێ و نە وەکوو شاری بین کە ئاوی زۆر دەکاتـە شیرەکەی و لەزەتی تێدا ناهێڵێ، با ڕێبازی ئێمە لە عەیب پاک بێ، شیرێکی سافی چاکی گـەوارا بێ و بە ئاسانی بخورێتەوە و سوودی لێ وەربگیرێ.

(قلنا كلُّ شيء مِنْ حيثُ الإيجاد
خيـرٌ صـادرٌ مـن ربِّ العبـاد

نَرْضــی بالقَضَــا وَ بمــا یُقْضــی
بذاتِ الشّــرّ المَقْضــی لا نرضــی)

واتە: لەمەوپێش باسی ئەوەمان کرد کە قـەزای خـودا هـەموو خێـرە، چونکـە خـودای گـەورە کردوویەتی. وا لێرەیشدا دەڵێین هەموو شتێ (من حیث الایجاد) خێرە و دروستکـراوی خـودای گەورەیە کە پێگەیێنی هەموو خەڵقی خۆیەتی، کەواتە ئێمە رازین بـە قـەزای خـودا و بـەوەیش خودا حوکمی پێکردووە، بەڵام لە زات و خودی ئەمرە پەیدابووەکە، مادام شەڕ بێ، رازی نین.

ئــەفعالی عیبــاد، ئــەر خــەیرە، ئــەر شــەڕ،
هــــەموو مــــەخلووقی خالقــــە یەکســــەر
(فَمِــنْ حَیْــثُ الخَلْــق) مەنســووب بــە حەقــە
(وَمِن حیثُ الکســب) مەنســووب بــە خەلقــە
(مِــنْ جِهَــةِ الخَلْــق) هــەمووی هــەر خــەیرە
(مِــنْ جهــةِ الخَلــق) بــەعزیکی ضــەیــرە
بــــۆچی؟ (خَــــالِقُ الــــوَرى) خــــەبیرە
بــە مەســنووعاتی خــۆی چــاک بەســیرە
نــاس ناســی و نــاقیس (جــاهلین بالحــال)
مەسدەریان وەک فیعل هـەموو (ذُو اعْـتِلال)
(لِـــــذا لایُسْـــــأَلُ عَمَّـــــا یَفْعَـــــلُ
وَ نحــــنُ عَمّــــا نَفْعَــــلُ نُسْــــأَلُ)
عیلمــــی تــــەمام و ئــــیرادەی تــــەمام
قــــودرەتی تــــەمام (خــــالق الأنــــام)
(بِالأشْــــیا، لَهــــا، عَلَیْهــــا) بــــێقیــــل
(بتَفصــــــیلِها لِلخَلْــــقِ دَلیــــــل) [٢٨]
(ألاَ یَعْلَــــمُ مَــــنْ خَلَــــقْ) بــــزان
(و هُوَاللَّطیــــف الخبیــــر) بــــێگومــــان
ئەڵــــبەتتە ئیجــــاد لایــــق بــــەو دەوێ

خـــالیقی ڕێکـــی هـــیچ کـــەس ناکـــەوێ
عیلمـــی نوقســـان و ئـــیرادەی نوقســـان
قـــودرەتی نوقســـان تائیفـــەی ئینســـان
ئـــەر کەســـێ چـــاوی دڵـــی بوێنـــێ(٢٩)
ســـیوای کاســـبی چـــی تـــر دەمێنـــێ؟
بڵـــێ بەوکەســـــە وا دەڕۆت بـــــە ڕێ:
بـــزان دەزانـــێ چەنـــد هـــەنگاو دەنـــێ؟
یـــا هـــەنگاوێکی چەنـــد بـــنگس دەوی؟
ئەمـــڕۆ یـــا ســـۆزوو، کـــەی دەگەتـــە جـــێ؟
لـــەدوای ســـوئال وە بـــێ قوولـــەقوول
مەعلوومـــە ئـــەوە پێـــی‌ناڵـــێن زوهـــوول
(فـــی أظْهَـــر الفعـــل) ئەمـــە حاڵـــی‌یـــە!
لـــــە حـــــەرەکاتی ئـــــەعزادا چییـــــە؟!
بـــێخەبـــەر لـــە حـــاڵ ئـــەووەل و مـــەئال
بـــە ئـــەوە دەڵـــێی (خـــالِقُ الأفعـــال)؟!
بۆ ڕوتبـەی ئیجـاد بـۆچی دەکـەی نەسـب؟
مەزهەرە و مەحەل (ذو الکسب) و (فَحَسْبْ)

خالقی ڕێکی هیچ کەس ناکەوێ: کەس حەدی خالقیی نییـە. بوێنـێ: ببینـێ. دەڕۆت بـەڕێ: بەڕێگەدا دەڕوات. بنگس: بنگووس، بست (شـبر). دەوێ: دەبـێ. سـۆزوو: سـبەی. قوولـەقوول: چەنەچەن و قڕەوقاڵە و قسەی بێهوودە.

خاوەن ئایینەکان، لەگەڵ جیاوازیی ئایین و باوەڕیاندا، هەموو هاودەنگ و یـەک قسـەن لەسـەر ئەوە کە دروستکەر و پەروەردگاری هەموو جیهان، ئاسمان و عەرز، مانگ و خۆر، کان و گیا و دار و درەخت، ئینسان و حەیوان و هەرچی لـەو جیهانـەدا هەیـە، هـەر خـودای گەورەیـە. هـەروەها وەزعی ئینسان ئەوەی کە دەستی خۆی تێدا نـەبێ و هـیچ مـاوەی خواسـت و خواهیشـی خـۆی

نەبێ، وەک باڵا و قامەت، خوو و ڕەوشت، ڕەنگ و دەنگ و هاوچەشنەکانیان، هەموو خودای گەورە دروستی کردوون و دەستی ئینسانی تێدا نییە.

مایەوە کار و کردەوەیێ کە پێوەندی بە خواستی ئینسانەوە هەیە، وەک هەستان، دانیشتن، قسەکردن، نان خواردن، هەڵمەت بردن... تاد.

لێرەدا چەند بیروڕای جیاجیا هەن، چواریان مەشهوورن:

یەکەم: بیروباوەڕی ئەهلی حەق کە ناویان بە ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەرکردووە و، پەیڕەویی حەزرەتی پێغەمبەر و یارانی دەکەن. ئەم کۆمەڵە دەڵێن ئەو کردەوانەیش وەک خاوەنەکانیان هەر زاتی خودا دروستیان دەکا، بنیادەم تەنها کاسبە و غەیری کەسب هیچ پێوەندییەکی پێیانەوە نییە.

دەلیلی ئەوە کە خودا خالقی کردەوەی عەبدە و عەبدەکە خالق نییە، عەقڵی و نەقڵی هەیە:

دەلیلی عەقڵی ئەوەیە ئەگەر عەبد خالقی کردەوەی خۆی بوایە دەبوا جوزئییاتی جم‌وجۆڵ و هەڵس‌وکەوتی خۆی لە کاتی کارەکەیدا بزانیایە، دەبوا بیزانیایە چەند شاڕەگ و چەند وردەڕەگ و چەند جمگە لەکاتی کارەکەیدا دەجووڵێتەوە، کەچی هیچ ئاگای لەم درێژەیە نییە، ئەم نەزانینیشیە لەبەر ئەوە نییە کە گۆیا غافڵ و بێئاگا بووە، تەنانەت ئەگەر لەکاتی کردەوەکەشدا پرسیاری لێ بکەی و ناچاری بکەی لەوشتانە تێفکرێ هێشتا هەر خەبەردار نابێ و ناتوانێ بیانژمێرێ و نازانێ چەندن و دان بە بێئاگایی خۆیدا دەنێ، بەڵێ ئەمە لە ڕووناکترین کردەوە و سادەترین کاردا، خۆ ئەگەر تەماشای هەندێ کردەوەی مەعنەوی بکەین وەکوو بیرکردنەوە لە کاتی تەعریف‌کردنی شتێکدا، یا بۆ دەلیل هێنانەوە لەسەر مەبەستێ، یا لەکاتی لێکۆڵینەوەی هەندێ کاروباری پاشەڕۆژدا، ئەوا گەلێ سەرکوێرترە.

بەڵام دەلیلی نەقڵی گەلێ زۆرە، وەکوو[الله خالق كل شيءٍ و هُوَ على كل شيءٍ وكيل](٣٠) واتە: هەر خودا دروست‌کوونندەی هەموو شتێکە و هەر ئەو ئیعتیمادی دەکرێتە سەر لە هەموو شتێکدا، لە دروست‌کردنیا و لە پاراستنیا.

یا وەکوو ئایەتی [أفَمَنْ يخلقُ كمَنْ لا يخلقُ أفَلا تَذكَّرون](٣١) کە باسی گەورەیی و دەستەڵاتی خۆی دەکا، یا ووەکو ئایەتی[ألاَ يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ و هو اللطيف الخبير](٣٢)

واتە: ئایا ئەوەی کە خەڵک دروست دەکا ئاگای لە دروست‌کراوەکانی خۆی نییە و پێیان نازانێ؟ بەڵێ زانایە و ئاگادارە، ئەگەر زانا نەبێ بە زاتی ئەو شتەی دەیەوێ دروستی بکا، بەگوێرەی

سوورەتە عیلمییە ئەزەلییەکەی، ئەگەر ئاگای لە هەموو ورد و درشتی سیفەت و حاڵی بڕیاردراوی ئەزەلیی نەبێ چۆنی دروست دەکا؟ ڕەوایە دروستکەر ئاگای لە دروستکراوی خۆی نەبێ؟

یاوەکوو ئایەتی [والله خلقكم وما تعملون](٣٣) واتـە: زاتی خـودا ئێوەیشـی دروسـت کـردووە و کاری ئێوەیشی دروست کردووە.

ئەمانە هەموو دەلیلن لەسەر ئەوە کە خـودای گـەورە هـەر وەکـوو خـالقی زات و سـیفەتمانە خالقی هەموو کردەوەکانیشمانە.

لە لایەکی ترەوە ئێمە، ئەهلی سوننەت و جەماعەت، لامان وایە ئینسـان پێوەنـدەیی کەسـب و ئیکتیسابی بەو کردەوانەیەوە هەیە کە دەیانکا، بـۆ ئەمـەیش دووبـارە دەلیلـی عەقڵـی و دەلیلـی نەقلی هەیە.

یەکێ لە دەلیلە عەقڵییەکان ئەوەیە ئەگەر خەڵک پێوەندییان بە کردەوەی خۆیانـەوە نەبوایـە بۆ خودای گەورە ڕەوا نەدەبوو تەکلیفیان لێبکا و فەرمان بدا ئەو ئیشە بکەن و ئەو ئیشـە مەکـەن؛ چونکە ئەم ئەمر و نەهیە پێویستە لە گیانلەبەرێ بکرێ کـە هـۆش و فـامی هـەبێ و توانایـیـەکی وەهای هەبێ بتوانێ ئەو ئیشە بکا یا ڕێگا لە نەفسی خۆی بگرێ و نەیکا.

دەلیلێکی تری عەقڵی لەسەر ئەم پێوەندییە فەرقی بەینی جووڵانەوەی ئەنـدامی ئینسـانە بـە ئارەزووی ئینسانەکە خۆی لەگەڵ جووڵانەوەیەکدا کە بەدەستی خۆی نەبێ، یەکەم وەک هەڵسان و، دانیشتن و ڕۆیشتن و، وەستان و خـواردن و خواردنـەوەی عـادەتی، دووەم وەک جووڵانـەوەی هەموو ئەندامی ئینسان لە کاتی لەرزوتادا، یا وەک کەوتنـە خـوار بـەپاڵ پێوەنـان یـا ڕاکێشـان و فڕێدانی کارەبا... تاد.

دەلیلی نەقڵیش بۆ ئیسباتی ئەم کەسـب و ئیکتیسـابە لـە قورئـانی پـیرۆزدا زۆر و زەبەنـدەن وەک: [لاَ يُكلّفُ الله نَفساً إلاّ وُسعَها لها ما كَسَبَتْ وَعَلَيْها ما اكتَسَبَتْ...](٣٤) یا [و قـلِ الحـقُّ مِـن ربّكم فمن شاء فليؤمِنْ وَمَنْ شاء فليكفر](٣٥) یا [فَمَنْ يَعْمَـلْ مثقـالَ ذرةٍ خيـراً يَـرَهُ، وَمَـنْ يَعْمَـلْ مثقالَ ذَرّةٍ شراً يَرَهُ](٣٦) یا [جزاء بما كانُوا يَعْملُون...](٣٧) و وێنەی ئەمانە کە زۆرن.

جا پێویستە باوەڕمان وەها بێ کە کرداری بەندەی خودا چـاک بـێ وەک نـانـدان بـە برسـی و ئاودان بە تینوو و ڕزگارکردنی داماو، یان خراپ بـێ وەک مـەنعی ئـاو و نـان لـە برسـی و تینـوو، کوشتنی ئینسانی بێتاوان، لە لایەنی دروستکردنەوە هەموو پێوەندییان بە خوداوە هەیە و خـودا دروستیان دەکا و، هەموو حیکمەتیان تێدایە و حەقیقەتن، بەڵام لە لایەنی کەسـبەوە پێوەنـدییان

بە خەڵکەوە هەیە و ئەو ئیکتیسابیان دەکا، لەم لایەنەوە چاکیــان هەیــە کــە خێــرە و خراپیشــیان هەیە کە شەڕە.

سیرڕی ئەمەیش ئەوەیە کە خودای هەموو عالەم خاوەن عیلمە و خەبــەردارە و بــە حەقیقــەتی شتەکان دەزانێ و لەئەنجامی راستی ئەو شتانە ئاگادارە کە لە پاشەڕۆژدا دروستیان دەکا، هــەرگیز کاری بێحیکمەت ناکا و گیانلەبەری بێسوود دروست ناکا، بەلام ئادەمزاد ناقیســن و حەقیقــەت نازانن، ئەگەر شتێکیش بزانن وادەبــێ لــەبیریان دەچێتــەوە، ئــەوەی کــە بەدیمــەن ســەرچاوەی کاریانە، کە زاتی خۆیانن، نەخۆشە و کردەوەکانیشیان نەخۆش و ناتەواون.

جا لەبەرئەوە کە کارەکانی زاتی (واجب‌الوجود) هیچیان بێحیکمەت نین و، ئەگەر لە لایەکەوە زیانیان هەبێ، لە لایەکی ترەوە سوودیان هەیە، بە شێوەی رەخنە پیشاندان پرسیاری لــێ نــاکرێ بۆچی فلانەشتت کرد؟ چونکە کارەکانی لە حەقیقەتدا بێحیکمەت نین، ئەگەرچی رەوایە لەســەر شێوەی (استفســار) واتــە داوای روونکردنــەوەی حیکمەتەکــە پرســیار بکــرێ، وەک فریشــتەکان لەکاتی دروستکردنی حەزرەتی ئادەمدا(د.خ) عەرزی خودایان کرد[أَتَجْعَلُ فيها مَــنْ يُفسِــدُ فيهــا وَيَسفِكُ الدّماء ونحنُ نُسبّحُ بحَمْدِكَ وَنُقَدّسُ لك... الاية][۳۸]

واتە: بۆچی ئەم نەوعە دروست دەکەی کە لەسەرزەویدا خراپەکاری دەکــەن و خــوێنی ناهــەق دەڕێژن؛ کەچی ئێمە سەنا و ستایشت دەکەین و دەتپەرستین؟ دیارە ئەم پرســیارە بــۆ مەبەســتی روونکردنەوەی حیکمەتەکە کراوە نەک بە شێوەی رەخنە.

بەلام ئێمەی بنیادەم بە شێوەی رەخنە و بە شێوەی داوای روونکردنەوە لە کار و کردەوەمــان پرسیار دەکرێ و ئەمە شتێکی عادەتییە.

زانینی تەواو، خواستی تەواو، توانای تەواو کە هەموو بۆ خودا سابت بوون دەلیلــە لەســەر ئــەوە کە دروستکردن و هێنانە وجوودی هەرشتێ هەر بۆ خودای گەورەیە؛ سەیری ئایەتی پیرۆزی [أَلاَ يَعْلَمُ من خَلَق وهو اللطيف الخبير][۳۹] بکە، کە دەلالەت لەوە دەکات ئەوەی خالق بــێ دەبــێ زانــا بێ، نەزان چۆن دەتوانێ شت خەڵق بکا؟ ئەم پایە و جاهە لایقی کەس نییە خودای گــەورە نــەبێ، بێگومان خەلق و ئیجاد لەگەڵ کەموکووڕیدا دوو شتی دژی یەکترن و پێکەوە کۆ نابنەوە. خالق پێویستە لە هەموو روویەکەوە تەواو بێ و لە هیچ کەمی نەبێ.

عیلم و ئیرادە و قودرەتی کەم و ناتەواوی ئادەمزاد تەنها ئەوەندە کاردەکا کە کەسب و کاســبی بۆ خاوەنەکەی دامەزرێنێ. ئەوانەی چاوی هۆش و فامیان کوێر و کز نەبێ باوەڕیان بــەم راســتییە

دەبێ و سیفەتی خەلق و ئیجاد نادەنە پاڵ بنیادەم. ئەگینا بەو کەسە بڵێ کە لافی خالقی بۆ خۆی لێدەدا، کاتێ کە بە ڕێگەدا دەڕوا، پێی بڵێ: چەند هەنگاو دەنێی؟، یان هەر هەنگاوێکت چەند بستە؟، کەی دەگەیتە مەنزڵ، ئەمڕۆ یان سبەی؟ دیارە نایانزانێ. جا ئەگەر بەهانەی هێنایەوە و وتی غافڵ بووم بۆیە تەفسیلەکەم نەزانی، تۆ ڕێگای لێ بگرە و بڵێ من لە کاتی خەریکبووندا پرسیارت لێ دەکەم کە غافڵ نیت، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو تەفسیلانە کە پرسیم نایانزانی؛ جا تۆ لە سادەترین کاردا ئاوا سەرکوێر بی دەبێ لە زانینی جموجووڵ و کاری وردە ئەندامەکاندا چۆن بی؟، ئینسانی بێخەبەر لە ئێستە و لە دوارۆژ و سەرەنجام، چۆن دەتوانی پێی بڵێی (خالق الافعال)؟ چۆن پایەی خەلق و ئیجادی پێ دەدەی؟ نەخەیر نابێ، ئەم بنیادەمە تەنها بۆ ئەوە دەشێ پێی بڵێی کاسب، شوێنی خەلق، دیاردەی کردەوەکان، نەک مەسدەر یان خالیق.

شوهرەتی مەزهەب حوکەما وەیە
ئەوان لەلایان وەسائیت هەیە
(أمّا تحقیقاً) لای ئەوانیچ واس
موئەسسیری (فیالوجودْ) هەر خوداس
خەلایق ڕۆین ئەلای ئەفلاتوون
چی دەڵێی؟ بڕۆین لە ترسی تاعوون؟
لە جواویاندا قسەی ئەمەیە:
تەماتان چییە؟ عالەم کورەیە،
زەمین مەرکەزە، ئەفلاک وەک کەمان،
حەوادیس وەک تیر، ئینسان وەک نیشان،
(واللە الرّامی فَأیْنَ المَفَرّ؟
وَهذا الکَلامْ یُشْعِر بما مَرّ)
ئەر نەقلی و عەقلی لە لات مەعلوومە
حالی ئیعیتزال تەواو مەفهوومە
حوکەمایچ بوون وەک موتەکەللیمین
ئەمجار ئەو مەر هەر پشت دا لە زەمین!

مەولەوی دەفەرموێ: ڕێبازی مەشهووری حەکیمەکان لە بابەتی خەلق و ئیجاددا ئەوەیـە کـە عیللەتە ئامادەکەرەکان و هۆیەکان حازرن، ئەو عیللەتانە و ئەو واسیتانە ئەوەیان پێشـتر بـێ، کـار دەکاتە ئـەوەیان کـە بـەدوایا دێ... تـاد. بـەڵام تـەحقیقی مەزهـەبی حەکیمـەکان ئەوەیـە کـە واسیتەکان هۆی عادەتین، ئیتر کاریگەری ڕاستەقینە هەر زاتی خودای گەورەیە.

دەگێڕنەوە لە سەردەمی ئەفلاتوونی مەشهووردا نەخۆشیی تـاعوون داکـەوت، خەڵـک ویسـتیان مشوورێکی خۆیان بخۆن، چوونە لای پرسیان پێکرد و وتیان دەرچین و لێی دوورکەوینـەوە یـان نا؟ لە وەڵامیاندا وتی: جیهان کورەیە، واتە: ئینسان ناتوانێ لە سنووری کورەکە دەرچێ، زەوییـش مەرکەز و ناوەڕاستی ئەم کورەیە و دەورە دراوە، ئاسمان کەوانە، بـەڵا و نەگبـەتی تـیرە، ئینسـان نیشانەیە و تیرەکەی تێدەگیرێ، تیرەندازیش خودای گەورەیە بەو هەمووە دەسـت ڕاسـتییـەوە کە هەیە، ئیتر بۆ کوێ ڕادەکەن؟ بۆ هەرکوێ دەچن لەژێر دەستان و ناتوانن لە سنوور دەرچن.

ئەم وتەی ئەفلاتوونە ئەوە دەگەیێنێ کە زوو وتمان هەر خودای گەورە خـالق و پـەروەردگارە. جا کە دەلیلی عەقلی و نەقلیت لە لا روون بوونـەوە، بـۆت دەردەکـەوێ حاڵـی ئـەهلی ئیعتیـزال چەند شلۆقە؟ وا حەکیمەکانیش هاتنە سەر قسەی موتەکەللیمەکان، ئیتر موعتەزیلـە لـە داخانـدا مەگەر هەرخۆی لە زەویدا بتلێنێتەوە و لە ورگی خۆی بدا.

ئەگـــەر ســـوئالی وەهـــا جـــارییـــە
(مُکَلّـــفْ بِـــەِ) ئیختیـــــارییـــە
مـــەخلووق بـــوو ئەسڵـــی تـــەکلیف بـــەتاڵ بـــوو،
مـــەدح و زەم، ســـەواب، عیقـــاب لـــەناوچوو
بـــۆ ئەشـــعەرییە هـــیچ مـــەعنای نییـــە
ئـــەو خرابەیـــە لەســـەر جەبرییـــە
جـەبریی ئەوپـەڕ[٤٠] خـەیر، ئـی ئـەمپـەڕ شـەڕە
ئـــەم پـــەڕە ســـەرحەد پـــڕ داوا و گـــەڕە
لـــە (مُـــرْتَعِش) و (بَطِـــشْ) عـــەرزی کـــەم
لـــەرزینی ئـــەوی و لەرزانـــدنی ئـــەم
یـــەکێ ڕاکێشـــن، یـــەکێ خـــۆی ڕاکـــا
یـــەکێ لاڵـــە و، یـــەک خـــۆی قســـە ناکـــا

فــــەرقیان هەیـــە ئـــەم چەنـــد ســـوورەتە
ئـــەر حیســـــی بـــوێ بـــە زەروورەتـــە
بـــۆچ ئینســـان هـــەروەک حەجـــەر دەی قـــەرار
نـــــەیوێ قـــــودرەت و فیعـــــل و ئیختیـــــار؟
خـــۆ موکەللەفـــە و موعاقـــەب مـــوثـــاب
لەســـەر کـــرداری چـــاک و ئـــی خـــراب
عەرزی کەم: عەرزی جەبری بکەم، پێـی بلـێم[٤١]

واتە: ئەگەر پرسیار و رەخنەیەک لێرە راست بکرێنەوە و بلێن: شتی تەکلیفپێکراو و داواکـراو دەبێ ئیختیاری بێ، جا ئەگەر وەک ئێوە دەڵێن ئەم تەکلیفپێکراوە دروستکـراوی خـودا بـێ و پێوەندی بە شەخسی موکەللەفەوە نەبێ، ئەوا تەکلیفەکە لە بناخەدا بەتاڵ دەبێت و، مـاوەی ئـەوە نامێنێ کە مەدح و زەم و پاداش و تۆلە لەسەر کردەوەکە روو بکاتە شەخسی موکەللـەف؛ چونکـە کردەوەکە ئیختیاری نەبوو.

لە وەڵامدا دەڵێم: ئەم رەخنە لە ئەشعەرییەکان نـاگیرێ، چونکـە ئـەمان هـەروەک نیسـبەتی دروستکردنی کردەوەکە دەدەن لە خودا و ئەو بە خـالق دادەنـێن نیسـبەتی کەسـبی هـەر ئـەو کردەوەیە لە عەبد دەدەن؛ خودا خالقە و بەندەیش کاسب، ئەم پێوەندیی کەسبە بە کردەوەکـەوە بەسە بۆ ئەوەی تەکلیف لە شەخسەکە بکرێ و دەیشبێتە هۆی مەدح و زەم و سـەواب و عیقـاب، بەڵێ ئەم رەخنەیە روودەکاتە کۆمەڵی جەبرییە کە هەرگیز دان نانین بە پێوەندیی خەڵک لەگەڵ کردەوەکانیاندا.

بەڵێ لەسەر بیروڕای ئەشعەرییەکان ئەگەرچی پاش ئیکتیسابەکە ناچار دەبێ شـتەکە دروسـت بکا ئەم جەبر و ناچارییە بەهۆی دانانیان بە ئیکتیسابەکەوە پڕە لە خـەیر، بـەڵام جـەبر و ناچـاریی کۆمەڵی جەبرییە پڕە لە شەڕ و نەگبەتی، چونکە ئەوان دان بەوەدا نانێن کە ئینسـانی موکەللـەف خاوەنی ئیکتیسابە و وەک دار و بەردی بێخواست و ناتوان تەماشای دەکەن. ئـەم جـۆرە جـەبرە مامناوەندی نییە و پەڕی ئەوپەڕی گرتووە، پەڕێکی سەرسنووری پڕئاژاوە و بگرەوبـەردە و هـەڵاتن و هەڵمەت بردنە. هی وای تێدایە هەڵمەت دەبا و هی وایشی تێدایە لە ترسا دەلەرزێ.

بـۆ زیـاتر روونکردنـەوەی جیـاوازیی نێـوان رای ئەشـعەرییەکان و رای جەبرییـەکان دەڵـێم: جەبرییەکان فەرق ناکەن لە بەینی لەرزینی ئینسانێکی ئیفلیجی لەرزۆک یا لەرزوتێدار و لـەرزینی

ئینسانێ لە ئەنجامی هێرش و هەڵمەتبردنیا بۆسەر یەکێکی تر کە خۆی دەلەرزێنێتـەوە. ئەمانـە وەک یەک سەیری لاڵێکی زگماکی بێچارە و یەکێکی ساغی بەدەموپل دەکەن کە بـە ئـارەزووی خۆی قسەناکا! لایان وایە یەکێ بە زۆر راکێشرێ و یەکێ بە خواستی خۆی رابکا وەک یەکن!.

بەلام ئەشعەرییەکان لایان وایە ئەمانەی کە وتمان زۆر لەیەک جیان و جیاوازییان شـتێکی زۆر ئاشکرایە و دەلیلی ناوێ، ئینسان بەردی بێدەنگ و سەنگ و توان و بێکار و بێخواست نییە.

فایــدەی تــەکلیفیچ هەیــە بیزانــە
داعیــی ئیختیــار فیعلــی ئینســانە
ئیسـنادی فیعلـیچ ئـەبال ئـەو، بفـام
بە حەقیقەتە هەر وەک (صَلّی) و (سـام)
نسووسـی قـەتعیش هەیـە بـێشـومار
خەتمێ بخوێنـە لەسـەر تـا بـە خـوار
هەر مونافی هـات لێـت بگـرێ تـەریق
بـۆ دەفعـی بکـۆش بـە یـاریی تـەوفیق
ئەمـە رێکـی عـەقڵ چلـۆن دەکـەوێ
بۆ عیبـاد (أصـلاً) هـیچ فیعلـێ نـەوێ

لەپێشدا باسمان کرد کە کۆمەڵی موعتەزیلە لایان وایە ئینسان دروستکەری کـاری خۆیـەتی، ئێمە ئەم قسەمان بەرپەرچ دایەوە بە دەلیلی عەقلی و نەقلی.

دەلیلی عەقڵیمان ئەوە بوو کە ئەگەر بەندە خاوەنی کـارەکـانی خـۆی بوایـە دەبـوا ئاگـای لـە یەکەیەکەی جموجووڵی ئەندامەکانی لەشی بوایە کـە لـە خۆیـەوە روودەدات، کـەچی ئەگـەر بـە وردی کابرای رێرەو حاڵی بکەی و ئاگاداری بکەیتەوە کە لە لەشی خۆی وردبێتـەوە نازانێ کـامی زۆر دەجووڵێتەوە و کامی کەم؟ یا ژمارەی جموجووڵەکانی چەندە؟

دوای ئەوە هەندێ دەلیلی نەقڵیشمان بۆ هەمان مەبەست هێنایەوە وەک ئایەتی [والله خلقکـم وما تعملون]، یا ئایەتی [الله خالق کل شيء].

هـەروەها رای جەبرییەکانیشـمان رەد کـردەوە و وتمـان: بەئاشـکرا جیـاوازی هەیـە لەبـەینی لەرزینی ئینسانێکی لەرزۆک و ئیفلیج یا لەرزلێهاتوو و لەرزینی ئینسانێ بە زۆر بیلەرزێنـنـەوە. بـێ

گومان ئەگەر ئیختیار نەبوایە تەکلیف لە ئادەمزاد نەدەکرا و پێغەمبەران رەوانە نەدەکران و یاسـای ژین و ئایین بێسوود دەبوو.

کەواتە بیروباوەڕی ئەشعەرییەکانی خۆمان بیروبـاوەڕێکی راسـت و رەوانـە و، لەگـەڵ عـەقڵ و نەقڵدا دەگونجێ، چونکە بەئاشکرا دیارە کە ئینسان لەو ئیشانەدا بەشدارە کە دەیانکا، چ لە لایەنی (تصوّر) و (تصدیق)ی نەفسییەوە و، چ لە لایەن هـاتوچـۆی زاهیرییـەوە. لـەو لایشـەوە خـودای پەروەردگاری عالەم بە خالیق دەزانین بۆ ئەو ئاسارانە کە لە ئێمەوە پەیدا دەبـن، چونکـە دروسـتە ئەم ئاسارانە بدەینە پاڵ ئەو خودایەی ئینسانەکەی دروست کردووە و سـیفەت و دافیعیشـی تێـدا دروست کردووە، چونکە توانای تەواوی هەیە بەسەر هەموو مومکینێکدا. ئـەم بیروبـاوەڕە لەگـەڵ ئەوەدا دەگونجێ کە ئینسانەکە بە کەسب و ئیختیار لە کارەکانی‌دا بەشدار بێ و، دروستکـردن و ئیجادیش تەنها بۆ خودای گەورە بێ.

جا لەبەر ئەوەی نەبادا یەکێ رەخنە بگرێ و بڵێ: مادام هەر خودا خالقی کار و ئاساری عیبادە و، ئەمان بێجگە کەسب و مەحەللییەت هیچ تەئسیرێکیان نییە، ئیتـر سـوودی تـەکلیفی خـودای گەورە لە عیباد دەبێ چی بێ؟ مەولەوی فەرمووی:

«فایدەی تەکلیفێ... تاد» واتە: فائیدەی تەکلیفی خودا لە عیبادی ئەوەیە هەرکەس تەکلیفی لێ کرا عیلم پەیدا دەکا بەو کەسە تەکلیفەکە دەکا و بە فیعلە تەکلیفپـێکراوەکـە و بـەو تۆڵـە و پاداشە کە لە گوناهـ و کرداری چاکەوە پەیدا دەبن. جا کە ئینسان ئەمانەی زانی و خێر و شـەڕی تەکلیفپێکراوەکەی تەماشاکرد، واتە لایەنی کردن و نەکردنی کارەکـەی رەچـاو کـرد، سـیفەتی ئیرادە و خواستیش لایەنێ بەسەر لایەنێکی تردا تـەرجیح دەدا و، لـەپاش ئـەو تەرجیحـە توانـای ئینسانە موکەللەفەکە روودەکاتە ئەو لایەنە تەرجیحدراوە، ئەنجا خودای گەورەیش بـۆی دروسـت دەکا.

لەگەڵ ئەوەیشدا کە خودای گەورە خالقی کارەکەیە، هەر ئەو کارە بە شێوەی حەقیقەت نـەک مەجاز دەدرێتە پاڵ کابراکە، بۆ نموونە دەوترێ (صَلّی زیدٌ، وَصَامَ عمروٌ)، بەلام ئەم پاڵدرانە لەسەر بناخەی کەسبە و لەسەر ئەوەیە کە کارەکان بە موکەللەفەکەوە راوەستاون، نەک بناخەی ئەوە کە ئەو دروستی کردوون؛ چونکە دروستکردن تەنها هی خودایە.

نسووسی قـەتعیی لـە قورئـانی کەریمـدا زۆرە لەسـەر نیسـبەتدانی کـردەوە لـە خەڵـک، چ لەشێوەی فیعل و عەمەلدا و، چ لەشێوەی کەسب و ئیکتیسابدا، ئەگەر خەتمێکی قورئـان بکـەیت، واتە لەسەر تا خوار بیخوێنیتەوە، لەگەڵ کەمێک ئاگاداریدا ئەم راستییەت بۆ دەردەکەوێ.

بۆ نموونە: [تِلْکَ أُمَّةٌ قد خَلَتْ لَها ما کَسَبَتْ ولَکُمْ مَا کَسَـبْتُم][٤٢] یـا ئایـەتی [لَهـا مَـا کَسَـبَتْ وَعَلَیْها مَا اکْتَسَبَتْ...][٤٣] یا ئایەتی [کُلُّ امْرِءٍ بمَا کَسَبَ رَهین][٤٤] یا ئایەتی [وَلاَ تکسِبُ کُـلُّ نَفْـسٍ إلاّ عَلَیْها][٤٥] یا ئایەتی [... وَمـا تـدری نَفْـسٌ مَـاذا تَکْسِـبُ غـداً...] [٤٦] و غـەیری ئەمانـەیش لـە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز.

ئیتر هەر شتێ دژی ئەوە بوو کە کار بدرێتە پاڵ ئینسان و ئەوەی دەگەیاند کـە خەڵـک کـار و کردەوەیان نییە و پێوەندییان بە کارەوە نییە بۆ دەفع و پەکخستنی تێکۆشە و داوای یارمەتی لـە خودای گەورە بکە، چونکە هەروەک رێکی عەقڵی سەلیم نییـە ئینسـان دروسـتکـەری ئـەفعالی خۆی بێ و، هەروەک رێکی عەقڵی سەلیم نییە ئینسان بێئیختیار و ناچـار بـێ وەک دار و بـەرد، وەهایش مەعقوول نییە ئینسان پێوەندی کەسب و ئیکتیسابی لەگەڵ کردەوەکانیدا نەبێ، لەگـەڵ بوونی ئەو هەموو ئایەتانە کە کەسب و ئیکتیساب دەدەنە پاڵ ئینسان.

ئـەر دەڵـێی جلـەو بـەم لادا بـادە
لـەدوای تـەعمیمی عـیلم و ئـیرادە
(ألجَبْـرُ لاَزِمٌ قَطعـاً وَ حَقـاً
لاَنّهمـا اِنْ تَعلّقَـا
بوُجُـودِ الفعـل) واجبـە وجـوود؛
جەهل و تەخـەللوف بـۆ مـراد مـەردوود.
(أولاَ فـامتنع)، چـاوی ئیختیـار
لـە دیـنی وجـوب، ئیمتینـاع بێـزار
(یَعْلَـمُ یریـد ربّـی فـی الأزَلْ
اَنّ عَبـدَهُ یتـرکْ أو یفعَـلْ
ذا الفِعـلَ والقَـوْلْ فـی مـا لا یـزال
باِختیـارِهِ؛ رُفِـعَ الإشـکال)

مەڵـــێ لەمــــەدا وا دای دیــــاری
ئیختیـــار کــــردن بـــێ ئیختیـــاری
بـــۆچ؟ بـــوو ئیختیـــار بـــە موتەعەللـــەق
بـــۆ ئـیرادە و عــیلم خـــالیقی بـــەر حـــەق
(إذِ الوجــــــــوبُ بالاختیـــــــــارِ
مُحَقَّـــــقٌ لَــــــهُ فَــــــلا تُمـــــارِ(٤٧))
ئـــەوا مـــەعلووم بـــوو ئـــەفعالی عیبـــاد
نـــەبوو لـــە تـــەرزی حەرەکـــەی جـــەماد
(وَأیْضـــا یُـــــنْقَضْ بأفعـــالِ الحـــق)
قائیل بە وجووب (علی الحـق أحمـق) (٤٨)

جلەو: جڵەوی ئەسپ و ماین. با دە: با بدە، وەریگەڕێنە. (فلا تُمارِ: فلا تجادلْ)

واتە: ئەگەر بـە شـێوەی ئیسـتیدراج بـۆ ئـەوەی رەخنـەم لـێ بگـری پـێم دەڵـێی: جڵـەوی ئەسپەکەت بەلای ئێمەدا وەرچەرخێنە و بڕوانە با عەرزت بکەم: وەکوو تۆ فەرمووت ئـەوەی عەبـد دەیکا لای خودا مەعلوومە، واتە عیلمـی خـودا تەعـەللوقی پێـوە بەسـتووە هـەروەها ئیرادەیشـی کردووە. جا کە مادام عیلم و ئیرادەی خودا هەموو کردەوەی عیباد بگرێتـەوە لازم دێ هـەموویان مەجبوور بن، چونکە ئەگەر عیلم و ئیرادەی خودا پێوەندی بە هەر شتێکەوە ببەسـتن واجبـە ئـەو شتە بێتە جێ؛ واتە ئەگەر نەیێتە جێ لازم دێ عیلمەکەی خودای گەورە ببێتە جـەهل و، ئـەوەی ویستوویەتی نەیێتە دی، گۆڕانی عیلمی خودا بە جەهل و جێبەجێ نەبوونی ویستیشی بەتاڵن.

خۆ ئەگەر عیلم و ئیرادەکەی خودا روویان کردە نـەبوونی کارەکـە ئـەوا دەبـێ نـەبێ و بـوونی مەحاڵە، کەواتە کاری عەبد یا واجب دەبێ وەک باری یەکەم، یا مـەحاڵ و مومتـەنیع دەبـێ وەک باری دووەم، ئەنجام: کارەکانی خەڵک ئیختیاری نەبوون؛ چونکە چاوی ئیختیار بێزارە لە بینـینی واجب و مومتەنیع، ئیختیار لەگەڵ وجووب و ئیمتیناعدا ناگونجێ. من لە وەڵامـی ئـەم رەخنـەی تۆدا دەڵێم: عیلم و ئیرادەی خودای گەورە وەها تەعەللوق نابەستن بە کارەکەوە کە مووجیب بـێ بۆ وجووبی کارەکە یا بۆ ئیمتیناعی، خۆ عیلم و ئیرادەکەی خودا وەها تەعللوقیان نەبەسـتووە کـە بڵێیت: خودا عیلمی بووە دەبێ ئەو فیعلە لەو عەبدەوە روبدا بە خۆی بزانێ یا نـەزانێ، خواسـتی لەسەری ببێ یا نا، بەڵکو عیلمەکەی وەها تەعەللوقی بەستووە کە ئەو ئینسانە فلانە کار لـە فلانـە

کاتدا بە خواستی خۆی دەکا، هەروەها ئیرادەی ئەو کارەی کردووە کە فلان کەس بە خواستی خۆی دەیکا بێئەوەی کەس زۆری لێ بکا، کەوابوو هیچ گیروگرفتێ نەما.

ئەمجار بە شێوەی رەخنەگرتن مەڵێ: وا لە وەڵامەکەتەوە دەرکەوت کە ئیش بە ئیختیارکردن بوو بە بێئیختیاری چونکە وەک وتت عیلم و ئیرادەی خودا تەعەللوقی بەست بە ئیختیاری ئینسانەکەوە و، هەرشتێکیش عیلم و ئیرادەی خودا تەعەللوقی پێوە ببەستێ دەبڕێتەوە، چونکە واجببوونی شتێ لەسەر ئەو ئەساسە کە ئەو کەسە بە ئیختیار شتەکە بکا و، عیلمی خودایش تەعەللوقی پێوە ببەستێ و قابیلی گۆڕان نەبێ ئیختیاری ئینسانەکە دووپات دەکاتەوە، کەواتە لەم باسەدا موجادەلە مەکە و گومانی خرابت نەبێ؛ خودای گەورە لە ئەزەلدا زانیویە کە فلان کەس لە دوارۆژدا بە ئیختیاری خۆی ئەو کارە دەکا نەک زۆری کەس.

وا لەم بەیانەوە دەرکەوت کە کردەوەی بنیادەم لە چەشنی جمەوجووڵی بەرد و دار نییە، چونکە جمەوجووڵی بەرد و دار لەگەڵ هۆش و فام و توانا و خواستدا نییە، بەپێچەوانەی جمەوجووڵ و هەڵسوکەوت چاکە و خراپەی بنیادەم.

لە لایەکی تریشەوە ئەگەر تەعەللوقی عیلمی خودا بە کارێکەوە ببێتە هۆی واجببوونی ئەو کارە، لازم دێ کارەکانی خودای گەورەیش هەموو واجب بن لە سەری، چونکە عیلمەکەی تەعەللوقی بە هەموویانەوە هەیە، واتە عیلمی خودای گەورە لە ئەزەلدا تەعەللوقی بەستووە بە هەر کارێکەوە کە لە پاشەڕۆژدا دەیکا، دیارە کەسیش دانی بەم وجووبەدا نەناوە، هەرکەس کاری خودا بە واجب بزانێ لە سەری، ئەو کەسە ئەحمەقە و ورد نییە.

جا ئەگەر یەکێ رەخنە بگرێ بڵێ کاری عەبد نیسبەتی لێ دەدرێ بە حەقیقەت چونکە عەبد پێوەندی پێیەوە هەیە، وا لەو لایشەوە دەڵێیت ئەو کارە دروستکراوی خودایە، ئەوا لازم هات تاقە کارێ بکەوێتە بەر دوو تەئسیر. من لە وەلامی ئەو رەخنەدا دەڵێم: بەڵێ، کاری عەبد نیسبەت دەدرێتە پاڵ خۆی و پاڵ خودایش، بەلام بناخەی ئەم دوو نیسبەتدانە یەک شت نییە؛ کە کار دەدرێتە پاڵ عەبد لەبەر کەسبەکەیەتی، کە دەدرێتە پاڵ خودای گەورە لەبەر خەلق و ئیجادەکەیەتی کە کاری خودایە، دیارە ئەم دوو نیسبەتە بە گژی یەکدا ناچن.

(تلخیصُ الکلام) لەلای عەقلی ورد
زەروورەت جەبری مەحزی بەتاڵ کرد

بۆچ؟ ئەگەر نەوێ بەسیرەت دەربـەس[٤٩]
فەرقی مورتەعیش دەگەڵ بەطیش هـەس
دیگتـــە ئـــیرادەت چلۆنـــە مـــەربووت
بە تەرەف سوعوود نـەک بـەلای سـوقووت
(هَـــلْ ســـمِعتَ قَـــطْ: أيّهـــا الحجـــرا!
قُـــمْ، لا تَقـــمْ، مـــن أجْهَـــلِ البشـــرْ
فكَيْـــــفَ ظَـــــنٌّ العاقـــــل الحـــــاذِق
بـــــربّ العـــــرش العلـــــيم الخـــــالِق؟)
بـێجیهـەت دەیێـت فورقـان و ئینجیـل؟
(لا وَباعِـــــثِ الرُسْـــــلِ بالّـــــدليل)
بـاز لـەم لایچـەوە ئەدیللـەی نـەقلی
هـەروەکوو حوجـەج قەتعییـەی عەقڵـی
سـەدای دای لـە گـوێی دەروونی ئاگاهـ
(لا خـــــــالِقَ للأشـــــــياء إلاّ الله)
پـەس وا واجـب بـوو عـەدل و ئیقتیسـاد
لــە ئیعتیقـاددا بـۆ ئـەهلی رەشـاد
گوێ نـە لـە ئـەم لا، نـە لـە ئـەولا کـەین
لا ذا، ولا ذا، أمْـــــرٌ بَـــــيْنَ بَـــــيْنْ
شـەرعی ئەقدەسـی (عـالیُ الجنـاب)
بـەو ئـەمرە دەڵـێ کەسـب و ئیکتیسـاب

دەربەس: دەرگا بەسراو، دەرگا داخراو. دیگتە: دیوتە، بینیوتە. دەیێـت: دێـت، بـاز: دووبـارە. لەملایچەوە: لەم لایشەوە. پەس: کەوابوو. کەین: بکەین.

واتە: پوختەی وتار ئەوەیە کە بە سرنجی عـەقڵ و هۆشـی ورد بـە بەداهـەت جـەبری خالسـی ئەهلی جەبر بەتاڵ کرایەوە، ئینسانی هوشیار باوەڕ ناکا بنیادەم وەکوو دار و بەرد بێ، زۆر ئاشکرایە

فەرق لە بەینی لەرزینی ئینسانی لەرزۆک و لەرزینی ئینسانی هێرش‌بەردا هەیە، یەکەم ناچاری‌یە و بە دەستی خۆی نییە و دووەم بە ئیختیاری خۆیەتی.

ئاخۆ هەرگیز تەنانەت لە نەزانترین کەست بیستووە کە بە بەردێ بلێ: هەڵسە یا هەڵمەسە؟ ئیتر چۆن پیاوی ژیر گومانی ئەوە بکا کە خودای عەرشی مەزن، خودای دانا و پەروەردگار رووی خیتاب و تەکلیفی بکاتە یەکێ کە هیچ جۆرە ئارەزوویەکی لە دەستی خۆیدا نەبێ؟ ئایا بێ‌حیکمەت و بێ‌هۆ و بێ‌لایەکی تایبەتی مەعقووڵە خودای گەورە قورئانی گەورە یا ئینجیل رەوانە بکا؟ حاشا وەکەللا. دەی چۆن دەچێتە عەقڵەوە ئەوانەی تەکلیفیان لێ دەکرێ بێ‌ئیختیار و بێ‌ئاگا بن؟ نەء قەسەم بەو خودایە پێغەمبەرانی بە دەلیلەوە رەوانە کردووە هەرگیز خودا داوای کارێ لە یەکێ ناکا کە دەستەڵات و ئیختیاری نەبێ.

لەم لایشەوە دەلیلی کاریگەری نەقلی وەک دەلیلی بەهێزی عەقڵی لە دڵ و گوێی ئینسانی ئاگاداردا دەنگ دەداتەوە و هاوار دەکا کە بێجگە زاتی خودا کەس خالق نییە، بۆیە پێویست بوو ئەهلی روشد و عەقڵ رێگای مامناوەندی بگرن و باوەڕیان وابێ: کە ئینسان نە مەجبوور و بێچارەیە وەکوو دار و بەرد، نە دروست‌کەرە. پێویستە نە بەگوێی جەبرییە بکەن کە دەڵێن ئینسان بێ دەستەڵاتە و، نە بە رێگای موعتەزیلەدا برۆن کە دەڵێن عەبد خالیقە، نە ئەو لارێ بگرین، نە ئەم لارێ.

پێویستە باوەڕ بە شتێ بکەین کە شەرعی شەریف پێی دەڵێ کەسب و ئیکتیساب.

بۆچ بۆ تەعەللوق قودرەت بە مەقدوور
وەجهی ئیختیراع هیچ نییە زەروور
(فی الأزَلْ قدرةُ ربّنا المُطاع)
بەستە بە عالەم بە بێ‌ئیختیراع
(عند الاختراع بنوعٍ آخر
من التعلق) پەنجەی دا لە دەر
تەعەللوقێکیچ با بوێ دیسان
نەوعێ تر لەبۆ قودرەتی ئینسان
هەر نەوعێ هەیە بە شەرعی موختار
موسەمماس بە ئیسم کەسب و ئیختیار

دەزانـــین هەیـــە نـــازانین چییـــە
بـــۆ ماهییـــەت ڕێـــی عیبـــارەت نییـــە
ویجـدان پێـت دەڵـێ هەیـە ئیختیـار
عیبـــارەت دەڵـــێ نـــایزانم هـــاوار
بۆچ عەیبە تەسدیق بە وجوودی شـەی
نـــەزانی بـــەیان حەقیقـــەتی کـــەی؟
بەعدەز[٥٠] دەلائیـل بـۆ بـوون ئـاوردن
هـەروەها دەبێـت بـۆ تـەقریر کـردن:
(فعلُنـــا داخِـــلْ تحـــتَ القُـــدرتینْ
بجهتـــــــینِ مُختَلِفَتـــــــینْ
مَقْـــدُورُ الله مِـــنْ حَیْـــثُ الایجـــاد
مِـنْ جِهَـةِ الكَسْـب مَقْـدورُ العبـاد)

پەنجەی دا لە دەر: دەرکەوت. شەی: شەیء: شت. کەی: بکەی. «بۆچ بۆ تەعـەللووق...تـاد» وەلامە بۆ رەخنەی ئەوانەی دەڵێن چۆن دەبێ عەبد کەسبی ببێ کەچی قودرەتەکەی بە شـێوەی خەلق و ئیجاد پێوەندی بە کەسبکراوەکەوە نەبێ؟ ئەمە وەکوو ئەوەیە بڵێیت: فلان کەس توانایە و توانا نییە، پوختەی ئەم وەلامەیش لەگەڵ هەندێ درێـژدا ئەوەیـە کـە پێوەنـدیی قـودرەت بـە مەقدوورەوە دوو جۆرە:

یەکەم: پێوەندییە بە شێوەی دروسـتکـردن و داهێنـان و لـە نەبوونـەوە هێنانـە بـوون، وەک پێوەندیی توانای خودای گەورە بەو شتانەوە کە دروستیان دەکا لـەکاتی دروسـتکردنیانـدا، لـەم جۆرەدا ئیختیراع و ئیبداعی قادر بۆ مەقدوور پێویستە.

دووەم: پێوەندییە نەک بە شێوەی خەلق و ئیجاد، بەڵکو یا بە شێوەی دیاریکردنیەوە بۆ ئیجاد لە پاشەڕۆژدا، وەک پێوەندیی توانای خودا لە ئەزەلدا بەو مەقدوورانەوە کە دەیەوێ لە کاتی خۆیدا ئیجادیان بکا، کە لێرەدا توانای خودای گەورە پێوەندی بە مەقدوورەکانەوە هەیە بە بێئیخـتیراع و ئیجاد لەکاتی پێوەندییەکەدا، یاخود بە شێوەی ئامـادەکردنی مەقدوورەکـەوە بـۆ ئـەوەی ببێـتە مەخلووقی خودا و ئیجاد و ئیبداع رووی تێبکا و لە هەمان کاتیشدا ببێتە سیفەتێکی بەسـتراو بـە خاوەن تواناکەوە، وەک پێوەندیی توانای عیبـاد بەوشـتانەوە کـە کەسـبیان دەکـەن، دیـارە ئـەم

پێوەندییە بە شێوەی ئیختیراع و ئیبداع نییە، بەڵکو بە شێوەی ئامادەکردنیە بۆ خەلق و ئیجاد لـە لایەن خودای گەورەوە. کەوابێ لە پێوەندیی قودرەتدا وەجهی ئیختیراع و ئیبداع پێویست نییە نە بۆ قودرەتی خودا و نە بۆ قودرەتی بەندەی خودا. ئەوەتە خودای گەورە قودرەتەکـەی لـە ئەزەلـدا بەستراوە بە مەقدوورەکانەوە کەچی لە ئەزەلدا خەلقیان ناکا و لـە (مـالایزال)دا پێوەندییـەکی تـر پەیدا دەبێ بۆ قودرەتی خـودا لەسـەر وەجهـی ئیخـتیراع و ئیبـداع. هـەروەها قابیلـە پێوەنـدیی قودرەتی ئینسانیش بە مەقدووراتەوە بە وەجهی ئیختیراع نەبێ بەڵکو بە وەجهی کەسب بێ.

هەرچۆن بێ ئەم جۆرە پێوەندیی خەلقە پێی دەڵێن کەسـب و، نەسسـەکانی قورئـانی کـەریم باسی بوونی ئەم کەسبە دەفەرموون وەک: [لَها ما كَسَبَتْ وَعَلَيها ما اكتَسَبَتْ] یا [كُـلُّ امْـرِئٍ بِمَـا كَسَبَ رَهين] یا [بلى مَنْ كَسَبَ سَيِّئَةً وأحاطـت بـهِ خطيئتُـهُ... الآيـة][٥١] وە هـی تـریش. بەڵـێ بەئاشکرا دەزانین هەیە بەڵام نازانین حەقیقەتەکەی چییە؟ ویجدان دەڵـێ ئیختیـار هەیـە، بـەڵام عیبارەت هاوار دەکا دەڵێ نازانم چۆن باسی بکەم. هیچ عەیبیش نییە ئینسان بـاوەڕی بـە شـتێ ببێ و نەزانێ بەیانی حەقیقەتەکەی بکا.

لەم بەیانە درێژەوە دەرکەوت کە کـاری ئێمـە مەقدوورێکـە لـەژێر دەسـتەڵاتی دوو قودرەتـدا، قودرەتی خودای گەورە و قودرەتی عەبد، بەڵام بـە دوو جیهـەتی جیـاواز؛ واتـە: لـەژێر قـودرەتی خودای گەورەدایە بە خەلق و ئیجاد و لەژێر قودرەتی عەبددایە بە کەسب و ئیکتیساب (فمن جهة الايجاد و الخلق مَقْدورٌ لِلّه تعالى، ومن جهة الكسب مقدورٌ للعبد).

بۆ فەرقی بەینی خـەلق و ئیکتیسـاب
چەند عیبارەت هەس بۆ (أولو الألباب)
وەکوو ئەمـە کەسـب دەگـەڵ ئالەتـە
مەقـدووری واقیـع لـەجێی قودرەتـە
هـەرچی کـە خەلقـە خـیلافی ئـەوە
بـاقیی لــە کوتــوب بــڕۆ بشــنەوە

واتە: بۆ بەیانی جیاوازیی خەلق و ئیکتیساب چەنـد عبارەتـێ هـەن لـە زانایانـەوە وەرگـیراون؛ یەکەم ئەوەیە کەسب بە ئالەت و ئەسباب دەبێ، بەڵام خەلق تەئسیرێکە پێویسـتی بـە ئەسـباب و ئالەت نییە، بۆ نموونە: خەلق و ئیبداعی خودای گەورە بۆ شتێ بریتییە لە دەرهێنانی ئەو شتە لـە نەبوونەوە بۆ بوون وەک دروستکردنی ئاسمان و زەوی و تۆوی دار و گیا و گـوڵ و خواردەمـەنی،

بەلام کەسب بەکارهێنانی ئالەتە لە ڕێکخستنی هەندێ شتدا، یا ئامادەکردنی شتێ لـە کۆمەڵـە پارچەیەک، بەڵێ ئەم کەسبە پێویستی بە ئەجزا و ئالەت هەیە؛ وەک هەستان، دانیشـتن، لێـدان، کوشتن... تاد، ئەمانە هەموو پێویستیان بە جووڵاندنەوەی دەست و پێ و ئالەتەکانی تر هەیە و بە بێئەوانە ناکرێن.

دووەم کەسـب مەقدوورێکـە وا لـە شـوێنی قودرەتەکـەدا، وەک هەسـتان کـە بریتییـە لـە جووڵاندنەوەی کابرا بۆ ئەندامی خـۆی و گـۆڕینی وەزعـی دانیشـتن بـە هەسـتان، بـەلام خـەلق مەقدوورێکە لە غەیری شوێنی قودرەتەکەدایە، وەک ئەوە کـە خـودای گـەورە هێـز لـە یەکێکـدا دروست دەکا بۆ هەستان و ڕاکردن، دیارە ئەم مەقدوورانە لە زاتی خـودادا نـین، بەڵـکو لـە زاتی زەلامەکاندان کە هەڵدەستن و ڕادەکەن.

سێهەم: ئەوەیە کەسب مەقسوود حاسڵ ناکا، کابرا تەنیا کاسـبە و موحتـاجی ئەوەیـە خـودای خالیق ئەو شتە کە مەقسوودیە بۆی دروست بکا، بەلام خەلق و ئیجاد تەنیا بە خـالیق جـێبـەجێ دەبێ و کەسی ناوێ وەکوو ئەو ئیبداعانە کە خودای گەورە لە نەبوونەوە دەیانکا.

چوارەم: ئەوەیە ئەوەی خەریکی کەسـب دەبـێ پێویسـتە لـە مومکینـات بـێ، بـەلام ئـەوەی خەریکی دروستکردن دەبێ پێویستە (واجبالوجود) بێ.

پێنجەم: خەلق و ئیجاد هەمیشە لەگەڵ حیکمەتدایە و هەڵە لە ئەنجامیدا نییە، بـەلام کەسـب یا هەر بێ حیکمەتە یا حیکمەتەکەی ناقیسە، هەروەها بەهەڵەیشدا دەچێ.

ئیجـــاد و خـــەلقی ئـــەفعالی قـــەبیح
لـــە حەکیمـــەوە مـــەحموودە و مـــەلیح؛
دەزانـــێ بـــۆچی تێرێتـــە وجـــوود
ئەمما کەسبی عەبد مەزموومە و مەردوود؛
بـــۆچ؟ عاقیبـــەتی لـــێ نادیـــارە،
دەگـــەڵ ئەمیچـــە نـــەهیی دووچـــارە،
دەزانــێ: شــاریع فەرمووگیــە: نەیکــەی!
نـــەوا مـــەزمووم بـــێ و عیقابـــێ بخـــۆی
وەهـــا کـــە عیلمـــی هەیـــە بـــە حەســـەن
دەزانـــێ شـــاریع فەرمووگیـــە: بیکـــەن

ئــەو بکــا جــەزای ئەڵــبەت عیقابــە
ئــەم بکــا جــەزای ئەڵــبەت ســەوابە

تێرێتە: دەهێنێتە. دەگەڵ: لەگەڵ. فەرمووگیە: فەرموویە.

واتە: خالیق هەرچی بکا باشە، هەرچەند ئەوکارە لە بەرچاوی ئێمەدا باش نەبێ وەکوو هێـزدان بە ئینسانێکی بەدڕەوشتی بێویجدان، یا یارمەتیدانی کۆمەڵێ کە بیروباوەڕیان باش نەبێ.

چونکە خودای گەورە زانایە و زانینەکەی بێسنوورە، ئەنجام و بەرهەمی کارەکانی لەلا رووناکە، دەزانێ بۆچی ئەو شتە دروست دەکا؛ بەڵام کەسبی عەبد بۆ شتی خراب بە یاسای شەرع مەزمووم و ناپەسەندە، چونکـە ئـەو ئـەنجامی کارەکـانی خـۆی نازانـێ هـەتا بلـێین مومکینـە ئاگـای لـە ئەنجامێکی خێری ئەو ئیشە بووبێ. لەگەڵ ئەمەیشدا لە لایەنی خوداوە نەهی رووی‌کردووەتە ئـەو کەسە ئـەو شـتە خراپـە دەکـا و، لـە کردنەکەیـدا نافـەرمانیی خـودا دێتـەجێ و، دەزانـێ خـودا فەرموویەتی: ئەو ئیشە نەکەی نەبادا تووشی تۆڵەی نالەبار و گیرۆدەی ئازار ببیت.

وەکوو چۆن دەزانێ فلانە کار باشە و خودا فەرموویەتی بیکەن، جا لەم کاتەدا کە کـابرا ئـەمر و نەهیی خودای بیست ئەگەر خراپە بکا پاداشی تۆڵە و ئازاری پاشەڕۆژە و، ئەگەر چاکە بکا پاداشـی خۆشی و ئاسایشی نەبڕاوەیە.

ئەرچی ئەوەندە زەرووری بـێ و بـەس
زیـاتر تـەقریر تێیـدا بی کـەم دەس
بەڵـێ[٥٢] تـەحقیقی عولـەمای ثوقـات
چاک واتە قەڵەم بۆت تـەحریر بکـات
(تَــدْریجاً إلـــی الَّـــذی أعْتَقِـــدْ
بِـــهِ عَلَیْـــهِ أرْضـــی أعْتَمِـــدْ)
گـوێ بـدێر مەکـە و هـیچ وەتەقـەوە
هـەرتا سـەردەنێی تـەق وە حەقـەوە
(أشْـــعَرَتْ إلـــی الأشـــعَری الوحیـــد
نفســـی، مـــا تریـــد نَحْـــوَ ماتریـــد)
وابەســـتە دەبـــێ ئـــیرادەی بـــاری
بـــە بـــەعزێ ئـــەفعال بـــێ‌ئیختیـــاری

بەنـــدە ئـــیرادەی بـــوێ یـــا نـــەوێ
تێرێتیـــە وجـــوود، یـــەکی ناکـــەوێ
ئەو فیعلە لاوە فڕەیدە ئـەو کـەنار[٥٣]
مەیکـە بـە دەلیـل نـەفیی ئیختیـار
بەڵـێ بـەعزێ فیعـل بەنـدە دیـارە
وجـــوودی مـــەربووت بـــە ئیختیـــارە
یانیهای (فی العبد) خـالیقی مـەعبوود
ئـــیرادەی قـــودرەت تێرێتـــە وجـــوود
ئـەو ئیرادەیـە کـە پێـی هاتـە بـەین
دەدا تـەرجیحی یـەک لـە تەرەفـەین
(فَتَعَلَّـــــقَ القُـــــدْرَةِ عَلیـــــهْ
تَفَـــرَّعْ کَصَـــرْفِ الـــدَّوَاعی الیـــهْ)
دەکـا خـەلقی فیعـل لـەدوای ئەمانـە
(تعقیبـــاً) زاتی یـــەکتای یەگانـــە
ئەمانـــە هـــەموو ئەســـبابی عـــادین
عـەلاماتی خـەلق حـەزرەتی هـادین
هیچی موئەسسـیر(فی الوجـود) نییـە
ســـیوای قـــودرەتی (ربّ البریّـــة)
هەر ئەو بە تـاقی بـزان بـە موسـبیت،
موحریق و قاتیع، موشبیع و، مونبیـت
بورهان، ئەگەر ئار، تێـغ، نـان و بـاران
هـەموو بـە ئەسـباب عادییـە بـزان
(أغْنـــی لـــدَیْها الخـــالِقُ القـــدیر
یخلـــق لابِهـــا فـــافهم التحریـــر)

گۆی بدێر: گویێ بگرە. مەکەو هیچ وە تەقەوە= هیچ مەکەوە بە تەقـەوە: واتـە: شـەرم مەکـە، خۆت بە ناچار و تیێکەوتوو مەزانە. تەق: لە پڕ. حەق: راسـتی یـا مـردن. نحـو مـا تریـد: بـەلای ئەوبوومەنسووری ماتوریدیدا. تێرێتیە: دەیهێنێتە. تێرێتە: دەهێنێتە. پەکی ناکـەوێ: دانامێنـێ. فرەی دەو کەنار: بیخەرە لاوە، گۆیی مەدەرێ. پێی هاتـە بـەین: پێـی هاتـە نـاو، هاتـە مەیـدان، یەکتا: تەنیا. یەگانە: تەنیا. بە تاقی: بە تەحقیق، یا بە تاقی تەنیا. ئار: ئاگر.

واتە: ئەگەرچی هەر ئەوەندەی کە باسمان کرد پێویست بێ و، تەقریری زیاتر تۆ تیا کـەمدەس و بێدەسەلات بێ و زۆر پێویست نەبێ، بـەلام تـەحقیقاتی زانایـانی باوەڕپـێکـراو لـەم بابەتـەوە پێویستە بنووسرێ، هەتا وردە‌ـوردە دەگەیتە ئەوەی کە خۆم باوەڕم پێی هەیە و لێی دلـنیام، جـا باش گوێ لەو تەحقیقە بگرە و لە زانین و سوودوەرگرتن شەرم مەکە هـەتا دەگەیتـە راسـتی، یـا هەتا ئەو رۆژەی دەمری.

من لەم مەسەلەدا مـەیلم بـەلای مەزهـەبی (ابوالحسـن)ی ئەشـعەریدایە، نـەک رێبـازی (أبـو منصور)ی ماتوریدی.

پوختەی فەرموودەی ئەشعەری ئەوەیە کە خودای گـەورە کـردەوە نائیختیارییـەکانی ئینسـان دروست دەکا بێئەوەی ئینسانەکە دەسـتی تێـدابێ، وەک سـاغی و ناسـاغی و بـەرزی و نزمـی و زیرەکی و کەودەنی... تاد؛ بەلام کـردەوە ئیختیارییـەکانی وەک هەسـتان، رۆیشـتن، خوێنـدن، بازرگانی، عیبادەت، گوناهـ... تاد، ئەمانە بەم جۆرە دێنە وجوودەوە:

خودای گەورە هێزی زانینی بە ئینسانەکە داوە کە لەپێش کردنیا بیری لـێبکاتـەوە و سـرنجی تێبگرێ، هێزی خواستیشی پێ بەخشیوە بەو خواسە کام لای پێ باش بێ بەسەر ئەولاکەی تـردا تەرجیحی دەدا، هێزی توانایشی داوەتێ کە بەپێی تەرجیحی خواستەکە رووبکاتـە ئـەوکارەی کـە ویستوویەتی. ئەنجا لەوکاتەدا کە توانای ئینسانەکە دەیەوێ بۆی خـەلق دەکـا. ئـەم ئینسـانە بـە هۆی بەکارهێنانی خواست و تواناکەیەوە، کە ئەسبابی عادەتین بۆ دروستکردنی کارەکە لە لایەن خوداوە، دەبێتە خاوەن کەسب و خودای گـەورەیش (بالـذات) خالیقـە. ئیتـر هـەرچی لەلایـەنی ئینسانەکەوە ببێ وەک زانین و، خواسـت و توانـا و، بـەکارهێنانی هۆیـەکان بـۆ کارەکـە، هـەموو ئەسبابی عادەتین بۆ دروستکردنی کارەکە لەلایەن خودای گەورەوە.

لەڕاستیدا بێجگە قودرەت و توانای خودای پەروەردگار هیچ شتێ کار لە بووندا ناکـا و، هـەموو بوونێ ئەنجامی توانای ئەوە، ئـەوە ئیسـباتی زانـینی نەتیجـە دەکـات نـەک دەلیـل، ئـەوە شـت

دەسووتێنێ نەک ئاگر، ئەوە شت دەبڕێ و لەتلەتی دەکا نەک تێغ، ئـەوە گیـانلەبـەر تێـر دەکـا نەک نان و خواردەمەنی تر، ئەوە شت دەڕوێنێ نەک باران. ئەمانە هەموو هۆی عادەتین و لەگـەڵ بوونیاندا خودا کارەکە دروست دەکا، وەک مەولەوی خۆی لەمەوپاش دەڵێ:

«یُمکِن ئار بوێ و ئیحراق هەر نەوێ
یا ئیحراق وە بـێ ئـاگر هەڵـکەوێ»

ئەنجا ئینسان کە کاسبە ئەگەر کەسبی شتێکی کرد ئەمر بە کردنی کراوە ئەوا پاداشـی چـاکی دەدرێتەوە، خۆ ئەگەر کەسبی کارێکی کرد کە نەهیی لێ کراوە ئەوا تۆڵەی لێ دەسەنرێتەوە.

(إنْ قُلْـــتَ ذاکَ التـــرجیح المزبـــور
المتفـــــرّع علیـــــه المـــــذکور)
ئـەر خـەلقی حەقّـە (فـالجبرُ بـاقٍ) [٥٤]
وەر فیعلـــی عەبـــدە خالقـــە تـــاقی
(نَقُـــولُ: عِنْـــدَ القـــادَةِ السّـــادَةْ
ذا مِـــــنْ مُقتضـــــی ذات الإرادة)
بەیان کریاگـە لـە جێـی خـۆی سـەریح
(تِلْـــکَ صِـــفَةٌ شـــأنها التّـــرجیح)
پـەس ئەگـەر بلـێی بینـا لـەم سـوورە
مـــورەججیح دەوێ ئـــەو (بالضـــرورة)
دڵ ئارەزوومەنـــد بـــۆ تـــەبیینیـــە
فائیـدە لـە ئـەم تەکلیفـدا چییـە؟[٥٥]
دەڵێن: داعی یە، هـەروەک بـوو بـەیان،
بـــۆ تەعـــەللوقی ئـــیرادەی ئینســـان
بـــۆچ؟ قـــودرەت تـــابیع ئـــیرادە دەوێ
ئـــیرادە ئەوشـــۆن عیلمـــت دەکـــەوێ
عیلمـــیچ تـــابیعی مەعلوومـــە ســـەحیح
مـــەعلوومیچ حەســـەن دەوێ یـــا قـــەبیح

پەس سا موکەللەف، مەسـەل، ئـەر زانی
تـەکلیف تەشـریفی فـەرموو ئـەرزانی
خیتاب رووی تێکرد کە موکەللەف تۆی
ئـەو فیعلـە چاکـە مـەیلت بـوێ بـۆی
دەوێ بـە داعـی، بـۆت بکـەم تـەوزیح
بـۆ تەعـەللوقی ئـیرادە و تـەرجیح
بەنـدە لەوێـدا چـاک سـاعی دەکـا
سـەرفی قـودرەت و دەواعـی دەکـا
(فَيَخْلُـقُ اللهُ رَبُّنَـا المالِـك
عـادةً ذا الفِعـلِ عُقَيْـبَ ذلِـكْ
لاَ بـالوجوبِ علـى التحقُّـقْ
وَباعتبـار ذاكَ التَعَلُّـقْ)
ئـەو فیعلـە دەوێ بـە تاعـەت حیسـاب
بـە عەلامـەت و نیشـانەی سـەواب

ئەر: ئەگەر. وەر: وە ئەگەر. تاقی: تەحقیق. کریاگە: کراوە. بوو بـەیان: بـەیان بـوو. ئەوشـۆن: لەدوای، تابیع، پەس: کەواتە. تەشریفی فەرموو ئەرزانی: تەشریف ئەرزانی فەرموو: تەشریفی هێنا، هات. لەئەسلا تەعبیرێکی فارسی‌یە. بوێ: ببێ. ساعی دەکا: دەکاتە ساعی. دەوێ: دەبێ.

واتە: ئەگەر بە شێوەی رەخنە بڵێیت: ئەو تەرجیحدانی یـەکێ لـە دوو لایـە کـە لـە ئـیرادەی ئینسانەکەوە پەیدا دەبێ و قودرەتەکەیش بەهۆی ئەوەوە پێوەنـدی بەولایـەوە دەبەسـتێ، ئەگـەر خودا دروستی کردووە نەک ئینسانەکە ئەوا گەڕاینەوە بۆ جەبرەکـە، واتـە ئینسـانەکە مـەجبوور و ناچار دەبێ. خۆ ئەگەر لە عەبدەوەیە ئەوا بوو بە خالیق؟

وەڵامی ئەم رەخنە ئەوەیە زانایانی ئوسوولی دیـن فەرموویانـە ئـەو تـەرجیحدانـە لـە سـیفەتی ئیرادەکە خۆیەوە پەیدا دەبێ، چونکە ئیشی ئیرادە تەرجیحە. جا ئەگەر بڵێیت کـە ئیشـی ئـیرادە تەرجیح بێ و بەقەتعی لایەک بەسەر لایەکی تردا تەرجیح بدا ئیتر فائیدەی تەکلیف چییـە؟ دڵـم حەز لە روونکردنەوەی ئەم شتە دەکا.

لە وەڵامدا دەوترێ تەکلیف‌کردن لەلایەن خوداوە و زانینی ئینسانی موکەللەف بـە تەکلیفەکـە دەبنە داعی و هۆ بۆ تەرجیحی لایەک بەسەر لایەکی تردا و ئەم تەرجیحە دەبێتە داعـی و هـۆ بـۆ پێوەندیی قودرەت و بەکارهێنانی ئەسباب بەرەو مەبەست؛ چونکە توانا تابیعی خواستە و خواسـت تابیعی زانینە و زانینیش دوای زانراوەکە دەکەوێ، واتە: جوانی و ناشیرینی زانراوەکە دەردەخـات، لەسەر ئەم بناخەیە کە ئینسانە موکەللەفەکە بە تەکلیفی شەرعی زانی و خیتـاب رووی‌تـێ‌کـرد و پێی وت: تۆ موکەللەفی و ئەو کارە باشە چاک وایە ئیرادەی بکەی، ئەم وەزعە دەبێتە داعی و هـۆ بۆ پێوەندیی ئـیرادەی موکەللەفەکـە و دەیجووڵـێنێ بـۆ بـەکارهێنانی قـودرەت و دەواعییـەکان، بەشوێنی ئەویشدا خودای گەورەیش کارەکەی بۆ دروست دەکا، بە شێوەی جـاری‌بـوونی عـادەت بەم جۆرە تەسەڕروف و ئیجادە، نەک بە شێوەی لەسەر واجب بوون.

جا ئەگەر کارەکە جوان بوو دەبێتە گوێڕایەڵی، خـۆ ئەگـەر دژی ئـەوکارەی ویسـت، خـودای گەورە ئەویشی بۆ دروست دەکا و دەبێتە گوناهـ.

دیارە گوێڕایەڵی دەبێتە نیشانەی پاداشی چاک و گوناهیش دەبێتە نیشانەی سزا و تۆڵە.

(وَالحاصـــل بخَلْـــقِ ربّنـــا العـــالی
یَظهـــرُ فـــی العَبْـــد عِلـــمٌ إجمـــالی
بأفْعالِـــــــــهِ الاختیارِیَّـــــــــةْ
قبـــلَ أن کانـــت منـــهُ جاریـــة
وَعِلـــمٌ بِحُسْـــن وَقُـــبْحِ الأفْعَـــالْ
وَمَـــا ترتَّـــبْ منْهَـــا فـــی المـــآل)
مەئخووذ لە لیسان شـاریع (ذوالحلـم)
(وَ إرادةٌ تَتَبّـــــــعْ ذا العِلـــــــم)
لـــەبۆ تـــەرجیحی بـــەعزێ ئامـــادە
(ثُـــمَّ قـــدرةٌ تِلـــوَ الارادة)
ذَات التَعَلُّـــقْ حَیْـــثُ إنّهـــا
لَـــو اســـتَقَلّتْ لأوْجَـــدَها)
پەس دەگـەڵ عیلمـێ کـەوا رابگـرد
ئەگـەر ئـیرادەی قـەبیحێکی کـرد،

با موقتەزای زات هیچ نەوێ حیساب،
موستەحیق دەوێ بـۆ زەم و عیقـاب
(بِإعتِبـــــــــارِ المَحلّيـــــــــةِ
وَمِـــــــنْ جِهَـــــــةِ المظهريّـــــــةِ
عَلـــى طَريـــقِ جَرْيـــانِ العـــاده)
هـەرچلۆن وتمـان لـە وجـووب لادە
وما تَرتّبْ: وما تَتَرتّب. رابگرد: رابوورد

مەولەوی، وەک لەمەوپێش فـەرمووی، مەبەسـتی دەرخسـتنی ڕێگـەی ڕاسـت و بیروبـاوەڕی ئەهلی سوننەتە، کەوابوو ئەگەر بابەتێکی لە دوو سێ شوێندا وتەوە هـەقی ئـەوەمان نییـە گلـەیی لێبکەین و ڕەخنەی لێ بگرین، ئەگینا ئەم باسە تائێستە بە چەند شێوەی کورت و درێـژ دووبـارە کراوەتەوە. پوختەی فەرمایشی ئەم جارەی ئەمەیە:

خـودای گـەورە ئینسـانەکە وەهـا دروسـت دەکـا کـە بـە شـێوەیەکی ئیجمـالی بـە کـردەوە ئیختیارییەکانی خۆی دەزانـێ پـێش ڕوودانیـان. هـەروەها لەبـەر ئـەوەی تـەکلیف لای خـوداوە ڕووی‌تێکردووە و ئەمری چاکەی پێ‌کراوە و نەهیی خراپەی لـێ‌کـراوە، لـە ڕێگـای شـەرعەوە بـە جوانی و ناشیرینی کردەوەکانی دەزانێ و، ئەنجامی هـەردوولای لا ڕوونـە، واتـە: پاداشـی چاکـە بەرامبەر کرداری چاک و سزا و تۆڵە بەرامبەر کرداری خراپ لە ڕۆژی قیامەتدا.

هەروەها خودای گەورە ئەو ئینسانەی وەها دروست کردووە کە پاش زانینەکە خواسـتی ئامـادە ببێ بۆ تەرجیحی لایێ بەسەر لایێکی تردا. دوابەدوای خواستەکەیش ڕاستەوخۆ توانای لەسـەرپێ و ئامادەیە و پێوەندی بە مەبەستەکەوە دەبەستێ. بەجۆرێ ئەگەر خۆی سەربەخۆ بوایـە یەکسـەر دەیکرد.

ئەنجا پاش ئەوەی کە بە جوانی و ناشـیرینی کردەوەکـانی زانی ئەگـەر کـردەوەی ناشـیرینی ویست و کردی ئەوا شایانی زەم و تۆڵە و سزایە، نەک لەبەر ئـەوە کـە خراپـە لـە موقتـەزای زاتی ئینسانە چونکە ئیمکان سەرچاوەی کەم‌وکووڕی‌یە، بەڵکو لەبەر ئەوە کە تەکلیف ڕووی تێکـردووە و ڕێگای چاکە و خراپەی بۆ ڕوون کراوەتەوە و، بە ئیختیاری خـۆی خواسـت و توانـای بـە لایەنـە خراپەکەوە بەستووە و، بووەتە مەحەل و مەزهەر بۆ زانین و خواست و توانـا. ئـەو شـتانەی هـۆی عادەتین بۆ دروست‌کردنی کارەکە لە لایەن خودای گەورەوە لەوەوە دەرچوون.

ئەوەیشت لەبیر نەچێ کە خودای گەورە عادەتی وەها جاری کردووە لەگەڵ بوونی ئەسبابدا ئەو کارە دروست بکا، نەکەی بڵێی ئەو دروستکردنە لەسەر خودا واجبە، خودا (واجب‌الوجود)، هیچی لەسەر واجب نییە و لە هەموو کارێکدا موختارە.

دیارە دووبارە کردنەوەیە کە بڵێین: ئەگەر ئینسانەکە لایەنە چاکەکەی ویست و کردی شایانی پاداشی چاک و رەزای خودایە.

ئـەرچی لـەناو قـەوم بووگـە بـە قوولـە
مـەفهوومی زوهـوور غـەیری حولوولـە
بەحسی[٥٦] قیـام و ئیتتیسـاف دەکـەین
تـا ئیسـنادی فیعـل بـە بەنـدە بـدەین
مـەحیللی‌یـە، بێـژ، یـا مەزهـەری‌یـە
بۆ ئەدای مەتلەب هیچ فـەرقی نییـە[٥٧]

بووگە: بووە. قوولە: هەرا. بێژ: بڵێ.

واتە: هەرچەند لەناو خەڵقا بووە بە قرەقڕ و قسەوباس و دەڵێن لەسەر ئەساسی قسەی پێشوو ئینسان موستەحەقی سزا نابێ؛ ئەو هەر ئەوەندەیە مەزهەرە بۆ کردارەکە و لێیەوە دەردەکەوێ، ئیتر مەحەللی نییە و ئەو خەلقی نەکردووە؟ ئێمە گوێ نادەینە ئەم قسە و بڕیاری ئەوەمان داوە کە ئەو شەخسە موتتەسیفە بەو کارەوە و کارەکە بەوەوە راوستاوە و ئیسنادی کارەکە ئەلای ئەو دەدرێ، ئیتر تۆ بڵێیت ئینسان مەزهەرە یا مەحەللە، بۆ مەبەستەکەی ئێمە هیچ ناگۆڕێ و، شایانیی کابرا بۆ تۆڵە و سزا ئیسبات بوو.

لە خەلقی ئـەفعال وایـە لـێ مـەفام
(قَامــتِ الافعــال بــرَبّ الأنــام)
ئاکیــل (مَــن قَــامَ بِــهِ الأکــلُ، لا
مَــنْ خَلَــقَ الأکــلَ، جــلّ وَعَــلاَ
موشتەق گشت وانە ئەر کەسێ زانی
کــافر و فاســق شــاریب و زانی
(فاســنادُ الکســب علــی التحقیــق
مِــنْ تــی الجهَــةٌ للعَبْــدِ حقیقــی)

ئایـــەتی (لهـــا مـــا کسَـــبَتْ) راس
(و علیهـــا مـــا اکتســـبت) هـــەر واس

وایە لێ مەفام: وەهای لێ تێمەگە. هەر واس: هەر وەهایە. مەولەوی بەم شیعرانە وەڵامی ئـەو ڕەخنەیە دەداتەوە کە دەڵێ: ـ مادام خودای گەورە کردەوەکـانی عەبـدی خـۆی دروسـت دەکـا پێویستە، بۆ نموونە، خودا ئاکیل، شاریب، عامیل، کاتیب، واتە بخۆر و کارکەر و بنووس و شتی تـر بێ، لەو سیفەتانەی کە ئینسانی ژیر بە ناڕەوای دەزانێ بیانداتە پاڵ خودا.

پوختەی وەڵامی ڕەخنەکەیش ئەوەیە: لەمەوە کە خودا خالیقی کردەوەی بەندەی خۆیـەتی وا تێمەگە کە ئەوکارانە بە زاتی خوداوە ڕاوەستاون؛ هەتا بەخودا بڵێین، والعیاذ بالله، (اکل، شـارب.. تاد) چونکە ئاکیل و شارب بەو کەسە دەڵێن خواردن و خواردنەوەکەی پێوە ڕاوەستاوە نـەک ئـەو کەســە کــە کــاری خواردنەکــە دروســت دەکــا. دیــارە هەرکــەس مــەعنای کەلیمــە عەرەبییــە موشتەقەکان بزانــێ لــەم ڕاسـتییە دەگــا، بــۆ نموونــە (کــافر) بــەو کەســە دەڵــێن کــە کوفرەکــە سیفەتیەتی، (فاسق) بەوکەسە دەڵێن فیسقەکە سیفەتیەتی، نەک بەوکەسە کە کـوفر و فیسـقەکە دروسـت دەکـا. نیسـبەت دانی کارەکـانیش لـەو کەسـانە کـە پێیانـەوە ڕاوەسـتاون لـە لایـەنی کەسبەکەوەیە. ئەم نیسبەت و ئیسنادەیش بۆ لای عەبد حەقیقەتە و مەجاز نییە.

لەسەر ئەم بناخەیە ئایەتی پیرۆزی [لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَـبَتْ](٥٨) ڕاسـت و بێگـەردە و زمان و عورفی ئەو خەڵکەی بەو زمانە قسە دەکەن گونجاوە.

عەدالـــەتێکی پـــاکی بـــێ ڕەیبـــە
(جَـــلَّ جَلاَلُـــهُ) هـــەمووی بـــێ عەیبـــە
ئەر ئیقتیزای زات ڕوتبەی نەکرد پەسـت،
بـــە حەســـەنەوە تەعـــەللوقی بەســـت
موســتەحیق مــەدح و ســەوابە بــێ مــەین
(بِجَـــری العـــادة بالاعتبـــارین) (٥٩)
بەهـ بەهـ لـەم فەزلـە، لـەم مەرحەمەتـە
ئـەدای ئـەم شـوکرە یـەکجار زەحمەتـە
لاوە گفـتوگـۆی عـەوامی شـوهرەت(٦٠)
مـــەدار زانینـــە و ئـــیرادە و قـــودرەت

ئایــا نــایزانی ئــەر بــەدێ بکــرێ،
نــەیزانی بــەدە، حــەق لێــی دەبگــرێ؟
موســتەحیق نییــەی بــۆ زەم و ئــازار(٦١)
(فَـــنِعْم المَـــوْلی وَنِعْـــمَ الغفّـــارْ)
ئــەر قەســدی بــەدی وەدڵــدا بگــرد
پێت زانی و عەزمت هەر موسەممەم کـرد
ئەگــەرچی خــەلقی فیعلەکــەیچ نــەوێ
بــۆ موئاخــــەزە ئیســـتیحقاق دەوێ
تـۆ عــەزمت جەزمــە و عــەدلت موقابیــل
(لَــیْسَ بِظَـــلاّم حَبَّـــذا العـــادل)

لاوە: لابە. نەیزانی بەدە: خاوەنی کارە بەدەکە نەیزانی کارەکەی خراپـە. لێـی دەبگـرێ: لێـی دەبوورێ، عەفوی دەکا. بگرد: تێپەڕی.

واتە ماشەڵلا لە عەدالەتی خودا چوند بێشوبهەیە، کە هەرگیز بە بێئەوەی عەبد خۆی هـۆ بـێ ئازاری نادا و هەرگیز پاداشی خێر و شەڕ ون ناکا. ئەگەر زاتی ئینسانەکە، کـە مـومکینی خاسـە و جێگای عەیب و کەموکووڕیـیە و ئیقتیزای خراپە دەکـا، لـە ئیقتیـزای خراپـە لایدا و خواسـت و توانای پێوەندی بە کردەوەی چاکەوە بەسـت، ئـەوا ئـەو ئینسـانە موسـتەحەقی مـەدح و سـەنا و سەوابی پاشەڕۆژ دەبێ.

عادەتی خودای گـەورەیش وا دامـەزراوە کـە پـاش پێوەنـدیی خواسـت و توانـای ئینسـان بـە کردارەکەوە بۆی دروست دەکا، هەروەها عادەتی وا دامـەزراوە کـە بەرامبـەر بـە کـرداری چـاک پاداشی چاک و بەرامبەر بە کرداری خراب تۆڵە و سزا بدا.

بەهـ بەهـ لەم فەزڵ و مەرحەمەتە، خودا خۆی خالقی چاکەکەیە و ئینسـان بێجگـە کەسـبەکە دەستێکی تێدا نییە، کەچی بەرامبەری پاداشی چـاکیش دەداتـەوە، کـێ دەتوانـێ سوپاسـی ئـەم نیعمەتە گەورەیە بکا؟

گوێمەدەرە گفتوگۆی (عوام الناس) و شۆرەتی ڕەخنەی ڕەخنەگر کە وتوویانە:

چۆن ئینسان تەنها بە مەحەللییەتی ئیرادە و قودرەت موستەحەقی پاداشی چاک و تۆڵە و سـزا دەبێت؟ دڵنیا بە کە زانینی ئینسان بە موکەللەفیی خۆی و خواستی بـۆ یـەکێ لـە دوو لایەکـە و پێوەندی توانای بە مەبەستەکەوە بناخەی شایانیی ئینسانە بۆ پاداشی چاک و سزا و تۆڵە.

ئایا نازانی ئەگەر ئینسان خراپەیێ بکا و نەزانێ کە کردەوەکـەی خراپـە، خـودای گـەورە لێـی دەبووری و تۆڵەی لێ ناسێنێ و بە موستەحەقی سزای دانانێ؟ یا ئەگەر قەسدی دڵ و عەزمت بـە تەواوی خستە سەر کردنی کارێکی خراپ، ئەگەرچی نەیشیکەی تەنها لەسەر عەزمە ئێجگارییەکە موستەحەقی تۆڵە و سزای و عەدالەتی خودا بۆتی دیاری دەکا.

دەڵـێی: ئـەو سـیفەت ئـیرادە وتمـان
(شـأنها التـرجیح) حادیسـە بـزان
ئـەر بـە ئـیرادەی بەنـدە مـەوجوودە
تەسەلسـول دەوێ ئـەوە مـەردوودە
وەر بـە ئـیرادەی حـەق (تعـالی)یـە
بەنـدە مـەجبوورە، دەی تەقالایـە
شـیققی سـانیمان دەڵـێم موختـارە
ئـیرادەی مـەخلووق بـاریی جـەبارە
بەنـدە لەوێـدا قەسـدی مـەهجوورە
(فـی نفـس تلـکَ الصّـفَة مَجْبُـورة)
(وَهُـوَ مَعْلـومٌ بـلا قیـل و قَـالْ
لاَ یَسْـتَلْزِمُ الجبـرَ فـی الأفعـال)
کـەوا سـادیرن لـەو ئـادەمزادە
(بَتوَسُّـطِ تلـک الارادة
(کمـا فـی أفعـال جنـاب البـاری)
بـۆچ ئـەو ئەفعالـە سـادیرە و جـاری
بـە تەوەسسـوتی ئـیرادەی موسـنەد
(إلـی ذاتِـهِ القـدیم الأبَـدْ)

(بوَجْـــــدِ الایجـــــاب مَـــــعَ أنّـــــهُ
مختـــــــارٌ فیهـــــــا فاعْلَمَنّـــــــهُ)
مُسْـــنَدْ الـــی الـــذاتِ بوَجْـــدِ الایجـــاب،
وەکـــوو ئـــیرادەی خـــالیقی وەهھـــاب،
دەگـــەڵ موســـتەنید (الـــی غیـــر الـــذات)،
وەک ئیرادەی تۆ، کێ فـەرقی دەکـات؟[٦٢]
بـە بـێئیختیـار هـەردوو هـەردوو هـەس
حـــودووس و قیـــدەم بەینیانـــە و بـــەس
لـــــەو ســـــیفەتەدا بـــــێئیختیـــــارن
لـــــە ئەفعالـــــەدا هـــــەردوو موختـــــارن
بەڵـێ بـۆ هـەر یـەک وەسـفێ موناسـیب
موختـــاری خـــالیق، موختـــاری کاســـیب

تەقالایە: کۆششێ. دەی تەقالایە: دەی کۆششێ بکە بـۆ وەڵامـی رەخنەکـەم. بـەبێ ئیختیـار هەردوو: بەبێ ئیختیاری خودا و بەندە. هەردووی دووەم: دوو ئیرادە واتە ئیرادەی قەدیمی خـودا و ئیرادەی حادیسی بەندە. هەردووی سێهەم: خودا و بەندە.

واتە: ئەگەر بەشێوەی رەخنەگرتن دەڵێن: سیفەتی ئیرادە لە ئینساندا، کە ئیشـی بریتییـە لـە تەرجیحی یەکێ لە دوو لا، شتێکی حادیسە و نەبوونی لێ پێش کەوتووە، جا ئەم ئیرادەیـە ئەگـەر دروستکراوی ئینسانەکەیە و ئیرادەیەکی پێشتر تەرجیح دراوە ئەوا دەچێتـە سـەر ئـەو ئـیرادەی ترە، کە ئەویش لە ئیرادەیێکی ترەوە بووە... بێ برانەوە! ئەمەیش دەبێتە تەسەلسول کـە مـەحاڵ و بەتاڵە. خۆ ئەگەر ئەو ئیرادەیە بە ئیرادەی خودای گەورە پەیدا بووە، ئەوا ئینسانەکە لەو ئیرادەدا ناچار بوو، واتە وا ئێوە دانتان نا بە جەبردا کە لاتـان پـووچ و بـەتاڵ بـوو. ئێمـە لـە وەڵامـی ئـەم رەخنەتدا دەڵێین:

لقی دووەم پەسەند دەکەین و دەڵێین بەڵێ ئەو ئیرادەی ئینسانە مەخلووقی خودای گەورەیـە و، بەندە دەستی لە دروستکردنی ئەو سیفەتەدا نییە و تیایا مەجبوورە، بەڵام مەجبوورییـەت لـە سیفەتی ئیرادەدا نابێتە هـۆی مەجبوورییـەت لـەو کردەوانـەدا کـە لـە ئینسـانەکەوە روودەدەن، هەروەکوو کارەکانی خودای گەورە کـە بـەهۆی سـیفەتە ئیرادەکەیـەوە لـێیـەوە روودەدەن ئـەو

ئیرادەیە کە بە ئیجاب سیفەتی قەدیمی زاتییەتی [لەسەر ئەو قسەی کە دەڵێت: ئیجاب لە کەمالدا کەماله] کەچی خودای گەورە لە کردەوەکانیدا موختارە.

لەم لێکدانەوەیە دەردەکەوێ: ئەو ئیرادەی بە شێوەی ئیجاب نیسبەت دەدرێتە لای زاتی خودای گەورە، وەک ئەو ئیرادەیە وایە کە بە شێوەی ئیجاب نیسبەت دەدرێتە لای ئینسان؛ هەردووکیان ـ خودا و بەندەـ ئەم دوو ئیرادەیەیان هەیە، واتە: خودای گەورە بە واجبی سیفەتی ئیرادەی قەدیمی ئەزەلی هەیە، بەندەیش بە واجبی ئیرادەی حادیس و تازە دروستبووی هەیە. دیارە جەوهەری جیاوازیی ئەم دوو ئیرادەیە قیدەم و حودوسەکەیە. هەروەها خودا و بەندە هەردووکیان لە خاوەنیەتیی ئەم ئیرادەدا ناموختارن، بەڵام لە کردەوەکانیاندا موختارن. خودا نیسبەت بە کارەکانی خۆی خالیقە و بەندە نیسبەت بە کارەکانی خۆی کاسب.

خودای گەورە بێقەیدوشەرت خالیق و موختارە و بەندەیش بێقەیدوشەرت کاسبە و موختار.

وایان کردگە عولەمای ئەبرار
لەگرەدا بەیان سیڕڕی ئیختیار
حەق عەتای فەرموو بەبێ گفت‌وگۆ
ئیرادەیێکی موتلەقە بە تۆ
(إنّ عَلّقْتَها بالخير فَخَيْرْ
أو عَلّقْتَها بالضير فَضَيْرْ
كَذا حَقّقَ الفحولُ الأحْرار
لكِنْ قَدْ بَقي لَنَا الاستفسارْ):
ئەو تەعەللوق و سەرفی قودرەتە
جەبرە ئەر خەلقی (ربّ العزّةَ)ە،
وەر خەلقی عەبدە راسە ئیعتیزال
بەندە خالیقە بۆ بەعزێ ئەفعال
ئەڵێی(٦٣): بە دڵدا ئەمە جارییە:
کەسبی بەندە ئەمر ئیعتیبارییە
بۆچ؟ ئەم مەسئەلە بە قەولی ثیقات
(تشمَلُ(٦٤) علَى الإعتبارِيّات)

کردگە: کردووە. لەگرەدا: لێرەدا. ئەر: ئەگەر. وەر: ئەگەر.

واتە: زانا گەورە خێرۆمەندەکانی ئیسلام لەم شوێنەدا سیرڕی ئیختیاریان بەمجۆرە بەیان کردووە:

خودای گەورە ئیرادەیێکی موتلەق و بەربەرەڵای پێ بەخشیوی، جا ئەگەر تۆ ئیرادەکەت رووی لە چاکە کرد و چاکەت پێ تەرجیح دا ئەوا قودرەتەکەیشت رووی تێدەکا و خودای گەورەیش بۆت دروست دەکا. خۆ ئەگەر ئیرادەکەت رووی لە کاری خراپ کرد ئەوا قودرەتەکەیشت رووی تێدەکا و خودای گەورەیش بۆت دروست دەکا.

بەڵێ لەم شوێنەدا پرسیارێکی رەخنە بابەت ماوە ئەوەیش ئەوەیە: پێوەندیی توانای ئینسانەکە بە کارەکەوە ئەگەر دروستکراوی خودایە ئەوا دیسان جەبر رووی دایەوە و قسەی جەبرییەکان سەرکەوت. خۆ ئەگەر دروستکراوی ئینسانەکە خۆیەتی ئەوا بیروباوەڕی موعتەزیلەکان راست دەبێتەوە، واتە: بەندە خالیقی هەندێ کردەوەی خۆیەتی.

لە وەڵامی ئەم رەخنەدا دەڵێین: پێوەندی قودرەت بەو کارەوە کە ئیرادەکە تەرجیحی داوە فەرعی تەرجیحەکەیە و لەوەوە پەیدا بووە، تەرجیحەکەیش لازمی ئیرادەکەیە و لێی جیا نابێتەوە، وەک بڕیار دراوە کە ئیرادە سیفەتێکە ئیشوکاری بریتییە لە تەرجیحی (أحد المقدورین) بەسەر بەرامبەرەکەیدا، کەوابوو پێوەندیی قودرەتەکە مەنشەئێکی تری ناوێ هەتا تۆ بڵێیت پێوەندیی قودرەتەکە کاری خودایە یا کاری بەندە؟ چونکە بۆت دەرکەوت پێوەندییەکە دوای تەرجیحەکە کەوتووە و لەوەوە پەیدابووە، تەرجیحەکەیش لازمی ئیرادەیە و لێی جیا نابێتەوە.

بەلام بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو رەخنە کە ئێستە باسمان کرد قەت نەکەیت ئەوەت بە دڵا بێت کە گۆیا ئەو پێوەندیی قودرەتە شتێکی ئیعتیبارییە، نە جەوهەرە و نە عەرەز و فاعیل و تەئسیری فاعیلی ناوێ؛ چونکە ئەم باسەی ئێمە، کە دەڵێین خودا خالیقی هەموو شتە و عەبد خالیقی هیچ نییە، ئیعتیبارییاتیش دەگرێتەوە و هەرگیز نابێ نیسبەتی تەئسیر لە بەندە بدرێ بۆ هیچ شتێ تەنانەت ئەگەر ئیعتیبارییش بێ.

تەحقیقێ تر هەس نزدیکتر لەمە
بۆ لای ئیسباتی مەتلەبی هەمە
خولاسەی مەزهەب شێخی ئەشعەری
داپۆشێ رەحمەت باری یەکسەری:

هەرکـەس تەتـەببوع ئەحادیسـی کـرد
لـە ئایاتــەدا تــیٚفکـری ورد[ورد][٦٥]
لــەم مەســئەلەدا لێــی زاهــیر دەویٚ
حەق هەر رێی رەئیـی ئـەوی دەکـەویٚ
بەڵ لە هەموو بـەحس ئوسـوولی دینـدا
هەر رایی ئەوە چاک چاک تەسـکین دا
(مــا خَــالَفَ قَــطّ ذلِــکَ الجنــاب
قَــولَ السّــنَّةِ ونُطْــقَ الکتــاب)
کە عەقڵـی داگـرت زولمـەتی غەسـەق
شـەوی ئیفـتیراق تاریکــەی فـیرەق
نــووری لــەوامیع تەوحیــدی ئــەفعال
کە ئەووەڵ حالە بۆ ئـەهلی ئـەحوال[٦٦]
مەنبەعێکی ساف لـە لێڵـیی تـەخلیت
عەری لـە ئیفـرات، بـەری لـە تـەفریت
لــــە تەشــــاوی پــــاک نوبووەتــــەوە
هــات وە ئیسـتیقبال ئـەو حەزرەتـەوە
(فبِشَمسِـــهِ فــــی خلـــق الأعمــــال
إن مَحَــا ضِــیَا کوکَــب الأقْــوال
فاســتَمِعْ لِمَــا قَــدْ یُتْلــی عَلَیْــکْ
وبَعْــــدَهُ الاختیــــارُ لَــــدَیْکْ)
بــە ئیسـتیلاحی کیتـاب و سـوننەت
عورفی عـام و خـاس ئـەهالیی لوغـەت
ئەم هەفت سـیفەتە هەیـە (کلإجمـاع)،
وەســەر بەنــدەدا موتلــەق بــیٚنیــزاع

ئیسـنادی ئـەفعال هەرکەسێ بۆخۆی
دەدا ئـەباڵ خـۆی تەماشـای دەکـەی
فـلان تواناس، ئـەو ناتوانا
ئـەوە دانایـە، ئـەویان نـەدانا
رویم و هەڵسام، دانیشتم، بـردم
خـواردم و کوشـتم، نـەمکرد یـا کـردم
حـەتتا کـە جـەبری شـوهرەی ئافاقـە
مـونکیری حیسـە هـەر بـەم سـیاقە
غایـەت ئەمەتـە لـە شـک بـەریـە
وەسف و فیعلی تۆ وەک ئی حەق نییـە
نە خـۆت وەک جـەماد بـە دڵ ئـاوردن
نە خۆیچت بەو تەرز بـە خـالیق کـردن

هەمە: ئێمە. یەکسەری: یەکجاری. رێی: رێگای. رەئیی، بیری. ئەوی: ئـەو. تەشـاو: شـەپۆل. (افراط): لە سنوور لادان لە لایەنی زیادییەوە. (تفـریط): لـە سـنوور لادان لـە لایـەنی کەمیـەوە. ئەباڵ خۆی: ئەلای خۆی. رویم: بە شێوە قسەی تاوگۆزی: رۆیشتم. هەر بەم سـیاقە: بـەم شـێوە قسە کە دەڵێ: هەڵسام، دانیشتم، کردم، خواردم... تاد.

واتە: لێرەدا لێکدانەوەیەکی تر هەیە بۆ بابەتی ئیسنادی کار ئەلای ئینسان بە ئیختیـار کـە لـە لێکدانەوە پێشووەکان لە مێشکی ئینسانەوە نزیکترە و ئاسانتر دەچێتـە مێشـکەوە، پوختـەی ئـەو لێکدانەوەیش ئەمەیە:

شێخی ئەشعەری، رەحمەتی خودا دایپۆشێ، بیروڕاکەی ئەوەندە راسـت و رەوان و بـێ گـەردە هەرکەس سەیری فەرموودەکانی پێغەمبەر و ئایەتەکانی قورئانی کەریم بکـات و بـە فـام و هـۆش لێیان وردبێتەوە تێدەگا کە حەق لای رێگای بیروباوەڕی ئەوە، نەک تەنها لـە مەسـەلەی کـاری ئیختیاریدا، بەڵکو لە هەموو مەسەلەکانی زانیاریی ئوسوولی دیندا. بەڵێ هـەر بـیروڕای ئـەوە کـە ئینسان دڵنیا دەکات و دایدەمەزرێنێ.

شێخی ئەشعەری هەرگیز پێچەوانەی قورئان و حەدیس نەجوولاوەتەوە. لەو سەردەم و رۆژەدا کە ئەوی تێدا هەڵکەوت تاریک و نووتەکیی شەوی دەیجووری بیدعەت و زۆربوونی گرۆهـ و دەستە و کۆمەڵ لەناو موسوڵماناندا زانست و ژیریی داگیرکردبوو و بیروباوەڕی راستی خەفەکردبوو. لەم کاتەدا بوو نووری درەخشانی پڕتەوبەخشی بیروباوەڕی تەوحیدی ئەفعال لە سەرچاوەی روون و سافی بێخەوش و خاڵی دوور لە ئیفراتی جەبری و تەفریتی موعتەزیلە لە شەپۆلی بەهێزی چاک و خاوێنی پێغەمبەرەوە هات بەپیریی ئەشعەرییەوە و حەقیقەتی بۆ روون کردەوە، ئیتر خۆری رووناکیبەخشی ئەو بیروباوەڕە جوانە هەموو ترووسکەیەکی ئەستێرەکانی قسەوقسەڵۆکی لەناوبرد.

دیارە ئەو تەوحیدی ئەفعالە کە ئێستە وتمان بریتییە لەوە هەر تەنها خودا بە خالیقی ئەفعال بناسرێ، ئەم تەوحیدەیش یەکەم حاڵی ئەهلی دڵ و خوداپەرستە نوورانییەکانە، ئەوانەی دڵیان تا ناخ بە نووری رەحمەت و هیدایەتی خودای گەورە ئاوەدانە.

شێخی ئەشعەریش(ر.خ) تەنها بە هەستکردن و بە بۆنکردنی ئەو نوور و هیدایەت و مەرحەمەتە خوداییە ئەو رێبازە رێکوپێکەی پەسەند کرد و بە خەڵقیشی راگەیاند و بە دەلیلی عەقڵی و نەقڵی بۆی ئیسبات کردن مادام ئینسان مەخلووقی خودایە، کردەوەکانیشی مەخلووقی خودان، واتە: بیروباوەڕی موعتەزیلە هەڵە و بێجێیە و عەبد خالیقی هیچ نییە.

بەڵام لەم لایشەوە تەماشا دەکەین بە ئیستیلاحی قورئان و حەدیس و لەسەر داب و نەریتی تێکڕای خەڵق یا ئەهلی زوبان حەوت سیفەتەکە وەک لە خودای گەورە نیسبەت دەدرێن (بلاتشبیه) لە ئادەمزادیش نیسبەت دەدرێن: بۆ نموونە دەوترێ فلان حەییە، عەلیمە، موریدە، قادرە، موتەکەللیمە، سەمیعە، بەسیرە.

جا کە ئەم حەوت سیفەتە نیسبەت دران لە ئینسان دەبێ ئەوکارانەیش کە لە سیفەتی قودرەتەکەوە دەردەکەون نیسبەت بدرێن لێی، ئەوەتە دەڵێین: فلان توانایە، فلان ناتوانایە، ئەو ئینسانە زانایە، ئەوی تر نەزانە. هەروەها دەڵێی: رۆیشتم، هەڵسام، دانیشتم، بردم، خواردم، کوشتم، کردم، نەمکرد. تەنانەت جەبرییەکانیش کە لای دنیا ناوبانگیان دەرکردووە بەوەی ئینکاری حیسسییات دەکەن ئەوانیش هەر بەم جۆرە قسە دەکەن: رۆیشتم، هەڵسام، دانیشتم... تاد.

کەواتە دەبێ کارە ئیختیارییەکان بە حەقیقەت نیسبەت بدرێن لە خاوەنەکانیان. تەنها ئەوەندە هەیە کە بێگومان سیفەت و کاری تۆ وەک سیفەت و کاری خودای گەورە نییە؛ ئەو نیسبەتی کارەکانی لێ دەدەین و خالق و داهێنی کارەکانیشە، بەلام ئینسان تەنها نیسبەتی کارەکانی لێ دەدەین بە شێوەی کەسب و ئیکتیساب ئیتر خالیقی کارەکان نییە.

بەم جۆرە ئیمامی ئەشعەری لە ڕێبازەکانی جەبری و موعتەزیلە لایدا و دانانی کەسب و ئیکتیسابی ئیختیاری بۆ ئینسانی موکەللەف کردە ڕێبازی ڕاست و ڕەوانی خۆی.

بە کورتی خودای گەورە عیلمەکە لە ئینسانەکەدا دروست دەکا و ئینجا سیفەتی ئیرادەی دەداتێ کە تەرجیحی لایەکی پێدەدا، دوایی قودرەت و توانا و تەوجیهـکردنی توانای بۆ کارەکە تێدا دروست دەکا، بەدوای ئەمانەیشدا کارە مەبەستەکەی بۆ دروست دەکا؛ خودا خالیقە و بەندە کاسب.

مەزهەبی قازی و فەلسەفە و ئوستاد
ئەوانیچ لاچوون نەیانکەین ئەو یاد
ئەمجار (انصافاً) ڕووو کە بەم لاوە
لەم مابەینەدا دوو مەزهەب ماوە
لە دەس ساحێبماڵ هەرگیز دەرناچین
بیدزین، یاڵ و کلکی هەڵپاچین
(إنْ تنظُرْ الى المَبْدَءِ البَعيدْ
وَهُوَ صِفَةُ المَبْدَءِ المُعيدْ)
خەواس هەر بۆ ئەو، هیچ سابت نەکەی
بۆ خۆت، لازیمەی سیفەت هەروەک خۆی
هەر مەزهەر بی تۆ خو[٦٧] سووفییەیە
ئەمە تەوحیدی سیفاتییەیە
ئەر وا ئیستیلاح عورفی خاس و عام
لەسەر سیفاتی بەندە هەس تەمام
مەبدەئی قەریب تێریتە نەزەر
سەبەبی عادی و مەحەل بی و مەزهەر

بــۆ خـــەلقی حـــەق و ئیجــاد و تەئسـیر
(اِلـــی مــــذْهَبِ الاشْـــعَری المصـــیر)

قازی: قازی ئەبووبەکری باقلانی[٦٨]. ئوستاد: ئەبوو ئیسحاقی ئیسفەرایینی. ئەوانیچ: ئـەوانیش. نەیانکەین ئەویاد: بیریان لـێ نەکەینـەوە، بەسـەریان نەکەینـەوە. ئـەر وا: ئەگـەر وەک. تێرێتـە: دەهێنێتە.

واتە: پاش ئەوە کـە رێبـازی جەبرییـەمان بـەتاڵ کـردەوە لەبـەر ئـەوە پێچەوانـەی قورئـان و فەرموودەی پێغەمبەرە و دژی ئەوەیە کە خاس و عام لەسەری پێک هاتوون و، هیچ کارێ نادەنـە پاڵ ئینسان و قاعیدەی (التکلیـف بمـا یُطـاق) تێـک دەدەن. هـەروەها پـاش ئـەوە کـە رێبـازی موعتەزیلەیشمان بەتاڵ کردەوە بەوە کە پێچەوانەی نەسسـی قورئـان و فـەرموودەی پێغەمبـەرە، بزانە: رێبازی قازیی ئەبووبەکری باقلانی کە ئەوەیە کاری ئینسان بە مەجمووعی قودرەتی خـودا و ئینسان دروست دەبێ لەسەر ئەو بناخەیە کە قودرەتی خودا کار دەکا لە ئەسڵی زاتی فیعلەکەدا و قودرەتی ئینسانیش کار دەکا لە سیفەتی فیعلەکەدا، واتە بـوونی بـە تاعـەت یـا بـە مەعسـییەت، لەگەڵ رێبازی ئوستاد ئەبووئیسحاقی ئیسفەرایینی کە دەڵێ کارەکە بە هەردوو قودرەتەکە دەبـێ، نەک لەبەر ئەوە کە قودرەتی خودای گەورە کەم و کۆتایە و بەتەنها کـار ناکـا، بەڵـکو لەبـەر ئـەوە دەخڵێ بۆ قودرەتی عەبدیش پەیدا ببێ هەتا رەوا بێ کارەکە ببێتە تاعەت یـا مەعسـییەت. بەڵـێ ئەم دوو مەزهەبەیش لەناودا نەمان چونکە تەئسیرێ بۆ قودرەتی ئینسان نەما نە لە زاتی کارەکـەدا و نە لە سیفەتیا.

جا ئەگەر حیسابی رێبازی ماتوریدی نەکەین؛ لەبەر ئەوە ئەو رێبازە دەگەڕێتەوە بـۆ مەزهـەبی ئوسـتاد ئەبووئیسـحاقی ئیسـفەرایینی، کـە بریتییـە لـە نیسـبەتدانی کـار ئـەلای تێکـڕای دوو قودرەتەکە، هەرچەند ئەمەیش رەد کراوەتەوە، هەر رێبازی شێخی ئەشعەریمان بۆ مایەوە.

پاش ئەم تەفسیلە روو کە بە لای منەوە تەنها دوو مەزهەب لە مەیدانا مان، ئەمانەیش بۆچـوون و رێبازی خەڵکی ترن نابێ بیکەینە قسەی خۆمان؛ رای خەڵک نادزرێ، ئەگەر هەوڵ درا بدزرێ و هەندێ گۆڕانی بەسەرا هێنرا هەتا نەناسرێتەوە، ئاخری خاوەنەکەی هەر دەیدۆزێتەوە و بەسـەری دەکاتەوە هەروەک چۆن ئەگەر یەکێ ئەسپێ بدزێ و بۆ مەبەستی ونکردنی لە خاوەنەکەی کلک و یاڵی هەڵپاچێ ئاخری هەر دەناسرێتەوە.

بەڵێ ئەو دوو مەزهەبە یەکەمیان مەزهەبی ئەهلی تەسەووفە کە مەشرەبیان لەسەر ئەوەیە بۆ سەرچاوەی دوور بڕوانن کە خودای گەورەیە و، خۆیان وەک هەموو خوداناسێکی راستەقینە بەندەی خودا دەزانن و ملکەچی ئەرێونەرێی ئەون و هەرگیز لە چوارچێوەی لەخوداترسی دەرناچن و پابەندی خۆشویستنی خودای گەورە و پێغەمبەرن، ئەمانە باوەڕیان وایە خودای گەورە خۆی سەرچاوەی بوونی هەموو شتێکە.

جا ئەگەر سەیری ئەوە بکەی کە خودا سەرچاوەی هەموو (ما سوی الله)یە و، ئەم بوون بە سەرچاوەییە سیفەتی ئەو خودایە کە سەرەتا جیهانی دروست کردووە و دواڕۆژیش پاش لەناوچوون جارێکی تر دروستی دەکاتەوە، حەق وایە هەرچی سیفەتی تەواوی و بێعەیبیی راستەقینەیە هەر بۆ خودای بڕیار بدەی و خەواسی ئەو سیفەتانەیش هەر بۆ خودا بڕیار بدەی و هیچی بۆ خۆت حیساب نەکەی؛ چونکە ئەوەی لازمی سیفەتی خودا بێ وەک سیفەتەکە خۆی هەر هی خودایە، هەروەها وا حیساب بکەی کە تۆ تەنها دیارگای تەجەللای زاتی خودای گەورەی. ئەمەی کە باسمان کرد مەشرەب و ڕێبازی ئەهلی تەسەووفە و لای ئەوان ئەمەیان پایەی دووەمی تەوحیدە و پێیدەڵێن تەوحیدی سیفات. ئەهلی تەسەووف بە وردی تەماشای تەوحیدی زات و تەوحیدی سیفات و تەوحیدی ئەفعال دەکەن. یەکەم پایەی سلووکیان تەوحیدی ئەفعالە. ئەم پایەیە بەوە دەبێ بە یەقین بگاتە باوەڕێ کە کەس نییە کاربکاتە کار و ئاسار و زات و سیفات، زاتی خودای (واجبالوجود) نەبێ.

پایەبەرز (ابوالحسن)ی ئەشعەریش هەر ئەم ڕێگایەی پەسند کردووە کە بەهۆی ڕێژەنی بارانی نووری پێغەمبەر(د.خ) دڵی لێوانی نوور بوو و هەرگیز تیشکی هیدایەتی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری بەجێنەهێشت و ملی ڕێگای راستی گرت و لێی جیا نەبوویەوە تا گەیشتە ئەم پایە باڵایە. بەمەدا بۆمان دەرکەوت کە ڕێبازی ئەشعەری لەگەڵ پلەی یەکەمی تەوحیدی سۆفییاندا یەک شتە و ئەم دوانە لەیەک جیا نابنەوە.

دووەم پلە و پایەی سلووکی ئەهلی تەسەووف پایەی تەوحیدی سیفاتە، واتە: سالیکی ئەم ڕێگایە وای لێدێت هەموو عیلمێ وەها دەبینێ کە بەشێکە لە عیلمی خودا و پڕتەوێکە لە پڕتەوی بێپایانی عیلمی ئەو، هەموو ئیرادەیەک وەها دەبینێ کە بەشێکە لە ئیرادەی خودا و دڵۆپێکە لە دەریای ئیرادەی بێبنی ئەو، هەروەها سیفەتەکانی تر...

پایە و پلەی سێهەمی سلووکیان پایەی تەوحیدی زاتە، کە ئێرە مـاوەی باسـکردنی نییـە و بـە عینایەت و چاودێریی و لوتفی خودایی بۆ ئەهلی موراقەبە دەردەکەوێ.

تا ئێستە باس باسی مەزهەبی یەکەم بوو، واتە مەزهەبی ئەهلی تەسەووف.

مەزهەبی دووەم مەزهەبی ئەشعەرییەکانە، کە وەک پێش نەختێ باسمان کـرد لەگـەڵ پایـەی یەکەمی تەوحیدی ئەهلی تەسەووفدا یـەک دەگرێتـەوە، ئـەوەی نـاوی تەوحیـدی ئـەفعال بـوو. مەولەوی ئەم مەزهەبەی بەم شیعرانە بەیان فەرمووە: «ئەر وا ئیسـتیلاح عـورفی خـاس و عـام... تاد». واتە: ئەگەر تۆیش وەک ئیستیلاحی ئەهلی عـورفی خـاس و عـام دەربـارەی سـیفەتەکانی ئینسان دەڕۆی بەرێوە و سەرچاوەی نزیک تەماشا دەکەی و سەبەبی زاهیری بەدەستەوە دەگری، کە بە عادەتی خـودای گـەورە بـووە بـە سـەبەب و وای حیسـاب دەکـەی کـە خـۆت مەحـەل و مەزهەری خەلق و ئیجادی لە لایەن خودای گەورەوە، ئەوا برۆ بۆلای رێبازی ئەشـعەری(ر.خ) کـە پوختەکەی ئەوەیە: بوونی هەرچی بوویەک هەیە لە زاتی خودا خۆیەوەیە.

وجوودی مومکین یەکـیـەک وە بـێ‌گـەڕ
هەر یەک لەڕاس خۆی ئەم‌پەڕ تـا ئەوپـەڕ
موسنەدە (عرضـاً)، نـە (طـولاً) بـە حـەق
وەسـائیت نییـە مەپـەڕ لـەق ئـەو لـەق
مەبدەئی یەک‌یەک مومکینـات یەکسـەر
هــەر ئــەوە ئایــا عــەرەز یــا جەوهــەر
غەیر لەسەر سیفات قەییوومەکەی حـەی
هیچ شەیئێ مەوقووف نییە لە هیچ شەی
ئــەم موقەددیمــە پــاک و موتلـەقە:
موئەسسـیری (فـیالوجـود) هـەر حەقـە
نە بوخار دەخلـی بـۆ هـەورە هـیچ تـەور
نـە بـەور و بـاران دەپرسـێ لـە هـەور
نـە بـۆ ئابـا هـەس نـە بـۆ ئوممـەهات
تەئسـیرێ (اصـلاً) بـۆ مەوالیـدات[٦٩]

بلـــێ: ئەبـــەوین دەخلـــیان هەیـــە
دەڵـــێین: ئـــادەمی و ئـــەدەب ئەمەیـــە
ئەگـــەر لابـــدا بـــاوک بـــە مووییـــێ
ئیلزامـــی دەدا عیســـا بـــە فوویـــێ[٧٠]
دەڵـــێ مەڵـــێ: (نَـــارٌ إِحـــرَاقٌ لَـــدَیْکْ
«بَـــرداً سَـــلاَماً»: ســـلامٌ عَلَیْـــکْ) [٧١]
(قطعـــاً، نـــاوی قـــەتع دەویـــری بـــردن
تێخ؟ زەبیح جـواو دەگرێتـە گـەردن[٧٢]

بێگەڕ: بێفێڵ. لەڕاس خۆی: لەعاستی خۆی. مەپەڕ: مەپەڕەوە. حەقە: خودایە. بـەور: بـەفر. ئابا: ئاباء، باوکان، مەوالید: جەمعی مەولوود. بلێ: ئەگەر کەسـێ بلـێ. (قطعـاً): هـەرگیز. قـەتع: برین. زەبیح: ئیسماعیل پێغەمبەر(د.خ). جواو: جواب. دەگرێتە گەردن: دەچێتە ژێری.

واتە: بوونی هەرچی مومکینە کە پێیدەوترێ (ماسوی‌الله) لە ئەووەڵەوە تـا ئـاخر یەکـە یەکـە هەرکام لەعاستی خۆی بە بێفرو‌فێڵ هەموو (بالذات) دەدرێنە پاڵ زاتی خودای گەورە بـە خـەتی عەرز (پان) نەک بە خەتی تووڵ (درێژی) ؛ وەک ئەوەی لە فەلاسـیفەکانی دەگێڕنـەوە کـە گوایـا هەر مەخلووقێکی پێشکەوتوو دەبێتە واسیتەی تەئسیر لەوەدا کە دێ بـەدوایا هـەتا ڕیچکەیـەکی درێژ پێک بهێنێ؛ چونکە لەبەر ڕووناکیی دەلیل و بورهان واسیتەی (فی التأثیر) لـەنێوان خـودا و مەخلووقی خودادا نییە. ئیتر تۆیش قەناعەت بکە بەم بیروباوەڕە جوانـە راسـتە و، دەس‌مەکـە بـە هاتوچۆ و بە وێنەی چۆلەکە لەم لقەوە بۆ ئەو لق مەفڕە، دامەزرێ و ئاژاوە مـەنێرەوە و بەرامبـەر بە ڕاستی مل‌کەچ بە.

شایانی وتنە: ئیسنادی مومکینات ئەلای خودای گەورە بە عەرز ئەوەیە کە مـومکینی (بالـذات) خۆی بە خالیقەوە پێوەندە، وەک ئەوەی لـە دائیرەیەکـدا خالـێکی مەرکـەزی دیـاری بکـەی بـۆ ئیشارە ئەلای خودا و، دەوران‌دەوری ئەو خاڵەیش خاڵ بن و، لە خاڵـە مەرکەزییەکـەوە بـۆ هـەر خاڵێ لەو خاڵانە هێڵێکی سەربەخۆ ڕابکێشرێ.

مەبدەء و سەرچاوەی یەکەیەکەی هەموو مومکینەکان هەر خودای گەورەیە، چ جەوهەر بێ و چ عەرەز. هەرچی مومکین هەیە تەنها لەسەر سیفەتی (قیّومی)ی خودای گەورە راوەستاوە و لەسەر هیچی تر رانەوەستاوە. قەییوم واتە: خۆی بە خۆیەوە راوستاوە و غەیری خۆی رادەگرێ، ئەو خۆی هەیە و غەیری ئەو لەوەوە. ئەم موقەددیمە پاکە و بێگومانە کە دەڵێ: ئەوەی کار لە بووندا دەکا هەر زاتی خودای گەورەیە.

ئیتر نە هەڵم دەخلێکی عەقلی هەیە بۆ پەیدابوونی هەور و، نە بەفر و باران لە هەور دەپرسن. نە باوکەکان و نە دایکەکان کارێکی عەقلیان هەیە لە پەیدابوونی ئەولاددا. بەڵێ باوک و دایک دەخلێکی عادەتییان هەیە لە بووونی ئەولاددا، هەڵم دەستێکی عادەتیی هەیە لە بوونی هەوردا وەک دەوری هەور لە بارینی بەفر و باراندا. بەڵام ئەم دەخلە وەها نییە کە بڵێین ئەگەر ئەم ئەسبابانە نەبن مەحاڵە موسەببەبەکان ببن؛ چونکە ئەگەر باوک بەقەد موویەک لە دەخلی عادەتی لابدا و بڵێت من دەخلی عەقلیم هەیە وجوودی حەزرەتی عیسا(د.خ) بە فوویەکی جیبرائیل بە بەرۆکی دایکیدا ئیلزامی ئەو باوکە دەدات و دەیبەزێنێ.

هەرگیز مەڵێ بە ئاگر: ئەی ئاگر! لەگەڵ بوونی تۆ و بەهۆی تۆوە سووتان پەیدا دەبێ. ئەگەر وات کرد لەولاوە یەکسەر [یا نار کونی برداً و سلاماً علی ابراهیم] بە راسەرتەوە رادەوەستێ، سلاوێکت لێ دەکا و یەخەت پێ دەگرێ و دەڵێ ئەی من چیم؟ ئەوە نییە ئاگر بووم و نەمسووتاند؟ یا هەرگیز تێغ دەوێرێ ناوی برین بەرێ و بڵێ: من شت دەبڕم. ئەگەر وێرای حەزرەتی ئیسماعیلی (ذبیح الله) (د.خ) وەڵامی گەزافی ئەو تێغە دەگرێتە گەردن و دەڵێت: ئەی ئەوە نەبوو باوکم تێغەکەی لە گەردنم گیر کرد و نەیبڕیم؟

لاکین بۆ عالەم ئەوسەر تا ئەم سەر
(کما للشَّرْعِ الأظهرِ الأنور)
زەهر و بەتنێ هەس بزان بە یەقین
(وَلِذآ البطنِ بطنٌ لسبعین)
هەر بەتنێ لە شەرع شەریفی ئەقوەم
رەبتی هەس دەگەڵ بەتنێ لە عالەم
بۆ هەر بەتنێکی ئەحکامێ هەیە
بۆ هەر شەخسێکی مەقامێ هەیە

(وَاللهُ أعْلَــــمْ بِتِلْــــكَ البُطَــــونْ)
ڕێ بۆ کـەس نییـە مـەربۆ (راسِـخون)
لە ئیجمال و ئەسل تا تەفسیل و فەرع
(إلــــى ظَهْــــرَی العَــــالَمِ وَالشَّــــرْعْ)
مـەداری ئـەحکام شـەرعی زاهـیرە
لەســـەر عالــــەمی زاهــیر دائـــیرە

ڕێ: ڕێگا: مەر: مەگەر. راسخون: الراسخون في العلم.

ئەم شیعرانە وەڵامی ئەو ڕەخنەیەن کە دەڵێت: بـەیانی بیروبـاوەڕی ئـەهلی تەسـەووف لـەناو مەزهەبەکاندا زۆر دوورە؛ چونکە سۆفییەکان زۆر کەمن و ئەو بیروباوەڕەیش بۆ غەیری ئەوان نییە.

پۆختەی وەڵامەکە ئەوەیە هەروەکوو ئەهلی تەسەووف بەشـێکن لـە کۆمەڵـی زۆری ئوممـەتی ئیسلام و گەلێ کۆمەڵی تر هەیە لە ئیسلامدا، هەروا شەریعەتی پاک و پیرۆزیش زەهـر و بـەتـنی، واتە دیوی دەر و ناوی هەیە، دیوی ناویش چەند دیوێکی تری ناوەوەی هەیە و پلە و پایـەی زۆری لێ دەبێتەوە، هەر چین و کۆمەڵێ جۆرە پایەیەکی هەیە.

بۆ نموونە ڕوکنەکانی ئیمان شەشن، واتە هەموو موسوڵمانێ پێویستە باوەڕی بەو شـەش شـتە هەبێ، بەڵام بێگومان باوەڕی هەموو موسوڵمانەکان لە یەک پایـەی پلـەدا نییـە؛ بـاوەڕی یـارانی حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) یا ئیمامانی ئال و بـەیت یـا دۆسـتانی خـودا و پیاچاکـان، یـا تـابیعینی ئەسحابە ئیمان و باوەڕیان لەگەڵ ئیمان و باوەڕی موسوڵمانانی ترا لە یەک پایەدا نییـە، هـەروەها ئەو کەسانە کە عیلمی (لَـدُنّی) یـان پـێدراوە لەلایـەن بارەگـای خوداییـەوە، ئەحواڵـیان، ڕادەی ئیمانیان، دامەزراویی دڵ و دەروونیان وەک هی کەسـانی تـر نییـە، تـەنها بـۆ نموونـە سـەیرێکی بەسەرهاتەکەی حەزرەتی مووسا و حەزرەتی خزر(د.خ) بکەن. هـەروەها تەماشـای پایـە و پلـەی نوێژکەرەکان بکەن چەند لە خوشووع و خـوزووع و جـوان جـێبـەجێکردنیـدا جیاجیـان، یـا لـە ڕۆژووگرتن و حەجکردن و جیهاد لە ڕێگای خودا و پاککردنەوەی نـەفس و دوورخسـتنەوەی لـە خوو و ڕەوشتی بـەد و کـرداری ناپەسـەنددا. بەڵـکوو ئینسـان دەتوانـێ بڵـێت جیـاوازیی پایـەی موسوڵمانان لە بەکارهێنانی حوکمەکانی شەریعەت و نوورانییەتی دڵ و لە خوو و ڕەوشـتی بـەرزو خزمەتی موسوڵماناندا ئەوەندە زۆرە مەگەر هەر خـودا بزانـێ. بۆیـە مەشـهوورە (حَسَـنَاتُ الأبـرار سَیِّئاتُ المُقَرَّبین). کەوابێ هیچ مانیع نییە گەلێ ئینسانی موسوڵمان بـاوەڕی وەهابـێ کـە خـۆی

دیارگای ئاسار و ئەنواری توانای خودای گەورەیە و، بەقەد تۆزقاڵێ نارەزایی لە قەزای ئـەو پێشـان نەدا و خوداپەرستی لەناخیا رەگی داکوتابێ و رەزای خودا لای ئەو هەموو شت بێ.

حیکمـــەتێ هەیـــە لـــەم تەرتیبـــەدا
لـــەم نـــەزم و نەســـق زۆر عەجیبـــەدا
ئـەرچی عەقڵـی مـن دەرکـی تـێناکـا
سەر بـەرەوژوور یـا بـەرەوژێر(٧٣) ڕاکـا
دەڵـێن: تـا تـەمیز ئەبـەین بکـەوێ
ئومـوور موختـەلیت موشتەبیهـ نـەوێ
یەکێ حاکم بـێ، یـەکێ مـەحکووم بـێ
یـەکێ خـادیم و یـەکێ مەخـدووم بـێ
یـــەکێ شـــاگردە، یـــەکێ ئوســـتادە
ئـــەوە نوقســـانە، ئەمـــە زیـــادە
ئـــەوە ســـیاهە و ئـــەم یەکـــە ســـفید
ئـــەوە موفیـــدە و ئـــەمیان موســـتەفید
فلانـــە باوکـــە، ئـــەوە لـــە ئـــەولاد
لـە دوای ئـەولاد پێـیدەڵـێن ئـەحفاد
لـە بوخـارە هـەور، لـە هـەورە مەتـەر
لـە مەتـەر گیـا(٧٤) سـەر تێرێتـە دەر
موقـــەددەم نـــاوی نریاگـــە ســـەبەب
بـە موئەخخـەریان دەڵـێن موسـەببەب
هەردوولا هەر خـەلق رەببی هـادییـە
ســـەبەبییەتیان ئـــەمری عـــادییـــە
لـە قـودرەتی حـەق عـادەت جارییـە
ئـــەو تێتـــە وجـــوود، ئـــەم دیارییـــە

(يُمْكِنْ) ئار بوێ و ئیحـراق هـەر نـەوێ
یـا ئیحــراق وە بــێ ئـاگر هەڵــکەوێ
لزوومــی عــەقلی لــە بەینــە تەریــد
(يَفعَــلْ مــا يشــا، يَحْكُــمْ مــا يُريــدْ)
چونکــە تــۆ چـاوت وا پێــی دەکــەوێ
وەهــــا دەزانی ئــــەمیان لـــەو دەوێ
مەبسووتە و مەقبووز بێدەستەلات فەی
(هُــوَ المُسْــتَقِلّ فــی الخَلْــقِ للشَّــی) (٧٥)
هەر بە خەلقی ئەو گشـت دێتـە عـەیان
ســیفاتی عەبــدیچ دەگــەڵ خاســەیان

سیاە: رەش. سفید: سپی. تێرێتەدەر: دەهێنێتەدەر. ناوی نریاگە: نـاوی نـراوە. تێتـە: دێتـە. ئار: ئاگر. بوێ: ببێ. فەی: فیء، سێبەر. للشَّی: لِلشَّیء.

واتە: ئەگەرچی من لە نهێنی و حکیمەتی کار و کرداری خـودای گـەورە تـێناگـەم و هـۆش و بیرم جارێ بەرەوخوار و جارێ سەرەوژوورە، جارێ کورت دەهێنێ و جارێ سەردەکا، بەلام دیـارە حیکمەت هەیە لەم تەرتیب و رێکوپێکی و دانانی ئەسباب و موسەببەبانەدا؛ یەکێ باوکە و یـەکێ نەوەیە و، یەکێ کاربەدەسـت و زەبەردەسـتە و یـەکێ ژێردەسـتەیە، یـەکێ مامۆسـتایە و یـەکێ قوتابییە. هەڵبەت خوای گەورە دەیەوێ خەلک فێری تـەرتیب و رێـکوپێکـی بکـا، ئـەگینا ئـەم ئەسبابانە لە ئەسبابی عادەتی بەولاوە هیچی تر نین، ئەمانە هیچیان عیللەتی عەقلی قـەتعی نـین بەو مەعنایە ئەگەر ئەو عیللەتـە نـەبێ مەعلوولەکـەیش نـەبێ؛ بـۆ نموونـە لەوانەیـە ئـاگر ببـێ و سووتاندن نەبێ، لەوانەیشە ئاگر نەبێ کەچی سووتاندن ببێ، لزوومی عەقلی لەم نـاوە دەرکـراوە و جێی نابێتەوە.

تۆ بە چاوی کەمبین و کورتبینـت ئـاگر و سـووتاندنەکە دەبـینی، سـەیری هـەور و بارانەکـە دەکەی، پاش بارانبارین دەبینی گیا سەوز دەبێ... تاد. وادەزانی ئەوەی بـە موسـەببەبت دانـاوە لەوەوە پەیدا بووە کە بە سەبەبت زانیوە، بەلام لە جەوهەر و ناوەڕۆکدا ئینسان وەکوو سێبەرە کـە

دەبینرێ و لەمس ناکرێ، هەیە و نییە، نە لە درێژبوونەوەیدا و نە لە کورتبوونەوەیدا دەستەڵاتی نییە؛ [أَلَمْ تَرَ الی رَبّک کَیْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاء لجَعَلَهُ ساکنا][٧٦] تەنها خودای گەورە سەربەخۆ و دەستەڵاتدارە، هەموو شت دروست دەکا، زات و سیفەتی زات، سیفەتەکانی ئینسان و لەوازیمی سیفەتەکانیشی هەر بە توانای خودا دەبن و ئەو دروستیان دەکا [یَفْعَلُ مَا یَشَاء وَیَحْکُمُ ما یُرید].

قودرەت دەگەڵی تەعەللوقیدا
تێرێتە وجوود لە ئادەمیدا
کەوا مەشهوورە بە ئیستیتاعە
(مَعَ الفِعْلْ عِنْدَ هذی الصِنّاعَةْ)
وەک سەلامەتیی ئەسباب و ئالات،
کە تەکلیف تەعویل لەسەر ئەو دەدات،
بە ئیستیتاعە ئەویچ ناودەبرێ
«مَنِ اسْتَطاعَ...» بە دەلیل دەکرێ
کە بەندەی مەوسووف گێرا بەوانە
کردی بە مەحەل ئەو سیفەتانە
قودرەتی (مَعَ التَعَلُّق) ئاورد
راس دەگەڵی فیعل موقارەنەی کرد[٧٧]
ئەو فیعلە دەفعی خالیقی وەدوود
(تعقیباً) زاتی تێرێتە وجوود
بەندە لەوێدا دەوێ بە موختار
بۆ تەکلیفی شەرع دەوێ بە مەدار
ئەگەر وە بێ ئەو قسەی مەزکوورە
خەلقی فیعلی کرد بەندە مەجبوورە

واتە: هەروەها خودای گەورە قودرەتی ئینسان و تەعەللوقی ئەو قودرەتەی تیا دروست دەکا کە لای ئەهلی ئوسوول پێی دەڵێن ئیستیتاعە، واتە توانایی لەسەر ئیش و کار لەگەڵ هەموو ئەسباب

و شەرتێکدا لەگـەڵ لابـردنی هـەموو کۆسـپێکدا. دیـارە ئـەم توانایـە بـێبـەرودوا لەگـەڵ کـارە توانراوەکەدا دەبێ.

هەروەها ئیستیتاعە بەکاردەهێنرێ بۆ ساق و سـەلامەتیی ئینسـان و ڕێـکوپێکیـی ئەسـباب و ئالاتی کار، کە تەکلیف لە عەبد لەلایەن خوداوە لەسەر ئەو ساغ و سەلامەتییە راوەستاوە و، ئەگـەر ئەوە نەبێ تەکلیف رووی تێناکا. دەلیل لەسەر ئەوە کە ئیسـتیتاعە ئەمـەیش دەگرێتـەوە ئایـەتی [... وَلله على الناس حجّ البيت مَنِ استطاع اليه سبيلا]یە(٧٨).

جا کە خودای گەورە بەندەی خۆی مەوسووف کرد بە سەلامەتیی ئەسباب و ئالات و، قودرەتی بەندە و پێوەندیی قودرەتەکە بە کارە مەقدوورەکـەوە هاتـە جـێ و لەگەڵـیا بەرامبـەر بـوو گـورج خودای گەورە ئەوکارەی بۆ دروست دەکا، بەندەیش لەبەر ئەوە کە بووەتـە شـوێنی ئـەو شـتانەی باسمان کردن بە موختار و ئارەزووبەدەست دادەنرێ، چ لە عورفی شەرع و چ لـە عـورفی خـاس و عامدا.

ئەگەر خودا بە بێ ئەم شتانەی کە وتمان کارێکی لـە بەنـدەدا دروسـت کـرد وەک نەخۆشـی، زویری، لاوازی، ئەوا ئەو بەندە بـە مـەجبوور و ناچـار دادەنـرێ و بـەو عورفانـەی باسمـان کـردن ئارەزووبەدەست نییە.

خولاسـە عـادەت جارییـەی حەقـە
ئەو خەلقی سەبەب عادیی ئەم خەلقـە
تـا بەنـدە بەوتـەرز نـەکا بـە موختـار
تـەکلیفی شـەرعی لـێ ناکـا جـەببار
نیشـانەی شـێوەی موختـاری چییـە؟
تەیەسسور بۆ ئەو تـەرک و فیعلـییـە
ئــەوە عەلامــەت ناموختارییــە
بــێتەیەســـوری و ئیزتیرارییــە
حاڵەتی ئەووەڵ تەکلیف بە حیکمـەت
حاڵەتی دووەم عـەفوی بـە ڕەحمـەت
ویجــدان فاریقــە (بَــیْنَ الحــالَتَیْنْ)
بینا لە وُسْعَەتْ تـەکلیف تێتـە بـەین

هــەرچی (عــادةً فــی الوُسْــعَه) نــەوێ
بەو چشتە تــەكليف نــاوێ هەڵــكەوێ

واتە: پوختەی قسە ئەوەیە: عادەتی خودایی كە پێیدەوترێ (سُنَّةُ الله) وا داهاتووە كە دروست كردنی خودای گەورە بۆ سیفەتی ئیرادە و قودرەت لە ئینساندا بێتە سەبەبی دروست كردنی كارە مەبەستەكە، بەكورتی دروست كردنی خودا بۆ سێ سیفەتەكە سەبەبە و دروست كردنیشی بۆ كاری مەبەست موسەببەبە.

خودای گەورە تا بەندەی خۆی نەكاتە خاوەنی ئەو سیفەتانە تەكلیفی كاری لێ ناكا، نیشانەی موختاریی بەندە ئەوەیە كە بتوانێ كارەكە بكا یا نەیكا، نیشانەی ناموختاری و ناچارییەكەیشی ئەوەیە دەستی بەسەر كردن یا نەكردنی كارەكەدا نەڕوا. لە حاڵەتی یەكەمدا روو تێكردنی تەكلیفی خودایە بۆ ئینسان لەسەر بناخەی حیكمەت، لە حاڵەتی دووەمدا عەفوكردن و سزانەدانە لەسەر بناخەی موحتاجیی ئینسانەكە بە بەزەیی و میهرەبانیی خودا. بێگومان جیاوازیی ئەم دوانە زۆر ئاشكرا و نومایانە و پێویستی بە دەلیل نییە.

دیارە هەر كارێ بەعادەت لە وزە و توانای موكەللەفدا نەبێ هەرگیز تەكلیفی پێنەكراوە و پێیشی ناكرێ.

بەڵێ وا بۆمان روون بووەوە كە ئینسان حوكمە تەكلیفییەكانی لەباردا هەیە، چونكە ئەگەر لە باریدا نەبوونایە لە لایەن خودای گەورەوە تەكلیفی لێ نەدەكرا؛ كەچی ئەوەتا دەیبینین تەكلیفی گەلێ ئەحكامی لێ كراوە، ئەمەیش مەعنای ئەوەیە ئینسان ئامادەیی تێدایە بۆ ئەو حوكمانە.

هەروەها بۆمان روون بووەوە هەر كارێ تەكلیف لە ئینسان كرابێ بە كردنی یا بە نەكردنی، لە وزە و توانادایە، هەرشتێكیش لە وزە و توانادا بێ كارێكی ئیختیارییە؛ كەوابوو هەموو كارێكی تەكلیف پێكراو ئیختیارییە.

ئەنجا لە شتێكدا تەكلیف بە كردنی كرابێ، بۆ نموونە وەک نوێژ، ئەوە دیارە كردنەكەی كارێكی ئیختیارییە. بۆ ئەوەیش تەكلیف بە نەكردنی كرابێ، بۆ نموونە وەک دزی، ئەویش لە ناوەڕۆكدا داوای ئەوە لە ئینسانەكە كراوە كە رێ لە نەفسی بگرێ و كارە ناڕەواكە نەكا، دیارە رێ لە نەفس گرتنیش كارێكی ئیختیارییە.

شایانی وتنە: شت بەپێی دابەشكردنی عەقڵی یا واجبە یا مومتەنیعە یا مومكین. واجب تەكلیفی پێ ناكرێ و لە ئینسان داواناكرێ، وەک تێكڕای هەناسەدانی ئینسان كە ژیانی لەسەر

بەندە؛ چونکە ئەوەی داوا بکرێ دەبێ ئیحتیمالی بوون و نەبوونی هەبێ، واجبیش دەبێ ببێ و ئیحتیمالی نەبوونی نییە، بۆیە تەکلیف پێکردنی و داواکردنی مەعنای تێدا نییە.

مومتەنیعیش، واتە مەحاڵ، یا مەحاڵی عەقڵییە وەک (اجتماع النقیضین) یا مەحاڵی عادەتییە وەک بەهەوادا فڕینی ئینسان بەبێ هۆ عادەتییەکانی فڕین، هیچ کام لەم دوانەیش داوا نەکراون؛ خودا خۆی دەفەرموێ: [لا يُكَلِّف الله نَفساً إلاَّ وُسْعَها].

مایەوە مومکینی زاتی کە ئەوەتە خۆی لەخۆیدا ئیحتیمالی بوون و نەبوونی هەبێ و لە وزە و توانادا بێ، ئەمەیان تەکلیفی ئینسانی پێ دەکرێ، چونکە خۆی لەخۆیدا وەک وتمان لە وزە و توانادا هەیە و بوون و نەبوون هەڵدەگرێ، ئەگەرچی بەپێی عیلمی خودا مەحاڵ بێ، واتە عیلمی خودای گەورە پێوەندی بە نەبوونیەوە بەستبێ، کە پێی دەڵێن مەحاڵی عیلمی.

ئەو موقارەنە کە پێی دەڵێن کەسب
ئیجاد لەدوویە بۆ تۆیە (فَحَسْبْ)
زاهیری ئەحکام شەرعی تاهیرە
مەناتی ئەوان فیعلی زاهیرە
ئەو مەحەللی‌یە و ئەو مەوسووفی‌یە
با تەئسیر نەوێ بۆیان کافی‌یە
لەسەر هەر فیعلێ بە بێ‌گفت‌وگۆ
موتەعەللەقە بۆ قودرەتی تۆ
ئەرصەد کە هەیە تەئسیری دەربەس
لەسەر ئەو فیعلە تەکلیف لە تۆ هەس
وا موقارەنە بێ‌تەئسیر ماوە
کەسبی ئەشعەری تەفسیر کریاوە
نیسبەتی[٧٩] مەدە ئەباڵ وەقاحە:
قودرەت بێ تەئسیر مَحض ئیصطیلاحە
لەلای خۆت قودرەت وا بکەی تەحریر
لە مەفهوومیدا موعتەبەر تەئسیر

نــەفیی تەئســیرت کــە بــە دڵ ئــاورد
ئــەواها نــەفیی قودرەتــت هــەم کــرد
یــا وەختــیَ قــودرەت تەئســیری نــەبوو
ئــەوا ئیســتیحقاق جــەزا لــەناوچوو
قودرەت وەسفێکە، ئەگەر هَەستْ دەرکْ،
(يَصِــحُّ منهــا الْفِعْــلُ وَالتَّــركْ)
قــودرەتی عەبــدیچ هــەروا بــەو دەســتوور
(يَصِــحُّ مِنْهــا ذالِــکَ المــذكور)
بــۆچ ئەگــەر قــودرەت خــودایی نــەویَ
ئەو فیعلە بــەویچ هــەر مــەوجوود دەویَ؟
لاکــین بــە قــودرەت قــادری مــەعبوود
ئــەو فیعلــە چونکــە دەیێتــە وجــوود[٨٠]
دەویَ قــودرەتی بەنــدەی پــڕ تەقســیر
(مُقــارن الفعــلِ مِــنْ غیــر تــأثیر)
بــــەڵ وتگیانــــە عولــــەمای قــــادە:
قــودرەت وەســفێکە ئــەودووی ئــیرادە[٨١]
موئەسسیر ویَ وەک قودرەتی (ذو الخلـق)
یــاخۆ کاســب ویَ وەک قــودرەتی خــەلق
مــەعنای تەئســیریچ ئەگــەر لــەیاد ویَ
وە نییە مونحەصیر هــەر (فــیالایجـاد) ویَ

ئیجاد لەدوویە: ئیجادی لـە دواوەیـە. ئـەرصـەد: ئەگـەرچی. تەئسـیری: تەئسـیری قـودرەتی ئینسان. دەربەس: دەرگا لیَبەسراو، حەپس. ئەباڵ: ئـەلای. دەیێتـە: دیَتـە. وتگیانـە: وتوویانـە. ئەودووی: لەدوای. تەئسیریچ: تەئسیریش. وە نییە: وەها نییە.

واتە تۆ ئەی بەندەی خودا! تەنها ئەوەت بۆ دەمێنێتەوە کە ئـیرادە و قودرەتەکـەت بەرامبـەر و هاوکات بیَ لەگەڵ ئیرادە و قودرەتی خودای گەورەدا. بۆ ئەوەیش کە پاداشی چاک وەربگـری یـا

تووشی سزا و تۆڵە ببی ئەوەندە بەسە کە خودای گەورە یەکسەر و بێوچان پاش ئەو بەرامبەری و هاوکاتییە کارەکەت دروست بکا.

حوکمە شەرعییە زاهیرە پاکەکانیش بەم کردەوە دیارییانەوە بەستراون، بۆ نموونە وجووب بە نوێژەوە پێوەندە و، حەرامی بە دزییەوە. پاداشی چاک بەرامبەر یەکەمە و تۆڵە بەرامبەر دووەم. ئیتر مادام کارەکان لە تۆوە دەرکەوتن و تۆ شوێنیان بووی و بوون بە سیفەتت با قودرەتەکەیش تەئسیری نەبێ ئەو مەحەللییەت و مەوسووفییەتە بەسە بۆ ئەوەی ببیتە موکەللەف، واتە: هەرکارێ کە قودرەتت پێوەندی پێوە هەبێ با تەئسیریشی نەبێ تۆ تەکلیفی کردن یا نەکردنیت لێ دەکرێ. ئەم بەرامبەرایەتیی قودرەت و ئیرادەی ئینسانە لەگەڵ ئیرادە و قودرەتی خودای گەورەدا کەسبەکەی ئیمامی ئەشعەرییە.

مەولەوی(د.خ) لە بەیتی «نیسبەتی مەدە..» و سێ بەیتی دوایدا پوختەی رەخنەیەکی موعتەزیلە لە ئەشعەرییەکان باس دەکا و، بە بەیتی «قودرەت وسفێکە..» تا بەیتی «مەعنای تەئسیریچ..» وەڵامی دەداتەوە و دەفەرموێ: تۆ ئەی زەڵامی موعتەزیلە مەشرەب! قسەکەی ئێمە بە ناشیرین دامەنێ کە دەڵێین قودرەتی ئینسان تەئسیری نییە، بە مەحزی ئیستیلاح و بە بێمەعنای حسێب مەکە، نەکەی مەعنای قودرەتی ئینسان وا لێبدەیتەوە کە تەئسیری ببێ، ئەنجا کە دیت تەئسیر نییە بڵێی: کەواتە قودرەتیش نییە، یا بڵێی: کە قودرەتەکەی کاری نەکرد ئیتر ئینسانەکە موستەحەقی سزا و پاداش نابێ و ئەنجام بەربەرەڵا دەبێ.

بەڵێ وا مەکە؛ چونکە تۆ ئەگەر ئاگادار و زانای دەبێ ئەوە بزانی کە قودرەت سیفەتێکە بە زاهیری بۆ کردن و نەکردنی کار بشێ. قودرەتی ئینسانیش هەروەهایە. گومان لەوەدا نییە ئەگەر قودرەتی خودای گەورە لەسەر کارەکە نەبێ بە قودرەتی عەبدەکە دەکرێ، بەڵام چونکە قودرەتی خودا حازر و ئامادەیە بۆ تەئسیر ئیجاد قودرەتی عەبدەکە هەر ئەوەندەی پێ دەبڕێ بەرامبەری کارەکە بێ بەبێ تەئسیر.

بەڵکو زانا پێشەواکانی ئایینی ئیسلامیش وتوویانە: قودرەت سیفەتێکە دواکەوتووی سیفەتی ئیرادەیە، چ تەئسیری هەبێ وەک قودرەتی خودای گەورە و، چ نەیبێ و تەنها لە کەسبدا دەستی هەبێ وەک قودرەتی عەبد.

سەرەڕای ئەوەیش دەتوانین بڵێین، قودرەتی عەبدیش هەر خاوەن تەئسیرە، بەڵام مەعنای تەئسیرەکە هەر ئیجادی شت نییە لە نەبوونەوە، بەڵکوو ئەوەیش دەگرێتەوە کە ببێتە سەبەبی عادی بۆ ئەوە خودای گەورە کارەکە دروست بکا.

مووددەعی[٨٢] ئاگای هیچ لە خۆی نییە،
سەبەب بێ‌تەئسیر دەڵێ بۆچییە؟
ئەر نەیێ بە هەور ترش و تاڵەوە
ناوا کەڵوپەل کەس وە ماڵەوە
ئەر نەدا باران پەڵە لە زەوی
کەی ئە تەدارەک جووتت دەکەوی؟
ئەر ئاگر نەوێ من کەی بزانم
ئارەبڕ بکەم دەوری خەرمانم؟
خەلقی قودرەت رەبت لە مندا نەوێ
چلۆن بزانم ئەو فیعلە دەوێ؟

ناوا: نابا. کەڵوپەل: شتومەکی ناوماڵ بە شێوەیەکی گشتی. بارانی پەڵە: یەکەم بارانی سەردەمی پاییز کە زەوی ئاو دەدا و تۆو سەوز دەکا. تەدارەک: ئامادەکردنی پێویستیی هەر کارێ. جووت: کێڵانی زەوی. ئارەبڕ: کە لە نزیکی خەرمانێ یا دەغڵێکەوە ئاگر بکەوێتەوە و مەترسی لێ بکرێ، دەوران‌دەوری خەرمانەکە لە پووش و پەلاش پاک دەکەنەوە و بەڵکو دەیگەیێننە سەر خاکی سوور؛ نەبادا لە ڕێگای ئەو پووش و پەلاشەوە ئاگرەکە لە خەرمانەکەیش بەربێ، بەم کارە دەڵێن: ئاگربڕ، کە لە ناوچەی تاوگۆزی پێی‌دەڵێن ئارەبڕ.

واتە: ڕەخنەگری دژی ئەشعەری ئاگای لە مەعنای قسەی خۆی نییە و دەڵێ: قودرەتی عەبد کە سەبەب بێ و تەئسیری نەبێ سوودی چییە؟ نەبێ باشترە!

نەخەیر خراپ تێ‌گەیشتووە. تەئسیر تەنها ئیجادی شت نییە لە نەبوونەوە؛ ئەوەیش هەر تەئسیرە کە ببێتە سەبەبی عادی بۆ ئیجادی لە لایەن خودای گەورەوە، ئەوەیش هەر تەئسیرە کە شتێک ببێتە نیشانەی شتێکی تر و سوودی لێ وەربگیرێ، بۆ نموونە: ئەگەر خودا هەوری ترش و تاڵ نەهێنێ کە نیشانەی بارانە کەس کەڵوپەل و شتومەکی ماڵی خۆی کۆ ناکاتەوە بەجۆرێ بیپارێزێ لە تەڕبوون و زیان‌لێ‌کەوتن. ئەگەر بە بارانی پاییز پەڵە نەدا کەس خۆی بۆ جووت

کردن ئامادە ناکا و پێویستییەکانی جووتوبەرە حارز ناکا. ئەگەر ئاگر و شاڵاوی ئاگر نەبینم چۆن بزانم ئاگر هەیە و ترسی تەشەنەکردنی لێ دەکرێ هەتا دەوروبەری خەرمانەکەم پاک بکەمەوە و رێی ئاگرەکەی لێ بگرم. ئەگەر خودا قودرەتێکی وەها لە مندا دروست نەکا کە پێوەندی بە خۆم و کارەکەوە ببێ چۆن بزانم ئەو کارە دەبێ.

تۆ خۆت کەسێکی موعریز لە حەقی
ئەشعەری فەرمووی: تۆ موستەحەقی؟[٨٣]
بێ ئیستیحقاقی زەرەری چییە؟
بە فەزل و عەدلە بە عەمەل نییە
ئەر دەڵێی ئەو کەسب زەعیف بەوتەورە
بۆچ لایقە بەو عیقابی گەورە؟
دەڵێم ئەو کەسبی زەعیف بەوتەورە
بۆچ لایقە بەو سەوابی گەورە؟
ئەر لەم مامەڵە خەبەردار دەوی
تۆ فانی دەدەی، باقیدار[٨٤] دەوی
خوسووس وجوودت لەوە موستەفاد
(لَیسَ عَلَیهِ حَقٌّ للعِبَاد)
مەڵێ، وەک نالێی ئیجادی ئیحراق
(بَعْدَ مَسِّ النار) بۆچ دەکا خەللاق؟[٨٥]
لە دووای ئەوە بۆچ ئەو سەوابە؟
یا دووای ئەوە بۆچ ئەو عیقابە؟
ئەر تەخسیس بکا بەعزێ بە سەواب
وەر تەخسیس بکا بەعزێ بە عیقاب
بەندە بەندەی خۆی مولکیچ مولکی خۆی
کوا زوڵم و ستەم؟ هەر چەنە دەدەی!

بەڵــێ مــەدح و زەم حەســەن و بــێفــەڕ
بــە ئیعتیبــاری مەحــەللیی بــێگــەڕ
ئــەر بــارانی خــەیر بــە ڕۆژ و بــە شــەو
لــە هــەوری وجــوود مەرحەمــەتی ئــەو
نــــەبارێ وەســــەر عەدەمــــدا تــــاوێ
عــەدەمی هــەر شــەڕ تێریتــەم نــاوێ(۸٦)
پەس ئەر سەواب دا وەهـ وەهـ لـەم فەزلـە
وەگەر عـەزاب دا بەهــ بەهــ لـەم عەدلـە

باقیدار: خاوەن باقی، خاوەنی شتی نەبڕاوە. چەنە دەدەی: قسەی زیادە دەکـەی. بـێفـەڕی: ناشیرین. بێگەڕ: بێعەیب. (وەهـ وەهـ) و (بەهـ بەهـ) دوو کەلیمەی تەعـەجوبن لـە مەدحـدا، وەک بەخبەخ.

واتە: تۆ کە لات وایە تا قودرەتی ئینسان بە تەئسیری ئیجـادی نـەکا ئینسـانەکە موسـتەحەقی سزا و پاداش نابێ، بەم قسە لە راستی لات داوە، کەی ئیمامی ئەشعەری فەرمووی: تـۆ خـۆت لـە زاتی خۆتا موستەحەقی سزا و پاداشی؟ ئیستیحقاقی تۆ بۆ سزا و پاداش تەنها لەبەر ئەوەیە کـە تـۆ مەحەل و مەزهەری کاری، واتە: شوێنی کارەکە تۆی و کارەکە لە تۆدا دەبینرێ.

چ زیانێ لەوەدایە کە ئینسـانەکە لـە زاتی خۆیـا هـیچ موسـتەحەق نـەبێ؟ سـزا و پـاداش بـە ئیستیحقاق نییە بەو مەعنا کە تۆ دەڵێی، بەڵـکو خـودای گـەورە خـۆی بـە فـەزڵ و گـەورەیی و میهرەبانیی خۆی پاداشی چاک دەداتەوە، خودای گەورە بە دادپەروەریی خۆی تۆڵە دەسێنێتەوە، سزا و پاداش بە کردەوە نییە، ئەوەتە تۆ ماریکی بێعەقڵ و شعوور دەکوژی چونکە بە زەهرەکـەی زیان لە گیانلەبەران دەدا.

ئەگەر دەڵێی: ئینسانەکە کە قودرەتی موئەسسیری نەبێ و ببێتە شـوێنی گوناهــ چـۆن ئـەبێ موستەحەقی ئەو سزا گەورەیە بێ لە دۆزەخدا؟ منیش دەڵێم ئەی ئەو کەسـبە لاوازە بـێهـێـزەی ئینسان لە کاری چاکدا چۆن دەبێتە هۆی ئیستیحاقی ئەو پاداشە گەورە گەورانە؟

ئەگەر نەختێ وریا بی و ئاگات لەم مامەڵەیە بێ بۆت دەردەکەوێ کە تۆ قازانجت کـردووە؛ خـۆ چەند سەعاتێ لە عومری کورت و بڕاوەی خۆت، لەش و ئەندامی کەموکـووڕ و دواهـاتووی خـۆت

لەڕێی خودادا بەخت دەکەی بەرامبەر بە پاداشێکی بایەخداری پایەداری نەبڕاوە و، هەمیشە لە بەهەشتی ئەبەدی‌دا دەمێنیتەوە.

بەتایبەتی تۆ بوونەکەیشت لە خوداوە وەرگرتووە، کەوابوو حەقی بەندە بەسەر خوداوە نییە، حەقی خودای گەورە بەسەر بەندەوە هەیە، ئەو زانین و خواست و توانا و سیفەتەکانی تری پێداوی و کردوویتیە شوێن و دیدگای کار.

کەوابوو هەروەک ئەگەر ئاگر بەربێتە داری وشک و کڵپەی لێ هەڵبسێنێ ناپرسی و ناڵێی بۆچی خودا پاش لێکەوتنی ئاگرەکە سووتاندنەکەی دروست کردووە، ئەگەر پاش کردەوەی باش پاداش و پاش کردەوەی خراپ سزای بە بەندەی خۆی دا، مەپرسە بۆچی دوای ئەو کردەوەیە پاداش و دوای ئەوی تریان سزایە؛ چونکە لە هەردوولا ئەسباب و موسەببەباتی عادییە، کە لەوت نەپرسی لەمیش مەپرسە.

خودای گەورە ئەگەر پاداش بە هەندێ بدات و سزای هەندێکی تر بدات دڵنیابە بەندە بەندەی خۆیەتی و موڵک موڵکی خۆی، بە هەرجۆر دەس بخاتە ماڵی خۆی بۆی هەیە و کەس هەقی ڕەخنەی نییە، نە زوڵمە و نە کاری بێهوودە، پاداشەکەی فەزڵ و میهرەبانییە و سزاکەیشی عەدل و دادپەروەرییە، ئیتر قسەی زیاد و هیچوپووچ مەکە.

بەڵام کە خودای گەورە مەدحی ئینسان دەکا لەسەر کاری جوان و زەمی دەکا لەسەر کاری ناشیرین، ئەو لەو ڕووەوەیە کە ئینسانەکە شوێن و دیدگای کارەکەیە، ئەمەیش شتێکی بێجێیە و عەیبی نییە.

ئەگەر سەیری غەیری مەحەللییەت بکەیت ناگەیتە ئەنجام و هەرگیز تەئسیری ئیجاد بۆ بەندە ئیسپات ناکرێ.

تەنانەت ئەگەر سەرومڕ بارانی خەیر لە هەوری وجوودی پڕمیهرەبانیی خودای گەورە و بەخشندە بەسەر نەبووندا نەبارێ و ڕێژەنی لوتف و کەرەمی بوون نەخاتە شوێنی نەبوون وا خەڵک دروست نەکا، نەبوون هەرگیز خێر لە ناوچاوانی نابێتەوە.

ئەنجام ئەگەر خودای میهرەبان پاداشی بەخشی ئەوا بەخ‌بەخ لە بەخشندەیی خودا و، ئەگەر سزایشی‌دا بەخ‌بەخ لە دادپەروەریی ئەو.

سیرڕی مەزهەبی شێخ، ئەر بەیان بێ
دەشێ موددەعا تەمام عەیان بێ

تەوحیــدی ئــەفعال موقتــەزای واســە
قــودرەتی بەنــدە بــێ‌تەئســیر راســە
نیســبەتی فیعلــیچ حەقیقــەت دەدرێ
(یَحْتَمِـلْ) تەوجیهــ بـەم تــەرزە بکـرێ
ســیفاتێ کــەوا لــە ئێمــەدا هــەس
مــەبادیی ئــەفعال ئیختیــاری‌یــەس
لــە خۆیــان مــەناس خەواســی ئــەوان
مەزهــەری خــەواس ســیفاتی خــودان
ئیزهــار دەکــا حــەق خــەبیر و عــەلیم
(حُسْــنی الخــواص)ی ســیفاتی قــەدیم
لــــە ســــیفاتەکەی ئێمــــەدا وەهــــا
(عَلــــی وِجْهَــــةِ نَتَّصِــــفْ بهــــا)
وەک دەڵێن کە نەفس حەیی (بالـذات)ە
بــەدەنیچ حەییــە هــەر بــەو حەیاتــە
بــــەڵ دەڵــــێن: (بِعَــــیْنْ إرَادَتِهــــا،
عَــــیْنِ علمهــــا، وَ قُــــــدرَتِها)
موریــدە و عــەلیم قــەدیرە بــەدەن
بــێ ئەمــە مــەجاز بــۆی قــەرار بــدەن
لەبــەر ئیختــیلاف ئــەنواع و ئەشــخاس
ئیزهاری دەکا بـە چەنـد نـەوعی خـاس
لە زیعف و قووەت، قیللـەت و کەسـرەت
یــــەعنی موافیــــق بــــۆ قابیلییــــەت
بـە ئیشـارەی رووت خـۆ دەدا لـە رووت
(بِـی یَسْـمَعْ وَ بـی یُبْصِـرْ) دەفـەرمووت
موقتەزای واسە: موقتەزاکەی ئەوەیـە...

واتــە: ئەگــەر حەقیقــەتی مەزهــەبی ئەشــعەری بــەیان بکــرێ مەبــەس روون دەبێتــەوە و دەگەڕێتەوە بۆسەر (تەوحیدی ئەفعال) کە لەمــەوپێش باسمــان کــرد، تەوحیــدی ئــەفعال ئــەوە دەگەیەنێ کە تەئسیر لە کائیناتدا هەر تەئسیری خودایە و قودرەتی بەندە بێ تەئسـیرە و، لەگــەڵ ئەوەشدا کە قودرەتی بەندە بێتەئسیرە، بە حەقیقەت نەک مەجاز، نیسبەتی کارەکانی خــۆی لــێ دەدرێ و ئەڵێی: فلان کەس نوێژکەرە، ئەوی تر رۆژووگرە... تاد... تەوجیهی ئــەم نیســبەتدانی کاری بەندە لە بەندەیە بەمجۆرە دەکرێ: ئەو سیفەتانە لــە ئــادەمزاددا هــەن و دەبنــە مەنشــەئی. کارە ئیختیارییەکانی بەهۆی نەفسی ئادەمزادەکەوە نییە، بەڵکو لەبــەر ئــەوە بووەتــە مەزهــەر بــۆ سیفەتەکانی خودا، واتە: خودای گەورەی زانــا و ئاگــاداری نهــێنی و ئاشــکرا بــە خواســتی خــۆی خاسییەتە جوانەکانی سیفەتەکانی خۆی لە ئینساندا دەردەخا بۆ هەنــدێ کــەم و بــۆ هەنــدێ زۆر [وَفَوْقَ کلّ ذی علم عَلیم] بەم جۆرە بەندە دەبێتە خاوەنی ئەو سیفەتانە بەوشێوە کە هەڵــدەگرێ و بۆی دەشێ.

بۆ زیاتر رووناککردنەوە ئەڵێین گیانی ئینسان، کە بە نەفســی ناتیقــەیش نــاودەبرێ، (بالــذات) زیندووە، لەشی ئینسانیش بە تەبەعییــەتی ئــەو زیندوویەتییــە زینــدووە، بەڵــکو دەڵــێین گیــانی ئینسان(بالذات) خاوەن ئیرادە و خاوەن قودرەتە و شەخسی بەدەنی ئینسانیش بەهۆی ئەو ئــیرادە و قودرەتەوە (بالواسطە) خاوەن ئیرادە و خاوەن قودرەتە.

جا لەبەر ئەوە کە لەبەینی ئەنواعی گیانلەبەراندا لە چۆنیەتی و چەندیەتیی زانــین و خواســتدا جیاوازی هەیە، هەروەها لەبەینی ئەفرادی نەوعی ئینسانیشدا ئەم جیاوازییە هەیە، خودای گــەورە لەسەر قابیلییەت و لێهاتوویی ئەو ئەنواع و ئەفرادانە زانین و خواست و توانــا و ســیفەتەکانی تــری دابەش کردووە. نابینی ئەگەر خودای گەورە بە ئیشارەیێکی موجــەڕەد لــە مــاددە نیونیگایــەکی لوتف و میهرەبانیی خۆیت تیبگرێ و پرشنگی تۆزقاڵێ نووری لە ڕوومەتت بدا بــە هــەموو جــۆرێ ڕادەی زانین و خواست و توانــا و وزەت بــەرفراوان دەبــێ و دەچێتــە جیهــانێکی تــرەوە وەک لــە حەدیسدا دەفەرموێ «..ومایزالُ عبدی یتقرّب إلیَّ بالنوافِلِ حَتیّ احِبَّهُ، فإذا أحْبَبْتُهُ کنــتُ سَــمْعَهُ الذی یسمع بهِ وَ بصَره الذی یُبْصِرُ بِهِ وَیَدَه الّتی یبطش بها»[٨٧].

مەسەلا: قودرەت[٨٨] بەشــەر، بشــنەوە،
مەزهــەری تەئســیر قــودرەتی ئــەوە،

تەئسـیریٚ کـەوا زاهـیر (فی الخلـق)ە
هـەر تەئسـیرەکەی قـودرەتی حەقـە
(عَلـی تَفـاوُتْ أظْهَـرَهُ فـی
قـدرة الخلـقِ[٨٩] بالفضـلِ الـوفی
فـذاکَ الفضـلُ الصّـادرُ عَنّـا
صـادرٌ عَنـهُ قطعـاً، لکنّـا
ذالـکَ الفِعـلَ قـائِمٌ بنـا
بـلاَ شُـبْهةٍ، لا بِرَبّنـا
لأنّـهُ مِـنْ اوصـاف الاجسـام
تَعـالی عَنـهُ خـالق الأنـام)

مەولەوی لەم چەند بەیتەدا مەبەستە پێشووەکە ڕوون‌تر دەکاتەوە و دەفەرمویٚ:

بۆ نموونە بۆت دەهێنمەوە قودرەت و توانای ئـادەمزاد مەزهـەر و دیـدگای قـودرەت و توانـای خودای گەورەیە. بیٚ‌گومان ئەو تەئسیرە کە لەسەر دەستی خەڵکدا دەردەکەویٚ و بە هـی ئـەوانی دەزانین هەر تەئسیری خودای گەورەیە و لە قودرەتەکەی ئەواندا دەری‌دەخـا لەسـەر جیـاوازی و جۆراوجۆرییەکدا کە خۆی لەواندا دایناوە.

کەوابیٚ ئەو کارە کە لە ئێمەوە ڕوودەدا کردەی خودای گەورەیە، بـەلام بـە ئێمـەوە ڕاوەسـتاوە نەک بە خوداوە، چونکە ئەو کارانە لـە سـیفەتەکانی جیسـمن و خـودای گـەورەش لـە جیسـم و جەوهەر و عەرەز بەری‌یە.

ئەم تـەحریرە چـاک لـە مـەحزوور پاکـە
نـە تـەوارودە و نـە ئیشـتیراکە
بـۆچ ئـەو تەئسـیرە بـەو دەویٚ سـدوور
هـەر یـەک تەئسـیرە دەیێتـە زوهـوور
وەهـا کـە وەسـفی حـەق‌تەعالایـە
دیسـان بەڕاسـی وەسـفی ئـەم لایـە
تەئسـیری ئـەوە چونکـە خودسـەرە

تەئســـیری ئەمـــە چونکـــە مەزهـــەرە
(فـــرقٌ لطیـــفٌ فـــی البَـــیْنِ إسْـــمَعْ)
ئـــەو بـــە ئەســـالەت، ئـــەم بـــە (بـــالتبع)
قیـــامی مـــەعنای واحیـــد بـــە ئـــەمرەین
بـــە ئیتتیســـافی (لَـــیْسَ فیـــه شَـــیْن)
هەروەک ئیتتیساف بە وەسفی ســـیرعەت
بـــۆ موتەحـــەڕڕیک، لـــەبۆ حەرەکـــەت
بـــۆ بەنـــدە ویجـــدان (أوضـــحِ السُّـــبُل)
بـــۆ حـــەق بـــە دەلیـــل ئیســـتینادی کـــول
(إسْـــنادُ الأفعـــال للـــربّ الهـــادی
کإسـناد‌ها الـــــی العبـــــاد
أی بالحقیقَـــــةْ إلـــــی الطـــــرفَیْنْ
لا تجـــوَّز أصْـــلاً فـــی ذا البـــین)
بەڵـــێ واجبـــە ئیحتیـــات بکـــەین:
مووهیم ئەباڵ حەق هیچ ئیسناد نـەدەین
هـــەروەک ئاکیـــل و شـــاریب و فاســـیق
نـــەک میســـلی مـــوعتی، خـــالیق و ڕازیـــق

دەبێتە: دێتە. خودسەر: سەربەخۆ.

واتە: جارجار ئینسانی کەمفام واتێدەگا لەم شوێنەدا تەوارود ڕوودەدات، واتە: دوو فاعیل خـودا و بەندە لەسەر کردنی یەک کار بن. یاخۆ ئیشتیراک ڕوودەدات، واتە خودا و بەندە بـە شـەراکەت یەک کار بکەن؛ بەڵام بە وردبوونەوە لە نووسینە چاکەکەم دەردەکەوێ کە ئەم باسە لە تـەوارود و ئیشتیراکەوە دوورە؛ تەوارود ئەوەتە هـەردوو فاعیلەکـە تەئسـیری تـەواو بکـەن لـە ئەسـەرەکەدا بەجۆرێ هەرکامیان بگری تەئسیری کردبێ لـەو ئەسـەرەدا و تـەواوی کردبـێ. ئەمـەیش بەتاڵـە چونکە تەحسیلی حاسیل واتە پەیداکردنی شتێکی بوو، ڕوودەدات.

ئیشتیراکیش ئەوەتە کە دوو فاعیلەکە ئەسەرەکە لەبەینی خۆیاندا بەش بکەن و هەر یەکێکیان ئەندازەیەک تەئسیری تێبکات. ئەمەیش بەتاڵە چونکە قودرەت و توانای خودا بەش ناکرێ، ئەم بەش‌کردنە ناتوانایی خودا دەگەیەنێ و ئەوەیش مەحاڵە.

ئێمە وتمان ئەسەر یەک ئەسەرە کە بەدیمەن فیعلی عەبدە و موجید و خالیقی تاقە یەکێکە کە خودای گەورەیە، نیسبەت‌دانی ئەو ئەسەرە ئەلای ئینسان لەبەر ئەوەیە کە ئینسانەکە مەزهەر و شوێنیەتی، ئەگینا لە حەقیقەتدا ئەسەر هی خودایە و هەر تەنها ئەو مووجید و خالیقیەتی. کاری خودای گەورە لەو ئەسەرەدا (بالذات) ە، کاری بەندە تێیدا بە تەبەعییەتی کاری خودایە.

ئەوا لە بابەتی ئیجادەوە فاعیل یەکێ بوو کە خودایە، لە بابەتی مەحەللەوە مەحەل یەکێ بوو کە بەندەیە، ئەمەیش هیچ خراپەیەکی تێدا نییە. لە بابەتی قیام و ئیتتیسافیشەوە عەیب نییە لەوەدا کە سیفەتێ نیسبەت لە دوو زات بدرێ یەکێکیان (بالذات) و ئەویتریان (بالتبع) وەک (سرعة) کە راستەوخۆ دەبێتە سیفەتی زاتە جووڵاوەکە و دەڵێین فلان سەریعە و، دەبێتە سیفەتی جووڵانەوەکەیش بەڵام (بالتبع) و دەڵێین جووڵانەوەکە سەریعە. یا وەک جووڵانەوە دەبێتە سیفەتی کەشتی و دەوترێ کەشتی جووڵاو، دەبێتە سیفەتی دانیشتووانی سەر کەشتییەکە و دەوترێ دانیشتووانی جووڵاوی سەر کەشتی، دیارە بۆ یەکەمیان (بالذات)ە و بۆ دووەمیان (بالتبع)ە، جووڵانەوەی راستەقینە هی کەشتییەکەیە و دانیشتووان لەبەر ئەوەی لەسەر کەشتییەکەن پێیان دەڵێین جووڵاو.

ئەو کارانە کە ئیرادە و قودرەتی بەندە روویان تێدەکا سیفەتی بەندەن و لەوەوە دەردەکەون، ویجدان و حیسسی ئینسان خۆی باشترین دەلیلە لەسەر ئەمە. هەر نەفسی ئەو کارانە نیسبەت دەدرێنە لای خودای گەورە، بە دەلیلی ئەوە کە ئیسپات بووە هەرچی مومکیناتە نیسبەت ئەلای خودا دەدرێن.

نیسبەتی کارەکان بۆلای خودا حەقیقەتە وەکوو نیسبەتیان بۆلای عەبد حەقیقەتە، بەڵام نیسبەتیان بۆلای خودا بە جیهەتی خەلق و ئیجادە و بۆ لای عەبد بە جیهەتی مەحەللییەت و مەزهەرییەت.

ئەوەندە هەیە لێرەدا پێویستە ئیحتیات بکەین و هەر سیفەتێ کە نیسبەت‌دانی لە خودا کەم‌وکووڕی و عەیب بگەیەنێ بە دەممماندا نەیێ، وەک (آكل) و (شارب) و (فاسق). دیارە ئەمانەی وتمان وەک سیفەتی (معطی) و (خالق) و (رزّاق) نین کە نیسبەت‌دانیان کەم‌وکووڕیی تێدا نییە.

ئـەر دەڵـێی: زاهـیر لـەم تەحقیقـەدا
نایەڵـێ حەسـری خـەلق لـە حەقـەدا
دەڵـێین: مـەعنای خـەلق ئیجـادی تامّـە
تـابیعی عیلمـی تـەمام و عامّـە
عیلمـی تەفسـیلی وانـەبێ مـەجهوول
شەیئێ لە هیچ جوز لە ئەجزای مەفعوول(٩٠)
خـۆ عیلمەکـەی تـۆ ناقیسـە و موجمـەل
عـەری لـە تەفسـیل ئـاخر و ئـەووەل
ئـەم قـودرەتی تـۆ و ئـەم خواهیشـی تـۆ
ئەڵـبەت تابیعـە بـە دانشـی تـۆ
هەرگاهـ کـە مـەتبووع وەهـا هەڵـکەوێ
حاڵـی تابیعـت لـێ مـەعلووم دەوێ
مەزهـەر ئەگـەرچی راسـە مەزهـەرە
لـە هـەم عینـانیی مـوزهیر ئـەودەرە
کەسـبێکی هەیـە بـە موجـاوەرە
نـە (بـالمرّة) هـیچ، نـە موکابـەرە
بڵـێ بـە فـانۆس: ئـەم ضـەوئـە ئـی تـۆس
چلۆنـە دەگـەڵ شـەمعی نـاو فـانۆس؟
ئـەملا و ئەولامـە میسـالی (أوْلـی)
نییـە، (لله المَثَـلُ الأعلـی)
بـێ کـەمم و کـەیفی پـێم دەڵـێ: مەڵـێ
ئـەمما چـیبکـەم کـە (مشـکاة) دەڵـێ

خـواهیش: مەبەسـتی ئیرادەیـە وەک (خواسـت)ی کـوردی بـەکاری هێنـاوە. هـەمعینـانی: هاوجلەوی، وەک یەکی. ئەودەرە: بەدەرە، خاریجە. نـە (بـالمرّة) هـیچ: جـەبری. نـە موکابـەرە: قەدەری.

واتە: ئەگەر بەشێوەی ڕەخنە دەڵێی لەم تەحقیقەوە ئەوە دەرکەوت کە خالیقییەت تەنها بۆ خودا نییە؛ چونکە وەک نیسبەتی کار درا بۆلای خودا کە خالیقە نیسبەتیش درا بۆ لای عەبد و ئەمیش بوو بە مەبدەئی کارەکە.

زانایان لە وەڵامی ئەم ڕەخنەدا دەڵێن: نەخەیر خالیقییەت هەر هی خودایە؛ چونکە مەعنای خەلق ئیجادی تەواوە، ئیجادی تەواویش تابیعی زانینی تەواوە، زانینێکی وەها کە هیچ بەش و پارچەیەکی دروستکراوەکەی لێ دەرنەچێ و هەموو دەر و ناو و ئاشکرا و نهێنییەکی بگرێتەوە، دیارە زانینی عەبدیش زۆر کەموکووڕ و ناتەواوە، ئیرادە و قودرەتەکەیشی تابیعی زانینەکەینی، بێ گومان کە مەتبووع ناتەواو بێ تابیعیش ناتەواو دەردەچێ.

بەڵێ ڕاستە ئینسان مەزهەری کاری خودایە و لەودا دەردەکەوێ، بەلام ئاشکرایە ئەو زاتە گەورە بێوێنەیە کە ئەسەرەکە دەردەخا زۆر جیاوازە لەو شوێنە لاوازە بێهێزە کە ئەسەرەکەی تێدا دەردەکەوێ.

ئینسان تەنها کەسبەکەی هەیە کە دراوسێ و هاوکاتی دروستکردنەکەی خودایە، ئەم کەسبە نە وایە کە ئێجگاری هیچوپووچ بێ وەک جەبرییەکان دەڵێن، نە وایە کە خەلق بێ وەک موعتەزیلە قەدەرییەکان دەڵێن.

بۆ نەختێ ڕوونکردنەوە برۆ بە فانۆس بڵێ: ئەم ڕووناکییە کە ئێمە سوودی لێ وەردەگرین هی تۆیە، چۆنە ئەم ڕووناکییەی تۆ لەچاو ڕووناکیی ئەو مۆمەی کە لە ناوتدایە؟ مەولەوی دەیەوێ ئەوە بگەیەنێ کە نیسبەتدانی ئاساری ئینسان لە گەورە وەک نیسبەتدانی ڕووناکییە لە مۆمی داگیرساوی ناو فانۆس، بەڵام نیسبەتدانی ئاسار لە ئینسانەکە خۆی وەک نیسبەتدانی ڕووناکییە لە فانۆسەکە کە مۆمە داگیرساوەکەی تێدایە. چی بکەم، هەرچی ئەملا دەکەم و ئەولا دەکەم و هەوڵ و تەقالا دەدەم بۆ نموونەیەکی باش دەربارەی ڕوونکردنەوەی تەئسیری خودای گەورە نموونەی وەهام دەس ناکەوێ کالا لە قەد بالای گەورەیی و بێچوونیی خودا بێ.

بێچەندوچۆنیی خودا پێم دەڵێ قسە مەکە و دەم لەم کارە مەدە، ئایەتی [اللهُ نـورُ السّـموات والأرضِ مَثَلُ نورِهِ كَمِشْكوةٍ فيها مِصْباحٌ الْمِصباحُ في زُجاجَةٍ الزجاجةُ كَأنّها كَوْكَبٌ دريٌّ يُوقَـدُ مِـنْ شَجَرَةٍ مُبارَكةٍ... الآية][٩١] یش پێم دەڵێ: بڵێ مەوەستە، قسە بکە، نموونە بهێنەرەوە، هێزی بێ پایانی خودای گەورە لە مێشکی تەنگ و تەسکی بنیادەم نزیک بخەرەوە.

پـــەس ئـــەو تەئســـیری ئیختیارییـــە
بەم وەجهـە مەنسـووب ئـەباڵ بـاری یـە
کـــەوا تابیعـــە بـــۆ قـــودرەتی ئـــەو
قـودرەتیچ بـۆ عـیلم ئیرادەتـی ئـەو
خەلقـە و[٩٢] لەوێـدا هـیچ نەقسـی نییـە
فیعلەکەیچ دەڵـیین پێـی: مەخلووقییـە
ئـەمما (مِـنْ حیـثُ) قودرەتەکـەی تـۆ
عـیلم و ئـیرادە و فیترەتەکـەی تـۆ
قـەتعی نـەزەر کـەی لـە مەزهەرییـە
لـە هـەمجیـواری و لـە مەحەللییـە
کە پێی مەوسووفی و پێی دەوی موختار
لـــە ویجدانـــەدا هـــیچ نییـــە دیـــار
لـەوە وتیـان: خـەلق ئیجـادی تاممـە
لێـــت نەشـــێویە چـــاکی بفامـــە
یانیهـــای فیعلـــی خـــالیقی ئەکبـــەر
نییـــە لـــە تـــەرزی کـــرداری بەشـــەر
فیعلـی ئـەو خەلقـە و تـەمام و جـێگیر
ئیجـــادی مەعـــدووم (واجـب التـــأثیر)
کەسـبە و نوقسـانە فیعلەکـەی عیبـاد
(لاَ تـــــأثیرَ لَـــــهُ لا وَ لا الایجـــــاد)
بەڵـێ چـون تەئسـیر لـەو دەبێتـە دەر،
لێی ئیسناد دەدرێ و دەوێ وە مەزهـەر،
پێـیدەڵـێن: وەسـف و تەئسـیری ئـەوە
لـە خـەلق و تەسـیر دوورئەوەکـەوە[٩٣]
ویجـــدان وەهایـــە دیـــارە لێـــوە

تــۆهــەر چتێکــی دەپێچیــەی پێــوە
بــا نەڵــێن: بەسـە لـە عەقڵـی دەرچـوو
(لا خـــــالِقَ لا مُوجِـــــدْ إلاّ هُـــــوْ)
بۆچ؟ ئیجاد و خەلق لەبەر چەنـد دەلیـل
پێی‌دەوێ عیلمی موحیـت بـە تەفسـیل
(حَصَـــرٌ فـــی اللهِ ذا العلـــمُ الأکمَـــل
فانحَصَـــر الخلْـــقْ فیـــه، عَـــزَّ جَـــلَّ)
ئــەمما بــۆ موتلــەق فیعــل و ئیختیــار
عیلمـــی تەفســـیلی نـــادرێ قـــەرار
ئیســـنادی ئـــەفعال وا حـــەقیقی بـــوو
لە دەس قودرەتی ئێمـەیچ تەسـیر چـوو
مەزهەب و مەشرەب شـێخی ئەشـعەری
عەیان بـوو بیـزان نـەک بـە سەرسـەری

نەشێویە: نەشێوێ، تێک نەچێ. دەپێچیەی: دەپیچرێی.

واتە: کەوابێ ئەو تەئسیرە ئیختیارییە کە بەندە شۆێنیەتی و لە بەندەدا دەردەکەوێ، بەم شـێوە لە خودای گەورە نیسبەت دەدرێ کە تابیعە بـۆ قـودرەتی و قودرەتەکـەی تابیعـە بـۆ ئـیرادەی و ئیرادەکەیشـی تـابیعی عیلمەکەیـەتی. ئـەم تەئسـیرە کـە وتمـان خـەلق و ئیجادێکـە هـیچ کەموکووڕییەکی تێدا نییە و کـارە کراوەکـەیش دروسـتـکـراوی زاتی خودایـە. بـەلام هـەر ئـەو تەئسیرە لەولایەنەوە کە تـابیعی قـودرەتی تۆیـە و، قودرەتـت تـابیعی ئیرادەتـە و ئیرادەکەیشـت تابیعی عیلمەکەتە، کە هەموو کەموکووڕ و کۆڵەوارن، ئـەو ئەسـەرانە لەوانـەوە پەیـدادەبن بـەپێی عادەت ناونابرێن بە خەلق و ئیجاد و، ئەگەر سەیری ئەوە نەکەین کـە تـۆ شـۆێن و دیـدگای ئـەو ئەسەرانەیت و لەو رووەوە دەبنە سیفەتت و خاوەن ئیختیاری، بە ویجدان دەردەکـەوێ کـە هـیچ شتێکی تر دیار نییە.

بەلام ئەو خەلقە کە نیسبەتی لە خودای گەورە دەدەین بریتییە لەوە کە شتەکە لـە نەبوونـەوە دەهێنێتە بوون بە شێوەیەکی تەواو، کاری خودای گەورە وەک مەزهەرییەتەکـەی ئینسـان نییـە، خودا نەبوویێک دەکاتە بوو کە کەس ناتوانێ بیکا ئەو نەبێ.

ئەو کەسب و بەکارهێنانی توانایە کە تۆی بەندە پێیەوە پێچراوی، هەر بەشی ئەوەندەیە کە ببیتە مەوسووف و پێت بوترێ داربڕ، ئاودێر، نان‌دەر... تاد، ئیتر بەشی ئەوە ناکا پێت بوترێ خالیق و مووجید، ئیجاد تەنها کاری خودایە؛ چونکە خەلق و ئیجاد دەبێ دوای توانای تەواو و خواستی سەربەخۆ و زانینی سەرانسەر بێ، ئەمانەیش هەموو تەنها لە زاتی خودادا هەن.

نیسبەتی کار بۆلای بەندە و بۆلای پەروەردگار، با هەر حەقیقەت بن، بەلام نیسبەتی بۆلای خودا لە لایەنی خەلق و ئیجادەوەیە و، نیسبەتی بۆلای بەندە لە لایەنی مەحەللییەت و مەزهەرییەتەوەیە.

شایانی باسە مەولەوی، رەحمەتی خودای لێ بێ، لەم باسی ئەفعالی ئیختیارییەدا گەلێ قسەی جوانی کرد، گەلێ‌جار مەبەستێکی دووجار و زیاتر دووبارە کردەوە بۆ جێگیرکردن و دامەزراندنی لە مێشکی ئەهلی ئاییندا.

بەلام بەدرێژی باسی رێبازی قازی ئەبووبەکری باقلانی و ئوستاد ئەبوئیسحاقی ئەسفەراینی نەکرد. هەروەها بەوجۆرەی پێویست بێ دەستی بۆ رێبازی شێخ ئەبوومەنسووری ماتوریدی نەبرد، کە یەکێکە لە گەورە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت و پێشەوای کۆمەلێکی زۆریانە.

جا من لێرەدا کە باسەکە لە تەواوبووندایە دەمەوێ ئەم رێبازانە بە پوختەیی روون بکەمەوە بۆ ئەوانەی ئەم بابەتە دەخوێنن و دەیانەوێ تێکڕا لە سەروبەری مەسئەلەکە بگەن و بەرچاویان روون بێت.

سەرژمێرکردنی رێبازەکان بەجۆرێ کە بیروباوەڕی (فلاسفە) کانیش بگرێتەوە ئا بەم جۆرەیە:

ئەوەی لە کاری ئینساندا تەئسیر دەکا یا تەنها توانای خودای گەورەیە بەبێ‌توانای ئینسانەکە، ئەمە رێبازی جەبرییەکانە. یا هەر توانای ئینسانە بەبێ‌ناچاری و لەسەر واجب‌بوون، ئەمە رێبازی موعتەزیلەیە. یا توانای ئینسانە بەلام بە شێوەی ناچاری و لەسەر واجب‌بوون بەجۆرێ کارەکە لە تەئسیری ئینسانەکە دوا نەکەوێ، ئەمەیش بیروباوەڕی (فلاسفە) یە.

یا تەنها توانای خودای گەورەیە بەبێ‌تەئسیری توانای ئینسان، ئەم تەنها شوێنی تەئسیرەکەیە و ئەسەری توانای خودا لەمدا دەردەکەوێ، ئەمە رێبازی شێخ ئەبوولحەسەنی ئەشعەرییە.

یا تێکڕای توانای خودا و توانای ئینسانەکە، واتە: هەردوو تواناکە بەیەکەوە تەئسیر بکەن لە ئەسلی کارەکەدا، نەک لەبەر بێ‌کیفایەتیی توانای خودای گەورە (معاذ الله) ؛ بەلکوو هەتا

ئینسـانەکە ببێتـە موسـتەحەقی سـزا و پـاداش، ئەمـەیش ڕێبـازی ئوسـتاد ئەبووئیسـحاقی ئەسفەرایینی‌یە.

یاخۆ تێکڕای هەردوو تواناکەیە؛ بەلام بەجۆرێ توانای خودا تەئسیر بکا لـە ئەسڵـی کارەکـەدا و توانای ئینسان تەئسیر بکا لە وەسفی تاعەت و مەعسییەتیدا، ئەمەیش ڕێبازی قـازی ئەبووبـەکری باقلانی‌یە.

بەلام ڕێبازی ئیمام ئەبوومەنسووری ماتوریدی بریتییە لەوە ئەو کارەی لە ئینسانەوە ڕوودەدا بە خەلق و ئیجادی خودای گەورەیە؛ بەلام ئەم خەلقە شەرتێکی عادەتی هەیە، ئەو شـەرتە کەسـبی ئینسانەکەیە.

کەسب لای ماتوریدی بریتییە لەوە ئینسـان ڕووی خواسـت و توانـای خـۆی بکاتـە کارەکـە و بەکاریان بهێنێ. ئەم بەکارهێنانی خواست و توانایە وەکوو پێی دەڵێ کەسب، (إرادة جزئية) یشـی پێ‌دەڵێ و، بڕیاری داوە ئەم سەرفی ئیرادە و قودرەتە ئەسەری عەبدە.

ئەبوومەنسووری ماتوریدی لەگەڵ ئەوەدا کە لای‌وایە عەبـد هـیچ شـت ئیجـاد ناکـا، ئـەوەی لا ڕەوایە کە عەبد توانای وای هەبێ کە نیسبەت و ئیزافەی پێ بگۆڕێ، واتە: لەوانەیـە توانـای عەبـد بتوانێ ئیرادەی بەرەولای کارەکە وەرچەرخێنێ هەتا خودای گەورە ئەو کـارەی بـۆ دروسـت بکـا؛ چونکە خودای گەورە خۆی لە گەلێ ئایەتدا نیسبەتی کەسب و ئیکتیسابی لـە عەبـد داوە، وەکـوو ئایەتی [...لها ما كَسَبَتْ وعليها ما اكْتَسَبَتْ...][٩٤] یا وەک ئایەتی [تلك أمّةٌ قَدْ خَلَتْ لها مـا كسَـبَتْ ولكم ما كَسَبْتُمْ][٩٥].

بەلام کەسب لای ئەبوولحەسەنی ئەشعەری، وەک لەمەوپێش باس کرا، بریتییە لە بەرامبەری و هاوکاتیی خواست و توانای عەبد لەگەڵ خواست و توانای خودای گەورە، عەبد تەنها شـوێنی ئـەم بەرامبەری و هاوکاتییەیە و بە هیچ جۆرێ تەئسیری نییە، نە لە کارەکەدا و نە لـە وەرچەرخانـدنی توانا و خواستدا بەرەو کارەکە، خالیق و موجیدی کار و پێشەکییەکانی کار تەنها خودای گەورەیە.

جا پاش ئـەوە کـە بـە دەلیلـی عەقڵـی و نەقڵـی ڕێبازەکـانی جەبرییـە و موعتەزیلـە و قـازی ئەبووبەکری باقلانی و ئوستاد ئەبووئیسحاقی ئەسـفەرایینی بەرپـەرچ دراونەوتـە و (فلاسـفە) یـش هیچ پێوەندییەکیان بە ئایینی ئیسلامەوە نییە، ئەو ڕێبازەی کـە جێـی ئیعتیبـار بـێ بریتییـە لـە ڕێبازی شێخ ئەبوولحەسەنی ئەشعەری و ڕێبازی شێخ ئەبوومەنسووری ماتوریدی.

ئەوکەسە بیروباوەڕی مەیلەو تەفویزە بۆلای خودای گەورە با ئیختیاری ڕێبازی ئەشعەری بکـا. ئەوکەسەیش مەیلی ئەوەی هەیـە کـە عەبـد، بێجگـە مەوسـووفییەت و مەحەللییـەت، پێویسـتە عەلاقەدار بێ بە کارەکانیەوە و کەسب لەوەوە پەیدابێ، با ڕێبازی ماتوریدی پەسەندبکا و بڕیار بـدا کە ئینسان وەرچەرخاندنی قودرەت و ئیرادەی بەرەولای کارەکـە بـە دەسـتی خۆیـەتی، چونکـە خودای گەورە خـۆی لـە قورئـانی پـیرۆزدا نیسـبەتی کەسـب و ئیکتیسـابی لـە ئینسـان داوە و، پەیڕەویی زاهیری ئەو نیسبەتانە عەیبی تێدا نییە.

بۆ ڕۆشن‌کردنەوەی ڕێبازی شێخ ئەبوولحەسەنی ئەشعەری؛ خودای لێ ڕازی بێ؛ زانـای نـاودار عەبدولحەکیمی سیالەکوتی لـە حاشـیەکانیا لەسـەر حاشـیەکانی زانـای دیـاری خەیاڵـی لەسـەر شەرحی کتێبی عەقائیدی نەسەفی فەرموویەتی: کاری عەبد دوو بەشە: یەکەم خواسـت و توانـای خوای گەورە پێوەندی پێوە دەبەستێ بەبێ‌پێوەنـدیی عەبدەکـە. دووەم خواسـت و توانـای خـودا بەهۆی خواست و توانـا و ئیختیـاری عەبـدەوە پێوەنـدی پێـوە دەبەسـتێ؛ واتـە خـودای گـەورە توانایەکی وای داوە بە ئینسان بتوانێ ئەو شتەی ئارەزووی لەسەری بێ بیکـا، خواسـتێکی وایشـی پێ‌داوە هەتا تەرجیحی لایەک بەسەر لایەکی تردا بدا. جا کاتێ خواستی ئەو ئینسـانە تـەرجیحی لایەکی دا تواناکەیشی لەسەر ڕەزای ئیرادەکەی ڕوودەکاتە ئەو لایـەی کـە تـەرجیحی داوە هـەتا بیکـا، لـەم کاتـەدا خواسـت و توانـای خـودای گـەورە پێوەنـدی دەبەسـتێ بـەولاوە و گـورج و بێ‌دواکەوتن دەیکا.

ئەگەر یەکێ بڵێ ئەو تەرجیحی ئیرادەی ئینسانە بۆ یەکێ لە دوو لا ئەگەر مـەخلووقی خودایـە ئەوا جەبر ڕوویدا، خۆ ئەگەر مەخلووقی عەبدە ئەوا لازم دێ ئینسـان خـالیقی ئـەو لایـە بـێ کـە ئیرادەکـەی تـەرجیحی داوە؛ دەڵـێم ئـەو تەرجیحـە موئەسسـیری نـاوێ و موقتـەزای سـیفەتی ئیرادەیە؛ نابینی لە تـەعریفی ئـیرادەدا دەڵـێن: «الإرادة صـفة مـن شـأنها تـرجيح أحـدالطرفين المتساويين على الآخر لذاتها» واتە ئیرادە سیفەتێکە خۆبەخۆ تەرجیحی یـەکێ لـە دوو لای وەک یەک دەدا بەسەر لاکەی تردا.

جا ئەگەر یەکێ بڵێ مادام ئەم تەرجیح‌دانی یەکێ لە دوو لایە موقتەزای ئیرادەیە ئیتر سـوود و فائیدە لە تەکلیفەکەی خودای گەورەدا چییە؟ خۆ ئیرادەکە لە خۆیەوە دەبەسترێ بە یـەکێ لـەو دوو لایەوە؛ ئەڵێم: سوودی تەکلیفەکە ئەوەیە دەبێتە هۆی پێوەندیی ئـیرادەی ئینسـان بـە کـارە داواکراوەکەوە؛ چونکە تابیعی عیلمـە، جـا کـە موکەللـەف زانی خـودا تـەکلیفی کـردووە و داوای

کارەکەی کردووە، ئەو زانینە دەبێتە هۆی ئەوە کە ئیرادەکەی بەو لایەنـە داواکـراوەوە ببەسـترێ، ئەگەر گوێڕایەڵ بێ. پێوەندیی ئیرادەکـەیش دەبێتـە هـۆی پێوەنـدیی قودرەتەکـەی، ئەمـەیش دەبێتە هۆی عادەتی بۆ ئەوە خودای گەورە ئەو لایە دروست بکا.

پوختەی قسە: خودای گەورە عیلمێکی ئیجمالیی لـە ئینسـاندا دروسـت کـردووە بـە کـردەوە ئیختیارییەکانی پێش ئەوەی دروست بکرێن، بەهۆی شەرعیشەوە دەزانـێ کـام کـاری ئیختیـاری جوانە و دەبێتە مەدحی دنیا و پاداشی ڕۆژی قیامەت، دەیشزانێ کام کاری ئیختیـاری ناشـیرینە و دەبێتە هۆی زەمی دنیا و سزا و تۆڵەی ڕۆژی قیامەت. هەروەها خودای گەورە خواستێکی وەهـای لە ئینساندا دروست کردووە تابیعی عیلمەکەیەتی و تەرجیحی لایەک بەسـەر لایـەکی تـردا دەدا، توانایەکی وەهایشی پێداوە کە تابیعی ئیرادەکەیەتی، ئەم ئینسانە هێزێکی وەهـای هەیـە ئەگـەر خودا مەیدانی بدایە ئەوکارەی سەربەخۆ دروست دەکرد.

جا لەگەڵ زانینی عەبددا بـە جـوانی و ناشـیرینی کردەوەکـان ئەگـەر ئیرادەکـەی تـەرجیحی کردەوەی باشی دا و قودرەتەکەی ڕووی تێکرد خـودای گـەورەش بـۆی دروسـت دەکـا و عەبـد لەبەرئەوە کە شوێن و مەزهەری ئەو عیلم و ئیرادە و قودرەتەیە مەدح دەکرێ و لە ڕۆژی قیامەتـدا پاداش وەردەگرێ.

بەڵام ئەگەر ئیرادەکەی تەرجیحی کردەوەی ناشیرینی دا و قودرەتەکەی ڕووی تێکرد، خودای گەورە ئەو کارە ناشیرینەی بۆ دروست دەکا و عەبد لەبەر مەحەللییەت و مەزهەرییەت لـە دنیـادا زەم دەکرێ و لە ڕۆژی قیامـەتدا سزا دەدرێ.

ئەگەر بڵێیت ئەو ئیرادە کە تەرجیحی یەکێ لە دوولا دەدا ئەگەر مـەخلووقی خودایـە لازم دێ عەبد مەجبوور بێ و، ئەگەر مـەخلووقی عەبـدە لازم دێ عەبـد خـالق بـێ؛ دەڵـێم ئـەو سـیفەتی ئیرادەیە مەخلووقی خودایە و عەبدەکە لە نەفسی ئەو سیفەتەدا مـەجبوورە، بـەڵام لازم نایـێ لـە کارەکاندا کە دەیکا مەجبوور بێ؛ چونکە کارەکان بە ئیختیار دەکا، وەک ئەوە کە خـودای گـەورە سیفەتی ئیرادەی لەگەڵ زاتیدایە و بەو سیفەتە تەرجیحی یەکێ لە دوولا دەدات کەچی لە هەموو کارێکدا موختارە و ئارەزووی بە دەستی خۆیەتی.

ئەو کارانەیش کە خودای گەورە بۆ ئینسانەکەیان دروست دەکا، وەک بـە حەقیقـەت نیسـبەت دەدرێن بۆلای خودا بە شێوەی خەلق و ئیجاد، نیسبەتیش دەدرێن بە حەقیقـەت بـۆلای ئینسـان

بە شێوەی کەسب و ئیکتیساب، وەک لە قورئاندا دەفەرموێ: «وأنَّهُ لَمّا قـام عَبْـدُالله يَـدْعُوهُ كـادُوا يكونُونَ عليهِ لِبَداً»[٩٦]

شـتێکی زۆر ئاشکرایشـە کـە فـەرق زۆرە لەبـەینی نیسـبەتی کـارە ئیختیارییـەکان و کـارە نائیختیارییەکاندا؛ نموونەی نیسبەتی کاری نائیختیاری وەک بڵێی فلان نەخۆش کـەوت یـا فـلان مرد. هی کاری ئیختیاری وەک: فلان هەڵسا یا فلان دانیشت. قورئانی پـیرۆز پـڕە لـە نموونـەی نیسبەتی کار ئەلای ئینسان وەک: [... إنَّما تُجْزَوْنَ ما كُنْتُمْ تَعْمَلُون][٩٧] یا [...فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فـی النارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إلاّ كُنْتُمْ تَعْمَلون][٩٨] [إلاّ الذين آمَنُوا وعَمِلوا الصـالحات وتواصَـوْا بـالحقِ وتواصَـوْا بالصبر][٩٩] [وَ نَجّيْناهُ مِنَ القريةِالتي كانَتْ تَعْمَلُ الخبائثَ... الآية][١٠٠].

جا وەرە قورئان بە تەواوی بخوێنەرەوە، ئەگـەر شـتێکی دژی ئـەم تـەقریرەی ئێمـەت دی بـە شێوەیەکی ڕەوا و بەجێ ڕەخنەی لێبگرە و ڕەددی بکەرەوە، ئەگینا ئینسان بێکار نابێ، بەڵکو بە شێوەی کەسب و ئیکتیساب خاوەنی کارەکانی خۆیەتی.

خەواسسێ کە هەس بـۆ سـیفاتی نـاس
هەرگاهـ خەواسسـی سـیفاتی خـوداس
مومکینـــە روئیـــەت (بـــارء الـــوَرَی)
لەبۆ مۆئمینـان لـە نەشـئەی ئـوخرا[١٠١]
بۆچی؟ مەرئی بوون، لە شـک ئـەودەرە،
کــە لــە ئاســاری وەســفی بەســەرە
خاســەی بەســەریچ چییــە؟ ئیبصــارە
ئەســـەری ئیبســـار چییـــە؟ دیـــارە
یـا مومتەنیعـە کـە قـەییوومی حـەی
خـۆی بوێنـێ زات بـێمیسـالی خـۆی،
زەحمەت کەس بێژێ: ئیسباتی دەکەم،
(أو تُمكــنْ لَنــا بِــلاَ كَيْــفْ وَكَــمّ)
جـائیزە و (سـمعاً) وقـووعی یـەقین
(رَبّنــا ا رْزُقْنَــا إيّاهــا آمــين)

هەرگاه: هەرکات، بەلام لەم جۆرە شوێنەدا وەک (کەوابوو) و (ئەگەر وابوو) بۆ مـەعنای شـەرت بەکاردەهێنرێ.

واتە: مادام هەرچی خەواسی سیفەتەکانی ئینسانە خەواسی سـیفەتەکانی خـودای گەورەیشـە بینینی خودای پەروەردگاری جیهان بۆ موسوڵمان لـە رۆژی قیامەتـدا بـێچەنـدوچوون شـتێکی مومکینە؛ چونکە بێگومان خاسسە و سیفەتی چاو بینینە، ئەسەری بینینیش بەوەیە بینراو ببێ.

ئینسان بە چـاوی خـۆی بەقـەدەر هێـزی چـاوی خـۆی و خەڵـکی تـریش دەبینـێ، خـودای گەورەیش غەیری خۆی دەبینـێ و زاتی بـێوێنـەی خۆیشـی بـێچەنـدوچوون دەبینـێ، کەواتـە مومکینە ئینسانی موسوڵمان لە رۆژی قیامەتدا خودای خۆی بێچەندوچوون ببینێ بەوجۆرەی کە خودا خۆی دەزانێ چۆنە؟

دوای ئەمە مەولەوی دەیباتەوە بۆ جیهانی عیلمی مەنتیق و بە شێوەی قیاسـێکی ئیستیسـنائی دەفەرموێ: یا ئەبێ مومتەنیع بێ خودای گەورە زاتی بێوێنەی خۆی بێچەنـدوچوون ببینـێ، یـا ئەبێ بۆ ئێمەیش مومکین بێ بە بێچەندوچوون ئەو ببینین. بە قانوونی عیلمی مەنتیق (یـا ئـەبێ مومتەنیع بێ... تاد) پێیدەوترێ (مُقَدّم) و بـە (یـا ئـەبێ بـۆ ئێمـەیش... تـاد) دەڵـێن (تـالی) و عیبارەتەکەیش بە هەردوو بەشەکەیەوە پێیدەوترێ (قضیەی منفصلەی حقیقیە)

لەم جۆرە قەزیەیەدا بەدی‌نەهاتنی موقەددیم دەبێتە هۆی بوونی تالی، واتە: کە بینینی خودای گەورە بۆ زاتی خۆی بێچەندوچوون مومتەنیع نەبوو وا بینینی موسوڵمانیش بۆی بێچەنـدوچوون مومکینە. کەسیش ناتوانێ بڵێ: بینینی خودای گەورە بۆ زاتی خۆی بێچەندوچوون مومتەنیعـە و ماهییەتی مومتەنیعیش ناگۆڕێ و، وەک خودا خۆی نابینێ موسوڵمانانیش نـایبینن، بەڵـێ کـەس ناتوانێ ئەمە بڵێ چونکە خودای گەورە بەصـەر و هێـزی بەسـەری هەیـە و ئەسـەری بەسـەریش بینینە و بینینی خۆی بۆ خۆی بەبێچەندوچوون مومکینە، ئەنجام بینینی موسوڵمانیش بـۆی لـە رۆژی دواییدا بێچەندوچوون مومکینە.

مەولەوی پاش ئەوە کە ئیمکانی بینینەکەی بە عەقڵ و دەلیلی مەنتیقی ئیسپات کـرد دەڵـێ: نەک تەنها ئیمکان و جەواز؛ بەڵکو بە دەلیلی سەمعیی یەقینی سـابت بـووە کـە ئـەم بینینـە بـێ چەندوچوونە لە رۆژی قیامەتدا بۆ موسوڵمان روودەدات؛ لە قورئـانی پـیرۆزدا دەفـەرمۆی: [وُجُـوهٌ يَوْمَئِذٍ ناضِرَةٌ إلى رَبّها ناظرة][١٠٢] یا [وَاتَّقُوا الله وَاعْلَمُوا أنّكُمْ مُلاقُوهُ وَبَشّـرِالمؤمنين][١٠٣] یـا [لِلّـذينَ أحْسَنُوا الحُسْنى وَ زِيادة... الآية][١٠٤].

هەروەها لە حەدیسی شەریفدا هاتووە:

«إنّکم سَتَرَوْنَ ربّکم کما تَرَوْنَالقمر لَیْلَةَ البدر» خودای گەورە بە میهرەبانیی بێپایانی خۆی بیکا بە نسیبمان.

کەوتگین ئەو بێخ با بێینەوەو سەر
لەسەر دوو قیسمە ئیمان بە قەدەر[١٠٥]
قیسمێکیان ئەمە کە باوەڕ بکەین
(سَبَقَ فی عِلْمْ خالِقِ الکونَین[١٠٦]
ما یفعلُهُ آحادُ العِبادْ
مِنْ خَیْرٍ شرٍّ، غَیٍّ أو رَشادْ،
وَما یُجازی العِبادُ عُلَیْه
وکَتَبَهُ وَأحْصَاهُ لَدَیْه[١٠٧]
مَتی؟ قَبْلَ اَنْ یُخْلَقَ الأنام
جُفَّتِ الصُّحُفْ، رُفِعَ الأقلام
وَتَجْری الأعمالُ علی ما سَبَق
فی کتابِهِ وَ عِلْمِهِ الحق)
عیلمی بێ تەبدیل، تەقدیر بێتەغییر
(«مایُبَدَّلُ...» إلیه یشیرُ)
عیلم و ئیرادەی باریی بەرز و پەست
هەر چلۆن بە بوون هەر شەیئێوە بەست
جەهل و تەخەللوف موراد مەحاڵە
هەر دەشێ بوێ بەو تەرزە و حاڵە
وەرنە لە عەدەم ئەزەلیدا ما
(مَنْ یُوجِدُهُ؟، بَلْ فیهِ داما)

کەوتگین ئەو بێخ: کەوتووینەتە بن. باری: خالق. بەرزوپەست: مەبەست ئاسمان و زەوی، یا چیا و دەشتە. وەرنە: وە ئەگەرنا. ما: مایەوە، یا (ما) لەگەڵ (دا)ی پێشەوەی یەک وشەیە و (داما)

يە، واتە: بە ناچارى لە نەبووندا داما و بێدەسەلات بوو. (من يوجدە): كێ دروستى ئـەكا. (دامـا): (دام) ەى فيعلى مازى و ئەلفى ئيتلاقە.

مەولەوى، بەڕەحمەت بێ، بەهۆى باس و روون‌كردنەوەى نهێنيى ڕێبازى ئەشـعەرى و گـەڕانى بەدواى تەعبيرێكدا كە لەگەڵ مەشرەبى ئەو ئيمامەدا بگونجێ لـە ئەسڵـى مەبەسـت كـە قـەزا و قەدەرە دووركەوتەوە، دوايى گەڕايەوە سەر ئاسار و لێى نزيـك بوويـەوە، وا ئێسـتەيش راسـتەوخۆ گەڕايەوە سەرى؛ ئەوەتا ئيمان بە قەدەر دەكا بە دوو بەشەوە، بەڵێ ئيشارەيە بـۆ ئەمـەى باسمـان كرد كە دەفەرموێ: «كەوتگين ئەوبێخ... تاد»، واتە: زۆر چوويـنـە نـاو باسـى كەسـب و خەڵـق و كەوتينە بنى دەرياى ڕێبـازى ئەشـعەرى و لـە مەبەسـتى سـەرەكى دووركەوتينـەوە، بـاش وايـە بگەڕێينەوە سەر دەريا و لەگەڵ قەزا و قەدەردا تێ‌هەڵچينەوە:

ئيمان بە قەدەر دووبەشە: يەكەم ئەوەيە باوەڕ بكەين بەوە كە هەرچى عيبادى خـودا دەيكـەن خێر بێ يا شەڕ، گومڕاهى بێ يا رزگارى و شارەزايى و، هەرجۆرە كارێ جەزاى لەسەر دەدرێتـەوە هەموو لە عيلمى خوداى گەورەدا رابوردووە و سەرژمێرى كـردووە لـە پـێش ئـەوەدا كـە جيهـان دروست بكا و خەڵقە موكەللەفەكان لە نەبوونەوە بهێنێتە مەيدانى بوون. خـوداى گـەورە عيلمـى رابوردووە بە كردەوە و هەڵس‌وكەوتى هەموو موكەللەفێ كە چۆن هێز و وزەى خۆى بەكار دێنـێ، چۆن هەڵدەسێ، چۆن دادەنيشێ لەسەر خواست و ئارەزووى خۆى هەتا ماوەى ژيانى تەواو دەبێ، كەوابێ نامەى نووسراوى كردەوەكانى پاشەڕۆژى بەندەگانى خودا بـە تـەواوى وشـك بووەتـەوە و خامە هەڵگيراوە.

كار و كردەوەكان بەوجۆرە دەڕۆن كە لە عيلمى خودا و كتێبەكەيدا هەن و، عيلمـى خـودايش ناگۆڕێ و هەڵس‌وكەوت چۆن بڕيار دراوە هەر بەوجۆرە دەبێ. ئايەتى [ما يُبدّلُ القولُ لَدَيَّ وَ ما أنا بظلّامٍ للعبيد][(١٠٨)] يش ئيشارەيە بۆ ئەمەى وتمان.

هەروەها باوەڕ بكەين بەوەى كە عيلم و ئيرادەى خوداى خاليقى ئاسمـان و زەوى پێوەنـديان بە بوونى هەرشتێكەوە بەست بە هەر شێوەيە كە دەيەوێ بەو شێوەيە دێتەجێ، نە عيلمى خوداى گەورە دەگۆڕێ و، نە ئەوەى ويستوويەتى دوادەكەوێ؛ ئەگەر ئـەوەى ئـەو زانيويـە نەيەتـە جـێ و شتێكى‌تر بێ يا هەر نەبێ زانينەكە دەبێتە نەزانين، ئەگەر ئەوەى ئـەو ويسـتوويەتى نەيەتـە جـێ دەبێتە بێ‌دەستەلاتى و بێ‌ئيرادەيى؛ ئەمانەيش بۆ خودا مەحاڵن.

دیارە ئەوەیش کە عیلم و ئیرادەکەی پێوەندی بە بوونیەوە نەبەستبێ لە نەبوونی ئەزەلی‌دا دەمێنێتەوە، کێ دروستی دەکا بێجگە خودای گەورە، کە ئەو دروستی نەکرد لە نەبوونی ئەزەلی‌دا بەردەوام و پایەدار دەبێ! لە حەدیسی حەزرەتی پێغەمبەردا هەیە: [مَا شاء الله كَان، وَمَا لم يَشَأْ لم يَكُن].

پێویستە موسوڵمانی وریا لەم مەسئەلە تێبگا و پێوەندیی عیلم و ئیرادەی خودای گەورە نەکاتە هۆی بێچارەیی و داماویی خۆی؛ چونکە وەک وتمان عیلمی خودا پێوەندی بەوەوە بەستووە کە فلان کەس لە فلانە کات و شوێندا لەسەر زانست و خواست و توانای خۆی روودەکاتە فلان شت و دەیکا، ئیرادەی خودای گەورەیش تابیعی عیلمیەتی و قودرەتیشی بۆ دروستکردنی شتەکان لەسەر شێوەی پێوەندیی ئیرادە و عیلمەکەیەتی.

وا لێرەدا ئەو قسە مەشهوورە روون بووەوە کە دەڵێ: (عیلم تابیعی مەعلوومە، یا عیلم حاکیی مەعلوومە) واتە: (بلا تشبيه) عیلمی خودا وەکوو ئاوێنەیەکە هەمووی جیهان بنوێنێ، وێنەی هەموو کار و کردەوەیەکی پاشەڕۆژی تێدایە، کەم و زۆر، بچووک و گەورەی لێ ون نابێ، چۆن روودەدەن وەها دەیان‌نوێنێ، کەوابێ مەدح و پاداش بۆ کابرای چاکەکارە و سەرزەنش و سزایش بۆ کابرای خراپەکار. [وَقَالَ الّذين كَفَرُوا لا تأتينا السّاعَةُ قُلْ بَلى وربّى لَتَأْتِيَنّكُمْ عالمِ الغَيْبِ لاَ يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقالُ ذَرّةٍ فى السّمواتِ وَلاَ فى الأرض وَلاَ أصْغَرُ مِنْ ذَلِكَ وَلاَ أكْبَرُ إلاّ كتاب مُبينٍ][١٠٩].

(لكِنْ فى لَوْح المحوِ والإثبات)
بۆ ئەمە کەس دەرک عیلمی حەق نەکات
بەعزێ بە موتڵەق نویسیاگە
قەیدی لە عیلمی حەقدا کریاگە
(هَذا سَعِيدٌ) کەچی (قَدْ يَشْقى)
(ذا شَقِيٌ) کەچی (يَسْعَدْ وَيَرْقى)
لەبەر ئەوە ئەمر وەلی سەقەتە
کەشفیچی راسە و کەچی غەڵەتە[١١٠]
بۆ بەعزێکیچ هەس شوقووقی تەعلیق
ئەر وابێ وەها، وەر نە وا تەحقیق

بـۆ مـەحو و ئیسـبات، بـۆ ئـەم تەوزیحـە
(یمحُـــوالله مَـــا یَشـــا) ســـەریحە
(فَمِـــنْ جِهَـــةِ عِلْمِـــهِ الأعْلَـــمْ
عَرَفْـــتَ القَضـــا کُلّـــهُ مُبْـــرَمْ)
ئەجـــەل یەکێکـــە لـــەڕێ لا نـــەدەی
مـــەقتوول مەیبیتـــە بـــە ئەجـــەلی خـــۆی
رزقت مەعلوومـە و ئـەم کەلامـە سـیدق:
(هُـــوَ الـــرّزاقُ، وَالحَـــرَامُ رِزق)
نە کەس لە رزقی خـۆی مـەحرووم دەوێ
نە کەس رزقی کەس بـۆی هەڵـدەکەوێ
هەرکەسێ ئـی خـۆی دەخـوا و دەنۆشـێ
حـەلاڵ یـا حـەرام ئـی خـۆی دەپۆشـێ
کەســـێ ئـــەر رەزا وەر نـــاڕەزا وێ
هـەر دەوێ هـەرچی حـوکمی قـەزا وێ
ئەر قـەزا نییـە بـۆچ ئـەم پەڕەوپـەڕ؟[111]
وەر قـــەزا هەیـــە (فَـــأَیْنَ المَفَـــرّ؟)
ئـەر رازیـی، دانـیش، وەرنـە بـێ بـڕۆ
لـەم جیهەتـەوە تـەی وێ گفـتوگـۆ

نویسیاگە: نووسراوە. کریاگە: کریاوە. ئەر: ئەگـەر. وابـێ: وەهابـێ. وەر: وە ئەگـەر. وا: وەهـا. دەوێ: دەبێ. رازی: کورتکراوەی (رازیت)ە. تەی وێ: تەی بێ، واتە با بپێچرێتەوە، با بەس بی.

واتە: وەکوو باسمان کرد ئەوەی لە عیلمی خودادا رابـوردووە دەبـێ هـەر ببـێ؛ زانـینی خـودا ناگۆڕێ بە نەزانین و چیی ویست دەبێ بێتـە جـێ. بـەڵام لەسـەر رووی (لـوح المحفـوظ)دا کـە پێیدەڵێن لەوحی مەحو و ئیسبات لەبەر ئەوە کە هیچ فریشتەیەک لەوانەی چاویـان بـەو لەوحـە دەکەوێ، یا هیچ وەلییەک لەو وەلییانە کە خوای گەورە بە لوتفی تایبەتیی خۆی بەرچاویان روون دەکاتەوە و جارجار بە شێوەی کەشف ئەو لەوحە دەبینن، نەگەنە حەقیقـەتی ئـەوەی لـە عیلمـی

خودادایە، هەندێ شت بە موتڵەقی نووسراوە کەچی لە عیلمی خودای گەورەدا قەیدی هەیـە، بـۆ نموونە: لەو لەوحی مەحو و ئیسباتەدا نووسـراوە: (هَـذا سَـعیدٌ): ئەمـە بـەختیارە بـە موتڵـەقی و بێقەید، لە عەینی کاتدا لە عیلمی خوادا موقەییەدە بەو شەرتە کە هاوڕێی فلان پیاوچاک بێ، جـا کابرا شەرتەکە بەجێ ناهێنێ و لەگەڵ ئەوەی پیاوچاکـدا هەڵـسوکـەوت ناکـا و ئـەنجام دەبێتـە شەقی و نابەختیار. یا نووسراوە: (ذا شقيٌ) ئەمە بەدبەخت و نابەختیارە، ئەمیش هەر بە موتڵـەقی و بێقەید، بەڵام لـە عیلمـی خـودای گـەورەدا موقەییـەدە بـەوە ئەگـەر بێـت و ڕەفاقـەتی فـلان پیاوخراپ بکا، کەچی ئەم زەلامە هاوڕێیەتی پیاوە خراپەکـە ناکـا و ئـەنجام لـەباتی بەدبـەختی و ماڵوێرانی بەختیار دەردەچێ وەک مەولەوی دەفەرموێ (يَسْعَدُ و يَرْقى).

جا لەبەر ئەمە کە وتمان هەندێ لە دۆستانی خودا بە کەشف هەندێ شـتیان بـۆ دەردەکـەوێ بەڵام بە قەیدەکەی نازانن کە تەنها لە عیلمی خوادایە. ئەمانە لە لایەکەوە ڕاسـت دەکـەن و شـتە موتڵەقەکەیان دیوە، لە لایەکی ترەوە کەوتوونەتە هەڵەوە؛ چونکە ئاگایـان لـە قەیدەکـەی نییـە و بەمجۆرە مەولەوی واتەنی، کاریان سەقەت دەبێ.

هەرووەها بو هەندێ شتی تر لە (لوح المحفوظ)دا شـەرتی جۆراوجـۆر دەنووسـرێ، بـۆ نموونـە دەنووسرێ: ئەگەر فلان کەس مامۆستای فلان قوتابخانە بـێ پایـەدار دەبـێ و ئەگـەر مامۆسـتای ئەوێ نەبێ ناپایەدار و دانەمەزراو دەبێ، لە عیلمی خودایشا ڕابوردووە کام شەرت لـەو دوو شـەرتە جیاوازانە دێتە دی و ئەنجامی کار چۆن دەبێ.

جا ئەو مەحو و ئیسباتە کە لە ئایەتی [يَمْحُوالله مَا يَشاء ويُثْبِتُ وَ عِنْدَهُ أمُّ الكتـاب](١١٢) دایـە یـا زیادکردن و کەمکردنەوەی عومر لە ئایەتی [وَمَا يُعَمَّـرُ مِـنْ مُعَمَّـرٍ وَلاَ يُـنْقَصُ مِـن عُمُـرِهِ إلاّ فـي كتاب...](١١٣) یا لە حەدیسی سیلەی ڕەحم و ڕاگـرتنی مـافی خزمایەتیـدا کـە دەفـەرموێ: «صِلَةَ الأرحامِ تزيدُ في العمر» ئەمانە هەموو لەسەر ئەو بناخەن کە ئەو شەرتانە بێنە جێ کە بە زاهـیری نین و لە عیلمی خوادا هەن، یا یەکێ لەو دوو شەرتە جیاوازانە کە نـەکا نموونـەیانمان بـاس کـرد بێـتە دی.

بۆ نموونە: لە (لوحِ المحفوظ)دا نووسراوە: فلان ئەمساڵ ئەمرێ، لە عیلمـی خـوادا بـەو شـەرتە دەمرێ کە سیلەی ڕەحم جێبەجێ نەکا، کەچی ئەو لەم ساڵـەدا سـیلەی ڕەحمـی زۆری بـەجێ هێنا و شەرتی تەمەن درێژییەکەی کە لە عیلمی خوادا شەرت بوو هاتە دی. ئـەنجام کـابرا چەنـد

ساڵی تر خودا تەمەنی درێژ دەکات و مردنی لەو ساڵەدا لەو لەوحە دەسڕێتەوە، هەروەها نموونەکانی تریش.

پوختەی قسە: لە لایەنی پێوەندیی عیلمی خودای گەورە بە حەقیقەتی شتەکانەوە، داخۆ فلان کار چۆن دەبێ و چۆن نابێ، شەرتی بەختیاری و چارەڕەشی دێتە جێ یا نا، هەمووکارەکان بێ لێجیاکردنەوە (مُبْرَم) و بڕاوەن، بەڵام لە لایەنی نووسراوییان لە لەوحی مەحو و ئیسبات، واتە لە (لوح المحفوظ)دا هەندێکیان موبرەمن وەکوو ئەوانەی کە نووسراوی لەسەر لەوحیان لەگەڵ ئەوەی لە عیلمی خوادایە جووت و ڕێک بن. هەندێکیشیان موعەللەقن وەکوو ئەوانەی کە لە (لوح المحفوظ)دا موبرەم دیارن و لە عیلمی خودای گەورەدا بەستراون بە شەرتێکەوە، شەرتەکە نایێتە جێ، ئەنجام ئەوانیش نایێنە جێ.

هەروەها دەبێ باوەڕمان وابێ ئەجەل، کە دواکاتی بڕانەوەی ژیانە، یەکێکە و بریتییە لەو لەحزەیە کە دواهەناسەی ئینسان دێتە دەر، ئیتر ئەو کاتە شتێکی عادەتی بێ وەکوو ئەجەلی پیرێکی بەتەمەن، یان نا وەکوو گەنجێکی تازەهەڵچوو دڵی ڕاوەستێ و بمرێ، یا یەکێ بە رووخانی خانوو بەسەریا یا بە خنکان یا بە سووتان، یا مارپێوەدان یا بە کوشتن بمرێ.

کوژراو بە ئەجەلی خۆی مردووە، لە عیلمی خوادا رابوردووە ئەو ئینسانە لەو ساتەدا و لەو شوێنەدا بە تاوانی کابرایەکی تاوانکار دەکوژرێ. ئەوانە کە دەڵێن ئەجەل دووانە تەبیعی و ناتەبیعی، یەکەم وەک مردنی ئینسانی تەمەن‌درێژ، دووەم وەک مردن بە کارەساتی لەپڕ و نالەبار، قسەکەیان هەڵەیە؛ چونکە ئەمانە تەماشای یاسای سروشت دەکەن، نەک عیلمی ئەزەلیی خودا. هەروەها قسەی ئەوانەیش هەڵەیە کە ئەڵێن ئەجەل یەکێکە و بریتییە لە تێکچوونی بونیە و مەزاجی ئینسان، ئیتر هەر هۆیەکی تر پێش ئەم تێکچوونی بونیە و مەزاجە ببێتە سەبەبی مردنی ئەوە ئەجەلە ئەسلییەکەی بڕیوە و پێشی خستووە، ئەمانیش هەر لەسەر یاسای مەزاج و ماددە قسە دەکەن نەک لەسەر بناخەی عیلمی خودای گەورە و پێوەندیی ئەو عیلمە بە تەواوبوونی ماوەی ژیانی ئینسانەکەوە.

لە عیلمی ئەزەلیی خودای گەورەدا رزق و ڕۆزیی هەموو کەس دیاری و زانراوە لە خواردەمەنی و بەرگ و پۆشاک و جێگە و ڕێگە و شتی تر. شتێکی زۆر ڕاستە خوا ڕۆزی‌دەرە و ئەو رزقە؛ چ بە شەرعی دەست بخرێ یا لە ڕێگای ناشەرعی و حەرامەوە پەیدا بکرێ هەر رزقە، دیارە ئەوەیان کە

بە ڕێگای ناڕەوا ڕزقی پەیداکردووە لە ڕۆژی جەزادا تۆڵەی ئەوەی لێ دەسەنرێتەوە کە ڕێگای چەوتی گرتووەتە بەر و لە ڕێی حەلاڵەوە هەوڵی ڕزق و ڕۆزیی نەداوە.

کەس لە ڕزقی دیاریی خۆی بێبەش نابێ و کەسیش ڕزقی کەسی تر ناخوا؛ هەرکەسێ لە ڕزقی خۆی دەخوا و دەنۆشێ، حەلاڵ بێ یا حەرام بەرگی خۆی دەپۆشێ.

ئێمە ڕازی بین یا ناڕازی هەرچی حوکمی قەزایە دەبێ بێتە جێ، کەوابوو حەق نییە ئینسان لە قەزای خودا زویر و دلتەنگ بێ، ئەم پەڕەپەڕ و پەلەقاژێ بێسوودە؛ چونکە لەوساتەدا ئەگەر قەزا نەبێ ترس پێویست نییە، خۆ ئەگەر قەزایش هەبێ ئەوا هەلاتن داد نادا.

(وَمِن ذی الأخری کما تَحَقَّق
عَرَفنا بَعْضُ القضا مُعَلَّقْ
نفِرٌ مِنْ ذا القضا بالرضا
بذاک القَضا إلی ذا القضا
ألَیْسَ قولَ الأمیرِ عُمَر
«نَفِرٌ مِنَ القَدَرْ لَلقَدَرْ»
قەزای دوعا ڕەدد قەزای بەلایە
قەزای عەنبەر دەفع قەزای وەبایە[١١٤]
لەو ئیحسانەوە عومرت زیادە
بەو چاکە عومری دوشمن بەربادە
ئەو چشتە دەکا عومری پێی کەمە
ئەویانە سەبەب نەگبەت و غەمە
فلان چت مایەی گرانی دەوێ
زینایە باعیس وەبا دەکەوێ
بۆ (مَوْتی) دوعا و سەدەقەی جاری
باعیسە بۆ عەفو حەزرەتی باری
(وَقَدْ فَسَّروا لِلَّذی وَعی)
«لَیْسَ للانسان إلاّ ما سَعی»

مَنسـوخةٌ فـي شـرعِنا القـويم)
یا بووگە بۆ قـەوم مووسـا و ئیـبراهیم
ئەمّا ئوممـەتی حـەزرەت مەرحوومـە
دەرحەقیان ڕەحمەت خودا مەعلوومە
یـا بـۆوە مـەیبیت لێـی نـاوێ خائیـب
(إذ النّـاوی لَـهُ عَنْـهُ کالنائِـب)
بـۆ وسـوولی ئـەو نـەفع و سـەوابە
حـەدیس و ئەسـەر زۆرن وریـا بـە

دەکەوێ: دادەکەوێ، بلاودەبێتەوە، دەکەوێتەناو. بۆوە: بۆ ئـەوە، لەبـەر ئـەوە. (عنـەکالنائب): (کالنائب عنە).

واتە: کە باسی لایەنی لەوحی مەحو و ئیسباتمان کرد، بەتایبەتی کە وتی «بۆ بەعزێکیچ هـەس شۆقووقی تەعلیق... تاد» زانیمان کە هەندێ قەزا هـەن بـە شـەرتەوە بەسـتراون، هەنـدێ شـت کراون بە مەرج و هۆی هەندێ شتی تر، ئەمـەیش هیچـی تێـدا نییـە؛ چونکـە لـە هەنـدێ قـەزا رادەکەین بۆ قەزایەکی تر و بە هەردووکیشیان رازین، بۆ نموونە: کـە نـەخۆش کـەوتین و ترسـی مردنمان بوو لەگەڵ ئەوەشدا رازین بە مردنەکە کە قەزای خودایە پەلاماردەدەین بۆ بـەکارهێنانی دەرمانی بەسوود کە ئەویش هەر قەزای خودایە.

حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب لە سەفەری شامدا کە بیستی تاعوون کەوتووەتە شام پرسـی بە هاوڕێکانی کرد، ئەوانیش فەرموودەکەی پێغەمبەریان بۆ گێڕایەوە کە (کاتێ بیستتان تاعوون لە شوێنێکدا بلاوبووتەوە مەڕۆن بۆ ئەو شوێنە و ئەگەر لە شوێنێکدا بوون تاعوونی تێدا بلاو بووە لێـی دەرمەچن) ئەویش سوپاسی خودای کرد و بڕیاری گەڕانـەوەی دا. ئـەنجا ئەبووعوبەیـدەی کـوڕی جەڕڕاح پێی فەرموو: «أفِراراً من قضاء الله یا عُمَرُ!» واتە: لە قـەزای خـودا رابکـەین ئـەی عومـەر؟ عومەریش وەلامی دایەوە: «لَوْ غیرُک قالَها یا أبا عبیدة، نَعَمْ نَفِرُّ مِنْ قضاءالله الـی قضـاءالله» واتـە: خوزگا، ئەبووعوبەیدە، یەکێکی غەیری تۆ ئەو قسەیەی بکردایە، بەڵێ لە قەزای خودا رادەکەین بـۆ لای قەزای خودا، واتە: لە هەر شوێنێکدا بین لە دائیرەی قەزای خودای گەورە دەرنـاچین. بـەلام مادام حەزرەت(د.خ) ڕێگای داوین لە قەزای گیرۆدەبوون بە تاعوون رادەکەین بـۆ قەزایـەکی تـر، وەکوو مان یا مردن لە ڕێوشوێنی خۆماندا.

ئەنجا مەولەوی هەندێ نموونەی قەزای موعەللەقمان بۆ دێنێتەوە و دەڵێ:

قەزای دوعا و نزا و پاڕانەوە لە خودا سەبەبە بۆ چاری قەزای بەلا کـە رووبکاتـە ئینسـان. بـۆنی عەنبەر هۆیە بۆ دەفعی تاعوون یا بەسوودە، دیارە بۆنکردنەکەیش و تاعوونەکـەیش هـەردووکیان قەزای خودان، چاکەکردن و دەستگرۆیی هەژاران تەمەن زیاد دەکا. فلانە کردەوەی چاکە یا فلانە خزمەتی بەکەلک بۆ عیبادی خودا تەمەنی دوژمن کورت دەکات. فلانە کار عـومر کـورت دەکـات وەک بێشەرمی لەگەڵ باوک و دایکدا. کاری وا هەیـە هـۆی نەگبـەتی و خـەم و پەژارەیـە وەک قومار. هی وایش هەیە هۆیە بۆ کەمبوونەوەی رزق و رۆزی و گرانی داکەوتن وەک نەدانی زەکات، زینا سەبەبی بلاوبوونەوەی تاعوونە، دوعا و نزا و لەخوداپاڕانەوە بۆ بەخشینی مردووانی موسوڵمان، خێر و خێراتی بەردەوام وەک مزگەوت، باخی وەقف، پرد، خەستەخانە و میهمانسەرا، سەبەبە بـۆ ئەوەی خودای گەورە خاوەنەکانیان عەفو بفەرموێ، دیارە دوعا و نزا و خێراتەکە و عەفوکردنەکەی خودایش هەردووکیان قەزان.

جا ئەگەر بڵێیت ئایەتی [وأن لیس للإنسان الاّ ماسَعی][١١٥] دژی قسەکەی تۆیە کە دوعا و نزا و خێرکردن بۆ مردوو سوودی هەیە بۆی، دەڵێم بە چەند جۆر وەڵامت دەدەمەوە:

یەکەم: ئەوەی لەم ئایەتە دەردەکەوێ لە شەریعەتەکانی پێش ئیسلامیشدا بووە و هەر بۆ ئێمە نییە؛ ئوممەتی حەزرەت(د.خ) خودا رەحمی تایبەتی هەیە دەربارەیان.

دووەم: تەنانەت لە شەریعەتی ئێمەشدا ئەگەر لە سەرەتادا وا بووبێ لە پاشاندا نەسخ کراوەتـەوە و کاری نەماوە.

سێهەم: کاری ماوە و نەسخ نەکراوەتەوە؛ بەلام مادام کابرای دوعاکردوو یـا خێرکـردوو نییـەتی گەیشتنی ئەو خێرەی بووە بۆ مردووەکەی، وەک ئەوەیە کە مردووەکە خۆی کردبێتی.

چوارەم: خودای گەورە دوو دوستووری هەیە: یەکەمیان عەدڵ و دادپەروەرییـە، بەمـەیان ئـەو خێر و سەدەقەیە ناڕۆن بۆ مردووەکـە. دووەم: ئیحسـان و میهرەبـانی و بەدەهەنەییـە، بەمـەیان هەرکەس بە نییەتی هەر مردوویێ هەر خێرێ بکا بۆی دەڕوا. هەر لەسەر ئەم بناخەیە دوعـا و نـزا و لەخوداپاڕانەوەی زیندوو بۆ مردوو بەسـوودە؛ خـوای گـەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا دەفـەرموێ: [والّذینَ جَاءوا مِن بَعْدِهِمْ یَقُولُونَ رَبَّنا اغفر لَنا وَلإخوانِنا الّذینَ سَبَقونا بالإیمان وَلاَ تَجْعَلْ فی قُلُوبنـا غِلاّ للّذینَ آمَنُوا رَبَّنا إنّکَ رَؤوفٌ رَحیم.][١١٦]

هەروەها گێڕانەوەی ڕۆژوو بۆ مردوو بەتایبەتی ئەگەر لە لایەنی ئەولاد و وەلیی شەرعی و برایەوە بێ بەسوودە، حەزرەت(د.خ) قوربانیی کردووە لەباتی هەموو ئەفرادی ئوممەتی خۆی. هەروەها گێڕانەوەی حەج لە لایەن ئەولادەوە بۆ باوکی مردوو بە حەدیسی سەحیح سابت بووە.

پوختەی قسە ئەوەیە توانای بێسنووری خودای گەورە کە تابیعی خواست و زانینی بێ پایانیەتی هەموو جیهانەکانی لە نەبوونەوە هێناوەتە دەر و بوونی داوەتێ، لە هەموو دروستکردنێکدا چاکی و جوانیی دەرخستووە، تۆزقاڵە شتێ نییە لەم هەمووە کەون و کائیناتەدا کە بێحیکمەت بێ؛ [وَ تَرىالجبالَ تحسَبُها جامِدةً وَ هِیَ تَمرُّ مرَّالسَّحاب. صُنْعَ الله الّذی أتْقَنَ کُلَّ شَیْءِ إنَّهُ خبیرٌ بما تَفْعَلُونَ][117]

کارەکانی لەو لایەنەوە کە ئەو دروستی کردوون هەمووی جوان و بەجێن [ما تری فی خَلْقِ الرَّحْمن مِنْ تَفاوُت...][118] دروستکردنی کان و گیا و دار و درەخت و گیانلەبەر بە ئینسانەوە، دروستکردنی بەرزی و نزمی و وشکانی و دەریا و ئەستێرەی لەژمارەنەهاتووی جیاجیا و مانگ و ئەستێرە، ئەوی دەجووڵێت و ئەوی ناجووڵێ، ئەوی تا ئێستە مێشکی ئینسان پەی پێبردووە و شتێکی لێ هەڵکڕاندووە و ئەوی هەتا ئێستە نەچووە بە جاڕیا، هەموو ئەمانە لە دائیرەی حیکمەتی خودای گەورەدا دەسووڕێنەوە [الله خالِقُ کُلِّ شَیْءِ وَهُوَ علی کل شیءٍ وکیل]، [لَهُ مقالیدُ السمواتِ والأرضِ والذین کفروا بآیات الله أولئک هم الخاسرون][119].

خودای گەورە لەم کائیناتەدا ڕێوشوێن و یاسایەکی ڕاست و ڕووناک و عادەتی ڕەنگ ڕشتووە، بۆ هەر شتێ هۆی عادەتی داناوە؛ چ لە کاروباری ماددیدا و چ لە هی مەعنەویدا. ئینسانی شارەزا کردووە و هۆش و فامی پێبەخشیوە کە ڕێی خۆی پێ بدۆزێتەوە، بۆ پشتگیری و زیاتر بەهێزکردنی ئەو هۆش و فامەی پێغەمبەرانی خاوەنبەهرە و خوو و ڕەوشت بەرزی بۆ ناردووە و لە ڕێگای ئەوانەوە بەڵێن و هەڕەشەی خۆی بە هەموو لایەکدا گەیاندووە [إنّا أرْسَلْناکَ بالحقِّ بَشیراً وَ نذیراً وَ إنْ مِنْ اُمَّةٍ إلاّ خَلاَفیها نَذیر][120] ڕێگای ئینسانی داوە کە چاکترینی دروستکراوەکانیەتی لە ڕێگای ئەسبابەوە هەوڵ بدا و خەریکی کشتوکاڵ و بازرگانی و خوێندن و ڕێوشوێنی تەندروستی و مسۆگەرکردنی ئاسایش و داهێنان و دۆزینەوەی شتی تازە و بەسوود بێ بۆ پێشخستنی کۆمەڵ.

دین و ئایین و خوداپەرستی کردووە بە هۆی ڕووناکیی دڵ و پاکیی حاڵ و چاکیی کردار. دنیاداریشی لەگەڵ ئاییندا جووت کردووە و کردوویە بە هۆی پایەداری و پێشکەوتن.

دادپەروەریی کردووە بە بناخەی بەختیاری. بەم جۆرە کائینات هـەموو بریتییـە لـە زنجیرەیـەکی دوورودرێژ و لق‌وپۆپ‌دار لە ئەسباب و موسەببەبات، ڕێکخستنی ئەم ئەسبابانە غەیری خودا کـەس نایکا و هیچ لایەکی تر پێی‌ناکرێ، [وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرى الله عَمَلَكـم]. لەبـەر ئـەوەیش کـار ئاسـان کردن و تەوفیق و شارەزاکردن بۆ ئەسباب و بەکارهێنانی و یارمەتیدان بۆ کاری سەرومڕ تەنها لـە توانای خودای گەورەدایە. واجـبی کـردووە لەسـەر ئینسـان کـە هەمیشـە لەگـەڵ بـەکارهێنانی ئەسبابدا هاوار بەرێتە بەر بارەگای خودا و پشت بەو ببەستێ و پشت بـە هـەوڵ و کـاری خۆیشـی ببەستێ و بەپێی توانا و خواست وزە بخاتە کار.

ئەم جۆرە ڕێڕەوە هۆی بەختیاریی دنیا و دوارۆژە، بێ‌گومان وەکـوو وتمـان کۆشـش و هەوڵـی بەندە لە عیلمی بێ‌پایانی خوادا رابووردووە و هیچی لێ ون نابێ.

ئەوەی بە ئێمە بکرێ هەوڵە و، تەوفیقیش بە لوتف و میهرەبـانیی خودایـە. (فَنَرجـو توفیقِـهِ و عنايتِهِ و رعايتهِ بِرَحمتهِ الواسعةِ و لطفهِ العميم).

لــە دوو قیســمەکان قیســمی ســانیمان
ئەمەتـــە بێـــرین هـــەمووممان ئیمـــان:
حـــەق خـــالیقی فیعـــل عیبـــادە یەکســـەر
ئەر کوفر ئەر ئیمان، ئەر خەیر ئەگەر شـەڕ
لـە حـەددی ئیمـان کـوفریچ هـەم بـزان
یـــــانی: (الكفـــــرُ عَـــــدَمُ الإيمـــــانْ)
خـــەیر (مـــا يَصْـــلَحْ بِـــهْ حـــالَ الرَجـــلِ، أوْ
يرغَـــبْ فيـــه الكُـــلْ)، شـــەڕ خـــیلافی ئـــەو
کـــــوللی واحیـــــدێ لەمانـــــە هـــــەردوو
(إمَّـــــــا مُطلـــــــقٌ أو مُقَيَّـــــــدُ)
(مرغـــــوبٌ فيـــــهِ) وْ (عَنْـــــهُ بـــــالمرّة)
یـــا بـــۆ یـــەکێ خـــەیر بـــۆ یـــەکێ شـــەڕە
خەیر ئوخرەوی هـەس بـۆت بکـەم بـەیان
وەک نـــەجات لـــە نـــار، دخـــوولی جینـــان

موشـــاهەدەی نـــوور جـــەمالی ئەحـــەد
موتالـــەی کـــەمال جـــەلالی ســـەمەد
ئـــەو نـــەوعی کـــەوا دونیەوییەیـــە
چـــــووارن، یـــــەکێ نەفســـــانییەیە
ئیمـــان و حوســـنی ئـــەخلاق و حیکمـــەت
شـــەجاعەت و جـــوود، عەدالـــەت، عیففـــەت
دووەم جیســـمانی هـــەروەکوو ســـیححەت
جـــەمال و تـــوولی عـــومر و عیبـــادەت
ســـێیەم خـــاریجی وەبـــێ قیـــل و قـــال
وەک ئەهل و نەسەب وەک جاهـ و ئەموال
چـــووارەم جەمعـــە، زەریـــف بیـــدە دڵ
(بَـــیْنَ الاســـبابِ) خـــاریج و داخـــڵ
وەک روشـــد و دەوام تەســـدید و تـــەوفیق
(کـــذالِکَ الشَـــرّ) تەقســـیم بـــەو تـــەریق
(لاَ حَـــــــوْلَ وَلا قـــــــوَّةَ إلّـــــــا
بـــــالله البـــــاریِ العلـــــیّ الأعْلـــــی
مِنْـــکَ بِـــکْ مَعَـــکْ فیـــکْ إلَیْـــکَ الشَّـــیْرْ
فَقِنـــــا الشّـــــرورْ وَأَوْلِنـــــا الخَیْـــــرْ
وَاْرزُقْنـــــا صَـــــبراً عَلـــــی بَلائِـــــکْ
وَحَمْـــــداً رِضـــــیً علـــــی قضـــــائِکْ
أَغْنِنـــــا فَضْـــــلاً عَمَّـــــنْ سِـــــواکا
أَعْطِنـــــا کُـــــلاً مَـــــنَّ لِقاکـــــا)

واتە: پاش ئەوەی تێگەیشتی کە بەشی یەکەم لە ئیمان بە قەدەر ئەوەتە ئینسان بـاوەڕی بـەوە هـەبێ کـە عیلمـی خـودای گـەورە هـەموو کردارێکـی موکەللەفـەکان و پاداشـی کردارەکانیـان دەگرێتەوە؛ چ کـردەوەی بـاش و چ کـردەوەی خـراپ و پاداشـیان هـەرچۆن بـێ، بزانـە بەشـی

دووەمیش لە ئیمان بە قەدەر ئەوەیە ئیمانت هەبێ بەوە کە خودای گەورە خالیق و مووجیدی هەرچی کاری ئینسانە، چ ئیمان، چ کوفر، چ گوێڕایەڵی، چ بێگوێیی، لە خێر و لە شەڕ میقداری نییە قابیلی زانین و بیرلێکردنەوە و تەسەووری ئێمە بێ و خودای گەورە دروستی نەکردبێ.

پاش ئەمە مەولەوی دێتە سەر (تعریف)ی کوفر و دەڵێ: کە لەپێشەوە زانیت ئیمان چییە ئیستەیش بزانە کوفر بەرامبەری ئیمانە. ئەنجا ئەگەر بەرامبەرییەکە بە شێوەی مەلەکە و عەدەم بێ ئەوا دەڵێین: کوفر عەدەمی ئیمانە. خۆ ئەگەر بەرامبەرییەکە (تضادّ) بێ و هەردووکیان، واتە کوفر و ئیمان، وجوودی بن، ئەوا تەعریفی کوفر بریتییە لە ئینکارکردنی هەرچی پێغەمبەر(د.خ) لای خوداوە هێناویەتی.

خەیر و شەڕیش دووشتی بەرامبەرن: ئەم دوانە شەرعییان هەیە و عەقڵیشیان هەیە. هەردوو جۆرەکەیش یا موتڵەقە یا موقەییەد. خەیری موتڵەقی شەرعی بریتییە لەوە حاڵی ئینسانی پێ چاک ببێ ئەوەش بەگوێکردنی ئەمر و نەهی خودایە. شەڕی موتڵەقی شەرعییش ئەوەیە حاڵی ئینسانی پێ خراپ ببێ، ئەوەیش گوناهـ و بێگوێیی‌کردنی ئەمر و نەهیی خودایە.

خەیری موتڵەقی عەقڵییش ئەوەیە هەموو عاقڵێ حەزی لێبکا و پێی باش بێ. شەڕی موتڵەقی عەقڵییش ئەوەیە هیچ عاقڵێ حەزی لێ نەکا و پێی باش نەبێ.

کە موتڵەقەکانت زانی موقەییەدەکانیش بە ئاسانی دەزانی، بۆ نموونە: خەیری عەقڵیی موقەییەد ئەوەیە هەندێ کەس حەزی لێ بکەن و قازانجی تیابێ بۆیان، کەچی هەندێکی تر حەزی لێ نەکەن و زیان بێ بۆیان.

هەندێ خەیر هەن بەنیسبەت رۆژی قیامەتەوە تەماشا دەکرێن وەک رزگاربوون لە ئاگری دۆزەخ و چوونە بەهەشتی نەبڕاوە، یا وەک چاوپێکەوتنی زاتی بێچوونی خودا و سەیری گەورەیی و توانای بێسنووری، ئەمانە هی دنیاکەی ترن.

بەڵام زانایان خەیری دنیایی‌یان کردووە بە چوار بەشەوە: بەشی یەکەم نەفسانییە وەک خوو و رەوشتی جوان و ژیری و ئازایی و بەدەهەندەیی و دادخوازی و داوێن‌پاکی.

دووەم: جیسمانییە وەک تەندروستی و جوانی و شۆخی و تەمەن‌درێژی و عیبادەت کردن. ئەمانە لە داخلی ئینسانەکە خۆیدان.

سێهەم: لە دەرەوەی ئینسانەکەدایە وەک خێزانی باش و ئەولادی بەخێر و جوامێر و سەربەرز و نەسەب و بنەچەی بەڕێز و دیاری، یا وەک پایە و سایەی بەرز و بەکەلک و ماڵ و سامانی حەلالی باش و بەسوود.

چوارەم: کۆبوونەوەی خەیری دەر و ناوە وەک باسمان کرد، کە دەبێتە هۆی سەربەرزی و سەرکەوتنی دینی و دنیایی.

ئەمانە چەند نموونەیەک بوون لە خەیر و جوانی لە جیهانی ئادەمزاددا.

دیارە شەڕیش کە موقابیلی خەیرە هەموو ئەم بەشانەی هەیە. لە پایانی ئەم باسەدا مەولەوی دەیەوێ بێهێزی و ناتوانایی بنیادەم بە تەواوی بخاتە روو، دەسەوستان لە بەردەمی بارەگای بەرفراوانی خودای گەورەدا دەپاڕێتەوە و دەڵێ: لە خودای خالیقی گەورەوە نەبێ نە توانا هەیە و نە هێز.

خودایا! سەرەتای رێڕەوی ژیانمان لە تۆوە دەس پێدەکا؛ تۆ ئیجادمان دەکەی، بە یارمەتیی تۆ بستبەبست، هەنگاوبەهەنگاو و هەناسەبەهەناسە دەبزووین. لەگەڵتین، لەگەڵماندای، وردەوردەی ژیان و کۆچ و بارمان لە عیلمی تۆدایە. کات و شوێن و سەرەتا و سەرەنجام و رێگا هەمووی تۆی تیای. بۆ لای تۆیش دەگەڕێینەوە (الیکَ المرجع والمصیر).

کەواتە لەم رێڕەوە سەخت و نالەبارەدا لە شەڕ لاماندە و بە میهرەبانیی خۆت خەیرمان بدەرێ. بە گەورەیی خۆت خۆگریمان پێببەخشە لەسەر هەر بەلایە کە لە تۆوە دێ. وامان لێبکە هەموو گیانمان ستایش و رازیبوون بێ بە قەزات. بێئیحتیاجمان بکە لە غەیری خۆت، لە رۆژی قیامەتدا بە نیعمەتی دیدار بینینت شادمان بکە، کە گەورەترین نیعمەت و ئەوپەڕی سەعادەتە.

ئەمتە کە زانی لەمسەر تا ئەوسەر
ئەمجار بزانە ئیمان بە قەدەر
(إسْتَلْزَمَ العلمَ بِتوحيدِ الذات
كَمَا استلزمَ العِلمَ بِالصِّفات
و بكَمالِ الصنع والأفعال
وَ بِأَنّهُ إليهِ المآل)
ئەو وەختە کە خۆت ئە گوناح دەخەی
لەوێ و دوایچ تا تەوبەی لێ دەکەی

جــەوازی نییــە هــەم مــەنێرە ســەر
ئیحتیجــاج کــردن بــە قــەزا و قــەدەر،
(سَــبَق فــی العلــم) بــۆ وە دەســم بــرد
(کُتِــبَ فــی اللــوح) منــیچ بــۆ وەم کــرد
دەفتەری عــیلم و لــەوحت لەبــەر بــوو؟!!
غەمت هەر جەهلی ساحیب دەفتەر بوو؟!
گروفتــاری نــەفس ئــەممارە خــۆتی
شەلوپەت دەکەی هــەی شــێتی پــەتی!
جــائیزە بەعــدەز تەوبــە بــدەی دەم
ئــەمما بــە ئــەدەب هــەروەکوو ئــادەم[١٢١]

ئــە گونــاح دەخــەی: دەخەیتــە نــاو گوناهــ. لــەوێو دوایــچ: لــەپاش ئــەوەیش. مەنێرەســەر: مەخەرەسەر. بۆ وە: بۆ ئەوە. منیچ: منیش. شەلوپەت دەکەی: لەتوکوت دەکەی، ئیشی خــراپ دەکەی، قسەی هەلەق و مەلەق دەکەی. شێتی پەتی: شێتی سەروپێ ڕووت و بەربەرەڵا، شێتی تەواو. بەعدەز= بعد از: لەپاش. ئادەم: بنیادەمی ژیر، حەزرەتی ئادەم(د.خ).

واتە: کاتێ ئەم دوو بەشەی ئیمانبەقەدەرت زانی و چاک لێی تــێگەیشــتی بزانــە ئــەم ئیمانــە دەبێتە هۆی زانینی خاوەنباوەڕەکە بە تــاک و تــەنیایی خــودای گــەورە و زانــینی ســیفەتەکانی، دەبێتە هۆی زانینی ئەوە کە کاری خودا بێعەیبە و جوان و ڕازاوەیــە، ئــەنجامی هــەموو کــەس و هەموو شت هەر خودایە و سەرەتا و دوایی هەموو لای ئەوە.

دیارە ئەگەر باوەڕت بوو بەوە کە خودا عالمە بە هەموو کردەوەیەکی تەکلیفلێکراوەکــان و بــە هەرچی شتێ کە هەیە، ئەوە مەعنای وایە کە خودای گەورە سیفەتی عیلمی شــامیلی هەیــە. کــە باوەڕت بەوە بوو خودا خالیقی هــەموو کارێکــە مــەعنای وایــە ســیفەتی ئیجــادی تــەواوی هەیــە، ئەمەیش واتە قودرەتی تەواوی هەیە، کە قودرەتی بوو دەبــێ ئیرادەیشــی ببــێ، چونکــە قــودرەت تابیعی ئیرادەیە، ئیرادەیش دەبێتە هۆی بوونی عیلم، چونکە تا عیلمی بــە دوو لاکــە نــەبێ چــۆن تەرجیحی یەکێکیان بەسەر ئەوی تریاندا دەدا، کە عیلمیش بوو دەبێ حەیاتیش ببێ. ئەنجا مادام ئیمانت بەم سیفەتە کامیلانە بوو و لات سابت بــوون، ئیمانــت بــەوە دەبــێ کــە پێویســتە زاتێکــی تەنیای بێ هاوتای (واجبالوجود) یش ببێ؛ چونکە کەمالی سیفات دەلیلە لەسەر کەمالی زات.

پاش ئەمانە بە شێوەی ئامۆژگارییەکی زانایانە ڕوودەکاتە ئەوانەی دەیانەوێ لە ڕێگای شموولییەتی عیلمەکەی خوداوە بێنە ژوورەوە و ڕەخنە بگرن و دەفەرموێ:

تۆ لەو وەختەدا کە گوناحەکە دەکەی و پاش ئەوەیش هەتا تەوبە دەکەی نەکەی تاوانێکی تر بخەیتە سەر گوناهەکەت و هەر قەزاوقەدەرەکە خۆی بکەیتە دەلیل و بڵێی: لە عیلمی خوادا ڕابوردووە کە من گوناهەکە دەکەم و لە (لوح المحفوظ) یشدا نووسراوە، جا ئەگەر نەیکەم عیلمی خودا ـ معاذالله ـ دەبێتە جەهل.

بۆچی تۆ دەفتەرەکەی عیلمی خودات لابوو، نووسراوەکانی (لوح المحفوظ) ت لەبەر بوو؟! هیچ خەم و پەژارەت نەبوو تەنها لەوە دەترسای کە خودای خاوەن لەوح و دەفتەر بە نەزان دەرچێ؟! تۆ گیرۆدەی نەفسی بەدی خۆتی و ناتوانی لە قسەی دەرچی، سەرت دەکا بە هەزار گۆما و لە خشتەت دەبا، نازانی چی دەکەی؟ دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکەی، نە کارت ڕەوایە و نە قسەت بەجێیە، دواییش عوزری وەها دێنیتەوە لە قەباحەتەکەت خراپترە.

ئەوەی لە (لوح المحفوظ)دا نووسراوە و لە دەفتەری عیلمی خوادایە ئەوە نییە کە تۆ بە ئارەزووی خۆت دایدەنێی؛ ئەوەی لەو دوانەدایە ئەوەتە کە تۆ بە ئارەزووی خۆت لە کات و شوێنی تایبەتیدا فلانە کاری بەد دەکەی، ئەم دوانە شایەتی ئەوەن کە تۆ بە ئارەزووی خۆت کارەکە دەکەی و کەس زۆری لێ نەکردووی، ئیتر ئەم پێوەندییی عیلمی خودایە بەم کردەی تۆوە چ عوزرێکت دەداتە دەست و چ سوودێکی تێدایە بۆت؟

بەڵێ پاش گوناهـ و پەشیمانبوونەوەکەت دەتوانی دەم بکەیتەوە و بڵێی گوناهەکەم کە بە ئارەزووی خۆم کردم و پەشیمانبوونەوەکەیشم کە هەر بە ئارەزووی خۆم بوو هەردووکیان لە عیلمی خوادا هەن و لە (لوح المحفوظ)دا نووسراون، بەڵام ئاگادار بە زۆر بە ئەدەب قسە بکە وەک ئینسانێکی ژیر، یا وەک حەزرەتی ئادەم و حەووا(د.خ) کە پاڕانەوە لە خودای گەورە و [قَالا ربَّنا ظَلَمْنا أنْفُسَنا فإن لم تَغْفِرْ لَنا وَتَرحَمْنا لَنَكُونَنْ مِنَ الخاسِرين](١٢٢).

***

١ـ ئەم سەرباسە لە نوسخە دەستنووسەکەدا نییە.

٢ـ وەسەر: بەسەر. ئەم«وەسەر»ە بەپێی ئیشارەکاریی شێوەنووسی نوسخە دەستنووسەکە، بەستراوە بە «فسق ظعننا»ی پێش ئەم باسەوە، واتە: ئەی سەرقافڵە تێپەڕکە بەسەر هەوارگەی شەشەمیندا، هەوارگەی قەزاوقەدەر، کە لە پارێزدایە بۆمان نەبادا ڕێگامان لێ بگرێ و نەیەڵێ کارەکەمان تەواو بکەین.

٣ـ لە دەستنووسەکەدا نووسراوە: «راست براست بلاتفاوت [ماتری فی خلق الرحمن من تفاوت، فارجع البصر هل تری من فطور، ثم ارجع البصر کرّتین ینقلب الیک البصر خاسئا و هو حسیر] ـ منه».

٤ـ ئایەتی(١٤) سوورەتی (ملک).

٥ـ بڕوانە: منصور علی ناصف، التاج الجامع للاصول فی أحادیث الرسول بیروت، دار احیاء التراث العربی، الجزء الاول، ١٩٦١، ل٢٥.

٦ـ من لام وایە مەبەستی مەولەوی لە «ئەر فکرت بویَ زووم کرد ئیشارەت» ئەو دوو بەیتەیە کە راستەوخۆ پێش دەستکردن بە ئەسلّی یەکەم فەرمووی:

تەهزیبی کەلام نەکەین زەریفە؛
بەحسی سیفات و زاتی شەریفە،
قەند تا موکەڕڕەر، موشک تا وەکۆتر
مەزاق شیرینتر، دەماغ خۆشبۆتر
وەکۆتر: وەکۆمەڵتر.

واتە: مەولەوی لەم کتێبە تێکرا، ئەوەندەی شیعر ماوەی هەبێ حەز لە درێژپێدان دەکا. لێرەیشدا ئاشکرایە دەیەوێ بڵێ: لە سەرەتادا باسی قەزاوقەدەرم بەکورتی هێنا، بەلام ئێستە حەزدەکەم گوێ لەم تەفسیلەیش بگری، هۆی ئەم درێژەپێدانەیشی بە دوو بەیت دەرخستووە لە (أولاً...) تا (تەکرار وێ). بەڵێ لێرەدا تەنها ئیشارەتی بۆ تەهزیبنەکردنەکە کردووە؛ بەلام لە سیاقی قسەدا دەزانین کە چی دووبارە دەکرێتەوە و باس دەکرێ.

٧ـ یا ئەم (حَبَّة)ە بەدەلە لە (خردل) ؛ چونکە لێرەدا زیاتر مەبەست تۆوی خەردەلە کە زۆر وردە، یا خۆ (حتّی) کەی هەر بۆ ژماردنی شتەکان هێناوە بەبێ سەیری گەورەیی و بچووکی‌یان.

٨ـ «کُلّ» بە فەتحەی لام شێوەنووسی دەستنووسەکەیە؛ لەوە دەچێ مەولەوی لە دڵی خۆیدا «تێرێتە وجوود»ی کردووەتە (یُخرِجُ الی الوجود)ی عربی و «کُلّ»ەکەیشی وەک (مفعول بە) لە رستەیەکی عەرەبیدا حسێب کردووە و سەری بۆ لامەکەی داناوە.

٩ـ وابزانم مەبەستی ئەوەیە سێبەر هی خاوەن سێبەرەکەیە و هەرگیز لێی جیانابێتەوە و دەبوا خۆی دروستکەری بوایە؛ کەچی کەم و زۆر دەستی تێدا نییە؛ خودا خۆی بە ئارەزووی خۆی درێژی دەکاتەوە و کورتی دەکاتەوە و ئەگەر بیویستایە رایدەوستاند. دیارە عیبارەتەکە ئیقتیباسە لە ئایەتی پیرۆزی [اَلَمْ تَرَ اِلی رَبِّکَ کیفَ مَدَّ الظِلَّ وَلَوْ شاء لَجَعَلَهُ ساکناً] ئایەتی (٤٥) سوورەتی (فرقان).

١٠ـ وەک پەراوێزێکی کورتی بە فارسی‌نووسراوی دەستنووسەکە تێمان دەگەیەنێ یەکێکیان، بێ دیاری‌کردن، مەرید و ئەویتریان موریدە. من لەبەر زیاتر گونجان لەگەڵ دوا کەلیمەی نیوەی یەکەمی بەیتەکە یەکەمم کردە مەرید و دووەم بە مورید، ئەگەرچی بەپێی موراعاتی لەفونەشری مورەتتەب دەبێ دووەم مەرید بێ.

١١ـ دوور نییە مەبەستی نەفەس بێ، واتە: هەناسە، بەلام لەبەر ئەمس (ف) کەی ساکن کردووە، ئەگینا (نەفس) لێرەدا هیچ پێوەندییەکی ئاشکرای بە (قەول) و (فیعل) ەوە نییە، ئەگەرچی دەشتوانین بڵێین: مەبەستی مەولەوی ئەو شتەیە بە نەفسدا تێدەپەڕێ.

١٢ـ لە نوسخە دەستنووسەکەدا پەراوێزێکی فارسیی مەولەوی خۆی لەسەر ئەم بەیتە نووسراوە ئەمە تەرجەمەکەیەتی:

(نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە دوو مەعنای هەیە و، لە نیوەی دووەمیشدا تیباق هەیە) ئەمە تەرجەمەی پەراوێزەکە بوو. دیارە مەعنای یەکەمی نیوەی یەکەم ئەوەیە ئەو وەسفە خودای گەورە بە کەمالی داناوە بیهێنە و بیدەرە پال خودا؛ ئەمە کارێکی چاکە یا وەسفەکە شتێکی چاکە.

مەعنای دووەمی: ئەو وەسفە بهێنە و بەکاری بێنە، چاکە نیسبەت بدە لە خودا نەک خراپە.

تیباقەکەی نیوەی دووەمیش لە کۆکردنەوەی (باوکە) و (ئەدا) دایە، (ئەدا) بە هەورامی دایکە. جا ئەگەر لێرەدا مەبەست لە (ئەدا) دایک بێ ئەوا تیباقەکە تەواوە، واتە: باوکە! دایکە! نوێژ بکەن کە پڕە لە ئەدەب. خۆ ئەگەر موخاتەب تەنها باوک بێ و (ئەداکە) یەعنی (جێبەجێبکە) بێ، ئەوکاتە تیباقەکە هەر بەدیمەن دەبێ نەک بە مەعنا.

١٣ـ بێگومان خێر و شەڕ هەردوو بە دەستی خودان، بەڵام قورئان کە لووتکەی ئەدەبە ئەدەبی ڕاگرتووە و هەر تەنها خێرەکەی وتووە.

١٤ـ ئیشارەیە بۆ ئایەتی (٧٩) لە سوورەتی(کهف) کە دەفەرموێ: [وَأمَّا السَّفینةُ فکانتْ لِمَساکینَ یعملونَ فی البحرِ فأردتُ أنْ أعِیبَها وکانَ وَراءهم مَلِکٌ یأخذُ کُلَّ سفینةٍ غصباً].

١٥ـ ئیشارەیە بۆ ئایەتی(٨٢) لە سوورەتی (کهف) کە دەفەرموێ: [وَأمَّا الجدارُ فکانَ لغلامین یتیمین فی المدینةِ وکانَ تحته کَنزٌ لهما وکان أبوهما صالحاً فأرادَ رَبُّکَ أنْ یَبْلُغا أشُدَّهما وَیَسْتخرجا کنزهما رَحمةً من ربک و ما فعلتُهُ عن أمْری ذلک تأویلُ ما لم تسْطِعْ علیهِ صبراً].

مەبەستی ئەوەیە ئەگەر پەیڕەوی شێوەی ئەدەبیی ئەم ئایەتە بکەی بێڕەنج دەگەیتە عەقڵ و گەنج. ئەوەیشی تێدایە کە خواستی خودایە بێڕەنج گەنج دەدا. بێجگە لەمانە ئەوەیش دەگەیەنێ کە ئایەتەکە بخوێنەرەوە لە (فأراد ربک) موە بێماندووبوون دەگەیتە وشەی (أشدّهما) دوای ئەویش دەگەیتە (لیخرجا کنزهما).

١٦ـ ئیشارەیە بۆ ئایەتی(٧٧) و (٧٨) لە سوورەتی (شعراء) [فإنهم عَدُوٌّ لی إلاّ رَبَّ العالمین* الذی خَلَقنی فَهُوَ یَهدینِ] و ئایەی (٨٠)ی هەمان سوورەت کە دەفەرموێ [وَاذا مرِضتُ فهو یشفینِ] کە باس هەر باسی ئەدەبی پێغەمبەرانە کە باسی خودا دەکەن و سیفەتی لایقی دەدەنە پاڵ.

١٧ـ شەڕیش هەر ئەو دروستی کردووە، بەڵام بۆ ئەو ناگەڕێتەوە، خەتای ئینسانەکەیە.

١٨ـ لە پەراوێزی دەستننووسەکەدا نووسراوە: «أی إمضغها وابلعْها حتی تستحیل وتکونَ جزء من طبیعتک، هنیئاً لک.»

١٩ـ ئیشارەیە بۆ ئایەتی (٩٠) لە سوورەتی (انعام) کە دەفەرموێ [أولئک الذین هَدی الله فَبِهَداهُم اقتدهْ... الآیة].

٢٠ـ لەسەر کەلیمەی (هەمە) لە دەستنووسەکەدا پەراوێزێکی مەولەوی خۆی بە فارسی نووسراوە ئەمە تەرجەمەکەیەتی: (واتە: نەبوون ئەسڵە بۆ ئێمەی موکەللەف، یا ئەسڵە بۆ هەموو بووەکان. مەعنای یەکەم زیاتر لە مەبەستەوە نزیکە، بەڵام دووەم فراوانترە).

دیارە (هەمە) واتە: هەموو.

٢١ـ لەسەر ئەم بەیتە پەراوێزیکی مەولەوی خۆی بە فارسی نووسراوە کە ئەمە تەرجەمەکەیەتی:
(مومکین سەرباری ئەوە کە ئەسڵەکەی نەبوونە (بالفعل) یش خاوەنی کەمالات نییە، نەبوون هەمیشە لێی جیانابێتەوە، واتە هەمیشە کەموکوورە. لەسەر ئەم بناخەیە خەیر لە (واجب‌الوجودە) ەوە پەیدا دەبێ و شەڕ دەدرێتە پاڵ مومکین).

٢٢ـ لە نوسخە چاپەکەدا (دلی)یە کە دەکاتە دەڵێ.

٢٣ـ لەچاپەکەدا نووسراوە (ئاودۆ) !

٢٤ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لەسەر عیبارەتی (لەبەرئەوە) نووسراوە «علت است برای حکم بوجوب سکوت در بیت دوم ـ منه ـ ».

واتە: ئەم عیبارەتە دەلیلی (حوکم بە وجوب)ە و لێی پێش کەوتووە. هەروەها لەسەر وشەی (تەقریر) یش نووسراوە «وهو قوله: بۆی هەیە تەکلیف... الی اخر البیتین. منه». واتە: ئەوەی تەقریرکراوە لە «بۆی هەیە..»وەیە هەتا «اذ هو الخبیر».

٢٥ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لەسەر ئەم بەیتە نووسراوە: «لا تقل لِمَ فَعَل، تعالی، ذالک؟ إذ لا یُسألُ عَمّا یَفعل وهُم یُسألون. ولا تبحث عن کیفیة صفاته إذ تقدّست عن البحث کذاته، تعالی شأنُهُ عَمّا یقولون. منه».

٢٦ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لەسەر ئەم بەیتە نووسراوە: «لا کلامَ فی ما قاله الناظم فی هذا المقام أجْمَعَ وَأشْمَل وَأبْلَغَ وأفْصَحَ مِنْ هذا البیت. منه».

٢٧ـ لە چاپەکەدا(شروان)ە.

٢٨ـ لە دەستنووسەکەدا لەسەر ئەم نیوبەیتە پەراوێزێکی عەرەبی نووسراوە ئەمە نەسسەکەیەتی:
«فیة لطافة حیث المعنِیِین أی للمخلوق علی أن فعله تعالی خلق و دیجاد أو دلیل للخلق أی الإیجاد، لان مقتضی تلک الصفات التامات هو الإیجاد ولا یلیق الإیجاد إلاّ بمن یتصف بها ـ منه ـ»

واتە: خەلق دوو مەعنا هەڵدەگرێ، یەکەم: خەڵک، بنیادەم. دووەم: دروست‌کردن.

٢٩ـ لە دەستنووسەکەدا لەسەر ئەم (چاوی دڵی)یە پەراوێزێکی فارسی هەیە ئەمە نەسسەکەیەتی:
«یعنی چشمِ دلش (بالاضافة) یا چشم ودلش (بالعطف). و امر الضمیر سهل».

واتە: هەڵدەگرێ (ی)ی (چاوی) هی ئیزافە بێ و (ی)ی (دڵی) زەمیر بێ و، (چاوی دڵی) مەعنای (عین بصیرتە) بێ. هەڵیشدەگرێ هەردوو (ی) یەکان زەمیر بن واتە: چاوی، دڵی.

بەلام لەم بارەدا (بوێنێ) بۆ یەکێکە و ئەوانیش دوانن، بۆیە مەولەوی دەفەرموێ: کاری زەمیری (بوێنێ) ئاسانە، لەوانەیە بڵێ (بوێنێ) دەکەینە خەبەری (دڵ) و بۆ چاویش بە قەرینە دەیزانین، دیارە کە (دڵ) بینی چاویش دەبینێ.

٣٠ـ ئایەتی(٦٢) سوورەتی (زمر).

٣١ـ ئایەتی(١٧) سوورەتی (نحل).

٣٢ـ ئایەتی(١٤) سوورەتی (ملک).

٣٣ـ ئایەتی(٩٦) سوورەتی (صافات).

٣٤ـ ئایەتی (٢٨٦) سوورەتی (بقرة).

٣٥ـ ئایەتی (٢٩) سوورەتی (کهف).

٣٦ـ ئایەتی (٧) و (٨) سوورەتی (زلزلة).

٣٧ـ ئایەتی (٢٤) سوورەتی (واقعة).

٣٨ـ ئایەتی (٣٠) سوورەتی (بقرة).

٣٩ـ ئایەتی (١٤) سوورەتی (ملک).

٤٠ـ لە نوسخە چاپەکەدا (ئەرپەڕ) ە، دیارە هەڵەیە.

٤١ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا بە فارسی نووسراوە: «یعنی عرض جناب جبری بکنم.».

٤٢ـ ئایەتی(١٣٤) سوورەتی (بقرة).

٤٣ـ ئایەتی (٢٨٦) سوورەتی (بقرة).

٤٤ـ ئایەتی (٢١) سوورەتی (طور).

٤٥ـ ئایەتی (١٦٤) سوورەتی (انعام).

٤٦ـ ئایەتی (٣٤) سوورەتی (لقمان).

٤٧ـ لە دەستنووسەکەدا لەسەر «فلاتمار» ئەم پەراوێزە فارسی‌یە نووسراوە: «عبارتی کە در اینجا شیرین باشد، الله اعلم، این است: چونکە قدرت تابع ارادە و ارادە تابع عِلم و علم تابع معلوم است، و معلوم باختیار عبد واقع می‌شود، پس می‌گوییم آن معلوم همچنان می‌شود از آنجهت علم بدان طرز باو تعلق بستە، نە علم بدان طرز بَـوَی تعلق بستە از آنجهت آن معلوم همچنان می‌شود؛ (فإنّ علمه تعالی، وان کان صادقاً مطابقاً و محیطاً بالشیء علی ما هو علیهِ فی نفس الأمر، لکن لیس موجباً لذلک المعلوم). والله الهادی ـ منه ـ».

واتە: (خودا خۆیشی ئەزانێ، قسەیێ لێرەدا شیرین و بەتام بێ ئەوەیە لەبەر ئەوەی قودرەت تابیعی ئیرادەیە و ئیرادە تابیعی عیلمە و عیلمیش روو لە مەعلوومەکە دەکات و، مەعلوومەکەیش بە ئارەزوو و بێ زۆرلێ‌کردن پەیدا دەبێ، دەڵێین کە زانراوەکە بوو، بەهۆی بوونەکەیەوە زانینی خودا بەو شێوەیە کە هەیە پێوەندی پێوە بەستووە، نەک زانراوەکە بەوجۆرە کە زانینەکە پێوەندی پێوە بەستووە وەها دەبێ؛ چونکە عیلمی خودای گەورە، ئەگەرچی راستە و لەگەڵ بووەکەدا رێکە و هەموو لایەکی گرتووەتەوە بەو جۆرەی کە هەیە، بەلام ئەم عیلمە لەو رووەوە کە عیلمی خوایە نابێ بە هۆی واجب‌بوونی روودانی کارەکە. دیارە مەعلوومەکە مەقدوورە، واتە قودرەت دەیکا، قودرەتەکەیش تابیعی ئیرادەیە، عیلمەکەیش (بلا تشبیه) ئاوێنەیە ـ وەرگێڕ ـ

٤٨ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لە پاڵ (علی الحق)دا نووسراوە: «فیە معنیان ـ منە ـ واتە: دوو مەعنای هەیە، یەکەم: وجووب لەسەر خودا. دووەم: بەڕاستی ئەحمەقە!

٤٩ـ وشەی (نەوی) لەم نیوە بەیتەدا هەڵدەگرێ (نەوێ) بێ و (بەسیرەت) فاعیلی بی. هەڵیشدەگرێ (نەوی) بێ و (ی) کە فاعیل بێ، واتە ئەگەر تۆ چاوبەسراو نەوی.

٥٠ـ وەک دەخوێنرێتەوە وەهام نووسیوە، ئەگینا لە دەستنووسەکەدا (بعد از) ە، فارسی‌یە، واتە: لەپاش.

٥١ـ ئایەتی (٨١) سوورەتی (بقرة).

٥٢ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا نووسراوە «ای لكن» واتە بەڵێ بە مەعنای (بەلام)ە.

٥٣ـ فرەی دەوکەنار: چۆن دەخوێنرێتەوە وەهام نووسیوە، ئەگینا لـە دەستنووسـەکەدا نووسـراوە (فَـرَّیْ دە أو کنار).

٥٤ـ لە دەستنووسەکەدا بەم شێوەیە. خۆی دەبوا (باقِ) بوایە، بەلام لەبەر هاوتایی لەگەڵ (تاقی)دا تەنوینەکـەی کراوە بە یەک کەسرە.

٥٥ـ دەبوا یا (فائیدە لەم تەکلیفەدا چییە) یا (فائیدە لە ئەم تەکلیفە چییە) بوایە.

٥٦ـ لە دەستنووسەکەدا لەپێش کەلیمەی (بەحثی) یەوە بە فارسی پەراوێزێ نووسراوە دەڵێ: «یعنی: ولـی مـا بحث الخ (منە) » دیارە بۆ رستەبەندییە، واتە: بەلام ئێمە باسی... تاد.

٥٧ـ لەسەر ئەم بەیتە لە دەستنووسەکەدا پەراوێزێکی مەولەوی خۆی هەیە دەفەرموێ: «فما فی عبارة بعضٍ من القول بالمظهرية دون لمحلية لينحرف عن مذهب الاشعريّ والصوفية و يدّعي مذهباً مسـتقلاً لـيس بمرضـيّ عنـد الناظم. ـ منه ـ»

واتە: ئەوەی هەندێکەس وتوویانە کە گوایا لێـرەدا (مظهريّـة) هەیـە نـەک (محلّيّـة) و دەیانـەوێ لـە رێبـازی ئەشعەری و سۆفییان لابدەن و رێگایەکی سەربەخۆ بگرن (ناظم) ـ مەبەسـتی خۆیـەتی ـ لێـی رازی نییـە. دیـارە هەروەک لەم بەیتەدا وتوویە چی ناودەنێی ناوی بنێ مەزهەرییەت یا مەحەللییەت مەسئەلەکە ناگۆڕێ.

٥٨ـ ئایەتی (٢٨٦) سوورەتی (بقرە).

٥٩ـ لە چاپەکەدا (یجری العادة)ة. زۆر تەواو نییە.

٦٠ـ لە چاپەکەدا (عەوام و شوهرەت)ە.

٦١ـ «نیةٌ» شێوەنووسی دەستنووسـەکەیە. «نیَیْ»یش شێوەنووسی چاپەکەیە. هەردووکیان دەکەنە (نی یـەی) واتە: تۆیش ئەگەر کارێکی بەدت لەدەس دەرچوو و، نەتزانی بەدە، موستەحەقی سزا و ئازار نابی.

دیارە لە بەیتی پێشوودا دەبارەی غائیب قسـە دەکـا و لـەم بەیتـەدا لەگـەڵ موخاتـەب، ئەمـەش لـە بەلاغـەدا پێی‌دەڵێن ئیلتیفات.

ئەگەر (نی‌یە) بوایە دەبووە تەواوکەری بەیتی پێشوو و ئیلتیفات نەدەما.

٦٢ـ بەپێی دوو پەراوێزی بچووکی دەستنووسەکە کەلیمەی (موسنەد)ی بەیتی پێشوو موبتەدایە و (کێ فـەرقی دەکات)ی ئەم بەیتە خەبەرەکەیەتی.

٦٣ـ ئەمە هی دەستنووسەکەیە، لە چاپەکەدا (نیی)یە کە دەکاتە (نەیێ).

٦٤ـ لە دەستنووسەکەدا لەژێر (م)ی (تشمل) کەسرە دانراوە. بەپێی قسەی قامووسەکان هەڵـەیە و ئـەوەی بـۆ ئێرە بشێ (تشمَلُ) و (تشمُلُ) یە.

٦٥ـ لە چاپەکەدا (ورد ورد)ە. ئەمەی ئێمە هی دەستنووسەکەیە و، کێشیشی سەلامەتە بەتایبەتی ئەگەر (ی)ی (تێفکری) نەختێ درێژ بکەینەوە و دان بە زەنەی (ف) و (ک)ی (تێفکری) و (و) و (ر)ی (ورد)دا بنێین.

٦٦ـ لە دەستنووسەکەدا لەسەر ئەم پەراوێزێکی مەولەوی خۆی هەیە بە عەرەبی ئەمە نەسسەکەیەتی:

«أحوال اهل الأحوال في التوحيد ثلاثة، توحيدَ الافعال و توحيد الصفات و توحيد الذات، سواء كان توحيداً وجودياً أو شهوديا، ولا يتعلق غرض الناظم بالمرتبة الأخيرة العلية بقسميها إذ تاک خارجة عن طور العقل. والمرتبتان الأوليان وإن كانتا عاليتين أيضا لكنهما قريبتان ولاسيما الأولى وهي مشرب الأشعري والثانية مشرب أهل المرتبة الثانية من الصوفية، قدس الله اسرارهم. فهاتان المرتبتان كلتاهما أحق بالاتباع بل هما الحق؛ ولذالک زيّن الناظم بهما الرسالة وختمها باعلاهما كما اشار بقوله في صدر الرسالة «منتهای علوم علم أوانه ـ منه ـ»

بەڵێ ئەوەتە لە سەرەتاکانی عەقیدەکەیدا لە خودای گەورە دەلالێتەوە فڕێی‌داتە ناو فیرقەی ناجییە و دەڵێت:

بەو هەڵکەوتنە (مەعدووم) راجی‌یە    هەوای‌دا ئەناو فیرقەی ناجی‌یە
هەر هەفتادوسێ گشت وا لەئاردا    لە رووی عەقیدە ئەو وا لە کاردا

هەروەها لە پێشدا باسی زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەکا و دەفەرموێ:

(علماً، عملاً) موخالیف ناون    لەسەر رەویەی پاک ئال و ئەسحاون
روتبەی ئیستیدلال وەختێ هاتە بەین    با وەقەد تاقەت نەقلێکی بکەین
لە ئەنفاسی پاک ئەئیممەی ئەعلام    لە گرۆی ئەشرەف تائیفەی کەلام

دیارە مەولەوی لەم عەقیدەیەدا تێکرا رێبازی ئەشعەرییەکانی پەسەند کردووە، لێرەیشدا لە (گرۆی ئەشرەف تائیفەی کەلام) هەر ئەوانی مەبەستە.

دوایی دەچێتە سەر باسی ئەهلی تەسەووف و دەفەرموێ:

لەدووی ئەنفاسم (ولا سیّما)    ئەنفاسی ئەنفوس قودسیی ئەولیا
(خصوصاً منهم شیوخ الإرشاد)    حەق بەرەکەتیان زیاد کا زیاد
بێ‌ئەوان ناوی، بە قەولی فحوول،    نە عیلم و عەمەل نە روتبەی وسوول
مونتهای علووم عیلمی ئەوانە    موقتەدای عەمەل ئەوان بزانە

ئەمە هی سەرەتای کتێبەکەی بوو. لە دوایی کتێبەکەیشیدا جارێکی تر نوقمی دەریای تەوحیدی سیفات دەبێتەوە، بۆنموونە دەفەرموێ:

کە پێی عەتا کرد ئەم مەزهەری‌یە    بۆ وەسفی جەمال یا جەلالی‌یە
دەلیلی ئەهلی حالە موتتەزیح    (وَ إن مِن شيء إلاّ يسبّح)
(فَبتقدير العزيز الخبير    ألأشيا طَراً كانت مقادير
لِأسمائِه وصفاتِهِ    تَجلّت فيها لا لذاتِه)
جێی نییە جیلوەی زاتی بەتاقی    مەر دڵی موئمین فانی‌یو باقی
عارف هەر خۆیە و مەعرووف خۆیە بەس    مەعریفەتی حەق بۆ کەس نادا دەس

٦٧ـ هەڵدەگرێ (خوو) بێ و لە ئەسڵدا (خووی) بووبێ و لەبەر شیعر کورت کرابێتەوە. هەڵیشدەگرێ (خۆ) بێ کە مەعنای ئاشکرایە.

٦٨ـ لە زانا هەڵکەوتووەکانی عیلمی کەلامە ساڵی (١٠١٣)ی ز لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

٦٩ـ جەمعی (مولود) بە (موالید) تەواوە، بەڵام بە (موالیدات) رەشۆکی‌یە.

٧٠ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لەسەر (بە فوویێ) نووسراوە: (فیە لطافة). دیارە چونکە دوو مـەعنای هەیـە، یەکەم: بە ئاسانی. دووەم بەو فوویە کە ئەوی لێدروست کرا بە بێباوک. ئەوەیشمان لەبیر نەچێ هێزی موو و فـوو زۆریان فەرقە. ئیتر بێجگە جوانیی جیناسی موو و فوو.

٧١ـ شیعرەکە بکەرەوە بە پەخشان و بەم جۆرە بیخوێنەوە: مەڵێ: (یا نارا إحراقٌ لَدیْک) ؛ (برداً سلاماً) دەڵـێ: (سَلَامٌ علیک!).

٧٢ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا دەڵێ: «فیە لطافـة» وابـزانم گونجانـدنی لەتافەتەکـەی بـەم جۆرەیـە: واتـا سەرەکییەکە ئەوەتە کە ئیسماعیلی زەبیح(د.خ) جواب دەگرێتە ئەستۆ، لە هەمان کاتیشدا تێغ و گەردن لە یەکەوە نزیکن بەتایبەتی بۆ قوّچ.

٧٣ـ «بَراَوْزور» و «بَراَوْزیر» شێوەنووسی دەستنووسەکەن، ئەمڕۆ بەوجۆرە دەنووسرێن کە من نووسیومنەتەوە.

٧٤ـ لە چاپەکەدا (گیاه)ە.

٧٥ـ لە چاپەکەدا لەباتی «فەی» نووسراوە «تەی» بێگومان هەڵەیە، بەتایبەتی لـە پـەراوێزی دەستنووسـەکەدا لەژێر (فەی)دا نووسراوە «سایە» واتە: سێبەر. هەر لە چاپەکەدا لەباتی «المستقلّ» نووسراوە (المستقبل). ئـەمیش هەر هەڵەیە.

تێکڕا مەبەستی مەولەوی ئەوەیە ئینسان وەک سێبەری بێدەستەڵاتە، کە خـودای گـەورە کـورتی دەکاتـەوە و درێژی دەکاتەوە، واتە خالیقی راستەقینە هەر زاتی بێچوونە و شتەکانی تر بەندە و غەیری بەندە هـەموو سـێبەر و سایە و بێهێز و مایەن.

هەروەها ئیشارەیشە بۆ (مەزهەرییەت) ەکە کە لە دوادوایی کتێبەکەدا باس دەکرێت.

٧٦ـ ئایەتی (٤٥) سوورەتی (فرقان).

٧٧ـ لە دەستنووسەکەدا لەسەر ئەم بەیتە بە فارسی پەراوێزێ نووسراوە ئەمە نەسسەکەیەتی: «یعنی علم و ارادە و قدرت و تعلق و صرف آنها را همگی در عید بوجود میآورد، بندە بدان سبب مختار میشود؛ چرا کە بنا بر ظاهری کە مدار احکام ظاهریە است موصوف بدانها خواهد شد، پس چونکە عدةً «ئەو خەلقی سەبەب عادیی ئەم خەلقـە» حق تعالی آن فعل را دفعةً خلق میفرماید. ـ منە ـ»

ئەمەیش تەرجەمەکەیەتی: «واتە: خودا زانین و خواست و توانا و پێوەندی و وەرچەرخان و بەرکارهێنانی ئەمانە لە بەندەدا دروست دەکا، بەندەیش بەوهۆیەوە دەبێتە ئارەزووبەدەست، چونکە بەپێی زاهـیر، ئـەوەی کـە حـوکمی زاهیری لەسەر راوەستاوە، بەندە مەوسووفە بەم سیفەتانە؛ پێی دەوترێ زانا، خاوەنخواست، توانا... تاد، دیارە پاش دروستکردنی ئەمانە خودای گەورە یەکسەر کارەکەی بۆ دروست دەکا چونکە «ئەو خـەلقی سـەبەب عـادیی ئـەم خەلقە» واتە: ئەو خەلقکردنی زانین و... تاد دەبێـتە سەبەبی عادەتی بۆ ئەم خەلقی کارە».

شایانی باسە «ئەو خەلقی... تاد» نیوەی دەهەم بەیتە لەمەوپاش ئەگەر لەم بەیتەوە حسێبی کەین.

٧٨ـ ئایەتی (٩٧) سوورەتی (آل عمران).

٧٩ـ لە دەستنووسەکەدا لەسەر کەلیمەی (نیسبەتی..) نووسراوە: «سؤال». مەبەستی رەخنەیە. دوایش لەسەر کەلیمەی (قودرەت)ی «قودرەت وەسفێکە... تاد» نووسراوە «جواب». مەبەستی وەلامی رەخنەکەیە، شەرحەکەیش لەبەر ئەم رووناکییە دارێژاوە.

٨٠ـ ئەم بەیتە ئەگەر بیکەیتە پەخشان وای لێدێت:

لاکین چونکە ئەو فیعلە بە قودرەتی قادری مەعبوود دەبێتە وجوود.

٨١ـ ئەم بەیتە و دوو بەیتی دوای تەنها لە نوسخە چاپەکەدا هەن.

٨٢ـ لەسەر کەلیمەی (موددەعی) لە نوسخە دەستنووسەکەدا بە پەراوێز نووسراوە: (سؤال) و لەسەر «نەیێ»ی بەیتی دوای نووسراوە: (جواب) واتە: رەخنەو وەلام.

٨٣ـ لە پەراوێزی ئەم نیوەبەیتەدا لە نوسخە دەستنووسەکەدا نووسراوە: «استفهام».

٨٤ـ باقیدار: خاوەنی پاداشێکی باقی، یا باقی دەبێ لە (دارالخلود)دا وەک لە پەراوێزی دەستنووسەکەوە دەردەکەوێ.

٨٥ـ ئەم بەیتە ئەگەر بیکەینە پەخشان وای لێدێت: وەک نالێی: خەللاق بۆچ (بعد مسّ النار) ئیجادی ئیحراق دەکات، مەلێ: (لە دوای ئەوە بۆچ...) تاد.

٨٦ـ شێوەنووسی دەستنووسەکە بەم جۆرەیە (تیریتَ امْ). ئەوە دەگرێتەوە کە لە مەتنەکەدا نووسراوەتەوە.

٨٧ـ بڕوانە (منصور علی ناصف، التاج الجامع للاصول فی احادیث الرسول، بیروت، داراحیاء التراث العربی، الطبعة الثالثة ١٣٨٢ هـ ١٩٦٢ م، الجزء الخامس) لاپەڕە (٢٠٧).

٨٨ـ لە نوسخە چاپەکەدا لەباتی (قودرەت) نووسراوە (زات).

٨٩ـ لە نوسخە چاپەکەدا لەباتی (قدرة الخلق) نووسراوە (ذوات العباد).

٩٠ـ لە چاپەکەدا (مەقوول)ە.

٩٢ـلە چاپەکەدا (خەلقە) یە.

٩٣ـ شێوەنووسی دەستنووسەکە (دور أوَه کَوَه) یە کە بە شێوەنووسی ئەمڕۆی کوردی وەک ئەوەی مەتنەکە دەنووسرێ، بەلام ئەوەی کورد بەکاریدێنێ (دوورەوە کەوە) یە.

٩٤ـ ئایەتی (٢٨٦) سوورەتی (بقرة).

٩٥ـ ئایەتی (١٣٤) سوورەتی (بقرة).

٩٦ـ ئایەتی (١٩) سوورەتی (جن).

٩٧ـ ئایەتی (١٦) سوورەتی(طور).

٩٨ـ ئایەی (٩٠) سوورەتی (نمل).

٩٩ـ ئایەی (٣) سوورەتی (عصر).

١٠٠ـ ئایەتی (٧٤) سوورەتی (أنبیاء).

١٠١ـ لە چاپەکەدا پێش ئەم بەیتە بەشێوەی عینوان نووسراوە: «مبحث الرؤیة» واتە: ئەم باسە تازەیە باسی بینینی خودای گەورەیە.

ئەم عینوانە بێجگە لەوە کە لە دەستنووسەکەدا نییە، بوویشەتە هۆی پچڕانی زەنجیرەی باسەکە. خوێنەوار کە تەماشای چاپەکە دەکا بەیتی پێش عینوانەکە وا حیساب دەکا کە پێوەندییەکی تایبەتی بە عینوانەکەوە نییە، کەچی تەنانەت سەرەتای ئەوەی کە مامۆستا نعێمی بە باسی رونیەتی داناوە لەوەوە دەس پێدەکا.

بۆیە من لەبەر رووناکیی دەستنووسەکە عینوانی چاپەکەم فڕێدا و، لە بەیتی پێشیەوە دەستم پێکرد و دارشتنەوەی مەعناکەش هەر لەسەر ئەم بناخەیە بوو.

پێویست بە وتن ناکا کە مەولەوی لە دوادوای ئەسلی یەکەمدا (٦٠) دانە بەیتی بۆ باسی بینینی خودای گەورە تەرخان کرد و بە درێژی لە شوێنی خۆیدا مەعنای لێدرایەوە.

ئێستەیش بەبۆنەی باسی سیفەتەکانی خودا و سیفەتەکانی بەندە و خەواسی هەردووکیانەوە حەزی کردووە چەند بەیتێکی تریش دەربارەی ئەم بینینە بخاتە سەر ئەوەی پێشوو، ئیتر پێویستی بە عینوان نییە.

١٠٢ـ ئایەتی (٢٣) سوورەتی (قیامة).

١٠٣ـ ئایەتی(٢٢٣) سوورەتی (بقرة).

١٠٤ـ ئایەتی (٢٦) سوورەتی (یونس).

١٠٥ـ لە نوسخە دەستنووسەکەدا لەسەر ئەم بەیتە پەراوێزێکی مەولەوی خۆی بە عەرەبی نووسراوە، ئەمە نُەسەکەیەتی:

«إشارةٌ إلى الناظمِ مِن جهة أنْ شغلَهُ بيانُ سرِّ مذهبِ الأشعري و عدولَهُ عن عبارة الغير و سعيُهُ في عبارةٍ توافِقُ مشرب الأشعري، بَعُدَ عن المعتقد؛ فارتدَّ على الآثار فقرب منه و اظهره بقولِهِ «لەسەر دوو قیسمە ئیمان بەقەدەر... الخ» ـ منه».

سرنج: لە دارشتنەوەی شەرحەکەدا ئەم پەراوێزە تەرجەمە کراوە.

١٠٦ـ لە نوسخە چاپەکەدا لەپێش ئەم بەیتەوە بەشێوەی سەرباس نووسراوە (مبحث الإيمان بالقدر خيرِهِ و شرِّهِ). ئەم سەرباسە لە دەستنووسەکەدا نییە و لەراستیشدا تەنانەت بۆ شەرحیش بەم سیفەیە بەکەڵک نایێ، هەر هیچ نەبوایە بینووسیایە: (ثم الايمان بالقدر قسمان). سەرەرای ئەوە کە بەیتی «کەوتگین... تاد»ی لەم بەناو تازە باسە پچڕیوە، کە دەبێ لەگەڵیدا بێ.

من لەبەر رووناکیی دەستنووسەکە و پەراوێزی پێش ئەم پەراوێزەدا وازم لەم سەرباسە هێنا و «کەوتگین... تاد»یشم خستە سەر ئەم بڕەشیعرە و شەرحەکەیش لەسەر ئەم بناخەیە دارێژرایەوە.

١٠٧ـ بێ فەتحەیی هەمزەی (أحصاه) شێوەنووسی دەستنووسەکەیە، دیارە کێشی شیعرەکە ناچاری کردووە، ئەگەرچی دەیتوانی واوی عەتفی (واحصاهُ)ی حەزف بکردایە و هەمزە قەتعەکەی سەرنەبڕیایە وەک واوی عەتفی بەینی (خیرٍ و شرٍّ)ی حەزف کرد بێناچاریی شیعر.

١٠٨ـ ئایەتی (٢٩) سوورەتی (ق).

١٠٩ـ ئایەتی (٣) سوورەتی (سبا).

١١٠ـ لە پەراوێزی دەستنووسەکەدا لەسەر (کەچی غەڵەتە) نووسراوە: «فيه لطافة ـ منه»

واتە: دوو مەعنا دەبەخشێ، یەکەم کەچی واتە لەگەڵ ئەوەشدا. دووەم کەچ دژی راست، واتە کەشفەکەی بەپێی موتڵەقەکەی لەوح راستە و بەپێی قەیدەکە غەڵەتە.

١١١ـ لە نوسخە دەستنووسەکەدا (أَمْ پَرْ، اوْپَرّ) نووسراوە، واتە: فەتحە لەسەر هەمزەی (اوْپَرّ) دانەنراوە، مەبەستی ئەوەیە بە (ئەمپەڕەوپەڕ) بخوێننەوە، منیش بەگوێم کرد و وام نووسییەوە.

١١٢ـ ئایەتی (٣٩) سوورەتی (رعد).

١١٣ـ ئایەتی (١١) سوورەتی (فاطر).

١١٤ـ لە دەستنووسەکەدا لەسەر ئەم نیوەبەیتە پەراوێزێکی فارسی نووسراوە ئەمە نەسسەکەیەتی: «در کتب طب بلکه در کتب فقه نیز هست که استشمام عنبر جهت دفع طاعون و وبا مفید است. (اللهم لا دواءً الاّ دواؤک و لا شفاءً إلاّ شفاؤک) ـ منه» واتە: لە کتێبە پزیشکییەکاندا، بگرە لە کتێبەکانی فیقهیشدا هەیە کە بۆن‌کردنی عەنبەر بۆ رێ لە تاعوون و وەبا گرتن بەسوودە. خودایا! بێجگە دەرمانی تۆ هیچ دەرمانێ نییە، بێجگە لە شیفای تۆیش هیچ شیفایەک نییە.

١١٥ـ ئایەتی(٣٩) سوورەتی (نجم).

١١٦ـ ئایەتی(١٠) سوورەتی (حشر).

١١٧ـ ئایەتی(٨٨) سوورەتی (نمل).

١١٨ـ ئایەتی(٣) سوورەتی (ملک).

١١٩ـ ئایەتی(٦٢) و (٦٣) سوورەتی (زمر).

١٢٠ـ ئایەتی(٢٤) سوورەتی (فاطر).

١٢١ـ لە نوسخە چاپەکەدا لەپێش ئەم شیعرەدا بە شێوەی عینوان نووسراوە (مبحث الخاتمة بالتوبة وخاتمة الکتاب).

عینوانەکە، سەرەڕای ئەوە کە لە دەستنووسەکەدا نییە، ئەم بەیتە تاقانەی لە بەشەکەی خۆی جیا کردووەتەوە. خۆ ئەگەر وەک شەرح عینوانێ دانرێ دەبێ دوای ئەم بەیتە بێ و تەنها بە (خاتمة الکتاب) یش ئیکتیفا بکرێ.

لەڕاستی‌دا نامەوێ زۆر لەسەری بڕۆم، بەڵام تەنها وەک یارمەتی‌دانێکی زۆر کەمی ئەوانەی بیانەوێ لە دوارۆژدا بە قووڵی لەسەر مەولەوی و سۆفییەتەکەی بنووسن دەڵێم ئەم شاعیرە زانا گەورەیە لە دوادوایی ئەم عەقیدەیەیدا بەتەواوی نوقمی دەریای تەسەووف بووە و لە خۆیەتیی خۆی دوور کەوتووەتەوە و، وەک سەرەتاکانی کتێبەکەی لەم رێیەوە دەس پێ‌کرد دواییشی هەر بەوە هێنا.

١٢٢ـ ئایەتی (٢٣) سوورەتی (اعراف).

## خاتيمة[1]

زانــینی ئــەووەڵ ئــە دەس ناکـــەوێ
بــە نەفــەس ئاگــات لــە خاتیمــە وێ
زاهــیری شــەرعی بگــره ئــە گــەردن
تــا ئــەم مــردن تــێ یــاخۆ ئــەو مــردن
چــون بــەو زاهــیره دڵ نــوورانی بــوو
پــەردەی زوڵــمانی لــە رووی دڵ لاچــوو
بــاتینی شــەرعی تێــت وەپــیرەوە
بــەم تــەقریرەوە و بــەم تــەحریرەوە
دەڵــێ: تــەقازای زاهــیر بــوو ئەمــە
ئــەم نیزاعــە و ئــەم هــەموو هەمهەمــە؛
یــەکێ جــەبری بــوو، یــەکێ قــەدەری
یــەکێ تــابیعی رەئیــی ئەشــعەری
یــەکێ لــە دەســی تــەوارود غــەمناک
یــەکێ خــەریکی دەردی ئیشــتیراک
کۆلانی چاوتــەنگ، تەشــاوی دڵ تــەنگ
جێ پەست و بولەند خار و دار و سەنگ!

نێڵـەی عـەوامیل لـە ملـیدا چوسـت
هێش و مشانی نەوع نەوعی لـێ خسـت
سـەدای سـەماعی و قیاسـی لـە گـوێی
نەقیزەی نەقیض مەتڵـەب دەیـدا لێـی
لـە هێڵـی لـەفزی هـۆی نـەدەداوە
مەعنـەوی بـەحاڵ دوو بـوو بـەلاوە
لـەلای باخەبـەر نـاقیس بـێخەبـەر،
تـەواو بـوو، مـاوە، سـەقیل، مونەککـەر

زانینی ئەووەڵ: زانینی یەکەمجار دروستبوونت، یا زانینی ئەوەی کە خـودا لـە سـەرەتاوە لـە ناوچاوانی نووسیویت. بە نەفەس: بە هەناسە، بە وردی، نەیخەیتە پشت گوێ. ئەم مردن: مـردنی نەفسی نابار و رام بوونی. ئەو مردن: گیاندەرچوون و ماڵئاوایی لـە ژیـان کـردن. هەمهەمـە: بـە پسکەپسک و پەنامەکی قسەکردن. کۆلان: کووچە، شاریع. تەشاو: شەپۆل. خـار و دار و سـەنگ: دڕک و دار و بەرد. نێڵە: پارچە دارێکی تایبەتییە لە کاتی جووتکردن و زەوی کێڵانـدا دەخرێتـە سەر ملی دوو گای جووت. چوست: چەسپ. هێش: لە ئالەتەکانی جووتە هەوجاڕیشی پێدەڵـێن، دارێکی دووفاقە گاسنەکە دەکرێ بە فاقە کورتەکەیانەوە. مشان: کە مژانیشی پێدەڵـێن، دارێکـی درێژە سەرێکی دەبەسترێ بە ناوەڕاستی نیڵـەکەوە و ئەوسەرەکەیشـی بـە هێشـەکەوە. نـەقیزە: دارێکی درێژی نووک تیژە یا پارچـە ئاسـنێکی تیـژ بـە سـەریەوە دەچـەقێنرێ و گـای پـێ لـێ دەخوڕرێ. هێڵ: شوێن گاسنەکەیە کە لە زەوییەکەدا هەڵیئـەدڕێ لـەمسـەر تـا ئەوسـەر. هـۆ: دەنگێکە جووتیار لە کاتێکدا دەگاتە ئەوسەری هێڵ، بۆ گێڕاندنـەوەی گاکـان و بـەردەوامییان لـە کاردا بەکاریدەهێنێ. هۆی نـەدەداوە: نەدەگەڕایـەوە. باخەبـەر: ئـەهلی دڵ، ئـەو خوداپەرسـتە دڵسۆزانەن کە خودای گەورە دڵ و دەروونیان بە نووری خۆی رووناک دەکاتـەوە و گـەلێ شـتیان حاڵی دەبێ. بێخەبەر: غـەیری ئـەو ئـەهلی دڵانەیـە. دوو: خـودا و پێغەمبـەر یـا خـودا و رۆژی قیامـەت، یـا قەزاوقـەدەر. نـەقیزی مەتڵـەب: دژی مەبەسـت کـە زانـینی حەقیقـەت و بـەرچاو روونبوونەوەیە. مونککەر: نەکیرە دژی مەعریفە.

واتە: خۆ زانینی یەکەمجار دروستبوونی ئینسان و سەرەتای، یا زانینی قەزاوقەدەر ئـەوەی لـە ئەزەلەوە بۆی دیاریکراوە لە وزەی کەسدا نییە و تەنها ئیشی خالیقی بێهاوتایـە، بـەلام زۆر بـە

وردی ئاگات لە دواساتی ژینت بێ، نەکەی بە کات و سات لێی غافڵ بی و بیخەیتـە پشـت گـوێ، ئەوەی لە تواناتدایە بیکە و ئەوی تریشی بدەرە دەستی خودای گەورە و وزە بێسنوور.

ڕێوشوێن و پێویستییەکانی ئەم ئاگا لە خاتیمە بوونەیش ئەوەیـە کـە پەیـڕەوکردنی زاهـیری شەریعەتی پاک و بێگەردی ئیسلام بگریتە ئەستۆ، هەتا نەفست دەمرێ و بەتـەواوی رام دەبـێ و دێتە ژێر بار و لەخوداترسان دەبێتە نان و ئاوی، یا هەتا مردنی ئێجگاری و کۆچی دوایی.

کە دڵ بە پەیڕەوکردنی زاهیری شـەریعەتی پـیرۆزی ئیسـلام نـوورانی بـوو پـەردەی تـاریکی گوناهی لێلادرا، باتینی شەریعەت دێ بەپیریەوە؛ چونکە تا دڵ پـاک نەبێتـەوە حەقیقـەت رووی تێناکا. هەر ئەو حەقیقەتە پێی‌دەڵێ: ئەم هەموو نیزاع و بەیـەکاهاتن و ئیسـپات و ڕەددە هـەموو لەوەوە پەیدا بووە کە دڵ خەریکی کاروباری زاهیری و ئەسبابە بینراوەکان بوو، بۆیە یەکێ بووبووە جەبری و رای وابوو عەبد وەک دار و بەردی کش و مات و بێدەستەلات و پـەک‌کـەوتووە. یـەکێ بووبووە قەدەری و دەیوت عەبد خالیقی کاری خۆیەتی. یەکێ ئەشعەری مەشرەب بـوو و دەیـوت عەبد لە ئیرادەدا مەجبوورە و خودا داویـەتێ، بـەلام لـە کـاردا ئیختیـاری هەیـە. یـەکێ خـەم و پەژارەی تەوارود دایگرتبوو وەک ئەبووئیسحاقی ئەسفەراییني و پەیڕەوانی کە دەیـان‌وت تێکـرای قودرەتی خودا و قودرەتی عەبد تەئسیر لە کارەکەدا دەکا، نەک لەبەر بێکیفایەتیی قودرەتی خودا ـ معازالله ـ بەڵکو لەبەر ئەوە کە عەبدەکە ببێتە موستەحەقی پاداش و تۆڵە. یەکێکیش گـیرۆدەی ئیشتیراکە و لای‌وایە هەردوو قودرەتەکە کاردەکەن؛ قودرەتی خودا لـە ئەسڵـی کارەکـەدا و هـی عەبدیش لە سیفەتی تاعەت و مەعسییەتی‌دا، وەک قازی ئەبووبەکری باقلانی دەیوت.

بەڵێ لەو حاڵەدا کە پابەسـتەی کاروبـاری زاهـیری بـوو، ئـەو ڕێگایـەی چـاو دەیکـردەوە بـۆ پیارۆیشتن کۆڵانێکی زۆر تەنگ و تەسک بوو، هەر ئەوەندەی دەبینی، شەپۆلی دڵ خۆی تـەنگ و هاتووەیەک بوو، بەردەم بەرزی و نزمی و پڕ لە کۆسپ بوو. لـەوبارە تایبەتییـەدا نێلـەی ئەسـبابی زاهیری لە ملی دڵ توند کرا و هێش و هەوجاڕ و مژانی جۆراوجۆری لێ بەسترا و ئـاوازی دەلیلـی نەقڵی و عەقلی و سەماعی و قیاسی پڕی گوێی کرا، یەک‌لەدوایەکیش، نەقیزەی دەلیلـی زاهـیری تێوە دەژەنرا بۆ ئەوەی بیری گورج‌تر بڕوا و زووتر بگاتە مەبەسـت و حەقیقـەتی بـۆ روون بێتـەوە، کەچی ئەم هەموو شتانە دژی مەبەستیان دەبەخشی و زیاتر مێشکیان ئالـۆز دەکـرد. لـەم کـار و کۆششە بێ‌ئەنجامەدا هەر خەریکی کێلانی هێڵی لەفزی و زاهـیری بـوو و هـەرگیز بـەرەو هێڵـی

مەعنا و باتین بای‌نەدەدایەوە، بە هەزارحاڵ دوو شتی مەعنەویی لا مابوو؛ خودا و دواهـاتنی ژیـان بەرەو جیهانی گیان، یا قەزاوقەدەر، یا ئیمان بە خودا و بە پێغەمبەر (ئیمان شتێکی مەعنەوییە).

مەولەوی دڵی ئینسانی دوای تەنها زاهـیر کـەوتووی بـەدوای حەقیقـەتا نەگـەڕاوی تەشبیهـ کردووە بە گای جووت؛ دیارە نیڵە و هێش و مشان و نـەقیزە و هـۆ و هـێڵ و کـۆڵان و شـەپۆل و بەرزی و نزمی و دڕک و دار و بەرد پێوەندییان بە کاری جووتەوە هەیە، هەروەها دەفەرموێ:

ئەوەی بەدوای دەلیلدا دەگەڕێ مادام هەر تەماشای زاهـیر بکـا و لـە نوورانییـەتی دڵ بـەش و بەهرەی نەبێ و تەنها قسە لەم و لەو ببیسێ و قیاسی غائیب لەسەر حازر بکا، واتە خودا و سیفەتی وەک مادده و سیفەتەکانی مادده سەیر بکا و، بەرچاوی تەنگ و هێزی بینینی کەم بێ و شـەپۆلی دڵی تەنگ و بێدەرەتان بێ و سوودی باش لە مەحسووسـات و مـەعقوولات وەرنـەگرێ و جـارێ ئاوڕێ لە مەعنەوییات نەداتـەوە و هـەر خـەریکی لێکۆڵـینەوەی زاهـیری بـێ، هـەر هەوڵـێ بـدا ماندووبوون نەبێ هیچی پێ نابڕێ و لەباتی دامەزرانی دڵ هەر لە گێژاوی دڵەڕاوکێ و بێهیوایی و بەئامانج نەگەیشتندا دەمێنێتەوە، وەک ئەو گاجووتە کە ماوەی جووتی تـەنگ بـێ و زەوییەکـەی بەرز و نزم و سەخت و رەقـەن و کـەمئـاو و بـێدەرەتـان بـێ، نـە نـەقیزە بیجوولـێنێ و نـە هـۆ وەریگێڕێ.

دیارە مەولەوی لە بەکارهێنانی خەبەر، مونەککەر، عـەوامیل، لـەفزی و مەعنـەوی، سـەماعی و قیاسی‌دا، کە لە مُوستەلەحاتی نەحون، تەورییەی بەکار هێناوە، دیارە بۆ ئـەو شـتێکی ئاسـانە بـە ئارەزووی خۆی یاری بە وشە بکا، ئەو کەی بۆ کەلیمە داماوە؟

تـا وەختــێ کــەلام ســوحبەتەکەی شــێخ
ئیزافــەی مــەعنی هیممەتەکــەی شــێخ
دای‌پێــی فائیــدەی تــەخفیف و تــەعریف[٢]
تەی کرد رێگەی حەق پێی، چلۆن؟ زەریـف:
(قیــلَ لَــهُ انظُــرْ مِــنْ أعْلَــی الــدَّرَجْ[٣]
لِقــاحَ صَفْصَــفْ) بــێئــەمت و عیــوەج
لــە (كُنْــتُ كنــزاً مخفیــاً) نیشــان
(فأحْبَبْــتُ أنْ أعْــرَفْ)، چــاک بــزان

(فَخَلَقْتُ الخَلْقْ)، بۆچ؟ (لِكَيْ أعْرَفْ
فَاعْرِفِ النّائِبْ وَقُلْ، لا تَخَفْ):
ئەگەرچی مەحبووب پاک پەردەی غەیب
دامەنە بێ گەرد لە توهمەت و عەیب
(فی كَمَالَيْهِ بِالغِنى مَقْرُونْ
عَمَّا قَدْ وَجَدْ وَ عَمَّا يَكُونْ)
ئاینەی بچووک تەنگی کەونییە
ئاینەی بالانومای ئەو نییە
شانەی تەفاسیل عەینی کائینات
داد، داد وە تاتای زولفی ئەو نادات
خوسووس ئاینە ئەغلەب بۆ عەیبە
چ عەیبێ لەلای (عالِمُ الغَيْبَ)ە
توغرای خودبەخود ئارایش دادە
وە ئەندازەی حوسن ئەزەل ئامادە
گرنج و شکنج پێچپێچ لەسەر خۆی
کەی رێی کەوت [4] تەرتیب تیپ رەیو کەی
چ ئیحیتیاجی هەیە بە شانە
(سُبْحَانَهُ مَا أعْظَمَ شَانَهُ)
بەلێ [5] موختارە ئەر خەلوەتی بوو
موتەفەززیلە ئەر جەلوەتی بوو [6]

ئەمت: بێهێزی. عیوەج: لاری. (النائب): نائیب فاعیل. (أعْرَف): فیعلی موزاریعی مەجهوولە، واتە: لەباتی فاعیل نائیب فاعیلی هەیە، دیارە نائیب فاعیلی (أعْرَف) زەمیری (أنا)یە کە مەبەست خودای گەورەیە. ئایینە: ئاوێنە. بالانوما: ئاوێنەی بەقەد بالابەرز کە تەواوی بالای ئەوکەسەی تیا ببینرێ کە بەرامبەری راوەستێ. «داد»ی یەکەم: هەی هاوار! «داد»ی دووەم: کەلک. توغرا: مەبەست زولفە، ئەگەرچی لە بنەڕەتدا جۆرە نووسینێکی شاهانە بووە. خودبەخود: خۆبەخۆ نەک

لە کەسی ترەوە. ئارایش دادە: رازێنراوە. گرنج: چین‌چین و لوول و یەک‌لەسەریەک. کەی ریێ‌کەوت: کەی حەددی هەیە. رەی: شاری (رەی). کەی: کورت کراوەی کەیخەسرەو و ئەو جۆرە ناوانەیە، یا واتا شاهی شاهان. (شانە)ی یەکەم: شانەی سەرداهێنان و ئارایشی زولفە. (شانە)ی دووەم: (شَأنُ)ی عەرەبییە و هەمزەکەی لەبەر قافیە کراوەتە ئەلف، واتە: حاڵ و پایە. خەلوەتی: خۆ پیشان‌نەدانی. جەلوەتی: خۆ پێشان‌دانی. ئەم دوانە هەردووکیان لە ئیستیلاحی ئەهلی تەسەووفن و مەعنای تایبەتییان هەیە. بەڵێ: لاکین، بەلام.

لە کۆمەڵە بەیتەکانی پێش ئەم کۆمەڵەدا گەیشتینە ئەوە کە دڵی بێ‌خەبەری دوای تەنها زاهیر و ئەسبابی مادی و عالەمی مەحسووسات کەوتوو وەک موبتەدای بێ‌خەبەری لێهات و بە پێوەندی و تێکەڵی لەگەڵیاندا سەرگران بوو، هەروەها نەکیرە و نەناسراو و سەرلێ‌شێواو بوو.

ئێستە مەولەوی لەم کۆمەڵە شیعرەیدا باسی ئەوە دەکا کە دڵ بەهۆی هاوڕێیەتیی شێخی تەواوی مورید پێ‌گەیێن و، بە یارمەتیی هیممەتی، دەگۆڕێ و دەکرێتەوە و وردە وردە بەرچاوی روون دەبێتەوە.

هاوڕێیەتیی شێخ وەک (ال)ی تەعریف، لەگەڵ ئیزافەی هێزی ئەو دڵە بۆ لای هیممەتی شێخ هەم تەعریفی پێ دەبەخشێ و هەم رۆح‌سووکی دەکا.

بەم هاوڕێیەتی‌یە دڵ دەبێتە مەعریفە و ناسراو، بەو نیسبەت و پێوەندییە مەعنەوییە لە باری گرانی لەفز و مادده و زاهیر و مەحسووسات دوور دەخرێتەوە و باری سووک دەبێ و لە ئاسمانی ئاشنایەتیدا دەفڕێ.

بە یارمەتیی لوتفی خودایی ماوەی دوور و درێژی رێڕەوی بەرەو زانینی حەقیقەتی پێ دەبڕێ. جا کە گەیشتە ئەو رادەیە و بەو پایە بەهرەمەند بوو لە لووتکەوە بانگی لێ دەکرێ و پێی دەوترێ: سەیری دەشتی پاکی بێ‌بەرزونزمی و جوان و رێک‌وپێک و دامەزراو بکە، بە چاکی لە نیشان و مەعنای «کنتُ کنزاً مخفیاً فَأحبَبْتُ الخلقَ لِکَیْ أعْرَفَ» حالی ببە، نائیب فاعیلی هەردوو (أعْرَفَ) ەکە بناسە کە خودای گەورەیە و بێ‌ترس بڵێ:

خودای گەورە جیهانی دروست کرد، بۆ ئەوەی بناسرێ و لەپاش ناسین بپەرسترێ، بەلام وا تێنەگەی کە خوداناسینی تەواو لە وزەی کەسدا هەبێ؛ ئەوەتا حەزرەتی(محمد المصطفی)، درووەی خودای لەسەر بێ، دەفەرموێ «سُبْحانَکَ ما عرفناکَ حقّ معرفتک» چۆن نوور و زانینی سنووردار زاتی خودای گەورەی لە هەموو روویەکەوە بێ سنوور کەشف دەکا؟ وەهایش مەزانە کە

خودای گەورە ـ معاذاللە ـ بەقەد تۆزقاڵێ موحتاجی ئەم ناسینە بێ، نەخەیر؛ خودای پاکی بێعەیب کە لە کەمالاتی ئیجابییە و سەلبییەدا دەوڵـەمەندە موحتـاجی کـەس نییـە و لـە غـەیری خـۆی بێنیازە. راستە ئەم کەون و کائیناتە وەک ئاوێنەیە و توانای خودای گەورەی تێدا نومایانـە، بـەلام ئاوێنەیەکی وەها بچووک بالانومای خودای گەورە نییە و حەقیقەتی (لامەحـدوود)ی ئـەوی تێـدا نابینرێ. ئاوێنەی وەها بچووک ناتوانێ ئاساری ئیبداعەکانی ئەو و دروستکراوەکـانی بـە تـەواوی بنوێنێ، چ جایێ بتوانێ بە درێژی حەقیقەتی لە زانین نەهاتووی کەشف بکا. ئەوانەی ئەم ئاوێنەیە دەیاننوێنێ سنووریان هەیە؛ زات و سیفەتی خودا حەقیقەتی بێسنوورە [قل لو کانَ البحـرُ مـداداً الکلماتِ ربّی لَنَفِدَ البحرُ قبلَ أن تنفَدَ کلِماتُ ربّی ولو جئنا بمثله مدداً][۷]

بەتایبەتی زۆربەی بەکارهێنانی ئاوێنە بۆ سەیری عەیب و چارەکردنیەتی، دەبێ چ خەوشـێ لـە زاتی پاکی ئاگاداری نهێنی و ئاشکرادا هەبێ؟!

ئەو شانەیە کە دانەدانەی بووەکان دادەهێنێ و تاتایان دەکا، هـەی داد هـەی بـێداد، کەڵـکی ئەوەی پێوە نییە تاتای لەژمارەنەهاتووی زوڵفی ئەو دابێنێ.

ئەو خودا خۆشەویستە، تووڕەی سەرگۆنای خۆبەخۆ جوانـە و ئـاڕایش دراوە و لـە ئەزەلـەوە تـا ئەبەد لەگەڵ ئەو جوانییە خۆییەدا ئامادەیە بۆ نومـایش دان، چـینچـین و پـێچپێچـی نـازداری ئەوەندە لەڕادەبەدەر جوان و دڵڕفێنە، کەی تەرتیب و ریزی سوپای شـاری رەی و شاهانشـاهانی «کەی» حەددی هەیـە لافی هاوشـانی لەگەڵـیا لـێبـدا و بلـێ مـن وەک ئـەو جـوان و رێـک و دڵڕفێنم؟

بەڵێ ئەم خودا گەورە بێوێنە و هاوتایـە چ ئیحتیاجییـەکی بـە شـانە و داهێنـان و رازاندنـەوە هەیە؟ ئای کە گەورە و بەدەستەلات و زات و سیفات بێسنوورە.

بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا ئارەزووی بـە دەسـتی خۆیـەتی و کـەس ناتوانـێ زۆری لـێبکـا، ئەگـەر بییەوێ خـۆی دەرنـەخا و؛ فـەزڵ و گـەورەیی و میهرەبـانیی خۆیـەتی ئەگـەر تۆزقاڵـێ تیشـکی گۆشەیەکی چاوی بەخشندەیی و بەزەیی بگرێتە جیهان یا ئەم و ئەو، [والله یخـتصّ برَحْمتِـهِ مَـنْ یَشاء وَالله ذو الفضلِ العظیم][۸]

کەواتە گەورەیی خۆیەتی کە جیهانی دروست کرد و خەڵکی بە ناسینی بەهرەمەند بوون.

هـــەروەها ســـیفات مەزهـــەرن بـــۆ زات
ئەسمایچ مەزهەرن یەکیـەک بـۆ سـیفات

بۆ هەر یەکێکیچ لە ئەسمای حوسنا
موقەددەری کرد یەکێ لە ئەشیا
کەوا لایق وێ بۆ مەزهەرییە
بۆ ئایینەی ئەو ئیسمی عەلییە
کردی بە مەبدەء لەبۆ ئەو شەیئە
ئەو ئیسمە خۆرە و ئەو شەیئە فەیئە
موستەعید دەوێ بەو ئیسمە ئەو شەی
بەو ئیسمە دەکا حەمد و شوکری حەی
زوبانێکی پاک مەلەکووتیی هەس
پێی دەکا تەسبیح جەنابی ئەقدەس
کە پێی عەتاکرد ئەم مەزهەرییە
بۆ وەسفی جەمال یا جەلالییە
دەلیلی ئەهلی حالە موتتەزیح
(وَ إِنْ مِنْ شَیء إِلاّ یُسَبّحْ
فبِتقدیر العزیز الخبیر
اَلأشیا طُراً کَانَتْ مقادیر
لِأسمائِهِ وَ صِفاتِهِ
تَجَلَّتْ فیها، لاَلذاتِهِ)
جێی نییە جیلوەی زاتی بەتاقی
مەر دڵی موئمین فانیو باقی
دەرکی دڵی خەڵق هەر دادەمێنێ
هەر خۆی لە بەرچاو خۆی دەنوێنێ
عاریف هەر خۆیە و مەعرووف خۆیە و بەس
مەعریفەتی حەق بۆ کەس نادا دەس

سـیدقی قەزییـەی مووجیبـە راسـە
موقتـەزیی وجـوود مەوزووعـە، واسـە
تـۆ خـۆ مەعـدوومی هـەر نادیـاری
نـە موختاریـت راس نـە لاموختـاری
(نیـزاع بـڕیاوە) دەگـەڵ (خـاس و عـام)
(صَـحَّ العقیـدة وَ تَـمَّ الکـلامْ)

ئەسمایچ: ئەسمایش. یەکێکیچ: یەکێکیش. شەی: شـەی. حـەی: زینـدوو، خـودای گـەورە. هەس: هەیە. بەتاقی: بەتەحقیق. مەر: مەگەر. نادا دەس: دەس نادا. واسە: وەهایە.

واتە: حەقیقەتی زاتی خودای گەورە کەس پەیی پێ نەبردووە و نایبا، بەڵێ ئەوانەی لـە ڕێگـای دەلیل کارییەوە ئەڕۆن، مەخلووقاتەکە دەکەنە دەلیل لەسەر بوونی خالیق و لەم ڕێگایەوە دەزانـن کە زاتی خـودای (واجـبالوجـود) هەیـە و لـە هـەموو ڕوویەکـەوە تـەواو و بـێعەیبـە. هـەروەها سیفەتەکانی خودای گەورە مەزهەری زاتەکەینی، واتە: بە سیفەتی عیلمدا دەزانرێ کە هیچ شتێ لە خودا ون نابێ [وَاتَّقُوا الله وَيُعَلِّمُكم الله والله بكل شيء عليم][٩]. بە سیفەتی ئیرادەدا دەزانرێ کە بەبێئیرادە و خواستی خودا هیچ شتێ نابێ (ماشاء الله کان و مـالم یشـأ لـم یکـن). بـە سـیفەتی قودرەتدا دەزانرێ کە هەرچی مومکینەکانە لەژێر هێزی تەئسیری خودان. بـە سـیفەتی بەسـەردا دەردەکەوێ کە هەر شتێ لە هەر شوێن و لە هەر کاتێکدا هەبێ خودای گـەورە دەیبینـێ و لێـی ون نابێ. بە سیفەتی سەمعدا بۆمان دەردەکەوێ کە هەر دەنگێ هەبێ خـودا ئاگـای لـێ دەبـێ و دەیبیسێ. بە سیفەتی کەلامدا دەزانرێ کە هەرچی کتێب و سەحیفەیەک بۆ پێغەمبـەران هاتبـێ هەموو کەلامی خودای گەورەن. لە سیفەتی حەیاتەوە دەزانرێ کە خودا ئـەزەلی و ئەبـەدیـیـە و بەرودوای بۆ نییە، نە نەبوونی لێ پێش کەتووە و نە نەبوونی بەدوادا دێ؛ چونکە کەسێ خـۆی لـە خۆیەوە ببێ دەبێ وەهابێ.

ئەو ناوە جوانانەی خودای گەورە کە لە قورئـان و حەدیسـدا نـاوبراون مەزهـەری سـیفەتەکانی خودای گەورەن، چونکە، بۆ نموونە سیفەتی قودرەت سیفەتێکی خاوەن تەئسیرە و ئەو تەئسـیرانە لە ئەسمای حوسناوە دەردەکەون؛ سـەیرکەن (رازق، وهـاب، نـافع، مُعْطـی) هـەموو لـە ئاسـاری سیفەتی قودرەتن. هەروەها هەریەک لـەو ئـەسمای حوسـنایە لـە کائیناتـدا مەزهـەرێکی هەیـە،

بۆنموونە: ئینسانی میهرەبانی دڵودەروونباشی بەکەڵکیخەڵکهاتوو لە ژێر ئاساری دوو ئیسمەی (الرحمان) و (الرحیم) دایە. ئینسانی سەرکەش و نالەبار و ئازاردەر لە ژێر ئاساری ئیسمی (القهار) دایە.

ئەو شتە یا ئەوکەسە کە بوو بە مەزهەر بۆ ئیسمەکە وەکوو ئاوێنەی لێ دێ بۆ ئیسمە پیرۆزەکە هەر دەڵێی ئیسمەکە نوورە و مەزهەرەکە سێبەرێکە و بەرامبەری ئەو نوورە پەیدا دەبێ. ئەوشتە یا ئەوکەسە بە تیشکی ئاساری ئیسمە پیرۆزەکە کە مەزهەری یەکێکە لە سیفەتەکانی خودا ئامادە دەبێ بۆ ئاسار. بۆ نموونە: زاتێ ببێتە مەزهەر بۆ ئیسمی نافیع هەتا تیشکی ئەو ئیسمە بەسەر ئەو زاتەوە بێ لە چەند لا و بە چەند جۆر سوود بەخۆی و بەغەیری خۆی دەگەیەنێ، دیارە بوونی ئەو زاتە یا ئەو شتەیش بە مەزهەری ئیسمە پیرۆزەکە کار و تەقدیری خودای گەورەیە و هی کەسیتر نییە.

ئەنجا ئەو زاتە مەزهەرە، بەپێی مەزهەرییەتی بۆ ئەو ئیسمە پیرۆزە، پێوەندی لەگەڵ خاوەنئیسمدا پەیدادەکا کە خودای بێهاوتایە و تەسبیحی دەکا. مەعنای [وإنْ مِنْ شيء إلاّ يُسَبِّحُ بِحمده ولَكِنْ لا تَفقَهُون تسبيحهم][10] لێرەدا دەرئەکەوێ.

بەڵام حەقیقەتی دەرکەوتنی ئەم ئاسارە، تایبەتییە بەوانە کە خودای گەورە و میهرەبان خۆی دەرگای دڵ و هەستیان دەکاتەوە و رووی تیشکی نووری تەجەللای خۆیان تێدەکا.

ئەم مەزهەرییەتەیش کە باسمان کرد هەمووی پێودانی تایبەتی هەیە، ئەندازەی دیاری بۆ دانراوە و مەزهەرەکانیش تەنها مەزهەری ئیسم و سیفەتن نەک زاتی خودای بێوێنە. جێگای تیشک و پرشنگی نووری زاتی خودا تەنها دڵی خاوەنباوەڕێکە کە لە پەرستنی خودا و بیرکردنەوە لە گەورەیی خودا بووبێتە قەرەبرووت، بوون و نەبوونی بۆ خودا بێ و لە خۆشویستنیدا توابێتەوە، بەڵێ ئەم جۆرە ئینسانە تایبەتییانە تیشکی نووری زاتی پەروەردگار روو دەکاتە دڵیان. بەڵام لە عاستی ناسینی زات و پەیبردن بە حەقیقەتیدا هەموو دڵێ داماو و بێدەستەڵاتە، زاتی خودا و حەقیقەتەکەی تەنها خودا خۆی دەیزانێ، خودا خۆی بناسە و خۆی ناسراوە، ناسینی حەقیقەتی لە وزەی کەسدا نییە.

ئەنجا مەولەوی لە دواچۆڕی عەقیدەکەیدا جارێکی تر دەگەڕێتەوە سەر مەنتیق و قسە لەگەڵ خۆیدا دەکا و دەڵێ لەناو مەنتیقییاندا باوە کە لە (قضیە)ی (موجبە)دا پێویستە (موضوع) ەکەی مەوجوود بێ، بۆ نموونە: کە وتیان (فلانٌ عارفٌ بالطّبّ) کەلیمەی (فلان) مەوزووعە و کەلیمەی

(عارف) مەحمووله و، ئەم رستەی (فلان عارف... الخ)ە کە موجیبەیە و نەفیی تێدا نییە بێ‌گومان ئەوە دەگەیەنێ کە فلانەکە هەیە، ئەنجا عارف و غەیری عارفی دەدرێتە پاڵ؛ نەبوو نیسبەتی هیچی لێ‌نادرێ، بوترێ (هو عارف بالله)؟ خۆ تۆ مەعدووم و نەبوویت ناتوانرێ نیسبەتی (مختار)یت لێ بدرێت و بوترێت (المعدوم مختار) تەنانەت نیسبەتی (لا مختار) یشت لێ نادرێ و ناوترێ (المعدوم لا مختار).

ئیتر با بەس بێ، تا توانیمان قسەمان کرد، تا عەقڵمان بڕی‌کرد لە نیزاع و شەڕەدەلیل کۆتاییمان نەکرد، چ لەگەڵ هەڕەمەی خەڵک و چ لەگەڵ زانایاندا، سوپاس بۆ خودا بیروباوەڕ بەڕاست دەرچوو و قسەیش تەواو.

منیش دەڵێم: حەزرەت(د.خ) فەرموویەتی: «...وَما تَواضَعَ أَحَدٌ لِلهِ إِلاّ رَفَعَهُ اللهُ»[11] ئەوەی لەبەر رەزای خودا و لە بەردەم گەورەیی خودادا خۆی بە کەم دابنێ و خاکینە بێ، خودای بێ‌وێنە بەرزی دەکاتەوە. مادام مەولەویش لەسەر بناخەی خۆبەکەمزانین و لەبەر رەزای خودا وای فەرمووە و خۆی بە مەعدووم داناوە ئومێدەوارم کە خودای گەورە بە لوتفی خۆی بە مەوجوودێکی خۆشەویستی خۆیی حسێب کردبێ و، لە کۆڕی ئەو خوداناسانەیدا دانابێ کە دڵیان جیلوەگای نووری خودایی بووە.

***

١ـ وەک لە پەراوێزی بەیتی (جائیزە بەعدەز تەوبە بدەی دەم)دا وتم لە دەستنووسەکەدا لێرەدا عینوان نییە، نوسخە چاپەکەیش پێش شیعری تاوبراو ئەو عینوانەی دانابوو کە باسم کرد.

ئێستە ئەم عینوانە کە وەک شەرح نووسیومە لەبەر رووناکیی پەراوێزێکی بە فارسی نووسراوی مەولەوی خۆیدایە کە لەسەر ئەم بەیتی «زانینی ئەووەل... تاد»ەدا نووسراوە و سەرەتاکەی دەڵێ:

«غیر از معنای ظاهرش إشاره بآن مینماید که خاتمه رساله بر معتقد اهل تصوف است... الخ» واتە: (ئەم شیعرە بێجگە مەعنا زاهیرەکەی ئیشارەیە بۆ ئەوە کە دوادوایی نامەکەی لەسەر بیروباوەڕی ئەهلی تەسەووفە.)

ئەڵبەت مەبەستی تەوحیدی سیفاتە کە لە پەراوێزێکی پێشووتردا لەسەر بەیتی:

«نووری لەوامیع تەوحیدی ئەفعال

کە ئەووەڵ حاڵە بۆ ئەهلی ئەحوال»

باس کرا کە مەولەوی خۆی ئەم شوێنەی دانابێ بە سەرەتای خاتیمە، جێی خۆیەتی وەک شەرح وشەی (خاتیمە) بکرێتە عینوان.

٢ـ لای نەحوییەکان ئیزافە تێکڕا، لەفزی و مەعنەویی، دەبێتە هۆی سووک‌کردنی لەفزی موزافەکە. بەڵام ئیزافەی مەعنەوی، لامییە و بەیانییەی، بێجگە تەخفیف دەبێتە هۆی تەعریفیشی، واتە ئەگەر موزافەکە لەپێشدا

نەکیرە بووبێ بەهۆی ئیزافەکەوە دەبێتە مەعریفە، یـا هـەر هـیچ نـەبێ نـەختێ تەخسـیس پەیـدا دەکـات، دیـارە (مضاف‌الیه) ی‌یەکەی مەولەوی مەعریفەیە و تەعریف و تەخفیف بەخشە.

٣ـ لە نوسخە دەستنوسەکەدا لەپاڵ کەلیمەی (قیل) ەدا نووسراوە: «إذا وصلت النفسُ إلى ذلك المقام عَرفْتْ أنَّ القائلَ مَنْ هو؟»

٤ـ چ راێکی هەیە؟ یا چ رایێکی دەکەوێ؟ بە واتای چ حەددی هەیە؟ لە کوردەواریـدا بـەکاردەهێنرێ، (کـەی رێی کەوت) یش لەم بابەتەیە.

٥ـ لە دەستنووسەکەدا لەپاڵ کەلیمەی (بەڵێ)دا نووسراوە: «أي لكن». واتە بەڵـێ. لێـرەدا بـە مـەعنا بەلامـە. وابزانم ئەمە ئیستیسنایە لە «ئەگەرچی مەحبووب.. تاد» هـەتا «سـبحانَهُ مـا اعظـمَ شـانە؟» وەهـایش شـەرحەکە دارێژرایەوە.

٦ـ (ی)ی (خەلوەتی) و (جەلوەتی) ئەگەر کورت بن زەمیرن و ئەگەر درێژ بن (ی)ی مەسدەرین. من دووەمیان بە باشتر دەزانم.

٧ـ ئایەتی (١٠٩) سوورەتی (کهف).

٨ـ ئایەتی (١٠٥) سوورەتی (بقرة).

٩ـ ئایەتی (٢٨٢) سوورەتی (بقرة).

١٠ـ ئایەتی (٤٤) سوورەتی (اسراء).

١١ـ بڕوانە (منصور علی ناصف، التاج الجامع للأصول في احاديث الرسول(ص)، دار إحياء التراث العربي، بيـروت، الطبعة الثالثة ١٣٨٢ هـ ـ ١٩٦٢م، الجزء الخامس ص ٥١)

## دوایی

سوپاس بۆ خودا (جلّ جلاله، وَعَمَّ نوالُهُ، وَ زاد إحسانه وافضاله) لەکاتی بانگی عەسری ڕۆژی پێنج شەممەی پێنجەمی مانگی (ربیع الاول)ی ساڵی (١٣٩٤)ی کۆچی، ڕێکەوتی ١٩٧٤/٣/٢٨ی زایینی لە ژووری مەدرەسەی عاتیکەخاتوون لە تەکیەی موبارەکی حەزرەتی شێخ (عبدالقادر)ی گەیلانی (قدّسَ سِرّهُ) لە بەغدا ئەم شەرحی عەقیدەی مەرزییەی مەولەوییەم تەواوکرد.

لە خودای گەورە دەپاڕێمەوە کە موسوڵمانانی کوردزمان، بەتایبەتی قوتابیانی بیروباوەڕی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، سوودی لێ وەربگرن و لە ڕۆژی قیامەتدا قازانجی بۆ هەموو لایەکمان ببێت (یَوْمَ لا یَنْفَعُ مالٌ و لا بَنُون إلاّ مَنْ أتی الله بقلب سلیم)

لە لوتفی بێپایانی خودای میهرەبان تکاکارم بە گەورەیی خۆی دواکەلامی بەتامی (نامی) [1] دوو ڕستەی پیرۆزی (أشهَدُ أنْ لا اله الاّ الله وَأشْهَدُ أنَّ مُحَمّداً رَسُولُ الله) بێ.

**سبحانَ ربّک ربّ العزة عما یصفون**

**وسلام علی المرسلین**

**والحمد لله رب العالمین**

**عبدالکریمی مدرس**

---

١ - نامی: نازناوی باوکمە.

## لناظم الرّسالة[1]

رســالةٌ جامِعَــةُ المَســائِلِ
يحِبُّهـا قلـبُ ذوى الفضـائِلِ
وَبَعْــدَمَا نظمتهــا وَأخْبَــرا
وسيلةُ الخلقِ لخـالِق الـوَرى
قُطبُ الزمانِ شيخُنا عثمـانُ
فاضَ عَلـى جنابِـهِ الرّضـوانُ
بِانّــهُ رَأى النّبــيّ الأكرمــا،
صَـلىّ عليــه ربُّنَــا وَسَــلّمَا،
يقــولُ: ذى رِســالةُ الينــا
محبوبَــةٌ مَرْضِــيّةٌ لَــدَيْنَا،
سَــمّيْتُها عَقيــدةً مرضِــيَّة
لَـدى جنــابِ ســيّدِ البريَّــة
صَـلّى عَليــهِ الله مِــن نوالِــهِ
وصِــحبِهِ وحزبِــهِ وآلِــهِ
بِـهِ لَنـا قـد تمّـتِ العوائِـدُ
صَحّتْ وَتَمَّتْ بهم العقائِـدُ[2]

واتە: ئەمەی لە بەردەستتدایە نامەیێکە گەلێ مەسئەلەی سەر بە بیروباوەڕی ئیسـلامی تێدایـە و، دڵی بەهرەمەند و زانا خۆشی دەوێ.

پاش ئەوەی لە هۆنینەوەی بوومەوە قوتبی زەمان شێخ عوسمان سیراجەددینی پیرمان، بـارانی ڕەزای خودای گەورەی بەسەردا بباریٚ و سەرڕێژ بکا، کە بەهۆی ئیرشاد و ڕێپیشـاندان و خەڵـک فێری خوداناسین کردنـەوە دەیانگەیێنێتـە پایـەی لـەخوداپەرسـتی نزیـکبوونـەوە و لـە دنیـا و ئارەزووی نەفس دوورکەوتنەوە. بەڵێ ئەم زاتە موبارەکە ئاگاداری کردم کە بە خەو یا بـە کەشـف حەزرەتی پێغەمبەری دیوە(د.خ) فەرموویەتی:

ئەم نامەیە بۆ ئێمە نێراوە و خۆشەویستە لامان و لێی رازین. منیش کە ئـەم موژدەیـەم بیسـت ناوم نا (عقیدة مرضیة) چونکە پێغەمبەری خودا(د.خ) لێی رازییە.

خودا بە کـەرەم و بەخشـندەیی خـۆی سـەلات و سـەلام بـڕژێنێ بەسـەر پێغەمبـەر خـۆی و هاوڕێیانی و پەیڕەوانی و ئال و بەیتیدا، لە ڕێگای حەزرەتی پێغەمبەرەوە خێروبێرمان بۆ تـەواوکرا و خراینە سەر ڕێی هیدایەت، لە ڕێگای هاوڕێیانیشیەوە بیروباوەڕمان دروست و تەواو بوو، ئـەوان بوون ئایینی ئیسلام و ڕەوشتی پێغەمبەریان بە جیهان گەیاند و قورئانی پیرۆزیـان وەک بیبیلـەی چاویان پاراست.

***

١ـ ئەم کۆمەڵە شیعرە هەشت بەیتییە بە خۆی و عینوانەکەیەوە بـە خـەتی مەولـەوی خـۆی لـەدوایی نوسـخە دەستنووسەکەوە نووسراوە.

٢ـ بەپێی ئەو ئیشارانەی لە دەستنووسەکەدا هەن (هێ)ی (بِهِ) بۆ (سیّد البریّة) و (هم)ی (بِهِمِ) یش بۆ (صحب) دەچێتەوە.

## پاشبەندێک لە سێ بەشدا

(١)

## نوسخەیەکی عەقیدەی مەرزییە
## بە دەستخەتی مەولەوی خۆی

**خۆینەوارە ئازیزەکان!**

گەیشتبووینە دوادوایی کتێبەکە و گەلێکیشی لێ چاپ کرابوو، لە کتێبخانەکەی باوکما فۆتۆکۆپیی نوسخەیەکی عەقیدەی مەرزییەی دەستخەتی مەولەوی خۆیمان بەرچاوکەوت، کە بەداخەوە لەم ماوە دوورودرێژەدا پێمان نەزانیبوو کە ئەگەر وانەبوایە کارەکەمان ئاسانتر و چاکتر و بێدەردی سەری‌تر تەواو دەکرد.

بە هەرحاڵ راستە ئەم نوسخە مەولەوی خۆی لە دواییدا نووسیویە کە خەتی خۆیەتی، بەڵام ئەمە لە چاکی و بەکەڵکیی نوسخەکەیماڵی جەنابی شێخ جەمال کەم ناکاتەوە کە لە تێکڕای ئەم لێکدانەوەدا یا بە (نوسخە دەستنووسەکە) یا (دەستنووسەکە) ناوبراوە؛ چونکە پڕیەتی لە پەراوێز و لێ‌نووسینی مەولەوی خۆی، بەتایبەتیش بۆ پیرزادە و دۆستی مەولەوی خۆی شێخ عبدالرحمن (ابوالوفا) نووسراوەتەوە و گومانم لەوەدا نییە کە مەولەوی خۆی پێیدا چووەتەوە.

من تەنها ئەوەم بۆ مایەوە کە بە وردی بەراوردێ لە نێوان ئەم دوو نوسخەدا بکەم و جیاوازییەکانیان دەس‌نیشان بکەم؛ بەتەمای ئەوە ئەگەر خودا هەڵی سووڕاند جارێکی تر ئەم کتێبە چاپ بکرێتەوە لە کەلیمە جیاوازەکاندا هی نوسخەکەی مەولەوی بکرێتە ئەسڵ، یا لەکاتی بەکارهێنانی هەر بەیتێ لەو بەیتانەدا کە جیاوازییان تێدایە بۆ هەر مەبەستێ، هەر ئەو پێش بخرێ.

**باسێكی ئەم نوسخەیە:**

ئەم نوسخەیە، كە (١٥٢) لاپەڕەی بردووە، سێهەم دەستخەتە لە بەرگێكی گەورەی (٢٥٩) لاپەڕەیی‌دا كە درێژیی لاپەڕەكانی (٢٢/٥ سم) و پانایی‌یان (١٥سم)ە. لە تێكڕای (١٥٢) لاپەڕەكانیدا بە هێڵی مەرەكەبی ڕەش چوارچێوەی ڕێك‌وپێك بۆ شیعرەكان كراوە.

ژمارەی بەیتەكان لە هەموو لاپەڕەكانیدا وەك یەك نییە؛ یەكەم لاپەڕەی [١٤] بەیتە و ئەوانی تری لە [١٥] بەیتەوە هەتا [١٩] بەیتیان تێدایە، بێ‌ئەوەی دێڕێ لە دێڕی كەوتبێ یا سەر و ژێر و بۆری كەلیمەیەك تێكەڵی هی كەلیمەیەكی تر بووبێ.

خەتەكەی مەولەوی بەڕاستی لە خەتە جوانەكان حسێب دەكرێ، بەیتەكانی ڕێك و جوان نووسیوەتەوە، زۆر چاودێریی ئەوەی كردووە كەلیمەكان یان حەرفەكان تێكەڵ نەبن و هەریەكەیان لەجێی خۆیدا بێ. كە ئینسانی خوێندەواری ئاگاداری بابەتەكە بیەوێ كتێبەكە بخوێنێتەوە، بەبێ‌فاریزە و كەوان و نوقتە و شاریحە و ئەوانەی تر كە ئەمڕۆ باون، بە ئاسانی بۆی دەخوێنرێتەوە. بەدەگمەن كەلیمەیەكی بە سەر و ژێر موحتاجی بێ سەروژێر بۆكردن بەجێ هێشتووە، بەلام داخەكەم پەراوێزێكی وەهای لە كتێبەكەی نەكردووە، بە خەتی خۆی چەند پەراوێزێ لێرە و لەوێ بەرچاو دەكەون، چەند پەراوێزێكی تریش هەن ئاشكرایە خەتی خۆی نین. جاروبار بە تاقە كەلیمەیەك مەعنایەكی جێگری دەرخستووە. بێجگە هەندێ وردەكاریی شێوەنووسی ئەوسا لەوە دەچێ فریانەكەوتبێ و هەر ئەوەندەی دەرفەت بووبێ لەگەڵ نوسخە دەستنووسەكەی تردا خەریك بێ كە بۆ خوالێخۆشبوو (ابوالوفاء) نووسراوەتەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا كێ دەڵێ نوسخەی تری نەبووە كە زۆر بایەخی پێدابێ و خۆشی كردبێ؟

لە هەمووی سرنج‌ڕاكێش‌تر ئەوەیە كە خەتی مەولەوی لەگەڵ جوانییەكەیدا زۆر جیاواز و دیارییە.

من كە ئەم نوسخەم دی لە یەكەم هەنگاوی بەراورددا بێ سێ‌ودوو و بە دڵنیایی‌یەوە وتم چ هەشت بەیتی ناونانەكە كە لە دوایی نوسخەكەی ماڵی شێخ جەماڵدا نووسراوە و چ هەندێ لە پەراوێزەكانی و هەندێ لەو بەیتانەی لەبیرچوون لە ریزی دێڕەكاندا، بنووسرێن و شێوەی (صحّ) لە دەری ریزەوە نووسراون دەستخەتی مەولەوی خۆینی.

**یەکەم دێڕی ئەم نوسخە بەمجۆرەیە:**

«بسم الله الرحمن الرحيم، وعليه توكلي واستنادي وبفضله ايماني واعتقادي».

لە دواییشدا نووسیویە:

«تمتْ بحمدالله بخطّ ناظمها المعدوم عبدالرحيم الحسيني عفا الله عنه وعن جميع المؤمنين».

ئیتر هەشت بەیتە عەرەبییەکەی لەمەڕ ناونانی کتێبەکە لەم نوسخەدا نین.

بەداخەوە ئەم نوسخە هیچ جۆرە مێژوویەکی نووسینەوەی تێدا نییە و ئەوەیشی تێدا نییە بۆ کێی نووسیوەتەوە و لەکوێ نووسیویەتەوە؟ هیچ دیار نییە.

شایانی باسە مەولەوی لەم نوسخەی خۆیدا تەنها حەوت سەرباسی داناوە، سەرباسەکانیش چەند بەیتێکن لە عەقیدەکە خۆی، بۆ هەریەکێ لەو بەیتانە شوێنێکی رازاندووەتەوە و تیایا دایناوە. ئەمانەش بەیتە سەرباسەکانن:

١ـ «ئەسڵی ئەووەڵمان بزان بە یەقین...» تاد.

٢ـ «ئەسڵی سانیمان لە شەش ئەسڵەکان...» تاد.

٣ـ «ئەسڵی سالیسمان تاقی بزانە...» تاد.

٤ـ «ئەسڵی چوارەم وە بێ قوولەقوول...» تاد.

٥ـ «حمدا لە. بەو یاد دەڕۆت بە ئەمین
یەومی ئاخیریچ ئەسڵی پەنجەمین»

٦ـ «وە سەر هەوارگەی شەشەمینەدا...» تاد

٧ـ «زانینی ئەووەڵ ئەودەس ناکەوێ
بە نەفەس ئاگات لە خاتیمە وێ»

خاوەنی نوسخە ئەسڵییەکە کە فۆتۆکۆپییەکەی لەسەر وەرگیراوە شێخ جەعفەری شێخ ئەحمەدی ناوجافە کە بنەچەی دەچێتەوە سەر پایەبەرز مەلا ئەبووبەکری موسەننیف. کوڕانی ئەم زاتە برایان حەیدەر و جونەیدن کە لە دێی قادری مارف لە شارەزوور دادەنیشتن.

لەباتی هەموو ئەوانەی ئەم کتێبە دەخوێننەوە و سوودی لێ وەردەگرن سوپاسی ئەوان و جەنابی شێخ جەمالی شێخ تاجالدین و هەموو ئەوانە دەکەین کە کەم و زۆر لەم کارەدا یارمەتییان داوین.[1]

***

١ـ وەک وتم ئەو بەرگە کە عەقیدە مەرزی‌یە دەستخەتەکەی مەولەویی تێدایە (٢٥٩) لاپەڕەی گەورەیە.

لەم بەرگەدا بێجگە عەقیدەکە، چوار دەستخەتی تریش هەیە:

الف- تەرجەمەی (معفوآت)ی مەلا خەلیلی سعرتی بە فارسی کە ناوی وەرگێڕی تێدا نییە و سالی(١٣٠٧)ی کۆچی لەلایەن موحەممەد حەسەن ناوێکەوە نووسراوەتەوە و بریتییە لە (١٦) لاپەڕە، ئەم کتێبە باسی ئەو شتە پیسانە دەکات کە شەرع چاوپۆشیی لێ کردوون.

ب- فەوائیحە فارسییەکەی مەولەوی لە (٢٥) لاپەڕەدا. ئەویش هەر لەلایەن موحەممەد حەسەنەوە نووسراوەتەوە لە سالی (١٢٨٩) دا.

ج- کتێبە شیعرێکی هەورامی باسی بیروباوەڕی ئایینی ئیسلامە و (١٥) لاپەڕەیە. نە ناوی دانەر و نە هی روونووسکەرەوە و نە مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە.

د- کتێبێکی (٢٨) لاپەڕەیی فارسی، باسی کەراماتی خوالێخۆشبوو شێخی سیراجەددین دەکات. وەک لە دوایی کتێبەکەوە دەردەکەوێ دانەرەکەی خوالێخۆشبوو مەلا حامیدی کاتبی شێخی سیراجەددینە. لەوە دەچێ سالی (١٢٩٢)ی کۆچی نووسرابێتەوە. ناوی نووسەرەوەی پێوە نییە.

(٢)

## ژمارەی شیعرەکانی عەقیدەی مەرزییە

نەمدەویست بچمە ناو ئەم باسەوە، بەڵام ئەوەی سەرنجی بۆ ڕاکێشام ئەوە بوو کە مەولەوی لـە دوو بەرهەمە بیروباوەڕ بابەتەکـەی تریـدا مێـژووی لێبوونـەوە لـە دانـان و، ژمـارەی شـیعرەکانی نووسیوە؛ ئەوەتە لە دوادوایی (فضیلە) کەیدا بۆ مێژووی لێبوونەوەی دەفەرموێ:

قُلْتُ لِمَـنْ تـأريخَ ذاک أمّـا

في (عَرَفه) مع دمع عين تمّا

واتە (عرفە) کە خاڵێ بکەوێتە سەر (ع) ەکە و ببێتە (غ) دەکاتە (١٢٨٥)ی کـۆچی، قسـە دێ و قسە دەبرێ، بەدووری نازانم ئەم (دمع)ی (عین)ە و ئەم (عرفە)یە ئیشـارە بـن بـۆ کـۆچی دوایـی حاجی شێخ (عبدالرحمانی ابو الوفا) کە لەم ساڵەدا و پـاش گەڕانـەوەی لـە حـەج کـۆچی دوایـی کردووە.

بۆ ژمارەی شیعرەکانیشی دەفەرمۆی:

أشعارُها جاءت طباق الغرض

إشعارُهُ شـافٍ لكـل المـرض

لەژێر وشەی (الغرض)دا ژمارەی (٢٠٣١) دانراوە، کە ژمارەی شیعرەکانیەتی.

سەبارەت بە (فـوایح)ە فارسییەکەیشـی، کـە لـە لاپـەڕەی (١٣٣)ی چاپەکـەدا ئـەم سەرباسـە نووسراوە: «راندن خامه در تقسیم نامه بر شش جهت و یک ختام و در تاریخ اتمام و تعیین عـدد و نهادن نام.. تـاد» لـە شـیعرەکانی ئـەم سەرباسـەدا گـەڕام بـەدوای مەبەسـتدا، چونکـە واتـای سەرباسەکە بە کوردی ئەمەیە:

«قەڵەم خسـتنە کـار دەربـارەی دابـەش‌کـردنی کتێبەکـە بەسـەر شـەش لا و یـەک پایـان و دەربارەی مێژووی تەواوکردن و دیاری‌کردنی ژمارەی شیعرەکان و ناونانی کتێبەکە.

لە ئەنجامدا دۆزیمەوە، ئەوەتە لە مێژووی تەواوکردنی کتێبەکەدا دەفەرموێ:

شـمِ التأریخَ اذ یبدی تمامَهُ
(عزیز طیبُهُ، مسک ختامه) [١]

جا ئەگەرچی خوالێ خۆشبووی زانا مامۆستا محیالدین صبری نعیمی لە پەراوێزدا هـیچ باسـی ژمارەی ئەبجەد و شتیوای نەکردووە شتەکە زۆر ئاشکرایە و پیتەکانی (عزیز طیبە، مسک ختامە) بەپێی حیسابی ئەبجەد دەکەنە (١٢٨٦) واتە ١٢٨٦ای کۆچی.

لە پاش چەند بەیتێکی تریش بۆ دیاریکردنی ژمارەی شیعرەکانی و بۆ ناونانی دەفەرموێ:

حساب از دسته گلها بود مفهوم
بنـام وی فوایـح گشـت معلـوم

واتە: ژمارەی شیعرەکان لـە نیمچـە رسـتەی (دسـتە گلـها) وە دەزانرێـت، کـە پیتـەکانی بـە حیسابی ئەبجەدد دەکەنە (٥٢٥) و بە (فوایح) ناونرا.

بەڵام کە شیعرەکانی (فوایح) تان ژمارد و (٥٢٦) بوون حیسابەکە بـە هەڵـە دامـەنێن، چونکـە دوابەیتی ئەم کتێبە هی مەولانای (جامی)یە کە پێش ئەم شیعرە بـە شـیعرێ ڕێگـای بـۆ خـۆش کردووە.[٢]

لەبەر ڕووناکی ئەم دووکارەدا سەبارەت بەم عەقیدە مەرزییەیش بەدوای ژمـارەی شـیعرەکانیدا گەڕام؛ چونکە وەک لە سەرەتاکانیدا بەرچاوتان کەوت مێژووی دەستپێکردن و تـەواوکردنی لـە دوو شیعردا وت:

وتی بۆ تـەعیین پـەکت ناکـەوێ
(فیض رحمان بۆی و مبـدأ دوێ)
تەعیینی مەبدەء بەگۆیتـەدا چـوو
خاتیمەیچ بزان وەختێ (فارغ) بوو

پیتەکانی «فیز رحمان... تاد» دەکاتە (١٢٨٠) و هی «فارغ» (١٢٨١) ن.

تەنها ژمارەی شیعرەکان مایەوە؛ بۆیە کەوتمە پشکنین و لێکۆڵینەوە، بەتایبەتی دەسـتکەوتنی نوسخە دەستخەتەکەی مەولەوی خۆی زیاتر هانیدام.

پاش دوو سێ جار بە وردی ژماردنی شیعرەکانی هـەر سـێ نوسـخەکە و، بـەراوردکردنیان لـە لایەنی زیاد و کەمییانەوە، گەیشتمە ئەم ئەنجامە:

١ـ نوسخەکەی ماڵی بەڕێز شێخ جەماڵی کوڕی مەرحوومی شێخ (تاج الدین)، کە هەموو جار لەم کتێبەدا بە (دەستنووس) یا (نوسخە دەستنووسەکە) ناوم بردووە، (٢٤٣٧) بەیتە. لە نوسخەکەی دەستخەتی مەولەوی‌دا یەک بەیت و لە نوسخە چاپەکەدا سێ بەیت هەن کە لەم نوسخەدا نین واتە: ٢٤٣٧+ ٤- ٢٤٤١.

٢ـ نوسخە دەستخەکەی مەولەوی خۆی (٢٤٣٤) بەیتە. لە نوسخەکەی ماڵی شێخ جەمالدا چوار بەیت هەن کە لەم نوسخەدا نین. لە نوسخە چاپەکەیشدا سێ بەیت هەن کە لەم نوسخەدا نین، ئەم سێ بەیتە هەمان سێ بەیتن کە لە نوسخەکەی ماڵی شێخ جەمالیشدا نەبوون، واتە ٢٤٣٤+ ٧- ٢٤٤١. نوسخە چاپەکە (٢٤٤٠) بەیتە و بەیتێکی دووبارەکراوەتەوە، واتە (٢٤٣٩) بەیتە.

لە نوسخە دەستخەتەکەی مەولەوی‌دا بەیتێک و لە نوسخەکەی ماڵی شێخ جەمالدا بەیتێک هەن کە لەم نوسخە چاپەدا نین، واتە: ٢٤٣٩+٢=٢٤٤١.

پوختەی مەبەست ژمارەی شیعرەکانی عەقیدەی مەرزییە بەم حیسابەی من بووە (٢٤٤١) شیعر.

بە حیسابی ئەبجەد پیتەکانی دوابەیتی عەقیدە مەرزییەکە بە شێوەنووسی کۆن:

(نزاع بریاوه) دگَلْ (خاص و عام)

(صِحّ العقیدة وَتَمّ الکلام)

بێجگە (دگَل) دەکەنە (٢٤٤١)، دیارە (ح)ی (صحّ) و (م)ی (تمّ) یەکێ بە حەرفێ حسێب دەکرێن؛ هەروەها دو هەمزە وەسڵەکانی (العقیدة) و (الکلام) یش حسێب دەکرێن؛ چونکە لە حیسابی ئەبجەددا حەرفی بینراو حسێب دەکرێ.

مەعنای بەیتەکە، بێجگە لایەنە ئەبجەدییەکەی ئەمەیە:

قڕەقڕ و شەڕەقسە لەگەڵ زانا و نەزان، چاک و خراپ، ئۆمی و نەخوێندەوار بڕایەوە و، ئەنجام بیروباوەڕ ڕاست دەرچوو و قسەیش دوایی هات.

مەعنا ئەبجەدییەکەیشی ئەمەیە:

پیتەکانی (نزاع بریاوه) + (خاص و عام) + (صح العقیدة وتمّ الکلام) ژمارەی بەیتەکانی ئەم عەقیدەیەن. واتە: (دگَلْ) تەنها مەعنای+ دەگەیێنێ و پیتەکانی حسێب ناکرێن[٣].

وتنی ناوێ هەشت بەیتە عەرەبی‌یەکەی لەمەڕ ناو و هۆی ناونان بەشێک نین لە عەقیدەکە، تا حیسابەکە ئالۆز بکەن؛ چونکە:

الف ـ مەولەوی لە کتێب بووەتەوە، ئەم ناوەی، دوایی و پاش ئەوەی وەک ئەستێرەی بەربەیان درەوشاوەتەوە، لێنراوە. ئەوەتە نوسخەکەی خۆی کە بە دەستی خۆی نووسیویەتیەوە ئەم بەیتانەی تێدا نین، لە سەرەتای کتێبەکەیشەوە مەولەوی خۆی هیچ ناوێکی لێ نەناوە.

ب ـ وەزنی ئەم بەیتە عەرەبییانە لە وەزنی بەیتی کتێبەکە نییە.

زۆرجوانە، کۆرپەی وا نازدار کۆڕی بۆ بەستراوە بۆ ناونان، مەولەوی هەژاری (سەرشاتە) یش هەقە ئەوەندەی پێ ببڕێ!

بۆ زیادە روونکردنەوەی ئەنجامی بەراوردی سێ نوسخەکە لە لایەنی زیاد و کەمی شیعرەکانەوە شایانی وتنە:

ئەو بەیتە کە تەنها لە نوسخە دەستخەتەکەی مەولەوی خۆیدا هەیە و لە هیچ کام لە نوسخەکەی ماڵی شێخ جەمال و نوسخە چاپەکەدا نییە ئەم بەیتەیە:

لەم کێشانەدا مەکێشە خەفەت
بۆ وەجهێ (أَوْمَتْ) «ثَقُلَتْ، خَفَّتْ»

شوێنی ئەم بەیتە لە باسی سیرات و میزاندایە پێش بەیتی

منها سؤال الرّبّ المُهَيمِن
حينَ ما يُدني عَبْدَهُ المؤمن

کە لە لاپەڕە (٩٤)ی چاپەکەدایە.

ئەو سێ بەیتەیش کە لە نوسخە دەستخەتەکەی مەولەوی و نوسخەکەی ماڵی شێخ جەمالدا نین و، تەنها لە نوسخە چاپەکەدا هەن، ئەمانەن:

بەڵ وتگیانە عولەمای قادە
قودرەت وەسفێکە ئەودووی ئیرادە،
موئەسسیر وێ وەک قودرەتی (ذو الخلق)
یا خۆ کاسب وێ وەک قودرەتی خەلق
مەعنای تەئسیریچ، ئەگەر وەیاد وێ
وە نیە مونحەسیر هەر (فی الایجاد) وێ

کە لە باسی ئەسلی شەشەمین، ئیمان بە قەزاوقەدەر، لاپەڕە (١١٨)ەی نوسخە چاپەکەدان.

ئەو چوار بەیتەیش کە لە نوسخەکەی مالی شێخ جەمال و نوسخە چاپەکەدا هەن و، لە نوسخە دەستخەتەکەی مەولەوی‌دا نین ئەمانەن:

١ـ عەجەب خەندەیێ حیکمەت چەند تەرز کرد
غولغولەی گریەی بولبولان بەرز کرد

لە ئەسلی چوارەم، لاپەڕە (٥٩)ی نوسخە چاپەکەدا.

٢ـ (جاهلاً) بە عەزل بە نەسبی ئەمیر
(هکذا) تا خوار نایێتە تەقریر

لە ئەسلی چوارەم، باسی ئەولیا، لاپەڕە (٧٠)ی نوسخە چاپەکەدا.

٣ـ یا وەختێ قودرەت تەئسیری نەبوو
ئەوا ئیستیحاق جەزا لەناوچوو

لە ئەسلی شەشەم، لاپەڕە (١١٨)ی نوسخە چاپەکەدا.

٤ـ ئەمما ئوممەتی حەزرەت مەرحوومە
دەرحەقیان ڕەحمەت خودا مەعلوومە

لە ئەسلی شەشەم، لاپەڕە (١٢٥)ی نوسخە چاپەکەدا. ئەو دوو بەیتەیش کە لە نوسخە چاپەکەدا نین، یەکێکیان: «لەم کێشانەدا مەکێشە... تاد» بوو کە پێشی نەختێ باسم کرد و تەنها لە نوسخە دەستخەتەکەی مەولەوی خۆیدا هەیە.

ئەویتریان ئەم بەیتەیە:

چـی بـۆ موجتەهید هەس بەر موقەللید
لەسەر مورید هەس نیسبەت بە مورشید

بەڵێ ئەم بەیتە لە نوسخەکەی مالی شێخ جەمال و نوسخە دەستخەتەکەی مەولەوی خۆیدا هەیە و، لە نوسخە چاپەکەدا نییە. شوێنەکەیشی پێش بەیتی: «بل قالوا: الشیخ فی... الخ»ە کە دەکەوێتە ئەسلی چوارەم، مبحث الائمة فی الاصول والفروع والطریقة واصحابها، لاپەڕە (٨٢)ی نوسخە چاپەکە.

بەیتە دووبارەکراوەکەی چاپەکەیش ئەم بەیتەیە:

وجوودی مومکین یەک یەک وە بێ گەڕ

هەر یەک لە راس خۆی ئەمپەڕ تا ئەوپەڕ

ئەم بەیتە لە لاپەڕە (١١٤) و (١١٥)ی سەر بە ئەسڵی شەشەمدا نووسراوە، لە یەکەمدا دوانزەهەم بەیتە و بێهەڵەیە بەڵام لە شوێنی خۆیدا نییە. لە دووەمدا چوارەم بەیتە و دوو هەڵەی تێدایە، بەڵام لە شوێنی خۆیدایە.

وابزانم ئەم بەراوردە لق‌وپۆپدارە شتێکی بێ‌کەڵک نییە. هەر سێ نوسخەکانیش جێگای متمانەن و هەر یەکێکیان لایەنی بەهێزی و بێهێزی خۆی هەیە، ئەگەرچی لە مەیدانی لێکۆڵینەوەدا نوسخەی دەستخەتی باش، بەتایبەتی دەستخەتی دانەر سەنگێکی تایبەتی هەیە.

ئیتر لەبیرچوونی نووسینی بەیتێک و دوو بەیت لێرەولەوێ شتێکی عەجایەب نییە، ئەوانیش بنیادەمن، یاخۆ کێ دەتوانێ بڵێ مەولەوی، کە کتێبەکەی کەوتووەتە دەست خەڵک، خۆی لێی لانەبردووە یا لێی زیاد نەکردووە؟ نازانین. سەیر ئەو دەس و قەڵەمە رەنگینە و مێشکە فراوان و هەڵکەوتووەیە کە لەفز و مەعنای وەها رازاندووەتەوە[٤].

***

١ـ (شِمْ): فیعلی ئەمرە لە (شَیم) دروست کراوە، واتە: تەئریخەکە نیشانە بکە و بینەخشێنە وەک خاڵ.

٢ـ دوابەیتی (فەوایح) ئەم بەیتەیە:

در این مشهد ز گویایی مزن دم — سخن را ختم کن (والله اعلم)

ئەم بەیتە دوابەیتی بابەتی «معراج رسالت پناه»ە لە کتێبی (یوسف زلیخا)ی مولانای جامی، سەیری لاپەڕە (١١)ی کتێبی (یوسف زلیخا) بکە دانانی مەولانا عەبدولڕەحمانی جامی، چاپخانەی موحەممەدی، شاری بۆمبی (١٢٦٩)ی کۆچی، دوایی باسی میعراجی پێغەمبەر(د.خ).

شایانی باسە مەولەوی خۆی پێش ئەم بەیتە دەفەرموێ:

کمی گوی و، بسی بشنو، بسی بین — زبان و گوش و دیده گویدت این

مرض را آورد حلوا ز خامی — بنوش ار پختەی از جام جامی

دو أسپەء مغفرت سویش دوان باد — روانش فیض حق بر وی روان باد

«در این مشهد ز گویایی مزن دم — سخن را ختم کن (والله اعلم) »

واتە: کەم بڵێ و زۆر ببیسە و زۆر ببینە، — زوبان و گوێ و چاو وەهات پێ دەڵێن

ـ دیارە چونکە زوبان یەکە و چاو و گوێ دو دوون ـ

حەڵوا بە کاڵی نەخۆشی دێنێ، ئەگەر پێ‌گەیشتووی لە پیالەی (جامی) بخۆرەوە،

عارەبانەی لێ‌خۆشبوونی خودای گەورە بەرەولای رابکات و بەرەکەتی خودایی بەسەر گیانی پاکیدا ببارێ، کە دەفەرموێ:

لەم مەیدانەدا لافی قسەزانی لێ‌مەدە          دوایی بە قسە بێنە، خودا لە هەموو کەس زاناترە

مەولەوی دەس و دەم و دەروون پاک رەوا نابینێ تەنانەت تاقە بەیتێکی خەڵکیش بکا بە هی خۆی؛ ئەوەتە لە باسی (النضرة العاشرة فی إحداثة للعالم من العدم..) پشدا، هەر لەم فەوایحەی، بەیتێکی تر هەیە هی خۆی نییە و ناونووسی کردووە کە هی نیزامی‌یە؛ گوێ بگرە چی دەڵێ:

چرا؟ زآلت تمامی ناتمامی است          خدایا! وقت رحمت بر نظامی است: ـ

«اگر تکوین بآلت شد حوالت          چه آلت بود در تکوین آلت»

ئەم «اگر تکوین... تاد» هی نیزامی گەنجەوی‌یە (٥٣٠ـ ٦١٤) کۆچی. باقڵم لەبەر ئەوەی ئەم بەیتەی نیزامی لە کرۆکی باسەکەیە مەولەوی بە یەکێکی حسێب کردووە لە (٥٢٥) بەیتەکە، بەڵام ئەم تاقە بەیتەی جامیی هەر بۆ موبارەکی لە دواییدا هێناوەتەوە بێ‌ئەوەی حسێبی بکا چونکە هەر تەنها بێ‌دەنگ بوون دەگەیێنێ و شتێکی تایبەتی باسەکەی تێدا نییە، دیارە هەردوو، جامی و مەولەوی، شەیدای یەک شتن و بەدوای یەک مەبەستدا وێڵن و شیعرەکانیشیان لە یەک وەزنن و ئیقتیباسیش لە حەزرەتی مووسا پێغەمبەرەوە بۆ مەولەوی و غەیری مەولەویش هاتووەتەوە[... إنی آنستُ ناراً لَعَلّی آتیکم منها بقبس أو اجدُ علی النار هدی] سوورەتی (طه) ئایەتی(١٠).

٣ـ لێرەدا نابێ ئەوە پشت گوێ بخەین کە برای بەڕێز شێخ باباعەلیی کوڕی ماموستا شێخ عومەری ئیبنولقەرەداغی- من پێ‌بزانم- یەکەم کەسە ئەوەی نووسیوە کە نیوەی دووهەمی دوابەیتی عەقیدەی مەرزییە بە حیسابی حورووفی ئەبجەد ساڵی لێ‌بوونەوە لە دانانی ئەگرێتەوە و، ئەمەی لە پەراوێزی لاپەڕە ١٥٢ی کتێبەکەیدا (هەڵبژاردەیەک لە عەقیدەی مەرزییەی مەولەوی) نووسیوە.

لێرەدا بەجێیە ئیشارەتێکیش بۆ ئەوە بکەین کە لەوانەیە مەولەوی مەبەستی بووبێ بە رستەی (صح العقیدة و تم الکلام) ئیشارەتێکیش بۆ ئەوە بکا کە باوەڕم بەگفتەکەی (شیخ عبدالرحمن ابو الوفا) بەڕاست دەرچوو کە فەرمووبووی بە ساڵێ لە دانانی ئەبیتەوە وەک لە سەرەتای عەقیدەکەدا ئەڵێ:

تەعیینی مەبدەء بە گوێتەدا چوو،          خاتیمەیچ بزان وەختێ (فارغ) بوو

٤ـ لە دواواییی ئەم باسەدا سەرنجی خوێندەواری ئازیز بۆ ئەوە رائەکێشم کە شیعرەکانی (العقیدة المرضیة)ی مەولەوی لەم کتێبەدا بە حەرفی رەش لە چاپ دراون و، چەند بەیتێکی باوکم لە شەرحەکەدا هەیە بە حەرفی سپی لەچاپ دراون، نەوەک کەسێک لە ریزی شیعرەکانی مەولەویدا بیانژمێرێ.

لەم کتێبەدا هەندێ وشە هەن کە لە عیلمە ئایینییەکاندا بەکار دەهێنرێن، بە باشم زانی بەپێی توانا واتاکانیان روون بکەمەوە: -

**إجتماع الضدين**: کۆبوونەوەی دوو سیفەتی وجوودی لە یەک شوێندا، ئەم کۆبوونەوەیە مەحالە، دەکرێ هیچیان نەبن، وەک رەشی‌یەتی و سپی‌یەتی، نابێ یەک شت رەشیش بێ و سپیش بێ، بەلام دەبێ هیچیان نەبێ.

**أجتماع النقيضين**: کۆبوونەوەی دوو شتە کە بوونی یەکێکیان نەبوونی ئەوی تریان بێ، وەک وجوود و عەدەم، ئینسان و لائینسان. ئینسان و لائینسان لە یەک شتدا کۆ نابنەوە، نایشبێ شتێ ئینسان نەبێ و لائینسانیش نەبێ.

**ئینشاءو ئیخبار**: یا رستەی خەبەری و رستەی ئینشائی. یەکەمیان ئەو رستەیە راستی و درۆیی هەڵبگرێ؛ چونکە قسە گەڕاندنەوەیە؛ بۆ نموونە یەکێ دەڵێ: «باران دەبارێ» ئەم قسەیە هەڵدەگرێ راست بێ و هەڵیشدەگرێ درۆ بێ.

بەلام دووەم راست و درۆیی هەڵناگرێ، قسە گەڕاندنەوە نییە، ئەمرە، نەهیە، پرسینە، نزایە... تاد. بۆ نموونە: بخوێنە! دەستدرێژی مەکەرە سەر خەڵق. بۆ بێگانە پەرستی دەکەی؟ خودایا بەختیارمان کەی... تاد.

ئەم دوانە لە عیلمی مەعانی‌دا باس دەکرێن.

**ئیشراق**: لای حوکەماکان بەوە دەڵێن کە نووره عەقلییەکان دەرکەون و بدرەوشێنەوە و سەرڕێژ بکەن بەسەر نەفسی تەواودا لەکاتی رووتبوونەوەیدا لە هەموو ماددەیەکی جیسمی.

ئیشراقی‌یەکان بەوانە دەڵێن کە ئەمە ڕێبازیان بووە. ئەم ڕێبازە لە ڕێبازی ئەرەستۆ جیایە؛ هی ئەو لەسەر دەلیل‌هێنانەوە و عەقڵ بەکارهێنان و پەیداکردنی زانست دامەزرابوو.

**ئیضافەی بەیانییە**: لە ئیستیلاحەکانی ئەهلی نەحوە، بەوە دەڵێن (مضاف) بەشێک بێ لە (مضاف‌الیه) وەک (خاتم فضة) یا (مضاف الیه) بەشێک بێ لە موزاف، وەک (فضّةُ خاتمٍ).

**ئیضافەی لامییە**: ئەمیش هەر لە زاراوەکانی نەحوە و بەوجۆرە ئیزافەیە دەڵێن دروست بێ (لام) لە بەینی موضاف و (موضاف الیه)دا دابنرێ وەک بڵێیت: (ابنُ محمدٍ)، یا (کتُبُ الاستاذِ)، دەتوانین بڵێین: (ابنٌ لمحمدٍ).

**إلهام**: ئەوەیە دەخرێتە دڵ لە ڕێگای ڕێژەنی بەرەکەتی خوداییەوە. لای سۆفییەکان یەکێکە لە هۆیەکانی زانین.

**ئەووەلییات**: ئەوەیە تەنها بە رووتێکردنی عەقڵ بزانرێ و موحتاجی هیچ نەبێ.

**بەدیهی**: ئەوەیە زانینی پێویست بە دەلیل نەبێ.

**بەرزەخ**: جیهانێکە لە بەینی جیهانی مەعنای رووت و جیهانی ماددیدا.

**الترجیح بلا مرجّح**: بۆ نموونە رستەیێک یا وشەیەک دوو واتا هەڵبگرێ، تۆ بێیت یەکێکیان لەوی تریان هەڵاوێری و پەسەندی بکەیت بە بێ هیچ هۆیەکی لایەنگر.

**تەغلیب**: یەکێکە لە ئیستیلاحەکانی عیلمی مەعانی و بریتییە لە بەکارهێنانی وشەیێک بۆ واتای دوو وشەی لە یەک نزیک، وەک بەکارهێنانی (قمرین) بۆ مانگ و خۆر یا (ابوین) بۆ باوک و دایک. بۆیە پێی‌دەڵێن تەغلیب چونکە قەمەر زاڵ کراوە بەسەر شەمسدا، یا ئەب بەسەر ئومدا ئەنجا کراونەتە موسەننا.

**تەوقیفی**: وەستان لە بڕیاردانی حوکمێکدا لە ئاست ئەو ئەندازەیەدا کە لە قورئان و حەدیسدا هەیە، بۆ نموونە دەڵێن ناوەکانی خودای گەورە تەوقیفین، واتە: تا خودا و پێغەمبەر لە ڕێگای قورئان و حەدیسەوە ڕێگامان نەدەن ناتوانین لە خۆمانەوە ناوێ لە خودای گەورە بنێین.

**الجبریة**: ئەوانەن دەڵێن کارەکانی ئینسان خودای گەورە خەلقی کردوون و ئینسان هیچ دەستی تێیاندا نییە و کەسبیشیان بۆ دانانین.

**جیس**: لە زاراوەی‌ئەهلی مەنتیقە: وشەیەکە بۆ چەند شتێکی لە حەقیقەتدا جیاواز بەکار دەهێنرێو زاتی‌یە بۆیان وەک (حیوان) کە ئادەمزاد و ئەسپ و شێر و هەموو گیان‌لەبەرێ دەگرێتەوە و بەشێکە لە زات و حەقیقەتی ئەو شتانە.

**جەوهەر**: شتێکە بە خۆیەوە راوەستێ و شتی تر بەووە راوەستێ، هەروەها خۆبەخۆ شوێن داگیر بکا.

**حەدسییات**: بەشێکە لە بەدیهییات، ئەوەیە کە عەقڵ بۆ زانینی پێویستی بە واسیتە نەبێ؛ ئەوەندە دیویەتی لای ئاشکرایە. وەک ئەوە کە رووناکیی مانگ لە خۆرەوەیە.

**حیسییات**: ئەوەی بە یەکێ لە پێنج حیسّەکان هەستی پێ دەکرێ.

**حەدیسی مەوزووع**: حەدیسێکە بناخەیەکی راست و دروستی نەبێ.

**حەدیسی زەعیف**: بەو حەدیسە دەڵێن ئەوانەی گێڕاویانەتەوە عەدالەتیان جێگیر نەبووبێ. ئەم جۆرە حەدیسانە تەنها لە پیاهەڵدانی پیاوچاکانی ئوممەتی پێغەمبەردا بەکاردەهێنرێن.

**حەدیسی ئاحاد**: بەو حەدیسانە دەوترێ ژمارەی ئەوانەی گێڕاویانەتەوە کەمتر بێ لە ژمارەی ئەوانەی حەدیسی موتەواتیریان گێڕاوەتەوە کە کۆمەڵێکن رێککەوتنیان لەسەر درۆ نەچێتە عەقڵەوە.

**حەدیسی مەشهوور**: حەدیسێکە ژمارەی ئەوانەی گێڕاویانەتەوە کەمتر بێ لە ژمارەی ئەوانەی حەدیسی موتەواتیریان گێڕاوەتەوە، بەلام پاش ئەوە لەناو خەڵکدا شۆرەت پەیدا بکا.

**حەقیقەت**: وشەیەکە لە زمانی ئەو کەسەدا کە قسەی پێ‌دەکا بۆ واتایە بەکار بهێنرێ کە بۆی دانراوە، وەک (اسد) لای عەرەب بۆ واتای شێر.

**حوکەما**: ئەوانەن کە رێبازی فەلسەفەیان گرتووەتە بەر، دیارە فەلسەفە لە رێگای عەقڵی رووتەوە باسی مەوجوود دەکات، لەو لایەنەوە کە شتێکی بووە و نەک لە لایەنی خودا و بیروباوەڕەوە.

**حمل المواطاة**: ئەوەتە حوکم بدەیت بە یەکێتی مەوزووع و مەحموول، یا موبتەدا و خەبەر، بۆ نموونە: (زیدٌ إنسانٌ) یا (العِلم صفة الکمال).

**دەلیلی ئیلزامی یا دەلیلی ئیقناعی**: بەو جۆرە دەلیلە دەڵێن ئەو کەسەی دژتە و رای لە رات جیاوازە بەپێی شێوە و رێبازی خۆی ناچار بێ قەناعەتی پێبکا و پێی رازی بێ، ئیتر بەڵگەکە خۆی لەخۆیدا راست بێ یا نا.

**دەلیل**: لە ئیستیلاحی ئەهلی مەنتیقە، لای ئەوان دەلیل لە دوو موقەددیمە پێکدێ، بە ئەنجامی دەلیلەکەیش دەڵێن نەتیجە. بۆ نموونە: «الانسان قواة محدودة، وکلّ ما هو قواه محدودة عاجز نسبیاً، فالانسان عاجز نسبیا»، لێرەدا «الانسان... تاد» سوغرایە، «وکل ماهو...تاد» کوبرایە و (الانسان عاجز...) نەتیجە و ئەنجامە.

جا ئەو دەلیلە ئەگەر موقەددیمەکانی بەپێی عەقڵ دانرابن ئەوا پێیدەڵێن دەلیلی عەقڵی، وەک ئەو نموونەی هێنامانەوە، خۆ ئەگەر بە بیستن لە قورئان و حەدیسەوە دروست کرابن ئەوا پێی دەڵێن دەلیلی سەمعی یا نەقلی وەکو: «لو کان فیهما آلهة الا الله لَفَسَدَتا، لکنهما لم تفسدا فلیس فیهما إلاّ اله واحد». لێرەدا کە دەلیلێکی شەرتییەیە موقەددیم ئایەتە.

**دەلیلی قەتعی**: بەو دەلیلە دەڵێن کە بەڕاستی مەبەستەکە بگەیێنێت و دابینی بکا.

**العام و الخاص من وجهٍ**: لە زاراوەکانی مەنتیقە، بریتییە لە دوو واتا کە دەشێ لە یەک شتدا بێنەجێ، وایش دەبێ لە یەک جیا دەبنەوە، بۆ نموونە:

ئینسان و سپی، لە خەڵکەکانی نیوەگۆی باکووری زەویدا کۆ دەبنەوە، ئینسانیشن، سپیشن، بەلام لە بنیادەمی پێستڕەشدا تەنها بنیادەمییەکە هەیە، هەروەها لە کاغەزی سپیدا تەنها سپییەتییەکە هەیە.

**عەرەز**: بەرامبەری جەوهەرە، شتێکە خۆی بە خۆیەوە راناوەستێ و بە شتی ترەوە رادەوەستێ، خۆبەخۆ جێگا ناگرێ و بەهۆی ئەو شتەوە پێیەوە راوەستاوە جێگا دەگرێ، وەک سپیەتی، رەشیەتی، درێژی، کورتی... تاد.

**عەرەزی خاس**: وشەیەکە بۆ ئەفرادی هاوحەقیقەت بەکاردەهێنرێت، بەلام زاتی نییە بۆیان، وەک (کاتب) بۆ هەموو بەرەی ئادەمزاد. ئەمیش لە زاراوەی مەنتیقە.

**عەرەزی عام**: وشەیەکە دەوترێت بە چەند شتێکی لە حەقیقەتدا جیاواز و، زاتی نییە بۆیان، واتە: بەشێ نییە لە ماهییەتیان وەک وشەی (ماشی)ی کە دەوترێ (الانسان ماشٍ، الفرس ماشٍ،... تاد).

**(عَیْنُهُ)**: خۆیەتی.

**(غیرُهُ)**: خۆی نییە، لێی جیایە، ئەمانـە لـە ئیسـتیلاحی عیلمـی کـەلامن. هەنـدێ وتوویانـە: سیفەتەکانی خودای گەورە زاتەکە خۆینی. هەندێکیش وتوویانە: خۆی نین و جیان لێـی. ئـەهلی سوننەت و جەماعەتیش دەڵێن: «لاهو ولا غیره» واتە: سیفەتەکانی خودا زاتی خودا خۆی نـین و لە زاتی خودایش هەرگیز جیا نابنەوە. لەبەر ئەم لێ جیا نەبوونەوە وتوویانە: «ولا غیره».

**فەصل**: لە ئیستیلاحەکانی مەنتیقە، وشەیەکە بۆ ئەوە بـەکاردەهێنرێ شـتێک لـە هاوجنسـی جیا بکاتەوە، وەک (ناطق) کە ئینسان لە گیانلەبەرە ناگۆیاکان جیا دەکاتەوە.

**القائم بالذات**: جەوهەرە.

**القائم بالغیر**: عەرەزە.

**القَدَرِیَّة**: لایان وایە ئینسان خالقی کردەوەی خۆیەتی و، کـوفر و گوناهــ بـە تەقـدیری خـودا نازانن!

**کەراهەتی تەحریمی**: لە ئیستیلاحەکانی شەرعە، بەو کـارە دەڵـێن کـردنی جـوان نـەبێ و، دەلیلێکی بێهێز لەسەر حەرامییەتی هەبێ.

**کەراهەتی تەنزیهی**: ئەمیش لە ئیستیلاحەکانی شەرعە، بە کارێ دەڵێن کردنی جوان نەبێ، بەڵام دەلیل لەسەر حەرامییەتی نەبێ.

**کەشف**: لە ئیسـتیلاحەکانی ئەهلی تەسەووفە، زانینی شـتە نادیارییەکانـە لـە ڕێگـای ڕێـژەنی خوداییەوە دەخرێتە دڵ، بێئەوەی پێویستی بە دەلیل هەبێ.

**کەلام**: عیلمێکە بە دەلیلی بەهێز بیروباوەڕە ئایینییەکانی ئایینی ئیسـلام جـێگیر دەکـا و لـە گومان دەیپارێزێ. دیارە لێرەدا مەبەس هەر بیروباوەڕەکان خۆیانن نەک کار و کـردەوەی وەکـوو نوێژ و ڕۆژوو... تاد؛ ئەمانە عیلمی خۆیان هەیە. ئەوەی لە عیلمی کەلام دا باس دەکرێ زانراوێکـە پێوەندی بە ئیسباتی ئەو بیروباوەڕانەوە هەبێ، دوور یا نزیک. مەبەست لە عیلمـی کـەلام بریتییـە لە:

الف ـ بەرزبوونــەوە و دوورکەوتنــەوە لـە نزمـایی و نشـێویی چاولێکـەری و دواکـەوتن، بـەرەو لووتکەی بڕوای پتەو و نەلەقیو.

ب ـ ڕێپیشاندانی ئەوانەی دەیانەوێ بکەونە سەر ڕێ بە ڕوونکردنەوە و دەلیل و بۆڕدانی ئەوانەی ئینکار دەکەن بە هێنانەوەی دەلیلی پتەوی دەمکوتکەر.

ج ـ پاراستنی پێڕەوەکانی ئایینی ئیسلام لە شوبهە و گومانی بێباوەڕان.

د ـ دامەزراندن و بنیاتنانی عیلمە پەیڕەوییەکان لە سەری؛ چونکە عیلمی کەلام بناخەیە.

هـ ـ ڕاستی و دروستی بیروباوەڕ.

**مأخذ الاشتقاق**: مەسدەر، چاوگ، وەک (نَصْر) بۆ (نَصَرَ) و (ينصرُ)...

**الماهية الجنسية**: ئەو جنسەیە کە باسمان کرد.

**الماهية النوعية**: ئەو نەوعەیە کە باسمان کرد.

**المتكلمون**: بەوانە دەڵێن کە خەریکی عیلمی خودا بەیەکزانین و عیلمی کەلام دەبن، ئەو عیلمەی کە باسی زات و سیفەتی خودا و چۆنییەتی مومکین و مەوجوود دەکا، باسکردنێ کە لەسەر هەستی ئاشکرای عەقڵ و نەقلی ڕاست دامەزراوە بەجۆرێ کە بیروباوەڕەکانی ئایین لە گومان و دوودلی بێباوەڕان ڕزگار بن. ئەمانە دەلیلی عەقلی و نەقلی بەکار دێنن.

**متواترات**: دەنگ وباسێکن کۆمەڵە خەڵکێ بیگێڕنەوە. مومکین نەبێ هەموویان لەسەر درۆکردن ڕێک کەوتبن.

**مەجاز**: وشەیەکە لە زمانی ئەو کەسەدا کە قسەی پێ دەکات بۆ واتایە بەکاربهێنرێ کە بۆی دانەنرابێ، بەڵام پێوەندی لەگەڵ واتا ئەسڵییەکەیدا هەبێ، وەک (اسد) لای عەرەب کە بە ئینسانی ئازا بوترێ...

**مەششائی**: بە ئەرەستۆ و پەیڕەوەکانی دەڵێن، ڕێبازی ئەرەستۆ لە فێربوون و فێرکردندا بەجۆرێ بوو کە قوتابییەکان لەگەڵیدا بوون، ڕێبازیان لەسەر دەلیلهێنانەوەی عەقلی و وەرگرتنی زانست و فێربوون دامەزرابوو.

**موشتەق**: بەو وشە عەرەبییە جۆراوجۆرانە دەوترێ کە لە چاوگێکەوە وەردەگیرێن، وەک (ضارب، مضروب، ضرّاب، مِضرَب... تاد) کە لە چاوگی (ضَرْب) ەوە وەرگیراون.

**موعتەزیلە**: کۆمەڵێکن لە زانایانی ئیسلام خاوەنی ڕای تایبەتین دەربارەی سیفەتەکانی خودا و، پایەی خاوەنی گوناهی گەورە و، بێدەستەڵاتی و دەستەڵاتداریی ئینسان لە کار و کردەوەی

خۆیدا، یا لە باسی ئەلفازی قورئاندا کە ئاخۆ دروستکراون یاخۆ قەدیمن... تاد. ئەمانە دژی ئـەهلی سوننەت و جەماعەتن و بە ئەهلی بیدعەت ناسراون.

دەربارەی هۆی ناونانیـان بـە موعتەزیلـە دەڵـێن: ڕۆژێ (واصـل)ی کـوڕی (عطـا) مامۆسـتا و پێشەوای موعتەزیلە لە کۆڕێکی حەسەنی بەسەریدا دانیشتووە، لەوکاتەدا زەلامێ خۆی دەکـا بـە ژوورا و بە حەسەنی بەسەری دەڵێ:

تاقمێک پەیدابوون خاوەنی گوناهی گەورە بە کـافر دادەنـێن و گونـاهی گـەورەیان لا کـوفرە. کۆمەڵێکیش دەڵێن: گوناهی گەورە لەگەڵ بوونی باوەڕدا زیانی نییە.

ئا لەوکاتەدا کە حەسەنی بەسەری بیری لە شتەکە دەکردەوە و پێش ئەوەی قسە بکا، (واسـل) وتی: من ناڵێم خاوەنی گوناهی گەورە کافرە و نایشڵێم موسوڵمانە، بەڵکو دەڵێم نە موسوڵـمانە و نە کافر، پایەیەکی هەیە لەنێو دوو پایەی موسوڵمان و کافردا...، ئەمەی وت و هەڵسایە سـەرپێ و چوو پاڵیدا بە یەکێ لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە و خەریکی تەقریری وەڵامەکەی بوو.

حەسەنی بەسـەری کـە ئەمـەی دی فـەرمووی: «إعْتَـزَلَ عَنّـا واصـل..» واتـە: واسـیل لێمـان جیابووەوە و کەناری گرت. لەو ڕۆژەوە واسیل و پەیڕەوەکانی ناونران (معتزله) واتە کەنارگرتوو لـە زۆربەی زانایانی ئیسلام.

**المفهوم الموافق، المفهوم المخالف**: لە ئیستیلاحەکانی عیلمی ئوسوولی فیقهن.

یەکەمیان ئەوەیە حوکمی ئەوەی لە ڕستەکەدا باس نەکراوە لەگەڵ ئەوەدا کە باس کراوە ڕێک و گونجاو بێ، بۆ نموونە: لە ئایاتی [ولا تَقُلْ لهما أفٍّ ولا تنهَرْهُما... الآیة]دا ئەوەی باس کراوە ئۆف نەکردنە لە ڕووی باوک و دایکدا و پیاهەڵنەکالانیانە، باسی لێدانیان نەکراوە، بەلام بـێ‌گومـان کـە ئۆف کردن لە ڕوویاندا ڕەوا نەبێ لێدانیان سەد قات ڕەوا نابێ.

دووەمیان ئەوەتە حوکمی بـاس‌نـەکراو لـە حـوکمی بـاس‌کـراو جیـاواز بـێ، بـۆ نموونـە: کـە پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێ: «فی الغَنَم السّائمة زکاةٌ» واتە: لە بزن و مەڕی بە دەمی خۆ لەوەڕیوی ئالف بۆ نەهێنراودا زەکات واجبە بەو مەرج و شێوانەی لە شەریعەتدا باس کراوە. لەم فـەرموودەوە دەردەکەوێ کە (لا زکاة فی العلوفة) واتە: ئەو بزن و مەڕەی ئالفی بۆ بهێنرێ زەکاتی لێ نادرێ.

**مومکینی خاس**: ئەوەتە بوون و نەبوونی وەک یـەک بـێ، واتـە: لەوانـەبێ ببێـت و لەوانـەبێ نەبێت، وەک ئەو هەمووە دروست‌کراوانەی لەبەرچاو دان.

**مومکینی زاتی**: شێکە تەنها بە عەقڵ بتوانرێ تەسەووری بوونەکەی بکرێ، ئیتر مەرج نییە ئەو شتە بووبێ یا لە پاشەڕۆژدا ببێ.

**مەوزووع و مەحموول**: لە عیلمی مەنتیق و کەلامدا بەرامبەری موبتەدا و خەبەرن لە عیلمی نەحودا، بۆنموونە: ـ لە رستەی (الله عالِمٌ)دا وشەی (الله) ئەهلی مەنتیق و کەلام پێی‌دەڵێن مەوزووع و وشەی (عالم) پێی دەڵێن مەحموول. نەحوییەکانیش بە یەکەم دەڵێن موبتەدا و بە دووەم دەڵێن خەبەر.

**نەوع**: وشەیەکە بۆ چەند شتێکی هاوحەقیقەت بەکار دەهێنرێ وەک وشەی (انسان) کە هەموو ئادەمزاد دەگرێتەوە و زاتییە بۆ ئەفرادەکانی. ئەمیش لە ئیستیلاحی ئەهلی مەنتیقە.

منیش رۆژی پێنجشەممەی [١٩]ی رەجەبی (١٤٠٧)ی کۆچی، رێکەوتی [١٩]ی ئازاری (١٩٨٧)ی زایینی لە کاری خۆم بوومەوە.

**فاتح عبدالکریم**

# سەرچاوەکان

## ١ـ عەرەبییەکان


| | |
|---|---|
| ١ـ إحكام الاحكام | سيف الدين ابوالحسن على الآمدى |
| ٢ـ اسد الغابة فى معرفة الصحابة | عزالدين ابن الاثير الجزرى |
| ٣ـ الإصابة فى تمييز الصحابة | ابن حجر العسقلانى |
| ٤ـ بداية المجتهد و نهاية المقتصد | ابن رشد الاندلسى |
| ٥ـ التاج الجامع للاصول فى إحاديث الرسول | منصور على ناصف |
| ٦ـ تاريخ الخلفاء | جلال‌الدين السيوطى |
| ٧ـ التعريفات | السيد الشريف الجرجانى |
| ٨ـ الجامع الصحيح/ صحيح البخارى | ابوعبدالله محمد بن ابى الحسن البخارى |
| ٩ـ جمع الجوامع | تاج الدين السبكى |
| ١٠ـ روح المعانى فى تفسير القرآن العظيم و السبع المثانى | ابو الثناء شهاب الدين محمود الآلوسى |
| ١١ـ روضات الجنات | ميرزا محمد باقر الموسوى الخوانسارى |
| ١٢ـ سنن ابن ماجة | ابو عبدالله محمد بن يزيد بن ماجة |
| ١٣ـ سنن ابى داود | ابو داود سليمان بن الاشعث السجستانى |
| ١٤ـ سنن الترمذى | ابو عيسى بن محمد بن عيسى الترمذى |
| ١٥ـ شرح صحيح مسلم | محى‌الدين ابوزكريا يحيى بن شرف‌النووى |
| ١٦ـ شرح العقائد العضدية | جلال‌الدين محمد بن اسعد الدوانى |

۱۷ـ شرح العقائد النسفیة — مسعود بن عمر التفتازانی

۱۸ـ شرح مقاصد الطالبین — مسعود بن عمر التفتازانی

۱۹ـ شرح المواقف — السید الشریف الجرجانی

۲۰ـ القاموس المحیط و القابوس الوسیط — مجدالدین ابوطاهر محمدبن یعقوب الفیروزآبادی

۲۱ـ القرآن الکریم

۲۲ـ لسان العرب — جمال‌الدین ابوافضل محمدالمشهور بابن منظور

۲۳ـ المستصفی — الامام الغزالی

۲۴ـ مسند الامام احمد — الامام ابوعبدالله احمد بن محمد بن حنبل

۲۵ـ معجم المطبوعات العربیة و المعرّبه — یوسف الیان سرکیس

۲۶ـ المعجم المفهرس لالفاظ القرآن الکریم — فؤاد عبدالباقی

۲۷ـ مفاتیح الغیب — فخرالدین الرازی

۲۸ـ المنجد فی اللغة والأدب والعلوم — الاب لویس معلوف الیسوعی

۲۹ـ الوسیلة فی شرح الفضیلة — عبدالکریم محمّد المدرّس


## ۲ـ کوردی‌یەکان:


۱ـ دیوانی مەولەوی — سەیید عەبدوڕڕەحیمی مەولەوی
لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس

۲ـ عەقیدەی مەرزی‌یە — سەیید عەبدوڕڕەحیمی مەولەوی
محی‌الدین سەبری نعیمی بلاوی کردووەتەوە.

۳ـ هەڵبژاردەیەک لە عەقیدە مەرزییەی مەولەوی — بابە عەلی شێخ عومەری قەرەداخی

٤ـ یادی مەردان، بەرگی دووەم — عەبدولکەریمی مودەڕڕیس


## ۳ـ فارسی‌یەکان


۱ـ فرهنگ برهان قاطع — موحەممەد حسێن، کە نازناوی بورهانی قاتیعە

۲ـ یوسف و زلیخا — نوورەددین عەبدوڕڕەحمانی جامیی نەقشبەندی

۳ـ فوایح — سەیید عەبدوڕڕەحیمی مەولەوی

# العقيدة المرضية

عبدالرحيم بن سعيد(مولوی کورد)

شرح و تحليل:

الشيخ عبدالكريم محمد المدرس

راجعه و اعاد صياغته و هوامشه:

فاتح عبدالكريم



١٥٠٠٠ دينار